# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک



## جیپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوک

سەرپەرشتیاری گشتی نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

بەرگی یەکەم



# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی یەکەم

## جیۆپۆلیتیکی پارێزگای کەرکوک

سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە
سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)

٢٠٢٣

دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان

بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری
جەمال عیرفان ٢٠٢٣
زنجیرە: (١٣٨)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

ناوی کتێب: ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک- بەرگی یەکەم: جیۆپۆلیتیکی پارێزگای کەرکوک
بەشداران: کۆمەڵێك نووسەر
سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە: سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)
سەرپەرشتیاری زانستی و ئەکادیمی: د. یوسف گۆران
سەرپەشتیاری کارگێڕی: زاهیر شکور
دیزاینی ناوەوە: ئەنجام سەعید
دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی
تایپ: زەینەب حەمید
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٣
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: چاپخانەی تاران

**لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی**
**(٢٠٠٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ پێ دراوە**

Tel: 0533202936 07736959302
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر قەیوان تاوەر

# ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک

## بەرگی یەکەم

## جیۆپۆلیتیکی پارێزگای کەرکوک


بەشداران

د. جەبار قادر
د. بەختیار سەعید
د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز
د. ناهیدە تاڵەبانی
محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق
هاشم کاکەیی
ئەمین شوان
سەروەر ساڵەیی
هێمن کامل
سەربەست کەرکوکی
سمکۆ بەهرۆز
د. دڵشاد مەحموود
د. زرار سدیق
د. محەمەد شوانی
ئەحمەد تاقانە
کاوە محەمەد (خەیام)
ئاریان جەمال
فەیسەڵ عەلی
دڵشاد ئەحمەد
محەمەد سەید
فاتیح قادر عوسمان



٢٠٢٣

## ئینسایکلۆپیدیای کەرکووك

کۆکردنەوەی زانیارییەکان و نووسینەکان و دۆکیۆمێنتەکان و سەرلەنوێ دارشتنەوەیان و ڕێکخستنەوەیان لە چوارچێوەی ئینسایکلۆپیدیایەکدا هەر وا کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پشوودرێژی و توانایەکی ئێجگار زۆری دەوێ بەتایبەت لە وڵات و ناوچەیەك کە دۆکیۆمێنتەکردنی زانیاری و نووسینەکان زۆر جێگەی بایەخ نەبووبێ، لەوەش ئەستەم تر لەناو گەل و نەتەوە و شارێك کە دوژمنانی بەدرێژایی مێژوو بەشێوەیەکی پیلان بۆ داڕێژراو کاریان بۆ سڕینەوە و لەناوبردن شێواندنی سەرجەم کایەکانی ژیان تێدا کردبێ، بۆیە بڕیاردان بۆ گرتنە ئەستۆی نووسینەوەی ئینسایکلۆپیدیای کەرکووك وەك شار و وڵاتانی دیکە هەروا کارێکی ئاسان نەبوو.

کەرکووك سروشتێکی تایبەتی هەیە، چونکە بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەبووە، هەربۆیە لە ڕابردوودا هەموو هێزە جیاکان ویستوویانە وێنەی ڕاستەقینەی شارەکە بشارنەوە، بۆیە ئێمە جیاواز لە ڕابردوو لە ڕێگەی ئەم پرۆژەیەوە هەوڵمانداوە وێنەی ڕاستەقینەی کەرکووك بەتەواوی پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی، کەسایەتییەکانی (ڕووناکبیری، ئایینی، سیاسی، کۆمەڵایەتی...) سروشتی لادێی و ئاوایییەکانی بخەینەڕوو.

ئەم هەوڵەی نووسینەوەی ئینسایکلۆپیدیای کەرکووك یەکەم هەنگاو و هەوڵ نەبووە، بەڵکو پێشتر و لە سالی نەوەدەکان لەناوەوە و دەرەوەی کەرکووك لەلایەن کەسایەتییە جیاکانی کەرکووکەوە چەندین هەوڵی هاوشێوە دراوە، بەڵام پرۆژەکانیان بە هۆکاری جیا نەگەیشتووەتە بەرهەم، بۆیە ئێمە سالی ٢٠١٣ بڕیارماندا ئەم ئەرکە مێژوویی و نەتەوەییە بگرینە ئەستۆ و خۆشبەختانە دوای (٤) چوار سال زیاتر بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر و پشوودرێژی کەسایەتییەکان لەسەرجەم نەتەوەکان توانیمان کنە و پشکنین بۆ لاپەرە جیاکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، ڕووناکبیری، جوگرافیا، هونەری، وەرزشی و کەلتووری مێژوویی... سەرجەم نەتەوە و پێکهاتەکانی کەرکوك بکەین، لە ئاکامدا توانیمان ئەو خەونە لە مێژینەی کەرکوك و کەرکووکییەکان بەدی بهێنین و، لە دوو توێی (١٠) بەرگدا هەموو لایەنەکانی ژیان لە کەرکوك بە وێنە و ئەرشیفی کەسایەتییەکان لە ئینسایکلۆپیدیای کەرکوکدا کۆبکەینەوە.

لەو (١٠) بەرگەدا بەشێوەیەکی ئەکادیمی باسی هەموو لایەنەکانی ژیان لە پارێزگای کەرکوك کراوە، وەك لایەنی جوگرافیا، مێژووی کۆن و نوێ و هاوچەرخی کەرکوك، ناوچە شوێنەوارییەکان و کەلتوورییەکان، ئەدەب و فەرهەنگ، هونەر و وەرزش، لە هەمان کاتدا باسی مێژووی پەروەدە و فێرکردن و ناوەندەکانی فێرکردن و شێوازەکانی فێرکردن بەدرێژایی مێژووی کەرکوك کراوە، هاوکات باسی لایەنی ڕۆژنامەوانی و کاری میدیا و ڕۆژنامەگەریمان لە کەرکوك کردووە، لەپاڵ ئەوانەشدا بەشێکی باسەکانی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك تەرخانکراوە بۆ خستنەڕووی لایەنی کارگێڕی و پێکهاتەی کارگێڕی کەرکوك و ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر دیموگرافیای کەرکوك لە چوارچێوەی سیاسەتی سێکوچکەی (بەعەرەبکردن و ڕاگواستن و بەبەعسیکردن) هاتووە. بۆ ئامادەکردنی ئەم ئینسایکلۆپیدیایەش نزیکەی (١١٤) مامۆستای زانکۆ و نووسەر و توێژەر و هونەرمەند بەباس و توێژینەوەی جیا بەشداربوون.

نووسینەوەی ئینسایکلۆپیدیایەکی لەو شێوەیە بێ سەرئێشە و کەموکوری نابێ، بەتایبەت لەو باسانەی کە پەیوەندی بە کوردەوە هەیە، چونکە زۆربەی کات بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکان یان ونکراون، یاخود هەر لە بنەرەتدا تۆمار نەکراون، بۆیە ئەم هەوڵەی ئێمەش بێ کەموکوری نابێ، بەڵام هەنگاوێکی گەورە و دەستکەوتێکی گەورەیە، ئەکرێ بەسوود وەرگرتن لە هەڵەی کەموکورییەکان چاپەکانی داهاتوو بەشێوەیەکی باشتر دابرێژینەوە، بۆیە ڕاو سەرەنج و بۆچوون و پێشنیاز و ڕەخنەی دڵسۆزان بۆ ئەم پرۆژە گرنگ و ئاوازەیە زۆر گرنگە.

بۆیە لێرەدا جێی خۆیەتی دەستخۆشی و سوپاسی هەموو ئەو کەسانە بکەین، کە هەماهەنگ و هاوکارمان بوون، چ لە کۆکردنەوەی زانیاری و بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکان یان ئەوانەی پاڵپشتی ماددیان کردین بەتایبەت خاتوو (هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد)، کە ئەرکی ماددی جێبەجێکردنی پرۆژەکەی گرتە ئەستۆ، هەروەها سوپاسی بەڕێز (ڕەفعەت عەبدوڵلا).... دەکەین، کە بەهەمان شێوە هاوکار و پاڵپشتمان بوو.

نووسینەوە و ئامادەکردن و جێبەجێکردنی پرۆژەی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك پرۆژەیەکی نیشتمانی و نەتەوەیی گرنگە و ئاماژەیەکیشە بۆ پێکەوەژیانی نەتەوەکانی (کورد، عەرەب، تورکمان، ئاشووری) و ئایینەکانی (ئیسلام، مەسیحی، جوولەکە، سابینەی مەندائی) و ڕێبازەکانی (سوننە، شیعە، قادری، نەقشبەندی، کاکەیی، کاسۆلیکی، ئەرسەدۆکس...)، هەروەك دەرخستنی ڕووی جوانی و ڕاستەقینەی مێژووی کەرکوك و کەرکووکییەکانە، هەر بۆیە هەوڵدەدەین لە ئایندەدا چاپی ئینگلیزی و عەرەبی و تورکی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك ئامادە و چاپ بکەین.

لە کۆتاییشدا، چاوەڕێی پێشنیاز و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانمان لە دڵسۆزەکانمان دەکەین، بێگومان لە چاپەکانی داهاتوودا سوود لە سەرجەم ئەو سەرەنج و پێشنیاز و ڕەخنانە دەگرین شوێنیان دەکەینەوە.

د. یوسف گۆران
سەرپەرشتیاری ئەکادیمی پرۆژەکە

* ناساندنی بەرگەکانی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك:-

سمکۆ بەهرۆز
سەرپەرشتیاری نووسین و پێداچوونەوە

ئینسایکلۆپیدیای کەرکوك خۆی دەبینێتەوە لە قەبارەی ١٠ بەرگ بە بارستایی (٥٨٥١) لاپەرەی A4 کە ٥٧١ لاپەرەی رەنگاورەنگە هەر بەرگێکی تایبەتە بە بوارێك لە بوارەکانی رۆشنبیری و مێژووی و هونەری و کەلتووری.

* بەرگی یەکەم:-
بەناونیشانی (جیپۆلەتیکی پارێزگای کەرکوك) بە بارستایی (٧١٧ لاپەرەی A4، تایبەتە بە بواری زەویناسی پارێزگای کەرکوك لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا بەتایبەتی لە بواری مرۆیی و ئابووریی و ئاینیی و کۆمەلایەتی و کارگێرییدا.
بابەتەکانی ئەم بەرگە دابەشبووەتە سەر ئەو بوارە هەمەچەشنانەی کە خۆی دەبینێتەوە لە:-
- بنەرەت و لێبوونەوەی ناوی کەرکوك
- شوێنی کەرکوك لە رووی مێژوویی و جوگرافییەوە
- پێکهاتە و رووی زەوی کەرکوك
- جۆرەکانی گڵ لە کەرکوك
- ئاوو هەوای پارێزگای کەرکوك
- جوگرافیای دانیشتوان و رووبەرەکەی
- چین و توێژە نەتەوەییەکانی کەرکوك
- دابەشبوونی هۆز و خێزانەکانی کەرکوك
- سەردەمی گۆرانە کارگێرییەکانی کەرکوك:
ئەم تەوەرە تایبەتە بە هەموو ئامارەکانی تایبەت بە پارێزگا و گوند و ناحیەو قەزاکانی کەرکوك هەر لە سالانی ١٩٢٠-٢٠٠٠ لەگەڵ کورتەیەك لە مێژووی بەشێك لە گوندەکانی کەرکوك
- تەوەرێکی تر تایبەتە بە بواری ئابووری لە رووی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و کانزاکان

* بەرگی دووەم:-
بە ناونیشانی (رووداوە مێژووییەکانی کەرکوك) بە بارستایی (٩٠٩) لاپەرەیە ئەم بەرگە تایبەتە بە مێژووی کەرکوك و دەورووبەری هەر لە حەوت هەزار ساڵ پێش مێژووەوە تا رووداوەکانی ساڵی ٢٠١٨ کە دیارترینیان فراوانخوازی داعش و شەری هێزی پێشمەرگە لە دەڤەرەکە.
ئەم مێژووە دابەش بووەتە سەر رووداوەکانی پێش مێژوو رووداوەکانی سەردەمە مێژووییەکان و رووداوەکانی چاخەکانی ناوەراست و سەرهەڵدانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەگەڵ مێژووی هاوچەرخی ناوچەکەدا لەگەڵ ئامارو هەڵسەنگاندنی ئەو رووداوە مێژووییانەی کە روویان داوەو رۆڵی ناوچەو هێزە ئیقلیمییەکان لەسەر کەرکوك و پێگەی کەرکوك لە پانتایی رووداوەکاندا.
گرنگی ئەم بەشە لەوەدایە بەشێوەیەکی ئەکادیمیانە هەڵسەنگاندن بۆ رووداوە مێژووییەکان کراوەو دەوری هەریەکە لە پێکهاتە ئاینی و نەتەوەییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو رەچاو کراوە کە خۆی دەبینێتەوە لە راستی رەوتی رووداوە مێژووییەکان.

* بەرگی سێیەم:-
خۆی دەبینێتەوە لە بارستایی (٤٢٢) لاپەرەی A4 کە دابەشبووەتە سەر سێ تەوەر بەم ناونیشانانەی خوارەوە:
- مێژووی سیاسەتی تەعریب لە کەرکوك:
ئەم تەوەرە تایبەتە بە مێژووی تەعریب هەر لە ساڵی ١٩٢٠ وە تا دوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە چوارچێوەی ئەو بەلگەنامانەو دیکۆمێنتانەی کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە دەرچووە یان بریارەکانی سەرکردایەتی بەعس کە ئەو کاتە دەریان کردوە دەربارەی تەعریب و راگواستن و گۆرینی کارگێری و تەعریبی خوێندن و راگواستنی نەتەوەو ئاین و گۆرینی ناسنامە.
- ئەو کۆمەڵ و رێکخراو و حیزبانەی لە کەرکوك سەریان هەڵداوە:
ئەم تەوەرە تایبەتە بە هەموو ئەو چالاکییانەی کە رێکخراوو حیزبەکان لە کەرکوك ئەنجامیان داوە لە رووی چالاکییە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری کە بەشێکی زۆر لە پێکهاتەو نەتەوەکانی وەکو کورد، عەرەب، تورکمان، جوولەکە، ئەرمەنی، ئاسووری، بەشێکی ئەم رێکخراوو حیزبانە چالاکییەکانیان هەر لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە برەوی هەبوو تاکو چالاکی کۆمەڵ و رێکخراوەکانی دوای پرۆسەی ئازادی.
- ئەو رۆژهەلات ناسانەی سەریان لە کەرکوك داوە:
تەوەری سێیەم تایبەتە بە چالاکی ئەو گەریدەو رۆژهەلات ناسانەی کە سەریان لە کەرکوك داوە لە چوارچێوەی چالاکییە سەربازی و سیاسی و ئابووریەکانیان لەگەڵ تۆماری ئەو یاداشتانەی کە لێیان بەجێماوە دەربارەی کەرکوك لە رووی پێکهاتەی دانیشتووان و ئاین و باری کۆمەلایەتی و ژیانیان لە چوارچێوەی ئەو مەرامانەی کە کاریان بۆ کردووە یان لەلایەن لایەنێکەوە سەرپەرشتی گەشتەکەیان کراوە بۆ ئەنجامدانی بە شێوەیەکی رێکوپێك کە هەر هەمووی کەرەستەیەکی بە پێزە بۆ نووسینەوەی مێژووی کەرکوك لە قۆناغە جیاجیاکاندا.

* بەرگی چوارەم:-
بە ناونیشانی(بیبلۆگرافیای ناوداران و رۆشنبیرانی کەرکوك) ئەم بەرگە بریتییە لە (٦٨٨) لاپەرەی قەبارە A4، تایبەتە بە چالاکییەکانی ئەو کەسایەتییانەی لە کەرکوکدا دەوریان بینیوە لە بواری سیاسی و سەربازی و رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ئایینی و هونەری لەگەڵ خستنە رووی ئەو بەرهەم و چالاکییانەی ئەنجامیان داوە لە ماوەی ژیانیاندا و بە ئەرشیف کردنی یان خستنەرووی وێنەکانیان کە بەلگەیەکی گرنگە بۆ دەوری براوتیان لە زنجیرە خزمەتەکانیان لە بوارە جیاجیاکان هەموو ئەم بەرگە پێرست کراوە بەپێی ریزبەندی پیتەکان کە لە ئەلفەوە دەستپێدەکات.

* بەرگی پێنجەم:-
بە ناونیشانی (هونەر لە دەڤەری کەرکوك) لە دوو توێی (٦٣٠) لاپەڕەی قەبارە A4 خۆی دەبینێتەوە لەم تەوەرانەی خوارەوە:-
- تەوەری یەکەم: مێژووی گۆرانی و مۆسیقا لە کەرکوك
- تەوەری دووەم: مێژووی هونەری شانۆ لە کەرکوك
- تەوەری سێیەم: مێژووی سینەما لە کەرکوك
- تەوەری چوارەم: مێژووی هونەری شێوەکاری لە کەرکوك
- تەوەری پێنجەم: وێنەگرانی کەرکوك

ئەم بەرگە تایبەتە بە هەموو لایەنەکانی هونەر هەر لە سەرهەڵدان و نەشونما کردن و پێگەیاندنی هونەرمەندان و دەرخستنی ڕووداوەکانی چالاکییە هونەرییەکانیان لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوە کە هەندێکیان لە چوارچێوەی ئاستی جیهانیدا ناوبانگیان دەرکردووە کە جێ پەنجەیان تاکو ئێستاکە بەدەردەکەوێت و سەرچاوەیەکی بەپێزە لەسەر ئاستی هونەری لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵگەدا.

* بەرگی شەشەم:-
بە ناونیشانی (کەلتورو شارستانییەت لە دەڤەری کەرکوك) بە قەبارەی (٧٨٠) لاپەڕەی A4 کە خۆی دەبینێتەوە لە:
- گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و کەلتورییەکانی دەڤەری کەرکوك
- پێکهاتەی چینایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان
- پیشەو پیشەکاران
- ڕووخسارە کۆمەڵایەتییەکانی شاری کەرکوك
- داب و نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان
- پۆشاك و جەژن و بۆنەکان
- ئەو خشڵانەی بەکارهاتوون لە دەڤەری کەرکوك
- نەریتی پرسەو مردوو ناشتن
- گواستنەوەی بووك
- پەندی پێشینان و مەتەڵی فۆلکلۆری
- چاوەزارو ئیرەیی
- پیشەوەرەکانی کەرکوك
- کەرەستەکانی جووت کردن
- بیروباوەرە ئاینییەکانی کەرکوك لە کۆندا
- ناسینەوەی بابە گوڕ گوڕ
- قمرەجەکانی کەرکوك
- ڕووناکی لە دەڤەری کەرکوك
- ئاوو سەرچاوەکانی ئاو لە کەرکوك
- کێش و سەنگ و پارە

* بەرگی حەوتەم:-
بە قەبارەی (٣١٧) لاپەڕەی A4 کە خۆی دەبینێتەوە لە دوو تەوەر بە ناونیشانی:
- تەوەری یەکەم: تەندروستی و خزمەتە تەندروستییەکانی کەرکوك
- تەوەری دووەم: وەرزش و یانە وەرزشییەکانی کەرکوك

* بەرگی هەشتەم:-
بەقەبارەی (٣١٢) لاپەڕەیA4 بە ناونیشانی: هونەری تەلارسازی و نەخش و نیگاری کەرکوك و دەوروبەری لە ڕوانگەی سەردەمە مێژووییەکانەوە.

* بەرگی نۆیەم:-
بە قەبارەی (٥٢٧) لاپەرە A4 بە ناونیشانی: (ئەدەب و ڕۆشنبیری لە دەڤەری کەرکوك) کە خۆی دەبینێتەوە لە سێ تەوەر بەم ناونیشانانە:
- خوێندن و پەروەردە لە کەرکوك
- ئەدەب و ڕۆشنبیری لە ناوچەی کەرکوکدا
- مێژووی زار و زاراوەکان لە کەرکوك

* بەرگی دەیەم:-
بە قەبارەی (٥٤٧) لاپەڕەی A4 بەناونیشانی (بیبلۆگرافیای ڕاگەیاندن لە دەڤەری کەرکوك)
کە خۆی دەبینێتەوە لەم تەوەرانەی خوارەوە
- ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی لە کەرکوك سەریان هەڵداوە
- ئەو پەرتوکانەی بە زمانە جیاجیاکان باسی کەرکوکیان کردووە.
- چاپ و چاپخانە لە کەرکوك
- کتێبخانە و کتێبخانە گشتییەکانی کەرکوك
. هونەری بەرگ تێگرتن

*نووسەرە بەشداربووەکانی ئەم ئینسایکلۆپیدیایە :
* د. ئیبراهیم خەلیل سەعید
* د. بەختیار سەعید مەحموود
* د. بەهادین ئەحمەد
* د. پشکۆ حەمە تاهیر
* د. جەبار قادر
* د. حوسێن یوسف حازم
* د. خەیرییە قاسمیە
* د. دڵشاد عوسمان
* د. دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز
* د. دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان
* د. ڕافیدە عەبدوڵلا قەرەداغی
* د. ڕەفیق شوانی
* د. سانیحە ئەمین زەکی
* د. سەعدی عوسمان هەرووتی
* د. شاکر سابیر زابت
* د. عەبدوڵلا دارتاش
* د. عەدنان هەریر ئەلشجویەری
* د. عوسمان عەلی
* د. عەلی شاکر عەلی
* د. قاسم ئەلجومەیلی
* د. کازم حەبیب
* د. کامەران کویخا جەلال
* د. کەمال مەزهەر ئەحمەد

* د. كەیوان ئازاد
* د. كۆزاد محەمەد
* د. مارف خەزنەدار
* د. محەمەد شوانی
* د. محەمەد عەبدوڵڵا كاكە سوور
* د. محەمەد كەساس
* د. مووسا محەمەد خدر
* د. ناهیدە تاڵەبانی
* د. نەجاتی عەبدوڵڵا
* د. نەجمەدین كەریم
* د. نوری تاڵەبانی
* د. ئیبراهیم خەلیل سەعید
* د. ئیمان عەبدولحەمید ئەلدەباغ
*د. زرار سدیق ناروجەیی
*د. عیماد عەبدولسەلام
* د. عەبدوڵڵا دارتاش
* د. قادر محەمەد حەسەن
* د. یوسف گۆران
* ئەحمەد مەجید ئەلحەسەن
* ئاراس عەبدولرەحمان
* ئارام رەزا عیزەدین
* ئارەزوو نوری
* ئاریان جەمال هەرزانی
* ئازاد ئەحمەد ئەسوەد
* ئاكۆ خالید ئەحمەد
* ئەنجام سەعید
* ئەحمەد باوەڕ
* ئەحمەد تاقانە
* ئەحمەد عەبدوڵڵا جاف
* ئەحمەد عەزیز
* ئەسیری
* ئەمین شوان
* ئومێد نەجم
* ئۆژین ئیبراهیم رەزا
* بەهرۆز ساڵح حەسەن
* بەیار عومەر عەبدوڵڵا
* بەختیار سەعید
* بوار نورەدین
* تاریق كارێزی
* پۆست هیلتەرمان
* پیرۆت تاڵەبانی
* جەمال نوری
* ج. كرامرز (تۆمابوا)
* چالاك سدیق
* حەسەن بارام
* حەسەن جاف
* حەمە زیاد مەولود
* حەمە سەعید زەنگنە
* حەمە كەریم عارف
* حەمید عەبدوڵڵا ساڵح
* حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ
* حوسێن عەونی
* خالید شوانی
* خالید دلێر
* دانا عەسكەر
* دڵشاد ئەحمەد
* ژیلوان لەتیف یار ئەحمەد
* رزگار شوانی
* رووخۆش عەلی
* زاگرۆس نانەكەلی
* زاهیر شكور
* سامان كەریم
* سەباح عەلی جاف
* سەباح ئیسماعیل
* سەباح بازرگان
* سەربەست كەركوكی
* سەروەر ساڵەیی
* سەلاح شوكور
* سەلاحەدین عەبدولحەمید
* سەركەوت عەبدوڵڵا حوسێن
* سیروان سەمین ئەحمەد
* سەمیرە ئەحمەد
* ستار عەبدوڵڵا بەرزنجی
* ستار كەریم سەعید
* ستران عەبدوڵڵا
* سمكۆ بەهرۆز
* سمكۆ شوانی
* سنوور سەباح سدیق
* شاكر فەتاح
* سیروان سەرگەڵوو
* سالار رەشید
* سامان ئەحمەد
* شەوكەتی حاجی موشیر
* شەرەفەدین جەباری
* شێرزاد عەبدولرەحمان
* چالاك سدیق
* عەبیر عەدنان یوسف
* عەباس دیك
* عارف قوربانی
* عەبدولحەكیم خەسرەو گوزەل
* عەبدولجەبار مستەفا باخەوان
* عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی
* عەبدولستار جەباری
* عەلی كاراتی
* عەلی حوسێن ساڵح
* عەلی كەریم

* عيماد محەمەد شەريف (عيماد جەباری)
* عيماد جەباری
* عاليە عەبدولكەريم مودەڕيس
* غازی حەسەن
* فاروق مستەفا
* فەرهاد عەبدولعەزيز
* فەلەكەدين كاكەيی
* فەيسەڵ عەلی
* فەرەيدوون عەبدولقادر
* قارەمان قادر شێخ بزێنی
* كاوە محەمەد
* كەمال نووری مەعروف
* لەتيف فاتيح فەرەج
* لەتيف هەڵمەت
* مەسعوود عەبدولخالق
* محەمەد باقی سەع
* مەلا شاخەوان
* مەلا شاخی
* مەلا محەمەد مەلا ساڵح گونبەدی
* محەمەد سەيید
* محەمەد شاكەلی
* مستەفا ساڵح كەريم
* مستەفا عەسكەری
* موزەفەر ساڵح قادر
* موعتەسەم ساڵەيی
* موعتەسەم نەجمەدين
* محەمەد حەمە ساڵح تۆفيق
* مەهاباد قەرەداغی
* محەمەد سەردار
* نوری فەقێ
* وەهبی ڕەسوڵ
* هاشم جەباری
* هاشم كاكەيی
* هەردەوێڵ كاكەيی
* هێمن كامل
* هێمن مەولوود

*** سوپاس و پێزانین:-**

**١ . بنکەی ژین.**
**سوپاسی هەریەکە لە مامۆستایان:- (سدیق سالح، رەفیق سالح) دەکەین کە ئەرکێکی گەورەیان کێشا لەگەڵماندا.**
**٢ . کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سلێمانی، بە تایبەتی بەڕێز د. محەمەد کەساس**
**٣ . کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی سەلاحەدین.**
**٤ . کتێبخانەی گشتی سلێمانی.**
**٥ . کتێبخانەی گشتی هەولێر (زەیتون).**
**٦ . کتێبخانەی گشتی کەرکوك.**
**٧ . بەڕێوەبەرایەتی کوردستان بۆ چاپ.**
**٨ . مۆزەخانەی نەتەوەیی ئەمنە سوورەکە بە تایبەتی سوپاسی بەڕێز ئاکۆ غەریب دەکەین.**
**٩ . مۆزەخانەی رستن و چنینی هەولێر لەسەر قەلا.**
**١٠- بۆ نووسەری بەڕێز (محەمەد سەعید) ناسراو بە حەمە سەعید زەنگنە) کە یارمەتی زۆریدایین بۆ دابینکردنی بەشێکی زۆری رۆژنامە و گۆڤارە کۆنەکان.**
**١١ . بۆ بەڕێز سەروەر عەبدوڵلا دەکەین کە هەستاوە بە کاری گرتنی بەشێکی زۆر لە وێنەکانی سەر قەلا و ناو بازارەکانی کەرکوك .**
**١٢ . بۆ بەڕێز ئالا محەمەد کاکل کە هەستاوە بە تایپکردنی بەشێك لە بابەتەکانی نێو ئینسایکلۆپیدیاکە.**
**١٣ . بۆ کەناڵی ئاسمانی کەرکوك.**
**١٤- بۆ هەریەکە لە بەڕێزان: ئەنجام سەعید، شوان مەندی، د. محەمەد خورشید، دانا عەسکەر، شوان عەبدوڵلا، نزار محەمەد سابیر، تەیب جەبار، ئەلماس فازل، سەلاح حەمە ئەمین، کە ئەرك و ماندووبوونێکی زۆریان کێشا بۆ سەرکەوتنی پرۆژەکە.**
**١٥- کەناڵی گەلی کوردستان، کە ئەرکیان کێشا لە دابینکردنی بەشێك لە (بەرنامەکانی ژیانەوەی کوردستان) بەڕێز دڵشاد ئەحمەد.**
**١٦- بۆ بەهرام عەبدوڵلا، لە راپەراندنی هەندێك لە کارەکان.**
**١٧- بۆ نووسەر و ئەکتەر محەمەد خدر کە لە دەستکەوتنی چەند سەرچاوەیەك یارمەتی داین.**
**١٨- بۆ بەڕێز د. محەمەد ئەحمەد دەکەین خاوەنی سەیدەلی فاروق.**
**١٩- بۆ بەڕێز مامۆستا سەباح تاڵەبانی.**
**٢٠- سوپاسی تایبەتی بۆ هەر یەکە لە دریڤان عەبدولقادر، فەلاح سەلاح و عومەر غەریب کە رۆڵێکی گەورەیان بینی لە سەرخستن و ئاسانکاری بۆ چاپکردنی ئەم پرۆژە گەورەیە.**

بەشی یەکەم

# بنەڕەت و لێبوونەوەی ئەو ناوانەی بە کەرکوك و دەورووبەرەکەی وتراوە

سمکۆ بەهرۆز

زۆر لە سەرچاوەکان کە دێنە سەر باسی وشەی کەرکوك تێکەڵوییەك دروستدەکەن و ناتوانن بگەنە سەر بنەڕەتی وشەکان، بۆیە سەیر دەکەین لێکۆڵینەوەکانیان تێکەڵوی تێدا دروست دەبێت و وشەکە بە بارێکی تردا ئاوەژوو دەکەن.. ئەو مەبەستە ڕێکوپێکە بە دەستەوە نادات کە پێویستە.

ئەمەیش چەند نموونەیەکی ئەم ڕاو بۆچوونانەیە:-

((ناتوانین بگەینە شارەزایی تەواو دەربارەی وشەی کەرکوك بەشێوەیەکی نەگۆڕو چەسپاو (واقیعانە)، ئەوەی کە باسی دەکرێت تەنها بریتییە لە ئەگەر (إحتمالات)و بەنزیك بوونەوە (تأویلات)...))[1].

خوالێخۆش بوو دکتۆر مستەفا جەواد بەم شێوەیە باسی دەکات:- ((ناوی کەرکوك، کە سێ پیت لە پیتی کاف کۆی کردووەتەوە، دادەنرێت بەناوە دەگمەنەکان، کە بنەڕەتەکەی دەگەڕێتەوە سەر زمانی ئارامی))[2].

یان:-

((ناوی کەرکوك بەپێچەوانەی هەریەکە لەناوی هەولێرو نەینەوا.. ناگەڕێتەوە سەر بنەڕەتێکی مێژوویی، هەرچەندە دەگەڕێتەوە سەردەمێکی زۆر زوو، بەڵگەی بوونی قەڵا لەکەرکوکدا بنەڕەتێکی کۆنییەکەیەتی..))[3].

یان:-

((وشەی کەرکوك ئارامی بێت یان (ئاری - سامی) کە دەبینرێت لەبەکارهێنانی ناوی هەندێك ناوی (قەڵا - قلاع) کە ئەمە وای بەدەردەخات کەرکوك قەڵا بووبێت..))[4].

ئەمانەی کەباسمان کرد نموونەی خەروارێکە، هۆی ئەم تێکەڵوییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە لە تێکەڵاو کردنی بنەڕەتی دۆزینەوەی ناوی کەرکوك و دەوروبەرەکەی:-

١. نەشارەزایی لە بنەڕەتی وشەکەو شینەکردنەوەی لەلایەن پسپۆڕی شارەزای زمان و مێژوو.. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی زانیاری دەربارەی ئەو زمانانەی کە لە ناوچەکەدا بەکار هاتوونە.

٢. زاڵ بوونی بیری دەمارگیری و ناوچە گەرێتی نەتەوەیی چەند کەسێك وایکردووە کەوشەکە نەتوانرێت بەشێوەیەکی ڕاست بێژەتی بکەن، ونەگەڕانەوە بۆ سەردەمە مێژووییەکان بەتایبەتی ئەم دەمارگیرییە لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتیدا زیاتر تەشەنەی کردووەو کوێرانە سەرو گوێلاکی وشەکەیان تێکداوە.

٣. نەدۆزرانەوەی سەرچاوەی پێویست لە شارەکەدا لە سەردەمی گۆتی و لۆلۆیی و (هۆری - میتانی) و کاشییەکاندا چ لەڕووی زمان و چ لەڕووی مێژووەوە، بۆ بەراوردکردنی بوونی بنەڕەتی ووشەکە.. هەرچەندە کە زمانە ناوخۆییە سوبارییەکە بەڵگەیەکی گرنگی ئەو سەردەمەیە بەڵام دۆزرانەوەی سەرچاوەی ئەم زمانە زیاتر بەراوردی وشەکانی ڕووندەکردەوەو لە ناوەڕۆکی بنچینەی دروستبوونی زمانە ناوخۆییە سوبارییەکەدا.

٤. نەبوونی سەرچاوەی تێرو تەسەل لەسەر مێژووی شارەکە لەلایەن پسپۆڕی شارەزا لە مێژوو، کە ئەمە وایکردووە سەرچاوەکان تەنها لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەدەست بکەوێت و سەردەمە مێژووە زووەکان پشتگوێ خراوەو هیچ شتێکی وا لێ نەنوسراوە تا بتوانین لەبەکارهێنانی بەراوردە مێژووییەکاندا بەکاری بهێنین.

٥. بەهۆی زاڵ بوونی هێزی دەمارگیری هەندێك لە نووسەرەکان وایکردووە هەریەکە بنەڕەتی ووشەکان بەپێی زمانەکەی خۆی شیبکاتەوە بۆیە وشەکە لەنێوان کوردی و عەرەبی و تورکمانی و ئارامی و ئاسووری دا هەڵەبەزو دابەزی پێدەکرێت و هەندێکیان نایانەوێت ڕاستی گۆڕانکارییە مێژووییەکە لەڕووی زمانەوە شیبکەنەوەو تەنها هەستی سیاسییەکەی سەردەم زاڵە بەسەریداو هەموو بارەکانی تر خراونەتە ژێر لێوەوەو بووەتە قوربانی گۆڕانکارییە سیاسییەکە.

دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییە، بنەڕەت و لێ بوونەوەی ناوی کەرکوك چەند دەورێکی مێژوویی پێدا تێپەڕیووە کە لەگەڵ گۆڕانکارییە مێژووییەکاندا گۆڕانی بەسەردا هاتووە.. دوورو نزیك تووشی سووان و داتاشین بووە.

کەرخو.. کرکی.. کەرخا.. کەرەك.. کەرەخ.. کەرخی.. کەرخ سلوخ.. کر.. گرگر.. کەرخینی.. کەرخیتی.. ئەربەخ.. ئەراپخا.. ئەرابخا.. کووکورا... کەرکینی.. ئەرابخیوس.. نوزی.. گا - سوور.. غا - سوور.. کاری کووك.. ئال ئیلانی.. ئال - تشینوی.. کارگورد، کارگود، کارگووت، هەموو ئەم ناوانە بە کەرکوك و دەوروبەرەکەیان هاتووەو دوورو نزیك ناوچەو فەرمانڕەوایی سەر بەئاقاری کەرکوك بوونەو لەسەردەمە جۆر بەجۆرەکاندا شێوە جیا.. جیای فەرمانڕەواو بەڕێوەبەری شارەکە بوونە.

بۆ ساغ کردنەوەی وشەی کەرکوك پێویستیمان بەوە هەیە بکەوینە شیکردنەوەی قۆناغە مێژووییەکان و دەوروبەرەکەی لەڕووی دابەشبوونی سەردەم و چاخە

مێژووییەکانی و دابەشبوونی ئەم سەردەمانە بۆ گۆڕانە مێژوویی و جوغرافیایی و زمانەوانی ئەم وشەیەو شیکردنەوەی ئەو گۆڕان و سووانەی تووشی بووە لە دروستبوونی قۆناغە مێژووییەکانداو هاتنە پێشی ئەم ناوە لەم سەردەمەی ئێستامانداو جێگیرکردنی بەشێوەی وشەی کەرکوك.

هەر لەسەردەمەکانی پێش مێژووەوە ناوچەیەکی ئاوەدان بووەو شارستانیەتی تێدا گەشەی کردووە، لەبەر ئەوە گۆڕانکارییە مێژووییەکان دەوری خۆیان بینیوە لەموتوربەکردنی وشەکەو دروستبوونی گۆڕانکاری لەنێوانیدا.

کۆنترین سەردەمێك ئاوەدان بووە سەردەمی گۆتییەکان بووە کەرکوك بنکەی فەرمانڕەواییەکەیان بووە، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە تائێستا لەسەرتاپای کوردستاندا سەرچاوەی پێویست دەربارەی نەدۆزراوەتەوەو ئەوەی بەدەستمانەوەیە لەبارەی زانیاری زمانەوانییەوە کەمەو وکو پێویست نییەو ئەوەی گەیشتووەتە دەستمان ئاوەدانی (ئەراپخا) زیاتر بەدیار دەکەوێت وەکو بەکارهێنانی وشەی زمانەوانی تر کەلەوانەیە لە دوارۆژدا زانیاری زیاتر بدۆزرێتەوە بۆ پالپشتی وشەی زمانەوانی تر لەسەر بنەڕەتی وشەی کەرخو یان کەرخی کە زمانە ناوخۆییە سووبارییەکە لەو کاتەدا گەشەی کردبوو، پارچەیەکی زمانەوانی یەککگرتوو بوو، بەڵام سەرچاوەی پێویست تاکو ئێستاکە نەدۆزراوەتە، بۆیە بمانەوێت و نەمانەوێت شارەکە ئاوەدان بووەو شکی تێدا ناهێڵێت کەگەشەی زمانەوانیش شان بەشانی گەشەی کردووە چونکە بنکەی بەڕێوەبەری گۆتییەکان بووە.

لەسەردەمی سۆمەری و ئەکەدییەکاندا دیسانەوە سەرچاوەی پێویست بەدەستمانەوە نییە بەڵام دەگەینە ئەو ڕاستییە کەوشەی (کەرخو) لەپێش ئەواندا بەکارهاتووەو لەوکاتەدا سووکە گۆڕانکارییەکی زمانەوانی دروستکردووە.

((بەڵام (کەرخو) کە بەرامبەر زاراوەی ئەکەدی (دورو)ە کە لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە سەر بێژە (سوباری)یە ناوخۆییە گەشە بووەکە، چەند جارێك بینراوە لەبەکارهێنانی ناونانە جوگرافییەکاندا بەشێوەی (دیمتو کەرخی شیلواخو)یە مانای (قەڵای شوورە دراو) دەگەیەنێت، ئەمانە هەمووی نووسراوەتەوە لەتابلۆکانی (نوزی) لەلای دەوروبەری کەرکوك.. لەسەردەمی کوڕی پاشا (شیلوا – تیشۆپ)، پێش گەشیتنی ئارامییەکان بۆ ئەو ناوچەیە بەماوەیەکی زۆر درێژ، بەکارهێنانی زاراوەی (کەرخا – سلوخ) هاوسەردەمی هێلینییەکانە.

(هرتسلفید) پێ لەسەر ئەم ڕاستییانە دادەگرێت و دەڵێت: کەبنەڕەتی وشەی (کەرخی) سووربارییەو پەیوەندە بەسەردەمی (شیلوا – تیشۆپ)، کە پاشبەندێکی سوباری (خی) پێوە لکێنراوە، کراوە بە:– (کەرخی – شیلواخو، کەرخا – سلوخ)، کە هەردووکیان ناوچەی کەرکوکی ئێستا دەگەیەنن..))[٥].

لەبەر ئەوە سەرەتای هەردوو وشەی کەرخوو کەرخی دەگەڕێتەوە سەر شێوە زمانە سورباییەکە، کە لەسەردەمی سۆمەری و ئەکەدییەکاندا بەناوچەیەکی فراوانی سەرووی (میزۆپۆتامیا) وتراوە کە کەرکوك بەشێکی فراوانی ئەو ناوچە فراوانە بووە، تێدا یەککگرتووییەکی زمانەوانی بەکارهاتووە، بۆیە وشە سورباییەکە دەگەڕێتەوە سەر ئەو میللەتانەی لەوێدا گەشەیان کردووەو تێکەڵاوییە زمانەوانییە یەککگرتووەکانی سورباییەکە دروست بووە لە نەتەوەکانی، (گۆتی)و (لۆلۆیی)و (سۆمەری)و نەتەوە بچووکەکانی تریش.

وردە.. وردە مێژوو بەرەو پێشەوە چوو، سەردەمە مێژووییەکانی تر هاتنە پێشەوە، ئاشوورییەکان یەکێکن لەو باڵاگەردانە مێژووییەو باڵادەستێکی مێژووییان دروستکرد زاڵ بوونە سەر ناوچەکانی تر، لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك تێکەڵاوییەکی زمانەوانی (ئاشووری – هوری میتانی) دروستبوو، کارتێکردنێکی بەهێزی پەیدا کرد بەتایبەتی لەوەی هەندێك لەسەرچاوەکان بنەڕەتی دروستبوونی قەڵا دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوورییەکان و ئاوەدانی شارەکە بۆ ئەو سەردەمە دەبەنەوە، بۆیە تێکەڵاوییەکی زمانەوانی سوباری لەگەڵ ئاشووری و هوریدا گەشەی کرد، کەتێیدا ناوی شارەکەش بەر ئەو گۆڕانکارییە کەوت، لەدواییشدا باڵادەستی میدییەکان بەناوچەکەدا وایکرد کە کارتێکردنێکی مێژوویی و زمانەوانی ڕەنگ بداتەوە.

((کاتێك کە فەرمانڕەوایی عێراق گوێزرایەوە بۆ سەردەمی ئەسکەندەری گەورە، کەرکوك بەشێك بوو لەئاقاری فەرمانڕەواکەی، کاتێکیش کە ئەسکەندەر مرد دەوڵەتەکەی لەنێوان هەر سێ سەرکردەکەیدا بەش کرا، (بەتلیمۆس) و (سلۆقس)و (ئەنتیفۆنس)، لەسەر ئەو شێوەیەی کە مێژوو باسی دەکات کەرکوك لە بەشی سلۆقس بوو، هەستا بەرووخاندنی خانووە کۆنەکانی و دروستکردنی لەسەر شێوەیەکی تازەو دروست کردنی شوورەیەکی فراوان بەدەوریدا))[٦].

((هەندێك سەرچاوەی ئارامی باسی کەرکوك بەشێوەی (کەرخا – د. سلوخ) دەکەن، مانای شاری سلۆقییەکان دەگەیەنێت کە ناوەکەی لە سەردەمی سلۆقییەکاندا لە عێراق، (٣١٥– ٣١٢) پێش زاین، ئاوەدان ببوبێتەوە. گوایە دامەزرێنەری سەلۆقییەکان، (سلۆقس) ئاوەدانی کردبێتەوە، شوورەیەکی پۆلایینی بەدەوریدا دروستکردبێت و کۆشك و باڵەخانەی گەورەی لێ دروستکردبێت، کردبێتی بەبنکەیەکی گرنگی قەڵەمڕەوی فەرمانڕەواییەکەی..))[٧].

((ئەم ناوە داڕێژراوە لەبێژەی ئارامی، (کەرخا – د – بیت – سلوخ) بەمانای شاری سلۆقس، کە ئەم ناونانە بەم شێوەیە هاتووە لە کتێبی (ئەسینۆ دیکۆن)، (المجامع النسطورية) هەر لە ساڵی (٤١٠)ی زاینیەوە، هۆی ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بووەتە کۆکردنەوەی شکڵ و تەرزی بیناکاری لەنێوان هونەری نەخش و نیگاری بەنایی (تەلارسازی) یۆنانی بەناوبانگ لە چاکی ڕووخساری لەلایەك و هونەری ئاشووری بەناوبانگ بەپتەویی و قەبەیی لەلایەکی تر..))[٨].

((لەو نووسەرە کۆنانەی هاتوونە تۆماری ناوچەی

کەرکوکیان کردووەو وەسپیان داوە (سترابۆ)یە، (٦٣ پ.ز - ١٩ پ.ن)، کە هاتووە بەناو ئاقاری (ئەرتەکینی)، بەڵام هەندێك لە شیکەرەوەکان وای بۆ دەچن کە ئەو ناوە ڕوونووسکردنەوەیەکی (إستنساخ) هەڵەی (ئەدیابینی) یە، واباوەڕ ئەکەم کە ڕوونووسکردنەوەیەکی هەڵەیە بۆ وشەیەکی تر ئەویش (گەرگینی)یە کە لەسەردەمی سترابۆدا دەبینرێت لەشێوەی شانشینێك کە پایتەختەکەی کەرکوکی ئەمڕۆ بووە، هەروەها وادەبینرێت کە ناوی (کەرکینی)، کە شکی تێدا نامێنێتەوە داتاشراوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەغرقییەکان، وا دارێژراوە لەناوی (گەرەك)، کە هەبووە لەپێش سەردەمی (سترابۆ)، ناوی (سلۆقس) کە هاتووە لە سەرچاوەی ئارامییەکاندا لە شێوەی (کەرخ - د. سلوخ) ناوی یەکێکە لەو چوار سلۆقییانەی کە فەرمانڕەواییان لەنێوان ساڵانی (٣١٢ - ١٧٥)ی پێش زایینی بووە، لەوانەیە ئەو زاراوەیە دانرابێت لەسەردەمی (سلۆقۆس کالینۆس)، (٢٢٦)ی پێش زایینی، کاتێك قەڵای دروست کردبێت بە دەوری کەرکوکدا یان دووبارە قەڵاکەی تازە کردبێتەوە..)).

((لە چارەکی کۆتایی سەدەی دووەمی پێش زایینی خێزانێکی (سکائی) فەرمانڕەوا پایتەختەکەیان پێی وتراوە (کەرەك) یان (کەرەخ)، ناوی هێنراوە لە تۆمارەکانی کڵێسەدا بەشێوەی (کەرخ د. سلوخ)، ئەمڕۆ بەناوبانگە بە کەرکوك، لەوانەیە ئەو ناوچەیە لەو سەدەیەدا پێی وترابێت (گرگینی) لە (گەرەك) بەزیاد کردنی ئامرازی (یینی ene) کە ئەگەڕێتەوە بۆ دەوری بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت.

لەو سەردەمەدا دوو شانشینی هاونزیك هەبوونە کە سەربەخۆیەکی ناوخۆییان هەبووە لەنێو ئیمپراتۆریەتی پرسییەکاندا بریتیبوون لە:- شانشینی (ئەدیابینی) کە پایتەختەکەی هەولێر بووە، هەروەها شانشینی (کەرگینی) کە پایتەختەکەی (کەرەك) بووە کەدەکاتە کەرکوکی ئەمڕۆ، ئەو دوو شانشینە هەبوونە لەسەرەتای فەرمانڕەوایی ساسانییەکان (لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی زاینی)، ئەوەی کە گومانی تێدا ناهێڵێتەوە ئەوەیە ئاقاری کەرکوك پێی وتراوە کەرکینی و بەبێژەی، کەرخینی، ئارامی..))[9].

دەگەینە ئەوەی کە ئاشوورییەکان وشەی (کی - رەك) یان بۆ قەڵا یان دێی شوورە دراو بەکارهێناوە، مادەکانیش وشەی (کی - رەك) یان بەکارهێناوە بۆ دێی دەورە دراو یان دارێژراو بەشوورە.

هەروەها لەدوای ئەو سەردەمەشدا بەکارهێنانی (کەرەك، کەرخ، کرەك، گرگینی، کەرکینی) لێك نزیك بوونەوەیەکی زمانەوانی هەیە لەنێوانیاندا کە دەگەڕێتەوە سەر تێکەڵاوە زمانەوانییە نەتەوەییەکانی شارەکە لەو سەردەمەدا.

زانای هێژا مامۆستا (تۆفیق وەهبی) دەڵێت:-

((ئەتوانین بڵێین ناوی کەرکوك پێی وتراوە (کەرەك)، بەئارامی (کەرەخ)، (کەرەك) داتاشراوە لەبێژەی (کار)ی (ئاشوورییەکان بەمانای (قەڵا.. گوندی دەورە دراو) لەگەڵ پێکەوە لکانی (ak)، دەردەکەوێت مادەکان ووشەی (کی - رەك) یان بەکارهێناوە بەمانای گوندی دەورەدراو، یان بەمانای گوندی دەورەدراو یان شوورە ڕێژکراو، ئارامییەکان لەوەو دواوە بەشێوەی (کەرەخ) بێژەتیان پێکردووە، کەبەکار هاتووە تاسەردەمی ئیسلامەتی..)).

مامۆستای هێژا سەری سوڕدەمێنێت لە (یاقوت حەمەوی) لە بەکارهێنانی لەنێو فەرهەنگەکەیدا لەسەدەی حەوتەمی کۆچی بۆ ئەو ناوەی کە ئەغریقییەکان بەکاریان هێناوە زیاتر لە هەزارو پێنج سەد ساڵ پێش ئەویش (کەرخینی)یەوە گۆڕینی بۆ (کەرکینی).

((یەکەم کەسێك بڵاوی کردبێتەوە کەلێك نزیك بوونەوە هەیە لەنێوان (کەرخینی)و کەرکوك، (هۆفمان) بووە لە (فەرهەنگی زانستی ئیسلامیدا)... بەڵام جۆری داتاشین و لێك نزیك بوونەوەکەی دیاری نەکردووە، تەنها هەوڵدانەکەی (دکتۆر مستەفا جەواد)ی دیاری کردووە کە گوایا کەرکوك لەشێوەی (کەرخینی) گواستراوەتەوە بۆ (کەرکی)، لەدواییدا بچووك کراوەتەوە بەڕێگا شێوە فارسی کە بووە بە (کەریك)و لەدواییدا کەرکوك..)).

مامۆستا دەڵێت:-

((ناوی کەرکوك داتاشراوە لەناوی (کەر - قەڵا) بەزیاد کردنی (uk) بۆی کەبووە بەشێوەیەکی (کەرەك) بەڵام داتاشینێکی تر بووە دوای ماوەیەکی تر بەزیاد کردنی پاشگری (uk) جارێکی تر کە بەکار هاتووە بۆ بچووك کردنەوەو خۆشەویستی و دەلال، داتاشینی (کەرەك) خۆی گرتووە لەشێوەی کەرکوك ئەو شێوەیەیە کە ئێستا بەکاردەهێنرێت..))[10].

((لەچیرۆکەکانی (فارسی)دا بەشێوەیەکی تر باسی ناوی کەرکوك دەکات کە گوایە لە (کاری کوك) بەمانای کاری چاك و بەهێزەوە هاتووە، ئەویش کاتێك ڕوویداوە گوایە یەکێك لەپاڵەوانەکانی ئێرانی هەڵهاتووە لەدەستی زوڵمی پاشاکانی فارسی، لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا هاتوونەتە ناوچەی کەرکوك و دەستیانکردووە بەدروستکردنی ئەم شارەو کارەکەیان زۆر چاك بووە وتراوە (کاری کوك)..))[11].

بەڵام ئەمە ڕێی تێناچێت، چونکە لەپێش ئەم ماوەیەدا ئەم شارە ئاوەدانبووەو خەڵکی هاتوونەتە زیارەتی ئاگرە پیرۆزەکەی.

((ڕاو بۆ چوونێکی تر هەیە کە دەری دەخات، ناوی کەرکوك لەڕابردوودا (گرگر) بووەو ناوی کەرکوك دەگەڕێتەوە سەر بنەڕەتی ئەم بۆچوونانە کە هاتووە لەهەریەك لە کتێبی (المرشد إلى مواطن الآثار والحضارة)و کتێبی دکتۆر جەمال ڕەشید بەناوی (دراسات كردية حول بلاد سوبارتوو).

مامۆستا جەمال ڕەشید دەڵێت:-

((هەرچەندە کە (عەرەفە - ئەراپخا) بەشێکە لە شاری کەرکوکی ئێستا، لەکاتی خۆیدا هۆزی (گورومو)ی ئارامی نیشتەجێ بوونەو هاتۆتە ناوییەوە، بەڵام ناتواین بڵێین کە زاراوەی کەرکوك کورت کردنەوەیە (الاختزال) لە زاراوەی ئارامی (کەردخا د . بیت سلوخ) کە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە سەردەمی ئیسلامەتی و بووەتە وشەی (کەرخینی)، چونکە پێش ئەم مێژووە وشەکە بەشێوەی (گرگر) بینراوە بۆ لاسایی کردنەوەی دەنگی ئاگری چاڵە نەوتەکان کە هەبووە لەناوچەکەدا، لەدواییدا پێی وتراوە (باباگرگر)

کە دەورە درابوو بەپەرستگای (ئەناهیتا)، لەسەردەمە زووەکاندا، ئەم زاراوەیە لەلای (بەتۆلیمی) هاتووە بەشێوەی (کور کورە) Kor Kowra، بەڵام بێژەی (گڕ) ماوەتەوە لەزمانی کوردیدا بەمانای دەنگەکە لەزاراوەی (گرگر) تەنها یا داگرتنە لەسەر نەژادی ئەو رووداوە لەسروشتدا، ولەسەر بنەڕەتی ئەو شێوازە، ناوچەی خواررووی شارەکە بەناو بانگە بەقیر پێی ووتراوە (کیپرات Kiperat)، کە ئەمە تۆمارکراوە لە هێرشەکانی (سیلهاك ئەنشیۆشیناك)ی تمیلای، هەروەها لەتۆمارەکانی ئاشوورییەکاندا شێوەی (کوپرو) ی وەرگرتووە، کە هاونزیکێتی لە دەسخەتە عێلامییەکان بەناوی (خورتو)، بەرابەری لەسەرچاوە ئەکەدییەکاندا بەناوی (خورتوم)، هەروەها هەریەکە لەدوو وشەی کفری و خورماتوو دادەنرێن بەپاشماوەی زمانی کۆنی (سوباری) کە تائێستا لەناو زمانەکاندا ماوەتەوە..))[١٣].

مامۆستا (عەبدوللا دارتاش) وای بۆ دەچێت کە بنەڕەتی ناوەکە لە (کارگورد)ەوە هاتووە بەناو قەڵای گوتییەکان یان بەوەی ئەوان دروستیان کردووە.

* لێبوونەوەی ناوی کەرکوك لە دەوری بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی تا ئەم سەردەمەی ئێستامان:-

کەرکوك لەسەردەمی ئیسلامەوە تا کۆتایی فەرمانڕەوایی ئیسلامی شوێنێکی دیاری نەبووە وەکو ناوچە یان لیوایەك بەڵکو تەنها بنکەی ناوچەکە بریتی بووە لە (داقوق) - (دقوقا) کە پاشبەندەکەی (کرخینی) بووە کە دەکاتە کەرکوك.. لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین جیاوازی هەیە لەنێوان بێژەی (کەرخینی) و بێژەی (کەرخیتی)، کە لە کتێبەکانی زمان و کتێبەکانی شاران و مێژوو (کتب البلدان) و سەرچاوە جوگرافییەکان و مێژووییەکاندا هاتووە بەشێوەی (کەرخینی).

((یاقوت حەمەوی کە لەساڵی (٦٢٦ی کۆچی - ١٢٢٨ی زایین دا مردووە) لە کتێبەکەیدا (معجم البلدان)دا وتوویەتی)):-

(کیرخین) بە شکانەوەی کافەکەی بەشێوەی یایی وەستاو و نوون و یایی درێژکراوە. بریتییە لە قەڵایەکی دروستکراو، لە زەوییەکی بەپیت لەنێوان (داقوق) و (هەولێر) دا لەسەر گردێکی بەرزە، کە هەواڵیە بەسەر شوێنێکی چۆڵەوە.

باسی رووداوە مێژووییەکانی هاتووە لە کتێبی (الحوادث الجامعة) بەهەمان بێژەی کە باسی هاتووە لە کتێبی (صاحب المعجم)، ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە کە لە (قاموس المحیط) دا بە بێژەی (کرخیتی) هاتووە بە (تا) ئەوەکو بە (نوون)، کە ئەمە وا دەبینرێت لەوانەیە هەڵەیەکی ڕەنووسکردن بێت، بەڵام بەشێوەی (تا) لە هەریەکە لە (تاج العروس) و (الأوقیانوس)دا جێگیرکراوە، بەڵام نەمانتوانی دەسنووسێکی کۆن بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ئەم شێوە جیاوازانەی ئەم بێژەتانە یەکلا بکاتەوە، هەروەها هیچ شتێکمان بەدەست نەکەوتووە لە کتێبەکانی زمان تا بتوانین رووی ڕاستی ئەم بۆچوونانە بدۆزینەوە.

((بەکارهێنانی (کەرخینی) هاتووە لە هەریەکە لە رووداوەکانی (هەولێر) و رووداوەکانی هێرشی (مەغۆل) لە کۆتایی سەردەمی عەباسییەکاندا هەتا کۆتایی رۆژگاری جەلائیرییەکان، تەنها بەشێوەی (کەرخینی) هاتووە لەوەی کە (فەیروز ئابادی) دەستنیشانی بۆ کردووە، هەندێك جار ناوەکەی هاتووە بە نزیك لە (داقوقا) لەبەر ئەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە بەکارهێنانی (کەرخینی) بەکارهاتووە لەهەموو سەردەمە ئیسلامییەکاندا، لەسەردەمی مەغۆلەکان تا کۆتایی سەردەمی جەلائیرییەکان هیچ کاتێك بێژەی کەرکوك بەکار نەهاتووە..))[١٤].

لەسەدەی شەشەمی کۆچی بەشێوەی (کەرخانی) هاتووە لە هەریەکە، لەلای (إبن شداد الموصلي)، لە کتێبی (سیرة صلاح الدین الأیوبي)، لاپەرە (١٩٣)دا، لە کتێبی (صدرالدین ناصر الحسیني) بەناونیشانی (تأریخ بني سلجوقي) لاپەرە (١٧٩).

هۆی ئەم لێك جیاوازبوونە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە کەسی هەمان سەردەم جیاوازن لە بێژەتی ناوێکداو بێژەی (تلفظ) دەکەن بەجیاواز، کە (إبن فضل الله العمري) لە کتێبی خۆیدا لەبەشی (الأکراد)، لە (مسالك الأبصار)دا بە (کرخین) ناوی دەبات، کە لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی کۆچیدا بووە...))[١٥].

((هەریەکە لە سەردەمی تەیمورییەکان و تورکمانەکاندا بەکارهێنانی (کەرخینی) بەردەوام بووە، لەهەمان کاتدا بەکارهێنانی کەرکوکیش باوبووە، هەروەکو ئەوەی هاتووە لە کتێبی (شرف الدین الیزدي) و هەندێك کتێبی مێژوویی جۆر بەجۆر وەکو (الغیاثي) و (الجامع الدول)، کە هەردوو وشەکە بەکارهاتووە، وشەی (کەرخین) کەمی کردووەو رووی لە کزیداوە، بەکارهێنانی باوی نەماوە تەنها لە کتێبە کۆنەکاندا نەبێت، هەروەکو لە کتێبی (تأریخ العراق بین الأحتلالین)، لەبەرگی سێیەمدا، لەگەڵێك شوێنی جیاوازدا باسی هاتووە... بەهۆی ئەمەوە وردە.. وردە ووشەی کەرکوك جێگەی گرتۆتەوەو بووە بە باو لەناو خەڵکیدا بۆ بەکارهێنانی.

((لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بەکارهێنانی وشەی کەرکوك جێگەی (کەرخینی) گرتەوە، وای لێهات بەکارهێنانی باوی نەما، بەکارهێنانی (کەرخینی) تەنها لە کتێبە کۆنەکاندا مایەوە..))[١٦].

* لێبوونەوەی ناوی ئەراپخاو نوزی:-

((سەلمێنراوە کە (ئەراپخا) کۆنترین شاری مێژووییە لە دوای هەولێر، لە سەرووی عێراقدا.. دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شارستانێتی سۆمەرییەکان لە چاخی (فجر السلالات) لە (٢٦٠٠) ساڵی پێش زایینی یان چاخی (عصر دویلات المدن الحاکمة)، ئەمە ئاشکرای دەکات کە لە هەموو سەردەمە مێژووییەکانی سۆمەرییەکاندا هەبووە وەکو شارێك یان بنکەیەکی شانشینی کۆن، کاتێکیش کە ئیمپراتۆریەتی (ئەکەدییەکان) سەری هەڵدا لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین ئەمیش هەروەکو شارو شانشینەکانی تر کەوتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی ئەکەدییەکانەوە..))[١٧].

((کۆنترین زانیارییەك کە بەدەستمانەوەیە تایبەت

بە کەرکوک هاتووە لە ڕۆژمێری جوگرافیای بەناوبانگی سامانەکانی (سەرجۆنی ئەکەدی) لە دەوری (٢٥٣٠ - ٢٤٧٣)ی پێش زایین، بەناوی وڵاتی (ئەرپخە) کەدەکاتە شوێنی شاری کەرکوک...))[١٨].

یەکەم دەرکەوتنێك بەم ناوەوە بە شێوازی (ئاراپخم) هاتووە لەدەستنووسە مێخییەکان، دەگەڕێتەوە خێزانی (ئوری سێیەم)، هەمان ناو بەدەرکەوتووە لە دەقە مێخییەکاندا لەسەردەمی بابلی کۆندا..))[١٩].

((لە هەمان کاتدا ناوی هاتووە لە کۆڵەکەی سەرکەوتن (مسلە النصر)ی پاشایەکی بابلی نادیار بەناوی ئەوەی کە (ئەراپخا)ی گرتووە بەم شێوەیە:- ((چوومەتە ناو کیرخو ئەرپخاوەو پێی خوداوەند (ئەدەد)م ماچ کردووەو، وڵاتم ڕێك خستووەتەوە))، لەمەدا بەدەردەکەوێت کە وشەی (کیرخو ئەراپخا) بەمانای (پەرستگا یان کۆشك)، وشەی (کیرخو) مانای قەڵا دەگەیەنێت))[٢٠].

(حەمورابی خاوەن شەریعەت یەکێکە لە پاشا بەناوبانگەکان (١٧٩٢ - ١٧٥٠) پێش زایین کە توانیویەتی وڵات هەموو کۆ بکاتەوە لەژێر دەوڵەتێکی یەکگرتوو. ناوی (ئەراپخا) بۆ یەکەم جار هاتووە لەسەردەمی ئەودا لە ساڵی (١٧٥٠)ی پێش زایینی، بەردەوام بووە ناوهێنانی لەدەسنووسەکاندا تا ساڵی (٦١٥)ی پێش زایینی)[٢١].

((ناوهێنانی شاری (ئەراپخا) لەهەموو دەستنووسەکانی سەردەمەکانی ئاشوورییدا هاتووە، لەوانەیە یەکەم ناو هێنانێك بگەڕێتەوە سەر دەسنووسەکانی (موڵکداری ئاشوورییەکان) کە لە دەسنووسێکی سەردەمی ئاشووری کۆن، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاشای ئاشووری (شەمشی ئەدەدی یەکەم)[٢٢]... ناوی کەرکوک مایەوە بەم شێوەیە تا سەردەمی ماددەکان...))[٢٣].

((باران بارینێکی زۆر لە ساڵی (١٩٢٣)دا، بووبەهۆی ڕامالینی ڕێژەیەکی زۆری خۆڵ لەلای لێواری قەڵاو بووە هۆی دەرکەوتنی نزیکەی پەنجاو یەك ڕەقییمی قوڕین، بریتی بوو لە دەسنووسی مێخی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەزاری دووەمی پێش زایینی.. دوای لێکۆڵینەوەو پشکنینی ئەم دەسنووسانە، توانرا بگەنە ئەو ڕاستییە کە بەشێك لە شاری (ئەراپخا) پێی وتراوە (ئال - ئیلانی - Al ilani)، مانای بەزمانی ئەکەدی شار یان گەڕەك یا خوداوەند..)).

((هەروەها ناوەڕۆکەکانی کۆمەڵەی دووهەم کەپێکهاتوون لە سی (٣٠) ڕەقیمی قوڕین ئەیسەلمێنن:-

کە لەوانەیە ئەمانە هاتبن لە شوێنی شاری (نوزی) کۆن (یۆرغان تەپەی ئێستا) لەدووری نزیکەی بیستو دووکیلۆمەتر لەخوارووی ڕۆژئاوای کەرکوک بەڵام بەشێکی هاو دوور هەیە وەکو (ئال - ئیلانی)، نزیکە لێیەوە پێی دەڵێن (ئال - تشوینی Al - Tasheniwi)، هەندێك لە ڕاوبۆچوونی پسپۆڕەکان وایە کە شوێنی (ئال - تشینوی) گونجاوە لەگەڵ شوێنی (تسعین)دا، بریتییە لە گردێکی شوێنەواری بچووك، لە سەریدا هەندێك کەرەستەی شوێنەواری کۆنی تێدا دۆزراوەتەوە کەدەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ناوەڕاستی هەزاری دووەمی پێش زاین، ئەم شوێنە سێ کیلۆمەتر دوورە لە باکووری کەرکوکەوە. بەڵام ئەوەی دەیبینین ئەوەیە کە شوێنی (ئال - ئیلانی) گونجاوە لەگەڵ قەڵای کەرکوك خۆیدا، ئەوەیش بەبوونی دووبەڵگەیە بۆ ڕاستی بۆ چوونەکە:-

یەکەمیان ئەوەیە کەناوی (ئال - ئیلانی) چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە لە دەسنووسەکانی (پەنجاو یەکەم) کە لە قەڵادا دۆزراوەتەوە، دەتوانین ئەمە بەزاورد بکەین لەگەڵ ئەوەی کە بەکەمی ناوی (ئەراپخا) هاتووە لەو دەسنووسانە، کە ئەمە وادەسەلمێنێت کە (ئەراپخا) قەڵا نەبووە بەگشتی، بەڵکو بەشێك بووە لە (ئەراپخا).

بەڵگەی دووەم ئەوەیە کە ناوی (ئال - تشینوی) گونجاوە لەگەڵ (تسعین)دا ناوی (ئەراپخا) شوێنێکی تری ناو شاری کەرکوکە، کە ئەمە وادەگەیەنێت (ئال - ئیلانی) هاو گونجاوی قەڵای کەرکوکە))[٢٤].

((لێرە بەدواوە دێینە سەر لێکۆڵینەوەی ناوی (ئەراپخا) و شوێنی، کەئەمە لەخۆیدا گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ دیاریکردنی پەیوەندی لەنێوان قەڵا خۆیو ناوچەکانی پەیوەست بە خۆیەوە، کە ئەم بابەتە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی (١٩٤٨) لەو کاتەی کە کۆمپانیای نەوتی عێراقی هەستا بەلادانی خۆڵ لە چەند ناوچەیەکی شوێنەواری دەوروبەری قەڵا کە ئەو ناوچەیە بەناوبانگ بوو بە (گردی عەرەفە).. لەکاتی خۆیدا کۆمپانیاکە کارەکانی ڕاگرتو لێکۆڵینەوەیەکی شوێنەواری هات بەسەرۆکایەتی مامۆستای خوالێخۆش بوو (تەها باقر) بۆ هەوڵدان بۆ ڕزگار کردنی ئەوەی کە ماوەتەوە لەو شوێنەدا.. ئەو لێکۆڵینەوانە شتێکی ئەوتۆیان دەست نەکەوت، تەنها بریتی بوو لە چەند چینێکی بیناکاری ژێرەوە ئەویش دەستی تێکدان گەیشت پێی، ئەوەی کە دۆزراوەتەوە لەو چینەی ژێرەوە چەند پاشماوەیەکی پەرشو بڵاوە لەسەردەمە جیاجیاکان لەوانە: (فجر السلالات) دەوری سێیەم (٢٦٠٠ - ٢٣٧٠) ی پێش زایینیو دەوری (ئەکەدی) کۆن (٢٣٧٠ - ٢١٦٠) ی پێش زایینی، هەروەها چەند پاشماوەیەکی (هوری)و (ئاشووریش).

شوێنی عەرەفە نزیکەی سێ کیلۆمەتر دوورە لەسەرووی خۆرئاوای قەڵای کەرکوکەوە، ئەوەی جێگەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە جێگەنشینی کۆنی عەرەفە گوێزرابێتەوە بۆ شوێنێکی تری بچووکتر لەوەی پێشوو بەڵام بەرزترە لەوە، کەوتۆتە نێوان شوێنی عەرەفەو قەڵای کەرکوك، ئەو شوێنەش گردی (مەلا عەبدوڵڵا)یە، نزیکەی (١٢٠٠) مەتر دوورە لە قەڵاوە، هەروەها کۆمپانیای نەوت دیسان بەشێکی دابڕی لێی بۆ کردنەوەی شەقامێك کە بڕوانێتە سەر گەڕەکی پیشەسازی (الحي الصناعي)، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (عەرەفە) شوێنی شاری (ئەراپخا)ی کۆنە، ئەوەی ڕاستی بێت کە گردی (مەلا عبدوڵڵا)یش دەگەیەنێت، قەڵای کەرکوك شوێنی (ئال - ئیلانی)یەو شوێنی (تسعین)یش (ئال - تشینویی)یە..)).

((ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کەناوی (عەرەفە) تەنها گۆڕینێکە

لەناوی كۆنی (ئەراپخا)، پاش ئەوەی گۆڕینی بەسەردا هاتووە لەسەر زمانی (ئەكەدی) بۆ سەرزمانی (عەرەبی)، بەگۆڕینی پیتی ئەلف بۆ (عەین)و گۆڕینی پیتی (پا) بۆ (فا)..))[٢٥].

((بەڵام ڕوودانی ئەوەی پەیوەستە بە زاراوەی ئەراپخاوە ئەوەیە كەبریتییە لە زاراوەیەكی ناوخۆیی كۆن هاوپەیوەستە بەزمانە كۆنەكان وەكو (پاراهشی) كە كەوتۆتە خواروی ڕۆژهەڵاتییەوە، كەبریتییە لەو ناوچانەی كەوتۆتە نێوان ڕووباری (سیروان) تا چیای (پشتكوە)، كە لەگەڵیدا دەشتایی (كرماشان)یش، كە هاوپەیوەستێكی زمانەوانی هەبوو لەگەڵ (ئەراپخا)دا، هەرچەندە كە لەدەرەوەی ناوچە بەرێوەبەرییەكانی بوو...))[٢٦].

ئەوەی زانراوە ئەوەیە كە كەركوك كەوتبووە نێوان شارستانێتییەكی كۆنەوە لەگەڵێك بنكەی شارستانیەتی دۆڵی نێوان دوو ڕووبارەوە، وەكو (نوزی)، (یۆرغان تەپە) ی ئێستا، كە لەرابردوودا بنكەی هورییەكان بوو لەهەزارەی دووەمی پێش زایینی.

ناوچەی نوزی زۆر كۆنترە لەسەردەمی هورییەكان، هەروەكو سەردەمی (سۆمەری)و (ئەكەدی) لەناوەندی هەزارەی سێیەمی پێش زاین، ناوی (كەركوك) لەو سەردەمەدا بەناوبانگ بووە بە (گاسر Gasur – گاسوور)[٢٧].

((ئەوەی جێگرو دیارە ئەوەیە پاشایەك لەپاشاكان كۆشكێكی هەبوو لە (نوزوو)، كەبەشێكی جیاكردبۆوە بۆ ئافرەت و منداڵ...))[٢٨] كە كۆشكەكە كرابووە دووبەش هەم بەرێوەبەری هەم كۆمەڵایەتی.

بۆ بنەرەتی ناوی (نوزی)یش دەتوانین بڵێین كە:-

((نێوی كەسی بەشێوەیەكی گشتی پیتی زەنگۆڵە داری بەدواوە هاتووە...، لەوانەیە نێوی شاری (نووزی) لەنێوی كەسی (نوزە)وە دارێژرابێت و وەرگیرابێت))[٢٩].

((نووزی لەسەدەی یازدەهەمی پێش زایین دا بەشارێكی هەرە مەزن و گرنگی سەر بە ویلایەتی (ئەراپخا)و كەركوك ژمێردراوە...))[٣٠].

ناوی (كوروخانی)یش ناوچەیەكی ئاوەدانی سەردەمی میتانییەكان بووە، كەلەوانەیە سەربە (ئەراپخا) بوو بێت.

## * سەرنج و بۆچوونەكان دەربارەی لێبوونەوەی ناوەكانی كەركوك:-

١. كۆنترین بەكارهێنانی ناوی كەركوك، (ئەراپخا)یە كە هەر لەسەردەمی (گۆتی)ی (لۆلۆپی)و (سۆمەری)و (ئەكەدی) یەكاندا بەكارهاتووەو پارچەیەكی فراوان و بنكەیەكی گرنگی فەرمانڕەوایی سەردەمی گۆتییەكان زانراوە لەبەرئەوە (ئەرپەخ)و (ئەربەخە)و (ئەراپخا) هەموویان دەگەڕێنەوە سەر بنەرەتێكی سووباری كۆن.

٢. هەموو ئەو ناوانەی بەكار هاتوونە لە لێبوونەوەی ناوی كەركوك وەكو (ئاراپخا)و (كەرخو)و (كەرخی)و (نووزی) و (ئال – ئیلانی)و (كووروخانی)و (ئال – تشینوی).. هەمووی بەكارهێنانێكی سوباری ناوخۆیی بووە، هەریەكە پارچەیەكی ناوچەیی سەر بە (ئەراپخا) بوونە لەسەردەمە جیاجیاكاندا.. هەریەكە لەمانە بەپێی سەردەم و گۆڕانكارییە مێژووییەكان تووشی داتاشین و سووان بوونەو كارتێكردنی زمانە دەسەڵاتدارەكەی كاریگەری خۆی كردووە چ لە ڕووی زمان و چ لەرووی مێژووەوە: بۆ نموونە ئەمە بەرروونی بەدەردەكەوێت لە بەكارهێنانی (كرخی – شیلوخو، كەرخا – سلوخ)دا، كە هەردووكیان دەگەڕێنەوە سەردەمێكی جیاجیاو گۆڕانكاری سەردەمەكە بەرروونی دیارە لەبێژە كردنیدا، لەنێوان وشەی (كەرخی، كەرخا) هەروەها لەنێوان (شیلوخو، سلوخ)دا.

٣. لەوانەیە بەكارهێنانەكەی (گرگر، كركر) كۆنترین وشە بێت كە لە پێش وشەی (كەرخەوە بەكارهاتبێت، گۆڕانكارییە زمانەوانییەكە جێ گۆركێی تێدا دروستكردبێت، چونكە لەسەردەمی (بەتلومی)دا (كوركورە) بەكار هاتوو، كە ئەمەش زیاتر پەیوەستە بەدۆزینەوەی یەكەم جاری سووتانی ئاگر كە لە شوێنی بابە گورگوری ئێستا، هێشتا سەرچاوەی پێویست نەدۆزراوەتەوە بۆ پاڵپشتی ئەو راستییانە.

٤. لەوانەیە بگەینە ئەو ڕاستییە لە هەمان جۆری بەكارهێنانی ناوی (كەرخ)و (ئەراپخا)و (نوزی)و (گاسوور)و (كوروخانی) ئەوە یەكلا بكاتەوە كە هەریەكەی لەسەردەمێكدا بەناوبانگ بووەو لەدواییدا كە كوێر بووەتەوە لە پارچەیەكی ناو شارەكەدا، پارچەیەكی تری ناوبانگی پەیدا كردووە، بۆیە بەكارهێنانی ناوەكانیش گۆڕانی تێدا دروستبووە، لەبەر ئەوە كارتێكردنە مێژووییەكە زیاتر هاوشان بووە لەگەڵ گۆڕانكارییە زمانەوانییەكەداو هەندێك جار باڵا دەستی بەدەردەكەوێت وەكو ئەوەی (ئەراپخا) كە مێژوویەكی ئاوەدانی هەبووە، ناوچەكانی كە سەر بەو بوون لەهەمان سەردەمدا ئاوەدان بوونە وەكو (ئال – ئیلانی)و (ئال – تشنیوی)، ڕاستی ئەمەش بەدەردەكەوێت لە (گاسوور)و (نوزی)دا.

٥. ((لام وایە وشەی (كەرخینی) هەر لەوشەی (كەرخ)ی كوردییەوە كراوە بە (كەرخینی) عەرەبی، لەدەوروبەری هەولێر دەڵێن (لەو كەرخە). ئەم زاراوەیە هەر لەكۆنیشدا باوبووە (كەرخ جدان) ناو بووە بۆ (قەرە حەسەن) هەروا ناوبوە بۆ (قەراخان – جەلەولا) كەرخەی كەناری ڕووباری (كارون)و كەرخی بەغداش هەر لەوێوە هاتوون))، خۆم لام وایە وشەی (كەرخ) ئارامی نییە، لە هەولێرو دەشتی دزەیی (كەرخ) لەباتی لاجێ بەكاردەهێنن، ئەڵێن (لەو كەرخە).. وادیارە هەر شارێ هەر گوندێ بەكەناری شیوێكی گەورەوە بووبێ ناونراوە (كەرخ).. ڕەنگە (ئارامی) لەكوردیان وەرگرتبێ و لەجێی شار یا قەڵا بەكاریان هێنابێت...))[٣١].

٦. باڵا دەستی ئەو نەتەوانەی كە حوكمیان كردووە لەكەركوك زۆریان لەرووی زمانەوانییەوە دەگەڕێنەوە، سەر زمانی (هیندی – ئەورۆپی)، بۆیە دەوڵەمەندی ئەم زمانانە وایكردووە وشەكەشی بەپێی سەردەم دەوڵەمەند كردووەو بێژەتی ناوەكەی لە بووەتەی ئەم میللەتانە دەرنەچووە.

٧. لە ناوچوونی كۆمەڵێكی زمانەوانی بەجێ ماوی پاشماوەی ئایینی زەردەشتی و مەسیحی لەسەردەمی

بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتیدا، چونکە ئەو کاری سووتاندنو فەوتاندنە وایکرد کەئەو کۆمەڵە زمانەوانییە نەگاتە دەستمانو بتوانین لەکاری بەراوردا بەکاریبهێنین، بەتایبەتی کتێبەکانی ئاینی زەردەشتی.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. (العراق الشمالي)، نووسینی (محمد هادي الدفتر، عبدالله حسن)، ساڵی (١٩٥٨)، چاپخانەی شەفیق، بەغداد، لاپەڕە (٢١٣).
٢. گۆڤاری (الفیصل)، ژمارە (١٣٤)، ساڵی دوانزەهەم، نیسان، ساڵی (١٩٨٨)، مقالة بعنوان (كركوك مدينة الذهب الأسود)) بە پێنوسی (عەبدولجەبار مەحمود ئەلسامەرائی)، لاپەڕە. (١٢)
٣. گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٩١ - ٩٢)، ساڵی (٢٣)، ساڵی (١٩٩٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی ((اربيل ونينوى وكركوك مدن آشورية)) بە پێنووسی (نائل حنون))، لاپەڕە (١٦٠).
٤. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢١٣).
٥. (كركوك لمحات تأريخية)، نووسینی لەیلا نامق جاف، بڵاوکراوەکانی خەبات، ساڵی ١٩٩٢، چاپخانەی (خەبات)، لاپەڕە (٣٠)
٦. هەمانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٨).
٧. (المرشد إلى مواطن الآثار والحضارة، المرحلة الرابعة، بغداد - كركوك - سليمانية)، نووسینی، تاها باقر، فوئاد ئەلسەفەر، ساڵی (١٩٥٦)، لاپەڕە (٨).
٨. گۆڤاری (الفیصل)، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (١٢).
٩. (كركوك لمحات تأريخية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣١)
١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٣١ - ٣٢)
١١. (ماذا في كركوك)، نووسینی، فەهمی عەرەب ئاغا، فازڵ محەمەد مەلا مستەفا، ساڵی (١٩٥٧) .
١٢. (كركوك لمحات تأريخية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩ - ٣٠).
١٣. (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)، نووسینی دکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد، بەغداد، ساڵی ١٩٨٤ لە چاپکراوەکانی ئەمانەتی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی حوکمی زاتی، چاپخانەی (دار آفاق عربية للصحافة والنشر)، لاپەڕە (٣١).
١٤. گۆڤاری (الإخاء)، ژمارە (١-٢) ساڵی (٢٦). مایسو حوزەیران، ساڵی ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (دراسات تأريخية حول كركوك)، نووسینی مێژوونووس عەباس عەزاوی، لاپەڕە (٧).
١٥. گۆڤاری (اهل النفط)، ژمارە (٣٢) ساڵی سێیەم، نیسان، ساڵی (١٩٥٤) لێکۆڵینەوەیەك بەناوی:- (كركوك في التأريخ)، بەپێنووسی دکتۆر مستەفا جەواد، لاپەڕە (٤)
١٦. گۆڤاری (الإخاء)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧-٨).
١٧. گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٣٦)، ساڵی (١٩٨١) ساڵی نۆیەم، جلدی نۆیەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی:- (اراپخا ونوزي في التأريخ ) نووسینی (روفائيل ميناس)، لاپەڕە (٣٢٧).
١٨. (كركوك لمحات تأريخية)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕەی (٣١).
١٩. گۆڤاری (بين النهرين)، هەمان سەرچاوەی پێشوو ژمارە (٩١ - ٩٢)، لاپەڕە (١٦٠)
٢٠. گۆڤاری (الاتحاد)، ژمارە (٥٢)، ساڵی (١٩٩٥)، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (كركوك في التأريخ)، نووسینی (عەبدولعەزیز سەمین ئەلبەیاتی)، لاپەڕە (٢٩).
٢١. گۆڤاری (بين النهرين)، ساڵی (٩) ژمارە (٣٦) ساڵی (١٩٨١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٢٨)
٢٢. گۆڤاری (بين النهرين) ژمارە (٩١ - ٩٢)، لاپەڕەی (١٦٠).
٢٣. كركوك لمحات تاريخية، هەمان سەرچاوی پێشوو، لاپەڕە (٣١).
٢٤. گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە (٩١ - ٩٢) لاپەڕە (١٦١).
٢٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٦١ - ١٦٢).
٢٦. (دراسات كردية في بلاد سوبارتو)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٣).
٢٧. گۆڤاری (الفیصل)، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە(١٣).
٢٨. (كركوك لمحات تاريخية)، لاپەڕە (٣٤).
٢٩. (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژوویی وڵاتی کوردەواری)، دکتۆر جەمال ڕەشید، دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ١٩٨٨، بەغدا، لاپەڕە (٢١٩).
٣٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٨٢).
٣١. (گۆڤاری هاواری کەرکوك)، ژمارە (٢) ساڵی (١٩٨٨)، کانوونی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:- (کەرکوك ناوی، مێژوویی کۆنی دانیشتووانی، دەسەڵاتەکانی)، نووسینی کوردێکی مێژوونووس، لاپەڕە (٢٢).

**بەشی دووەم**

*** شوێنی کەرکوك و گرنگی لە ڕووی مێژوویی و جوگرافیایی و بازرگانی و ڕامیارییەوە:-**

دەتوانین ((کەرکوك بە شوێنێکی گرنگی ئابووری و جوگرافیایی و بازرگانی دابنێین، هەر لەسەردەمە جیا.. جیا مێژووییەکاندا تا ئەم سەردەمانەی ئێستامان.. دادەنرێت بە ناوچەیەکی گرنگی کوردستانی گەورە کە دەکەوێتە خوارووی کوردستانی خوارووە، هێڵی پێکەوەلکانە لەگەڵ عێراقدا، لەبەر ئەوە ناوچەیەکی سنوورییە لەگەڵ عێراقدا لەڕووی هێڵە کوردستانییەکەدا، یەکێکە لەو چوار پارێزگایەی کە کەوتۆتە کوردستانی خواروو یان کوردستانی عێراق.

پارێزگاری (کەرکوك) درێژ دەبێتەوە لەسەرووی ڕووباری زێی بچووکەوە هەتا کۆتایی سنووری قەزای (کفری) و لەسنووری لیوای (سلێمانییەوە) بەرەو ڕووی چیای (حەمرین).

((لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ لیوای (دیالە)، لە سەرووی ڕۆژئاوا هاوسنوورە لەگەڵ (هەولێر) و بەشێك لە (موسڵ).. لەخوارووی ڕۆژئاواشەوە هاوسنوورە لەگەڵ (بەغدا) و بەشێکی (دیالە)، لەسەرووی ڕۆژهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ لیوای سلێمانی..))[1].

چەند سنوورێکی سروشتیش دەوری شارەکەیان داوە:-

یەکێکیان لەسەرەوە ڕووباری زێی بچووکە[2]، لەخوارەوە ڕووباری (دیالە - سیروان) و چیای (حەمرین)ە[3]، بەشی ڕۆژهەڵاتی پارێزگاکە دەگرێت، بەشی ڕۆژئاوای بریتییە لەدەشتاییەکی بەپیت، زێی بچووك بووەتە هاوسنوور لەگەڵ پارێزگای (هەولێر) و (کەرکوك) و هەروەها (موسڵ)یش، ڕووباری (دیالە - سیروان)یش بووەتە هاوسنوور لەگەڵ پارێزگاری (دیالە) و (بەغدا)[4].

((کەوتۆتە سەر هێڵی پانی (٣٥° - ٢٨') سی و پێنج پلەو بیست و هەشت دەقیقەی سەرووە. هێڵی درێژی (٤١° - ٤٥') چل و یەك پلەو چل‌وپێنج دەقیقەی ڕۆژهەڵات، بەرزیی (٣٥٠) مەتر لەڕووی دەریاوەیە[5]، لەکۆندا ناوچەی (حەویجە) نزمترین شوێنی (کەرکوك) بووە بەرزیی (٢٢٥) مەتر لەڕووی دەریاوە نزمە[6]، ئێستا لەلای بەشی سەرووی ڕۆژهەڵاتی بەرزترین شوێنی لەڕووی دەریاوە (١٢٧٥ پێ) یە، نزمترین شوێنی لەڕووی دەریاوە (١٠٥٠ پێ)یە))[7].

((.. هەموو ئەو هێزو ئیمپراتۆریەتانەی کە لەکاتی خۆیدا ناوچەکەیان داگیرکردووە، جێگەی بایەخێکی تایبەتی بووە لایان، چونکە ڕێگای هاتووچۆکردن و بازرگانی لەدەشتاییەکاندا دەبێتە هۆی دەست بەسەراگرتنی پەیوەندی بەجیهانی دەرەوە، لەبەر ئەوە دەبینین ئەو ڕێگا دیارانەی کە هەیبووە، هیچ دوور نییە لەو ڕێگوزەرو دەربەندە چیاییانەی هاوسنوورو هاوشانی، وەکو دەربەند (بازیان) و (باسەرە) و (سەگرمە) و هیتر، بۆیە دەبینین ئەو هێزانە بایەخیان داوە بەدروستکردنی شوێنی سەربازی لەناوچەکانی نزیك لەو ڕێگا تایبەتییانە لەشوێنەکانی (کفری) و (خورماتوو) و (داقوق) و (چەمچەماڵ) و (پردێ)، هەروەها شاری کەرکوك خۆشی..))[8].. لەهەمان کاتدا شوورەیەکی بەردەم ڕێیە بۆ ئاسانکردنی گرنگی (کەرکوك) لە چەمچەماڵدا، کە کەوتووەتە نێوان ڕێگای کەرکوك (دەربەند بازیان..)) [9].

لەڕووی بازرگانییەوە دەتوانین دایبنێین بە پارێزگایەکی گرنگ:-

((لەبەر ئەوەی کەوتۆتە ناوچەیەکی ناوەندی بازرگانی گرنگ کە بەستراوەتەوە بەناوچەکانی سەرووی ڕۆژهەڵات و ناوەندو خوارووی عێراقەوە، کۆمەڵێك هێڵی بازرگانی قیرتاوکراو بەستوویەتییەوە بەقەزاو ناحییەکانی پارێزگاکەوە))[10]، لە هەمان کاتدا شوێنێکی گرنگی هەبووە لە پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ناوچەکانی کوردستان.

دەبینین هەر لەکۆندا (ئەراپخا) دوای (کەرکوك) هەمان ئەو دەورە گرنگەیان بینیوە لەناوچەی درێژبوونی ڕووباری زێی بچووك و دیالەداو تا ئەم سەردەمەی ئێستامان بەردەوامە))[11].

لەبەر ئەوە شوێنێکی گرنگی هەیە کە کەوتۆتە نێوان چیای زاگرۆس و ڕووباری زێی بچووك و ڕووباری (دیجلە) و زنجیرە چیای (حەمرین) و ڕووباری (سیروان - دیالە)، کەلەکاتی ساسانییەکاندا زانراوە بە (گەرمەکان - Garmakan)[12].

لە ڕووی هێڵی گەرێنەوە دەتوانین دووری شاری (کەرکوك) ببەستینەوە بەشارەکانی خواروو و سەروو ناوەڕاستی (عێراق) هەروەکو ئەو خشتەیەی خوارەوە:-

**خشتەی ژمارە (١)**

**دووری کەرکوك لە پارێزگاکانی عێراق بەکیلۆمەتر[13]**

| زنجیرە | پارێزگاکە | دووری بەکیلۆمەتر |
|---|---|---|
| ١ | بەغدا | ٢٥٠ کیلۆمەتر |
| ٢ | بەعقوبە | ٢١٥ کیلۆمەتر |
| ٣ | بەسرە | ٨٢٣ کیلۆمەتر |
| ٤ | دیوانیە | ٤٥٩ کیلۆمەتر |
| ٥ | هەولێر | ٩٣ کیلۆمەتر |
| ٦ | حیلە | ٣٧٨ کیلۆمەتر |
| ٧ | کەربەلا | ٣٨١ کیلۆمەتر |
| ٨ | کووت | ٤٦٥ کیلۆمەتر |
| ٩ | موسڵ | ١٧٧ کیلۆمەتر |
| ١٠ | ڕومادی | ٣٨٨ کیلۆمەتر |
| ١١ | سلێمانی | ١٠٩ کیلۆمەتر |
| ١٢ | ناسریە | ٦٣٧ کیلۆمەتر |

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە لەگەڵ پارێزگاکانی سلێمانیو دیالەو موسڵو هەولێر هاوسنوورو نزیکە، پەیوەندی بەتینی بازرگانی لەنێوانیاندا هەیە. ((پارێزگای کەرکوك شوێنێکی ناوەندی داگیرکردووە لەنێوان پارێزگاکانی کوردستان، هەر لەبەر ئەمەشە کاری بەعەرەبکردنو گۆڕینی ڕووی نەتەوایەتی لە کوردستاندا لەوەوە دەستی پێکردووە))[١٤].

((پردێکی بەیەك گەیاندنە لەنێوان ناوچەکانی سەروو هەروەها خوارووی کوردستانی عێراق، چونکە گۆڕینی ڕووی ڕاستی نەتەوایەتی هۆیەکی ئاسانە بۆ قووت دانی ناوچە کوردییەکانی تر، هەروەها زنجیرەی پێکەوە بەستنە لەنێوان ناوچە کوردییە فەیلییەکانو کورد تەنگە تاوکەی لەسلێمانی کەرێگە نەبێت بۆ دەرباز بوون تەنها لەدەروازە دیارەکان نەبێت.

بۆیە دەبینین ئینگلیزەکان کاتێك پرۆژەی هێڵی شەمەندەفەرییان ڕاکێشا لەنێوان (بەغداد – هەولێر) ئەو هێڵە دەڕۆیی بە (کفری)و (خورماتوو)و (کەرکوك)و (پردێ) و ئینجا هەولێر، چونکە ڕێگای نێوان (سلێمانی – هەولێر) خەڵکی کەم پێدا دەڕوات، ئارەزوو دەکات بە کەرکوکدا بێتو بچێت بۆ سلێمانی، لەبەر ئەوەی کورت ترە.. ئەوەی گرنگی ئەم پارێزگایە زیاد دەکات ئەوەیە کە دەڕوانێت بەسەر زێی بچووكو ڕووباری سیروان، کە دەتوانێت بۆ دابڕانی لە ناوچە کوردنشینەکان لەیەکتری، ناتوانرێت ئەم ڕووبارانە ببڕێ تەنها بە دروست کردنی پرد لەسەری کە ئەمەش کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی حکومەتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین پارێزگای کەرکوك کاری دووڕوو دەکات:–

یەکەمیان:– دادەنرێت بەکاری دابڕان لەنێوان پارێزگاکانی کوردستان.

دووەمیان:– کاری دەورەدانە بۆ پارێزگا کوردییەکان، لەبەرئەوە دەست بەسەراگرتنی کەرکوك مانای دەست بەسەراگرتنی زەوییەکی زۆری کوردستانە، هەربۆیە بنکەیەکی گرنگو سەرەکی بووە بۆ سوپای عێراقو نەخشەی پاشەوەو (خط الخلفي)و بنکەی ئازووقە بووە، هەروەها وێستگەی دەرچوونی فڕۆکەکان بۆ بۆردومانی ناوچەکانی کوردستان، لەبەر ئەوەی کەرکوك دادەنرێت بەشادەماری کوردستان کارتێکردنی گرنگی هەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی بۆ پاشەڕۆژی میللەتەکەمان بەگشتی..))[١٥].

هەروەها شوێنێکی دیاریکراوو گرنگی سەردەمە جیاجیا مێژووییەکانی هەیە، کە لەسەردەمەکانی پێش مێژوودا شوێنێکی ئاوەدانو گرنگ بووە خاوەنی شارستانێتییەکی ئاوەدانی (چەرموو)و (مەتارە)و (قادیش)ی گەورەو بچووك بووە، سەرەتای گۆڕانێکی ناوچەیی مێژوویی گرنگ بووەو وەچەرخانی سەرەتا مێژووییەکان بووە، لە سەردەمەکانی مێژووشدا شوێنێکی گرنگی سنووری ناوهێنانی (سوبارتو)و (هوری – میتانی) بووەو بەناوچەیەکی گرنگی ئەو سەردەمانە زانراوە چونکە وشەی (سوبارتوو) یان (سەروو) کە بەناوچەکانی سەروی میزۆپۆتامیا وتراوە، کەرکوك بەشێکی ئەو هێڵە سنوورییە بووە، لە سەردەمی شارستانیەتی (هوری – میتانی)یشدا شوێنێکی گرنگو بنکەیەکی ئەو شارستانییەتە بووە، یان لەسەردەمی دوای بڵاوبوونەوەی مەسیحییەتدا پێی ووتراوە (بیپ گەرمی) کە ناوچەی (گەرمیان) دەگەیەنێت.

(سوبارتو) وەکو کۆنترین شێوە بەکارهێنان دەگەڕێتەوە سەردەمی (نەرام – سین) کە دانیشتووانی وڵاتی (سووبارتوم) پێکهاتبوو لە: (ئەراپخا .. نادرا .. پاراخی)و گەلێك ناوچەی تر کە (کەرکوك) دەکاتە خوارووی وڵاتی (سوبارتووم) کە پێی دەوترا پارچەی (ئەراپخا)، کە لە سەردەمێکی درەنگدا بەشێك بوو لەکەرکوکی ئێستا کە پێی دەوترێت (عەرەفە).. لە کۆندا چیای (حەمرین) سنووری بووە، لە ڕۆژئاواوە (ڕووباری دیالە) جیای کردووەتەوە، لەخواروو لەوڵاتی (حەلوان)و (نوار)، لەسەروو گەیشتۆتە ڕووباری زێی بچووك، کە لەوێ وڵاتی (حەزیب)و (ئەربیلا) لەسەر هەردوو زێیەکە بوونە، لەڕۆژهەڵات گەیشتۆتە چیا سەرکەشەکانی نزیك سنووری وڵاتی (زاموا)..))[١٦].

بەکارهێنانی (گەرمیك – گەرمیان) یش وەکو بەکارهێنانی زۆر بەزوو بەو ناوچانە وتراوە کە (گەرمەسێر)ە کە (ئارامی) یەکان لەشێوە (بیث گەرمی)دا بەکاریان هێناوە، وەکو بەعەرەبی بوو بە (باجرمی)، کە لە کوردیدا بووە بە (گەرمیان) ی ئێستا ئەمەش ئەو ناوچە گەرمانە دەگەیەنێت کە بەرامبەر ناوچە ساردە چیاییەکانە..))[١٧].

بەڵام مامۆستا (تۆفیق وەهبی) دەڵێت:–

((هۆی ئەم دابەش کردنە دەگەڕێتەوە سەر کورسی (مەتران)ی ڕۆژهەڵات، چونکە بۆ ئەم مەسەلەیە، ناوچەکانیان دابەش کردووە بەدوو بەشەوە کە یەکێکیان وڵاتی گەرمیانو ئەوی تریان وڵاتی کوێستان، کە گەرمیان ئەو ناوچانە دەگرێتەوە لەنێوان زنجیرە ڕووباری (دیالە) لە ڕۆژئاواوەو ڕووباری زێی بچووك کە ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان سلێمانیو کەرکوك، بێجگە لە ناوچەی (پشدەر)، بنکەی ئەو (باجەرمی – سلوخ)، کەرکوك بووە))[١٨].

((لە ڕووی ئابووریشەوە پارێزگاری کەرکوك کەوتۆتە ناوەندی تەختاییەکی فراوانی دەریاچەی نەوت کە دادەنرێت بە دەوڵەمەندترین دەریاچەی نەوت لە جیهاندا..))[١٩].

(چاڵگەی کەرکوك درێژترینو گەورەترین چاڵگەی نەوتی جیهانە لە قوبەکانی (بابا – سارەلو – سەربەشاخ) پێك دێو لەناوچەی جەبەڵ بۆرەوە تاناوچەی دیبەگە درێژ دەبێتەوە، بۆیە شادەماری ئابووری عێراقو گرنگترین شوێنی ستراتیژی باکووری عێراقە چونکە گرتنی کەرکوك واتا دەست بەسەراگرتنی کەرکوك واتا دەست بەسەراگرتنی سەرچاوەی پەترۆلی عێراق)[٢٠].

**سەرچاوەو پەراوێزەکانی:**

١. (متصرفية لواء كركوك، المشاريع والأعمال المنجزة لواء كركوك خلال العام الثالث من ثورة (١٤) تموز المجيدة)، چاپخانەی شارەوانی کەرکوك، لاپەڕە (١٧).

٢. ڕووباری زێی بچووك:- لە چیاکانی ئێران لە دەریاچەی (ئورمیه) هەڵدەقوڵێت‌و دوای ئەوەی بەرەو خوار دەڕژێتە زەوی ئێرانەوە چیای هەورامان دەبڕێت دێتە ناو زەوی (عێراقەوە)، چەند چیایەك دەبڕێت لەپارێزگاری سلێمانی‌و سنوور دروست دەکات لەنێوان هەولێرو کەرکوك. شاری کۆیە جێ دەهێڵێت لەلای دەستە ڕاست، بە ئاڵتون کۆپریدا دەروات تێکەڵ بە دیجلە دەبێت. (جغرافية العراق الحديثة)، هاشم ئەلسەعدی، لاپەڕە ٢٢.

٣. چیای حەمرین: ((بەتەنیا لەسەر دەشتاییەك دروستبووە کە لە نزیك (مەندەلی)یەوە دەست پێ دەکات لە لای سەرووی زنجیرەی (پشتی کەوە) درێژ دەبێتەوە، لە لای سەرووی ڕۆژئاواوە، بەرزاییەکەی لەنێوان (٢٠٠ - ٣٠٠) مەتر دەبێت، هەریەکە لە ڕووباری (دیالە)و (عوزێم)و (دیجلە) دەبڕێت، کە (دیجلە) لەلای دەربەندی (فەتحە) لە ماوەی (١٢٠)میل لە سەرووی (بەغدا)وە دەیبڕێت، لەوێوە درێژ دەبێتەوە، لە لای سەروو هەتا بزر دەبێت لە خوارووی (شەرگات). (جغرافية العراق الحديثة)، هاشم ئەلسەعدی، چاپی یەکەم چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا، ساڵی ١٩٢٤، لاپەڕە ٧ ).

٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥. (العراق الشمالي)، عەبدوڵڵا حەسەن‌و محەمەد هادی ئەلدەفتەری، ساڵی (١٩٥٨)، چاپخانەی (شەفیق)، بەغدا، لاپەڕە (٢١٩).

هەروەها بڕوانە سەرچاوەی (Conseruration on an historic taun – The Galaa of Kirkuk) نووسینی دلێر هیدایەت، کە نامەی ماجستێرە لەساڵی ١٩٦٥ وەرگیراوە لەزانکۆی بەغدا:- کە هێڵی پانی (٥٣٥ - ٣٠) داناوە، وەهێڵی درێژی بە (٥٤٤ - ٢٥) داناوە، لاپەڕە (٢).

٦. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو. هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:- (گۆڤاری هیوا) ساڵی (١)، ژمارە (٤) تشرینی یەکەم ١٩٥٧ کەبەرزی کەرکوکی لەڕووی دەریاوە بە (٣٤٠) مەتر داناوە، لاپەڕە (٥)، هەروەها بڕوانە:- (دليل المملكة العراقية، تاريخي، إداري، تجاري، صناعي، زراعي)، ساڵی یەکەم (١٩٣٥ -١٩٣٦)، چاپخانەی (الامين)، بەغدا، ساڵی ١٩٣٥، لاپەڕە (١٠٠٩) کەبەرزی لەڕووی دەریاوە بە (١١٦٠) پێ داناوە.

٧. (قەڵای کەرکوك)، دلێر هیدایەت، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢-٤) .

٨. (منطقة كركوك ومحاولة تغيير واقعها القومي)، دکتۆر نوری تاڵەبانی، لەندەن، ساڵی (١٩٥٩). لاپەڕە (٩) .

٩. گۆڤاری (بين النهرين)، ساڵا نۆیەم، بەرگی (٩) ژمارە (٣٦)، ساڵی (١٩٨١) ئەراپخا و نوزی لەمێژوودا لاپەڕە (٣٢٥) لە نووسینی (روفائیل میناس).

١٠. (قەڵای کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢ - ٤).

١١. گۆڤاری (بين النهرين)، ساڵی (٢٢) ژمارە (٩١ - ٩٢) ساڵی (١٩٩٥) لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی:- (اربيل ونينوي وكركوك ومدن آشورية)، نووسینی دکتۆر نائل حنون، لاپەڕە (١٦٥).

١٢. (منطقة كركوك ومحاولة تغيير واقعها القومي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٩).

١٣. (قەڵای کەرکوك)، هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (٢٣).

١٤. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، ئەیلول، ١٩٩٨، لاپەڕە (١٣٢٩) بەناونیشانی:- (الأمن القومي الكوردي لأراضي محافظة كركوك الزراعية) نووسینی (محەمەد عەبدوڵڵا عومەر).

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٣٩ - ١٤٠)

١٦. (دراسات كردية حول بلاد سوبارتو)، نووسینی دکتۆر جەمال ڕەشید، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦ - ٢٨).

١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧).

١٨. (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)، جەمال بابان، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٩، لاپەڕە (٢٥١).

١٩. (مشاهير الألوية العراقية)، عەبدولمەجید فەهمی، بەرگی دووەم.

٢٠. (ئەمنی ستراتیجی عێراق‌و سێکوچکەی بەعسییان، تەرحیل، تەعریب، تەبعیس)، نووسینی ئەمین قادر مینە، بڵاوکردنەوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، چاپی دووەم، ساڵی ١٩٩٦.

## بەشی سێیەم

*** پێکهاتەو رووی زەوی کەرکوك لەگۆڕانە جیۆلۆجییەکاندا:**

بۆ ئەوەی زانیاری تەواومان دەست بکەوێت پێویستە بزانین گۆڕانە جیۆلۆجییەکان لە ناوچەکەدا چۆن رووی داوەو، چۆن بووەتە هۆی پێکهاتەی رووی زەوی شارەکەو دروستبوونی گردو دۆڵو چیاو دەشتایی لە پێکهاتەی گۆڕانە جیۆلۆجییەکانداو دروستبوونی ئەو رووەی کە ئێستا لە ناوچەکەدا جێگیر بووە.. ئەو گۆڕانکارییە دەمانگەیەنێتە نیشاندانی چینەکانی ژێر زەوی ئەو ناوچەیە، ئەو کانزاو کەرەستانەی کەتێدا جێگیر بووە کە ئێستا بووەتە کەرەستەیەکی گرنگی ئەو شارەو دەوری هەیە لە گۆڕانە جۆر بەجۆرەکاندا.

((گۆڕانی رووی زەوی لە کوردستانی عێراقدا مێژوویەکی کۆنی هەیە ئەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین کاتی جیۆلۆجی، بەکورتی چوار زەمانی جیۆلۆجی بەسەر خاکی کوردستانی عێراقدا تێپەڕیوە.. تاکو گەیشتۆتە ئەم سەدە تازەیە، بۆ ئەم گۆڕینەش دوو هۆ هەبووە:-

**یەکەم:-**

بوونی خاکی پتەوو رەقی نێو دوورگەی عەرەب، خۆراگرتنی بەرامبەر جوڵانەوەی زەوی شاخو دۆڵی لێ پەیدا بووە.

**دووەم:-**

دەریای (تیش - دەریای سپی ناوەراست) کە دەریایەکی گەورە بووەو دراوسێی نیوە دوورگەی عەرەبستان بووە، ئاوی ئەم دەریایە گشت گوزەرانی داپۆشیبوو، بەڵام بنکەی بێ هێزتر بوو لە خاکی عەرەبستان لەبەر ئەوە جووڵانەوەی زەوی تینی زیاتر ئەکردە سەری بەتایبەتی شوێنە دوورەکانی لە عەرەبستانەوە، لەبەر ئەم هۆیە شوێنە نزیکەکانی کوردستانی لە عەرەبستانەوە دەشتاییان زۆرترە.

بەرەبەرە گردو تەپۆڵکە زۆر ئەبێت تاوەکو ئەگاتە شاخو چیا بەرزەکانی ژووروی وڵات وەك تەپۆڵکەکانی رۆژئاوای عێراقو دەشتی ناوەندیو ریزە گردۆڵکەکانی شاخی حەمرین. لەماوەی سەدەی دووهەمەوە تا سێهەم زەوی ژێر دەریای (تیش) زۆرجار تووشی جووڵانەوە ئەبوو، کە ئەبووە هۆی پەیدابوونی گرژیو چاڵو چۆڵی، ئینجا ئەم چاڵو چۆڵییە بەگڵی داماڵراوی بنی دەریاکە پڕ ئەبووەوە، لەگەڵ خۆشیا گەلێك زیندەوەری ئاوی ژێر خۆی دەنا، ئەم زیندەوەرانە، پاش مردنیان، ئێسکەکانیان کە مادەی کلسە بووەتە گڵی گەچ و قسل، کە چین بەچینی بەرەوە زیادی رۆیشتووە، لەبەر ئەوەی لەم سەدەیەدا جووڵانەوەیەکی زۆر هەبووە، ئەتوانین بڵێین کە گڵنشتن بەردەوام بووە، هەتا وەکو سەدەی (ئۆلیکۆسین) کە سەدەی دەهەمی زەمانی سێهەمە، بەم جۆرە دەریاکە بەرە بەرە قووڵاییەکەی کەم ئەبووەوە، تاوەکو گەیشتە ئەوەی بوو بە دووگۆمی تەنك..

لەدواکاتی سەدەی (مێوسین)دا کە دوا سەدەی زەمانی سێیەمە، بەهێزترین جووڵانەوە روویداوە کە بووەتە هۆی پەیدا بوونی ریزە شاخەکانی (ئەلپ) لە ئەورووپاو شاخەکانی (زاگرۆس) کە شاخەکانی کوردستانی عێراق بەشێکێتی. بەم جۆرە شاخەکانی کوردستان ئەم شێوەیەی ئێستایان وەرگرتووە کە بریتییە لە شاخی بڵندو سەختو گردۆڵکەکانی گەرمیانی عێراق کە بەشێوەی لێژیان بەرەو رۆژهەڵاتو خوارەوەیە.

ئەم جووڵانەوەیە هەر بەردەوام بووە تاوەکو سەرەتای زەمانی چوارەم کە سەدەی (بیلۆستۆسین)ە لەئەنجامیشدا شێوە شاخەکانی کوردستانی باشووری پێ تەواو بووە..[1].

((.. لەبەرئەوە دەگەینە ئەوەی کە ناوچەکانی کوردستانی باشوور قووڵترین شوێنی دەریای تیش بووە..))[2].

(کەرکوك) لەو ناوچە فراوانەی کوردستاندا بەشێکی قووڵی ئەو دەریایە بووە، بەپێی نزمی شوێنەکەی ئێستای لەرووی دەریاوە، هەر بۆیە کەوتوتە ژێر کارتێکردنی ئەو گۆڕانە جیۆلۆجیانەی کە بەسەر گۆی زەویدا هاتووە کەئەم پێکهاتەو شێوەیەی زەوی کەرکوکی دروستکردووە، کە بەشێکی ئەو ناوە نیشتووە، زەوییەکەی بووەتە ناوچەیەکی بەپیتی کشتوکاڵ، هەربۆ راستی ئەمە سەرهەڵدانی شارستانی (چەرموو)و (قادیش)و (مەتارە)و ناوچە جۆربەجۆرەکانی تر.

*** جۆرەکانی گڵ لە پارێزگای کەرکوکدا:**

دەتوانین بەپێی پێویست گڵی ناوچەی کەرکوك بکەینە ئەم بەشانەی خوارەوە:-

*** گڵی قاوەیی:-**

چینی ژووروی ئەم گڵە تاوەکو قووڵی (٣٥) سانتیمەترە، رەنگێکی قاوەیی بۆری هەیە، رێژەی ماددە ئۆرگانییەکانی دەگاتە (٢٪)و پووشێکی درێژ دایپۆشیوە[3].

*** بۆرە خاك:-**

ئەم جۆرە خاکە لەناوچەی گەرمیانی کوردستاندا هەیە کە زەوییەکەی فراوانە. لە قووڵایی (٢٠ - ٣٠) سانتیمەتردا، بەرەنگە گڵی قسڵاوی دەردەکەوێتو رێژەی ماددەی ئۆرگانییەکەی ئەگاتە (٢٪).

*** گڵە سوورە:-**

لە زۆر شوێنی وڵاتی کوردستاندا هەیە بەتایبەتی لە ناوچەی (گەرمیان)، رەنگی بۆرو سوورە، چینی ژێرەوەی سوورییەکەی زیاترە، لەژێر ئەم چینە قسڵو گەچ هەیە هەندێ شوێنی نەرمو فشە یان سەختە، کارەساتی راماڵینو بیۆلۆجیو کیمیایی کەمە.

*** گڵی ناوچەی شاخەکان:-**

ئەم خاکە لە کەژەکاندا هەیە، زۆریو کەمی بەپێی لێژیو بەرزیو ئاوداری شوێنەکەیەوە دەگۆڕێت. رەنگی خاکەکەی بۆرە، بەردو چەوی زۆرە، قووڵاییەکەی دەگاتە (١٠ - ٣٠) سانتیمەتر..[4].

* گڵی کەستەنایی:-
ڕێژەی مادده ئۆرگانییەکانی ئەگاتە (٤٪) ڕەنگێکی قاوەیی تۆخی هەیە. ئەم گڵە لەو ناوچانەدا پەیدادەبێت تێکڕای بارانی ساڵانەی دەگاتە (٨٠٠) ملیمەتر..))(٥).
هەروەها بێجگە لە جۆری گڵەکان جۆری بەهێزو بێهێزی گڵیش هەیە، لەگەڵێك شوێنی ناوچەی کەرکوکدا گڵەکەی قایم و جیرەو فش نییە بەڵام هەندێك جێگەی تری فشی هەیەو ئاو زیاد هەڵدەمژێت:- بۆ نموونە گڵی ناوچەی پاپیلان لە ناوچەی شوان بەناوبانگە بەقایمی و جیری ڕەنگ سووری کە جۆرە قایمییەکی هەیە بەتایبەتی لەکاتی باران باریندا ناوچەی لای لەیلان و قەرەتەپەیش جۆرە سیفاتێکی لەم جۆرەیان هەیە.

* چینە جیۆلۆجییەکانی ناوچەی کەرکوك:

* چینی بلیستۆسینی تازە:-
پێکهاتەکانی بلیتۆسین و سەردەمی تازە بریتییە لە:-
ئەو نیشتە لادراوە درشتە کۆنانەی چەوو زیخ و (کۆنجلۆمرات) یان بریتییە لەنیشتەی ڕووبارە تازەکان لەچەو لم و لیتەی نەرم، کەئەم جۆرانە بەشێکی زۆری ناوچەکانی سەرووی کەرکوك، هەر لەدەشتی حەمرین و دەشتی حەویجەو بانی کەرکوك..))(٦) دەگرێتەوە.
* چینی (بیلۆسینی) ماوەی بەختیاری:-
چینەکانی ژێرەوەی ئەم ماوەیە بریتییە لە چەوو لم و لیتەو قووڕ، هەریەکە لەلیتەو قووڕە سواڵەت (صلصال) ڕەنگیان شین باوەو، لەمەکەی ڕەنگی خۆڵەمێشییە لەگەڵ بوونی بەرد لە بەشەکانی سەرەوەی ئەم ماوەیەدا(٧).
دەبینین ئەم چینە لەئاقارێکی فراوان لە پارێزگاری کەرکوك بڵاوبووەتەوە، کەوای لێهاتووە بڵێین کە قەزای کفری بە تەواوەتی داگیرکردووە، لەگەڵ ناحیەی (قادر کەرەم و قەرەحەسەن)(٨).
* چینی کریتاشوسی:-
ئەمە لەبەشێکی زۆرکەمی پارێزگاکەیە، وەکو نەبوون وایە، بەڵام پێکهاتەی (کریتاشوسی) شێوەی بەردی جیری بەدەر نەکەوتووە لە پارێزگاری کەرکوك..(٩).
* چینی مایۆسینی ژێرەوە:-
((چەند چینێکی یەك لەدوای یەکە لەگەچ و بەردی (کلس) و لیتەو قوڕە سواڵەتی سەوزو سوورو جۆرەها بەردی کلسی و بڵاوبوونەوەی لیتە بەشێوەیەکی زۆر لەگەڵ هەندێك بەرد..(١٠).
* چینی ئۆلیکۆسین:-
نیشتەیەکی دیاریکراوە لەبەردی کلسی ئەرخەوانی لەنێوان هەردوو زێیەکەدا..(١١).
* چینی ئایۆسینی:-
بریتییە لە بەردی یەك پارچەیی (کلتە) و بەردی کلسی پارچە .. پارچە، نموونەی بەردی کلسی قەرەجۆغی تێدایە..(١٢).

* چینی جۆراسکی:-
بریتییە لە بەردی کلسی(١٣) کە بەشێکی زۆر کەم لەناوچەی کەرکوك بڵاوبووەتەوە.
* بوونی چینی نەزانراو:-
بوونی چەند چینێکی جۆراو جۆر کە تائێستا جۆری چینەکەی نەزانراوە لە پارێزگاکەدا هەیە(١٤).

* پێکهاتەی گڵی چەمچەماڵ و حەویجە:
((ئەوەی گرنگە لەپێکهاتەی جیۆلۆجی سەرووی عێراق ئەوەیە کە پێکهاتووە لە هەندێك پێکهاتەی بەردی، کە پەیوەستێکی گرنگی هەیە بەبژاڤی ژیانی تایبەتی مرۆڤایەتی.. لەبەر ئەوەی بەشێکی گرنگی ئەو پێکهاتانە هەڵگری سیفاتی کلسی هەیە. پەیوەندییەکی گرنگی هەیە لەنێوان پێکهاتەی کلسی و پیرۆی (نظام) ئاو کە گرنگییەکی گەورەیە، بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە ئەناڵێت بەدەست کەمی ئاوی سەر ڕووبەرەکەی.
گرنگی بەردی کلسی لەوەدایە کە ئاوی بارانا و هەڵدەمژێت و دووبارە دەیگەڕێنێتەوە بۆ سەر ڕووی زەوی لەشێوەی چاوگەی ئاوی کانیاو، بۆیە بوونی ئەم جۆرە بەردانە دەبێتە هۆی شێوەی دیاریکردن و دابەش کردنی ژیانی مرۆڤایەتی و نیشتەجێ بوون.
گرنگییەکی تری پێکهاتەی ئەم بەردانە لەو ناوچەیەدا ئەوەیە کە پەیوەستە بەجۆرەها کانزا وەکو نەوت و خوێ و گەچ، گەلێك کەرەستەی بیناکاری لێدەربەهێنرێت وەکو مەرمەڕو چیمەنتۆو گەچ(١٥).
هەر لەبەر ئەوەیە ناوچەی کەرکوك بەشێکی گرنگی کوردستانی خواروو لەڕووی گرنگی جۆربەجۆری لە نەوت و گەچ و بەردی بیناکاری و چیمەنتۆو کەرەستەی تری پێویست کە بەتایبەتی لەنەوتدا دەوڵەمەندترین شوێنە لە هەموو ناوچەکەدا.
لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم کە باسێکی هەریەکە لە پێکهاتەی جیۆلۆجی گڵی چەمچەماڵ و حەویجەو کەلارو کفری بکەم کە ناوچەیەکی گرنگی جیۆلۆجی کەرکوکن.
* گڵی چەمچەماڵ:-
خۆڵی چەمچەماڵ بریتییە لە چینی خۆڵێکی قووڵ، گەشەی کردووە لەسەر چینی قووڕی ڕووباری کۆن. کە چینی خۆڵەکانی سەرەوەی بریتییە لە پێکهاتەیەکی درشتی (زبر) ئەستوورو نەگۆڕ، بەڵام کەرەستە بنەڕەتییەکانی لەنێواندا بریتییە لەبەردی جیری، لەژێرییەوە لە قووڵی دوومەتر چینێك لەزیخ و چەوی جیری هەیە.
ئەم جۆرە خۆڵانە گەشەی کردووە لەناوچەیەکی کەستنایی (کستنائی) سوور، کە هەیە لە بەرزایی دۆڵی چیاکاندا، شەپۆلێکی کەمی هەیە، ڕێژەی باران بارینی لەنێوان (٤٥٠ – ٨٠٠) ملیمەتردایە، دەگونجێت بۆ بەرهەمهێنانی گەنمە بەهارە بێ بەکارهێنانی ئاودێری دەستکرد(١٦).
* گڵی حەویجە:-
بەڵام خۆڵی حەویجە خۆڵێکی بەپیتی هەیە، کە بەرهەمهێنانێکی بەرزی هەیە ئەگەر بەراوردی بکەیت لەگەڵ ناوچەکانی

تری پارێزگاکەدا کە پێکهاتەی خۆڵەکەی دروستبووە لە گۆرانکارییە جیۆلۆجییەکانی ناوچەکانی دەوروبەری وەکو چیای حەمرین و گردەکانی کەرکوك.

خۆڵی ناوچەکانی خوارووو رۆژئاوایی قەزاکە بریتییە لە رەنگی قاوەیی سوورباو، بریتییە لەبەردی لمی نەرم و نیشتەیی رووباری کۆن، کە لەژێریدا پێکهاتەی کلسی و گەچەکەیان قایم و بەهێزە یان فشەڵە.

بەڵام سەرووی قەزاکە بریتییە لە رەنگێکی قاوەیی دیار کە هەرچەندێك بچێتە ژێرەوە دەگۆرێت بۆ قاوەیی تۆخ.

بەڵام خۆڵی ژێر دۆڵەکانی شێوەی پێکهاتەکەی دروستبووە لە نیشتەی رووباری دیجلە و زێی بچووك لەکاتی هەڵسانی لافاودا، دەبێتە هۆی نیشتنەوەی رێژەیەکی زۆر لەقوڕو لم و لیتە بەشێوەیەکی جۆراوجۆر، بەڵام هەرچەندێك لە لێواری ئاوەرۆی رووبارەکان دوور بکەوینەوە ئەو نیشتەیە نەرمییەکەی کەم دەبێتەوە و زیاتر درشتی پەیدا دەکات و بەپیتییەکەی کەم دەبێتەوە))[١٧].

بەڵام ئەو خۆڵانەی کە بەکەڵکی کشتوکاڵ نایەت شوێنەکەی چۆڵە لە دانیشتووان، بەتایبەتی لەخوارووی قەزاکەدا کە هەندێك لەگڵی داشکاو (الاخدودیە) و کراوەیە، بەزۆری بریتییە لە لێژیی و دادرانی زەوییەکە..))[١٨].

*** دابەشکردنی رووی زەوییەکەی:**

دەتوانین دابەشکردنی رووی زەوییەکەی بکەینە چەند بەشێکی بەم جۆرە لەگردو دۆڵ و چیاو دەشت:

*** گردو چیاکانی پارێزگاکە:-**

((بریتییە لە کۆمەڵێك گرد کە بەرزییان لە (١٠٠٠) مەتر تێپەر ناکات لەسەر رووی دەریاوە، گرنگترین ئەم چیایانە ئەمانەیە:-

*** چیای حەمرین:-**

درێژ دەبێتەوە لە ناوچەی (الفتحة) هەتا سنووری (عێراق – ئێران)، بریتییە لەو چیایە کە لە (٥) کیلۆمەتر زیاتر نییە، تەنها لە هەندێك لادا نەبێت کە دەگاتە (١٢) کیلۆمەتر، زۆرترین بەرزی دەگاتە (٥٢٧) مەتر لەنزیك ناوچەی (فەتحە)، ئەم بەرزییە کەم دەبێتەوە هەرچەندە بەرەو خوارووی رۆژهەڵات برۆین کە لە (٢٠٩) مەتر تێپەر ناکات، رووبارەکانی ئەم زنجیرە لەم ناوچانەوە دەردەچێت وەکو رووباری دیجلە لە فەتحە، و رووباری (رۆخانە) لە (عوزێم)، رووباری (میرقیو) و رووباری (سیروان) لەلای (منسوری)یەوە.

بوونی هەندێك گرد لەلای خوارووی رۆژهەڵاتی پارێزگاکەوە، کەبریتییە لە چیای (جەبە) و (گلابات) کە درێژ دەبێتەوە بە هاوشانی گردەکانی (حەمرین)، بەرزی لەنێوان (٢٠٠ – ٣٠٠) مەتردایە، لەلای سەرووییەوە زنجیرەیەك هەیە پێکهاتووە لە چیای (گمر) و (کفری) و (نەوت کۆ) و (خورماتوو) کە بەرزی لەنێوان (٢٠٠ – ٤٠٠) مەتردایە، بێجگە لەمە زنجیرەیەکی تر هەیە ناسراوە بەچیای (شاکەلی) و (تساق) و (عەلی کۆ)، کە ئەم چیایانە بەشێکە لە بانی (هضبة) کەرکوك لەلای سەروو، کە بووەتە هۆی دروستکردنی لێواری خوارووی بانەکە، بەرزییەکەی لەنێوان (٣٥٠ – ٦٠٠) مەتردایە.

لەلای رۆژئاوای شاری کەرکوکەوە زنجیرە چیایەك هەیە بەناوی (کانی دومەڵان)، درێژی دەگاتە (١٠٠) کیلۆمەتر، لەلای خوارووەوە زنجیرەی (باتیوە) هەیە، لێوارەکانی ئەم چیایە و دەروازەکانی دەبێتە پێکەوە بەستنی دەشتایی کەرکوك و ناوچەکانی تری کوردستان))[١٩].

*** بانی کەرکوك (الهضبة):-**

((بریتییە لە بانێك لەنێوان سنووری عێراق – ئێران و دەشتی هەولێر لەلای رۆژهەڵات و رۆژئاواوە، لەنێوان زنجیرە چیای بەرز لەسەروو، گرد لەلای باشوور، کەبەرزی لەنێوان (٦٠٠ – ١٠٠٠) مەترە))[٢٠].

لەلای رۆژهەڵاتی بەرزییەکەی لە (٣٠٠) مەتر تێپەرناکات[٢١] پێکهاتەی ئەم بانە بەهۆی روودانی جووڵەی زەوی روویداوە، بووەتە هۆی دروستبوونی پێچا و پێچی قۆقز (کووڕ) (إلتوائات محدبة) لە لێوارەکانی رۆژئاوای وەکو چیای (تساق – ٦٨٨ مەتر) و چیای (خاڵخاڵان – ١١٨٥ مەتر) و چیای (شاکەل – ٤٠٥ مەتر)، لای لێوارەکانی رۆژهەڵاتی زنجیرە چیایەك درێژ بووەتەوە وەکو (بازکی) و (زەنوی)[٢٢] (١١٨٠) مەترو (ئۆمەر ئەولیا)[٢٣] بەهاوشانی ئەم چیایانە بوونی دۆڵێکی درێژ هەیە کە دەبێتە هۆی لێك جیا بوونەوەی بانی کەرکوك و نێوان ناوچە چیاییە بەرزەکان، کەبریتییە لە چەند زەوییەکی تەختی کشتوکاڵی[٢٤].

هەریەکە لەرووباری زێی بچووك و بەشەکانی رووباری (عوزێم، رۆخانە)، (باسەرە، تاووق، ئاوەسپی) و رووباری (دیالە – سیروان) هەستاون بەبەشکردنی بانی کەرکوك بۆ گردو دۆڵ کە بووەتە هۆی یاریدەدەری بێبەشی لێژی و بوونی بەردی نەرم (لین) تێیدا، بوونی چەند دەشتێکی نیشتوویی لادراو (فیضیة)ی بچووك هەیە نزیك ئاوەرۆی رووبارەکان، وەکو دەشتی رووباری ئاوە سپی، بەڵام دۆڵەکانی بەشێوەیەکی گشتی بەکەڵکی هیچ نایەت تەنها بۆ شینبوونی گژوگیا نەبێت..))[٢٥].

*** دەشتی کەرکوك:-**

((بریتییە لە دەشتێکی فراوان کە درێژ دەبێتەوە بەماوەی (٣٠٠) کیلۆمەتر، فراوانی لەنێوان (٦٤ – ٨٠) کیلۆمەتردایە، لە ناوەراستدا تەسك دەبێتەوە دەگاتە (٣٢) کیلۆمەتر، ئەم دەشتە لەتەنیشت زنجیرە گردەکانی (حەمرین)دا درێژ دەبێتەوە، کە بریتییە لە پێچاوپێچێکی کووڕ، پربووەتەوە بەهۆی ئەو نیشتانەی کە لە بەرزاییەکانەوە هاتۆتە خوارەوە، بەهۆی راماڵین و باران بارین، ئەم دەشتە چۆڵە لەبەرزایی تا رادەیەك، تەنها ئەو شوێنانە نەبێت کە باسمانکرد، بەرزی ئەم دەشتە لەنێوان (٢٢٥ – ١٨٠) مەتر دایەوە ئاوەرۆی ئەو ئاوانەی کە دەیبرێت فراوانە، چینێکی ئەستوور لە چەو دایگرتووە، زیاتر ئەم ئاوەرۆیانە وەرزییە و لێوارەکانی ئەم دەشتانە فراوانە کە رووباری پێدادەروات، بەرزی لەنێوان (٣ – ٦) مەتردایە.

بارینی باران لەدەشتی کەرکوك دا دەگاتە ئەوەی کەبەشی کشتوکاڵی بەرباران بکات، هەروەها دەتوانرێت سوود لە ئاوەرۆی رووبارەکانی تەنیشت وەرگیرێت بۆ ئاودێری هەروەکو ئەوەی هەیە لە پرۆژەی حەویجەی جێنشین

(الاستیطان) بەکار بهێنرێت.
دەتوانن پارێزگاکە دابنێن بەناوچەیەکی دەشتی فراون، هەروەها ئەو بەرزاییانەی کە هەیەتی بەهەمان شێوە دەتوانن بەکاری بهێنین بۆ کشتوکاڵ وەکو میوەجات یان دارستان.
دەشتی کەرکوك دەشتێکی گرنگە لەبەرئەوەی شوێنێکی ستراتیژیەتی نەتەوەیی هەیە لە کوردستاندا چ لەرووی بەرهەمهێنانی جۆر بەجۆر، کەپێکەوە بەستنێکی بەتینی ئاسایشی نەتەوەیی کوردی هەیە لە هەموو لایەنێکەوە، بەتایبەتی مرۆڤی، بێجگە لە کشتوکاڵی، هەروەها رێگە دراو بووە بۆ ئاسانکردنی جێبەجێ کردنی هێرشی سەربازی جۆراوجۆری حکومەتی بەعسی رووخاو بۆ شەر دژی کورد، هەروەها دەتوانێت کاری جێنشین کردنی تێدا بکات بۆ هێنانی عەرەب لەو ناوچانەدا..))[٢٦].

*** رووبارو لقەکانی پارێزگای کەرکوك:**
گەلێك رووبارو لقی هەمە چەشنە لە ناوەراستەو دەوروبەری پارێزگاکەدا هەیە کە گرنگی خۆی هەیە لە بواری جیپۆلەتیکی و سروشتی و سەربازی و ئابووریدا.
*** رووباری خاسە:**
ئەم رووبارە رووبارێکی وەرزی گەورەی پارێزگایە کە ناوەراستی شارەکە دەبرێت لە لای قەڵای رووبارەکەوە بەشی رۆژهەڵاتیە، کە بەشی گەورەی شارەکەیە، بەشی رۆژئاوای کە بە ناوبانگە بە قۆرییە پێی دەوترێت بەشی بچووکی شارەکە.
بەشی زۆری سەرچاوەی ئاوەکە کە دێتە خاسەوە یان ئەو لقانەی کە تێیدا دەرژێت لە بەرزاییەکانی شوان و چەمچەماڵەوە دێت.
لەدوای رۆیشتنی بەردەوامی بەناحیەی (تازە)و (خورماتوو) بەردەوام دەبێت بەرەو خواروو بەلای خوارووی رۆژئاواوە، کە تێکەڵ بە رێچکەی رووباری (ئاوەسپی- عوزێم) دەبێت لە نزیك چیای (حەمرین).
حەوزی چەمی (خاسە- زەغیتون) بەشێکە لە حەوزی رووباری عوزێم کە رووبەرەکەی دەگاتە (٥٩٠٠)کم² واتە (٤٩٪) لە رووبەری حەوزی عوزێم کە رووبەرەکەی (١٢٠٠٠کم²) یە.
زۆربەی زەوی و زاری ئەم حەوزە دەکەوێتە پارێزگای کەرکوك و بەشەکەی تریان کە پێی دەوترێت چەمی (زەغیتون) کە ئێستا بەشێکە لە پارێزگای (سەلاحەدین).
بەڵام ئەم حەوزە بەشێکە لە کوردستان و بووەتە سنووریشی چونکە چەمی (زەغیتون) شان بە شانی شاخی (حەمرین) دەروات لەلای رۆژهەڵاتییەوە. چەمی خاسەیش بە ناوەراستی شاری کەرکوکدا دەروات کە یەك دەگرن لەگەڵ ئاوی (رۆخانە)و (ئاوەسپی)و بە گوری هەموویانەوە رووباری عوزێم دروست دەکەن[٢٧].
بەشێوەیەکی گشتی بەرزای ئەم حەوزە لەنێوان (١٥٠- ٧٥٠) مەترەو چوار زنجیرە شاخ لەم حەوزەدا درێژ بوونەتەوە، شاخەکان دەکەونە بەشی چیاچەماوە نزمەکانەوەو لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەمانەن:

**١. زنجیرە شاخی (قۆقزی حەمرین):**
دەکەوێتە رۆژهەڵاتی رووباری دیجلەو سنووری کوردستانی باشوورە، بەرزای (٤٦٥) مەترە، قۆقزییەکەی بریتییە لە دوو بەش هەردووکیان بەشێوەی (ASYMETRICAL) ناوەراستی ئەم شاخە لە کۆمەڵە بەردی فارسی خواروو (فەتحە) داپۆشراوە، دەوروبەریشی داپۆشراوە بە کۆمەڵە بەردی بەختیاری (مقدادیە)و فارسی و خواروو (فەتحە).
**٢. زنجیرە شاخی (قۆقزی پەڵکانە):**
دیسان (ASYMETRIC) کە ناوەراستی داپۆشراوە بە کۆمەڵە بەردی فارسی خواروو (فەتحە)و لە دەوروپشتی کۆمەڵە بەردی فارسی سەروو (ئینجانە) لە تازە خورماتووە دەست پێ دەکات هەتاکو دوای حەوزەکە لەبەشی خوارەوەیدا، بەرزاییەکەی لەنێوان (٢٥٠- ٣٠٠) مەترە.
**٣. زنجیرە شاخی قۆقزی (پاتیوە):**
ئەم زنجیرە شاخە زنجیرەیەکی دوورو درێژە، بەڵام زۆربەی دەکەوێتە حەوزی رووباری زێی بچووکەوە (دەرەوەی ئەم حەوزە) بەرزاییەکەی لە (٣٥٠) مەتر زیاتر نییە.
**٤. زنجیرە شاخی قۆقزی کەرکوك:**
ئەم شاخە دەکەوێتە سەرووی رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوەو بەرزاییەکەی (٤٥٠) مەترە. لە ناوەراستی ئەم شاخەدا کۆمەڵە بەردی (فەتحە) فارسی خواروو دەبینرێت. لە دەوروبەریشی کۆمەڵە بەردی فارسی سەروو (ئینجانە)و (بەختیاری) هەیەو شکاندنێکی گەورەیشی بە دوورو درێژی بە بەردەوامی هەتاوەکو شارۆچکەی (لەیلان) کە دەکەوێتە خوارووی شاری کەرکوکەوە هەیە. بەڵام لە (لەیلان) نابینرێت چونکە داپۆشراوە بە کۆمەڵە بەردی نیشتەنی چاخی چوارەم.

لە بەینی ئەم شاخە قۆقزانەدا ئەم دەشتایانە دەبینرێت لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات[٢٨]:
**١. دەشتی (حەویجە):**
دەشتێکە بەشێوەی زۆر پان و فراوانە لە شاخی حەمرینەوە هەتا وەکو شاخی پەڵکانە درێژ دەبێتەوە، بەڵام نزیکی (تازە خورماتوو) تەسك دەبێتەوە، لێرەدا پانایی دەگاتە (٣٠) کیلۆمەتر، بەڵام بەینی شاری کەرکوك و شاخی حەمریندا دەگاتە (٥٠) کیلۆمەترو هەمووی بە کۆمەڵە بەردی شاخی چوارەم داپۆشراوە کە لەنێوان (١٥٠- ٢٠٠) مەتر دایەو چەند چەمێکی تێدایە کە ئاوی پێدا دەروات و لەکاتی باراندا راماڵینی گشتی و خەتی دروست دەکات هەندێ جار راماڵینی خەندەقیش دروست دەکات[٢٩].
**٢. دەشتی (لەیلان):**
دەکەوێتە بەینی شاخی (پەڵکانە- باتیووە)، لە رۆژئاواوە شاخی کەرکوك (کانی دوومەڵان) لە رۆژهەڵاتەوە، بەرزایی ئەم دەشتە لەنێوان (٢٠٠- ٢٥٠) مەترەو زۆربەی کۆمەڵە بەردی چاخی چوارەم داپۆشراوەو چەمی خاسەو باجوانی پێدا دەروات.
**٣. گردۆڵکەکانی سەرووی شاری کەرکوك:**
ئەم بەشە لە هەموو بەشەکانی تری حەوزی (خاسە) بەرزترەو

لە زەوییەخراپەکان‌و لە ئەنجامی ڕاماڵینی خەتییەوە دروستبووە، جگە لە چەمی (خاسە)و (زەغیتون) ئەم چەمانەی خوارەوە بەدی دەکرێت کە هەریەکێکیان حەوزێك دروست دەکەن بەبێ دابەشکردنی ئاو:

**١. چەمی نەفت‌و حەوزەکەی:**

سەرچاوەی ئاوەکەی لە شاخی باتیوەوە دەست پێ دەکات، بەرزی لەنێوان (١٥٠- ٣٠٠) مەترەو ڕاستەوخۆ دەڕژێتە چەمی زەغیتونەوە، لێژاییەکەی لەنێوان (٤,١-٢٪) پلەیەو ڕووبەری حەوزەکەش (١١٣٣) کیلۆمەتر دووجایە.

**٢. چەمی (ئەبو خانجیر):**

دیسانەوە زۆربەی سەرچاوەی ئاوەکەی شاخی باتیوەیەو ڕووبەری حەوزەکەی (٢٣٠) کیلۆمەتر دووجایە، ئاوی ئەم چەمە دەڕژێتە چەمی نەفتەوەو بەرزایی حەوزەکە لەنێوانی (١٥٠- ٢٥٠) مەترە.

**٣. چەمی قورنە:**

ڕووبەری حەوزەکەی (٣٤٣) کیلۆمەتر دووجایەو ئاوەکەی دەڕژێتە چەمی زەغیتوونەوەو بەرزای حەوزەکە لەنێوان (١٥٠- ٢٠٠) مەترە.

**٤. چەمی (خاسە کەرکوك):**

ڕووبەری حەوزی ئەم چەمە (٤٦٣) کیلۆمەتر دووجایەو سەرچاوەی ئاوەکەی لە زنجیرە شاخی کەرکوکەوە دەست پێ دەکات، بەرزایی حەوزەکە لەنێوان (١٥٠- ٣٥٠) مەترەو بەشاری کەرکوکدا دەڕوات.

**٥. چەمی (تازە خورماتوو):**

ڕووبەری حەوزی ئەم چەمە (٧٥٧) کیلۆمەتر دووجایە بەرزاییەکەی لەنێوان (١٥٠- ٣٠٠) مەترەو هەردوو شارۆچکەی (تازە خورماتوو)و (داقوق) دەکەوێتە ناو ئەم حەوزەوە، سەرچاوەی ئاوەکەیشی لە شاخی پەلکانەوە دەست پێ دەکات.

**٦. چەمی (لهێب عەبدولعەزیز):**

ڕووبەری حەوزی ئەم چەمە (٢٨٠) کیلۆمەتر دووجایە بەرزاییەکەی لە (٢٠٠) مەتر زیاتر نابێت[٣٠].

**٧. چەمی (باجوان):**

ڕووبەرەکەی (٤٩٢) کیلۆمەتر دووجایە، سەرچاوەی ئاوەکەی

**خشتەی چەم‌و خەسڵەتی حەوزەکان لە چەمی (خاسە- زەغیتون)دا:-**

| ناوی حەوزو چەمەکان | ڕووبەر/کم$^{2}$ | بەرزای بە مەتر | لێژی ٪ | کۆمەڵە بەردەکان | بەرگەی ڕاماڵین | ڕادەی ئاو کۆ کردنەوە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١- چەمی نەوت | ١١٣٣ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٣٠٠ م | ١،١٤- ٢،٠ | کۆمەڵە بەردی چاخی چوارەم پلاستۆسین لە پرریندەم بەردی لم‌و زیخ‌و کڵ | لاوازە | بەرزەو زۆر باشە بۆ ئاو کۆکردنەوە بەڵام هەندێك جار میتاڵی هەیە |
| ٢-چەمی ئەبولخانجیر | ٢٣٠ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٢٠٠ م | کەمترلە(١،١٤) | | لاوازە | |
| ٣- چەمی قورنە | ٣٤٣ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٢٠٠ م | کەمترلە(١،١٤) | | لاوازە | |
| ٤- خاسەی کەرکوك | ٤٦٣ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٣٥٠ م | ١،١٦- ٢ | | لاوازە | |
| ٥-چەمی تازە خورماتو | ٧٥٧ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٣٠٠ م | (١،١٦- ٢،٢٩) | | لاوازە | |
| ٦- چەمی لهێب عەبدولعەزیز | ٢٨٠ کم$^{2}$ | ٢٠٠ م | (٠،٥٧- ١،٧١) | | لاوازە | |
| ٧- چەمی باجوان | ٤٩٢ کم$^{2}$ | ٢٥٠- ٤٠٠ م | ١،١٧- ٢ | | لاوازە | |
| ٨- چەمی تەرجیل‌و باشیلاخ | ٦٠٤ کم$^{2}$ | ٥٠٠ م | ١،٠- ٢،٠ | بەختیاری‌و فارسی | بەرزو نزم تا بەرز | بەختیاری زۆر باشە |
| ٩- چەمی خاسەی سەروو | ٤٦٧ کم$^{2}$ | ٤٠٠- ٧٥٠ م | (٢،٢٨- ٢،٥٨) | بەختاری‌و فارسی | بەرزو نزن تا بەرز | فارسی بەڵام فارسی ئاوی میتاڵی هەیە |
| ١٠- چەمی زەیتون | ١١٥٦ کم$^{2}$ | ١٥٠- ٤٠٠ م | ١،١٤- ٢،٠ | فارسی‌و هۆلۆسین | بەرزو نزم نزم | باشە بەڵام ئاوەکەی میتاڵی تێدایە[٣١] |

لە شاخی کەرکوکەوە دەست پێ دەکات، بەرزایی حەوزەکە لەنێوان (٢٥٠- ٤٠٠) مەترە.

ئەم چەمو حەوزانەی باسمانکرد هەموویان دەکەونە خوارەوەی شاری کەرکوکەوە، تەنها دوو حەوز دەکەوێتە سەرەیەوە کە ئەمانەن:-

٨. چەمی (تەرجیل باشبلاخ):

ڕووبەری حەوزەکە بە هەردوو چەمی سەرەکی تەرجیلو باشبلاخەوە دەگاتە (٦٠٤) کیلۆمەتر دووجاو سەرچاوەی هەندێك لە ئاوەکەی شاخی (چەلمانە)، ئەم حەوزە هەندێك شارۆچکەو گوندی بە ئاوبانگی تێدایە لەوانە: قەرەهەنجیر، قەرە حەسەنو بەرزاییەکەی لە (٥٠٠) مەتر زیاتر نییە.

٩- چەمی (خاسەی سەروو):-

ڕووبەری حەوزەکەی (٤٦٣) کیلۆمەتر دووجایەو بەرزایی حەوزەکەی ئاوەکە لەنێوان (٤٠٠- ٧٥٠) مەترەو بە شاری کەرکوکدا دەڕوات.

١٠- چەمی (زەغیتون):-

ڕووبەری حەوزەکەی (١١٥٦) کیلۆمەتر دووجایو زۆربەی سەرچاوەی ئاوەکەی لە چیای حەمرینەوەیەو بە سنووری جیاکەرەوەی دابەشکردنی ئاوی نێوان عوزێمو دیجلە دادەنرێتو بەرزای حەوزەکە لەنێوان (١٥٠- ٤٠٠) مەتر دایە.

* ڕووباری (زێی بچووك):

ئەم ڕووبارە لە زەوییەکانی ئێرانەوە هەڵدەقوڵێت، لە دەوای ئەوەی کە شاری سەردەشتی ئێران بەجێ دەهێڵێت، دەگاتە پارێزگای سلێمانی، لە دوایدا دێتە نێو پارێزگای کەرکوکەوە، لەم پارێزگایەدا گەلێك زەوی کەرکوك دەبڕێت لەبەشی سەرووی ڕۆژهەڵاتی، لە دوایدا ناوچەیەکی دەشتی نێوان گردۆلکەکانی کەرکوکدا دەبڕێت لەبەشی خوارووی پارێزگاکە، کە دەبەسترێتەوە بە ڕووباری (دیجلە)وە لە ناوچەی (فەتحە).

ڕێژەی ئەو ئاوەی کە لە ڕووباری زێی بچووك دەڕژێتە وێستگەی دووبزەوە نزیکەی (٢٢٦) کیلۆمەتر سێ جایە، کە بە ڕێژەی ١٦,٧٪ ئاوی ڕووباری دیجلە پێك دەهێنێت.

ئەم ڕووبارە گرنگیەکی گەورەی هەیە لە وەبەرهێنانی زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی لە ڕۆخی ڕووبارەکەو ئاودێری ناوچەی حەویجە لە پای پرۆژەی ئاودێری حەویجەی کۆن، لە بنەڕەتدا لەسەر خشتەیەکە کە لقێکی لێ دەبێتەوە لە ڕۆخی چەپی زاپ لەو لقەی ڕووباری عەباسی کۆن لە دووری ٥٥ کیلۆمەتر لە ڕووباری دیجلەوە کە دەڕژێتە ناوییەوە.

* ڕووباری (ئاوە سپی):

ئەم ڕووبارە لە ناوەڕاستی قەزای خورماتوو هەڵدەقوڵێتو بەردەوام دەبێت بە شێوەی هاوتەریب لەگەڵ دوو لقی تر تا تێکەڵ بە ڕێچکەی ڕووباری عوزێم دەبێت لە چیای (حەمرین)، ئەم ڕووبارە سەرچاوەکەی لە بەرزاییەکانی سەنگاوە هەڵدەقوڵێت، کە لە هاوینەشدا ئاوی ئەم ڕووبارە بەردەوام دەبێت.

* ڕووباری (کفری):

ئەم ڕووبارە کەوتووەتە نێو قەزاکەوە لە نزیك شارۆچکەی قەرەتەپە دەڕژێتە ڕووباری (تارین)ەوە، کە لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت بەرەو خواروو تا دەڕژێتە ڕووباری (دیالە) وە لە لای چیای (حەمرین).

* ڕووباری (حاجیلە)، (سەیدەلان)، (کولەجۆ):

ئەمەش ڕووباری بچووكو وەرزین بۆ ماوەیەکی کەم ئاویان تێدا هەیە.

* ڕووباری (داقوق):

ڕووباری داقوق بە تەنیشت شارۆچکەی داقوقەوە دەڕوات کە لە بەرزاییەکانی (قەرە حەسەنەوە) هەڵدەقوڵێت، هاوتەریب لەگەڵ لقێکی سەرووی ڕووباری خاسە، کە لەگەڵ ڕێچکەی ڕووباری سەرەکی (عوزێم) تێکەڵ دەبێت دوای ئەوەی چیای (حەمرین) دەبڕێت، ئاودێری زەویو زارەکانی شارۆچکەی داقوق دەکات بە شێوەیەکی ئابووری، بە تایبەتی لە بەرووبوومی مزرەمەنیو بێستان لە هەریەکە لە تازەخورماتوودا.

* ڕووباری (عوزێم):

یەکێکە لە لقەکانی ڕووباری (دیجلە) کە بایەخێکی کەمی هەیە لەبەر ئەوەی ڕووبارێکی وەرزییە کە لە وەرزی هاویندا ووشکی کردووە، ئەم ڕووبارە پێکهاتووە لە چەند شیوێك کە لافاوی ئاوەکە لە چیای قەرەداغەوە هاتووە، دروستی کردووە. ڕێژەی ئاو لەم ڕووبارە لەنێوان (٤٠٠- ٥٠٠) مەتر سێ جایە، لە وەرزی هاوینە بەڵام لقەکانی کە دەڕژێتە ناوییەوە بریتییە لە: (ڕووباری خاسە، ڕووباری داقوق، ڕووباری ئاوەسپی).


پێکهاتەی
چینە جیۆلۆجییەکانی
پارێزگای کەرکوک
پارێزگای هەولێر
پارێزگای سلێمانی
پارێزگای نەینەوا
پارێزگای سەلاحەددین
پارێزگای دیالە
دوکان
دوبز
کەرکوک
چەمچەماڵ
حەویجە
خورماتوو
کفری
کەلار
دەربەندیخان
نیشتووی لافاوەکان
تیکەڵاوی بلاپستۆسین
نیشتووی جۆراوجۆر
پارچە نیشتووی رووبارەکان
پێکهاتەی بەختیاری سەروو
پێکهاتەی بەختیاری خواروو
پێکهاتەی فارسی سەرەوە
پێکهاتەی فارسی خوارەوە
پێکهاتەی بیلاسپی
درزە هەڵگەڕاوەکان


شوێنی کەرکوك لە پێکهاتەی چینە جیۆلۆجییەکانی عیراقدا
تورکیا
سوریا
ئێران
سعودیە
کوەیت
موسل
کەرکوك
کفری
عانە
سامەرا
بەعقوبە
بەغدا
روتبە
کوت
نخیب
ناسریە
قورنە
بەسرە
فاو
چینی بلیستۆسینی نوێ
چینەکانی پلایۆسین
چینەکانی مایۆسینی ژێرەوە
چینەکانی ئۆلیگۆسین
چینەکانی ئایۆسین
چینەکانی کریتاشۆس
چینەکانی جوراسك
چینەکانی چیای سنام
چینەکانی بەردە گۆڕاو و بورکانییەکان
ئەو شوێنانەی بەردەکانی پۆلێن نەکراوە

* سەرچاوەو پەراوێزەكانی:
١. گۆڤاری (زانیاری)، ساڵی ١٩٧١ ساڵی یەكەم، ژمارە (٢)، چاپخانەی دار السلام، لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی (گۆڕانی شێوەی جیۆلۆجی لە كوردستانی عێراقدا)، نووسینی (غەفور عەزین) لاپەرە (٧٣، ٧٤، ٧٥).
هەروەها بۆ زانیاری تەواو بڕوانە:
- (العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية)، دكتۆر شاكر خەسباك، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ساڵی ١٩٧٣ لاپەرە (١١).
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١).
٣. گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٢) ساڵی (١٩٧١) لاپەرە (٧) لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی (گڵی كوردستان و گیروگرفتی) نووسینی دكتۆر (تاریق عەماری)، لاپەرە (٧).
٤. گۆڤاری (زانیاری)، ژمارەو (٢) ساڵی ١٩٧١ لاپەرە (٧٦ - ٧٧) هەمان سەرچاوەی پێشووی پەراوێزی یەكەم.
٥. گۆڤاری (زانیاری) ژمارە (٢)، ساڵی (١٩٧١) لاپەرە (٧) هەمان لێكۆڵینەوەی پەراوێزی ژمارە (٣).
٦. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩). هەروەها بۆ زانیاری پێویست بڕوانە: (دليل جمهورية العراقية)، لێكۆڵینەوەیەكە لەسەر (تطور العراق الجيولوجي)، لاپەرە (٦٦).
٧. (دليل الجمهورية العراقية)، لاپەرە (٦٦، ٦٧).
٨. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٩).
٩. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٨).
١٠. (دليل الجمهورية العراقية)، لاپەرە (٦٦ - ٦٧)
١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٦).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو،
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو،
١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو،
١٥. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٥).
١٦. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١١٤ - ١١٥)
١٧. (قضاء الحويجة المركز، دراسة انثروبوجية اجتماعية)، د. خالد فەرج ئەلجابری، لاپەرە (٢٩).
١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٠)
١٩. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، ژمارە (١) ئەیلولی (١٩٩٨)، لاپەرە(١٤٠ - ١٤١ -١٤٢). لێكۆڵینەوەیەكە بەناونیشانی:- (الأمن القومي الكوردي لأراضي محافظة كركوك الزراعية) نووسینی (محەمەد عەبدوڵلا عومەر). هەروەها بڕوانە سەرچاوەی (العراق الشمالي) هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (٤٠ - ٤١).
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٤).
٢١. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (١٤٢).
٢٢. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، لاپەرە (١٤٢)
٢٣. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، لاپەرە (١٤٢).
٢٤. (العراق الشمالي)، لاپەرە (٤٤).
٢٥. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، لاپەرە (١٤٣).
٢٦. گۆڤاری (هاواری كەركوك)، لاپەرە (١٤٤).
٢٧. (پاراستنی ئاوو خاك لە هەردوو چەمی خاسەو زەغیتون)، د. ناهیدە تاڵەبانی، كەركوك ژمارە ٦، ساڵی دووەم، ٢٠٠٠. لاپەرە ١١٨.
٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١١٩- ١٢٠.
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٢٠.
٣٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەی ١٢٢.
٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٢٢- ١٢٣.

*** ئاوو هەوای پارێزگای کەرکوك:**

ئاو هەوای پارێزگاکەش لەگەڵ گۆڕانکارییە جیۆلۆجییەکاندا کارتێکردن و گۆڕانکاری خۆی هەبووە، بۆیە شانبەشانی چاخە جیۆلۆجییەکان هەریەکە لەپلەی گەرما و شێ و هەوا و پاڵە پەستۆ، هێڵی بەیانی ئاوو هەواکەیان دیاریکردووە. ((چاخی جیۆلۆجی بەناو (پلاستوسینی)، نوێترین بەشی مێژوویی گۆی زەویمانە، کە هاوچەرخە لەگەڵ ڕوودانی ماوە بەستەڵەکییەکان، کەپێی دەوترێت چاخی بەستەڵەکی. چاخی بەستەڵەکی زیاتر لەنیو ملیۆن ساڵ دەبێت دەستی پێکردووەو، کۆتایی هاتووە لەپێش بیست هەزار ساڵ، ئەم چاخە بەچوار لەرە (ذبذبة) بەستەڵەکی دا ڕەتبووە، کە لەنێوانیاندا سێ ماوەی بارانی تا ڕادەیەك گەرم ڕوویداوە.))[1] بۆیە دەبینین لەدوایی کۆتایی چاخە بەستەڵەکەکەدا ئاوو هەوا گۆڕانی بەسەردا هاتووەو ژیانی مرۆڤایەتی بوژانەوەی بەخۆیەوە دیوەو کەوتووەتە جووڵەو کارکردن و بنیاتنانی شارستانی هەروەها هاتنە گەڕی چاخێکی ترکە ئەم چاخەی ئەم سەردەمەی ئێستامانە بەناوبانگە بەچاخی (ئەیۆسین)، ناوچەی کەرکوك بەشێکی گرنگی ئەو شارستانییەتەی پێکەوە ناوە لە گۆڕانکاری ئەو جێگۆڕکێی ئاوو هەوایەدا. بووەتە دروستبوونی شارستانییەتی گرنگی گونجاوی ئەو ئاوو هەوایە.

ئەگەر سەیری ئاو هەوای ئێستای کوردستان بکەین دەبینین کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی ((ئەو هەوا شێ دارەی کەدێت لەدەریای سپی ناوەڕاستەوە))[2]. بۆیە ئەگەر سەیری ئاو هەوای پارێزگاری کەرکوك بکەین دەبینین ئاوو هەواکەی لەنێوان ئاوو هەوای دەریای ناوەڕاست و ئاوو هەوای بیابانی دایە کە ناوچەیەکی ئاو و هەوای گواسترایەوە لەنێوان دەریای ناوەڕاست و ئاو هەوای بیابانیدا..))[3]، خۆی بەشێکی زۆری ئاوو هەواکەی ئاوو هەوای (ئەستەبسە) (استبس)[4]، لەبەر ئەوە دەبینین ئاوو هەواکەی جێگیر نییە، لەساڵێکەوە بۆ ساڵێك، لەوەرزێکەوە بۆ وەرزێك جیاوازی دەبێت لەنێوان مانگەکاندا[5]، بەشەکانی سەروو ڕۆژهەڵات کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی ئاوو هەوایی دەریای ناوەڕاست، بەڵام بەشەکانی خواروو ڕۆژئاوای کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی ئاوو هەوای بیابانی.

((ئاوو هەواکەی ووشك و سەلامەتەو هەواکەی پاك و سازگارەو گەرمای لەهاویندا دەگاتە (٤٥)پلە، هەندێك جار سەرماکەی تووندو تیژ دەبێت))[6] بەڵام بەشێوەیەکی گشتی مام ناوەندییە.

((ناوچەکانی قەزای حەویجە بۆ نموونە کەوتووەتە نێو ئاووهەوای ئەستەبسەوە، کە ئاوو هەوایەکی گوێزراوەیە لەنێوان ئاو و هەوای دەریای ناوەڕاست و ئاوو هەوای بیابانی..))[7].

*** باران:-**

ئاو و هەواکەی بەشێوەیەکی گشتی مام ناوەندییە چونکە وەرزەکانی زستانی بەشێوەیەکی ئاسایی دەڕوات و ڕێژەی باران بارینەکەی لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێك دەگۆڕێت، بارینی بەفر بەڕێژەیەکی زۆر کەم دەبارێت وا ڕێ دەکەوێت کە لەچەند ساڵێکدا تاوێك دەبارێت، ئەمەش زۆری ناوچەکان دەگرێتەوە.

ڕێژەی باران بارینی لەنێوان ساڵانی (١٩٣٨ – ١٩٦٠) دا (٣٨٥,٢) ملیمەتر[8] کە لە ساڵانی (١٩٦٠)دا (٣٢٤,٤) ملیمەتر بووە، ڕێژەی باران بارینی لەنێوان (١٩٦٨ – ١٩٧٠) دا (٣٩٧) ملیمەتر[9] بووە. بۆیە دەبینین لای ڕۆژهەڵاتی پارێزگاکە ڕێژەی باران بارینی لەنێوان (٤٠٠ – ٦٠٠) ملیمەترە لەساڵێکدا کە دەکاتە ناوچەکانی چەمچەماڵ و تەکیەو قەرەهەنجیرە، گەلێك ساڵ بەفریشی لێ دەبارێت. بەڵام ناوچەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاواو سەروو خوارووی پارێزگاکە لەنێوان (٢٠٠ – ٤٠٠) ملیمەتردایە لەساڵێکدا..[10]، ئەم ناوچانە زیاتر پشت بە ئاودێری دەبەستن لە بەرهەمهێنانی بەروبومی کشتوکاڵیدا. بۆ نموونە ئەگەر سەیری قەزای حەویجە بکەین لەڕووی بارنبارینەوە لەنێوان (٢٠٠ – ٣٠٠) ملیمەتردایە لەماوەی ساڵێکدا ((کە لە ساڵی (١٩٨٧)دا ڕێژەی باران بارینی ئەو ساڵە (٢٦٤,٢) ملیمەتر بووە، کەبەرزترین پلەی باران بارینی لەمانگی ئازاردا (٤٦,٨) ملیمەتر بووە لەمانگی شوباتدا (٤٢,٩) ملیمەتر بووە..))[11]. دەبینین ڕێژەی باران بارین لەقەزای (حەویجە) لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێك دەگۆڕێت، ئەمەش کارێکی زۆر دەکاتە سەر بەروبوومی کشتوکاڵی..))[12].

((ئەگەر سەیری پلەی مام ناوەندی باران بکەین لەپارێزگاری کەرکوك لەگەڵ شارەکانی تری کوردستاندا (٣٨٥,٢) ملیمەترە، لەنێوان ڕێژەی ناوەندی بارانی کوردستان کە (٣٨٠ – ٥٠٠) ملیمەترە، ئەمە ئەو دەگەیەنێت کە ڕێژەی ناوەندی باران بارینەکەی مام ناوەندییە لەسەر ئاستی کوردستان..))[13].

لەبەر ئەوە سەیر دەکەین زستان و بەهارو هاوینی بەشێوەیەکی ڕوون بەدەردەکەوێت.. ئەو مانگانەی ووشکە بارانە بریتییە لە مانگەکانی حوزەیران و تەموزو ئاب و ئەیلول و ئەو مانگانەی بارانی تێدا دەبارێت مانگەکانی کانوونی یەکەم و کانوونی دووەم و شوبات و ئادارو نیسانە[14].

مانگەکانی حوزەیران و تەمموزو ئاب و ئەیلول بە هیچ جۆرێك بارانی تێدا نابارێت و ئەگەر ببارێت زیان بە بەروبومی کشتوکاڵی دەدات لەجیاتی ئەوەی سوودی هەبێت. ((بڕوانە خشتەی ژمارە (١)، (٢)، (٣)، (٤) )).

**خشتەی ژمارە (١)**
**پلەی ناوەندی بارانی ساڵێك**

| زنجیرە | شار | پلەی ناوەندی باران |
|---|---|---|
| ١ | مالاتیا | ٤٤٠ ملیمەتر |
| ٢ | وان | ٣٨٠ ملیمەتر |
| ٣ | ئۆرفە | ٤٤٠ ملیمەتر |
| ٤ | دیاربەکر | ٤٧٠ ملیمەتر |
| ٥ | سنە | ٥٠٠ ملیمەتر |
| ٦ | کرماشان | ٤٨٩ ملیمەتر |
| ٧ | کەرکوك | ٣٨٥,٢ ملیمەتر |
| ٨ | خانەقین | ٣٨٥,٢ ملیمەتر |

**خشتەی ژمارە (٢)**
**ڕێژەی باران بارینی مانگێك لەنێوان ساڵانی (١٩٣٨ - ١٩٦٠)**

| زنجیرە | مانگەکان | تێکرای (١٩٣٨ - ١٩٦٠) | ١٩٦٠ |
|---|---|---|---|
| ١ | کانوونی دووەم | ٦١,٧ | ٦٨,٦ |
| ٢ | شوبات | ٧٠,٦ | ١٣,٧ |
| ٣ | مارت | ٨٥,٦ | ٤٤,٢ |
| ٤ | نیسان | ٤٨,٨ | ٣٥,١ |
| ٥ | مایس | ٩,٤ | ٦,٣ |
| ٦ | حوزەیران | ٠,٢ | ٠ |
| ٧ | تەموز | ٠ | ٠ |
| ٨ | ئاب | Tr. | ٠ |
| ٩ | ئەیلول | ٠,٨ | ٠ |
| ١٠ | تشرینی یەکەم | ٣,٧ | Tr. |
| ١١ | تشرینی دووەم | ٣٦,٣ | ١٣٧,١ |
| ١٢ | کانونی یەکەم | ٣٨,٦ | ٢٤,٤ |
| | کۆی گشتی: | ٣٨٥,٢ | ٣٢٤,٤ |

**خشتەی ژمارە (٣)**
**ڕێژەی باران بارینی ساڵانە بەمیلیمەتر**

| زنجیرە | شار | ناوەندی باران بارین | ماوەی پێوانە بەساڵ |
|---|---|---|---|
| ١ | کەرکوك | ٣٧٤,٤ ملیمەتر | ٣٠ ساڵ |
| ٢ | حەویجە | ٢٥٨,٣ ملیمەتر | (٢٦-٢٨)ساڵ |

**خشتەی ژمارە (٤)**
**ڕێژەی مانگانەی ڕۆژە بارانا وییەکان**
**لەنێوانی ساڵانی (١٩٣٥ - ١٩٦٠)[١٨]**

| کانوونی دووەم | شوبات | مارت | نیسان | مایس | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١١,٥ | ١١,٣ | ١٢,٦ | ١٠,٦ | ٥,٩ | ٤,٩ | ٨,٦ | ٩,٧ | ٥٧,١ |

هەروەها (دینیس) لەو لیستەیەدا کە دەربارەی ڕێژەی باران بارینی کەرکوکی پێوانە کردووە لەماوەی چواردە ساڵدا بە (٣٧١) ملیمەتر، کەنزمترین تێکرای بە (٢٦٥) ملیمەترو بەرزترین تێکرای بە (٦٥٧) ملیمەتر پێوانە کردووە...)[١٩] .

*** نموونەی چەند باران بارینێکی پارێزگاری کەرکوك:-**

لە ساڵی (٦٤٦) کۆچی (١٢٤٦) زاینییدا بارانێکی زۆر باریوە لە موسڵو کەرکوك دا... کەدێییەکی زۆری خستۆتە ژێرەوە کە بووەتە هۆی ڕووخاندی قەڵای (کەرخینی) لەکەرکوك...[٢٠].

لە ساڵی (١١٧٨) کۆچی (١٧٧٥) زاینیی، بارانێکی زۆر... زۆر باریوە لەکەرکوك[٢١].

لە ساڵی (١٩٠١) دا بەفرێکی زۆر باریوە لەسەرتاپای عێراقو کەرکوکدا.

لە ساڵی (١٩١٣) دا بەرفرێکی زۆر باریوە[٢٢].

(لەڕۆژی (١/٣/١٩٥٣) دا بەڕێژەی (٩٧,٦) ملیمەتر باران باری کە ئەمە گەورەترین ڕێژە بوو لەسەرتاپای عێراقدا هەروەها لە کەرکوکدا)[٢٣].

## ڕێژەی باران بارین لە ساڵی ١٩٩٥

| مانگ | گردۆلکەکانی کەرکوک | باران بارین | شێی ڕێژەیی | بەهەڵمبوون | خێرایی با | دەشتایی حەویجە | باران بارین | شێی ڕێژەیی | بەهەڵمبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کانوونی یەکەم | | ٥٩ | ٧٠ | ٦,٣ | ٠,٩ | | ٥٠,٨ | ٧٠ | ٩,١ |
| شوبات | | ٦٥,٣ | ٦٢ | ٨,٨ | ١,٤ | | ٤٨,٣ | ٦٢ | ١٢,٥ |
| ئادار | | ٧٢,٣ | ٥٥ | ٢٣,٦ | ١,٥ | | ٣٠,٠ | ٥٥ | ٣٠,٠ |
| نیسان | | ٤٩,٧ | ٥٠ | ٦٢,٠ * | ١,٨ | | ٣٠,٥ | ٤٥ | ٥٦,٠ |
| مایس | | ١٧,٦ | ٣٢ | ١٧٤,٠ | ٢,١ | | - | ٣٠ | ١٢٣ |
| حوزەیران | | ٠,٣ | ١٨ | ٢٧٨ | ١,٩ | | - | ١٦ | ٢١٤ |
| تەمموز | | - | ١٧ | ٢٥٩,٣ | ١,٩ | | - | ١٥ | ٢٧٠ |
| ئاب | | - | ١٧ | ٣٢٦,٠ | ١,٨ | | - | ١٥ | ٢٤٤ |
| ئەیلول | | ٠,٣ | ٢٠ | ٢٠٢,٥ | ١,٤ | | - | ٢٠ | ١٥٣ |
| تشرینی یەکەم | | ٧,١ | ٣٠ | ١٠٠,٨ | ١,٥ | | ٥,١ | ٣٠ | ٧٤,٣ |
| تشرینی دووەم | | ٣٩,٣ | ٥٥ | ٣٢,٣ | ١,٢ | | ٧,١ | ٥٥ | ٣٣,٤ |
| کانوونی یەکەم | | ٥٩,١ | ٧٠ | ٩,٧ | ١,٠ | | ٢٥,٤ | ٧٠ | ١٠,٨ |
| ڕێژە | | ٣٧٠ | ٤١,٤ | ١٥٨٣ | ١,٥ | | ١٩٧,٤ | ٤٠,٣ | ١٢٣٠ |

## ڕێژەی باران بارین لە ساڵی ٢٠٠٠ لە پارێزگای کەرکوک

| کانوونی یەکەم | شوبات | ئادار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەمموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦٢ | ٦٦ | ٦٣ | ٥٢ | ١٧ | ٠,١٥ | ٠ | ٠,١ | ٠,٤ | ١٠ | ٣٩ | ٥٩ |

**پلەی گەرما :-**

((.. لەزستاندا پلەی گەرما بەتێکرا لەناوچەکانی کوردستاندا دێتە خوارێ‌و سارد دەبێت. زستانی لەهەموو کاتێك درێژترەو هاوینی تارادەیەك کورت‌و خۆشەو ساردترین ڕۆژانی زستانی لەمانگی ڕێبەندان (کانوونی دووەم)دایەو گەرمترین ڕۆژانی هاوینی لە مانگی خەرمانان (تەموز) دایە..))[٢٤].

ئەگەر سەیری پارێزگای کەرکوك بکەین کە پلەی گەرماکەی بە شێوەیەکی گشتی وەکو پلەی گەرمای کوردستانە کە سەرماکەی ناگاتە پلەی بەستن لە چەند کاتێکی کەم نەبێت گەرماکەشی لە هاویندا لەناوچەکانی تری کوردستان گەرمترە.

((دەبینین ڕێژەی نزمترین پلەی گەرمای لە مانگی کانوونی دووەمدا لەنێوان (٢° - ٤°) پلەی سەدی دایە کە زیاتر ناوچەکانی سەروو ڕۆژهەڵاتییەتی بەڵام ناوچەکانی ناوەڕاست‌و خواروی لەنێوان (٣° - ٦°) پلەی سەدییە.

هەروەها ڕێژەی نزمترین پلەی گەرمای لەمانگی تەموزدا لە ناوچەکانی ناوەڕاست‌و خوارووی پارێزگاکە لەسەر (٢٦°) ی سەدی دایە بەڵام سەرووی پارێزگاکە لەنێوان (٢٤° - ٢٦°) پلەی سەدیدایە.

ڕێژەی بەرزترین پلەی گەرما لەمانگی کانوونی دووەمدا لەنێوان (١٢° - ١٤°) پلەی سەدیدایە، بەرزترین ڕێژەی پلەی گەرمای لەمانگی تەموزدا لەناوچەکانی سەروو ڕۆژهەڵات‌و ناوەڕاستی پارێزگاکە لەنێوان (٤٢° - ٤٤°) پلەی سەدیدایە، بەڵام ناوچەکانی خواروو ڕۆژئاوای لەسەر (٤٤°) پلەی سەدییەوەیە. لەبەر ئەوە سەیر دەکەین پلەی ناوەندی گەرما لە مانگی (پوشپەڕدا) لەشاری کەرکوك (٤١,٨) پلەیە کە ئەگەر لەسەر ئاستی کوردستاندا بەراوردی بکەین مام ناوەندییە، پلەی ناوەندی گەرما لەمانگی (بەفرانبار)دا (١٢°) پلەیە.

تێکرای گەرمای لە ڕێبەنداندا (٤١,٨) پلەی سەدییە کە تێکرای گەرمای لە (خەرماناندا) (٢,٥) پلەی سەدییە))[٢٦].

تێکرای پلەی گەرما لەشاری کەرکوك لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٨ - ١٩٧٢)دا (٢٢°) پلەیەو گەرمترین مانگەکانی گەرما لەتەموزو ئاب دایە کە تێکرای پلەی گەرما لەنێوان ئەم دوو مانگەدا (٤٨°) پلەیە، ساردترین مانگ بریتییە لە مانگەکانی کانوونی دووەم‌و شوبات، کەتێکرای پلەی گەرما لەم دوومانگەدا (١٥°) پلەیە، جیاوازی تێکرای نێوان ئەم دوو پلە گەرمایە (٢°) پلەیە[٢٧].

بەڵام ناوەندی پلەی گەرما لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠ - ١٩٧٣) لەنێوان ١٣,٠٩ - ٢٠,٣) پلەدایە کە تێکرای ناوەندی نێوان ئەم ساڵانە نزیکەی (١٥) پلە دەبێت[٢٨].

هەروەها بڕوانە ناوەندی بەرزترین‌و نزمترین پلەی گەرما لەنێوان ساڵانی (١٩٤٠ - ١٩٧٠) لەپارێزگاری کەرکوك بەپلەی سەدی بەپێی دابەشبوونی مانگەکان لەپارێزگاکەدا.

((بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە خشتەکانی ژمارە ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠ ))

**خشتەی ژمارە (٥)**

**تێکرای پلەی گەرماو ناوەندی پلەی گەرما لەسەر ئاستی کوردستان**

| زنجیرە | شار | پلەی ناوەندی گەرما لە پوشپەڕدا | پلەی ناوەندی گەرما لە بەفرانباردا | تێکرای گەرما لە خەرماناندا | تێکرای گەرما لە ڕێبەنداندا |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مالاتیا | ٢٦,٥ | ١,٥ | ١,٥ | ٢٦,٥ |
| ٢ | وان | ٢٢,٥ | ٣,٥ | ٢,٥ | ٢٢,٥ |
| ٣ | ئۆرفە | ٣٢ | ٤,٥ | – | – |
| ٤ | دیاربەکر | ٣١ | ٢,٥ | ٢,٥ | ٣١ |
| ٥ | سنە | ٣٥ | ١٥ | ١٥ | ٣٥ |
| ٦ | کرماشان | ٣٧,٥ | ١٠ – ١٥ | – | – |
| ٧ | کەرکوك | ١٤,٨ | ١٢ | ١٨ | ٤٣ |
| ٨ | خانەقین | ٤٣ | ١٤,٥ | ٢,٥ | ٤١,٨ |

**خشتەی ژمارە (٦)**
**ناوەندی پلەی گەرما**
**لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠ - ١٩٧٣)[٣١]**

| زنجیرە | ساڵەکان | ناوەندی پلەی گەرما |
|---|---|---|
| ١ | ١٩٥٠ | ١٤,٥ |
| ٢ | ١٩٥١ | ١٤,٨ |
| ٣ | ١٩٥٢ | ١٥,٠ |
| ٤ | ١٩٥٣ | ١٥,٩ |
| ٥ | ١٩٥٤ | ١٨,٩ |
| ٦ | ١٩٥٥ | ١٥,٦ |
| ٧ | ١٩٥٦ | ١٦,٨ |
| ٨ | ١٩٥٧ | ١٥,٢ |
| ٩ | ١٩٥٨ | ٢٠,٣ |
| ١٠ | ١٩٥٩ | ١٥,٦ |
| ١١ | ١٩٦٠ | ١٦,٣ |
| ١٢ | ١٩٦١ | ١٨,٧ |
| ٣١ | ١٩٦٢ | ١٤,٤ |
| ١٤ | ١٩٦٣ | ١٦,٦ |
| ١٥ | ١٩٦٤ | ١٥,٩ |
| ١٦ | ١٩٦٥ | ١٥,٧ |
| ١٧ | ١٩٦٦ | ١٥,٤ |
| ١٨ | ١٩٦٧ | ١٥,٨ |
| ١٩ | ١٩٦٨ | ١٥,٨ |
| ٢٠ | ١٩٦٩ | ١٦,٣ |
| ٢١ | ١٩٧٠ | ١٣,٩ |
| ٢٢ | ١٩٧١ | ١٥,٨ |
| ٢٣ | ١٩٧٢ | ١٦,١ |
| ٢٤ | ١٩٧٣ | ١٦,٠ |

**خشتەی ژمارە (٧)**
**ناوەندی بەرزترین و نزمترین پلەی گەرما**
**لەنێوانی ساڵانی (١٩٤٠ - ١٩٧٠)**

| مانگەکان | بەرزترین | نزمترین |
|---|---|---|
| کانوونی دووەم | ١٣,٧ | ٤,٥ |
| شوبات | ١٥,٥ | ٥,٥ |
| مارت | ١٩,٣ | ٨,٥ |
| نیسان | ٢٥,٥ | ١٣,٠ |
| مایس | ٢٣,٩ | ١٨,٠ |
| حوزەیران | ٣٩,٩ | ٢٣,٠ |
| تەمموز | ٤٢,٨ | ٢٦,٧ |
| ئاب | ٤٢,٥ | ٢٦,٥ |
| ئەیلول | ٣٨,٣ | ٢٢,٤ |
| تشرینی یەکەم | ٣١,٦ | ١٧,٢ |
| تشرینی دووەم | ٢٣,٠ | ١١,٣ |
| کانوونی یەکەم | ١٦,١ | ٦,٨ |

**خشتەی ژمارە (٨)**

**تێکڕای پلەی گەرمای بەرزو نزم و بەرزترین پلەی گەرما**

**لەنێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٢)[٣٣]**

| ز | ساڵ | تێکڕای پلەی بەرزی گەرما | تێکڕای پلەی گەرمای نزم | بەرزترین پلەی گەرما لە مێژوودا | نزمترین پلەی گەرما لە مێژوودا | تێکڕای پلەی گەرما |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٦٨ | ٢٩,٧ | ١٥,٧ | ٤٨ لە ٢٤ی تەمووز | ٠,٣لە ١٩ی حوزەیران | ٢١,٩ |
| ٢ | ١٩٦٩ | ٢٨,٦ | ١٦,٢ | ٤٨,٢ لە ٢٠ی ئاب | ٦,٠لە٣ ی شوبات | ٢٢,٣ |
| ٣ | ١٩٧٠ | ٢٩,٥ | ١٦,٦ | ٤٧,١ لە١٢ی تەمموز | ٠,٠ لە ١٤ی کانونی یەکەم | ٢٢,٨ |
| ٤ | ١٩٧١ | ٢٨,٤ | ١٥,٨ | ٤٥,٤ لە ٢٥ی تەمموز | ٢,٣ لە ٤ ی شوبات | ٢٢,١ |
| ٥ | ١٩٧٢ | ٢٧,٥ | ١٥,٢ | ٤٧,٠ لە ٨ی ئاب | ١,١لە ٢٠ی حوزەیران | ٢١,٣ |

**خشتەی ژمارە (٩)**

**تێکڕای ڕۆژانەی بەرزترین و نزمترین پلەی گەرما بە پێی مانگەکانی**

**لەنێوان ساڵانی (١٩٣٨ - ١٩٦٠)[٣٤]**

| ز | مانگەکان | تێکڕای ناوەندلای هەردووکی | | تێکڕای ڕێژەی نزم | | تێکڕای ڕێژەی بەرز | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٦٠-٣٨ | ١٩٦٠ | ٦٠-٣٨ | ١٩٦٠ | ٦٠-٣٨ | ١٩٦٠ |
| ١ | کانونی دووەم | ٨,٦ | ١٠,٥ | ٣,٩ | ٥,٣ | ١٣,٢ | ١٥,٦ |
| ٢ | شوبات | ١٠,٥ | ١٣,٤ | ٥,٠١ | ٧,٩ | ١٥,١ | ١٨,٩ |
| ٣ | مارت | ١٢,٩ | ١٤,٠ | ٧,٣ | | ١٨,٥ | ١٩,٥ |
| ٤ | نیسان | ١٨,٩ | ٢٠,٠ | ١٢,٣ | ١٤,١ | ٢٥,٤ | ٢٥,٩ |
| ٥ | مایس | ٢٦,٠ | ٢٨,٤ | ١٨,٤ | ٢١,٢ | ٣٣,٥ | ٣٥,٦ |
| ٦ | حوزەیران | ٣١,٣ | ٣١,٤ | ٢٣ | ٢٣,٧ | ٣٩,٣ | ٣٩,١ |
| ٧ | تەموز | ٣٤,٦ | ٣٥,١ | ٢٦,٤ | ٢٧,٧ | ٤٢,٧ | ٤٢,٤ |
| ٨ | ئاب | ٣٤,٢ | ٣٢,٨ | ٢٦,٠ | ٢٥,٩ | ٤٢,٣ | ٤١,٧ |
| ٩ | ئەیلول | ٣٠,٤ | ٣١,٣ | ٢٢,٠ | ٢٣,٣ | ٣٨,٧ | ٣٩ |
| ١٠ | تشرینی یەکەم | ٢٤,٢ | ٢٤,٩ | ١٧,٠ | ١٦,٨ | ٣١,٤ | ٣٣,٠ |
| ١١ | تشرینی دووەم | ١٦,٩ | ١٧,٢ | ١١,٢ | ١٢ | ٢٢,٧ | ٢٣,٣ |
| ١٢ | کانوونی یەکەم | ١٠,٨ | ١٢,٨ | ٥,٩ | ٦,٦ | ١٥,٦ | ١٩,٠ |
| تێکڕای ساڵانە | | ٢١,٦ | ٢٢,٧ | ١٤,٩ | ١٦,١ | ٢٨,٢ | ٢٩,٤ |

**خشتەی ژمارە (١٠)**
**تێکڕای مانگانەی پلەی گەرما بە پێوانەی سەدی**

| ز | مانگەکان | کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ تێکڕا | | کاتژمێر نۆی پاش نیوەڕۆ تێکڕا | | | | کاتژمێر شەشی پاش نیوەڕۆ تێکڕا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | ٦٠-٣٨ | ١٩٦٠ | ٦٠-٣٨ | ١٩٦٠ | ٦٠-٣٨ | | ١٩٦٠ |
| ١ | کانونی دووەم | ١٢,٠ | ١٤,٧ | ٧,٥ | ٨,٩ | ٥,٣ | | ٦,٦ |
| ٢ | شوبات | ١٤,٢ | ١٨,٢ | ٩,٩ | ١٢,١ | ٦,٥ | | ٨,٩ |
| ٣ | مارت | ٧,٤ | ١٨,٢ | ١٣,٢ | ١٤,٤ | ٨,٩ | | ٩,٥ |
| ٤ | نیسان | ٢٤,٢ | ٢٤,٣ | ١٩,٨ | ١٩,٨ | ٢٠,٧ | | ١٥,٤ |
| ٥ | مایس | ٣٢,٣ | ٣٤,٤ | ٢٧,٨ | ٣٠,٤ | ٢٠,٣ | | ٢٢,٨ |
| ٦ | حوزەیران | ٣٨,٤ | ٣٧,٧ | ٣٣,٧ | ٣٣,٠ | ٢٥,٤ | | ٢٥,٥ |
| ٧ | تەموز | ٤١,٨ | ٤١,٤ | ٣٦,١ | ٣٥,٨ | ٢٨,١ | | ٢٩,٠ |
| ٨ | ئاب | ٤١,٥ | ٤٠,٩ | ٣٥,٦ | ٣٤,٥ | ٢٧,٧ | | ٢٦,٨ |
| ٩ | ئەیلول | ٣٧,٥ | ٢٨,٢ | ٣١,٥ | ٣٢,٧ | ٢٣,٦ | | ٢٤,٢ |
| ١٠ | تشرینی یەکەم | ٣٠,٤ | ٣٢,٠ | ٢٤,٩ | ٢٥,٣ | ١٧,٦ | | ١٧,٧ |
| ١١ | تشرینی دووەم | ٢١,٦ | ٢١,١ | ١٦,٩ | ١٦,٩ | ١٢,٥ | | ١٣,٣ |
| ١٢ | کانوونی یەکەم | ١٤,٣ | ١٧,٥ | ١٠,٠ | ١١,٩ | ٧,٤ | | ٨,٤ |
| تێکڕای ساڵانە | | ٢٧,١ | ٢٨,٢ | ٢٢,٣ | ٢٣,١ | ١٥,٥ | | ١٧,٣ |

**هەروەها لە کۆمەڵەی ئاماری ساڵانەی (١٩٦٠)دا بەم جۆرە باسی پلەی گەرما لە پارێزگاکەدا دەکات:-**
**پلەی گەرمای پارێزگاکە لەسەر تێکراوەیە بەرێژەیەك کە لەنێوان (٠,١ - ٢,٩) پلەی سەدییە، لەهەموو مانگەکەدا تەنها لە (ئاب)دا نەبێت کە پلەی گەرمای لەژێر تێکراوەیە بەرێژەی (٠,٤) پلەی سەدی.. بەرزترین پلەی گەرما لە ساڵی (١٩٤٠/٧/٢٣) دا بریتی بووە لە (٤٧,٨) پلەی سەدی، نزمترین پلەی گەرما (٦,٧) پلەی سەدی بووە لەژێر سفرەوە بەمێژووی (١٩٤٧/١/٢٦) و (١٩٤٧/٢/٤).**
**((لە ساڵ (١٩٦٢)دا بەرزترین پلەی گەرما تۆمارکراوە کە (٤٨,٢) پلەی سەدی بووە، نزمترینیان کە تۆمارکراوە لە ساڵی (١٩٤٧)دا لە شوباتدا (٦,٧) پلە لەژێر سفرەوە بووە..))[٣٦].**

### ڕێژەی پلەی گەرما بۆ ساڵی ١٩٩٥

| ناوچە | کانونی یەکەم | شوبات | ئادار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانونی یەکەم | ڕێژە | ماوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گردۆڵکەکانی کەرکوك | | | | | | | | | | | | | | |
| ڕێژە | ٨,٦ | ٩,٨ | ١٤,٧ | ١٩,٨ | ٢٦,٧ | ٣٢,٣ | ٣٥,٤ | ٣٥,٠ | ٢٧,٩ | ٢٤,٧ | ١٦,١ | ١٩,٣ | ٢٢,٥ | ٧١-٨٠ |
| بەرز | ١٢,٧ | ١٥,٨ | ١٩,٨ | ٢٦,٢ | ٣٣,٤ | ٣٩,٣ | ٤٢,٩ | ٤٢,٤ | ٢٨,٨ | ٣١,٥ | ٢٢,٥ | ١٥,٤ | ٢٨,٥ | ٤١-٧٠ |
| نزم | ٤,٥ | ٥,٥ | ٨,٥ | ١٢,٠ | ١٨,٨ | ٢٣,٧ | ٢٦,٧ | ٢٦,٥ | ٢٢,٤ | ١٧,٢ | ١١,٣ | ٦,٥ | ١٥,٤ | ٤١-٧٠ |
| دەشتایی حەویجە | | | | | | | | | | | | | | |
| ڕێژە | ٩ | ١٢ | ١٥ | ٢١ | ٢٧ | ٣٣ | ٣٥ | ٣٤ | ٣١ | ٢٥ | ١٧ | ١١ | ٢٢,٥ | |
| بەرز | ١٥ | ١٧ | ٢١ | ٢٨ | ٣٥ | ٤٠ | ٤٤ | ٤٤ | ٣٩ | ٣٣ | ٢٤ | ١٧ | ٢٩,٨ | |
| نزم | ٣ | ٢ | ٨ | ١٢ | ١٢ | ٢٢ | ٢٢ | ٢٦ | ٢٦ | ١٦ | ١٠ | ٢ | ١٤,٨ | |

### ڕێژەی پلەی گەرمای مانگانە
### لە ساڵی ٢٠٠٠ لە پارێزگای کەرکوك

| کانوونی یەکەم | شوبات | ئادار | نیسان | مایس | حوزەیران | تەموز | ئاب | ئەیلول | تشرینی یەکەم | تشرینی دووەم | کانوونی یەکەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٩,٣ | ١٠,٩ | ١٤,٥ | ١٩,٨ | ٢٦,٥ | ٣١,٧ | ٣٥,٢ | ٣٤,٨ | ٣١ | ٢٤,٧ | ١٦,٩ | ١١ |

کەرکوك بوونیان هەیە، لە هەر یەکە لە (زاخۆ)و (ئەفرۆك) لە کوردستانیش بڵاوبوونەتەوە.
کڵێسەی ئەرمەنی (ئەرسەدۆکس) لە شاری بەسرە هەیە لە ساڵی (١٩٧٠)ی زاینییەوە بنیات نراوە.
ژمارەیەك کڵێسەی ئەرمەن لە شاری بەغدا بوونیان هەیە ئەویش کڵێسەی (قەدیس کرابێت) لە ناوچەی (کەمپ سارە)و کڵێسەی (قلب الأقدس) لە ناوچەی (کرادة الشرقیة)، هەروەها کڵێسەی (گریگۆر، غریغور) بۆ ئەرمەنی (ئەرسەدۆکس) لە ناوچەی (باب الشرقي).
بوونی کڵێسەی ئەرمەن لە ناوچەی (چادریە)و کڵێسەی (سیدة الزهور) بۆ ئەرمەنە کاسۆلیکەکان لە ناوچەی (کرادة) و (مریم عذراء). کە بە کۆنترین کڵێسە دادەنرێت لە شاری بەغدا لە ناوچەی (مەیدانە).
جگە لەو کڵێسانە چەند بنکەیەکی رۆشنبیریی و وەرزشی لە بەغدا هەیە، ئەویش بۆ فێرکردنی زمانی ئەرمەنی بۆ منداڵەکانیان، لە ساڵی (٢٠٠٤) قوتابخانەیەکی ئەرمەنی لە بەغدا کراوەتەوە.
"ژمارەیەك کڵێسەی ئەرمەنی کاسۆلیکی، نزیکەی (٢١٨٠) کەس دەبن کە لەنێوان شارەکانی (بەغدا، بەسرە، سنجار، موسڵ، کەرکوك) بڵاوبوونەتەوە ئەم ئەبرەشیە سێ کاهینی هەیەو دوو کڵێسیەی هەیە هەروەها کڵێسەکانی خۆرهەڵاتی لە سنووری شاری کەرکوك ئەبرەشی هەیەو کڵێسەو کاهێنێکی هەیە".

*** لەسەرەتای عێراقدا گەلێك کەسایەتیی و ناوداری ئەرمەنی لە عێراقدا بوونیان هەبووە وەکو:**
١- فارتان مالاکیان: وێنەکێش بووە ئێستا لە ئەمەریکا دەژێت.
٢- سیتا هاکۆبیان: گۆرانی بێژێکی عێراقی ناسراوە.
٣- شانت کنوریان: نووسەرێکی ئەرمەنییە.
٤- سیلیڤات کاکیان: شاجوانێکی عێراقی لە ساڵی ٢٠٠٦.
٥- یەعوب سەکییس: نووسەرێکی عێراقی.
٦- خیرایر کایایام: وەرزشکارێکی عێراقی، ساڵی ١٩٤٩ یەکەم پاڵەوانی لەش جوانی بووە.
٧- ئارام ئەرمیناك بابوڤیان: موزیك ژەنێکی ناسراوە.
٨- یوسف عەبدولمەسیح: ئەرمینێکی شانۆکارە.
٩- سەعد جۆزیف جاك: یەکەم نوێنەری کڵێسەی ئەرمەنی ئەرسەدۆکس بەراوێژکاری حکومەت لە ساڵی ٢٠٠٤ دامەزرا.
ئەو پیشانەی کە ئەرمەنەکان پێی بە ناوبانگ بوونە دروستکردنی گالیسکە بووە لە عێراقو دواتر لە ناویاندا پیشەی فیتەرچیی و شۆفێریی و ئاڵتوچێتیی و چاککردنەوەی مەکینەو کەرەستە گەورەکان ناوبانگیان دەرکردووە.
سەبارەت بە جیاوازی دابو نەریتی ئەرمەنەکان لەگەڵ مەزهەبەکانی دیکە هیچ جیاوازییەکی نیە، هەموویان رۆژانی یەکشەمە سەردانی کڵێسەکانیان دەکەن بۆ خودا پەرستی لە رووی ژنو ژن خوازیشەوە، جیاوازی نیە لەنێوانیاندا، واتە ئەرمەنی دەتوانێت ئاشووری بخوازێت، بە پێچەوانەشەوە لەگەڵ مەزهەبەکانی تری مەسیحی لە کاتی رێورەسمی پرسەو مردوو ناشتندا، دوای شۆرینی دەبرێتە کڵێسەو لەلایەن قەشەوە نزای بۆ دەخوێنرێت، بەرەو گۆرستان دەبرێو لەوێ بە تابووتەکەیەوە بە خاك دەسپێردرێت، دیسان لەوێش دوعاو نزای تری بۆ دەخوێنرێت.
ئەرمەنەکان لە سەرەتادا لە گەرەکی حەدیدییەکان گۆرستانی تایبەتی خۆیان هەبووە، بەڵام دوای ئەوەی پاشماوەو جێگا نەما، بۆیە لە ئێستادا گۆرستانێکی تایبەتیان هەر لە (سێ کانیان) لە سەرووی کەرکوك. سێ رۆژ پرسیەی بۆ دادەنرێتو چلەی بۆ رێکدەخرێت.
سەبارەت بە جلوبەرگی ئەرمەنەکانی کەرکوك هیچ جلوبەرگێکی تایبەتیان نیە لەگەڵ خەڵکی پارێزگاکە.
بەڵام لە رووی زمانەوە، هەر چەند جیاوازن، زۆربەی وشەکانیان لە زمانی کوردییەوە نزیکە بۆ نموونە:-
چوارس، واتا چوار
مێل، واتا یەك
داسی، واتا دە
هەزار، هەزار
گەلێك ووشەی تر.

ئەرمەنەکان لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە، وەکو هەموو نەتەوەو مەزهەبەکانی تری عێراق، تووشی نەهامەتیی و کوشتنو برین بوونە لەلایەن گرووپی تیرۆرستانەوە، کە زۆربەی کڵێسەکانیان لە شاری بەغداو بەسرە تووشی تەقاندنەوە بوونە.
لە ساڵی (٢٠٠٧) بە هۆی بارودۆخی ئەمنی (٣٠٠) ئەرمەن عێراقیان بەجێ هێشتووە، بەرەو وولاتانی دەرەوە، ژمارەیەکیشیان کۆچیان کردووە بۆ وولاتی سوریا، هەروەك هەندێکیشان گەراونەتەوە بۆ ئەرمینیاو بەشێکی دیکەشیان روویان کردووەتە (ئۆردن)، بەڵام لە کەرکوك تووشی کۆچو توندو تیژی مەزهەبی نەبوونەتەوە[٤٢].

*** عەرەب:-**
ئەمەش زیاتر لەدوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەماوەیەکی زۆر نیشتەجێ بوون کە خۆی دەبینێتەوە زیاتر لە کۆچێکی سەربازیی و ئابووری تابەوەی کۆچێکی مێژوویی بێت کە بۆ داگیرکردنی ناوچەکە هاتوون، بۆ ئەوەی سامانی ئابوورییەکەی زەوت بکەنو زەویی و زارەکەی بکێڵن، ئەمەش لە کۆچرەوی هەریەکە لەو هۆزی جبورو عوبێدا خۆی دەبینێتەوە کە زیاتر بەهۆی نەبوونی ناوچەیەکی ئابووری خۆیان کۆچیان بۆ ئەم ناوچەیە کردووە.
((هۆزی عوبێد هاتوونەتە عێراقەوە لەپێش چوار سەدەدا کە نیشتەجێ بوونە لەزەوییە فراوانەکانی (جەزیرە) لەسەرووی (عێراق) کە لەسەر رۆخی رووباری فوراتی سەروو، توانییان ئەو ئاقارە داگیر بکەنو دەست بگرنە سەر ئەو هۆزانەی کە لەوێدا نیشتەجێ بوونە.
بەڵام بەهۆی شەرو ئاژاوەو گێچەڵیان لەگەڵ هۆزەکانی ئەو ناوچەیەدا بەتایبەتی هۆزی (شەمەر)، هاتوونەتە ناوچەی دەشتی (حەویجە)، جێگیر بوونیان لەسەر رۆخی (دیجلە)

و زەوییەکانی ناحیەی (مەلحە)ی سەر بەبنکەی قەزای (کەرکوك)و ناوچەی (شبیجە)ی سەر بەقەزای داقوق، بلاّوبوونەوەیان لەناوچەیەکی زۆری (کەرکوك)و (بەغدا) و(دیالە)..))[٤٣].

((.. لەسەرەتای دامەزراندنی حکومەتی عێراقدا لە کەرکوك تەنها گەڕەکێ عەرەب هەبوو لەنێوان گەڕەکی موسەللاّو گەڕەکی پیریادی ئەوان (٣٠) ماڵێك ئەبوون، کاریان جامبازیو قەسابیو جەلەب کرینو فرۆشتن بوو.. لەنێوان گوندی (تسعین) کە ئێستا بووەتە ناوەڕاستی شارو نێوان پردە کۆنەکە هەندێ صەریفەو کولبە هەبوون نزیکەی پەنجا ماڵی بوون، پیاوەکانیان عەرەبانچی بوونو ژنەکانیان گامێشو چێلو ئەوانەیان هەبوو، بەرۆژ ماستیان ئەفرۆشت، قەیماغیان ئەبردە بازارو لە ماڵەکانو لە خانەکان کاریان ئەکرد، بەمانەیان ئەوت (حەدیدی)).

کەرکوك پەرەی سەند لەدوای دامەزراندنی حکومەتی عێراقو هاتنی شەمەندەفەر بۆ کەرکوك جارێکیان مەلیك فەیسەل لە شەمەندەفەرەکە دائەبەزێ یەکسەر ئەم سەریفەو کوڵبەیانەی بەرچاو ئەکەوێ، لە موتەسەریف (عومەر نەزمی) و لە سەرۆکی شارەوانی مەجید یەعقوبی ئەپرسێ: ئەمانە چین؟ ئەوانیش لەوەلاّمدا ئەڵێن: ئەوانە کاولی عەرەبن، مەلیك ئەڵێت لێرە لایاندەن،، ئەمانە ئەگوێزنەوە خۆرئاوای کەرکوك...))[٤٤].

بۆیە دەبینین هەر لە وەزارەتی (یاسین هاشمی)ەوە مەسەلەی عەرەب هێنان بۆ کەرکوك زیادی کردووە، بەلێشاوێکی زۆرەوە هەموو شتێکیان بۆ ئاسان کرا بۆ هێنانیان بۆ ئەوەی لە کەرکوکدا نیشتەجێ بن، زەویو زارێکی زۆریان پێ بەخشرا لە دەشتی (حەویجە) بۆ نیشتەجێکردن.

*** حەدیدییەکانی کەرکوك:**

**سەروەر ساڵەیی**

حەدیدییەکان، کە بەپێی وتەی خۆیان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زاینییەوە بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان هەردوو خێڵی شەمەرو عوبێد پەراگەندەی کەرکوك بوونە، حەدیدییەکانی موسڵ بەرەگەز عەرەبن، لە سنووری پارێزگای موسڵەوە ڕوویان کردووەتە ناوچە کوردنیشینەکانی سنووری حەمرین.

یاسین حەدیدی نووسەرو ڕووناکبیری عەرەب پێیوایە، کە مێژووی هاتنی حەدیدییەکان بۆ ئەم سنوورە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٠٥)ی زاینی، کە لە سنووری پارێزگای موسڵەوە ئاوارەی ناوچە کوردییەکان بوونو لەسەرەتای هاتنیانەوە گەڕیدە بوونو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر گواستوویانەتەوە وەك کۆمەڵە خێزانێکی کۆچەر، کاریان کردووەو سەرقاڵی ئاژەڵداری بوونەو بژێوی ژیانیان لەسەر ئەو پیشەیە بووە.

هۆکاری ناونانی بنەماڵەکەشیان بە ناوی (حەدیدییەکان) دەگەڕێتەوە بۆ محەمەد نورەددین کە بە (عجان الحدید) ناوبانگی دەرکردووەو گۆڕەکەی لە قەزای حەدیسەیە.

پاش ئەوەی ساڵانێکی زۆر حەدیدییەکانی کەرکوك بە گەڕیدەیی ماونەتەوەو سەرقاڵی ئاژەڵداری بوونە، لە ساڵی (١٨٥١)ی زاینی ڕوویان کردووەتە ئەو گەڕەکەی ئێستا بەناوی حدیدییەکانەوە ناسراوەو دەکەوێتە دەوروبەری بینای پارێزگای کەرکوکەوە.

ڕۆشنبیرانی حدیدییەکان، هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو شوێنە دەگەڕێننەوە بۆ پێگەی ئابووری گرنگو هەڵکەوتەی جوگرافی شوێنەکە، کە نزیك بووە لە ناوەندی شارو گەڕەکە جیاوازەکانی شارەوەو حەدیدییەکانیش ئەم پێگە جوگرافییەیان قۆستووەتەوە، بەمەبەستی فرۆشتنی بەرهەمە جیاوازەکانیان لە شیرو ماستو خوری مەڕ.

لەهەمان کاتدا حەدیدییەکان لەو ناوچەیە نزیك بوونە لە گەڕەکی تسعینەوە، کە بە ناوچەیەکی کشتوکاڵیو بازرگانی ناسراو بووەو لەو ساتەوەش پەیوەندی نێوان خانەوادەکانی ئەو دوو گەڕەکە پتەو بووە.

گرینگترین شوێنەواری حەدیدییەکانیش کە تا ئێستا بوونی ماوە، ئەو گۆڕستانە تایبەتەی حەدیدییەکانە، کە ئێستا بەشێکە لە گۆڕستانی گەڕەکی موسەللاّی کەرکوكو لە فەرمانگەی ئەوقافی کەرکوکیش بەناوی (گۆڕستانی حەدیدییەکان) تۆمارکراوەو زۆربەی کەسایەتییەکانی حەدیدییەکانیش لەو گۆڕستانە نێژراونو مێژووی ئەو گۆڕستانەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٧٩)ی زاینی، کە لەو ساڵەدا ئەو گۆڕستانە بووە بە گۆڕستانی تایبەتی حەدیدییەکانو گرنگترین ئەو کەسانەش لەنێوان ساڵانی (١٨٧٩)و (١٩٠٠)ی زاینی لە گۆڕستانەکە نێژراون بریتین لە: (جەبەل کوری ڕەشید)و (مەرعی حەسەن).

گەرچی حەدیدییەکان لە کەرکوکدا، زیاتر وەکو بنەماڵەیەك دەرکەوتوون، بەلاّم خودی حەدیدییەکان پێیانوایە کە ئەوان عەشیرەتێکنو بەشێکن لە حەدیدییەکانی موسڵو دیالەو بەغدادو ناسرییەو حیللەو سوریا.

لە ساڵی (١٩٢٤) کاتێك مەلیك فەیسەڵی یەکەمی پاشای عێراق هاورێ لەگەڵ ئیبراهیم حەدیدی وەزیری ئەوقافی حکومەتەکەی سەردانی کەرکوکیان کردووە، حەدیدییەکان لەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان وێستگەی شەمەندەفەری کەرکوكو بینای پارێزگا پێشوازییان لێی کردووەو ئەویش بڕیاریداوە، کە لە هەمان ناوچەدا کە لێی دەژین زەوی نیشتەجێبوونیان بەسەردا دابەش بکرێتو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك خانووی لەسەر بکەن لە جیاتی ئەو خانووانەی کە لە قوڕو خێمە دروستکراونو سیمای شاریان شێواندبوو.

پرۆفیسۆرد. کەمال مەزهەر لە یەکێك لە کتێبەکانیدا باسی ئەو ڕووداوەی کردووە.

لەسەروبەندی ئەو بڕیارەی مەلیك فەیسەڵدا بەشێك لە کەسایەتیو خانەوادەکانی حەدیدییەکانی ناوچەکەیان جێهێشتووە، چونکە پێیانوابووە ئەو بڕیارە بۆ بەزۆر ناردنیانە بۆ خزمەتی سەربازی.

بەشێك لەو ڕاستییانەی کە لە ئێستادا بنەماڵەکە دانی پێدادەنێن، ئەوەیە کە چەندین کەسی حەدیدی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی (١٩٢٦) پەیوەندییان کردووە بە پۆلیسی عێراقەوەو بەشێکی تریان خۆبەخشانە

پەیوەندییان کردووە بە هێزە چەکدارەکانو بەشێکی تریشیان قەرەبووی نەقدییان داوە بەحکومەت لە بری ئەنجامدانی کاری سەربازی نێوان ساڵانی (١٩٢٨- ١٩٣٦).
حەدیدییەکان پێیانوایە بەشێکی تر لەو زەوییانەی خانوویان لەسەر بونیادناوە، ئەو زەوییانەن کە لە جوولەکەکانی کەرکوك کڕیویانەتەوە، کە دیارترین ئەو کەسە جولەکانەی زەوییان لێ کڕیوە، هەر یەك لە (ئیسحاق عەبودی پاشا جفیل)و (مەحمود سەید جیهاد)یش بشێك لە زەوییەکانی کڕیوەتەوە.
پاش جێگیربوونی حەدیدییەکان لە شوێنی ئێستایان وازیان لە پیشەکەی خۆیان هێناوەو بەشێکی زۆریان پاش دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی باکوور لە ساڵی (١٩٢٧) پەیوەندیان بەو کۆمپانیایەوە کردووەو بوونەتە کارمەند تێیدا، لە کاتێکدا کە لەو کۆمپانیایە پێویستی بە دەستی کار هەبووەو ئێستاش بەشێکی زۆر لە پیاوانی حەدیدییەکان لەو کۆمپانیایە کار دەکەن.
لەهەمان کاتدا حەدیدییەکان دەستێکی باڵایان هەبووە لە دامەزراندنی وێستگەی شەمەندەفەری شارەکە، کە وەك کرێکارو کارمەند کاریان تێدا کردووە.
لە دوای ئەو ڕووداوانە، گوزەرانی حەدیدییەکان باشتر بووەو بەشێك لە هاوولاتیانی حەدیدییەکانی کەرکوك بوونەتە فەرمانبەری حکومەتو بەشێکی تریش لە کەرتی تایبەت کاریان کردووە.
لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر گوزەرانیان دێت، حەدیدییەکان دەستیان کرد بە ناونووسکردنی منداڵەکانیان لە قوتابخانەکانو ئێستاش بەشێکی زۆری گەنجانی حەدیدی لە زانکۆکان وەرگیراونو دواتر لە دەزگا فەرمیو نافەرمییەکان دامەزراون.
ئەوەی تائێستا حەدیدییەکان پێی ناسراون، ئەوەیە کە مۆرکی نەتەوایەتی خۆیان وەك عەرەب پاراستووەو لەگەڵ ئەوەشدا توانیویانە پەیوەندی پتەو لەگەڵ نەتەوەو پێکهاتە جیاوازەکانی کەرکوك دروست بکەنو تا ئێستاش ئەو پەیوەندییە کۆمەڵاتییانە بە پتەوی ماونەتەوە و تەنانەت بە شێوەیەکی بەرچاو ژنو ژنخوازی لەنێوانیاندا هەیە.
حەدیدییەکان وەك خۆیان دەڵێن شانازی بەوەوە دەکەن، کە تا ئێستا لە کەرکوك زوڵمیان لە کەس نەکردووە و نەبوونەتە ئامرازێك بۆ ئازاردانی پێکهاتەکانی تری کەرکوك.
سەقەر تەرفاوی جەبەل، کە یەکێکە لە کەسایەتییەکانی بنەماڵەکە بەپێی دەفتەری نفوسەکەی لە ساڵی (١٨٥٢) لە کەرکوك لە دایکبووەو وەك یەکێك لە پیاو ماقوڵانی حەدیدییەکان ناوبانگی پەیداکردووە.
ئەحمەد ڕەجەب تەرفاوی ساڵی (١٩١٤) لە کەرکوك لەدایکبووە و لەساڵی (١٩٤٢) بووەتە سەرباز لە سوپای پاشایەتی عێراقو ساڵانێك خزمەتی بەو سوپایە گەیاندووەو بەپێی گێڕانەوەی نەوەکانی ناوبراو، ئەو ڕۆژەی بەکر سدیقی لە شاری موسڵ کوژراوە، ئەحمەد لەهەمان یەکەی سەربازی، سەرباز بووە کە بەکر سدقی تێیدا کوژرا.
جگە لەوەش ئەحمەد ڕەجەب ماوەیەك کارمەندی کۆمپانیانی نەوتی باکوور بووەو سەرۆکی لیژنەی سەندیکایی بووە لەناو کۆمپانیاکەو لە ساڵی (١٩٩٦) کۆچی دوایی کردووە.
ناوبراو پێش مردنی ئەندامی ڕابیتەی نەتەوەچییە عەرەبەکان بووەو ڕێکخستنێکی نەتەوەیی تایبەتی لە کەرکوك پێکهێناوەو بڕوای تەواوی بە عەرەبچێتی هەبووە.
بە درێژایی مێژوو چەندین کەسایەتی حەدیدی ڕۆڵی بەرچاویان لە کەرکوکدا بینیوەو بەشێك لە حەدیدییەکان لە گەرەکی شۆڕیجە نیشتەجێ بوونەو تەنانەت حدیدییەکان باس لەوە دەکەن کە دایکی (شەهید ئەریە) حدیدی بووە هەروەها ئیسماعیل حەدیدی، کە پێش پرۆسەی ئازادکردنی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣) وەك بازرگانێك کاری کردووە، لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە وەك کەسایەتییەکی سیاسی دەرکەوتووە، ماوەیەك ئەندامی کۆمەڵەی نیشتیمانی عێراق بووە بۆ نووسینەوەی دەستورو ماوەیەکیش وەك جێگیری پارێزگاری کەرکوك کاری کردووەو لە ساڵی (٢٠٠٩)ش خۆی کاندید کردووە بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، بەڵام دەنگی پێویستی بەدەستنەهێناوە.
مەغار چۆدەر، یەکەمین موختاری حدیدییەکان بووە لە کەرکوكو لەسەردەمی پاشایەتیدا ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە، بەو پێیەی پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق هەبووەو نەوەکانی کاری زێڕنگەری دەکەن لە بازاڕی زێڕنگەرانی کەرکوك.
دوای مردنی مەغار جاسم محەمەد ئەلخەناو بووەتە موختاری حەدیدییەکان.
محەمەد ئیسماعیل کەسایەتییەکی حەیدییەو لە ساڵانی هەشتاکان، وەك بەڕێوەبەری ئەوقافی کەرکوك کاری کردووە.
چەندین بازرگان لەناو حەدیدییەکانەوە هەڵکەوتوون، کە بازرگانی گەنمو جۆیان کردووە لەنێوان شارە جیاوازەکانی عێراقدا لەوانە: عاسی مەحمودو عیدان شەتبو خەلەف تین، ئیسماعیل ئیبراهیمو جیهاد ئەسوەدو حەمید جیهاد بەشێکی ترن لە پیاو ماقوڵانی حەدیدییەکان.
یاسین حەدیدی ساڵانێك وەك یاریدەدەری بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك کاری کردووەو دوای پرۆسەی ئازادیش خانەنشینکراوەو ئێستا وەك نووسەرو ڕووناکبیری یەکێکە لە کەسایەتییەکانی حەدیدییەکانو لە ڕۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکانی کەرکوك بابەتو نووسینەکانی بڵاودەکاتەوە.
هەروەها ئەسعەد حەدیدی یاریدەدەری سەرۆکی دەستەی وەبەرهێنانی کەرکوك و دکتۆر عیسی حەدیدی سەرۆکی بەشە لە نەخۆشخانەی گشتی کەرکوكو حەبیب حەدیدیو فەلاح شەیال، کە دوو پزیشکی ناوداری کەرکوکن.
بەشێکی تر لە کەسایەتییە ناودارەکانی کەرکوك خەمیس عاسی مەحمودە، کە یەکێك بووە لە کەسایەتییەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراق لە سەردەمی حیزبی بەعسو سەرۆکی یەکێتی نیشتیمانی قوتابیانی عێراق بووە لە سوریاو پاش مردنی فاخر ئەسعەد لە سوریا دەرکراوە و ڕووی کردووەتە ئەمریکاو ئێستاش لەو وڵاتە ژیان بەسەر دەبات[٤٥].

*** هۆی زیادبوونی ژمارەی کورد لە کەرکوکدا:**

ئەگەر بەراوردێك بكەین لەنێوان قەبارەی ئەو دەرکردنانەی (کورد)و قەبارەی ئەو هێنانەی (عەرەب)دا، دەبینین کە هێشتا ڕێژەی کورد زیاترە لەچاو ڕێژەی عەرەبو نەتەوەکانی تردا، چونکە تەنانەت پاش کاری بەعەرەب کردنی زۆر لە شارەکەداو دەرکردنێکی زۆری خەڵکەکە، هێشتا سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧)و (١٩٩٧) ڕێژەی کورد زیاتر بوو، هەر بۆیە هەستان بەکاری (ئەنفال) کردن بۆ ئەوەی پشتێنەی کەرکوک بکەنە ناوچەیەکی سەربازیو قەدەغەکراو، لەبەر ئەوە چەند هۆیەك هەیە لەزیاد بوونی ژمارەی کورددا:

١. هەریەکە لە ئاسووریو تورکمان بایەخ بەزیاد بوونی منداڵ نادەن لەچاو کورد، چونکە ئەگەر ڕێژەی گەشەکردنی منداڵیان لەزیاد بووندا بوایە ئەوە بە ماوەیەکی کورت عەرەبێکی زۆر نیشتەجێ دەکراو گەشەیان دەکرد، هەر بۆیە لەو ماوەیەی پرۆسەی بە عەرەب کردنی کەرکوك، حکومەت بیری کردەوە بەهێنانی چینە هەژارەکانی عەرەب تا بۆ ئەوەی خۆیان لە زیاد هێنانی منداڵدا ببیننەوە بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ئابوورییەکی چاکیانی بۆ نەرەخساندووە، زیاد بوونەکەش لەبارێکی سروشتیدا گەشەی نەکردبوو، بەڵام لە دواییدا بەپێی نەخشەیەکی دارێژراوی بەعسیانە کە خۆی دەبینییەوە لە ستراتیژیەکی دوورو درێژ بۆ ئەوەی لە هەوڵدانی ئەوەدا بن لە ڕێگای زۆربوونەوە بە هێنانی منداڵ ڕێژەی عەرەب لە کەرکوك زیاد بکەن، هەندێك لەو ستراتیژییە شۆڤێنیانەی خۆی بینییەوە لە بەکارهێنانی جۆرەها ڕێگا بۆ ئەوەی لە ناوچە کورد نشینەکان ڕێژەی منداڵبوون کەم ببێتەوە یان پیاوو ژن تووشی نەزۆکی بکات، ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێدەکرێت کە لە هەشتاکاندا لە قوتابخانەکانی ناوچە کورد نشینەکان بە ناوی لێدانی دەرزی لە منداڵانی کورو کچ ئەو جۆرە دەرمانانەیان بەکاردەهێنا کە تا ئێستاکەش بەشێکی زۆری ئەو کەسانە تووشی نەزۆکی بوونە، یان بە کارهێنانی جۆرەها کاری نەهێنی لە ناوچە کوردنشینەکان لە بەکارهێنانی دەرمانو خۆراکی ماوە بەسەرچوو کە هەندێك لەو جۆرە دەمانانە گەلێك هۆکاری ناراستەوخۆی هەبوو بە ڕوودانی نەزۆکیو گەلێك نەخۆشی دیکە.

٢. پشتێنەیەکی ئابووری گەشەکردوو: گشت لادێکانی دەوروبەری (کەرکوك) کوردن، لەبەر ئەوە پشتێنەیەکی ئابوورییان هەیە، بۆ بەخێوکردنو هێنانی منداڵ، هۆیەکی سروشتییە بۆ ئەوەی کوردەکە گەشە بکەنو پەرەبسێنن، هەر ئەمەش وای کرد ڕووخاندنی لادێکانی گەورەترین کارەساتی قرکردنی کورد بوو، بۆ وەستاندنی ئەو گەشە سروشتییە. ئەوەش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە هەوڵیدا ئەو پشتێنە ئابوورییە لە ناوچەیەکی وەکو حەویجە دووبارە بکاتەوە ئەویش بە فێرکردنی عەرەبی هاوردە بۆ ڕاهاتنیان لەسەر کشتوکاڵو ئاودێری.

٣. کورد زیاتر لەسەر شێوازی خێڵەکیو هۆزایەتییە کە بایەخ بە پشتو نەتەوە دەدەن.

٤. کارتێکردنی ئایینیو پیرۆزی منداڵ: کارتێکردنی ئیسلام لە هەموو نەتەوەکانی تر لەسەر کورد پیرۆزی منداڵو بایەخ دان پێی.. ئەوەی زیاتر ئەم پیرۆزییەی دروست کردووە مانەوەی ڕەگی ئایینی زەردەشتییە، کە لە کاتی خۆیدا بایەخی داوە بە پەروەردەکردنی منداڵو زیادکردنی، بۆیە ئەم ڕەگە پیرۆزە لە بوونی ئیسلامەتییەکەدا ڕەنگی داوەتەوە.

٥. لە دوای ڕزگارکردنی کەرکوك لە ڕاپەرینەکەی ساڵی (١٩٩١)ەوە ڕێژەیەکی زۆر عەرەب کۆچیان کردووە بۆ دەرەوەی (کەرکوك)، زیاتر لەوەی کە کوردیان لە کەرکوك دەرکردووە، چونکە بێ پشتی حکومەت لە ڕاپەرینەکەدا ئەوەی خستە مێشکیانەوە کە مانەوەیان مەحاڵە لەم شارەدا کە ئەمە وای کردووە مەسەلەی جێنشینی عەرەب لە کەرکوکدا هەرەس بهێنێتو بەرەو ڕووخان بچێت، ئەمەش بە ڕوونی بەدەردەکەوێت لە سەرژمێری ساڵی (١٩٩٧)دا کە ڕێژەیەکی زۆر لە عەرەب لە شارەکەدا چۆڵیان کردووە.

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقیشەوە ئەو هاوکێشەیە تا ڕادەیەك نادروستییەکی پێوە دیارە لە چوارچێوەی ئەوەی کە نەگەیشتووەتە ئەو ئاستە کە بتوانرێت جێگیری دروست بکات لە باری گەشەکردنی سرووشتی لەنێوان کوردو عەرەبدا لەبەر ناجێگیری بارە سیاسییەکە لەم ناوچەیە وای کردووە کە هەردەم لە ڕۆیشتنو هاتنی نەتەوەکان بێتو ئێستایشی لەگەڵدا بێت پرۆسەی تەعریب کردن بە جۆرێکی دیکە بەکاردەهێنرێت کە حکومەتی ئێستای عێراق لە هەوڵی ئەوەدایە کە ڕێژەی عەرەبی شیعە زیاد بکات لە کەرکوك لە پای ئەوەی کە پشتێنەیەکی ئەمنی شیعە بە شێوەیەك دروست بکات کە لە داهاتوودا ببێتە بنەمایەك بۆ لێکدانەوەو چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك.

*** سەرنجو بۆچوونەکان دەربارەی سەرژمێرییەکان:-**

١. نەبوونی سەرژمێرییەکی ڕاستو دروستو بێ پێچو پەناو غەلو غەش، بەڵکو زۆربەی سەرژمێرییەکان لە تای تەرازووی بارە سیاسییەکەدا دەسووڕێتەوە زیاتر ئەمە بە ڕوونی بەدەردەکەوێت لەنێوان ساڵانی (١٩٦٥ - ١٩٧٧)و لەوە بەدواوە، ئێستاش لە دووای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە هەوڵدەدرێت کە سەرژمێرییەکی بێ غەلو غەش بکرێت سەرناگرێت، ئەمەش خۆی دەبینێتەوە لەوەی کە تاکوو ئێستاکە بیری دەمارگیری نەتەوەییو ئایینی زاڵە بەسەر دەسەڵاتی عێراقدا.

٢. هەوڵدان بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی کورد هەرچەندە کە زۆرینەشی بەدەست هێناوە.

٣. شاردنەوەی سەرژمێرییەکان لە ساڵانی (١٩٦٥، ١٩٧٧، ١٩٨٧، ١٩٩٧)داو دەرنەخستنی ڕووی ڕاستی سەرژمێرییەکان.

٤. هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی دەرکردنو گۆڕینی ناسنامەو بەعەرەب کردن لە کاتی هەر سەرژمێرییەك.

٥. هەوڵدان بۆ دانانی هەموو نەتەوەکان بە عەرەب بۆ ئەوەی زیادبکرێت لە چوارچێوەیەکی یاساییدا.

٦. دەرکردنی ژمارەیەکی زۆری کورد بۆ دەرەوەی پارێزگاکە لە پێش دەسپێکردنی سەرژمێرییەکاندا.

**خشتەی ژمارە (٤)[٤٦]**
**دابەش بوونی ڕێژی نەتەوەکانی پارێزگاری کەرکوک**

| ز | ساڵەکان و سەرچاوە | کورد | عەرەب | تورکمان | ئەوانیتر |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قاموس الاعلام (١٨٩١) | (٧٥٪) | (٢٥٪)ی بۆ نەتەوەکانی تر داناوە | | |
| ٢ | سەرژمێری تورکی لەلایەن عیسمەت پاشا ئینەنۆ | (٩٧٠٠٠) | (٨٠٠٠) | (٧٩٠٠٠) | |
| ٣ | سەرژمێری ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٤ | (٤٢,٥)<br>(٤٧٥٠٠) | (٣٢)<br>(٣٥١٥٠) | (٢٣,٣)<br>(٢٦١٥٠) | (٢,١)<br>(٢٤٠٠) |
| ٤ | محەمەد ئەمین زەکی | (٥١٪) | (٢٩٪) | (٢٢٪) | |
| ٥ | دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کێشەی موسڵ | (٤٣٪) | (٣٢٪) | (٢٣٪) | |
| ٦ | سەرژمێری ساڵی(١٩٤٧) | (٥٣٪) | | | |
| ٧ | سەرژمێری ساڵی(١٩٥٧) | (٤٨,٣٪) | (٢٨,٢٪) | (٢١,٤٪) | (٢,١٪) |
| ٨ | سەرژمێری ساڵی(١٩٦٥) | (٣٦,١٪) | (٣٩٪) | (١٩,٥٪) | (٥,٤٪) |
| ٩ | سەرژمێری ساڵی(١٩٧٧) | (٣٧,٦٪) | (٤٤,٤٪) | (١٦,٣٪) | (١,٧٪) |
| ١٠ | سەرژمێری ساڵی ١٩٩٧ | (١٣٩٧٥٤)<br>٣٧,٦٢٪ | (١٤٧١٧١)<br>٣٩,٦١٪ | (٨٢٧٣٦)<br>٢٢,٢٧٪ | |
| ١١ | بۆچوونی (میڤل) حاکمی سیاسی کەرکوک دەربارەی سەرژمێری کەرکوک لە دوای پرۆسەی عێراق | ٤٠٪ | ٣٥٪ | ٢٠٪ | ٥٪<br>ئاسووری |
| ٢١ | بەپێی ئاماری ٢٠٠٩ | ١,٣٤٨,٦٣٦،١کەس، ٨٨٦,١٠٧رەگەزی نێر<br>٦٦٠,٥٢٩ رەگەزی مێ | | | |
| ٣١ | بەپێی ئاماری خۆراک ساڵی ٢٠٠٩ | ١,٢٩٧,٢٧٣ کەس | | | |
| ٤١ | ژمارەی ئاوارەو هاوردە کە بەپێی ئاماری مادەی (١٤٠) کە لە ٢٠٠٩/١١/١١ ئامادە کراوە | ٩٢,٣٢٠ – ئاوارە<br>٨٢,٠٠٠ – هاوردە<br>١١٠,٣٢٠ – کۆی گشتی | | | |

**خشتەی ژمارە (٥)[٤٧]**
**ژمارەی نەتەوەکان بە پێی سەرژمێری (١٩٥٧)**

| ساڵ | عەرەب | کورد | تورکمان | ئێرانی | ئنیگلیزی | فەرەنسی | هندی | کلدانی – سریانی | زمانیتر دیاری نەکراوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ١٠٩٦٥ | ١٨٧٥٩٣ | ٨٣٣٧١ | ١٢٣ | ٦٩٧ | ٤١ | ٨٧ | ١٦٠٥ | ٥٧٠٢ |
| ١٩٧٧ | ٢١٨٧٥٥ | ١٨٥٢٦٣ | ٨٠٣٤٧ | – | – | – | – | ٤٦٣١ | – |

*** دابەشكردنی جوگرافیایی هۆزو عەشیرەتەكانی پارێزگاكە:**

*** هۆزی شوان:-**

((بنكەی سەرەكی ئەم هۆزە (رێدارە)و ئەو گوندانەی كە كەوتونەتە ئاقاری ئەم هۆزەوە ئەمانەیە:-
جەوەجەوە، قولی بەگ، تۆراغ، دووبزنی، قادر زەمە، حەسار تەما، كاریز، بێرالك، عەلی بەیان، دارەختیار، ئیلینجاغ، ئۆمەرمەندان، توركمان باغ، تەرەقە، دووشیوان، نەیبەسەرە، ناڕووجەی حاجی جەرجیس، ناڕووجەی ئەحمەد رەجەب، ناڕووجەی محەبلە، هەردوو تەپە كورە، مەحمە خان، قادر عەلی، ئۆمەربەگ، پاپیلان، هەردوو حاجی بەیخان، سمایل بەگی قەرەبلاخ، قەمەر، خدر شیرین، توركە، برایم زانە، جولحان، گورگان، تۆمار، عەلی موسا، كلاوقوت، گولمكەوە، رەحیماوە، فەقێ میرزا، پەلكەرەش، یەختەخان، عەلی میكایل، ئاوپاریك، گۆران، دەلۆ، داربەسەرە، ناسرو میسر، كارێزەی خالخالان..))[٤٨].
((شوێنی نیشتەجێیان لەباكوورەوە پێكهاتووە لە شریتێكی درێژ لەو گوندانەی كەسەر بەعەشیرەتی (شێخ بزێنی)ن، درێژ دەبێتەوە بەدرێژای لێواری چەپی زێی بچووك. لە رۆژهەڵاتدا درێژ دەبێتەوە لەهێڵێكی نادیار كە لەوانەیە لە رۆژهەڵاتی (تەق.. تەق)، راستەوخۆ كە رێگای (كەركوك - چەمچەماڵ) دەبڕێت. لە خوارووا درێژ دەبێتەوە لە گردەكانی (قەرەحەسەن)، لەرۆژئاوادا پێكهاتووە لەو زنجیرە چیایانەی كە درێژ دەبێتەوە لە قەرەحەسەن بە رووی زێ كە هاوسەنگ لەنێوان رێگای كەركوك - پردێ..))[٤٩].

*** عەشیرەتی شێخ بزێنی:-**

((ئەم هۆزە جێگیر بوونە لەو گوندانەی هەردوولای زێی بچووك.. كە لەسەرەوە بەشی كۆیەو لەخوارەوە هۆزی شوان، لە رۆژهەڵاتەوە لە (تەق تەق) لەلای راستی زێو رووباری (شیوەسوور) لەنزیك (گەڵناغاج)، لەلای چەپی هەمان رووبارو لەرۆژئاوا پردێو هۆزی ساڵەیی[٥٠].
گوندەكانی هۆزی شێخ بزێنی بریتین لە:-
توركی، هەردوو قەرە سالم، كاولە سوار، شەوگێر، پەلكانە، دەرماناو، عەمدۆن، هەردوو مەرزیخە، حەسەن قەباغ، كانی رەش، جگیلە، سماقە، گورزەیی[٥١].

*** هۆزی ساڵەیی:-**

(ناوچەی (ساڵەیی) یەكەیەكی پێكەوە بەستووی جوگرافییای هەیە كە درێژدەبێتەوە لە دەشتی هەولێر لە سەرووی پردێو تەق تەق لە هێڵێكی لێژ بەرەو رۆژهەڵات كە دەكاتە ناوچەكانی عەشیرەتی زەنگەنەو جەبارە، لە خوارووشەوە تێكەڵدەبێت بە ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی عەشیرەتی داوودەو تاڵەبان، لە رۆژئاواش تێكەڵدەبێت لەگەڵ عەشیرەتی سیانو دزەیی و ناحییەی مەلحە، لەگەڵ رێژەیەكی زۆری دانیشتووان لە هەردوو رۆخی رووباری زێی بچووك كە دەكاتە بەشی گەورەی هەرێمی (ئەراپخا) لە چاخە كۆنەكاندا كە شارۆچكەی پردێ بنكەی سەرەكی ئەم هەرێمەیە).
دێیەكانی ناوچەی ساڵەیی بریتییە لە:
(قەرەجەم، بای حەسەن، مشێرفە، ئەبو خورجە، هەردوو مەلحە، تۆیلعە، عەلەغێر، مامە، خەرابە رووتە، سمایلاوا، تەق تەق، كونە ڕێوی، دۆرم، مامشە، نەرعەلی سابونچی، قوشتەپە، دوبز، قەرەدەرە، قایەباشی، كتكە، قەرغانلوو، گورزەیی، نەبیاوە، شانەشین، غەزنەفەر، هەردووچیا چەرمك، هەردوو دەرماناو، سەربیر، گەڵۆزی، گەوەنی، رۆژبەیانی، قادر باغر، هەردوو پیرەسپان، یارمجە..))[٥٢].

*** هۆزی بـیـبـانی:-**

سەنتەری ئەم هۆزە بیبانی گەورەیە كەلەم گوندانە پێكهاتووە (كەڵوری باشتەپە، كەڵور، هەردوو دارەمان، حەساری گەورە، حەساری بچووك، حەساری كوێخا رەزا، هەردوو بیبانی، زەردك، هەردوو گۆڵدەرە، قزلقایە، وەلی پاشایی. ئەم عەشیرەتە لە هەردوو ئەو دێیانە نیشتەجێن كە ناوی بیبانیان هەڵگرتووە لەگردەكانی گوڕ گوڕ لەسەرووی رۆژئاوای كەركوك..))[٥٣].

*** هۆزی شێخانی بەرزنجی:-**

هۆزی شێخانی لە زۆر ناوچەو دێهاتی كوردستاندا هەنو بڵاوبونەتەوەو زۆربەی زۆریان خۆیان بەسەید دەزانن و هەندێكیشیان خۆیان بەسەید نازانن.
شێخانی دەوروبەری قادر كەرەم لەم گوندانە نیشتەجێن: یۆلە، قەڵا میكایلی گەورە، قەڵا میكایلی بچووك، قەشقە، چەم سورخاو، ژاژ، شاووك، داربەسەرە، میل ناسر، هەردوو قەڵغانلوو، كولەكانی، تەپەسەوز، تازەشار، چاڵەو دوانە، عەلی مستەفا، قەرەچێوار، نەوروز، پاریۆلە[٥٤]. لەناوچەی (ئاغجەلەر) گوندێك هەیە خۆیان بەشێخانی بەرزنجە دەزانن، هەروەها لەناوچەكانی بەغداو كەركوكو هەولێرو خورماتووو كفریو چەمچەماڵیش هەن[٥٥].

*** هۆزی زەنگەنە:-**

زەنگەنەی عێراق لەچەند ناوچەیەكدا پەرتو بڵاوبوونەتەوە وەك (كەركوك)و ناوچەی (قادر كەرەم) لە رۆژهەڵاتی كەركوك كە دەیان دێو ناوچەكە تەپۆڵكاوییەو هەردەو سەختە لەنێوان زێی رۆخانە (باسەرە) لە رۆژئاواوە (ئاوەسپی) لە رۆژهەڵاتەوە، زنجیرە چیای (ئیمام زەنور) لەسەرەوە، تیرەی شێخانو تاڵەبانی و گل لەخوارەوە لەنێوان عەشیرەتی جافو هەمەوەندو شێخانو جەباریو تاڵەبانیدایە[٥٦].
هەروەهاش دەتوانین ئەم هۆزە لەرووی رەچەڵەكو جوگرافیاوە بكەینە دووبەشەوە كە بەشێكیان لە (ئیبراهیم خانچی) نیشتەجێن، بەشێكیان لە (كفری)و (زەرداو) نیشتەجێن[٥٧].

*** هۆزی داودە:-**

لەسەر رۆخەكانی زێی بچووكدا نیشتەجێن. لەخوارووی رووباری (رۆخانە) لە نزیك ناحیەی (قادر كەرەم)و

(خورماتوو)، لە رۆژئاوایی قەزای (کفری)، لەو دەشتاییانەی کەدرێژ دەبێتەوە بۆ رووی چیای (حەمرین)[٥٨]. ئەو گوندانەی کە تێدا نیشتەجێن بریتییە لە:-
کولەکانی، قەڵغانلوی گەورەو بچووك، عەزیز قادر، پیرەمۆنی، توکن، تالاو، نەوجول، میل ناسر، چاڵەدوانە، کومتی، عومەر سۆق، حەیدەرە سوور گەرمەك، هەردوو وارنی، جوری، کۆشکی گەورەو بچووك، کرکرەکان، هەردوو باش تەپە، سەفەریات، ئیمام محەمەد، شێخ هەواری قەلعە، هەردوو تەپە چەرمك، سالەیی، قوالی، قەڵای چەرمك، هەردووزەنانە، دەراجی، عەزە، پەلکانە، نەهرەوان، لەك، قوشلان، جەرەس، تەپەسەوز، خدروەلی، شۆراو، ئەعجەمەشت، سەنگر، ئەلبوسەباح، شاسیوان، ماوەغ، سێیەکی دێی یەنگیجە، چەورکە، زەند مەلا یوسف، زەند بەنعیز، هەفتەغار، گڵی تەپە، ئەلبو نەجم، جەنگەڵاوە، ئەلبوسەراج، تەل ئەلبەسەل، شەلخە، قەرەتامۆر، غروب، خشافتە، سماقە، کانی بی.

### * عەشیرەتی جەباری:-

ئەم عەشیرەتە نیشتەجێی ناوچەی ناحیەی (قادرکەرەم)ن[٥٩] کە شوێنی ئەم عەشیرەتە بەم شێوەیە دابەشکراوە:-
لەسەرووەدا (شوانی خاسە)، لەخوارووەدا (شیوی لەیلان) لە رۆژهەڵاتدا قەزای چەمچەماڵە، لە رۆژئاواوە کەرکوك[٦٠] ئەم گوندانە عەشیرەتی جەباری تێدا بڵاوبوونەتەوە:-
پاریاولا، نەورۆز، تاوێربەرز، حەسەنخان، حەمك، عەلی مستەفا، زەردە عالیاوە، مەحمود پەرێزان، گوڵەمەد، بانگوڵ، قوڵچی، قەڵاوێز، ئەکێ، زەوج، تەپەکورە، جاف، هەنارە، مۆرانە، هەفتا چەشمە، کوڵەبان، گۆران، شێردەر، پیوزل، بەکر باولان، وەستا خدر، چنگز، قایتەوەن، قەڵا میکایل، حەمە شەریف.

### * عەشیرەتی شێخانی:-

ئەم عەشیرەتە لەناوچەی (قادر کەرەم) نیشتەجێن[٦١]، لەم گوندانە بڵاوبوونەتەوە: یۆڵە، قەشقە، قەڵا میکائیلی خواروو، قەڵا میکائیلی سەروو، شاووك، ژاژ، چاڵەو دووانە، میل ناسر، قەڵغانلووی گەورە، قەڵغانلووی بچووك، تەپە سەوز، تازە دێ، کولەکانی، پاریاوڵە، عەلی مستەفا، چەمسوورخاو، قەرە چێوار.
شێخان دوو بەشە: شێخانی سەروو و شێخانی خواروو، کە ئاوی زێی (رۆخانە) دەیانکاتە دوو بەشەوە، (شێخ ئیمام باوە) گەورەی هەموویانە کە کچی (میر سمایلی زەنگەنە) خێزانی بووە، بۆیە تێکەڵاوییان لەگەڵ هۆزی زەنگەنەدا هەیە.

### * هۆزی کاکەیی:-

لەسەرەوە باران داغو گردەکانی دەورپشتی، لە خوارەوە دەشتەکانی حەمرین، لە رۆژهەڵاتەوە رێگای سەرەکی کە تازە بە (خورماتوو)ەوە دەبەستێتەوە، لە رۆژئاوای ناوچەی حەویجە[٦٢]، هەروەها بڵاوبوونەتەوە لە ناوچەی چەمچەماڵ و دەوروبەری.

ئەودێیانە کاکەییان تێدا بڵاوبووەتەوە بریتین لە:-
کوهبز، تەل رابیتە، دەلەسی گەورە، دەلەسی بچووك، زەنقر، عەلی سەرای تۆبزاوە، مەتیق، عەرەب کۆی، ئەلبومحەمەد، عەلوە پاشا، سەید ئەحمەد، خۆرس، دیمەکان، سەید عەلی، سلێم، حەشیشە، تەپە عوێز، لاسون .. لاسن.

### * تایفەی کاکەیی لە کەرکوکدا:
### هاشم عاسی کاکەیی

لەم نووسینەدا بەرکولێك لە مێژووی کەرکوك و ناوچەکانی دەخەمە روو لەگەڵ بوونی کورد لەم شارەدا بەگشتی و بڵاوبوونەوەی تایفەی یەزدانی کاکەییەکان تێیدا بەتایبەتی کە زیاتر نیشتەجێ بوونیان دەگەرێتەوە بۆ رۆژانی بەرایی موسڵمانان دەسەڵات و فەرمانڕەوایی عەنازییەکان و ئەردەلانییەکان. هەروەها کاریگەری ئایین و ئاینزاکانی ناوچەکە لە سەرییان، کاتێك بنەماڵەکانی قەرەقۆینلو، بەکتاشیان دێنە ناو کەرکوك و دەوروبەری.
سەردەمانی رابوردووی کەرکوك گەلێ کەس و لایەن فەرمانڕەوای بەخۆیەوە بینیوە، دەست بەدەست هاتووە وەکو فارس و رۆم و مەغۆل و تورك هەریەکەشیان هەندێ شوێنەواری لێ بەجێماوە. لەدوای سەردەمی ئیسلامیدا دانیشتووانی ئەم شارە کەم بووەتەوە، تاوای لێهاتووە بووەتە بەشێك لە (داقوقا)و پاشان شوێن خۆی گرتووەتەوە[٦٣].
سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی شارەکە بەهۆی ئاوی بیرو کارێزو کانییەوە بووە، بەڵام لە دواییدا بەهۆی زێی خواروو. سەرچاوەی نەوت و ئاگرەکەی لەدەوروبەری ساڵی (٥٥٠ پ. ز) پەیدابووە[٦٤] کاتێکیش فارسەکان بەم ئاگرەیان زانیوە هەر لەبەر ئاگرەکەش بووە کەرکوکیان داگیر کردووە، شاکانیان ئاهەنگی ئاینییان لەچواردەوری بەرپاکردووە قوربانیان بۆ داوە، هەندێ کەس لای وایە ئەم قەڵایە بەخۆڵ دروست کراوە لەشێوەی گردی گەورە پاشان قەڵاکەیان لەسەر بنیات ناوەو بەم کارە ئەمرەشیان وتووە (کارکۆك) کاری پوختەو پاك[٦٥].
شاری کەرکوك بەهۆی ئاوی (خرخاسە)وە بووەتە دوو بەشەوە قەڵاو دەوروبەری، بەو دیوێشیان وتووە قۆریە یان خواریە وەك هەندێ کەس بۆی ئەچن. بابا گورگور بووەتە نازناوی ئەم شارەو (بابا) لەزمانی کوردی دا واتای باپیرە دێت و بەرامبەری وشەی (پیر) بەکارهێنراوە وەك نازناوی پیاوە رۆحییەکان وێنەی (پاپا)ی لای گاوران و پاشان هاتووەتە ناو کوردستان وەك نازناوێك لەدوای دەست بەسەردا گرتنی سەلجوقییەکان بەسەر ئێران و کوردستان و عێراق دا، یەکەم کەسێ ئەم نازناوەی پێدرابێ (بابا تاهیری عوریانی هەمەدان)یەو، لەلایەن سولتان تۆغرل سەلجوقی لەکاتی چاوپێکەوتنی دا، پاش ئەویش ئەم نازناوە بووە میراتی باوکە رۆحییەکانی کوردستان بەتایبەت شێخانی کاکەییەکان و لەوێنەی (بابا عەلی هەمەدانی و بابا ناوز، بابا یادگار، بابا ئەردەلان، باوەشاسوار، باوە قەتاڵ، باوە پڵاوی، باوە مەحمی، بابان،...) بەڵام وشەی پیر ئەگەرێتەوە

بۆ سەردەمە كۆنەكانی (پیرموغان) ئەمەش كورتكراوەی وشەی (پدەر)ی بەرامبەر وشەی (بابا)یە، پێشتر دراوەتە پاڵ كەسانی وەك ( پیرەمەگرون، پیرمەسویر، پیر میكایل، پیریادی، پیرپیران)و ئەمجا دراوەتە پاڵ شێخانی قادری وەك (پیر گەیلانی، پیر ولیانی، پیرحەیاتی)[٦٦].

كەركوك شارێكی دێرینەو دانیشتووانی پێكهاتەی كوردو كلدو ئاشووریو جولەكەو توركمانو عەرەبە. بەڵام ئەمڕۆ جولەكەی تێدا نییە، لە ڕووی ئایینەوە دەبنە مەسیحیو موسڵمان: بە شیعەو سوننەو بەكتاشیو كاكەییو ئیسماعیلیو گروپە باتنییەكان. واتە لە كەركوك دا چەندین ئایینو پەرستنی جیاوازو تێرامانی پێش دەركەوتنی ئیسلام لە كۆنەوە سەری هەڵداوەو لە ناوچەكەدا بوونیان هەیە. بەڵام بە دەركەوتنی ئایینەكانی مەسیحیو ئیسلام كاریگەرییان لێ كردووە، جگە لەو بیروباوەڕانەی كە پێشتر لە ناوچەكەدا هەبوون وەك زەردەشتی، ئەو گروپو ئاینانە لە سەردەمی موسڵمانان بە ئەهلی زیمە (ئەهل كیتاب) دراونەتە قەڵەم لە دوایشدا ئەو مافەیان لێدەسێندرێو بە خەواریجو لادەرو شیعەی توندڕەو دێنە ئەژماركردن. بەڵام ئەمان دەستبەرداری دابونەریتو ئایینی خۆیان نەبوونو لە هەموو سەردەمەكاندا پاراستویانەو هەندێ ڕەنگوبۆی زەردەشتیو مەسیحیو ئیسلام دەكەوێتە ناوییەوە، چونكە ئاینیش چەشنی هەموو دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی دەكەوێتە ژێر كاریگەریی ئەو گۆڕانكارییانەی لە ڕەوتی ئابووریو كەلتووری كۆمەڵگاو فەرهەنگو ئەدەبی ڕوودەدات. بە قسەی مامۆستا تۆفیق وەهبی: لە سەدەی هەشتەمی كۆچی لە كوردستانو عێراقی عەرەبداو عێراقی عەجەم، پیرانی ئیسماعیلی خاوەن بزوتنەوەكانی باتنی تێدا بوونو زیاتر لە ٥٠ هەزار موریدیان پەیدا كردبوو، هەردوو شاری (سلێمانی) و (كەركوك) ببووە مەڵبەندیانو سەرۆكەكانی باتنییەكان مژدەی دەستبەردار بوون لە فەرزەكانی ئاینییان بە گوێی خەڵكاندا دەدا بە بۆنەی (قیامة القیامات) واتە بەرپابوونی ڕۆژی دواییو پەیدا بوونی حەزرەتی مەهدی، كەوا سەرۆكی ئیسماعیلی بەرجەستە بوو (حەسەن ئەلرۆزباری) كە ناوی بە پیرۆز رادەگیراو دەوترا (علی ذكره السلام)، ئەم پیاوە ڕۆژی نیوەڕۆی هەینی (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٥٧٧) كۆچی لە (ئەلەموت) ئەمەی ڕاگەیاندو ئەم ڕۆژەش بە جەژن لەقەڵەم درا.

چالاكییەكانی باتنییەكان بوونە هۆی دەركەوتنی ئایینی (ئەهل هەق) كەوا پێدەچێ ڕەگو ڕیشەی بگەڕێتەوە بۆ بیروباوەڕی(زروانیە)ی ئێرانی[٦٧]. هەروەها مامۆستا تۆفیق وەهبی ئەڵێ: سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی باتنییەكان لە ناوچەكانی كەركوكو سلێمانی بە تایبەتی لە سەردەمی مەغۆلەكاندا بەڵگەمان ئەو ناوانەیە وەك (دەربەندی بازیان) كە (مستەوفی ٧٣٤ كۆچی) بە (دەربەند خەلیفە)ی نووسیوە، خەلیفەیش نیشانەی ئیمامەكانی ئیسماعیلی (باتنییەكان)ە، كە خۆیان بە خەلیفەی خودا لەسەر زەوی دادەنا. هیچ جیاوازییەكیش نییە لەنێوان واتای (دەربەند خەلیفە)و (دەربەند ئیمام شا) تەنیا ئەوە نەبی كەناوی یەكەم كۆنترە لە دووەم. بەكارهێنانی ناوی لێكدراوی (ئیمام شا) نزیكترە لە دەركەوتنی (شا خۆشین) كە لە سەردەمی خۆیدا بە (بابا خۆشین) دەناسراو لە ڕاستیدا خاوەن بیروباوەڕەكانی باتنییەكان لەم ناوچانەدا نیشتەجێن لە سەدە گەلێكی كۆنەوەو نیشانەی سەرۆكەكانیان بە (بابا) یاخو(پیر) دەناسرانو ئەمانە ئەو كۆمەڵە مرۆڤانە بوون لە توركستانو خۆراسانەوە بە هۆی فشارەكانی مەغۆلو داگیر كردنی خاكیان لە چەشنی پەنابەر خۆیان دەگەیاندە چیاكانی زاگرۆسو ئەنەدۆڵو سوریە[٦٨].

وەك زانراوە لە سەردەمی موسڵماناندا ئەم گرۆ ئاینییە نهێنییانەی كوردستان كاریگەرییان هەبووە لەسەر زۆر كەسایەتی ئیسلامیو ئیسلامیش كاریگەری خۆی هەبووە لەسەر ئەمان، دەستێوەردانی تایفە یەزدانییەكان (باتنییەكان) لەبیروباوەڕی موسڵمانان زیاتر لەسەردەمی پیرشالیارەوە دەستپێدەكات، تا دەگاتە حوكمرانی بنەماڵەی قەرەقۆینلو لە ڕۆژئاوای ئێرانو ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (١٣٨٠/ ١٤٦٨) زایینی، لەگەڵ دە ساڵی یەكەمی پەیدا بوونی فەرمانڕەوایانی سەفەوی (١٥٠١ز) هاتە دی، بەڵام ئەم سەفەوییانە گەلێ كاریان ئەنجامدا بۆ هەڵگەڕاندنەوەی پەیڕەوانی تایفە یەزدانییەكان لەئاینە ڕەسەنەكانی خۆیان بۆ بنبڕكردنیانو سەركووت كردنیان[٦٩]. تا وای لێدێت ناوی شێخ سەفی بە پیاوچاكو كەسایەتییەكی گەورە لە كەلتووری ئایینی كاكەییو شەبەك دێتە ئەژمارو بەشێك لە بیروباوەڕیان داگیردەكات.

بەهۆی جەورو ستەمەوە تایفە عەلەوییەكانی ئەنەدۆڵ، لەسۆنگەی بێ ئومێدییەوە ناوی جەعفەرییان لەخۆناوە، لەبەردەم ئەنجام دەرانی سەرژمێری توركیا بەجەعفەری خۆیان ناو نووس كردووە[٧٠]. سەیر ئەوەیە زۆربەی موسڵمانانی ئێرانو قەوقاز بەهۆی گوشارو فشاری سەفەوییەكانی سەردەمی (عەلەوییگەری) دەستیان لەڕێبازی سوننەگەری هەڵگرتووە[٧١]. ئەم ڕێبازو ڕێڕەو گۆڕینە لەهەموو سەدەیەكدا بەردەوام بووە، بەهۆی گۆڕانی بارودۆخ.. دەبینین زۆربەی دانیشتووانی ئەو دەڤەرانەی كە عێراقی ئەمڕۆیان لێ پێكهاتبوو، پێش هاتنی عەلەوییە شۆڕشگێڕەكان لەئەنەدۆڵەوە، شیعە بوونو هەرگیز نەبوون بەعەلەوی[٧٢].

لقێكی دیكەی تایفە یەزدانییەكانی وەك (یارسان) لەڕۆژانی بەرایی ئیسلامەوە لەناوچەكەدا بوون، ئەمانە بەشێوەیەكی ئاشتییانە كاروباری خۆیان بەڕێوە دەبردو هەڵسوكەوتیان دەكرد. پەیڕەوانی تایفەكە لەكاتی بۆ خۆ دەربازكردن بەلایانەوە دژوار نەبووە كە خۆیان وەك شیعە پێشان بدەن بەهۆی بوونی ناوی ئیمامی عەلی لەهەردوو لاو هەر چەندە بیروباوەڕیشیان لەزۆر ڕێوڕەسمدا لەیەك دوور ئەكەوێتەوە.

هاتنی توركە ئازەرییەكان لەسەردەمی عوسمانیدا بۆ كوردستان ئەم پەیوەندییەی زیاتر كردووە، وا دیارە عەلەویو یارسان زۆریان كار لە یەكتری كردووە بەڵام لە ڕاستیدا ڕەنگە بەهیچ جۆرێك شیعە نەبنو بەهەڵە ئەم گروپانە دەبەنەوە سەر شیعە هەروەك شەبەكیو باجەڵان كە

ڕێزو خۆشەویستی ئیمامی عەلی لای ئەمانە بووەتە هۆی وەرگرتنی ناسنامەی شیعەی موسڵمان یاخود توندڕەو.
کاکەیی ئەو تایفە کەمایەتییەی ئەمڕۆی کوردستان، سەردەمانێك پێیان دەوترا ئەهلی هەق، یارسان بەدرێژایی مێژوو نیشتەجێی چیا سەختەکانی زاگرۆس و شارەزوور بوون وەك کوردێکی ڕەسەن لە سەرهەڵدان و بزوتنەوەدا بوونە، وەك ماف خوراوێك و خاوەنی ڕاستەقینەی وڵات بەرەنگاری هەموو چەشنە داگیرکارێکی خاکی کوردستان بوونەتەوە زیاتریش بۆ لەدەس نەدانی بیروباوەڕی تایبەت بەخۆیان بەگوێرەی چەند کتێبێکی پیرۆزی دەسنووسی پارێزراوی کەلتوری بەجێماویان، ئەمانە خاوەنی زۆربەی ناوچەکانی شارەزورو هەڵەبجەو ئەردەڵان و شاخەکانی شاهۆ، باڵامبۆ، شندروێ، شرام، هەوارەبەرزە، شەمیران و شارو گوندەکانی خورماڵ، سەرگەت، گوڵپ: گوڵپەت، بەڵخە، بیارە، تەوێڵە، نەوێ، هاوار، گرییانە، هاوارە کۆن، دزڵی، شیان، کەڵاتی، سێ قاڵتان، وزیار، چادرگە، تەپی سەفا، سازان، مۆردین، پردێوەر، نەوسود، شێخان، دگاشێخان، داودان، دیواندەرە، دزاوەر، عەربەت، سەیسایق، باوەنور، خۆشێن، کفری (باوە شاسوار)، خانەقین و مەنەلی، گوندەکانی گەرمیان شارۆچکەکانی قەسری شیرین و کرماشان بوون.
لەشەرەفنامەدا ئاماژە بۆ چەند شوێنێ لەمانەی ناومان برد کراوەو خولێخۆشبوو مامۆستا ڕۆژبەیانی زیاتری لەسەر نووسیوە، دەسنووسەکان بەڕاشکاوی دەڵێن ئەم کاکەییانە خاوەن حکومەت و دەسەڵاتداری ئەم ناوچانەی کوردستان بوونە، کە بەندە پێم وایە بەشێکیان بە (ئەنان) یاخود دەوڵەتی (عەیار)ی پەیدا بوون و پاشان ناویان بەنوسەیری لەکوردستاندا ژیاوەتەوە، لەدوای سێ سەدە بەناوی ئەهلی هەق هاتوونەتە سەرهەڵدان و ڕەنگوبۆی شۆڕشەکانی سەردەمانی (ئومەوی و عەباسی)یان لەخۆ گرتووە دژی ئەو دوو دەسەڵاتە لەکوردستاندا بۆ ڕزگاربوون هاوشانی خەڵکانی تری غەیرە عەرەب لەژێر دەسەیی، دەستیان بەسەرهەڵدان کردووە، برێ جاریش چەشنی ئەو شۆڕشانەی بەناوی (مەهدی – مەهدەوییە) لەبزووتنەوەو سەرهەڵدان دا بوونە، سوودیان لەو شۆڕشانە بینیوە، کە لەمێژوودا چەندین شۆڕشیمان خوێندوەتەوە بەناوی پەیدا بوونی حەزرەتی مەهدی و ئامانجیش لەو شۆڕشانە خۆ ئاڵاندن بووە بۆ پەیداکردنی پشتگیری و سووربوون لەسەر بەردەوامی سەرهەڵدانەکە. دیارە گەلانی ستەم دیدە، یاخود گرووپە ئایینییەکان زیاتر پەنایان بۆ ئەم مەبەستە بردووە، بۆیە لەم ماوەیەدا ئەوانەی بەم شۆڕشانەوە خەریك بوونە ڕەنگو بۆی شیعەیان لێنیشتووە، بەناو، بۆگێڕانەوەی ماف زەوتکراو بۆ بنەماڵەی (ئال و بەیت)ی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەتایبەتی عەلی و حوسەینی کوڕی (سەلامی خوای لەسەر بێت).
لە چیاکانی زاگرۆسی کوردستان، ئەم جۆرە سەر هەڵدانانە نێونراون بەشۆڕشەکانی (عەلەوی) یان (فاتمی)، یان باتنییەکانی وەك شەبەك و نوسەیری و ئەهلی هەق کە لە ڕاستیدا هیچ پەیوەندییەکیان بەشیعەگەرییەوە نیە، سەرچاوەکانی شیعەش ڕەتیان دەکەنەوە، بەپەیدا بوونی شێخ عیسێ و موسێیی بەرزنجی لەکوردستاندا کە ئەو کات لەهەمەدانەوە هاتنە کوردستانی باشوورو ناوچەی کرمانجی شارباژێر لە شوێنێکدا کە زنجی لێدەڕوا هەواریان گرت و خەڵکانێ لەدەوریان کۆبوونەوە کەدوو زاتی خواناسی بێ وێنەی ئەو دەمەبوون، لەناو ئەو ماڵە خانەوادەیە زاتێك پەیدابوو بەناوی (سان سەهاك– سوڵتان ئیسحاقی کوڕی شێخ عیسا) (٧١٦ کۆچی–١٣١٦ زایینیی).
خەڵکانی کاکەیی لەدەوری کۆبوونەوە کە هەرلێرەدا بەناوی (کاکەیی) ناونران. دیارە پەیدابوونی ئەم زاتە (چاوەڕوان کراوە) گەورەترین دەرگای خێرو خۆشی بۆ کاکەیی کردەوە، سەردەمی زێرینی بوژانەوەو ژیانەوەی ئەو خەڵکانە لەقەڵەم دەدرێ کە بەدرێژایی مێژووی ناوچەکە لە بزاڤ و سەرهەڵداندا بوون.
(سان سەهاك) ئەو ڕێبەرە گەورەیە توانی گۆڕانکاری بەسەر دەورەکانی پێش خۆی بهێنێت کە بەناوزی و شاخۆشین دەناسران، هەستا ڕێرەوو ڕێبازێکی سۆفیزمی گونجاوی خواپەرستانەی بناغە دانا لە شارۆچکەی (پردێوەر)ی نەسود، موریدانێ زۆری کەمەندکێش بوو لە شارەزوورو هەردوو هەورامانی تەخت و لهۆن و بەوناوچانەدا شۆڕبوەوە، لێرەدا کاکەییان ڕەنگوبۆی بیری موسڵمانێتیان لەخۆ گرت و زیاتریرو باوەڕی دەروێشی و زاراوەکانی تەسەوف لەناو نوسراوەکانیاندا دەبینرێ، کە چی ٣٠٠ ساڵ پێش پەیدابوونی سان سەهاك تاموبۆنێکی تر لەنوسراوەکانی شاخۆشین لوڕستانی و باباناوزی سەرگەتی هەست پێدەکرێ تادەرکەوتنی بنەماڵەی ئەردەڵانییەکان کە بابا ئەردەڵان بە دامەزرێنەری ئەم ئیمارەتە دەژمێردرێ و زمانی ڕەسمی بەڕێوەبردن و دینی ئیمارەتەکە (ماچۆی هەورامی–گۆران) بوو، بابانەکانیش هەر لەمانەوە چەکەرەیان کردووە.
ئەدەبیاتی ئایینی ڕێبازەکە هەموو بەزاری گۆران یاخود وەك خۆیان ئەڵێن بەشێوە زاری (ماچۆ)ی گۆران وتراون. لەگەڵ ئەم زارەش دا شێوەی کرمانجی شارباژێر بەکار هێنراوە، بەڵام دیارە ئەدبیاتی نووسراوی کلاسیکی گۆران پێشی کەوتووە بەوەی کاتێ سان سەهاك چووە مەڵبەندی گۆرانەکان سوودی لەزمانەکەیان وەرگرت و کردیە زمانێکی ڕەسمی ڕێبازەکەی. جا ئەبینین سان سەهاك بەزاری گۆران هاتووەتە ئاخاوتن و کەمجار بەشێوەی کرمانجی شاباژێر دواوە. ئەو گفتو گۆ ئەدەبی و ئایینییەی نێوانی خۆی و (عابەدین)[٧٣] جوانترین قاڵبی دارشتنی شیعرو ئەدەبیاتە، عابەدین بلیمەترین و خۆشخوانترین کەسێکە لەناو یارانی سەهاکدا کە هاتووە بەرامبەری سوڵتانی سەهاکی گرتووەو جوانترین و بەنرخترین ملوانکەی شیعری ئایینی و سۆفیزمی نەخشاندووە.
کاکەیی و بیروباوەڕی تێکەڵ بە بیرۆکەکانی دەوڵەتی ئاق قۆینلو، قەرە قۆینلو، سەفەوییەکان دەبێت کاتێك ئەمانە شاری کەرکوك و داقوق دەوروبەری داگیردەکەن و دەبنە حاکمی ناوچەکەو ئیمارەتی ئەردەڵان بێهێز دەکەن، لە کاتێکدا لە دوای نەمانی مەغۆل لە کوردستاندا لە ساڵی

(٧٣٩ کۆچی-١٣٣٥ زایینی) داقوق سەر بە ئیمارەتی ئەردەڵان بوو، سورخاب بەگ حاکمی داقوق بووە، واتە داقوقو کەرکوك بەشێك بوون لە شارەزوورو لەژێر دەستی ئەردەڵانییەکاندا بووە تا دوا سەردەمی عوسمانییەکانیش چونکە (مەئمون بەگی کوڕی بێگەبەگ)یش سوڵتان سەلیمی قانونی دەیکاتە پارێزگاری کەرکوك بە موچەی سی هەزار ئاقچە.

لەدوای کەوتنی خەلافەتی عەباسی بەدەستی هۆلاکۆو، ملکەچ کردنی ئێرانو جزیرەو کوردستانو عێراقی عەرەبی بۆ داگیرکەرانی مەغۆلیو پاش هەرەس هێنانی دەسەڵاتی داگیرکەرانی مەغۆلە تەتەرەکان لە کوردستان بە لەناوچوونیان لەساڵی (٧٣٩ کۆچی-١٣٣٥ زایینی)، داقوقو دەوروبەری کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئیمارەتی ئەردەڵانی گۆرانە کوردەکان کە (بابا- باوە ئەردەڵان)ی سەرگەورەیان بە دامەزرێنەری ئەم ئیمارەتە دەژمێردرێو لەپاش خۆی چەند پشتێك لەنەوەکانی فەرمانڕەوایی تێدا دەکەن.

لە شەرفنامە بەدرێژی باسی نەوەکانی بابائەردەڵان کراوە تاکو سەردەمی شەرەفخان خۆی واتا تا ساڵی (١٠٠٥ کۆچی-١٥٩٧ زایینی) سەبارەت بەرەگو رەچەڵەکی (بێگەبەگ) لە نووسراوێکی (مەئمون بەگ)ی کوردیدا هاتووە دەڵێ: ((رشتەی بەندە (بێگە بەگ) دەگەڕێتەوە بۆ (ابي عبيدە الجراح) و (أمير المؤمنين العباس) و یەکێك لە باپیرانی بەناوی (عادل-عادلان)یەوە لە سەرەتای رۆژانی کوشتارەکانی (جەنگیزییەکان) لەسەر (شارەزور) والی بووە))[٧٤]. کەچی شەرەفنامە دەڵێ: ((بابا ئەردەڵان ناوە بۆ پیاوێك کەچەند سەردەمو تاوێك لەناو هۆزەکانی گۆراندا ژیانی رابواردووە، لەبەرەو دوای جەنگیزییەکاندا دەستی بەسەر شارەزووردا گرتووەو ئەمیرایەتی لێ دامەزراندوە، ئەوسا ناوی بابا ئەردەڵانی گۆڕیوەو کردوویە بەقوبادی کوڕی فەیروزی ساسانی))! [٧٥].

بەڵام مامۆستای خوالێخۆشبوو رۆژبەیانی لەم بارەیەوە دەڵێ: ((لەدوای وەرگێڕانی شەرەفنامەو وردبونەوەو قوڵبونەوەم لەم ناوچانەی ئەم دەوڵەتی ئەردەڵانەی تێدا پەیدا بوو، گەیشتمە بیروباوەڕێك کە هیچ کام لەمێژوونوسانی بیریان بۆ نەچووە کەوا بابا ئەردەڵان یەکێك بووە لەپیرەکانی (گۆران) ی کاکەییەکانو (بابا) واتای وشەی (پیر- شێخ)ی رێباز دەگەیێنێو وشەی ئەردەڵانیش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە (هەردەڵان- شاخەکان، تەپۆلکاییەکان) دێتو ئەو ناوچانەی (هاوار، داودان، نەوسود، شێخان، زەڵم) لە کاتی خۆیدا دانیشتووانی کاکەیی بوون، شەرەفخانیش ئاماژەیەکی بۆ ئەم باسە کردووە بەوەی وتوویە وادیارە دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە کۆتایی پێهات بۆ فەرمانڕەوا (پیر بۆ داق بەبەیی- بابایی) کەواتای نازناوەکەی گۆ کردنی (بابان) دەگەیێنێتو ئەمانەی ناویان دەبەین وەکو (باوە محەمەد، باوە پڵاوی، باوە شاسوار باوە یادگار.. پیرەمەگرون، پیرمەسویر، پیرشالیار لەسەرۆکە ئایینییەکانی کورد بوون))[٧٦].

ئەگەر سەرنج لە نووسینەکانی (مەئمون بەگی کوڕی بێگە بەگ) بدەین، کە بریتییە لەنووسینێ بیرەوەرییەکانی خۆی وەك سکاڵایەك بۆ (سوڵتان مورادی سێیەم)ی عوسمانی بەهۆی دانشتنیەوە لەسەر تەختی پادشایی، دەبینین باسی بەسەرهاتوو فەرمانڕەواییو دەسەڵاتی خۆیو باوکیو بارودۆخی ناوچەی شارەزور دەکاتو پێناسەی رشتەی بنەماڵەکەیان بۆ سوڵتان دەردەخاتو خۆی دەباتەوە سەر بنەماڵەی (عادلانی)، ڕای کردووە لەو راستییەی کە بزاندرێت یەکێکە لە بنەماڵەی بابا ئەردەڵانو لەسەرۆکەکانی گۆران ئەوەك سوڵتان بزانێ ئەمانە خاوەن بیروباوەڕێکی تایبەتن....)[٧٧] بەڵا پاش ئەوەی مەئمون بەگی بێگەبەگ کەوتە بەر لوتفو مەرحەمەتی سوڵتان سلێمان قانونی، کرایە پارێزگاری لیوای کەرکوك پاش وەفاتی باوکی لەساڵی (١٥٥٠) زایینی مێرنشینی شارەزوری پێ بەخشرا.

لە ساڵی (١٥٧٧) زایینی کوڕێکی هەبووە بەناوی محەمەد ئەویش ماوەیەك پارێزگاری کەرکوك بووە، شایانی وتنە ناوچەکانی داقوقو قەرەحەسەنو زەنگ ئابادو شوێنانی تری کەرکوکی لەژێر دەسەڵاتدا بووە[٧٨].

لە کاتی دووبارە هاتنی سەفەوییەکان بۆ ناوچەکانی کەرکوكو دەوروبەری، لەسەردەمی شاە تەهماسپی یەکەم (١٥٢٤-١٥٧٦) زایینی بەشێوەیەکی کاتی هەستان حاکمێکی کەلهوری کوردیان لەسەر (کەرکوك) دانا[٧٩] داقوقیش بەشێك بوو لەکەرکوك. کریستین نیبۆر لەیاداشتەکەیدا ((گەشتی عەرەبستان وولاتە دراوسێیەکانی)) لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدە سەبارەت (داقوق) نووسیویەتی: ((وەختی خۆی کەرکوكو شاری (تاوغ-دەقوقای کۆن) هەر یەکە ناوچەیەکی سەر بەفەرمانڕەوایی کورد بوو، بەڵام لەم دواییەدا لێی دابڕانو سەر پادشایەتی بەغدا خراون.. پاشای پلە دووی تورکان کە لەکەرکوك دادەنیشێ، لەناوەندی شار دادانیشێ، لەوبەر دادەنیشێ، زەویو زاری زۆرکەمە، قەڵاکەی کەبەناوی شارەکەوە ناونراوە، زۆر ئاپۆرە، حامیەیەکی یەنیچەری لێیە...))[٨٠].

ئەردەڵانییەکان خاوەنی دەسەڵاتێکی بەرفراوان بوون، خۆی دەگەیاندە (زێی کۆیە)، هەورامان، شارەزور، قەرەداغ دەشتی گەرمیانو (نێوان چیای قەرەداغو رێگای کفری- کەرکوك) یشیان لەژێر دەسەڵاتدا بووە[٨١] بەتایبەتی کەرکوكو چواردەوریو هەندێ جار پاشای (کەرکوك) عوسمانی، هێزەکانی خۆی لەکەرکوك دەکشانەوە، کاروباری بۆ (خان ئەحمەد خان)ی سەرۆکی ئیمارەتی ئەردەڵان بەجێ دەهێشت[٨٢]. ئەو ململانێیەی نێوان سەفەویو عوسمانی هەندێ جار دەبووە هەلێك بۆ ئیمارەتی ئەردەڵان کە بێتە خاوەن دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆیانو بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتو دەوڵەتیان، هەر لەم رێگایەوە هەندێ جار لایان بەلای سەفەویدا کردووەتەوەو هەندێ جاریش بەلای عوسمانیدا. لەو بۆچوونەوە کەوا ئەردەڵانییەکان کاکەیی بوونەو هیچ بە دووریشی نازانم راستییەك بخەمە روو کە گۆڕی (خان ئەحمەد)ی کاکەیی کە شەخسێکی پیرۆزی کاکەییەکانی گەرەکی چایو موسەڵلای کەرکوکە کەئەمرۆ بووەتە (ئیمام ئەحمەد) زیارەتگای کاکەییەکانە هەمان ناوداری ئەردەڵانی (خان ئەحمەد خان) بێت کە خۆی دایە

پاڵ عوسمانییەکان‌و دژی سەفەوییەکان جەنگی، لە شاری موسڵ دادەنیشت لە ساڵی (١٠٤٦ کۆچی) کۆچی دوایی کردووە لەدایکبووی قەڵای (حەسەن ئاوا)یە.کە شێخ ڕەزای شاعیر لەشیعرەکانیدا ئاماژە بۆ ناوەکەی دەکات.

ئەدمۆندز سەبارەت بەدانیشتووانی داقوقی نووسیوە: دانیشتووانی داقوق لە تورکمانە قزڵباشەکانن بە پلە یەك، بەڵام زۆرینەی دانیشتووانی گوندەکانی کوردو عەرەبن لەگەڵ تورکمانێکی زۆرکەم لەدوو گوندی نزیکی داقوقدا، ژمارەیەکی زۆر گوندی کوردان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ چەند گوندێ عارەبان لە ڕۆژئاواوە کەموڵکایەتی زەوییەکانییان دەگەڕێنەوە بۆ کاکەییەکان کە خاوەنی هەژدە گوندی ناوچەی داقوقن، تاڵەبانییەکانیش خاوەنی حەوت گوندی ناوچەکەن‌و داودییەکانیش خاوەنی یانزە گوندن(٨٣).

ئەدمۆندز دێتە سەر پێناسەی قزڵباش‌و ئەڵێ: زۆربەیان سەر بە بیرو باوەڕی بەکتاشین کە (حاجی بەکتاش وەلی) مورشیدو پیرێکی خوراسانی بوو، لە (کرمشهر)ی ئەناتولیا لەنیوەی دووەمی سەدەی دوانزە تێیدا جێگیر بووە، سوڵتان موڕادی یەکەم سوودی لێوەرگرتن بۆ ماوەی چوار سەدە بەهۆی دروست کردنی سوپای یەنیچەری- الانکشاریە، ئەم سوپایە پێکهاتبوو لە منداڵانی مەسیحی، ئەوانەی بە زۆر دەبران‌و دەکران بەموسڵمان، یاخود لەشەڕدا دەستگیر دەکران، فێری سەربازی‌و ژیانێکی سۆفییانەی تایبەت دەبوون بۆ بەرگری بوونەوە لەنارەحەتی ژیان‌و سەختی ڕۆژانی سەربازی، ئەمانە بڕبڕەی پیشتی سوپای عوسمانی بوون‌و هیچ پارەو پولێکیان پێ نەدەدرا تەنیا لە ڕۆژانی شەڕدا نەبێ. بۆیە ماوەی ئەوەیان پێدرابوو بازرگانێتی بکەن‌و لەدوایی دا ئەمانە مەیلیان بەرەو شۆڕش بوو، دوا سەرهەڵدانیان لە زستانی ساڵی ١٨٢٦ زایینیی بەسەر برین کۆتاییان پێهات، بەکتاشی زیاتر لەتازە-بەشیر-تسین‌و داقوق، خورماتوو، قەرەتەپە، لەیلان دا هەن‌و ئەمانەیش لەدوو تایفەی مەزهەبی (دەروێشان‌و سۆفییان) پێکهاتوون (٨٤). هەر لەبەر ئەمەیشە دەبینین لە داقوق‌و کەرکوك ئەم سێ ڕێبازە سۆفیگەرییە دێتە دامەزراندن:

١. بەکتاشی- ڕێبازی حاجی بەکتاش وەلی ٧٣٨ کۆچی- ١٣٣٧ زایینیی.

٢. بابایی- ڕێبازێکە دەدرێتە پاڵ باباتاهیری عوریان هەمەدان- کوردی ئال هەق.

٣. ڕێبازی بەرزنجی- دەدرێتە پاڵ شێخ حەسەن بەرزنجی لە نەوەی شێخ عەلی دۆڵ پەمو.(٨٥)

ئاووهەوای داقوق مامناوەندییەو ئاوی سازگارو خۆشە کە بە (ڕۆخانە)و (باسەرا)ی نێودەبەن، بەزۆری خانووبەرەی لەقوڕ دروست کراون‌و دارەڕا کراون، رووناکیشیان بەهۆی زەیت‌و مۆمەوەیە، زمانەکانیشی کوردی‌و تورکییەو شتێکی نامۆ بووە کەسێك بەعەرەبی بدوێ یان لێی تێبگات(٨٦).

ژمارەی گوندەکانی داقوق (٦٢) گوندەو گرنگترینیان (هەفتەغار)و قوتابخانەو نەخۆشخانەیەکی تێدا بووە، دووەمیان (تۆپزاوەی کاکەیی)یە لە ١٩٣٥ خاوەنی قوتابخانەو بیری ئیرتیوازی‌و نەخۆشخانەیەك بووە.

هۆزەکانی ناحیەکەش بریتین لەچوار هۆز، داودەو تاڵەبانی‌و کاکەیی‌و عوبێد لەگەڵ هەندێ لەتیرەی هۆزەکانی کوردو عەرەب(٨٧).

مامۆستا ڕۆژبەیانیش دەڵێ: ناوی (داقوق- دقوقا) دەستەواژەیەکی کوردی ئاوێتەیە لەدوو بڕگەی (دە) واتە گوندو (کوك-کۆك) کەبەواتای گەورە دێت، کە تێکڕا واتاکەی دەبێتە (دێی کۆك- دێی گەورە)(٨٨). کەچی تورکە ئازەرییەکانی داقوق ناوەکەیان بە (تاووق) گۆڕیوە واتە مریشك. کاکەییەکانی ناو شارۆچکەی داقوقیش گوندەکەی خۆیان ناو ناوە (خۆرس= کەڵەشێر)و بووەتە گەڕەکێکی مەزنی داقوق.

شایانی باسە قزڵباش تەنیا تورك ناگرێتەوە بەڵکو بەشێکیشی کوردن‌و ئەمۆندز ئاماژەی پێداوە لەلاپەرە (٢٥٢) کتێبەکەیدا کەوا تیرەی (عمارلی) قزڵباش کوردن‌و سەر بەفارس بەگن لەدەڤەری بەیاتدا.

دەکرێ بوترێ کاکەییەکان بە گوێرەی چەندین لێکۆڵینەوەو سەرچاوەی مێژوویی یەکێکن لە دانیشتووانە ڕەسەنەکەی شاری کەرکوك‌و دەورووبەری‌و کەرکوکی زادەن‌و نیشتەنی ڕەسەنی ناوچەکەن هاوشانی بنەماڵەکانی تەتەر-بەیات، کەڵهوڕ، سۆرانی، هەورامی، گۆران، هەمەوەن، زەنگەنە، ساڵەیی، جەباری، داودە، شێخانی، لەك.

کەرکوك نزیکەی سەدەیەك لەمەوبەر لەژێردەستی ئیمپراتۆرێتی عوسمانییاندا بوو، زمانی دانیشتووانی کوردیی‌و فارسیی، زیاتر تورکی بووە، لەبەر ئەوەی زمانی فەرمی دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانی بووە، کراوەتە زمانی خوێندن‌و بەڕێوەبردنی شارەکە، بەڵام زمانی شیعرو ئەدەبیات زیاتر فارسی‌و شێوەزاری ماچۆی گۆران بووە، کە دەیان داستانی پێ نووسراوەتەوە.

(عەباس ئەلعەزاوی) ئەڵێ لەناو شاری کەرکوك دا ڕوحێکی ئەدەبی هەیە مەیلیش بەرەو زمانی فارسی زیاترەو چەندەها دیوانی شیعری فارسی تێدا بڵاوبووەتەوە ڕەواجی هەیە خەڵکی ئەم شارە خوویان داوەتە ئەدەبی فارسی‌و تورکی وای لێهاتووە کە زمانی تورکی لەم شارە ببێتە زمانی لە یەك گەیشتن، هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ نیشتەجێ بوونی ئەو قەومە تورکانەی کە زمانیان ئازەرییەو نزیکە لەتورکی ئەنادۆڵەوە، کەرکوکیش گەورەترین سەرچاوەی کاربەدەستانی تورك بوو لەسەردەمی عوسمانیدا(٨٩).

کەوابوو بەردەوام لە کەرکوکدا ڕوحێکی ئەدەبی هەیە، پێشتر تورکی‌و فارسی زمانی شیعر بووە هاوشانی زمانی کوردی، (بۆ نموونە سەرنجی شیعرەکانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی‌و هیجری دەدەی کاکەیی بدەن بە کوردی‌و تورکی‌و فارسیی) یە چەندین دیوانی شیعری فارسی‌و کتێبەکانی گوڵستان‌و بۆستان سەعدی شیرازی‌و شاکارەکانی فیردەوسی‌و دیوانی شاعیرانی تورکی عەلەویانی بەکتاشی وەك ئەودال‌و رووحانی‌و وێرانی‌و فزولی کە بە شێوەی ئازەری نوسراوون. لەناو شارەکەدا بڵاوبونەوە، سەرەڕای ئەمانە کەرکوك گەورەترین شوێنی کاربەدەستانی تورکی عوسمانییان بووە هەر لێرەیشەوە خەڵکانێکیان پێدەگەیاند کە بتوانن سوودی

*** تایبەتمەندی هورمزییەکان:**
هەر چەندە هورمزییەکان بەشێکی دانەبڕاون لە نەتەوەی کوردو لەکوردستان دەژین، بەڵام گەلێك دابو نەریتی تایبەتی خۆیان هەیە، کە هاوپەیوەستی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەن کە زۆر تۆکمەو بەهێزە لەنێوان خۆیاندا، لە رووی ژنو ژنخوازیو یارمەتیو باربووکردنی یەکتری بۆ کاری پێویست بەتایبەتی لە کاتی تەنگانەو کارەساتدا.
بەڵام لە بارەی سرووتی ئاینیو کاروبارە ئاینییەکاندا لەسەر پەیڕەوی ئاینی ئیسلامن، ئەویش لەچوارچێوەی باوەڕبوونیان بە ئاینی ئیسلام.

*** هورمزییەکان لە رووی زمانەوە:**
بەشی زۆری زمانی هورمزییەکان دیالێکتی کرمانجی خوارووە، لەناوچەی خانەقینیش بە زمانی ئەو ناوچەیە قسەدەکەن، بەڵام لە ناوچەی موسڵ وەکو شەبەکەکانی ئەو ناوچەیە قسە دەکەن، هەروەها بەشی زۆریان بەو زمانە باوەی کوردستان قسە دەکەن.

*** شەجەرەی هورمزییەکان لە کەرکوك:**
بنەرەتی ئەم هورمزییانە دەگەڕێتەوە بۆ سەر (عەبدولرەحمان چادر وەسمان)، کە دەکاتە باپیرە گەورەیان، یان وەکو هورمزییەکان باسی دەکەن ئەم ناودارەیان لە دێی (قوشاغلو) نێژراوە، بەڵام لەدوای خۆی کوڕێکی لێ بەجێماوە بەناوی سلێمان چادر وەسمان، ئەم زاتەش سێ کوڕی لی بەجێماوە بە ناوەکانی قادر، بایز، چۆبان.
لە بنەرەتدا چۆبانیش سێ کوڕی لێ بەجێماوە بەناوەکانی بایز، عەلی مالی، سلێمان.
بەڵام دەربارەی (چادر)و براکانی گوایە دەڵێن لە گوندی قوشاغلو لە ناحیەی (قوشتەپە) هاتوونەو بڵاوبوونەتەوە، تاکو ئێستاکە گەلێك خێزانی هورمزیاریان هەیە لە هەولێر بەناوەکانی: خێزانی حاجی حەسەن، خێزانی قادر سەڵاحی، قادر حەداد، نازم قەساب، ئەنوەر عەلیاوە، ئەحمەد ماستاوە، خێزانی سەعدی لەگوندی گۆمەشین، مام کاکل، گوندی شێخ شێروان، مامە غەفور لە گوندی سەیید عوبێد لە سمایلاوە، چۆخا ئەسکەندەر لە سمایلاوە، نەریمان، لەمیە سوورە، کاکە ئەمین لە کۆیە حاجی سەعید لە ساتوقەڵا، چۆخا جەوهەر لە تلیان، هەلی فەتاح لە بازیان حاجی مستەفا لە گوندی مەحمود قەجەر.
بنەرەتی شەجەرەکەیان، وەسمان چادر.
سلێمان چادر وەسمان منداڵەکانی بریتییە لە: (قادر، بایز، چۆبان).
منداڵەکانی بایز بریتییە لە: (محەمەد، خدر، عەبدوڵڵا، محێدین، مەحمود)، منداڵەکانی چۆبان بریتییە لە: (بایز، عەلی مالی، سلێمان).
* منداڵەکانی عەلی مالی: رەمەزان- حەمید.
* منداڵەکانی سلێمان: عومەر- مستەفا- قادر- نادر- محەمەد- عەلی.
* منداڵەکانی محەمەد بایز: سەعید- کەریم- عەزیز- سەلیم- سدیق- سەمەد- حەسەن.
* منداڵەکانی ئەحمەد بایز: عوسمان- حەمید- جەلال- خورشید- رەشید- سەلاح.
* منداڵەکانی سالح قادر سلێمان: نوری- عیزەدین- نەجمەدین- بەهائەدین- مامەند (سوور).
* منداڵەکانی ئەحمەد قادر سلێمان: یاسین- تەها- محەمەد- بەکر- قادر- شوکر- عەباس.
* منداڵەکانی کەریم قادر سلێمان: جاسم- قاسم- محەمەد- رەمەزان- خالید- قارەمان.
* منداڵەکانی عەبدوڵڵا قادر سلێمان: عەبدلمەناف- محەمەد- عەبدولوەهاب.
* منداڵەکانی حەمە رەزا نادر سلێمان: سلێمان- عوسمان- تۆفیق.
* منداڵەکانی محەمەد سلێمان: حوسێن محەمەد سلێمان: سەلاح سوڵتان محەمەد سلێمان: محەمەد- عادل- ئەحمەد.
ئەحمەد محەمەد سلێمان: منداڵی نییە.
* منداڵەکانی عەلی سلێمان:
عەبدولرەحمان عەلی سلێمان: عوسمان- بەکر.
وەلی عەلی سلێمان: شوان- ئازاد.
ئیبراهیم عەلی سلێمان: رەمەزان- خەلیل- جەلیل- ئیسماعیل- عەبدوڵڵا- عادل.
* منداڵەکانی خدر بایز: قادر.
* منداڵەکانی محەمود بایز: کەمال- عەلی- عەبدوڵڵا- ئازاد- خالید- شێرزاد- مقداد- شوکور- فەرهاد.
* منداڵەکانی محێدین بایز: حەمید- مەجید- ناسراو.
* منداڵەکانی عەبدوڵڵا بایز: منداڵی نییە.
* منداڵەکانی عومەر سلێمان: سەعید.
* منداڵەکانی مستەفا سلێمان: فەتاح- رەسوڵ- محەمەد ئەمین.
* منداڵەکانی قادر سلێمان: سالح- ئەحمەد- کەریم- عەبدوڵڵا.
* منداڵەکانی نادر سلێمان: حەمە رەزا.
* منداڵەکانی محەمەد سلێمان: حوسێن- ئەحمەد سوڵتان.
* منداڵەکانی عەلی سلێمان: عەبدولرەحمان- وەلی ئیبراهیم.
* منداڵەکانی سەعید عومەر سلێمان: حەسەن- سەفەر- جفر- جەبار- جەلال- ستار- کەمال.
* منداڵەکانی فەتاح سلێمان: منداڵی نییە.
* منداڵەکانی رەسول مستەفا سلێمان: حەسەن- رەمەزان.
* منداڵەکانی محەمەد ئەمین مستەفا سلێمان: شەریف- ئەحمەد- ئەیوب[١١٤].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. (کوردو کوردستان)، دکتۆر عەبدلرەحمان قاسملۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢٦).
٢. (قاموس الاعلام التركي)، (٥١٣٠٨، ١٨٩١)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣. گۆڤاری (اهل النفط)، گۆڤارێکی بۆ ژمارە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە بەناونیشانی (كركوك بين ١٩٢٧ – ١٩٥٧) نووسنی (فازل مستەفا)، لاپەڕە (٢٤).
٤. (العراق الشمالي)، شاکر خەسباك، لاپەڕە (٢٣٤).
٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٠. بۆ زیاتر بروانە ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:- (دليل المملكة العراقية تاريخي، اداري، تجاري، صناعي، زراعي، مصور) سالی یەکەم (١٩٣٥ – ١٩٣٦)، چاپخانەی (ئەمین) بەغدا، ١٩٣٥م.
– (دليل جمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠).
– (دليل جمهورية العراقية لسنة ١٩٦٥).
– (احصاء سكان لسنة ١٩٤٧. احصاء سكان لسنة ١٩٥٧).
– (مجموعة الأحصائية لسنة ١٩٦٠).
١١. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٧).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (٢٦٩).
١٣. بروانە سەرچاوەی ئامارەکانی ساڵەکانی: (١٩٩٤، ١٩٤٧، ١٩٥٧، ١٩٨٥، ١٩٧٧).
١٤. گۆڤاری (هەتاو)، ژمارە (١٠٩)، ساڵی چوارەم (٣٠ ئەیلول)، ١٩٥٧، لاپەڕە (١٨).
١٥. گۆڤاری (هەتاو)، ژمارە (١٧٩)، ساڵی حەوتەم، ١٥ی حوزەیران ١٩٦٠، لاپەڕە ٢٨.
١٦. (کوردو کوردستان)، د. عەبدولرەحمان قاسملۆ، لاپەڕە (٢٦).
١٧. (قاموس الاعلام)، بەرگی پێنجەم، بەزمانی تورکی، ئەستەمبول، ١٨٩٦، لاپەڕە (٣٨٠٢).
١٨. (كركوك لمحات تاريخية)، لەیلا نامیق جاف، هەولێر، ١٩٩٤، لاپەڕە (٩).
١٩. گۆڤاری (گولانی عەرەبی)، ژمارە (٣٢)، (٢٥)ی کانوونی دووەم ١٩٩٩، لاپەڕە (٣٨ – ٣٩).
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩).
٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە.
٢٢. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٣٥ – ١٣٧).
٢٣. گۆڤاری (گولانی عەرەبی)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨، ٣٩).
٢٤. (موجز تأريخ التركمان في العراق)، شاکر سابیر زابیت، لاپەڕە (٢٦).
٢٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٧، ٢٨، ٣٠).
٢٦. (كرد ترك عرب)، ئەدمۆند، لاپەڕە (٢٤٢).
٢٧. (مشاهير الألوية العراقية)، عەبدولمەجید فەهمی، بەرگی دووەم، کە تایبەتە بە پارێزگاری کەرکوك و سلێمانی، لاپەڕە (٥٧ –٥٨). هەروەها بروانە:
– گۆڤاری (الأخاء)، ژمارە (٨و ٩) ساڵی (١٩٦٧ – ١٩٦٨)، لاپەڕە (٨).
٢٨. (كرد ترك عرب)، هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (٢٤٢).
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤٢).
٣٠ گۆڤاری (کەرکوك)،
٣١. گۆڤاری (هەتاو)، ژمارە (١٤٤)، ساڵی (٥)، (٣٠) تشرینی دووەم ساڵی (١٩٥٨). لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:- (زمانی تورکی لە عێراقدا چۆن پەیدا بوو)، لاپەڕە (٢٢).
٣٢. ((تۆرانیەت جووڵاندنەوەیەکی تەسك و تروسکی نەتەوەییە، لە ئاخرو ئۆخری سەدەی پێشوودا نیشانەی دەرکەوت، وەك ڕێبازێکی دوژمنانە بڵاوبووەوە کە تا شۆرشی (١٩٠٨)ی تورکیا مەبەستی ئەوە بوو ئەو نەتەوانەی ژێر دەستی تورکیا کە تورك نەبوو بیانکا بە تورك، پاشانیش شێوەیەکی تازەی وەرگرت بانگی ئەکرد بۆ یەکخستنەوەی (تۆران)ی نیشتمان کە بە تەما بوون بەشێکی زۆری عێراقیش بگرێتەوە.. بروانە گۆڤاری هیوا، ژمارە (١) ساڵی (٣) تشرینی دووەمی (١٩٥٩) جووڵانەوەی تۆرانیەت لەژێر تیشکی لێکۆڵینەوەدا نووسینی ئیبراهیم عەلاوی، وەرگێرانی (محەمەد مەلا کەریم)، لاپەڕە (٢٠ – ٢١).
٣٣. (العراق قديماً وحديثاً)، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم، ساڵی (١٩٨٢)، لاپەڕەی (٤٣).
٣٤. (ڕۆمانی هەڵکشان بەرەو لووتکە)، عەبدوللا سەراج لاپەڕە (٥).
٣٥. (العراق قديماً وحديثاً)، لاپەڕە (٤٥).
هەروەها بروانە:
– (مشاهير الألوية العراقية)، لاپەڕە (٦٤).
(٣٦). (پەیوەندییەکانی ئاسوورییەکان و بەریتانیا ١٩١٨-١٩٣٢)، لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی-سیاسی)یە، سیروان حەمە سەعید حەمە خورشید، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٢٦).
(٣٧) (تاريخ الاثوريين)، بەشی یەکەم، نووسینی ماتفییف و مار یوحنا)، وەرگێرانی ئوسامە نوعمان، ١٩٧٠، لاپەڕە (٧).
(٣٨) (یاداشتەکانی مێجەر نۆئێل لە کوردستان)، حوسێن ئەحمەد جان، حوسێن عوسمان نێرگزە جاری، بەغدا، ١٩٨٤، لاپەڕە (١٨٥).
(٣٩) (پەیوەنییدەکانی ئاسوورییەکان و بەریتانیا ١٩١٨-١٩٣٢)، لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی-سیاسی)یە، سیروان حەمە سەعید حەمە خورشید، ٢٠٠٩، لاپەڕەکان (٣٢-٣٣).
(٤٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٣٧-٣٨).
(٤١) (تاريخ الاثوريين)، بەشی یەکەم، نووسینی ماتفییف و مار یوحنا)، وەرگێرانی ئوسامە نوعمان، ١٩٧٠، لاپەڕە (٤٤).
* سەرچاوەی ئەرمەنەکانی کەرکوك
(٤٢) (مێژووی بڵاوبوونەوەی ئاینیی مەسیحی لە ناوچەی

کەرکوکدا)، سمکۆ بەهرۆز (ئەژی)، ٢٠٠٦، لاپەرە (٩٣)، هەروەها بروانە: چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسایەتی (هوسیب بید روس) کە لە ساڵی ١٩٣٣ لە دایك بووە.
٤٣. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٢) (١٩٩٩).
٤٤. گۆڤاری (گوڵانی عەرەبی)، ژمارە (٣٢)، کانوونی دووەم ساڵی (١٩٩٩)، لاپەرە (٣٨، ٣٩).
٤٥. رۆژنامەی هەواڵ
٤٦. (إحصاء السكان لسنة (١٩٤٧). إحصاء السكان لسنة ١٩٥٧)، چاپخانەی ئەلعانی، بەغدا، دەربارەی سلێمانیو کەرکوك.
٤٧. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٢) لاپەرە (١١٠ - ١١١).
٤٨. (العشائر الكردية)، وەرگێرانی فوئاد حەمە خورشید، ساڵی (١٩٧٩)، لاپەرە (١١٩ - ١٢٠).
٤٩. (العشائر الكردية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١١ - ١١٢).
٥٠. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٣) لاپەرە (١١١ - ١١٢).
٥١. (العشائر الكردية)، لاپەرە (١١٠ - ١١١).
٥٢. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٣).
٥٣. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە لاپەرە (١١٣).
٥٤. (العشائر الكردية)، لاپەرە، (٢٨).
٥٥. (پوختەیەك دەربارەی هۆزی شێخانی بەرزنجی)، محەمەد سەید عەبدولکەریم شێخانی بەرزنجی، ساڵی (١٩٨٨ م - ١٤٠٨ هـ)، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، لاپەرە (٢٤، ٢٥).
٥٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە (٢٦ ، ٢٧).
٥٧. (مێژووی عەشیرەتی زەنگەنە)، محەمەد عەبدولرەحمان زەنگەنە، چاپی یەکەم، ١٩٨٠، چاپخانەی (الأندلس)، بەغدا، لاپەرە (٤٣).
٥٨. (العشائر الكردية)، لاپەرە (١٤٠ - ١٤١).
٥٩. (هۆزەکانی کورد)، وەرگێرانی حوسێن جاف، بەشی دووەم، بەغدا (١٩٩٢)، لاپەرە (٢٢).
٦٠. (تأريخ مشاهير الألوية العراقية)، لاپەرە (٦٥) هەروەها بروانە الداودية ماضيها وحاضرها، غالب عەلی داودی، چاپخانەی (الحيدرية) لە نەجەف، (١٩٥١)م.
٦١. (الداودية ماضيهاو حاضرها)، لاپەرە (١٣).
٦٢. (تاريخ مشاهير الألوية العراقية)، لاپەرە (٦٦).
٦٣- مذكرات مأمون بگ بن بيگە بك، لاپەرە ٤٠٢.
٦٤- العراق الشمالي، لاپەرە ١٥٣.
٦٥- العراق الشمالي، لاپەرە ١٥٣.
٦٦- داقوق دقوقا في التاريخ، لاپەرە ٤١٥.
٦٧- دەستنووسێکی خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ.
٦٨- سەرچاوەی پێشوو.
٦٩- میهرداد ئیزەدی، ئایین و تایفە ئایینییەکان لە کوردستاندا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ژمارە (٢)، ساڵی حەوتەم ١٩٩١، لاپەرەکانی ٥٦-٥٧.
٧٠- سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ٥٧-٥٨.
٧١ سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ٥٧-٥٨.
٧٢- سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ٥٧-٥٨.
٧٣- گۆڤاری کاروان، ژمارە ٦٢، ساڵی ١٩٨٨.
٧٤- داقوق في التاريخ، لاپەرە ٤٠٢.
٧٥- شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، بەکوردی هەژار، چاپی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٣، لاپەرە ١٩٤.
٧٦- داقوق دقوقا في التاريخ، پەراوێزی ژمارە(٢٨٨)، لاپەرە ٤١٥.
٧٧- مذكرات مامون بگ بن بيگە بگ، لاپەرە ١٦، پەراوێز هەروەها گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٢، لاپەرە ٤١.
٧٨- سەلاح نەقشبەندی، یاداشتەکانی مەئموون بەگی بێگە بەگ، سلێمانی، لاپەرەکانی ٢١و ٥٩.
٧٩- د. کەمال مەزهەر، کرکوك و توابعها، لاپەرە ٢٧.
٨٠- کوردو کوردستان لە نیگای چەند گەریدەیەکی رۆژئاواییەوە، لە تورکییەوە شوکور مستەفا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی دەیەم، بەغداد، ١٩٨٣، لاپەرەکانی ١٦٤-١٦٥.
٨١- محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، چاپی دەزگای سەردەم، سلێمانی، لاپەرە ٢٠٦.
٨٢-د. کەمال مەزهەر، كركوك وتوابعها، لاپەرە ٤٥.
٨٣- سی. جی. ئەدمونز، كرد وترك وعرب، وەرگێرانی جەرجیس فەتحوڵڵا، چاپخانەی (تایمس)، بەغدا ١٩٧١، لاپەرە ٢٥١.
٨٤- سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ٢٤٢-٢٤٣.
٨٥- محەمەد جەمیل رۆژبەیانی، داقوق - دقوقا في التاريخ، چاپخانەی (المجمع العلمي العراقي)، ١٩٨٣، بەغدا، لاپەرەکانی ٤٤٥-٤٤٦.
٨٦- العراق قديماً وحديثاً، چاپی حەوتەم، لاپەرە ٢٢٥.
٨٧- العراق الشمالي، ضاڤخانەي (شفيق)، لاپەرە ٢٧٧.
٨٨- محەمەد جەمیل رۆژبیانی، داقوق - دقوقاء في التأريخ، چاپخانەی (المجمع العلمي العراقي)، ١٩٨٢، لاپەرە ٣٧١.
٨٩- عەباس عەزاوی، الكاكائية في التاريخ، لاپەرە ٤٥.
٩٠- کتێبی کوردو کوردستان، ئەمین زەکی بەگ، بەرگی (١)، چاپچانەی (سەیدیان)، مهاباد، لاپەرە ٣٣٧.
٩١- كرد وترك وعرب، لاپەرە ١٧٨.
٩٢- نوری یاسین هەرزانی، الكاكائية دراسة انثروبولوجية، ساڵی ١٩٨٣.
٩٣- هەمان سەرچاوەی، پێشوو، لاپەرە ٤١.
٩٤- ئەژی، مێژووی کارگێری ناوچەی کەرکوك، گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤)، ٢٠٠٢، لاپەرە ١٥.
٩٥. (شۆرشەکانی ئیبراهیم خانی دەلۆ)، ساڵی (٨٠ - ٨١).
٩٦. (گۆڤاری رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)،. حوزەیران، ساڵی (١٩٨١)، (ئاورێك لە مێژووی هەمەوەند)، نووسینی جەمال بابان، لاپەرە (١١٠ - ١١١ - ١١٢).
٩٧. (كركوك دراسة سياسية - اجتماعية)، وریا جاف، لاپەرە (٣٤).
٩٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٤).
٩٩. (العشائر الكردية)، لاپەرە (٩٧).
١٠٠. (گۆڤاری رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١١). ساڵی

(١٩٨٦)، مێژووی هۆزی گل، لەتیف گلی لاپەرە (١١٦).
١٠١. (سەیدەکانی هۆزی گەرمکی گەرمیان)، سەید ئەحمەد سەید حەمید گەرمکی، چاپخانەی ئاشتی - سلێمانی (١٩٩٠)، لاپەرە (١٠ - ١١١).
١٠٢. (شۆرشەکانی ئیبراهیم خانی دەلۆ)، لاپەرە (١٠٣).
١٠٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* سەرچاوەی جەلالییەکان:-
١٠٤. ئینسکلۆپیدیای هەولێر، بەرگی شەشەم، لاپەرە ٢٢٩٤.
١٠٥. مێژووی هۆزەکانی کورد، ئی. جی. ئات هێنری فێلد، وەرگێرانی حوسێنی ئەحمەد جاف، لاپەرە ٨٠ - ٨١.
١٠٦. ئینسکلۆپیدیای گشتی، یاسینی سابیر ساغ لاپەرە ٣٧٣.
١٠٧. اسرة آل الجلالي في التأريخ، تيموجيني حسن الجلالي، ص ١٢.
١٠٨. فەرهەنگی باشوور (کوردی - کوری - فارسی)، (تایبەتە بە ناوچەی کرماشان - ئیلام - لوورستان، عباس جەلیلیان، دەزگای ئاراس ل ٥٨٠.
١٠٩. فەرهەنگی خاڵ، شێخ محەمەدی خاڵ، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥، ل ٤١٣ - ٤١٤.
١١٠. اصول أسماء المدن والمواقع العراقية، بەرگی یەکەم، جەمال بابان، ١٩٨٩، ل ٢٥٦ - ٢٥٧.
١١١. يكمن ر سملى توركچه قاموس، اسطانبول، ١٩٢٨، ص ٢٥٩.
١١٢. قاموس لغت ناجى.
١١٣. قاموس تركي، ش، سامي، ١٣١٧، ص.

* سەرچاوەی هورمزییەکان:
١- فەرهەنگی باشوور.
٢- ئینسکلۆپیدیای گشتی، یاسین سابیر ساڵح، لاپەرە (١١٣٣).
٣- ناونامەی کوردی (ژی نۆ)، ناسیح رەحمانی، لاپەرە (١٣٢).
٤- فەرهەنگی مەهاباد، گیوموکریانی، چاپخانەی کوردستان، لاپەرە (٧٠٣).
٥- فەرهەنگی ئاریانڤاج (کوردی کۆن و کوردی نوێ)، د. هەورامانی ٢٠٠٨، لاپەرە (٥٩٣- ٥٩٥).
٦- مێژووی ئاینی زەردەشت، عەبدوڵڵا موبلغی ئابادانی، وریا قانع، چاپی سێیەم، ٢٠١٠، لاپەرە (٤٤- ٤٥).
٧- ئاینی زەردەشت، مێری بۆیس، فەرشید شەریفی ٢٠١٠.
٨- بلاد مابين نهرين، ليو اومنهانيم، سعدي فيض الله عبدالرزاق، ١٩٨١ دار رشيد للنشر (٤٥٦- ٤٥٧).
٩- ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان، ئارتوور کریستێنسێن، سەلاحەدین ئاشتی نکەی ژین، سلێمان ٢٠٠٦.
١٠- پاشکۆی رۆژنامەی ئاسۆ، چاوپێکەوتن لەگەڵ دکتۆر موکەرەم تاڵەبانی.

### * بنەماڵەی قیردارەکانی کەرکوك

ئەمین شوان

بنەماڵەی قەردار لە کەرکووك هەرچەندێك ئێستا خۆیان بە تورکمان دادەنێن، بەڵام لە ڕەسەندا لە ئێڵی بلباسی کوردن، چەند کەسێکی دیاریان لە دەوڵەتی عوسمانییدا مەئمووری گەورە و لە دەوری کۆماری تورکیاشدا یەکێکیان بوو بە والی ئەستەموول، حافظ ئەفەندی لەوان بوو و لە بەغدا دەژیاو لەگەڵ شێخ ڕەزادا زۆر ڕێك نەبوو، هەموو دەم شێخ هەجوویانی دەکرد لەبەر ئەو نارێکییەیە.

مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی لە کتێبی "کەرکووك، مێژووی کۆنی - دانیشتووانی - دەسەڵاتەکانی" دەڵێ: "قەردارەکان خەڵکی ڕەواندز بوون، بە قسەی حوزنی (حوسێن حوزنی موکریانی) و چیاوك (مەعرووف چیاووك) ئەمانە (کاردار) بوون، کە بەشێکن لە هۆزی شکاك. ئەوەی ئێمە لەبیرمانە، خەڵکی کەرکووك بە "کەردار" ناویانی دەبرد. (قیر) هەرگیز ئەوەندە کاریگەر نەبووە و لە قەبارەشدا زۆر نەبووە، کە خەڵکی پێ دەوڵەمەند بێت و بیکا بە بنەماڵە و پاشان ببێ بە لەقەب بۆی. ئەوەیەکی بەرێزیان (نەزیر قیردار) لە ژمارە (٩٦) ی ساڵی هەشتەمی گۆڤاری (تورکمن ئیلی)دا دەڵێ: ناوی ڕاستەقینەی بنەماڵەکە (قەردار)ە نەك (قیردار).

### * یەعقوبییەکانی کەرکوك

د. زرار سدیق تۆفیق

یەعقوبییەکان یەکێکن لە خێزان یان ئەو هۆزە کۆنانەی کەرکوك، کە ماوەیەکی دوورو درێژە لە ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکاندا ناویان هاتووە.

لە بەشێکی زۆری ناوچەکانی موسڵو کەرکوكو هەولێر بڵاوبوونەتەوە، بەشێکیان خۆیان بە تورکمان دادەنێن، بەڵام لە بنەڕەتدا هۆزێکی بە ناوبانگی کوردنو بەشداری بەرچاویان هەیە لە ڕووداوەکانی چاخی ناوەڕاستی سەردەمە ئیسلامییەکان.

".. هەندێك لە خێزانە کوردەکان ناسنامەی خۆیان گۆڕیوە، وەکو خێزانی یەعقوبییەکان (ئال یەعقوب زادە)ی بەناوبانگ، کە لە بنەڕەتدا دەچنە سەر هۆزی زەنگەنە، هەرچەندە کە یەعقوبییەکانی هەولێر پارێزگارییان لە ناسنامەی نەتەوەی خۆیان کردووە، یەعقوبییەکانی کەرکوکیش خاوەنی مۆڵکداری گەورە.. گەورەن و دەسەڵاتیان لە ناوچەکە زۆر بووە..[1].

(( لە چاخی ناوەڕاست لە هۆزەکانی ڕۆژهەڵاتی موسڵن، لە ماوەی سەدەی (سێزدەیەمی کۆچی - نۆزدەی زایینی) لە (مەزح) قەراریان دەگرت، پیاوەکانی چوونە پاڵ بزووتنەوەکانی (خەواریج)ەکان، کە لەو کاتەدا ئەو هێزە لە هەرێمی جەزیرە چالاك بوونو (مساور کوڕی عەبدولحەمید ئەلشاری) سەرۆکایەتیی دەکردن، لەپاش ئەویش سەرۆکایەتی بۆ (هاڕوون کوڕی عەبدوڵڵا ئەلبجلی) گوازرایەوە، دواتر وای لێهات کوردانی یەعقوبی بزوتنەوەیەکی خەواریجی تایبەت بەخۆیان بۆ دروستبوو، سوپای خیلافەت سێ جار لەسەر یەك لە ساڵەکان (٨٧٢ - ٨٨٠ - ٨٨٧)ی زایینی لە گەڵیان بەشەر هات، بەڵام لە دوایینی شەڕدا کە لە (سوق الاحد) لە دەوروبەری موسڵ ئەنجامدرا، سەرکەوتن بووە بەشی (یەعقوبییەکان).

لە سەدەی دواتریش، مەسعودی ئاماژەی بۆ یەعقوبییەکان کردووە گوتوویەتی:- ((ئەمانە لەگەڵ جورجان لەسەر ئایینی (نەسرانێن) لە مەشدا دیارە بەهەڵە چووە، چونکە تێکەڵییەکی لەنێوان یەعقوبییەکان و یەعاقیبەکان، کە ئەمەی دووەم گروپێکی نەسرانییەوە، بەڵام ئەمەی یەکەم موسڵمانن، هەر مەسعودی وڵاتی یەعقوبییەکانیشی بە ((ئەو ناوچەیەی لە دوای موسڵو چیای جودییەوە دێ)) دەستنیشانکردووە، لە (مروج الذهب بەرگی دووەم لاپەرە ١٢٤) ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پێدەچێت، بۆیە لە شوێنی بنجی خۆیان کە (مروج)ە کۆچیان کردبێ، چونکە لەوانەیە لە ترسی تەنگ پێهەڵچنینی سوپای (موسل)، یانیش لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێ کە وەرزی گەرمی هاوین. بچن لە لەوەرگا هاوینییەکانیان لەسەر لووتکەی چیای جودی بەسەرببەن. ئیتر دوای ئەوە هەر لەسەدەی چوارەمی کۆچییەوە هەواڵی یەعقوبی ون دەبێت[2].

((.. هاوکات لەگەڵ بزاڤی (مساور کوڕی عەبدولحەمید)دا کوردە یەعقوبییەکانیش بە بزاڤێك ڕابوونو بە (الیعقوبیە الشراە) ناوبراونو بزاڤەکەیان ماوەی پازدە ساڵی خایاند، لە ڕاستیدا لقێك بوون لە بزاڤی (مساور)و هەندێك لە کوردە یەعقوبییەکان تا مردنی (مساور) هەر لە گەڵیدا مانەوە. سەرەتای بزاڤی کوردە یەعقوبییەکان ڕوون نییە، ئەوەندە هەیە سەرکردە (مسرور ئەلبلخی) لە ساڵی (٨٧٢)ی زایینیی هێرشیکردە سەریانو بە گوێرەی ئاخافتنی (الطبري) ژمارەیەکی لێکوشتن، پاش هەشت ساڵ ولە ساڵی (٨٨٠)ی زایینی سوپایەکی تری عەباسی بەسەرکردایەتی سەرکردەی تورکی (ئیسحاق کوڕی کنداج) هێرشیکردە سەریانو ماڵو سامانی تاڵانکردن، بەڵام ئەم هێرشانە نەبوونە هۆی لەناوبردنی ئەم بزاڤە، بەڵکو لایەنی کەم تا ساڵی (٨٨٦)ی زایینی هەر بەردەوام بوو، لەم ساڵەدا کوردە یەعقوبییەکان زیانێکی قورسیان بەو لەشکرە عەباسییە گەیاندە کە لە موسڵەوە بۆ باج وەرگرتن هاتبوونە ناوچەی مێرگو (سوق الاحد - دەڤەری مرێباو قەسرۆك)و نزیکەی هەشتسەد[2].

کەسیان لێکوشتنو لەمە بەدواوە هیچ زانیارییەکی تر دەربارەی کوردە یەعقوبییەکان لە بەردەست نییە (تأریخ الطبري بەرگی ٩ لاپەرە. ٤٩، الکامل بەرگی ٥، لاپەرە ٦٨٧ بەرگی ٦ لاپەرە ٤٨، ١١٢ - ١١٣) (٣).

* سەرچاوەکان:-

١- کرکوك وتوابعها حکم التاریخ والضمیر. دراسة وثائقیة عن القضیة الکردیة في العراق، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بەرگی یەکەم، لاپەرە (٨٩).

٢- هۆزو دەسەڵاتە هۆزەکییە کوردییەکانی چاخی

ناوەڕاست، د. زرار سدیق تۆفیق، وەرگێڕانی ئیدریس عەبدوڵلا مستەفا، لاپەڕە (٢٦٨- ٢٦٩).
٣- کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەی ئیسلامیا، د. زرار سدیق تۆفیق، چاپی سێ یەم، ٢٠١٣، لاپەڕە (١٠٣).

*** گەڵاڵی - الكلاليه - الجلاليه :-**

د. زرار سدیق تۆفیق

جەلالی، یان گەڵاڵی لە گەورەترین و دێرینترین هۆزەکانی شارەزوورو داقوق و (کەرخینی - کەرکوک)ە، یەکەم هەواڵ لە بارەیەوەی بۆ ساڵی (٨٨١)ی زایینی دەگەڕێتەوە[١].
لە ساڵی (٩٢٦)ی زایینی ئەم کوردە گەڵاڵییانە بەرووی (ابي الهيجاء) عەبدوڵلا کوڕی حەمدان)ی والی موسڵ و شارەزوورو ڕاپەڕین[٢].
سەرچاوەکانی سەردەمی عەباسی ناوی ئەم هۆزەیان بە (الجلاليه) چەسپاندووە، کە ئەمە بە عەرەبیکراوی ووشەی (گەڵاڵی)یە[٣]، بەڵام سەرچاوەکانی سەردەمی مەغۆلی و هەروەها سەرچاوە مەملوکییەکانیش ناویان جارێك بە گەڵاڵی (الكلاليه)و جارێکی تر بە جەلالی (الجلاليه) هێناوە[٤].
لەولاشەوە (نقشبندی) لەو بڕوایەدایە کە گەڵاڵی (الكلاليه) جیایە لە جەلالی (الجلاليه)و هۆزێکی دیکەی سەربە خۆیە، هیچ پەیوەندییەکی بە جەلالی (الجلاليه)ەوە نییە، تەنانەت تا ئێستاش (جەلالی - الجلاليه)و (گەڵاڵی - الكلاليه) دوو هۆزن وەکو خۆیان ماون و پارێزگارییان لە ناوە کۆنەکەی خۆیان کردووە[٥].
کەچی وەکو لە گووتەی مێژوونووسانی تر تێدەگەین، ئەوان بە زۆری پێیان، هیچ جیاوازییەك لەنێوان گەڵاڵی و جەلالی ناکەن، ئەوە تا میرشەرەفەدین کوڕی سەلاری میری هەولێرو ئەشنۆیە لە کۆتاییەکانی سەردەمی عەباسی و سەرەتاکانی دەرکەوتنی هێرشکاری مەغۆلی دراوەتە پاڵ گەڵاڵی[٦].
لە هەمان کاتدا (الفقيه ابا الحسن عبدالله کوڕی شروين) دراوەتە پاڵ جەلالی کە ئەو لە گوندی (باکلبا)ی نزیك هەولێرو لە هاوڕێیانی یاقوتی حەمەوی بوو کە لە (١٢٢٩)ی زایینیی کۆچی دوایی کردووە[٧].
دیسانەوە (عیزەدین عەبدولعەزین) نووسەری هەولێری دراوەتە پاڵ جەلالی[٨].
هەروەها تەواوی لقەکانی (الجلاليه)ی بڵاوبووەوە لە (درتنك و کەرخینی و داقوق و هەولێرو ئەشنونە) لەو سەردەمە بە گەڵاڵی ناسراون[٩].
لەسەردەمی ئەتابەگی لە جەلالیەکاندا میر (مجاهیدەدین بزان کوڕی مامین ئەلکوردی)ی (میری کوردان)ی کە لە (١١٦٠)ی زایینیی کە خاوەنی (سەرخەد) بووەو یەك بووە و لە پێشەنگای سوپای نوری (مەبەست نورەدین مەحمود کوڕی زەنگییە) لە دیمەشق و وولاتی شام، ئەم (مجاهیدەدین) ە بەڵایەکی گەورەی بەسەر خاچپەرستاندا هێنا، لەبەر بەرگرییەکانی بۆ هێرشەکانیان، (قلانسی)ی هاو چاخی لەبارەیەوە دەڵێت (ئەو بەشەهامەمەت و ئازایەتی ورای دروست وزانیاری بە شەرەکان وەسفکراوە.. هەروەها بە بوێری و لێبووردن و نوێژو دابەشکردنی سەدەقات بەسەر هەژارو لاوازەکان وەسفکراوە...[١٠].
میر (مجاهیدە دین) بە پارەی خۆی مزگەوتێکی لە دەروازەی (باب الفراديس)، هەروەها مەدرەسەی موجاهیدییەشی لە دیمەشق دروستکرد، سەرەنجام میر مجاهیدەدین لە ساڵی (١١٦٠)ی زایینی گیانی لە دەستداو کۆچی دوایی کرد[١١].
لە ماوەی سەردەمی مەغۆلی، گەڵاڵی (کلاییە)کان لە سێ شوێندا نیشتەجێ بوون، تایەفەیەکیان لە (داتترك؟) و (نەهاوەند)ی نزیك شارەزوور، تایەفەی دووەمیان لە لادێکانی (داقوق)و (کەرکوك) دەژیان، تایەفەی سێیەمیش کەوتبوونە (ئەشنۆیە)ی سەر بە هەرێمی ئازەربێجان[١٢].
هەروەها لە هەولێریش گەڵاڵی دەبینین، (مەلەك شەرەفەدین کوڕی سالار) وەکو ئاماژەی بۆ کرا، لەو گەڵاڵییانەبوو، کاتێکیش لە ساڵی (١٢٦٠)ی زاینیی، شەرەفەدین کوژرا، تاکەکانی هۆزەکەی لە مەغۆلەکان یاخی بوون و لێیان ڕاپەڕین، لە پاشان ناچار بوون هەولێریان جێهێشت و بەرەو وولاتی شام و ڕۆیشتن، لەوێ پەیوەندییان بە مەمالیکەکانەوە کرد، ئەوەی لە نێو ئەوانەوە دیار بوو، میر تاجەدین شروان کوڕی حەمدان (ڕاستییەکەی سلار)ی برای (مەلیك شرەفەدین)و میر (ڕوکن ئەلدین)ی خوشکەزای بوون، لەگەڵ حەفتا سوار چاك[١٣].
لە گەڵاڵییەکانی ئەشنۆیەو هەولێر گەلێ نووسەرو ئەدیب و پیاوی کارگێری هەڵکەوتن لەوانە:-
الفقيه والحسن عبدالله کوڕی شروين الجلالي[١٤].
نووسەر عزالدين ابو المجد عبدالعزيز علی کوڕی ابي الهيجاء الاربلی الجلالي[١٥].
نووسەر عزالدين ابو علي الحسن کوڕی علی کوڕی ابي الهيجاء الاربلی برای عزالدين عبدالعزيز، ئەمە شاعیر بووە، لە ساڵی (١٢٨٨)ی زاینیی چەند دێرێك شیعری بۆ (ابن الفوطي) گووتووە[١٦].
ئێستاکە گەڵاڵییەکان لە چەندین ناوچەی لێکجیای کوردستان بڵاوبوونەتەوە[١٧].

*** سەرچاوەکان :-**

١- الكامل في التأريخ، دار الفكر، بەیروت، ساڵی (١٩٧٨)، بەرگی شەشەم لاپەڕە (٣٦).
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨٣).
٣- مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الفكر، بەرگی دووەم، بەیروت، چاپی پێنجەم، ساڵی (١٩٧١)، لاپەڕە (١٢٤) هەروەها بڕوانە:-
الرسالة الثانية، اعتنى بنشرها، وەرگێڕانی: مینۆرسکس، چاپخانەی زانکۆی قاهیرە، ساڵی (١٩٥٥)، لاپەڕە
الكامل في التأريخ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی ٦ لاپەڕە ٣٦.
٤- تأريخ الملك الظاهر، ئەحمەد حطيط، بەیروت، ساڵی (١٩٨٣) لاپەڕە (٣٣٣).

هەروەها بروانە:-
الروض الزاهر في سير الملك الظاهر، لێکۆڵینەوەی عبدالعزيز الحويبطر، رياز، ساڵی (١٩٧٦)، لاپەرە (٨٨).
مسالك الابصار، السفر الثالث، دەسنووس، کۆڕی زانیاری ، لاپەرە (١٢٥- ١٢٦).
نهاية الادب في فنون الادب، دار الكتب العلمية، بەيروت، ٢٠٠٤ دووەم، ٣٠٧.
٥- الرسالة الثانية المسعر مهلهل و شهروز، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژمارە (٨)، لاپەرە (٢١٨).
٦- تاريخ الملك الظاهر هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٣٣).
هەروەها بروانە:-
الروض الزاهر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٨).
٧- معجم البلدان، دار صادر، بەيروت، ساڵی (١٩٧٩)، بەرگی (١) لاپەرە (٣٢٨).
٨- مجمع الاداب معجم الالقاب، لێکۆڵینەوە محەمەد کازم، تاران، ساڵی (١٤١٦)ی کۆچی، بەرگی (١)، لاپەرە (٢٣٦).
٩- مسالك الابصار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢٥- ١٢٦) بەرگی سێ یەم.
١٠- ذيل تأريخ دمشق، چاپخانەی (الاباء اليسوعيين). بەيروت، (١٩٠٨)، لاپەرە (٣٠٦- ٣٥٩).
هەروەها بروانە:-
ذيل الروضتين، دار الجيل، بەيروت، (١٩٧٤)، بەرگی یەکەم، لاپەرە (٣٤٢- ٣٤٣).
الدارس في تأريخ المدارس، راست کردنەوەی صلاح الدين المنجد دار الكتاب الجديدة، (١٩٧١)، بەرگی یەکەم، لاپەرە (٤٥٢).
١١- الدارس في التأريخ المدارس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٥١- ٤٥٥)، بەرگی (٢).
ذيل تأريخ دمشق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥٩)
الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الجزيرة، لێکۆڵینەوەی یەحیا زەکەریا عەبارە، بەرگی یەکەم، دیمەشق، (١٩٩١)، لاپەرە (٢٤٨).
١٢- مسالك الابصار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢٥) بەرگی سێ یەم.
١٣- تاريخ الملك الظاهر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٣٣)
هەروەها بروانە:-
مسالك الابصار، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢٥).
١٤- معجم البلدان، هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی یەکەم، لاپەرە (٣٢٨)
١٥- معجم الالقاب، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٣٦).
١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٥).
١٧- الرسالة الثانية وشهرزور، لاپەرە (٢١٨- ٢١٩).

*** بزێنی - شێخ بزێنی:-**

د. زرار سدیق تۆفیق

(ابن العماد الحنبلي) کە لە ساڵی (١٩٧٨)ی زایینی کۆچی دوای کردووە دەڵێت: (بزوێن بە کۆکراوەیی و بە بچووککراوەیی هۆزەێکە لە کوردان[١]، شذرات الذهب بەرگی هەشت، لاپەرە ٣٣١، لەوانەشە بزێنی هەر بریتی بێت لە هۆزی شێخ بزێنی خۆی، کە لە بنجدا لە هۆزەکانی قەڵای (دیردە)ی سەر بە دەڤەری (تەنزی - تەنزە)ی سەر بە جەزیرەی بۆتان بوو[٢]. بەڵام بەشێکیان لەوێ هاتنە خوارو بەرەو کوردستانی باشوورهاتن، بە درێژایی کەناری چەپی زێی خوارو لە ئالتون کۆپری بۆ تەقتەق نیشتەجێ بوون.
ئەوانەی سەر بە (بزێن)ن، فەقیهی شافیعی (عەبدولرەحمان کوری ئەسفەهان)و (عەبدوڵڵا)ی کورنیە، کە (عەبدوڵڵا) زانستەکانی نەحوو سەرف و مەنتیق و بەلاغەی لەلای باوکی ولەلای زانایانی سەردەمەکەی خوێندووە لە ساڵی (١٥٥٥) ی زایینی لە شاری (قەسیر)ی شام کۆچی دوایی کردووە[٣].

* سەرچاوەکان:-
١- شذرات الذهب في اخبار من ذهب، بەرگی هەشت، بەيروت لاپەرە (٣٣١).
٢- شرفنامە،شەرفنامەی شەرفخانی بەدلیسی، لاپەرە (٢٧٤)
٣- شذرات، هەمان سەرچاوەی پێشووە،لاپەرە(٣٣١ -٣٣٢).

*** هۆزی مەلکیشایی - مەلەکشایی:-**

یەکێکە لە هۆزە گەورەکانی کوردستانی گەورە، لە سەرووی کوردستان نیشتەجێن لە دەرسیم، ئەرزنجان، سیواس، دیاربەکر، بنیگول، ئەزیر، مەلاتیە، کە دەرسیم بنکەی سەرەکی نیشتەجێیانە و پایتەختی سەرەکیانە لە ئیماراتی چەمشگزگ.
لە کوردستانی رۆژهەڵات لە پارێزگای ئیلام، کە رۆژئاوای هۆزەکە و زۆرترینیان بڵاوبوونەتەوە لە قەزای ملیکشایی و قەزای ئەرکوزا و مەهران و ئەیوان و شیروان و چەرداول و کرماشان و لورستان و کۆهدەشت و خورەم ئاباد، کە لە پارێزگای سنە لە گوندی ملکیشایی سەروو و خواروو نیشتەجێ بوونە.
لە کوردستانی خواروو لە خانەقینی و هەولێر و دهۆك و زاخۆ و موسڵ و کەرکوك و سلێمانی نیشتەجێ بوونە لەگەڵ دێی ملکیشایی و مەندەلی و بەدرە و زرباتییە و کوت و بەغدا.
هەروەها برێکیان لە ئەسکەندەنافییە و ئەڵمانیا، نیشتەجێ بوونە، ئەم هۆزە نزیکەی ٣٤ لقی هەیە لە ئێران، کە لە ساڵی ١٩٤١ی زایینی ژمارەیان ٧٥٠٠خێزان بوونە کە ٥٠هەزار کەس بوونە کە سەرژمێری ئەو کاتەی ئێران ١٢ملیۆن کەس بووە.
لقەکان مەلکیشایی بریتیی بووە لە:-
خەمیس، رەسوڵ وەند، کازم بەگ، نەقی، گلان، خەلیل وەند، حوسێن بەگ، عەلی نەزیر، شوکر بەگ، قەیتول، کلوەند، کلکل، کناری‌وند پاولگ.
ئەم هۆزە لە سەردەمی بەعسدا زیانێکی زۆری بەرکەوتووە، بە تایبەتی لە شەڕی عێراق - ئێراندا، کە نزیکەی ٤٠٠ کەسیان لەناوخۆی عێراق لێ کوژراوە.

## * پێکهاتەی دانیشتووان و دابەشبوونی جوگرافییان:

د. دلشاد مەحموود

### أ. پێکهاتەی نەتەوەیی و زمانیی دانیشتووان:

بەر لە شیکردنەوەی پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك و دابەشبوونی جوگرافییان لەنێوان سالانی (١٩٢١-١٩٥٨)دا، پێویستە سەرنج بۆ دەگمەنی و نادروستی داتا و سەرژمێرییەکان رابکێشرێت. کێشەی گەورەی لێکۆلینەوە لە پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك، وەك هەر شارێکی دیکەی عێراق، لە سالانی ئینتیدابی بەریتانیدا نەبوونی سەرژمێرییەکی وردە. هەرچی ئەو سەرژمێرییانەی لە دواتر لە لایەن هێزەکانی بەریتانی و لایەنەکانی دیکەی (تورکی و عێراقی) لە چوارچێوەی کێشەی ویلایەتی موسل ئەنجامدرا، لە راستییدا بە مانای وشە ناکەونە خانەی سەرژمێرییەوە، بەلکو خەملاندن و مەزەندەکارین.

سەرباری ئەوەی هەر یەك لەو لایەنانەی سەرەوە، بە گوێرەی بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان، ژمارەی پێکهاتە نەتەوەیی و زمانییەکانی دانیشتووانی شارەکەیان بەرزو نزم کردووە[١] (وەکو لە خشتەی ژمارە (١)دا ئاماژەمان پێکردووە). هەرچەندە ئەو خەملانە وێنایەکی گشتی دەدەنە دەست، بەلام لە کاری زانستیدا ناتوانرێت، بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە، پشتیان پێ ببەسترێت و وەك واقیعێکی چەسپاو مامەلەیان لەتەکدا بکرێت.

**خشتەی ژمارە (١)**

**بۆچوونە جیاوازەکانی خەملاندنی دانیشتووانی لیوای کەرکوك**

**لە کۆنگرەی لۆزان (١٩٢٣)دا[٢].**

| دانیشتووانی کەرکوك | بۆچوونی تورکی | | بۆچوونی بەریتانی | |
|---|---|---|---|---|
| | ژمارە | رێژە | ژمارە | رێژە |
| کورد | ٩٧٠٠٠ | ٪ ٥٢,٧١ | ٤٥٠٠٠ | ٤٨,٩١ ٪ |
| تورکمان | ٧٩٠٠٠ | ٪ ٤٢,٩٣ | ٣٥٠٠٠ | ٣٨,٠٤ ٪ |
| عەرەب | ٨٠٠٠ | ٪ ٤,٣٤ | ١٠٠٠٠ | ١٠,٨٦ ٪ |
| جوو | ... | ... | ١٤٠٠ | ٪ ١,٥٢ |
| مەسیحی (کلدان و ئەرمەن) | ... | ... | ٦٠٠ | ٪ ٠,٦٥ |
| کۆی گشتی | ١٨٤٠٠٠[*] | ٪ ١٠٠ | ٩٢٠٠٠ | ٪ ١٠٠ |

هۆی سەرەکی ئەو ناکۆکی و دژیەکییە زەقەی لە خەملاندنی ژمارەی دانیشتوواندا لە خشتەی سەرەوەدا بەرچاو دەکەوێ، دەگەرێتەوە بۆ لە ئارادابوونی کێشەی هەستیاری ویلایەتی موسل لەنێوان تورکیا و بەریتانیا-عێراق. هەر ئەوەش بەلگە و گەواهی نادروستی زانیارییەکانی ئەو سەرژمێرییە مەزەندەکارییانە بە دەستەوە دەدات:

یەکەم سەرژمێریی مەزەندەکاریی نیمچە متمانەپێکراو لە عێراقدا، سەردەمی ئینتیدابی بەریتانی ئەنجامدرا (١٩٢٢-١٩٢٤)، کە دواتر بووە داروەکازی دەستی لێپرسراوان و بناغەیەکیش بۆ بنیاتنانی سەرژمێرییە مەزەندەکارییەکانی دیکە. لەو سەرژمێرییەدا کۆی گشتیی دانیشتووانی لیوای کەرکوك بە (١١١٦٥٠) کەس خەملێنراوە، کە پێکهاتەی دانیشتووانەکەی بەم جۆرە بووە: کورد (٤٧٥٠٠) کەس، تورکمان (٢٦١٠٠) کەس، عەرەب (٣٥٦٥٠)، مەسیحی(٢٤٠٠) کەس و هیچ ئاماژەیەکیش بۆ بوونی جووەکان لە لیواکەدا نەکراوە[٣].

لەگەل هەموو هەلە و کەموکورییەکانی ئەو سەرژمێرییە مەزەندەکارییانەی باسکران، بەو پێودانەی لە هەموو بارێکدا، دەشێ وێنایەکی گشتی سەبارەت بە خەملاندنی ژمارەی دانیشتووان بدەن بە دەستەوە، لە لایەن توێژەروان و مێژوونووسانەوە گرنگی تایبەتیان وەرگرتووە. سەرژمێرییە مەزەندەکارییەکانی دیکەی بەر لە سەرژمێریی سالی (١٩٤٧)، بە ئاکامێکی چاکترو نزیکتر لە واقیع گەیشتوون. چونکە هەلومەرجی سیاسی و کۆمەلایەتیان لەبارتر بوو. بۆ نموونە دوای تەواوبوونی کێشەی ویلایەتی موسل و یەکلاییبوونەوەی لە بەرژەوەندی عێراقی عەرەبیدا، دەسەلاتدارانی ئینتیدابی بەریتانی لە سالی (١٩٢٨)دا سەرژمێرییەکیان لە لیوای کەرکوکدا ئەنجامدا، ئاکامی خەملاندنەکە تا رادەیەك وردەکاری پێوە دیارە. بەپێی ئەو سەرژمێرییە کۆی گشتیی دانیشتووانی لیوای کەرکوك بە (١٣٥٧٦٤) کەس خەملێنراوە، ژمارەی پێکهاتە جیاوازەکانی لیواکەش بەم شێوەیە بووە: کورد (٧٨٣٨٤)کەس، تورکمان (٢٩٦٨٧) کەس، عەرەب (٢٣٩٧٥)، مەسیحی و جوو (٣٧١٨) کەس[٤].

ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە ژمارەی کۆمەلە دانیشتووانی کورد و عەرەب لەو دوو سەرژمێرییە مەزەندەکارییە بەرچاو دەکەوێت، واتە سەرژمێریی (١٩٢٢-١٩٢٤) و سەرژمێریی (١٩٢٨)، بۆ فاکتەری بەرژەوەندیی سیاسیی بەریتانیا و عێراق دەگەرێتەوە، کە لە سەرژمێرییەکەی یەکەمدا بەرژەوەندییان لەوەدا بوو ژمارەی عەرەب زیاد بکەن.

سەرژمێرییەکانی سالانی (١٩٣٠، ١٩٣٤، ١٩٤٢)، کە لە لایەن دەسەلاتدارانی عێراقەوە ئەنجامدراون، بە هەمان شێوە خەملاندن و ناچنە خانەی سەرژمێرییەکی وردەوە[٥]. دیارترین جیاکەرەوەی ئەو سەرژمێرییانە، بریتییە لە زالبوونی مۆرکی رەمەکی لە تۆمارکردنی زانیارییەکاندا. بە بەلگەی ئەوەی حسێبێکی ئەوتۆ بۆ جیاکردنەوەی یەکە کارگێرییەکان لەیەکترو رەگەزە جیاجیاکانی دانیشتووی کەرکوك نەکراوە. بەلکو بە شێوەیەکی رەمەکی ژمارەی دانیشتووان بەسەر یەکەوە مەزەندە کراوە.

**خشتەی ژمارە (٢)**

**خەملاندنی ژمارەی دانیشتووانی لیوای کەرکوك بە هەزارە بەر لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)[٦].**

| ساڵ | خەملاندنی دانیشتووانی کەرکوك | ڕادەی زێدەبوون | ڕێژەی کەرکوك | دانیشتووانی عێراق |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٣٠ | ١٣٢[٧] | ٢١ | ٪٤,٦ | ٢,٨٢٤ |
| ١٩٣٢ | ١٣٨ | ٦ | ٪٤,٨ | ٢,٨٥٧ |
| ١٩٣٤ | ١٦٦ | ٢٨ | ٪٥,٧ | ٢,٨٩١ |
| ١٩٣٥ | ١٨٠ | ١٤ | ٪٥,٣ | ٣,٣٥٢ |
| ١٩٤٢ | ٢٥٠ | ٧٠ | ٪٦ | ٤,١٤٦ |

ئەم سەرژمێرییە مەزەندەکارییانەی لە پێشەوە باسکران هەموویان سەبارەت بە ژمارەی تەواوی لیوای کەرکوك بوو. هەرچی تایبەت بێت بە ژمارەی دانیشتووانی ناوەوەی شاری کەرکوك زانیارییەکی ئەوتۆ لە سەرچاوە مێژووییەکاندا تۆمار نەکراوە. تەنها چەند ژێدەرو بەڵگەنامەیەکی کەمو دەگمەن نەبێت لەم ڕووەوە باس لە ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك دەکات، بەڵام ئەوانیش وەك سەرژمێرییەکانی دیکەی ئاماژەیان بۆ کرا، بە هەمان شێوە خەمڵ و مەزەندەکارین.

زانیاریمان دەربارەی ژمارەی دانیشتووانی ناو شاری کەرکوك بەر لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) بریتییە لە سەرژمێریی دەسەڵاتدارانی شارەکە (کاربەدەستانی ئینگلیزو شارەوانی کەرکوك).

دەسەڵاتدارانی داگیرکاری بەریتانی، لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) ساڵ دوای ساڵ هەوڵیان خستووەتەگەڕ بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی دەربارەی لایەنە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی دانیشتووان. بەپێی بەڵگەنامە کارگێڕییەکانی بەریتانی ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك ڕاستەوخۆ لە دوای تەواوبوونی جەنگ (١٩١٨) بریتیبووە لە (١٦٠٠٠) کەس، بەڵام ئەم ژمارەیە لە ساڵانی دواتردا هەڵکشانی بەخۆوە گرت، ئەوەش لە ئاکامی هێوربوونەوەی بارودۆخی ناوچەکەو گەڕانەوەی خێزانەکان بۆ سەر کاروباری خۆیان، بۆیە ژمارەکە ساڵی (١٩١٩) گەیشتووەتە (١٨٨٣٩) کەسو ساڵی (١٩٢٠) بووە بە (٢٢٠٠٠) کەس[٨].

گۆڕانێکی نوێ سەبارەت بە پەرەسەندنی دیمۆگرافیی شاری کەرکوك لە ساڵانی ئینتیدابی بەریتانی بریتیبوو لە بەستنەوەی شاری کەرکوك لە ڕێگەی تۆڕە هەمەچەشنەکانی گواستنەوە بە ناوچەکانی دیکەی عێراقەوە، بە تایبەت تۆڕی هێڵی ئاسنی، کە ساڵی (١٩٢٥) کەرکوکی بە ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق[٩] گرێدا. ئەمەش ڕۆڵی هەبوو لە زێتر گرێدانی شاری کەرکوك بە ناوەندی دەسەڵاتەوە لە بەغداو پەرەسەندنی دەسەڵاتی سەنتەر بە سەر کەرکوکەوە[١٠].

سەرژمێرییەکی دیکەی دانیشتووانی شاری کەرکوك بەر لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، لە لایەن شارەوانی کەرکوکەوە ساڵی (١٩٣٠) ئەنجامدراوە. بە گوێرەی ئەو سەرژمێرییە ژمارەی دانیشتووانی شاری کەرکوك بریتیبووە لە (٣٥٠٠٠) کەس. پێکهاتە نەتەوەییو زمانییەکەی بەمجۆرە بووە: کورد (٢٢٠٠٠) کەس، تورکمان (٧٠٠٠) کەس، مەسیحی (١٠٠٠) کەس، ئاسووری (٢٠٠٠) کەس، ئەرمەن (٥٠٠) کەس، جوو (٢٥٠٠) کەس[١١].

یەکەم سەرژمێریی گشتیو فەرمیی لە عێراقدا، سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) بوو[١٢]، کە بە مێژووی (١٩ی تەشرینی یەکەمی ١٩٤٧) ئەنجامدراو دواتریش وەك نەریتێکی فەرمی، هەر دە ساڵ جارێك دووبارە کرایەوە. واتە لە ساڵی (١٩٥٧)یش دووەم سەرژمێریی فەرمی ئەنجامدرا کە هەر لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدایە. ئەم سەرژمێرییە فەرمییانە سەرباری لەخۆگرتنی کۆمەڵێك خەسڵەتی چاكو زانیاریی جۆری، هێشتا لە کەموکوڕی بەدەر نەبوونو زانیارییەکانیان پڕ ووردەکاریو تەواو یەکلاکەرەوە نەبوون[١٣]. یەکێك لە گەورەترین کەموکورییەکانی ئەم سەرژمێرییە دەستنیشان نەکردنی باری نەتەوایەتییە لە ناوچەو شارەکانی عێراق، هەروەها کۆکردنەوەی داتاکانی سەرژمێرییەکە لەسەر ئاستی یەکە کارگێڕییە گەورەکان ئەنجامدراوە.

بە گوێرەی سەرژمێریی فەرمیی (١٩٤٧)، ژمارەی دانیشتووانی مەڵبەندی قەزای کەرکوك، بریتیبوو لە (٩١٥٨٢) کەس. لەم ژمارەیە (٤٣٦٣٥) کەسیان لە ڕەگەزی مێو (٤٧٩٤٧) کەسیشیان لە ڕەگەزی نێر بوون[١٤]. هۆی زەقی ئەم جیاوازییەش لەنێوان ڕەگەزەکاندا، بێگومان بۆ ڕۆڵی کۆمپانیای نەوتی عێراق دەگەڕێتەوە، کە ڕەگەزی نێری لە زۆر ناوچەو کونو قوژبنەوە، بە تایبەت لە لیواکانی موسڵو بەغداو دیالە، بە مەبەستی کارکردن بۆ خۆی کێش کردبوو[١٥]. سەرباری ئەوەش بەشێکی دیکەی ئەو جیاوازییە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە خێزانەکان زانیاری تەواویان دەربارەی مێینەکان نەدەدایە ژمێرکاران.

بێگومان، لە ماوەی ئەو دە ساڵەی پاش ئەنجامدانی یەکەم سەرژمێریی فەرمیی (١٩٤٧)، بارودۆخی دیمۆگرافیای لیوای کەرکوك پێبەپێو لە چوارچێوەیەکی گشتییدا، گۆڕانو پەرەسەندنی لێ هاتە ئارا. بە گوێرەی دووەم سەرژمێریی فەرمی، کە لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٧) ئەنجامدرا،ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، بریتی بووە لە (٢٢١,٨٥١) هەزار کەس، کە (١١٣,٤٩٤) هەزار کەسیان لە ڕەگەزی نێرو (١٠٨,٣٥٧) هەزار کەسیشیان لە ڕەگەزی مێ بوونە[١٦].

ئەم پەرەسەندنە ناسروشتییە لە ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، کە بە ڕادەی جیاوازی نێوان دوو سەرژمێرییە فەرمییەکە (١٣٠,٢٦٩) هەزار کەسە، هێمایەکی هەرە گەورەی گەشەسەندنی بەرچاوی شارەکەیە.

هەر لەو ڕووەوە، خشتەی ژمارە (٣)، ئەرکی ڕوونکردنەوەی زێتری لایەنی ئەم گەشەسەندنە ناسروشتییەی گرتووەتە ئەستۆ. لەو خشتەیەدا، کە زانیارییەکانی پشت بە

سەرژمێرییەکانی (١٩٤٧)و (١٩٥٧) دەبەستێت، ڕاشکاوانە ئەو ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە، کە زیادبوونێکی نابەرانبەر لە ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، بە بەراورد لەگەڵ قەزای ناوەندی لیواکانی موسڵ، هەولێر، کووت، دیالەو سلێمانیدا هەیە[١٧].

هەرچی سەبارەت قەزای ناوەندی کەرکوکە، بە بەراوردکردنی لەگەڵ زێدەبوونی ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی دیالە، ڕێژەکە نزیکەی سێ هێندەیە. بەڵام هەمان زیادبوون لە ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، بە بەراورد لەگەڵ قەزای ناوەندی موسڵ، کە وەك دەزانرێ لە کەرکوك پتر شارێکی باشتری کار پەیداکردنەو لە ڕووی پیشەسازییشەوە لە چاو کەرکوك پێشکەوتووترە، سەربارِی ئەوانەش، لە ڕووی ژمارەی دانیشتووانەوە بنکە فراوانترە، ئینجا هێشتا نزیکەی دوو هێندەیە(!) ئەم حاڵو بارەی زێدەبوونی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، سەبارەت بە قەزای ناوەندی لیوای هەولێریش، ڕێژەکەی وەك قەزای ناوەندی موسڵ نزیکەی دوو هێندەیە. هەرچی قەزا ناوەندییەکانی (کووتو سلێمانی) یە، ئەو زیادبوونەی ژمارەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، لە بەراوردکردندا، نزیکەی هێندەو نیوە.

**خشتەی ژمارە (٣)**

**ڕێژەی زێدەبوونی دانیشتووانی قەزای کەرکوك، به بەراورد بەچەند قەزایەکی ناوەندیی دیکەی عێراق[١٨].**

| قەزای ناوەندی | ژمارەی دانیشتووان | | زێدەبوونی نێوان دوو ژمارە فەرمییەکە |
|---|---|---|---|
| | ١٩٤٧ | ١٩٥٧ | |
| موسڵ | ١٣٢,٧٤٦ | ٢٥٩,٩٩٥ | ١٢٧,٢٤٩ |
| کەرکوك | ٩١,٥٨٢ | ٢٢١,٨٥١ | ١٣٠,٢٦٩ |
| کووت | ٥٥,٧٧٩ | ١٢٣,٣٨٠ | ٦٧,٦٠١ |
| سلێمانی | ٤٣,٠١٤ | ١١٠,١٧١ | ٦٧,١٥٧ |
| هەولێر | ٢٦,٨٨٥ | ٨٤,٥٣٦ | ٥٧,٦٥١ |
| دیالە | ٤٢,٣٧٥ | ٧٠,٣١٥ | ٢٧,٩٤٠ |

وا دەبینرێ، هۆی سەرەکی ئەم پەرەسەندنە ناسروشتییەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوك، بۆ بوونی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە لایەكو لە لایەکی دیکەشەوە، بۆ بەردەوامیی خزینی نیشتەجێبووە دەرەکییەکان لە ناحیەی مەلحە (حەویجە)ی سەر بە قەزای ناوەندی بگەڕێتەوە. هەروەها کۆچی ناوخۆیی گوندنشینەکانی دەوروبەری شاری کەرکوك لە خێڵە کوردییەکان بۆ نێو شار هۆیەکی دیکەی زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی شارەکەیە.

دیاردەی کۆچی ناوخۆیی، لە گشت قۆناغە مێژوویەکاندا، خەسڵەتێکی پەیوەستدارە بە پێشکەوتنی کۆمەڵگاوە. ئەم کۆچە لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستەمەوە بە گوڕتر دەرکەوتو لە پەنجاکانیشدا بەربڵاوتر بوو[١٩]. لە خاڵە سەرنج ڕاکێشو گرنگەکانی سەرژمێریی فەرمیی ساڵی (١٩٥٧)، خستنە ڕووی دابەشبوونی دانیشتووانی ناوچەو لیواکانە بەپێی زمانی دایك. ئەوەش بۆ یەکەمجار بوو سەرژمێرییەکی فەرمیی و تا ئەندازەیەکی چاکیش، بابەتییانە، لەو بارەوە ئەنجام بدرێت. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤).

**خشتەی ژمارە (٤)**

**دابەشبوونی دانیشتووانی لیوای کەرکوك**

**لەسەر بنەمای زمانی دایك**

**لەسەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا[٢٠].**

| زمان | ناو شاری کەرکوك | | |
|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | تێکڕا |
| تورکمانی | ٢٢٥٦٤ | ٢٢٧٤٢ | ٤٥٣٠٦[٢١] |
| کوردی | ٢١٢٨١ | ١٨٧٦٦ | ٤٠٠٤٧ |
| عەرەبی | ١٥٠٠٨ | ١٢١١٩ | ٢٧١٢٧ |
| سریانی | ٧٧٤ | ٧٣٥ | ١٥٠٩ |
| کۆی گشتی | | | ١١٣,٩٨٩ |

لەم خشتەیەدا، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە دانیشتووانی نێو شاری کەرکوك، بە تایبەت لە تورکمانو کوردو عەرەب پێك دێت، کە هەر یەکەیان بەم ڕێژانەی خوارەوە پشکداریان لە پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك کردووە: تورکمانی (٣٩,٧٪)، کوردی (٣٥,١٪)، عەرەبی (٢٣,٧٪)، سریانی (١,٣٪)[٢٢]. هەر بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، (٦٩٧) ئینگلیزیو (٤١) فەرەنسیو (١٢٣) فارسیو (٨٧) هیندیو (٥٧٠٢) کەسیش کە بنەچەکی نەتەوەیی خۆیان نەدرکاندووە، لە لیواکەدا بوونیان هەبووە[٢٣]. سەبارەت بە دابەشبوونی جوگرافیی پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، بەو شێوەیە بووە کە لە خوارەوەدا باسکراوە:

**١. کورد:**

زۆرینەی کوردەکان مێژوویەکی کۆنیان لە شارەکەدا هەیەو لە شێوەی کۆمەڵی هۆزو تیرەو بنەماڵەو خێزان گردبوونەوەیان بەرچاو دەکەوێت، بە ناوبانگترین کۆمەڵی دانیشتووانی کورد بریتین لە: (تاڵەبانی، بەرزنجی، جەباری، کاکەیی، شوانی، شێخ بزێنی، داوودی، هەمەوەندی، ساڵەیی، زەنگەنەیی، ڕۆژبەیانی، پاڵانی، جاف)[٢٤]. ڕێژەی دانیشتووانی کورد، لە جەنگی دووەمی جیهانی بەدواوە، لە ئاکامی کۆچی دێهاتییەکان بۆ نێو شار زیادی کرد. ئەوەش لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆی ئابووریو کۆمەڵایەتیو کارگێڕیی تایبەت بە ناوچەکەو عێراق ڕوویدا[٢٥].

سەبارەت بە شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان لە نێو شاردا، زیاتر لە بەشەکانی باکوورو ڕۆژهەڵات گردبوونەوەیان هەبووە. واتە ئەو ناوچانەی پەیوەستن بە ناوچە شاخاوییەکانەوە. سەرباری ئەوەش شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان بەرەو ناوچەکانی باشوورو ڕۆژئاوای لیواکە درێژ دەبێتەوە تاوەکو لەگەڵ شوێنی نیشتەجێبوونی عەرەبەکان تێکەڵ بە یەك دەبن[٢٦]. هەرچەندە شوێنێکی سەد لە سەد لە نێو شاری کەرکوکدا نییە بۆ یەك ڕەگەزو لایەنی پێکهاتەی دانیشتووان یەکلا بووبێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، دانیشتووانی کورد لە بەشی قەڵاو بەرقەڵا، لە چەند گەڕەکێکی دیاریکراو نیشتەجێن، وەك گەڕەکەکانی: (ئیمام قاسم، ئاخور حوسێن، شۆریجە، موسەڵلا، ئاوچی، چقوور، پیریادی، بولاق، مەیدان و حەمام موسلیم)[٢٧]. هەروەها لە بەشی قۆریەش بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو بوونیان هەبووە، بە تایبەت لە گەڕەکەکانی: (تەپە، بەگلەرو شاترلو).

٢- تورکمان:

لە ڕوویەکی گشتیدا، تورکمانەکان لەو ناوچانە نیشتەجێبوونە کە بە لێك جیاکەرەوەی ناوچەی نیشتەجێبوونی کوردو ناوچەی نیشتەجێبوونی عەرەب لە باکووری عێراق دەناسرێن[٢٨]، واتە (ڕێگای سوڵتانی)، کە لە تەلەعفەرەوە دەستپێدەکات و بە پردێ و کەرکوك و داقووق و کفری تێپەڕ دەبێت و لە خانەقین و مەندەلی و جیزان کۆتایی دێت[٢٩]. سەبارەت بە مێژووی پەیدابوون و نیشتەجێبوونی تورکمانەکان لە ناوچەکە جێی مشتومڕێکی زۆرە. نووسەرە تورکمانەکان پێیانوایە مێژووی پەیدابوونی تورکمان لە شارەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی عەبباسییەکان[٣٠]. بەڵام هەندێك مێژوونووس مێژووی نیشتەجێبوونی تورکمانەکان لە شاری کەرکوکدا دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی هەڵمەتەکەی سوڵتان موڕادی چوارەمی عوسمانی (١٦٣٨) بۆ سەر بەغدا. وەك دەزاندرێت نیشتەجێبوونی تورکمانەکان لە شێوەی شەپۆلی کۆچکردندا بووە لە ناوچە ڕەسەنەکانیانەوە بۆ عێراق، کە چەند قۆناغێکی جیای بەخۆوە بینیوە.

لە خوێندنەوەو بەراوردکردنی زانیارییە مێژووییەکانەوە وا دەردەکەوێت کە مێژووی پەیدابوونی تورکمانەکان بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یەکەمی حوکمڕانیی عەبباسی کە وەك سەربازی کرێگرتە هێنراون، بەڵام ئەو ڕۆژگارە بوونیان بەو شێوەیە نەبووە کە وەك بەشێك لە پێکهاتەی دانیشتووان حسێب بکرێن، بە بەڵگەی ئەوەی وڵاتناسانی ئیسلامی، وەك: (ابن مهلهل، ابن حوقل، القزويني، ياقوت الحموي، ابو الفداء، ابن فضل الله العمري، القلقشندي) ئاماژەیان بە بوونی پێکهاتەی تورکمانی لە عێراقدا نەکردووە[٣١].

لە قۆناغەکانی دواتردا، لە سەرەنجامی شاڵاوەکانی هۆزە تورکمانییەکانی ئاسیای ناوەڕاست (سەلجووقی و دەسەڵاتدارێتی قەرەقۆینلوو (١٤١١-١٤٦٨)، ئاقۆینلوو (١٤٦٨-١٥٠٨))دا، شەپۆلی هاتنی تورکمانەکان لە ناوچەکەدا دەرکەوتووەو لە سەردەمی دوورو درێژی عوسمانیشدا، دوا شەپۆلە کۆچی تورکمانەکان بۆ ناوچەکە هاتووەتە ئارا[٣٢]. لەبەر ئەوەی زەمانی تورکمانەکان هەمان زەمانی دەسەڵاتی حوکمڕانی عوسمانی بوو لەو سەردەمەدا، بۆیە بە شێوەیەکی پتەو توانیان ڕەگ داکوتن لە نێو کۆمەڵگاکانی عێراقی[٣٤].

هەڵبەت دەبێت سەرنج بۆ ئەو ڕاستییەش ڕابکێشرێت زۆربوونی ژمارەو گەشەکردنی ڕێژەی تورکمانەکان لە ناوچەکەدا پەیوەندی بە باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و کارگێڕییەوە هەبووە، کە بەشێکی بەرچاوی کورد لە پای دەستکەوتی ئابووری و پێگەی کۆمەڵایەتی و پۆستی کارگێڕی و سەربازیدا، لە سەردەمی باڵادەستیی عوسمانییەکاندا وردە وردە لە نێو بووەتەی تورك و تورکمانبووندا تواونەتەوە[٣٥]. ئیدی لەو ئاکامەشدا شاری کەرکوك بە مەڵبەندی سەرەکی نیشتەجێبوونی تورکمانەکان لە قەڵەمدراوە[٣٦].

ئەم پرۆسەی خۆ بە تورکدانە قەڵەمە دوو نووسەری ئەمریکی هێناوەتە ئەو باوەڕەی کە بڵێن: "لە عێراق لە سەروبەندی سەدەی نۆزدەهەمدا بانگەوازی تورکیبوون، بە بەڵگەیەکی لۆژیکدار، کلیلی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی بووە.. بۆیە شتێکی ئاساییە کە کەرکوك لە ئاکامی ئەو بایەخە لە ڕادەبەدەرەی هەیبوو لە لایەن بنەماڵە بە بنەچە تورکەکانەوە پایە باڵاکانی بە درێژایی چەند سەد ساڵێك قۆرخ بکرێت"[٣٧]. لەم زانیارییانەی پێشەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە مێژووی پەیدابوون و نیشتەجێبوونی تورکمانەکان بە بەراورد بە مێژووی نیشتەجێبوونی بەشە سەرەکییەکانی دیکەی پێکهاتەی دانیشتووانی ناوچەکە نوێترە.

وەك لە پێشەوەدا ئاماژەمان بۆ کرد ئەستەمە بتوانرێت بە وردی دابەشبوونی جوگرافیی پێکهاتەی دانیشتووانی کەرکوك جیا بکرێتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی شوێنی نیشتەجێبوونی تورکمانەکان لە شاری کەرکوکدا دەکەوێتە گەڕەکەکانی قەڵاو قۆرییەوەو بوونیان لەو گەڕەکانە بە چڕی دیارە. لە بەرقەڵاشدا لە گەڕەکەکانی: (چای، چقوور، ئاوچی) بوونیان زەقە. بنەماڵە بەناوبانگەکانی تورکمان لە شاری کەرکوکدا بریتین لە: (نەوتچی، قیردار، ئاوچی، یاقوبی). هەروەها خێزانە بەناوبانگەکانی هۆزەکانی (بەیات و قەرەئولوس و تاتران) لە کەرکوکدا نیشتەجێبوونە[٣٨].

٣. عەرەب:

هۆزەکانی عەرەب لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلامەوە بەرەو ناوچەکانی عێراق و وڵاتی شام کۆچیانکرد و ئەم کۆچەش بەردەوام بوو، بۆیە بازنەکانی بڵاوبوونەوەی هۆزە عەرەبییەکان بەربڵاوبوون[٣٩]. پەیدابوونی عەرەبەکان لە کەرکوکدا بە دوو ڕێگە بوو:

یەکەمیان: لە شێوەی نیشتەجێبوونی هۆزو خێڵە کۆچەرییەکان (البدوية) بوو لە ناوچەکەدا. دووەمیان: لە شێوەی فەرمانبەرو خاوەن پیشەو کرێکاریدا بووە. سەبارەت بە ڕێگەی یەکەمیان والی بەغدا (مەدحەت پاشا) (١٨٦٩-١٨٧٢) و سەرۆك وەزیرانی عێراقی (یاسین هاشمی) (١٩٣٤-١٩٣٦) ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لە نیشتەجێکردنی

هۆزە عەرەبییەکان لە ناوچەی کەرکوکدا[٤٠]، بە تایبەت هۆزەکانی: (شمر، عبید، طی، جبور، جحیش، عکیدات، کروی، لهیب، البو صباح، دلیم، عنزة، ضفیر، نعیمی، جوالة، جمیلة، قرەغولی[*])[٤١].

بەناوبانگترین دانیشتووانی عەرەبی نێو شار بریتیبوون لە (نعێمی)یەکان، کە شوێنکەوتووی رێبازێکی سۆفیگەری دیار بوون (رفاعی) لە شارەکەدا[٤٢]. پێویستە ئەوەش بوترێت، کە راکێشانی هێڵی ئاسنی و پەیدابوونی هۆی گواستنەوەی نوێ (ئۆتۆمبێل) و کردنەوەی رێگا نوێیەکان کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر پتەوبوونی رایەڵی پەیوەندییەکانی کۆچەرییەکان بە چەقی شارەکانەوە[٤٣].

سەبارەت بە رێگەی دووەمیان حکومەتەکانی عێراقی و کۆمپانیای نەوت رۆڵی گەورەیان تیایدا گێراوە. بەر لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی (١٩٢١) ژمارەیەکی یەکجار کەم عەرەب لەنێو شاردا بوونیان هەبوو، کە بریتیبوون لە حەدیدییەکان. بەڵام دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی (١٩٣٢)، ساڵ دوای ساڵ ژمارەی عەرەبەکان زیادی کرد ئەوەش لە رێگەی گواستنەوەی شوێنی کاری زۆرێك لە کاربەدەست و فەرمانبەرانی عەرەب لە لیوا عەرەبییەکانەوە بۆ شاری کەرکوك[٤٤]. هەروەها جێگیرکردنی بنکەی فیرقەی دووی سوپای عێراق لە شارەکەدا لایەنێکی دیکەی ئەو سیاسەتە بوو کە حکومەتی عێراقی عەرەبی(!) پەیڕەوی کرد. رۆڵی کۆمپانیاش لە هاتنی ژمارەیەکی زۆری عەرەب بۆ شاری کەرکوك بە مەبەستی کارکردن و پەیداکردنی بژێوی ژیانیان، کەم نەبوو[٤٥].

بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) ئەو کەسانەی زێدی رەسەنیان لیوا عەرەبییەکان بووە و لە شاری کەرکوك ناونووس کراون، وەك لە خشتەی ژمارە (٥)دا روونکراوەتەوە، بریتیبوونە لە (١٤٨٠٩) کەس، کە لەم ژمارەیە (٧٧٣٥) کەسیان لە رەگەزی نێر و (٧٠٧٤) کەسیشیان لە رەگەزی مێ بوونە.

خشتەی ژمارە (٥)

پۆلێنکردنی دانیشتووان بەپێی زێدی لەدایکبوون لەنێو شاری کەرکوك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)[٤٦].

| زێد | رەگەز | | تێکڕا |
|---|---|---|---|
| | نێر | مێ | |
| موسڵ | ٢٦٦٦ | ٢٢٧٠ | ٤٩٣٦ |
| دیالە | ١٠٨٧ | ٩٢٥ | ٢٠١٢ |
| رومادی | ٤٠٩ | ٣٧٠ | ٧٧٩ |
| بەغداد | ١٩٤١ | ١٨٤٧ | ٣٧٨٨ |
| کوت | ١٠٢ | ١٠٦ | ٢٠٨ |
| حللە | ١٠٢ | ٧٤ | ١٧٦ |
| کەربەلا | ٣٣ | ١٨ | ٥١ |
| دیوانیە | ٩٠ | ٧٤ | ١٦٤ |
| عمارە | ٦٤٩ | ٧٣٢ | ١٣٨١ |
| ناسریە | ٣٠٩ | ٣٣٥ | ٦٤٤ |
| بەسرە | ١٤٠ | ١٣١ | ٢٧١ |
| دیار نەکراو | ٢٠٧ | ١٩٢ | ٣٩٩ |
| کۆی گشتی | ٧٧٣٥ | ٧٠٧٤ | ١٤٨٠٩ |

بە دڵنیاییەوە بەشێکی زۆری ئەم ژمارەیە بۆ گەشت و گەران و کاری کت وپڕ لە سەرژمێرییەکە لە شاری کەرکوك ناونووس نەکراون، بەڵکو زۆربەیان ئەو کەسانەن کە بە مەبەستی کار و بژێوی ژیان و هەروەها لە چوارچێوەی کۆچی دەرەکی لە شاری کەرکوکدا گیرساونەتەوە. سەرباری ئەم عەرەبانەی لیوا عێراقییەکان، خەڵکانی دیکەی عەرەب لە وڵاتانی عەرەبییەوە لە شارەکە نیشتەجێبوونە.

لە هەمان سەرژمێرییدا هاتووە ژمارەی دانیشتووانی وڵاتانی عەرەبی وەك: (سووریا، لوبنان، ئوردن، شانشینی عەرەبی سعوودی و وڵاتانی دیکەش) کە لە شاری کەرکوك نیشتەجێبوونە بریتیبووە لە (٣٤٨) کەس. لەو ژمارەیە (١٧١) کەسیان لە رەگەزی نێر و (١٧٧) کەسیشیان لە رەگەزی مێ بوونە[٤٧]. سەبارەت بە دابەشبوونی جوگرافیی عەرەبەکان لە ناو شاری کەرکوکدا، بە شێوەیەکی گشتی شوێنی نیشتەجێبوونیان دەکەوتە گەرەکەکانی خوارووی شار، بە تایبەت گەرەکی چقوور[٤٨]. هەروەها سەرباری ئەوەی بەشێکیان لەسەر قەڵادا بوونیان هەبوو لە بەشی قۆریەشدا بە شێوەیەکی پەرت و بڵاو نیشتەجێببوون.

٤. کلدان:

مێژووی نیشتەجێبوونی کلدانەکان[٤٩] لە ناوچەکەدا کۆنە[٥٠]، بەڵام هەمیشە وەك کەمینەیەك لە کۆمەڵگای کەرکوکی ماونەتەوە، لە باشترین باریاندا رێژەیان لە شاری کەرکوکدا (٧٪)ی تێپەڕ نەکردووە. ئەوەش بۆ چەند هۆیەکی زانراو دەگەرێتەوە، لەوانە: کۆچی ناوخۆیی، واتە کۆچی کلدانەکانی شاری کەرکوك بۆ شارەکانی دیکەی وەك موسڵ و بەغدا[٥١]. سنووردارکردنی وەچە و منداڵ و رێکخستنی خێزان[٥٢]. هەروەها زۆربوونی لە رادەبەدەری ژمارەی دانیشتووانە موسڵمانەکان، بە جیاوازیی رەگەز و نەتەوەکانیانەوە، کاریگەری هەبووە لەسەر نزمبوونەوەی ژمارە و رێژەی مەسیحییەکان (کلدان، ئاشووری) بە شێوەیەکی گشتی.

شوێنی نیشتەجێبوونی کلدانەکان لە شاری کەرکوکدا لە سەرەتای سەردەمی پاشایەتیدا، بە شێوەیەکی گیرخواردوو، تەنها لە گەرەکی حەمام (حەمام مەسیحی) بوون. بەڵام لە دوای پەرەسەندنە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی شارەکە و سەقامگیریی ئاسایش، زۆربەی کلدانەکان ئەو کۆتەی پێشوویان شکاند و قەڵایان جێهێشت و بە مەبەستی نیشتەجێبوون روویان لە بەشی قۆریە کرد، لە گەرەکەکانی: (شاترلو، ئەلماس، تەپە و عەرەفە (نەوتی کەرکوك)) گیرسانەوە[٥٣].

٥. جوو:

جووەکان لە ئەنجامی کۆمەڵێك شەپۆلی ڕاگواستنەوە لەسەر دەستی پاشاکانی ئاشووریو بابلییەوە لە وڵاتی عێراق نیشتەجێبوونە[٥٤]. بە گوێرەی (ئینسکلۆپیدیای جودابیکا)ی جووەکان، یەکەم نشینگەی جووەکان لە شاری کەرکوکدا، کە لە سەرچاوەکاندا ناوی هاتبێت دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەمی زایینی. سەبارەت بە ژمارەشیان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم هەمان سەرچاوە بە (٢٠٠) خێزان خەمڵاندوویەتی[٥٥]، بەڵام بە هاتنی ئینگلیزەکانو دەرهێنانی نەوت ژمارەی جووەکانی شاری کەرکوك هەڵکشانی بەخۆوە بینیو باری ئابووریو کۆمەڵایەتیان گەشەی بەخۆوە گرت[٥٦].

لە ئاکامی هۆی تایبەت بە ئایینی جووەکانو پەیوەندییەکانیان بە پێکهاتە سەرەکییەکانی دانیشتووانی شارەوە، جووەکان لە گەڕەکێکی تایبەتدا نیشتەجێبوون کە هەر بە ناوی خۆیان ناسرابوو (پیریادی موسەوی).

٦. ئەوانی دیکە:

جگە لەو ڕەگەزو نەتەوانەی لە سەرەوە باسکران، گرووپو ڕەگەزی دیکەش لە شاری کەرکوکدا هەبوون، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر کەم، کە لەناویاندا کۆمەڵی ئەرمەنەکان لە هەموویان ناسراوتر بوون. لە ڕاستییدا مێژووی بوونی ئەرمەنەکان لە شاری کەرکوکدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانێکی زۆر بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی[٥٧]. لە سەروەختی جەنگو دواتریشدا شەپۆلی دیکەی کۆچی ئەرمەنەکان لە ترسی گیانی خۆیان لەژێر جەورو ستەمی تورکە عوسمانییەکان بەرەو ناوچەکانی عێراق هەڵاتن[٥٨]. لەو ئاکامەدا بەشێك لەوانە لە شاری کەرکوکدا گیرسانەوە. ئەرمەنەکان زیاتر لەگەڵ کلدانییەکان هەڵسوکەوتیان بووەو لە پاڵ شوێنی نیشتەجێبوونی ئەوان ئەمانیش ژیانیان گوزەراندووە. ئەو نزیکایەتیەی نێوانیان بێگومان بۆ هاوئایینی مەسیحی گەڕاوەتەوە[٥٩]. ماوەتەوە بوترێت ئەرمەنەکانی کەرکوك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) لە خانەی ئەو کەسانەی زمانی نەتەوەیی خۆیان دەست نیشان نەکردووە لە قەڵەم دراون[٦٠]. ساڵی (١٩٥٩) حکومەتی عێراقی ڕێگەی بە ئەرمەنەکانی عێراق دا تاوەکو بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان (ئەرمینیای ڕۆژئاوا)، بۆیە بەشێکی زۆری ئەرمەنەکان گەڕانەوەو بەشێکی کەمیان، ئەوانەی لەگەڵ ژیانی عێراق ڕاهاتبوونو هۆی پەیداکردنی بژێوی ژیانیان دەستکەوتبوو، لە عێراق مانەوە[٦١].

سەرباری ئەرمەنەکان بەشێك ڕەگەزو نەتەوەی دیکە لە کەرکوك بوونیان هەبووە، بەڵام بە شێوەی نیشتەجێبوونی بەرچاو نەبووە، بەڵکو زۆربەیان لە کۆمپانیای نەوت کاریان کردووەو تێکەڵ بە کۆمەڵگەی کەرکوکی بوونە، وەك: ئینگلیزو فەرەنسیو فارسو تورکو هیندیو پاکستانی[٦٢]. هەشیانبووە لە پای دەستکەوتنی زانستو زانیاریی ڕووی لە مەدرەسەو مزگەوتەکانی کوردستان کردووە، وەك: ئەفغانیو هیندیو پاکستانی[٦٣].

ب. پێکهاتەی ئایینی دانیشتووان:

شاری کەرکوك هەر لە کۆنەوە شوێنی کۆبوونەوەی کۆمەڵێك ئایینو ئایینزای جیاجیا بووەو پەیڕەوانی ئایینو شوێنکەوتووانی ئایینزاکان بەبێ بوونی گرفتێکی گەورەی کۆمەڵایەتی پێکەوە ژیانیان لە شارەکەدا گوزەراندووە. بەپێی سەرژمێرییە مەزەندەکاریو فەرمییەکان، وەك لە خشتەی ژمارە (٦)دا خراوەتەڕوو، ئایینی ئیسلام هەمیشە پشکی شێرو هەرە گەورەی لە نێو بیروباوەڕەکانی دانیشتووانی شاری کەرکوك بۆ خۆی پچڕیوە.

خشتەی ژمارە (٦)
پۆلێنکردنی دانیشتووانی کەرکوك
بەپێی بیروباوەڕی ئایینییان[٦٤].

| سەرژمێری | ژمارەی دانیشتووان | موسڵمان | مەسیحی | جوو | ئەوانی دیکە |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٢١ | ٩٢٠٠٠[٦٥] | ... | ٦٠٠ | ١٤٠٠ | ... |
| ١٩٣٠ | ٣٥٠٠٠ | ٢٩٠٠٠ | ٣٥٠٠ | ٢٥٠٠ | ... |
| ١٩٤٧ | ٩١٥٨٢ | ٨١٨٤٨ | ٦٧١٥ | ٢٩٥٠ | ٦٩ |
| ١٩٥٧ | ١٢٠٤٠٢ | ١٠٧٣٩٠ | ١٢٦٩١ | ٥ | ٢٨٢ |

وەك لە خشتەی سەرەوەدا ڕوونکراوەتەوە زۆرینەی دانیشتووانی شاری کەرکوك موسڵماننو دوای ئەوانیش مەسیحییەکان بە پلەی دووەمو جووەکان بە پلەی سێیەم دێن. ئەگەر سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) وەك بنەرەتێك وەربگرین بۆ زانینی ڕێژەی بیروباوەڕەکانی پێکهاتەی دانیشتووانی شاری کەرکوك[٦٦]، دەردەکەوێت موسڵمانەکان (٨٩,٣٧٪) لە پێکهاتەی ئایینی شارەکەیان پچڕیوە. مەسیحییەکانیش (٧,٣٣٪)ی پێکهاتەی دانیشتووانیان بەردەکەوێت. ئینجا جووەکان بە (٣,٢٢٪) بەشداری لە پێکهاتەی ئایینی دانیشتووانی شاری کەرکوك دەکەن. بیروباوەڕە ئایینییەکانی دیکەش بریتییە لە (٠,٠٧٪) لە ڕێژەی پێکهاتەی ئایینی دانیشتووانی کەرکوك.

١. موسڵمان:

شاری کەرکوك بە سەرکردایەتی (عوتبە کوڕی فەرقەد) لەنێوان ساڵانی(١٨-٢٠ کۆچی/ ٦٣٩-٦٤١ زایینی)، کەوتووەتە نێو قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامەوە[٦٧]. ئیدی لەو مێژووە بەدواوە ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا بڵاوبووەتەوە. لەو ئاکامەی ناوچەکە بە درێژایی سەردەمە مێژووییەکان لەژێر سایەو سێبەری موسڵمانەکاندا مایەوە، ئایینی ئیسلام بووە پێکهاتەیەکی سەرەکیو هۆزە کوردەکانو بنەماڵە تورکمانەکانی ناوچەکە لە دواتردا،

بوونە پاڵپشتێکی بەهێزی جێگیربوونی. بەڵام بە تێپەڕینی کات، لەنێو پەیرەوانی ئایینەکە، ئایینزاو ڕێبازی جیاواز بڵاوبۆوە، کە گرنگترینیان بریتیبوون لە: ئایینزای (سوننەو شیعە)و ڕێبازی سۆفیگەری (قادری و نەقشبەندی و ڕفاعی). لە خوارەوەدا بە کورتی دەربارەی هەر یەکەیان دەدوێین.

**یەکەم: سوننەکان:**

سوننە مەزهەبەکانی کەرکوك گەورەترین بەشی پێکهاتەی ئایینزایی دانیشتووانن. لەبەر ئەوەی بە درێژایی مێژوو سایەی ئەو بنەماڵەو وڵاتە حوکمرانانەی سوننە مەزهەب بوون دەستیان بەسەر شارەکەدا راگەیبوو، مەزهەبەکە ڕۆژ دوای ڕۆژ تەشەنەی کردووەو شوێنەواری ئایینی و ئایینزایی دیاری لێکەوتووەتەوە، وەك شوێنەکانی پەرستنیش (مزگەوت و تەکیەو خانەقا)و مەزاری پیاوچاکان[٦٨]. لە بەناوبانگترین مزگەوتەکانی شارەکە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا: (نائیب لە گەڕەکی ئاخور حوسێن، نوعمان لە بازاری گەورە، خەلیل ئاغا لە گەڕەکی ئاوچی، ئەرسەلان ئاغا لە گەڕەکی شاترلو، مەلا ئەلیاس لە بازاری گەورە، تۆقاتی لە گەڕەکی پیریادی، مزگەوتی گەورە لەسەر قەڵا، حەسەن مەکی لە گەڕەکی ئاغالق، حەسەن پاکیز لە گەڕەکی مەیدان، عەلی بەگ لە گەڕەکی بەگلەر). تەکیەو خانەقا بەرچاوەکان بریتیبوون لە: (تەکیەی تاڵەبانی لە گەڕەکی بولاق، خانەقای سەیید ئەحمەدی خانەقا لە گەڕەکی شاترلو، تەکیەی نەجیب لە گەڕەکی ئاغالق، مەقام خادم سوججادە لە گەڕەکی بولاق، تەکیەی جەباری لەسەر قەڵا، تەکیەی کەسنەزانی لە گەڕەکی ئیمام قاسم، تەکیەی بیارە، تەکیەی شێخ باقی لە گەڕەکی شاترلو). مەزارە بەناوبانگەکانیش بریتیبوون لە: (نەبی دانیاڵ و هاوڕێیانی لەسەر قەڵا، ئیمام قاسم لە گەڕەکی ئیمام قاسم، سوڵتان ساقی لە گەڕەکی تسن، ئەبو عڵووگ لە گەڕەکی مووسەڵلا)[٦٩].

**دووەم: شیعەکان:**

بە گوێرەی بەڵگەنامە عوسمانییەکان، پەیدابوونی ئایینزای شیعی لە ناوچەی کەرکوك زۆر پێش هەڵمەتەکانی شا عەبباسی گەورەی سەفەوی (١٦٢٣)و نادر شای ئەفشاری (١٧٣٣-١٧٤٣)یە، کە وەك سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان بۆ کردووە ئەو دوو شایە، تورکمانە قزلباشەکانیان لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك و دووزخورماتوو نیشتەجێکردووە[٧٠]. سەبارەت بە ژمارەی شیعەکانی کەرکوکیش، وەك سەرژمێرییە مەزەندەکارییەکەی ساڵی (١٩١٩) ئاماژەی پێداوە ژمارەیان لە لیوای کەرکوك بریتیبووە لە (٥٠٠٠) کەس. لە بەرانبەردا (٨٥٠٠٠) کەس لەسەر مەزهەبی سوننە بوونە[٧١]. شوێنی نیشتەجێبوونی شیعە مەزهەبەکان لەنێو شاری کەرکوکدا دەکەوێتە بەشی خوارووی خۆرئاوای کەرکوکەوە، بە تایبەت لە گەڕەکی (تسن) بوونیان هەبووە. یەکەم (حوسەینییە)ی شیعەکان لە شاری کەرکوکدا لە سەرەتای پەنجاکاندا هەبووە لە شەقامی ئەتلەس[٧٢]. پێویستە بگوترێت ئەو شیعانەی لە شاری کەرکوکدا بوونیان هەبووە زۆرینەی زۆریان لە ڕەگەزی تورکمان بوونە[٧٣]. دواتر لە شەستەکانی سەدەی بیستەم بەدواوە، ناوچەی نیشتەجێبوونی شیعە لە کەرکوك پەریوەتەوە بەشی بەر قەڵا و لە گەڕەکی (قەسابخانە)دا چەند کۆڵان و شوێنێکیان تەنیوە[٧٤].

**٢. مەسیحی:**

بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکوکدا مێژوویەکی کۆنی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی زایینی[٧٥]. ئەم شارە هەر لە زووەوە شوێنێکی گرنگی مەسیحییەکان بووە، شارەکە بە یەکێك لە کۆنترین مەترانیەتەکانی کڵێسای ڕۆژهەڵاتی حسێبکراوە[٧٦]. ئێستاشی لەگەڵدا بێت شاری کەرکوك بە پلەی ئەبرەشیە ماوەتەوە. لە ئەنجامی جیاوازیی بیروبۆچوونی مەسیحییەکان سەبارەت بە سروشتی کەسێتی حەزرەتی عیسا و مەریەمی دایکی، چەند ئایینزایەك لەنێویاندا بڵاوبۆوە[٧٧]، کە لە گرنگترینیان ئایینزای: (کاتۆلیکی و ئەرسەدۆکسی و پرۆتستانتی) بوو. زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی ئەم مەزهەبانە گەیشتنە ناوچەی کەرکوك و بڵاوبوونەوە، بەڵام لە نێو شاری کەرکوکدا تەنها دوو مەزهەب بوونیان هەبووە: کاتۆلیکی و ئەرسەدۆکسی[٧٨]. مێژووی سەرهەڵدانی مەزهەبی کاتۆلیکی لە کەرکوك دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمی زایینی، بەڵام مێژووی دەرکەوتنی مەزهەبی ئەرسەدۆکسی لە کەرکوك کۆنترەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زووتر[٧٩]. کلدانەکانی کەرکوك سەر بە مەزهەبی کاتۆلیکی و ئەرمەنەکانیش سەر بە مەزهەبی ئەرسەدۆکسین.

بەپێی بەڵگەنامەکانی عوسمانی ژمارەی مەسیحییەکانی کەرکوك لە ساڵی (١٨٩٥)دا بریتیبووە لە (٢٢٩) کەسی نێر[٨٠]. لە کاتێکدا بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی دەگمەنی کونسوڵی نەمسا-مەجەریش لە بەغدا ساڵی (١٩٠١)، ژمارەی خێزانەکانی ئەبرەشیەی کەرکوك گەیشتووەتە (٣٥٠) خێزان[٨١]. پێکهاتەی مەسیحیی لە کەرکوك بە بەراورد بە پێکهاتەکانی دیکەی شارەکە لە پاشەکشەدابووە، بۆیە ژمارەیان لە سەرژمێریی ساڵی (١٩١٩)دا تەنها بریتیبووە لە (٦٠٠) کەس. ئەم ژمارەیە لە ئاکامی بەکارکەوتنی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوك و هاندانی دەسەڵاتدارانی کۆمپانیا بۆ کارپێدان بە مەسیحییەکان هەڵکشانی بەخۆوە گرت، مەسیحییەکانی وا لێکرد لەو قاوغە کۆنە چەند ساڵەی خۆیان بێنەدەرێ و کۆت و پێوەندەکانی کۆنیان بشکێنن و لە خوارەوەی قەڵا بەناو گەڕەکی موسڵماناندا بڵاو ببنەوە، دواتریش بە چڕی لە چەند گەڕەکێکی تایبەت و تازەدا نیشتەجێبن. ئەوەی پێویست بە وتن دەکات دابەشبوونی جوگرافیی مەسیحییەکانی کەرکوك، بە شێوەیەکی سەرەکی لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەسەر قەڵا و لە گەڕەکی (حەمام) بوو، بەڵام لە ئاکامی چەند هۆیەکی زانراو، کە لە لاپەڕەکانی پێشەوەدا ئاماژەی پێدرا، گۆڕانێکی چڵۆنایەتی لە دابەشبوونی جوگرافییان هاتە ئارا بەوەی بەسەر چەند گەڕەکێکی تازەی شاردا پرژو بڵاوبوون. بۆیە شوێنی سەرەکییان لەو مێژووە بەدواوە

بریتییە لە گەڕەكەكانی: (حەمام، ساری كەھیە، بەگلەر، شاترلو، ئەلماس، خاسە، عەرەفە)[٨٢]. مەسیحییەكان لەنێو شاری كەركوكدا لە ماوەی لێكۆڵینەوەكە خاوەنی سێ شوێنی دیاری پەرستن بوونە: (كڵێسای (ام الاحزان)و كڵێسای مار یووسف لەسەر قەڵاو كڵێسای سوور لە ڕۆژھەڵاتی شاری كەركوك)[٨٣]. پێشتر كڵێسای دیكەشیان ھەبووە، بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەكان لەسەر داروپەردووی كڵێسای مەسیحییەكان مزگەوت بنیاتنراوە لەوانە: مزگەوتی گەورە (اولو جامع) لەم بابەتەیە.

٣. جوو:

مێژووی نیشتەجێبوونی جووەكان لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (٥٩٧)و (٥٨٦)ی پێش زایین، كاتێك پاشای كلدانی (نەبوخد نەسەر) بە زۆر لە زێدی خۆیانی ڕاگواست بۆ وڵاتی میسۆپۆتامیا[٨٤]. بە تێپەڕینی سەردەمەكان زۆربەی ئەو جووانە مانەوەو توانیان خۆیان لەگەڵ بارودۆخی ناوچەكان بگونجێنن. ئەو ئایینە ئاسمانییانەی دواتریش پەیدابوون ڕێگرنەبوون لە بیرو باوەڕیان، بۆیە جووەكان پارێزگاریان لە بوونی خۆیان كرد لە ناوچەكەدا. لە سەردەمی عوسمانیشدا جووەكان ئازادیی ئایینییان پارێزراو بوو، لەو ڕۆژگارە دوو دەزگای تایبەت كاروباری جووەكانی ھەڵدەسوراند: یەكێكیان سیڤیلو ئەوی دیكەیان ئایینی بوو. سەرۆكی حاخامەكان (حاخام باشی) كە لە لایەن دەروازەی باڵاوە (باب العالی) دەستنیشان دەكرا، كاروباری گرووپی جووەكانی لە دەوڵەتی عوسمانی بەڕێوە دەبرد، ھەر لەو سەردەمەدا جووەكان چەند دەزگایەكی ئایینیو فێركاریو خێرخوازیان ھەبوو[٨٥]. لە ڕۆژگاری داگیركاری (١٩١٨-١٩٢٠)و ئینتیدابی بەریتانی (١٩٢٠-١٩٣٢)یشدا، جووەكان گەشانەوەو نەشونمابوونێكی باشیان لە بوارەكانی كۆمەڵایەتیو ئابووری بەخۆوە بینی. ژمارەیان لە سەرژمێریی ساڵی (١٩١٩) لە تەواوی عێراق گەیشتووەتە (٨٧٤٨٨) كەس، كە لەو ژمارەیە (١٤٠٠) كەسیان بەر كەركوك كەوتووە. واتە بە ڕێژەی (١,٦٠٪) لە كۆی گشتیی جووەكانی عێراق. ئەو گەشەكردنەی بوارە جیاجیاكانی گرووپی جووەكان ساڵانی سیو چلی سەدەی بیستەمیشی گرتەوەو بەردەوام بوون لە سەركەوتن بەسەر پەیژە كۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕۆشنبیرییەكانی كۆمەڵگەی عێراقی[٨٦]. جووەكان لە نێو كۆمەڵگەی عێراقی، بە تایبەت لە شارەكاندا، ھەر لە شێوەی كۆمەڵگەی باوی جووەكان بە شێوەی (گیتۆ) دەژیان، كە لە وڵاتی عێراق بە گەڕەك ناسراوە. بۆیە لە چەند شارێكی عێراقی گەڕەكی تایبەت بە جووەكان ھەبوو. لە كەركوكدا جووەكان لە گەڕەكی (پیریادی موسەوی) نیشتەجێببوون. ئەو گەڕەكە لەژێر فەرمانی سەرۆكی گەڕەكەكە بوو، كە گوزارشتبوو لە كەسێتی (حاخام)و بەرپرسی ھەڵسوكەوتیان بوو لە بەردەم دەسەڵاتدا[٨٧]. جووەكان لە كەركوكدا خاوەنی كەنیشتە (سیناگۆگ)و چەند مەزارگەیەكی بەناوبانگ: (دانیاڵ، عوزێر، حونەینو میكائیل) بوون[٨٨]، كە كەوتوونەتە سەر قەڵا.

٤. ئەوانی دیكە:

لە شاری كەركوكو لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢١-١٩٥٨)دا، چەند ئاینو ئایینزاو گرووپی دیكەی ئایینی دەژیان، وەك: (كاكەیی، سابیئەی مەندایی[٨٩]، ئێزیدی[٩٠]). دیارترینی ئەوانە گرووپی ئەھلی ھەق بوو، كە لە كوردستانی عێراق بە (كاكەیی) ناسراون. ئەمانە كۆمەڵێكی ئیتنۆ-ئایینین لە نێو نەتەوەی كورددا، لە چوارچێوەی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان دووره پەرێزانە دەژینو خاوەنی باوەڕێكی ئایینیو گەلێك مۆركو نەریتی تایبەتین[٩١]. دەربارەی كۆمەڵی كاكەییو بنەچەو مێژووی دەركەوتنیان، مێژوونووسو توێژەرەوان نەگەیشتوونەتە بۆچوونێكی یەكلاكەرەوە[٩٢]، ھەڵبەت ئەوەش بۆ پەنھانبوونی بیروباوەڕەكانیان دەگەڕێتەوە، كە ڕێگە بە ئاشكراكردنیان نەدراوە.

ھەرچۆنێك بێت، كۆمەڵی كاكەیی لە ناوچەی كەركوكدا بوونێكی بەرچاوی ھەیە. لە نێو شاردا، كاكەییەكان لە گەڕەكێكی تایبەتدا بە ناوی (ئیمام ئەحمەد) دەژیان، كە گەڕەكێكی بچووكە لەنێو گەڕەكی (موسەڵلا)[٩٣]. بەڵام لەگەڵ ئەو پەرەسەندنو گۆڕانە ئابووریو سیاسییانەی لە چلەكاندا ھاتنە ئارا، باری كۆمەڵایەتی دانیشتووانی كەركوكیش لە چوارچێوەیەكی گشتییدا، وەرچەخانی بەخۆوە بینی، بۆیە دەبینین ھاوشێوەی مەسیحییەكان، كاكەییەكانیش لەو ڕۆژگارەوە بە شێوەیەكی داخراو ناژین، بەڵكو تێكەڵ بە گەڕەكی دیكەی موسڵمانان دەبنو شانبەشانی ئەوان دەژین. لەو گەڕەكە دیارانەی كاكەییەكان تیایدا نیشتەجێ دەبن گەڕەكی (چای)ە[٩٤]. دەڵێن گوایە یەكەم كەس كاتی خۆی لە گەڕەكی (ئاخور حوسێن) نیشتەجێبوو بێت كەسێكی كاكەیی بووە بە ناوی (كاكە حوسێن)[٩٥]، بەڵام ئەمە تەنھا بۆچوونێكە. سەبارەت بە ژمارەی دانیشتووانی كاكەیی لە كەركوكدا، لە ئاكامی پەنھانبوونی بیروباوەڕەكانیان، ھیچ كەرەستەو بەڵگەیەكی مێژوویی بەردەست نییە. تەنانەت لەنێو سەرژمێرییە فەرمیو نافەرمییەكانیشدا، كەم تا زۆر زانیاری دەربارەیان تۆمار نەكراوە.

ھەرچی گرووپەكانی دیكەیە لە كەركوكدا، بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، ژمارەی (سابیئەكان) لە نێو شاردا (٢٠٧) كەس بووە كە لە گەڕەكەكانی: (ساری كەھیە، بەگلەر، خاسە، حەمام، عەرەفە) بە تایبەتی نیشتەجێبوونە. ژمارەی (ئێزیدی)یەكانیش بە گوێرەی ھەمان سەرژمێری (٢١) كەس بووە، شوێنی نیشتەجێبوونیان سنووردار نییە، بەڵكو بە شێوەیەكی پەرتو بڵاو بەسەر گەڕەكەكانی بەشی قۆریەدا دابەشبوونە[٩٦].

لەو زانیارییانەی سەرەوەدا دەردەكەوێت، بەشی قۆریە،لە ڕۆژگاری پاشایەتیو ماوەی لێكۆڵینەوەكە، دیاردەی فرەچەشنی ئایینی بەسەردا زاڵترە وەك لە بەشی بەر قەڵا. پێدەچێت ھۆی ئەم فاكتەش بۆ دوو لایەن بگەڕێتەوە كە لە بەشی قۆریەدا ھەبووە: یەكەمیان: بوونی كۆمپانیای نەوتو ڕۆڵی لە ھاندانی گرووپە ئایینییەكان بۆ كاركردن لە پرۆژەكانی كۆمپانیادا. دووەمیان: بوونی دەستگا

سەرەکییەکانی دەوڵەت و بڵاووبوونەوەیان بە شێوەیەکی بەربڵاو لە گەرەکەکانی قۆڕیەدا، ئەوەش جێی دڵنیایی ئەو گرووپە ئایینییانە بووە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) لەم رووەوە، بروانە: فاضل حسين، (مشكلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية العراقية-الانكليزية-التركية وفي الراي العام)، الطبعة الثالثة، بغداد، ١٩٧٧، صفحات متعددة.

(٢) ب.ط. سعد، قضية الموصل في مؤتمر لوزان، مطبعة الفلاح، بغداد، ١٣٤٣هـ/ ١٩٢٤م، ص٤.

(*) لە سەرچاوەکەدا بە هەڵە کۆی گشتیی دانیشتووان بە (٢٨٤٠٠٠) کەس تۆمارکراوە.

(٣) عصبة الأمم، مسألة الحدود بين تركية والعراق، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٢٤، ص٩٤.

(٤) عثمان علي، الكورد في الوثائق البريطانية، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٨، ص ص١٧٨-١٨٠.

(٥) خليل اسماعيل محمد، كردستان العراق في ضوء التعدادات السكانية، اربيل، ٢٠١١، ص١٠؛دلشاد مەحموود عەبدوررەحمان، ل٤٠-٤٢.

(٦) متّي عقراوي، العراق الحديث، (ترجمة: د.متي عقراوي و مجيد خدوري)، الجزء الاول، بغداد، ١٩٣٦، ص١١؛ هاشم جواد، مقدمة في كيان العراق الاجتماعي، بغداد، ١٩٤٦، ص١٠؛ سعيد حمادة، النظام الإقتصادي في العراق، بيروت، ١٩٣٨، ص١٢؛ احمد نجم الدين، أحوال السكان في العراق، دون مكان الطبع، ١٩٧٠، ص١٠٨.

(٧) ئەم خەمڵاندنە لە سەرچاوەکەدا بە (١٣٦,٧٥٠) کەس هاتووە، بەڵام پاش وردبوونەوەو کۆکردنەوەی سەرجەم ئەو زانیارییانەی داویەتی، کۆی ژمارەکە دەکاتە (١٣٢,٧٥٠) کەس. بروانە:

P.R.O، F.O، 371 /14521/5247، Recial statistics for Kurdish Areas to latest Figures، February 1930، P.19.

(8) Iraq Administration Reports (1914-1932)، Vol: (2)، 1918، Administrative Report، Kirkuk District، Period October 26th December 31st، 1918، P.434; Vol: (4)، 1919، P.2; Vol: (5)، 1920، P.5.

(٩) ساڵی (١٩٤٩) شاری کەرکوك بە هەمان رێگە بە ناوچەکانی باکووری عێراق بەسترایەوە.

(١٠) بروانە: صلاح حميد الجنابي وسعدي علي غالب، جغرافية العراق الأقليمية، الموصل، ١٩٩٢، ص ص٢٤٩-٢٥٠.

(١١) محەمەد ئەمین زەکی، دوو تەقەلای بێ سوود، لێکۆڵینەوە: سەباحی غالب، (هەزارمێرد) "گۆڤار"، ژمار (٤)، سلێمانی، حوزەیرانی ١٩٩٨، ل٧٧.

(12) M. S. Hasan، Growth and Structure of Iraq Population (1867-1947)، Oxford University Press، London، 1958، P.334.

(١٣) مقبل عايد الحمد، تحليل لبعض الإحصاءات السكانية، مطبوعات الجهاز المركزي، بغداد، ١٩٧٢، ص٥؛ جبار قادر، التكوين الاثني لسكان كركوك خلال الفترة (١٨٥٠-١٩٥٨)، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص٢٦٨.

(١٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، لواء كركوك، ص١٠٣.

(١٥) بروانە: ا.م. مینتیشاشڤیلی، کورد (کورتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتی-ئابووریی، رۆشنبیریو گوزەران)، (وەرگێرانی: د.عیزەدین مستەفا رەسووڵ)، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٣٠٠؛ نوري خليل البرازي و خطاب صكار العاني، جغرافية العراق، بغداد، ١٩٧٩، ص ١٤١-١٤٢؛ عبد الرزاق عباس حسين، نشأة مدن العراق وتطورها، دون مكان الطبع، ١٩٧٣، ص٧٣-٧٤.

(١٦) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك،ص١٤٥.

(١٧) لەسەر بنەمای جۆر بە جۆریی ناوچەکانی عێراق (باکوور، ناوەراست و باشوور)، ئەم چەند قەزا ناوەندییە بە نموونە وەرگیراون.

(١٨) بۆ ئامادەکردنی ئەم خشتەیە، پشت بەم سەرچاوانە بەستراوە:إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧؛المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧.

(١٩) بروانە: لطيف هاشم كزار الطائي، التوزيع السكاني والسياسة السكانية في العراق، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة بغداد، ١٩٩٦، ص١١٩.

(٢٠) بروانە:المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، الجدول السادس عشر، ص٢٤٣.

(٢١) ئەم ژمارەیە، بەشێك کورد و کلدانەکانیش دەگرێتەخۆ، چونکە زۆرێك لە دانیشتووانی نێو شاری کەرکوك، لە ئەنجامی زاڵیی کەلتووری تورکمانی بەسەر سیما سەرەکییەکانی شارستانێتی شارەکەوە، بە زمانی تورکمانی دەدوان. تەنانەت هەندێك بنەماڵەی دیاری کورد، زمانی ئاخاوتنی نێو خێزانیان بە تورکمانی بووە! ئەو دیاردە بەرچاوەی، کە سەرچاوەیەکی تورکیی هاوسەردەم، سەبارەت بە سێ سەدو پەنجا خێزانی کلدانی پشت راستی کردووەتەوە.

Islām Ansiklopedisi (İslām Ālemi، Tarih، Coğrafya، Etnografya Ve Biyografya Lugati)، Cild (61 to 66) Maarif Basimevi، Istanbul، 1957، S.590;

دیمانەیەك لەگەڵ نەژاد عەبدوڵڵا عەزیز، بە مێژووی (٧ی نیسانی ٢٠٠٥)، هەولێر. (نەژاد عەبدوڵڵا عەزیز ساڵی (١٩٣٥) لە شاری هەولێر لە دایکبووە، سەرەتایی و ناوەندیی لە کەرکووك خوێندووە، باوکی بۆ ماوەیەکی درێژ (١٩٣٩-١٩٤٨) قائیمقام بووە لە کەرکووك. ئابراو خاوەن بروانامەی

ماستەرەو ئێستا لە هەولێر نیشتەجێیە؛ دیمانەیەك لەگەڵ مارف خەزنەدار (دكتۆر)، بە مێژووی (٢٣ی شوباتی ٢٠٠٦)، هەولێر. (مەعرووف عەبدولقادر مەعرووف) ساڵی (١٩٣٠) لە هەولێر لە دایکبووە، چواری ئامادەیی لە کەرکووك خوێندووە. لە کۆتایی پەنجاکان لە شاری کەرکووك ژیاوە. بڕوانامەی دوکتۆرای لە ئەدەبی کوردیدا بەدەستهێناوە، ماوەیەکی زۆر مامۆستای زانکۆ بووە، (٢٥/١٠/٢٠١٠) کۆچی دوایی کرد.

(٢٢) لە حسێبکردنی ئەم ڕێژانەدا، ژمارەی دانیشتووانە بیانییەکان دەرهێنراوە. بۆ ساغکردنەوەی ڕێژەکان و بەدەستخستنی ئاکامەکان، مامەڵە تەنها لەگەڵ کۆی ژمارەی چوار لایەنەکە کراوە.

(٢٣) بروانه: المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، الجدول السادس عشر، ص٢٤٣.

(٢٤) عمار يوسف عبدالله عويد العكيدي، السياسة البريطانية تجاه عشائر العراق (١٩١٤-١٩٤٥)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص١٢.

(٢٥) جعفر الخياط، القرية العراقية (دراسة في احوالها واصلاحها)، بيروت، ١٩٥٠، ص ٤٧-٤٨؛ نوري خليل البرازي، البداوة و الاستقرار في العراق، دون مكان الطبع، ١٩٦٩، ص١٣٣.

(٢٦) مهدي صالح سعيد العباسي، كركوك في اواخر العهد العثماني (١٨٧٦-١٩١٤) دراسة في اوضاعها الادارية والإقتصادية والثقافية، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الآداب بجامعة الموصل، ٢٠٠٥، ص٢٧.

(٢٧) محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧؛ دیمانەیەك لەگەڵ عیسمەت حەبیب، بە مێژووی (٢٠ ئەیلوولی ٢٠٠٥)، کەرکوك. (عیسمەت حەبیب محەمەد) ساڵی (١٩٤٢) لە شاری کەرکووك لەدایکبووە، نەخوێندەوار، بەڵام بەردەوام لەنێو شاری کەرکووك ژیاوەو دانیشتووی گەرەکی ئیمام قاسم بووە. ساڵی (٢٠٠٨) کۆچی دوایی کرد.

(٢٨) خليل اسماعيل، التوزيع الجغرافي للتركمان في العراق، "السياسة الدولية" (مجلة)، العدد (٤)، اربيل، كانون الثاني ١٩٩٤، ص ص٢٨-٢٩.

(٢٩) جاسم محمد الخلف، جغرافية العراق (الطبيعية والإقتصادية والبشرية)، دار المعرفة، القاهرة، ١٩٥٩، ص٤٠٦.

(٣٠) شاكر صابر الضابط، موجز تاريخ التركمان في العراق، الجزء الاول (من سنة ٥٤هـ/٦٧٣م الى ٢٧ذي القعدة ١٣٧٧هـ/ ١٤ تموز ١٩٥٨)، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٦٠، ص ص٣٥-٣٩؛ عزيز قادر الصمانجي، التاريخ السياسي لتركمان العراق، دار الساقي، بيروت، ١٩٩٩، ص٤٠-٤١؛ ارشد الهرمزي، التركمان والوطن العراقي، الطبعة الثالثة، دار العربية للموسوعات، بيروت، ٢٠٠٥، ص١٥-١٦.

(٣١) عبدالرزاق الحسني، العراق قديما وحديثا، ص٤٩.

(٣٢) عمر ابراهيم توفيق، التركمان في العراق دراسة تاريخية ديمغرافية، "كركوك" (مجلة)، العدد (٢٤)، كركوك، ربيع ٢٠٠٥، ص ص١٤٣-١٧٦؛ عبدالرقيب يوسف، التركمان في كردستان الجنوبية، "كركوك" (مجلة)، العدد (٢١)، كركوك، صيف ٢٠٠٤، ص ص١٣٧-١٥٤.

(٣٣) بە تایبەت لە سەردەمی هەڵمەتەکانی شا عەبباسی گەورەی سەفەوی (١٦٢٣)و نادر شای ئەفشاری (١٧٣٣-١٧٤٣) تورکمانە شیعەکان لە ناوچەکە نیشتەجێبوونە. سنوور سەباح سدیق، مێژووی سیاسەتی بە عەرەبکردن لە پارێزگای کەرکوك (١٩٦٣-١٩٩١)، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٩-٣٠.

(٣٤) جاسم محمد الخلف، المصدر السابق، ص٤٠٦.

(٣٥) ئاماژەی مێژوویی لەم بارەوە زۆرن، بڕوانە: (C.J. Edmonds،Op.cit ، P.266.)(لە وەرگێڕانە کوردییەکە، ل٣٢٣-٣٢٤)؛كمال مظهر احمد، كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير (دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، الجزء الاول، دون مكان وسنة الطبع، ص٨٩؛ ا.م. مینتیشاشڤیلی، کورد، ل٣٨-٣٩. بۆ زانیاریی زیاتریش، بروانه: جبار قادر، كركوك قرن ونصف من التتريك والتعريب، "كركوك" (مجلة)، العدد (١٧)، كركوك، صيف ٢٠٠٣، ص ص١٩١-٢٠٦.

(36) W.R. Hay، Two years in Kurdistan: Experiens of a Political Officer (1918-1920)، London، 1922، P.85.(في نسخته المترجمة الى العربية: ص١٠٦)

(37) Liam Anderson & Gareth Stansfield، Crisis in Kirkuk (The Ethnopolitics of Conflict and Compromise)، University of Pennsylvania Press، Philadelphia، 2009، P.25.

(٣٨) عباس العزاوي، عشائر العراق، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٣٧، ص١١٤؛ حسن اوزمن، التركمان في العراق وحقوق الانسان، انقرة، ٢٠٠٢، ص٣٩-٤٠.

(٣٩) خليل اسماعيل محمد، البعد القومي للاستيطان العربي في محافظة كركوك، في: كركوك بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ص٢٠٤.

(٤٠) احمد محمد الجبوري، الاستيطان الريفي في قضاء الحويجة، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٦، ص ص٤٤-٤٧؛ خليل اسماعيل، دوورایيە (ڕەهەندە) مێژووییەکانی دابەشبوونی جوگرافیای عەرەب لە عێراقدا، "سیاسەتی دەولی" (گۆڤار)، ژمارە (٣)، سلێمانی، تشرینی یەکەمی ١٩٩٤، ل٦٠؛ نوری تاڵەبانی، ناوچەی کەرکوك و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەیی ئەم ناوچەیە، وەرگێڕانی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٥٢-٥٣.

(*) بەشێك لە قەرەغولییەکان خۆیان بە تورکمان لە قەڵەم دەدەن.

(٤١) نافع القصاب، ملامح جغرافية حول استيطان القبائل البدوية المستقلة، "الجمعية الجغرافية العراقية" (مجلة)، المجلد الخامس، بغداد، ١٩٦٩، ص١٧؛ ثامر لؤي العامري، موسوعة العشائر العراقية، بغداد، ١٩٩٣، ص ص٢٦٨ و٣٠٠،

الجزء الخامس، ص ص١٦٠، ٢٠٦-٢١١، الجزء السابع، ص ص٨٤-٨٨ و ١٨٩-١٩٢، الجزء الثامن، ص١٢٢و ١٨٩، الجزء التاسع، ص٧٦.

(٤٢) بڕوانە: يونس الشيخ ابراهيم السامرائي، القبائل والبيوتات الهاشمية في العراق، بغداد، ١٩٧٦، ص ص٩٨-١٠٠.

(٤٣) خليل علي مراد، الاحوال الاجتماعية في العراق في عهد الانتداب البريطاني، في: المفصل في تاريخ العراق، ص٥٥٢.

(٤٤) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم الملف: (٣١١/١١٣٩)، رقم الوثيقة: (٥)، الموضوع: مذكرة مستشار وزارة الداخلية حول الاوضاع في كردستان (شباط/ ١٩٣٠)، ص١٠؛ عثمان علي، الكورد في الوثائق البريطانية، ص٢١٢.

(٤٥) شاكر خصباك، العراق الشمالي/ دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية، بغداد، ١٩٧٣، ص٢٠٥؛نوری تاڵەبانی، ناوچەی کەرکوك، ل٤٨-٥١.

(٤٦) المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص ص٢٣٦-٢٣٧.

(٤٧) المصدر نفسه، ص٢٣٧.

(٤٨) محمد علي قرداغي، هوية كركوك الثقافية والأدارية، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٤، ص١٦١.

(٤٩) دەربارەی کلدانەکانی عێراق بڕوانە: سيروان شابي بهنان، كلدان العراق، رساله ماجستير غير منشوره، مقدمه الى مجلس كليه الاداب بجامعه صلاح الدين/ اربيل، ١٩٩٩.

(٥٠) جرجيس جبرائيل هومي، القوميات العراقية ماضيها وحاضرها واثرها الفعال في ثورة ١٤ تموز وخدمة الجمهورية الخالدة، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٥٩، ص ص٥٧-٨٠.

(٥١) دیمانەیەك لەگەڵ يوسف حنا يوسف، بە مێژووی (١٩/٤/٢٠٠٥)، هەولێر. یووسف حنا یووسف (ئەبو حیکمەت) ساڵی (١٩٢١) لە شەقڵاوە لە دایکبووە، لە چلەکانی سەدەی بیستەم لە شاری کەرکووك ژیاوە. ساڵی (٢٠٠٧) کۆچی دوایی کرد.

(٥٢) دیمانەیەك لەگەڵ مار لويس ساكۆ (دکتۆر)، بە مێژووی (٢٤/٤/٢٠٠٥)، کەرکوك. مار لويس ساكۆ ساڵی (١٩٤٥) لە شاری کەرکوك لەدایکبووە، خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە، سەرۆکی ئەبرەشیەی کەرکووکە؛ دیمانەیەك لەگەڵ سەلیم بەترۆس (دکتۆر)، بە مێژووی (١٦/٢/٢٠٠٦)، هەولێر. سەلیم بەترۆس لە ساڵی (١٩٥٢) لە شاری هەولێر لەدایکبووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستی کۆمەڵناسیدا بەدەستهێناوە، شارەزاییەکی چاکی دەربارەی بارودۆخی کلدانەکانی کوردستانی باشوور هەیە، ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر.

(٥٣) بگەڕێوە بۆ تەوەری یەکەم لەم بەشەدا.

(٥٤) احمد سوسة، مدخل الى العرب واليهود في التاريخ، مطبعة الزمان، بغداد، ١٩٧١، ص٢١؛ يوسف رزق الله غنيمة، نزهة المشتاق في تاريخ العراق مع ملحق بتاريخ يهود العراق في القرن العشرين، دار الوراق، لندن، ١٩٩٧،ص٤٨-٤٩.

(55) Haim J. Cohen، "Kirkuk"، Encyclopaedia Judaica، Ed. Michael Berenbaum and Fred Skolnik، 2nd ed، Vol: 12، Detroit: Macmillan Reference USA، 2007، P.187.

(٥٦) علي ابراهيم عبده وخيرية قاسيمة، يهود البلاد العربية، منظمة التحرير الفلسطينية، بيروت، ١٩٧١، ص٤٥.

(57) T.C. Basbakanlik Devlet Arsivleri Genel Mudurlugu، Osmanli Arsivi Daire Baskanligi، Musul- Kerkuk ilgili Arsiv Belgleri (1525-1919)، Yayin Nu: (11)، Ankara، 1993، S.14.

(٥٨) طه الهاشمي، جغرافية العراق، بغداد، ١٩٣٣، ص ص٨٢-٨٥؛ بول اميل، تاريخ ارمينيا (عرض مبسط لتاريخ الشعوب الارمنية منذ فجر التاريخ حتى اليوم)، ترجمة: شكري علاوي، دار الحياة، بيروت، دون سنة الطبع، ص١١٨.

(٥٩) دیمانەیەك لەگەڵ ڤرێنش نزارێت چەتاڵیان، بە مێژووی (٣١/٥/٢٠٠٥)، کەرکوك. ڤرێنش نزارێت چەتاڵیان ساڵی (١٩٤٠) لە شاری کەرکوك لە دایکبووە، بە ڕەگەز ئەرمەنییە، خوێندنی هەر لە شاری کەرکووکدا بووە، خاوەنی تاقیگەی وێنەیی (الكواكب) بوو لە کەرکووك.

(٦٠) المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص٢٤٣.

(٦١) ستيفن همسلي لونكريك، العراق (١٩٠٠-١٩٥٠)، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٣٢، (هامش المترجم).

(٦٢) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص١١٧؛ المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص٢٤٣.

(٦٣) دیمانەیەك لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی، بە مێژووی (١٧/١/٢٠٠٥)، هەولێر. مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی ساڵی (١٩١٨) لە دەوروبەری هەولێر لەدایکبوە. بۆ خوێندن بە زۆر شوێندا گەڕاوە، ماوەیەکیش لە مەدرەسەکانی کەرکووکدا خوێندوویەتی. خاوەنی چەندان نووسین و کتێبە، ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی زانیاری بوو لە شاری هەولێر. لە (٤/١٠/٢٠١٠) کۆچی دوایی کرد؛نووری تاڵەبانی، شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی ئەم بنەماڵەیە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٧٤.

(٦٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص١١٨؛ المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص١٧٠؛ عصبة الأمم، المصدر السابق، ص٣٦؛محەمەد ئەمین زەکی، سەچاوەی پێشوو، ل٧٧.

(٦٥) سەرژمێرییە مەزەندەکارییەکەی ساڵی (١٩٢١) لەسەر ئاستی لیواکەیە نەك شار، بەڵام چونکە زۆرینەی زۆری مەسیحی و جوولەکان لەنێو شاردا نیشتەجێبوونە، بۆیە لە پای ڕوونکردنەوەدا بە چاکمان بینی ئاماژەی بۆ بکەین.

(٦٦) لەبەر کۆمەڵێك هۆ سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) بە شیاوتر زانرا بۆ لێکدانەوە و تێگەیشتنی قەبارەی پێکهاتەی ئایینی دانیشتووانی شاری کەرکوك، لەوانە: سەرژمێریی ناوبراو زانیارییە تۆمارکراوەکانی لەسەر ئاستی ئایینی بە شێوەیەکی ورد مامەڵەی لەگەڵ کراوە بە بەراورد بە هەموو سەرژمێرییەکانی پێش و دوای خۆی، لە لایەکی دیکە کۆمەڵە

دانیشتووانی جوو لە ساڵی (١٩٥٠) بە زۆر کۆچیان پێکرا بۆ ئیسرائیلو لە پێکهاتەی ئایینی دانیشتووانی کەرکوك سڕانەوە.

(٦٧) البلاذري، فتوح البلدان، الجزء الثاني، (تحقيق: د.صلاح الدين المنجد)، مطبعة دار النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٥٧، ص٤١٠؛ ابن الفقيه، مختصر كتاب البلدان، مطبعة بريل، ليدن، ١٨٨٥، ص١٣١.

(٦٨) دەربارەی کورتە مێژوویان، بڕوانە: گۆران فەتحی، شاری کەرکوك (بەشێك لە مێژووی مزگەوت، تەکیە، خانەقا، زاناو پیاوە ئایینییە ناودارەکانی)، ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، سلێمانی، ٢٠١٢.

(٦٩) عبدالمجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ص٨٦-٨٧.

**(70) J.C. Huerwitz‹ Military Politics in the Muslim Dynastic States (1400-1750)‹ Journal of the American Oriental Society‹ Vol; 88‹ 1968‹ PP. 96-104.**

(٧١) عصبة الأمم، المصدر السابق، ص٣٦.

(٧٢) عبد الكريم خليفة حسن المحمداوي، شخصيات الجماعات التي من اصل جنوبي القاطنة في حي (العرصة) الكركوكلي، في: موسوعة كركوك قلب العراق، ص١٥٩.

(٧٣) نادية الصالحي، مناطق التركمان الشيعة في كركوك، في: موسوعة كركوك قلب العراق، ص١٧٣؛ نوری تاڵەبانی، سیاسەتی بە عەرەبکردنی کەرکوك، وەرگێڕانی: مەریوان حوسێن چیمەنی، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٨.

(٧٤) نشأت احمد، رعاية المرجعية الدينية لمدينة كركوك، في: كركوك مدينة القوميات المتاخية، ص٢٨٠.

(٧٥) فرست مرعي، دراسات في تاريخ اليهودية والمسيحية في كوردستان، اربيل، ٢٠٠٨، ص٩١.

(٧٦) جمال رشيد، كركوك في العصور القديمه، في: بحوث المؤتمر العلمي حول كركوك، اربيل، ٢٠٠١، ص٧٧.

(٧٧) كابان عبدالكريم علي، الاصلاح الديني في المسيحية مقارنة بالاصلاح الفكري في الاسلام، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية الشريعة والدراسات الاسلامية بجامعة صلاح الدين/ اربيل، ٢٠٠٢، ص٢٧.

(٧٨) دیمانەیەك لەگەڵ مار لویس ساکۆ (دکتۆر)، بە مێژووی (٢٠٠٥/٤/٢٤)، کەرکوك. لەم چەند ساڵەی دوایی کڵێسایەك بۆ ئەو مەسیحییانەی سەر بە مەزهەبی پرۆتستانتین لە کەرکوك بنیاتنرا، هەرچەندەش بە ژمارە کەمن.

(٧٩) شاكر خصباك، العراق الشمالي، ص٢٢٢.

**(80) Musul- Kerkuk ilgili Arsiv Belgleri (1525-1919)‹ S.31.**

(٨١) عصبة الامم، المصدر السابق، ص٦١.

(٨٢) المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، الجدول التاسع، ص ص١٦٨-١٧٠.

(٨٣) دیمانەیەك لەگەڵ مار لویس ساکۆ (دکتۆر)، بە مێژووی (٢٤ی نیسانی ٢٠٠٥)، کەرکوك.

(٨٤) علي ابراهيم عبدة وخيرية قاسيمة، المصدر السابق، ص٤٥.

(٨٥) علي الوردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الجزء الاول، بغداد، ١٩٦٩، ص١٤٩.

(٨٦) منذر عبدالمجيد البدري، جغرافية الاقليات الدينية في العراق، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٧٥، ص٣٤.

(٨٧) جيمس ولستيد، رحلتي الى بغداد في عهد الوالي داود باشا، ترجمة: سليم طه التكريتي، مطبعة ثويني، بغداد، ١٩٨٤، ص٩٦.

(٨٨) اريك براور، يهود كردستان، ترجمة: شاخوان كركوكي وعبدالرزاق بوتاني، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠٢، ص٣٢٥؛فرست مرعي، المصدر السابق، ص٢١.

(٨٩) دەربارەی ئەمانە بڕوانە: غضبان الرومي، الصابئة المندائيون، "التراث الشعبي" (مجلة)، العدد (١٠)، بغداد، ١٩٧٣، ص ص٩-ومابعدها.

(٩٠) دەربارەی ئێزیدییەکان، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، اليزيديون، مطبعة الوفاق، صيدا، ١٩٦١؛ سامي سعيد الاحمد، اليزيدية (احوالهم ومعتقداتهم)، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧١.

(٩١) رەشاد میران، رەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی دووەم، سەنتەری برایەتی، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١٥٢.

(٩٢) لەم بارەوە بڕوانە: نوري ياسين هرزاني، الكاكائية (دراسة انثروبولوجية للحياة الاجتماعية)، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٥، ص٦٦؛ كريم نجم الشواني، الكاكائية، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الشريعة بجامعة بغداد، ١٩٨٩، ص٣٩.

(٩٣) محمد علي قرداغي، هوية كركوك الثقافية، ص١٦١.

(٩٤) بڕوانە: هاشم عاسی کاکەیی، تایفەی کاکەیی لە کەرکوك دا، "وەرز" (گۆڤار)، ژمارە (٢)، کەرکوك، بەهاری ٢٠١١، ل٤٨-٧٣.

(٩٥) عباس العزاوي، الكاكائية في التاريخ، شركة الطباعة والتجارة المحدودة، بغداد، ١٩٤٩، ص٤.

(٩٦) المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، الجدول التاسع، ص ص١٦٨-١٧٠.

## * گەڕەکەکانی شاری کەرکوک:

د. دڵشاد مەحموود

مێژووی دروستبوونی شاری کەرکوک و ئاوەدانی تیایدا، وەك دەزانرێت دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن. هەڵبەت لەو سەردەمە کۆنانەدا خەڵکی تەنها لەنێو شوورەکانی شاردا، نیشتەجێبوون و ژیانیان دەگوزەراند. چونکە لەو سەردەمانەدا شار، واتە (قەڵا)، قایمترین شوێنی بەرگریکردن و خۆپارێزی بووە لە هەڕەشە و هێرشی داگیرکاری.

بەڵام بە تێپەڕینی ڕۆژگارو لە ئاکامی کۆمەڵێك هۆی دیاریکراو، لەوانە: گەشەکردنی ژمارەی دانیشتووان، لە سەدەکانی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا شارەکە فراوانبووە. ئەو فراوانبوونەش شێوە کەوانەیی و بە ئاقاری ڕۆژهەڵات و باشووری قەڵادا بووە. لە ڕێگەی مانەوەی هەندێك لە شوێنەوارە مێژووییەکانی شارەکە، وەك: مزگەوتی ئیمام قاسم و تەکیەی تاڵەبانی[1]، روون دەبێتەوە کە پانتایی شاری کەرکوك لەو ڕۆژگارەدا لە چەند کیلۆمەترێکی چوارگۆشە تێپەڕی نەکردووە.

لەباربوونی کەش و هەوای شارو ناوچەکە، هەروا ڕێژەی باران بارین تیایدا، کاریگەری کارای لەسەر گەشەو فراوانبوونی شارەکە هەبوو لە گشت بوارەکاندا، بە تایبەت ئابووری و کۆمەڵایەتی و شارستانی. لە سەردەمەکانی دواتریشدا، بە هۆی هاتنە ئارای سەقامگیریی سیاسی و بەهێزبوونی ئەمن و ئاسایش و بڵاوبوونەوەی دام و دەزگاکانی حکومەت لە دەرەوەی سنوورەکانی شار، بە تایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، شاری کەرکوك گەشەی سەندو گوندو ئاوەدانییەکانی نزیك شار کەوتنە نێو بازنەی شارەوە[2]. ئەوەش ئەوپەڕی گەشەکردن و بەرفراوانبوونی شاری کەرکوك بوو بە درێژایی مێژووی ڕابردووی. شاری کەرکوك لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، لە رووی قەبارەو مێژووی ئاوەدانی تیایدا، لەلایەن زۆرێك لە گەشتیارو ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە باسکراوەو پەنجەی سەرنجی لەسەر دانراوە. جارجاریش بە یەکێك لە شارە گەورەو ئاوەدانەکانی وڵاتی میسۆپۆتامیا وەسفکراوە[3].

بەپێی چەند زانیارییەك، باری ئاوەدانی شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینییەوە. ئەم گەشەکردن و پەرەسەندنە لە کۆتاییەکانی سەدەی ئاماژە بۆ کراوو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، گەورەتر بوو[4]، کە لەو ساڵانە شاری کەرکوك لە سێ بەش پێکدەهات: (قەڵا، بەرقەڵا، قۆریە[*]). هەر سێ بەشەکەش بەسەر یەکەوە بریتیبوون لە (١٤) گەڕەك[5]. بەشی قەڵا، کە سێ گەڕەکی لەخۆ دەگرت: (حەمام، ئاغالق-ئاغاکان، مەیدان)، چینی خانەدان و ئەریستۆکراتەکانی شاریان تیادا نیشتەجێبوون. بەشی بەر قەڵاش، بە نۆرەی خۆی، هەشت گەڕەك بوو: (چای، چقوور، موسەڵلا، بولاق، ئاوچی، ئاخور حوسێن، ئیمام قاسم و پێریادی). دانیشتووانی ئەم بەشە، ئاوێتە بوون لە ڕەگەزی جیاواز: (کورد، تورکمان، جوو).

هەرچی بەشی قۆریە بوو، کە دەکەوتە ئەو بەری ڕووباری خاسەوە (ڕۆژئاوای شاری کەرکوك) و لە سێ گەڕەك پێکدەهات: (بەگلەر-بەگەکان، شاترلو، ساری کەهیە)، زۆرینەی دانیشتووانی تورکمان و برێکیش لە ڕەگەزە جیاجیاکانی دیکەی تێدا نیشتەجێبوون[6].

لە چوارچێوەیەکی گشتیدا، ڕەوتی پەرەسەندن و گەشەکردنی شارە کوردییەکانی کوردستانی باشوور، بە شاری کەرکووکیشەوە، لە ڕاستیدا سست و لەسەرخۆ بووە، ئەوەش لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆی تێکهەڵکێش، لەوانە: نەبوونی سەقامگیریی سیاسی و ئەمنی بووەتە هۆی قووتبوونەوەی لەمپەر لەبەردەم پەرەسەندنی لایەنی بازرگانی و دروستبوونی مەڵبەندی گەورەی بازرگانی[7]. هەروەها هەڵکەوتەی جوگرافی و شوێنی لە نەخشەی سیاسیی هۆیەکی دیکە بووە بۆ گەورە نەبوونی شارە کوردییەکان بە شێوەیەکی گشتی، کەرکوکیش کە شارێکی نزیك لە چەقی ململانێ سیاسی و سەربازییەکان پێکدێنێت، چ سەبارەت بە کێشمەکێشی عوسمانی-ئێرانی، یان سەبارەت بە شەڕوشۆڕی نێوخۆیی میرنشینە کوردییەکان بێت[8] بەدەر نییە لەم هۆیانە.

گەشەکردنی شاری کەرکوك و گەورەبوون و بووژانەوەی ئاوەدانی تیایدا، تا دوای کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکەدا (١٩١٨)، تا ڕادەیەك، سروشتییەو وەك هەر شارێکی دیکە، ئەو هۆیانەی بوونەتە مایەی گەورەبوون و گەشەکردنی قەبارەی دانیشتووان و بەرفراوانبوونی پانتایی زەوییەکانی شار، هەمان ئەو هۆیانەن کە شوێن پەنجەیان لەسەر گەشەکردنی شارەکانی دیکە داناوە[9].

ئەوەی لە ڕەوتی مێژوویی پەرەسەندن و گەشەکردن و گەورەبوونی شاری کەرکوکدا تێبینی دەکرێت، ئەوەیە کە گەشەکردنی شار بە چەند شێوازو ئاراستەیەکدا تێپەڕیوە. لە سەرەتادا شار بە شێوەی کەوانەیی گەشەی کردووەو دەوری قەڵای داوەو دواتریش گردبوونەوەیەکی زۆر لە نزیك بازارەکانی شاردا ڕوویداوە[10].

لە سەردەمێکی دواتردا، شاری کەرکوك لە ئاکامی چەند هۆیەکی جیاوازو نوێ ڕووەو گەورەبوون و بووژانەوەی ئاوەدانی چوو. بە تایبەت دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٢٧)دا یەکەم بیری نەوت لە (باباگورگور) لێدراو کەرکوك بەرەو پیری پیشەسازی چوو. ئیتر ئەو ڕووداوە خاڵی گەورەو کاریگەرە لە پرۆسەی پەرەسەندن و گەشەکردنی شاری کەرکوك.

ئاقارەکانی گەشەکردنی شارەکە هەر بە بنیاتنانی یەکەی نیشتەجێبوونی نوێ تەواو نەبوو، بەڵکو خودی گەڕەکە کۆنەکانیش ڕووەو گەشەکردن و گەورەبوون چوون و کەلەکەبوون و پاڵەپەستۆیەکی نەخوازراوی، بێ بەرنامە لەلایەن شارەوانییەوە، دەستپێیکرد[11]. ئەوەش بەڵگەیەکی دروستە بۆ سەلماندنی ئەوەی، کە لە بەشێکی زۆری ئەو سەردەمەدا شاری کەرکوك خەسڵەتی شارێکی بێ پلان (عشوائي)ی لەخۆ گرتووەو خاوەن کۆڵانی تەسك و تروسك و بە پێچ و پەناو خانووی بچووکی لەپاڵ یەکهەڵچنراوە. لە ڕاستیشدا شاری کەرکوك تا سەردەمێکی درەنگ نوێگەری

لەلایەنی بیناسازی و نەخشەسازیی گەڕەك و شوێنە گشتییەکانی تێدا بەرجەستە نەبوو.

لە دوای ساڵی (١٩٥٢)ەوە، دوای ئەوەی کارەکانی ئەنجومەنی ئاوەدانی عێراق (مجلس الاعمار العراقي) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوەو ژمارەیەك لە گەڕەکەکانی شارەکە گەشەکردنێکی بە پلانی بەخۆوە گرت[١٢]. بە شێوەیەکی ڕوونترو وردتر، دەتوانرێت قۆناغەکانی پەرەسەندن و گەشەو گەورەبوونی ئاوەدانیی شاری کەرکوك، لە ماوەی مێژوویی لێکۆڵینەوەکەدا، بۆ سەر دوو قۆناغی جیا، دابەش بکرێن:

قۆناغی یەکەم:

سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، واتە ساڵی (١٩٢١) دەگرێتەوە، تاوەکو ساڵی (١٩٥٢) بەردەوامیی هەیە. لەم ماوەیەدا، لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆ، لەوانە: تەواو بوونی دۆزی ویلایەتی موسڵ و یەکلاییبوونەوەی لە بەرژەوەندیی عێراق (١٩٢٥)، تەواوبوونی ڕاکێشانی هێڵی ئاسنیی بەغداد-کەرکوك (١٩٢٥)، کەوتنە کاری کۆمپانیای نەوتی عێراق (١٩٢٧)و گواستنەوەی ئۆفیسی کۆمپانیا لە شارۆچکەی خورماتووەوە بۆ نێو شارو دەرهێنانی نەوت و هەناردەکردنی بۆ دەرەوەی وڵات (١٩٣٤)، وێڕای کۆمەڵێك هۆی دیکەی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی، پەرەسەندنێکی بەرچاو بەسەر شاری کەرکوکدا هات و گەشەو گەورەبوونی بەخۆوە گرت[١٣]. بەڵام بە بەراورد بە قۆناغی دووەم، بە قۆناغێکی سست سەبارەت بە گەشەو گەورەبوونی شاری کەرکوك دەدرێتە قەڵەم.

قۆناغی دووەم:

چەند ساڵێك بەر لە کۆتایی هاتنی ڕۆژگاری پاشایەتی دەگرێتەوە، لە ساڵی (١٩٥٢)ەوە تاوەکو ساڵی (١٩٥٨). لە ساڵی (١٩٥٢)دا کاری ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوەی عێراق کەوتە بواری جێبەجێکردنەوەو ژمارەیەك یەکەی نیشتەجێبوون لە شارەکەدا دروستکران. لە ئاکامی پرۆتۆکۆلە نەوتییە نوێیەکانی حکومەت لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی عێراق، داهاتی نەوتی عێراق زۆر زیادی کردو حکومەت بڕیاریدا بەشێکی زۆری ئەو داهاتە (٧٠٪)، لە ئاوەدانکردنەوەی بوارە جۆراوجۆرەکانی وڵاتدا خەرج بکات[١٤].

ئەوەی پێویست بە وتن دەکات سەبارەت بە پلانی بنەرەتیی شاری کەرکوك لە ڕووی نیشتەجێبوونەوە، لە ڕۆژگاری پاشایەتی لە عێراقدا بە هەمان شێوەی ڕۆژگاری عوسمانی شارەکە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە: قەڵا، بەرقەڵا، قۆریە. بەڵام گەشەکردن و پەرەسەندنێکی یەکجار زۆر، بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژگاری عوسمانیدا لێهاتووەتە ئارا.

**أ. قەڵای کەرکوك:**

نیشتەجێبوون لە شاری کەرکوکدا لە قەڵاوە دەستیپێکردووە، کە دەکەوێتە بەری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری خاسە. ڕووپێوی قەڵا گەیشتووەتە (٢٢) هێکتار (نزیکەی (٢,٢) کیلۆمەتر دووجا) و (١٨) مەتریش لە ئاستی سەرزەمینیی دەوروبەری بەرز بووەتەوە[١٥]. مێژووی بنیاتنانی قەڵا زۆر کۆنە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری هەزارەی سێیەمی بەر لە زایین[١٦]، ناوبردنیشی لە تۆمارە مێخییەکاندا کەوتووەتە پێش ناوی (هەولێر)[١٧]. بۆیە کەرکوك بە یەکێك لە کۆنترین شارەکانی جیهان لەقەڵەمدراوە، کە بەردەوام تاوەکو ئێستا ژیانی تێدا بێت[١٨].

قەڵای کەرکوك، لە سێ گەڕەکی سەرەکی پێکهاتووە: (حەمام، ئاغالق-ئاغاکان، مەیدان)و خاوەنی چوار دەروازەی سەرەکییە: (حەلواچی، تۆپ قاپی، تاش قاپی، یەدی قزلەر)[١٩]. دوو دەروازەی یەکەمیان شیاو بوون بۆ هاتووچۆی گالیسکەو تێپەڕینی ئۆتۆمۆبێلی بارهەڵگری بچووك، بەڵام دوو دەروازەکەی دواییان تەنها بە کەڵکی هاتووچۆی وڵاخسواری و پیادە دەهات.

دەرگای تۆپ قاپی دەکەوتە ڕۆژئاوای قەڵاو دەرگای (حەلواچی)یش لە بەشی ڕۆژهەڵاتی قەڵا دەیڕوانیە سەر بازاڕی گەورەی شار. دەرگای (یەدی قزلەر) لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی قەڵادا بوو، بەڵام دەرگای (تاش قاپی) یان دەرگای گەورە لە بەشی باشووری ڕۆژئاوای قەڵا نزیك بە پردی بەردین بوو. تا دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانییش، دەرگای سەرەکی قەڵای کەرکوك لە ڕۆژدا کراوەو دوای بانگی شێوان داخراوەو ڕێگە بە ڕێبوارو کاروانەکان و خەڵکی نەدراوە بچنە ژوورەوە[٢٠]، تاوەکو لە کاری دوژمنکارانە پارێزراو بن.

گەڕەکەکانی قەڵا وەك هەر شارێکی دیکەی قۆناغی ئیسلامی، لە شەقامێکی بەرین و درێژو خاوەن لق و پۆپی زۆر، کە بە کۆڵانی تەسك و پێچاوپێچ هەندێك جاریش داخراو دەناسرێتەوە، پێکهاتوون[٢١]. سەبارەت بە شێوازی بیناو خانووەکانیشی لەسەر شێوازی کۆنی ڕۆژهەڵاتییە، واتە هەبوونی حەوشەیەك لە ناوەڕاستی خانووەکەو چوار دەوری بە ژوور گیراوە. زۆربەی ئەو هۆدەو ژوورانەشی کە دەڕواننە سەر کۆڵان و شەقامەکان یان بێ پەنجەرەن یان خاوەن پەنجەرەی بچووك بچووکن لەپێناو پاراستنی حورمەتی دانیشتووانی خانووەکە. باری ئاوەدانی و باڵەخانەکانی مامناوەندی و ڕوو لە خراپبوون بوو.

گەڕەکی (حەمام) لەبەر ئەوەی دوو گەرماوی گەورەی لەخۆ گرتبوو: (گەرماوی موسڵمانان و گەرماوی مەسیحییەکان)، بۆیە بەو ناوە ناونراوەو مێژووی بنیاتنانیشی نادیارە. ئەم گەڕەکە دەکەوتە بەشی باشووری قەڵاوە. گەڕەکی حەمامی مەسیحییەکان هەر لە کۆنەوە شوێنی نیشتەجێبوونی کلدانەکانی کەرکوك بوو، کڵێسا کۆنەکانیشیان هەر لەو بەشەی شاردا بوو، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنها بەشێکی زۆر کەم و وێرانەو شوێنەواری ماوەتەوە.

هەرچی گەڕەکی (ئاغالق-ئاغاکان) بوو، کاتی خۆی شوێنی نیشتەجێبوونی سەربازانی عوسمانی (یەنیچەری) بووەو بنکەکەشیان هەر لەو گەڕەکەدا بووە، بۆیە ئەو ناوەیان بەسەردا بڕیوە. ئەم گەڕەکە مەڵبەندو چەقی قەڵای گرتووە. هەر بۆیەش زۆرجار بە گەڕەکی قەڵا ناودەبردرێت.

گەڕەکی (مەیدان)یش، کە دەکەوێتە بەشی باکووری قەڵاوە، گوزارشت بووە لە بازاڕەکانی شار. مەیدانی کڕین و فرۆشتن و ئاڵوگۆڕی کاڵا بازرگانی و شوێنی پیشەکاران

بووە، پێشتریش مەیدانی جریتبازی(*) بووە. هەر لەبەر ئەو هۆیەش ئەو گەڕەکە بە (مەیدان) ناوزەد کراوە[٢٢].

هەر لەنێو گەڕەکە سەرەکییەکانی قەڵادا چەند گەڕەکێکی بچووك و لاوەکی هەبوون، کە لەلایەن دانیشتووانی قەڵاوە لە پای ناسینەوەدا داهێنرابوون و ناویان لێنرابوو، وەك گەڕەکی: (یەدی قزلەر، زیندان، تۆپ قاپی، تاش قاپی، حەڵواچی). ئەم گەڕەکە بچووك و کۆڵانە نێودێرانە بەشێك بوون سەر بە گەڕەکە سەرەکییەکانی قەڵا و بەشێکیان دەیانڕوانیە سەر بەشی خوارەوەی قەڵا، واتە ئاوەدانییەکانی بەرقەڵا[٢٣].

دانیشتووانی قەڵا تێکەڵبووە لە ڕەگەزە جیاجیاکانی: کورد، تورکمان، کلدوئاشوور، جوو، ئەرمەن و شوێنێکی بەرچاوی فرە چەشنیی ئایینی: ئیسلام، مەسیحی، جوولەکە بووە. غەیرە موسڵمان شانبەشانی موسڵمانان ژیاون، ئێستاش بەشێك لە شوێنەواری شوێنی پەرستن و نوێژو پاڕانەوەیان، کە لە یەکتر نزیك بووە، بوونی ماوە.

مەسیحی و جووەکان لەنێو قەڵادا چەند شوێنێکی پەرستنیشیان هەبووە، بەڵام بە تێپەڕینی ڕۆژگار هەندێك لەو شوێنانە مزگەوتیان لەسەر بنیاتنراوە. لە نموونەی ئەوانە: مزگەوتی گەورە (ئۆلو جامع) و مزگەوتی (دانیاڵ) پێغەمبەرو مزگەوتی (مریەمانە)، کاتی خۆی لەسەر داروپەردووی کڵێسای مەسیحییەکان و کەنیشتە (سیناگۆگ)ی جووەکان دروستکراون[٢٤]. کڵێسای دیاری مەسیحییەکان لە قەڵادا

بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری حکومەت دروستکرا بێت[٢٧].

لە شوێنەوارو مەزارگە دیارەکانی قەڵا: مەزارگەی دانیاڵ پێغەمبەرو مەزارگەی سێ هاوەڵەکەی (عزاریا، حنانیا و میشائیل)(واتە عوزێر، حونەین و میکائیل) و گۆك گومبەت(*)، کە مەزارگەی یەکێك لە شازادە سەلجووقییەکانە بە ناوی (بوغدای خاتوون)[٢٨].

لە بنەماڵە دیارەکانی قەڵای کەرکوك (زەنگەنە، یاقوبی، موفتی، ئاوچی، کەمالی، سیلاو) و لە ماڵە بەناوبانگەکانیش ماڵی (حاجی تەیفوور، جەلیل ئاغا، ڕەفعەت ئاغا، کەمال بەگ، حاجی یوسف دەباغ[٢٩]، مستەفا ئاغا و زۆرێکی دیکە) بوون.

ڕووپێوی نیشتەجێبوون لە گەڕەکەکانی قەڵادا، کە نزیکەی (٤٢٪)ی لە تێکڕای ڕووپێوی قەڵای داگیر کردووە و بە شەقام و کۆڵانی تەسك و تەنگ و پێچاوپێچەکانی دەناسرێتەوە، کە نزیکەی (١٢٪)ی لە ڕووپێوی قەڵای گرتووەتەوە[٣٠].

خانووەکانی ئەم بەشەی شار، لەبەر تەنگی شوێن و بە مەبەستی بەهێزبوونی لایەنی بەرگریکردن، لە پاڵ یەکدا هەڵچنراون. بەشەکانی دیکەی قەڵا، بریتییە لە تەلارو باڵەخانە و شوێنی عیبادەت و باخچە و گەرماو و گۆڕەپان.

لە سەرژمێریی فەرمیی ساڵی (١٩٤٧)دا گەڕەکەکانی قەڵا بە چوار گەڕەکی جیا تۆمار کراون. سەبارەتیش بە باری ئاوەدانی و چۆنیەتی شوێنی نیشتەجێبوون لە گەڕەکەکانی سەر قەڵا، سەرژمێریی ناوبراو زانیاریی وردی تۆمار کردووە. بەپێی ئەو سەرژمێرییە ژمارەی خانووەکانی قەڵا بریتیبووە

خشتەی ژمارە (١)

پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی قەڵا

بەپێی چەشنی خانووەکان و چڕی دانیشتووان لە ساڵی(١٩٤٧)[٣١].

| ز | ناوی گەڕەك | ژمارەی دانیشتووان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە یەك خێزان لە خانووێکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | جەمام موسلیم | ٢١٦٠ | ٢٠٤ | ١٠٩٩ | ٥٧ | ٢٤٠ | ١٠٢١ |
| ٢ | حەمام مەسیحی | ٧٣٤ | ٥٣ | ٢٨٧ | ٢٤ | ٩٥ | ٤٣٩ |
| ٣ | (ئاغالق) | ١٦٢٣ | ٨٨ | ٥١٦ | ١٣٣ | ٢٥٥ | ١١٠٧ |
| ٤ | مەیدان | ١٢٤٧ | ٦٤ | ٣٩٢ | ٤٦ | ٢٠٣ | ٨٢٩ |
| کۆی گشتی | | ٥٧٦٤(*) | ٤٠٩ | ٢٢٩٤ | ٢٦٠ | ٧٩٣ | ٣٣٩٦ |

بریتیبوو لە کڵێسای (ام الاحزان) [٢٥] دایکی خەمەکان، کە کەوتبووە بەشی باشووری قەڵاوە لە گەڕەکی حەمام مەسیحی. کۆنترین و بەناوبانگترین تەلارو باڵەخانەکانی قەڵا (یەدی قزلەر) واتە حەوت کچە، کە کەوتووەتە لای چەپی قەڵاوەو لە پێنج نهۆم پێکهاتووە[٢٦]. نهۆمی ژێرەوەی ئەو باڵەخانەیە لەبەر ئەوەی کاتی خۆی گرتووخانەی تێدا بوو، بۆیە ئەو سوچ و خیابانەی باڵەخانەکە دەڕوانێتە سەری، بە نێوی (زیندان)ەوە ناسراوە. ئەو باڵەخانەیە، بە بەڵگەی ئەوەی ژوورەکانی فراوانن، پێدەچێت کاتی خۆی

لە (٦٦٩) خانوو، ئەوەش پەرەسەندنێکی نوێیە سەبارەت بە ئاوەدانی قەڵا لە ڕووی چەندێتییەوە. بڕوانە خشتەی ژمارە

ئەوەی لە خشتەکەدا جێی تێبینییە ئەوەیە: ژمارەی ئەو خێزانانەی بە تەنها لە کۆشك و خانوودا ژیان دەگوزەرێنن زیاترن لەو خێزانانەی کە لەگەڵ خێزانێکی دیکە و دووان لە یەك خانوودا نیشتەجێن. بەم پێودانە دەبینین، لە (٦٦٩)ی کۆی گشتیی خانووەکانی قەڵا، (٤٠٩) خانوویان لەوانەن کە یەك خێزان بە شێوەیەکی سەربەخۆ تیایدا دەژین، کە ئەوانیش

تێکرای ژمارەی دانیشتووانیان گەیشتووەتە (٢٢٩٤) کەس، یان بەرانبەر بە (٥,٦) کەس بۆ هەر خانوویەك. ژمارەی دانیشتووانی ئەو خانووانەش کە زیاتر لە یەك خێزان تیایدا دەژین، وەك لە خشتەکەدا روون کراوەتەوە، بریتییە لە (٣٣٩٦) کەس لە کۆی گشتیی (٢٦٠) خانوو یان بەرانبەر بە (١٣) کەس بۆ هەر خانوویەك. بە گشتییش تێکرا چڕی دانیشتووان بۆ خانووەکانی قەلا خۆیداوە لە (٨,٦) کەس بۆ هەر خانوویەك.

لە خشتەی ژمارە (١)دا ئەوەش بە روونی دەردەکەوێت کە گەڕەکی (حەمام) پێشەنگی ئەو گەڕەکانەی گرتووە لە رووی بوونی خانووی یەك خێزانیو پاش ئەویش لە پلەی دووەمدا گەڕەکی (ئاغالق) دێت ئینجا گەڕەکی (مەیدان) بە پلەی سێیەم. هەرچییش سەبارەت بە کۆبوونەوەی رێژەی زۆرتری ئەو گەڕەکانە بێت کە لە خانوویەکدا زیاتر لە یەك خێزان ژیانی تێدا دەگوزەرێنن، گەڕەکی (ئاغالق) بە پلە یەك دێت، دوای ئەویش گەڕەکی حەمامو مەیدان بە پلەی دووەمو سێیەم دێن.

هەر لە سەرژمێرییەکانی ساڵی (١٩٤٧)دا ئەوەشمان بۆ روون دەبێتەوە، کە تاکە دەزگایەکی حکومی لەسەر قەلادا بوونی نەبووە، کەچی (٢١) دامودەزگای ئەهلی[٣٢] لە گەڕەکی (مەیدان) و (٣٨)ی لەو جۆرە لە گەڕەکی (حەمامی موسڵمانەکان)دا هەبووە، سەبارەت بە دەزگا ئایینییەکانیش[٣٣] لە گەڕەکەکانی قەلا بەمشێوەیە تۆمار کراون: گەڕەکی (حەمام مەسیحی) (٧)و (حەمامی موسڵمانەکان) (٢)، گەڕەکی (مەیدان) (٥). بەلام گەڕەکی (ئاغالق) هیچ دەزگاییەکی ئایینی تێدا تۆمار نەکراوە[٣٤]!

لە دووەم سەرژمێریی فەرمی ساڵی (١٩٥٧)دا، گۆڕانێکی چۆنیەتی بەسەر ژمارەی گەڕەکەکانی قەلادا هاتووەو ژمارەیان وەك رۆژگاری عوسمانی بووەتەوە بە سێ گەڕەك، ئەوەش لە ئەنجامی گۆڕانێکی کارگێری هاتووەتە ئارا، چونکە وەك دەردەکەوێت هەردوو گەڕەکیان بەیەك گەڕەك هەژمار کردوون. بڕوانە خشتەی ژمارە (٢).

**خشتەی ژمارە (٢)**
**ژمارەی دانیشتووانی گەڕەکەکانی قەلا لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا[٣٥].**

| ژ | گەڕەك | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٥٧ | جیاوازیی زۆرو کەمی (+ -) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | حەمام | ٢٨٩٤ | ٢٥٧٠ | - ٣٢٤ |
| ٢ | ئاغالق | ١٦٢٣ | ١٨٦٣ | + ٢٤٠ |
| ٣ | مەیدان | ١٢٤٧ | ١٣٩٣ | + ١٤٦ |
| کۆی گشتی | | ٥٧٦٤ | ٥٨٢٦ | + ٦٢ |

لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە ژمارەی دانیشتووانو چڕی دانیشتووانی گەڕەکەکان،لە ماوەی نێوان هەردوو سەرژمێریی فەرمی (١٩٤٧)و (١٩٥٧)، نەهاتووەتە ئاراوە، تەنیا ئەوەندە نەبێت کە ناوی گەڕەکی (حەمام مەسیحی) هەڵگیراوەو لەگەڵ (حەمامی موسڵمانەکان) یەکخراوە، لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە پەرەسەندنێکی جۆری لە گەڕەکەکە هەست پێدەکرێت سەبارەت بە ژمارەو چڕی دانیشتووانەکەی. چونکە ژمارەی گەڕەکەکە، بە بەراورد لەگەڵ زانیارییەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، بە پێچەوانەی لۆژیكو سروشتی گەشەکردنی دانیشتووان، لە کورتی داوە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٣). پێدەچێت هۆی ئەمەش بۆ نیشتەجێبوونی بەشێك لە مەسیحییەکانی قەلا لە گەڕەکی تازە دروستکراوی (کەرکوکی نوێ) (عەرەفە) بگەڕێتەوە، کە لەلایەن کۆمپانیای نەوت، لە سەرەتای ساڵانی پەنجا، بنیاتنانراو مەسیحییەکان پشکی شێریان لە نیشتەجێبوون لەو گەڕەکەدا بەرکەوتبوو، بە تایبەتی دەسەڵاتدارانی کۆمپانیای نەوت گرنگییەکی تایبەتییان بە مەسیحییەکان دابوو. هەروا هۆیەکی دی بۆ باشبوونی باری ژیانیان دەگەڕێتەوە، کە ئەو خانووە کۆنانەی پێشوویان گونجاو نەبووە لەگەڵ پێگەی ئابووریو کۆمەڵایەتیی نوێیان[٣٦]، بۆیە بەشێك لە دانیشتووانی گەڕەکی (حەمام مەسیحی) لە قەلا هاتوونەتە خوارێو لە قۆریەدا، بە تایبەت لە گەڕەکی ئەڵماس نیشتەجێبوونە، کە ئەو رۆژگارە خەڵکی وەك دیاردەیەکی مۆدێرن روویان لە قۆریە کردووە.

**ب. بەر قەلا:**

ئەم بەشەی شار ئەگەرچی بە وردی نازاندرێت لە چ رۆژگارێکدا بنیاتنراوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە چەندین سەرچاوەی مێژوویيو لە میانەی نووسینی گەڕۆکە بیانییەکانەوە ئاماژەی بۆ کراوە. بەپێی هەندێك سەرچاوە، مێژووی دروستبوونی ئاوەدانی لە خوارەوەی قەلا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم[٣٧]، کەچی دواتر هەندێك لە گەڕیدەکان، کە لە سەدەی حەڤدەهەمو هەژدەهەمدا سەردانی شارەکەیان کردووە، پەنجەیان بۆ بوونی ئاوەدانیی لە خوارەوەی قەلادا درێژ نەکردووە[٣٨]. پێدەچێت ئەوەش لەبەر ئەوە بوو بێت کە ئەو شارە زۆرجار دووچاری قەیرانی سیاسیو ئابووری هاتووە[٣٩]و کەوتووەتە بەر شاڵاوی لەشکری ئێرانی (سەفەوی، ئەفشاری)[٤٠]، لەو ئەنجامەشدا ئاوەدانی لەو بەشەی شاردا نەما بێت، یان زۆر کزو کەم بایەخ بوو بێتو جێی سەرنجی گەڕۆکەکان نەبوو بێت.

ئەوەی سەبارەت بە شاری کەرکوك تێبینی گەورە هەڵدەگرێت ئاماژەکانی هەر یەك لە گەشتیاران (کارستن نیبور)(*) (Carsten Niebuhr)و (جەیمس بەکینگهام) ە (J. Buckingham). نیبور کە ساڵی (١٧٦٦) سەردانی کەرکوکی کردووە بەم شێوەیە دەربارەی دواوە: "کەرکوك دەکەوێتە دەشتاییەکی جوانی پڕ لە پیتو بەرەکەت، بەلام کەم ئاوەدان.. ئەمەی قەلای پێ دەڵێن ئابوودترین شوێن بوو کە تا ئێستا بینیومە.."[٤١].

هەرچی بەکینگهامە کە سەردانەکەی بۆ کەرکوك پەنجا ساڵ لە دوای گەشتی نیبورە (١٨١٦)، بەم شێوەیە دەربارەی ئاوەدانیی کەرکوك دواوە: "شاری کەرکوك لە سێ بەشی جیا پێکدێت، هەر بەشێکیان رووپێوی فراوانی هەیە، بەشی سەرەکییان لەسەر تەپۆڵکایی هەڵکەوتووە.. بەشی دووەمی شار.. رووپێوی فراوانترو ژمارەی دانیشتووانی زۆرترە لە بەشەکانی دیکە.. هەرچی بەشی سێیەمە دەکەوێتە دووری نیو میل.."[٤٢].

لە وردبوونەوەی ئەو دوو دەقەدا، ئەوە روون دەبێتەوە کە شاری کەرکوك لە ماوەی ئەو پەنجا ساڵەی نێوان گەشتی نیبورو بەکینگهامدا، گەشەو گەورەبوونی زۆری بەخۆیەوە بینییوە، هەروەها لەو ماوە کورتەدا لە شارێکی وێران‌و قەتیسبووی قەڵا کۆنەکە وەردەچەرخێت بۆ شارێکی فراوان‌و (بە گەورەترین شاری دەشتاییەکانی رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە بمێنێتەوە)[٤٣].

دواتریش شاری کەرکوك، لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیشدا، هەر شارێکی گرنگ‌و قەشەنگ بووەو مایەی سەرنج و تێبینی میوان‌و ئەو کەسانە بووە کە روویان تێکردووە[٤٤].

ئەم بەشەی شار لەبەر گرنگیی پێگە ئابوورییەکەی‌و لەخۆگرتنی بازار، لە سەدەی نۆزدەهەم‌و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، فراوانترین‌و چڕترین شوێنی نیشتەجێبوونی دانیشتووان بووە. هەڵکەوتنی گەڕەکەکان‌و شێوازی دروستکردنی خانووەکانی بەشی بەر قەڵا، جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ چەشنی بنیاتنانی خانووەکانی قەڵادا نییە. هەر بەو شێوازە کۆنەی دروستکردنی خانوو، بەردی کلسی‌و قوڕو هەندێکیشیان گەچیان تێدا بەکارهێنراوە. بە هەمان دەستووریش، لە پای بەهێزبوونی لایەنی بەرگری، خانووەکان لەپاڵ یەکدا هەڵچنراون‌و خاوەنی کۆڵانی پێچاوپێچ‌و تەنگەبەرن. بە گوزارشتێکی دیکە خانووەکانی بەشی بەر قەڵا لەسەر چەشنی وێکچوو بە شێوازی بنیاتنانی عەبباسی دروستکراون، کە لە شێوەی قەڵایەکی پارێزراو دێنە بەرچاو، دەرگاکانی لە دار گوێز دروستکراون‌و بە بزماری گەورە گەورە پتەو کراون، پاش داخستنییان بە چەند مرۆی بەهێز ناکرێنەوە. زۆربەشیان ژوورەکانیان تاریك‌و خاوەن پەنجەرەی زۆر بچووکی شێوە بازنەیین تاوەکو لە رووداوی دزی بە دوور بن[٤٥]. بەشی بەر قەڵا، لەم گەڕەکە سەرەکییانە پێکدەهات:

*** گەڕەکی ئیمام قاسم:**

کۆنترین گەڕەکی بەشی خوارەوەی قەڵایە، مێژووی ئاوەدانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم. لە دەفتەری تەحریراتی عوسمانی (١٥٤٨)، کە لە رۆژگاری (سوڵتان سولەیمانی قانوونی) (١٥٢٠-١٥٦٦)دا نووسراوە، زانیاریی ورد دەربارەی تۆمارکراوە[٤٦]. ناوی گەڕەکەکە لە ناوی پیاوێکی ئایینی وەرگیراوە، کە مەزارگەکەی لە هەمان گەڕەك دایەو بەپێی هەندێ سەرچاوە دەگەڕێتەوە سەر ئیمام موسای کازم[٤٧]! گەڕەکی ئیمام قاسم گەڕەکێکی گەورەیەو گەلێك گەڕەکی بچووك‌و کۆڵانی بەناووبانگ لەخۆ دەگرێت‌و دەکەوێتە لای باکووری قەڵاو بە تەنیشت بەری رۆژهەڵاتی چەمی خاسە هەڵکەوتووە. لە گەڕەکە بچووکەکانی: (یادگار، عاشوور، زێویە، بەرتەکیە، کیلانەکە، ئاخور حوسێن)[٤٨] و (خاسە، چوارباغ). لە کۆڵانە بەناوبانگەکانی: (سەیید سەروەر، نائیب، دڵی باش، زێویەی خواروو، زێویەی سەروو، چوارباغ..)[٤٩].

ئەم گەڕەکە گەڕەکێکی کوردنشینەو زۆر شاعیرو کەڵەپیاوی تیادا هەڵکەوتووە. ئیمام قاسم خاوەنی شەش تەکیە: (تاڵەبانی‌و کەسنەزانی‌و بەرزنجی‌و شێخ نوورەددین‌و شێخ عیزەددین‌و شێخ عەبدولرەحمان)و چەند مزگەوتێکی بەناوبانگە، وەك: (مەلا عومەر گومبەتی، مەلا ئەحمەد گردە، دڵی باش). تەکیەی تاڵەبانی، کە مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٧٠٦)، بە تایبەت، رۆڵێکی کاریگەری گێراوە لە ئاوەدانبوونەوەی گەڕەکەکە[٥٠] و شارەکەو هۆی کێشکردنی ئەوانە بووە کە لە دەرەوەی شار بە مەبەستی نیشتەجێبوون هاتوونە.

*** گەڕەکی ئاخور حوسێن:**

دەکەوێتە خوارووی گەڕەکی ئیمام قاسمەوە. لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری کەرکوکە، پێشتر بەشێك بوو سەر بە گەڕەکی ئیمام قاسم، بەڵام لە ئاکامی گەشەو گەورەبوونیدا، لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا وەکو گەڕەکێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵ کرا. سەبارەت بە ناوەکەی بیروڕای جۆراوجۆر هەیە، هەندێك پێیانوایە بنەڕەتی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی (خان‌و ئاخور) لەو شوێنەداو لادێنشینەکانی (ناوچەی شوان‌و دەوروبەری) کە هاتوونەتە شار لەو خانەدا ماونەتەوە کە (ئاخور حوسێن)ی لێبووە، ئیدی بە تێپەڕینی کات ناوی ئاخور حوسێن بەسەر ئەو گەڕەکدا براوە. هەندێکی دیکە وای بۆ دەچن کە ناوەکەی (ئەخی حوسێن) ە، بنەڕەتەکەشی رێکخراوی (ئەخیان)[*]ی عوسمانییە[٥١]. بەڵام هیچ بەڵگەیەکمان نییە کە رێکخراوێکی لەم جۆرە لەم ناوچەیەدا بوونی هەبێت. لەبەر ئەوەی ئەم ناوەی بە زمانی عەرەبی بوو، دەوڵەتی عێراق‌و کاربەدەستانی بەم ناوە کاریان دەکردو لە مامەڵەو پەڕاوە فەرمییەکانیاندا جەختیان لەسەر دەکردەوە.

*** گەڕەکی پیریادی:**

ئەم گەڕەکە لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری کەرکوکەو دەکەوێتە بەری رۆژهەڵاتی قەڵاوە بە تەنیشت گەڕەکی بولاق لە باکوورو گەڕەکی موسەڵلاو گۆڕستانی ئەبو علووك لە باشوور. بنەڕەتی ناوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئەو گوندەی کە چەند خێزانێکی دانیشتووی گەڕەکەکە لێوەی هاتبوون[٥٢].

پیریادی لە دوو بەش پێکدەهات: (پیریادی موسلیم)و (پیریادی موسەوی، واتا جوو). بەشی (پیریادی موسەوی) نزیك بازاری گەورەی شار بوو، دەکەوتە باکووری گەڕەکەکە تا سەر رێگای کەرکوك-سلێمانی سنووری هەبوو. بەڵام لە دوای ساڵی (١٩٥٠)، بەهۆی کۆچکردنی جووەکان بۆ

ئیسرائیل[٥٣]، بەشی (پیریادی موسەوی) ئەماو لەگەڵ بەشی (پیریادی موسلیم) یەکی گرت. بۆیە وردە وردە شوێنەواری ئەو بەشە رووەو سڕینەوە چوو. شێوازی بنیاتنانی خانووەکانی بەشی (پیریادی موسەوی)، کە ئێستاش بەشێکیان ماون، جیاوازییان هەبوو لەگەڵ چەشنی خانووەکانی دیکەی کەرکوك، بەوە دەناسرێنەوە کە بنمیچی خانووەکانیان بە بەراورد لەگەڵ خانووی موسڵمانان بەرزترەو نەخشی تایبەتی تێدا بەکارهێنراوە.

*** گەڕەکی چقوور:**

گەڕەکێکی بچووکی شاری کەرکوك بوو، کە سنووری لەگەڵ گەڕەکەکانی پیریادیو ئاوچیو بولاق یەکی دەگرتەوە. دەکەوتە شوێنێکی نزمەوە لە بەرانبەر قەلا. ناوەکەشی، وەك (جەمال بابان) لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، بنەڕەتێکی تورکی هەیەو لەو زمانەدا بە مانای (قووڵ) دێت. بەلام هەشە وای بۆ دەچێت، کە وشەکە کوردییەو لەبەر ئەوەی ناوچەکە نزمو ئاوێکی زۆری پەنگخواردووی لێبووە (چەم قوور)یان پێوتووە، بەلام دواتر لەسەر زاری خەڵکی کراوە بە چقوور[٥٤]. گەڕەکی چقوور چەند کۆڵانێکی بەناووبانگی تێدا بوو، کە زۆرتر بە جۆرە شوێنو پیشەیەکەوە ناوزەد کرابوون: (تەکیە، پالانچیلەر (کورتاندروو)، زەنگینلەر، ئەکمکچیلەر (نانەوا)، قەسابلەر، عەرەبلەر)[٥٥].

*** گەڕەکی ئاوچی:**

ئەم گەڕەکە راستەوخۆ دەکەوێتە بەشی باشووری قەلاو لە رۆژهەڵاتی گەڕەکی پیریادی درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە نزیك پردی بەردینی کۆن. لە باشووریش لەگەڵ گەڕەکی موسەلا هاوسنوورە. بنەچەی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی ئاوچییەکان، کە لەم گەڕەکەدا نیشتەجێبوونە[٥٦].

*** گەڕەکی بولاق:**

لە رووی قەبارەوە گەڕەکێکی مامناوەندییە، دەکەوێتە ئەوپەڕی رۆژهەڵاتی قەلا، گەڕەکێکی پەرگەی شارەو سنووری لەسەر رێگای کەرکوك-سلێمانی دەستپێدەکاتو هاوسنوورە لەگەڵ گەڕەکی پیریادی لە رۆژئاواوە. درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە گەڕەکی شۆریجە لە بەشی باشووری. بنەچەی ناوەکەشی تورکییەو بە مانای سەروچاوەی ئاو دێت لە زمانی تورکییدا، کە ئەم گەڕەکە خاوەنی چەند سەروچاوەیەکی ئاو بووە[٥٧]. بەپێی لێکدانەوەی (ڤلادیمێر مینۆرسکی) (V. Minorsky) مانای بولاق لە تورکیی کۆندا واتای (بەهار) دەگەیەنێت. هەمان ناو لە وڵاتی میسریشدا هەبووە، کە کاتی خۆی لەگەڵ هاتنی فەرەنسییەکانەوە داکەوتووە، لە زمانی فەرەنسی (Beaux Lac) واتای گۆلاوی جوان دەبەخشێت، لە میسر چاپخانەیەکیش بە ناوی بولاق هەبوو[٥٨].

*** گەڕەکی موسەللا:**

گەڕەکێکی گەورەیەو دەکەوێتە باشووری قەلاوە، هاوسنوورە لەگەڵ گەڕەکی چایو پیریادیو گۆرستانی ئەبو علووگ. سەبارەت بە بنەڕەتی ناوی ئەم گەڕەکە بۆچوونی جیاواز هەیە، هەندێك پێیانوایە ناوەکەی لە (موسا لال)ەوە هاتووە. بەلام (جەمال بابان) بۆچوونێکی جیاوازی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بنەچەی ناوەکە عەرەبییەو بە مانای شوێنی نوێژکردن دێت، بەڵگەشی بۆ قسەکەی ئەوەیە کە دانیشتووانی قەلا فەریزەی نوێژیان، بە تایبەت نوێژی جەژن، لە دەرەوەی شارداو لەو شوێنەدا کە گەڕەکەکەی لە دواتردا لەسەر ئاوەدانبووە بەجێگەیاندووە، بۆیە ئەو ناوەی بەسەردا براوە[٥٩]. لە کۆلانە بەناوبانگەکانی گەڕەکی موسەللا: (بویوك مەحلە، دار سوقاق، چمچلی بیل، گدیکلەر، ئیمام ئەحمەد، سمانچیلەر، باشی کسیك، یەنکی داملەر، حوسێن عەونی، قەسابخانە، عەزاو باغچەسی)[٦٠].

*** گەڕەکی چای:**

(چای محەلەسی) گەڕەکێکی دیکەی شاری کەرکوکە، پێشتر بەشێك بوو سەر بە گەڕەکی موسەللاو پێی دەوترا گەڕەکی (چای موسەللا). چای لە زمانی تورکیدا واتە: دۆڵ، رەنگە بوونی دۆڵو نشێوێك لەو گەڕەکەدا هەبوو بێت بۆیە ئەو ناوەی بەسەردا براوە[٦١]. یان پێدەچێت ناوەکەی لە چەمی خاسەوە وەرگرتبێت، لەبەر ئەوەی گەڕەکەکە کەوتووەتە سەر خاسە، کە ئەو کات بە خاسە دەوترا (خاصە چای).

*** گەڕەکی شۆریجە:**

تازەترین گەڕەکەکانی بەشی بەر قەلا بوو، ئەم گەڕەکە پێشتر ئاوایییەك بوو لە دەرەوەی شاردا، بەلام لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا لەلایەن خەڵکە گوندنشینەکانی نزیك شاری کەرکوك ئاوەدانی زیاتری تێکەوت، ئەو خەڵکە هەژارەی قووتی ژیان وای لێکردبوون رووەو شار کۆچ بکەنو لەو گەڕەکە بگیرسێنەوە، کە سیمای گەڕەکی پێوە دیار نەبوو[٦٢]. بنەچەی ناوەکەی نا روونە، وەك (جەمال بابان) ئاماژەی پێدەدات گوایە لە پیشەی (شیرج)(*)ەوە هاتبێت کە لەلایەن جووەکانەوە ئەنجام دەدرا. یان لە ناوی ئەو گوندانەوە هاتبێت کە خەڵکانی گەڕەکەکە لێوەی هاتوون[٦٣].

ئاوەدانی لە بەشی بەرقەلا، وەك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا تۆمارکراوە، گەشەکردنی دیاری بەخۆوە بینیوە بە بەراورد لەگەڵ رۆژگاری پێشتر، چونکە گەڕەکی نوێی لێ هاتووەتە ئارا (شۆریجە)و گەڕەکە کۆنەکانیش رێژەیەکی گەورەی یەکەی نیشتەجێبوونیان گر تووەتەخۆ. بە گوێرەی سەرژمێریی ناوبراو ژمارەی گەڕەکەکانی بەرقەلا (١٠) گەڕەکە، کە گەڕەکی پیریادی وەك گەڕەکی حەمام لە بەشی قەلا کراوە بە دوو بەش: (پیریادی موسلیم، پیریادی موسەوی).

بە وردبوونەوە لە داتاکانی سەرژمێرییەکەی ساڵی (١٩٤٧)دا ئەوە روون دەبێتەوە، کە کاربەدەستانی ئەو رۆژگارەی

عێراق مامەڵەیەکی ئایینییان لەگەڵ گەڕەکەکاندا کردووە! گردبوونەوەو پێکهاتە ئایینییەکانی گەڕەکەکان، وەك بنەماو بنەرەتێك وەرگیراون بۆ کۆکردنەوەو تۆمارکردنی زانیارییەکانی سەرژمێرییەکە، واتا سەرژمێرییەکە دانیشتووانی بەپێی ئایین پۆلێنکردووە. هەر لەبەر ئەوەش ناوی گەڕەکەکانی حەمامو پیریادی بۆ پێکهاتە ئایینییەکانیان گەڕاندووەتەوەو لەتەلەتکراون[٦٤].

وەك لە خشتەی ژمارە (٣)شدا خراوەتەروو، گەڕەکی پیریادی، ئەگەر لێکجودا نەکرابانەوە، زۆرترین ژمارەی دانیشتووانی لەخۆ دەگرت، بەڵام لەبەر ئەوەی بە دوو گەڕەکی جیای نیشتەجێبوون دراونەتە قەڵەم، بۆیە پلەی سێیەمی، لە دوای هەر یەك لە گەڕەکەکانی موسەڵلاو ئیمام قاسم، لەو رووەوە باوی ئەو رۆژگارە وای خواستووە خێزانەکان بە شێوەی سەربەخۆ لە خانووەکانیاندا بژین. بۆیە لە کۆی گشتیی (٢٩٥٣) خانووی بەشی بەرقەڵا، (١٩٠٣) خانوو لەو بابەتەن کە یەك خێزان بە شێوەیەکی سەربەخۆ تیایدا دەژین و کۆی گشتیی دانیشتووانی بریتییە لە (١١٢٧٦) کەس یان هاوتا بە (٥,٩) کەس بۆ هەر خانوویەك. لە بەرانبەردا ژمارەی دانیشتووانی ئەو خانووانەی کە زیاتر لە یەك خێزان تیایدا دەژین، وەك لە خشتەکەدا هاتووە، بریتییە لە (١٦١٢٤) کەس لە کۆی گشتیی (١٠٥٠) خانوو یان بەرانبەر بە (١٥,٣) کەس بۆ هەر خانوویەك.

زۆری ژمارەی ئەو خانووانەی زیاتر لە خێزانێك تیایدا دەژین، بۆ کۆمەڵە هۆیەك دەگەڕێتەوە، وای بۆ دەچین

**خشتەی ژمارە (٣)**

**پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی بەرقەڵا**

**بەپێی چەشنی خانووەکان و چڕی دانیشتووان لە ساڵی (١٩٤٧)دا[٦٥].**

| ژ | ناوی گەڕەك | ژ. دانیشتوان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە یەك خێزان لە خانوویەکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | موسەڵلا | ٤٦٧٤ | ٣٢٣ | ١٩١٥ | ١٢٩ | ٥٤٩ | ٢٦٨٨ |
| ٢ | ئیمام قاسم | ٤٦٧٢ | ٢٢٧ | ١١٨٢ | ٢٣١ | ٨٥٧ | ٣٣٩١ |
| ٣ | پیریادی موسلیم | ٣٣٦٥ | ٣٢٢ | ١٩٢٣ | ١١٠ | ٣٠٧ | ١٤٣٥ |
| ٤ | پیریادی موسەوی | ١٦٤٦ | ٧٧ | ٥٧٣ | ٥٠ | ١٨٧ | ١٠٠٨ |
| ٥ | چقوور | ٣٢٥٢ | ٢٤٦ | ١٥٨٧ | ٩٥ | ٣٢٣ | ١٦٥١ |
| ٦ | بولاق | ٣٠٣٦ | ٢١٢ | ١٢٤٦ | ٦٦ | ٣٦١ | ١٦٦٦ |
| ٧ | شۆریجە | ٢٣٦٨ | ١٣٦ | ٧٤٧ | ٢٠٦ | ٣٦٧ | ١٦١٥ |
| ٨ | ئاخور حوسێن | ٢٠٤٥ | ١١٢ | ٧١٧ | ٦١ | ٢٢٧ | ١٣٠٣ |
| ٩ | چای | ١٧٥٤ | ١١٦ | ٦٩٣ | ٦٤ | ١٥٩ | ٧٦٥ |
| ١٠ | ئاوچی | ١٣٠٣ | ١٣٢ | ٦٩٣ | ٣٨ | ١٣٦ | ٦٠٢ |
| | کۆی گشتی | ٢٨١١٥(*) | ١٩٠٣ | ١١٢٧٦ | ١٠٥٠ | ٣٤٧٣ | ١٦١٢٤ |

بەرکەوتووە. بەپێی ئەو زانیارییانە بێت، کە لە خشتەی ژمارە (٣)دا هاتوون، ژمارەی خانووەکانی (١٠) گەڕەکەکەی بەرقەڵا بریتییە لە (٢٩٥٣) خانوو، تێکرای دانیشتووانیشی گەیشتووەتە (٢٨١١٥) کەس.

لە خشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت، ئەو خانووانەی یەك خێزانی تێدا دەژین ژمارەیان بە رادەی دوو بەرانبەر زۆرترە لەو خانووانەی کە زیاتر لە خێزانێك تیایدا دەژین. ئەوەش پێدەچێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەم بەشەی شار توانای ئاسان فراوانبوون و گەورەبوونی هەیە، چونکە کەوتووەتە پێدەشت و باری تۆپۆگرافیای خاکەکەی یارمەتیدەرە بۆ فراوانبوون بە ئاقاری باکوورو رۆژهەڵاتی قەڵادا. هەروەها پێدەچێت بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە عورف و عادەتی کۆمەڵایەتی کە دەستکورتی و بێ توانایی خێزانەکان بۆ دابینکردنی ژیانێکی سەربەخۆ هۆیەکی هەرە گەورە بوو بێت. پاشان باوی دیاردەی جیانەبوونەوەی کوڕان لە باوانیان دوای هاوسەرگیری هۆیەکی دیکەی ئەم باسەیە. چونکە ئەو رۆژگارە خەڵکی زۆر بە سانایی بێ کەوتنەوەی کێشە توانیویانە پێکەوە لەگەڵ یەکدی هەڵکەن. بە شێوەیەکی گشتی تێکرا چڕی دانیشتوان بۆ خانووی گەڕەکەکانی بەرقەڵا خۆیداوە لە (٩,٥) کەس بۆ هەر خانوویەك، کە ئەمەش رێژەیەکی بەرزە.

سەبارەت بە گرنگترین گەڕەکەکانی بەرقەڵا خشتەکە، لە رووی نیشتەجێبوونەوە، ئەوە دەداتە دەست کە گەڕەکی موسەڵلا پلەی یەکی لەو رووەوە بۆ خۆی پچڕیوە، پێچەوانەی رۆژگاری پێشوو کە گەڕەکی ئیمام قاسم لە گەڕەکە هەرە

گەورەکان بوو لە تەواوی شاری کەرکوکدا. پاش ئەویش لە پلە دوو گەڕەکی ئیمام قاسم ئینجا گەڕەکی پیریادی و چقوور لە پلەی سێیەم و چوارەم دێن.

بە گوێرەی خشتەی ژمارە (٣)، گەڕەکی موسەڵلا گەورەترین ڕێژەی خانووی یەك خێزانییە، هەروا خاوەن زۆرترین ژمارەی دانیشتووانیشە، کە ژمارەی خانووە یەك خێزانییەکانی خۆیداوە لە (٣٢٣) خانوو. پاش ئەویش گەڕەکی پیریادی موسلیم (٣٢٢) خانوو، ئینجا گەڕەکی ئیمام قاسم (٢٢٧) دێت. بەڵام ئەو گەڕەکانەی ڕێژەی زۆرتری ئەو خانووانەی زیاتر لە یەك خێزانی تێدا لەخۆ دەگرن، بە پلە یەك گەڕەکی ئیمام قاسم دێت کە (٢٣١) خانوو، دوای ئەویش گەڕەکی شۆڕیجە (٢٠٦) خانوو، ئینجا گەڕەکی موسەڵلا دێت، کە (١٢٩) خانوو بووە.

بە گوێرەی زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، دەردەکەوێت کە زۆرترین دامودەزگاکانی حکومی لە بەشی بەرقەڵا لەم دوو گەڕەکدا کۆبووەتەوە: ئیمام قاسم (٥٣) دەزگا، پیریادی موسەوی (٥٢) دەزگا. لە پلەی دووەمیشدا گەڕەکی موسەڵلا (٥) دەزگا و گەڕەکی بولاق یەك دەزگای حکومی تێدا بووە. هەرچی دەزگا ئەهلییەکانی ئەم بەشەی شارە ئەوا زۆربەیان لە گەڕەکی چای کۆبوونەتەوە کە ژمارەیان (٢٩٦) دەزگایە! لە پلەی دووەمیشدا گەڕەکی بولاق بە (٥٣) دەزگا و گەڕەکی موسەڵلا لە پلەی سێیەم بە (٣٩) دەزگا، گەڕەکی چقوور پلەی چوارەمی داگیرکردووە بە (١٠) دەزگای لەو شێوەیە. دەزگا ئایینییەکان کە برەوێکی گەورەیان لەم بەشەی شاردا هەبوو پشکی شێر بەر گەڕەکی بولاق کەوتووە بە (٥٠) دەزگای ئایینی. هەرچی گەڕەکەکانی ئیمام قاسم (٢٩) دەزگا، موسەڵلا (٢٧) دەزگا، ئاخوڕ حوسێن (٢٥) دەزگا یەك لە دوای یەك دێن لە ڕووی هەبوونی زۆرترین ژمارەی دەزگا ئایینییەکان تیایاندا[٦٦].

بە هاتنی ساڵی (١٩٥٧) و ئەنجامدانی دووەم سەرژمێریی فەرمی لە عێراق، ژمارەی گەڕەکەکانی بەرقەڵا گۆڕانێکی چەندی و چۆنییان لێ هاتە ئارا. بە گوێرەی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧) ژمارەی گەڕەکەکانی ئەم بەشەی شار لە کورتی داوە و ناوی دوو گەڕەك سڕاونەتەوە لە لیستی ناوی گەڕەکەکان، ئەوانیش گەڕەکی (ئاخوڕ حوسێن) و (پیریادی موسەوی)ن. بڕوانە خشتەی ژمارە (٤).

هۆی نەمانی گەڕەکی پیریادی موسەوی بۆ کۆچکردنی جوولەکان بۆ ئیسرائیل دەگەڕایەوە. بۆیە ئەم گەڕەکە لەوەبەدوا ناوی یەکخرا، لە بری پیریادی موسلیم و پیریادی موسەوی، تەنها بە پیریادی ناودەبرا. هەرچی گەڕەکی ئاخوڕ حوسێن بوو، ئەوا لەگەڵ گەڕەکی ئیمام قاسم لێکدراو بە یەك گەڕەك مامەڵەیان لەتەك کرا، گەڕەکەکەش وەك گەڕەکێکی بچووك لەناو گەڕەکی ئیمام قاسم مایەوە، ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت هەر بەو شێوەیەیە، هەروەها هۆکارێکی تر کە خۆی دەبینێتەوە لە پرۆسەی تەعریب و توانەوەی لە ناوە عەرەبی و شێواندنی ناوی گەڕەکەکان.

**خشتەی ژمارە (٤)**
**پێکهاتەی دانیشتووانی گەڕەکەکانی بەرقەڵا لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا[٦٧].**

| ن | گەڕەك | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٥٧ | جیاوازیی زێدەی و کەمی (+) (−) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسەڵلا | ٤٦٧٤ | ٨٢١٧ | + ٣٥٤٣ |
| ٢ | ئیمام قاسم | ٤٦٧٢ | ١١١٣٨ | + ٤٤٢١ |
| ٣ | پیریادی موسلیم | ٣٣٦٥ | ٦٠٦٣ | + ١٠٥٢(*) |
| ٤ | پیریادی موسەوی | ١٦٤٦ | ..... | ..... |
| ٥ | چقوور | ٣٢٥٢ | ٣٥٢٣ | + ٢٧١ |
| ٦ | بولاق | ٣٠٣٦ | ٣٤٠٥ | + ٣٦٩ |
| ٧ | شۆڕیجە | ٢٣٦٨ | ٧٧١١ | + ٥٣٤٣ |
| ٨ | ئاخوڕ حوسێن | ٢٠٤٥ | ..... | ..... |
| ٩ | چای | ١٧٥٤ | ١٦٦٢ | − ٩٢ |
| ١٠ | ئاوچی | ١٣٠٣ | ٢١١٩ | + ٨١٦ |
| کۆی گشتی | | ٢٨١١٥ | ٤٣٨٣٨ | + ١٥٧٢٣ |

لەم خشتەیەدا ئەوە بە ڕوونی دەرکەوتووە، لە ماوەی نێوان دوو سەرژمێرییەکە، گەشەکردن و پەرەسەندنێکی گەورە لە هەندێك لە گەڕەکەکانی بەرقەڵا هاتووەتە کایە. چ سەبارەت بە زۆربوونی ژمارە و بەرزبوونەوەی چڕیی دانیشتووان بێت، یان سەبارەت بە گەورەبوونی ئاوەدانی بێت لە هەندێك لە گەڕەکەکان، وەك گەڕەکەکانی: شۆڕیجە و ئیمام قاسم و موسەڵلا. ئەو گەڕەکانە لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانیان، بێگومان چڕیی دانیشتووانەکانیان بەرزبووەتەوە و پێویستیان بە گەشە و گەورەبوونێکی نوێی ئاوەدانی و بنیاتنانی خانووبەرە هەبووە. بۆیە ئەو گەڕەکانە سنووری تەقلیدییەکانی خۆیان بەزاندووە و فراوانبوونە.

دەبێت ئاماژە بەو ڕاستییەش بدرێت لەبەر ئەوەی گەڕەکەکانی موسەڵلا و ئیمام قاسم و پیریادی نزیك بازاری گەورەی شاربوونە، بۆیە خواست لەسەر نیشتەجێبوون لەو گەڕەکانە زۆر بووە و خەڵکێکی زۆریان تێخزیوە. هەروەها کۆمەڵێك ئیعتیباری دی، وەك ئەوەی گەڕەکی شۆڕیجە شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان بوو، لەو ماوەیەشدا کۆچێکی بەردەوامی گوندنشینەکانی دەوروپشتی کەرکوك بۆ نێو شار لە ئارادا بوو. بۆیە ئەو گەڕەکانە ئاسروشتییانە گەشەیان کردووە و کەڵەکەبوونێکی زۆر دروستبووە. لە بەرانبەریشدا گەڕەکی چای کە گەڕەکێکی کۆنی شارە لە ڕووی ژمارەی دانیشتووانەوە لە کورتی داوە. هەڵبەت ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەڵکی لەو ڕۆژگارەدا وەکو چاولێکەری

پێیان خۆشبووە لە خانووی نوێ و گەڕەکی نوێ نیشتەجێبن، بۆیە بەشێك لە دانیشتووانی ئەو گەڕەکە پێدەچێت بەرەو بەشی قۆریە گواستبێتیانەوە، یان بەشێك لە دانیشتووانی ئەم گەڕەکە لەلایەن کۆمپانیای نەوتەوە لە عەرەفە خانوویان بۆ دابینکرابێت. ئەمەو لە کاتێکدا کە بزانرێت هیچ قەیران و پەتایەکی ترسناك لەو گەڕەکەدا نەهاتووەتە کایە. ئەم پێودانە بە هەمان شێوە بەسەر گەڕەکەکانی بولاق و چقوورو ئاوچی پیادە دەبێت.

ماوەی نێوان دوو سەرژمێرییەکە (١٩٤٧-١٩٥٧) بە خەسلەتێکی دیار دەناسرێتەوە، ئەویش ئەوەیە لێرەوە دیاردەی یەکەم گۆڕان لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی شار پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێوە، بەوەی پارەدارو دەوڵەمەندەکانی شار، وەك: ئاغاو سەرۆك خێڵ و بازرگان و فەرمانبەرەکانی دەوڵەت، دەستپێشخەربوون لە جێهێشتنی شوێنە کۆنەکانی نیشتەجێبوونیان و گیرسانەوەیان لە گەڕەکە نوێیەکانی بەشی قۆریە، کە سیمای شارێکی مۆدێرن و دامەزراوەیی هەبوو لەو ڕۆژگارەدا(٦٨). ئەوەش گەواهی پرسی کەمیی گەشەکردنی ئاوەدانیی گەڕەکەکانی چای و بولاق و چقوورو ئاوچی دەسەلمێنێت.

### ج. قۆریە:

ئەم بەشەی شار، کە دەکەوێتە ئەو بەری ڕووباری خاسەو ڕۆژئاوای شاری کەرکوکەوە، بە بەراورد لەگەڵ بەشەکانی دیکەدا، مێژووی ئاوەدانی تیایدا نوێیە. بەڵام سەرباری ئەوەش، بە وردی مێژووی ئاوەدانکردنەوەی دیار نییە. ئەم بەشە پێدەچێت پێشتر گوندێك بوو بێت لە نزیك شارداو دواتر وردە وردە فراوان بوو بێت و کەوتبێتە نێو سنوورەکانی شارەوە. وەك هەندێ توێژەر ئاماژەی بۆ دەکەن مێژووی ئاوەدانی لەم بەشەی شاردا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم(٦٩). بەڵام تا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەشێکی کەم بایەخ و بچووك بووە. بەو پێودانەی جێی سەرنجی زۆرێك لە گەڕیدە ئەورووپییەکان نەبووە. بەڵکو تەنانەت لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشدا لە چاوی (میرزا غولام حوسێن شیرازی- سۆن) لە گوندێك بەولاوە زێتر نەبووە(٧٠).

لەو ڕۆژگارە کاریگەریی تەنزیماتی عوسمانی گەیشتووەتە ناوچەکەو کاربەدەستانی عوسمانی دامودەزگاکانی ئیدارەی حکومەتیان لە شاری کەرکوك گواستووەتەوە ئەو بەر (واتە بەشی قۆریە)، ئەم بەشەی شار وردە وردە گەشەی کردووەو فراوان بووە. چونکە گواستنەوەی دەزگاکانی حکومەت و دروستکردنی بینای نوێ، بۆ بەڕێوەبردنی شارو ناوچەکە، کاریگەری زۆری لەسەر سەقامگیری ئەمن و ئاسایشی شارەکەو دەوروبەری هەبووەو بووەتە مایەی پەیدابوونی باوەڕی بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی شار، لە ماوەیەکی دواتردا، بۆ هاتنە خوارەوە لە قەڵا و نیشتەجێبوون و بڵاوبوونەوەیان لە نزیك باڵەخانەکانی حکومەت(٧١). قسەکانی مێژوونووسی بەناوبانگی عێراقی (عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی) گەواهی ئەم ڕاستییە دەدەنە دەستەوە کاتێك نووسیویەتی: "..خانەدان و بازرگان و دەسترۆیشتووەکان لە بەشی دەشتی شاردا نیشتەجێبوونە.."(٧٢).

ئەوەی ڕاستیی گەشەو گەورەبوونی قۆریە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم چەسپاوتر دەکات دروستکردنی پردێکی بەردینە لەلایەن موتەسەریفی کەرکوك (نافیز پاشا) لە ساڵی (١٨٧٥)دا، کە بە (تاش کۆپرو) ناوی دەرکرد. ئەم پردە ڕۆڵی بەرچاوی لە وەرچەرخانی بەشی قۆریەدا بینی بۆ لێکترگرێدانی هەر سێ بەشی شار بە یەکترەوەو بوونی قۆریە بە مەڵبەندێکی گرنگی کێشکردنی دانیشتووان(٧٣).

جیاوازیی بەشی قۆریە لەگەڵ بەشەکانی دیکەی شاردا هەر ئەوە نەبووکە لە ڕووی ئاوەدانییەوە مێژوویەکی نوێی هەبوو، بەڵکو شێوازی دروستکردنی خانووەکان و بەکارهێنانی زەوییەکانیشی جیاوازیان هەبوو. خانووەکانی ئەم بەشە وەك بەشەکانی دیکە بە تەنیشت یەکدییەوە هەڵنەچنرابوون، زۆر ئاماژەی مێژوویی جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکەنەوە، کە خانووەکانی بەشی قۆریە لە دووری یەکتر دروستکراون و هەروەها ئەم بەشەی شار ڕێژەی سەوزایی زۆر بووە(٧٤). سەرباری ئەوانەش شێوازی بنیاتنانی خانووەکانی بەشی قۆریە، لە ڕووی نەخشەسازییەوە، جیاوازییان هەبوو لەگەڵ خانووی بەشەکانی دیکەی کەرکوك، کە لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی دروستکرابوون(*) و زۆرێکیشیان باڵەخانەی دوو نهۆمی بوون(٧٥). ئەوەش هەنگاوێکی نوێیە سەبارەت بە نزیککەوتنەوەی کەرکوك لە خەسڵەتەکانی شارێکی سەردەمییانە. (عەلائەددین سوجادی) لە ساڵی (١٩٥٥)دا سەردانی شاری کەرکوکی کردووەو بەم شێوەیە دەربارەی بەشی قۆریە دواوە: "ئەم بەرەی دەستی ئاوەدانی بە ئاشکرا گەیشتوتی، کۆشك و خانوو بەرەی نایاب، باخچەو خیابانی تازەبابەت. بە هەر لایەکدا بڕۆی بە تەواوی شارستانی تازەت بەرچاو ئەکەوێ"(٧٦). بەشی قۆریە لە ماوەی ساڵانی (١٩٢١-١٩٥٨)دا، لەم گەڕەکانە پێکدەهات:

### * گەڕەکی شاترلو:

گەڕەکێکی کۆنی بەشی قۆریەیە. دەکەوێتە بەرانبەر گەڕەکی ئیمام قاسم لەو بەری ڕووباری خاسەوە بە دووری نزیکەی دوو میل، هاوسنوورە لەگەڵ گەڕەکی ئەڵماس لە باکوورو گەڕەکی بەگلەر لە باشوور. سەبارەت بە بنەچەی ناوەکەی (جەمال بابان) پێیوایە لە وشەی (شاتری)یەوە وەرگیرا بێت کە کۆمەڵە خەڵکێکن سەرەتا لە تورکیاوە بەرەو ئازەربیجان و لە وێشەوە ڕووەو عێراق کۆچیان کردووەو چوونەتە ژێر سایەی عەشیرەتی جافەوە(٧٧). هەرچۆنێك بێت دانیشتووانی ئەم گەڕەکە پەیوەندییەکی چاکیان بە دانیشتووانی کفری و خانەقینەوە هەبووە(٧٨). لە کۆڵانە بەناوبانگەکانی: (ئەڵماس، دمیر باش، بەگلەر، نەوتچییەکان، یەدی قزلەر، تەپەی مەلا عەبدوڵڵا، گڵچییەکان)(٧٩).

### * گەڕەکی (بەگلەر-بەگەکان):

لە گەڕەکە کۆنەکانی بەشی قۆریەیە. هەر لە ناوەکەیەوە دیارە کە دانیشتووانی بەگەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی و

کاربەدەستە گەورەکانی تورکی عوسمانییە[٨٠]. ئەم گەڕەکە بە تەنیشت گەڕەکی (شاترلو)ەوە لە باکووری گەڕەکی ساری کەهیە لە باشوورەوەیە. لە کۆڵانە بەناوبانگەکانی: (ئیمام عەباس، ئاغالار، هورمزلولەر، تەعلیم تەپە، سەیید خدرئۆجاغی، شامتورلو، زورناچیلەر)[٨١].

بەڵام بەپێی سەرچاوەکان زۆربەی بەگەکەکانی (داودەو جافو زەنگەنە) لەم گەڕەکەدا نیشتەجێ بوونە.

*** گەڕەکی ساری کەهیە:**

گەڕەکێکی کۆنە، زیاتر شیمانەی لێدەکرێت کاتی خۆی گوندێك بوو بێت لە نزیك شارو بە تێپەڕینی ڕۆژگار، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا، کەوتبێتە نێو سنوورەکانی شارەوە. زۆرینەی دامودەزگاکانی حکومەتی عوسمانیو دواتریش داگیرکاری (١٩١٨-١٩٢٠)و ئینتیدابی بەریتانی (١٩٢٠-١٩٣٢)و دەوڵەتی عێراقی (١٩٢٤-١٩٥٨) لەم سێ گەڕەکەدا: (شاترلو، بەگلەر، ساری کەهیە) بەڕێوەچوونە. بۆیە بێ هۆ نییە ڕێژەی زۆری دانیشتووانی ئەم گەڕەکانە لە چینی خانەدانو زەنگینو بنەماڵە دەسترۆیشتووەکانی شار بوونە. بنەڕەتی ناوی گەڕەکەکە دوو وشەی تورکییە، کە بە مانای (زەردە کەهیە) یان (کویخا زەردە) دێت[٨٢]. بۆچوونێکیش هەیە پێیوایە ناوەکە لە ناوی دامەزرێنەرو ناوەدانکەرەوەی گەڕەکەکەوە هاتبێت کە (محەمەد پاشای ساری کەهیە)یەو لە ڕۆژگاری خۆیدا سەرکردەی گشتیو فەرمانڕەوای سەربازیی ناوچەی کەرکوك بووە، دواتر لە ئەنجامی شیاوبوونی، لەنێوان ساڵانی (١٦٥٨-١٦٦٨) دا، بووە بە والی کەرکوك[٨٣]. لە کۆڵانە بەناوبانگەکانی: (جنچیلەر، سوکوتلەر، گاورباغی، سەیید جیهاد، جریت مەیدانی)[٨٤].

*** گەڕەکی خاسە:**

گەڕەکێکی دیاری شاری کەرکوکەو لە گەڕەکە نوێیەکانە، تا ساڵانی پەنجاکان لە شێوەی گەڕەکێك دەرنەکەوتووە. دەکەوێتە بەرانبەر قەڵا لەو بەری چەمی خاسەو هاوسنوورە لەگەڵ گەڕەکی بەگلەر لە ڕۆژئاوادا. ناوەکەی لەوە هاتووە، کە ئەو ناوچەیە کاتی خۆی بەشێك بووە لە موڵکە تایبەتەکانی سوڵتانی عوسمانی (الاملاك الخاصة للسلطان العثماني)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هاوواتای زەوییەکانی ئەمیرییە[٨٥].

*** گەڕەکی ئەڵماس:**

پێشتر شوێنەکەی دارستان بووەو ئینجا بووە بە بەشێك لە گەڕەکی شاترلو. بەڵام لە دواتردا بە هۆی فراوانبوونی، لە ساڵانی لێکۆڵینەوەکەدا، بە وردیش لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم، وەك گەڕەکێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵ کراوە. گەڕەکی ئەڵماس دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای گەڕەکی (شاترلو)ەوە، کە گەڕەکێکی پەرگەی شار پێکدەهێنێت. ناوەکەی وەك (جەمال بابان) دەڵێت: لە ناوی ئافرەتێکەوە هاتووە، کە پێدەچێت خاوەن موڵكو دەسترۆیشتوو بوو بێت لەو شوێنەی دواتر گەڕەکەکەی لێ پەیدا بووە[٨٦].

*** گەڕەکی نەوتی کەرکوك:**

لە سییەکانی سەدەی بیستەم وەکو ناوچەیەکی ئاوەدان دەرکەوت، لە پەنجاکان بە گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی شار لەقەڵەمدرا. لە ناوەکەیەوە دیارە کە تایبەت بوو بە کاربەدەستو کرێکارانی نەوتی کەرکوك. ئەم گەڕەکە زیاتر بە (عەرەفە) ناوی دەرکردووە، کە کۆمپانیای نەوتی عێراقی سنووردار (IPC) بۆ کارمەندانی نەوتی کەرکوك لەسەر شێوازی نوێ بنیاتی نابوو[٨٧].

*** گەڕەکی تسن (تسعین):**

ئەم گەڕەکە لەسەر داروپەردووی گوندی تسن دروستبوو، بە (ینگی تسن)ش (تسنی نوێ) ناوی دەبردرێت، لە دووەم سەرژمێریی فەرمی (١٩٥٧)دا، وەك گەڕەکێکی شاری کەرکوك مامەڵەی لەتەك کراوە. گەڕەکی تسن دەکەوتە ئەوپەڕی باشووری ڕۆژئاوای شاری کەرکوکەوە. دانیشتووانی لە چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگەی کەرکوکی پێکدەهات. دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی بیروبۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، لەوانە: دەگەڕێتەوە بۆ بوونی نەوەد ئیمام لەم ناوچەیە، لەبەر ئەوەش عەرەبەکان بە مەبەستەوە بە (تسعین) ناوی دەبەن، یان ناوی تیرەیەکی تورکمانییە یاخوود ناوەکە مێژووییەکی کۆنی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ ناوی کاربەدەستێکی ناوچەکە کە لە سەردەمە کۆنەکانی مێژوودا فەرمانڕەوایەتی کردووە[٨٨]. لە شوێنە دیارەکانی گەڕەکی تسن: (سوڵتان ساقی، سونا کولو، جیملیلەر، قاب قیران، جکلیر، قەرە مریەم، قابسی، شیخلەر، حەمزەلی[*]..). کۆڵانە بەناوبانگەکانی ئەم گەڕەکە: (سەفەر ساقی، قیز باشی، ئەسلان باسان، وەلی جێ، ئەفندی باغی)[٨٩].

*** گەڕەکی مەحەتە:**

گەڕەکی مەحەتە لە گەڕەکە نوێیەکانی شاری کەرکوك بوو، لە دوای ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەری (بەغداد-کنگربان) بۆ شاری کەرکوكو تەواوبوونی لە ساڵی (١٩٢٥)دا، شارو ناوچەکە پەرەسەندنی نوێی لێ هاتە ئارا[٩٠]، یەکێك لەو پەرەسەندنانە گەشەکردنو ئاوەدانبوونی ناوچەیەك بوو لە ڕۆژئاوای گەڕەکی تسن بەناوی (حەمزەلی)[٩١]، کە وێستگەی شەمەندەفەری لێ دانرا، بۆیە دواتر بە گەڕەکی مەحەتە ناسرا. ئەو گەڕەکە وردە وردە ئاوەدانبۆوە تا کۆتاییەکانی ساڵانی چلی سەدەی ڕابردوو، ئینجا لە پاڵیدا گەڕەکێکی دیکە دروستبوو بەناوی مەحەتەی نوێی کەرکوکەوە.

*** گەڕەکی دادچی:**

گەڕەکێکی نوێی کەرکوك بوو، لەبەر ئەوەی شوێنی دادگا لەو ناوچەیە بوو بۆیە ناوی (دادچی) بەسەردا برا، کە بە تەنیشت گەڕەکی ساری کەهیەوە بوو. ئەم گەڕەکە لە پەنجاکاندا، وەکو گەڕەکێك پەیدابوو[٩٢]، بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بوونی نییە، چونکە دادگا لەو شوێنە نەماو گواسترایەوەو گەڕەکەکەش لەگەڵ ساری کەهیە لێکدرا.

بەشی قۆریە وەك لە پێشەوەدا ئاماژەی پێدرا، بە ماوەیەکی پێوانەیی و لە ئاکامی چەند هۆیەکی تایبەتەوە ئاوەدانییەکی گەورەو فراوانی بەخۆوە بینی. گەشەکردن و گەورەبوونی ئەم بەشەی شار لە ڕۆژگاری پاشایەتی لە عێراقدا (١٩٢١-١٩٥٨) بەرچاوانەتر دەرکەوت. چونکە بە هەمان شێوەی ڕۆژگاری عوسمانی، لە قۆناغی داگیرکاری و ئینتیدابی بەریتانی و دواتریشدا، شوێنی جێگیربوونی دامەزراوەکانی دەوڵەت بوو. هەر لە بینایەی موتەسەریفیەت و بنکەی تیپی دووەمی سوپای عێراق و فرۆکەخانەو وێستگەکانی گواستنەوەو گەیاندن و خانەی پول و پۆستەوە بگرە تا هۆیەکانی کات بەسەر بردن وەك سینەما و قاوەخانە بەناوبانگەکان و باخچە گشتییەکان. بۆیە ئەم بەشەی شار ئاڵوگۆڕێکی گەورەترو گەشەو نەشونمایێکی زۆرتری بەخۆوە بینی لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا. بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی گەڕەکەکانی قۆریە بریتییە لە سێ گەڕەك، کە ژمارەی کۆشك و خانووەکانی خۆیداوە لە (٢٥٦٠) خانوو، ژمارەی دانیشتووانیشی گەیشتووەتە (٣٤٤٣٨) کەس، یان هاوتا بە (١٣,٤) کەس بۆ هەر خانوویەك. بڕوانە خشتەی (١٦٢٣) خانوو، کە (٨٨٩٣) کەسی لەخۆ گرتووە یان هاوتا بە (٥,٤) کەس بۆ هەر خانوویەك. هەروەها ژمارەی ئەو خانووانەی لەلایەن زیاتر لە یەك خێزانەوە بەکاردەهێنرێت، بریتییە لە (٩٣٧) خانوو، کە (١٩٧٠٣) کەس ژیانیان تیایدا دەگوزەرێنن یان هاوتا بە (٢١) کەس بۆ هەر خانوویەك. ئەوەش بەرزترین چڕی دانیشتووان پێکدێنێت لە سەرتاسەری شاری کەرکوکدا.

لە ڕووی بایەخ و خواستی نیشتەجێبوونەوە، وەك لە خشتەی ژمارە (٥)دا دیارە، بەر گەڕەکی ساری کەهیە کەوتووە ئینجا گەڕەکی بەگلەر. خاڵی بەهێزی ڕاکێشانی دانیشتووان بۆ ئەو گەڕەکانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو گەڕەکانە، بە تایبەت ساری کەهیە، مەڵبەندی چەقی ئاوەدانی بووەو خودان باخچەی گشتی و ناوچەی سەوزایی و نزیك وێستگەی شەمەندەفەر بووە. بەپێی خشتەی سەرەوە ژمارەی ئەو خانووانەی یەك خێزانی تێدا دەژیت لە گەڕەکی ساری کەهیە بریتییە لە (٨٥٩) کۆشك و خانوو، کە (٤٨٤٩) کەس تیایاندا نیشتەجێن یان بەرانبەر بە (٥,٦) کەس بۆ هەر خانوویەك. لە کاتێکدا ژمارەی ئەو خانووانەی کە لەلایەن

**خشتەی ژمارە (٥)**

**پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی قۆریە**

**بەپێی چۆنیەتی خانووەکان و چڕی دانیشتووان لە ساڵی (١٩٤٧)دا[٩٣].**

| ز | ناوی گەڕەك | ژمارەی دانیشتووان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە یەك خێزان لە خانوویەکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | ساری کەهیە | ٢١٥٠٥ | ٨٩٥ | ٤٩٤٨ | ٥٧٢ | ٢٥٦٨ | ١٠٨٨٤ |
| ٢ | بەگلەر | ٨٦٠٣ | ٤٧٢ | ٢٥٤٤ | ٢٤٩ | ١٣٧٠ | ٦٠٢١ |
| ٣ | شاترلو | ٤٣٣٠ | ٢٥٦ | ١٤٠١ | ١١٦ | ٥٩٣ | ٢٧٩٨ |
| کۆی گشتی | | ٣٤٤٣٨(*) | ١٦٢٣ | ٨٨٩٣ | ٩٣٧ | ٤٥٣١ | ١٩٧٠٣ |

ژمارە (٥).

لە خشتەکەدا، وەك دەرکەوتووە، ژمارەی یەکەکانی نیشتەجێبوون لەگەڵ ڕۆژگاری پێشووتر گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، هەر وەك خۆی بە سێ گەڕەك ماوەتەوە. بەڵام لە ڕووی ئاوەدانییەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ڕۆژگارەدا، پەرەسەندنێکی زۆری بەخۆوە بینیوە. باڵەخانەو خانوویەکی زۆری تیادا بنیاتنراوە، کە خۆیداوە لە (٢٥٦٠) خانوو. بە گوێرەی خشتەی سەرەوە، لە کۆی گشتیی ژمارەی خانووەکانی بەشی قۆریە، ژمارەی ئەو کۆشك و خانووانەی یەك خێزان بە شێوەیەکی سەربەخۆ تیایدا دەژین، بریتییە لە زیاتر لە خێزانێك بەکاربراوە هەر لە هەمان گەڕەکدا بریتییە لە (٥٧٢) خانوو، کە ژمارەی دانیشتووانیان گەیشتووەتە (١٠٨٨٤) کەس یان هاوتای (١٩) کەس بۆ هەر خانوویەك. لەم ڕاڤەکارییەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە نیشتەجێبوون لەم گەڕەکە خواستێکی زۆری لەسەر بووە بە بەراورد بە گەڕەکەکانی دیکەی شار.

هەر بە گوێرەی زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، دەردەکەوێت کە زۆرترین دامودەزگاکانی حکومی بەر گەڕەکی ساری کەهیە کەوتووە. لە دوای ئەویش گەڕەکی (شاترلو) دێت. هەرچی گەڕەکی بەگلەرە تاکە دامەزراوەیەکی

حکومی تێدا نەبووە. سەبارەت بە دامەزراوە ئەهلییەکانیش، ئەوا دیسان گەڕەکی ساری کەهیە پشکی شێری بەرکەوتووەو زۆرترین دامەزراوەی ئەهلی تێدا بووە. لە دوای ئەویش گەڕەکەکانی (شاترلو)و (بەگلەر) یەك بە دوای یەك دێن. دامەزراوە ئایینییەکانیش لەم بەشەی شار بەرجەستانە بوونی خۆیان سەلماندووە، کە لەو ڕووەوە گەڕەکی (شاترلو) بە پلەی یەکەم دێتو زۆرێك ژمارەی دامەزراوەی ئایینی تێدا بووە. ئینجا گەڕەکی (بگلەر)و گەڕەکی (ساری کەهیە) دێن[٩٤].

دوای تێپەڕبوونی تەنها (١٠) ساڵ بەسەر سەرژمێریی (١٩٤٧)دا، لە ساڵی (١٩٥٧)دا گۆڕانێکی گەورە لە باری ئاوەدانی بەشی قۆریەدا هاتە ئارا، بەوەی کۆمەڵێك گەڕەکی نوێو ئاوەدان دروستبوون، کە ئەم گەڕەکەکانە بوون: (خاسە، ئەڵماس، دادچی، مەحەتە، مەحەتەی نوێ، تسن، کۆمپانیای نەوت). ئەوەی پێویست بە وتن دەکات چوار گەڕەکە نوێیەکەی دواییان (مەحەتە، مەحەتەی نوێ، تسن، کۆمپانیای نەوت) پێشتر گوند بوون، واتە ئاوەدان بوون، بەڵام دواتر لە ئاکامی گەشەکردنیان کەوتنە نێو سنووری شارەوانیی شارەوە. وەك گەڕەکێکی نوێی شار مامەڵەیان لەگەڵدا کرا. هەڵبەت دیاردەی ئەو گەشەکردنە بەرزەی گەڕەکەکانی بەشی قۆریە لەم ماوە مێژووییەدا، بۆ ئەو دەگەڕایەوە کە لە ساڵی (١٩٥٢)دا کاری ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوەی عێراق (مجلس الاعمار العراقي) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوەو ژمارەیەك یەکەی نیشتەجێبوون لە شارەکەدا دروستکران[٩٥].

ژمارەی گەڕەکەکانی بەشی قۆریە،بەپێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، بووەتە (١٠) گەڕەك، کە کۆی گشتیی ژمارەی دانیشتووانیان گەیشتووەتە (٧٠٧٣٨) کەس، واتە بە ئەندازەی زێدەبوونی (٩٥,١٪). بەوەش هەموو لۆژیك‌و ڕێسایەکی گەشەکردنی سروشتییانەی تێپەڕاندووە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦)، پێکهاتەی دانیشتووانی گەڕەکەکانی قۆریە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا.

**خشتەی ژمارە (٦)**
**پێکهاتەی دانیشتووانی گەڕەکەکانی قۆریە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)دا[٩٦].**

| ز | گەڕەك | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتووان لە ساڵی ١٩٥٧ | جیاوازیی زێدەبوون (+) (-) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەگلەر | ٨٦٠٣ | ١٩٩٠٣ | ١١٣٠٠ + |
| ٢ | ساری کەهیە | ٢١٥٠٥ | ١٦٨١٣ | ٤٦٩٢ - |
| ٣ | خاسە | ... | ١٠٩٠٩ | ١٠٩٠٩ + |
| ٤ | ئەڵماس | ... | ٦٥٥٨ | ٦٥٥٨ + |
| ٥ | شاترلو | ٤٣٣٠ | ٥٤٧٨ | ١١٤٨ + |
| ٦ | تسن | ... | ٤٣١٢ | ٤٣١٢ + |
| ٧ | مەحەتە | ... | ٢٩٥١ | ٢٩٥١ + |
| ٨ | دادچی | ... | ١٥٢٣ | ١٥٢٣ + |
| ٩ | کۆمپانیای نەوتی کەرکوك | ... | ١٣٦١ | ١٣٦١ + |
| ١٠ | مەحەتەی نوێی کەرکوك | ... | ٩٣٠ | ٩٣٠ + |
| کۆی گشتی | | ٣٤٤٣٨ | ٧٠٧٣٨ | ٣٦٣٠٠ + |

لە کاتی بەراوردکردنی باری چڕیی دانیشتووانی گەڕەکەکانی قۆریە، لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)، دەردەکەوێت گەڕەکی ساری کەهیە پاشەکشەی کردووە بۆ پلەی دووەم، پێدەچێت بەشێکی دیار لە یەکەکانی نیشتەجێبوونی ئەم گەڕەکە خرابێتە سەر گەڕەکە تازە داکەوتووەکانی وەك: (خاسەو دادچیو مەحەتەو مەحەتەی نوێ)، بۆیە ژمارەی ئەم گەڕەکە کەمی کردووە. لە بەرانبەردا گەڕەکی بەگلەر پلەی یەکەمی داگیرکردووەو ژمارەی دانیشتووانی زیادی کردووە بە ئەندازەی زێدەبوونی (١٣١,٣٪). لەم ڕاستییەوەش ئەوە دەسەلمێندرێت، کە گەڕەکی بەگلەر هۆی کێشکردنی بەشێکی زۆری دانیشتووانی شارەکە بووە لەو ماوەیەدا. بۆیە گەڕەکەکانی بەرقەڵا، وەك: (گەڕەکی چایو چقوورو بولاق) بەو ڕادەیە ڕێژەی دانیشتووانیان لە سەرژمێریی دووەمدا نزم بووەتەوە. (بگەڕێوە بۆ خشتەی ژمارە (٤)). هەروەها لەبەر ئەوەی گەڕەکی (شاترلو) گەڕەکی ئەڵماسی لێ جیاکرایەوە، بۆیە زێدەبوونێکی کەم لەو گەڕەکە، لەم ماوە مێژووییەدا، هاتووەتە ئارا. لە ڕۆشنایی داتاو زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا، ڕوون دەبێتەوە کە پلانەکانی گەشەپێدانو هێنانە ئارای پڕۆژە پیشەسازییەکان، بە

هەموو جۆرەکانییەوە، لە ساڵانی پەنجادا کاریگەری قووڵی لەسەر فراوانبوونی قەبارەی تەواوی شارەکەدا هەبووە، کە لە هیچ قۆناغێکی مێژوویدا شاری کەرکوك گەشەکردنی لەم چەشنەی بەخۆوە نەدیوە. لە ئاماژەکانی ئەم فراوانبوون و گەشەکردنەش دروستکردنی چەند شەقامێکی سەرەکی و شوێنی گشتی بوو لە شاری کەرکوکدا، بە مەبەستی بەستنەوەی گەڕەکە تازەکان بە گەڕەکە کۆنەکان و دابینبوونی کارئاسانی لەپێناو هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی حکومەت و دانیشتووان.

بە شێوەیەکی گشتی باری ئاوەدانیی گەڕەکەکانی شاری کەرکوك، لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا، بەم شێوەیە بووە وەك لە خشتەی ژمارە (٧)دا خراوەتەڕوو.

**خشتەی ژمارە (٧)**
**پێکهاتەی شاری کەرکوك**
**لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)[٩٧].**

| ن | بەشەکانی شار | کۆی ژمارەی خانوو | کۆی ژمارەی خێزان | کۆی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکان(*) | کۆی گشتیی دانیشتووان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەڵا | ٦٦٩ | ١٢٠٢ | ٧٣ | ٥٧٦٤ |
| ٢ | بەرقەڵا | ٢٩٥٣ | ٥٣٧٦ | ٦٧٧ | ٢٨١١٥ |
| ٣ | قۆریە | ٢٨٢٣ | ٦٤٣٢ | ٥٧٨٠ | ١٩٧٠٣ |
| کۆی گشتی | | ٦٤٤٥ | ١٣٠١٠ | ٦٥٣٠ | ٥٣٥٨٢ |

ئەوەی جێی لێوردبوونەوە و سەرسوڕمانیشە، لە هەمان کاتدا، کۆی گشتیی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکانە، کە ژمارەیان لە کۆی گشتیی خانووەکانی شاری کەرکوك زیاترە! ئەم زانیارییە دووپاتەی ئەو ڕاستییە دەکاتەوە کە شاری کەرکوك هەمیشە شارێکی گرنگ بووە سەبارەت بە دەسەڵاتی ناوەندی و هێزو ڕایەڵی دەسەڵاتی ناوەندی باڵادەست بووە بەسەر شارەکەدا. هەروەها بوونی دیاردەی فرەڕەگەزی و فرەئایینی کاریگەری هەبووە لەسەر زۆربوونی ژمارەی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکانی شارەکە و زاڵبوونی بەسەر باری ئاوەدانی لەنێو شاردا، کە هەر نەتەوە و ئایین و ئایینزایەك بە جیا لە یەکتر خاوەن دەزگای ئەهلی و ئایینی بوون. تەنها دامەزراوە حکومییەکان نەبن کە کۆکەرەوەی هەموو لایەنە هەمەچەشنەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کەرکوکی بوون.

**ج. شەقام و بازاڕ و خان و ئوتێل و گەرماو و گۆڕستانەکان:**

**شەقام:**

شەقامەکانی شاری کەرکوك، وەکو هەر شارێکی مێژوویی، قۆناغی کۆن و ئیسلامی، خاوەن یەك شێوازی تایبەت و دیاریکراوی شەقامەکان نین. بەڵکو شارە کۆنەکان، بە شاری کەرکوکەوە، بە چەند شێوازێکی هەمەچەشنەی شەقام و ڕێگاوبانەکان دەناسرێنەوە. دروستبوونی ئەم دیاردەیەش بۆ هەلومەرجی تایبەتی هەڵکەوتنی جوگرافیی هەر یەك لە شارەکان و شێوازی کۆنی بنیاتنانی گەڕەك و ئاوەدانییەکان دەگەڕێتەوە.

ئەوەی تایبەت بێت بە شاری کەرکوك، ئەوەیە کە سیستەمی شەقامەکانی ڕوون نییە و تێکهەڵکێشییەکی زۆری لەخۆ گرتووە، نە لە ڕووی ئاراستەو نە لە ڕووی فراوانییەوە خاوەن شێوازێکی لێکچوو و دیاریکراو نین. وەك لە زانستی مۆرفۆلۆجیای شاریشدا[*] دەزاندرێت، سەرووەربوونی هەر جۆرە شێوازێك لە شێوازەکانی شەقامەکان کاریگەری و شوێنپەنجەی دیاری دەبێت لەسەر فۆرم و شێوەی شار یان درێژبوونەوەی ئاسۆییانەی شار. بۆ نموونە ئەگەر سیستەمی بازنەیی بەسەر شەقامەکانی شاردا سەروەر بوو ئەوا شارەکە لە کۆتاییدا فۆرم و شکڵی بازنەیی دەنوێنێت. ئەمە سەرباری ئەوەی هەر سیستەمێك لە سیستەمەکانی شەقامەکان کاریگەریی پۆزەتیف و نێگەتیف لەسەر پلاندانانی شار دادەنێت[٩٨].

لە سەرنج لێگرتنی شەقامەکانی کەرکوك و بەراوردکردنیان بە شێوازە جیاجیاکانی شەقامەکان، دەردەکەوێت شاری کەرکوك، لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا، سێ چەشنە شەقامی تێدا سەروەرە، کە ئەمانەن:

١. شەقامە بازنەیی و نیمچە بازنەییەکان: وەکو شەقامی چواردەوری قەڵا، کە شێوەی قەڵای هەڵگرتووە.

٢. شەقامە ئەندامییەکان (نارێکەکان): ئەم چەشنە شەقامانە لە گەڕەکە کۆنەکانی شاردا، وەك: (ئیمام قاسم و ئاخوڕ حوسێن و پیریادی و بولاق و چقوورو چای)دا کۆبوونەتەوە. ئەم جۆرە شەقامانە خاوەن یەك ئاراستەی ڕێك و یەك قەبارەی فراوانی نین، بگرە هەندێك لەو شەقامانە لە سەرێکیاندا داخراون و ماوەی هاتووچۆیان تێدا نییە، واتە قەپاتە.

٣. شەقامە تیشك ئاساکان (شعاعي): ئەو چەشنە شەقامانەن کە لە نێو جەرگەی شارەوە بەرەو چواردەوری شار درێژ دەبنەوە، واتە ئەو شەقامانەی لە شێوەی تیشك لە مەڵبەندی شارەوە بەرەو لاییەکانی شار دەردەچن. لە نموونەی ئەم جۆرە شەقامانە: شەقامی کەرکوك–سلێمانی، شەقامی کەرکوك–بەغدا، شەقامی کەرکوك – هەولێر، شەقامی مەلیك غازی و قۆریە و.. تادوایی.

لەو ڕاستییانەی سەرەوە دەردەکەوێت شێوازە باوەکانی شەقامەکانی شاری کەرکوك مۆرفۆلۆجیەتی شارەکەی بە یەك چەشنی یەکانگیر دەرنەخستووە. هەر شێوە و سیستەمێکی شەقامەکانیش خاوەن کاریگەریی جیاکەرەوە

بووە. سیستەمی شەقامە شێوە بازنەیی و نیمچە بازنەییەکان کە لە ئاکامی کەڵەکبوونی بەردەوامی ئاوەدانیی شارەوە پەیدابوو بوون[99]، کۆتاییەکانیان هەر تەنها بە شەقامە بازنەییەکان خۆیان تەواو نەدەبوو، بەڵکو شەقامە تیشك ئاساکانیش تێکهەڵێشیان لەگەڵیاندا دروستکردووە. هەرچی شەقامە نارێکەکانە، تەنگو تەسكو پێچاوپێچ بوون، بۆیە لەگەڵ بارودۆخی ڕۆژگارەکە نەدەگونجان، بە تایبەت لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی. چونکە گەڕەکە کۆنەکان کەڵکێکی ئەوتۆیان لە خزمەتگوزارییەکانی هۆیەکانی گواستنەوە وەرنەدەگرت[100].

بەو پێودانەی سیستەمی شەقامەکانی شاری کەرکوك کاریگەرییان لەسەر مۆرفۆلۆجییەتی شار لە ڕووی پێکهاتەی پلانە ناوخۆییەکان داناوە، ئەوا ئەم شەقامانە بە تایبەت شەقامە تیشك ئاساکان، کە شاری کەرکوك بە شارەکانی دیکەوە دەبەستەوە، وەك: شەقامی سلێمانی (کە شاری کەرکوك بە شاری سلێمانی)و شەقامی غازی (کە شاری کەرکوك بە بەغدای پایتەختەوە)و شەقامی موسڵ (کە شاری کەرکوك بە شاری موسڵ)ەوە دەگەیاند، ڕۆڵی زۆریان لە گەشەو گەورەبوونی ئاسۆییانەی شاری کەرکوکدا گێڕا. زۆرجاریش ئەو فراوانبوونە بەدرێژایی شەقامەکان دەرکەوتن‌و بوونە مایەی پەیدابوونی پانتایی بۆشایی (عرصە) لەنێوان ئەو شەقامانە، ئەوەش بە نۆرەی خۆی کاریگەریی هەبوو لەسەر کەمبوونەوەی خزمەتگوزارییە فراهامکراوەکانی شارەوانییەکان بۆ گەڕەکە پەرت‌وبڵاوەکانی سەر ئەو ڕێگایانە. چونکە شارەوانی لە توانایدا نەبوو بەو هەموو پانتاییەی زەوی ڕابگات کە لەنێوان گەڕەك‌و ئاوەدانییەکانی شاردا هەبوو. وەك ڕاکێشانی ئاو بە بۆری و گەیاندنی کارەبا بۆ گەڕەك‌و ماڵەکان‌و هەروا پاککردنەوەی گەڕەکەکان لە زبڵ‌و خاشاك[101].

شەقامەکانی کەرکوك لە دوای دەرکەوتنی بەریتانییەکان، تا ڕادەیەك نوێگەری تێدا بەدی کرا، لەوە بەدوا شەقامەکان لەبارکران بۆ هاتووچۆی ماشێنی سەربازی‌و ئوتۆمبێلی سیڤیل، دواتریش لە کۆتایی سەردەمی پاشایەتیدا شەقامەکانی کەرکوك بەوە جیا کراونەتەوە لەگەڵ شەقامەکانی شارەکانی دیکەی کوردستان، کە فراوان‌و چەورێژکراو‌و خاوەن دارو درەختی جوانن[102].

شەقامە گرنگەکانی شاری کەرکوك لە سەردەمی لێکۆڵینەوەکەدا، لەمانەی خوارەوە پێکدەهات[103]:

*** شەقامی بازاڕی گەورە (جووت قاوە):**

لە شەقامە کۆنەکانی شاری کەرکوك بوو، دەکەوێتە خوار قەڵاوە بە بەری ڕۆژهەڵاتدا، لە فەرمانگەی (بەشی شارەوانی) (*) درێژ دەبۆوە، بە بازاڕی گەورەدا گوزەری دەکرد دەچووە گەڕەکی ئاخور حوسێن، لە نزیك گەرماوەکانی گەڕەکی ناوبراو کۆتایی دەهات.

*** شەقامی ئیمام قاسم:**

لە شەقامە کۆنەکانی شاری کەرکوك بوو، دەکەوێتە گەڕەکی ئیمام قاسمەوە، لە گەرماوەکانی گەڕەکی ئاخور حوسێنەوە درێژ دەبۆوە تا دەگەیشتە باکووری گەڕەکی ئیمام قاسم‌و لەوێشەوە لەگەڵ شەقامی سلێمانی تێکەڵ دەبوو.

*** شەقامی سلێمانی:**

لە شەقامە کۆنەکانی شاری کەرکوك بوو، ئێستا بە شەقامی (حەسیرەکە) بەناوبانگە، لە پردی بەردینەوە دەستی پێدەکردو بە تەنیشت قەڵاوە درێژ دەبۆوە گەڕەکی ئیمام قاسمی دەبڕی تا دەگەیشتە ڕێگای سلێمانی.

*** شەقامی مەلیك غازی (الثورة):**

لە شەقامە نوێیەکانی شاری کەرکوك بوو، ساڵانی (١٩٣٨-١٩٣٩) لە تەواوکردنی بوونەوە، فراوانترین شەقامەکانی شاری کەرکوك بوو تا ئەو سەردەمە. لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە دەستی پێدەکردو بە دووڕێیانێك لە گۆڕەپانی تەکیەی شێخ باقی کۆتایی دەهات.

*** شەقامی مەلیك فەیسەڵی دووەم (الجمهورية):**

لە شەقامە نوێیەکانی شاری کەرکوك بوو، سەرەتای ساڵانی چل بنیاتنرا، لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە لە ڕۆژئاوای شەقامی مەلیك غازی دەستی پێدەکرد، گەڕەکەکانی ساری کەهیەو بگلەرو شاترلوی دەبڕی، لە گۆڕەپانی تەکیەی شێخ باقی کۆتایی دەهات.

*** شەقامی وەسی (عەبدولئیلا):**

لە شەقامە نوێیەکانی شاری کەرکوك بوو، سەرەتای ساڵانی چل هاوکات لەگەڵ شەقامی مەلیك فەیسەڵی دووەم بنیاتنرا، لە دەروازەی گوندی نەوتی کەرکوك (نیو کەمپ) درێژدەبۆوە‌و بە ناوچەی (تعلیم تەپە)دا دەڕۆی تا لەگەڵ شەقامی مەلیك فەیسەڵی دووەم یەکی دەگرتەوە.

*** شەقامی سەرای:**

لە شەقامە کۆنەکانی شاری کەرکوك بوو، لە فەرمانگەی شارەوانییەوە دەستیپێدەکرد بە تەنیشت سەراو مۆڵگە سەربازییەکەی شاردا گوزەری دەکرد تا دەگەیشتە دەروازەی قۆریە.

*** شەقامی قۆریە:**

لە دەروازەی گەڕەکە بچووکەکەی قۆرییەوە دەستیپێدەکرد تا دەگەیشتە جرت مەیدان بە کۆتایهاتنی جرت مەیدان شەقامی قۆریەش کۆتایی دەهات.

*** شەقامی موسڵ:**

لە بەیەکگەشتنی شەقامەکانی مەلیك غازی‌و مەلیك فەیسەڵی دووەمەوە درێژدەبۆوە بە بەردەم خانەی میوانداری (دار الضيافة) کەرکوك‌و دواتریش بەناو باخچەی (أم الربيعين)دا، نزیك بە ڕێگای هەولێر دەڕۆیی تا دەگەیشتە ڕێگای موسڵ.

*** شەقامی باباگورگور:**
لە شەقامە نوێیەکانی شاری کەرکوك بوو، مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی سی، لە نزیك باخچەی (ام الربیعین)ەوە دەستیپێدەکرد بەرەو رۆژئاوای شار بە تەنیشت موڵکەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق درێژ دەبۆوە تا دەگەیشتە گۆرەپانی شەقامی وەسی.
سەرباری ئەو شەقامانەی لە سەرەوەدا باسکران چەند شەقامێکی دیکەش هەبوون، وەك: شەقامەکانی (مەجیدییە، ئەوقاف، ئەلماس، شاترلو[*]، عەلمێن، مەلیك عەلی، گاوریاغی، قەسابخانە، موسەللا، ئەبو علووگ، پیریادی)و تادوایی.
پێویستە ئاماژەش بەوە بدرێت، کە شەقامەکانی شاری کەرکوك بە بەراورد بە شەقامەکانی زۆربەی لیواکانی عێراق، شەقامی پان و بەرین و پاك و خاوێن بوونە[١٠٤]. ئەوەش رەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هەلکەوتە جوگرافییەکەی شار گونجاو بووە بۆ فراوانبوونی ئاوەدانی و دروستکردنی رێگاوبان و شەقامی بەرین، بە تایبەت لە بەشی قۆریەدا.
لە لایەکی دیکەوە کەمی هۆیەکانی گواستنەوەو کۆنییان، گالیسکەی دوو چەرخە، کە (پایلی)یان پێ دەگوت، لە ئەندازەو رادەی قەرەباڵغیان کەم کردووەتەوە. بۆیە خەلکی ئەو کات تا کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتیش، وەکو بەشێکی سروشتی ژیانی رۆژانەیان، زیاتر بە پێ هاتووچۆو بازاڕیان کردووە[١٠٥]. ئەوانەی هۆیەکانی گواستنەوەیان بەکارهێناوە یان ئەوەتا خانەدان و دەولەمەند بوونە یان ئەوەتا پیرویەککەوتەو نەخۆش بوونە[١٠٦].
ماوەتەوە بوترێت کۆمپانیای نەوتی عێراق رۆلی بەرچاوی هەبوو لە خۆشبوونی رێگاوبانەکانی کەرکوك و قیرتاوکردنی بەشێکی زۆریان و رایەلکردنی شەقام و رێگای نوێ و هاوکاریکردنی چەند پرۆژەیەك لە نێو شاردا کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیای نەوتی دەکرد[١٠٧].

*** بازاڕ:**
شاری کەرکوك لەبەر ئەوەی لە سەردەمی عوسمانیدا کەوتبووە سەرە رێی بازرگانی، بایەخی تایبەتی لە رووی ئابوورییەوە بۆ پەیدا ببوو. پەیدابوونی ئەو بایەخەش رەنگدانەوەی دیاری بەسەر چالاکی و جموجۆلی کڕین و فرۆشتن لەنێو شارەکەدا هێنابووە کایە[١٠٨]. بەلآم بازاڕی کەرکوك بە هاتنی ئینگلیزەکان لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٨)[١٠٩] و راکێشانی هێلی شەمەندەفەر (١٩٢٥) و بەستنەوەی شاری کەرکوك بە دەولەتی تازە دروستبووی عێراق، گۆرانگەلی زۆری لە رووی چۆنیەتی و چەندێتییەوە بەخۆیەوە بینی. کەرکوك وەك ناوەندێکی گرنگی بازرگانی و بازاڕێکی گەورەی ناوچەکانی دەوروپشتی و تەنانەت شارە کوردییەکانیش دەرکەوت[١١٠].
لە ئەنجامدا ژمارەیەك بازاڕی گشتی و تایبەتمەند لە شاری کەرکوك دروستبوون. بازارە گشتییەکانی شاری کەرکوك ئەمانە بوون:

*** بازاڕی قەلآ:**
مێژووی پەیدابوونی نادیارە، دەکەوتە بەشی باکووری قەلآوە لە گەرەکی مەیدان بوو. کۆنترین بازاڕی شار بوو[١١١]. هاوهەنگاو لەگەل زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان و کەمبوونەوەی پانتایی زەوییەکانی سەر قەلآ، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بازاڕی قەلآ گرنگی جارانی لەدەستدا. چونکە بازاڕی شار کرایە دوو بەش و بەشە نوێیەکەیان بردە خوارەوەی قەلآ. ئەم بازارە لە رۆژگاری پاشایەتی هەر مابوو، بەلآم وەکو جاری جاران گەرم و گوڕ نەبوو.

*** قەیسەریی کەرکوك:**
دەسەلآتدارانی عوسمانی وەك مەلبەندێکی بازرگانی لەپێناو ئاسانکردنی کردەی کڕین و فرۆشتنی دانیشتووان، لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بازاڕێکی میچداری فراوان و نوێیان بنیاتنا[١١٢] بەنێوی بازاڕی (قەیسەری)[*]. قەیسەریی کەرکوك لە خوارەوەی قەلآ، لە نزیك دەرگای یەدی قزلەر، کە دەکەوێتە باشووری رۆژهەلآتی قەلآ، بە دووری تەنها (١٠) مەتر لە قەلآوە، بە تەرزێکی بیناکاری سەرنجراکێش و تایبەت دروستکراوە. لە وردبوونەوە لە پێکهاتەی بازارەکەدا ئەوە بە روونی دەردەکەوێت، کە کاتەکان (الاوقات) وەك بنەرەتێك لە بنیاتنانی قەیسەریی کەرکوکدا ئیلهامبەخش بووە.
قەیسەریی کەرکوك (٣٦٠) دوکان لەخۆ دەگرێت، کە هێمایە بۆ رۆژەکانی سال، هەروا (١٢) شوقەکەی سەر دوکانەکان ئاماژەیە بۆ مانگەکانی سال، (٢٤) دالآنەکانی (ممر) رەمزی ژمارەی کاتژمێرەکانی شەو و رۆژە. وەك چۆن (٧) دەروازەکەی قەیسەریی کەرکوك هێمایە بۆ ژمارەی رۆژەکانی هەفتە[١١٣].
سەرباری ئەوانەش بازارەکە بە شێوەیەك دروستکراوە کە لە کاتی خۆرهەلآتندا، رووناکی تیشکی خۆر لە دەروازەیەکی بازارەکە بێتە ژوورەوەو لە کاتی خۆر ئاوابوونیشدا یەکێك لە دەروازەکانی دیکەی بازارەکە هەمان رۆل دەبینێت.
قەیسەریی کەرکوك بازرگان و پیشەکارو فرۆشیارێکی زۆری لی کۆبۆوە، بازاڕێکی گرنگی (بەرگدرووی، عەتتاری، خەفافی، کۆتال، رستن و چنین و سوفکاری و خومگەری و.. هتد) بووە[١١٤]. ئەم بازارە لە سەردەمی پاشایەتیشدا گەرمترین بازاڕی سەوداو مامەلەو کڕین و فرۆشی دانیشتووانی کەرکوك بوو.

*** بازاڕی حەلواچی:**
دەکەوتە بەری رۆژهەلآتی قەلآوە بەرانبەر دەرگای حەلواچیی قەلآ. مێژووی پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم. هەرچەندە وەك لە ناوەکەیەوە دەردەکەوێت کە بازاڕی فرۆشتنی حەلوا بووە، بەلآم بازارەکە تەنها تایبەتمەند نەبووە بەو بەرهەمە، بەلکو بە تەنیشت ئەوەوە زۆر بەرهەم و کالآی دیکە فرۆشراوە[١١٥].

*** بازاڕی گەورە:**

دوا بە دوای گەشەو گەورەبوونی ئاوەدانی لە بەشی بەرقەڵادا، هەروا دوای دروستبوونی بازاڕی میچداری قەیسەریو حەلواچی، وردە وردە ئالوگۆڕی بازرگانیو جموجۆڵی ئابووری لە شاری کەرکوکدا بەهێزتر دەبوو، پێویستییەکانی دانیشتووانی شار هەر بەو بازاڕانە تەواو نەدەبوو. بۆیە دوکانی نوێتر، لە دەرەوە قەیسەریو بە تەنیشت بازاڕی حەلواچی، بە شێوەیەکی پەرتو بڵاو پەیدابوو، کە لە کۆتاییدا ئەو دوکانە پەرتو بڵاوانە یەکیان گرتو ناوی بازاڕی گەورەی لەلایەن خەڵکی شارەوە بەسەردا برا. مێژووی پەیدابوونی بازاڕی گەورە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٧٠)[١١٦]. ئێستاشی لەگەڵدا بێت بازاڕی گەورەی کەرکوك بازاڕێکی گەرمی کڕینو فرۆشتنی دانیشتووانی شارە.

*** بازاڕی چای:**

دەکەوێتە دامێنی باشووری ڕۆژئاوای قەڵاوە نزیك بە پەیژەکانی دەرگای (تاش قاپی). وا مەزەندە دەکرێت مێژووی پەیدابوونی بگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەو بەڵگەی لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی پێش ئەو وەختە ئاماژەی بۆ نەکراوە. بەڵام لە سەردەمی داگیرکاریو ئینتیدابی بەریتانی، ئەفسەری بەریتانی (سیسیل جۆن ئیدمۆندز) (C.J. Edmonds) ناڕاستەوخۆ ئاماژەی پێداوە[١١٧]. ئەم بازاڕە لەپاڵ بوونی چەند دوکانێکی تایبەتمەنددا، بۆ ماوەیەك بە تایبەت لە کۆتایی سەردەمی پاشایەتی، هەراجخانە بووە. ئەوەی ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەکاتەوە ئەوەیە، کە دوای ئەوەی شارەوانی کەرکوك لە ساڵانی پەنجادا، لەمبەرو ئەوبەری چەمی خاسەدا پەیژەی دروستکرد بە مەبەستی پەڕینەوەی هاووڵاتیان لە چەمەکەدا، فرۆشیارە سەرپێییەکان کاڵاکانی خۆیان لە وشکە چەمی خاسەدا، لە هەردوو ڕۆخی ڕێگاکەدا داناوە. ئەم بازاڕە لەو ڕۆژگارەدا لە بازاڕە بەناوبانگەکانی کەرکوك بووە[١١٨].

*** بازاڕی قۆریە:**

لە بازاڕە بەناوبانگەکانی بەشی قۆریەیە، بە تایبەت لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە دوای ئەوەی ناوچەکە گەشەسەندنێکی زۆری بەخۆوە بینی، ئالوگۆڕێکی دیار بە شێوەیەکی گشتی بەسەر جموجۆڵە ئابوورییەکاندا هاتو ئەم بازاڕەش بزاوتی تێکەوت. دەکەوێتە نێوان گەڕەکانی ساری کەهیەو بەگلەرەوە، چایخانەیەکی بەناوبانگ لە دەستە ڕاستی بازاڕەکە هەبوو بە ناوی (چایخانەی ئەحمەد ئاغا)، بۆیە زۆرجار بازاڕەکە بە بازاڕی ئەحمەد ئاغا ناودەبرا. بەڵام ئەم بازاڕە پێچەوانەی بازاڕەکانی بەرقەڵا تاكوتەرا خانی هەبووە، پێکهاتەکەشی بریتیبووە لە: (عەتتاری، قەسابی، سەوزەو میوەفرۆشی). واتە تەنها بازاڕی ئەو بەرهەمو کاڵایانە بووە کە خەڵکی ڕۆژانە پێویستییان پێیەتی[١١٩].

*** بازاڕی عەسری:**

لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتیدا (١٩٥٦-١٩٥٧)، لەلایەن شارەوانی کەرکوکەوە دوو بازاڕی نوێو سەردەمییانە دروستکران بە نێوی بازاڕی عەسری، یەکێکیان لە بەشی بەر قەڵا کە دەکەوتە بەرانبەر قەڵا لە ڕووی باکووری، نزیك پردی خەباتی ئێستا (تەبەقچلیی کۆن) لەسەر شەقامی سلێمانی، کە لە (١٢٣) دوکان پێکدەهاتو ئەوی دیکەشیان هەر بەو ناوە لە بەشی قۆریە دروستکرا، کە (١٠٠) دوکانی لەخۆ دەگرت[١٢٠]، ئەم بازاڕەیان دەکەوتە سەر شەقامی مەجیدییە. بازاڕی یەکەمیان لە دوای ڕووخانی کۆمەڵە باڵەخانەیەك دروستکراو دوکانەکانی ڕووی پشتەوەی تایبەت کرا بە فرۆشیارانی سەوزەو میوەو گۆشتفرۆشان تاوەکو ئەو دوو جۆرە کاڵایە لەم بازاڕەدا کۆبکەنەوە بە مەبەستی ئاسان بوونی چاودێریی تەندروستی[١٢١].

هەرچی بازاڕە تایبەتمەندەکان بوو ژمارەیان زۆربوو[١٢٢]، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون: (قزانچیلەر (بازاڕی قازان)، خەنچەرچیلەر (بازاڕی خەنجەرو چەقۆ)، دامرچلەر (بازاڕی ئاسنگەران)، اسکی ئالتونچلەر (بازاڕی کۆنی زێڕینگەران)، بالغچلەر (بازاڕی ماسی)، پالانچیلەر (بازاڕی کورتان)، دنگچیلەر (بازاڕی بەنناو بیناسازی)، زورناچیلەر (بازاڕی ئامێرە هونەرییەکان)، عربانچیلەر (بازاڕی گالیسکەو عەرەبانە)، بامبوغچیلەر (بازاڕی پەمووچییەکان)، بەرگدرووان، سەوزەفرۆشان، پێڵاوفرۆشان، بەنفرۆشان (گوریس)، بازاڕی خوێ، ئەشك مەیدان (بازاڕی بەرزەوڵاغ)، بازاڕی بۆیاغچییان، بازاڕی کەرەستەی بیناسازی، بازاڕی دانەوێڵە)و.. تادوایی. لەم جۆرە بازاڕانەدا کاڵایەکی تایبەت دەفرۆشران کە هەر یەکەیان بە ناوی ئەو کاڵایەوە دەناسرایەوە. هەروەها چەندین بازاڕی جۆراوجۆری دیکە لە شاری کەرکوکدا هەبوون، وەك: (بازاڕی جانبازان)، کە مەڕو ماڵاتی تێدا دەفرۆشرا. (بازاڕی قەسابەکان)، (بازاڕی عەتتاران). هەرچی شوێنی فرۆشتنی خواردەمەنییەکان (ئازووقە)و هی دی بوو، وەك: (مریشكو هێلکەو ساوەرو شیرو ڕۆنو برنجو دۆشاوی تەماتەو خورماو شتی دیکە) ئەوا زۆریان بە شێوەی کۆ بە یەکەوە لە خانەکاندا دەفرۆشران[١٢٣].

*** خانو ئوتێل:**

لە شاری کەرکوکدا ژمارەیەکی بەرچاو خان(*) یان کاروانسەرا هەبوون، ئەو خانانە تەواو پەیوەست بوون بە بازاڕەوە، هەر شوێنێك بازاڕی لێ نزیك بوو بێت ژمارەیەك خانی لێ دروستکراوە. لەبەر ئەوەی کەرکوکیش کەوتبووە سەرە ڕێی بازرگانیو هۆیەکانی گواستنەوە سست بوون لەو ڕۆژگارەدا، بۆیە لێرەدا ژمارەیەکی زۆر لە خانەکان هاتنە ئارا، کە وەك قۆناغێکی سەوداو مامەڵەو پشوودانی کاروانی بازرگانی بوون[١٢٤]. ئەم میوانخانەو کاروانسارایانە (خان) دوو ئەرکیان لە ئەستۆ بوو: لە لایەکەوە ئەرکی میوانخانەی شارو هاوکات

شوێنی حەواندنەوەی ئاژەڵەکانیشیان (ئەسپو گوێدرێژ) بوون، لە لایەکی دیکەوە فرۆشگاو بازاڕی ساغکردنەوەی بەروبوومەکان بوون[١٢٥].

خانەکان دوو چەشن بوونە، هەبووە تەنها شوێنی پشوودانی ڕێبوارانو خەڵکی لایدە بووە (وەك میوانخانەکانی ئەمڕۆ)، کە لە چەند ژوورێك پێکهاتووە. هەبووە شوێنی فرۆشیارو جووتیاران بووە کە لە دوو نهۆم پێکهاتووە، نهۆمی سەرەوە چەند ژوورێکی لەخۆ گرتووە بۆ پشوودانی کاروانسەراکانو فرۆشیاران تایبەتکراوە، نهۆمی ژێرەوەش وەك کۆگەی کەلوپەلو کاڵاکانو شوێنی داکردنی ئەسپو گوێدرێژەکان (هۆیەکانی گواستنەوەی ڕۆژگار) بەکار هاتووە. تاکە خانێك لە کەرکوکدا کە خاوەنی سێ نهۆم بووە (خانی تەها بەگ)ە، کە کەوتووەتە تەنیشت بازاڕی قەیسەری[١٢٦]. خانەکانی کەرکوك ژمارەیان زیاتر لە (٢٠) خان بووەو زۆرتریش بە ناوی ئەو کاڵاو لایەنەوە ناویان دەرکردبوو کە پەیوەست بوو بە خانەکەوە، وەك: ناوی کاڵا: (خورما خانی (خانی خورما)، کومور خانی (خانی خەڵوز)، یوغورت خانی (خانی ماست)) و.. هتد. ناوی لایەن: (قازی خانی، هندیلەر خانی (خانی هیندییەکان)، گاورلەر خانی (خانی گاوران)، بلدیە خانی، ئەوقاف خانی، گومرگ خانی، قۆریە خانی، ئەسعەد بەگ خانی، سادق سەراف خانی، سەیید عومەر خانی، چقوور خانی، گوڵبانی خانی، ڕەشەگوڵ ڕەزا خانی، قیردار خانی، کاروانچی خانی)و.. هتد[١٢٧].

پێویستە ئاماژە بەوەش بدرێت کە مێژووی وردی بنیاتنانی ئەو خانانە ناروونو نەزانراون، هەندێکیان بۆ سەردەمی عوسمانی دەگەڕێنەوەو هەندێکیان لە سەدەی بیستەمدا دروستکراون. خانەکان تا شەستەکانی سەدەی بیستەم لە کەرکوکدا خەڵکی ڕوویان تێکردووە. بەڵام لە ئاکامی پێشکەوتنی ئاوەدانیو گۆڕانە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکاندا میوانخانەکان پەیدا بوون. مێژووی پەیدابوونی یەکەم میوانخانەش (ئوتێل) لە شاری کەرکوکدا دەگەڕێتەوە بۆ دوای هاتنی ئینگلیزەکان بۆ شارەکە لە ساڵی (١٩١٨)دا. ئەو میوانخانەیە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بنیاتنرا بە ناوی (Rest House). دوای ئەویش میوانخانەیەکی دیکە لە ساڵی (١٩٢٥)دا بنیاتنرا بە ناوی میوانخانەی (ئەحمەد پالاس)، کە لە هەمان شوێنی ئوتێل کەرکوکی ئەمڕۆ بوو. بەپێی بەڵگەنامەیەکی بەریتانی هەر لەو ساڵانەدا میوانخانەیەکی دیکە دروستکراوە بە نێوی میوانخانەی (New Moon)[128] لە بەشی قۆریە. پاش ئەوانەش چەند میوانخانەیەکی دی لە شارەکە دروستکران، بە تایبەت لە بەشی قۆریەدا، کە لەنێویاندا (ئوتێل شەهرزاد)[١٢٩] لە چلو پەنجاکاندا لە میوانخانە بەناوبانگەکانی کەرکوك بوو. هەروەها لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی، موتەسەریفیەتی کەرکوك لە چوارچێوەی بەرنامەی ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوەی عێراق، ساڵی (١٩٥٧)، لە نزیك چایخانەی مەجیدییە میوانخانەیەکی نوێو سەردەمییانەی دروستکرد بە ناوی (فندق كركوك)[١٣٠].

*** گەرماو:**

گەرماو لە شاری کەرکوکدا برەوێکی چاکی لە نێو دانیشتووانیدا هەبووە، چونکە لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی وەك نەریتێکی باو لە خانووەکانی خۆیاندا گەرماوی ڕێکوپێکیان دروست نەدەکرد. ئەوەش لەبەر نەبوونی توانای ئابووری، چونکە گەرماو پێویستی بە دابینکردنی بڕێکی دیاریکراوی ئاو و سوتەمەنی هەبوو، کە ئەوەش لە توانای زۆرکەسدا نەبوو لەو کاتەدا، بە تایبەت دانیشتووانی قەڵا. بۆیە بە مەبەستی خۆشوشتن، خەڵکەکە ڕوویان لە گەرماوە گشتییەکان دەکرد، کە شارەکە ژمارەیەکی زۆر لەم چەشنە گەرماوەی تێدا بوو. هەروا پێدەچێت نەبوونی پانتایی زەوی، بۆ دروستکردنی گەرماو لەنێو خانووە بچووکە تایبەتەکاندا، هۆیەکی دیکە بێت لەم ڕووەوە[١٣١]. بە تێپەڕینی کات خۆشوشتن لە گەرماوە گشتییەکانی شاردا وەك دیاردەیەکی باو لەنێو دانیشتووانی کەرکوك تەشەنەی کرد[١٣٢]. بەڵام ئەم دیاردەیە لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتیو ماوەی لێکۆڵینەوەکە بەرەو کەمبوونەوە هەنگاوی لەسەرخۆی دەهاویشت. بەپێی ئامارێکی تایبەت کە لە ساڵی (١٩٥٦)دا ئەنجامدراوە، لە کۆی گشتیی خانووەکانی قەزای ناوەندی لیوای کەرکوك کە بریتیبووە لە (٢٤٦٧٨) خانوو، تەنها (٥٢٥٥) خانوو گەرماوی تێدا بووە[١٣٣]! بە دەربڕینێکی دیکە واتە ئەو خانووانەی گەرماویان تێدا بووە تەنها (٢١,٢٩٪)ی لە ڕێژەی گشتی خانووەکانی قەزای ناوەندیی کەرکوك پێکهێناوە. ئەم زانیارییە لە باریدا هەیە وێنای وردی قەبارەی بڵاوبوونەوەی دیاردەی خۆشوشتنی خەڵکی لە گەرماوە گشتییەکان لەنێو شاری کەرکوکدا بداتە دەستەوە، کە ڕێژەیەکی یەکجار بەرزە. بۆیە حەمامو حەمامچێتی پیشەیەکی پڕ قازانج بووە[١٣٤]. لە گەرماوە بەناوبانگەکانی کەرکوك دەکرێت ئاماژە بە هەر یەك لە گەرماوەکانی: (حەمامەکانی قەڵا (حەمام موسلیم، حەمام مەسیحی)، (جووت حەمام) لە بازاڕی گەورە، (دەدە حەمدی حەمام) لە گەرەکی چای، (شۆر حەمام) لە بازاڕی گەورە، حەمامی پیریادی، (تۆقات حەمام) لە قۆریە، (عەلی بەگ حەمام) لە قۆریە، بولاق حەمام، (حاجی باقی حەمام) لە بازاڕی گەورە، (حاجی حەسەن حەمام) لە بازاڕی گەورە، (سەرای حەمام) لە قۆریە)[١٣٥]. جێی سەرنجە، گەرماوەکان زۆرتر لە تەنیشت خانەکان دروستکراون کە پەیوەست بوون بە یەکەوە، چونکە کاتێك ڕێبوارانو کاروانچییەکان دەهاتنە نێو شار لە خان دادەبەزینو ڕوویان لە گەرماو دەکرد بۆ خۆپاککردنەوەو دەرچوونی شەکەتی ڕێگە. سەبارەت بە مێژووی دروستبوونی گەرماوەکان، سەرچاوەکان زانیاریی تەواو نادەنە دەست.

*** گۆڕستان:**

شاری کەرکوك کۆمەڵێك گۆڕستانی لەخۆ گرتووە کە مێژووی هەندێکیان زۆر کۆنەو بە وردی نازاندرێت دەگەڕێنەوە چ سەردەمێکی مێژوویی، وەك گۆڕستانی قەڵا. بەڵام

گۆڕستانەکانی دیکە مێژووی پەیدابوونیان دەگەڕێنەوە سەردەمی سەروەربوونی دەسەڵاتی عوسمانی. لە گۆڕستانی قەڵادا دانیشتووان بە جیاوازی ئاین (ئیسلام، مەسیحی، جوولەکە)و نەتەوە (تورکمان، کورد، کلدان، جوو) تەرمی مردووەکانیان لە نزیك مەزاری دانیاڵ پێغەمبەر نێژتووە بە مەبەستی پیرۆز وەرگرتن و ڕێزلێگرتنی دانیشتووان لەو مەزارە[١٣٦]. لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا، گۆڕستانە بەناوبانگەکانی کەرکوك ئەمانە بوون:

*** گۆڕستانی ئیمام قاسم (شێخ محێیەددین):**

مێژووی پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم. کۆنترین گۆڕستانی بەشی خوارەوەی قەڵایە، دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی قەڵاوە. لەبەر بوونی مەزاری یەکێك لە پیاوچاکان بە ناوی (شێخ محێیەددین) ناونراوەو هاوسنوورە لەگەڵ گەرەکی (ئیمام قاسم). شێخ محێیەددین (١٧٢٠-١٧٨٠) کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەیەو بە شێخ محێیەددینی قولەیی بەناوبانگ بووە، لە ناو گۆڕستانی ئیمام قاسمدا شێخ سەرپەرشتی مزگەوت و تەکیەی بچووکی کردووەو لەوێشدا نێژراوە، بۆیە گۆڕستانەکە لە دواتردا ناوی شێخی هەڵگرتووە[١٣٧].ئەم گۆڕستانە تایبەتە بە کوردەکانی دانیشتووی شاری کەرکوك، هەر لەبەر ئەوەش تەرمی زۆرێك لە ناسراوانی کوردی شارەکە لەو گۆڕستانە بە خاك سپێردراون.

*** گۆڕستانی موسەڵلا (ئەبو علووگ):**

گەورەترین گۆڕستانی شاری کەرکوکە، دەکەوێتە باشووری گەرەکی موسەڵلاوە. مێژووی پەیدابوونی نادیارە. گۆڕستانێکی تێکەڵەو تایبەت نییە بە هیچ ڕەگەزو نەتەوەو ئاینێك، بۆیە تەرمی هەم موسڵمان و هەم کەمە ئاینییەکانی تێدا بە جیا نێژراوە. سەبارەت بە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بوونی مەزاری پیاوچاکێك بەناوی (ابو علوك)، زۆرجاریش کەرکوکییەکان بە (گۆڕستانی موسەڵلا) ناوی دەبەن، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەم گۆڕستانە هاوسنوورە لەگەڵ گەرەکەکە.

*** گۆڕستانی تەعلیم تەپە:**

ئەم گۆڕستانە لە بەشی قۆریەیەو دەکەوێتە ڕۆژئاوای گەرەکی بەگلەر. مێژووی پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی هەژدەو نۆزدە. گۆڕستانەکە کە لەسەر گردێك پەیدابووە زۆرتر تایبەتە بە بنەماڵە تورکمانەکانی شار.

*** گۆڕستانی کڵێسە سوور:**

مێژووی پەیدابوونی ئەم گۆڕستانە ناروونە! بەڵام یەکێك لە گۆڕستانە کۆنەکانی شاری کەرکوك پێك دەهێنێت، کە تایبەتە بە پێکهاتەی کۆمەڵە دانیشتووانی مەسیحیی شارەکە (کلدان و ئەرمەن). ئەم گۆڕستانە نزیك بە کڵێسەی کۆنی مەسیحییەکانی کەرکوکە (بەیعەتی شەهیدان)، کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، لە سەردەمی لێکۆڵینەوەکەدا کەوتووەتە پەرگەی شار.

سەرباری ئەو گۆڕستانە بەناوبانگانەی لە پێشەوەدا باسکران، چەند گۆڕستانێکی بچووکی دیکەش لە شارەکەدا بوونیان هەبووە، وەك: گۆڕستانی ساری کەهیە، گۆڕستانی سەیید عەللاوی لە نزیك (ساحة الطيران). هەروەها هەندێك لەو گۆڕستانانە تایبەتن بە دانیشتووانە ناموسڵمانەکانی شارەکە، وەك: گۆڕستانی ئەرمەنە ئەرسەدۆکسەکان کە دەکەوێتە باکووری شارەوە نزیك بە گوندی گورگەچاڵ.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

(١) ماهر النقيب، كركوك وهويتها القومية والثقافية، ترجمة من التركية: حبيب الهرمزي، استانبول، ٢٠٠٨، ص ص٨٣-٨٤.

(٢) بەپێی وتەی سەرچاوەیەك رووپێوی ئاوەدانی کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٨٩٠-١٩١٤)دا، دوو هێندەی پێشووی زیادی کردووە. S. H. Longrigg، Iraq 1900 to 1950، P.53. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص٩٧).

(٣) بڕوانە: ليونهارت راوولف، رحلة المشرق الى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين (١٥٧٣)، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٨، ص١٩٨؛ هلكوت حكيم، كركوك في كتابات الرحالة الفرنسيين، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات، لندن، ٢٠٠١، ص١٤٢.

(٤) بڕوانە: موصل ولايتى ايجون ايكنجى دفعه، ترتيب اولنان سالنامەدر، ترتيب ايدن، حسن توفيق، موصل ولايت مطبعه سى، (١٣١٠هجرى/١٨٩٢ميلادى)، ص٢٠٥؛موصل ولايتى سالنامه رسميسى، ترتيب ايدن، صفوت، موصل، مطبعه ولايت، (١٣٢٥هجرى/١٩٠٧ميلادى)، ص٢١٢.

(*) قۆریە: ئەم وشەیە، وەك (تۆفیق وەهبی) باسیکردووە، ڕەنگە ناوێکی وەسفی بێت بۆ ئەو ناوچەیەی ئەم ئاوەدانییەی لێ پەیدا بووە، کە مانای (نزم) دەبەخشێت. توفيق وهبي بك، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٥.

(٥) گەڕەك: بە یەکەیەکی بنچینەیی دەژمێردرێت لە پێکهاتەی شارەکاندا، کە رووخسارەکانی پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتییانەی تێدا دەردەکەون و دەمارگیریی شارنشینێتی لە خانەی خۆیدا کۆ دەکاتەوە. هەموو شارێکی ناوچەکەش، وەك نەریتە، چەند گەڕەکێك دەگرێتەخۆ. هەر گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی شار لە شەقامێکی پان و کۆڵانە تەسك و تەنگ و پێچاوپێچەکانی، کە لقی شەقامە گەورەکەن، پێکدێت. ئەم پێناسەیە، هەرچەندە بۆ کەرکوك نەکراوە، بەڵام دەکرێ بۆ کەرکوکیش هەمان شت بوترێت و پیادە بێت. بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف العطار، الحياة الاجتماعية في العراق ابان عهد المماليك (١٧٤٩-١٨٣١)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة القاهرة، القاهرة، ١٩٧٦، ص٦٧.

(٦) بە پشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەکی هەمەچەشن، بە تایبەت ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ. بڕوانە: موصل ولايتى سالنامەسى، ترتيب ايدن، مكتوبى ولايت صادق افندى، موصل ولايتى مطبعه سى - (١٣١٢هجرى/ ١٨٩٤ميلادى)، ص٢٩٩.

(٧) سعدي عثمان حسين، المصدر السابق، ص٥١.

(٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بەختیار سەعید مەحمود شوانی، کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا (لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری و ئابووری)، نامەی ماستەر، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر کراوە، ٢٠٠٨، ل١٢-١٨.

(٩) بڕوانە: صبحي ساعتجي، احياء كركوك ومعالمها، ترجمة: نصرت مردان، "ميزوبوتاميا" (مجلة)، العددان (٥-٦)، جنيف-بغداد، تموز ٢٠٠٥، ص ٤٠٢.

(١٠) بڕوانە: يوسف شريف، مدن الطرق القديمة وتخطيطها ومبانيها وما حصل من تطور في بعضها، "آفاق عربية" (مجلة)، العدد (١٦)، بغداد، شباط ١٩٧٦، ص٢٢؛ سليم طه التكريتي، مدونات الرحالين عن النفط في العراق، "النفط والعالم" (مجلة)، العدد، (٦)، بغداد، ١٩٧٣، ص٥٥.

(١١) بەڵگەی ئەم ڕاستییە، زۆر بە ڕوونی، لە ڕاپۆرتە جیاجیاکانی شارەوانی کەرکوك تێبینی دەکرێت، کە ئێستا هەندێکیان لە خانەی کتێب و بەڵگەنامەکانی عێراقی لە بەغدا (دار الكتب والوثائق العراقية)دا پارێزراون. بۆ نموونە، بڕوانە: د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، وزارة الداخلية، تقارير بلدية كركوك، الموضوع: امور بلدية كركوك، (١٩٣٤/٨/٨ - ١٩٣٩/٦/١٥).

(١٢) بۆ یەکەمجار داڕشتنی نەخشەکێشانی بنەڕەتی (MasterPlan) شاری کەرکوك لەنێوان ساڵانی (١٩٧٣-١٩٧٥)دا بوو، کاتێك نەخشەکێشانی بنەڕەتی شار بەخشرایە دەزگای دۆکسیادیس (Doxiadis) کە حەوت ڕاپۆرتی هەمەچەشنی لەو بارەوە پێشکەش دەسەڵاتدارانی ئەو ڕۆژگارە کردووە. بۆ نموونە، بڕوانە: **Doxiadis، Kirkuk Master Plan، Final Report، No. 7، December 1975.**

(١٣) الملا جميل روزبياني، كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية، (ترجمة: انور مندلاوي)، "سردم العربي"(مجلة)، العدد (٢)، سليمانية، خريف٢٠٠٣، ص١١٩؛نوري خليل البرازي، البداوة و الاستقرار في العراق، القاهرة، ١٩٦٩، ص١٢٨.

(١٤) مؤيد ابراهيم الونداوي، العراق في التقارير السنوية للسفارة البريطانية (١٩٤٤-١٩٥٨)، بغداد، ١٩٩٢، ص١٢٩.

(١٥) محمد هادى الدفتر وعبدالله حسن، العراق الشمالى، بغداد، ١٩٥٨، ص ص٢١٣-٢١٦.

**(16) K.M. Ahmed، The Northern Transtigris in the first half of second millennum، M.A. thesis، unpublished، Leiden، 2003، P.52.**

(١٧) توفيق وهبي بك، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٤٧.

(١٨) جليل العطية، قلعة كركوك: اهميتها التاريخية وقيمتها الحضارية، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص٦٣٢.

(١٩) موصل ولايتي سالنامه رسميسيدر، موصل ولايتي مطبعه سى - (١٣٣٠هجرى/ ١٩١٢ميلادى)، ص٢٤٤.

(20) E.B. Soane، To Mesopotamia and Kurdistan in Disguse (With Historical Notices of the Kurdsh Tribes and the Chaldeans of Kurdistan)،Printed by Oliver and Boyd Edinburgh، London، 1912، P.338.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص ص٩٧-٩٨)

(٢١) درێژیی‌شەقامی سەرەکیی قەڵا جێی سەرنجی (سۆن) بووە، بۆیە لەم بارەوە ئاماژەی پێداوە بەوەی شەقامێکە بە دووری یەك میل درێژە. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص٩٨).
Ibid، P.338.

(*) جريت: يارييەكی سوارچاكییە، لە دوو تیپی سوار چاك پێكدێت، هەر تیپێك لەوانە هەوڵدەدات لایەكەی دیكە بە هۆی گۆپاڵێكەوە لەسەر ئەسپەكەی بخاتە خوارەوە. لە رۆژگاری عوسمانی ئەم یارییە باو بوو، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەم قەدەغە كرا.
Yeni Turk Ansiklopedisi، Cilt: (2)، Otuken، Istanbul، 1985، S.515.

(٢٢) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٣؛عەلی مەحمود محەمەد، كەركوك (شاری قەڵاو ئاگرو خوێن، چارەسەر: نموونەی برۆكسل یان بەرلین؟)، چاپخانەی ئارابخا، كەركوك، ٢٠٠٦، ل١٠٦.

(٢٣) گەرەكەكانی قەڵا، لەوەتی هەن، تا چۆڵكردنیان لە ساڵی (١٩٩١)دا، بە بیانووی نۆژەنكردنەوەو راگرتنی وەك شوێنەوارێكی دێرین‌و جێگەیەكی گەشتیاری بەشێكی دیاری شاری پێكهێناوە. نصرت مردان، اغتيال قلعة كركوك، "قارداشلق=الاخاء" (مجلة)، العدد (٦)، حزيران ٢٠٠٠، ص٤٣.

(٢٤) عبدالرزاق الحسني، موجز تاريخ البلدان العراقية، ص١٨٦؛آنجى طارق، الحنين الى القلعة، في: موسوعة كركوك قلب العراق، جنيف، نيسان ٢٠٠٨، ص١٨٠.

(٢٥) بەشێك لە بینای ئەو كڵێسایە ئێستاش لە قەڵادا ماوەو دەكەوێتە پشت مزگەوتی دانیاڵ پێغەمبەر.

(٢٦) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی باڵەخانەو تەلارەكانی قەڵای كەركوك، بڕوانە: جرجيس محمد الرملاوي، الابنية التراثية في قلعة كركوك، "التراث الشعبي" (مجلة)، العدد (٢)، بغداد، شباط ١٩٨٢، ص ص١٤-١٧.

(٢٧) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٣-٤٠٤؛عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

(*) گوك گومبەت یان گومبەزی شین، ساڵی (١٩٣٩) بە فەرمی وەك شوێنەوارێكی دێرین راگەیەندرا. "الوقائع العراقية" (جريدة رسمية)، العدد (١٦٨٧)، بغداد، (١٩٣٩/٣/٣).

(٢٨) بەڵگەی یەكلاكەرەوە بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو مەزارگانە شوێنی راستەقینەی ئەو كەسایەتیانە بوو بێت كە ناومان بردوون. چونكە لە شوێنی دیكەش مەزارگەیان هەیە. لەوانە: مەزارگەی دانیال پێغەمبەر، وەك لە دائیرەی مەعاریفی ئیسلامیدا هاتووە، لە (سوسە) لە ئێران. هەروەها مەزارگەی عوزێر پێغەمبەر لە هەولێر. ئەوە بە چاوپۆشین ئەگەر ئەو مەزارگانەی كەركوك بوونیان لە شارەكە راست بێت، ئەوا ئەوە دەسەلمێت، كە قەڵای كەركوك شوێنێكی كۆن‌و گەورەی نیشتەجێبوونی جووەكان بووە پاش پەرش‌وبڵاو بوونیان. سترك، مادة (السوس)، في: دائرة المعارف الإسلامية، المجلد الرابع، ١٩٣٤، ص٥٩٤.

(٢٩) آنجى طارق، المصدر السابق، ص ص١٨١-١٨٢.

(٣٠) زين العابدين علي صفر، التجديد الحضري لقلعة كركوك،"المورد" (مجلة)، العدد (٦٩)، بغداد، ربيع ١٩٨٩، ص٧٩.

(٣١) المملكة العراقية، وزارة الشؤون الاجتماعية (مديرية النفوس العامة)، إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٥٤، ص ص١٠٨-١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە،بەپێی ئامارەكان، دەركەوت (٧٤) كەس لە دانیشتووانی قەڵا لەژێر هیچ جۆرە چەشنێكی نیشتەجێبووندا تۆمار نەكراون. بۆیە لە كاتی كۆكردنەوەی ژمارەكانی خشتەكە ناگەینە ئەنجامێكی دروست‌و دەقاودەق.

(٣٢) پاش كنەو پشكنینێكی وردیش وادیارە سەركەوتوو نەبووین لە دەستنیشانكردنی پێناسێكی ورد بۆ ئەو دامودەزگایانە، بەڵام لە رووییەكی گشتگیردا، دەتوانرێت پەنجە بۆ كارخانەو ئۆفیس‌و شوێنە بازرگانی‌و رۆشنبیری‌و كۆمەڵایەتییەكان درێژ بكرێت.

(٣٣) مەبەست لە دەزگای ئایینی مزگەوت‌و تەكیەو خانەقاو هەموو ئەو شوێنانەیە كە سەروكاری‌ئایینییان هەیە.

(٣٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص١٠٨.

(٣٥) الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية (مديرية النفوس العامة)، المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، مطبعة العاني، بغداد، دون سنة الطبع، ص١٥٤.

(٣٦) بە گوێرەی سەرچاوەیەك داهاتی تاكی كەركوكی لە ساڵی (١٩٥٦)دا، بەرزترین ڕێژەی هەبووە لە دوای بەغدادی پایتەخت. بڕوانە: خيرالدين حسيب، تقرير الدخل القومي في العراق (١٩٥٩-١٩٦١)، بيروت، ١٩٦٤، ص ص٤٢٠-٤٢١.

(٣٧) المديرية العامة لارشيف الدولة التابعة لمجلس وزراء الجمهورية التركية، رئاسة دائرة الارشيف العثماني، دفتر التحرير المفصل المرقم (١١١) الخاص بلواء كركوك. وەرگیراوە لە: ماهر النقيب، المصدر السابق، ص ص٨٣-٨٤.

(38) Dr. Mirella Galleti، Report on Kirkuk، Op.cit، PP.A1-31. (في نسخته المترجمة الى العربية: ص ص١٨٧-٢٠٦).

(٣٩) لەم بارەوە بڕوانە: سعدي عثمان هروتي، دراسات اكاديمية في تاريخ كردستان الحديث، عمان، ٢٠١٢، ص ص١١-٨٧.

(٤٠) لەنێو ئەو شاڵاوە سەربازییانەدا، شاڵاوی شا عەبباسی گەورەی سەفەوی (١٦٢٣)و شاڵاوی نادرشای ئەفشار (١٧٤٣) دوو نموونەی بەرچاون لە ڕوودانی زۆرێك كاولكاری لە شارەكەدا. لەو بارەیەوە بڕوانە:الشيخ رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ترجمة عن التركية: موسى كاظم نورس، بيروت، دون سنة الطبع، ص٥٠؛

S.H. Longrigg، Four Centuries of Modern Iraq، Oxford University Press، England، 1925، PP.54، 138.(في نسخته المترجمة الى العربية: ص١٧٠).

(*) نیبور، كە بە بنەچە ئەڵمانییەو لە گەڕیدە پێشەنگەكانی ئەوروپییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەمدا سەردانی ناوچەكەی كردووە. زۆربەی زۆری گەڕیدە ئەوروپییەكانی سەدەی نۆزدەهەم سەبارەت بە كەركوك پشتیان بە ئاماژەكانی ئەو بەستووە.

Dr. Mirella Galleti، Report on Kirkuk، Op.cit، P.A6.(في نسخته المترجمة الى العربية: ص ص١٩٠-١٩١).

(٤١) كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة عن الالمانية: د.محمودحسين الامين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، وزارة الثقافة والارشاد، بغداد، ١٩٦٥، ص٨٥.

(42) J. S. Buckingham، Travels in Mesopotamia، Vol: (1)، Printed by D. S. Maurice، London، 1827، PP.115-116.(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص ص١٤٢-١٤٣).

(٤٣) نخبة من اساتذة التاريخ، المدينة والحياة المدنية، الجزء الثاني، الفصل الثامن: مدن القلاع، دراسة من اعداد: علاء موسى كاظم نورس، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٨، ص ص٢٧٢-٢٧٤.

(٤٤) مێژوونووسی ناسراو (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی)، لە سەرەتای ساڵانی بیستی سەدەی بیستدا، سەردانی شارەكەی كردووەو سەرنج و تێبینی لەسەر گرنگی شارەكەو خۆشیی ئاووهەواو پاكی و فراوانی شەقام و جوانی باڵەخانەكانی كەركوك تۆماركردووە. بڕوانە:موجز تاريخ البلدان العراقية، ص١٨٧.

(٤٥) بڕوانە:عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق او خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية،بغداد، ١٩٢٥، ص١٥٢.

(٤٦) بڕوانە:صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٤.

(٤٧) جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٦، ص٢٥٠.

(٤٨) موعتەسەم ساڵەیی، ناودارانی گەڕەكی ئیمام قاسم لە شاری كەركوك، "كەركوك"(گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، كەركوك، بەهاری ٢٠٠٥، ل٩٧-٩٨.

(٤٩) نجاة كوثر، بحث حول اسماء الاماكن والمناطق في كركوك، في: موسوعة كركوك قلب العراق، ص١٤٨.

(٥٠) موعتەسەم ساڵەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩-١٠٦.

(*) ئەخیان: دامەزراوەیەكی كۆمەڵایەتییە، لە سەدەی سیانزەهەمەوە لەنێو خاوەن پیشە ئازادەكان و كاسبكاران و بازرگانەكانی ئەنادۆڵ بڵاوبۆوە. دواتر شێوازێكی سەربازییان وەرگرت و لە شەڕەكانی عوسمانی دژی بێزەنتە بەشدارییان دەكرد. سهيل صابان، المعجم الموسوعي للمصطلحات العثمانية التاريخية، من منشورات مكتبة الملك فهد الوطنية، الرياض، ٢٠٠٠، ص١٣.

(٥١) ماهر النقيب، المصدر السابق، ص٨٧.

(٥٢) (جەمال بابان) پێی وایە بنەڕەتی ناوی پیریادی لە ناوی كەسایەتییەكی ئایینییەوە هاتبێت، كە (پیر) واتا شێخ و (یادی) واتا ژیانم، كە دەكاتە (شێخی ژیانم)و گوندێك لە نزیك چەمچەماڵ بەناوی ئەو كەسەوە كراوەو بەشێك لە دانیشتووانی ئەو گوندە دواتر لە گەڕەكی پیریادی نیشتەجێبوون و گەڕەكەكەیان بەناوی گوندەكەی خۆیانەوە ناوناوە. اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٥٣) ساڵی (١٩٥٠)، حكومەتی عێراق بە مەبەستی كۆچپێكردنی جوولەكان بۆ ئیسرائیل، بڕیاری لێ سەندنەوەی ڕەگەزنامەی جوولەكانی عێراقی دەركرد. بڕوانە:يعقوب يوسف كورية، يهود العراق (تاريخهم، احوالهم، هجرتهم)، لبنان، ١٩٩٨، ص

ص١٥٥- ومابعدها.

(٥٤) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠؛سمکۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و...، ل٧٣.

(٥٥) نجاة کوثر، بحث حول اسماء الاماکن، ص١٤٨.

(٥٦) سمکۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و...، ل٧٣.

(٥٧) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٥٨) ئەم ناوانە ڕۆژهەڵاتناسان لێکدانەوەی زۆریان بۆ کردوون و دەیان بەڵگەو سەرچاوەیان لە زمانە جیاوازەکانەوە لەسەر بەراورد کردووە. بەڵام زۆریان بە بنج نەگەیشتوون، بۆیە ئەو لێکدانەوانە پێویستیان بە توێژینەوەی زیاتر هەیە. بڕوانە:

V. Minorsky، Mongol Place – Names in Mukri Kurdistan (Mongolica، 4) in: Bulletin of the School of Oriental and African Studies، University of London، .Vol: (19)، No. 1، 1957، P. 58-81

(٥٩) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١؛سمکۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و...، ل٧٢.دەبێت سەرنج بۆ ئەوە رابکێشرێت گومان دەکرێت نوێژی جەژن لە دەرەوەی شاردا کرابێت، بەڵکو ڕەنگە نوێژەبارانە بوو بێت.

(٦٠) نجاة کوثر، بحث حول اسماء الاماکن.. المصدر السابق، ص١٤٨.

(٦١) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١.

(٦٢) بهاء الدین نوري، مذکرات بهاء الدین نوري، الطبعة الثانیة، اربیل، ١٩٩٥، ص٧٩.

(*) شیرج: پیشەی گرتنی ڕۆنی کونجییە، کە جووەکانی بەغدا ئەو کارەیان دەکرد، بۆیەش لە شاری بەغداش بازاڕو گەرەکێکی بەناوبانگ بەو ناوەوە هەیە.

(٦٣) دوو گوند لە لیوای کەرکوك بەو ناوەوە هەن: یەکێکیان سەر بە ناحیەی قەرەحەسەنەو ئەوی دیکەیان سەر بە ناحیەی ئاغجلەرە. جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٨٨.

(٦٤) لە شاری هەولێرش گەرەکی (تەعجیل) بە دوو یەکەی نیشتەجێبوونی جیاواز مامەڵەی لەگەڵ کراوە: (تەعجیل ئیسلام، تەعجیل یەهود). بڕوانە: هاشم خضر الجنابي، مدینة اربیل دراسة في جغرافیة الحضر، الموصل، ١٩٨٧، ص ص٤٥و٤٩.

(٦٥) إحصاء السکان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە،بەپێی ئامارەکان، دەرکەوت (٧١٥) کەس لە دانیشتووانی گەرەکەکانی بەرقەڵا لەژێر هیچ جۆرە چەشنێکی نیشتەجێبووندا تۆمار نەکراون. بۆیە لە کاتی کۆکردنەوەی ژمارەکانی خشتەکە ناگەینە ئەنجامێکی دروست و دەقاودەق.

(٦٦) إحصاء السکان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩.

(٦٧) المجموعة الإحصائیة لتسجیل عام ١٩٥٧، لوائي السلیمانیة وکرکوك، ص ص١٥٢-١٥٤.

(*) ژمارەی دانیشتووانی گەرەکی (پیریادی موسەوی) لێ دەرهێنراوە، کە لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا (١٦٤٦) کەس بوونە.

(٦٨) بڕوانە: فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفی، المصدر السابق، ص ص٤٨-٤٩.

(٦٩) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٦.

(70) E.B. Soane، Op.cit، P.348.(في نسخته المترجمة الی العربیة: الجزء الثاني، ص١١١)

(٧١) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٨.

(٧٢) عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق أو خاطرات الحسني، ص ص١٥١-١٥٢.

(٧٣) پردی بەردین لە ساڵی (١٩٥٤) ڕووخێنراو لە نزیك ئەو پردێکی نوێ دروستکرا. مراسل، في کرکوك: اعمار وتجدید، "اهل النفط"(مجلة)، العدد (٧١)، کرکوك، ایلول ١٩٥٧، ص٤٤.

(74) J. S. Buckingham، Op.cit، P.116.(في نسخته المترجمة الی العربیة: الجزء الاول، ص١٤٣)

(*) واتە خانووەکان بەپێی لێکۆڵینەوەو حیساباتی‌ورد نەخشەکێش کراون، کە لە ڕووی شکڵەوە دووریەکی ڕێكوپێکیان هەیە (منتظمة الابعاد)و لایەنەکانی شارەوانی سەرپەرشتی دەستنیشانکردنی مەوقیعیان کردووە. بە دەگمەن لەو خانووە نوێیانەش هەڵکەوتووە حەوشەکەی لە ناوەڕاستی خانووەکەدا بێت، بە پێچەوانەی خانووە کۆنەکان. ئەو پەنجەرانەی دەکەونە ڕووی پێشەوەی خانووە نوێیەکان گەورەو فراوانن و هەروا باخچەو گەراجی ئۆتۆمبێل و سیاجیان هەیەو دەرگای خانووەکانیشیان نزمە.

(٧٥) وجدي انور مردان، من دفاتر ایام زمان (زیارة جدیدة لمدینة کرکوك القدیمة)،

http://www.alturkmani.com/makalaat/)(mindafater3.htm

(٧٦) علاءالدین سجادی، گەشتێك لە کوردستانا، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٥٦، ل٧٧.

(٧٧) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص ص٢٥٠-٢٥١.

(٧٨) سمکۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی)، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.

(٧٩) نجاة كوثر، بحث حول اسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٠) (جەمال بابان) تەنها بە ڕستەیەك دەربارەی گەرەكی بەگلەر دوواوە، بەوەی ناوەکە وشەیەکی تورکییەو مانای شوێنی یان گەرەکی (بەگ) یان (بەگەکان) دەبەخشێت. اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٨١) نجاة كوثر، بحث حول اسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٢) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١.

(٨٣) عصمت حسن رفيق صاري كهية، آل صاري كهية في كركوك، "الاخاء" (مجلة)، العدد (٨٧)، بغداد، ١٩٨٩، ص ص٢٥-٢٦.

(٨٤) نجاة كوثر، بحث حول اسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٥) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠. هەندێك پێیانوایە ناوەکە زۆر کۆنترەو بنەرەتەکەی بریتییە لە: (حاشا). بڕوانە: روفائيل ميناس، كركوك و محلة خاصة، "الاخاء"(مجلة)، العددان (٧-٨)، بغداد، ١٩٨١، ص٢١.

(٨٦) اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٨٧) فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص٥٣.

(٨٨) دەربارەیان، بڕوانە: جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠؛ نائل حنون، اربيل ونينوى وكركوك مدن آشورية، "بين النهرين" (مجلة)، العددان (٩١-٩٢)، بغداد، ١٩٨٥، ص١٦١؛ سالم محمد تسنلي، تسعين، "صوت الاتحاد" (مجلة)، العدد (٤)، بغداد، كانون الثاني ١٩٧٢، ص٨.

(*) لە ساڵانی دواتردا بووە گەڕەکێکی سەربەخۆ بەنێوی گەرەکی مەحەتە.

(٨٩) نجاة كوثر، بحث حول اسماء الاماكن، ص ص١٤٩-١٥٠.

(٩٠) علي ناصر حسين، تاريخ السكك الحديد في العراق (١٩١٤-١٩٥٨)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٧، ص٣٥.

(٩١) بڕوانە: سمكۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی)، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و بەڕێوەبەرییەکانی پارێزگای کەرکوك، ل٧٥.

(٩٢) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص١٥٤.

(٩٣) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە،بەپێی ئامارەکان، دەرکەوت (٦٢٧٦) کەس لە دانیشتووانی گەڕەکەکانی قۆریە لەژێر هیچ جۆرە چەشنێکی نیشتەجێبووندا تۆمار نەکراون. وا پێدەچێت لەنێو باڵەخانە حکومییەکان و دەزگا ئەهلییەکان ژیانیان گوزەراند بێت. بۆیە لە کاتی کۆکردنەوەی ژمارەکانی خشتەکە ناگەینە ئەنجامێکی دروست و دەقاودەق.

(٩٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، الجدول الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩.

(٩٥) دەربارەی هەموارکردنەوەی جیاووك و هاوپشکیی نێوان عێراق و کۆمپانیای نەوتی عێراق لە داهاتەکانی نەوتی کەرکوك، بڕوانە: نوري عبدالحميد خليل، التاريخ السياسي لامتيازات النفط في العراق، (١٩٢٥-١٩٥٢)، بغداد، ١٩٨٠، ص ص٣٣٧-٤١٧.

(٩٦) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص ص١٥٢-١٥٤.

(٩٧) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨-١٠٩.

(*) ئەم ژمارانە بەدەر لە کۆی ژمارەی باڵەخانەی قوتابخانەکان، کە ژمارەیان لە بەشی قەڵا (١)، بەشی بەرقەڵا (٦)، بەشی قۆریە (٥٢) قوتابخانەیە، واتە هەموویان بەسەر یەکەوە (٥٩) باڵەخانە بوونە لە شاری کەرکوك.

(*) زانستێکە گرنگی بە لێکۆڵینەوەی بونیەی ئاسۆیی شار (واتە لێکۆڵینەوەی سیستەمی شەقام و گۆڕەپان و باڵەخانەکان) و بونیەی شاوڵیشار (واتە زانینی تەمەن و بەرزیی و چۆنیەتی کەرەستە بیناسازییە بەکارهاتووەکانی باڵەخانەکان و شێوەکانی ئەو باڵەخانانەو..هتد) دەدات. خالص حسني الاشعب و صباح محمود محمد، مورفولوجية المدينة، مطبعة جامعة بغداد، بغداد، ١٩٨٣.

(٩٨) لەم بارەوە، بڕوانە: هاشم خضر الجنابي، المصدر السابق، ص ص٥٨-٦١.

(٩٩) هەمان دیاردە لە شاری هەولێریشدا هەبووە. بڕوانە: صلاح حميد الجنابي، التركيب الداخلي لمدينة اربيل (دراسة مقارنة في جغرافية المدن)، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، العدد (١١)، بغداد، ١٩٨٠، ص٣١٩.

(١٠٠) بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: زين العابدين علي صفر، النقل في مدينة كركوك (دراسة حضرية-كارتوكرافية)، رسالة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب/ جامعة بغداد، ١٩٩٦.

(١٠١) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، متصرفية لواء كركوك،

قلم التحريرات، العدد (٧٣٠٣)، الموضوع: امور بلدية كركوك، (١٩٣٩/١/١٥)؛ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، متصرفية لواء كركوك، قلم التحريرات، العدد (٧٨٧٥)، الموضوع: التقرير عن تفتيش بلدية كركوك و لجنة اسالة الماء و الكهرباء في كركوك، (١٩٣٩/٦/٥).

(١٠٢) وجدي انور مردان، المصدر السابق.

(١٠٣) زۆربەی زانیارییەکان لە بارەی شەقامە کۆنەکانی شاری کەرکوك لەم سەرچاوانە وەرگیراون: عبدالمجيد فهمي حسن، دليل مشاهير الألوية العراقية، الجزء الثاني (لواء كركوك)، مطبعة دجلة، بغداد، ١٩٤٧، ص ص١٠١-١٠٣؛ فهمي عرب اغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، صفحات متعددة.

(*) فەرمانگەکانی شارەوانی کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتیدا بریتیبوونە لە چوار بەشی جیا، ئەم بەشەی باسکراوە بەشی چوارەم بووە. بڕوانە: عبدالمجيد فهمي حسن، المصدر السابق، ص ص١٠٢-١٠٣.

(*) لە سەرەتای شەستەکاندا نازناوی (شەقامی تکساس)ی بەسەردا برا.

(١٠٤) عبدالرزاق الحسني، موجز تاريخ البلدان العراقية، المصدر السابق، ص١٨٧؛ علاءالدين سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

(١٠٥) هەتا کۆتاییهاتنی ڕۆژگاری پاشایەتی لە عێراقدا، مەسلەحەی گواستنەوەی سەرنشینی (مصلحه نقل الركاب) لە کەرکوکدا بوونی نەبوو، کە لانیکەم لە ئەنجامی ئەو گەشەسەندنو بەرفراوانبوونەی شاردا پێویستی بە (٣٠) دانە پاس هەبوو. لە کۆتاییەکانی ئەو ڕۆژگارە هەوڵدرا کارێك لەو بارەوە بکرێت، بەڵام بێ ئاکام بوو شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی بەسەردا هات.

(١٠٦) فاضل العزاوي، الروح الحية (جيل الستينات في العراق)، الطبعة الثانية، دار المدى للثقافة والنشر، دمشق، ٢٠٠٣، ص٢٧٩.

(١٠٧) قیرتاوەکە لە جۆری قیرتاوەکانی ئەمڕۆ نەبوو، بەڵکو بریتیبوو لە داپۆشینی شەقامەکە بە نەوتی ڕەش (جەفت). کۆمپانیای نەوت بە هەمان شێوە لە یاریگای (ستادیۆم) کەرکوکیشدا نەوتی ڕەشی بەکارهێنا تاوەکو تەپوتۆزی نەمێنێ.

(١٠٨) بێ هۆ نەبووە شاری کەرکوك لە ساڵی (١٩١٢)دا، (١٣٨٢) (دوکانو موغازە)ی تێدا هەبووە. موصل ولايتى سالنامه رسميسيدر، موصل ولايتى مطبعه سى - (١٣٣٠هجرى/ ١٩١٢ميلادى)، ص٢٤٥.

(١٠٩) بەپێی زانیاریی ڕاپۆرتێکی کارگێڕیی بریتانی، تەنها ژمارەی (دوکان)ەکانی کەرکوك ساڵی (١٩١٩) دوو هێندەی ژمارەی ساڵی پێشووی زیادی کردووەو گەیشتووەتە (١٤٠٠) دوکان. بڕوانە: ڕاپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکوك (ماوەی ١ی کانوونی دووەم تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩)، وەرگێڕانی: سەربەست کەرکوکی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣١.

(110) C.J. Edmonds، Kurds، Turks، And Arabs: Politics، Travel and Research in North- Eastern Iraq (1919-1925)، Oxford University Press، London، 1957، P.278.

(لە وەرگێڕانە کوردییەکە، ل٣٣٨)

(١١١) عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

(١١٢) مێژووی وردی بنیاتنانی قەیسەریی کەرکوك جێی مشتومڕە، هەندێك ساڵی (١٨٠٠)و هی دی ساڵی (١٨٥٥) بە ساڵی بنیاتنانی دادەنێن. بڕوانە: سالمة العبيدي، كركوك مدينة الاخوة والاصالة، "ميزوبوتاميا" (مجلة)، العدد (١٢)، بغداد، ٢٠٠٨، ص٧٠؛ القيصريات التاريخية في كركوك، (www.alturkmani.com/makalaat/2010/12082010/3.htm).

(*) لە شارەکانی دیکەی عێراق بە هەمان چەشنی کەرکوك بازاڕی لەو چەشنە دروستکراوە. بۆ نموونە لە موسڵو لە هەولێر بازاڕی لەم چەشنە دروستکراون. بڕوانە: ئاراس ئیسماعیل خدر، بازاڕی قەیسەریی شاری هەولێر، لە: ئینسکلۆپیدیای هەولێر، بەرگی چوارەم، ل٢١٩٦.

(١١٣) نجات كوثر اوغلو، صفحات من تاريخ كركوك منذ فجر التاريخ الى ١٩٥٨، كركوك، ٢٠٠٩، ص٣٢١.

(١١٤) نصرت مردان، حمامة التاريخ بين قشلة كركوك وسوق القيصرية، http://turkmentribune.com/Kerkuk/30.html.

(١١٥) بڕوانە: عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١-١١٢.

(١١٦) بڕوانە: ماهر النقيب، المصدر السابق، ص٩٨. عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١-١١٢

(117) C.J. Edmonds، Op.cit، P.285.(لە وەرگێڕانە کوردییەکەدا، ل٣٤٦)

(١١٨) بڕوانە: وجدي انور مردان، المصدر السابق.

(١١٩) وجدي انور مردان، المصدر نفسه.

(١٢٠) مراسل، في كركوك: اعمار وتجديد، "اهل النفط" (مجلة)، العدد (٧١)، كركوك، ايلول ١٩٥٧، ص٤٥.

(١٢١) فهمي عرب اغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص٤٥.

(١٢٢) سەبارەت بە بازاڕە میللییەکانی شاری کەرکوك، بڕوانە: شفيق ابراهيم الجبوري، الاسواق الشعبية في كركوك، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٩٤.

(١٢٣) شاكر صابر ضابط، كركوكده اجتماعي حيات (فولكلور)، زمان باصم ئەوی، بغداد، ١٩٦١، ص١٢٢.

(*) خان: ئەو شوێنو باڵەخانەیە کە لە ڕۆژگاری خۆیدا گوزارشتی لە میوانخانەکانی ئەمڕۆ دەکرد، دیوارەکانی بە قوڕی سپی (گەچ) سواغ دەدراو میچو سەربانەکانیشیان بە قوڕو دیرەگ گیراوە. خانەکان تا شەستەکانی سەدەی بیستەم لە کەرکوکدا خەڵکی ڕوویان تێکردووە.

(١٢٤) لە ڕۆژگاری کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانیدا شاری کەرکوک (١٢) خانی تێدا هەبووە. بڕوانە: موصل ولایتی سالنامەسی، مكتوبی ولايت سعادتلو حسين توفيق افندی معرفتيله ترتيب اولنمشدر، موصل ولايت مطبعه سی، (١٣٠٨هجری/ ١٨٩٠میلادی)، ص١٣٩.

(١٢٥) عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٨-٩٩.

(١٢٦) ماهر النقيب، المصدر السابق، ص ص٢٦٦-٢٦٧؛ عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

(١٢٧) لە ئاكامی زاڵبوونی كلتورو زمانی توركی بەسەر بازاڕی شاردا ناوەكان بەم شێوانە ناسراون. دەربارەی خانەكان بڕوانە: ماهر النقيب، المصدر السابق، ص٢٦٦؛ گولەر سیامەنسووری، کەرکوك شاری ئاگری هەمیشەیی، "هاواری کەرکوك" (گۆڤار)، ژمارە (٢)، هەولێر، کانوونی یەکەمی ١٩٩٨، ل٤٦؛نصرت مردان، حمامة التاريخ؛هذه هي كركوك (تأريخ المدينة من الف الى ياء)،
http://www.aslanarlyuvasi.com/vb/.showthread.php?t=1274

(١٢٨) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، وزارة الطيران ٤١٢/٢٣، رقم الوثيقة: اكس/ام ٤٥٨٣، (٧٣) سري، من المفوضية البريطانية في طهران الى مقر قيادة القوة الجوية ببغداد، (٢٢/ ايلول/ ١٩٢٧). (نسخة مصورة ومترجمة عن الارشيف الوطني البريطاني).

(١٢٩) علاءالدين سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦.

(١٣٠) لەنێو ڕۆشنبیرە کوردو تورکمانەکان لەسەر ناولێنان لەو میوانخانەیە مشتومڕ کەتووەتەوە، کوردەکان داخواز بوونە ناوی (فندق سیروان)ی لێبنرێت، بەڵام تورکمانەکان ڕازی نەبوونە. وجدي انور مردان، المصدر السابق.

(١٣١) عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

(١٣٢) بە گوێرەی زانیارییەکانی ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵو قاموسی ئەعلام، شاری کەرکوك لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا خاوەنی (٨) گەرماوی گشتی بووە. بڕوانە: موصل ولایتی سالنامەسی، (١٣٠٨هجری/١٨٩٠میلادی)، ص١٣٩؛ش.سامی، قاموس الاعلام، بشنجی جلد، مهران مطبعه سی، استانبول، ١٣١٤هـ، ص٣٨٤٦. کەچی ئەم ژمارەیە ساڵی (١٩١٢) بووە بە (١٤) گەرماو. موصل ولايتی سالنامه رسمیسیدر، موصل ولايتی مطبعه سی - (١٣٣٠هجری/ ١٩١٢میلادی)، ص٢٤٥.

(١٣٣) فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص٥٥.

(١٣٤) گولەر سیامەنسووری، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.

(١٣٥) دەربارەیان بڕوانە: ماهر النقيب، المصدر السابق، ص٢٦٧-٢٦٨؛ عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

(١٣٦) سالمة العبيدي، المصدر السابق، ص٧١.

(١٣٧) مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، کەرکوك ناوی مێژووی کۆنی - دانیشتووانی - دەسەڵاتەکانی، کەرکوك، ٢٠٠٦، ل٦٣.

*** پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتووانی کەرکوک لە ماوەی سەدەیەک (لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە تاوەکو سالی ١٩٥٧):**

**د.جەبار قادر**

لەمیانەی مێژووی دوورو درێژی خۆیدا، شاری کەرکوک ڕووبەڕووی چەندین هەلمەتی داگیرکاری ئەو زلهێزانەی جیهانو ئیمپراتۆرییەتانە بووەتەوە کە بە بەردەوام ویستویانە کۆنترۆلی ئەم شارەو ناوچەکانی دەورووبەری بکەنو بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، بەوپێیەی کەرکوک دەکەوێتە سەر ڕێگەیەکی ستراتیژی کە کەناراوەکانی دەریای ڕەش بە کەنداو. هەروەک ڕێگەی ئاوریشمو ئاسیای ناوەڕاستو وولاتی چین-یش پێکەوە دەبەستێتەوە.

هەر بۆیە ئەو زلهێزانە هەلساون بەدروستکردنی قەلاو پێگەی سەربازی بەدرێژایی ئەو ڕێگایە لەپێناو پارێزگاریکردن لە کاروانە بازرگانییەکانیانو هێلە سەربازییەکانو لەو پێناوەشدا سەربازگەو بنکەی سەربازییان بۆ بەرگری کردن لەخۆیانو ئەنجامدانی ئۆپێراسیۆنی سەربازی لەدژی گەلانی ناوچە شاخاوییەکان دامەزراندووە.

هەروەک ئەو زلهێزانە هەر لە زووەوە درکیان بە گرنگیی و پڕبایەخی پێگەی ستراتیژی کەرکوکو دەورووبەری کردووە. بەو هۆیەشەوە زۆرێک لەو زلهێزانە هەولیانداوە کەسانو هاوولاتیانی خۆیان لەم ناوچانە نیشتەجێ بکەن بەتایبەت لەسەدەکانی ئەم دواییەی چەرخی نوێدا، هەلبەتە هەر ئەوەشە وایکردووە فرەییەکو هەمەچەشنییەک لە پێکهاتەی دانیشتووانی ناوچەی کەرکوکو دەورووبەری بێتە کایەوە.

ئاشکرایە کەوا کەرکوک لە ڕووی سنووری جوگرافیاو مێژووەوە بەردەوام بەشێک بووە لە کوردستان. لە سەدەکانی ئەم دواییەشدا بەشێک بووە لە ئەماراتی ئەردەلان کە ئەماراتێکی کوردییە.

لە سالی (١٥٨٣)ی زایینی سولتان (مورادی سێیەم) میری موکریان ڕاسپێردرا فەرمانڕەوایی ویلایەتی شارەزور بکات کە کەرکوک بەشێک بووە لێی. هەروەک هەولێرو سلێمانیش بەشێک بوون لەو ویلایەتە.

لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمیشدا کەرکوک بوو بە بەشێک لە ئیمارەتی بابان کە جێگرەوەی ئیمارەتی ئەردەلان بوو لەو ناوچەیەی ئەمڕۆ بە کوردستانی باشوور یا خود کوردستانی عێراق ناسراوەو لەسەردەمی زێڕینی خۆشیدا ئیمارەتی بابان هەریەک لە قەلاچوالانو کەرکوکو هەولێرو کۆیەو ڕەواندزو حەریرو بانەو کفریو قەرەتەپەو مەندەلیو بەدرەو داودەو عەسکەرو شوانو چەمچەمالو قەرەداغ تاوەکو ڕووباری دیالەو سەردەشتو مەرگەو پشدەرو ماوەتو ئالانو گەلالەو چوارتاو سیوەیلو شینک قزلجەو قەرە حەسەنو قەسر شیرینو زەهاوی لەخۆگرتووە بەشێوەیەک فراوان بووە تا ئەو ڕادەیەی کە (بلۆنگریک) بە ئیمپراتۆریەت ناوی بردووە[1].

تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم هیچ ئاماژەیەک بەرچاو نەکەوتووە کە کەرکوک سەر بە دەولەتی عوسمانی بوبێت. بەلام بەپێی ڕێکەوتنامەی ئۆماسیا لەنێوان عوسمانییەکانو سەفەوییەکان لە سالی (١٥٥٥)ی زایینی کەرکوک بەشێوەیەکی فەرمی بوو بە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.

هەرچی خێلە تورکمانییە قزلباشیەکانە کەوا لەگەل هەلمەتەکەی شا عەباسی سەفەوی لە سالی (١٦٢٣-١٦٣٠)ی زایینی هاتوون بۆ ناوچەکە بەتایبەت لە هەلمەتەکانی نادر شای ئەفشاری لە سالەکانی (١٧٤٣-١٧٤٦)ی زایینی بۆ سەر کەرکوکو هەولێرو موسل کە بەهۆیەوە ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوکیان وەکو لەوەڕ بۆ مەڕومالاتەکانیان بەکار دەهێنا نەبێت کەوا دژایەتی دەولەتی عوسمانییان دەکردو لایەنگری ئێرانیان دەکرد لە ململانێی نێوان ئەو دوو زلهێزەدا دیارە ئەویش بەهۆی هۆکاری مەزهەبیو ئایینیو کۆمەلایەتییەوە.

لەگەل ڕووخانی دوایین ئیمارەتی کوردی لە کوردستان لەسەردەمی دەولەتی عوسمانی کە ئیمارەتی بابان بوو لە سالی (١٨٥١)ی زایینی، دیارە ئەویش بەهۆی سیاسەتی نوێی (باب العالي) لە کوردستان. دیارە ئەویش بەهۆی دەستبەرداربونی دەولەتی عوسمانییەوە لەسیاسەتی پەیڕەوکراوی خۆی بوو لە کوردستان. لە ئاکامدا کاروبار کەوتە دەستی سەرکردە خێلەکییەکانی ناوچەکە لەبەرانبەر پابەندبونیان بە دەسەلاتەکانی سولتانی عوسمانی لەوانە ناوهێنانی سولتان لە نوێژی هەینیو ڕەوانەکردنی سەرباز بۆ شەرکردن لەبەرژەوەندی عوسمانییەکانو ناردنی دیاریو باجی سالانە بۆ سولتانی عوسمانی، لەبەرانبەر هەموو ئەوانە سیاسەتی نوێ پەیڕەوکرا کە بەهۆیەوە توانرا کۆنترۆلی ڕاستەوخۆی هەموو ئەو ناوچانە بکرێت کە لەژێر ڕکێفی عوسمانییەکاندا بوو.

هەرچی ڕووخانی ئیمارەتی بابانیشە دەرگای والا کرد لەبەردەوم کۆنترۆلی ڕاستەوخۆی دەولەتی عوسمانی بەسەر کەرکوکو ناوچەکانی دیکە. بەلام لەگەل ئەوەشدا بەعوسمانیکردنی دانیشتووانانی کوردستان بە کەرکوکیشەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بەشێوەیەکی بەرچاو نەبوو.

بەلگەش بۆ ئەو کارە ئەوەیە زۆربەی ئەو ئامارانەی لەبەردەستدان تایبەت بە پێکهاتەی نەتەوەیی بەو سەردەمە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کەوا کورد پێکهاتەی سەرەکیو ڕەسەن بوونو هەندێک خێزانی مەسیحی کلدانیو ئەرمەنو ژمارەیەک جولەکەش هەبوون[2].

ئەو بەلگەنامە مێژووییانەی لەبەردەستدان زانیاری پێویستیان تێدانییە سەبارەت بە پێکهاتەی نەتەوەیی شاری کەرکوک ئەو ناوچانەی دەوربەری کە دەکەونە سەر ئەو هێلەی دەکەوێتە سەر ئەو ڕێگایە. بەلام لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەم بەدواوە هەندێک ئامارەی جیاجیاما بەرچاو دەکەوێت لەهەندێک سەرچاوە سەبارەت بە پێکهاتەی ئیتنیکی کەرکوک، بۆیە لێرەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ناکرێت پشت بەو ئامارو بەلگانە ببەستین چونکە تەنیا مەزەندەو خەملاندنە بۆ چەند کەسانێک تەنیا چەند ڕۆژێکیان لێرە یان

هەر شارێکی دیکە بەسەر بردووە.

هەروەک ناکرێت پەنا بۆ ئەو ژمارانەش ببرێت کە بۆ سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧)ی زایینی دەگەڕێتەوە بەو پێیەی ووردو بابەتی نییە. هاوکات سەرجەم سەرژمێرییە حکومیانەی دیکەش سەختەو شێواندنی راستییەکانی بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراوی تێدایە سەبارەت بە پێکهاتەی نەتەوەکانی شاری کەرکوک.

لەو بارەیەوە (عەلائەدین سوجادی) مێژوونووس دەڵێت: "حکومەتی عێراق لە رۆژی (١٩)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٧) داوای لە دانیشتووان کرد لەماڵەکانی خۆیان بمێننەوە بەمەبەستی ئەنجامدانی سەرژمێری".

سوجادی ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە وێرای مانەوەی دانیشتووان لە ماڵەوەو دەرنەچوونە دەرەوە هیچ کەس و فەرمانبەرێك نەهات بۆ ئەوەی ناوی تۆمار بکات.

هەر بۆیە دەپرسێت و ماف خۆشیەتی بپرسێت ئەگەر لە بەغدای پایتەخت ئەو کارە ئەنجام درابێت چ جای گوندەکان ناوچە خێڵنشینەکانی کۆچبەران. تەئکیدیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کاتێك بەدواداچون کرا بۆ ئەو دیاردەیە دەرکەوت کە زیاتر لە نیو ملیۆن لەو سەرژمێرییەدا ناونووس نەکراون[٣]. رەنگە لەگەڵ ئەو ژمارەیەدا هاورا نەبین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەو سەرژمێرییانەی لە عێراق و وڵاتانی ناوچەکە ئەنجام دەدرێت.

رەنگە کۆنترین ئاماژە لەم بوارەدا ئەوە بێت کە (یوسیب چیرنیك) ئەندازیاری روسیایی نوسیبێتی کە لە ساڵەکانی (١٨٧٢-١٨٧٣)ی زایینی بەمەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوەیەك سەبارەت بە گەشت لە روبارەکانی دیجلەو فورات وسەردانی کەرکوکی کردووە. دواتریش دەرەنجامەکانی توێژینەوەکەی لە ساڵی (١٨٧٩)ی زایینی لە بەرگی شەشەم بلاوکراوەی کۆمەڵەی جوگرافیای قەفقاسی روسیایی بلاوکردەوە. لەو توێژینەوەیەدا (چیرنیك) ژمارەی دانیشتووانی کەرکوکی بە (١٢-١٥) هەزار کەس خەمڵاندو جەختیشیکردەوە لەسەر ئەوەی جگە لە (٤٠) خێزانی ئەرمەنی کە لەشارەکەدا دەژیان، تێکرای دانیشتووانی شاری کەرکوك کوردن[٤].

دیارە تاوەکو سەردانەکەی چیرنیك بۆ کەرکوك پێشتر سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ فەرمانبەرە تورکەکان لە سەربازگەی عوسمانییەکان لەو شارە نەکردبوو وەکو بەشێك لەدانیشتووانی شارەکە. بەڵکە بە نامۆو غەریب وەسفیان کردبوون بەتایبەت لە قۆناغە سەرەتاییەکانی لەبوونی عوسمانییەکان لەو شارە. چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دوای تەواوبونی ئەرکەکانیان دەگەڕانەوە بۆ ئەو وڵاتانەی لێوەی هاتبوون. تەنیا چەند کەسانێك نەبێت دەمانەوەو نەدەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان دیارە ئەویش بەهۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی. هەڵبەتە هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە ئەو ئەندازیارە روسیاییە ئاماژەی بە بوونی تورك یاخود تورکمان لەشارەکە نەکردووە.

هەروەک رەنگە هەموو مەسیحییەکانی دانیشتووی شارەکەشی بە ئەرمەن لەقەڵەمدابێت بەو پێیەی نەیتوانیوە لێکیان جیا بکاتەوە چونکە روسەکان زیاتر بە ئەرمەن ئاشنابوون وەك بە مەسیحی و ئاسوری و ئەوانی تر.

هاوکات لەگەڵ رووخانی ئیمارەتی بابان و کۆنترۆڵی راستەوخۆی (باب ئەلعالی) بەسەر شاری کەرکوك و ئەو شارۆچکانەی دەکەونە سەر رێگای ستراتیژی ناوبراودا، دیاردەی بەعوسمانیبوون لە کەرکوك دەرکەوت.

دوای دوو دەیەش لەسەردانەکەی (چیرنیك) گۆڕانکاری لە پێکهاتەی ئیتنیکی شاری کەرکوك دەرکەوت لە بەرژەوەندی تورك و تورکمانەکان، لەو بارەیەشەوە شەمسەدین سامی لە بەرگی پێنجەمی (قاموس الاعلام) کە بە ئەنسکلۆپیدیایەکی مێژوویی و جوگرافیایی عوسمانی ئەژمار دەکرێت سەبارەت بە کەرکوك هاتووە: "شارێکە دەکەوێتە (١٦٠) کیلۆمەتری باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی موسڵ لە کوردستان، لە ناوچەیەکی گردەڵانی لە شێوەکانی سەنتەری سەنجەقی شارەزور. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی٣٠ هەزار کەسەو ٣ چارەکی دانیشتووانەکەی کوردن و چارەکەکەی دیکەشی پێکهاتووە لە تورك و عەرەب و ئەوانی دیکە، لەگەڵ ٧٦٠ جوولەکەو ٤٦٠ کلدانی"[٥].

رەوشی بەعوسمانیکردن (بەتورککردن) لە دوو دەیەی دواتردا و بەتایبەت لەسەردەمی یەکێتییەکاندا ( الاتحادیین) بەشێوەیەکی خێراتر بووەو سیاسەتێکی شۆفینی لەلایەن ئیمپراتۆریەتی تورکی عوسمانییەوە دەرهەق بەگەلانی ناوچەکەی غەیرە تورك پەیرەوکرا.

لەو بارەیەشەوە گەرۆك و نووسەرە ئینگلیزییەکان لەو ژمارانەی خستویانەتە روو کۆك نین، هەرچی (مێجەرسۆن)ە ساڵی (١٩٠٧)ی زایینی کە (١٦) رۆژی لە یەکێك لەخانەکانی ناو شارەکەدا ماوەتەوەو سەبارەت بەشاری کەرکوك دەڵێت: "ژمارەی دانیشتووانی شارەکە لانی کەم (١٥) هەزار کەس دەبن. ئەم شارە دەکەوێتە سەر سنووری کوردستان و دانیشتووانەکەی بەهەر سێ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکمانی قسە دەکەن، هەروەك ئەرمەن و جولەکەو کلدان و سریانیشی تێدایە".

هەروەها ئاماژە بەهەبوونی گیانی لێبوردەیی نێوان دانیشتووانی شارەکە دەکات و دەشڵێت ئازادییەکی بەربڵاوی ئایینی و نەتەوەیی بەرچاو دەکەوێت، پێیشوایە زمانی تورکمانی تێیدا بڵاوەو شارەکە بە نەوتەکەی و میوە بەناوبانگە[٦].

لای خۆشیەوە (محەمەد ئەمین زەکی) بە شێوەیەکی بابەتییانە باس لەبۆچوونەکانی (مێجەرسۆن) دەکات و دەڵێت کە ناوبراو چەندین هەڵەی بەرچاوی کردووە وەکو ئەوەی هەر کەسێك بە تورکمانی قسەی کردبێت ئەو بە تورکمانی زانیوە، کەچی هەرچی کوردو کلدانی شاری کەرکوك هەیە بە تورکمانی دەتوانن قسە بکەن. دیارە ئەویش بەهۆی ئەوەی زمانی رەسمی و فەرمی ئەو کاتی وڵات تورکی بووە، بۆیە زمانی ئیدارەو پەروەردەو بازار تورکی بووە[٧].

بەبۆچوونی (زەکی) بەهێزترین بەڵگە بۆ بەهەڵەداچوونی (مێجەرسۆن) بریتییە لە راپرسییەکەی ساڵی (١٩٣٠)ی زایینی بووە کەلەلایەن شارەوانی کەرکوکەوە ئەنجامدراوە

که تێیدا ژمارەی دانیشتووانی کەرکوک بە (٣٥) هەزار کەس دانراوەو ژمارەی کوردیش تێیدا نزیکەی (٢٢) هەزار کەس و تورکمان (٧٠٠٠)و (١٠٠٠) مەسیحی و (٢٥٠٠) جولەکەو (٥٠٠) ئەرمەنی بووە. هەرچی دانیشتووانی گەڕەکەکانی ئیمام قاسم و بولاق و ئاوچی پریادییە کورد بوون و بەشی هەرەزۆری شارەکەیان پێکهێناوەو زۆرینەی گەڕەکەکانی چقورو موسەللاو چای بوون(٨).

ویڕای پەسەندکردنی بۆچوونەکانی محەمەد ئەمین زەکی سەبارەت بەو بیروبۆچوونانەی (مێجەرسۆن) لە کۆتایی دەیەمی یەکەمی سەدەی بیست، کەچی بالادەستی زمانی تورکی لەناوەڕاستی شاری کەرکوک و بازارەکانیدا بەو شێوەیەی (مێجەرسۆن) باسی لێوە دەکات و بۆچوونێکی هەڵەیەو ئاماژە بەو سیاسەتانە دەکات کەوا عوسمانییەکان لە شارەکەدا پەیڕەویان کردووە لەماوەی نیو سەدە لە حوکمرانی شارەکە کە وەکو بنکەی سەربازی تورکی مامەڵەیان لەگەڵ کردووەو خوێندنگاو فەرمانگەیان بەزمانی تورکی تێدا کردووەتەوەو فەرمانبەرانی تورک و خێزانەکانیان نیشتەجێکردووە.

هەر ئەو سیاسەتەشە کە بەتورککردنی دانیشتووانی خۆماڵی شارەکەی لێکەوتوەتەوە بەهۆی بەندبوونی بەرژەوەندی ئەو کەسانە بە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

لەو بارەیەوە (ئەدمۆندز) نوسیویەتی: "کەرکوک لە رووی سەربازییەوە شارێکی گرنگ بووەو حامیەیەکی سەربازی تێدا بووەو بەردەوام جەندرمەو فەرمانبەری مەدەنی جێمتمانەی بۆ حکومەتی عوسمانی دابین دەکرد". هەڵبەتە ئەوەیە هۆکاری سەرەکی پێکهاتەی رەگەزپەرستی و زمانەوانی لەو شارەدا. ئەوەشە وایکردووە هەرچی خێزانە ئەرستۆکراتەکانی شارەکەش چ کورد بن یان تورک هەر بەتورکی قسەیان کردووە.

لەو بارەیەوە (جۆرجی ئەلبیرت مینیتاشفیلی) خۆرهەڵاتناس لەو بارەیەوە دەڵێت: "ژمارەیەك لە بنەماڵە دەسترۆیشتووەکانی کەرکوک هەر چەندە خۆیان بە نەفتچی و یەعقوبی و قیردارو ئەوانی دیکە ناودەبەن، بەڵام بە رەچەڵەك کوردن زۆربەیان لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە سەر عەشیرەتی زەنگەنەی کورد".

هەروەك زۆر جاران نوسەرانی ئینگلیز دەستەواژەی تورکیان بۆ فەرمانبەرە مەدەنییەکان و سەربازییەکان و ئەریستۆکراتەکانی کەرکوک بەکار هێناوە(٩).

لێرەشەوە جێی خۆیەتی ئاماژە بەو جیاوازییە گەورەیەی بۆچوونەکانی نوسەران بکەین سەبارەت بەژمارەی دانیشتووانی کەرکوک و پێکهاتەی نەتەوەییان بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم.

لەو رووەوە (های) ژمارەی دانیشتووانی شارەکەی بە (٣٠) هەزار کەس خەمڵاند. هەرچی (مارك سایکس)ە ژمارەی دانیشتووانی شارەکەی بە (٧٠) هەزار کە مەزەندە کرد بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم. کەچی لە راستیدا ژمارەی دانیشتووانی شارەکە تاوەکو کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم و گۆڕینی کەرکوک بۆ ناوەندێکی سەرەکی بەرهەمهێنانی نەوت تەنیا (٦٩) هەزار کەس بووە(١٠).

یەکەم پرۆسەی سەرژمێری دانیشتووان لە لیوای کەرکوک لەلایەن موتەسەرفییەی شاری کەرکوکەوە ئەنجامدرابێت،شارەوانی شارەکە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم ئەنجامدرا، (محەمەد ئەمین زەکی) لە یاداشتێکیدا بۆ مەلیك فەیسەڵ لە (٢٠)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٠) ئاماژەی پێکردووە. بە سەرژمێرییەکی نارێکوپێك وەسفیکردووە.

رێژەی دانیشتووانەکەشی بەم شێوەیە بووە: کورد (٥١٪)و تورکمان (٢١,٥٪)و عەرەب (٢٠٪)و ئەوانی دیکە (٧,٥٪)(١١).

هەرچی ئەدمۆندە لە ساڵی (١٩٢٢)ی زاینیی ئاماژەی بەوە کردووە کە ژمارەی دانیشتووانی شارەکە نزیکەی ٢٥ هەزار کەس بووەو نزیکەی چارەکی ئەو ژمارەیەش کوردن. ئەوانی دیکەش لە عەرەب و تورکمان و نەسرانییەکان پێکدێن(١٢).

هەرچی کوردیشە فراوانترین و زۆرینەی پێکهاتەی ئیتنیکی شارەکەن. گومان لەوەدا نییە کە ئەو ژمارانەی (ئەدمۆندز) باسی لێوە کردووە زۆر دوورن لە راستییەوە، رەنگە هۆکاری سەرەکی لە پشت کەمکردنەوەی رێژەی کورد لە شارەکە لەلایەن ئەدمۆندزەوە ئەوە بووبێت کە کورد لەو کاتەدا بەسەرۆکایەتی (شێخ مەحمودی حەفید) لەجەنگێکی سەختدا بووە لەدژی بەریتانیا لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی کە شاری کەرکوك دڵی ئەو وڵاتەیە بەو پێیەی ناوبراو نوێنەری داگیرکەری بەریتانیا بووە.

دیارە ئەو گۆڕانکارییە لە رێژەی دانیشتووانی شارەکە بەهۆی خواستی ئیمپریالیزمی بەریتانیا بووە. هەروەك ئاماژەیەکیشە بۆ هەوڵەکانی ئینگلیزەکان بۆ زیادکردنی ژمارەی دانیشتووان لەغەیرە کوردو بوار رەخساندنیشە بۆ فەرمانبەرە مەدەنییەکان و سەربازییەکانی عوسمانییەکان خۆیان و خێزانەکانیان بۆ ئەوەی لەشارەکەدا نیشتەجێ بین و راسپێردرێن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری و پەروەردەیی لە شارەکە.

هەرچی ئامارو ژمارە جیاوازەکانی لایەنە جیاکانە سەبارەت بە کێشەی موسڵ تیشك دەخاتە سەر پێکهاتەی دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ بە لیوای کەرکوکیشەوە. بەو پێیەش لایەنە پەیوەندیدارەکان سەبارەت بەو کێشەیە وەکو (تورکیاو بەریتانیاو عێراق) ژمارەو ئاماری جیایان سەبارەت بە پێکهاتەی ئیتنیکی دانیشتووانی ویلایەتەکە.

هەرچی ئینگلیزە لە راپۆرتەکانیاندا بۆ کۆمەڵەی نێودەوڵەتی ژمارەی دانیشتووانی کەرکوکی بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم بە (٤٥) هەزار کوردو (٣٥) هەزار تورك و (١٠) هەزار عەرەب و (٦٠٠) مەسیحی و (١٤٠٠) جولەکە خەمڵاند، بەو پێیەش تێکرای ژمارەی دانیشتووانی شارەکە دەکاتە (٩٢) هەزار کەس.

لایەنی تورکیش ژمارەی دانیشتووانی لیوای کەرکوکی

به (٩٧) هەزار کوردو (٧٩) هەزار تورك‌و (٨) هەزار عەرەب واتە کۆی دانیشتووان دەکاتە (١٨٤) هەزار کەس[١٣].

بەو پێیەش جیاوازییەکی یەکجار زۆر لەنێوان خەملاندنەکانی هەردوولادا هەیە. تورکیا کە بەر جەنگی جیهانی یەکەم‌و لەسەروبەندی جەنگیشدا فەرمانڕەوای کەرکوك بووە، دەکرێت ئاماری ووردی تایبەت ژمارەی دانیشتووانی کەرکوکی هەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت پشت بەو ئامارانەی تورکیا ببەسترێت، دیارە ئەوەش بەهۆی زیادکردنی یەکجار زۆری ژمارەی تورك لە هەموو ویلایەتی موسل بەگشتی‌و لیوای کەرکوك بەتایبەت. بۆ نموونە لە ئامارەکانیاندا هاتووە کە ژمارەی تورك لە شاری سلێمانی (٣٢٩٦٠) تورکمانە دیارە ئەوەش ناگونجێت لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە هەرگیز تورکیا جگە لەسەربازی تورك هیچ هاووڵاتییەکی تورکی لەو شارەدا نەبووە بەدرێژایی تەمەنی عوسمانییەکان.

لایەنەکانی عێراق‌و بەریتانیاش لای خۆیانەوە بەردەوام هەوڵیانداوە بە بەردەوامی ڕێژەی عەرەب لە ویلایەتی موسل زیاد بکەن، دیارە ئەویش بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆیان بسەلمێنن بە دوو بەرانبەری ئاماری ئینگلیز خەملاندووە.

هاوکات لە بەرژەوەندی هیچ لایەنێکدا نەبووە ڕێژەی کورد بەرز بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچار بوون دان بەوەدا بنێن کە کورد زۆرینەی ڕەهای پێکهاتەی ویلایەتەکەیە. بەپێی ئاماری بەریتانیا کورد (٤٥٤٧٢٠) کەس‌و تورکمان (٦٥٨٩٥) کەس‌و عەرەب (١٨٥٧٦٣) کەس‌و مەسیحییەکان (٦٢٢٢٥) کەس‌و جولەکە (١٦٨٦٥) کەس بوون، بەو پێیەش کۆی دانیشتوان خۆی لە (٧٨٥٤٦٤) کەس داوە. هەروەها ئامارەکەی بەریتانیا ئەو کۆچبەرانەشی لەخۆگرتبوو کە لە ویلایەتی موسلدا گەڕۆك بوون.

ئاماری تورکیای عوسمانیش ئاماژەی بە بوونی (٢٨١٨٣٠) کوردو (١٤٦٩٢٠) تورك‌و (٤٣٢١٠) عەرەب‌و (٣١) هەزار غەیرە م وسلمان کردووەو بەو پێیەش کۆی ئاماری دانیشتووانی ویلایەتەکە دەکاتە (٥٠٣) هەزار کەس، بەڵام لەو ئامارەدا هیچ ئاماژەیەك بۆ (١٧٠) هەزار کۆچبەری گەڕۆك نەکراوە.

لە بەرانبەریشدا بەریتانیا گومانی زۆری هەبووە لە ئاماری تورکەکانداو بە کۆن‌و بەسەرچووی لەقەڵەمداوە بەوپێیەی بەبۆچوونی ئینگلیزەکان پشتی بە داتا زانیارییەکانی سوپا بەستووە. هاوکات ژمارەی عەرەبیشیان بە (٧٥٪)ی کۆی دانیشتووانی شاری موسل لەقەڵەمداوەو هەرچی تورکیشە (٨٪)ی ئەو شارە.

هەرچی تورکەکانیشە جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەو کە ساڵەهایە حوکمڕانی ئەو وڵاتەیان کردووەو زۆر بە ووردی ئاگاداری هەموو شتێکی ویلایەتەکەن لە ڕووی بارودۆخ‌و ژمارەی دانیشتووان‌و هاوکات بەریتانیاشیان بە زیادەڕەوی تۆمەتبارکردووە بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی عەرەب.

هەروەك تورکەکان لە هەوڵی ئەوەشدابوون بوونی کورد لە ناوچەکە لە بەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن ئەویش لەڕێی ئەوەی کە کوردو تورکمان زۆرینەی ڕەهای ناوچەکە پێکدەهێنن کە دەگاتە (٨٥٪)ی کۆی دانیشتووانی ویلایەتی موسل.

هەروەك زۆربەی ئەوانەشیان کە بە عەرەبی قسەیان دەکرد بە تورك لە قەڵەم دەدا بە بیانووی ئەوەی تورکن‌و زمانی خۆیان لەبیر کردووە. هەروەها باسیان لەوەش دەکرد کە کوردو تورك لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ یەك ڕەگەز.

لەو کاتەشدا کە لایەنەکان ڕەخنەی توندیان لەئامارەکانی لایەنی بەرانبەری خۆیان دەگرت، نێردەی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی (عصبة الامم) گومانی لە ئامارەکانی هەموو لایەنە دژ بەیەکەکان هەبووەو ئامارەکانی تورك‌و ئینگلیزو حکومەتی عێراقیشی بە ناوورد لەقەڵەمداوە بەو پێیەی ئەو ڕێگەچارانەی گرتویانەتە بەر لە ئەنجامدانی ئامارەکاندا جێگەی گومان بووە.

چونکە تورکیا زیادەڕەوی کردووە لە ژمارەی تورکمان‌و بەریتانیاش پێیوایە کەوا تەنیا ڕێژەی (٨٪)ی دانیشتووان پێکدەهێنن‌و لە ئامارەکانی حکومەتی عێراقیشدا ڕێژەی (٥٪) یان پێکهێناوە. هاوکات ڕێژەی عەرەبیش جیاوازی زۆری تێدابووەو لە ئاماری تورکدا (٩٪)و لە ئاماری بەریتانیا (٢٤٪) و لە ئامارەکانی حکومەتی عێراقدا (٢١٪)یان پێکهێناوە. هەرچی کوردیشە لە ئامارەکاندا کەمتری جیاوازی بەخۆوە بینیووە هەبووەو بەپێی ئاماری تورکەکان (٥٦،١٪)و بەپێی ئاماری حکومەتی عێراق (٦٥،١٪)و بەریتانیاش (٥٧،٩٪)ی کۆی دانیشتووانی ویلایەتەکەی پێداوە[١٥].

*** دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ بە پێی نەتەوەکانیان:**

| نەتەوە | ئاماری تورك | ئاماری بەریتانیا | ئاماری عێراق |
| --- | --- | --- | --- |
| کورد | ٥٦،١ | ٥٧،٩ | ٦٥،١ |
| عەرەب | ٨،٦ | ٢٣،٧ | ٢٠،٩ |
| تورکمان | ٢٩،٢ | ٨،٤ | ٤،٨ |
| مەسیحی | ٦،١ | ٧،٩ | ٧،٧ |
| جولەکە | – | ٢،١ | ١،٥ |
| کۆ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

بەو پێیە لەم کێشەیەدا دەرکەوت کەوا هەموو پێکهاتەکانی کەرکوك، تەنیا کورد نەبێت، پشتیوانی خۆی هەبوو کە داکۆکی لێدەکرد. هاوکات چەندین شارو شارۆچکەی کوردیش سەرژمێری تێدا ئەنجام نەدرا، تەنانەت ئێزیدییەکانیش کە سەرجەم لایەنەکانی نزیك لە کێشەی ویلایەتی موسل کۆکن لەسەر کوردبوونیان، لەو ئامارانەداو ئامارەکانی داهاتوی حکومەتی عێراقدا لە کورد جیاکرانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئامارەکانی حکومەتی عێراق سەبارەت بە کەرکوك نزیك بووە لە ئامارەکانی بەریتانیا. لە ڕاپۆرتێکیشیدا کۆمەڵەی نەتەوەکانی جیهانی سەبارەت بە

سنووری نێوان تورکیاو عێراق دەڵێت لایەنی عێراقی ژمارەی دانیشتووانی کەرکوکی بۆ ساڵەکانی (١٩٢٢-١٩٢٤)ی زاینیی بە (١١١،٦٥٠) کەس خەملاندووە کە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشکراوە:

کورد (٤٢،٥٪)، عەرەب (٣١،٩٪)، تورکمان (٢٣،٤٪)، ئەوانی تر (٢،٢٪)[١٦].

سەبارەت بە ئاماری سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ کە ئێستا لەبەردەستدایە ئاماژە بە پێکهاتە نەتەوەییەکانی کەرکوك نەکراوە، بەڵکو تەنیا ئاماژە بە ئایین کراوە. لەو سۆنگەیەشەوە ئامارەکانی قەزای ناوەندی کەرکوك بەم شێوەیە بەرچاو دەکەوێت:

موسڵمانان (٥٨٦٥٤) کەس، مەسیحیان (٦٧١٥) کەس، جوو (٢٨٧٣) کەس، سابینە (٣٧) کەس، ئێزیدی (١) کەس، ئەوانی تر (٢٨). لە گوندەکانی قەزای کەرکوکیش (٢٣١٩٤) موسڵمان‌و (٨٦٢) مەسیحی‌و (٧٧) جولەکەو (٣) لەوانی تر[١٧].

لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)یشدا هاووڵاتیان لەشاری کەرکوك بەپێی قسەکردن بە زمانی دایك پۆلێنکراون. هەرچەندە ئەم سەرژمێرییە بەرێکوپێکترین سەرژمێری ئەژمار دەکرێت، بەڵام هەندێك کەموکوڕی تێدایە. بەر لە هەمو شتێك پەنابردن بۆزمانی دایك بۆساغکردنەوەی نەتەوەی هاووڵاتیان هەوڵێکە بۆخۆدزینەوە لە داننان بەناسنامەی نەتەوەیی کەمینەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە پێکهاتەی کورد. ئەمە وێڕای ئەوەی هەوڵێکیشە بۆ شێواندنی ڕاستییەکان لەبارەی پێکهاتەی هاووڵاتیان‌و ڕێگەخۆشکردنیشە بۆ ئەنجامدانی ساختەکاری بەشێوەیەکی بەرفراوان چونکە سەرژمێری لەسەر بنەمای زمانی دایك زۆربەی جار یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئینتیمای نەتەوەیی. چونکە ڕەنگە کەسانێك هەبن لە ناو نەتەوەکانی دیکەدا ژیابن زمانی ئەو نەتەوانە باشتر لە زمانی دایکی خۆیان قسە بکەن‌و دیارە ئەوەش مانای ئەوە نییە ئەو کەسانە نەتەوەی خۆیان گۆڕیبێت.

بەو پێیەش باڵادەستی زمانی تورکی لەو سەردەمەدا لە بازاڕو فەرمانگەکانی کەرکوکدا لەگەڵ ڕاستی ژمارەی تورکماندا لە کەرکوك یەکناگرێتەوە. هەر بۆیەش ئەنجامدانی ڕاپرسی ساختەکارییەکی زۆری لە گەڕەکە میللییە کوردنشینەکانی شاری کەرکوك بەخۆوە بینی.

هەڵبەتە ئەو ساختەکارییانە لەڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی سەرژمێرییەکەدا ساڵی (١٩٥٩) بەڕوون‌و ئاشکرا دەرکەوت بەتایبەت دوای سەردانیکردنی کورد بۆ فەرمانگەکانی نفوسی کەرکوك بۆیان دەرکەوت کە ڕێژەیەکی زۆری کوردی کەرکوك برگەی زمانی دایك بە تورکمان لەلایەن ئەنجامدەرانی سەرژمێرییەکەوە تۆمارکراون.

بەتایبەتی لەو گەڕەکە میللیانەی کەزۆربەی دانیشتووانەکەی زمانی عەرەبییان نەدەزانی‌و بەوهۆیەوە فۆرمەکانیان لەلایەن خەڵکانی دیکەوە بۆ پڕکراوەتەوە. هەرچەندە دواتر ژمارەیەکی زۆری ئەوانە سکاڵایان بۆ ئەو مەبەستە تۆمار کردووە. کەسانی دیکەش داوای یاسایین لەبەردەم دادگا پێشکەشکرد بۆ گۆڕینی ئەو کردارە بە بڕیارێکی دادگایی[١٨].

جێی ئاماژەیە زۆربەی ئەو فەرمانبەرانەی بەشداری سەرژمێرییەکەیان لە پێکهاتەی تورکمان بوونەو هەموو ئەوانەی بە تورکمانی وەڵامی پرسیارەکانیانیان داوەتەوە بە تورکمان ناونووسیان کردوون‌و پرسیاری زمانی دایکی ڕاستەقینەیان لێنەکردوون. بەو پێیەش هەزاران کوردی شارەکە بەناوی نەتەوەی ڕاستەقینەی خۆیانەوە تۆمارنەکراون. لە ئەنجامیشدا زیاتر لە (٥٠٠٠) کەس لە خشتەی ئاماری سەرژمێرییەکاندا ناوی زمانی دایکیان نەنوسراوەو ئامانجی سەرەکی ئەو کارەش کەمکردنەوەی ڕێژەی کوردی شاری کەرکوك بووە بۆ بەرژەوەندی پێکهاتەکانی دیکە. بەو پێیەش پۆلێنکردنی دانیشتووانی کەرکوك لەسەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)ی زاینیی بەپێی زمانی دایك بەم شێوەیە بوو:

**پۆلینکردنی دانیشتووان لە کەرکوك لەسەر بنەڕەتی زمانی دایك[١٩]:**

| زمانی دایك | شاری کەرکوك | دەوروبەر | کۆی گشتی لیواکە |
|---|---|---|---|
| عەرەب | ٢٧١٢٧ | ٨٢٤٩٣ | ١٠٩٦٢٠ |
| کورد | ٤٠٠٤٧ | ١٤٧٥٤٦ | ١٨٧٥٩٣ |
| ئێرانی فارسی | ١٠١ | ٢٢ | ١٢٣ |
| تورکی تورکمانی | ٤٥٣٠٦ | ٣٨٠٦٥ | ٨٣٣٧١ |
| ئینگلیزی | ٦٣٤ | ٦٣ | ٦٩٧ |
| فەرەنسی | ٣٥ | ٦ | ٤١ |
| هیندی | ٧٩ | ٨ | ٨٧ |
| کلدانی‌و سریانی | ١٥٠٩ | ٩٦ | ١٦٠٥ |
| زمانی دیکە | ٤١٨ | – | ٤١٨ |
| نا دیار | ٥١٤٦ | ١٣٨ | ٥٢٨٤ |
| کۆی گشتی | ١٢٠٤٠٢ | ٢٦٨٤٣٧ | ٣٨٨٨٣٩ |

زۆر کەس‌و لایەن گومانیان لە ووردی ئەم ئامارنەی سەرەوە هەیە، یەکێك لەو کەسانەش مێژوونووسی کورد (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی) کە بە یەکێك لە بەتواناترین مێژوونوسی ناوچەکەیە لە ڕووی ڕەسەنیی دانیشتووانەکەی‌و کاروباری خێڵەکان‌و عەشیرەتەکانییەوە بەم دواییانە لە بەغدا لە نەوەدەکانی تەمەنیدا تیرۆر کرا[٢٠].

هەروەك دەکرێت تەئکید بکرێتەوە کە ژمارەیەکی زۆری خێڵەکان‌و گوندەکان‌و کۆمەڵگە نیشتەجێبوەکانی

کەرکوك پرۆسەی سەرژمێری نەیگردونەتەوە. دیارە باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە دەسەڵاتە ئیداری و سەربازییەکانی عێراق هیچیان دەربارەی ئەو ناوچانە نەزانیوە تەنیا کاتێك نەبێت کە داگیرو وێرانی کردوون و دواتریش دانیشتووانەکەی ئەنفالکردوون[٢١].

هەروەك دەتوانین بڵێین ئەو (٥٢٨٤) کەسەی کە لە ئاماری سەرژمێری (١٩٥٧)ی زاینیی ئاماژەیان بۆ کراوە گوایە زمانی دایکیان نادیارە، کوردن بە ئەنقەست ناونووس نەکراون بەهۆی سیاسەتی حکومەت و دەسەڵاتدارانی عێراق لە سەرژمێری لیوای کەرکوك.

دیارە ئەوەش ویستراوە ئامارژەیەك بێت بۆ ئەوەی ژمارەی ئەوانەی بە تورکمانی قسە دەکەن لەکەرکوك لەچوارچێوەی ئەو سەرژمێرییەدا زیاتر بکرێت لەو کەسانەی بە کوردی قسەیان کردووە (٥٢٤٩) کەس کە نزیکە لە کۆی ئەو کەسانەی زمانی دایکیان دەستنیشان نەکراوە لە خشتەکەدا. دیارە ئەمەش لەگەڵ ئەو ئامارو داتایانەدا یەکناگرێتەوە کە سەرچاوە زانستییە بێلایەنەکان باسیان لێوە کردووە.

لەو بارەیەشەوە دکتۆر (شاکر خەسباك) کە وەکو زانایەکی عێراقی بەویژدان ناسراوە، رایگەیاندووە کە رێژەی کورد لە کەرکوك لە ساڵەکانی پەنجاکاندا (٥٥،٢٪)ی کۆی دانیشتووانی لیوای کەرکوك بووە[٢٢].

بەو پێیەش ئەو رێژەیەی دکتۆر (شاکر خەسباك) نزیکترینە لە راستییەوە. هەروەك ناسەقامگیرییەکیش بەو ئامارانەوە دیارە کەدواتر رێژەی دانیشتووانی کەرکوکییان بەپێی زمانی دایك دەستنیشانکردووە. بۆ نموونە رێژەی تورکمان لە لیوای کەرکوك لە ساڵی (١٩٢٠)ی زاینیی بە (٣٠،٣٪) دانراوەو لە ساڵی (١٩٥٧)ی زاینیی بووە بە (٢١،٤٪)و لە ساڵی (١٩٦٥)یش (٢٦،٣٪)و دواتریش لە ساڵی (١٩٧٧)ی زاینیی گەراوەتەوە (١٦،٣١٪)[٢٣].

دیارە هۆکاری ئەو ناسەقامگیریەش لە رێژەی تورکمان لە کەرکوك دەگەرێتەوە بۆ سیاسەتە چەوتەکانی حکومەتی عێراق لەدژی پێکهاتەکانی عێراق پەیرەوی کردووەو ئەو بارودۆخە نائاسایی و ناهەموارەی لە کوردستان لە دەیان ساڵی رابردوودا بەرقەرار بووە کە بەهۆیەوە خەڵك ناسنامەو زمانی دایکی خۆی شاردووەتەوە دیار ئەویش بۆ ئەوەی لەگەڵ حکومەتدا رووبەروو نەبنەوە بە تایبەت لەشاری کەرکوکدا. چونکە کوردبوونی هاووڵاتیان لەو شارە بووەتە هۆکاری ئەشکەنجەدان و راوەدونانی حکومەت. هەر بەو هۆیەوەشە ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتیانی کورد ناچار بوون نەتەوەی خۆیان بشارنەوەو نەوێرن ئاشکرای بکەن لە پێناو وەلاوەنانی راوەدونانی سیاسی.

لە ساڵانی دواییشدا حکومەتی عێراق سیاسەتێکی روونی پەیرەو کرد بۆ گۆرینی دیمۆگرافیای شاری کەرکوك. دیارە باشترین کەسیش گوزارشی لەو سیاسەتە کردبێت (عەلی حەسەن مەجید) ناسراو بە ( عەلی کیمیاوی) بوو لە کۆبونەوەیەکیدا لەگەڵ بەرپرسانی حیزبی بەعس و سوپای دەزگا ئەمنییەکانی رژێمدا لە (١٥)ی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٩)ی زاینیی کە دواتر کۆنوسەکەی لە راپەرینی ساڵی (١٩٩١)دا کەوتە دەستی جەماوەری راپەریو کە تێیدا شانازی بەو دەستکەوتانە دەکات کە لە ماوەی (٢) ساڵی کارکردنی وەکو حاکمی رەهای کوردستان بەدەستیهێنابوو، هاوشێوەی ئەنجامدانی تاوانی ئەنفالی بەدناوو بۆمبارانکردنی زیاتر لە (٤٠) شوێن بەچەکی کیمیایی و وێرانکردنی سەرجەم گوندو لادێکانی کوردستان. سەبارەت بە (دەستکەوتەکانیشی) لە کەرکوك عەلی کیمیایی دەڵێت: "پێویستە باس لە ٢ خاڵ بکەم یەکەمیان تەعریب کردنەو دووەمیشیان ناوچە هاوبەشەکانی نێوان خاکی عەرەب و کوردستانە، دیارە ئەویش کەرکوکە. کاتێك لێرە دەستبەکار بووم کۆی ژمارەی دانیشتووانی عەرەب و تورکمان نەدەگەیشتە (٥١٪)، بەڵام بری (٦٠) ملیۆن دینارم خەرجکرد تاوەکو گەیشتنی بەو بارودۆخەی ئێستا کەرکوکی تێدایە. با روون و ئاشکراش بێت بەلاتانەوە وێرای هەموو ئەوەی کردمان بەڵام تائێستا رێژەی عەرەب نەگەیشتووەتە ٦٠٪ ی دانیشتووانی شارەکە. بۆیە ئەو کات فەرمانمدا کارکردنم لە کورد قەدەغە کرد لە کەرکوك و ناوچەکانی دەرەوەی ئۆتۆنۆمی.

دیارە کەرکوك ئاوێتەیەکە لە ئاین و ئایینزاو نەتەوەی جیاواز. هەموو ئەوەی رامانگواستن لەماوەی نێوان (٢١) ی مانگی ئایار تاوەکو (٢١)ی حوزەیران خەڵکی ناوچە قەدەغەکراوەکان (محرمە) نەبوون بەڵام لەژێر کۆنترۆڵی (وێرانکەران – مخربین)دا بوون چ لەگەڵیان بوون یاخود دژیان بوون"[٢٤].

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. بۆ زانیاری زیاتر بروانە ئەم سەرچاوانە:
– Longrigg S.H، (Four centuries of modern Iraq)، Oxford، ١٩٢٥.
– محەمەد ئەمین زەکی، (تأريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي)، وەرگێڕانی: محەمەد عەلی عەونی، قاهیرە، ١٩٤٨.
– ئەی. ئەی. فاسیلیفا، (كردستان الجنوبية الشرقية خلال القرن السابع عشر وحتى بداية القرن التاسع عشر، لمحات من تاريخ امارتي اردلان وبابان)، مۆسکۆ، ١٩٩١.
٢. ئینسایلکلۆپیدیای جوولەکە ئاماژە بە بوونی جوولەکە دەکات لە کەرکوك لە ماوەی ئەو چوار سەدەیەی کۆتایی، کە بە (٢٠٠) خێزان دەیخەملێنێت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، کە لە گەرەکێکی تایبەتی بە خۆیان نیشتەجێ بوون و لە ساڵی (١٩١٨)ی زاینیی بە یارمەتی مەسیحییەکان دەوریان هەبوو لە داگیرکردنی شارەکە. ژمارەی جولەکەکانی کەرکوك لە ساڵی (١٩٤٧)ی زاینیی بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە ئینسایلکلۆپیدیای جوولەکەدا هاتووە بە (٢٣٥٠) کەسی داناوە، کە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠ – ١٩٥١)ی زاینییدا هەموویان کۆچیان کردووە، بۆ زیانیاری زیاتر بروانە:
– (Encyclopaedia judaica)، vol. ١٠، P. ١٠٤٧ – ١٠٤٨.
٣. عەلائەددین سوجادی، (مێژووی ئەدەبی کوردی)، بەغدا، ١٩٥٢، لاپەڕە (٦٥ – ٦٦).
٤. گەشتی ئەندازیار یۆسیب (یوسف) گیرینك، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر حەوزی دیجلەو فورات لە ڕووی هونەرییەوە، لەگەڵ وەسپی ئەو ڕێگایانەی کە دەڕوات بۆ سوریا، وەرگێردراوە لە زمانی ئەڵمانییەوە، بڵاوکراوەی بەشی قەفقاس لە کۆمەڵەی جوگرافی پاشایەتی ڕووسی، جلدی VI، ١٨٧٩، لاپەڕە (٩١).
٥. شەمسەددین سامی، (قاموس الاعلام)، جلدی پێنجەم، ئەستەمبول، چاپخانەی (مهران)، ١٣١٥، لاپەڕە (٢٨٤٢).
٦. مجێەرسۆن، (رحلة متنكرة الى بلاد ما بين النهرين وكردستان)، وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی: فوئاد جەمیل، بەرگی یەکەمی لە ئەستەمبوڵەوە بۆ سلێمانی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٠، لاپەڕە (٥٨ – ١٦٣).
٧. محەمەد ئەمین زەکی هیچ ئاماژەیەکی بە ناوی کتێبی (سۆن) نەکردووە کە ئەو ژمارانەی لێ وەرگرتووە، ئەو کتێبەی (سۆن) کە ئاماژەی پێ کردووە لەژێر دەستمایە هیچ ئاماژەیەکی بەو ژمارانە نەکردووە تەنها ئەوانە نەبێت کە ئاماژەمان پێ کرد، وای پێ دەچێت کە ئەم زانیارییانەی لە کتێبێکی تری (مێجەرسۆن) وەرگرتبێت کە زۆر ئاماژەی بە کوردستان کردبێت، لەنێوانیان (دليل او مرشد كردستان الجنوبية)، ئەو کتێبە زۆر ووردو ڕاستییەکانی بە دروست تێدایە بەپێی بۆچوونی وەرگێڕی کتێبەکە فوئاد جەمیل، بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٥٠).
٨. محەمەد ئەمین زەکی، (ملاحظاتي على قانون اللغات المحلية، في كتاب (محاولتان غير مجديتين)، لێکۆڵینەوەو پێشەکی و هەڵسەنگاندنی: سەباح غالب، لەندەن، ١٩٨٤، لاپەڕە (١٠٤ – ١٠٥).
٩. بروانە:
– سی. جی. ئەدمۆنس، (كرد وترك وعرب، سياسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي في العراق ١٩١٩ – ١٩٢٥)، وەرگێڕانی: جەرجیس فەتحوڵلا، بەغدا، ١٩٧١، لاپەڕە (٢٤١).
– ا. م. مینتیشاشفیلی، (الكرد، لمحات في العلاقات الاجتماعية – الإقتصادية والثقافية واساليب المعيشة)، بە زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٨٤، لاپەڕە (٢٥)و (١٩٣).
10. – Hay W. R، (Tow years in Kurdistan: Experiens of a political officer 1918 – 1920)، (London، 1922، P (81).
– longrigg S. H.، (Iraq 1900 to 1950، A politicalm social and economic history)، (Londod، 1953، P (53).
١١. (مذكرة محمد امين زكي الى الملك فيصل الاول حول الشأن الكردي العراقي في ٢٠ كانون الاول ١٩٣٠)، پێشەکی و وەرگێڕان: دکتۆر جەبار قادر، (الملف العراقي)، ژمارە (١٠٤)، ئاب، ٢٠٠٠، لاپەڕە (٦٤ – ٦٥).
١٢. ئەدمۆنس، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٤٠ – ٤١).
13. Loder Y. de V.، (The truth about Mesopotamia، Palestine and Syria)، London، (1923، P. (214).
14. Ibid، P. (215 – 218).
بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
– م. س. لازرێف، (الامبرالية والمسألة الكردية ١٩١٧ – ١٩٢٣)، بە زمانی ڕووسی، مۆسکۆ، ١٩٨٩، لاپەڕە (٣٠٦ – ٣٠٩).
١٥. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٤)، هەولێر، ١٩٩٩، لاپەڕە (١٧٧ – ١٧٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (كركوك في تقرير عصبة الامم)، هەروەها بروانە:
– (مسألة الحدود بين تركيا والعراق)، چاپخانەی (الحكومە)، بەغدا، لاپەڕە (٩٤).
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٧. (إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧)، بەشی دووەم، خشتەی شەشەم، قەزای کەرکوك، لاپەڕە (١١٨).
١٨. دکتۆر نوری تاڵەبانی، (منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي)، چاپی دووەم، ١٩٩٩، لاپەڕە (٧٩).
١٩. (المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، تصنيف السكان من حيث الجنس ولغة الام للواء كركوك)، چاپخانەی (العاني)، بەغدا، ١٩٥٩.
٢٠. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٢٠)، هەولێر،

کانوونی یەکەم، ١٩٩٨، لاپەڕە (٣١).

٢١. گەلێك ئاماژەی جۆربەجۆر هەیە لە بەڵگەنامە حکومییەکان کە هاوپەیوەستە کۆمەڵکوژی ئەنفال کە کەوتووەتە دەستی خەڵکانی ڕاپەڕی‌و دەربارەی گەلێك لە دێیەکانی تایبەت بە پارێزگای کەرکوك کە ئەنفال کراوە کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی کارگێڕییەوە نەزاندراوەو هیچ بوونێکی نەبووە لەسەر نەخشە فەرمییەکانی مەدەنی‌و سەربازی عێراقی، بۆ زیاتر بڕوانە:

– (Genocide in Iraq. The Anfal campaign aginst the Kurds)، HRW / ME، New York، 1993.

٢٢. دکتۆر شاکر خەسباك، (الكرد والمسألة الكردية)، بەغدا، ١٩٥٩، لاپەڕە (٤٣).

٢٣. گۆڤاری (السياسة الدولية)، ژمارە (٤)، هەولێر، کانوونی دووەم، ١٩٩٤، لاپەڕە (٢٨ – ٢٩)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:

(التوزيع الجغرافي للتركمان في العراق)، نووسینی: دکتۆر خەلیل ئیسماعیل.

Genocide in Iraq. The Anfal campaign) – .24 aginst the Kurds)، Human Rights Watch / .(ME، New York، 1993، P. (353

*** سیاسەتەكانی حكومەت لەكەركوك لەسەردەمی پاشایەتیدا:-**

د. جەبار قادر

مەبەست لەم توێژینەوەیە تیشكخستنە سەر سیاسەتەكانی حكومەت لە كەركوك لە سەردەمی پاشایەتی و دەستنیشانكردنی هۆكارە سیاسی و ئابووری و ستراتیژییەكان و رەهەندەكانی ئەو سیاسەتانەیە.

یەكەم:

حكومەتە یەك لە دوایەكەكانی عێراق سیاسەتێكی گشتیان بەرانبەر بە گەلی كورد پەیرەو كردووە كە خۆی لە رەتكردنەوەی بوونی نەتەوەی كوردو سەلماندنی كوردستان وەكو نیشتمانی ئەو گەلەو رەتكردنەوەی پەسەندكردنی مافە نەتەوەییە رەواكانی و سەركوتكردنی بزووتنەوە رەواكانی كە ئامانجی بەدیهێنانی یەكسانی نێوان هاوولاتیان بەبێ رەچاوكردنی جیاوازی ئایینی و نەتەوەیی و یەكسان بوون لە دابەشكردنی داهاتی ولات بەدەر لە بەتالانبردنی سەروەت و سامانی گشتی و هەژاركردنی كوردو پشتگوێ خستنی رۆلی لە ژیانی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری.

لەو پێناوەشدا سیاسەتێكی زۆر تایبەتی دەرهەق بە كورد لە كەركوكدا پەیرەو كرد كە لەچەندشێوازێكدا رەنگدانەوەی هەبوو كە لەماوەی هەشتا ساڵی رابردوودا گەیشتبووە قۆناغی پاكتاوی رەگەزی لە سەردەستی رژێمی بەعسی گۆربەگۆر.

دووەم:

رەوشی گشتی ئەو سیاسەتەش بۆ دەوڵەتی عێراق بۆ ماوەی دەسەلاتدارانی داگیركەری عوسمانی دەگەرێتەوە، كە هەر لەسەرەتاوە ئەو دەسەلاتە دركی بە گرنگیی و بایەخی كەركوك و شارو شارۆچكەكانی دەورووبەری كردووە دیارە ئەوەش بەهۆی ئەوەی ئەو شارە دەكەوێتە سەر رێگای ستراتیژی نێوان بەندەرەكانی هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرەو دەریاكانی ناوەراست و دەریای رەش و سنوورەكانی ئێران.

هەڵبەتە دەوڵەتی عوسمانی تەنیا هێزنییە ئەو سیاسەتەی پەیرەو كردبێت بەڵكو سەرجەم ئەو هێزو ئیمپراتۆرییانەی ناوچەكەیان دواتر داگیر كردووەو ویستویانە جێ پێیان بە ناوچەكەوە دیار بێت هەستیان بەو گرنگیی و بایەخەی شارەكە كردووە، بەلام هیچیان سەركەوتوو نەبوون بەو شێوەیەی هەردوو هێزی عوسمانی و سەفەوی تێیدا سەركەوتوونە بەسەر رێگا سەرەكییەكانی سەر ئەم رێگایەیە. ئەمە وێرای دروستكردنی كۆمەڵگای نیشتەجێبوون هاوشێوەی ئەوەی عوسمانییەكان لە سەدەكانی ئەمدواییەدا ئەنجامیانداو سیاسەتی بەتوركككردنیان پەیرەوكرد لەرێی بەشێك لەدانیشتووان كە وەكو ئامرازێك پشتیان پێبەستن بۆ جێبەجێكردنی سیاسەتە شۆفێنیستەكانی خۆیان لەم بەشەی كوردستان.

سێیەم:

لەپێناو جێبەجێكردنی سیاسەتە ئیمپریالیستەكانی خۆیدا لە عێراق، بەریتانیا هەوڵێكی زۆری بەگەر خست بۆ دابرانی ئەم بەشە گرنگەی كوردستان لەنیشتمانی دایكی كوردستان و بەستنەوەی بەدەوڵەتی عێراق. لەو پێناوەشدا هەرچی راوێژكاری سیاسی و سەربازی و ئابووری دەستپۆیشتووی خۆی هەبوو لەعێراق لەسەردەمی شاهانە سیاسەتەكانی خۆیان بەهاوشێوەی سیاسەتەكانی نیمچە كیشوەری هیندی گۆری بەتایبەت دوای ئەوەی دركیان بەو دەریا نەوتە كرد كە لەشارەكەدا هەیە. ئەمە بەهاوزەمان لەگەڵ ئەو گۆرانكارییە سیاسییانەی لە هەردوو ولاتی روسیاو توركیا روویدا لەسەردەمی رووداني جەنگی جیهانی یەكەم و دواتردا هاتە ئاراوە.

هەموو ئەو رووداوانــە سیاسەتمەدارانی بەریتانیای لــەخــۆرهــەلات نـاچـاركـرد چاوبخشـێـنـنـەوە بـەهـەمـوو ستراتیژەكانیان لە ناوچەكەدا لەپێش هەمووشیانەوە سیاسەتەكانی دەرهەق بە كورد.

چوارەم:

بەهۆی تێهەڵچژانی سیاسەتەكان بەرانبەر بە كورد لەگەڵ سیاسەتەكان سەبارەت بە كەركوك، كە یەكێكە لەگرێ كوێرە سەرەكییەكانی كەیسی كورد لە عێراق و رێگری سەرەكی لەبەردەم چارەسەری ئاشتیخوازانە بۆ ئەو كەیسە. لەبەر ئەو هۆكارەشە كە ناتوانرێت هیچ توێژینەوەیەك ئەنجامبدرێت بەدەر لەگەڵ فاكتەرەكانی دیكە. بەوهۆیەشەوەیە كە پێویستە تیشك بخرێتە هەندێك بابەت كە لەسەرەتادا وەكو بابەتێكی دوور لەبابەتی ئەم توێژینەوەیە دێتە پێش چاو.

نووسەری ئەم بابەتە پێیوایە تیشك نەخستەسەر ئەو سیاسەتانەو شیتەڵ نەكردنی هۆكارەكانی رەهەندە سیاسی و ستراتیژی و ئابوورییەكانی ناكرێت لەو سیاسەتە حكومییانەی دەربارەی كەركوك بگەین بەسیاسەتەكانی بەعسی فاشیستیشەوە.

هەروەك ناشكرێت كۆتایی بەكێشەی كەركوك بهێنرێت لە دوارۆژدا كەبەلای نووسەرەوە بە بەرمیلی بارود ناوبراوە كە لەهەر ئانوساتێكدا ئەگەری تەقینەوەی هەیە. بەو هۆیەشەوەیە كە ئەم قەیرانە بایەخی زانستی وسیاسی خۆی هەیە.

*** كەركوك بەر لە پێكهێنانی شانشینی عێراق:-**

كەركوك لەسەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە تاوەكو كۆتایی جەنگی جیهانی یەكەم لەژێر ركێفی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە.

ئەو ماوەیەش كە كوردستان و عێراق لەژێر قەڵەمرەوی عوسمانیدا بووە بە سەردەمێكی تاریكی مێژووی ناوچەكە لە رووی دارمانی ئابووری و سەركوتكردنی نەتەوەیی و مەزهەبی و دواكەوتنی رۆشنبیری لە قەڵەمدراوە.

حوكمرانی عوسمانییەكان لەبنەرەتدا لەسەر بنەمای ویلایات بووەكە بەسەر لیوا یاخود سەنجەقدا دابەشبووە.

راستەوخۆ دوابەدوای داگیركردنی لەلایەن عوسمانییەكانەوە، ئەوەی ئێستا بەعێراق دەناسرێت بەسەر چوار ویلایەتدا دابەشكرا كە بریتین لە بەغدادو موسڵ و بەسرەو شارەزوور.

هەرچی ویلایەتی شارەزوورە ماوەیەكی دوورودرێژ نائارامی و ناسەقامگیری بەخۆوەبینی شاری كەركوك پایتەختی بووبووە گۆرەپانی ململانێی سەختی عوسمانی-ئێرانی. لە سەدەی شازدەهەمیشدا ئەم ویلایەتە پێكهاتبوو لە ١٦ سەنجەق دواتریش لەسەدەی دواتر بۆ ٣٢ سەنجەق زیادیكرد، كە زۆربەیان لەقەڵای سەرچیاكان یاخود قەدپاڵی چیاكان پێكهاتبوون كە پاشان بەهۆی كاریگەریی جەنگەكانی نێوان هەردوو وڵات و دەرەبەگەكانی كوردەوە نەمان و لەناوچوون. دیارە لە هەموو ئەو سەنجەقە بەناوبانگانەش بریتین لەسەنجەقەكانی ویلایەتی شارەزوور، كەركوك، هەولێر، هەریر، كۆیە، شەمامك، دەشتی مەخمور، شارباژێر، مەرگە، شمیران، قەرەداغ، قزلجە، چیای حەمرین و ئەوانی دیكە[١].

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بكەین كە سنووری ویلایەتەكانی دەوڵەتی عوسمانی سەقامگیر نەبووەو بەردەوام گۆرانكاری بەسەردا هاتووە. دیارە ئەوەش بەهۆی ئەو گۆرانكارییە ئیدارییانەوە بووە كە دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی جەنگ و كێشە و ململانێی بەردەوامەوە لەگەڵ ئێراندا كە ویلایەتی شارەزوور گۆرەپانی سەرەكی بەخۆوە بینیوە.

سیستەمی بەڕێوەبردن لە دەوڵەتی عوسمانی گۆرانكاری زۆری بینیوە تاوەكو لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا سەقامگیر بووە لەساڵی ١٨٧٩ زایینی ویلایەتی موسڵ لەسەنجەق پێكهاتووە سەنجەقی موسڵ و قەزاكانی دهۆك و زاخۆو زێبار و شنگال و ئاكرێ وشارەزوور و كەركوك كە پێكهاتبوو لە قەزاكانی هەولێرو رانیەو رەواندزو كۆیەو سەلاحییە -كفری. هەرچی سەنجەقی سلێمانیشە قەزاكانی بازیان و شارباژێر و قەرەداغ و گوڵعەنبەرو مەرگە بووە[٢].

سەنجەقی شارەزووری ئەوكات گەورەترین سەنجەقەكانی ویلایەتی موسڵ بووە لە رووی ژمارەی قەزاو ناحییەكانییەوەو ٦ قەزاو ١٧ ناحیەو ١٧١٢ گوندی لەخۆگرتووە. هەرچی سەنجەقی موسڵیشە ٦ قەزاو ١٥ ناحیەو ١٥٩٨ گوندی هەبووەو سەنجەقی سلێمانیش ٥ قەزاو ١١ ناحیەو ١٠٨٢ گوندی هەبووە[٣].

هەرچی دەسەڵاتی عوسمانیشە هەروەكو پیشەی هەمیشەی خۆی هەر سەرقاڵبوو بە بەتاڵانبردنی داهاتەكانی سەنجەقی كەركوك بەبێ ئەوەی هیچ خزمەتگوزارییەكی ئەوتۆ پێشكەش بە دانیشتووانەكەی بكات.

لەساڵی ١٨٨٨ی زایینی تێكرای داهاتی كەركوك بریتیبوو لە ٧ ملیۆن و ٥٠٠ هەزار قورش هەڵبەتە ئەو داهاتەش لەرێی باجی موڵكداری و باجی مەروماڵات و رەشبنێری سەربازی و باجی داهات و باجی دەیەك و دارستان و باجی دادگاكانەوە دراوەتە ئەو دەسەڵاتە. هاوكات هەردوو باجی دەیەك و باجی مەروماڵات لە هەمووجۆرە باجەكانی دیكە داهاتیان زۆرتر بووەو گەیشتووەتە نزیكەی ٤ ملیۆن و ٥٠٠ هەزار قورش، كەچی لە بەرانبەردا دەسەڵاتی حوكمڕانی عوسمانی تەنیا ٣ ملیۆن قورشی بۆ خزمەتگوزاری لەو شارەدا خەرجكردووە. تەنانەت زیاتر لە نیوەی ئەو برە پارەیەش لە كاروباری جەندەرمەو پۆلیس و سەربازی خەرجكراوە. هەروەك نزیكەی ٥٠٠هەزار قورش بۆ دادگاكان و موچەی فەرمانبەران خەرجكراوە. لەبەرانبەریشدا هیچ برە پارەیەك بۆ كاروباری پەروەردەو فێركردن و ئاوەدانكردنەوەو رێگاوبان و كاروباری تەندروستی وخزمەتگوزارییە پێویستییەكانی قەزاو ناحییەكان خەرجنەكراوە[٤].

بارودۆخی پەروەردەو فێركردن لە ویلایەتی موسڵ كە شاری كەركوك بەشێك بووە لێی لە بارودۆخێكی زۆر ناڵەباردا بووە، تەنانەت لەو ساڵەشدا واتە ساڵی ١٨٨٨ زایینی تەنیا ٧ قوتابخانەی تێدابوو. واتە هەر شارێكی وەكو موسڵ، كەركوك، هەولێر، سەلاحییە )كفری، ئاكرێ، رەواندز، سلێمانی یەك قوتابخانەیەكی تێدابووەو كۆی ژمارەی قوتابییەكانیش تەنیا ٣١٨ قوتابیبووە[٥].

بەو پێیەش داگیركاری عوسمانییەكان بۆسەر ئەم وڵاتە تەنیا هەژاری ودواكەوتوویی و وێرانكاری بەدوای خۆیدا هێناوەو ئاستەنگی زۆری هێناوەتە كایەوە لەبەردەم پێشكەوتنی ئەو وڵاتە. لەهەموو ئەوەش خراپتر ئەوەیە كە ئەم ناوچەیە هاوشێوەی چەندین ناوچەی دیكەی خۆرهەڵاتی ناوەراستی لەژێر ركێفی عوسمانییەكان لەدوایین قۆناغەكانی ئەو حوكمرانییەدا بوون بەئامانجی فراوانخوازی ئەورووپاو ئامانجی ململانێی نێوان بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیاو رووسیا لەپێناو داگیركردنی خۆرهەڵاتی دوورو ناوەراست. هەرچی كوردستانیشە وەكو وڵاتێكی گرنگ لە رووی ستراتیژی و ئابووریی دەوڵەمەند یەكێك بوو لە پێگە گرنگەكانی ئەو ململانێیە.

هەر لەپێش جەنگی یەكەمی جیهانییەوە هەریەك لە بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیاو روسیا لەهەوڵی ئەوەدا بوون جێ پێی خۆیان لە كوردستان قایم بكەن و كۆنترۆڵی نەوتەكەی و داهاتەكەی بكەن. هاوكات بیشیبەستنەوە بە بازارەكانی خۆیانەوە بۆئەوەی كاڵا بازرگانییەكانی خۆیانی تێداساخ بكەنەوە. هەڵبەتە نەوتیش یەكێكە لەو هۆكارانەی لەو ململانێیەدا پێگەی گرنگی خۆی هەبووە.لەوپێناوەشدا زانایانی جیۆلۆجی خۆرئاوا بەر لە كۆتایی سەدەی نۆزدەیەم باسیان لە چەندین دەریای نەوتی دەرنەهێنراو لە ناوچەی باباگورگور كردووە لەو ناوچەیەدا. تەنانەت مۆرگان كە بەرەچەڵەك فەرەنسایی بووە توانیویەتی بری نەوتی یەدەكی كەركوك و خانەقین و چیای كویخای لە دووری ٣٠٠ كیلۆمەتر لە قەسر شیرین دیاریكردووە[٦].

دیارە سووربوونی كۆمپانیاكانی بەریتانیا لەسەر دەستبەسەراگرتنی ناوچەكانی كوردستانی باشوور بەتایبەتی كەركوك ،ۆكاری سەرەكیبووە بۆ ئەوەی هەوڵبدات ویلایەتی موسڵ داگیربكات (كوردستانی عێراق لەدواییدا).

وینستۆن چەرچەڵی سەرۆك وەزیرانی ئەوكاتی بەریتانیا بایەخی خۆی بۆ داگیركردنی ویلایەتی موسڵ نەشاردەوەو لەساڵی١٩١٣ بە ئاشكرا باسی لەو هەوڵانەی خۆی بۆ داگیركردنی تەواوی ویلایەتی موسڵ دەكرد. وتیشی:-

پێویستە هاوشێوەی خاوەنەکانی نەوت دەستمان بگاتە پێگەکانی نەوت و کۆنترۆلی هیچ نەبێت بەشێك لەو پێگانەمان لەدەستدابێت کە لە داهاتوودا پێویستمان پێدەبێت"[٧].

دواتریش لەساڵی ١٩١٦ ڕێکەوتننامەی سایکس - بیکۆ وەکو هەوڵێك هاتەکایەوە بۆ دابەشکردنی وەك یەکلاییکردنەوەیەك بۆ ئەو کێشانەی لەئاکامی دابەشکردنی پاشماوەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەنێوان زلهێزەکانی ئەوکاتی جیهان هاتە ئاراوە.

هاوکات بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە میزۆپۆتامیای باشوورو بەغدا کەوتنە ژێرحوکمرانی بەریتانیاو ناوچەکانی ناوەوەی ئەو شوێنانەش بوون بەشوێنی قەڵەمڕەوی بەریتانیا. بەڵام هەرچی خودی ویلایەتی موسڵ کەوتە ژێر هەژموونی فەرەنساوە. دواتریش لەچوارچێوەی کۆنگرەی سان- ریمۆ لە ساڵی١٩٢٠ بەریتانیا فەرەنسای ناچارکرد دەستبەرداری داواکاری خۆی ببێت سەبارەت بەویلایەتی موسڵ لە بەرانبەر بڕی٢٥ ٪ پشکی کۆمپانیای نەوتی تورکیا. هەرچەندە پێشتر پەیمانی بەخشینی کۆنترۆڵکردنی بەشی هەرە زۆری کوردستانی عێراق و سوریاو بەشی باشووری تورکیاو بەشی خۆرئاوای ئەرمینیا بە فەرەنسا درابوو. پاشان کە ناوچەکانی کوردستانی عێراق و باشووری کەرکوك و چیای حەمرین و بەشێکی کوردستانی خۆرئاواو باشووری خۆرئاوای ئێران خرایەسەر ناوچەکانی هەژموونی بەریتانیاو ناوچەکانی دیکەی کوردستانی باکوورو خۆرئاوا خرانە سەر روسیا.

دواتریش ڕێکەوتننامەکە بەپێی سیناریۆ جیاکانەوەو لەدوای شۆڕشی بۆلشۆی لە روسیاو کۆنترۆڵکردنی موسڵ لەلایەن بەریتانیاوەو دەرکەوتنی بزووتنەوەی کەمالیزم لە تورکیا، چووە بواری جێبەجێکردنەوە.

دوابەدوای ئەوەش لەدوا ساڵی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەریتانیا زۆر بەگورجیی کەوتەخۆو چالاکییەکی زۆری نواندو پێشڕەوییەکی زۆری لەسەر زەوی کردو لە٢٨ ی نیسانی ساڵی ١٩١٨ بەرەو کەرکوك کەوتەرێ و کفری گرت و لە ڕۆژی دواتردا خورماتووی گرتوله٧ ی مانگی ئایاری هەمان ساڵدا هێزەکانی بەریتانیا کەرکوکیان داگیر کرد. پاشان لەماوەی ٢٤ سەعاتی دواتردا پاشەکشەیان کردو هێزەکانی عوسمانییەکان چوونە ناو شاری کەرکوکەوە. دواتریش هێزەکانی بەریتانیا ٥ ڕۆژ بەر لە ئاگربری مۆدۆرس لە٢٥ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ زایینی بەهاوکاری سەرۆك هۆزە کوردییەکان لە کەرکوك و سلێمانی چوونە ناو شارەکەوەو هێزەکانی عوسمانییەکانیان تاوەکو شارۆچکەی (ئاڵتون کۆپری )پردێ ڕاونا.

هەر لەگەڵ کۆنترۆڵکردنی شاری کفری، هێزەکانی بەریتانیا دەستیان کرد بە ئاراستەکردنی پەیامی پێویست بەو مەبەستە بۆ سەرۆك هۆزە کوردییەکانی کەرکوك و سلێمانی. هاوکات دەستیشیان کرد بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی لێکپچڕاندنی ناوچەکانی کوردستانی باشوور کە سەرکردەیەکی بەرچاوی ئیمپریالیزمی بەریتانیای لێ بوو بەناوی نێدمۆند جۆنز، ناوبراو بەڕاشکاوی ئاماژەی بە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتە کردووە لە شارەکانی کەرکوك و موسڵ و سلێمانی.

هەرچی شارەکانی هەولێرو کۆیسنجەق و ڕەواندوزیشە لەساڵی ١٩١٨ زایینی لە قەزای کەرکوك جیابوونەوەو لیوایەکی سەربەخۆیان بەناوی هەولێر پێکهێنا. خانەقین و مەندەلیش کە دەکەونە سەر سنووری عێراق -ئێران و سەر بە ویلایەتی بەغداد بوون و زۆربەی دانیشتووانەکەی کورد بوون خرانەسەر لیوای دیالە کە لە هەمان ساڵ واتە ساڵی ١٩١٨زایینی پێکهێنرا[٨].

مەملەکەتی عێراق لە سەرەتای دروستبوونییەوە لە ١٤ویلایەت پێکهات ولیوای کەرکوکیش لە ٤ قەزاو ١٥ ناحیە پێکهاتبوو، ئەم بارودۆخەش ماوەی ٥٠ ساڵ بەردەوامبوو بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەکی سەرەکی بەسەردابێت. بەڵام لە هەردوو دەیەی حەوتەم و هەشتەم پێکهاتە ئیدارییەکانی گۆڕانکارییەکی زۆریان بەخۆوەبینی و هەڵبەتە کەرکوکیش نەوەك لەو گۆڕانکارییە بێبەش نەبوو، بەڵکو زۆرترین ئەو گۆڕانکارییانەی بەخۆوە بینی. وێڕای گۆڕینی ناوە جۆگرافیاییەکەی لە کەرکوکەوە بۆ تەئمیم، یەکە ئیدارییەکانیشی پارچەپارچەکران و خرانە سەر پارێزگاکانی دراوسێی.

یەکەم و سەرەتاییترین ڕێنماییەکان بۆ مێجەر نۆئێل کەیەکەم ئەفسەری سیاسی بەریتانی بوو لە پاییزی ساڵی ١٩١٨لەکەرکوك دامەزرا، بریتی بوو لە-: تۆ لە پۆستی ئەفسەری سیاسی لە١ ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩١٨ لەکەرکوك دامەزراویت، لیواکەی تۆ لەزێی بچووکەوە بۆ دیالەو تاوەکو سنووری ئێران درێژەی هەیە. کەرکوك بەشێکە لە ویلایەتی موسڵ و چارەنووسی کۆتایی لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە دیاریدەکرێت، بەڵام لە ئێستادا پێویستە لە چوارچێوەی داگیرکاری سەربازی وئیداریدا بێت. بۆیە پێویستە دەسەڵاتەکانت لێرەوە سەرچاوەبگرێت. هەروەك پێویستە بۆ ئەو سەرکردە ناوخۆییانەی لەگەڵمان دەکەونە گفتوگۆ، ڕوون بکەیتەوە کە بە نیازنین هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی بیانی پەیڕەو ناکرێت کە لەگەڵ خواست و ویستی ئەوان نەگونجێت. هەروەك پێویستە ڕێنمایی گرنگیان بدەیتێ بۆپێکهێنانی یەکێتییەك بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانیان بەسەرپەرشتی ئەفسەرانی بەریتانیا. لەئاکامی جەنگ وراپێچکردنی خەڵکان و کاری زۆرەملێ و سەپاندنی باج و پارەوپووڵ هۆکاری سەرەکی بوون بۆ دارمانی کشتوکاڵ وکارو باری ئابووری و کاری دەسترەنگینی[٩].

هەروەك پیشەسازی خۆماڵی ومیللی وبەخێوکردنی مەروماڵات پاشەکشێی بەرچاوی بەخۆوەبینی و ڕێگاوبانی بازرگانیش بەهۆی کاری جەنگییەوە پساو پەیوەندی نێوان ناوچەکان پچڕان. هاوکات بەهۆی ئاستەنگی گواستنەوەو کەمبوونەوەی هەناردەو بەرووبوومی پیشەسازی وخۆراك و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و پەتای جۆراوجۆرو برسێتی وقاتوقڕی هەزاران هاووڵاتی گیانیان لەدەستدا.

لەبەرانبەریشدا ڕەخنەو دژایەتیکردنی بەریتانیا لەلایەن هاووڵاتیانەوە پەرەی سەند. لەلایەکی دیکەشەوە

پرۆپاگەندەی تورکەکان لە کەرکوك و ویلایەتی موسڵ کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر رای گشتی و هەڵوێستی خەڵك سەبارەت بە حوکمرانی ئەوکاتی وڵات.

بەهەرحاڵ خەڵکی کەرکوك هەڵوێستیان لەدژی بەریتانیا وەرگرت و چوونە ریزی ئەو کاروچالاکییانەی دژ بە ئینگلیز ئەنجام دەدران. لەسەروبەندی شۆرشی١٩٢٠ دا گردبوونەوەیەکی فراوان لە کەرکوك سازکرا بۆمەحکوم کردنی سیاسەتەکانی بەریتانیا لەو وڵاتەو هێڵی ناسنینی شارەکە دەستی بەسەرداگیراو پەکیانخست[١٠].

لەبەرانبەریشدا هەر پێشوەخت ئینگلیز بریاری دابوو سەرەرای هەر شتێك لەسلێمانی لیوا کوردنشینەکانی دیکەدا رووبدات، کەرکوك لەژێر رکێفی خۆیدا بهێڵێتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە هیچ ئاماژەیەکی روون لەهیچ دۆکیومێنت ونووسراو و پرۆژەیەکی ئینگلیزدا بەرچاو ناکەوێت سەبارەت بەچارەنووس و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەی کورد لە عێراق.

هاوکات پێشکەوتن و گەشەکردنی بزاڤی شۆرشگێری کورد، دەسەڵاتدارانی بەریتانیای ناچارکرد بیر لە دۆزینەوەی چارەسەری کێشەی کورد بکەنەوە بەشێوەیەك کەخزمەت بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاو حکومەتی ناوەندی عێراق بکات.

بەڵام هەموو ئەو چارەسەرانە لەلایەن کوردەوە رەتکرانەوە، چونکە هیچیان بەرژەوەندی باڵای کوردیان لەبەرچاو نەگرت. هەموو هەوڵ و پلانەکانی ئینگلیز بۆ ئەوەبوو کەرکوك لەجەستەی قەوارەی کوردستاندا بپچرێت بەتایبەت لەوکاتەدا کە ئەو بابەتە سەرچاوەی وتوێژو گفتوگۆی زۆر بوو. هەر بۆیە نوێنەری باڵای ئەوکاتی بەریتانیا رێنماییەکانی خۆی بۆدیاریکردنی زێی بچووك وەکو سنووری باکووری دەوڵەتی عێراق کە بەنیاز بوون دروستی بکەن، خستەرو. دیارە ئەویش بەهۆی دەوڵەمەندی و بەپیتی ئەو ناوچەیەوەیە کە نزیکە لە سەرچاوەکانی نەوت و کێڵگەکانی چاندنی توتن و گەنم وخەڵوزەوەیە[١١].

لە کۆبوونەوەیەکیشدا کە لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بەرێوەچوو، هاوکات کێشەی کوردی تێدا تاوتوێکرا. لەو کۆبوونەوەیەدا ئیسی مۆنتیگیۆ، وەزیری کاروباری هیندستان لە حکومەتی بەریتانیا پێشنیاری کرد هێڵی سنووری نێوان میزۆپۆتامیا و کوردستان لە باکوورەوە خانەقین و کفری و کەرکوك و ئاڵتون کۆپری و زاخۆو فیشخابور بێت. پلانی ناوبراویش وابوو هەموو ئەو ناوچانە بخاتە ژێر رکێفی میزۆپۆتامیا، تەنیا شاری هەولێر نەبێت چونکە چارەنووسی شارەکە چاوەروان بوو بخرێتە ئەستۆی پیاوماقوڵان و سەرکردەکانی ناوچەکە[١٢].

بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی داهاتی ناوچەکە دەسەڵاتدارانی بەریتانیا پەنایان بردە بەر نانەوەی ئاژاوەو بشێوی لەنێو پێکهاتە ئایینییەکانی کەرکوك بەو هۆیەشەوە بشێوی ئاژاوەو دوژمنایەتی درێژەی کێشا تەنانەت دوای رۆیشتنی ئینگلیز لە عێراق. هەڵبەتە ئاژاوەکانی مانگی مایسی ساڵی ١٩٢٤ شاری کەرکوك نموونەیەکی زیندووی ئەو سیاسەتەی بەریتانیایە لە چاندنی تۆوی دووبەرەکی لەنێوان رۆڵەکانی کەرکوك کە بە گەواهی نووسەرانی خودی ئینگلیز تا رادەیەکی زۆر کۆك و یەکریز بوون. لە رۆژی ٤ی مانگی مایس لە ساڵی ١٩٢٤ زایینی رووبەرووبوونەوە لە بازارەکانی شاری کەرکوك روویدا کاتێك هێزەکانی لیڤی ئاشووری کە لەلایەن بەریتانیاوە پشتگیریان لێوە دەکرا هێرشیان کردە سەر بازرگانان و دەستیان بە تەقەکردن کرد لە هاووڵاتیانی مەدەنی. هەڵبەتە هەڵوێستی هێزەکانی بەریتانیا هۆکاری سەرەکی بوو لە ئەنجامدانی تاوانەکانی هێزەکانی لیڤی بەو پێیەی بەریتانیا بواری نەدا پۆلیس دەست وەرداتە کارەکە بۆ ئەوەی توند و تیژییەکان رابگرێت و بەو هۆیەشەوە ٥٠ کەس کوژران و ٢٠٠ی دیکەش بریندار بوون. لە ئەنجامدا هۆزەکانی کورد لە شارەکە قینیان هەستاو بریاریاندا پەلاماری شارەکە بدەن بۆ تۆڵە سەندنەوە لە خوێنی قوربانیان و هاوکات شێخ مەحمودی نەمریش هەوڵیدا شارەکە ئازاد بکات و تاوانبارانیش سزا بدات[١٣].

بەلای خەڵکی شارەکەشەوە ئەو رووداوە بە شەری ئەرمەن ناسراوە، چونکە ئەوان جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان ئەرمەن و ئاشورییەکان. هەر بەو هۆیەوە دانیشتووانی شارەکە نارەزاییان لەدژی رەفتارەکانی ئینگلیزو هێزەکانی لیڤی دەربری لە بەرانبەر دانیشتووانی شارەکە. بە تایبەت کە هێزەکانی هەوڵیاندا ئێوارەی جەژن هەڵبکوتنە سەر گەرماوی ژنان کە بە گەرماوی ( جوت حەمام ناسراوە). لە ئەنجامی ئەو کارەدا خەڵکی نارەزایی دەربری و لە بەرانبەریشدا هێزەکانی لیڤی بە تەقە وەڵامی خەڵکیان دایەوە. لە بەرانبەریشدا ئەدمۆندز وێنایەکی ناشرینی سەبارەت بەو رووداوە خستەروو ئەویش بەوەی رووداوەکەی وەکو ناکۆکییەکی گوایە لەنێوان هێزەکانی لیڤی چەند بازرگانێك روویدا بێت خستەروو ئەویش گوایە بەهۆی نرخی کاڵاو شمەکەوە بێت دواتریش پەرەی سەندبێت ئەو هەموو قوربانییەی لێکەوتبێتەوە.

دواتریش موسڵمانەکان لە کاردانەوەیەکدا رۆژی دواتر پەلاماریان داوە و موڵك و ماڵ و کڵێساکانی مەسیحییەکانیان بەتاڵان بردووە. دیارە بەڵگەی زۆریش لەبەردەستدایە کە هێزەکانی داگیرکاریی بەریتانیا کۆمپانیای نەوتی عێراق راوێژکارو سیاسەتمەدارانی ئینگلیز رۆڵی بەرچاویان هەبووە لە قووڵکردنەوەی کێشەو گرفتەکانی نێوان پێکهاتە ئایینییەکانی کەرکوك. بەتایبەت چەند کارێکی دوژمنکارانە لە دژی کورد بەریا کراوە بەو پێیەی هەرەشەی گەورە بوون لە دژی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لەو ناوچەیەی زۆر بە نەوت دەوڵەمەندە بەتایبەتی لەو کاتەدا کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد کاری بۆ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەکرد. لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کە حکومەتەکانی عێراق لە هەردوو سەردەمی پاشایەتیی و کۆماری درکیان بە مەترسی ئەم سیاسەتە نەکردووە لەسەر داهاتووی عێراق و بەڵکو بە پێچەوانەوە زیاتر سوور بوون لەسەر جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی دڕندانەتر و بەو هۆیەشەوە رووداوی کارەساتبار روویداو رەهەندی ترسناکی لێکەوتووەتەوە

باشترین بەڵگەش بۆ چەوتیی ئەو سیاسەتە ڕووداوەکانی مانگی تەممووزی ساڵی ١٩٥٩ بوون.

هەرچی گەشەکردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردیشە فەرمانڕەوایانی بەریتانیای ناچار کرد لە قۆناغی دوای داگیرکردنی کوردستاندا بیر لە بەجێهێشتنی ناوچە شاخاوییە کوردییەکان بکەنەوەو زیاتر دەست بەناوچە دەشتاییەکانەوە بگرن بە تایبەتی کەرکوك دیارە ئەوەش بەهۆی ئەوەی ڕووبەڕووبوونەوەی چەندین ڕاپەڕینی جەماوەری لە چەندین ناوچەی جیاجیای کوردستان.

هەڵبەتە هەمان بۆچوونیش لە کۆنگرەی قاهیرەدا ڕەچاو کراو جەختکرایەوە لەسەر مانەوەی کەرکوك و موسڵ وەکو بەشێك لە خاکی عێراق و دەستبەرداربوونی ناوچەکانی دیکەی کوردستان. دیارە ئەوەش بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی کوردی ئەو ناوچانەیە کە کاریگەری زۆری خستبووە سەر باری دارایی بەریتانیا. لە ئەنجامیشدا داواکرا لەو ناوچانە هێزەکانی بەریتانیا پاشەکشە بکات بەهۆی زۆری خەرجی پێویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕاپەڕینی ئەو ناوچانە. هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە کەرکوك دوای داگیرکردنی لەلایەن بەریتانیاوە ڕووبەڕووی سیاسەتی سەربازی توندو ئیدارەیەکی تایبەت بە خاکی داگیرکراو و فەرماندەی ئەفسەرانی سەربازی بووەوە کە هەر هەموویان بوون بەدار دەستی نوێنەری باڵای بەریتانیا کە ڕکێفی هەموو کارەکانی لەدەستدا بوو(١٤).

لەو سۆنگەیەوە ئەدمۆندز ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق ئاماژە بە هەوڵەکانی بەریتانیا دەکات لەپێناو مانەوەی کۆنترۆڵی بەریتانیا بەسەر ویلایەتی موسڵ و بەتایبەتی شاری کەرکوکی سەر بەو ویلایەتە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق. ناوبراو لەو بارەیەوە دەڵێت" هیچ کات گومان لای کەسمان دروست نەبووە کە ئێمە شەڕی مان و نەمان دەکەین سەبارەت بە عێراق، دیارە ئەویش بەهۆی ئەوەی بەسرەو بەغدا بەبێ موسڵ ناکرێت وڵاتێکی گونجاوییان لێ دروست بکرێت لە ڕووی ستراتیژو کاروباری ئابوورییەوە."

وێڕای هەوڵەکانی ئەدمۆندز بۆ شاردنەوەی خواستەکانی بەریتانیا لە نەوتی کەرکوك و موسڵ، ناچار بوو ئاماژە بە ڕاپۆرتەکانی ڕۆژنامە جیهانییەکان بکاتەوە کە جەختیان دەکردەوە لەسەر ئەوەی هۆکاری داگیرکردنی موسڵ بەهۆی شەڕی نەوتەوەیە. هاوکات مەلیك فەیسەڵیش لای خۆیەوە بایەخی زۆری بە ویلایەتی موسڵ دەداو لەو بارەیەوەشەوە بە یاداشتێکیدا سەبارەت بە کێشەی ویلایەتی بۆ کۆمەڵەی نێودەوڵەتی ئەو کات دەڵێت "شاری موسڵ سەری لاشەی عێراقە. باوەڕی خۆیشی خستبووە ڕوو لەوەی هەرچەندە ئەو ویلایەتی سنووری نێوان عێراق و تورکیا دیاری دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ویلایەتە دیاریکەری قەوارەی وڵاتی عێراقە بە گشتی بۆیە خۆشگوزەرانی یاخود خەمی ٤ ملیۆن مرۆڤی عێراق بەرجەستە دەکات".

سەبارەت ویلایەتی موسڵ بەرژەوەندییەکانی عێراق و بەریتانیا بەتەواوەتی جووت بوون. لەو بارەیەوە ئەدمۆندز دەڵێت" بەلای ئێمەی ئەفسەرە پلە نزمەکانی بەریتانیا هیچ جیاوازییەك لەنێوان بەرژەوەندییە دوور مەوداکانی عێراق و بەریتانیاوە ڕاستەوخۆ نەدەبینران.(١٥)"

هاوکات کوردستانی باشوور ڕووبەڕووی چەندین هێزی داگیرکار بووبووەوە کە چاویان بڕیبووە سامان و دزینی داهاتەکانی. لەلایەکەوە کەمالیستەکان چاوی تەماحیان بڕیبوو لێی و هەموو هەوڵەکانی خۆیان بۆ بەگەڕخستبوو بۆ ئەوەی کۆنتڕۆڵی تورکی بۆ بگێڕنەوە. گرنگیی و بایەخی لە ڕادەبەدەری ئەم مەسەلەیەش بە نیسبەت کەمالیستەکانەوە ئەوەیە کە مستەفا کەمال لە یەکەمین سەردانیدا بۆ ئەنکەرە لە ٣١ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ تەئکیدی کردەوە لەسەر ئەوەی سنووری تورکیای نوێ هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە پێشتر لەژێر کۆنتڕۆڵی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە لە کاتی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەی ئاگربەر هەر لە خاڵی باشووری کەنداوی ئەسکەندەرۆنەوە تاوەکو ئەنتاکیاو ڕێڕەوی حەلەب و وێستگەی شەمەندۆفێری قەتمە تا دەگاتە ڕووباری فورات و باشووری جەرابلوس. لەوێشەوە بە ئاراستەی باشوور تاوەکو دیرەزۆرو دواتریش بەرەو خۆرهەڵات تاوەکو موسڵ و کەرکوك و سلێمانی. ئەم ناوچانەمان نەك بەهێز پاراستووە لەلایەن هێزی چەکدارمانەوە، بەڵکو خاکی خۆمانە گەلی تورك و کوردمانی تێدا دەژین. لە باشووری ئەو هێڵەشەوە ئەو برا ئایینیانەی ئێمە دەژین کە بەزمانی عەرەبی ئاخاوتن دەکەن. ئێمە ئەو خاکەی ئەو سنوورانە بە گشتیی دەزانین ناکرێت هیچ بەشێك یاخود پارچەیەکی لێ پەرت بکرێت(١٦).

هێزەکانی بەریتانیا بە هاوتەریبی لەگەڵ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە ئاگرو ئاسن، بە بەردەوامی کاری بۆ ئەوە دەکرد کەرکوك بە تۆکمەیی ببەستێتەوە بە عێراق. لەو پێناوەشدا نوێنەری باڵای بەریتانیا لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨زایینی بیرۆکەی دروستکردنی هێڵی ئاسنینی بۆ پێکەوە بەستنەوەی کفری- کەرکوك- ئاڵتون کۆپری-هەولێر- ڕانیە- سلێمانی خستەڕوو. دیارە ئامانجی ڕاستەقینەی پشت ئەو پرۆژەیەش مانەوەی کۆنتڕۆڵی بەریتانیا بەسەر خاکی کوردستان، بۆیە وەزارەتی جەنگی بەریتانیا ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی لەسەر پرۆژەکە دەربڕی بەبێ هیچ مەرجێك. دواتریش پرۆژەیەکی هێڵی ئاسنین بۆ بەغدا- باقوبە- کنگربان- کەرکوك- هەولێر لە ساڵی ١٩٢٥زایینی جێبەجێکرا وەکو چاکترین هۆکار بۆ پێکەوە بەستنەوەی کەرکوك و کوردستانی باشوور بە گشتی بە بەغداوە بەپێی وتەکانی ویلسۆن(١٧).

هەڵوێستی دانیشتووانی کەرکوك سەبارەت بە داگیرکاری بەریتانیاو بەرنامە سیاسییەکەی هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهات. هاوکات دانیشتووانی شارەکە دەنگیان بۆ مەلیك فەیسەڵ نەدا بۆ ئەوەی ببێتە پاشای عێراق، دیارە ئەویش بەهۆی سیاسەتەکانی بەریتانیاوە لە دژی کوردو پڕوپاگەندەی تورك لە بەرانبەر لکاندنی موسڵ بە عێراقەوە بوو. هاوکات هیچ نوێنەرێکی کەرکوك لە ئاهەنگی بەشاکردنی پاشای نوێی عێراق لە ٢٣ی ئابی ساڵی ١٩٢١زایینی ئامادە نەبوو. هەڵبەتە هەمان شا سەبارەت بە شاری سلێمانیشەوە ڕوویداو نوێنەرییان لەو ئاهەنگەدا ئامادە نەبوو. بەڵام هەموو

ئەو هەڵوێستانە کاریگەریی نەبوو بەسەر ئەو سیناریۆیەی بەریتانیاوە. لەو بارەیەوە مس بێل لەپاش دەستبەکاربوونی فەیسەڵ وەکو شای عێراق نووسیویەتی و دەڵێت" ئێمە هەفتەیەکی سەختمان بەڕێکرد، بەڵام ئێستا پاشایەکی تاج لەسەرمان هەیە.[١٨]"

*** سیاسەتەکانی بەریتانیا و عێراق لە کەرکوك لەسەردەمی ئینتیداب:**

لەسەردەمی کێشەکانی موسڵدا شاری کەرکوك چەندین سەردانی گەورە بەرپرسانی بەریتانیاو عێراقی بەخۆوە بینی. لە ٢٠ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤زایینی مەلیك فەیسەڵ سەردان کەرکوکی کرد. دیارە ئەوەش بەمەبەستی داواکردن لە هاووڵاتیانی شارەکە بۆ ئەوەی بچنە ریزی دەوڵەتی نوێی عێراقەوە. هەڵبەتە سەردانەکەش بەهەند وەرگیرا بۆ ئەوەی ئاڵای عێراق لەسەر دامودەزگاکانی لیوای کەرکوك بەرز بکرێتەوە. واتە تەنانەت لەدوای ساڵێ لە لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی نێودەوڵەتی (عصبة الأمم) هێشتا کەرکوك لەلایەن ئەفسەرانی سیاسی بەریتانیاو پاشماوەکانی ئیدارەی عوسمانییەوە بەڕێوە دەبرا کە زۆربەیان لە نەتەوەی تورکمانی سوننە بوون[١٩].

هەردوو دەسەڵاتدارانی بەریتانیاو عێراقیش هەر بەردەوامبوون لەسەر هەوڵەکانی خۆیان بۆ قایبلکردنی کورد لە پێناوی لایەنگریکردنیان لە کێشەکەیاندا بۆ مولکدارێتی ویلایەتی موسڵ و بە مەبەستی سەرکەوتن و رەتکردنەوەی خواستەکانی تورکیا کە بەبەردەوامی دەستکەوتەکانی خۆی لە عێراقدا ئەو کات لەدەست دەدا. دیارە ئەویش بەهۆی ئەو سیاسەتە شۆڤینیانەی لەدژی هاووڵاتیانی کوردانی باکوور پەیڕەوی دەکرد.

لەو سۆنگەیەشەوە هەردوو لای بەریتانیاو عێراق لێدوانێکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە تێیدا هاتبوو "حکومەتی خاوەنشکۆی بەریتانیاو حکومەتی عێراق دان بە مافەکانی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لە چوارچێوەی سنووری عێراق دەژین و ئەو مافانە دەچەسپێنن بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی کوردی لەو ناوچانەی دانیشتووانەکەی زۆرینەی رەهای کوردن. بۆ ئەو مەبەستەش داوا لە کوردانی ئەو ناوچانە دەکەن بۆ ئەوەی پەیوەندی پێکەوە بکەن بە زووترین کات بۆ ئەوەی رێکەوتنی نێوانیان ئەنجام بدەن بۆ پێکهێنانی ئەو حکومەتەی خۆیان ئارەزووی دەکەن و سنووری حکومەتەکەیان ئیداری دیاری بکەن. هاوکات نوێنەرەکانی خۆشیان رەوانەی بەغدا بکەن بەمەبەستی تاوتوێکردنی پەیوەندیی ئابووری و سیاسییەکانی داهاتوی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق وبەریتانیا[٢٠].

دیارە ئەمە جگە لەو لێدوانانەی گەورە بەرپرسانی سەردەمی پاشایەتی عێراق کە لەسەروبەندی کێشەی موسڵدا بڵاویان دەکردەوەو تیایدا جەختیان لەسەر سەربەخۆیی کوردو رەزامەندی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی لەو بارەیەوە، کەچی دواتر دەرکەوت هەموو ئەو لێدوانانە بلقی سەر ئاون رۆڵی کۆمەڵەی نێودەوڵەتیش لەو بارەیەوە تەنیا بۆ فریودان بووە.

هەربە زوویش ئەو لێدوانانە لەبیر کراون و پشتگوێ خراون هەڵسوکەوتی ئەو لایەنانەش بەپێچەوانەی لێدوانەکانیان بووە.

سەرەتا ئینگلیزەکان بە پشتیوانی حکومەتی عێراقەوە هەوڵیان دەدا لە لیواو شاری کەرکوکدا رۆڵی کورد پشتگوێ بخرێت بە تایبەت لە رووی ژیانی سیاسی و ئابووری و ئیدارییەوە. لەو پێناوەشدا بەریتانیا هەلی بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەتە هەڵوەشاو و دۆراوەکەو خێزانەکانیان دەرەخساند بۆ ئەوەی لە کەرکوك و شاروشارۆچەکانیدا بمێننەوەو لەوێ جێگیر بن تەنیا ئەوان ببێ ئەوەی بوار بەهیچ شتێکی دیکەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بدەن بە مانەوە.

لەوەش سەیرو سەمەرەتر ئەوەیە دەسەڵاتدارانی داگیرکاری نوێ پەنای بردە بەر هەمان فەرمانبەرانی پێشوو بۆ ئەوەی کاروباری ئیداری و فێرخوازی لیواکە رایبکەن.

هەڵبەتە هیچ کەسی شارەکە دڵخۆش نەبوون بە پیاوان و فەرمانبەرانی پێشووی عوسمانی. دیارە ئەوەش تەنیا بە مەبەستی بەرگرتن بوو لەوەی نەبادە کورد رۆڵی کاریگەر لە داهاتووی ئەو لیوایە بگێڕن، بەتایبەت دوای گرنگیی ئەوەی رۆڵی ئابووری بایەخی ستراتیژی شارەکە بۆ هەموو لایەك دەرکەوت بە تایبەت بۆ بەریتانیا کە لەهەوڵێکی بێ پەروادا بوو بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق بەو سنوورەی کەوا ئێستا هەیەتی.

دیارە داواکاری بزووتنەوەی ئازادیخوازی ئەو کاتی کوردیش بۆ پێکهێنانی قەوارەیەکی نەتەوەیی سەربەخۆ لەچوارچێوەی سنووری جوگرافیایی و مێژوویی ناسراو بەلای ئینگلیزەوە هۆکاری پابەندبوونی بەریتانیا بووە بەو هەڵوێستەی بەرانبەر کورد دەیگرتە بەر.

هەڵبەتە ئەو ئەزمونانەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەریخست ببێ هیچ گومانێك کە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی کە بەنیازبوو پێکبهێنرێت بەهیچ شێوەیەك نەدەبوو بە دۆستی بەریتانیا یاخود هاوپەیمانی ئەو، دیارە ئەویش بەهۆی ئەو سیاسەت و رێگەچارە سەرکوتکارانەی لەدژی کوردو دژایەتیکردنی خەونەکان و ئارەزووەکانی کەوا لە پارچە جیاجیاکانی کوردستان دەیانگرتەبەر[٢١].

ئاشکرایە کەوا بەریتانیا ئاستەنگی زۆر گەورەی رووبەروو نەبووەوە لە هێنانەوەی پاساو بۆ ئەو سیاسەتانەی خۆی لە کەرکوك. زۆر کاتیش نوێنەرەکانی بەریتانیا باسیان لەوە کردووە کە ئەو شارە فەرمانبەرانی مامۆستایانی خۆماڵی ئەو شارەی کەمە. لەبەر ئەوە پێویستی دەکرد لەپێناو راییکردنی کاروباری شارەکە پەنا بۆ فەرمانبەران و مامۆستایانی ئیدارەی پێشوو ببرێت. هەڵبەتە ئەو وتانە تەنیا پاساوێك بوون و هیچی تر!

دواتریش داتاو سەرژمێرییەکانی شارەکەو لەدوای نزیکەی ٤٠ ساڵ لە کۆتایی هاتنی کۆنترۆڵی عوسمانییەکان لەو شارە کە بەشێکی ئەو سیاسەتە نەگریسەی ئاشکرا کرد کاتێك دەرکەوت کە هەزاران لە دایکبووی تورکیا لەنێو شاری کەرکوکدان و دەیان هەزار لەدایکبووی شارەکانی دیکەی پارێزگاکانی دیکەی عێراق بەهەمان شێوەن. یەکێك

لەو دیاردە بنەڕەتییانەی ئاماژە بە پشتگوێخستنی کورد دەکات ئەوەیە کە پۆستە باڵاکانی شارەکە دەسپێردرا بەغەیرە کورد. هەرچەندە کورد بە بەردەوامی ڕێژەی زیاتر لە٥٠٪ی شارەکەو ٧٥٪ی دانیشتووانی سەرجەم کەرکوکیان پێکدەهێنا. لە ماوەی ٣٧ ساڵی حوکمرانیدا، کە کتێبەکە باسی لێوە دەکات تەنیا ٥ موتەسەریفی کورد دەست بەکاربوون بەهەموویانەوە ٧ ساڵ حوکمران نەبوون، ئەوانیش هەریەك لە فەتاح پاشای کوردی (١٩٢٢-١٩٢٤) و تەحسین عەسکەری (١٩٣٠-١٩٣١) و سەعید قەزاز (١٩٤٨-١٩٤٩)و شێخ مستەفا قەرەداغی (١٩٥٠-١٩٥٢) و ڕەشید نەجیب (١٩٥٢-١٩٥٣).

لە بەرانبەردا هەرچی پۆستی سەرۆکی شارەوانیشە کە گوزارش لە ڕێژەی دانیشتووان دەکات بەردەوام پشکی کوردو بنەماڵەی تاڵەبانی بووە. وەکو محەمەد حەبیب تاڵەبانی ١٩٣٤-١٩٤٩ و فازڵ تاڵەبانی لە پەنجاکان، تا دەست لە کارکێشانەوەی لە پۆستەکەی لەدوای ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ی زایینی.

لە هەمان کاتدا سەرچاوەکان ئاماژە بە سەرۆکێکی تیپی دووی سەربازی دەکەن، کە کورد بووە ئەویش فەریق (ئەمین زەکی سلێمان)ە لە ماوەی ساڵی ١٩٣٦. هەروەها بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوك کە (عەلی کەمال)ە لە ساڵی ١٩٣٤ی زایینیە.

لە کاتێکدا دوو لەسەر سێی نوێنەرانی ئەنجوومەنی (نیابی) عێراق لە کورد بوون لە ماوەی فەرمانڕەوایی پاشایەتی و یەك لەسەر سێ لە تورکمان و عەرەب پێکهاتبوون، کە نوێنەرانی نیابی دەربڕی هاوسەنگی نەتەوەیی دانیشتووان دەخاتە ڕوو لە پارێزگاکە، بەپێی ئەو ئاماژەیەیە کە د. نوری تاڵەبانی باسی لێوە کردووە، هەرچەندە ئەم ڕێکەوتنە ناگونجێت لەگەڵ ئەو یاداشتەی کە محەمەد ئەمین زەکی ناردوویەتی بۆ فەیسەڵی یەکەم[٢٢].

مێژوونووس و وەزیری کورد محەمەد ئەمین زەکی لە یاداشتەکەیدا کە بۆ فەیسەڵی یەکەمی ناردووە لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠، دەربارەی پشتگوێخستنی کورد لە ئیدارەدانی لە عێراق و کوردستان و بە تایبەتی لە کەرکوك کە حکومەتی عێراق پابەند نەبووە بە پەیمانەکانی بەپێی بڕیاری (عصبة الأمم) کە ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیوە لەگەڵ هاوپەیمانەکەی بەریتانیای گەورە لەگەڵ بەڵێنەکانی سەرۆك وەزیرانی عێراقی لە (مجلس الامة) لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ی زایینی کە وەزیری (المستعمرات) پاکنووسی خستە ڕوو لە ٣ی ئەیلوولی هەمان ساڵ بۆ (عصبة الأمم) سەرۆك وەزیران لە وتەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە:- (پێویستە ماف کورد بدرێت، فەرمانبەران دابمەزرێنن بۆیان و دەبێت زمانەکەیان فەرمی بێت و فێرکردنی منداڵەکانیان لە قوتابخانە بە زمانی خۆیان بێت[٢٣].

ئەو زانیارییانەی کە لەم یاداشتەدا هاتووە گرنگییەکی گەورەی هەیە لەبەر ئەوەی نێردراوەکەی گەلێك پۆستی گرنگی وەرگرتووە لە وەزارەتەکانی ناوخۆ و مەعاریف و ئابووری و بەرگری و کار بۆ ماوەی پانزە جار لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٢٥ - ١٩٤٢).

زانیارییەکانی سەرچاوەی وەرگرتووە لە تۆمار بەڵگەنامە حکومییە فەرمییەکان و بەناوبانگە بە نووسەرێکی دەستپاك و بابەتی و پێکەوەژیان کە بەرەو ڕووی پاشای عێراق قسە دەکات نەك یەکێکی تر بۆیە بەڵگەکانی ڕاستگۆیی تێدایە.

محەمەد ئەمین زەکی ئاماژە بەوە دەکات کە هیچ ماوەیەکی ئەو بەڵێنانە جێبەجێ نەکراوە لەدوای پێنج ساڵ بەسەر دەرچوونیەوە.

ژمارەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە ژمارەی فەرمانبەرە کوردەکان لە زۆربەی وەزارەتە سەرەکییەکان پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە، بەڵام لە گەلێك وەزارەتی تر ڕێژەیان کەمی کردووە، لە هەمان کاتدا ژمارەی فەرمانبەرە غەیرە کوردەکان زۆری کردووە بەڕێژەی سەد لەسەدا، کە ئەم ناهاوسەنگییە لەگەڵ بەیانەکانی وەزیری (المستعمرات) ی بەریتانی هەروەها بەرپەرچی ئەو هەڵانەی داوەتەوە کە گوایە پاکانەی ئەوە دەکەن کە گوایە کەسانی شیاویان نییە لە نێو کورد بۆ وەرگرتنی پۆستی حکومی لە وەزارەت و لیوا کوردییەکان، یاداشتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە فەرمانبەرانی کورد لە سەردەمی عوسمانی گەلێك کاری گەورەی مەدەنی و سەربازییان بەجێهێناوە لە هەرسێ ولایەتەکانی کە عێراقیان لەسەر دامەزراند لەدوایدا.

زۆربەی ئەو کەسانەش لەو ناوچانەی لێکنران بەعێراقەوە تا ئێستا ماون و لە ناوچەکانی خۆیان دەژین، بۆیە حکومەتی عێراق بەهیچ شێوەیەك ناکرێت پاساو بهێنێتەوە بۆ ئەوەی کەوا کەسی شیاو لە ڕیزی کورددا نییە بۆ لەدەستگرتنی ئەو پۆستانە. بەڵکو کەسانێکن کە ئارەزوو توانای پێویستیان هەیە بۆ لەدەستگرتنی ئەو جۆرە پۆستانە. هەرچی خودی محەمەد ئەمین زەکی گەواهی ئەوە دەدا کە زۆرێك لەو کەسایەتییانەی ئیدارەی عوسمانی سەردانی ئیدارەی عێراقیان کردووە بە پۆستی نزمتر لە تواناکانی خۆیان قایل بوون، بەڵام وەڵام نەدراونەتەوە، کەچی ئەوانی دیکە لە نەتەوەکانی تر بەتواناو کارامەیی نزمترەوە پۆستیان وەرگرتووەو کورسی وەزارەتیان پێدراوە[٢٤].

سەبارەت بە پشتگوێ خستنی کوردو ڕەچاونەکردنی دادپەروەری و یەکسانی لەنێوان پێکهاتەکانی عێراق لە ڕووی دامەزراندنی فەرمانبەرانەوە، محەمەد ئەمین زەکی لە یاداشتێکیدا نووسیویەتی (بەر لەوەی وەڵامی پرسیارێکی دیکە بدەمەوە پێویستە بڵێم حکومەت ڕەچاوی دادپەروەری و یەکسانی ناکات لەنێوان نەتەوەکانی عێراق لە بواری دامەزراندندا.

گەر وردبینییەك لە دۆکیومێنتەکاندا بکەین دەردەکەوێت ڕێژەی فەرمانبەرانی کورد لە لیوای کەرکوك٢٤,٥٪و تورکمان نزیکەی ٥٦,٥٪ و عەرەب و ئەوانی دیکە ١٩٪. لە کاتێکدا بەپێی ئەو سەرژمێرییە موتەسەریفییەی لیوای کەرکوك خودی خۆی ئەنجامیدا دەرکەوت ڕێژەی دانیشتووانی کورد لە لیواکەدا ٥١٪و تورکمان٢١٪و عەرەب٢٠٪و نەتەوەکانی دیکەش٧٪. لێرەوە دەردەکەوێت کە حکومەت بەهۆی هەندێك هۆکاری نەزانراوەوە بەلای منەوە پێشموانییە کە

راست بێت، هاوکاری تورکمان دەکات و زیان بەهەریەك لە کورد و عەرەب دەدات. هەڵبەتە ئەم هەڵوێستەشی بەبێ هیچ گومانێك نارەزایی و بێزاری کورد دەوروژێنێت هەروەك گومانی ئەوەش دێنێتە ئاراوە سەبارەت بە دادپەروەری حکومەتی عێراق کە پێویستە بە یەکسانی رەچاوی بکات بۆ هەموو نەتەوەکانی کەوا پێویستە بە یەك چاو تەماشای هەموویان بکات[٢٥]. کەواتە ٧٦٪ ی فەرمانبەرانی لیوایی کەرکوك لە نەتەوەی غەیرە کوردن کەچی بەپێی دادپەروەری و یەکسانی دەبوو ٥١٪ بۆ کوردو ٤٩٪ بۆ نەتەوەکانی دیکە ببوایە.

هەروەك پێویستە لێرەدا ئاماژە بە هۆکارێکی گرنگ بکەین کە هۆکاری پشتگوێ خستنی کوردی لێکەوتبووەوە لە ئیدارەی دەوڵەتی عێراقدا ئەویش ئەوەیە زمانی خوێندەواریی و پەروەردە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا زمانی تورکی بووەو هاوکات لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقی نوێدا زمانی عەرەبی شوێنی ئەو زمانەی گرتووەتەوە وێرای ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری سەربازان و فەرمانبەران زمانی عەرەبییان نەزانیوە لەو کاتەدا. بەو پێیەش مافی بەدەستهێنانی پۆستی حکومییان لەدەستداوە.

لە ئەنجامیشدا زۆرێك لە فەرمانبەرە باڵا کوردە گەراوەکانی ئەو کات بۆ عێراق پەنایان بردووەتە بەر مامۆستای تایبەتی زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی فێری هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی ببن. هەڵبەتە خودی محەمەد ئەمین زەکی یەکێك بوو لەو کەسایەتییانە کە لەدوای گەرانەوەی لە ئیستانبوولەوە پەنای بردە بەر مامۆستای تایبەت بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و بەباشی فێریان بوو، بەڵام ناوەخت کۆچکردنی فێری قسەکردن بە دیالێکتی لۆکاڵی بەغدادی نەبوو کە زۆر مەراقی فێربوونی بوو[٢٦].

هاوکات حکومەت هیچ هەنگاوێکی نەگرتەبەر بۆ لابردنی ئەو ستەمە کەوا بەرانبەر بە کورد ئەنجام دەدرا، بەڵکو ئەو سیاسەتەی حکومەت پەیرەوی دەکرد ئەو بارودۆخەی لە داهاتودا قووڵتر کردەوە. لەو سۆنگەیەوە ژمارەی ئەو خوێندکارانەی رەوانەی هەندەران کران لە ساڵی ١٩٢٩ بەمەبەستی بەردەوامیدان بە خوێندن ١٢٠ خوێندکار بوون کەچی ٢یان٣ کەسیان کورد بوون. بەپێی مەرجەکانی وەزارەتی مەعاریفی ئەو کات ناردنە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن دەبوو خوێندکار قۆناغی ئامادەیی تەواو کردبێت. کەچی لە هەموو خاکی کوردستاندا تەنیا یەك قوتابخانەی ئامادەیی هەبوو. هاوکات قوتابیانیش لە توانایاندا نەبوو بەمەبەستی خوێندنی ئامادەیی رووبکەنە بەغدای پایتەخت، دیارە ئەویش بەهۆی ئاستەنگی زمان و توانای داراییەوە بووە. بەو جۆرەش ساڵ لەدوای ساڵ بارودۆخەکە بەرەو خراپی دەرۆیشت و حکومەتیش وای دەردەخست کەوا کوردەکان لە شارەکانی دیکەی عێراقی غەیرە کوردی پۆست دەگرنە دەست. کەچی راستی بارودۆخەکە بەو شێوەیە نەبوو رێژەی فەرمانبەرانی کورد لە هیچ شارێك نەدەگەیشتە ٥٪.کەچی رێژەی ٢٦٪ فەرمانبەرانی شاری سلێمانی لە نەتەوەکانی غەیرە کورد بوون و تەنیا یەك بەرێوەبەری گشتییش لە کۆی ١٩ بەرێوەبەری گشتیی کورد نەبوو.

هاوکات تەنیا یەك ئەفسەری کورد لە سەرۆکایەتی و بەرێوەبەرایەتی فەرمانگە سەربازییەکانی وەزارەتی بەرگریدا هەبوو هەروەك لە فەرماندەییە سەربازییەکانی ناوچەکانی دیکەش هەر بە هەمان شێوە بوون[٢٧].

سەبارەت بە نوێنەرایەتیکردنی کوردیش لە پەرلەمان، محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت: مافی دەستووری کورد لە ئەنجوومەنی نوێنەران کەم بووەو بەپێی راپۆرتەکانی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی رێژەی دانیشتووانی کورد لە لیواکانی باکووری عێراق دەگاتە ١٨٪ی کۆی دانیشتووانی عێراق نەوەکو ١٧٪ وەکو هەندێك لایەن بانگەشەی بۆ دەکەن. بەو پێیەش دەبوو ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانی کورد ١٦ پەرلەمانتار بێت لە کۆی ٨٨ ئەندام. کەچی گەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ ئەوەی وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا خودی خۆی ناونووسی کردوون بۆ پەرلەمان تەنیا ١١ ئەندام پەرلەمان بوون[٢٨].

هەروەك دابەشکردنی پۆستەکانی وەزارەتی دادیش کە بەلای کۆمەڵەی نێودەوڵەتییەوە جێی بایەخ بوو لەکاتی هەڵسەنگاندنی کێشەی موسڵ و لکاندنی بە عێراقەوە. رێنماییدا بە پێویستی دامەزراندنی فەرمانبەرانی کوردو گرتنەبەری رێوشوێنەکانی دادگاییکردن بە زمانی کوردی بەو پێیەی پەیوەندی راستەوخۆی بە ژیانی هاووڵاتییانەوە هەیە.

کەچی وێرای بەڵێنەکانی هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراق، بەڵام هیچیان جیبەجێنەکران تەنیا لە شارەکانی سلێمانی و کۆیە نەبێت. لەو بارەیەوە محەمەد ئەمین زەکی ئاماژە بەوە دەکات( کورد لە دادگاکانی لیواکانی کەرکوك بەزمانی تورکی و لە هەولێر و مووسل و خانەقین ناچار دەکرێن بە عەرەبی دادگایی بکرێن. دیارە ئەو بارودۆخەش هۆکارێکی زۆر سەخت بوو بۆ نەهامەتییەکانی کورد لەو ناوچانە بەو پێیەی دەبوو پەنا بەرنە بەر وەرگێری زمانەوانی بۆ دەرخستن و خستنەرووی سکاڵاو داواکارییەکانیان لە بەردەم دادگاکان و ئەرکی داکۆکیکردن لە مافەکانیان بسپێرن بەو وەرگێرانەو چاوەروانی بەزەیی ئەوان بن. دیارەی زۆربەی جاریش ستەمێکی زۆریان دەرهەق کراوە، هەڵبەتە ئەویش بەهۆی لاوازی وەرگێرەکان یاخود ئەنجامدانی ساختەکاری لە مافەکانی سکاڵاکارو سکاڵالێکراو دیارە ئەویش بەهۆی بەرژەوەندی تایبەتەوە، هەڵبەتە ئەوەشە هۆکاری سووربوونی کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی لەسەر پێویستی دادگاییکردن بە زمانی کوردی لە دادگاکاندا)[٢٩].

بەو پێیەش دەبینین کە بارودۆخی کورد لە عێراق لە ساڵی ١٩٣٠زایینی لە بواری بەشداریکردن لە چالاکیی سیاسی و ئیداری زۆر لە بارودۆخی ساڵی ١٩٢٦ زایینی خراپتر بوو، کە ساڵی بەڵێن و پەیمان بوو سەبارەت بەراییکردنی مافەکانی کورد لە ویلایەتی موسڵ. دیارە وێنای کورد لە کەرکوك زۆر لەو بارودۆخەش خراپتر بووە.

هەڵبەتە زمانی نەتەوەیی و بارودۆخی پەروەردەو فێرکردن

و پارێزگاریکردن لە کلتوری نەتەوەیی و پێشخستنی ئەو کلتووره لایەنی گرنگی ژیانی نەتەوەکانە و هەڵوێستی حکومەتەکانی فرە نەتەوەش لەو بارەیەوە سەنگی مەحەك و بەردی بناغەی دانپێنانی ناسنامەی نەتەوەیی و سەلماندنی مافەکان و سەروەریی دادپەروەری و یەکسانییە بەرانبەر بە هەموو پێکهاتەکان.

هەروەك دانپێنان بە ناسنامەی نەتەوەیی و زمان و رۆشنبیری و کلتووری نەتەوەیی هۆکارێکی بنەرەتی بەدەستهێنانی هەلی پێویستە بۆ رۆڵەکانی کەمینە نەتەوەییەکان بۆ ئەوەی بەشدار بن لە چالاکی سیاسی و ئابووری و ئیداری و کلتوری وڵاتدا. بە پێچەوانەشەوە چارەنووسی ئەو کەمینانە پشتگوێ خستن و دواکەوتن و سرینەوەی ناسنامەو ماف نەتەوەییانە. لەو سۆنگەیەوە جەخت لەسەر ئەو بابەتانە دەکەینەوەو ئاماژە بەو داتاو ئامارو سیاسەتەکانی حکومەت دەکەین لەو بارەیەوە سەبارەت بە کوردی کەرکوك بە تایبەت.

لە راپۆرتێکیشیدا سەبارەت بە بارودۆخی فێرکاری لە عێراق مێژووناسی کورد محەمەد ئەمین زەکی ئاماژە بۆ ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان خەرجییە دارایییەکانی نێوان لیواکانی عێراق دەکات لەساڵەکانی ١٩٢٦-١٩٢٧.

لە کاتێکدا کە ٣٨٪ی داهاتی لیوای بەغداو ١٩٪ی داهاتی لیوای موسڵ بۆ کەرتی فێرکاری ئەو دوو لیوایە تەرخان کرابوون، ٩٪ ی داهاتی کەرکوك بۆ ئەو بوارە تەرخان دەکرا[٣٠]. هەرچی لیواکانی دیکەشە زۆر لەو رێژەیە کەمتریان بۆ تەرخان کرابوو. سەبارەت بە لیوای سلێمانی ١٪ی رێژەی داهاتی بۆ تەرخان دەکرا. هاوکات پشکی شێری ئەو رێژەیە کە بریتی بوو لە ٩٪ ی داهاتی کەرکوك بەر خوێندنگا غەیرە کوردییەکان دەکەوت.( چونکە هیچ خوێندنگایەکی کوردی لە لیواکەدا نەبوو) بەو پێیە سیاسەتەکانی حکومەت لە کەرتی فێرکردندا نموونەیەکی زەقی پێشێلکردنی مافەکانی کوردو پشتگوێ خستنی رۆڵی کورد بوو لە بوارە جیاوازەکانی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری.

هەڵبەتە بڵاوکردنەوەی خوێندنی کورد لە ناوچە کوردنشینەکاندا یەکێك بوو لەو چوار مەرجەی کە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی دانابوو بە رەزامەندی حکوومەتی عێراق و حکومەتی هاوپەیمانی بەریتانیاو بۆ ئەو مەبەستەش پەیمانی جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەیان لەبەردەم ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی (مجلس العصبة) دابوو.

لە دوای تێپەربوونی پێنج ساڵ بەسەر ئەو پەیماننامەیەشدا دیمەنەکە لە گومان و نیگەرانی زیاتر شتێکی تر نەبوو بەلای کوردەوە. خوێندن تەنیا لە شاری سلێمانی بەزمانی کوردی بوو. هەرچی لیوای کەرکوکە کەوا زۆرینەی دانیشتووانەکەی کوردن، تەنیا ٣ قوتابخانەی کوردی تێدا بوو. لە بەرانبەریشدا ئەو٢٠ خوێندنگاکەی شارەکە، یەکێکیان نەبێت، هەر هەمووی خوێندن تێیدا بەزمانی تورکی بوو. ئەمە لە کاتێکدا کە رێژەی ئەوانەی بەزمانی تورکی لە شارەکەدا قسەیان دەکرد لە ٢١٪ تێپەڕنەدەبوو. لەو سۆنگەیەشەوە محەمەد ئەمین زەکی نیگەرانی خۆی لەو بارودۆخە خستەروو هەروەك تەئکیدیشی کردەوە کەوا هاووڵاتیانی کوردی کەرکوك ئارەزوویان نییە منداڵەکانیان بۆ خوێندن بە زمانی تورکی بنێرن، چونکە خۆشحاڵ نین منداڵەکانیان بە زمانی تورکی بخوێنن، بەهۆی ناچارییەوە ئەو کارە دەکەن. هەروەك ئەوەشی خستەڕوو کەوا ئەو کارە پێچەوانەی بنەماکانی زانستی فێرخوازییەو لەوەی زیاتر کە زیان گەیاندنە بە کوردو پشتگیریکردنی لایەنەکانی دیکەیە، شتێکی تر نییە.

لەوەش سەرسامتر ئەوە بوو کەوا بە بەردەوام ژمارەی قوتابخانە کوردییەکان روویان لە کەمتر بووە لە ساڵی ١٩٢٣ تەنیا ٦ خوێندنگای کوردی هەبوو لە بەرانبەر ١٣ خوێندنگای تورکی. پاساوی ئینگلیزەکانیش بۆ ئەو کارە ئەوە بوو کە سیستەمێکی فێرخوازی ئامادەی تورکی بوونی هەیەو وا پێویست دەکات کار بۆ مانەوەی بکرێت. تاوەکو سیستەمێکی نوێی خوێندن لە عێراق ئامادە دەکرێت و بەردەوام کەمیی ژمارەی مامۆستایانی کوردی و کەمیی ژمارەی کتێبی بە زمانی کوردی کردبووە بیانوو. لێرەدا وا پێویست دەکات ئاماژە بەوە بکرێت کە زۆریی ژمارەی قوتابخانە تورکییەکان لە شارەکە هەرگیز ناکرێت وەکو بەڵگەیەك بۆ زۆریی ژمارەی هاووڵاتیانی تورك لە کەرکوك بە هەند وەربگیرێت، بەڵکو دەکرێت وێناکردن و رەنگدانەوەی سیستەمی فێرخوازی تورکی بێت لە کەرکوك و هەمان شێوەش لە ویلایەتە عوسمانییەکانی دیکە بەرچاو دەکەوتن.

بەو پێیە دەرکەوت کە حکومەتی عێراق بەهیچ شێوەیەك پابەندی ئەو بەڵێنانەی خۆی نابێت کە لە چوارچێوەی خوێندن بە زمانی دایکدا بە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی (عصبة الامم)ی دابوو. لەو رووەشەوە گۆڤاری (زاری کرمانجی) وێنەیەکی روونی سەبارەت بە نیگەرانیی خوێندکارانی کوردی لە کەرکوك خستەروو. لەو پێناوەشدا نووسەری کەرکوکی ع.خ.ی لە گۆڤاری ناوبراودا لە بەرواری ١٩ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٩ نووسیویەتی دەڵێت: خوێندن لە قوتابخانە کلدانی و ئیسرائیلییەکان (جولەکەکان)و ئەرمەنییەکانی کەرکوکدا بەزمانی ئەو نەتەوانە بوون، لە کاتێکدا تەنیا خوێندکارانی کورد ناچار دەکران بە زمانی بێگانە بخوێنن، ئەمەش دۆخێکی لێڵی لە پرۆسەی خوێندن لە کەرکوکدا هێنابووە پێشێ و وایکردبوو خوێندکارانی کورد بە بەراورد لە هاوپیشەکانی خۆیان دوابکەون. لە سەرەتای خوێندنیانەوە کورد ناچار دەکران ماوەی چوار ساڵ بەزمانی تورکی بخوێنن و دواتریش بەبێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆی زانستی فێر ببن دەخرانە بەر خوێندن بە زمانی عەرەبی و پاشان دوای سێ یان چوار ساڵی خوێندنی دیکە کە فێری زمانی عەرەبی دەبوون دەچوونە بەغداو تاقیکردنەوەیەکی سەختیان ئەنجام دەدا بۆ ئەوەی لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرنەچن و دواتر لە پرۆسەی خوێندن دوور بخرێنەوە.

نووسەر زیاتر دەڵێت لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا هەموو ئەو خوێندکارە کوردانەی لە کەرکوکەوە چووبوون بۆ بەغدا بە سەرنەکەوتویی گەڕاونەتەوە. کاریش بەوەوە نەوەستا، بەڵکو سەرجەم ئەو خوێندنگا کوردی تەکیەو

حوجرانەش کەوا کورد هیوایەکی زۆری لەسەر هەڵچنیبوو و منداڵەکانی خۆیان بۆ خوێندن ناردبوو بە پەلە داخران و هەموو هەوڵەکانیش بۆ کردنەوەیان بێسوودو بێئەنجام بوو.

لە کۆتایی بابەتەکەشیدا نووسەر دەڵێت: کورد نەهامەتییەکی زۆری هەبوو بەهۆی سەردانیکردنی فەرمانگە حکومییەکان ئەو نووسراوانەی ئەو فەرمانگانە چونکە کورد لێی تێنەدەگەیشتن پەنایان بۆ مەلاو پیاوانی ئایینی دەبرد بۆ ئەوەی بۆیان شیکار بکەنەوە[٣٢].

وێڕای ڕێنماییەکانی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی سەبارەت بە کێشەی موسڵ و بایەخدان بە خواست ویست و ئارەزووی کورد بۆ دامەزراندنی فەرمانبەری کوردی حکومەت لە ناوچەکانیان و کردنی زمانی کوردی بە زمانی دادگاو قوتابخانەکان، ژمارەی قوتابخانەی کوردی لە کەرکوك تەنیا ٦ قوتابخانەو لە موسڵیش تەنانەت یەك قوتابخانەی کوردیشی لێنەبوو. کەچی لە کەرکوك سیازدە قوتابخانەی تورکی بە ڕەسمی بوونی هەبووەو لە موسڵیش قوتابخانەیەکی ئەهلی تورکی هەبوو ئەمە وێڕای چوار قوتابخانەی ئاشووری حکومی و یەك قوتابخانەی ئەهلی غەیرە حکومی. ئەم خشتانەی خوارەوەش ئەو ڕاستییانە بەوردی دەخاتەڕوو:

قوتابخانە سەرەتاییە حکومییەکانی کوڕان

| ساڵ | لیوای کەرکوك ژ.قوتابخانە | ژ. قوتابی | لیوای موسڵ ژ.قوتابخانە | ژ. قوتابی |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٢٣\٢٢ | ٦٧٨٩ | ٦٨ | ١٣٦٩ | ١٤ |
| ١٩٢٤\٢٣ | ٦٤١٧ | ٧٢ | ١٥٤٤ | ٢٤ |
| ١٩٢٥\٢٤ | ٦٢٨٩ | ٧٣ | ١٤٧٤ | ٢٤ |
| قوتابخانە سەرەتاییەکانی کچان | | | | |
| ١٩٢٣\٢٢ | ١٧٦٩ | ١٩ | ١٦٩ | ٣ |
| ١٩٢٤\٢٣ | ٢٢٣٠ | ١٨ | ٩٢ | ٢ |
| ١٩٢٥\٢٤ | ٢١٩٧ | ١٩ | ٩٥[٣٣] | ٢ |

وێڕای یەکلاییبوونەوەی کێشەی موسڵ و ڕێنماییەکانی لیژنەی تایبەت بە بایەخدان بە خوێندنی کوردی، کەچی بارودۆخەکە چاکبوونەوەی بەخۆوە نەبینی و ژمارەی قوتابخانە کوردییەکان لە ساڵی ١٩٣٠ گەیشتە ٤١ قوتابخانەو ١٥٤٥ قوتابی. کەچی لە هەمان کاتداو لە هەمان ساڵ ١٤ قوتابخانەی تورکی حکومی ٩٦١ قوتابییان هەبووەو ٢٧ قوتابخانەی مەسیحی ٣٣٠٣(؟)و ٥ قوتابخانەی جوولەکەش ٥٨ خوێندکاریان هەبوو[٣٤]، هەڵبەتە ئەو بارودۆخەش کوردی نیگەران کردووە و دەسەڵاتدارنی ئینتیدابی بەریتانیاش لە نووسراوەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بەو نیگەرانییەی کورد کردووە سەبارەت بە کەمیی ژمارەی قوتابخانەی کوردی و هاوکات پاساوی بۆ ئەوەش هێناوەتەوە گوایەکە جێبەجێ کردنی خواستەکانی لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای عێراقدا یەکناگرێتەوە تەنانەت بە بەرژەوەندی کوردیشەوە[٣٥].

لێرەدا پرسیار ئەوەیە : چۆن دەبێت خوێندن بەزمانی دایك لەبەرژەوەندی نەتەوەکەدا نەبێت.

هەرچەندە ڕێنماییەکانی پاشای ئەو کاتی عێراق لە ساڵی ١٩٢٦ بۆ هاووڵاتیان ئەوە بووە کە ئەرکی ئەوان ڕەچاوکردنی برایانی کوردی عێراقییان بن بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ناسنامەی عێراقی بوونی خۆیان بکەن لەو وڵاتە دوور نەکەونەوە، هەروەك عەبدولموحسن سەعدونی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتی عێراقیش لە ٢٢ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ بە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ڕاگەیاند: گەر عێراق بخوازێت بە ئارامی گوزەران بکات پێویستە لەسەری ماف سەرجەم پێکهاتەکانی فەراهەم بکات، چونکە هەموو بینیمان بەچاوی خۆمان کەوا هۆکاری هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانی چیبوو کە ماف پێکهاتەکانی خۆی پێشێل دەکردو بەری پێشکەوتن و گەشەکردنی لێدەگرتن".

هاوکات نوێنەری باڵای (المندوب السامي) بەریتانیاش لەهەمان بۆنەدا کە مەلیك فەیسەڵ وتارێکی خوێندەوە، دەسەڵاتدارانی عێراقی لەوە ئاگادار کردەوە کەوا" پێویستە ئامانجی حکومەتی عێراق ئەوە بێت کە سەرجەم ڕۆڵەکانی ئەو وڵاتە دڵسۆزی وڵاتەکەیان بن بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش پێویستە کار بۆ ئەوە بکات پابەندی ئایینی خۆیان بن و شانازی بە هاووڵاتیبوونی خۆیانەوە بکەن و هەرگیز کورد نەکرێت بە عەرەب، هەروەکو ئەوەی کە ئوسکوتلەندی نەبووەتە ئینگلیز. هەرگیز نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە نایەتە ئاراوە گەر کورد ناچار بکرێت کە زمانی عەرەبی بەکاربهێنێت و دابوونەریتی عەرەبی پەیرەو بکات. پوختەی وتارەکەشی ئەوەبوو کە ناکرێت هەوڵبدرێت کورد بکرێت بە عەرەبی تەواو، بەڵکو پێویستە هان بدرێت بۆ ئەوەی ببێتە کوردێکی دڵسۆزی تەواو.[٣٦]"

هەڵبەتە ئاشکرابوو لای ئینگلیز کە گەر کورد بواری بۆ برەخسێت بەزمانی خۆی فێر بکرێت و گەر توانیان ڕۆشنبیری نەتەوەیی خۆیان پەرەپێبدەن ئەوا هەرگیز بەو بارودۆخە ناهەموارە ڕازی نابن و داوای مافە زەوتکراوەکانی خۆیان و بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری دەکەن. کەچی لە بەرانبەردا سیاسەتی بەریتانیا لەسەر بنەمای پشتگوێخستنی ڕۆڵی کوردو بێبەشکردنیان لە بەشداریکردنی کاریگەری سیاسی بوونیاتنرابوو.

دواتریش ددرهاویشتەکانی پشتگوێ خستنی حکومەت بۆ خوێندنی کوردی لە کەرکوك زۆر بەڕوونی دەرکەوت، کاتێك ژمارەی خوێندەوارانی لە ساڵی ١٩٥٣ گەیشتە ٢٠٥٣٤ کەس نەخوێندەوارانیش ٢١٤٩٨٠ کەس. هەروەك ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوڕان ٧١ قوتابخانەو کچانیش ١٣و باخچەی ساوایانیش ١١ قوتابخانەی ناوەندی کوڕان ٦و کچانیش ٢. هاوکات هەموو ئەو قوتابخانانە لە ناوجەرگەی شارو قەزاو ناحییەکان بوون.

دکتۆر شاکر خیسباك لای خۆیەوە کێشەو گرفتەکانی پەروەردەو فێرکردنی لە کوردستان دەستنیشانکرد، ناوبراو دوای ئەوەی بەشێوەیەکی بابەتیانە ئاماژە بە هۆکارە ئابوورییەکان دەکات، دواتر ئاماژە بەوە دەکات کەوا ناوچە

کوردییەکان کێشەی تایبەت بەخۆیان هەیە ئەویش کێشەی زمانی خوێندەوارییە، چونکە خوێندن لەو ناوچانە لە قۆناغی سەرەتاییدا بەزمانی کوردییە لە کاتێکدا لە قۆناغی ناوەندی ئامادەییدا بە زمانی عەرەبییە.

ئەوەشی کە گومانی تێدا نەبێت ئەوەیە کە گۆڕانکاری لەناکاوی زمانی خوێندن لە کوردییەوە بۆ عەرەبی پرۆسەیەکی زۆر سەختە بۆ خوێندکاری کورد. بۆیە بەپێی بڕیارەکانی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی(عصبة الامم) وەکو ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٦دا ڕاگەیەندرا، مافی خۆیانە بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بخوێنن و پێویستیشە لەسەر وەزارەتی فێرکردن کتێب بە زمانی کوردی دابنێت و کتێبە عەرەبییەکان بگۆردرێت بۆ زمانی کوردی، هاوکات دەکرێت قۆناغەکانی دواتری خوێندن لە زانکۆ و پەیمانگاکانداو تاوەکو کردنەوەی زانکۆ بە زمانی کوردی، وەکو ئاسانکارییەك زمانی عەرەبیش وەکو بابەتێکی سەرەکی لە قوتابخانە کوردییەکاندا بوترێتەوە.

لە بەرانبەریشدا بەو پێیەی دەبوو مامەڵەکردنی نەتەوە جیاوازەکانی وڵات بە یەکسانی بەبێ جیاوازیی بوایە، پشگوێخستنی زمانی کوردی بە بەردەوامی مایەی نیگەرانی نەتەوەی کورد بووە[٣٧].

هەر لەو سۆنگەیەشەوەیە کە کەرکوك پێشکەوتنی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی بەتایبەتی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا. لە هەمان کاتدا ئینگلیزەکان لە ١٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ەوە، واتە لەدوای تەنیا ٢٠ ڕۆژ لەداگیرکردنی عێراق، ڕۆژنامەیەکی عەرەبییان بەناوی (النجمة) لە کەرکوك دەرچوواند. دواتریش لە ساڵی ١٩٢٦ ناوەکەیان گۆڕی بۆ (کرکوك) و یەکەم ژمارەی ڕۆژنامە نوێیەکە لە ١٢ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٦ دەرچوو. ئەوەی مایەی نیگەرانیش بوو دەسەڵاتداران بواریان نەداوە هیچ بابەتێك بەزمانی کوردی تێیدا بڵاوبکرێتەوە. پاشان دوابەدوای پەیماننامەی بەریتانیا-عێراق و هەوڵەکانی وەرگرتنی عێراق وەکو ئەندام لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و لەژمارەی ٣٠٢ ڕۆژنامەکە بەدواوە لەڕۆژی ٢ی مایسی ساڵی ١٩٣٠ بوار درا بۆ ئەوەی لەکۆی ٦ لاپەرەی ڕۆژنامەکە ٢ لاپەرە بەزمانی کوردی بێت. هەروەك ٢ لاپەرەشی بۆ ئاگاداری و کاروباری حکومی و ئەهلی تەرخانکرا.

لە هەمان کاتدا ئەم بۆچوونە نوێیەی ڕۆژنامەکە بەم پاساوە ئەنجامدرا: "دیارە ئەم گۆڕانکارییە ناوازەیە لە ئەنجامی بۆچوونە دادپەروەرییەکانی حکومەتە دادپەروەرە بەرێزەکەمانەوە هاتووە بەمەبەستی بەدیهێنانی مافەکانی هاووڵاتیانی کوردی ناو شارەکەمان ".

هەڵبەتە تەرخانکردنی ٢ لاپەرەی ڕۆژنامەکە وەکو ڕێگەخۆشکەرێك ئەنجامدراوە بۆ کارکردن بۆ بە ئەندامبوونی عێراق لە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی و هەنگاوێکی دیکەشی بەدواداهات کە بریتیبوو لە دامەزراندنی (تەحسین عەسکەری) دانیشتووی گوندی عەسکەری نزیك چەمچەماڵ وەکو موتەسەریفی شاری کەرکوك و دامەزراندنی (تۆفیق وەهبی)ش وەکو موتەسەریفی شاری سلێمانی و دەرچوونی یاسای زمانەکانی ناوخۆ.

لەو بارەیەشەوە ڕۆژنامەی (کەرکوك) لە دوای دابەزاندنی ژیاننامەی موتەسەریفی نوێ دەنووسێت کە لە خێزانێکی کوردی بەناوبانگەو چەندین پلەو پایەی لە سوپای عوسمانی و دەوڵەتی عێراقیدا هەبووە، هەروەك ئاماژە بە گەیشتنی بە کەرکوك دەکات بۆ وەرگرتنی پۆستە نوێیەکەی و دەڵێت: (هەر کە تەشریفی هێنایە کەرکوك کە نیشتمانی خۆیەتی و خۆی باوك و باپیری ناوبانگی زۆری تێدا بەدەستهێناوە، لەلایەن دانیشتووانی شارەکەوە بەشێوەیەکی نائاسایی پێشوازی زۆر گەرمی لێوەکرا).

لە بەشێکی دیکەشدا دەڵێت: (ناوبراو خوێندنی باڵای تەواوکردووە و ئەزموونێکی زۆریشی لە ئیدارەو سیاسەتدا هەیە و ئاگاداری بارودۆخی ڕۆحی ناوچەکەیە، بەو پێیەش هیواخوازین سەرکەوتووبێت و هۆکاری بەدەستهێنانی پێشکەوتنی شارەکە بێت و مایەی خێروخۆشی بێت بۆ لیواکەمان).

لەوەش بەدەر، دیارە کە دامەزراندنی تەحسین عەسکەری وەکو موتەسەریفی لیوای کەرکوك هەوڵێك بووە بۆ سڕینەوەی ئەو ئاسەوارە نەخوازراوەی ڕەفتارەکانی عەبدولمەجید یەعقوبی موتەسەریفی پێشووتری کەرکوك ١٩٢٤-١٩٢٧ دەریخستووە بەتایبەت دەرهەق بەدزینی ماڵی هاووڵاتیان بەبێ ڕەوا بەتایبەت ماڵی کورد. لەو پێناوەشدا ڕۆژنامەی کەرکوك پشتیووانی لەهەردوو ڕۆژنامەی (ژیان )و ( زاری کرمانجی) کردووە کە سلێمانی و ڕەواندز دەردەچوون. بەڵام دواتر دوای ساڵێك لە گواستنەوەی تەحسین عەسکەری لە کەرکوك دەسەڵاتداران بڕیاری هەڵوەشانەوەی بەشی کوردی ڕۆژنامەی کەرکوکیاندا، دیارە ئەوەش بەهۆی بەرگرتن لە بڵاوکردنەوەی بیرو هۆش و هەستی نەتەوەیی کوردی لەنێو کوردی دانیشتووانی کەرکوك[٣٨].

هەڵبەتە بارودۆخی ژیان لە هیچ ڕووییەکەوە باشتر نەبوو لە بارودۆخی پەروەردە، ڕۆژنامەگەری، بۆ نموونە لە بواری خزمەتگوزاری تەندروستیدا لە ساڵی ١٩٥٥ تەنیا ٥ نەخۆشخانەو ٤٨ پزیشك هەبوون بۆ هەموو لیواکە کەوا دانیشتووانەکەی ٢٦٨٠٠٥ کەس بوون. هەروەك ڕێژەی لەدایکبوون٥،٥٪ و مردنیش٢،٨٪ بوو لە ساڵی ١٩٥٣[٣٩].

یەکێك لە شێوازەکانی دیکەی پێشێلکردنی مافی کوردو خۆدزینەوە لە بەڵێنەکان کە لەو کاتەدا واتە لەکاتی کێشەو بەربەرەکانی سەر لیوای موسڵ دیارە (یاسای زمانە ناوخۆییەکان) بوو کە شا فەیسەڵ لە٢٣ی مایس لە ساڵی ١٩٣١ی زایینی دەریکردو دەقی ئەو یاسایەی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتی عێراق پەنایان بردە بەر بۆ پشتگوێخستنی زمانی کوردی لە کەرکوك و شارەکانی دیکە لە مادەی ژمارە ٢ هاتووە: (زمانی کوردی لەم قەزایانە زمانی ڕەسمی دادگاکان دەبێت لە لیوای موسڵ، ئامێدی، زاخۆ، زێبار، ئاکرێ، لیوای هەولێر، کۆیە، ڕانیە، ڕەواندز، لیوای کەرکوك، کیل، چەمچەماڵ، لیوای سلێمانی، هەڵەبجە، شارباژێر) هەرچی ماددەی ٣یشە دەڵێت (دەکرێت زمانی دادگاکان لەم قەزا کوردیانەدا کە لە خوارەوە دێن زمانی تورکی یان عەرەبی بێت (دهۆك، شێخان، هەولێر، مەخمور، کەرکوك، کفری) دەکرێت

بڕیارەکانی دادگا بەو زمانە بێت کە زیاتر لە هەمووان بڵاوترە لە ناوچەکە.

مادەی ٤یش دەڵێت:

أ: بواری بە تاوانبار دەدرێت لەو قەزا ناوبراوانەدا لە هەمو باروودۆخێکدا بەعەرەبی دادگایی بکرێت و بەو زمانەش ئاگادار بکرێتەوە گەر زمانی ماڵەوەی عەرەبی بێت.

ب: دادگاییکردنی زارەکی دەکرێت بگۆڕدرێتە سەر زمانەکانی کوردی یاخود عەرەبی و تورکی و کۆپییەکی وەرگێڕدراوی دادگاییکردنەکەش دەدرێتە تاوانبار. هەروەك دەکرێت هەموو کەس سکاڵاو دەعوای خۆی بەزمانەکانی کوردی، عەرەبی یان تورکی لەو قەزایانە پێشکەش بەدادگاو سەلاحییەکان بکات.

مادەی ٥ بواری داوە سەرجەم نووسراوەکانی نێوان سەنتەری لیواکان و وەزارەتەکان و سەنتەری لیوای موسڵ و قەزا عەرەبییەکان و ئەم قەزایانە بەزمانی کوردی بێت: لیوای موسڵ، ئامێدی، ئاکرێ، دهۆك، زاخۆ، زێبار، لیوای هەولێر، مەخمور، کۆیە، رانیە، رەواندز، لیوای کەرکوك، چەمچەماڵ، کیل، سلێمانی، هەڵەبجە، شارباژێر، هەروەك دەکرێت لەهەریەك لە کەرکوك و کفری زمانی تورکی بەکاربهێنرێت.

دەقی مادەکانی دیکەش بەم شێوەیە بوون: مادەی ٦: زمانی خوێندن لە قوتاغەکانی باخچەو سەرەتایی لەو قەزایانەی دیاریکراون لەم مادەیەدا بەکوردی، عەرەبی یان تورکی بەپێی زمانی دانیشتووانەکەی دەبێت.

مادەی ٧: دەکرێت هەموو کەس سەردانی فەرمانگەو ناوەندەکان بە زمانی عەرەبی بکات و وەڵامی خۆی لێوەیان وەربگرێت. سەردانەکانی بەهەر زمانێك وەکو ئەوەی لەمادەی ٥ هاتووە بێت وەڵامەکەشی هەر بەو زمانە دەبێت.

مادەی ٨: زمانی کوردی لە قەزاکانی لیواکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر بەکار دەهێنرێت وەکو بەم شێوەیە لە یاساکەدا هاتووە. هەروەك دەکرێت دیالێکت وزمانە ناوخۆییەکانی ئەو لیوایانە لەبەرواری دەرچونی ئەم یاسایەوە لە لیوای موسڵیش بەکاربهێنرێت. هەروەك دەکرێت دانیشتووانی ئەو ناوچانە لە شێوەیەکی دیاریکراوی زاراوە رێبکەون بۆ ئەوەی بەکاری بهێنن.

یاساکە سەرجەم وەزیرەکانی راسپاردووە بۆ ئەوەی بەپێی دەسەڵاتەکانیان یاساکە جێبەجێ بکەن. قانونەکەش لە ٢٣ی مایس لە ساڵی ١٩٣١زایینی بە ئیمزای شا فەیسەڵ و نوری سەعید سەرۆکوەزیرانی عێراق و جەمال بابان وەزیری دادو عەبدوڵا دەملوچی وەزیری ناوخۆو مزاحم پاچەچی وەزیری دەرەوەو جەمیل راوی وەزیری دارایی و رۆستەم حەیدەر وەزیری بەرگری و عەبدولحسەین وەزیری مەعاریف دەرچووە[٤٠].

هەڵبەتە ئەم یاسایە بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بەرواری ١٦دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٥ی تایبەت بە مافە ئیداری و رۆشنبیرییەکانی کورد هاتووە دوای ئەوەی ویلایەتی موسڵ لکێنراوە بە عێراقەوەو هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراقیش بەرپرس بوون لە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە.

لە یاساکەدا زاراوەی زمانی ناوخۆ لە جیاتی زمانی دایك یاخود زمانی نەتەوەیی بەکارهاتووە بەو پێیەش ئاستەنگی زۆر لەبەردەم بڵاوبوونەوەی زمانی نەتەوەیی کورد دانراوە.

محەمەد ئەمین زەکی لە سەرنجەکانیدا لەسەر ئەو یاسایە ئاماژە بە پابەندنەبوونی حکومەتی عێراق دەکات بەو بەڵێنانەی ئەو حکومەتە بە کۆمەڵەی نەتەوەکانی دابوو سەبارەت بەمافەکانی کورد.

لەو سۆنگەیەشەوە مادەی٤ لە یاسای زمانە ناوخۆییەکان ئاماژە بەوە دەکات کەوا دەکرێت زمانی تورکی لە چەندین ناوچەو قەزای کوردیدا بەکاربهێنرێت، تەئکیدیش دەکاتەوە کە ئەو برگەیە لەسەر داوای ئەنجوومەنی ئەو کاتی ئیدارەی کەرکوك دانراوە.

لای خۆشییەوە محەمەد ئەمین زەکی پێیوایە ئاسودەبوونی هەموان بەمافە نەتەوەییەکانی خۆیان کارێکی پێویستن بەڵام ناکرێت ئەو کارە لەسەر حیسابی مافەکانی لایەنەکانی دیکە بێت و ئەو کارەش بە هەڵەیەکی زەق ناو دەبات. هەروەك لەو بارەیەشەوە ناوبراو چەندین نموونە بە دۆکیومێنت دەخاتەروو دەڵێت" رێژەی دانیشتووان بەپێی ئامارە رەسمییەکانی حکومەت لە لیوای کەرکوك کورد ٥١٪و تورکمان ٢١٪و عەرەب٢٠٪و غەیرە موسڵمانەکانیش ٨٪ ".

لەو بارەیەشەوە ئەمین زەکی تەئکید دەکاتەوە کە ئەو ئامارانەی لە ناوەندێکی فەرمی فەرمانگەی ناسنامەی کەرکوکەوە دەستکەوتووە کە لەگەڵ داتاو ئامارەکانی سەرژمێری کەرکوك کە بەشێوەیەکی رەسمی پشتی پێ دەبەسترێت یەکناگرێتەوە. بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٣٠ کە لەلایەن شارەوانی کەرکوکەوە ئەنجامدراوە ژمارەی دانیشتووانی کەرکوك ٣٥٠٠٠ هەزار کەسەو ژمارەی کورد بەپێی سەرژمێرییەکە ٢٢هەزارو تورکمان ٧٠٠٠و ١٠٠٠ مەسیحی و ٢٠٠٠ تەیارییەکان و ٥٠٠ ئەرمەنی و ٢٥٠٠ جوولەکە. کەچی لە بەرانبەر ئەو رێژەیەدا کورد تەنانەت یەك قوتابخانەی نەبووەو ژمارەی فەرمانبەرانیش بەم شێوەیە بووە ٥٦٪تورکمان، ٢٤٪ کوردو ٢٠٪یش عەرەب و غەیرە موسڵمان[٤١].

بەو پێیەش سیاسەتی حکومەت دەرهەق بەکورد لە هەموو کایەکاندا بە دامەزراندن و پەروەردەو بەکارهێنانی زمانی کوردیشەوە پێچەوانەی ئەو پەیمان و بەڵێنانە بووە کە عێراق بەکۆمەڵەی نێودەوڵەتی داوە لە ٣٠ مایس لە ساڵی ١٩٣٢ی زایینی لە پێناو بە ئەندامبوونی لەو کۆمەڵەیەدا لە لێدوانێکی ئاشکرادا بە کۆمەڵەی ناوبراوی راگەیاندبوو.

پێشتریش ئەو راگەیاندراوە لە٥ مایس لە هەمان ساڵدا لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنرانەوە پەسەند کراوەو بەیاسایەکی بنەرەتی ناسراوە بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانی هاووڵاتیانی عێراق بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئایین و نەتەوە.

مادەی٩ی تایبەت بەزمانی کوردی لەو بارەیەوە دەڵێت: حکومەتی عێراق رەزامەندی دەردەبرێت لەسەر ئەوەی زمانی کوردی هاوشانی زمانی عەرەبی زمانی رەسمی بێت لەو قەزاو ناوچانەی زۆرینەی کوردی تێدا دەژین لە هەر یەك لە لیواکانی موسڵ و هەولێرو کەرکوك و سلێمانی."

هەروەك بەڵێنیش دەدات فەرمانبەری دانیشتووی ئەو ناوچانە لەو قەزایانە دابمەزرێنێت بەتایبەت ئەوانی زمانی کوردی دەزانن و پێوەری دامەزراندنیش لەو قەزایانە لێهاتوویی و زانینی زمانی کوردی دەبێت بەر لە مەرجی نەتەوەیی هەروەکو ئەوەی لە شارەکانی دیکەی عێراقدا بەرچاو دەکەوێت.

بەو پێیە حکومەت رازی بوو فەرمانبەرانی ئەو ناوچانە پەسەند بکات. هاوکات ئەو بەڵێنانە مۆرکێکی نێودەوڵەتی پێوە دیار بووەو لە مادەی ژمارە ١٠شدا هاتووە:- هەرچەندە رەنگە ئەو مەرجانە کاربکەنە سەر ئەو کەسانەی لە رەچەڵەکدا سەر بەکەمینەو ئایینی جیاوازو نەتەوەکانن، بەڵام ئەوە بەڵێنێکە مۆرکێکی نێودەوڵەتی پێوەیەو گرانتییەکە بە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی دراوەو هیچ گۆرانکاری و هەموارکردنەوەیەکی تێدا ناکرێت بە رەزامەندی ئەنجوومەنی ئەو کۆمەڵە نێودەوڵەتییەوە نەبێت[٤٢].

هەڵبەتە تووندترین سیاسەتەکانی حکومەتی عێراق لە کەرکوك دیارە سیاسەتی گۆڕینی دیمۆگرافیای شارەکەیە. هەروەك لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت سەرجەم حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەیان داوە هەرچەندە بەرێکاری جیاجیاش بووبێت، تا کار گەیشتە ئەوەی پەنا برایە بەر سیاسەتی پاکتاوی رەگەزی کە حکومەتی بەعس پەیرەوی کرد. وێرای کۆچی ئاسایی لەلادێوە بۆ شارەکان بەهۆی پێشکەوتنی ئابووری هەندێك لەو شارانەوەو دۆزینەوەی نەوت بەتایبەت لە کەرکوك لەساڵی ١٩٢٧ی زایینی و دواتریش دەرهێنانی نەوت لە ساڵی ١٩٣٤، گۆرانکارییەکی زۆر هاتە ئاراوە لە بواری کۆمەڵایەتی و ئابووری و فرەنەتەوەیی شارەکە. لەو پێناوەشدا کۆمپانیای نەوت ژمارەیەکی یەکجار زۆری کرێکارو فەرمانبەری بەکارهێنا کە زۆربەیان لە دەرەوەی ناوچەکەوە هێنرابوون. لە ئەنجامداو لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ژمارەیەکی زۆری گەرەکی سەربەخۆی تایبەت بە ئەرمەن و ئاشوری و عەرەب پێکهات لەچوارچێوەی گەرەکە کۆنەکانی شارەکەدا، بەتایبەت لە گەرەکەکانی نزیك دامەزراوە نەوتییەکان. هاوکات ژمارەی کرێکارانی کورد لە کۆمپانیاکە بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە لەهەر هەموویان کەمتر بوو. بەوپێیەش وەبەرهێنان لە کێڵگە نەوتییەکان و ناوچەکانی نزیکیان بوو بەهۆکاری نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە رادەبەدەری خەڵکانی ناوچەکانی دیکەی عێراق بەشێوەیەکی هەمیشەیی[٤٣].

هاوکات وێرای هێنانی ژمارەیەکی زۆری کرێکارو فەرمانبەرو پیاوانی پۆلیس، حکومەتی عێراق بەوەشەوە نەوەستا بارەگای فیرقەی دووەمی سوپای عێراقی لە کەرکوك دامەزراند.

بەڵام گەورەترین هەنگاوی حکومەتی عێراق لە بواری گۆرانکاری دیمۆگرافیای کەرکوك لەسەردەمی پاشایەتیدا بریتیبوو لە نیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبییەکان لە ناوچەی حەویجە لە ساڵەکانی ناوەراستی سییەکاندا. لەو پێناوەشدا حکومەتەکەی یاسین هاشمی پرۆژەیەکی لەژێر ناونیشانی پرۆژەی زەوییەکانی یەکەکانی وەبەرهێنان (مشروع اراضي الوحدات الإستثمارية) دەستپێکرد دوای ئەوەی ئاوی لەرێی زێی بچووکەوە بە پرۆژەیەکی ئاودێری گەورەوە هێنایە ناوچەکە.

هەنگاوی یەکەمی پرۆژەکەش بریتیبوو لەهێنانی١٠٠٠ خێزانی کۆچبەرو نیشتەجێکردنیان لە پێدەشتەکانی چیای حەمرین، بۆ ئەو مەبەستەش نزیکەی ١٠٠٠ کیلۆمەتر دووجای بەخشی بە هۆزی عوبێد لە باشووری رووباری پرۆژەکەوە تاوەکو ناوجەرگەی شاری کەرکوك، بەوپێیەش لە ماوەی ٢١ ساڵداو تاوەکو سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ زایینی توانیان ١٢٤ گوند دروست بکەن.

هەرچی عەشیرەتی جبورە نزیکەی ٩٠٠ کیلۆمەتر دووجایان پێدرا لە ناوچەی زێی بچووك و ئەوانیش تاوەکە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧زایینی نزیکەی ٦٥گوندیان بۆ خۆیان دروستکرد. هەرچی عەشیرەتی ئەلبوحەمدانە ٢٠٠ کیلۆمەتر دووجای ناوچەی نێوان زێی بچووك و رێی سەرەکی کەرکوکیان پێدراو تاساڵی ١٩٥٧ زایینی توانیان ١٤ گوند پێکەوونێن.

ئەمە وێرای چەندین کۆمەڵ لە عەشیرەتی عەرەبی وەکو تکارتە و دووریيەکان و عەشیرەتە کوردەکانی وەکو دزەیی و شوان و شێخ بزەینی کە پێشتر لە ناوچەکەدا دەژیان و نزیکەی ١٠٠ کیلۆمەتر دووجاش بۆ ئەوان تەرخان کراو تەنیا لە ٥ گونددا نیشتەجێبوون[٤٤].

پرۆژەکە کە لەساڵی ١٩٣٧ زایینی تەواو بوو بریتیبوو لە هەڵکەندنی کەناڵێکی سەرەکی لە زێی بچووکەوە بۆ حەویجە، بۆ ئەو مەبەستەش حکومەت هەموو زیندانیانی عێراقی بەکارهێنا لەپێناو جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە.

لەو بارەیەشەوە مەلا جەمیل رۆژبەیانی مێژوونووسی بەناوبانگی کورد باس لەوە دەکات کە خودی خۆی یەکێك بووە لەو زیندانیانەی بەشداری جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیان کردووە لە ساڵی ١٩٣٧ی زایینی. تەئکیدیش دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە بریاربووە کوردو عەرەب لەو ناوچەیە نیشتەجێبکرێن بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوەی حەویجە. بەڵام ئەم کەناڵە بەشێوەیەك هەڵکەندرا کە بەناو ناوچە کوردییەکاندا تێپەر نەبێت کە سەر بە سەید ئەحمەدی خانەقاو حاجی حەسەن ئاوچی و بنەماڵەی نەفتچی بوون.

کاتێك یاسین هاشمی دەستبەکار بوو بریاریدا حەویجە تەنیا بۆ عەرەب بێت. کەچی لە پلانە بەراییەکەدا دەبوو عەشیرەتە کۆچەرەکان لەو ناوچەیە جێگیر بکرێن کە زۆربەیان جاف و هەمەوەند بوون. تەنانەت چیچانەکان کە لەنزیك چیای حەمرین لەسەر رووباری زەغیتوون چەند گوندێکیان هەبوو، ئەوانیش ناچار کران ناوچەکانی خۆیان بەجێبهێڵن[٤٥].

جێی ئاماژە بۆکردنە بیرکردنەوە لەو جۆرە پرۆژانە هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدان و دەرکەوتنی چالاکییەکانی ناسیۆنالیستە توندرەوەکانی عەرەب لە عێراق کە بەهۆی ناکۆکیان لەگەڵ بەریتانیا کەوتبوونە داوی پروپاگاندەی نازی و فاشییەکانەوەو هەوڵیان دەدا شێوازی حوکمرانی

و کارکردنی نازییەکان لە چەوساندنەوەو کۆنترۆلکردنی نەتەوەکانی دیکە پەیرەو بکەن.

لەو بارەیەوە مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەڵێت: ماوەی حوکمرانی ناسیۆنالیستەکانی عەرەب لەسەردەمی رەشید عالی گەیلانی درێژەی نەکێشا لەو ماوەیەشدا ئەو نەتەوە پەرستانە هەولیان دەدا بەر بە دانیشتووانی گوندەکانی کەرکوك بگرن و نەهێلن لە شاری کەرکوك نیشتەجێ بېن و زەوی و زار لە شارەکەدا بکرن."

مەلا جەمیل رۆژبەیانی نزیکەی ٩٠ سالی ژیانی لە کەرکوك بەسەر بردووەو زۆربەی رووداوە گرنگەکانی ئەو شارەی بەچاوی خۆی بینیوە، هەر لە جەنگی یەکەمی جیهانییەو بە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و دەرهێنانی نەوت و چەندین رووداوی گرنگی مێژوویی ترو هەروەك زانیاری بەسوودی دەربارەی بوونی عەرەب لە کەرکوك لەسەردەمی پاشایەتیدا.

لەو بوارەشدا ئاماژە بەوە دەکات لەکاتی پێکهێنانی دەوڵەتی عێراقدا تەنیا یەك گەرەك لە کەرکوکدا هەبووە کە نزیکەی ٣٠ مالی عەرەبی تێدابووە ئەویش کەوتوونەتە نێوان هەردوو گەرەکی موسەلاو پیریادییەوەو سەرجەمیان بەکاری کرین و فرۆشتنی ئاژەلەوە سەرقال بوون. هەروەك هەندێکی دیکەش لە نزیك گوندی تسین بوون کەوا دواتر بووە یەکێك لە گەرەکەکانی کەرکوك. لەنزیك پردی کۆنی شارەکەش نزیکەی ٥٠ کەپر هەبوو کە دواتر بە گەرەکی (حەدیدییەکان) دەناسرا.

دواتریش بەپێی فەرمانێکی شا فەیسەل کە لە کاتی سەردانی کەرکوکدا چاوی بەو خانووە نەشیاوانە کەوت بریاریدا هەموو ئەو عەرەبانە بگوازرێنەوە بۆ رۆژئاوای شاری کەرکوك[٤٦].

مەسەلەی هەوڵەکانی گۆرینی دیموگرافیای کەرکوك لەلایەن حکومەتەکانی عێراقەوە زۆر بلاوبووبووەوە نەك تەنیا لە رووی سیاسییەوە، بەلکو چەندین ساڵەو لە زۆربەی توێژینەوەکانی تایبەت بە کوردستان و عێراق باس لەو هەولانە کراوە. لەو سۆنگەیەشەوە (فەرمانگەی مەعاریفی ئیسلامی) کە سەرچاوەیەکی زانیاری تۆکمەو جێی بروا کە بە بابەتیبوون و وردبوون لە توێژینەوەکانیدا ناسراوە ناچار بووە لە یەکێك چاپە نوێیەکانیدا باس لەو بابەتە بکات لە کەرکوکداو تەئکید بکاتەوەو بلێت" جێی ئاماژەیە دەسەلاتدارانی حکومی عێراقی هەولی زۆریان داوە لەماوەی چەندین ساڵدا بۆ ئەوەی عەرەب لەجێی کورد لە شاری کەرکوك نیشتەجێ بکەن[٤٧].

هاوکات چەندین سەرچاوەی دیکەی جیاوازیش باس لەزیادبوونی دانیشتووانی کەرکوك دەکەن بەشێوەیەك کە لەگەل هیچ پێوەرێکی دیموگرافیای ئاسایی جیهانیدا ناگونجێت. دیارە ئەوەش بەلگەیەکی زیندووی دیکەی ئەو سیاسەتە چەپەڵەی حکومەتەکانی عێراقە. لەو رووەشەوە ژمارەی کۆچکردن بۆ کەرکوك لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٤٧– ١٩٥٧ بە ٣٩ هەزار کەس خەملێنراوە[٤٨].

دیارە ئەو تۆمارەی بە دەنگی عەلی حەسەن مەجید یان ( عەلی کیمیاوی) کەوا لە کۆبوونەوەیەکی بەرپرسانی بەعس و سوپاو ئەمنی کەرکوك لە ١٥ی نیسانی سالی ١٩٨٩ی زایینی وتوویەتی باشترین بەڵگەیە بۆ ئەو سیاسەتە نەگریسە.

بەر لە دوو ساڵ لەو بەروارە ناوبراو حاکمی رەهای کوردستان بوو لەو بارەیەوە ناوبراو دەڵێت:– من لێرەدا دەمەوێت باس لە دوو خاڵ بکەم یەکەمیان تەعریبەو دووەمیشیان ناوچە هاوبەشەکانی نێوان خاکی عەرەب و ناوچەی ئۆتۆنۆمییە. ئەوەی من ئەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە کاتێك من هاتم بۆ ئێرە ژمارەی عەرەب و تورکمان لە ٥١٪ی دانیشتووان کەمتر بوون، بۆ زانینی ئێوە من ٦٠ ملیۆن دینارم خەرجکرد تاوەکو گەیشتینە ئەم بارودۆخەی ئێستا.

هەموو ئەو عەرەبانەی هێناومانن رێژەی دانیشتووانیان نەگەیاندووە بە٦٠٪ دانیشتووان، بۆیە کوردی کەرکوك و ناوچەکانی نزیکی ئەم شارەم قەدەغە کردووە لەکارکردن لە دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

ئەم سیاسەتانەی حکومەتەکانی عێراق پەیرەویان دەکرد دۆخێك لە گومان و دوودڵی لای کورد بەگشتی و کوردی کەرکوك بەتایبەت هێنابووە ئاراوە سەبارەت بە نیازی ئەو حکومەتانە دەربارەی کەرکوك کە بە لێبوردەیی و کرانەوەی نێوان پێکهاتەکان بەناوبانگ بوو. دیارە ئەو سیاسەتانەش دەرگای والا کرد لەبەرانبەر ئالۆزبوونی بارودۆخی کەرکوك، تاوەکو کار گەیشتە ئەوەی کێشەی کەرکوك لەم سالانەی دواییەدا ببێتە گرێکوێرەی سەرەکی کێشەی کورد لە عێراقدا.

*سەرچاوە و پەراوێزەکان:-


١- خەلیل عەلی عەبدوڵلا، تأريخ العراق الإداري والإقتصادي في العهد العثماني الثاني، ١٨٣٨-١٧٥٠، نامەی ماستەر بلاونەبووەتەوە، زانکۆی بەغدا، ١٩٧٥، الصفحات٤٥، ٦٠-٦٢.

٢- سالنامة دولت علية عثمانية سنة ١٣٠٢ هجري، قرقنجي دفعه، معارف نظارات جليلة سنك اثر ترتيبدر، در سعات ١٣٨٢، ص٧٤-٧٥، هەروەها بڕوانە، ستيڤن هيميسلى لۆنگريك، اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، وەرگێرانی جەعفەر ئەلخەیات، چاپی شەشەم، بەغدا، ١٩٨٥، لاپەڕە ٣٧٦.

٣- موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر ١٣٣٠ سنة هجرية سنة مخصوص اولمق اوزره بشنجي دفعة اوله رق موصل مطبعة اولنمشدر، لاپەڕە ١٧.

٤- موصل ولايتى سالنامەسی، برنجى دفعه ١٣٠٨ هجرى، موصل مبطعة سندة طبع اولمنمشدر ١٣٠٨ هجرى، ١٣٠٦ رومى، الصفحه ١٠٧.

٥- سالنامة نظارت معارف عمومي، ايكنجي دفعة اوله رق ترتيب اولنمشدر ١٣١٧ هجري، ص ١٤٠٤ وللمزيد من المعلومات عن أوضاع كردستان الجنوبية خلال العقود الأخيرة من الحكم العثماني أنظر بحثنا الموسوم، اربيل في السالنامات العثمانية، بحث مقدم الى ندوة اربيل بين الحاضرة والماضي والآفاق المستقبلية التي نظمتها جامعة صلاح الدين عام ١٩٩٠، والمنشور في مجلة (كاروان) العدد ٩١، اربيل، كانون الأول، ١٩٩٠، ص ١١٦ - ١٢٧.

٦- Morgan J.de، Mission scientifique en perse، Etudes Geographiques، T.II paris ١٨٩٥،P.٨٦.
و: ئەداموۆ.ا، العراق العربي، ولاية البصرة بين الأمس واليوم، بطرسبورك ١٩١٢، لاپەڕە٢٦ (بالروسية).

٧- ا. ديني، الصراع على الاحتكارات النفطية، موسكو - لينينگراد ١٩٣٤، لاپەڕە ٤٣، (بالروسية).

٨- سي. جي. ادموندز، كرد وترك وعرب - سياسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي في العراق ١٩١٩-١٩٢٥، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد ١٩١٧، ص ١٢-١٣و٣٢.

٩- الدكتور وليد حمدي، الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية، لندن ١٩٩٢، ص٤٧-٤٨.

١٠- ا.ف. فيدضينكو، العراق في النضال من اجل الاستقلال ١٩١٩-١٩٦٩، موسكو ١٩٧٠، ص١٩: فريق المزهر الفرعون، الحقائق الناصعة في الثورة العراقية سنة ١٩٢٠ ونتائجها، بغداد ١٩٥٢، ص٢٣٦.

١١- FO ٣٧١/٣٤٠٧. From political commission. Baghdad. ١٥Mov. ١٩١٨. Nr.٨٧٤٤

١٢- م.س. لازريف، الامبريالية والمسألة الكردية ١٩١٧-١٩٢٣، موسكو ١٩٨٩، ص٨٥-٨٦ (بالروسية).

١٣- عبدالرزق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الأول، صيدا ١٩٥٣، ص١٤١-١٤٢ هەروەها بڕوانە: سی.جی ادموندز، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٣٤٩.

١٤- عبدالرزاق الحسني، الثورة العراقية الكبرى، صيدا ١٩٥٢، ص ٢٤.

١٥- سي. جي. ادموندز، هەمان سەرچاوەی، لاپەڕە٣٥٦-٣٥٧.

١٦- مستەفا کەمال، طريق تركيا الحديثة- إعداد قاعدة انقرة ١٩١٩-١٩٢٠ ج٢، موسكو ١٩٣٢، لاپەڕە ١١٠-١١٣ (بالروسية).

١٧- A-Wilson.A.T.Mesoptoamia١٩١٧-١٩٢٠. clash of loyalities.A personal and historical record. London ١٩٣٠. P١٤٢.

١٨- Bell G.L.J The letters of Gertrude Bell. vol.٢.London ١٩٢٧. P٦٠٧

١٩- الدكتور نوري طالباني، منطقة كركوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ط٢، بلا. م، ١٩٩٩.

٢٠- عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ج١.

٢١- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئەو لێکۆڵینەوەیەمان بە ناونیشانی کرکوك، قرن ونصف من التتريك والتعريب، الملف العراقي، العدد٩٩، ئادار ٢٠٠٠، لاپەڕە ٤٢-٤٦.

٢٢- عن هؤلاء وغيرهم من الشخصيات في كركوك انظر: مير بصري، اعلام الكرد، لندن ١٩٩١، لاپەڕە١٦١-١٦٢، ٢٣٥، ٢٤٠ و: د.نوری تالەبانی، هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٣-٤٤ و: فەهمی عەرەب ئاغا وفازڵ محەمەد مەلا مستەفا، ماذا في كركوك، كركوك ١٩٥٧. و: گۆڤاری هاواری کەرکوك ژمارە٣، هەولێر١٩٩٩، لاپەڕە١٤٩-١٥٠.

٢٣- مذكرة محمد امين زكي الى الملك فيصل الاول حول الشأن الكردي العراقي في ٢٠ كانونی یەکەم ١٩٣٠، تقديم وترجمة الدكتور جبار قادر، الملف العراقي، العدد ١٠٤، اب ٢٠٠٠، لاپەڕە ٦٣.

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٤.

٢٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٦٤-٦٥.

٢٦- الدكتور كمال مظهر احمد، التاريخ - دراسة موجزة لعلم التاريخ والكرد والتاريخ، بغداد ١٩٨٣، لاپەڕە ١٥٩ (بالكردية).

٢٧- مذكرة محمد امين زكي الى الملك فيصل الاول، لاپەڕە ٦٥

٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە٦٥

٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە٦٦

٣٠- ڕۆژنامەی (ژیان) ژمارە ١٢٩، ٢٠ ئەیلوولی ١٩٢٨.

٣١- مذكرة محمد امين زكي، ص٦٥

٣٢- ع. خ. ي. لواء كركوك وجميع اقضيته ونواحيه وقراه من الكرد، زار كرمانجي، رواندوز، ذمارة ١٩، ١٩/١٠/١٩٢٩: نقلا عن ممتاز حيديري، مجلة هاواري كركوك، العدد، اربيل، ئادار ١٩٩٩. ص٦٥.

٣٣- Report for the period april ١٩٢٣-december ١٩٢٤. pp٢١٧-٢١٨.
هەروەها بڕوانە: الدكتور كمال مظهر احمد، حركة التحرر

الوطني في كردستان العراق ١٩١٨ -١٩٣٢، باكو ١٩٦٧، ص ٦٢ (باللغة الروسية).

٣٤- spesial report by his majest'y government in the united kingdom of great britain and northern ireland.

٣٥- special report, ibid, p٢٣٠

٣٦- مذكرة محمد امين زكي لاپەرە٦٧.

٣٧- الدكتور شاكر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، ترجمة امد شاكلي، السويد١٩٩٧ ص٦٣-٧١ (الطبعة الكردية).

٣٨- عن هذه الجريدة وبعض اعدادها الكردية انظر الدراسة الموثقة للكاتب: احمد تاقانة، جريدة كركوك، الكوردیية عام ١٩٣٠ كولان العربي، العدد ٤٣ كانون الأول ١٩٩٩، ص٥٥-٥٩.

٣٩- الدكتور شاكر خصباك، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٦٣-٦٩.

٤٠- جريدة الوقائع العراقية - العدد ٩٨٩ بتاريخ ١ حزيران ١٩٣١، هەروەها بڕوانە: گۆڤاری هاواری کرکوك، العدد ٣ هەولێر ئادار ١٩٩، لاپەرە ١٥٢-١٥٤.

٤١- محمد امين زكي، ملاحظاتي حول قانون اللغات المحلية، في كتاب (محاولتان غير مجديتين) تقديم وتدقيق صباح غالب، لندن ١٩٨٤، ١٠٣-١٠٥.

٤٢- League of Nations, series of league of nations Publication, VII political ١٩٣٢. VII.٩. P,٣٠١.

٤٣- الدكتور نوري طالباني، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە٥١.

٤٤- احمد رحيم امين، الحويجه، مجله هاواری کرکوك، العدد٤، اربيل ١٩٩٩، ص ٤٨-٤٩.

٤٥- مؤرخ كردي، كركوك، اسمها، تاريخها القديم، سكانها وسلطاتها، مجلة (هاواري كركوك) العدد٢، اربيل ١٩٩٨، لاپەرە ٢٩-٣٠

٤٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣١.

٤٧- The Encyclopaedia of islam, Art kirkuk, vol. V, leiden ١٩٨٦, p١٤٥.

٤٨- الدكتور احمد نجم الدين، احوال السكان في العراق، القاهرة، ص ١٠٩، نقلا عن الدكتور نوري الطالباني، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٤٨.

٤٩- Genocide in iraq, the Anfal Campagin Agaign the kurds. HRW/ME, New york ١٩٩٣. p٣٥٣.



كۆمەڵێك لە قوتابیانی ئایینی لە مزگەوت و تەكیەی (سەید مونجوغ جەباری-سەی بنجك) لە بازاڕی حەسیرەكە
سالی ١٣٢٩ی كۆچی

## * مێژووی سەردەمە کارگێڕیی و بەڕێوەبەرییەکانی کەرکوك

سمکۆ بەهرۆز- ئەژی

*** ئایا لەسەردەمەکانی پێش مێژوودا ناوچەی کەرکوك کارە بەڕێوەبەرییەکانی هەبووە؟:**

لەم سەردەمەدا زانیارییەکانمان زۆر کەمن، بەلام دەتوانین بگەینە ئەو راستییە کە ناوچەیەکی ئاوەدان بووەو مرۆڤی تێدا ژیاوە، بەتایبەتی لەناوچەکانی کەریم شایەر، بەردە بەلـکە، چەرموو، مەتارە، قادیش، کفری و حەویجە. ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لەم ناوچانەدا مرۆڤ خۆی خواردنی خۆی بەدەستهێناوە، بۆیە لەسەرەتادا شێوەی ژیانێکی کارگێری و بەڕێوەبردنی نەبووە، تا بتوانێت لەسەر هێلێکی رێکوپێك پێویستییە کارگێرییەکانی بەڕێوەبەرێت، لەبەر ئەوە هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە کەمرۆڤ کاروبارە کارگێرییەکانی بەڕێوەبردبێت و دەستگا و پێویستی کارگێری هەبوبێت بۆ خزمەتی خۆی، چونکە ژیان لە ئەشکەوتێك یان لە کۆچرەویدا بووە بیری بەو فراوانییە لە چاك کردنی ژیان نەکردوەتەوە.

سەرهەلدانی چەرموو وەکو گوندێکی ٢٠-٣٠ مالی لە سەردەمی بەردینی نوێدا، پێویستییان هەبووە بە کاروبارە کارگێرییەکان، هەرچەندە بەشێوەیەکی سادە بوبێت، لەیەکتری کۆیانی کردووەتەوە، وای کردووە ژیانی خێزانی لە چوارچێوەی ناوچەکەدا گەشە بکات، پێویستی کردووە بیر لەرێکوپێککردنی ژیانیان بکەنەوەو بتوانن کاروبارەکانی رۆژانەیان بەڕێوەبەرن و هەوڵ بدەن لێك گونجاندن بکەن لە بەڕێوەبەردن و هاوسەنگ کردنی ژیانی کۆچەری و ژیانی کشتوکالیدا، چونکە گۆرانی ژیانی کۆچەری لەشێوەی ژیانی هەلەشەیی و تاکێتیدا پێویستی بەماوەیەك هەیە بۆ خۆسازدان لە ژیانی گوندە کشتوکالییەکاندا.

هەر ئەم گونجاندنە وای کرد کە زیاتر گەشە لەناوچەکانی مەتارە، قادیشی گەورە، قادیشی بچووك و حەویجەدا روو بدات و جواتر قۆناغە کارگێرییەکان بەڕێوە بچێت و هەنگاوی بەهێز بنێت.

"دانیشتووانی چەرموو لەئەنجامی رزگاربوونیان لەترس و برسێتی و مەینەتی و کوێرەوەری و گۆرانی ژیانی ئابوورییان، مەودایەکی فراوان و نوێ لەبەردەمی گۆرانی بیروباوەرو جۆری بیرکردنەوەیان پەیدابووە، کە بووە هۆی گۆرانی ژیانی کۆمەلایەتی نەك لەکوردستان، بەلکو تەشەنەی بەجیهاندا کرد..."(١).

ئەو پێشکەوتنە ئابوورییە لەگەل خۆیدا گەلێك شتی نوێی هێنایە گۆرێ، زیاتر پێشکەوتنی ژیانی بەڕێوەبردنی ژیاری چەرمووی مسۆگەرکرد، هەرچەندە لەچوارچێوەی گوندێکی کشتوکالیدا بووە، نەك لەچوارچێوەی شار یان دەولەتێکدا، کۆبوونەوەی کۆمەلێکی کشتوکالی وەکو چەرموو، مەتارەو قادیش پێویستی بەوە کردووە هەولی بەڕێوەبردنی ژیانیان بدەن، هەرچەندە بەشێوەیەکی سادەیش بووبێت، چ لە رووی هەرەوەزی و کۆمەك و باربووکردن و رێکخستنی گەرەك و دروستکردنی هۆیە خزمەتگوزارییەکانی وەکو تەوالێت و ژووری چێشت لێنان و خەوتن و جیاکردنەوەی ئاژەل و دیاریکردنی شوورەو هێلی نێوان گەرەکەکان و گۆران لەدروستکردنی خانوو لەشێوەی بازنەیی و لاکێشەیی، بەرەو چوارگۆشەیی.

لەسەردەمەکانی بەردینی کانزاییدا گۆرانی زیاتر روویدا، کارە خزمەتگوزاری و بەڕێوەبەرییەکان فراوانتر بوون و شارەکان ئاپۆرە بوون لە خەلکی، ئەمەش وای کرد پێویستی بەجولانی قەبەترو گورجتر هەبێ بۆ راپەراندنی کارەکان، کە ئەمجارە گەرەکەکان و خانووەکان فراوان کرانەوەو لەگەل خۆیدا پێویستی بەدابەشکردنی خزمەتگوزاری و کارگێرییەکان دەکرد تا بۆ ئەوەی کارەکان بەچاکی بەڕێوەببرێت. هەروەها گۆرانی هاتووچۆو بازرگانی لـەگـەل نـاوخـۆو دەرەوەدا جۆرە پەیوەندییەکی کارگێری و بەڕێوەبردنی هەمەلایەنەی دروستکرد، کەفێری لێك وەرگرتن و سوودوەرگرتن بوون لەیەکتری.

دەتوانین ناوچەی کەرکوك بە ئاقارێکی گرنگی کارگێری دابنێین، تاقیگەی گۆرانە مێژووییەکان بوو کە لەگەل خۆیدا مرۆڤی ناوچەکە هەولی داوە داهێنانێکی تازە بەدەست بهێنێت بۆ زیاتر رێکخستنی باری ژیان لە رووی ئابووری و بیناکاری و کارگێری و بەڕێوەبردنەوە.

*** مێژووی یەکە کارگێری و بەڕێوەبەرییەکانی سەردەمە مێژوییەکانی ناوچەی کەرکوك:**

سەردەمە مێژووییەکان بەوەرچەرخانێکی گرنگی هەمەلایەن دادەنرێت، چەند تایبەتمەندییەکی هەبوو کە لەسەردەمەکانی پێش مێژووی جیا دەکاتەوە چ لە رووی سەرهەلدانی نووسین و فراوانی شار و گۆرانی بیناکاری و مەودای سەرهەلدانی ئاین و گۆرانی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان، کە هەموو ئەمانە لەگەل خۆیدا بووە فراوانی کارە خزمەتگوزاری و بەڕێوەبەرییەکان.

سەردەمە مێژوییەکان لەناوچەی کەرکوکدا شوێنێکی دیاری هەبوو لەبەرئەوەی سەکۆیەکی گرنگ بوو، بۆ بانگەوازی کۆچ لە دەشتاییەکانەوە بۆ ناوچەکانی خواروو ناوەراستی عێراق، هەر لەبەر ئەمەشە بناغەیەکی کارگێری و بەڕێوەبەری گرنگی دروستکرد لە ناوچەکەیداو پەلی هاوێشت بۆ ناوچەکانی دەوروبەری و درێژبۆوە بۆ شوێنی دوورتر. لەو نەتەوانەی لەناوچەی کەرکوك گەشەیان کرد لەسەرەتادا سۆمەری، گۆتی و لۆلۆیی و ئەکەدییەکان بوون، هەریەکەیان تاماوەیەکی چاك بالادەستی خۆیان نواند لەبەڕێوەبەردنی کاروباری ناوچەی کەرکوکدا، هەریەکەی بەچەند جۆرێك و لەماوەیەکی دیاریکراودا، شوێنی خۆیان دیاری کردووە لە بەڕێوەبردنی کارە کارگێرییەکانیاندا.

سەرچاوەکانمان بەتەواوی بەدەستەوە نییە بۆ چۆنییەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان، دەربارەی بالادەستی کامیان

لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا ئایا گۆتییەکان باڵادەست بوون یان لۆلۆیی یان (ئەکەدی-سۆمەری)، یان قەڵەمڕەوی گۆتی و لۆلۆییەکان تا کوێ بووەو بەچ جۆرێك بەڕێوەچووە.

"گۆتییەکان لەناوچەکانی سەرووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ژیاون و بڵاوبونەتەوە بەرەو خواروو بە لێواری زێی بچووکدا، کە ڕاستر وایە بڵێین ناوچەکانی پشدەرو ڕانیە گرنگترین شوێنی بنکەکانیان بوون و لەدواییدا کەرکوك (ئاراپخا - نوزی) شوێنی بڵاوبوونەوەیان بووەو لۆلۆییەکان دراوسێیان بوون و چونەتە ناو یەکترییەوە بەهۆی نزیکی بڵاوبوونەوەیان.."[٢].

"لۆلۆییەکان لەرۆژئاوادا دەربەند بازیان، شاری چەمچەماڵ وڵاتی پوختیان بووە، تا بەرەو ڕۆژئاوایش برۆین تێکەڵ بوونیان لەگەڵ گەلانی تر دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەش مانەوەی ڕەگەزی خورییەکان تا ئەو کاتە جێگای گومانە بەڵام وادادەنێین کە لەگەڵ لۆلۆدا دەژیان، پێشتریش تێکەڵ بوونی (لوللو) لەگەڵ خورییەکان گەیشتبووە ناوچەی (تاوغ-داقوق) کە ڕەنگە (لویدی) کۆن بێت"[٣].

"ناوی گۆتییەکان لەدەستنووسی سۆمەرییەکاندا لەماوەی (فجر السلالات)دا لەنێوان ساڵانی (٢٨٠٠-٢٤٠٠)ی پێش زایین هاتووە، کە هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سۆمەرییەکان بوونێکی سیاسی لاوازیان هەبووە، دامەزراوە لەسەر بنەڕەتی دەوڵەتی شارستانی و توانایان نەبووە بۆ هێرش کردنە سەر کوردستان، یان بەمانایەکی تر لێکیان نەداوە لەگەڵ گۆتییەکاندا، بۆیە لەو ماوەیەدا سەرچاوە سۆمەرییەکان ئاماژەی بۆ ناکەن"[٤].

"لەماوەی (٢٢٣٠-٢١٢٠)ی پ.ز گۆتییەکان توانیان دەست بگرن بەسەر ناوچەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق و کیانی سیاسی ئەکەدییەکانیان لەناودا"[٥].

زانیارییەکانمان زۆر کەمە دەربارەی ئەو ماوەیەی گۆتییەکان لەناوەڕاست و خوارووی عێراقدا بوون، ئایا کەرکوکیش ئاقارێکی ئەو بەڕێوەبەرییە بووە، یان کەرکوك بنکەی سەرەکی دەوڵەتەکەیان بووە، بەڵام وادەردەکەوێت کە دەوڵەتێکی فراوانیان هەبووەو فەرمانڕەوایان داناوە بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکانیان.

گۆتییەکان وەکو سەرەتایەکی سەردەمە مێژووییەکان شاری کەرکوکیان کردە بنکەی بەڕێوەبردن و کاروباری دەوڵەتەکەیان، فەرمانڕەواییان لەماوەی ٩١ ساڵداو فراوانکردنی قەڵەمڕەوییان دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە ڕێکخستنی بەڕێوەبردنیان هەبووەو تەنها شەڕو شۆڕو چەکیان نەبووە لەژیاندا، چونکە عەقڵ ڕێی پێ نابات کەتەنها ژیانێکی خێڵەکی ڕووتیان هەبووبێت بەدەر لەهەموو جۆرە بەڕێوەبردنێك، ئەگەر وابوایا هەرزوو هەرەسیان دەهێنا.

فەرمانڕەوای گۆتییەکان زۆر بەهێزبووە، فەرماندەکانی وڵاتی سۆمەر باج و خەرجی گرانیان بۆ ئەناردن، لەهەمان کاتدا لەسەرانسەری کیشوەردا ئارامی حوکمی دەکرد، کەوابوو ناتوانین ماوەی کەمی سەڵتەنەتی پاشایانی گۆتی بەهۆی جەنگ و بگرەو بەردەوە بگێڕینەوە..[٦].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەسەردەمی گۆتییەکاندا ئەوەیە کە هەڵبژاردن هەبووە لەنێوانیاندا و پاشاکانیان هەڵبژاردوون، بەپێی زنجیرەی حوکمی پاشاکانیان دەردەکەوێت کە تیایاندا هەیە دووجار هەڵبژێردراوە[٧].

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کاروبارێکی بەڕێوەبەری ڕێکوپێکیان هەبووە لە بەڕێوەبردنی ناوچەکانیاندا، "گۆتییەکان جۆرە سوێندخۆری و یەککرتنێکی خێڵەکی و هۆزایەتییان سازدابوو، ملکەچی فەرماندەیەکی ئۆرۆستۆکراتی بوون"[٨].

لەسەردەمی سۆمەری-ئەکەدی، ئەوەی کە پەیوەستە بە ناوچەی گاسورەوە، تا ڕادەیەك زانیاریمان کەمەو ئەو زانیارییانە لەلایەنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان تێناپەڕێت، بەڵام پەرستنی عەشتارو ناوهێنانی گەلێك دەزگای بازرگانی و سەربازی سەردەمی سەرجۆن ئەوە دەخاتە ڕوو کە کاروبارە بەڕێوەبەرییەکانیان لەو ناوچەیەدا فراوان بووەو کێڵگەو دارستان و زەوی و زاریان هەبووەو لەلایەن کۆمەڵێك کارمەندو کرێکارەوە بەڕێوەبراون، کە بەڵگەی فراوانی حوکمرانی ناوچەکەیە لەو سەردەمەدا. لەوانەیە ئەم ناوچەیە (گاسوور) کیشوەرێکی سەربەخۆی سەر بە حوکمرانی ئەکەدی بوبێت، تا ڕادەیەك جۆرە سەربەخۆییەکی هەبوبێت لەبەڕێوەبردندا[٩].

کاتێ ناوی گۆتی لەسەر شانۆی زەمان نەما لەباکووردا چەند پاشانشینێکی بەهێز سەرییان هەڵدا، وەك پاشانشینی (ئۆربیلیۆم- اربیل)، خارشە (خورماتوو) و کیماش (کفری).

لە پارچە گڵێکی دۆزراوەی سێ هەزارەی پێش زایین لەسەردەمی شۆسنی پادشای بنەماڵەی ئوری سێیەمدا، دەگێڕنەوە کە شیلبوم فەرمانڕەوا بووەو لەگەڵ فەرمانڕەواکانی (ئوردا) کاغەزیان بۆ یەکتر نوسیوەو نوێنەرییان لەنێوانیاندا هەبووە، بەتایبەتی لەشاری کیماشەوە لەسەردەمی پادشای بنەماڵەی ئوری سێیەم ناوی پیاوەکەی کیماش هاتووە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە (کیماش - کفری) فەرمانڕەوایی بەدەستەوە بووە، شولکی لەساڵی بیست و شەشەمی فەرمانڕەواییەکەیدا هەڵی کوتایە سەر وڵاتی لۆلۆ، لەساڵی چل و شەشەمی فەرمانڕەوایەکەیدا، فەرمانڕەوای (خارشە - دون) ورچێکی بەدیاری بۆ نارد، خارشەی ئەوسا نزیك بە کیماش بووە، زۆر کەس لەو باوەڕەدان کە شیمۆرو کیماش واتە کۆیری و کفری بریتی بوون لەدوو وڵاتی سەر سنوور بۆ پارێزگاری کردنی ڕێگەی هاتووچۆکردن[١٠].

پاش ئەوە سەردەمێکی نوێ سەری هەڵدا ئەویش دەرکەوتنی دەوڵەتی ئاشوورییەکان بوو وەکو دەوڵەتێکی سیاسی فراوان و هەمە لایەنە. ئاشوورییەکان گۆڕانێکی گەورەیان دروستکرد، کە خۆی لەگەڵ فراوانکردنی دەوڵەتەکەدا دەبینیەوە.

(پاشا لەوڵاتی ئاشووردا ڕابەری حکومەتی ناوەندە لە پایتەختدا، یان چەند پایتەختێك بەکار دەهێنێت لە بەڕێوەبردندا.. پاشا فەرمانڕەوای هەیە لەپارچەکانی دەوڵەتی ئاشووریدا، بەرپرسیارن بەرامبەر پاشا لەکۆکردنەوەی باج و پارێزگاریکردنی ئاسایش و دابەشکردنی بەندکراوەکانی جەنگ، بەرپرسیارن ڕاستەوخۆ بەرامبەر پاشاو، نێردراو

هەیە بۆ هێنان و بردنی نامە لەنێوانیاندا..).

"هەموو فەرمانڕەواکانی دەوڵەتی ئاشووری ڕاستەوخۆ لەلایەن پاشاو دام و دەزگاکانی کۆشکەوە دادەنرێن.. زیاتر ئەوانە هەڵدەبژێردرێن کە لە چینی فەرمانڕەوان.."[11].

دەبینین ناوچەیەکی وەکو (کەرکوك)و دەورووبەری پارچەیەکی سەر بەدەوڵەتی ئاشووری بووەو، باج و سەرانەی لی کۆکراوەتەوە، فەرمانڕەواکانی لەلایەن پاشای ئاشوورەوە بۆ دانراوە.

بەڵام تا ڕادەیەك ئاشوورییەکان لەو ناوچەیەدا دەست بەسەراگرتنێکی تەواویان نەبووە، بەهۆی هێزو بەربەرەکانی ناوچەکانی کەرکوك لەگەڵ ئاشوورییەکاندا کە ئەم بێ هێزییە لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاستدا بەزەقی دەردەکەوێت، کە بووە سەرهەڵدانی هێزی (هوری – میتانی) وەکو دەوڵەتێکی میتانی بەهێز لەناوچەکەدا.

ناوچەی کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی ئاشووریدا شوێنێکی گرنگی هەبوو، بەڵام هیچ کاتێك نەکرایە پایتەختی دەوڵەتەکەو هەروەکو ئاقارێکی گرنگی ئیمپراتۆریەتەکە مایەوە.

هەر لەبەرئەوە دەبینین هەر یەکە لە (نەینەوا)و (کالخ)و (دور- شرۆکین)، جێگای بڵاوبوونەوەی دامودەزگاکانی دەوڵەتی تێدابووە لەکەرەسەی جەنگی و ئازوقەو پێویستییەکانی شەڕو کۆشکی قەبە، بێجگە لە قەڵا سەرەکییەکانیان، بۆیە دەبینین کەرکوك (ئەراپخا)، هیچ کاتێك تۆپۆگرافی ئەوشارە ئەوەی نەسەلماندوە کە ئەو شوێنانەی تێدا بێت کە بشێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباره کارگێرییەکانی دەوڵەت و ئیمپراتۆریەتەکە[12]، چونکە هیچ کاتێك لەوە دەرنەچوە کە بنکەی ئاقارێك یان پارێزگایەك بوو بێت، لەبەرئەوەی بوونی کۆشکی قەبەو دامودەزگای کارگێڕی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی پادشایەتی بە پلەی یەکەم..[13]، بۆیە ئەو پایتەختانە هەر بەڕووخاندنی دەوڵەتی ئاشووری، بوونەتە شوێنێکی چۆڵکراو لەلایەن خەڵکییەوە ئەویش لەبەرنەمانی ژیانی کارگێڕی تێیدا، بەڵام ئەمە لەهەریەکە لە هەولێرو کەرکوکدا ڕووی نەداو دوای ڕووخاندنی ئاشوورییەکان هەر بەردەوام بوو، چونکە پەیوەست نەبوون بە هۆکارە سیاسییەکان و دەوڵەتی ئاشوورییەوە..[14].

ئەو چالاکییە گرنگانەی کە پادشای ئاشووری (تەجلات پلیزر) لە ڕووی سەربازی و کارگێڕییەوە پێی هەڵسا، ئەویش لکانەوەی سنووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی ئاشوورەو دووبارە هەستان بەڕێکخستنەوەی ئەو ناوچەیەو دابەشکردنی بۆ دوو ناوچە یان ئاقار، یەکێکیان (ئاراپخا)یە کە درێژدەبێتەوە هەتا ڕۆژهەڵاتی (بەغدا)، بەڵام ناوچەکەی تر، کە بریتییە لەو زەوی وزارانەی کەوتووەتە خوارووی ئەو بەشەی ترەوە، ئەبێتە جیابونەوەی وڵاتی (عیلام) لەگەڵ وڵاتی بابل... ئەمەیش وای لە تەجلات پلیزر کرد، بایەخ بەفراوان کردنی لای سەرووی ڕۆژهەڵاتییەوە بدات[15].

بەمەش دەگەینە ئەوەی کە ئەم ناوچەیە هەردەم جێگایەکی دیارو چەسپاوی نەبووە، هەردەم کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی هێزی ناوچەکە بۆ بەربەرەکانی.

لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاستدا، کە دەوڵەتی میتانی وەکو هێزێکی سیاسی بەهێز لەزۆر ناوچەدا سەری هەڵداو لەناوجەرگەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکاندا، جێ پەنجەی خۆی بەدەرخست، "دەوڵەتی میتانی پێکهاتبوو لە سێ یەککگرتن، یەککگرتنێکیان بریتیی بوو لە پارچەکانی ڕۆژهەڵات کە پایتەختەکەی (نوزی)بووە، یەککگرتنی دووەم بریتیی بوو لە پارچەکانی ناوەڕاست کە پایتەختەکەی (خانی گلیت) بووە لەکاتێکداو لەکاتێکی تردا شاری (شۆکنی) بووە، کەکەوتووەتە سەر ڕووباری (خاپوور) لەلای شاری (سەرێ کانی – راس العین)، یەککگرتنی سێیەم بریتی بووە لەپارچەکانی ڕۆژئاوا، کە پایتەختەکەی (ئالالاخ) بووە لە نزیك (حەلەب).."[16].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کەرکوك یەکێك بووە لە پایتەختەکانی ئەو دەوڵەتە فراوانە، لەناو ئەو یەککگرتنەی ڕۆژهەڵاتی میتانییەکاندا چەند شوێنی شارستانی ئاوەدان هەبووە وەکو (نوزی)و (کوڕوخانی)و (ئاراپخا)و (ئال- ئیلانی)و لەوانەیە کە یەککگرتنێکی بەڕێوەبەریی فراوان لەم پایتەختەو پارچەکانیدا هەبووبێت، کەبەڵگەی ڕێکوپێکی و کارگێڕی خزمەتگوزاری ژیانی ئەو دەوڵەتە بوبێت.

فراوانی کۆشکەکان و زۆری پاشماوەی دەسنووسەکان ئەوە ڕووندەکەنەوە کەتوانایەکی کارگێڕیی و بەڕێوەبردنی فراوانیان هەبووە، بۆ هەڵسوڕاندنی توانای ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی میتانییەکان کە پایتەختەکەی (نوزی) ناوچەی کەرکوك بووە.

"ئەو پایتەختەی ڕۆژهەڵاتی میتانییەکان بریتییە لەو پارچانەی نێوان (خاپور)و (ئاراپخا)، تاماوەیەکی تر وای لێهات هەموو کوردستانی گرتەوەو دەسەڵاتیان هەتا وڵاتی ئاشوورو دەشتاییەکانی هەولێر ڕۆییوەو پیرۆیی دەوڵەتی میتانییەکان لە سەر شێوازی دەرەبەگایەتی ڕۆییوە، کە ناوی گەورەکانیان پێی وتراوە (ماریانۆ).."[17].

(کوڕووخانی) پارچەیەکی سەر بە ئاراپخا بووە، بریتی بووە لە کۆشکێکی دانیشتن و لەهەمان کاتدا شوێنی بەڕێوەبەری دەرەبەرەگایەتی بووە، کەدەسەڵاتێکی فراوانی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەبووە، دەستی بەسەر ناوچەی (کوڕوخانی – تل فخار)دا ڕۆیشتوە..[18].

نموونەی ئەمەش لەکۆشکی نوزیدا بەرچاو دەکەوێت ئینجا دەگەینە ئەو ڕاستییە، ئەویش ئەوەیە ئەم پارچانەی ئاراپخا هەریەکەی لەسەر بنەمایەکی ئابووری گرنگ دامەزراوە، بۆیە بەڕێوەبردنی کاروبارو خزمەتگوزاری ناوچەکەیان، خاوەنی پیرۆیەکی زۆر بەهێز بووە لەدەوڵەتی میتانیدا.

ئاراپخا، بنکەی بەڕێوەبردنی پاشا بووەو هەریەکە لە نوزی و کوڕووخانی ناوچەی ئاوەدانی سەر بە دەسەڵاتی ئاراپخا بوون و لەژێر دەسەڵاتی قەڵەمڕەوی ئەودا بەڕێوە چووە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەو سەردەمەدا، ئەوەیە کە کاروبارە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکانی فراوان بووەو دامودەزگا سەربازی و شارستانی و ئایینی جۆربەجۆریان بۆ بەڕێوەبردن هەبووە.

تا ئێستا تۆمارەکانی پاشایەتی لە ئاراپخا نەدۆزراوەتەوە

لەبەرئەوەی پاشا لە (ئال – ئیلانی) دانیشتوە (شاری خواوەند)... پاشا خۆی گەورەی دادوەران و سەرکردەی سەربازی بووە و هەریەکە لە نیشتەجێی ئاراپخا و نوزی، سامانی تایبەتی خۆی هەبووە، (می لوگال – Milugal)... بەردەمی یەکێك لەکۆشکەکانی بەکارهاتووە بۆ کۆبونەوەی دادوەری، ئاسەوارناسەکان بەڵگەیان دۆزیوەتەوە کەئەو راستییە دەسەلمێنێت. ئەویش لە وەڵام و پرسیاری (کوشی حەربا)، یەکێك لەفەرمانڕواییەکانی نوزا (خرانۆ) دەربارەی تاوانبارکردنی بەزیادڕۆیی دەسەڵاتەکەی لەناوچەکەدا.

دادوەرەکان وا بەدەردەکەون کە هەڵدەبژێردرێن لەنێوان ئەو گەورانەی کە ناویان هاتوە لەدەستنوسەکاندا، کە وادادەنرێت ئەمانە ئەندامن لەدادگای دادوەریدا و سەرۆکی مۆڵگە (حصن)، (خالزوخلو) بەشدار دەبێت لەگەڵیاندا لەهەندێك کاتدا.

گەورەکان (شیبۆتۆ)، لە کۆبونەوەی ئاساییدا کۆدەبنەوە و دادگا دەکەوێتە ژێر کارتێکردنی گۆڕانە دەورییەکان... دادوەرەکان دەتوانن کۆبونەوەکانیان ببەستن بە ئەمری تایبەتی کارمەندی پاشایەتی..[19].

لەدوای ئەوەی کە میدییەکان ناوچەکانی خۆیان فراوان کرد بەتایبەتی لەماوەی فەرمانڕوایی (خشاثریتا)، (٦٥٥–٦٢٣) پ.ز و (کەی خەسرەو)، (٦٣٣–٥٨٤) پ.ز، کە لە سەردەمی (کەی خەسرەو)دا هەستان بەهێرش بۆ سەر ئاشوور و لە (٦١٢)ی پ.ز توانی شاری نەینەوا داگیر بکات و کەرکوک و دەوروبەریشی کەوتە ژێر دەسەڵاتییەوە[20].

سەردەمێکی تر هاتە کایەوە ئەویش هاتنی (ئەخمینییەکان – هەخامەنشی) بوو، کە لەگەڵ خۆیدا گۆڕانێکی هەمەلایەنەی لەناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکاندا دروست کرد و بووە هۆی هەڵتەکاندنی بنەما کۆنەکان. "لەسەردەمی ئەخمینییەکاندا وڵات دابەشکرا بە سەر بیست دەهقانەدا، هەریەکە لەم دەهقانە والییەکی بۆ دانا بۆ بەڕێوەبردنی دەهقانەکە و کۆکردنەوەی باجی سەپێنراو بەسەر ناوچەکەدا.."[21].

سەردەمی ئەخمینییەکان سەردەمێك بوو بۆ گەشەکردنی بازرگانی دەوڵەتی و گۆڕان لەبنەماکانی ئابووری و بەڕێوەبردن لەناوچەکەدا.. فارسەکان لەبارەی سیاسییەوە هەستابوون بەدەوری سەرۆك و لەژێر دەسەڵاتیاندا کارە بەڕێوەبەرییەکانیان لەسەر شێوازێکی بیرۆکراتی بەڕێوە دەبردو هەڵدەستان بە بەکارهێنانی ئەو کەسانەی کە زانیارییان هەیە لەکاروبارە کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەکاندا لە هەر یەك لەئارامی، میسری، بابلی، عیلامی، عیبری و یۆنانی[22].

ئەخمینییەکان لەسەردەمی کۆرشدا ئیمپراتۆریەتێکی فراوانیان دروستکرد، درێژ بووەوە لە هیندەوە هەتا دەریای ئیجە و ئاسیای بچووك و وڵاتی بابل و ئاشوور، لەدوای خۆی قەمبیزی کوڕی هەستا بەبەڕێوەبردنی کاروبارە کارگێڕییەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی[23].

کۆرش توانی دەست بگرێت بەسەر ناوچەی قۆتودا کەلەنێوان زێی بچووك و دیجلە و چیای سلێمانی دابوو، ئەم ناوچەیە لەژێر فەرمانڕوایی (نەبوخوزنەسر)دا بوو، ئاراپخا (کەرکوك) بنکەی بەڕێوەبردنی بوو کە ئەمەی سپارد بە (غبارو) بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ناوچەیە، بەڵام وا دەگێڕنەوە کە گوایا ئەم پیاوە لەبنەرەتدا فەرمانڕەوایەکی بابلی بووە، بەڵام لایەنگری کۆرش بووە[24].

لەسەردەمی (دارا)دا شێوەیەکی تری بەڕێوەبردنی بەکارهات ئەویش بەهەڵوەشاندنەوەی سیاسەتی (لامەرکەزی) و نەرمی و لێبوردن لەسیاسەتداو لەجێگەی ئەوەدا فەرمانڕەوایانی راستەوخۆی دانا بۆ هەر کیشوەرێك، لەسەر هەر کیشوەرێك فەرمانڕەوایەکی دانا کە دوو راوێژکاری هەبێت، یەکێکیان بۆ کاروباری سەربازی و ئەوی تر بۆ کاروباری باج کۆکردنەوە[25].

"یەکتر گیربوونی سەرتاسەری ئاسیای خۆرنشینی، لەژێر ئاڵای دەسەڵاتی پادشایەتی هەخامەنشیدا، دابەشبوونی ئەم خاکە بەربڵاوە بۆ چەند هەرێمێکی ژێر چاوەدێری و سەر بە حکومەتێکی ناوەندی، دامەزراندن و بەدی هێنانی رایەڵەی پەیوەندی نێوان هەموو بەشەکانی ئیمپراتۆری بە رێگای وشکانی و دەریاییدا و پێکهێنانی دام و دەزگایەکی بە پارسەنگی وەرگرتنی پیتاك و سەرو لێژبوونی لێشاوی زێڕ بۆ خەزنەکانی حکومەتی، کۆمەڵێك هۆکاری بەهێز بوون کە ژیانی ئابووری ئێرانیان بووژاندەوە. هاتنی پێوەرو سەنگ و تەرازوو و بڵاوبونەوەیان بە تەواوی خاکی پادشایەتیدا و بە تایبەتی لێدرانی سکە، برەوی بە بواری کاروباری بازرگانیی دەرەکی دا کە لە سایەسەری ئابووری نیشتمانییەوە، گەلێکی گەشە کردبوو"[26]. "لە سەردەمی هەخامەنشی دا، زەوی و زاری بەربڵاو، سەرچاوەی بەرهەم و داهاتی کشت و کاڵ بوون"[27].

" لە زەمانی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشییەوە، دنیا پێی نابوو بە سەردەمێکی یەکجار لە بارو گونجاوی ئابووری. ئەو ناوچە و هەرێمانەی کە لە پێشودا پێکەوە نەکەوتبوونە ئاڵوگۆڕی بازرگانی، بۆ وێنە جێگایەکی وەکو بابل و یۆنان، توانییان پردی پەیوەندی هەڵبەستن و پەرە بە رەوتی کارەکە بدەن"[28].

" ناوی ئەو گەل و نەتەوانەی کە فەرمانڕەوایەتیی هەخامەنشییەکانیان پێکهێناوە، لە دەقەکانی پارسی و هەروەها کتێبی (هێرۆدۆت)یشدا جەللەکراون. کۆنترین لیزگەی ئەو ناوانە لە پێشەکیی بەردەنووسی بێستووندا خۆی دەنوێنی و دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی (٥٢٠) ی پێش زایین، (داریووش) بۆ ناساندنی سەرزەمینەکان واژەی (دەهیاوا – دەهیڤاڤە – دەهیاوە) خستۆتە نێو دەقی بەردەنووسەکەوە و لە لیزگەی بەراییدا وەبەرچاو دێن، بۆ وێنە هەرێمی (پارس – پارسە)، بەڵام لەسەر رووکاری گۆڕی (داریووش) و جێنیشینەکانی لە نەخشی رۆستەم، وا دیارە ناوەکان سەبارەتن بە هۆزو نەتەوەکان، بۆ وێنە (iyam parsa – ئەمە پارسە – پارسییە).

لەویێ هەر ناوەی سەبارەتە بە قەڵافەتێکی داتاشراوی نەخشە بەردینەکە. کە لەوانەیە ناوی هەرێمەکان لە ناوی کەسەکان

یەكتر دەخوێنێتەوە كە هەر كامەیان جلوبەرگ و بەژن و باڵایان جیاوازە، پێرستی سەرەكیی داریووش ئاوا ریزكراوە: ئورڤە جا (عیلام) یان بە گوتەی هیرۆدۆت هەرێمی (كیسیان)، بابە ئیرووش (بابیرووش - بابل)، (ئاسوورا - ئاشوور - ئاشۆر)، (عەرەبیا - عەرەبستان)، (موودرایا - میسر)، (تایابی - درایابیا)، ئەوانەی لە دەریادا دەژین، (سپاردا - سارد)، (یائوونا - ئییۆنییەكان - یۆنانییەكان)، (مادە - ماد)، (ئارمینا - ئەرمەنستان)، (كاپاتووكا - كاپادۆكیە)، (پەرسەوت - پارت)، (زرەنكا - زەرەنگ - زەرەنگە)، (درانجیانا)، كە بێ گومان هەر ئەو خەڵكەن وا هێرۆدۆت پێیان دەڵێت (سارانگایی)، (هارائیوا - هەرەئیڤە - ئارێئیا - هیرات)، (ئووقارارزمی - خارەزم)، (باختەریش - باكتەریا - بەلخ)، (سوگدا - سۆغدیان)، (گەندارە - پاروپیارا ئێسانا) لە زمانی بابلی و عیلامی دا، (سەكا - سەكەكان یان ئێسكیتەكان، (تاتاگووش) هەمان (ساتاگیدای)ی هێرۆدۆت، (هارەئووڤاتیش - ئاراخۆزیا - رۆخج) و ماكایان (مەكران)، سەرجەمی ئەمانە بێجگە لە پارس دەبنە بیست و دوو سەرزەمین"[٢٩].

"واوێدەچێ كە پادشایەتی تازەی بابل دوای رووخانی نەینەوا بەرەو باكووری دوو چۆمان پەرەی گرتووە و ئەوبەر رووبار لە زەمانی (نەبووكەد نەسسەرداِ) پێوەی زیاد كراوە، كەوایە ئەو كاتەی (كووروش) لە ساڵی (٥٣٩)دا بابلی گرت، ئێرانییەكان توانییان ئیمپراتۆرییەكی دیكە وەچەنگ بێنن. بەڵگەنامەكانی بابلی دەریدەخەن كە لە سەرەتادا بابل و (ئەبەرنەهەر - ئەوبەر رووبار) تەواو وەكو هەرێمێك چاویان لێ كراوە و كاروباریان هەڵسووراوە. بەڵام پاش تێپەڕینی شەش ساڵی بەسەر پادشایەتیی داریووش یەكەمدا، بوونە بە دوو هەرێم (ساتراپی)"[٣٠].

لێرەدا دەگەینە ئەوەی كە شوێنی كەركوك لە نێو ناوچەكانی ئەوبەر رووبار یان بابلدا یا لە شوێنە كۆنەكانی ئاشووریدا لە نێو (ساتراپی)ێكی دیاریكراودا بووە.

بەڵام سەلۆقییەكان سیاسەتێكی تری بەرێوەبردنیان گرتەبەر، لەسەر شێوازی (هیلینسیتانە) لەناو جەرگەی ئیمپراتۆریەتە رۆژهەڵاتییەكەیان، لەسەر شێوەی ئەوەی كە هەموو ناوچەكان بەشێكن لە ئیمپراتۆریەتەكە.. نەخشەكەیان لەسەر شێوازی پێكەوە بەستنەوەی وڵاتی سوریا و سەرووی میزۆپۆتامیا بە كیشوەرێكی یەكگرتوو لە شێوەی مەكەدۆنیا (مەقەدۆنیا)یەكی تر[٣١].

هەر بۆیە دەبینین ناوچەی كەركوك لەزۆر لایەنی بەرێوەبەری و كارگێری و بیناكاری و ئابووری كەوتە ژێر كارتێكردنی نەخشەی ئیمپراتۆریەتی هیلینسیتانەی ئەسكەندەری مەكەدۆنییەوە و كەوتە بەر ئەو تازەكردنەوەیە... لەكاتی هاتنی ئەسكەندەر بۆ سەر قەڵا و ئەو پێشوازییەی كە لێی كراوە جۆرە سەربەخۆییەكی فراوانی دایەوە لەلایەن ئەسكەندەرەوە بۆ بەرێوەبردنی كاروبارەكان.

فراوانی ئیمپراتۆریەتی سلۆقییەكان درێژ بوبووەوە لە هیندەوە هەتا سنووری میسر و لەدەریای رەشەوە هەتا كەنداوی فارسی، لەسەرەتاوە ئەم ئیمپراتۆریەتە دابەشكرابووە سەر دوو بەشەوە، بەشە رۆژهەڵاتییەكەی پێكهاتبوو لە عێراق و پارچە رۆژهەڵاتییەكانی ترو پایتەختی تازەی بۆ دانا بەناوی سلۆقییەوە لەرۆخی رووباری دیجلە..[٣٢].

"دامەزراندنی ئیمپراتۆریی ئەسكەندەرو گۆرانی بۆ سێ پادشایەتیی هێلینی، بە باری ئابووریدا، گۆران و شۆرشێكی راستەقینە بوو لە دنیای ئەو سەردەمەدا. بۆ یەكەم جار بوو كە دوورترین ناوچەكانی دنیا وا پێكەوە دەبەسترانەوە كە بچووكترین گرمە هەرا لە ناوچەیەك تەشەنەی دەكرد بۆ ناوچەكانی دیكە، باری ئابووری هەرگیز هەتا ئەو ئەندازەیە نەببوو بە تێبەستەی ئاڵوگۆری سیاسی و ئاوا نەكەوتبوویە ژێر باندۆری رەوتی ئەم رووداوانەوە، سەنگ و بایەخی سكە كە لەو مەیدانە بەربڵاودا برووزی ئەستاندبوو، زۆر گرنگی دەنواند"[٣٣].

"بارودۆخی بازرگانی لەم قۆناغەدا جارێكی دیكە گۆرانی بەسەردا هات. قەبارەی كەلوپەل و بەرهەمی هەرزانبایی كە لە ماوەی سەردەمی رابردوودا، بەشی هەرە زۆری ئاڵوێرەكانی پێكدەهێنا، پلەی دابەزی و شتومەكی جوان و ناسك جێگەی گرتەوە. رۆم وەكو دەورگێرێكی تازە كەوتە نێو رەوتی كاروباری بازرگانیی جیهانەوە.

كەرەستەی خاوی وەكو دارو كانزا كە ئێران و هیند گەورە بەرهەم هێنەرییان بوون، كریارێكی زۆر سەرەیان بۆ گرتبوون. كەلوپەلەكانی بازرگانی بریتی بوون لە: (بەردی گرانبایی و گەواهێراتی نەخشێن و كەندەكاری كراو، دەفری سواڵین، شووشە، كووتاڵ، دەسكاری هونەری، پاپیرووسی و كۆمەڵی كۆیلان). ئەم رەوتەی بازرگانی لەگەڵ كاڵا و كەلوپەلەكان شێوەی تازەی بیروبۆچوون و رێگایی نوێباوی ئابووری و رێ و شوێنی گەرمە تەندووری كرین و فرۆشتنی دێنایە ئێرانەوە"[٣٤].

"سلۆكییەكان پێكهاتەی كشتوكاڵی ئێرانی سەردەمی هەخامەنشییەكان تێكەوە دەپێچن و گەلێك زەوی و زاری بەربڵاوی میری و تایبەتی یان سەر بە پەرستگاكان بە سەر ئاراندا دادەبشن یان دەیانكەنە باربووی كۆچەرنشینانی لەشكری. ئەم رەوتە دەبێتە هۆی بەدی هاتنی ئاڵوگۆر لە كاروباری كشتوكاڵیداو بۆ ماوەی سەدان ساڵ خۆی رادەگرێ و لەسەر بنەمای پێكەوە ژیانی هاوبەش و كاری شان بە شان لەگەڵ یۆنانییەكان دادەمەزرێ كە لێیان فێری شێوەی تازەی وەرزێری دەبن"[٣٥].

".. نەمانی دەسەڵاتی مەقدوونی لە چوارچێوەی قەڵەمرەویدا، هەراو ئاژاوەیەكی توندو تیژی نایەوەو واوێدەچێ كە ئاسیای زیاتر گرتبێتەوە، ئەوەی راست بێت ئەم سەردەمە بە باری هەڵگرسانی شەرو تەنینەوەی تاڵان و رێگری دا، لەگەڵ تاریكترین سەردەمانی پێشوو بەراوورد ناكرێ"[٣٦].

بەڵام لەدوای كۆچی دوایی ئەنتیۆخسی سێیەم ئەم ئیمپراتۆریەتە دابەش بوو و پارچەی رۆژهەڵاتی لێی جیابۆوە لەلایەن (پرس)یەكانەوە بەرێوەدەبرا، لەساڵی ١٢٦ی پێش زایین[٣٧]، هەر لەسەردەمی پرسییەكانەوە ئاشوور ئاوەدان كرایەوەو شارەكانی سەرووی عێراق ئاوەدانی بەخۆیەوە

دیوەو گەشەی کرد.

"سنووری ئێران لە ڕۆژگاری دەوڵەتی ئەشکانییەکاندا بە تەواوی دیار نییە، بەڵام لە نووسراوەکانی مێژوونووسان‌و لە نووسەرەکانی یۆنان‌و ڕۆمەوە وا دەردەکەوێت کە ئەم ئەیالەتانە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی پارتەکاندا بوون.

١. پارت یان خوراسانی دێرین.
٢. داموغان.
٣. ناوچەی پتورییەکان‌و ئامارەکان.
٤. مادی گەورە یان عێراقی عەجەم.
٥. مادی بچووك یان ئازەربایجان.
٦. ئادیاین‌و هەولێر یان ئاشووری دێرین.
٧. کردۆن (ناوچەی کوردستان).
٨. ئەرمەنستانی گەورەو بچووك.
٩. ئەدس یان ئورفا.
١٠. الحضر (هارنزا).
١١. کلدەی دێرین یان بابل یان کەنداوی فارس.
١٢. خوزستان.
١٣. پارمی یان فارس.
١٤. کرمان.
١٥. کەویری لووت‌و کوسیستان یان ناوچەی ساگارتی.
١٦. باختەر تا ئەو ناوچانە کە لە خۆرهەڵاتی باختەران تا هیندو هیمالایا.
١٧. ناوچەکانی دراوسێی هیند.
١٨. ناوچەکانی دراوسێی خۆراسان تا ڕووباری جەیحون.

دەوڵەتی ئەشکانی لە تەواوی ماوەی تەمەنی دەوڵەتەکەیاندا یەکسەر ئەم ناوچانەی سەرەوەیان لەژێر دەستدا بوو، چەندین جار جیاوازی‌و دوورکەوتنەوە بە هۆی ڕۆژگارو کزبوون، گەشەکردن‌و لەشکرکێشییەکانەوە ڕوویانداوە"[٣٨].

لە سەردەمی مترپداتسی یەکەم (١٧١-١٣٨ یان ١٢٧)ی پێش زایین، توانرا دەست بەسەر سوسەو کەرخینەو وڵاتی میدیا و زنجیرە چیای زاگرۆسدا بگرن‌و، وا بکەن کە دەسەڵاتی سلۆقییەکان تەنها لە ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق بمێنێت لەنێوان فورات تا سوریا[٣٩].

ئەوەی تایبەتمەندی هەبوو لەدەوڵەتی ساسانیدا، سەرهەڵدانی ڕوحێکی نوێ بوو بۆ ژیانەوەی بیروباوەڕی ڕۆژهەڵاتی، بەرامبەر هیلینی، چونکە پیرۆزی بەڕێوەبەری‌و یەکگرتنەوەی پارچەکان‌و یەکخستنەوەی وڵات لەژێر ئاوەزێکی ئایینی زەردەشتی، یەکێکە لەبنەماکانی دەوڵەتی ساسانی کە لەکاتی خۆیدا لەدوای ڕووخانی خۆشیدا کارتێکردنی بەجێهێشت‌و هێشتنەوەی ئایینی زەردەشتی وەکو ئایینێکی باوی دەوڵەتەکە[٤٠].

ئەگەر چاوێك بەسەردەمی ساسانییەکان بگێڕین لەناوچەی کەرکوکدا دەبینین کارتێکردنێکی گەورەی دروستکرد بەتایبەتی لە ڕووی جێبەجێکردنەکانی ئایینی زەردەشتی کە تاکو ئێستا کاریگەری خۆی هەرماوە. بەشەکانی ئەم دەوڵەتە پێکهاتبوو لە فارس، کرمان، سجستان، خراسان، ئەسفهان‌و زەوی چیا (ارض الجبال) کەپێکهاتبوو لەم ماهانە.. ماە کوفە، ماە بەسرە، ماە سبزان، هەمەدان، شارەزوور، دەرئاباد، صامغان، ئازربایجان، ئەرمینیا، ئاران، بلیقان. کەرکوك بەشێك بووە لە شارەزوور کەلەزۆر کاتدا پێکهاتبوو لە کەرکوك‌و سلێمانی[٤١].

"ساسانییەکان دەستیان لە دابەشینی پێشووی وڵات وەرنەداو چوارقۆڵەیان لە جێی خۆی نەترازاند. هەر چۆنێکی بێ لە سەرەتای سەدەی پێنجەوە دەبینین کە بە حاکمانی ئەو هەرێمانەیان گوتووە (سنووروان)، ئەم چوار سنوورانە کەم‌و زۆر شانیان لە شانی ئەو بنەماڵە میرانە دەدا کە باسیان کراوە وەك ئەوان خاوەنی ناو و نازناوی پادشایەتی بوون. ئەو حوکمرانانەی کە لە بنەماڵەی ساسانیش بوون، هەر ئەم شانە بەرزەیان درابوویە. لە ڕۆژگارانی کۆنەوەدا باوبوو کە کورانی پادشا دەکرانە حوکمران، بە تایبەتی ئەو شازادانەی کەرەنگبوو ڕۆژانێك بگەنە سەر تەختی پادشایەتی ناچار بوون ببنە حاکمی هەرێم‌و ناوچەیەك هەتا خۆیان بۆ ئەرکی پادشایەتی تێرو تەیار بکەن.

.. لە نێو فەرمانڕەوایانی ساسانیدا: (شاپوری یەکەم، هۆرمزدی یەکەم، وەهرامی یەکەم، وەهرامی دووەم)، بەر لەوە دانیشنە سەر تەختی پادشایەتی، میروحوکمرانی خوراسان‌و کووشان بوون. هۆرمزدی یەکەم (هۆرمزد ئەردەشیر) حکومەتی ئەرمەنستانی لە ئەستۆ بوو، (شای گەورەی ئەرمەنییەکان) وەهرامی یەکەم بە نازناوی (گیلانشا)وە حکومەتی بەسەر گیلاندا دەکرد. لە کورانی شاپووری یەکەم (نەرسە)، (سەکانشا - شای داهاتوو) حاکمی سیستان‌و (شاپوور)، (میشان شا) حاکمی میشان بوو. هەروەها وەهرامی سێیەم (سەکان شا)ی دواتر، بوو بە حوکمرانی سیستان‌و ئەردەشیری دووەم کرایە ئوستاندرای (ئادیابێنی)"[٤٢].

"حوکمرانانی هەرێمەکان، ئوستانداران یان سنووردانانیش بەکار بەدەستانی پایە بەرزی دەوڵەت داندراون. شان بە شانی ئەو سنووروان‌و شاروانانەی کە خاوەنی نازناوی پادشا بوون، چەند میرێکی بەرەژێریش هەبوون کە حکوومەتیان بەسەر ناوچەو مەڵبەندەکانی نێو خۆی وڵاتا دەکرد"[٤٣].

"لە سەرەتاکانی سەردەمی زایینی مەسیحیدا، دوو مەملەکەتی نزیك یەکتری هەبوو کە سەربەخۆییەکی ناوخۆییان هەبوو لە نێو ئیمپراتۆریەتی (پرسی - ئەشکانی)یەکان، مەملەکەتی (ئەدیابێنی) کە پایتەختەکەی (ئەربیل) بوو پادشاکەی ناوی (ئێزەتی یەکەم) بوو، مەملەکەتی (گرکێنی) لە خوارووی زێی بچووك بوو کە پایتەختەکەی (کەرەك - کەرکوك) بوو، پادشاکەی (ئەدینرگلوس)، هەروەها ئەم دوو مەملەکەتە لە سەرەتاکانی فەرمانڕەوایی ساسانی بوونی هەبوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی زایینی، لەو سەردەمەدا پاشای ئەدیابێنی پێی ووتراوە (شەهرەت)و پاشای کەرکوك (کەرخ سلۆخ) پێی ووتراوە (دومیتان).

ئەوەی جێگەی گوومان نییە کە دەڤەری کەرکوك لەو سەدەیانەدا پێی ووتراوە (گرکێنی)و بێژەتی گرخێنی لە سەدەی حەوتی کۆچی بوونی هەبووە[٤٤].

## * سەردەمە كارگێڕی و بەڕێوەبەرییەكانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچەی كەركوكدا

بڵاوبونەوەی ئایینی ئیسلام و داگیركردنی كەركوك لەلایەن سوپای ئیسلامەوە، وای لێهات كە گۆڕانێكی تر لە ژیانی كارگێڕی و بەڕێوەبەریدا دروست بێت، تارادەیەك جیاواز بوو لەسەردەمەكانی پێش بڵاوبونەوەی ئیسلام، ئەمە بووە هۆی هەرەس هێنانی هەموو ئەو سەردەمە كارگێڕییانەی كە پێشتر باوبووە، بووە هۆی داڕێژرانەوەی لەسەر بنەمای ئابووری ناوچەكان، بۆ ئەوەی بەشێوازێكی وابێت كەبگونجێت لەگەڵ ژیانی شەركەری موسوڵماندا.

هەر لەكاتی ڕزگاركردنی عێراقدا ناوچەكە بە سەر دوو والی دابەشكرا: یەكێكیان لە كوفەو ئەوی تر لەبەسرە، بەهەریەكەیان وتراوە (ئەمیر)، هەر ئەمیرێك بەرپرسیار بووە بەرامبەر بەڕێوبردنی ئەو ناوچانەی كە لەژێر دەسەڵاتی دایە، كەبەڕێوەبەرێتی ئەمیری كوفە بریتی بووە لەناوچەكانی ناوەراستی عێراق و سەرووی بەگشتی، هەروەها بریتی بووە لەناوچەكانی سەرووی گردۆڵكەكانی ئێران كە لەگەڵیدا هەمەدان، قەزوین، ڕەی و ئەسفەهان.

بەڵام ئەمیری بەسرە ناوچەكانی بریتیبووە لەناوچەكانی خوارووی عێراق، ئەهواز، فارس، كرمان، مەكران، سجستان و خراسان....و ئەمیر بەرپرسیاربووە بەرامبەر ئاسایشی وڵاتەكەی كەپەیوەست بووە بەبەڕێوەبردنی ولایەتەكەی و كۆكردنەوەی باج و چارەسەركردنی گیروگرفتەكانیان كە لەهەر كاتێكدا سەریان هەڵبدایە، هەر ئەمیرێك (والی) دادەنێت بۆ ئەو ناوچانەی كە دوورن، وەكو ئەوەی ئەمیری كوفە والی دادەنێت بۆ هەریەكە لە موسڵ، ئازەربایجان، هەمەدان، قەزوین، ڕەی و ئەسفەهان... لەسەردەمی عەبدولمەلیكدا ولایەتی موسڵ و ئازەربایجان جیاكرایەوە لەبەر دوورییان، عێراق دابەشكرایە سەر دوانزە یەكەی بەڕێوەبەری، كە بە هەریەكەیان دەوترا كورە یان ئوستان و هەر یەكە لەم بەشانە دابەشكرایە سەر چەند (تەسایج) كە هەریەكە لە تسوجێك پێك دێت لە چەند (رساتیق) و دێیەك، لەهەر كورەیەك یەكێك دانراوە كە بەرپرسیارە لەسەر بەڕێوەبەری ناوچەكەی لەهەموو ڕووییەكەوە[٤٥].

لەسەردەمی ئەمەوییەكاندا هەمان ڕێرەوی سەردەمی ڕاشیدینەكانیان گرتەبەر تاسەردەمی مردنی ئەمیری كوفە (موغیرە كوری شوعبە) لە ساڵی (٥٠)ی كۆچی، كەئەمە وایكرد (معاویەی كوری ئەبو سفیان) هەستێت بەدانانی ئەمارەتی بەسرەو ئەمارەتی كوفە لەیەك بەڕێوەبەریدا لەژێر دەسەڵاتی ئەمیرێكدا.

بەڵام كاتێك (حەجاج كوری یوسف ئەلسەقەفی) كرایە والی عێراق لە ساڵی ٧٥ی كۆچی (٦٩٤ی زاینی)، هەستا بەدانانی شوێنێكی تازە لەنێوان كوفەو بەسرەدا بۆ بەڕێوەبردنی كارەكانی كە ئەویش شاری (واسیت) بوو كە ئەمە تا كۆتایی دەوڵەتی ئەمەوی بەردەوام بوو[٤٦].

خەلیفەی ئەمەوییەكان وایان دانابو كە ویلایەی عێراق و بەشی ڕۆژهەڵاتی دوور لێوەی وەكو خۆراسان، كرمان، وڵاتی چیاو وڵاتی دوای ڕووبار، بەڵام زەوی موسڵ كە نوساوە پێوەی نەكەوێتە نێو ئەم دیاریكردنەوە، ئیبن عەبد ڕەبە وتویەتی (زەوی جەزیرە كە لەنێوان دیجلەو فوراتدایە ناكەوێتە سەر ولایەتی عێراق)، و والی بۆ دانراوە لەلایەن خەلیفەی ئەمەوییەوە..[٤٧].

لەسەرەتاكانی ئیسلامدا داقوق لكێنرابوو بە ویلایەتی كوفەوە، كە ئەمە هەر لەسەردەمی ئەمەوی و عەباسی دا هەر بەردەوام بوو، كە لەكاتی ئەمەوییەكاندا بنكەی ئاژاوەو شۆڕشی خەوارج بووە[٤٨].. بۆیە ئەمە وادەردەكەوێت كەناوچەی كەركوك و دەورووبەرەكەی لەسەردەمی بڵاوبونەوەی ئیسلام و ڕاشدی و ئەمەویدا سەر بەویلایەی كوفە بوون، بەڵام داقوق ناوچەیەكی گرنگ بووە لە چاو ناوچەكانی تری دەورووبەری كەركوك و زیاتر بنكە بەڕێوەبەرییەكە لەناوچەی داقوق بووە.

* "كوردستان لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە بەسەر ئەم هەرێمانە دابەشكرا:

١. هەرێمی چیاكان، كوێستان و شارەزوور.
٢. هەرێمەكانی ئاوەربیجان و ئەرمینا و ئاران.
٣. هەرێمی جەزیرە.
٤. هەرێمی خوزستان"[٤٩].

* "هەرێمی جەزیرە:

جەزیرە واتا ئەم ناوچانەی دەكەونە نێوان دوو ڕووباری (دیجلە) و فوراتەوەو ئەم دوو ڕووبارە دەبنە سروشتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هەرێمەكە، هەر چەندە هەندێك شارو دەڤەر هەبوون دەكەوتنە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوە یان ڕۆژئاوای فوراتەوە كەچی لە ڕووی ڕێڤەبەرییەوە هەر سەر بە جەزیرە بوون.

جەزیرە لە باشوورەوە دادەكشا تا قەڵای تكریت لەسەر دیجلەو باژێری هیت لەسەر فورات و هێڵی نێوان تكریت- هیت دەبووە سنووری نێوان جەزیرەو عێراق، هەرچی لە باكووریشەوەیە ئەوا هاو سنووری ئەرمینا و وڵاتی ڕۆم بوو. كورد لە مێژەوە پێكهاتەیەكی ڕەسەن و بنەرەتیی دانیشتووانی جەزیرە پێكدەهێنێت، مێژوویەكی دێرین و ڕەگداكوتاوی لەو هەرێمە هەیە"[٥٠].

"لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەمەوییەكاندا كەركوك و داقوق بەشێك بووە لە كوفە، بەڵام لە دواییدا بۆ ماوەیەك لكێندراوە بە موسڵەوە، گەلێ جیاوازی و لێكدانەوە هەیە دەربارەی ئەو ماوەیەی كە داقوق لكێندراوە بە موسڵەوە، هەر وەكو ئەوەی (ئەلبەلازری) دەگێڕێتەوە كە گوایە: (مەتەر كوری عەمران، لە باجەرمی یان داقوقا كوژراوە كە سەر بە ئاقاری موسڵ بووە، دەرچوونی مەتەر كوری عەمران پێش دەرچوونی سالح كوری مەسرەح بووە، كە دەكاتە پێش ساڵی (٧٦)ی كۆچی بەرامبەر (٦٩٥)ی زاینیی، هەر وەكو ئەوەی (ئەلئەزدی) گێراوێتێوە كە داقوق سەر بە ئاقاری كوفە بووە تا ساڵی (١١٣)ی كۆچی بەرامبەر بە (٧٣١)ی زاینیی، بەڵام لەو ساڵەدا دووبارە ڕێكخستنی یەكە كارگێڕییەكانی

ویلایەتییەکان کراوەو داقوق لە کاروباری کارگێڕی موسڵدا بووە)"[٥١].

*** "والییەکانی کەرکوك لە سەردەمی ئەمەوی:**

– (عەبدولرەحمان کوڕی عوسمان ئەلسەقەفی) ناسراو بوو بە (ئیبن ئوم ئەلحەکەم)و خوشکەزای (موعاویە کوڕی ئەبی سوفیان) بوو، لە ساڵی (٥١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٧١)ی زایینیی کرا بە والی.

– (محەمەد کوڕی ئەلئەشعەس کوڕی قەیس)، لەلایەن (عەبدول کوڕی زوبێر) کرا بە والی لە ساڵی (٦٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٣)ی زایینیی.

– (سەعید کوڕی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان)، لە ساڵی (٦٥)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٤)ی زایینیی کرا بە والی.

– (عەبدولرەحمان کوڕی سەعید کوڕی قەیس)، لەلایەن (ئەلموختار ئەلسەقەفی) کرا بە والی لە ساڵی (٦٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٥)ی زایینیی.

– (ئیبراهیم کوڕی ئەلئەشتەر)، لەلایەن (ئەلموختار ئەلسەقەفی) کرا بە والی لە ساڵی (٦٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٦)ی زایینیی.

– (ئەلموهەلەب کوڕی ئەبی سەفرە)، لەلایەن (موسعەب کوڕی ئەلزوبێر) کرا بە والی لە ساڵی (٦٧)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٦)ی زایینیی.

– (ئیبراهیم کوڕی ئەلئەشتەر)، بۆ جاری دووەم، لەلایەن (موسعەب کوڕی ئەلزوبێر) کرا بە والی لە ساڵی (٦٨)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٨٧)ی زایینیی.

– (محەمەد کوڕی مەروان کوڕی ئەلحەکەم)، لە ساڵی (٧١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٦٩٠)ی زایینیی کرا بە والی.

– (یەحیا کوڕی یەحیا ئەلغەسانی)، لە ساڵی (١٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧١٩)ی زایینیی کرا بە والی.

– (عومەر کوڕی هبیرە ئەلفەزاری)، لە ساڵی (١٠١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧١٩)ی زایینیی بۆ ماوەیەکی کەم کرا بە والی کەرکوك، لە دواییدا کرا بە والی عێراق.

– (مەروان کوڕی محەمەد)، لە ساڵی (١٠٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٢٠)ی زایینیی کرا بە والی.

– (ئەلحەربەن یوسف)، لە ساڵی (١٠٦)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٢٤)ی زایینیی کرا بە والی.

– (یەحیا کوڕی ئەلحەربەن یوسف)، لە ساڵی (١١٣)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٣١)ی زایینیی کرا بە والی.

– (ئەلوەلید کوڕی تەلید ئەلعەبسی)، لە ساڵی (١١٤)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٣٢)ی زایینیی کرا بە والی.

– (ئەلوەلید کوڕی بەکیر)، لە ساڵی (١٢١)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٣٨)ی زایینیی کرا بە والی.

– (ئەبو قوحافە ئەلمەزنی)، برازای (ئەلوەلید کوڕی تەلید ئەلعەبسی)، لە ساڵی (١٢٢)ی کۆچی بەرامبەر بە (٧٣٩)ی زایینیی کرا بە والی.

– (مەروان کوڕی مەروان)، بۆ جاری دووەم، لە ساڵی (١٢٦)ی کۆچی (٧٤٩)ی زایینیی کرا بە والی.

– (ئەلزەماك کوڕی قەیس)، لە ساڵی (١٢٨)ی کۆچی (٧٤٥)ی زایینیی کرا بە والی.

– (هیشام کوڕی عەمرو ئەلزوهێری)، لە ساڵی (١٢٨)ی کۆچی (٧٤٥)ی زایینیی کرا بە والی، تا ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی لە ساڵی (١٣٢)ی کۆچی (٧٤٩)ی زایینیی"[٥٢].

*** کەرکوك لە سەردەمی عەباسییەکاندا:**

((هەر لەکاتی دامەزراندنی بەغدادا لە ساڵی (١٤٥)ی کۆچی، ئەم شارە کرایە بنکەی خەلافەتی عەباسیی و بنکەی کارگێڕی دەوڵەتی عەباسی بوو)).

لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عەباسی دا عێراق دابەشکرایە سەر سێ ناوچەی کارگێڕی کە بەغدا، کوفەو بەسرەو هەریەکە لە والییەکانی کوفەو بەسرە لەلایەن خەلیفەوە ڕاستەوخۆ دانراوە.. لەسەرچاوەی عەباسییەکاندا وادەرکەوتووە، کەگەلێك گۆڕانیان لە کارگێڕیی و بەڕێوەبەری عێراقدا کردووەو پەیرەوی گەلێك دابەشکردنی بەڕێوەبەری جۆربەجۆریان کردووە، کە ئەمانە باوبوون هەتا کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی، بەڵام لەدواییدا ئەم دابەشکردنە بەڕێوەبەرییانە هەڵگیران و لەجێگەیاندا دابەشکردنی بەڕێوەبەری تازە دانرا، هەروەها لەکاتی دەستڕۆیی تورکەکان لە ساڵی ٢٤٧-٣٣٤ی کۆچی و بووەیهیەکان لەساڵی (٣٣٤-٤٤٧)ی کۆچی و سەلجوقییەکان لەساڵی (٤٤٧-٥٥٢)ی کۆچی، دەوری گرنگیان بینی لە بێهێزکردنی خیلافەت و بێهێزی دابەشکردنە کارگێڕییەکان و قرتاندنی بەشێکی زۆر لەلەشی دەوڵەتەکە بۆ ئەمارەتی بچووك بچووك[٥٣].

"بە درێژایی سەردەمی ئیسلامی دەیان گوندو دەڤەرو شارەدێی کوردنشینی ناوبانگیان هەبوو وەك: باعەزرا، باهەدرا، داسن، باجلێ، بابەغێش، باجرمێ، (خانیجار، کانی هەنجیر، خوورماتوو)، حەززەی نزیك هەولێر، ئەردەمشت، ئەمانەش سەر بە موسڵ بوون.

لە سەدەکانی دواییدا ژمارەیەکی دی شارو شارۆچکەو قەڵا ناوبانگیان پەیدا کرد وەك: (هەولێر- ئەربل)، (الحسنیە- زاخۆ)، (خەفتیان- هاودیان)، (هەرور- ئامێدی).

لەسەردەمی عەباسی، موسڵ و دەورووبەرەکەی کە پتر کوردنشین بوون لە هەرێمی جەزیرە دابڕێنران و وەك هەرێمێکی سەربەخۆی لێهات.

(باجرمێ- گەرمیان): ناوێکی جوگرافی دێرینەو لە نووسراوە سریانی و عەرەبییەکاندا بە باجرمێ، بیتجرمێ، باجرمق هاتووە کە هەر لە ووشەی گەرمی کوردییەوە داتاشراوەو پێشگری بار- پیتی خراوەتە سەر کە نیشانەی شوێنە لە زمانی سریانیدا بە واتای وڵاتی (گەرم- گەرمیان) گەرمیان پێکدەهات لە داقوق و خیناساپورو خاینجارو (کەرخین- کەرکوك)، دەڤەرێکی سەر سنووری نێوان هەردوو هەرێمی جەزیرەو عێراق بوو، زۆربەی کات وەك ولایەتێکی سەربەخۆ وابوو، هەر چەند لە ڕووی کارگێڕییەوە سەرەتا سەر بە جەزیرە بوو پاشان لە ئەنجامی هەڵستانەوەو بەهێزبوونی خیلافەی عەباسییەوە لە سەدەی شەشەمی کۆچی و دوانزەی زایینیی خرایە سەر عێراق"[٥٤].

"شارۆچکەی داقوق کە کەوتووەتە خوارووی شاری کەرکوك بە دووری ٤٥ کیلۆمەتر، یەکێکە لە ناوچە بە ناوبانگەکانی (باگرمی – کەرکوك)، لە سەردەمی عەباسی، فەرمارەوایی ئەم شارە لە کۆتایی سەدەی دووەمی کۆچی، سەدەی هەشتەمی زایینی، لەلایەن کەسێکەوە بە ناوی (ابي ضرغام العجل) بەرێوەبراوە، کە شارەکە لەو سەردەمەدا کۆشکی فەرمانڕەوایی لێ هەبووە.

لەبەر نزیکی لە پایەتەختی خیلافەتەوە، بەغدا، بایەخی زۆری پێ دراوە، لە کاتی تەنگانەدا لە بەرچاوگیراوە.

لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی، سەدەی دەیەمی زایینی، لە دوای بێ هێزی کە تووشی خیلافەتی عەباسی بوون، بۆیە خەلیفەکان فەرمانڕوایی بەشێك لە ناوچەکانیان سپارد بە سەرکردەو باوەڕ پێکراوانیان بۆ بەرێوەبەردنی ناوچەکان.

هەروەکو سەرنج دەدەین کە خەلیفە (موقتەدر باللە) فەرمانڕەوایی شارۆچکەی داقوقی لە ساڵی (٣٠٨)ی کۆچی (٩٢٠)ی زایینی سپاردبوو بە یەکێك لە سەرکردەکانی بە ناوی (بەدر ئەلشەرابی)، هەروەکو بە دەردەکەوێت لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچی (٩٢٩)ی زایینی لەلایەن (ئەبو ئەلهیجا کوری حەمدان) بەرێوەبراوە، کە لەحەمدانییەکانی موسل بووە، بۆیە ماوەیەك لەلایەن حەمدانییەکانەوە بەرێوەبراوە، هەروەها لە سەردەمی خەلیفە (ئەلتائیع باللە) (٣٦٢)ی کۆچی – (٣٨١)ی کۆچی، (٩٧٤)ی زایینی – (٩٩١)ی زایینی لەلایەن خەلیفەوە بەرێوەبراوە.

لە دوای بێ هێزی دەسەڵاتی ناوەندی خیلافەت و زیادبوونی دەسەڵاتی حەمدانییەکان لە موسل و ناوچەکانی تر لە جەزیرە، بوو بە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتی (ئەلعەقیلیە) کە پاشماوەی دەسەڵاتی حەمدانییەکان بووە.

لە هەمان ماوەو بە دیاری کراو لە ساڵی (٣٨١)ی کۆچی – (٩٩١)ی زایینی، ئیمارەتێکی کوردی بە ناوی ئیمارەتی (عەنازی) سەری هەڵدا لە ناوچەکانی (حەلوان)، خانەقین و (قرمسین – کرمانشا)، وەکو دیارە کە دەسەڵاتی ئەم ئیمارەتە تا دەڤەری کەرکوك درێژەی کێشابوو.

لە ساڵی (٣٨٧)ی کۆچی (٩٩٧)ی زایینی، یەکێك لە سەرکردەکانی دەوڵەتی (ئەلعەقیلیە) بە ناوی (ئەلموقەلید کوری ئەلموسەیب) هەوڵی داگیرکردنی (داقوق)یان داوە.

لە هەمان ساڵدا یەکێك لە سەرکردەی زۆنگاوەکان (ناوچەیەکی زۆنگاوییە لەنێوان بەغداو بەسرە) بە ناوی (جیبرائیل کوری محەمەد) هەوڵی دا کە بەختی خۆی تاقی بکاتەوە بۆ داگیرکردنی هەندێك لە ناوچەکان، بۆیە بەشێك لە خەڵکی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، هەوڵی دا بە داقوقدا بڕوات، بەڵام کاتێك زانی لەلایەن (ئەلموقەلید)ەوە گەمارۆ دراوە، بۆیە خەڵکەکە هانایان هێنا بۆ (جیبرائیل) بۆ پاراستنیان، بۆیە وا بە دەردەکەوێت کە ئەو ناوچەیە لە دەسەڵاتی هیچ کەسێکدا نەبوو لە دەسەڵاتی خیلافەتەوە یان لە دەوڵەتەکانی دراوسێ، کە لەلایەن دوو کەسی مەسیحییەوە بەرێوە براوە، کە خەڵکی شارۆچکەکە نا ڕازی فەرمانڕەواکەیان بوونە.

بەپێی نووسینی (ئیبن ئەلئەسیر) بەدرەوشتییان لە ناوچەکەدا بڵاوکردبووە بۆیە خەڵکی داقوق نوێنەری خۆیان (باکنجیانی) ناردە لای (جیبرائیل) بۆ ڕزگارکردنیان، بۆیە ماوەیەکی کەم فەرمانڕەوای داقوقی کردووە، بۆیە فەرمانڕەوایەکی ڕاستگۆ بووە، بەڵام لە دوایدا لەلایەن (ئەلموقەلید ئەلعەقیلی) بەرێوە بردراوە.

لە دواییدا لەلایەن (محەمەد کوری عەنان) ئەمیری ئیمارەتی عەنازی کوردی بەرێوەبراوە، لە سەردەمێکی تردا لەلایەن دەسەڵاتی (ئەلعەقیلیین) بەرێوەبراوە، لە دواییدا سەرکردەی بوەیهییەکان (فەخرئەلدەولە کوری غالیب) دەسەڵاتی بە سەر ناوچەکەدا ڕۆیشتووە، بۆ جاری دووەم (جیبرائیل کوری محەمەد) گەڕاوەتەوە ناوچەکە بە پشتگیری ئەمیرێکی کورد بە ناوی (موسەك کوری چەکو) تا بۆ ئەوەی لایەنگرانی (فەخرئەلدەولە) دەرکەن، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاندووە تا دووبارە (ئەلموقەلید ئەلعەقیلی) دووبارە گەڕاوەتەوە.

ئەم بەربەرەکانی و ململانێیە ماوەیەکی زۆری خایاندووە لەوانەیە ئەمە هەمووی لە سەدەی (٤)ی کۆچی، سەدەی دەی زایینی رووی دابێت.

هەروەکو بە دەردەکەوێت کە ناوچەکە تا ساڵی (٤٢١) ی کۆچی، (١٠٢٩)ی زایینی لەژێر دەسەڵاتی (عەقیلیین) بوو بێت، بەڵام لەو ساڵەدا (ئەبو شەواك)ی ئەمیری عەنازی گەمارۆی داقوقی دابێت کە فەرمانڕەواکەی (مالیك کوری بەدران ئەلعەقیلی) بوو بێت، کە دوای دەست بە سەرا گرتنی شارەکەی لێ کردووە، چونکە لە ڕابردوودا بەشێك بووە لە فەرمانڕەوایی (عەنازی)، لە سەرەتادا دانی نەناوە بەم حەقەی عەنازی، بەڵام لە دواییدا کە زۆری بۆ هاتووە کۆڵی داوە.

لە کاتی هێرشی تورکە سەلجوقییەکاندا بۆ سەر دەسەڵاتی ئیمارە عەنازیی، (سوڵتان تەغرەل بەگ)ی سەلجوقی نەیتوانییوە بەسەر دەسەڵاتی عەنازی کوردیدا لە ناوچەکەدا زاڵ بێت، بۆیە لە ساڵی (٤٤٣)ی کۆچی، (١٠٥٢)ی زایینی دانی بەوەدا هێناوە کە لەژێر دەسەڵاتی (موهەلهەل کوری محەمەد ئەلعەنازی)دا ماوەتەوە بە تایبەتی ناوچەکانی سیروان، دقوقا، شارەزوور، ساخمان، کە دەسەڵاتی عەنازییەکان لەم ناوچەیەدا بۆ ماوەی (١٣٠)ی ساڵی خایاندووە تا ساڵی (٥١١)ی کۆچی، (١١١٧)ی زایینی"[٥٥].

دابەشکردنەکانی یەکە بەرێوەبەرییەکانی دەوڵەتی عەباسی بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیە بووە:

(اقليم جزيرة، اقليم الجبال، اقليم العراق، اقليم خوزستان، اقليم فارس واقليم ازربايجان) کە کەرکوك و هەولێرو داقوق کەوتبوونە بەر ئاقاری (اقليم جزيرە)، داقوق لەسەردەمی عەباسییەکاندا بنکەی ئیمارەتێکی سەربەخۆ بووەو خۆی پارەی خۆی لێداوەو لەسەری نوسراوە (لا اله الا الله وحده لا شريك له محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم)[٥٦].

کاتێك سەلجوقییەکان هاتنە بەغدا لە ساڵی (٤٤٧)ی کۆچی، عێراق بوو بەئاقارێکی بەرێوەبەری سەر بە سەلجوقییەکان. [٥٧]و سەلجوقییەکان لە بەرێوەبردنی عێراقدا پیرۆی دەرەبەگی سەربازییان بەکارهێنا، کە ئەمە باوبووە لەسەردەمەکەیان وەکو شێوازێکی ڕێکخستنی بەرێوەبەری و دارایی و دابەشکردنی ولایەتەکانی عێراق بۆ سەرکردە سەربازییەکان،

کە بەرپرسە لەیەکە بەڕێوەبەرییەکەی[٥٨].

دوای داگیرکردنی لەلایەن مەغۆلە ئیلیخانییەکانەوە عێراق بوو بە بەشێکی ئیمپراتۆریەتەکەیان کە درێژ دەبووەوە لەنێوان ڕووباری جەیحون و ئۆقیانوسی هیندی و لەسەندەوە تا فورات و بەشێکی ئاسیای بچووك و قۆقاز، کە بنکەکەی ئازەربایجان بوو، کە لەپێشدا بەغدا بوو، بۆیە هەریەکە لە تەبرێزو سولتانیە بوونە پایتەختی سەرەکییان و بایەخ بەو دوو ناوچەیە درا.

عێراق و دووروبەرەکەی دابەشکرایە سەر سێ ولایەتەوە:-

یەکەم: عێراق، کە گرنگترین بەشێتی، درێژ دەبێتەوە لە زێی سەروو بۆ عەبادان بە درێژی و لەقادسییەوە بۆ حەلوان بە پانی.

دووەم: جەزیرەی فوراتی، کە پێکهاتبوو لەموسڵ، سنجار، عەمادیەو هەولێر.

سێیەم: وڵاتی چیا (بلاد الجبل)، کە شاری شارەزووریش لەگەڵیایەتی[٥٩].

بەڕێوەبردن لە ئیمپراتۆریەتی ئیلیخانییەکان (نا مەرکزی) بوو، کە فەرمانڕەوای عێراق تارادەیەك سەربەخۆیی هەبووە لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی بەرامبەر پێشکەشکردنی پارەی پێویست بۆ خەزێنەی ئیمپراتۆریەتی ئیلیخانییەکان[٦٠].

هۆلاکۆ پشتی دەبەست بە شێوازی بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆ (مەرکزی) لە ڕێکخستنی کاروباری عێراقدا، بەڵام لە دواییدا کردیە ناڕاستەوخۆ (نا مەرکەزی)و کاروبارە بەڕێوەبەرییەکان شێوەیەکی چەسپاوی وەرنەگرت تا سەردەمی (ئیلخان ئەباقا)[٦١] بەڵام بەشێوەیەکی گشتی هیچ ڕێکخستنێکی گرنگیان نەکرد، هەروەکو ئەوەی پێش خۆیان بوو[٦٢].

لە کاتی داگیرکردنی هۆلاکۆ، عێراق دابەشکرابووە سەر هەشت یەکەی کارگێڕی و لەسەر هەریەکێکی کارگێڕێك دانرابوو، کە بەم جۆرە بوو:

کارگێڕی بەغدا، کارگێڕی ڕۆژهەڵاتی، کارگێڕی فوراتی، کارگێڕی واستیە، کارگێڕی دوجەیلی، کارگێڕی کوفە، کارگێڕی ئەنباری و کارگێڕی داقوقی کە بریتی بووە لە ناوچەی داقوق و دەوروبەرەکەی[٦٣]. کەئەمە لەوانەیە ناوچەکانی کەرکوك هەمووی گرتبێتەوە.

بەڵام لەسەردەمی جەلائیرییەکاندا گۆڕینێکی وا گەورە ڕووی نەدا، بەڵکو بەردەوامی دەسەڵاتی مەغۆلە ئیلیخانییەکانە، لە ڕووی کارگێڕی و بەڕێوەبەرییەوە ئەوەی گرنگ بوو لە جیاتی تەبرێز، عێراق بوو بەبنکەی گەورەی کاروبارە بەڕێوەبەرییەکان. نەبوونی سەرچاوەی تۆمارکراوی سەردەمی جەلائیرییەکان، یان ئەو سەرچاوانە بەدەستمان نەگەیشتوە، ئەمە بووەتە هۆی نەزانینی شێوەی بەڕێوەبەری و کارگێڕی ئەو ناوچانە، بەڵام دەتوانین بڵێین کاتێك سولتان بنکەی بەڕێوەبەریی بەغدا بوو، ناوچەکە بریتی بووە لەسێ ناوچەی بەڕێوەبەریی کە عێراقی عەرەبی، دیاربەکرو کوردستان و دووانەکەی دوایی لەلایەن سولتانەوە ڕاستەوخۆ دانراوە[٦٤].

داقوق شارێکی ناوەندە، هیچ شتێکمان بەرچاو ناکەوێت دەربارەی کارەبەڕێوەبەرییەکان پێش هاتنی (تەیمور لەنگ)، لەکاتی گەیشتنیدا بۆ کەرکوك، فەرمانڕەواکەی لە ساڵی (٧٩٦)ی کۆچی و (١٣٩٣)ی زاینی ئەمیر قزل عەلی ئویرات (سارت عەلی ئویرات) بووە، بەڵام نازانین تا چ ڕادەیەك سەر بە سولتان ئەحمەد بووە، (حافز ئیرو) وا دەگێڕێتەوە، کە هێزەکەی تەیمور لەکاتی هاتنی بۆ ئەم شارە، بڕیاری گرتنی داوە، بەڵام (یەزدی) (١٤٤٦)ی زاینیی، دان بەوەدا دەنێت کە لە کاتی هاتنی تەیموردا لایەنگری خۆی بۆ ڕاگەیاندوە لەگەڵ فەرمانڕەوای شارو قەڵاکانی دەوروبەریدا..[٦٥]، لەکاتی ئەحمەد جەلائیریدا هەموو دێیەکانی داقوق سەر بە بنکەی بەڕێوەبەری داقوق بوون[٦٦].

دەربارەی ناوچەی چەمچەماڵ سەر بە ویلایەتی کوردستان بووە ئەم شارە سولتان ئۆلجایتۆ (خدابندە) بنیاتی ناوە، کە پێی وتراوە (سولتان ئاباد)و شوێنێکی گرنگی هەبووە، کەوتووەتە نێوان ڕێگای ئازەربایجان و عێراق و هێزەکانی تەیمورلەنگی پێیدا تێپەڕ بووە لەکاتی هاتنیان بۆ عێراق، بەڵام هیچ شتێکیان دەربارەی فەرمانڕەواییەکانیان نەوتووە[٦٧].

لەکاتی ڕووخاندنی دەوڵەتی (قەرەقۆنیلۆ)دا و بەپێی ئەوەی نووسراوە لە کتێبی (أخبار الدول)ی یوسف قرەمانی دا بنکەی ئاقاری شارەزوور بووە، کە لەوکاتەدا بەشێکی لقی دەوڵەتی ئەردەڵان بووە کە فەرمانڕەوایی ناوچەی شارەزووریان کردووە[٦٨].

*** ئەمارەتی قەفجاقییەی ناوچەی کەرکوك:**

لەوانەیە دامەزرێنەری ئەم ئەمارەتە (قەفجاق کوری ئەرسەلان تاشی تورکمانی بێت)، لەگەڵ سوپای سەلجوقییەکانەوە هاتبێت و ئەم ئەمارەتەی دانابێت. ناتوانین سەرەتای تەواوی دامەزراندنی ئەم ئیمارەتە دیاری بکەین بەڵام (ئیبن ئەلئەسیر) دەست نیشانی ئەوەی کردووە: (کە شارەزوورو کاروبارەکانی و ئەوەی دەوروبەری لەژێر دەسەڵاتی قەفجاق کوری ئەرسەلاندا بووە، ئەم ئەمارەتە لەناوچەی کەرکوك و شارەزوورو سلێمانی بووە، بەڵام (عیمادەدین زەنگی) تەماحی کردووە لەم ناوچەیەو لەساڵی (٥٣٤)ی کۆچی هێزێکی سەربازی نارد بۆ داگیرکردنی و هەردوو سوپاکە لە دەربەندبازیان گەیشتونەتە یەکتری و لەپاشان توانیان ئەمارەتەکە لەناوبدەن...[٦٩].

زانیاری دەربارەی بەڕێوەبەری ئەو ئەمارەتە زۆر کەمەو، نازانرێت ئایا یەکەیەکی سەربەخۆی هەبووە یان نا، یان سەر بە چ یەکەیەکی بەڕێوەبەری بووە یان لەدوای داگیرکردنی لەلایەن عیمادەدیندا چی بەسەر هاتووەو ئینجا موزەفەر کوکەبری خستویەتیە پاڵ ئەمارەتەکەی یان نا؟

"پەیوەندی (بەنی قەفجاق) بە خیلافەتی عەباسییەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (قەفجان کوری ئەرسەلان تاش)، لە سەردەمی خەلیفە (موستەرش)دا (٥١٢-٥٢٩)ی کۆچی، قفجاق سەر بە دەسەڵاتی سولتانی سەلجوقی (مەسعود) بووە، بۆیە هەردەم قەفجاق لە ئامادەباشیدا بوونە بۆ یارمەتی خێزانی سەلجوقییەکان تا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن، هەر چەندە کێشە کەوتبووە ناو خێزانەکانییانەوە

لەسەر دەسەڵات.
لە ڕووداوە مێژووییەکاندا بۆمان دەرکەوتووە کاتێك کە سوڵتانی سەلجوقی (مەسعود) چووە بۆ بەغدا کۆمەڵێك سوارچاکی ئیمارەتی قەفجاقی لەگەڵ بووە، لە هەمان کاتدا (عیماددەین زەنگی) ئەتا بەگی موسڵ لەژێر فەرمانڕەوایی (مەسعود)دا بوو.
لێرەدا دەگەینە ئەوەی کە ئیمارەتی قەفجاق لایەنی خۆی بەو پەیوەندییە ئاسوودە کرد، بەڵام کاتێك کە نێوانی سوڵتان لەگەڵ زەنگی تێکچوو، زەنگی بیری لەوە کردەوە کە لەوانەیە قەفجاقەکان یارمەتی سوڵتان بدەن دژی بۆیە هەستا بە داگیرکردنی زەوییەکانی و لکاندنی بە ئەتابەگییەوە.
کاتێك لە بەغدا گەڕاییەوە بۆ موسڵ لە ساڵی (٥٢٧)ی کۆچی هێزێکی بە سەرکردایەتی (سەلاحەددین یاغسیانی)و (ئوسامە کوڕی مەنقەز) ناردە سەر ئیمارەتی قەفجاق، توانی گەلێك مۆڵگەو شوێن و قەڵای ئیمارەتەکە بگرێت کە لەسەر هەموویەوە کەرکوك بوو، بەڵام ئەم شوێنەیان بەجێهێشت کە تاوەکو ئێستاکە هۆکار کشانەوەکەی نازانرێت، بەڵام پەیوەندییان لەو ماوە مێژووییەدا هەر لە ناخۆشییدا بوو.
لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی (ڕاشد)دا (٥٢٩-٥٣٠)ی کۆچی، بوو بە هۆی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی (مەسعود)، چونکە زۆرێك لە فەرمانڕەواکانی ناوچەکە لێی هەڵسان، لە هەمان کاتدا دەسەڵاتی خەلیفەی (موقتەفی) (٥٣٠-٥٥٥)ی کۆچی بەرەو نەمان دەچوو، کە تەنها دەسەڵاتی بەسەر موڵکە تایبەتییەکانییەوە مابوو، کە هەموو ئەمانە لە بەرژەوەندی (سالح زەنگی) بوو، کە بۆیە توانی لە ساڵی (٥٣٤)ی کۆچی بەسەر ئیمارەتی (قەفجاق)یدا زاڵ بێت"[٧٠].
"ناوچەی کەرکوك و ویلایەتی شارەزوور لە ساڵی (٥٣٤)ی کۆچی، (١١٣٩)ی زایینی، تووشی هێرشی ئەمیر (عیمادەددین زەنگی) بووە کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەتابەکی بووە لە موسڵ، کە توانی بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بۆیە داقوقیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی زەنگییەکانەوە، بۆ ماوەیەك خەلیفەی عەباسی (ئەلموقتەفی بیئەمر الله) لە ساڵی (٥٥٠)ی کۆچی (١١٥٥)ی زایینی بیخاتەی ژێر دەسەڵاتی و بەڵام لەبەر فشاری زەنگییەکان کشایەوە لێی.
لەبەر ئەوەی ئەتابەکییەکان بەشێك بوون لە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەیوبی بۆیە ناوچەی کەرکوکیش بووە بەشێك لەژێر دەسەڵاتی (سەلاحەددین ئەیوبی)، بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی ساڵی (٥٨١)ی کۆچی (١١٨٥)ی زایینی ناوچەی شارەزوور کەوتە ژێر دەسەڵاتییەوە کە ناوچەکانی (دقوقا و ئەربیل و شارەزوور)یش بەشێکی لەژێر دەسەڵاتیدا بوو"[٧١].
"لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی تری دەڵێت: لە ساڵی (٥٨١) ی کۆچیدا جارێکی تر دەسەڵاتی قەفجاقییەکان هاتۆتە کەرکوك و لەژێر دەسەڵاتی خەلیفەی عەباسی (ناسر لیدینئەللا) بووە"[٧٢]، بەڵام تا چەندێك ڕاستە نازانرێت.

*** یەکە بەڕێوەبەرییەکان لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەکاندا:**

پێش دروستکردنی ولایەتی موسڵ لەلایەن عوسمانییەکانەوە، بۆ ئەوەی خۆیان بە هێز بکەن بۆ داگیر کردنی ئەم بەشەی کوردستان، لەم ناوچەیەدا ئیمارەتێك سەری هەڵدا بە ناوی بابان هەر لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم و وورده وورده دەستی کرد بەفراوان کردنی لەسەر ئەو ئیماراتانەی کە لە دەورووبەری دا هەبوو، سنووری درێژ بووە تا کەرکوك کە بنکەی ئەیالەتی شارەزوور بوو، ئەم ئایالەیە هەڵوەشایەوە لەیەکە بەڕێوەبەرییەکاندا، ئەو کاتەی کە ئیمارەتی بابانەکان هێزیان گەورەو فراوان بوو، جێگەی ترس بوون بۆ ئیمپراتۆریەتەکە.
بەهۆی فراوانی دەسەڵاتەکەی ئەم ئیماراتە ناز ناوی پاشای کوردستان بە سەر ئەمیری باباندا سەپێندرا هەر لە کۆتایی سەدەی هەشتەهەم و سەرەتایی سەدەی نۆزدەهەم کە سولەیمانی بنکەی ئیمارەتەکەبووە هەر لە ساڵی (١٧٨٤) ی زایینی لە بەرامبەریدا ناوچەی کەرکوك کەمکرایەوە لەئیماراتەکەدا.
بەڵام دوای ئەوەی کە دەستگیرا بەسەر هەموو ئیماراتە کوردییەکاندا و دەست کرا بەچاکسازی یەکە بەڕێوەبەرییەکان لەدەوڵەتی عوسمانیدا و دەستگیرانی لەسەر هەموو ناوچە کوردییەکاندا هەستان بە پێك هێنانی ولایەتی موسڵ کە پێکهاتبوو لە سێ سەنجق (موسڵ، کەرکوك، سلێمانی)[٧٣].
عوسمانییەکان بیرۆکەی (ئەیالات - ولایات)یان بەکارهێنا لە هەموو پارچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیاندا کە (ئەیالە - ولایە) بریتییە لە گەورەترین یەکەی بەڕێوەبەری و دابەش دەکرێتە سەر چەند یەکەیەکی بەڕێوەبەری بچووکتر پێی دەوترێت (سنجق) واتا لیواوو فەرمانڕەواییەکەی ناسراوە بە سنجق بەگ یان (ئەمیر ئەللیوا)، لەسەرەتادا عێراقیان دابەشکرد بە سەر چوار ولایات و لە سەرەتای سەدەی پانزەهەمی کۆچی (سەدەی حەڤدەهەمی زایین) شێوەیەکی ڕێکوپێکی وەرگرت کە بریتی بوو لەبەغدا و موسڵ و بەسرەو شارەزوور (کەرکوك)[٧٤]، کە ویلایەتی بەغدا بریتی بوو لەهەژدە (سنجق) یان لیوا، ویلایەتی موسڵ، کە بریتی بوو لەشەش سنجق و شارەزوور بریتی بوو لە بیست و یەك سنجق، ولایەی بەسرە بریتی بوو لە ڕێکخستنی هۆزایەتی بۆیە (سنجق) ی نەبوو، بەڵام لەدواییدا چەند گۆڕانێکی لاوەکی ڕوویدا لەم دابەشکردنەدا[٧٥]، گەورەترین گیروگرفت کە بەرەورووی عوسمانییەکان بووەوە لەویلایەتی شارەزوورو بەسرە بووە، کە لەشارەزووردا بەردەوام گیروگرفت هەبووە لەسەر سنوور لەگەڵ دەوڵەتی سەفەویدا، ئەویش لەدیاریکردنی سنووری هەردوولادا[٧٦].
لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمی زایینیدا، باری گشتی عێراق بەرەو تێکچوون ڕۆیشت، بووە هۆی بێ ئارامی و ئاژاوەگێڕی و بڵاوبوونەوەی بزوتنەوەی جیابونەوەو سوود وەرگرتنی سەفەوییەکان لەم بێ هێزی و جیابونەوەیە، ئەویش

دەگەڕێتەوە بۆ بێ دەسەلاتی سولتانەکان و بەدڕەوشتی بەڕێوەبەرو سەربازی دەوڵەتەکە[٧٧].
هەروەها زۆر بەزەحمەت توانراوە کە سنوورێکی دیارو ورد بۆ هەریەکە لە ویلایەتەکانی بەغدا، موسڵ، بەسرەو شارەزوور دابنرێت، ئەویش بەهۆی جێگیرنەبوونی ئەم ناوچانەیە لە ئالوگۆڕکردنی (سنجق)ی هەریەکە لەناوچەکان لەنێوان ولایەتەکاندا.

*** لە ساڵی (١٨٦٢)دا لیوای کەرکوك لە ولایەتی موسڵ پێکهاتبوو:**
(ڕەواندوز، هەولێر - اربیل، کفری، کۆیسنجق، ڕانیە - مرگە).

*** لە ساڵی (١٨٧٥)دا لیوای کەرکوك پێکهاتبوو لەم قەزایانە:**
(راوەندوز، اربیل -هەولێر، کفری، کۆیسنجق، ڕانیە، قادر کەرم - گیل، خورماتوو).

لە نێوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بیرۆی (تشكيل الولاية) جێبەجێکرا لە عێراقدا لە ساڵی (١٢٨١ی کۆچی - ١٨٦٤ی زایین)و بەپێی ئەمە عێراق دابەشکرایە سەر سێ ویلایەت کە ئەویش ویلایەتی بەغدا، بەسرەو موسڵ بوون[٧٨].
((ساڵی ١٨٧٩ شاری موسڵ کرایە بنکەی ولایەتەکە، کە لەپێشدا بنکەی (سنجق) بوو، سنجقەکانی کرایە موسڵ و کەرکوك و سلێمانی))[٧٩].
سنووری ئەم ولایەتە لەباکوورەوە ولایەتی وان و دیاربەکرە، لەرۆژهەڵاتەوە مەملەکەتی فارس و لە ڕۆژئاوایەوە سنجقی دیر الزورو لەباشوورەوە ولایەتی بەغدایە. سنجقی کەرکوك بنکەکەی لەکەرکوك بوو، کە بریتی بووە لەم قەزایانەی خوارەوە، کەرکوك، هەولێر، ڕانیە، ڕەواندز، کۆیسنجاق و کفری[٨٠].

*** لە ساڵی (١٩١١) لیوای کەرکوك پێکهاتبوو لەم قەزایانە:**
١. قەزای کەرکوك، ناحییەکانی: (شوان، داقوق، پردێ، گیل، ملحە (حویجە).
٢. قەزای ڕەواندوز، ناحییەکانی: (حەریر، باڵەك، برادۆست، شیروان).
٣. قەزای کۆیسنجق، ناحییەکانی: شەقڵاوە.
٤. قەزای ڕانیە، بەبێ ناحیە.
٥. قەزای اربیل، ناحییەکانی: سوڵتانیە، دزەیی.
٦. قەزای کفری، ناحیەی: قەرە تەپە.

**پێکهاتەکانی کارگێڕی سەنجەقی کەرکوك**
**لە سەردەمی عوسمانییەکان لە ساڵی (١٩١٢)[٨١]**

| ژ | قەزا | ناحیە | ژ. دێهاتەکان |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | کەرکوك | کەرکوك | ١٣٣ |
| | | داقوق | ٣٣ |
| | | شوان | ٦٦ |
| | | ئاڵتون کۆپری | ٢٧ |
| | | قادر کەرەم | ٦٧ |
| | | مەلحە | ٣٧ |
| ٢ | ڕەواندووز | ڕەواندووز | ١١٩ |
| | | دیرەو هەریر | ٤٠ |
| | | باڵەك | ٦٠ |
| | | برادۆست | ٦٤ |
| | | شێروانەو مزووری | ١٠٨ |
| ٣ | کۆیە | بالیسان | ٢٥٢ |
| | | شەقڵاوە | ٢١٥ |
| ٤ | هەولێر | هەولێر | ٧٠ |
| | | سوڵتانە | ٤٨ |
| | | دزەیی | ٦٠ |
| | | شەمامك | ١٢٢ |
| ٥ | کفری | کفری | ٩١ |
| | | قەرەتەپە | ٥٣ |
| | | دووزخورماتوو | ١٣ |
| ٦ | ڕانیە | ڕانیە | ٢٥ |
| ٧ | ٦ قەزا | ١٧ ناحیە | ١٧١٢ دێ |

*** ولایەتی شارەزوور:**

سەرهەڵدانی ئەم ولایەتە بۆ ڕێکخستنەوەی پارچەکانی ئەمارەتی شارەزوور بوو کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی ئەردەڵانییەکان بوو. دەسەڵاتی عوسمانییەکان لەم ویلایەتە، شێوەیەکی رووکەشی هەبوو، دەسەڵاتی راستەقینە بەدەستی ئەمیری ئەردەڵانییەکانەوە مابوو، ئەو ئەمیرانە لەسەر شێوازی کۆن فەرمانرەوایی ئەمارەتەکەیان دەکرد، هەروەکو ئەوەی کە لایەنگری عوسمانییەکان نین، بەڵام سەنجقەکانی ئەم ولایەتە، هەردەم لە گۆڕانی زۆرکردن و کەمکردندا بوون کەبەشێکی زۆری بەخشراوە بەئەمارەتی بابانەکان.

لەدوای گواستنەوەی بنکەی ولایەتەکە بۆ شاری کەرکوک لەسەرەتای سەدەی یانزەهەمی کۆچیدا، گۆڕانێکی زۆر گرنگ لە مێژووی ولایەتەکە روویدا، کە ئەمە ئەوەی روونکردەوە، تەنها گرنگی ئەم ویلایەتە دەست بەسەراگرتنی دەروازەکانی چیا نییە لە سنوورەکان لەگەڵ ئێراندا، بەڵکو روانینە بەسەر ناوچە فراوانە دەشتییەکانی شارەزووردا، کە ئەم دەشتاییە ڕێگای سەرەکییە بۆ ناو ولایەتی بەغداو موسڵ، بۆیە گرنگی ئەم ولایەتە لە رووی سەربازییەوە بەرگریکردنە، نەك هێرشکردن[٨٢].

وەك سیستمێکی دەرەبەگایەتی باو ویلایەتەکە دابەشکرا بۆ بیست سنجق، لەماوەی سەدەی شانزەهەمدا کرا بە سیو دوو سنجق لەناوەراستی سەدەی یانزەمی کۆچی (ناوەراستی سەدەی حەڤدەهەم) زۆری سەنجقەکانی بەقەڵاو دەروازەی گرنگ پارێزراون چونکە شوێنێکی بڵاوبونەوەی هۆزایەتی و هەرەشەی بەردەوامی ئێرانییەکانی لێبووە، ناوی زۆربەی سەنجقەکان ئەمرۆ نازانرێت بەڵام. سەنجەقەکانی شارەزوور بریتییە لە:

کەرکوك کە (شوێنی پاشا) بوو، هەولێر، حەریر، کۆیە، شەمامك، مەخمور، ئەبورومان، ئەوشتی، باف، برند، بلقاس، بیل، شهربازار، شهرزور، عجور قەلعە، غازی کشان، مرکاوە، مهربان، هەزارمێرد، رودین، شەمیران، قەرەداغ، جاغان، قزلجە، بیە، زنکە، ئەنجیران[٨٣].

لیوای کەرکوك لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بنکەی یەکەیەکی بەرێوەبەری بووە، کەلە هەندێك کاتدا شارەزووریشی گرتۆتەوە، لەهەندێك کاتدا ئەیالە یان لیوایەکی سەربەخۆ بووە، کاتی دەست رۆیشتویی بابانییەکان بنکەی بەرێوەبردنی شارەزوور بووە، ماوەیەك بەدەست والی (ئەیالە) یان متصرفی سەر بەبەغدا یان ولایەتی موسڵ بووە، یان جیا لێیان..[٨٤]، لەسەردەمی (بوداق کوری ئەبدال)دا سەر بە بابانەکان بووە، لەسەردەمی دوای نەمانی بابانەکانی یەکەمدا، کەرکوك و کفریش، سەر بە ئەمارەتی بابان بوون[٨٥].

ئەمارەتی بابان لە نیوەی یەکەمی سەدەی دوانزەهەمدا، دەسەڵاتیان زۆر فراوان بوو، وای لێ هات هەندێك لەناوچەکانی ولایەتی بەغدا، بکەوێتە ژێر رکێفیانەوە، وەکو کەرکوك، بەدرەو جەسان، بەڵام ئەمە لەکاتێکدا روویدا کە دوو والی بەهێز ئەوانیش حەسەن پاشاو ئەحمەد پاشای کوری بوون کە سەریان هەڵدا بۆ یەکخستنی عێراق، ئەمە بوو بەهۆی پێکدادان لەگەڵ بابانەکان و وای لە بابانەکان کرد کە بکشێنەوە لەو ناوچانەی کە داگیریان کردبوو و بیدەنەوە دەست والی بەغدا[٨٦].

لە ساڵی (١٨٧٠)ی زایینی (میدحەت پاشا) هەستا بە چاکسازی پێروی کارگێری لە عێراقدا، هەستا بە گۆڕینی ناوی (ولایە شارەزوور) بە (متصرفیە شارەزوور)، کە قەزاکانی (اربیل) و (رواندن) و(رانیە) و(کۆیسنجق) و(صلاحیە-کفری) سەر بە ئەو بوونە.

لەساڵی (١٨٧٩) (متصرفیە -شارەزوور -کەرکوك)و لیوای سلێمانی بەسترایەوە بە ویلایەتی موسڵ و فەیزی پاشا کرایە والی ولایەتی موسڵ.

ولایەتی شارەزوور تاماوەی سێ سەد ساڵ بەردەوام بوو ئینجا بچووك کرایەوەو ناوەکەی لەویلایەوە گۆرا بۆ متصرفیەو لکێنرا بە ولایەتی موسڵ، لە کۆتاییدا ناوی شارەزووریی لێ سرایەوە.

لە (٢)ی شوباتی ساڵی ١٨٩٣ ی زایینی سەرۆك وەزیران (الصدر الاعظم) (جەواد پاشا) بە کتێبێکی فەرمی لە سوڵتان عەبدولحەمید بە گۆڕینی ناوی شارەزوور لە (سنجاق شارەزوور) بۆ (سنجاق کەرکوك) ئەویش مەهانەی ئەوە بوو کە گوایە لێکچوون هەیە لەنێوان ناوی (سنجاق شارەزوور) لەگەڵ (سنجاق زور - دیر الزور) کە ئێستا لە سوریایە[٨٧].

بۆ زیاتر شارەزایی دەربارەی ئەم گۆرانکارییە بروانە ئەو یاداشتەی خوارەوە کە بەرز کراوەتەوە بۆ سوڵتانی عوسمانی دەربارەی رەزامەندی وەرگرتنی:

**"گۆڕینی ناوی سە نجەقی شارەزوور بۆ سە نجەقی کەرکوك:**

شورای دەوڵەت/ فەرمانگەی ناوخۆ:

ژمارە: ٢٨٨٦.

فەرمانگەی ناخۆ چاوی خشاند بە راپۆرتی مێژووی (٢٠) ی رەجەبی ساڵی (١٣١٠)ی کۆچی کە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە هاتوون و نێردراوە بۆ شوورای دەوڵەت.

لەبەر هاوشێوەی لەنێوان ناوی سەنجەقی (ئەلزور)و سەنجەقی شەهرەزوور، رۆیشتن و هاتنی گەلێك لە کتێبە فەرمییەکانی دەوڵەت بە هەڵە بۆ هەردوو لا دەروات، لەبەر ئەمە تووشی گەلێك لە زیان و ئاگاداری کراوین، لە رابردوودا هەردوو ئەم ناوەندە ناوی پێشوویان هەبووە: (ئەلدێر) و (کەرکوك)، داواکراوە لەسەر رەزامەندی گەرانەوەی ناوە کۆنەکەی بۆ هەریەکە لەو دوو سەنجەقە، تا بۆ ئەوەی هەڵە روو نەداتەوە ئەگەر هاتوو گونجاوبێت بە گۆڕینی ناوی سەنجەقی (ئەلزور) بۆ ناوە کۆنەکەی (ئەلدێر) کە ناوەندی کارگێری لە شارە دێی (ئەلدێر) دەبێت، بیرکردنەوە لە کۆکردنەوەی ناوچەکانی دەورووبەری سنووری سروشتی سەنجەقی (ئەلزور)و ولایەتێکی لێ پێکبهێنرێت، پێویستی ئەو ناو هێنانەی کە بۆی دانراوە، بەمانای لەبەر چاوگرتنی گۆڕینی ناوی ئەم لیوایە.

هەروەها شرۆڤەی یاداشتی نەزارەی ناوخۆ کراوە دەربارەی ناوهێنانی لیوای شارەزوور بۆ ناوە کۆنەکەی کە کەرکوکە،

ئەگەر هاتوو ڕەزامەندی سوڵتان وەرگیرا دەربارەی ئەم یاداشتانە، پێویستە ئەرکی جێبەجێکردنی بنێرێت بۆ فەرمانگەکانی ناوەندو ولایەتەکانو بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەکان.

سەرۆکی فەرمانگەی ناوخۆ    مۆری
مۆری
عاکف    شورای دەوڵەت
ئەندامانی تر
(١٢)ی شەعبان، ساڵی (١٣١٠)ی کۆچی"[٨٨].

*** ئەنجوومەنی مەبعوسانی عوسمانی لە کەرکوک**

ئەوەی بەرچاوە دەکەوێت لە کاروباری کارگێڕیو بەڕێوەبەرییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ئەوەیە، کە بنەڕەتی کارەکان بە شێوەی هەڵبژاردن نەبووەو یاسایەکی ئەوتۆ نەبووە کە ئەو کاروبارانە ڕێکبخات تاکو دامەزراندنی ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی.

عوسمانییەکان کارو هەڵبژاردنو نوێنەری نیابیان زانیوە لەو کاتەدا کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩) هەستا بە دەرکردنی یاسای ئەنجومەنی مەبعوسان لە ساڵی (١٨٧٦)ی زایینی، بەڵام ئەم کارە زۆر درێژەی نەکێشاو لە ئەنجامدا کارەکانی هەمووی وەستا، لە ساڵی ١٨٧٧ تا کودەتانی (ئیتحادییەکان) لە ساڵی (١٩٠٨)دا ڕوویدا.

بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە کە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە خەڵکی کەرکوک لە ئەنجومەنی مەبعوسانی عوسمانی بەشداری نەکردووە کە لە ساڵی ١٨٧٧ کرایەوە بە تایبەتی لە (١٩)ی ئاداری ١٨٧٧، هەروەکو ئەوەی لە ویلایەتەکانی تری عێراقیش لەبەر ئەوەی نوێنەرەکان لەلایەن کاروبارە ناوخۆییەکانەوە هەڵدەبژێردرا، خەڵکەکە هیچ دەوری هەڵبژاردنی نەبوو.

ئەنجومەنی مەبعوسانی دووەم (١٩٠٨-١٩١٢) کە هەڵبژاردنی دەست پێکرد لە دوای کودەتای کۆمەڵەی (ئیتحادو تەرەقی) لە ساڵی ١٩١٨ کەشو هەوایەکی زۆر هێمن دەستی پێکردو خەڵکی لەو باوەڕەدا بوون کە زۆری (ئیتحادییەکان) دەردەچن، بۆیە لە لیوای کەرکوک هەر یەکە لە (محەمەد عەلی قیردار، سالح پاشا نەفتچی) هەڵبژێردران بە ئەندامی کەرکوک.

لە ئەنجومەنی مەبعوسانی سێیەمدا لە ساڵی (١٩١٢) دا بەستراو ئەنجومەنی مەبعوسانی چوارەم لە ئایاری ١٩١٤ تا ئابی ١٩١٤ بەسترا، کە لە چوارەمدا هەمووی لە بەرژەوەندی (ئیتحادییەکان) بوو، بەڵام زۆری ئەنجومەنی سێیەم لە بەرژەوەندییان نەبوو، بۆیە هەستان بە لەکار خستنی ئەنجومەنی مەبعوسانو وایان دانا کە هەڵبژاردن هەڵوەشاوەتەوە.

هەر بۆیە لە نوێنەری کەرکوک هەر یەکە لە: (محەمەد عەلی قیردار، نازم بەگ کوڕی سالح نەفتچی) هەڵبژێردرا.

بەڵام ئیتحادییەکان دووبارە هەڵبژاردنیان کردەوە تا بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندییان دەرچێت، بۆیە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان لە (٤)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ ڕاگەیاندرا کە هەر یەکە لە: (محەمەد قیردار، نازم بەگ نەفتچی، عەبدوڵڵا سافی یەعقوبی) هەڵبژێردرا.

*** "والییەکانی کەرکوك لە سەردەمی عوسمانی یەکەمدا لەساڵی (٩٦٠-١٠٣٣)ی کۆچی بەرامبەر (١٥٥٢-١٦٢٣)ی زایین:**

| ز | ناوی والی | ماوەی فەرمانڕەوایی |
|---|---|---|
| ١ | موراد پاشا شەیتان | ٩٦٠ی کۆچی |
| ٢ | مەئمون بەگ بێگە بێگ | ٩٦٩ کۆچی |
| ٣ | موزەفەر پاشا | ٩٧٥-٩٧٧ی کۆچی |
| ٤ | مەحمود پاشای کوڕی شەمس ئەحمەد پاشا | ٩٨٧ی کۆچی |
| ٥ | مەحمود پاشای کوڕی ئەیاس پاشا | ٩٨٨-١٠٠٠ی کۆچی |
| ٦ | عەلی پاشا تات | ١٠٠٠-١٠٠٤ی کۆچی |
| ٧ | داود پاشا | ١٠٠٤-١٠٠٤ی کۆچی |
| ٨ | حەسەن پاشا منلاجق | ١٠٠٤-١٠٠٧ی کۆچی |
| ٩ | وەلی پاشا | ١٠١٥ی کۆچی |
| ١٠ | زولفەقار پاشا | ١٠٢٤یکۆچی |
| ١١ | بستان پاشا(*) | ١٠٣٣ی کۆچی |
| ١٢ | بستان پاشا | ١٠٣٤-١٠٣٦ی کۆچی |


نازم بەگ نەفتچی

*** والییەکانی کەرکوك لەماوەی عوسمانی دووەمدا لەسالی ( ١٠٤٨-١٣٣٢ )ی کۆچی بەرامبەر ( ١٦٣٨-١٩١٤ )ی زایین :**

| ز | والییەکان | ماوەی فەرمانڕەوایی |
|---|---|---|
| ١ | محەمەد پاشا ئاش | ١٠٤٨- ١٠٤٩ی کۆچی |
| ٢ | جەعفەر پاشا کرجی | ١٠٤٩-١٠٥٨ی کۆچی |
| ٣ | محەمەد پاشا چاووش زادە | ١٠٥٨-١٠٦٣ی کۆچی |
| ٤ | شا غازی پاشا شەموار زادە | ١٠٦٦-١٠٦٩ کۆچی |
| ٥ | محەمەد پاشا صاری | ١٠٦٩-١٠٧٩ی کۆچی |
| ٦ | محەمەد پاشا کوڕی قەرە مستەفا پاشا | ١٠٧٩ی کۆچی |
| ٧ | حوسێن پاشا عموجە زادە | ١٠٨٩-١٠٩٧ی کۆچی |
| ٨ | حەسەن پاشا توپال ئۆغلۆ | ١٠٩٧ی کۆچی |
| ٩ | سیاوش پاشا | ١١٠٤ی کۆچی |
| ١٠ | حەسەن پاشا بوشناق | ١١٠٨-١١٠٩ی کۆچی |
| ١١ | ئیبراهیم پاشای کورد | ١١٠٩-١١٠٩ی کۆچی |
| ١٢ | یوسف پاشا ئەعرەج | ١١١١-١١١٢ی کۆچی |
| ١٣ | موستەفا پاشا ئاشچی | ١١١٢-١١١٣ی کۆچی |
| ١٤ | حەسەن پاشا فراری کیسەچی | ١١١٣-١١١٤ی کۆچی |
| ١٥ | ئیبراهیم پاشا دێومرمەگ | ١١١٤-١١١٤ی کۆچی |
| ١٦ | حەسەن پاشا ئەیوبلی | ١١١٥-١١١٥ی کۆچی |
| ١٧ | ئیبراهیم پاشا داماد شەهریاری | ١١١٦-١١١٧ی کۆچی |
| ١٨ | یوسف پاشا ئەعرەج | ١١١٨-١١١٩ی کۆچی |
| ١٩ | ئیبراهیم پاشا سلاحدار | ١١١٩-١١٢٠ی کۆچی |
| ٢٠ | ئیبراهیم پاشا داماد شەهریاری | ١١٢١-١١٢٢ی کۆچی |
| ٢١ | محەمەد پاشا شاهوار زادە | ١١٢٢-١١٢٢ی کۆچی |
| ٢٢ | یوسف پاشا چەترە فیل | ١١٢٣-١١٢٣ی کۆچی |
| ٢٣ | عەبدولڕەحمان پاشا صۆفی | ١١٢٥-١١٢٦ی کۆچی |
| ٢٤ | حەسەن پاشا بۆرك | ١١٢٦-١١٢٦ی کۆچی |
| ٢٥ | ئیبراهیم پاشا داماد شەهریاری | ١١٢٦-١١٢٧ی کۆچی |
| ٢٦ | ئەحمەد پاشا کوڕی حەسەن پاشای ئەیوبی | ١١٢٧-١١٣٦ی کۆچی |
| ٢٧ | مستەفا پاشا قەرە | ١١٣٦-١١٣٨ی کۆچی |
| ٢٨ | ئیبراهیم پاشا | ١١٣٨-١١٣٨ی کۆچی |
| ٢٩ | عەلی پاشا کوڕی حەسەن پاشای ئەیوبی | ١١٤١-١١٤٥ی کۆچی |
| ٣٠ | سلێمان پاشا جرکس | ١١٤٥-١١٤٨ی کۆچی |
| ٣١ | محەمەد پاشا | ١١٤٩ ی کۆچی |
| ٣٢ | حەسەن پاشا کەمال زادە | ١١٥٦-١١٥٩ی کۆچی |
| ٣٣ | عەبدولڕەحمان پاشا صاری | ١١٥٩-١١٦١ی کۆچی |
| ٣٤ | محەمەد پاشا کوڕی ئەحمەد پاشای ئەیوبی | ١١٦٥-١١٦٦ی کۆچی |
| ٣٥ | محەمەد پاشا کوڕی ئەحمەد پاشای ئەیوبی | ١١٦٧-١١٦٨ی کۆچی |
| ٣٦ | محەمەد ئەمین پاشا جەلیلی | ١١٧٥ی کۆچی |
| ٣٧ | موتەسەلیم ئەسیر ئاغا | ١١٧٥-١١٧٦ی کۆچی |
| ٣٨ | خەمیس پاشا دیورکلی | ١١٧٦-١١٧٨ی کۆچی |
| ٣٩ | سلێمان پاشای جەلیلی | ١١٩٠-١١٩٠ی کۆچی |
| ٤٠ | حەسەن پاشا گۆلەمەن | ١١٩٠-١١٩١ی کۆچی |
| ٤١ | وەزیر حەسەن پاشا | ١١٩١-١١٩٢ی کۆچی |
| ٤٢ | موتەسەلیم | ١١٩٣ ی کۆچی |
| ٤٣ | عوسمان پاشا | ١٢٣٧-١٢٣٧ی کۆچی |
| ٤٤ | محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار | ١٢٤٩-١٢٥١ی کۆچی |
| ٤٥ | عەلی ڕەزا پاشا | ١٢٥٣-١٢٥٦ی کۆچی |
| ٤٦ | سەلیم پاشا | ١٢٦١-١٢٦٧ی کۆچی |
| ٤٧ | حاجی عەلی پاشا کوتاهیلی | ١٢٦٧-١٢٧٤ی کۆچی |
| ٤٨ | تەقییەدین پاشا | ١٢٤٧-١٢٧٦ی کۆچی |
| ٤٩ | ئیسماعیل پاشا | ١٢٧٦ ی کۆچی |
| ٥٠ | سابت پاشا | ١٢٨٨ ی کۆچی |
| ٥١ | یوسف موزەفەر پاشا | ١٢٩٠-١٢٩١ |
| ٥٢ | نافز پاشا | ١٢٩١-١٢٩٣ |
| ٥٣ | عاسم پاشا | ١٢٩٤-١٢٩٦ |
| ٥٤ | فەیزی پاشا | ١٢٩٦-١٢٩٦ |
| ٥٥ | تەحسین پاشا | ١٢٩٦-١٢٩٦ |
| ٥٦ | منیر پاشا | ١٢٩٦-١٣٠٠ |
| ٥٧ | جەمیل پاشا | ١٣٠٠-١٣٠٣ |
| ٥٨ | ئەحمەد ڕەشید ئەفەندی | ١٣٠٣-١٣٠٧ |
| ٥٩ | عەبدولوەهاب پاشا | ١٣٠٧-١٣٠٨ |
| ٦٠ | مەهدی پاشا | ١٣٠٨-١٣٠٩ |
| ٦١ | یەحیا نەزهەت بەگ | ١٣٠٩-١٣١٠ |
| ٦٢ | عەبدولوەهاب پاشا | ١٣١٠-١٣١٣ |
| ٦٣ | جەلال پاشا | ١٣١٣- ١٣١٤ |
| ٦٤ | عەبدولڕەحمان بەگ | ١٣١٤-١٣١٥ |
| ٦٥ | جەمیل پاشا | ١٣١٥-١٣١٦ |
| ٦٦ | بەیرام پاشا | ١٣١٦- ١٣١٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ٦٧ | نەزهەت پاشا | ١٣١٧-١٣١٨ |
| ٦٨ | عوسمان بەگ | ١٣١٩-١٣٢٠ |
| ٦٩ | ئیبراهیم موخلیس بەگ | ١٣٢١-١٣٢٢ |
| ٧٠ | جەمال بەگ | ١٣٢٢-١٣٢٣ |
| ٧١ | مەحمود بەگ | ١٣٢٣-١٣٢٤ |
| ٧٢ | سالح سالم پاشا | ١٣٢٤-١٣٢٦ |
| ٧٣ | محەمەد عەونەڵلا کازم پاشا | ١٣٢٦-١٣٣٠ |
| ٧٤ | فایەق بەگ | ١٣٣٠-١٣٣١ |
| ٧٥ | نوری ئەفەندی | ١٣٣١-١٣٣٣"[٨٩] |



محەمەد عەونەڵلا کازم پاشا

*** راپۆرتی کارگێڕیی دەڤەری کەرکووك، لە ماوەی (١)ی کانوونی دووەم تا (٣١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩١٩):**

**و. سەربەست کەرکوکی**

*** عەشایرو بابەتی گشتی:**

راپۆرتە کارگێڕییەکانی ساڵی ١٩١٨ی ناوچە (مەڵبەند)ەکانی کەرکووك، لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩١٩دا، لەلایەن یارمەتیدەرانی ئەفسەرە سیاسییەکانەوە پێشکەش کران[١]، Adminstration report of Kirkuk Division.

لەو کاتەدا یەکبوونی ئەو دوو مەڵبەند (ناوچە)ە لە دەڤەرێکدا بڕیار درابوو، بەڵام یەکبوونەکە لەسەر بناغەی لێپرسراوێتی و دەڤەریی ئەفسەرە سیاسییەکان دانرابوو. بۆیە یارمەتیدەری ئەفسەرە سیاسییەکان (A.P.O) نامە گۆڕینەوەیان یەکراست لەگەڵ Civil Commissioner حاکمی مەدەنیی گشتیدا بوو[٢].

ئەم شێوازی کارە تا مانگی ئازار بەردەوام بوو، تا حاکمی مەدەنیی گشتی C.C، حاکمی سیاسیی Political Officer– po بۆ دەڤەری کەرکووك دانا و گۆڕینی گەورەی لە ئاراستەی لێپرسراوێتیی کارگێڕییدا دروست کرد[٣].

*** سنوورەکان:**

سنوورەکانی ئەم دوو ناوچە دەست نیشانکراوانە لە راپۆرتە پڕ بەهاکانی ساڵی (١٩١٨)دا، ئاماژەیان پێکراوە. ئەوانەی یەکەم جار بۆ ئەم دەڤەرە ئیشارەیان پێ کراوە، دەشێ جارێکی تر بخرێنەوە بەردەست:

رۆژهەڵات: دەبی ئەمانەی تێدابێ: لەك، ساڵەیی، شوان، کە لەکاتی تورکەکاندا (مەبەستی کاتی عوسمانییەکانە، وەرگێڕ) سەر بە ناحیەیەك بوو بە هەمان ناو، شێخ بزێنی لێ دەرکرێ لە وێوە بە سنوورە کۆنەکانی نێوان کەرکووك و ناحیەی چەمچەماڵدا بڕوات، رۆژئاوای زەوییەکانی جەباری و رۆژهەڵاتی گوندەکانی تاڵەبانی ببڕێ کە هی حەمیدان (شێخ حەمید وەرگێڕ). هەروەها دروست لە دوو ئاوانەی CHIAZARIN چیا زێڕین ئاوی ئاق سووی (ئاوە سپی) رۆژهەڵاتی عەشیرەتی زەنگەنەوە رەت ببێ، لە وێوە بە هێڵێکی راست، تا دەگاتە بەرامبەر بە (مەیدان)ی سەر رووباری سیروان.

باشوور: لەو خاڵەی بەرامبەر (مەیدان)ی سەر سیروانەوە تا خاڵی بەیەك گەیشتنی رووباری (نەهرین)و سیروان (دیالە).

رۆژئاوا: لەو خاڵەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، لە رۆژهەڵاتی (جەوەڵ حەمرین)ە وە تا چاڵە خوێیەکانی جەوەڵ حەمرینی تێدابێ. لەوێوە، بەرەو سەروو تا لە خاڵی (تەل عەلی) خۆی لە (زاب) دەدات.

باکوور: هاوتەریبی (زاب) تا (ئاڵتوون کۆپری)، ئەو شوێنەو گوندەکانی (لەك)ی تێدابێ، کە دەکەونە بەشی سەرووی رووباری (زاب). تا ئەو خاڵەی کە لە رۆژئاوای زەردك ZARDİK دایە، لەو شوێنەی کە سنوورەکانی رۆژهەڵاتی دەڤەرەکە دەست پێ دەکەن[٤]. لەو مانگانەوە کە

ئەو سنوورانەی سەرەوە دەستنیشان کروان، تەنیا هەندێ دەستکارییان کراوە، لەوانە: گواستنەوەی پێنج گوندی سەر بە عەشیرەتی لەك بۆ سەر دەڤەری ئەربیل، لە شەش گوند (کانی قرژاڵە)ی سەر بە ناحیەی (شوان) ئەم گوندە نزیك بە چەمچەماڵە بۆ سەر دەڤەری سلێمانی. هەڵگرتنی هێڵی سنوور، لە قوژبنی باکووری رۆژئاواوە، تا لەباتی ١٢ میل، لە چوار میل دووری دیجلەوە بە زابدا تێپەربێ.

هەموو ئەم دەستکارییانە بە رەزامەندی ئەفسەرانی نزیك بەو ناوچانە کراون[٥].

سروشت و شێوازە جوگرافییەکانی ئەو ناوچەیە، روون و ئاشکرا جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەوەی کە لە عێراقدایە. سەربارەت بەم بابەتە، لەوە زیاتر بەراشکاوی لە راپۆرتی ساڵی ١٩١٨دا هاتووە، هیچێکی ترمان نییە و پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

(١) ئەم راپۆرتە، یەکێکە لەو دۆکیومەنتە گرنگانەی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا، تۆمارگەی گشتی بریتانیا (public Record office)ی لەندەن، کە بە ژمارە Fo. ٣٧١/ ٥٠٦٩ لە ئەرشیفی تۆمارگەکەدا پارێزراوە و کۆپییەکی لە ئەرشیفی دەوڵەمەندی کتێبخانەی کوردستانی سەر بە مەڵبەندی رۆشنبیری کوردی- لە لەندەندا هەیە. دۆکیومەنتەکە بە گشتی ٢٤ لاپەرەی A٣ یە، بە ئەندازەی (٢٩cm. ٤١cm) لەم راپۆرتەدا بۆ وشەی Division، من وشەی دەڤەرم بە چاك زانیوە، هەروەها بۆ District دوو وشەی ناوچە یا مەڵبەندم بەکارهێناوە. یارمەتیدەری ئەفسەرە سیاسییەکان، لە نووسینی ئێمەدا هەر بە یاریدەدەری حاکمی سیاسی هاتووە، بۆیە هەوڵ دەدەم هەر ئەو ناوە مێژووییە بەکاربهێنم.

(٢) لە راستیدا لێپرسراوێتی سەرەکی و ویلایەتەکانی میزۆپۆتامیا، کە دواجار ئینگلیز پێی چاك بوو ناوی عێراقی لێ بنێ، تا مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠) ئەرکی فەرماندەی گشتی هێزەکانی بریتانیا بوو. ئەم ئەرکەش لەلایەن (Sir Percy Cox)ەوە درابوو بە جێگیرەکەی، واتە درابوو بەو بەرپرسەی کە بەناوی civil commissioner حاکمی سیاسی (حاکمی مەدەنی)یەوە سەرپەرشتی دەکرد. شایەنی باسە، تا مانگی مایسی ساڵی (١٩١٨) سێر پێسری کۆکس خۆی بەم کارە هەڵدەستا، پاشان کردیە ئەرکی جێگرەکەی Lieutenant- colonel Arnold Wilson ئارنۆڵد ویلسن و، یەکراست خۆی بووە حاکمی مەدەنی (Civil Commissioner)، کە لە راستیدا خۆی گەورەترین دەسەڵاتی ئیستیعماری بریتانی بوو لە هەموو ناوچەکانی میزۆپۆتامیادا.

Stephen Hemesley Lorgrigg، IRAQ ١٩٠٠- ١٩٥٠ A political، Social& Economic History، ١٩٥٣، P ١٠٧.

(٣) کاتێ کەرکووك داگیرکرایەوە، هەروەك د. کەماڵ مەزهەر ئاماژەی بۆ کردووە، ویلسن، (مێجەر نۆئیل)ی حاکمی سیاسی کەرکووك دەستنیشان کرد. سنووری ئیدارەی دەڤەرەکەشی دەستنیشان کردووە و ئەم فەرمانەی ئاراستەی نۆئیل کردووە: (ئێوە لە یەکی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨)ەوە وەك حاکمی سیاسی دەست نیشان کران بۆ دەڤەری کەرکووك، ئەم دەڤەرەش لە زێی بچووکەوە تا (دیالە) و سەرووی رۆژهەڵاتەوە تا سنووری تورکی- ئێرانیەو، ئەم ناوچەیە بەشێکە لە ویلایەتی مووسڵ، کە حکومەتی خاوەندشکۆ ئاکامەکەی دەستنیشان دەکات (بروانە: لاپەرە (٩)ی کتێبی: (كركوك توابعها حكم التاريخ و الضمير) بەشی یەکەم).

سوپای بریتانیا دوو جار کەرکووکیان داگیرکردووە. یەکەم جاریان وەك مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەڵێت: "لە کاتێکدا لەشکری ئینگلیز بەرەو کەرکووك هاتن، سوپای عوسمانی لێی دەرچووبوون، بۆیە رۆژی ١٩١٨/٥/٧ بە ئاسانی هاتنە ناو کەرکووك و داگیریان کرد، (بروانە: (كركوك في عهد الاستعمار البريطاني و العهود التالية)، مەلا جەمیل رۆژبەیانی، وەرگێرانی: ئەنوەر ئەلمەندەلاوی، گۆڤاری (سردم العربي)، ژمارە (٢)، ساڵی ٢٠٠٣.

ستێفن هیمزلی لۆنگریگ (stephen hemsley longrigg) یش لە لاپەرە (٩٢)ی کتێبەکەیدا پاداگری دەکات لەم مێژووە و دەڵێت: بەپێی بریارەکانی وەزارەتی جەنگی بریتانیا، سوپاکەمان لە ١٩١٨/٥/٧ دا شاری کەرکووکی داگیر کرد (بروانە: ٩١ P...١٩٥٠ - ١٩٥٠٠ ARAQ.

بەڵام پێش گرتنی کەرکووك، بریتانیا لە ١٩١٨/٤/٢٨ شارۆچکەی تووزی داگیر کرد (بروانە لاپەرە (٩١)ی کتێبەکەی ستیڤن هیمزلی لۆنگریگ).

شایەنی باسە، وەك هەواڵەکانی ئەو ساتانە تەئکیدی لێ دەکەن، سوپای تورك لە پرۆسەی ئێران دۆران و پاشەکشەکانی خۆیدا، بەتایبەتی لە کوردستاندا، هەرچی خراپە هەیە بە خەڵك و ماڵ و موڵکیانی کردووە، ئەوەتا (مس بێل) لە راپۆرتی ساڵی (١٩٢٠)ی دەڵێ: (ئەوان- مەبەستی توورکەکانە- بەشێوەیەکی زۆر توند وەڵامی دانیشتووانی (قزلرەبات) و خانەقینیان داوەتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی کە لە سلێمانی کاتی پاشەکشەکردنیان چەندین زەلامیان لە سێدارەداوە...).

بروانە: Review of the civil Administration of medsopitamia، p ٤٦.

بۆ سەلماندنی ئەم حاڵەتی دژە ئینسانییەی لەشکری تورك، مەلا جەمیل رۆژبەیانی دەڵێت: "ئەوەبوو خەڵکانی شار و گوندەکان کەوتنە هێرش و تاڵانکردنی لەشکری عوسمانی و، ئەمەش بووە هۆی برسێتی و قووقاتی و مردنی سەدان کەس (كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية).

هەروەها (سمکۆ بەهرۆز)ی نووسەریش لە بابەت (مێژووی بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە ناوچەی کەرکووکدا، گۆڤاری (هەزارمێر) ژمارە ١٦) دەڵێت: کاتی کشانەوەی عوسمانییەکان لە کەرکووك لە کاتی بەربەرەکانێدا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، کەوتنە تەقاندنەوەی (کڵێسە سوور)ەکەی کەرکووك..).

کڵێسەی سوور: (هەمان کڵێسەیە کە ساڵی (٤٧٠)ی زاینیی مار مارۆن (یۆحەنا)ی سێیەم بە ناوی (کڵێسەی ماتەهماز

کورد)ەوە دروستی کرد. ئینگلیزەکان وای بۆ چووبوون کە خەڵکەکە بە هاتن و سەرکەوتنی ئەمان خۆشحاڵن، بۆیە مس بێل لە راپۆرتێکی ئاماژە پێکراوی سەرەوەدا، لە لاپەرە (٤٧) دا دەڵێت: (بە سەرکەوتوویی لە کفری و تووز، کە کەرکووك داگیر کرا، هێزەکەمان لەلایەن خەڵکەوە بەگەرمی پێشوازیی لێکرا).

لەلای کوردیشەوە، هەندێ بەڵگەی ئەو پێشوازی لێکردنە پیشان درابوو. بۆ نموونە ئەحمەد خواجە، لە (چیم دی) یەکەیدا ئەوە روون دەکاتەوە کە شێخ مەحموود بۆ رزگارکردنی نەتەوەی کورد لە جەوری تورکان، هەر لەگەڵ داگیرکردنی کەرکووکا لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە، بە کەسێکی وەك (عەبدوڵڵا ساف یەعقووبی)ی لایەنگری ئینگلیزدا نامەیەکی پشتیوانی ناردووە بۆ جەنەراڵ مارشاڵی سەرکۆماندەی لەشکری ئینگلیز. مەلا جەمیل رۆژبەیانی لە (كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية، لاپەرە ٣)دا ئەم مەسەلەیەی باس کردووەو دەڵێت: بەڵام پاش ٢٠ رۆژی داگیرکردنی کەرکووك، واتە لە رۆژی (٢٧)ی ئایاری ساڵی (١٩١٨)دا، لەشکری ئینگلیز بارەگاکانی خۆیان لە کەرکووك دەپێچنەوەو پاشەکشە دەکەن و خۆیان دەگەیەننە توزخورماتوو. بۆیە کە هەر لەو کاتەدا لەشکری عوسمانی گەڕانەوە بۆ کەرکووك. عەبدوڵڵا یەعقووبی تورك نەژاد پاك و پوخت نامەکەی شێخ مەحموودی دایە دەست سەرلەشکری تورك و، ئەمەش بووە هۆی تەهلوکەیەکی مەزن بۆ شێخ مەحموودی حەفید، (بڕوانە کتێبی: (یادداشت)، بەرگی یەکەم، لاپەرە ٥٢).

لێرەدا چەندین بۆچوون هەیە، بۆ هۆیەکانی کشانەوەی لە پڕی لەشکری ئینگلیز لە شاری کەرکووك و دەورووبەری، ئەگەر لێرەدا هەندێکیان باس بکەین: ستیڤن هەمزلی لۆنگریگ لە لاپەرە (٩١)ی کتێبەکەیدا دەڵێ: "بەهۆی کێشەی ئازووقەوە، هێزەکانی بریتانیا نەیانتوانی بمێننەوە، هەروەها مانەوەیان بە بۆچوونی خەڵکی ناوچەکەو پەیوەندیمان لەگەڵیاندا هەندێ کارەساتی دروست کرد، بۆیە هێزەکان کشانەوە بەرەو تووز".

د. کەمال مەزهەر ئەحمەدیش لە لاپەرە (١٠٢)ی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی: (كركوك و توابعها حكم التاريخ والضمير) دا تا رادەیەك هۆیەکەی ستیڤن هەمزلی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەم دەڵێ رۆژی (٢٤)ی شوباتی ساڵی (١٩١٨) لەشکری ئینگلیز لە کەرکووك پاشەکشەیان کردووە. بەهەشتی رەفیق حیلمی لە کتێبی (یادداشت) لاپەرە (٥٢)دا بۆ هۆی کشانەوەکە دەڵێ: "هۆیەکانی کشانەوەی ئینگلیزو شکستی لەشکرەکانی سوێندخۆرەکان لە جەبهەی فەرەنساو بەتەمای ئەوەبوون لەشکرەکەیان نەك هەر لە کەرکووك بەڵکو لە هەموو عێراقدا بکێشنەوە". بەڵام لە راستیدا چەندین هۆی سەرەکی تر هەبوون کە بوونە مایەی ئەو بڕیارە لە پڕەی لەشکری ئینگلیز، کە ئەوە رۆژانە لە چاوی خەڵکەکەدا بەشکانێکی سوپایی لە قەڵەم درابوو:

یەکەم: ئەوەیە کە هێشتا لەگەڵ فەرەنسا بۆ دابەشکردنی میسۆپۆتامیا و سووریا نەگەیشتبوونە ئەو ئاکامەی کە ئینگلیز بە تەمابوو. ئینگلیز بەتەمای هەر سێ ویلایەتەکەی میسۆپۆتامیا بوو، بەڵام بەپێی دابەشکردنەکەی سایکس بیکۆ، زۆربەی ویلایەتی موسڵ لە بەشەکەی فەرەنسا بوو، بۆیە دەیویست بەهەوڵی دیبلۆماسی، نەك بەتێکچڕاژانی بەرژەوەندیی لەشکری، بگاتە مەرامەکەی.

دووەم: ئەوەبوو هەر لە یەکەم رۆژی داگیرکردنی کەرکووکەوە تا ماوەی دوو هەفتە، ئۆردوگا سەرەکییەکەی لەشکری بریتانیا هەموو شەوێك دەکەوتە بەر هێرشی چەکداری لادێیی و عەشیرەتی دەورووبەری کەرکووك. هەڵبەتە تا ئێستا نەمبینیوە یان نەمبیستووە هیچ نووسەرێ یان مێژوونوسێ سەبارەت بەم راستییە مێژووییە شتێکی نووسیبێ. بەڵام بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی سەبارەت بەم رووداوانە کۆمکردووەتەوە، وا بۆ یەکەم جار لەم چەند دێرە پێشکەشی خوێنەرانی دەکەم، بە ئومێدی ئەوەی نووسەرانی تریش لێکۆڵینەوەی زیاتر لەسەر ئەم راستییە مێژووییە بکەن.

لە دیدارێکدا لەگەڵ (سەید خەتابی سەید ئۆمەری کاکەولای حەسەن وەسمانی هورمزیار)ی باوکم کە شەوی (٣)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٧٥) کردوومە، ناوبراو ساڵی ١٩٩٧ لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا ئەمری خودای کردووە، لەو دیدارەدا خوالێخۆشبوو ئەم زانیارییانەی پێشکەش کردم و منیش وەك سەرەقەڵەم زانیارییەکانم لە دەفتەرێکدا نوسیبووەوەو، وا هەروەك خۆی پێشکەشیان دەکەم:

١. کاتێ ئینگلیز دەگاتە (تاوق)، سوپای شکاوی عوسمانی کەرکووك بەجێ دەهێڵێ و بەرەو (یاروەلی- یارەوەلی کە گوندێکی ناوچەی ناوشوانەو نزیکەی ٧ کیلۆمەتر لە سەرووی کەرکووکەوەیە - وەرگێڕ)، و گوندەکانی دەورووبەری دەکشێتەوە.

٢. سوپاسی عوسمانی بۆ ماوەی هەفتەیەك خۆی لە یارەوەلی و دەورووبەری مۆڵ دەدات، پاشان هەموو چەك فڕێ دەدەن، ئەوێش بەجێ دەهێڵن.

٣. هەر لەو حاڵەدا دەنگ بڵاو دەبێتەوە کە ئینگلیز بە نیازە بەرەو یاروەلی بێت.

٤. خەڵکی یاروەلی و گوندەکانی دەورووبەری، لە ترسا دەدەنە چۆڵ و چوار رۆژ لە چۆڵەوانی و دامێنی تەپۆڵکەکاندا دەمێننەوە.

٥. هەر لەو رۆژانەدا، بۆ لەناوبردنی هەموو ئازووقەو جبەخانە کۆکراوەکانی تورك و بۆ چاوترساندنی خەڵك، فڕۆکەکانی ئینگلیز (یاروەلی) بۆردومان دەکەن.

٦. لە بەهاری ساڵی (١٩١٨)دا خورشید ئاغاو خەڵکی ناوچەکە بۆ ماوەی هەفتەیێ تا دە رۆژ هەموو شەوێك هێرشیان بردووەتە سەر ئۆردووگای ئینگلیزەکان لە (قەشقە). بۆیە یەکەم هەنگاو ناچاربوون لەشکرەکەیان بێننە ناو شار.

٧. لەکاتی بەرەنگاریکردندا سێ لاوی شارەکە، کە یەکێکیان ناوی نەریمان و برای سەید ئۆمەری کاکەولا بوو، کاتی هەوڵدان بۆ بڕینی تەلەگرافی لەشکری ئینگلیز کەمینی بۆ دانابوون و دەستڕێژی لی کردوون و هەرسێکیان دەم و دەست شەهید بوون.

هەر سەبارەت بەم راستیانە لە (٥)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٤)

دا دیدارێکم لەگەڵ پیرە پیاوێکی خزمەدا بەناوی (مام سەعید لەتیفی حەسەن وەستا)ەوە کرد، ئەویش سەبارەت بەم ڕووداوانە، ئەم زانیارییانەی خوارەوەی پێ بوو:

١. لە باوکم بیستووە، واتە لە: لەتیف حەسەن وەسمان هورمزیار، ئەوانەی سەرپەرشتی ئەم هێرشانەیان کردووە، ئەمانە زیاتر سەرکردە یان ئاژاکانیان بوون: خورشید ئاغای دووحێلە، کوێخا ئەورەحمانی گۆگچە، حەمە کەچەڵی دالآوی، کاکەخان ناوێك و مەمۆ ناوێکی کوچك نەخشینە.

٢. سەربارەت بەو نەریمان ناوەی باسمان کرد، دەڵێت: "راستە ئەو کەسە مامی باوکم بووە، کورێکی لاوی ١٨ ساڵ بوو، وەك پیشە، کاروانچی بووە لەنێوان کەرکوك و سلێمانی و ئێراندا. ئەو لە کاری پێشمەرگایەتیدا لەگەڵ دوو لاوی تردا کوژراوە، کە کە بەداخەوە ناوەکانیان نازانم. ئینگلیز لاشەی ئەو سێ لاوەی لە ناوچەی (کولك) فڕێ داوە.

شایەنی باسە، بۆ جاری دووەم ئینگلیز لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا هاتەوە ناو شاری کەرکووك، (بروانە: د. وەلید حەمدی، (الکرد وکردستان في الوثائق البریطانية)، لەندن، ١٩٩١، لاپەرە ٤٦). د. وەلید ئەم زانیاریەی لە دۆکیومەنتەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا وەرگرتووە. بەڵام هێژا د. نووری تاڵەبانی، لە لاپەرە (٤٧)ی کتێبی (منطقة کرکوك ومحاولات تغيير واقعها القومي، ١٩٩٩)دا، ڕۆژی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)ی داناوە بەو ڕۆژەی کە ئینگلیز جارێکی تر شاری کەرکوکی داگیر کردووەتەوە. مەلا جەمیل ڕۆژبەیانیش، بۆ داگیرکردنەوەی کەرکوك ڕۆژی (٢٨)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)ی داناوە. ستیڤن لونگ لە لاپەرە (١٩)ی کتێبەکەیدا هەر ئەوەندە دەڵێ کە: لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا، جارێکی تر هێزەکانی بریتانیا کەرکوك و ئاڵتوون کۆپرییان داگیرکردوۆتەوە. بەڵام د. کەمال مەزهەر بە پشتیوانی بۆ چوونەکانی (ئارنولد وێلسن)ی حاکمی میسۆپۆتامیا، لە لاپەرە (١٠٣)ی کتێبەکەیدا دەڵێ: بریتانییەکان لە (٢٦)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا کاپتن (نۆئێل)یان بە حاکمی سیاسی دەستنیشان کردووە (د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، (کرکوك وتوابعها، حکم التأريخ والضمير). بە گوێرەی گرتنی شاری مووسڵیش، د. فازیل دەمیرچی دەڵێ: (بەپێی ڕێککەوتنی مۆدرۆس کە لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨)دا کرا، دەبوو هەردوو لەشکرەکە (واتە ئینگلیزو عوسمانی) لە شوێنەکانی خۆیان بمێنەوە. بەڵام ڕۆژی (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨) ئینگلیز داوای لە عەلی ئیحسان پاشای سەر لەشکری ٦ی عوسمانی کرد مووسڵ بەجێ بهێڵن. ئینگلیز لە (٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨)دا مووسڵیان داگیر کرد....
(بروانە: Dr. fazildemic the Iraqi turks yesterday and today printing press ١٩٩١ p.١١)

د. دامیرچی دەڵێت: ماددەکی پەیماننامەی میللیی تورك turk mili misaqi کە لە مانگی دووی ساڵی (١٩٢٠)دا دەرچووە، دەڵێ:
"ئەو ناوچەیەی کە لە (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨) دا لەژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بوون لە ناو سنووری نیشتمانیی ئێمەدان".

د. کەمال مەزهەر تارادەیەك تەئکید لەو مێژوانەی د. فازیل دامیرچی دەکات و دەڵێ: کە ڕۆژی (٣٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩١٨) ئاگربەستی مۆدرۆس کۆتایی بە شەری هاوپەیمانان و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هێنا، هێشتا لەشکری ئینگلیز دوانزە میلی مابوو بگاتە ناو شاری موسڵ. (بروانە: (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، بەشی یەکەم، بەغداد، ١٩٨٥، لاپەرە ١١٢). ئەم راستییە، لە لاپەرە (٤٢٣)ی کتێبی: (the letters of Gertrude bell) دا تەئکیدی لێ کراوە دەڵێ: مێجەر جەنەراڵ سیر پێرسی کۆکس لە وتارێکیدا دەڵێ:

"we were wiunid ١٢ miles of mosul the follwing day when news of armistic reached the commander in chief two days later mosul itself was occupied..".

واتە: "ئێمە دوانزدە میل لە مووسڵ دوور بووین، کاتێ هەواڵی ئاگربەست گەیشتە سەر لەشکر. پاش دوو ڕۆژ مووسڵ خۆێشی داگیرکرا".
(the letters of Gertrude bell penim books sufflok Britain ١٩٨٧)

د. فازیل حوسەین، دەفەرمێ: ... دوای شەڕو لەگەڵ سەرکەوتنی کەمالیەکاندا، تورکیا ئەوەی (مەبەستی مەسەلەی کاتی گرتنی مووسڵە – وەرگێر) کرد بە بیانوو بۆ داواکردنەوەی ویلایەتی مووسڵ بروانە: (مشکلة الموصل، دراسة في الدبلوماسية العراقية، الانطليزية، الترکية وفي الراي العام)، بەغدا، لاپەر ٣٣٦). گوایە بەم شێوەیە کێشەی مووسل لەلایەن تورکیاوە کراوەتە کێشەیەکی مێژوویی نێودەوڵەتی.

(٤) وەك لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ڕوونمان کردووەتەوە، ڕاستی مێژوویی ئەوە بووە کە ئینگلیز ویستوویەتی بە هەر شێوەیەك بێ ئەو سێ ویلایەتە (بەغدا، بەسرا، مووسڵ)ی میسۆپۆتامیا، بکاتە دەوڵەتێك لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بێ. بەڵام لەبەر هەندێ هۆی ناوەکی و بارودۆخی جەنگ و هاوپەیوەندی لەگەڵ فەرەنسادا، هێندە سنووری جوگرافی پیلانەکانیان لا ڕوون نەبووە. بۆیە دەکرێ ئەم فەرمانە کاریگێرییەی وێلسن، کە دەستکاریکردنێکی باری کارگێریی دەڤەرەکەیە، بە یەکەم هەنگاوی ئاشکراکردنی پیلانەکە بزانرێ. بەڵام ئایا بارودۆخی ئیداری (کارگێری) کەرکوك و یا کوردستانی باشوور بەگشتی، لە دوا ساڵانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا چۆن بووەو چۆن دەستکاری کراوە؟ ئەوە پرسیارێکە ئێمە هەوڵ دەدەین زۆر بە کورتی و بەپێی ساڵ لێرەدا پێشکەشی بکەین.

لەتیف فاتیح فەرەج لە کتێبی (کەرکووك: کورتە خوێندنەوەیەکی دێرۆکییانەی کەرکووك)دا، هەندێ زانیاریی مامۆستا عەبدولرەقیب یوسف دووبارە دەکاتەوەو دەربارەی ویلایەتی شارەزوور، دەڵێ: "شارەزوور کە مەڵبەندەکەی کەرکوك بووە لە ٢٠ سەنجەق پێکهاتووە، یەکە کارگێرییەکانی ئەمانە بوون: (سرۆچك، هەولێر، کسنان (پێم

وایە ئەمە دەبێ کەسنەزان بێ، وەرگێڕ)، شاربازێڕ، چەنگوڵە (نزیك کرماشانە)، چیای حەمرین، هەولێر، هەزارمێرد، گۆران، مەرگە، هەریر، رۆدین، ئەمیل تاری، زنجیر، عەجوز، هەورامان، باقپرنلی، پەلقاس شنۆ، قەڵای غازی..)، بڕوانە: لاپەڕە (٢٢)ی کتێبی ناوبراو، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

دەبێ بڵێین تا ئێستاش هەندێ ناوی ئەم یەکە کارگێڕییانە ساغ نەبوەتەوەو مرۆڤ ناتوانی هەروا بە سانایی بڕوا بە هەندێ لەو ناوانە بکات. هەروەها قەد نەبیستراوە کە ویلایەتی شارەزووری عوسمانی بیست سنجەقی هەبووبێ‌و ژمارەی ئەو یەکە کارگێڕییانەی کە وەك سنجەق ناویان هاتووە ١٨ سنجەق نەك بیست، بە هیچ شێوەیەك ناوی سنجەی (سلێمانی) یا (کۆیە)یان تێدا نییە، دەبێ ئەوەش بڵێین کە باسی ئەو ساڵە یان ساڵانە نەکراوە کە ئەو بیست سنجەق (یەکە کارگێڕی)یەی عوسمانی تێدا دامەزرێنراون.
بەڵام ئەگەر ئەو ساڵە دەستنیشان نەکراوە بە جێبهێڵین، دەبینین ساڵی (١٨٧٠) (میدحەت پاشا)ی عوسمانی باری کارگێڕیی ویلایەتی شارەزوور (کەرکوك)ی کردووەتە شەش قەزا (قەزاکانی کەرکوك، ئەربیل، رەواندووز، کفری، کۆیە، رانیە) پاشان بەپێی فەرمانی سیستەمی ویلایات لە عێراقدا کە (میدحەت پاشا)ی سەدری ئەعزەم ساڵی (١٨٧٩) لە ئەستەمبوڵ دەریکردووە، سەنجەقی شارەزوور (کەرکوك) بە خۆی پێنج قەزاوە، سنجەق سلێمانی بە خۆی‌و ناوچەی شارەزوورو هەڵەبجەوە، کراون بە دوو سنجەقی سەرەکیی ویلایەتی موسڵ، (بڕوانە: لەیلا نامیق شەریف، (کرکوك.. لمحات تاریخیە)، لە بڵاوکراوەکانی (خەبت)، ١٩٩٢).
مامۆستایی قانوونناس: دکتۆر نوری تاڵەبانیش، بە پشت بەستن بە زانیارییەکانی لاپەڕە (١٤٧)ی (دائیرەی مەعاریفی ئیسلامی، بە زمانی فەرەنی) دەڵێ: (ویلایەتی موسڵ لە سێ سنجەق پێکهاتووە: موسڵ، کەرکوك، سلێمانی. ساڵی (١٩١٨) سێ قەزای سەرووی زێی بچووك لە سنووری جوگرافی کەرکوك دابڕران‌و لیوای ئەربیل (هەولێر)یان لێ دروست کرا، (بڕوانە: لاپەڕە (٣٤)ی (منطقة کرکوك ومحاولات تغییر واقعها القومي)، چاپی دووەم، ١٩٩٩).
شایانی باسە، دوا وێنەی ناوچەکارگێڕییەکانی (ویلایەتی موسڵ) لە وا ساڵانی دەسەڵاتی عوسمانیدا، بە تایبەتی ساڵانی دەسەڵاتدارێتی (ئیتحادو تەرەقی) ١٩٠٨-١٩١٤، پێکهاتبوو لە سێ لیوا، ١٤ قەزا، ٣٣ ناحیە، ٢٢٠٧ گوندو حەوت عەشیرەت.

یەکە ئیدارییەکانی بە گشتی ئەمانەی خوارەوە بوون:

| لیوا | قەزا | ناحیە | گوند |
|---|---|---|---|
| موسڵ | موسڵ<br>عەمادییە<br>زاخۆ<br>دهۆك<br>عەقرە<br>سنجار | شێخان، عەشایری سەبعە<br>داودیە، بەرواری باڵا،<br>بەرواری ژێری، ڕێکان<br>نێروە<br>مزووری<br>زێبار<br>تەلەعفەر | ٥٠٦<br>١١٠<br>٢١٥<br>١٣٢ |
| کەرکوك | کەرکوك<br>رەواندز<br>کۆیسنجق<br>رانیە<br>ئەربیل<br>صەلاحییە | مەڵحە، داقوق، ئاڵتون<br>کۆپری، گێل، شوان<br>دێرە حەریر، باڵەك،<br>برادۆست، شێروان<br>شەقلاوە<br>...<br>سوڵتانییە، دزەیی<br>قەرەتەپە، توزخورماتوو | ٣٤٨<br>٢٨٣<br>١٢١<br>٩٠<br>٢٣٠<br>٩١ |
| سلێمانی | سلێمانی<br>گولعەنبەر<br>مەعموورەی<br>حەمید<br>بازیان<br>شەهربازاڕ | قەرەتاغ<br>ئەڵەبجە، سرۆچك، قزڵجە<br>قەلعەدزە، سووداش،<br>مەرگ<br>قەلعەسیوکە، سەنگاو<br>سنکێ، ماوەت | ١٣٩<br>٤٧٢<br>١٣٧<br>١٠٥٩و<br>٧ خێڵ |

(بڕوانە لاپەڕە (٤٧)ی کتێبی: (فیصل محمد الارحیم، تطور العراق تحت حکم الاتحادیین ١٩٠٨-١٩١٤)، موسڵ، ١٩٧٥.

(٥) ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز، لەو ساڵانەدا وەك حاکمی گشتی، بێ گوێدانە ویستی خەڵکی ناوچەکان، بە ئارەزووی خۆیان ئەم سنوورانەیان دەگۆڕی، (ویلسن)ی حاکمی سیاسی گشتی میسۆپۆتامیا، لە ڕاپۆرتی ئیستخباراتی تایبەت بە بابەتەکانی باشووری کوردستاندا، لە ساڵەکانی جەنگی گەورەدا، ئەوەی ئاشکرا کردووە کە حاکمە سیاسییەکان بۆیان هەبووە لەو چوارچێوە گشتییەی کە بۆیان دانرابوو، ئەو جۆرە وردە دەستکارییە کارگێڕییەی ناوچانە بکەن. (بڕوانە: (دۆکیومەنتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ژمارە (٣٧١ F.O/٤١٩٢٩,٣)ی ئەیلولی ١٩١٩)، لاپەڕە (٩).

*** سەردەمە کارگێڕیو بەڕێوەبەرییەکانی کاتی هاتنی ئینگلیزەکان**

لە ماوەی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیو پێش هاتنی ئینگلیزەکان، ناوچەی عێراق دابەشکرابووە سەر سێ ولایەت کە: ولایەتی بەغدا، ولایەتی موسڵو ولایەتی بەسرە بوون‌و، ولایەتی موسڵ دابەشکرابووە سەر سێ موتەصەرفیە لەوانە موتەصەرفیەی موسڵو موتەصەرفیەی شارەزوور، کەبنکەکەی کەرکوک‌و قەزاکانی کەرکوک‌و هەولێرو کفری‌و رانیەو رەواندوز، لەگەڵ موتەصەرفیەی سلێمانی))[٩٠].

لەکاتی داگیرکردنی بەریتانیا بۆ عێراق (١٩١٤-١٩١٨) هەستان بەدامەزراندنی بەڕێوەبەرییەکی بەریتانی - هندی، بۆ هەموو ناوچەکانی..[٩١]. هەروەها هەوڵی هێنانی ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرانی سیاسیو بەڕێوەبەرییەکانی عێراق، ئەویش بۆ دامەزراندنی دەزگای بەڕێوەبەریو دادوەری[٩٢]. لەگەڵ دانانی بەڕێوەبەرییەکی بیانی لەجێگای بەڕێوەبەری عوسمانی پێشوو، کە بنەڕەتی ئەم بەڕێوەبەرییانە پێکهاتبوو لەبەریتانییەکان‌و هیندییەکان، لەدوای داگیرکردن، عێراق دابەشکرایە سەر شانزە یەکەی بەڕێوەبردن (لیوا)، کە لەو بچووکتر قەزاو ئینجا ناحیە بووە.

عێراق بریتی بووە لەم لیوایانە: بەغدا، عەمارە، بەعقوبە، بەسرە، دیر الزور، دیوانیە، دلێم، حلە (لەگەڵیدا کەربەلا)، خانەقین، کەرکوک، کوت، موسڵ، مونتەفەگ، سامەرا، شامیە (لەگەڵیدا نەجەف)و سلێمانی[٩٣].

هەر چەندە بەریتانییەکان گۆڕانێکی گەورەیان لەکارە بەڕێوەبەرییەکاندا کرد، زیاتر هەوڵی ئەوەیان دەدا کە پشت ببەستن بە کارە بەڕێوەبەرییەکانی عوسمانییەکان بەڵام لەسەر شێوازێکی تازەترو گۆڕاو بەپێی سەردەمەکە بۆیە لەماوەی هاتنیادا گەلێک گۆڕان روویدا لە قەبارەی کارە بەڕێوەبەرییەکان تا بەوەی جێگای نەگۆڕی خۆی گرت، بۆ نموونە لەسەرەتادا عێراقیان دابەشکردە سەر شانزە لیوا ئینجا دە لیوا لەدواییدا بەسەر چواردە لیوادا دابەشکرایەوە.

هەر لەساڵی (١٩١٨)ەوە، لەکوردستانی خواروو دوو ناوچەی بەڕێوەبەری سەری هەڵدا کەئەویش سلێمانی‌و موسڵ‌و ئینجا لەساڵی ١٩١٩، کەرکوک جیاکرایەوەو کرایە ناوچەیەکی سەربەخۆ پێی دەوترا (لیوای کەرکوک).. سەرچاوەو راپۆرتی بەریتانیا ئەوەیان روونکردووەتەوە کە ئەم دابەشکردنە بەڕێوەبەرییە لەسەر بنەڕەتی کارە جوگرافییەکان بووە کە گوایە هەر یەکە لە موسڵ‌و کەرکوک‌و هەولێر، لە ناوچە دەشتاییە بەرزەکانن[٩٤].

بەڵام کەرکوک نەبووە بەشێک لەدەوڵەتی عێراقی، تا هاتنی دەستەی نەتەوەیەکگرتوەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە راستییەکانی ولایەتی موسڵ، کە لەدواییدا کۆمەڵەی نەتەوەکان لەو کۆبونەوەیەی کە لە جنێف بەستی لەرۆژی (١٦)ی کانونی یەکەم ساڵی (١٩٢٤)دا، هەموو ئەو زەوییانەی کە کەوتونەتە خواروی هێڵی برۆکسلەوە دای بە دەوڵەتی عێراقی تازە، کەرکوک بەپێی ئەم بریارە بوو بە بەشێک لە عێراق..[٩٥].

کاتی دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لەلایەن شێخ مەحمودەوەو دروستبوونی ناوچەیەکی بەڕێوەبەری، کەجیاواز بوو لەناوچەکانی ترو وای کرد کە بەڕێوەبەرییەکی تارادەیەک رێکوپێک دروستبکات، هەوڵی دەدا، کە وردە وردە فراوانی بکات‌و پەل بهاوێژێت بۆ ناوچەکانی تر، (ئەوەبوو لەرۆژی (٢١)ی کانونی یەکەم ساڵی ١٩٢٢، ئاڵای حکومەتی کوردستان لەناوچەی چەمچەماڵ هەڵکرا)[٩٦]. شێخ مەحمود بریاریدابوو، کەبچێت بەرەو کەرکوک‌و بیخاتە سەر نەخشەی کوردستانی خواروو[٩٧]. بەڵام ئەوەی ئینگلیزەکان مەبەستیان بوو ئەوەبوو کەدەیانویست وابکەن کەرکوک لەبەڕێوەبەری ناوچەکانی تری کوردستان دابڕن‌و بەتایبەت دەرکەوتبوو کەناوچەی کەرکوک خاوەنی نەوتێکی زۆرە، بۆیە چاویان بەلای بارە ئابوورییەکەدا زیاتر دەڕۆیی‌و هەوڵی دابرینیان دەداو چاویان لەگەڵێک کاری حکومەتی عێراق دەپۆشی بۆ ئەوەی مەرامەکانیان بهێننەدی.

لە کەرکوک مەجید یەعقوبی کە رەئیس بەلەدیە بوو، ئەویشیان کرد بە موتەسەریف، بۆئەوەی بەتەواوی لەسلێمانی جیای بکەنەوە. مێجر میلەر کەسێکی تورکی زانیان دۆزیەوەو بەناوی حاکمی سیاسییەوە ناردیان بۆ کەرکوک، ئەم ئینگلیزە تورکی زانەو موتەسەریف هانی کەرکوکییەکانیان ئەدا داوای ئیستقلالی خۆیان بکەن‌و هەر بۆ ئەوەی لە سلێمانیان ببچرنەوە[٩٨].

لە (٢٧)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٢٠)دا بوو گواستنەوەی کارە بەڕێوەبەرییەکانی عێراق لە مەندوب سامی بەریتانیاوە بۆ حکومەتی عێراقی بەسەرۆکایەتی عەبدولرەحمان ئەفەندی نەقیب، بەڵام مەندوب سامی خۆی هەستا بەسەرپەرشتی ناوچە کوردییەکان، تاکو بەریتانیا بتوانێت بگاتە ئەوەی بریار لەسەر سیاسەتێکی دیاریکراو بدات تا بۆ ئەوەی گونجاو بێت لەگەڵ سیاسەتی عێراقی تازە دامەزراو کە پەیوەست بێت بەسیاسەتی نێوان دوو رووبار[٩٩].

بەشی زۆری کوردەکان لە لیوای کەرکوک دژی هاتنی مەلیک فەیسەڵ بوون، دانیشتووانی ناو شارەکە دژی فەیسەل بوون‌و داوای حکومەتێکی کوردییان دەکرد، بەڵام مەجلیسی کەرکوک، کە ئەندامەکانی دیاریکراو بوون لەلایەن راوێژکاری بەریتانیاوە، دەنگیاندا بۆ لایەنگری مەلیک فەیسەڵ، چونکە ئەم مەجلیسی ولایەتانە، بەپێی رێنماییەکانی ولسن لە (١٠)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٨)دا دانرابوو، بۆیە هیچ سەیر نییە کەلایەنگری مەلیک فەیسەل یان بەریتانیا بن.

بەڵام لەسەر ئاستی جەماوەردا، هەستان بەکۆبوونەوە، لەماڵەکاندا یەکەم کۆبوونەوە لەماڵی موفتی بوو لەرۆژی (٢٣)ی تەمموز، دەربارەی ئەم بابەتە، پێیان داگرت لەسەر ئەوەی کە فتوایەک دەربکەن دژی فەیسەڵ‌و تاوانباری بکەن کە گوایە موسوڵمان نییەو یەزیدییە، ئەوەیان دووپاتکردەوە، ئەگەر فەیسەڵ بێتە مەلیک ئەوان داواکاری ئەوە دەکەن، کەیەکبگرن لەگەڵ کوردستاندا. گەورەکانی کورد لە لیوای کەرکوک لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ئەوەیان راگەیاند بۆ راوێژکاری بەریتانیا گوایا دەنگ دەدەن بۆ ئارەزووی بەریتانییەکان، بەڵام بوونی مەلیک فەیسەڵ‌و حکومەتێکی عەرەبییان ناوێت، تورکمانەکان ئەوەیان لا باشتر بوو کە لایەنگری تورک بن، رازی نەبوون بە

بوونی مەلیك فەیسەڵ.

ئەنجامی ڕاگۆڕینەوەکە بەم جۆرە بوو:

| ناوچەکان | لایەنگری فەیسەڵ | دژی فەیسەڵ |
|---|---|---|
| شاری کەرکوك | ٦٤ | ٢٧٨٦ |
| ناوچەی کەرکوك | ١٩٧ | ٧٢٠ |
| ئاڵتون کۆپری | – | ١٥٠٠ |
| داقوق (تاوق) | – | ١٠٠٠ |
| مەلحە | – | ١٥٠٠٠ |
| شوان | – | ١٢٦٣ |

ئاهەنگی ڕەسمی لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٢١) ڕاگەیەنرا بۆ دانانی مەلیك فەیسەڵ لەسەر کورسی عێراق، نوێنەری هەموو پارێزگاکان ئامادەبون تەنها سلێمانی و کەرکوك نەبێت[١٠٠].
ساڵی ١٩٢٩ چەند ژمارەیەك لە نائیبەکانی کورد لەعێراق یاداشنامەیەکیان پێشکەش بەحکومەتی عێراق کرد بۆ دروستکردنی یەکەیەکی بەڕێوەبەری کوردی پێکهاتوو لە سلێمانی و هەولێرو کەرکوكو دروستکردنی لیوایەکی تازە لە قەزا کوردییەکانی لیوای موسڵ.
هەروەها لەو یاداشتنامەیەی کەکورد لە ساڵی (١٩٤٣)دا بۆ سەفیری بەریتانیایان نارد بۆ پێکەوەنانی ولایەتی کوردستان لە لیواکانی سلێمانی، هەولێر، کەرکوكو خانەقین..[١٠١] یەکێکە لەو هەوڵانەی بۆ پێکەوەنانی بەڕێوەبەرییەکی یەکگرتووی ولایەتەکانی کوردستانی خواروو ئەنجامدرا.

*** لە ساڵی (١٩٢٩-١٩٣٠)دا یەکە بەڕێوەبەرییەکانی لیوای کەرکوك بەم شێوەیە بووە:**

١. مەرکەزی لیوا، بریتی بوو لەکەرکوك، داقوق، ئاڵتون کۆپری (پردێ)، قەرەحەسەن (لەیلان)، شوان و مەلحە.
٢. قەزای چەمچەماڵ، بریتی بوو لە ناحیەی چەمچەماڵ.
٣. قەزای کفری –صلاحیە، بریتی بوو لەکفری، دووزخورماتوو، قەرەتەپە، قەڵای شیروانەو شەبیجە.
٤. قەزای گل، بریتی بوو لە ناحیەی گل و سەنگاو.

*** لەساڵی (١٩٣٦)دا یەکە بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك بەم شێوەیە بووە:**

١. قەزای کەرکوك، بریتی بووە لەناحییەکانی کەرکوك، ئاڵتون کۆپری(پردێ) و مەلحە.
٢. قەزای کفری، بریتی بووە لەناحییەکانی دووز، قەرەتەپەو قەڵای شیروانە.
٣. قەزای چەمچەماڵ، بریتی بووە لە ناحییەکانی ئاغجەلەرو شوان و سەنگاو.
٤. قەزای گل، بریتی بووە لەناحییەکانی قادرکەرەمو داقوق.

*** لە ساڵی (١٩٤٧)دا شێوە بەڕێوەبەرییەکانی قەزاو ناحییەکانی شاری کەرکوك بەم جۆرە بووە:**

١. قەزای کەرکوك، بریتی بووە لە (کەرکوك) و (قەرەحەسەن–لەیلان) و (ئاڵتون کۆپری–پردێ) و (مەلحە) و (شوان).
٢. قەزای چەمچەماڵ، بریتی بووە لە لە ئاغجەلەرو سەنگاو و چەمچەماڵ.
٣. قەزای داقوق، بریتی بووە لە داقوقو قادرکەرەمو دووزخورماتوو.
٤. قەزای کفری، بریتی بووە لە کفری و قەرەتەپەو شێروانەو پێباز.

*** لەساڵی (١٩٤٨)دا یەکە بەڕێوەبەرییەکانی قەزاو ناحییەکانی کەرکوك بەم جۆرە بووە:**

١. قەزای کەرکوك، ناحییەکانی کەرکوكو قەرەحەسەن (لەیلان) و ئاڵتون کۆپری (پردێ) و مەلحەو شوان.
٢. قەزای کفری، ناحییەکانی کفری، پێباز، و قەرەتەپەو شێروانە.
٣. قەزای چەمچەماڵ، ناحییەکانی چەمچەماڵ و ئاغجەلەرو سەنگاو.
٤. قەزای دوزخورماتوو، ناحییەکانی دوزو داقوقو قادرکەرەم[١٠٢].

لەساڵی (١٩٥٧)دا، لەقەزای کەرکوك لە جیاتی ناحیەی مەلحە، ناحیەی حەویجە هاتۆتە گۆڕێ و ناحیەی مەلحە لادراوە.

*** یەکە بەڕێوەبەرییەکانی ناوچەی کەرکوك تا هەڵگیرساندنی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ بەم جۆرە بووە:**

١. قەزای کەرکوك، قەرەحەسەن (لەیلان)، ئاڵتون کۆپری (پردێ)، حەویجە، شوان، کەرکوك.
٢. قەزای کفری، قەرەتەپە، شێروانە، پێباز، کفری.
٣. قەزای دوزخورماتوو، مەرکەزی قەزا، قادرکەرەم، داقوق.
٤. قەزای چەمچەماڵ، ئاغجەلەر، سەنگاو، چەمچەماڵ.

کارە بەڕێوەبەرییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٥٧–١٩٦٥) بەوە بەناوبانگە، کەبووە گۆرانێکی سیاسی بە پەلە، لەهەمویان گرنگتر، سەرهەڵدانی ڕژێمی کۆماری لەساڵی ١٩٥٨و شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ لە کوردستانداو هێرشی سەربازی بەردەوام بۆ ئابلۆقەدانی، کەبووە سەرهەڵدانی هێڵی بەعەرەبکردن لەناوچەکە، هەروەها لەم ماوەیەدا قەبارەی دانیشتووانی پارێزگاکە بەرێژەی (٢,٧٪) لەساڵێکدا بەرزبووەوە. دروستکردنی قەزای حەویجە لەساڵی ١٩٦٢دا بەرووبەری (٨٪) ڕووبەری پارێزگاکەو بەرێژەی (١٧٪) ی ژمارەی دانیشتوانی پارێزگاکە، کەزۆربەیان لەعەرەبی هێنراو بوون بۆ نیشتەجێکردن. دروستکردنی ناحیەی تازەو دووبزو لکاندنەوەی بەمەرکەزی قەزا، کەبووە هۆی زیادبوونی دانیشتووان بەرێژەی (٤،٦٪)، لەهەمان کاتدا بووە کەمبونەوەی قەبارەی دانیشتووانی قەزای کفری و دوزخورماتوو.

*** یەکە بەڕێوبەرییەکانی پارێزگای کەکوك لە ساڵی ١٩٦٥ پێکهاتبوو لەم قەزایانەی خوارەوە:**

١. قەزای کەرکوك: ناوەندی ناحیەی کەرکوك، ناحیەی تازە، خوورما توو، قەرە حەسەن، ئاڵتون کۆپری، شوان، دووبز.

٢. قەزای کفری: ناحیەی ناوەندی کفری، پێباز، قەرە تەپە، شێروانە.

٣. قەزای چەمچەماڵ: ناوەندی قەزا، ناحییەکانی سەنگاو، ئاغجەلەر.

٤. قەزای طوز: ناوەندی طوز، ناحییەکانی قادر کەرەم، داقوق.

٥. قەزای حەویجە: ناوەندی حەویجە، ناحیەی ڕیاز.

بەڵام بەڕێز دکتۆر (شاکر خەسباك) یەکە بەڕێوەبەرییەکانی لە ساڵی (١٩٦٥)دا بەم جۆرە نووسیوەتەوە:

١. قەزای کەرکوك: ناوەندی قەزای کەرکوك، ناحییەکانی شوان، قەرە حەسەن، دووزخورماتوو، پردی، دبس (دووبز).

٢. قەزای کفری: ناحییەکانی قەرەتەپەو جەبارە.

٣. قەزای حەویجە: ناوەندی قەزا، ناحییەکانی ڕیاز.

٤. قەزای کەلار: ناوەندی قەزا، ناحییەکانی شێروانە، پێباز.

٥. قەزای چەمچماڵ: ناوەندی قەزای چەمچماڵ، ناحییەکانی سەنگاو، ئاغجەلەر.

٦. قەزای تووزخورماتوو: ناوەندی قەزا، ناحییەکانی قادرکەرەم، داقوق، ئامرلی، سلێمان بەگ.

*** "گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٤٧-١٩٦٥:**

١. هێنانەکایەی قەزای دووز خورماتوو لە ساڵی (١٩٢٥) بە هەڵوەشاندنەوەی قەزای داقوق، لە مەڵبەندی قەزاو هەر دوو ناحیەی داقوق و قادر کەرەم پێکهاتبوو.

٢. هێنانەکایەی ناحیەی دبس بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٦) لە (٢٣)ی ئاياری ساڵی (١٩٦١) لە (٣٤) کەرت پێکهاتووە، بە دابراندنی (١٨) کەرت لە ناحیەی ئاڵتون کۆپری و (٨) کەرت لە ناحیەی (حەویجە – مەلحە) و (٨) کەرت لە مەڵبەندی کەرکوك.

٣. هێنانەکایەی ناحیەی تازە خورماتوو لە سەرەتای شەستەکان، کە لە (٣٣) کەرت پێکهاتبوو بە دابراندنی (٣١) کەرت لە ناحیەی مەڵبەندی قەزای کەرکوك و (٢) کەرت لە ناحیەی (داقوق).

٤. هێنانەکایەی ناحیەی ڕیاز لە ساڵی (١٩٦١)، کە لە (٢٩) کەرت پێکاتبوو بە دابراندنی (٢٦) کەرت لە ناحیەی (داقوق) و (٣) کەرت لە مەڵبەندی قەزای کەرکوك.

٥. هێنانەکایەی قەزای حەویجە لە ساڵی (١٩٦٢)، کە لە هەردوو ناحیەی حەویجەو ڕیاز پێکهاتبوو.

٦. دابراندنی کەرتی (٢٠/ سورەدێی خواروو) لە ناحیەی شوان و بەستنەوەی بە مەڵبەندی قەزای کەرکوك.

٧. دابراندنی (٣) کەرتی مەڵبەندی قەزای کەرکوك و بەستنەوەیان بە ناحیەی داقوقەوە.

٨. دابراندنی (٣٨) کەرتی ناحیەی قەرەتەپەی سەر بە قەزای کفری و بەستنەوەیان بە ناحیەی جەلەولای سەر بە قەزای خانقین.

٩. دابراندنی (٥) کەرتی ناحیەی شێروانەو بەستنەوەیان بە ناحیەی پێباز لە سنووری قەزای کفری"[١٠٣].

ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٥–١٩٧٠)، دروستکردنی دوو ناحیەی (ئامرلی) و (سلێمان بەگ) و لکاندنەوەی بەقەزای دووزخورماتوو، بووە هۆی زۆری قەبارەی دانیشتووان بەڕێژەی نزیکی (٤٪) هەموو ساڵێك. دابڕانی ناحیەی (پێبان) و شێروانە لەقەزای کفری و لکاندنەوەی بەقەزای کەلار، کەتازە دروستکرا بوو بەپێوانەی (٢٤٪)ی پێوانەی پارێزگاکەو بەڕێژەی (٥٪)ی دانیشتووان، کەبووە هۆی دابەزینی ڕێژەی قەبارەی دانیشتووانی کفری.

*** "گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٦٥ – ١٩٧٧:**

**١. لە قەزای کەرکوك:**

– دابراندنی کەرتەکانی (٥٦، ٦٤، ٦٧، ٦٨، ٦٩، ٧٦، ٧٧، ٧٨) لە ناحیەی ڕیازو بەستنەوەیان بە ناحیەی تازە خورماتوو بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦) لە (٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٢).

– هێنانەکایەی ناحیەی یایچی بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٣٨٤) لە (٤)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٧٢)، کە لە (٢٦) کەرت پێکهاتووە بە دابراندنی (١١) کەرت لە ناحیەی دبس و (١٣) کەرت لە ناحیەی تازە خورماتوو (٢) کەرت لە ناحیەی ڕیاز.

– دابراندنی کەرتەکانی (٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٦٣) لە مەڵبەندی قەزای چەمچەماڵ و بەستنەوەیان بە ناحیەی شوان.

**٢. لە قەزای کفری:**

– هێنانەکایەی ناحیەی جەبارە بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٠٣) لە (٣٠)ی ئاداری ساڵی (١٩٦٩) بە دابراندنی (٢٤) کەرت لە ناحیەی شێروانە.

– دابراندنی هەردوو ناحیەی شێروانەو پێباز لە قەزای کفری بۆ هێنانەکایەی قەزای کەلار.

– هێنانەکایەی ناحیەی کۆکس بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٦١) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢)، بە دابراندنی (٦) کەرت لە ناحیەی جەبارەو (٩) کەرت لە ناحیەی قەرەتپە.

– گۆڕینی ناوی ناحیەی (شێروانە) بۆ (سەرقەڵا) بەپێی بڕیاری وەزارەتی ناوخۆ ژمارە (٢٦٣٦٣) و دابراندنی لە قەزای (کەلار)ەوەو بەستنەوەی بە قەزای کفری بەپێی فەرمانی کۆماری (٦٠٧) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥).

– دابراندنی قەزای (کفری) لە پارێزگای (کەرکوك) و بەستنەوەی بە پارێزگای (دیالە) بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥).

**٣. لە قەزای کەلار:**

- هێنانەکایەی قەزای (کەلار) بە دابڕاندنی هەردوو ناحیەی (شێروانە)و (پێبان) لە قەزای کفری بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (١٣٧) لە (٢٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٠).
- هێنانەکایەی ناحیەی (تیلەکۆ) بە دابڕاندنی (٦١) کەرت لە ناحیەی (شێروانە) لە قەزای کفری بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٦١) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢).
- دابڕاندنی (٢١) کەرت لە ناحیەی (سەرقەڵا – شێروانە) و بەستنەوەیان بە مەڵبەندی قەزای (کەلار) بەپێی بڕیاری وەزارەتی ناوخۆ ژمارە (٢٦٣٦٣).
- دبڕاندنی قەزای (کەلار) لە پارێزگای (کەرکوك)و بەستنەوەی بە پارێزگای (سلێمانی) بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥).

**٤. لە قەزای (دبس-دووبز):**

- هێنانەکایەی قەزای (دبس–دووبز) بە دابڕاندنی هەردوو ناحیەی (دبس–دووبز)و (ئاڵتون کۆپری) لە قەزای کەرکوك بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٧٢) لە (١٥)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٦).
- دابڕاندنی (٢٩) کەرت لە ناحیەی (کەندیناوە)و (١١) کەرت لە ناحیەی (قەراچ)ی قەزای (مەخمور)ی سەر بە پارێزگای هەولێرو بەستنەوەیان بە ناحیەی (دبس–دووبز) بەپێی فەرمانی کۆماری (٣٣) لە (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٦).
- دبڕاندنی هەردوو کەرتی (١٨٢)و (١٨٣) لە ناحیەی (قوشتەپە)ی سەر بە قەزای مەڵبەندنی پارێزگای هەولێرو بەستنەوەیان بە ناحیەی (ئاڵتون کۆپری) بەپێی فەرمانی کۆماری (٣٣) لە (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٦).

**٥. لە قەزای دووز خورماتوو:**

- هێنانەکایەی ناحیەی ئامرلی بە دابڕاندنی (٢٥) کەرت لە مەڵبەندی قەزای دووز خورماتوو بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٣٩) لە (٣)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٩).
- هێنانەکایەی ناحیەی (سلێمان بەگ) بە دابڕاندنی (١٠) کەرت لە مەڵبەندی قەزی دووز خورماتو بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٤٠) لە (٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٦٩).
- دابڕاندنی کەرتەکانی (١، ٢، ٣، ٤، ٥) لە ناحیەی (قادر کەرەم)و بەستنوەیان بە مەڵبەندی قەزای دووز خورماتوو بەپێی فەرمانی کۆماری (١٣٦) لە (٢٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٧٠).
- هێنانەکایەی ناحیەی نەوجول بە دابڕاندنی (٣٣) کەرت لە مەڵبەندی قەزای دووز خورماتوو بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٤٦٠) لە (٢٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٧٢).
- دابڕاندنی ناحیەی داقوق لە قەزای دووز خورماتوو و بەستنەوەی بە قەزای مەڵبەندنی کەرکوك بەپێی فەرمانی کۆماری (٢٥٦) لە (١٨)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٦)و مانەوەی هەر سێ کەرتی (٦٦/ )و (٨٠/ ئالبو رەیاش)و (٨١/ ئەحمەد سەمیر) لە سنووری قەزای دوز.

**٦. لە قەزای حەویجە:**

- هێنانەکایەی ناحیەی عەباسی لە حەفتاکاندا بە دابڕاندنی (١٣) کەرت لە مەڵبەندنی قەزای حەویجە.
- دابڕاندنی کەرتی (٢١/ دغیلە سەید خەلەف) لە مەڵبەندنی قەزای حەویجەو بەستنەوەی بە ناحیەی ڕیازەوە"[١٠٤].

لەنێوان ساڵانی (١٩٧٠–١٩٧٧)، گەلێك گۆڕانی سیاسی گرنگ ڕوویدا، لەهەموویان گرنگتر، هەرەسهێنانی ڕێککەوتننامەی (١١)ی ئازاری (١٩٧٠)و هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لەنێوان بزافی کوردیو حکومەتی عێراق، لەنێوان ساڵانی (١٩٧٤–١٩٧٥)، لەدوایيدا ڕوودانی ڕێککەوتننامەی نێوان عێراق و ئێران لەساڵی ١٩٧٥. ئەوەی لەم ڕێککەوتننامەیەدا ڕوویدا بەدەرکەوتنی لایەنی خراپی لێکەوتەوە بۆ ناوچەکانی کوردستان بەگشتیو ناوچەی کەرکوك بەتایبەتی. لکاندنی قەزای دوزخورماتوو بە پارێزگای سەلاحەدین، بێجگە لە ناحیەی داقوق، کە خرایە سەر قەزای کەرکوك.

لکاندنی قەزای کفری بەپارێزگای دیالەو قەزای چەمچەماڵ و کەلار بەسلێمانی، بووە هۆی دابەزینی یەکە بەڕێوەبەرییەکانی پارێزگاکە لە ٢٣ یەکەوە بۆ ١١ یەکەی بەڕێوەبردن لەنێوان ساڵانی (١٩٧٧–١٩٨٧)و بەم شێوەیەی لێهات:

١. قەزای کەرکوك:

بریتیبووە لە قەرەحەسەن (لەیلان)، یایچی، شوان، تازە، داقوق و ناحیەی مەرکەزی قەزا.

٢. قەزای حەویجە:

بریتیبووە لە عەباسی، ڕیازو ناحیەی مەرکەز. سێیەم: قەزای دوبز، ناحیەی مەرکەزو ئاڵتون کۆپری (پردێ).

لەنێوان ساڵانی (١٩٨٠–١٩٨٧)دا، گۆڕانێکی گەورە لەپێکهاتەی بەڕێوەبەرییەکانی عێراقدا ڕوویدا، ئەویش بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان (عێراق – ئێران)، لەساڵی ١٩٨٠ تا ساڵی ١٩٨٨، لابردنی ناحییەکانی قەرەهەنجیر، یایچی، قەرەحەسەن (لەیلان)و شوان لەقەزای کەرکوك و مانەوەی قەزاو ناحییەکانی تازەو داقوق، ناحیەی مەرکەزو لابردنی ناحیەی القدس لەسەر قەزای دوبز، بەرزبوونەوەیەکی نائاسایی دانیشتووانی قەزای حەویجە ئەویش بەلکاندنی ناحیەی (الزاب)ی پارێزگای نەینەوا بەقەزای حەویجەوە. ئەگەر سەرنج بدەین لە دابەشکردنەکانی بەڕێوەبەرێتی عێراق، هەتا نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە، لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی بیستدا، دەبینین کە نیوەی دووەمی گۆڕانێکی گەورەو بەردەوامی لەسنووری بەڕێوەبەرییەکانیدا بەسەرداهاتووە، کە تەنها لە پێکهاتەکانیدا نەبوو، بەڵکو لەپێوانەو ناوەکانیشدا ڕوویدا، کارتێکردنێکی گەورە لەتایبەتمەندی دیمۆگرافییەکەیدا ڕوویدا، بەتایبەتی لەگەشەی دانیشتووان و، پێکهاتەی نەتەوەیی و ئایینی و زمانەوانی، کە یەکێکە لەو پارێزگایانەی کە لەهەموو پارێزگاکانی تر زیاتر کەوتووەتە بەر کارتێکردنی گۆڕانەکانی سنووری بەڕێوەبەریەتییەکان[١٠٥]، هەر ئەمەش

بوو وای کرد کەناوەکەی لە کەرکوکەوە بکرێتە (التأمیم) بۆ دابراندنی دروستبوونی هۆکارە مێژووییەکانی. لەدوای ساڵی (١٩٨٨) هەریەکە لە قەرەهەنجیر، قەرەحەسەن (لەیلان) و شوان لەنەخشەدا سڕانەوەو کرانە ناوچەیەکی چۆڵەوانی و ئۆردوگای سەربازی.

*** "گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٧٧-١٩٨٧:**

١. هێنانەکایەی ناحیەی (ربیع - قەرەهەنجیر) بە دابراندنی (٢١) کەرتی ناحیەی (قەرە حەسەن)و (٩) کەرتی ناحیەی شوان بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە(٦٥٢) لە (٣)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٧).
٢. دابراندنی کەرتی (١/قەرە سالم)ی ناحیەی شوانی قەزای مەڵبەندی پارێزگای کەرکوك‌و بەستنەوەی بە ناحیەی (ئاڵتون کۆپری)ی قەزای دبس لە پێی فەرمانی کۆماری (٢٣٢) لە (٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٩).
٣. دابراندنی کەرتەکانی (٢٣)و (٢٤)و (٢٦)ی ناحیەی (ئاڵتون کۆپری)و بەستنەوەیان بە ناحیەی (شوان) بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٢٣٢) لە (٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٩).
٤. دابراندنی کەرتی (٢٧/عەلی میکائیل)ی ناحیەی شوان‌و بەستنەوەی بە ناحیەی (ربیع - قەرەهەنجیر) بەپێی فەرمانی کۆماری (٢٣٢) لە (٦)ی ئایاری ساڵی (١٩٧٩).
٥. دابراندنی ناحیەی (قادر کەرەم) لە قەزای دووز خورماتوو و بەستنەوەی بە قەزای (چەمچەماڵ)ی سەر بە پارێزگای سلێمانی بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٣٦٨) لە (٣٠)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٨٧).
٦. دابراندنی ناحیەی (زاب) لە قەزای (شرگات)ی پارێزگای موسڵ‌و بەستەوەی بە قەزای (حەویجە)ی پارێزگای کەرکوك لە ساڵی (١٩٨٤)دا"[١٠٦].

*** لە ساڵانی ١٩٩٠-١٩٩١ دا قەزاو ناحییەکانی پارێزگاکە بەم جۆرە بووە:**

١. قەزای کەرکوك، ناحییەکانی: تازەخورماتوو، داقوق.
٢. قەزای حەویجە، ناحیەی: ڕیاز.
٣. قەزای دووبز، ناحیەی ئاڵتون کۆپری (پردێ)[١٠٧].

بەڵام لەدوایی ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٢)دا ناوچەی کەرکوك کەوتە بەر دوو یەکەی بەڕێوەبردنی جیاواز، یەکێکیان لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بەڕێوە دەبراو ئەوی تریان لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بەڕێوەدەبرا. ئەو یەکە بەڕێوەبەرییانەی کەلەلایەن حکومەتی عێراقەوە بەڕێوەدەبرا، بەم جۆرە بوو:

١. قەزای کەرکوك، ناحییەکانی داقوق، تازەخورماتوو.
٢. قەزای حەویجە، ناحییەکانی: ئەلعەباسی و ڕیاز.
٣. قەزای دوبز، ناحییەکانی: ئاڵتون کۆپری(پردێ)و ئەلقودس.

بەڵام ناوچەکانی قەزای چەمچەماڵ‌و قەزای کفری‌و قەزای کەلار کەوتنە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان‌و دەربەندیخان کرایە ناوەندی بەڕێوەبردنی پارێزگای کەرکوك.

*** "ناوی موتەسەریفەکانی کەرکوك لە سەردەمی پاشایەتی دا (١٩٢٢-١٩٥٨)ی زایینی:**

| ژ | ناوی موتەسەریفەکان | ماوەی فەرمانڕەوایی |
|---|---|---|
| ١ | فەتاح پاشا | ١٩٢٢-١٩٢٤ |
| ٢ | عەبدولمەجید یەعقوبی | ١٩٢٤-١٩٢٧ |
| ٣ | عومەر نەزمی | ١٩٢٧-١٩٣٠ |
| ٤ | تەحسین عەسکەری | ١٩٣٠-١٩٣١ |
| ٥ | عەبدولحەمید عەبدولمەجید | ١٩٣١-١٩٣٣ |
| ٦ | جەمیل ڕاوی | ١٩٣٣-١٩٣٦ |
| ٧ | حەسامەدین جومعە | ١٩٣٦-١٩٣٨ |
| ٨ | ئەحمەد ڕاوی | ١٩٣٨-١٩٣٩ |
| ٩ | عەبدولحەمید عەبدولمەجید | ١٩٣٩-١٩٤٠ |
| ١٠ | فایەق شوکر | ١٩٤٠-١٩٤١ |
| ١١ | مەکی شەربەتی | ١٩٤١-١٩٤٤ |
| ١٢ | وەفیق حەبیب | ١٩٤٤-١٩٤٤ |
| ١٣ | ئەمین خالصی | ١٩٤٥-١٩٤٦ |
| ١٤ | حەسەن فەهمی | ١٩٤٦-١٩٤٦ |
| ١٥ | عەبدولجەلیل پرتۆ | ١٩٤٧-١٩٤٨ |
| ١٦ | سەعید قەزاز | ١٩٤٨-١٩٤٨ |
| ١٧ | موراد شاوی | ١٩٤٩-١٩٥٠ |
| ١٨ | شێخ مستەفا قەرەداغی | ١٩٥٠-١٩٥٢ |
| ١٩ | ڕەشید نەجیب | ١٩٥٢-١٩٥٣ |
| ٢٠ | عەبدولکافی عارف | ١٩٥٣-١٩٥٣ |
| ٢١ | ڕەشید نەجیب | ١٩٥٣-١٩٥٥ |
| ٢٢ | یوسف ضیاء | ١٩٥٥-١٩٥٦ |
| ٢٣ | بەشیر حەدید | ١٩٥٦-١٩٥٨ |



بەشیر حەدید موتەسەڕیفی کەرکوك لە کاتی چاندنی دارو درەختدا



موتەسەڕیفی کەرکوك بەشیر حەدید لە یادی ٣٠ ساڵەی کێڵگەی بابا گوڕگوڕ



يوسف زيا



هاتنى مەليك فەيسەڵ لە ساڵى ١٩٥١ بۆ كەركوك



موتەسەڕیفی کەرکوك زیا لە کاتی کردنەوە پێشانگای ساڵانەی کەرکوك



موتەسەڕیف محەمەد قەرەداغی لەگەڵ مەلیك فەیسەڵی دووەم

*** موتەسەڕیف ( پارێزگار )ەکانی پارێزگای کەرکوك لەنێوان ساڵانی ( ١٩٥٨ -٢٠١٨ ):**

| ز | ناوی موتەسەڕیفەکان | ماوەی فەرمانڕەوایی |
|---|---|---|
| ١ | عەبدولجەلیل ئەلحەدیسی | ١٩٥٩-١٩٥٨ |
| ٢ | مەحمود ئەلبەکری | ١٩٦٢/٩/٨-١٩٥٩/٨/٢٣ |
| ٣ | ناجی عیسا خەلەف | ١٩٦٣/٢/٢٣-١٩٦٢/٩/٢٦ |
| ٤ | عەمید عەبدولڕەزاق سەید مەحمود | ١٩٦٣/٥/٨-١٩٦٣/٢/٢٣ |
| ٥ | د. فوئاد شاکر مستەفا | ١٩٦٤/٢/٢٢-١٩٦٣/٥/١٥ |
| ٦ | نایف حەمودی | ١٩٦٤/١٢/٥-١٩٦٤/٢/٢٢ |
| ٧ | نوری ئەلراوی | ١٩٦٨/١/١٦-١٩٦٥/٣/٢٩ |
| ٨ | عەبدولجەبار سەعدی | ١٩٦٩/١١/٩-١٩٦٨/١/٥ |
| ٩ | غانم عەبدولجەلیل | ١٩٧١/١/٢٣-١٩٦٩/١١/١١ |
| ١٠ | شوکری سەبری ئەلحەدیسی | ١٩٧٣/٨/١٦-١٩٧١/١/٢٥ |
| ١١ | خالید عەبدولحەمید تەبرە | ١٩٧٤/٨/٢٦-١٩٧٣/٨/٢٥ |
| ١٢ | وەلید ئیبراهیم ئەلئەعزەمی | ١٩٧٦/١٢/٣١-١٩٧٦/٢/١٤ |
| ١٣ | وەلید مەحمود ئەلخەشالی | ١٩٧٦/١٢/٣١-١٩٧٦/٢/١٤ |
| ١٤ | عەبدوڵلا فازل ئەلسامەرائی | ١٩٧٧/١/٢١-١٩٧٧/١/١٥ |
| ١٥ | محەمەد حەمزە گیتان ئەلزوبەیدی | ١٩٧٩/٧/٢١-١٩٧٧/٢/٢١ |
| ١٦ | عادل عەبدوڵلا مەهدی | ١٩٨٢/٣/١٣-١٩٧٩/٩/١٥ |
| ١٧ | زوهێر محێدین ئەلقادری | ١٩٨٥/٦/٣-١٩٨٢/٤/١٧ |
| ١٨ | مونزر نوسەیف جاسم | ١٩٨٩/١٠/٢٢ -١٩٨٥/٦/٤ |
| ١٩ | عدنان غیدان محەمەد | ١٩٩١/٣/٢٠-١٩٨٩/١٠/٢٢ |
| ٢٠ | هاشم حەسەن ئەلمجید | ١٩٩٣/١/١٤ -١٩٩١/٤/١ |
| ٢١ | یاسر حەسەن سوڵتان | ١٩٩٤ - ١٩٩٣/١/١٤ |
| ٢٢ | مەحمود فەیزی ئەلهەزاع | ١٩٩٦/١/١٤ -١٩٩٥/٨/١٠ |
| ٢٣ | ئەیاد فەتیح ئەلراوی | ١٩٩٨/٨/١١- ١٩٩٦/١/١٥ |
| ٢٤ | نوفل ئیسماعیل خضیر | ٢٠٠٠/٤/٢٠ - ١٩٩٨/٥/٥ |
| ٢٥ | سەباح نوری عەتوان | ٢٠٠١/١/١٦-٢٠٠٠/٤/٢٩ |
| ٢٦ | قەیس عەبدولروزاق ئەلئەعزەمی | ٢٠٠٢/٤/٨- ٢٠٠١/١/١٧ |
| ٢٧ | مانع عەبد ڕەشید | ٢٠٠٣/٤/١٠ -٢٠٠٢ |
| ٢٨ | عەبدولڕەحمان مستەفا | ٢٠٠٣/٥/٢٨<br>٢٠١١/٤ |
| ٢٩ | نەجەمدین عومەر کەریم | ٢٠١١/٤<br>- ٢٠١٧/١٠/١٦ "[١٠٨] |
| ٣٠ | ڕاکان سەعید | ٢٠١٧/١٠/١٦ - بە وەکالەت |

### * "ناوی سەرۆك و بەڕێوەبەرانی شارەوانی کەرکوك:

| ژ | ناو | دەسبەکاربوون |
|---|---|---|
| ١ | عومەر ئاغا محەمەد سەعید ئاغا | (١٨٧٥-١٩٠٠) |
| ٢ | حاجی عەلی قیردار | (١٩٠٠-١٩١٠) |
| ٣ | بەهادین ئەفەندی هورمزی | (١٩١٠-١٩٢٠) |
| ٤ | عەبدولمەجید یەعقوبی | (١٩٢٠-١٩٢٤) |
| ٥ | باقی ئاغا گدك | (١٩٢٤-١٩٢٩) |
| ٦ | عەبدولڕەحمان بەکر ئەفەندی | (١٩٢٩-١٩٣٤) |
| ٧ | شیخ حەبیب تاڵەبانی | (١٩٣٤-١٩٤٩) |
| ٨ | شامل یەعقوبی | (١٩٤٩-١٩٥٣) |
| ٩ | شێخ فازڵ تاڵەبانی | (١٩٥٣-١٩٥٨) |
| ١٠ | نورەدین واعز | (١٩٥٨-١٩٥٩) |
| ١١ | مەعروف بەرزنجی | (١٩٥٩-١٩٥٩) |
| ١٢ | حسامدین ساڵحی | (١٩٦٠-١٩٦٩) |
| ١٣ | مەزهر عەبدلقادر تکریتی | (١٩٦٩-١٩٧٠) |
| ١٤ | نازم نوری ساڵحی | (١٩٧١-١٩٧٥) |
| ١٥ | ئیبراهم مەحمەد مەحمود | (١٩٧٦-١٩٨٤) |
| ١٦ | قەیسر فاتح ئەحمەد | (١٩٨٤-١٩٨٥) |
| ١٧ | محەمەد حوسێن تەقی/بە وەکالەت | (١٩٨٥) |
| ١٨ | عەلی حوسێن عەلوان/بە وەکالەت | (١٩٨٥-١٩٨٦) |
| ١٩ | قەیسر فاتح ئەحمد/بە وەکالەت | (١٩٨٦) |
| ٢٠ | حەمید حوسێن عەلاوی/بە وەکالەت | (١٩٨٦-١٩٨٨) |
| ٢١ | عەبدول موحسن یەحیی سلێمان | (١٩٨٨-١٩٨٩) |
| ٢٢ | عەبدولرحمان مستەفا ئەرسلان/بەوەکالەت | (١٩٨٩-١٩٩٠) |
| ٢٣ | محەمەد حوسێن تەقی | (١٩٩٠-١٩٩٤) |
| ٢٤ | محەمەد حوسێن موحسن | (١٩٩٤-١٩٩٥) |
| ٢٥ | عامر یونس حەمدو | (١٩٩٥-١٩٩٦) |
| ٢٦ | نایف ساڵح حەمەد | (١٩٩٦-١٩٩٧) |
| ٢٧ | محەمەد حوسێن تەقی | (١٩٩٧-١٩٩٨) |
| ٢٨ | نایف ساڵح حەمەد | (١٩٩٨-٢٠٠٠) |
| ٢٩ | محەمەد حەسەن موحسن/ بەوەکالەت | (٢٠٠٠-٢٠٠٠) چوار مانگ |
| ٣٠ | وەحید سوبحی حەمەد | (٢٠٠٠-٢٠٠٠) چوار مانگ |
| ٣١ | محەمەد حەسەن موحسن/ بەوەکالەت | (٢٠٠٠-٢٠٠١) |
| ٣٢ | حوسێن دەرویش خزر | (٢٠٠١-٢٠٠١) |
| ٣٣ | نایف ساڵح حەمەد/بە وەکالەت | (٢٠٠١-٢٠٠٢) |
| ٣٤ | حاتەم موسی محەمەد | (٢٠٠٢-٢٠٠٣) |
| ٣٥ | جەمال محەمەد شوکر | (٢٠٠٣- ٢٠١١) |
| ٣٦ | عەبدولکەریم حەسەن | (٢٠١١-٢٠١٤ |
| ٣٧ | سەردار عەلی حەسەن | (٢٠١٥- بەردەوامە) |

### * ئەندامانی کەرکوك لەئە نجومەنی نیابی عێراقدا

(ئەنجومەنی نیابی) یەکێکە لەو دەستکەوتانەی ئەو کاتەی دەوڵەتی عێراق کە توانرا ئەم (ئەنجومەنی نیابی)یە بۆ ماوەی شانزە خولی ببەستێت و هەموو پارێزگاکانی عێراق بەشدارییان لێی کردووە کە پارێزگای کەرکوکیش یەکێك بووە لەو پارێزگایانەی عێراق کە ئەندامی خۆیان هەبووە لە ئەنجومەنەکەدا.

بەڵام ئەگەر سەیرو سەرنجی ئەو کاتەی مێژوو بدەین دەبینین کە ئەنجومەنی نیابی و ئەندامەکانی ئەو توانایان نەبووە کە لەگەڵ خواستی میللەتدا بجوڵێنەوەو هەنگاوەکانیان تەنها لەبەرژەوەندی خۆیان کاریان کردووە، کارەکانیشیان لە ئاست خواستی میللەتەکەدا نەبووە.

هەر بۆیە لەکاتی خۆیدا رۆژنامەی ژیان بەم جۆرە وەسپی ئەنجومەنی نیابی و نائیبەکانیان دەکات:

((....موقابیل بەم وظیفە موهیمەیەتان و لەحاڵێکا کە ئەزانن میللەتەکەتان ئەمەندە دواکەوتوەو ئەبی فەوقەلحەد سەعی بۆ بکرێت کەچی مەعەلئەسف هەتاکو ئێستا نە لەمەجلیس داو نە لەخاریجەوە بەنەشریات و تەشەبوثات کەس خدمەتێکی لە ئێوە نەدی و فەعالییەتێکتان نەنواند و تەئمینی یەکی لەمەقاصیدانی میللەتتان نەکرد)).

### * خولی یەکەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:

خولی یەکەم بەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی میللەت دەستی پێکرد بە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی کە لە (١٦)ی تەمووزەوە لە ساڵی ١٩٢٥ تا (٢٩)ی تشرین یەکەمی هەمان ساڵ بەردەوام بوو کە (٤٧) کۆبوونەوەی ئەنجام دا.

لە یەکی تشرینی دوومی ١٩٢٥ کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی بەست تا ١٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ بەردەوام بوو.

کۆبوونەوەی دووەمی لەتشرینی دووەمی ١٩٢٦ وەتا (٣٠) نیسانی ١٩٢٧ بەردەوام بوو.
لە(١)ی تشرینی دووەمی (١٩٢٧)وە کۆبوونەوەی سێیەم بەردەوام بوو تا(٢٨)ی کانوونی دووەمی (١٩٢٨).
ناوی ئەندامەکانی خولی یەکەمی پارێزگای کەرکوك:
- سەعید حوسێن.
- حەبیب تاڵەبانی.
- رەفیق خادم ئەلسوجادە.
- نەشئەت ئیبراهیم.

*** خولی دووەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
لە (١٩) ئایار تا (٢٨)ی ئەیلول ساڵی ١٩٢٨ کۆبونەوەی ئاسایی خۆی لە ئەنجومەنی نائیبەکان بەست.
کۆبونەوەی ئاسایی دووەمی خۆیی لە ٢ی تشرینی دووەمی ١٩٢٩ تا (١٤)ی ئاداری ١٩٣٠ بەردەوام بوو.
تا بەوەی بەفەرمانی پاشایەتی لە یەکی تەمووزی ساڵی ١٩٣٠ هەڵوەشێنرایەوە.
ناوی ئەندامەکانی خولی دووەمی پارێزگای کەرکوك:
- محەمەد سەعید حاجی حوسێن.
- عەلی قیردار.
- مستەفا ئەفەندی.
- محەمەد جاف.

*** خولی سێیەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لەیەکی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ تا ساڵی ٤ی تشرینی دووەمی (١٩٣٢) کە سێ کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی بەست.
ناوی ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی سێیەم:
- حەبیب تاڵەبانی.
- سلێمان فەتاح.
- مستەفا ئەفەندی.
- محەمەد عەلی قیردار.

*** خولی چوارەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئم خولە بەردەوام بوو لە (٨)ی ئاداری ١٩٣٣ تا (٤)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٣٤)
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی چوارەم:
- جەمیل بابان.
- سلێمان فەتاح.
- فەوزی عەلی.
- محەمەد عەلی قیردار.

*** خولی پێنجەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٢٩)ی کانوونی یەکەمی (١٩٣٤) کە تا (١١)ی ئاداری ساڵی (١٩٣٥).
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی پێنجەم:
- جەمیل بابان.
- خەلیل زەکی.
- محەمەد نوعمان.
- محەمەد عەلی قیردار.
- حەبیب تاڵەبانی (بەڵام لەدوایدا سلێمان فەتاح ) لەجێگەی دانرا.

*** خولی شەشەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە(٨)ی ئابی ١٩٣٥ تا (٢٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٦.
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی شەشەم:
- خەلیل زەکی.
- داود ئەلداود.
- داود جاف.
- سلێمان فەتاح.
- فائق تاڵەبانی.
- عەلی رەزا عەسکەری.

*** خولی حەوتەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٢٧)ی شوباتی ١٩٣٧ تا (٢٦)ی ئابی ساڵی (١٩٣٧).
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی حەوتەم:
- یوسف ئیبراهیم یوسف.
- مەحمود بەرقی.
- شێخ قادر تاڵەبانی.
- عاسی ئەلعەلی.
- ئەحمەد ئاغا.
- حوسێن ئاغا نەفتیچی.

*** خولی هەشتەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٢٣)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٧) تا (٢٢)ی شوباتی ساڵی (١٩٣٩).
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی هەشتەم:
- حوسێن ئاغای نەوتچی.
- ئەحمەد یەعقوبی.
- عاسی ئەلعەلی.
- جەمیل بابان.
- ئەحمەد ئاغا.
- شێخ وەهاب تاڵەبانی.

*** خولی نۆیەمی ئە نجومەنی نائیبەکان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (١٢)ی حوزیرانی ساڵی (١٩٣٩) تا (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٣).
ئەندامەکانی پارێزگای کەرکوك لە خولی نۆیەم:
- دارا بەگ.
- محەمەد حاجی نوعمان.
- فائق تاڵەبانی.
- جەمیل قیردار.
- ئەمین رەشید هەمەوەند.
- داود جاف.

*** خولی دەیەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٩)ی تشرینی یەكەمی ساڵی (١٩٤٣)تا (٣١)ی ئایاری ساڵی (١٩٤٦).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی دەیەم:
- جەمیل قیردار.
- دارا بەگ.
- سلێمان فەتاح.
- داود جاف.
- محەمەد نوعمان.
- عەبدولوەهاب تاڵەبانی.

*** خولی یانزەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (١٧) ئاداری ساڵی ١٩٤٧ تا (٢٢) ی شوباتی (١٩٤٨).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی یانزەهەم:
- ئەمین قیردار.
- كامل یەعقوبی.
- فازل تاڵەبانی.
- داود جاف.
- دارا بەگ.
- سلێمان فەتاح.
- سالح نوعمان.
- ئەمین ڕەشید هەمەوەند.

*** خولی دوانزەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٢١)ی حوزیرانی سالی ١٩٤٨ تا (٣٠) حوزیرانی (١٩٥٢).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی دوانزەهەم:
- ئەحمەد یەعقوبی.
- داود جاف.
- عەبدوڵلا سلێمان.
- ئەمین هەمەوەند.
- عەبدولوەهاب تاڵەبانی.
- عەلی ڕەفیق.
- ناجی هورمزی.
- محەمەد نوعمان.

*** خولی سیانزەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
ئەم خولە بەردەوام بوو لە (٢٤)ی كانوونی دووەمی (١٩٥٣) ی تا (٢٨)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٤).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی سیانزەهەم:
- ئیبراهیم نەفتچی.
- ئەمین ڕەشید.
- ئەمین قیردار.
- داود جاف.
- فازل تاڵەبانی.
- كامل یەعقوبی.
- مەحمود بابان.
- عەبدوڵلا سلێمان.

*** خولی چواردەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
بەردەوام بوو لە (٩)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٥٤) تا ئابی (١٩٥٤).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی چواردەهەم:
- ئەمین قیردار.
- حوسێن خانەقا.
- حەبیب تاڵەبانی.
- داود جاف.
- زەینولعابیدن.
- قەنبر.
- كامل یەعقوبی.
- مەحمود بابان.
- عەبدوڵلا ئاوچی.

*** خولی پانزەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
بەردەوام بوو لە (١٦)ی ئەیلولی ١٩٥٤، تا (٢٧)ی ئاداری ساڵی (١٩٥٨).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی پانزەهەم:
- ئەمین ڕەشید.
- حوسێن خانەقا.
- ئەمین قیردار.
- داود جاف.
- سلێمان بەیات.
- كامل یەعقوبی.
- مەحمود بابان.
- ئیبراهیم نەفتچی.

*** خولی شانزەهەمی ئە نجومەنی نائیبەكان:**
بەردەوام بوو لە (١٤)ی شوباتی ساڵی ١٩٥٨، تا (١٤)ی تەموزی (١٩٥٨).
ئەندامەكانی پارێزگای كەركوك لە خولی شانزەهەم:
- مەحمود بابان.
- سلێمان بەیات.
- نەزیر قیردار.
- كاكە حەمە.
- مەحمود فەهمی.
- داود جاف.
- نەجیب یەعقوبی.
- ئیبراهیم نەفتچی.
- قوستەنتین فتوحی.

ئەگەر چاوێك بخشێنین بەسەردەمە بەڕێوەبەرتییەكانی پارێزگاكەو هەوڵ بدەین كەبەراوردێكی سەرنجەكان بدەین دەگەینە ئەم خاڵانەی خوارەوە:
١. بەهۆی گرنگی ناوچەكە هەر لەبەرەبەیانی مێژووەوە



عەبدولمەجید ئەلیەعقوبی



عەبدولقادر تالەبانی



حەسیب تالەبانی



باقی ئاغا



عەلی ڕەزا عەسکەری



عومەر ئاغا محەمەد سەعید ڕۆژبەیانی



حاجی عەلی قیردار



شێخ مەعروف عەبدولکەریم بەرزنجی



شامیل یەعقوبی



فازڵ تالەبانی



عەبدولڕەحمان بەکر ئەفەندی



شێخ حەبیب تالەبانی



موزەفەر تکریتی لە کۆبونەوەیەکی شارەوانی



ئیبراهیم محەمەد مەحمود



حوسێن دەروێش خدر



دەستەی بەڕێوەبەرانی شارەوانی کەرکوك



موزەفەر تکریتی



عامر یونس حەمدو



محەمەد حەسەن موحسن



نایف سالح حەمەد



محەمەد حوسێن تەقی



جەمال محەمەد شوکر



عەبدولکەریم باوەیی



دانشتوو حوسام ئەلدین سالحی



حاتەم مووسا محەمەد



سەردار عەلی حەسەن



محەمەد فەقێ هەمەوەندی



شێخ وەهاب تالەبانی



داود جاف



ئەمین ڕەشید هەمەوەندی



دارا بەگ



حوسێن خانەقا



عەبدولقادر تالەبانی



حەسیب تالەبانی



شەقامی جمهوری لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو



کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی کەرکوك

بووەتە جێگای پێکدادانی سیاسیو لەگەڵ خۆیدا کارە بەڕێوەبەرییەکان، کەوتونەتە بەر شاڵاوی ئەو پێکدادانە رامیارییەو، هەموو کاتێك وای لێکراوە، کە کارە بەڕێوەبەرییەکان لەخزمەتی جێبەجێ کردنی هەنگاوە سیاسییەکاندا بێت.

٢. هەردەم هەولدراوە، کارە بەڕێوەبەرییەکانی لەناوچەکانی کوردستان دابڕێتو وای لێ بکرێت کە وەکو شارێکی کوردی نەناسرێتەوە، وانیشان بدرێت کە شارێکی فرە نەتەوەییە، ئەمەیش بەزەقی دیارە هەر لەسەردەمی عوسمانییەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستا. هەر ئەمەیش وای کردووە کە لە کاتی رێککەوتننامەکانی گەلی کورد لەگەڵ حکومەتدا هەولدراوە کە ئەم ناوچەیە لە بەڕێوەبەریەتییەکانی ناوچە کوردییەکان جیا بکرێتەوە.

٣. هەولدراوە هێڵێکی بەڕێوەبردن لەنێوان ناوچەکانی کەرکوكو ناوچە کوردنشینەکان دروستبکرێت بۆ دابراندنی لەکوردستانو وابکرێت بە ئاسانی دەست بەسەریدا بگیرێت، ئەمەش بەزەقی دیارە لەدابراندنی ناوچەکانی لەدوای ساڵانی (١٩٥٧)ەوە کەخرانە سەر پارێزگاکانی دەورووبەری وەکو پارێزگای سەلاحەدینو دیالەو سلێمانیو هەولێر.

٤. هەولدان بۆ هێنانی کارمەندی کارە بەڕێوەبەریەتییەکان لەجێگای کارمەندی بەڕێوەبردنی کورد، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانن، دەست بەسەر کارە بەڕێوەبەریەتییەکانی پارێزگاکەدا بگرن، وەکو هێنانی عەرەب لە جێگایاندا.

٥. هەولدان بۆ فەوتاندنی هەموو ئەو دەستنوسو لێکۆڵینەوە کارگێڕیو بەڕێوەبەریەتییانەی کە لەپارێزگاکەدا باوبووە، بۆ ئەوەی زنجیرەی راستی کارە بەڕێوەبەریەتییەکان بشێوێنرێت، نەتوانرێت نەوەکانی ئەم سەردەمە پەی بە راستییەکان بەرێت.

٦. دارێژانی کارە بەڕێوەبەریەتییەکان لە پارێزگاکە هیچ کاتێك حیسابی دانیشتووانو شوێنو ئایینی بۆ نەکراوە.

*** ناوی نوێنەرانی کەرکوك لە یەکەم پەرلەمانی هەڵبژێردراوی کوردستان لە ساڵی (١٩٩٢)دا:**

١. جەوهەر نامیق سالم.
٢. فەوزییە عیزەدین رەشید.
٣. گەلاوێژ عەبدولجەبار جەباری.
٤. سیروان کاکەیی.
٥. شەفیق ئەمین.
٦. جەلال جەوهەر عەزیز.
٧. حەسەن حەمید (مام رۆستەم).
٨. د. ناسح غەفور.
٩. عەلی عەبدوڵڵا.
١٠. سەلاحەدین عەبدولحەمید.
١١. مەلا محەمەد ئەمین چەمچەماڵی.
١٢. جەوهەر ئەحمەد شاواز.
١٣. مەلا شاخی.
١٤. شالاو عەلی عەسکەری.
١٥. شێخ یەحیا محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی.
١٦. عەبدولخالق محەمەد رەشید زەنگەنە.
١٧. بورهان عەلی جاف.
١٨. مەلا محەمەد تاهیر محەمەد زەینولعابدین.
١٩. حەسەن حوسێنی بەفری.
٢٠. فەلەکەدین سابیر کاکەیی.
٢١. سەلاحەدین ئیبراهیم دەلۆ.
٢٢. د. حەمە نەجم حەمە فەرەج جاف.
٢٣. یونادم یوسف کنا.

**ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ی کوردستان**

| پارێزگا | ناوەند | ژمارەی دەنگی پارێزگا | ژمارەی دەنگی دراو |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٥٦ | ٤٥٠٠٠٠ | ٣٤٩١٦٤ |
| دهۆك | ٤٢ | ١٧٨٠٠٠ | ١٣٥٨٢٧ |
| هەولێر | ٦٢ | ٣٤٠٠٠٠ | ١٩٣٣٥٢ |
| کەرکووك | ١٦ | ١٤٤٠٠٠ | ٨٨٦١٠ |
| سەرجەم | ١٧٠ | ١١١٢٠٠٠ | ٩٧١٩٥٣ |

| پارێزگا | پارتی دیموکراتی | پاسۆك و سۆشیالیست | یەکێتی و زەحمەتکێشان | پارتی گەل | حیزبی شیوعی | دیموکراتخوازان | ئیسلامی | دەنگی نەژمێردراو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دهۆك | ١٦٨٦٨٣ | ١٩٨٣ | ١٥١٨٤ | ٦٠٥١ | ١٥٤٦ | ٤٩ | ٣٨٧٤ | ٩٨٢ |
| هەولێر | ١٥٢١٤٣ | ٨٨٨٣ | ١٤٨٣٥٢ | ٢١٠١ | ١١٤٠٧ | ١٨٤ | ١١٠٩٢ | ٧٠٢٥ |
| کەرکووك | ٢٤٦٠٤ | ٢٠٣٨ | ٥٣١٢٩ | ٦٣٣ | ٢٨٣٧ | ٥٥ | ٤٨٠٨ | ٥٠٦ |
| سلێمانی | ٩٢٤٤٩ | ١١٩٧٨ | ٢٠٧١٦٧ | ١١١٨ | ٥٦٩٣ | ٢١٣ | ٢٩٣٣٤ | ١٢١١ |
| سەرجەم | ٤٣٧٨٨٩ | ٢٤٨٨٢ | ٤٢٣٨٣٣ | ٩٩٠٣ | ٢١١٢٣ | ٥٠١ | ٤٩١٠٨ | ٤٧٢٤ |
| رێژەی٪ | ٤٥,٠٥ | ٢,٥٦ | ٤٣,٦١ | ١,٠٢ | ٢,٠٧ | ٠,٠٥ | ٥,٠٥ | ٠,٤٩ |

*** پرۆسەی ڕزگارکردنی کەرکوك**

یەکێك لەو دەسکەوتە خێرایانەی کە لە عێراقدا ڕوویاندا، پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق لە دەستی ڕژێمی بەعس و ڕووخاندنی ڕژێمەکەی سەدام حوسێن بوو کە لە گەڵ خۆیدا سوپای ئەمریکاو هاوپەیمانەکان بەبەرنامەیەکی ڕێکوپێك توانیان هەموو بنەماکانی دەوڵەتی بەعس لەعێراقدا هەرەس بهێنێت.

ڕزگارکردنی کەرکوك لە ٢٠٠٣/٤/٩ خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ داڕووخاندنی هەموو بنەماکانی بەعس لەو شارەداو بەرچاوبڕینی دەوڵەتەکانی دەوروبەروو هێزە سیاسیە ناوخۆییەکان لەبەرامبەر ئەم شارەدا، وای کرد شارەکەی خستە سەر ململانێیەکی گەورەی سیاسی و کەوتە بەر هەنگاوێکی قەبەو بەربەرەکانی لەنێوان خواستی نەتەوەکانی ئەم شارەدا لەلایەك و هەنگاوەکانی هەڵبژاردنی پارێزگارو ئەنجومەنی پارێزگاو دابەشکردنی بەڕێوەبەری دام و دەزگا حکومییەکانی شارەکەو پرۆسەی دارشتنەوەی دەستوری بەڕێوەبردنی کاتی عێراق و هەڵبژاردن و دووبارە دارشتنەوەی حکومەت و هەنگاوەکانی نووسینەوەی دەستوری بەردەوامی عێراق لەلایەکی تر کەرکوك بوو بە یەکێك لەکێشە سەرەکییەکانی بەربەرەکانی پۆستەکان و یەکە کارگێرییەکان لەنێوان کوردو شیعەو سوننە یەکێکە لەوکێشانەی کە تاکو ئێستاکە بەکراوەیی ماوەتەو پێویست بەوە دەکات هەوڵی جدی بدرێت بۆ یەکلا کردنەوەی هەموو کێشەکانی لەبارێکی هاوسەنگ و ڕێکوپێکدا. لەماوەی ساڵێکی ڕزگارکردنی عێراقدا، گەلێك گۆڕانی خێرا بەسەر عێراقدا هات کەخۆی بینیەوە لەدروست کردنی حکومەتێکی کاتی لەعێراقداو دامەزراندنی وەزارەتەکان و پۆستە وزارییەکانی عێراق، ئەویش هەوڵدان بۆ ڕێکخستنەوەی عێراقی ڕووخاو و خاوەن کێشە کە لەگەڵ خۆیدا لەماوەی فەرمانڕەوایی عێراق هەڵبژاردن و دەستوری کاتی عێراقی لێکەوتەوە هەرچەندە کەموکوری و کێشەکانی زۆری لەبارێکی نەگۆڕاو مایەوەو یەکێك لەوانە کێشەی کەرکوك بوو کەر زۆر بە ناعەدالەتەوە مامەڵەی لەگەڵ کراو هەردەم بەرەو ئالۆزی و چارەسەنەکردن ڕۆیشتووە.

*** هەڵبژاردنی پارێزگارو ئەنجومەنی پارێزگا**

بەسەرپەرشتی هێزی هاوپەیمانان ئەنجومەنی پارێزگا پێکهات کە میکاینزمەکەی لە کۆی (٣٩) نوێنەری کورد کە لەئەندامی لایەنە سیاسیە جیا جیاکانی کوردستان پێکهاتبوو، شەش ئەندامی ئەنجومەنی کورد هەڵبژێردرا.

لەکۆی (٣٩) نوێنەری تورکمان کە لەئەندامانی لایەنە سیاسیە جیا جیاکانی تورکمان پێکهاتبوو، شەش ئەندامی تورکمان هەڵبژێردرا.

لەکۆی (٣٩) نوێنەری عەرەب کە لەکەسایەتی و نوێنەرانی هۆزەکانی عەرەب پێکهاتبوو، شەش ئەندامی عەرەب هەڵبژێردرا.

لەکۆی (٣٩) نوێنەری (کلدو ئاشووری) کە لەنوێنەری لایەنە سیاسییەکان و کەسایەتییەکانی کلدو ئاشوور، پێکهاتبوو، شەش ئەندام هەڵبژێردرا.

لەکۆی (١٤٤) نوێنەری بێ لایەنی کورد، عەرەب، تورکمان، کلدو ئاشوور، شەش ئەندامی بێ لایەن هەڵبژێردرا، واتا ئەنجومەن بووە (٣٠) ئەندام، ئینجا پارێزگارو جێگری پارێزگار هەڵبژێردرا، ئەنجومەنەکە مایەوە بە (٢٨) ئەندام.

دواتر نوێنەرانی قەزاو ناحییەکانی کەرکوکی خرایە سەری و ئەنجومەن بووە (٤٠) کەس، لەناو ئەم (٤٠) ئەندامە، ڕێژەی نەتەوەکان بەم جۆرە بوو: (کورد ١٣ ئەندام)، (عەرەب ١٠ ئەندام)، (تورکمان ١٠ ئەندام)، (کلدوئاشوور ٧ ئەندام).

پێش ئەم پرۆسەیە ئەنجومەنی پارێزگا (٢٤) کەس بوو کە پێکهاتبوو لەشەش کورد (سێ یەکێتی، ٢ پارتی، یەك شیوعی) و شەش تورکمان (حیزب الاتحاد الوطني، حیزب الاخاء الترکماني، الجبهة الترکمانية، الاتحاد الاسلامي الترکماني، حرکة الوفاق الترکماني، حیزب الشعب الترکماني) و شەش عەرەب (سێ عوبێدی، سێ جبوری) و شەش کلدو ئاشووری و چوار بێ لایەن، دوو ئەندامی حرکة دیمقراطي الاشوري).

*** ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بەم شێوەیە بوو:**

لە یەکەم پرۆسەی هەڵبژاردن بەم شێوەیە بوو کەشەش ئەندام بوو:

(ڕزگار عەلی حەمەجان)، (گەلاوێژ عەبدولجەبار)، (ئەحمەد عەبدوڵلا ڕەزا)، (کەمال کەرکوکی)، (نیزامەدین گلی)، (فەرهاد -حیزبی شیوعی).

لەپرۆسەی دووەم ئەندامەکانی بەم جۆرە بووە:

(ڕزگار عەلی)، (ئەحمەد عبدوڵلا ڕەزا)، (پیرۆت تاڵەبانی)، (کەمال کەرکوکی)، (محەمەد کەماڵ)، (نیزامەدین گلی).

ئەندامانی کورد لە گروپی بێ لایەن:

(عەلی ساڵەیی)، (هەوری تاڵەبانی)، (مەلا مستەفا)، (حەسیب ڕۆژ بەیانی)، (فوئاد حەقی)، (عەبدولرحمان مستەفا).

ئەندامانی کورد لەئەنجومەنی پارێزگا پاش هاتنە سەری نوێنەری قەزاو ناحییەکان بووە (١٣) ئەندام بەم جۆرە:

(ڕزگار عەلی)، (ئەحمەد عەبدوڵلا)، (پیرۆت تاڵەبانی)، (کەمال کەرکوکی)، (محەمەد کەماڵ)، (حەسیب ڕۆژبەیانی)، (مەلا مەستەفا)، (هەوری تاڵەبانی)، (مامەند کەریم)، (شێرزاد عەلی)، (عەلی ساڵەیی)، (عەبدولعەزیز ئەحمەد)، (ئیحسان عەلی)

*** یاسای بەڕێوەبردنی کاتی دەوڵەتی عێراق**

لەدوای پرۆسەی ڕزگار کردنی عێراق و دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق، بۆ یەکەم جار یاسای بەڕێوەبردنی کاتی بڵاو کرایەوە دەربارەی دەوڵەتی عێراق، کە لەلایەن

ئەو ئەنجومەنەی دەوڵەتی عێراقەوە دانرا كە هەموو چین‌و توێژەكانی حیزب‌و ڕێكخراوە عێراقییەكانی تێدا بەشدار بوو.
یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق، هەرچەندە بێ كەم‌و كورتی نەبوو بەڵام هەنگاوێكی چاك بوو بۆ دارشتنەوەی دوا رۆژی نووسینەوەی دەستوری بەردەوامی دەوڵەتی عێراق.
ئەم یاسایە پێكهاتووە لە نۆ (باب - دەرگا) بەم شێوەیە:
الباب الاول (المبادئ الاساسية): كە پێكهاتووە لە (٩) مادەی یاساكە.
الباب الثاني (الحقوق الاساسية): كە پێكهاتووە لە (١٢) مادەی یاساكە.
الباب الثالث (الحكومة العراقية الانتقالية): كە پێكهاتووە لە (٦) مادەی یاساكە.
الباب الرابع (السلطة التشريعية الانتقالية): كە پێكهاتووە لە (٥) مادەی یاساكە.
الباب الخامس (السلطة التنفيذية الانتقالية): كە پێكهاتووە لە (٨) مادەی یاساكە.
الباب السادس (السلطة القضائية الاتحادية): كە پێكهاتووە لە (٥) مادەی یاساكە.
الباب السابع (المحكمة المختصة والهيئات): كە پێكهاتووە لە (٤) مادەی یاساكە.
الباب الثامن (الاقاليم والمحافظات والبلديات والهيئات المحلية): كە پێكهاتووە لە (٤) مادەی یاساكە.
الباب التاسع (المرحلة مابعد الانتقالية): كە پێكهاتووە لە (٣) مادەی یاساكە.
ئەوەی لێردا گرنگە كە ئاماژەی پێ بكەم دەرچوونی ئەم یاسایە لەقۆناغێكدا بڵاوكراوەتەوە كە بنەماكانی دەوڵەتی رابردووی عێراق بەتەواوی هەڵوەشایەوە، دووبارە دارشتنەوەی عێراق لەسەر بنەمایەكی دیارو بەرچاوو لەسەر پەیرەوێكی دیموكراتی‌و فیدراڵی پێویستی بەگەلێك ئامانج‌و بۆچوون‌و بەربەرەكانی سیاسی هەیە تا بەوەی بگەینە ئەنجامێكی نەگۆڕو پتەو بۆ دوا رۆژی ئەم دەوڵەتی عێراقە بۆیە هەنگاوەكانی دارشتنەوەی یاساو دەستوور لەهەر وڵاتێكدا پێویستی بەبەربەركانییەكی گەورە هەیە بۆ دووبارە ڕێكخستنەوەی.
كەركوك یەكێكە لەو كێشانەی كەلەم یاسایەی كاتی عێراقدا تارادەیەك بەهەڵپەسراوی مایەوەو لەچەند خاڵێكدا خۆی بینیووە تا چارەسەر بكرێت كە ئامانجی جێبەجێ كردنەكان تا ئەوەی پێش هەڵبژاردن (تطبيع) بكرێت‌و خاڵەكانی نێو یاساكە بەرجەستە بكرێت، هەرچەندە جێبەجێ كردنی ئەو خاڵانە لەخۆیدا هەنگاوێكی چاك بوو ئەگەر جێبەجێ بكرایە بۆیە لەمەو دوا هەوڵی تاوتوێ كردنی برگەكانی هەریەكەی دەدەم تا بگەینە لاینە چاك‌و خراپەكانی خاڵی یاساكە.
ئەوەی زیاتر كێشەی بەڕێوەبردن‌و كارگێڕی چڕ كردۆوتەوە، لە (باب)ی هەشتەمی (الأقليم والمحافظات والبلديات والهيئات المحلية) كە خۆی دەبینێتەوە:
لەمادەی پەنجاو سێ دا هاتووە بەم جۆرە:
(ا) (يعترف بحكومة اقليم كوردستان بصفتها الحكومة الرسمية للأراضي التي كانت تدار من قبل الحكومة المذكورة في ١٩ آذار ٢٠٠٣ الواقعة في المحافظات دهوك، اربيل، السليمانية، كركوك، ديالى، نينوى).
ئەوەی لەم برگەیەدا بەدەر دەكەوێت ئەو پارچانەی كەركووكە كە لە ساڵی (١٩٩١)ەوە رزگار كراوە سەر بە حكومەتی هەرێمی كوردستانە وەكو خۆی دەمێنێتەوە، كەركوكیش بەشێكی بەر هەرێمی كوردستان دەكەوێت وەكو (چەمچەماڵ، كفری، كەلار، دەربەندیخان).
(ب) (تبقى حدود المحافظات الثمانية عشرة بدون تبديل خلال المرحلة الانتقالية).
هەر بۆیە كەركوكیش ئەوەی لەژێر دەستی حكومەتدا بووە لەو (فقرە)ی (ج)دا بەم جۆرە هاتووە:
(ج) (يحق للمحافظات خارج اقليم كوردستان، فيما عدا (بغداد) و (كركوك)، تشكيل اقليم فيما بينها وللحكومة العراقية المؤقتة ان تقترح آليات لتشكيل هذا الاقاليم، عليها ان تطرح على الجمعية الوطنية المنتخبة للنظر فيها واقرارها، يجب الحصول بالاضافة الى موافقة الجمعية الوطنية على أي تشريع خاص بتشكيل اقليم جديد على موافقة اهالي المحافظات المعنية بواسطة استفتاء).
ئەم برگەیەش خۆی لەخۆیدا هێشتنەوەی (كەركوكە) لە چوارچێوەیەكی دیاری كراو بۆ ئەوەی ئاسایی كردنەوەی ئەم شارە جێبەجێ بكرێت ئینجا بڕیاری دوایی بدرێت لەچوارچێوەی چارە نووسی لەلایەن خەڵكەكەوە.
لە برگەی (٢)ی ئەم مادەیەدا مافی كەمە نەتەوەكانی ئەم پارێزگایانە دەسەلمێنێت كە كەركوكیش یەكێكە لەو ناوچانە:
(يضمن هذا القانون الحقوق الادارية والثقافية والسياسية للتركمان والكلدو آشوريين والمواطنين الآخرين كافة).

لە مادەی پەنجاو هەشتدا كێشەی كەركوك لەچوار خاڵدا چڕ كراوەتەوەو دارێژراوە:
(ا) (تقوم الحكومة العراقية الانتقالية ولاسيما الهيئة العليا لحل النزاعات الملكية العقارية وغيرها من الجهات ذات العلاقة، وعلى وجه السرعة، بأتخاذ التدابير، من اجل رفع الظلم الذي سببته ممارسات النظام السابق والمتمثلة بتغير الوضع السكاني لمناطق معينة من ضمنها كركوك، من خلال ترحيل ونفي الافراد من اماكن سكناهم، ومن خلال الهجرة القسرية من داخل المنطقة وخارجها، وتوطين الافراد الغرباء عن المنطقة، وحرمان السكان من العمل ومن خلال تصحيح القومية ولمعاجة هذا الظلم على الحكومة الانتقالية العراقية اتخاذ الخطوات التالية:
١. فيما يتعلق بالمقيمين المرحلين والمنفيين والمهجرين والمهاجرين، وانسجاماً مع قانون الهيئة العليا لحل النزاعات الملكية العقارية، الاجراءات القانونية الاخرى، على الحكومة القيام خلال فترة معقولة، بأعادة المقيمين الى منازلهم وممتلكاتهم. واذا تعذر ذلك على الحكومة تعويضهم تعويضاً عادلاً.
٢. بشأن الافراد الذين تم نقلهم الى مناطق وارض معينه، وعلى

الحكومة البث في امرهم حسب المادة (١٠) من قانون الهيئه العليا لحل النزاعات الملكية العقاريه، لضمان امكانية اعادة توطينهم، او لضمان امكانية تلقي تعويضات من الدولة، او امكانية تسلمهم لأراضي جديدة من الدولة قرب مقر اقامتهم في المحافظة التي قدموا منها، او امكانية تلقيهم تعويضاً عن تكاليف انتقالهم الى تلك المناطق.

٣. بخصوص الاشخاص الذين حرموا من التوظيف او من وسائل معيشية أخرى لغرض اجبارهم على الهجرة من اماكن اقامتهم في الاقاليم والأراضي، على الحكومة ان تشجع توفير فرص عمل جديدة لهم في تلك المناطق والأراضي.

٤. اما بخصوص تصحيح القومية فعلى الحكومة الغاء جميع القرارات ذات الصلة، والسماح للاشخاص المتضررين بالحق في تقرير هويتهم الوطنية وانتمائهم العرقي بدون اكراه او ضغط.

(ب) (لقد تلاعب النظام السابق ايضاً بالحدود الادارية وغيرها بغية تحقيق اهداف سياسيية، على الرئاسة والحكومة العراقية الانتقالية تقديم التوصيات الى الجمعية الوطنية وذلك لمعالجة تلك التغييرات غير العادلة، وفي حالة عدم تمكن الرئاسة من الموافقة بالاجماع على مجموعة من التوصيات، فعلى المجلس الرئاسة القيام بتعيين محكم محايد وبالاجماع لغرض دراسة الموضوع وتقديم التوصيات، وفي حالة عدم قدرة مجلس الرئاسة على الموافقة على محكم، فعلي المجلس الرئاسة ان يطلب من الامين العام للامم المتحده تعيين شخصية دولية مرموقه للقيام بالتحكيم المطلوب).

(ج) (تؤجل التسوية النهائية للأراضي المتنازع عليها، ومن ضمنها كركوك، الى حين استكمال الاجراءات اعلاه، واجراء إحصاء سكاني عادل وشفاف، والى حين المصادقه على الدستور الدائم، يجب ان تتم هذه التسوية بشكل يتفق مع مبادئ العدالة، اخذاً بنظر الاعتبار اراده سكان تلك الأراضي).

*** هەڵسەنگاندنێکی یاساکە:**

١. ئەگەر بچینە نێو ناخی یاساکە، ئەوەی کە هاوپەیوەستە بەکەرکوك، بێ بەش نییە لەکەمو کوڕیو تارادەیەك خۆی دەبینێتەوە لەهەندێك لایەنی تەمو مژو لێڵی لە جێبەجێ کردنی بەرنامەیەکی ڕوون، یەکێك لەو چەوتییانەی کە هەر بەوشێوەیەی دوور لەکاری حکومەت مایەوەو نەتوانرا هەنگاوی پێویستی بۆ بنێردرێت کە هاو گونجاوبێت لەگەڵ خواستەکان.

٢. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت لەمادەی (٥٨)، ئەوەیە کە ووردەکاری جێبەجێ کردنی برگەکانی دیاری نەکراوە، ڕوون نییە لە ووردەکارییەکانی برگەکانی بۆ کاتو شوێنو ماوەی جێبەجێ کردنەکە.

٣. مادەی (٥٨) خۆی لەخۆیدا دانپێنانە بەوەی کە حکومەتی بەعس هەستاوە بەکاری بەعەرەب کردنو تالآنیو کۆکوژییو ئەنفال خۆی لە خۆیدا بەرنامەیەکە بۆ دارشتنەوەی گەرانەوەی کەرکوك بۆ پێش پرۆسەی تەعریب.

٤. هەروەها مادەی (٥٨) دانپیانانێکی ناراستەوخۆیە بەکوردستانی بوونی کەرکوك ئەویش لەچوار چێوەی ئەوەی کە یەکێك لەو شارانەی کە پرۆسەی بەعەرەب کردنی تێدا کراوەو کوردو تورکمان لە شارەکە دەرکراوەو ڕێژەی عەرەب زیادکراوە، ئەمیش لەو قۆناغە خۆی دەبینێتەوە کە هەوڵدان بووە بۆ سرینەوەی تایبەت مەندی شارێك کە پێکهاتەکەی لە کوردستانو ژمارەی کوردو تورکمانی لەڕابردوودا زیاد بووە.

٥. (ئەرتیکلەکە – مادە) ئاماژە بەهەوڵی گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچەی دیاریکراوو کەرکوك دەکات، ئاماژە بەنارەوایەتییەکانی سەردەمی ڕژیمی بەعس دەکاتو ئاماژە دەکات بەدیاردەی نارەوای وەکو ڕاگواستن، دەرکردن، کارلێسەندنەو، جێنیشکردنی خەڵکی بێگانە بەناوچەکەو ڕاستکردنەوەی ناسنامەی نەتەوە. دەبێ تێبینی ئەوە بکەین، کەوا ئەو ئەرتیکلە تەنها دەیەوێت چارەسەری ئەو تاوانکارییانە بکات کە لەسەردەمی بەعسدا ڕوویانداوە، واتە ئەو بەعارەبکردنەی پێشی هاتنی ئەوان ڕوویانداوە جێگای خۆیان گرتو تێپەڕین باس ناکات.

٦. (خاڵی یەکی برگەی (ا)، ئاماژە بەچۆنیەتی چارەسەری کێشەی خاوەنداریەتی دەکاتو دەڵێ دەبێ تەبابێت لەگەڵ کۆنیسیۆنی خاوەنداریەتی خانوو زەوی، پێوەری دیکەو گونجاو لەگەڵ یاسا ئەوانە چینو واتایان چییەو ئەوپێوەرانە چین؟ دەکرێ کێشەی زۆر هەڵگرێتو لێکدانەوەی جودا هەبن، ئەگەر چارەسەری گونجاو نەدۆزرایەوە ئەوا دەبێ زیانلێکەوتووان قەرەبوو بکرێنەوە وەکو ڕۆژانە دەبیستین، ئەو کوردانەی گەراونەتەوە لە خراپترین باردا ژیان بەسەر دەبەنو زەویشیان بەتاپۆوە نەدراوەتێ. بەغدا جووڵەی نییەو بەدەنگ داواکاریی کوردەکانی ئەنجومەنی کەرکوکەوە نەهاتووە.

٧. (خاڵی دوو، هێما بۆ گەرانەوەی ئەوانە دەکات کە لەناوچەی دیکەوە هێنراون لەو ناوچانە نیشتەجێکراون. ئەوەش دەبێ تەبابێت لەگەڵ ئەرتیکلی ١٠ و مافەکانی هاووڵاتیان کە لەبەشەکەدا هاتووە ئەو خاڵە ناڵێ کێن ئەوانەی هاتوونو وەکو عارەب ناویان نابات، واتە ناڵێت ئەو عارەبانەی بەهۆی پرۆسەی بەعارەبکردنەوە هێنراونەتە ئێرە دەبێ بگەرێنەوە شوێنی پێشوویان. لێرەدا هەوڵدراوە ناوی عارەبان لەکەدار نەکەن. ئەو خاڵە دەڵێت دەبێ ئەو چارەسەرە لەگەڵ (ئەرتیکلی) ١٠ تەبا بێت، ئەوە دەکرێ کێشە بۆ چارەسەر دروست بکات، چونکە ئەوە هاتووە کە دەبێ ڕێزی مافەکانی عێراقیان بگیرێت کە لەبەشەکەدا هاتووە).

*** هەڵبژاردنی عێراقو پرۆسەی ئاسایی کردنەوەی کەرکوك**

یەکێك لەئامانجەکانی یاسای کاتی بەرێوەبردنی دەوڵەت، کاری هەڵبژاردنو دروست بوونی حکومەتێکی کاتی، تا کاربکات بۆ نووسینەوەی دەستوری بەردەوامی عێراق، تا هەموو چینو توێژەکانی عێراق بەشداری دارشتنەوەی دەستوور بکەن.

هەڵبژاردن لەعێراقدا بەئەنجام درا، هەر چەندە گەلێك کەمو کوڕی هەبوو، هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵی عێراقی

بەشدارییان تێدا نەکرد، بەڵام توانرا هەڵبژاردن بەئەنجام بگەیەنرێتو ڕێگایەك بکرێتەوە بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەی حکومەتی کاتی عێراق کە ئامانجەکانی دەستوور تاوتوێ بکات.

هەڵبژاردن هەر لەسەرەتاوە گەلێك ئاستەنگی هاتە پێش کە خەڵکی عێراق بووە دوو بەشەوە بەشێکی بانگەوازی هەڵبژاردنی دەکرد بەشێکیش هەوڵی دواخستنی هەڵبژاردنی دەدا. کە ئەم بەربەرەکانیە کاتێکی درەنگی خایاندا، هەر چەندە کە کەموکورییەکان هەبوو بەڵام هەڵبژاردن لەوادەی خۆیدا کرا.

کەرکوك یەکێك بوو لەو شارانەی کە پرۆسەی هەڵبژاردن گەلێك ئاستەنگو کێشە هاتە بەردەمی، کە هەوڵەکان هەمووی بۆ ئەوە بوون تاوەکو کێشە بێتە بەردەم هەڵبژاردنو نەتوانرێت چینو توێژەکان بەشداری تێدا بکەن بەبارێکی ڕاست، ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەو کێشانەی کە دەستەی هەڵبژاردن دروستیان کرد کە لە کۆنە بەعسییەکانی شارەکە بوون سەرئەنجام دوای هەوڵو کۆششی زۆری حیزبە کوردستانییەکان لەکەرکوك، بەتایبەتی مەڵبەندی دووی ڕێکخستنی کەرکوك (ی. ن. ك) و لقی سێی پارتیو گروپی کوردی لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوکو لیژنەی هەڵبژاردن لە کوردستانو هەڤاڵانی بەغدا بەتایبەتی بەڕێزان (د. بەرهەم) و (سەعدون فەیلی). دوای دانوستاندنێکی زۆر لەنێوان سەرکردایەتی سیاسی کوردو لایەنەکانی تر، کە دواجاریان سەردانی وەفدی سەرکردایەتی سیاسی کورد بوو بەسەرۆکایەتی بەڕێز مام جەلالو ئەندامێتی کاك نێچیرڤان بارزانیو ژمارەیەکی تر. وەفدەکە توانی چەندین گرەنتی یاساییو سیاسی لەلایەن سەرۆك کۆماری عێراقو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە ئێراقو سەرۆکایەتی پەرلەمانی ئێراق بە دەست بهێنی، حکومەتی بەریتانیاو ئەمریکا پشتگیری خۆیان نواند دەربارەی حکومەتی عێراق بۆ دانانی لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی (حەمید مەجید موسا) بۆ چارەسەکردنی کێشەی مادەی (٥٨) لە دەستوری کاتی عێراقدا.

دەستەبەر کردنی ئەم گرەنتیانە بووە هۆی ئەوەی پەرلەمانی کوردستان لە (٢٠٠٥/١/١٥)و بەئامادەبوونی بەڕێزان (مام جەلال) و (کاك مسعود بارزانی)و زۆربەی هەرە زۆری حیزبو ڕێکخراوە کوردستانییەکان، بڕیاریان دا لەکەرکوك بەشداری هەڵبژاردن بکەین. لەئەنجامی دەستەبەر کردنی ژمارەیەك گرەنتی سیاسیو قانونی لەئاستی ئێراقو نێو دەوڵەتیو لەئەنجامدا بڕیاری پەرلەمانی کوردستانو حیزبو ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان لەکەرکوکو ژمارەیەك حیزبی تورکمانو کلدو ئاشووریو ژمارەیەك لە کۆمەڵی عەرەبیو کەسایەتی لە کەرکوك، بڕیاریاندا بەناوی لیستی برایەتی کەرکوك بچنە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.

سەرەتا کێشەکان تەنیا کێشەی سیاسیو یاسایی بوو لەمەسەلەی هەڵبژاردن لەکەرکوك، بەڵام بەهۆی گوێ نەدانی خۆمان وەکو کوردو بەهەند وەرنەگرتنی بوونو ڕۆڵی کورد لەکۆمسیۆنی هەڵبراردنی ئازاد لەبەغداو کۆمیسیۆنی کەرکوك ئەمە وایکرد هەندێ لایەنو نەتەوە هەڵپەو دزە بکەن بۆ ئەو جێگایانەو ئەنجام زیاد لەقەوارەی نەتەوەییو سیاسی خۆیان شوێنیان داگیر کرد لە کۆمیسیۆنەکانی بەغداو کەرکوك لەسەرەتای دروست بوونی لیژنەی باڵای هەڵبژاردنی ئازاد لەبەغدا یەکێك بەناوی (د. موکەرەم) دانرابوو لەسەر حیسابی کورد، بۆ سەرپەشتی لیژنەی هەڵبژاردن لە کەرکوك، دوای ئەوەی لە (ئوردن) دەورەکەشی بینی، ئەوسا لە ترسانا وازیهێناو سازشی لەسەر ئەو شوێنە کرد.

کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی ئازاد لە بەغدا وورد نەبوون لەپێکهێنانی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لەکەرکوك، پێوانەی کێشەکانی سیاسیو نەتەوەییو مەزهەبی کەرکوکیان نەکردبوو، وەك خۆی، کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لەناوەند ڕێگەی دا بەژمارەیەك لێپرسراوی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لەکەرکوك بگرنە ئەستۆ، کە مەرجی ئەندامێتی هەڵبژاردنیان تێدا نەبوو، چونکە چەند کەسێکیان هەم ڕابردوویان باش نەبوو و هەم بێلایەنیش نەبوون.

نووسینگەی کەرکوك لە (٣٥) کەس پێکهاتبوو، کە (١٥) کەسیان عەرەبو (١٦) کەسیان تورکمانو (١) مەسیحیو (٣) کەسی کورد. دوای نەمانی (یەحیا عاسی ئەلحەدیدی)، بەڕێوەبەری کۆمیسیۆنی کەرکوك، ژمارەی کۆمیسیۆنی کەرکوك بوو بە (٣٧) کەس، (١٦) تورکمان، (١٥) عەرەب، ٢ کەس مەسیحی، (٤) کورد کە ئەمە نارەوایەکی یەکجار گەورە بوو بە حەقی کورد. ژمارەی دانیشتووانی هەموو تورکمان بە هەڵسەنگاندنی ئێمە لە سنووری هەموو پارێزگای کەرکوك تێناپەڕی لەسەدو پەنجا هەزار کەس، ماف ئەوەی هەبێ لەکۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لە کەرکوك (١٦) کەس بێت، بەڵام ژمارەی دانیشتووانی کورد لەهەموو سنووری پارێزگای کەرکوك کەمتر نییە لەچوار سەدو پەنجا هەزار کەس کە تەنها چوار کەسی بۆ دانرابوو کە ئەمە سەرەتای هەموو ناحەقییەکان بوو.

پێکهاتەی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لە کەرکوك، لەسەر دەستی بەرەی تورکمانی پێکهاتو دامەزرا. بەتایبەتی دوایی دەست لەکار کێشانەوەی (د. موکەرەم)، کە بووە هۆی ئەوەی (عیزەددین محەمەد شەفیق) کە یەکێکە لەو (٧) ئەندامەی ئەنجومەنی باڵای هەڵبژاردن لەبەغدا، کە پیاوێکی ڕەگەز پەرستی تورکمانە کە دەبێتە تەنیا دەسەلات بۆ پێکهێنانی کۆمیسیۆنی کەرکوك، ئەویش (عیزەددین) کۆمیسیۆنی کەرکوك لەمەکتەبی ماف مرۆڤەکەی خۆی دروست کرد لەسەر دەستی (عیزەددین محەمەد شەفیق)، ژمارەیەك تورکمان دانران کە هەموویان سەر بەبەرەی تورکمانی عێراق بوون کە ئەمانەیە ناوەکانیان.

١. محەمەد سەمەد زەینەڵ (م. مەخزەن).
٢. محەمەد سوبحی ئیسماعیل (م. مەخزەن).
٣. نیهاد ئەکبەر شوکر (م. تدریب).
٤. عەلی عەبوش (م. تدریب).

ئەمە پیلانی یەکەم بوو دژی کوردو لیستی برایەتی کەرکوك، لەکۆمسیۆنی هەڵبژاردن لەکەرکوکەوە پیلانی دووەم هەر بەفیتی (عزەددین)و (یەحیا عاسی ئەلحەدید)، دیسکی

مانگی (٦)ی (٢٠٠٤)یان بەبنەڕەتی سەرژمێری کەرکوك، کە بەو پێیە، زیاتر لەسەدو حەفتا هەزار دەنگدەر بێ بەش بوونو بەشی هەرەزۆری کورد بوون، دوای هەوڵو کۆششی زۆری لایەنە سیاسییەکان لەکەرکوك، بەتایبەتی (ی. ن. ك)و (پ. د. ك)و تەدەخول کردنی سەرکردایەتی ئەوە بوو کۆمسیونی هەڵبژاردن لەبەغدا ڕێگە چارەی بۆ ئەم کێشەیە دۆزیەوەو تا ڕادەیەك.

پیلانی سێیەم، ئەوە بوو، کۆمسیونی هەڵبژاردن لە کەرکوك نەخشەیەکی تریان دانا، بۆ بێبەش کردنی ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان لەدەنگدان، ئەویش ئەوەبوو، ناحیەی شوان، قەرەهەنجیر، سەرگەران، لەبنەڕتدا بنکەیان بۆ دیاری نەکردن، جگە لەمەش بنکەکانی ڕەحیماواو ئیسکانو ئازادی، کە ژمارەی دەنگدەریان زۆر زۆر بوو، بۆ ڕەحیماوە تەنها (٨) بنکەیان بۆ دانرابوو لەکاتێکدا بەپێی ژمارەی دەنگدەر دەبوو دوو بەرامبەر بێ، لە هەمان کاتدا، ناوچە عەرەبو تورکمانەکان زیاد لەقەوارەی دەنگدەر ناوەندیان بۆ کردبوونەوە بۆ نموونە لە (تازە) شانزە هەزار دەنگدەری تێدا بوو، (١١) ناوەندیان بۆ کرابۆوە، لە گەڕەکی (تسعین) بەهەمان شێوە زیاد لەقەوارەی دەنگدەرەکان ناوەندیان کردبۆوە بەم شێوەیە ویستیان دەنگدەری کورد بێ بەش بکەن بەهۆی کەمی سندوقی دەنگدان دوای ئەوەی ئەم پیلانەش بەتاڵکرا، ڕێگەدرا ئاوارەکان ناوی خۆیان تۆمار بکەنو بۆ ئەوەی فۆرمی ژمارە (١١)یان داهێنا، بۆ ئەوەی ئەمیش سەرنەگرێ هەستان بەدروستکردنی تەگەرە لەبەردەم ئەوانەی ناوی خۆیان تۆمار دەکرد لەناوەندەکان بۆ نموونە داوای سجلی نفوسی ساڵی (١٩٥٧)یان دەکرد لە کاتێکدا بەشی زۆری سجلی نفوسی کورد گوازراوەتەوە بۆ شارەکانی دیکەی کوردستانو خواروو ناوەڕاستی عێراق کە ئەم پیلانەش سەری نەگرت لەسەر داوای بەرەی تورکمانی، بەتێکرای ئەوانەی دەستیان هەبوو لەپیلانەکە، دەستیان لەکارکێشاوە لە ٢٠٠٥/١/٢٧، کە زانیان ئەم وەرقەیەش سووتاوە، خۆیان پاشگەز بوونەوە.

پاش سەرنەگرتنی هەموو پیلانەکان، ئەمجارەیان لەڕۆژی دابەشکردنی کەلوپەلی هەڵبژاردن لەسەندوقو مەرەکەبو فۆرمی دەنگدانو بەهۆی بەشی لۆجستییەوە ئەو پێداویستیانەیان نەبنارد بۆ ئەو بنکانەی کە تازە کرابوونەوە لە ناوچە کوردییەکان، بەمەبەستی ڕێگە گرتن لەبەشداری خەڵکی ئەو بنکە تازانە، بەرەی تورکمانی هەر بەمانەوە نەوەستان، بەسەدان فەرمانبەری تورکمانی سەر بەبەرەی تورکمانی لە ناوەندەکان دامەزراند لەبەر ئەوەی لە مەکتەب کەرکوك دەسەڵاتیان هەبوو، بۆیە بەشی کوردو عەرەبیان دابوو بەئەندامانی بەرەی تورکمانی.

هەروەها بەرەی تورکمانی هەڵمەتی ڕاگەیاندنی ڕانەگرتو هەتا ڕۆژی هەڵبژاردن بەردەوام بوون، دژایەتی بەرنامەی لیستی برایەتیان دەکرد بەدڕینی لافیتەو بڵاوکراوەکانیان.

* ئەو لایەنانەی بەشداری هەڵبژاردنیان کرد:

| ژ. لیست | ناوی لیست | ژمارەی دەنگ |
|---|---|---|
| ١٣٤ | حيزب الاخاء الوطني العراقي | ٦٣٦ |
| ١٤٦ | تجمع الوحدة الوطنية العراقية | ١,٥٩٠ |
| ١٦٥ | جبهة العمل المشترك الديمقراطي | ١٨١ |
| ١٦٦ | جهة الوطنية لوحدة العراق | ٨٨٠ |
| ١٧٠ | التجمع من اجل الديمقراطية العراقية | ٣٩٠ |
| ١٧٤ | الجبهة العربية الموحدة | ٤,٠٦٤ |
| ١٧٥ | جبهة تركمان العراق | ٧٣,٧٩١ |
| ١٧٧ | حركة القومية للتركمان | ١,٨٥١ |
| ١٧٨ | الإتلاف الاسلامي والتركماني | ١٢,٦٧٨ |
| ١٩٢ | حركة الدعوة الاسلامية | ١,٢٢٠ |
| ٢٠٤ | قائمة الرافدين الوطنية | ١,٥٥٤ |
| ٢٠٩ | حيزب البناء الديموقراطي | ٩١٤ |
| ٢٢٣ | حيزب الاتحاد الديمقراطي الكلداني | ٥٣٦ |
| ٢٤٩ | الحيزب الاسلامي الديمقراطي | ٣٣٣ |
| ٢٦٠ | حيزب الحل الديمقراطي الكردستاني | ٥٥٤ |
| ٢٨٣ | الجماعة الاسلامية الكردستانية/ العراق | ٢،٣٢٥ |
| ٢٨٩ | التجمع الوطني العراقي | ١٢٣٢٩ |
| ٢٩٩ | التجمع الجمهوري العراقي | ٤٣٦٣٥ |
| ٣١١ | كتلة المصالحة والتحرير | ١,١٣٣ |
| ٣١٢ | حيزب الجمهورين الاحرار | ١٣٥ |
| ٣٤٦ | اتحاد بيث نهرين الديمقراطي | ٧٠٨ |
| ٣٥١ | الحيزب الاسلامي العراقي | ٥٩٤ |
| ٣٦٤ | حيزب المحافظين الكردستاني | ١,٥٥٨ |
| ٣٦٧ | قائمة كركوك المتاخية | ٢٣٧٣٠٣ |
| | کۆی گشتی | ٤٠٠٨٩٢ |

لەم (٢٤) لیستە، تەنها (٥) لیستیان دەنگی یاساییان بەدەستهێنا وەكو ئەم خشتەیەی خوارەوە:

| ژ. لیست | ناوی لیست | ژ. دەنگ | ژ. كورسی |
|---|---|---|---|
| ١٧٥ | جبهة التركمان | ٧٣,٧٩١ | ٨ |
| ١٧٨ | الإئتلاف الاسلامي التركماني | ١٢٦٧٩ | ١ |
| ٢٨٩ | التجمع الوطني العراقي | ١٢٣٢٩ | ١ |
| ٢٩٩ | التجمع الجمهوري العراقي | ٤٣,٦٣٥ | ٥ |
| ٣٦٧ | قائمة كركوك المتاخية | ٢٣٧,٣٠٣ | ٢٦ |

*** دەقی نامەكانی د. ئەیاد علاوی و نیگرۆپۆنتی:**

- دەقی نامەكەی نیگرۆپۆنتی:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا

بەغدا، عێراق

١٥ی كانونی دووەم ٢٠٠٥

ئێسكەلەنسی خاوەن سەعادەت:-

وەك ئەنجامی گفتوگۆكانمان لە (١٠)ی كانونی دووەمدا سەبارەت بەنامەكەی (٩)ی كانونی دووەمی سەرۆك وەزیر عەلاوی دەربارەی (وەزعی) باردودۆخی كەركوك، رێم بدە باپشتگیری ویلایەتە یەكگرتووەكان بۆ جێبەجێ كردنی تەواوەتی (TAL) قانوونی كاتی بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراق. هەروەك جێگری وەزیری دەرەوە (ئارمیتاج) ئێوەی دڵنیا كردەوەو بەئاشكراش رایگەیاند، ویلایەتە یەكگرتووەكانی پشتگیری دەكات لەجێبەجێ كردنی تەواوەتی (TAL) قانوونی كاتیی بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بەتایبەت هەموو برگەكانی ماددەی (٥٨)، هەروەها بروای وایە جێبەجێكردنی تەواوەتی ئەو مادەیە گەوهەرییە، لەبەر ئەوە، حكومەتی ویلایەتە یەكگرتووەكان كۆكە لەگەڵ نامەكەی سەرۆك وەزیردا. لەوەش زیاتر حكومەتی ویلایەتە یەكگرتووەكان ئامادەیە ئەو بەشەی لەسەرییەتی بیكات بۆ زەمینەی سازكردنی جی بەجێكردنی ماددەی پەنجاو هەشت لەرێی یارمەتیدانی ئەو دامەزراوانەی لێپرسراون لەو رێ و شوێنانەی لەبرگەی (ئەلف)ی ماددەی (٥٨)دا هەیە.

دڵسۆزتان

جۆن دی نیگرۆپۆنتی

*** نامەكەی د. عەلاوی بۆ بەرێزان تاڵەبانی و بارزانی:**

بسم الله الرحمن الرحيم

كۆماری عێراق

نوسینگەی سەرۆك وەزیران

برای ئازیزو بەرێز مەسعود بەرزانی

برای ئازیزو بەرێز جەلال تاڵەبانی

بابەت/ هەڵبژاردنی پارێزگای كەركوك

سڵاوێكی برایانە

دیارە ئێوە دەزانن ئێمە موتابەعەی گفتوگۆكان دەربارەی هەڵبژاردنی پارێزگای كەركوك دەكەین و لەهۆكارە سیاسی و مێژووییەكانی كێشەی ئەو پارێزگایە تێدەگەین ئەوەش وا لەهەموو لایەكمان دەكات كە پێكەوە بۆ چارە سەركردنی ئەو كێشەیە كار بكەین حكومەتی كاتی پابەندە بەجێبەجێكردنی مادەی (٥٨) لەیاسای بەرێوەبردنی دەوڵەت بۆ ماوەی گواستنەوە، بەڵام مەسەلە ئەمنییە ترسناكەكان كە رووبەرومان دەبنەوە رێگرن لەبەردەم كاری حكومەت لەزۆربەی بوارەكاندا. سەرەرای ئەوەش ئێمە چەند هەنگاوێكی سەرەتاییمان ناوە بۆ جێبەجێكردنی مادەی (٥٨) لەیاساكە، ئەوەش لەرێگەی هەڵوەشانەوەی بریاری (٤٢)ی پەیوەست بەكێشەی خاوەندارێتی لەكەركوك و هەڵوەشانەوەی هەموو راسپاردەو فەرمانەكانی كە لەژێر سایەی رژێمی پێشوودا سەبارەت بەراگواستنی زۆرە ملێی قەیدی هاووڵاتیان دەرچوو بوو، هەروەها ماف ئەوەمان داوە بەگەرانەوەی ئەو قەیدانە بۆ جێگای رەسەنی خۆیان لەو پارێزگایانەی كە لێوەی گواستراونەتەوە.

سەرەرای ئەوانەش حەز دەكەم لێرە دا دووپاتی بكەمەوە كە:

١. ئەنجامی هەڵبژاردنەكانی ئەنجومەنی پارێزگای كەركوك هەرچیەك بێت كار ناكاتە سەر بریاردانی كۆتایی سەبارەت بەبارودۆخی كۆتایی شاری كەركوك، لەم بارەیەشەوە پێویستیی بریاردان لەچارەنوسی ئەو پارێزگایەو پەیوەندیە ئیدارییەكەی بەگوێرەی ئەو میكانیزمەی كە لەمادەی (٥٨) لەیاسای بەرێوەبردنی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوە هاتووە دووپات دەكەینەوە.

٢. حكومەت پەیمان دەدات بەچالاككردنی ئەو میكانیزمەی كە دەبنە هۆی مسۆگەر كردنی جێبەجی كردنی ئەو برگانەی كە مادەی (٥٨) لەخۆی دەگرێت كە دەكرێ لەمادەی گواستنەوەدا بە گوێرەی یاساكە جێبەجی دەكرێت لەم بوارەشدا خوازیاری روایژكردنمە لەگەڵ ئێوەو ئەنجومەنی نیشتمانی كاتی و دەستەی سەرۆكایەتیدا بۆ پێكهێنانی لیژنەیەكی باڵای تایبەتی خاوەن دەسەڵاتی یاسایی و دارایی بۆ جێبەجی كردنی مادەی (٥٨) لەیاسای ناوبراو بۆ رامالینی شوێنەوارەكانی سیاسەتی راگواستنی و پاكتاوی رەگەزی كە بەمەبەستی گۆرینی دۆخی دانیشتووان لەكەركوكدا ئەنجام دراون.

٣. لەكاتێدا لە رووی مەبدەئییەوە وا بریارە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاكان بۆ خولێكی چوار ساڵی بێت، لەوانەیە رێك بكەوین لەسەر ئەوەی كە خولی هەڵبژاردنی

ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بەشێوەیەکی ئیستسنائی بۆ ماوەی (١١) مانگ بێتو دواتر لەکۆتایی ئەمساڵدا دووبارە هەڵبژاردن بکرێتەوە ئەویش بەگوێرەی خەمڵاندنی دۆخی پارێزگاکە.

٤. حکومەت بەردەوامە لە هەوڵەکانی لەگەڵ کۆمیسیۆنی باڵای سەربەخۆیی هەڵبژاردنەکان لەپێناو هاندانی بۆ نیشاندانی ئەوپەڕی نەرمو نیانی بۆ تۆمارکردنی دەنگدەران لەو کەسانەی کە ڕاگوێزراون ئێستا گەڕاونەتەوە بۆ کەرکوك بۆ ئەوەی زەمانەی بەشداریکردنیان لەپرۆسەی هەڵبژاردنا بکرێت.

٥. من دڵنیام لەوەی کە ئێوە ڕەچاوی مەترسییەکان دەکەنو هاوکاری سەرکەوتنی پرۆسەی هەڵبژاردنو پرۆسەی سیاسی لەوڵاتدا دەکەین وەکو خاڵێکی دەستپێك بەرەو و عێراقێکی دیموکراسی فیدراڵی.

ئەوپەڕی ڕێزمان قبوڵ بکەنو بمێنن بۆ برایەتی

د. ئەیاد عەلاوی

سەرۆك وەزیران

* ناوی ئەندامانی هەڵبژێردراوی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك:

١. بەرەی تورکمانی عێراق ژمارە (١٧٥):
- عەلی مەهدی سادق.
- حەسەن تۆران بەهائەددین سەعید.
- ژاڵە یونس ئەحمەد.
- تەحسین محەمەد عەلی وەلی.
- قاسم حەمزە ئەحمەد.
- تورکان شوکر ئەیوب.
- تورهان مەزهەر حەسەن.
- مەجید عیزت جومعە.

٢. (الائتلاف الاسلامي والتركماني) ژمارە (١٧٨):
- محەمەد مەهدی ئەمین.

٣. (التجمع الوطني العراقي) ژمارە (٢٨٩):
- ئەحمەد خضر غەرب.

٤. (التجمع الجمهوري العراقي) ژمارە (٢٩٩):
- بورهان مەزهەر عاسی
- ڕاکان سەعید عەلی
- ڕەملە حەمید ئەحمد
- عەبدوڵڵا سامی عاسی
- محەمەد خەلیل نصەیف

٥. (قائمة كركوك المتاخية - لیستی برایەتی کەرکوك) ژمارە (٣٦٧):
- رزگار عەلی حەمە جان.
- محەمەد کەمال سالح.
- پەروین محەمەد ئەمین عەلی.
- عەبدولرەحمان مستەفا فەتاح.
- ئەحمەد عەبدوڵڵا ڕەزا.
- گەلاوێژ عەبدولجەبار مەجید.
- مەحمود محەمەد مەجید.
- عەلی نامیق ڕەشید.
- سلفانا بۆیا ناسر.
- عەلی محمود محەمەد ئەحمەد.
- عیرفان جەمال تۆفیق.
- جوان حەسەن عارف.
- جەمال مەولود باپیر.
- ئازاد سابیر محەمەد.
- نەسرین خالد وەهاب.
- ئاوات محەمەد محەمەد ئەمین.
- ڕێبوار فائق عبدولحەمید.
- ساهرە سیفولدین نوری.
- شێرزاد عادل خورشید.
- با بەکر سدیق ئەحمەد.
- ئەڵماس فازل کەمال.
- ڕیاز محەمەد دانوك.
- جواد جاسم محەمەد.
- لەیلا محەمەد خدر.
- ئیبراهیم خەلیل ڕەشید.
- دلشاد پیرۆت عەزیز.

* ناوچە بەڕێوبەرییەکانی کەرکوك لە دوای پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق:-

ئەوەی بەرچاو دەکەوێت کە ڕچاوی بەرێوەبەری پارێزگاکە کراوە، بەوەی، ووردە گۆڕانێك لەشێوەی کارگێری ناوچەکە بەسەریدا هاتووەو تارادەیەك گەلێك شوێن کە ئاوەدان نەکرابۆوە ئاوەدان کراوەتەوەو تارادەیەکی چاك خەڵکەکەی گەڕاونەتەوە یان خەریکی گەڕانەوەن.

ئەو ناحیانەی کە سەر بەکەرکوکنو لەسەر پارێزگای کەرکوکن بریتییە لە (ناحیەی شوان)، (ناحیەی سەرگەران)، (ناحیەی قەرە هەنجیر)، (ناحیەی تازە خورماتوو)، (ناحیەی داقوق)، (ناحیەی ئاڵتون کۆپری - پردێ)، (ناحیەی لەیلان) بەڵام قەزای (دووز خورماتوو) تاکو ئێستاکە سەر بەپارێزگای تکریتە لەگەڵ قەزاکانی چەمچەماڵو کفریو کەلاریش سەر بەکوردستانی ڕزگار کراوەو تاکو ئێستاکە بەهەڵواسراوی ماوەتەوە، چاوەڕێی ئەوەن کە لەچوار چێوەی مادەی (١٤٠) جێبەجێبکرێت. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت، لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە، گەلێك لادێکانی دەورووبەری کەرکوك کە لەکاتی ڕژێمی بەعس چۆڵەوانیو جێگەی سەربازگە بوو

ئاوەدان بووەتەوەو، خەڵکێکی زۆر گەڕاونەتەوەو لادێکانیان دووبارە دروستیان کردووەتەوە.. بەڵام ئەوەی دەبینرێت لەماوەی ساڵێکدا لادێیەکی زۆر خەڵکەکەی دەستیان بەکار کردووەتەوەو بە کشتوکاڵی، مەرداریییەوە خەریکن، بەڵام هێشتا لادێیەکی زۆر ماوە کە خەڵکەکەی لەئەنفالدا لەناوچوون ماون و بەچۆڵەوانی بەجێ ماون. ئەمیش پێویستی بەقۆناغێك هەیە تابەوەی بنەماکانی ئاوەدانی بۆ دروست بکرێت لەدووبارە گەڕانەوەی خەڵك بۆی. زیاتریش ئەو لادێیانە ئاوەدا بوونەتەوە کە نزیکن لەو شوێنانەی کەوتوونەتە سەر ڕێگا سەرەکییەکان و پێویستییەکانی ژیانی تێدا هەیە، بەتایبەتیش ئاو بناغەیەکی گرنگە بۆ دووبارە سەرهەڵدانەوەی ژیان بۆ ئەو گوندانە"(١٠٩).

*** کۆمەڵەی نیشتمانی راگوێزراو - جمعية الوطنية الانتقالية:-**
ئەم کۆمەڵەیە لە دوای دوو ساڵ لە رزگارکردنی پرۆسەی ئازادی عێراقەوە دامەزرا کە لە (٣١)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥) تا (١٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٥)، کە ئەندامان لە هەموو پارێزگاکانی عێراق بەشدارییان تێدا کرد، ئەندامەکانیان بەم شێوەیە بوونە:-
١- جەلال تاڵەبانی (مام جەلال)
٢- عارف تەیفوور، پارتی دیموکراتی کوردستان
٣- ویداد حەمە غەریب فەرەج، پارتی دیموکراتی کوردستان
٤- رەمەزان حاجی رەشید، یەکێتی نیشتمانی کوردستان
٥- شلێر رەشید حەمە ئەمین، یەکێتی نیشتمانی کوردستان
٦- ئالا نوری تاڵەبانی، یەکێتی نیشتمانی کوردستان
٧- تەڵعەت محەمەد گلی
٨- سۆلاف عەبدوڵڵا، پارتی دیموکراتی کوردستان
٩- وەلید شەریکە، پارتی دیموکراتی کوردستان
١٠- فاروق عەبدوڵڵا، بەرەی تورکمانی
١١- ئیسماعیل رەجەب ئەحمەد حەدیدی
١٢- دارا نورەددین بەهادین
١٣- سەرتیپ محەمەد حوسێن (سیروان کاکەیی)، پارتی دیموکراتی کوردستان
١٤- ریاز جەمال ئەمین، بەرەی تورکمانی
١٥- فەیحا زەینولعابدین، بەرەی تورکمانی
١٦- یەشار محەمەد شاکر، پارتی شروقی تورکمانی
١٧- عەبدولرەحمان کوردە، پارتی دیموکراتی کوردستان
١٨- عەبدولمەجید زەنگنە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان
١٩- پاکیزە مستەفا، یەکگرتووی ئیسلامی

*** ئەندامەکانی کەرکوکی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٥):-**
١- خالید شوانی، هاوپەیمانی کوردستانی
٢- سەعدی بەرزنجی، هاوپەیمانی کوردستانی
٣- عەبدولخالق زەنگەنە، هاوپەیمانی کوردستانی
٤- تانیا تەلعەت، هاوپەیمانی کوردستانی
٥- وەلید شەریکە، هاوپەیمانی
٦- سەعدەدین ئەرکیج، بەرەی تورکمانی.
٧- محەمەد عەلی تەمیم، حوار الوطني
٨- عومەر جبووری، المصالحة والتحرير
٩- عەبدوڵڵا ئەسکەندەر، المصالحة والتحرير

*** هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە کەرکوك لە ساڵی ٢٠١٠**
عەرەبە سوننییەکان و چەکدارەکانی پێشوو کە بایکۆتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥یان کرد، ئەم جارە بەشدارییان کردو دەنگیان دا بۆ لیستەکەی عەللاوی. هەروەها تورکمانە سوونییەکان و لەوەش گرنگتر شیعە تورکمانەکان پێشتر دەنگیان بۆ مەزهەبەکەی خۆیان دابوو ئەمجارە دەنگیان بۆ عەللاوی دا.
لەبەر ئەوەی لیستە کوردستانییەکان بە یەك هاوپەیمانی بەشداری هەڵبژاردنەکانیان نەکرد، بەشێکی زۆری دەنگەکان بەهەدەر چوو و بەزیان بۆ کورد گەڕایەوە لەنێو کەرکوکدا.
بەپێی سەرچاوە سەرەتاییەکان کە بڵاوکرایەوە لیستی عێراقییە (٢٥٢)هەزار دەنگ، لیستی هاوپەیمانی (٢٢٥)هەزار دەنگ، یەکگرتووی ئیسلامی (٤٣٠٠٠)هەزار دەنگ لیستی گۆڕان (٣٧٠٠٠)هەزار دەنگ، لیستی کۆمەڵ (١٦٠٠٠)هەزار دەنگ، لیستی قەلا زیاتر لە (٢٠٠٠)هەزار دەنگ.

*** لیستە کوردستانییەکانی کەرکوك بەم شێوەیە رێژەی دەنگدانیان هەبوو:-**
١- یەکێتی نیشتمانی کوردستان (١٤٧٤٦٧) هەزار دەنگ
٢- پارتی دیموکراتی کوردستان (٤٨١٨٧) هەزار دەنگ
٣- بزووتنەوەی گۆڕان (٣٦٥٥٤) هەزار دەنگ
٤- یەکگرتووی ئیسلامی (٢٤٢٤٧) هەزار دەنگ
٥- کۆمەڵی ئیسلامی (٧١٥٤) هەزار دەنگ
٦- حیزبی شیوعی کوردستان (٣٣٩٧) هەزار دەنگ
٧- بزووتنەوەی ئیسلامی (٩٠١) دەنگ
٨- حیزبی سۆشیالیستی کوردستان (٤١٧) دەنگ
٩- زەحمەتکێشان (٢٣٠) دەنگ
١٠- بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان (٨٢١) دەنگ

*** ئەندامەکانی کەرکوکی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی (٢٠١٠)**
١- خالید شوانی، هاوپەیمانی کوردستانی.
٢- نەجمەدین کەریم، هاوپەیمانی کوردستانی
٣- عارف تەیفور، هاوپەیمانی کوردستانی
٤- سیروان ئەحمەد، (مەلا سیروان)، هاوپەیمانی کوردستانی
٥- ئالا تەحسین تاڵەبانی، هاوپەیمانی کوردستانی
٦- لەیلا حەسەن، هاوپەیمانی کوردستانی
٧- ئەرشەد ساڵحی، العراقيه
٨- محەمەد عەلی تەمیمی، العراقيه
٩- عومەر ئەلجبووری، العراقيه
١٠- ئیبراهیم ئەلمهیری، العراقيه
١١- ژاڵە نەفتچی، العراقيه
١٢- یاسین ئەلعوبێدی، العراقيه
١٣- عیماد یۆخانا، کۆتا.

*** هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی ٢٠١٤:-**

لە بەرواری ٣٠ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٤ لە سەرتاپای عێراقدا هەڵبژاردنێکی گشتی پەرلەمانی عێراق کرا کە هەموو پارێزگاکانی عێراق بەشدارییان تێدا کرد و گەلێك حیزب و یەکگرتنی جۆراوجۆر لە لیستەکاندا سەری هەڵدا.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە کەرکوك یەکێك بوو لەو پارێزگایانەی عێراق کە بەشداری هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقی کرد و گەلێك حیزب و یەکگرتنی تازە بەشدارییان کرد وەکو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەرەی تورکمانی، پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەلعەرەبییە، ئیئتیلاف عەرەب کەرکوك، بزووتنەوەی گۆڕان، حیزبی سۆسیالیست، حیزبی شیوعی کوردستانی، حیزبی زەحمەتکێشان، حیزبی ئاینده، یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان، کۆمەڵەی ئیسلامی کوردستان، بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان، کلدانی ئاشووری، ئەلوەرکائی دیموکراتی.

لەدوای یەکلاکردنەوەی دەنگەکان لە کەرکوك ئەم حیزب و لایەنانە براوەی هەڵبژاردنەکان بوون:-

١- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، شەش کورسی.
٢- پارتی دیموکراتی کوردستان، دوو کورسی.
٣- بەرەی تورکمانی لە کەرکوك، دوو کورسی.
٤- ئەلعەرەبییە، یەك کورسی.
٥- ئیئتیلاف عەرەب کەرکوك، یەك کورسی.
٦- کۆتاکانی کەرکوکیش بەم شێوەیە بوو:-
- قائمة الرافدين، دوو کورسی.
- مجلس الكلداني الآشوري، دوو کورسی.
- قائمة الوركاء الديمقراطية، یەك کورسی.
- پێکهاتەی سابئی، یەك کورسی.
- پێکهاتەی شەبەك، یەك کورسی.
- پێکهاتەی یەزیدی، یەك کورسی.

ناوی هەڵبژێردراوی حیزبەکانیش بەم جۆرە بوون:-

١- د. نەجمەدین عومەر کەریم. یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٢- ڕێبوار تەها مستەفا. یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٣- محەمەد عوسمان عەزیز (حەمە سوور دووشیوانی). یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٤- ئاڵا تەحسین حەبیب. یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٥- بێستوون عادل وەیس. یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٦- لەیلا عەلی خدر، یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
٧- ئەرشەد ڕەشاد فەتحوڵلا، بەرەی تورکمانی.
٨- حەسەن تۆران بەهادین، بەرەی تورکمانی.
٩- شاخەوان عەبدوڵلا، پارتی دیموکراتی کوردستان.
١٠- ئەمیرە کەریم حەمەلاو، پارتی دیموکراتی کوردستان.
١١- محەمەد عەلی محەمەد، ئیئتیلاف ئەلعەرەبییە.
١٢- خالید حەمەد عەلاوی، ئیئتیلاف عەرەب کەرکوك.
١٣- شوان داوودی، یەکێتی نیشتمانی کەرکوك.

*** ئە نجوومەنی قەزای کەرکوك:-**

یەکێك لەو کارانەی لە پارێزگای کەرکوك جێبەجێ کرا، دامەزراندنی ئەنجوومەنی قەزای کەرکوك بوو. بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی قەزای کەرکوك لە چوارچێوەی چالاکییەکانی پارێزگا.

ئەم ئەنجوومەنە بە شێوەیەکی ئەوتۆ دارێژرابوو کە پێکهاتبوو لە (٢١) ئەندامی ئەنجوومەن بەم شێوەیە:-

- ٦ ئەندامی کورد.
- ٦ ئەندامی تورکمان.
- ٦ ئەندامی عەرەب.
- ٣ ئەندامی (کلد و ئاشوری و سابیئە و ئەرمەن).

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥)و (٥٦)، کانونی یەکەم، ساڵی ١٩٧٦، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (یەکەمین لانکەی رەسەنترین شارستانییەت)، رەزا شوان، لاپەرە ٣٦.
٢. گۆڤاری (شانەدەر)، ژمارە ٦، حوزەیران، ١٩٩٨، (الأقوام الكردية القديمة، الگوتيون)، محەمەد ساڵح زێباری، لاپەرە ٨٠.
٣. (مێژووی گەلی لوللو، دانیشتووانی کۆنی ناوچەی پارێزگای ئەمڕۆی سلێمانی)، فازل قەرەداغی، بڵاوکردنەوەی راگەیاندنی بزوتنەوەی راپەرینی ئیسلامی، زنجیرەی ٢، ساڵی ١٩٩٨-١٤١٩، لاپەرە ١٠.
٤. گۆڤاری (شانەدەر)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٨١.
٥. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٨١-٨٢.
٦. (میدیا)، ئی.م. دیاکۆنۆف، وەرگێڕانی بورهان قانیع، ١٩٧٨، چاپی یەکەم، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، لاپەرە ١٦٥.
٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٦٧.
٨. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٤٠، ساڵی ١٩٩٧، (تیۆرێك دەربارەی رەسەنی گۆتییەکان)، د. فوئاد حەمە خورشید، لاپەرە، ٧٤.
٩. (آثار بلاد الرافدين)، سيتون لويد، وەرگێڕانی د. سامی سەعید ئەلئەحمەد، لاپەرە ١٧٣. هەروەها بڕوانە: (العراق القديم، دراسة تحليلية لاحواله الإقتصادية والاجتماعية، جماعة من العلماء السوفيت)، وەرگێڕانی سلیم تەها ئەلتکریتی.
١٠. رۆژنامەی (التآخي)، ژمارە رۆژی ١٩٦٧/١٠/٢٤، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (شمال العراق في تاريخه القديم)، د. سامی سەعید ئەلئەحمەدی.
١١. (حضارة العراق)، بەشی دووەم، لاپەرە ٢٦-٢٨.
١٢. گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە ٩١-٩٢، ساڵی (٢٣)یەمین، ساڵی ١٩٩٥، لاپەرە ٦٣-٦٤.
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٣.
١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٦.
١٥. (العراق في التاريخ)، لاپەرە ١٥٢.
١٦. گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٢، ساڵی (١٢)هەمین، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (معالم كركوك التاريخية، مدينه نوزي ويورگان تەپە، نيسان ١٩٧٣، نووسینی، احمد قوشچي اوغلو، لاپەرە ١٠.
١٧. گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٠، ١١، ١٢، ١٩٨٤، نیسان، ئازار، شوبات، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (الحوريون ومدينة نوزي في كركوك)، روفائیل میناس، بەشی دووەم.
١٨. گۆڤاری (سومەر)، لاپەرە ٤٧.
١٩. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٦٢-٣٦٣.
٢٠. گۆڤاری (گوڵان العربي)، لاپەرە ١٢٥، د. محەمەد عومەر عەبدوڵڵا، (اطلس كركوك).
٢١. (تأريخ حضارة وادي الرافدين، في ضوء مشاريع الري الزراعية والمكتشفات الاثارية والمصادر التاريخية)، د. ئەحمەد سوسە، لاپەرە ١٧٠.
٢٢. (العراق في التاريخ)، لاپەرە ٢٣٧-٢٣٨.
٢٣. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٤٥٤.،
٢٤- (العراق في التاريخ)، لاپەرە ٢٥٠.
٢٥. (تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف العصور)، شەریف یوسف،، لاپەرە ١٨٩.
٢٦. (مێژووی ئێران لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام)، رۆمەن گیرشمەن، وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەرە (٢٤٦).
٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٨).
٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٩).
٢٩. (مێژووی ئێران، سەردەمی هەخامەنشییەکانی)، پێداچوونەوەی: ئیلیا گێرشێڤیچ، وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی (ژین)، ٢٠١٢، لاپەرەکانی ٩٧-٩٩.
٣٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٢٧.
٣١. (العراق في التاريخ).
٣٢. (تاريخ فن العمارة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٩٣.
٣٣. (مێژووی ئێران لە سەرەتاوە هەتا هاتنی ئیسلام)، رۆمەن گیرشمەن، وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەرە (٣٥٣).
٣٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٣٥٣-٣٥٤).
٣٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥٧).
٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٢٧).
٣٧. (تاريخ فن العمارة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٩٣-١٩٤.
٣٨. (دێرینەناسیو هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنشیو ئەشکانیو ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وەرگێڕانی: وریا قانع، لاپەرەکانی (٤١٩-٤٢٠).
٣٩. (رضا جواد الهاشمي، تاريخ الشرق الادنى القديم ايران والاناضول، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي)، د. سامی سەعید ئەلئەحمەد،، لاپەرە ١٤٣.
٤٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٥٣.
٤١. (اطلس كركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٤٢. (ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان)، ئارتوور کریستێنسێن، وەرگێڕانی: سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی (ژین)، ٢٠٠٦، لاپەرەکانی (١٣٣-١٣٤).
٤٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٤١).
٤٤. (توفيق وهبي، الاثار الكاملة)، رەفیق ساڵح، چاپی دووەم، بنکەی (ژین)، ٢٠١١، لاپەرە (٢٣٢).
٤٥. (العراق في التاريخ)، لاپەرە ٣٢٣-٣٢٤.

٤٦. (حضارة العراق)، بەرگی شەشەم، لاپەڕە ١١٢.
٤٧. گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە ٤، ساڵی ١٩٧٦، لاپەڕە
٩٤. ثابت اسماعيل الراوي، لێکۆڵینەوەیەك بە ناوی (التحديد الجغرافي والاداري والسياسي للعراق في العصر الاموي)، هەروەها بڕوانە:-
- (العراق في عهد الحجاج بن يوسف الثقفي، من الناحية السياسية والادارية)، د. عەبدولواحید زەنون تەها، چاپی یەکەم، ١٩٨٥-١٤٠٥، بڵاوکراوەی نووسینگەی (بسام).
- هەروەها بڕوانە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر هەمان کتێبی سەرەوە لەلایەن ئیبراهیم خەلیل، گۆڤاری (بين النهرين)، ژمارە ٤، ١٩٧٦، لاپەڕە ٤٦.
٤٨. گۆڤاری (الف باء)، ژمارە ١٥١١، ساڵی سییەك، (١٠)ی ئەیلولی ساڵی ١٩٩٧، لاپەڕە ٤.
٤٩. (کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا)، دکتۆر زرار سەدیق ترفیق، چاپی سێیەم، ٢٠١٣، لاپەڕە (٣٣).
٥٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧).
٥١. (داقوق، دراسة في تاريخها السياسي والحضاري، ١٦-٦٥٦ ه/٦٣٨-١٢٥٨م)، ئاریان جەمال ئیسماعیل هەرزانی، ٢٠٠٩، لاپەڕە (٣٥).
٥٢. (موسوعة كركوك الحضارية)، بەرگی یەکەم، لیژنەی نووسینی مێژووی کەرکوك، ٢٠٠٢، لاپەڕە (١٦٢).
٥٣. (حضارة العراق)، بەرگی شەشەم، لاپەڕە ١٢٣-١٢٤.
٥٤. (کوردو کوردستان لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئیسلامیدا)، دکتۆر زرار سەدیق ترفیق، چاپی سێیەم، ٢٠١٣، لاپەڕەکانی (٣٨-٣٩).
٥٥. (بحوث الندوة العلمية حول كركوك، ٣-٥ نيسان ٢٠٠١)، کۆمەڵێك نووسەر، هەولێر، ٢٠٠٢، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی: (منطقة كركوك في العصر العباسي)، نووسینی: قادر محەمەد ئەشکەنەیی، لاپەڕەکانی (٣٢٨-٣٣٠).
٥٦. گۆڤاری (الف باء) د. ئەحمەد سوسە، (الدليل الجغرافي العراقي..) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٥٧. (حضارة العراق)، بەرگی شەشەم، لاپەڕە ١٢٧.
٥٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٢٨.
٥٩. (العراق في التاريخ)، لاپەڕە ٥٤٩.
٦٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٥٠.
٦١. گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٥، ساڵی ١٩٧٦، لاپەڕەکانی ١٠٩-١١٠.
٦٢. گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە ٧، ساڵی دووەمین، ساڵی ١٩٩٧، لاپەڕە ٢١.
٦٣. (تأريخ الامة العربية، عصر الانحدار، يشتمل علي تاريخ العراق والشام والجزيرة العربية والمغرب العربي منذ سقوط بغداد سنة ٦٥٦ الهجرية الى فجر عصر النهضة في القرن الثالث عشر)، محەمەد ئەسعەد تەلس، ساڵی ١٩٦٣، بەیروت، دەزگای ئەندەلوس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، لاپەڕە ١٦٧.
٦٤. (العراق في العهد الجلائيري، ٧٣٨-٨١٤، ١٣٣٧-١٤١١م، دراسة في اوضاعه الادارية والإقتصادية)، نوری عەبدولحەمید ئەلعانی، دەزگای بەڕێوەبردنی ڕۆشنبیری گشتی، ١٩٦٨، لاپەڕەکانی ٤١-٤٢.
٦٥. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٠.
٦٦. (منطقة كركوك ومحاولة تغيير واقعها القومي)، د. نوری تاڵەبانی، لندن، ١٩٩٥، لاپەڕە ١٨.
٦٧. (العراق في العهد الجلائيري)، لاپەڕە ٥٥.
٦٨. ڕۆژنامەی (الاتحاد)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (كركوك في عهد الدول العثمانية).
٦٩. گۆڤاری (الاخاء)، ئاب-ئەیلول، ١٩٨٦، لاپەڕە ٩.
٧٠. (موسوعة كركوك الحضارية)، بەرگی یەکەم، لیژنەی نووسینی مێژووی کەرکوك، ٢٠٠٢، لاپەڕەکانی (١٦٩-١٧١).
٧١. (بحوث الندوة العلمية حول كركوك، ٣-٥ نيسان ٢٠٠١)، کۆمەڵێك نووسەر، هەولێر، ٢٠٠٢، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی: (منطقة كركوك في العصر العباسي)، نووسینی: قادر محەمەد ئەشکەبنی، لاپەڕە (٢٣٣).
٧٢. (موسوعة كركوك الحضارية)، بەرگی یەکەم، لیژنەی نووسینی مێژووی کەرکوك، ٢٠٠٢، لاپەڕەکانی (١٦٩-١٧١).
٧٣. (اطلس كركوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣٨-١٣٩.
٧٤. (حضارة العراق)، بەرگی ١٠، لاپەڕە ١٠٧.
٧٥. (العراق في التاريخ)، لاپەڕەکانی ٥٧٣-٥٧٤.
٧٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٧٥.
٧٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٥٧٨.
٧٨. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەڕە ٢٣.
٧٩. (دليل الجمهورية العراقية)، ١٩٣٦، لاپەڕە ٥١.
٨٠. گۆڤاری (بين النهرين)، ساڵی دەیەم، ژمارە ٣٧-٣٨، ساڵی ١٩٨٢، لاپەڕە ١٤٧-١٤٨.
٨١. (موصل ولايتي سالنامه رسيمسيد)، چاپخانەی (موصل)، ١٩١٢، لاپەڕەکانی (٨٢، ٢٣٢).
٨٢. (ادارة العراق، الأسر الحاكمة، ورجال الادارة والقضاء في العراق في القرون المتاخرة، (٦٥٦-١٣٣٧) هجري - (١٢٥٨-١٩١٨)م)، د. عیماد عەبدولسلام ڕەئوف، ١٩٩٢، لاپەڕە ٢٣٥-٢٣٦.
٨٣. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەڕە ٢٢.
٨٤. گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ٢٦١، ساڵی (٢٦)یەم، مایس-حزیران، ١٩٨٦، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (کرکوك)، نووسینی عەباس ئەلعەزاوی، لاپەڕە ٨.
٨٥. (ادارة العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٢٤٩-٢٥٠.
٨٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٥٤.
٨٧. (حدود كردستان الجنوبية تاريخيا وجغرافيا خلال خمسة آلاف عاما)، عەبدولرەقیب یوسف، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، لاپەڕەکانی ١٣١-١٣٢.
٨٨. (مختارات من كتاب - الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية)، دکتۆر خەلیل عەلی موراد، بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠٠٥، لاپەڕە (؟؟).

(*) لەسەردەمی ئەودا سەفەوییەکان دەستیان گرت بەسەر کەرکوکداو (قاسم خان)یان کردە فەرمانڕەوای شارەکە.

٨٩. بڕوانە:

- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٩٣، ساڵی (٢٨)ەمین، حوزیران، تەمووز ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (الولاة والمتصرفون والمحافظون في كركوك منذ العهد العثماني وحتي العهد الجمهوري)، ئامادەکردنی عیسمەت ڕەفیق صاری کهیە، لاپەڕەکانی (١٠-١١-١٢-١٣-٢٣).

- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ٢٠٠، ئادار - مایس، ١٩٩٠، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (مختارات من وقائع كركوك عبر القرون)، ئامادەکردنی نەجات کەوسەر ئۆغلو، لاپەڕە ١٦.

٩٠. (دليل الجمهورية العراقية)، بەرگی دوانزەهەم، لاپەڕە ٢١.

٩١. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩٢. (العراق في التاريخ)، لاپەڕە ٦٦٤.

٩٣. (حضارة العراق)، بەرگی دوانزەهەم، لاپەڕە ٢٢-٢٣.

٩٤. (البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك)، د. خەلیل ئیسماعیل، لاپەڕە ٣٧.

٩٥. (منطقة كركوك ومحاولة تغير واقعها القومي)، د. نوری تاڵەبانی، لاپەڕە ٢٠.

٩٦. (چیم دی، شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزن)، نوسینی ئەحمەد خەواجە، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٦٨، لاپەڕە ١٣٠.

٩٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٥٠.

٩٨. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ١٤٤.

٩٩. گۆڤاری (گولآن العربي)، ژمارە ٣٢، ٢٥، کانونی دووەم، ساڵی ١٩٩٩، لاپەڕە ٧٣.

١٠٠. هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٧٣.

١٠١. (البعد القومي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٣٧-٣٨.

١٠٢. (دليل الجمهورية العراقية).

١٠٣. (ئەتڵەسی کەرکوك، گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٤٧-١٩٨٧)، سوهەیل خورشید عەزیز، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەڕە (٣٧).

١٠٤. (ئەتڵەسی کەرکوك، گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٤٧-١٩٨٧)، سوهەیل خورشید عەزیز، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەڕەکانی (٥٩-٦١).

١٠٥. (البعد القومي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو. هەروەها بڕوانە: (گۆڕینی سنووری ئیداری پارێزگای کەرکوك)، گۆڤاری (سەنتەری ستراتیژی)، د.خەلیل ئیسماعیل، ژمارە (١)، ساڵی هەشتەم شوباتی ١٩٩٨، لاپەڕە ٣٤.

١٠٦. (ئەتڵەسی کەرکوك، گۆڕانکارییە کارگێڕییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٤٧-١٩٨٧)، سوهەیل خورشید عەزیز، سلێمانی، ٢٠١٣، لاپەڕە (١٠٥).

١٠٧. (العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية)، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٧٣، لاپەڕە ١٤٠. هەروەها بڕوانە (دليل الجمهورية العراقية).

١٠٨. بڕوانە:

- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ١٩٣، ساڵی (٢٨)ەمین، حوزیران، تەمووز ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (الولاة والمتصرفون والمحافظون في كركوك منذ العهد العثماني وحتي العهد الجمهوري)، ئامادەکردنی عیسمەت ڕەفیق صاری کهیە، لاپەڕەکانی (١٠-١١-١٢-١٣-٢٣).

- گۆڤاری (الاخاء)، ژمارە ٢٠٠، ئادار - مایس، ١٩٩٠، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (مختارات من وقائع كركوك عبر القرون)، ئامادەکردنی نەجات کەوسەر ئۆغلو، لاپەڕە ١٦.

١٠٩. بڕوانە:

- ڕۆژنامەی (نێوەند)، ژمارە (١٣)، ڕۆژی (١٧)ی شوباتی ساڵی (٢٠٠٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (ئەرتیکلی ٥٨ گەرەنتی چارەسەرێکی ڕەوا ناکات)، شاخەوان شۆڕش.

- ڕۆژنامەی (کوردستانی نوی)، ژمارە (٣٦١٥)، ڕۆژی (٧)ی ئاداری ساڵی (٢٠٠٥)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (هەڵبژاردن لە کەرکوك، کێشەکانی، ئەنجامەکانی)، جەلال جەوهەر عەزیز.

- ڕۆژنامەی (ئاسۆ)، ژمارە (٣٩)، ڕۆژی (١٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)، لە دەقی نامەکەیاندا بۆ تاڵەبانی و بارزانی عەلاوی و نیگرۆپۆنتی پابەندی مادەی (٥٨) دەبن.

- گۆڤاری (شار)، ژمارە (٣)، چاوپێکەوتنێکە لەلایەن ئەندامێکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك (ڕزگار عەلی حەمە جان).

**ئەندامانی هەڵبژێردراوی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك**



ڕزگار عەلی حەمە جان

*** رزگار عەلی حەمە جان.**
ئاستی لە ئەنجومەن: سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك.
ئاستی خوێندنی: پەیمانگانی تەکنیکی، بەشی ڕووپێو.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم لە ساڵی ۲۰۰۳ خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
لە ۲۲ی ئاداری ساڵی ۲۰۱۱ دەستی لە کار کێشایەوە و ئیداوار ئۆراهام ئۆدیشۆ جێگەی گرتەوە.



ڕێبواری فایق تاڵەبانی

*** ڕێبوار فایق تاڵەبانی**
ئاستی لە ئەنجومەن: جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك، ئێستا سەرۆکی ئەنجوومەنە بە وەکالەت
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆسی لە ئەندازیاری.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
لە ساڵی ۲۰۰۵ بەشداری خولی دووەمی کردووە و لە ۲۱ی حوزەیرانی ساڵی ۲۰۰۵ وەکو جێگری سەرۆکی ئەنجوومەن هەڵبژێردراوە و لە ۲ی ئەیلوولی ساڵی ۲۰۱٤ بە سەرۆکی ئەنجوومەن هەڵبژێردراوە بە وەکالەت تا ۱٦ئۆکتۆبەری ۲۰۱۷.
لایەنی سیاسی: یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان.



مەجید عیزەت جومعە

*** مەجید عیزەت جومعە.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: پەیمانگای مامۆستایانی سەرەتایی.
سەر بە: بەرەی تورکمانی عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم لە ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵



ئەحمەد عەبدوللا عەسکەری

* ئەحمەد عەبدوللا عەسکەری.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: ماجستێری لە ئەندازیاری باری شارستانی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم لە ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.



نەسرین خالید وەهاب

* نەسرین خالید وەهاب.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە زانستی بیرکاری.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: پارتی دیموکراتی کوردستان.



گەلاوێژ عەبدولجەبار جەباری

* گەلاوێژ عەبدولجەبار جەباری.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە یاسا، دبلۆم لە پەروەردە.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.



تەحسین محەمەد عەلی کەهیە

* تەحسین محەمەد عەلی کەهیە.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە کارەبا، دەرچووی حەوزە.
سەر بە: بەرەی تورکمانی عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣ و خولی دووەم ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: یەکێتی ئیسلامی تورکمانی عێراق.



محەمەد خەلیل نسەییف

* محەمەد خەلیل نسەییف.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە کارگێری یاسایی.
سەر بە: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣ و خولی دووەم ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١٦ بەدەستی تیرۆر شەهید کرا.



پەروین محەمەد ئەمین عەلی

* پەروین محەمەد ئەمین عەلی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە پەیمانگای مامۆستایان.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: پارتی دیموکراتی کوردستان.



بابەکر سدیق ئەحمەد

* بابەکر سدیق ئەحمەد.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە یاسا.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.



ئاوات محەمەد ئەمین

* ئاوات محەمەد ئەمین.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئەدەب و زمانی ئینگلیزی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان.



عەلی نامیق ساڵەیی

* عەلی نامیق ساڵەیی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئابووری و پەیوەندییە بازرگانییە جیهانییەکان.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: بێ لایەن.



ئەڵماس فازڵ کەمال

* ئەڵماس فازڵ کەمال.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە یاسا.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
بڕیاردەری ئەنجوومەنی پارێزگایە.
لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی ٢٠١٨ لەسەر لیستی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەرچووە.



جەمال مەولود باپیر

* جەمال مەولود باپیر.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە میکانیکی فرۆکەوانی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: حیزبی شیوعی کوردستان.



تۆرهان موزهیر موفتی

* تۆرهان موزهیر موفتی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دکتۆرا لە زانستی جیۆلۆجی.
سەر بە: بەرەی تورکمانی عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: بزوتنەوەی تورکمانە سەر بەخۆکان، بەرەی تورکمانی.
لە ١ی شوباتی ساڵی ٢٠١١ دەستی لەکار کێشایەوە و ڕەعەد ڕوشدی لە جێگەی دانرا.



عیرفان جەمال كەركوكلی

*** عیرفان جەمال كەركوكلی.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە پەیمانگای تەكنیكی.
سەر بە: لیستی برایەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەكەم ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: حیزبی گەلی توركمان



ژاڵە یونس ئەحمەد نەفتچی

*** ژاڵە یونس ئەحمەد نەفتچی.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەكالۆریۆس لە زانستی سیاسی.
سەر بە: بەرەی توركمانی عێراق.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
لایەنی سیاسی: بەرەی توركمانی
لە ۳ی تەمووزی ساڵی ۲۰۱۰ەوە بووەتە ئەندام پەرلەمانی عێراق



عەلی مەهدی سادیق

*** عەلی مەهدی سادیق.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەكالۆریۆس لە ئەندازیاری باری شارستانی.
سەر بە: بەرەی توركمانی عێراقی.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەكەم ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: حیزبی توركمان ئیلی.



ساهيرە سەيفەددين نوری

* ساهيرە سەيفەددين نوری.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەكالۆريۆس لە زانست.
سەر بە: ليستی برايەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: يەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لايەنی سياسی: حيزبی يەكگرتووی توركمانی عێراقی.



لەيلا محەمەد خدر

* لەيلا محەمەد خدر.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەكالۆريۆس لە زمانی ئينگليزی.
سەر بە: ليستی برايەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: يەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لايەنی سياسی: حيزبی شيوعی كوردستان.



ئيبراهيم خەليل ڕەشيد

* ئيبراهيم خەليل ڕەشيد.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: قوتابی بەشی ژمێرياری.
سەر بە: ليستی برايەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: يەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لايەنی سياسی: يەكگرتووی ئيسلامی كوردستان.


عەلی مەحمود محەمەد

* عەلی مەحمود محەمەد.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: پەیمانگای باڵای ئابووری.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: حیزبی شیوعی کوردستانی.
لە ساڵی ۲۰۰۷ کۆچی دوایی کردووە و لەیلا محەمەد جێگەی گرتووەتەوە.


عەبدوڵڵا سامی ئەلعاسی

* عەبدوڵڵا سامی ئەلعاسی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە زانستی سەربازی.
سەر بە: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ۲۰۰۳ و خولی دووەم ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: بێ لایەن.
لە ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ۲۰۱۳ دەستێکی تیرۆر شەهیدی کردووە و محەمەد ئیبراهیم ئەلحەمدانی جێگەی گرتووەتەوە.


ڕەملە حەمید ئەحمەد

* ڕەملە حەمید ئەحمەد.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئەندازیاری باری شارستانی.
سەر بە: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ۲۰۰۵
لایەنی سیاسی: گردبوونەوەی کۆماری عێراق



ئازاد سابیر جەباری

* ئازاد سابیر جەباری.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئاداب.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.



محەمەد خدر غەرب

* محەمەد خدر غەرب.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە زانستی سەربازی.
سەر بە: گردبوونەوەی نیشتمانی عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: گردبوونەوەی نیشتمانی عێراقی



جواد جاسم ئەلجەنابی

* جەواد جاسم ئەلجەنابی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە پەروەردەی وەرزشی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: بێ لایەن.



سلفانا بۆیا ناسر

* سلڤانا بۆیا ناسر.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەكالۆریۆس لە كارگێڕیو ئابووری.
سەر بە: لیستی برایەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: حیزبی نیشتمانی ئاشووری.



دلشاد پیرۆت عەزیز

* دڵشاد پیرۆت عەزیز.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: ئامادەیی پیشەسازی.
سەر بە: لیستی برایەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: پارتی دیموكراتی كوردستان



شێرزاد عادل خورشید

* شێرزاد عادل خورشید.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: پەیمانگای مامۆستایان.
سەر بە: لیستی برایەتی كەركوك.
ژمارەی خولەكانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: پارتی دیموكراتی كوردستان.



مەحمود محەمەد مەجید

* **مەحمود محەمەد مەجید.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆمی تەکنیکی کارگێڕی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: پارتی دیموکراتی کوردستان.



تورکان شوکر ئەیوب

* **تورکان شوکر ئەیوب.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە زمانەکانی کۆمپیوتەر.
سەر بە: بەرەی تورکمانی عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: بەرەی تورکمانی عێراقی.



جوان حەسەن زەنگەنە

* **جوان حەسەن زەنگەنە.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە پەیمانگای مامۆستایان.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی.



ڕیاز محەمەد دانوك

*** ڕیاز محەمەد دانووك.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە زانستی فڕۆکەوانی.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: بێ لایەن.



حەسەن تۆران بەهائەددین

*** حەسەن تۆران بەهائەددین.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە کشتوکاڵ.
سەر بە: بەرەی تورکمانی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: حیزبی (العدالە)ی تورکمانی.
لە ٢٩ی ئاداری ساڵی ٢٠١١ بووەتە سەرۆکی ئەنجوومەن
لە ٢ی ئەیلوولی ساڵی ٢٠١٤ بووەتە ئەندام پەرلەمان و عەدنان نورەددین جێگەی گرتووەتەوە



قاسم حەمزە بەیاتی

*** قاسم حەمزە بەیاتی.**
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئەندازیاری باری شارستانی.
سەر بە: بەرەی تورکمانی عێراق.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: بزوتنەوەی (الوفاء)ی تورکمانی.



بورهان موزهر ئەلعاسی

* بورهان موزهر ئەلعاسی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە کارگێڕی یاسایی.
سەر بە: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی



نەجات حوسێن حەسەن

* نەجات حوسێن حەسەن.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لە ئەندازیاری.
سەر بە: ئیئتیلاف ئیسلامی تورکمانی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
لایەنی سیاسی: ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق.
لە ١٢ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٦ لە جێگەی محەمەد بەیاتی هەڵبژێردراوە.



لەیلا حەسەن شوکر

* لەیلا حەسەن شوکر.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆم لە نەخشەی ئەندازیاری.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: یەك خول.
خولی دووەم لە ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: یەکێتی نیشتمانی کوردستان.
لە ٧ی ئاداری ساڵی ٢٠١١ بووەتە ئەندامی ئەنجوومەن لەبری سوتیلن ئیستیفیان یوسف



محەمەد کەمال

* محەمەد کەمال.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: دبلۆمی پەیمانگای مامۆستایان.
سەر بە: لیستی برایەتی کەرکوك
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣ و خولی دووەم ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: پارتی دیموکراتی کوردستان.



ڕاکان سەعید عەلی

* ڕاکان سەعید عەلی.
ئاستی لە ئەنجومەن: ئەندام.
ئاستی خوێندنی: بەکالۆریۆس لەزانستی کیمیا.
سەر بە: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی.
ژمارەی خولەکانی لە ئەندامێتی ئەنجومەن: دوو خول.
خولی یەکەم ساڵی ٢٠٠٣ و خولی دووەم ساڵی ٢٠٠٥
لایەنی سیاسی: گردبوونەوەی کۆماری عێراقی
لە ٢٩ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ بووەتە جێگری پارێزگاری کەرکوك و هالە نورەدین جێگەی گرتووەتەوە. بەڵام لە دوای ١٦ی ئۆکتۆبەرەوە بووەتە پارێزگاری کەرکوك بە وەکالەت، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە ساڵی ٢٠١٨ لەسەر لیستی عەرەبی دەرچووە و دەنگی بەدەستهێناوە.



عەبدولڕەحمان مستەفا
پارێزگاری کەرکووك (پێشوو)

* عەبدولڕەحمان مستەفا فەتاح:
- ساڵی ١٩٥١ لە کەرکوك لەدایکبووە.
- ساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٧٤ پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە.
- ساڵی ١٩٧٣-٢٠٠٣ کاری پارێزەری لە کەرکوك کردووە.
- لە ٢٨ی مایسی ساڵی ٢٠٠٣ وەکو پارێزگاری کەرکوك هەڵبژێردراوە.
- لە ٣ی نیسانی ساڵی ٢٠١١ بەردەوام بووە وەکو پارێزگار.



د. نەجمەدین کەریم
پارێزگاری ئێستای کەرکووك



فەتاح پاشا و عیزەت پاشا و مەجید بەگ



موتەسەڕیفی کەرکوك زیا لە کاتی کردنەوە پێشانگای ساڵانەی کەرکوك



عەبدولجەلیل پرتۆ پارێزگاری لیوای کەرکوک



سدیق ڕەسوڵ قادری قائیمقامی مەرکەزی قەزای کەرکوک



ئەمین قیردار جێگری پارێزگاری کەرکوک



حەسەن فەهمی مەدفەعی پارێزگاری لیوای کەرکوک



ئەنوەر یەكتە مستەفا دادوەری قەزای كفری



ئیسماعیل عەبدولحافیز قیردار دادوەری لێكۆڵینەوەی لیوای كەركوك



تاهیر سەید قادر چاودێری هێڵی كارەبای كەركوك



جەلالەددین مەولود بەرێوەبەری ناحیەی قەرەحەسەن



جەلیل شاکر عەلی بەڕێوەبەری مەعاریفی کەرکوك



حەسەن سەعید مەئموری سرییەی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك



جەمال عەبدولقادر خەتیب بەڕێوەبەری ناحیەی شوان



دکتۆر ئەحمەد نەقیب دکتۆر لە نەخۆشخانەی سەربازی کەرکوك



دکتۆر بەشیر سەرسەم بەڕێوەبەری تەندروستی لیوای كەركوك



دکتۆر نەجیب ڕەزوقی میخائیل دکتۆر لە نەخۆشخانەی سەربازی كەركوك



زەینولعابدین عومەر بەڕێوەبەری ناحیەی قادر كەرەم



سەلمان داوود كارمەند لە بەشی گەشت و گوزارو ناسنامە لە كەركوك



عەبدولقادر عەباس مەئموری مەرکەزی لێکۆڵینەوەی کەرکوك



محەمەد ئەدیب عەزیز بەڕێوەبەری داهاتی لیوای کەرکوك



محەمەد ئەمین یاملکی بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەتەپە



محەمەد خەلیل بەڕێوەبەری تەحریراتی لیوای کەرکوك



محەمەد ڕەئوف حیشمەت بەڕێوەبەری ناحیەی ئالتون کوپری



موقەدم سدقی عەباس بەڕێوەبەری تەجنیدی لیوای کەرکوک



محەمەد ڕەشاد عەلی یەعقوبی مەئموری مەرکەزی خورماتوو



عەبدولباقی نوری ساحیبقڕان قائیمقامی قەزای داقوق

* ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک لە ئێستادا:-
١- ڕێبوار فائیق عەبدولمەجید (سەرۆک بە وەکالەت).
٢- ئەلماس فازڵ ئاغا (بڕیاردەری ئەنجومەن).
٣- ئیبراهیم خەلیل ڕەشید
٤- ئەحمەد عەبدوڵڵا ڕەزا.
٥- ئەدوارد ئۆراها ئۆدیشۆ.
٦- ئازاد سابیر
٧- ئاوات محەمەد ئەمین
٨- بابەکر سدیق ئەحمەد
٩- بورهان موزهر عاسی
١٠- پەروین محەمەد ئەمین
١١- تەحسین محەمەد عەلی وەلی
١٢- تورکان شوکور ئەیوب
١٣- جەمال مەولود باپیر
١٤- جەواد جاسم محەمەد
١٥- جوان حەسەن عارف
١٦- دلشاد پیرۆت عەزیز
١٧- ڕەعد ڕوشدی ئاگا
١٨- ڕەملە حەمید ئەحمەد
١٩- ڕیاز محەمەد دانوك
٢٠- ساهیرە سەیفەدین
٢١- سلڤانا بۆیا ناسر
٢٢- سوتیلن ئستیفان یوسف
٢٣- شێرزاد عادل خورشید
٢٤- مەعەن ئیبراهیم محەمەد ئەلحەمدانی
٢٥- عەدنان نورەدین محەمەد
٢٦- عیرفان جەمال تۆفیق
٢٧- عەلی مەهدی سادق
٢٨- عەلی نامیق ڕەشید
٢٩- فوئاد حوسێن کۆیخا.
٣٠- قاسم حەمزە ئەحمەد
٣١- گەلاوێژ عەبدولجەبار
٣٢- گوڵەن ئەحمەد ڕەشید
٣٣- لەیلا محەمەد خدر
٣٤- مەجید عیزەت جومعە
٣٥- محەمەد خدر غەرب
٣٦- محەمەد خەلیل نوسەیف
٣٧- محەمەد کەمال سالح
٣٨- مەحمود محەمەد مەجید
٣٩- نەجات حوسێن حەسەن
٤٠- نەسرین خالید عەبدولوەهاب
٤١- هالە نورەدین



عەبدوڵڵا عەزیز بەڕێوەبەری ناحیەی مەلحە

* فەرمانگەی پۆستەی عێراق
لە ساڵی (١٩٢١) ژمارەی فەرمانگەی سەر بە پۆستەی عێراق (٥) فەرمانگە بووە کە لەنێویاندا پۆستەی موحەمەرە و ئەحواز و لەسەرەتای بیستەکاندا لە پۆستەی عێراق جیابووەوە کە لەژێر سەرپەرشتی کەسێکی کارگێری بەریتانی بوو بەناوی (D.smith.G.E.O) هەروەها پۆستەی کوێت لە چلەکاندا لێی جیابووەوە و فەرمانبەرە بەریتانییەکان تا نیسانی ساڵی (١٩٢٣) سەرپەرشتیاری فەرمانگەی پۆستەی عێراق بوون، لەدواییدا حیکمەت سلێمان دامەزرا لەلایەن سەرۆکایەتی حکومەتی عێراقەوە بۆ چەند جارێك بەناونیشانی بەڕێوەبەری پۆستە و گەیاندنی عێراق.
لە ١ی نیسانی ساڵی ١٩٢٣وە هەموو بڵاوکراوەکانی پۆستەی عێراقی بەزمانی عەرەبی بوو کە لەسەرەتادا بە زمانی ئینگلیزی بووە.
* بەشەکانی فەرمانگەی پۆستە و گەیاندن لە ساڵی ١٩٢٧ بەم شێوەیە بوو:-
- ئەبو سەخیر، هەولێر، بەدرە، بەسرە، بەعقوبە، بەغدادی١، بەغدادی٢، شاری بەسرە، سەربازگەی بەغدا، ڕۆژئاوای بەغدا، ئەلبەغیلە، تکریت، تەلەعفەر، تلکێف، چەمچەماڵ، حەدیسە، حیللە، ئەلحەی، خانەقین، دەلتاوە، دهۆك، دیوانیە، ڕوتبە، ڕومادی، ڕومێسە، ڕەواندوز، زاخۆ، زوبێر، سامەڕا، بەنداوی هیندییە، سلێمانییە، سلێمان بەگ، سەماوە، سنجار، بازاڕی شیوخ، سیبا، شامیە، شرگات، شەترە، شەهرەبان، سوێرە، داقوق، تۆبریچ، خورماتوو، عەقرە، عەلی غەربی، عەماددیە، عەمارە، عانە، فاو، فەلوجە، قەرەتەپە، قزلبات، قەلعەت سالح، قەلعەت سوکەر، قورنە، کازمیە، کەربەلا، کەرکوك، کفری، کۆیە، کوفە، کووت، کوێت، ماکیل، مەجلیس ئەلئومە، مەحموودیە، موسەیەب، مولتەقا ئوڕ، مەندەلی، موسڵ، ناسریە، نەجەف، هیت.

*** ناوی قائیمقامەکانی قەزای کەرکوك:-**

١- سدیق رەسوڵ قادری، لەنێوان ١٩٤٦- ١٩٤٧
٢- عەبدولقادر بابان، لە ٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٧- ٣ی مایس ساڵی ١٩٥٩
٣- ئەحمەد کەریم شەریف، لە ٣ی مایس ساڵی ١٩٥٩- ساڵی ١٩٦٣
٤- خەلیل یاسین جەراد، لەنێوان ١٩٧٧- ١٩٨٠
٥- عەلی حوسێن عەلوان، لەنێوان ١٩٨٠- ١٩٨٥
٦- زیاب حەنفیس، لەنێوان ١٩٨٥- ١٩٨٩
٧- ئەنس عەبدولمەجید، لەنێوان ١٩٨٩- ١٩٩١
٨- موممتاز هاشم جاسم، لەنێوان ١٩٩١- ١٩٩٧
٩- حامید رەشید حامید، لەنێوان ١٩٩٨- ٢٠٠٠
١٠- قەیس عەبدولکافی حوسێن، لەنێوان ٢٠٠٠- ٢٠٠٣
١١- ئیحسان عەبدولمەجید گلی، لەنێوان ٢٠٠٥- ٢٠١٠
١٢- کامیل عەبدوڵڵا ساڵەیی، لەنێوان ٢٠١٠- ٢٠١٦

*** بەڕێوەبەرە گشتییەکانی ژووری بازرگانی کەرکوك:-**

١- عەبدولهادی ئاوچی، لەنێوان (١٩٥٧- ١٩٥٨)
٢- محەمەد عەباس ساڵەیی، لەنێوان (١٩٥٨- ١٩٦٩)
٣- حەسانی یاسین ئەلحەدیسی، لەنێوان (١٩٦٩- ١٩٨٣)
٤- نەزار تۆفیق ئەلعەمری، لەنێوان (١٩٨٣- ١٩٨٩)
٥- مەزهەر میدحەت دەدە کاکەیی، لەنێوان (١٩٨٩- ١٩٩٣)
٦- سەباحەدین محەمەد سەلاح، لە (١٩٩٣- بەردەوام).

*** بەڕێوەبەرییە گشتییەکانی پۆلیسی پارێزگای کەرکوك:- کاوە محەمەد (خەیام)**

١- عەبدولڕەزاق فەتاح لە ٢١ی تشرین یەکەمی ساڵی ١٩٤٥
٢- عەمید (سەلیم ئەلبەدری)، لەنێوان (١٩٦٧- ١٩٦٩)
٣- عەمید (عەبدولڕەزاق ئەلراوی)، لەنێوان (١٩٦٩- ١٩٧١)
٤- لوقمان (سەلیم ئەلخەیات)، لەنێوان (١٩٧١- ١٩٧٤).
٥- عەقید (فوئاد تەها ئەلئەحمەد)، لەنێوان (١٩٧٤- ١٩٧٧)
٦- عەقید (یونس سابت بەشیر)، لەنێوان (١٩٧٧- ١٩٨٠)
٧- عەقید (سوهەیل بەهیج ئەدیب)، لەنێوان (١٩٨٠- ١٩٨٣) لە بنەڕەتدا فەلەستینی بووە.
٨- عەقید (عەبدولکەریم موتعب حازور ئەلجومەیلی، لەنێوان (١٩٨٣- ١٩٨٥)
٩- عەمید (تاریق موتعب ئەحمەد ئەلجبووری، لەنێوان (١٩٨٥- ١٩٨٧)
١٠- عەقید (حەسەن سلێمان خەمیس ئەلخەزرەجی، لەنێوان (١٩٨٧- ١٩٨٩)
١١- لیوا (قاسم عوسمان بەکر ئەلعەزاوی، لەنێوان (١٩٨٩- ١٩٩١)
١٢- لیوا (خەیروڵڵا حەمادی عەبد)، لەنێوان (١٩٩١- ١٩٩٧)
١٣- عەمید زەکری ئەحمەد لافی ئەلغەریری، لەنێوان (١٩٩٧- ١٩٩٨)
١٤- عەمید ئەیاد ئەلبەدری، لەنێوان (١٩٩٨- ١٩٩١)
١٥- لیواو مەجید مەندیل (بۆ ماوەی دوومانگ)
١٦- لیواو هانی غسیس، لەنێوان (٢٠٠١- ٢٠٠٣)
١٧- عەمید (مەحمود عەبدوڵڵا) (پێش ڕزگارکردنی عێراق بەمانگێك)
١٨- لیوا (ئەحمەد ساڵح بەرزنجی، لەنێوان (٢٠٠٣- ٢٠٠٥)
١٩- لیوا (شێرکۆ شاکر)، لەنێوان (٢٠٠٥- ٢٠٠٧)
٢٠- لیوا (جەمال تاهیر بەکر)، لەنێوان (٢٠٠٧- ٢٠١٥)
٢١- عەمید (خەتاب عومەر) (٢٠١٥- بەردەوامە)

*** بەڕێوەبەرەکانی ئەوقافی پارێزگای کەرکوك:-**

١- مەلا ڕەزای واعیز لە ؟-١٩٢٥.
٢- عەبدولقادر عوسمان خەتیب (مەلا قادری ئیمام) (١٩٢٥- ١٩٣٤).
٣- جەلال قازی (١٩٣٤-١٩٤٢).
٤- بەهادین محەمەد عەلی (١٩٤٢-١٩٥٠).
٥- عەبدوللەتیف کوبەیسی (١٩٥٣-١٩٥٧).
٦- عەبدولمەجید ئەمین (١٩٥٣-١٩٥٧).
٧- عەبدولجەبار عەبدولکەریم ئەحمەد شکاکی (١٩٥٨- ١٩٦٣).
٨- حیکمەت دوراجی (١٩٦٣-١٩٦٤).
٩- محەمەد فەوزی جومعە عیسا (١٩٦٤-١٩٧٧).
١٠- عەدنان ناجی (١٩٧٧-١٩٧٨).
١١- عەبدولجەبار عوبێدی (١٩٧٨-١٩٧٩).
١٢- قوتەیبە ڕەزا (١٩٨٠-١٩٨١).
١٣- محەمەد ئیسماعیل ئیبراهیم (١٩٨١-١٩٩٥).
١٤- حوسێن تاهیر کەسنەزانی (١٩٩٥-١٩٩٦).
١٥- عەدنان حەمەد عەبدولغەفوور ئەلنعێمی (١٩٩٦-٢٠٠٣)
١٦- مستەفا حەسەن حوسێن (٢٠٠٣-٢٠١٠).
١٧- ئەحمەد جەمیل مەلا عەبدولمەجید مودەڕیس ٢٠١٠- ).

*** بەڕێوەبەرەکانی باج و داهاتی کەرکوك**

ئەم بەڕێوەبەرییە لەسەرەتا سەر بەدەستەی باج و داهات و عەقار بوو لە بەغدا:

١- خەدیجە عەلی عەباس (١٩٨١-١٩٨٢).
٢- سەباح نوری ئەلبەکر (١٩٨٣-١٩٨٥).
٣- عیماد عەبدولحوسێن ئەلبەیاتی (١٩٨٥-١٩٩٣).
٤- نەجات فەیزوڵڵا میرزا (١٩٨٨-١٩٩٣).

ئەمە وەکو جێگر و هەڵسەنگێنەر دەستبەکار بووە.

٥- خالید حاجی ئەحمەد (١٩٩٣- بە وەکالەت).
٦- ئیلهام مەتی جەرجیس (١٩٩٧-٢٠٠٣).
٧- نزار فائیق ئیبراهیم (٢٠٠٣-٢٠٠٩).
٨- ئەکرەم مستەفا- بە وەکالەت (٢٠٠٩-٢٠١٠)
٩- مەنیعە داود حەمید (٢٠١٠-٢٠١٥).

لە ساڵی ٢٠٠٠ بەڕێوەبەرایەتییەکە کرایە دوو بەش بەناوی کەرکووکی یەکەم و کەرکوکی دووەم.

*** یەکە کارگێرییەکانی کەرکوك لە دوای هاتنی داعش:-**

داگیرکردنی کەرکوك لەدوای هاتنی داعش لەبەرواری ( ٢ - ٣٠)ی ئابی ساڵی ٢٠١٤ یەکە کارگێرییەکانی کەرکوك بووە دوو بەشەوەو بەشێکی زۆر لە قەزاو ناحییەکانی کەرکوك کەوتە ژێر رکێفی داعشەوەو بەشێکی تری لە چوارچێوەی پارێزگای کەرکوك مایەوە.

" لە ١٠ی حوزەیران تا ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی (٢٠١٤) داعش دەستی گرت بە سەر نەینەواو ناوچە عەرەبییەکانو سەربازگەکانی سوپاو بنکە ئەمنییەکانو کۆگاکانی چەكو زیندانەکانو بانکەکانو کۆگاکانی خواردەمەنیو دەرمانو بیرەکانی نەوتو رێگا سەرەکییەکان، هەروەها رووەو باشووری نەینەوا بۆ بەغداو رووەو رۆژهەڵاتیش بە ئاراستەی گوندە عەرەبییەکانی کەرکوك هات"[1].

داعش لەو ماوەیەدا بۆ بەهێزکردنی توانا مادییەکانی دوور لە چاوی دەزگا هەواڵگرییەکان، کاری بە قاچاخبردنی نەوتو فرۆشتنی نەوتی ئەنجام دەدا، لە هەمان کاتیشدا هێزەکانی عێراقی خەریکی بەرپەرچدانەوەی هێرشە کتوپڕەکانو هێرشە جۆراوجۆرەکانی بەرەکانی شەڕو هەڵگرتنەوەی بۆمبە چێندراوەکانو ئازادکردنی دەیان گوندی نێوان: کەرکوك، دیاله، تکریت، وەستاندنی پێشڕەویی چەکدارەکانی داعش بوون لە ناوچەکانی پشتێنەی بەغدا.

لە (٢-٣٠)ی ئابیش، داعش بۆ فراوانخوازی زیاتری دەسەڵاتەکەی لە ناوچە عەرەبیو کوردییەکاندا رووی کردە هەرێمی کوردستان، بە جۆرێك دەستی گرت بەسەر هەموو ناوچە کێشە لە سەرەکانی نێوان هەرێمو بەغدا.

داعش هەوڵیشیدا خۆی لە شەڕی رووبەروو و راستەوخۆ لابداتو پەنا بباتە بەر شەڕی ناوشارەکان، ئەویش لەپێناوی خۆشاردنەوە لە فڕۆکەکانی هاوپەیمانانو راکێشانی هێزەکانی حکومەتو حەشدی شەعبیو پێشمەرگە بۆ شەڕی کۆڵان بە کۆڵانی ناو شارەکان، کە زۆر جار لەم شەڕانەدا هێزە نیزامییەکان زۆرترین زیان دەکەن.

داعش هەوڵێکی زۆری دا، کە سەر تاپای پارێزگای کەرکوك داگیر بکاتو ناوی (ویلایەتی کەرکوك) بە سەر ئەم دەڤەرەدا بسەپێنێت، بەڵام شەڕی پێشمەرگەو هێزی هاوپەیمانان، فراوانخوازی داعشی لە چوارچێوەی خۆی سست کردو پاشەکشێی پێکرد هۆزە سوونییەکانی کەرکوك رۆڵێکی گەورەیان بینی لە هێنانی داعش بۆ داگیرکردنی ئەم دەڤەرە، تابۆ ئەوەی سونەکان باڵا دەست بن.

داعش یەکە کارگێرییەکانی لە عێراقدا بەم شێوەیە دابەشکرد لەسەر شێوەی (ویلایەت):-

١- ولایەتی (نەینەوا)، موسڵ، حەمام ئەلعەلیل.
٢- ولایەتی (کەرکوك)، حەویجە، ریاز، رەشاد.
٣- ولایەتی (ئەنبار)، عانە، قائیم.
٤- ولایەتی (سەلاحەدین).
٥- ولایەتی (سەرووی بەغدا)
٦- ولایەتی (خوارووی عێراق)
٧- ولایەتی (جەزیرە)، ئەلبەعاج، تەلعەفەر، ئەلمحەلەبیە.
٨- ولایەتی (دیجلە)، ئەلشەرگات.

بۆیە هەستا بە هەڵوەشانەوەی پارێزگاکانو لەسەر بنەمای ولایەتی ئیسلامی دایرشتەوەو لەسەر بنەمای جوگراف شوێنەکان بنەمای بۆ کرا.

ولایەتی کەرکوك: پێکهات لە قەزای حەویجەو ناحییەکانی رەشادو ناحیەی ریاز بە هەموو گوندو شارۆچکەکانیانەوە، بەڵام بەشێك یا گوندێك لە ناحیەو قەزاکانی داقوقو تازەو پردێ چووە چوارچێوەی ئەو یەکە کارگێرییەوە کە بەشێك لە گوندەکانی دەگەیاندنو بەشێکیان لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە رزگار کرایەوە.

هەروەها بەشێك لە گوندەکانی قەزای خورماتوو کە لە ئێستادا سەر بە پارێزگای سەلاحەدینە کەوتە چوارچێوەی ویلاتەی سەلاحەدینەوە بەڵام بەشێکی زۆری رزگار کرا یان بووەتە مەیدانی شەڕی هەردوولا.

*** سەرچاوە.**

١- جیهانی داعش، د. هیشام هاشمی، وەرگێڕانی: هێمن مەحمود، چاپخانەی (چوارچرا)، ٢٠١٥.

*** بارودۆخی خزمەتگوزارییە گشتییەکان لەنێوان ساڵانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو تا ساڵی ١٩٥٧:**

**د. دڵشاد مەحموود**

دابینکردن و فەراهامکردنی خزمەتگوزاییە گشتییەکان لە هەر کات و سەردەمێك، هۆیەکی کاریگەرە لە بووژانەوەی کایە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری و سیاسییەکانی هەر شارو ناوچەیەك. خزمەتگوزارییە گشتییەکان کارو کارتێکردن لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی دەهێنێتە ئارا. بە نەبوون و کەمییان ئاست نزمیی پلەی شارنشینی و بە بوونیشیان نیشانەکانی بووژانەوەی کۆمەڵایەتی دەسەلمێنێت. ئامرازو لایەنی پەیوەندیداری بەهێز بریتییە لە شارەوانییەکان و لایەنەکانی دی.

١. شارەوانی:

مێژووی پەیدابوونی شارەوانییەکان لە عێراق دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی دەیەی هەشتەمی سەدەی نۆزدەهەم، ئەو کاتەی لە شاری بەغداد لە ساڵی (١٨٧٨)دا شارەوانیی ئەعزەمییە (الاعظمیة) دامەزرا. دواتر بە شارە گەورەکانی دیکەی عێراقدا: موسڵ و بەسرەو کەرکوك بڵاوبوونەوە. پەیدابوونی شارەوانییەکان نیشانەی گۆڕانکارییەکانی واقیعی گەورە شارەکانی عێراق بوو. لێرەوە هەنگاوە سەرەتاکان رووەو ژیانی نوێگەری و گونجاندن لەگەڵ ڕۆحییەتی سەردەم دەستی پێکرد. خەڵکی شار لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی شارەوانییەکانەوە ممارەسەی یەکەم شکڵی هەڵبژاردنەکانی کرد. هەر لە ڕێگەی شارەوانییشەوە نوێنەرانی شار بۆ (ئەنجوومەنی مەبعوسانی عوسمانی) دیاری دەکرا[١]. سەبارەت بە پێکهاتەی دەستەی شارەوانییەکانی کەرکوك لە ڕۆژگاری پاشایەتی زۆرتر لە کوردو تورکمانەکان پێکدەهات. تا ڕۆژگاری پاشایەتی کەرتەکانی شارەوانیی کەرکوك گەیشتە چوار بەشی جیاجیا[٢].

هەرچەندە شارەوانیی کەرکوك لە سەرەتای سەردەمی پاشایەتیدا، سەبارەت بە دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکانی شارەکە بە پاڵپشتیی دەسەڵاتدارانی ئینتیداب بەردەوامبووە لەسەر کارەکانی و برە پارەیەکی زۆری بە ڕێگەو شێوازی جیاجیا لە دانیشتووان وەرگرتووە، بەڵام هەرگیز هاوشانی خواست و داواکارییەکانی دانیشتووان نەبووە. کەم ئەزموونی و ناکارایی کارەکانی دەسەڵاتداران و فەرمانبەرانی شارەوانیی کەرکوك بە ڕوونی لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا دەردەکەوێت. بە گوێرەی ڕاپۆرتە فەرمییەکانی لیوای کەرکوك، ساڵی (١٩٢٣) بوودجەی لیوای کەرکوك بریتیبووە لە (١٤٢,٣٦٨) ڕووپیە. بەڵام لە ئەنجامی ئەوەی ئەم برە پارەیە، بە کارامەیی و شارەزایی، لە داهێنان و دروستکردنی پرۆژە خزمەتگوزارییەکاندا خەرج نەکراوەو نەتوانراوە لەو پارە زۆرە سوودی گەورە ببینرێت. بۆیە برێکی زۆری پارەکە بۆ ساڵی ئایندە دەور کراوە. لەو ئاکامەشدا ساڵی (١٩٢٤) بوودجەی لیوای کەرکوك گەیشتووەتە (١٩٥,٧١٢) ڕووپیە[٣].

سەبارەت بە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی لیوای کەرکوك، چارەسەرکردنی کێشەی کەم ئاوی، داواکاری و خواستی گەورەی دانیشتووانی شاری کەرکوك بووە. پەیتا پەیتا دانیشتووان لە ڕێگەی جۆراوجۆرو بە شێوازی هەمەچەشن دەنگی نارەزاییەکانیان بە گوێی دەسەڵاتداران گەیاندووە. لەم ڕووەوە، دووبارەکردنەوەی داواکارییەکان لەسەر ڕووپەری ڕۆژنامەکەی ئەو ڕۆژگارەی شارەکە (کرکوك)، بەردەوام بووە[٤]. ئەم کێشەیەی، زۆرترین بەدەنگەوە هاتن و زیاترین پێداگیریی و موکربوونی، لە بازنەی گفتوگۆو لێدوانەکانی نوێنەرانی کەرکوك، لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقیدا داگیر کردووە[٥]. لە ئاکامی بەردەوامبوونی دەنگی نارەزایی و داواکارییەکانی دانیشتووان و لێدوانەکانی نوێنەرانی کەرکوك، لەبارەی چارەسەرکردنی کێشەی کەم ئاوی، حکومەت ناچاربوو لە ڕێگەی شارەوانییەکان و لایەنەکانی دیکەوە هەنگاو رووەو نەهێشتنی ئەو گرفتە هەڵنێ. پێشتر دابینبوونی ئاوی پاکی شاری کەرکوك، سەرباری ژمارەیەك کارێز، لە ڕێگەی چوار سەرچاوەی ئاویی دەوروبەری شارەوە بوون: (زێویە، بڵاوە، قۆریە، تسن)[٦]. بەڵام لە ئاکامی هەوڵە بەردەوامەکانی شارەوانی وردە وردە ئاوی پاك بە ڕێگەی بنیاتنانی تۆڕێکی نوێی گەیاندنی ئاو، کێشەی کەم ئاوی بەرەو بچووك بوونەوە چوو. شارەوانی لە سییەکاندا توانی لە (تەپە)وە ئاو بۆ گەڕەکەکان ڕاکێشێت بەهۆی دانانی ماتۆری بەهێزو دروستکردنی عەمبارێکی گەورەی ئاو لەسەر تەپە. لە ساڵی (١٩٤٦)دا شارەوانی بە ڕێگەیەکی دیکە، لە ئاوی (زێی بچووك)ەوە، بە بۆری ئاو بۆ شار دابین بکات[٧]. بەوەش تارادەیەك کێشەی کەم ئاوی چارەسەرکرا.

یەکێك لە خزمەتگوزارییە گشتییە فەرامۆشکراوەکانی دیکەی کەرکوك، کێشەی دابینکردنی وزەی کارەبا بوو. ئەم لایەنەش وەك کێشەی کەمی ئاو خواستی سەرەکی دانیشتووان بووە. بە هەمان شێوەش دانیشتووان داواکارییەکانی خۆیان لەسەر ڕووپەری ڕۆژنامەی (کرکوك) خستووەتەروو[٨]. هەروەها لە هۆڵی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانیش سەدای هەبووە.لەو نوێنەرانەی لەمەڕ بەرفراوانترکردنی تۆڕەکانی وزەی کارەبای کەرکوك، لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا، وەدەنگ هاتوون و داواکاری خۆیان خستووەتە بەردەم حکومەت: (ناجی هورمزی)، (داوود بەگی جاف)و (عەلی خادم سەججادە) بوون[٩].

لە ساڵانی سی، لە ئاکامی گەورەبوون و گەشەکردنی شارو شاڵاوی کۆچی لادێیەکان بۆ نێو شار، بێ سەروبەری و پیسییەکی زۆر لەسەر شەقام و لەنێو کۆڵانەکانی گەڕەکەکان هاتە ئارا. شارەوانی لە ئەنجامی کەمتوانایی و ڕێ تێنەچوونی گرتنەبەری ئامرازی پێویست بۆ پاککردنەوەی شەقام و شوێنە گشتی و کۆڵانە تەسك و باریك و پێچاوپێچەکان بارێکی ناهەموار، بە تایبەت لە گەڕەکە کۆنەکانی ناو شارو گەڕەکە

تازەدروستبووەکانی پەراوێزی شار، پەیدا ببوو. ڕاستیی، ڕەنگە لۆژیکانە بێت هۆی سەرەکی پشتگوێخستنی هەندێك لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان، لە لایەن حکومەتەوە، بۆ کێشەی نەبوونی دارایی پێویست بگەڕێندرێتەوە[١٠]. بڕوانە خشتەی ژمارە (٣١). بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێك جار ئەمە بیانوویەکی کارا بووە بەدەستی دەسەڵاتدارانەوە، لە پێناو پشتگوێخستنی کاروبارو خزمەتگوزارییە گشتییەکانی بڕێك شارو ناوچە[١١]، بە تایبەت شارە کوردییەکان.

خشتەی ژمارە (١)

ژمارەو ڕێژەی خەرجییەکانی شارەوانی لە کۆی خەرجییەکانی دەوڵەت و پشکی تاك بە دینار[١٢].

| ساڵ | خەرجیی دەوڵەت | خەرجیی شارەوانی | ڕێژەی سەدی | پشکی تاك |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٢٧ | ٤,٢٧٤ | ٣٠٠ | ٧,٠٢ | .... |
| ١٩٢٨ | ٤,٤٩٢ | ٢٩٩ | ٦,٦٠ | ... |
| ١٩٣٣* | ٣,٩١٨ | ٢٩٣ | ... | ... |
| ١٩٣٦ | ٧,١٥٨ | ٧٠٣ | ٩,٢٨ | ٢٧٥ |
| ١٩٣٧ | ٧,٥٤٢ | ٦٤٥ | ٩,٣٠ | ٢٤٥ |
| ١٩٣٨ | ٨,١٣٤ | ٦٣٨ | ٧,٨٠ | ٢٣٤ |
| ١٩٣٩ | ٨٦,٦٠٢ | ٦٣٥ | ٧,٣٠ | ٢٢٦ |

لە خشتەی سەرەوەدا ڕوون دەبێتەوە هەرگیز خەرجییەکانی شارەوانییەکان لە کۆی گشتیی خەرجییەکانی دەوڵەت نەگەیشتووەتە (١٠٪). بێگومان لەوەی ئەو خەرجییانەی کە بۆ شارەوانییەکانیش دابینکراوە، لە ناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی دیکە بەرزو نزمی تێدا بووە. بۆیە بەو هۆیەو زۆر هۆی دی شارەوانییەکان نەیانتوانیوە لەو ڕۆژگارەدا هاوشانی پێویستییەکانی سەردەم هەنگاو بنێن. لە شاری کەرکوکدا لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان و ئاستەنگ و سەختیی چارەکردنی ئاوەڕۆکان و بڵاوبوونەوەی تەویلەی ئاژەڵان لەنێو شاردا بەهۆی خان و ماڵە لادێنشینە تازە پەیدابووەکان، لە زەحمەتییەکانی ئەرکی شارەوانی زۆرتر بوون[١٣].

لە دوو دەیەی چوارەم و پێنجەمی سەدەی بیستەم، شارەوانی کۆمەڵێك هەنگاوی گەورەی لە بواری دروستکردن و لەبارکردنی ڕێگاوبانەکان و دروستکردنی باخچەو ناوچەی سەوزایی هەڵناوە. بۆ نموونە لە بواری سەوزکردنی شاردا، ساڵی (١٩٤٠) باخچەی (شا غازی) بە ڕووپێوی (٢٠) هەزار مەتری چوارگۆشە بنیاتنرا، بۆ حەوانەوەی خێزانەکان و هۆیەکانی خۆشرابواردنی منداڵانیشی تێدا دانرا. ساڵی (١٩٤١) باخچەیەکی دیکە لە باکووری شار دروستکراو ناوی لێنرا (ام الربیعین) لەبەر ئەوەی کەوتبووە سەر ڕێگەی موسڵ. ڕووپێوی ئەم باخچەیە (٥٠) هەزار مەتر چوارگۆشە بوو. کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٤٢)یش لە دەروازەی شار لەسەر ڕێگەی سلێمانی باخچەیەکی دیکە دروستکرا. لە بواری کردنەوەو لەبارکردنی ڕێگاوبانەکانیش زۆر کاری گەورە ئەنجامدرا. هەروەها لە ساڵی (١٩٤١) مەلەوانگەیەکی گەورەی گشتی بە تەنیشت ڕۆژهەڵاتی باخچەی (ام الربیعین) کراوەتەوە، کە (١٥٠) هەزار گالۆن ئاوی لەخۆ دەگرت[١٤]. لە پەنجاکانیشدا، دوای لەباربوونی خەرجییەکانی شارەوانی کاری بەرچاو ئەنجامدراوە، بۆ نموونە پەرژینکردنی باخچە گشتییەکان و باخچەی دەوری قەڵاو دروستکردنی باخچەیەکی دیکە لە ڕێی بەغدادو ڕواندنی دارو درەخت لە شەقامەکان و هێنانی شەتڵ و تۆو بۆ زۆربوونی گوڵەکان و ڕاگرتنی پاك و خاوێنی شارەکەو فراوانکردن و دروستکردنی شەقامی نوێ لە کارە بەرچاوەکانی شارەوانیی کەرکوکە[١٥].

هەرچی ڕێگاوبانەکان بوو، بە گوێرەی سەرچاوە تایبەتەکان، قەڵەمبازێکی چاکی بەخۆوە بینیوە، بەوەی زۆر شەقام و ڕێگا، سەرەکی و لاوەکی، لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی، کراونەتەوەو قیرتاوکراون[١٦]. ساڵی (١٩٥٤)یش، ئەو پردە بەردینەی، کە مێژوویەکی کەونارای هەبوو، ئەمبەرو ئەوبەری شاریشی بە یەکدییەوە دەبەستەوە، ڕووخێنراو لەبری ئەو، دوو پردی ئاسنین دروستکران[١٧]. هەر هەمان ساڵ، باڵەخانەیەکی گەورە بۆ بەنکی ڕۆژهەڵاتی، بە گوژمەی (دە) هەزار دینار دەست بە بناغە لێدانی کرا[١٨].

لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری پاشایەتی، حکومەت هەنگاوی جیدی، لە هەندێك ڕووەوە، هەڵناوەو باربووی کردوون. وەك: پرۆژەکانی (کارەبا، ڕێگاوبان، دروستکردنی پرد یا نۆژەنکردنەوەیان، گەیاندن، بەنك و زۆر بواری دی). بەپێی کۆمەڵە ئاماری گشتیی ساڵانەی (١٩٥٧)، ساڵانی (١٩٥٥-١٩٥٦)، لیوای کەرکوك، لە ڕووی بەکاربردنی یەکەی کارەباوە، لەسەر ئاستی هەر چواردە لیواکەی عێراق، بە پلەی یەکەم هاتووە. بەڵام ساڵی (١٩٥٧)، هەنگاوێك دواکەوتووەو بووەتە پلە دوو پاش بەغدای پێتەخت. دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت کە پرۆژەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە بەکاربردنی کارەبا لە شاری کەرکوکدا هاوبەشەو ئەم برە بە تەنها لە لایەن دانیشتووانی شارەوە بەکارنەهێنراوە. لە ڕووی خزمەتگوزاریی بەنکییەوە، شاری کەرکوك لە کۆتاییەکانی سەردەمی پاشایەتی چوار لقی بەنکی خۆماڵی و لقی بانکێکی بیانی تێدا کراوەتەوە، کە ئەو ڕۆژگارە لە هەموو عێراقدا حەوت بانکی خۆماڵی و هەشت بەنکی بیانی هەبوون[١٩]. سەبارەت خزمەتگوزارییە سەرەکییەکانی دیکەش سەرچاوە فەرمییەکان ژمارەی زۆر گەورە گەورە تۆمار دەکەن کە جێی گومانن، وەك: قاوەخانە، میوانخانە، سینەما، گەراج، وێستگەکانی نەوت و بەنزین و گاز، شوێنی پارە گۆڕینەوەو قەباڵە (صیارفة)، شوێنی ئوتو، سەرتاشخانەو زۆر خزمەتگوزاریی دیکە. ئەوانەی لە

دامەزراوە خزمەتگوزارییەکانی کەرکوکدا کاریان کردووە خۆیداوە لە (٢٤١٨) کەس لە ژن و منداڵ و پیاو[٢٠].

**٢. کۆمپانیای نەوتی عێراق:**

کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمدا، لە باربووکردنی شارەوانی و پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا شوێن پەنجەی دیاری هەبووە. بە تایبەت لە رووی دابینکردنی وزەی کارەباوە بە هێزی (١١) هەزار ڤۆڵت بۆ شارەکەو رووناککردنەوەی شەقامە سەرەکی و شوێنە گشتییەکانی شاری کەرکوك[٢١]. هەروەها لە هێنانە ئارای پرۆژەی جۆراوجۆر بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی شاری کەرکوك. رەنگە نموونەی هەرە دیاری ئەو خزمەتگوزارییانەی دەسەڵاتدارانی کۆمپانیای نەوت ئەنجامی دابێت بریتی بێت لە دروستکردنی سەدان یەکەی نیشتەجێبوون بۆ کارمەندانی کۆمپانیاکەیان لە سەرەتای پەنجاکاندا.

وێرای ئەو کارانە، کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوك هاوکارییەکانی خۆی بۆ کەمکردنەوەی کێشەی کەم ئاوییش پێشکەش کرد. ئەویش بە دابینکردنی رۆژانەی (٧) ملیۆن گالۆن ئاوی پاك بە بۆری بۆ دانیشتووانی کەرکوك[٢٢]. بەڵام ئەم پرۆژەیە کەموکوری تێدا هەبووە، چونکە ئەو تۆرە ئاوەی کۆمپانیای نەوت بنیاتی نابوو لە هەندێك شوێن تێکەڵ بە نەوت ببوو، لەو ئەنجامەشدا دانیشتووانی کەرکوك لە هەندێك شوێندا ئاوە تێکەڵبووەکە دەخۆنەوە. بۆیە زۆوری بازرگانیی کەرکوك بەر لە کۆتایی هاتنی سەردەمی پاشایەتی نارەزایی دەربریوە و داوای چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەی کردووە[٢٣].

لە دوای هەوڵەکانی شارەوانی و کۆمپانیای نەوتی عێراق بۆ فەراهەمکردنی ئاوی پاك و وزەی کارەبا، بەپێی زانیارییەکانی سەرچاوەیەکی ئاگادار، ساڵی (١٩٥٧) ئەو ماڵانەی خزمەتگوزاریی ئاو و کارەبایان پێگەیشتووە لە کۆی گشتیی (٢٤٦٧٨) ماڵ بەم شێوەیە بووە: ئەو ماڵانەی بە بۆری ئاویان بۆ راکێشراوە (٩٢٤٢) ماڵ، ئەو ماڵانەی وزەی کارەبایان هەبوو (٧٤١٦) ماڵ[٢٤]. لەمەوە روون دەبێتەوە ئەو ماڵانەی بە بۆری ئاویان بۆ راکێشراوە، لەو ساڵەدا تەنها (٣٧,٤٥٪)ی لە کۆی گشتیی ماڵەکانی قەزای ناوەندیی کەرکوکیان پێکهێناوە. هەروەها ئەو ماڵانەی لە وزەی کارەبا سوودمەند بوون، تەنها بریتی بووە (٣٠,٠٥٪)ی لە کۆی گشتیی ماڵەکانی قەزای ناوەندیی کەرکوك.

**٣. ئیدارەی مەحەللی:**

ئیدارەی مەحەللی بە هەمان شێوەی شارەوانی دەستی لە بووژانەوەی شار و پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا هەبوو. بەڵام بە پلەیەکی نزمتر. دەستی باڵای ئیدارەی مەحەللی لە کردنەوەی قوتابخانە و نەخۆشخانە و کتێبخانە و دابینکردنی جلوبەرگی قوتابیان و دروستکردنی بازاری هاوچەرخ (بازاری عەسری)، بنیاتنانی تیمارگەی ڤێتەرنەری و هێنانە ئارای کۆمەڵێك پرۆژەی دی دیار و بەرچاوە. لە ساڵانی پەنجادا کارەکانی ئیدارەی مەحەللی هێز و برستی زیاتریان پێوە دیارە، بە تایبەت پاش ئەو کۆنگرەیەی بۆ موتەسەریفی لیواکان لە (٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٤) سازکرا، کە تیایدا جەخت لەسەر کاراکردنی کارەکان و داهێنان و ئەنجامدانی پرۆژەکانی خزمەتگوزاریی گشتی و لەکارنانی دەستی بێکاران و زۆرکردنی پرۆژەکانی ئاو و کارەبا لە شارەکاندا کراوەتەوە[٢٥]. بۆیە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٤-١٩٥٧) پرۆژەگەلی زۆر لە لایەن ئیدارەی مەحەللییەوە ئەنجام دراوە[٢٦].

**٤. ئەنجوومەنی ئاوەدانکاری:**

مێژووی پەیدابوونی ئەم ئەنجوومەنە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیستەم، لە دوای هەمووارکردنەوەی ماف و جیاووگەکانی نەوتیش هێز و برستی زیاتر بوو. ئەوەی تایبەت بێت سەبارەت بە کارەکانی ئەنجوومەنی ئاوەدانکاری لە شاری کەرکوك دابینکردنی هەندێك لایەنی خزمەتگوزاریی گشتیی بوو بۆ دانیشتووانی شارەکە. لەوانە: بە مێژووی (٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٥) بە ویستیی پاشایەتی (الارادة الملکية) ژمارە (١٠٣٢)، بریار دراوە ئەنجوومەنی ئاوەدانکاریی عێراق دەستپێشخەری بکات لە دروستکردنی خانوو بۆ کرێکار و ئەو فەرمانبەرو خەڵکانەی داهاتیان مامناوەند و کەمە لە شاری کەرکوك و شارانی دی بە گوژمەی دە ملیۆن دینار[٢٧].

کارەکانی ئەنجوومەن هەر لە بواری بنیاتنانی خانوو و بەردا نەبوو، بەڵکو یارمەتی گەورەی پێشکەش بە ئیدارەی مەحەللی و شارەوانی کرد لە دابینکردنی ئاوی پاك و وزەی کارەبا. سەرباری ئەوانەش لایەنی دیکەشی لە پێداویستییەکانی شارەکەی گرتووەتە ئەستۆ[٢٨]، وەك: بنیاتنانی بگۆڕێکی (بدالة) ئۆتۆماتیکی لە (کانوونی دووەمی ١٩٥٢) بە گوژمەی (کلفة) (٧) هەزار دینار، دروستکردنی خانەی وێستگەی لاسلکی (دار الاذاعة اللاسلکية) بە زمانی کوردی لە (مایسی ١٩٥٤) بە گوژمەی (١١٢٥٠) دینار[٢٩].

لە چوارچێوەیەکی گشتییدا، دەوڵەت بە درێژایی رۆژگاری پاشایەتی، تەنیا لە سنووری راوەستاوکردنی دامەزراوە حکومییە پێویستییەکاندا نەبێت، نەیتوانی ببێتە ئامراز و توخمێکی کارای ئاوەدانکاریی شاری کەرکوك. بۆیە پرۆژەکانی ئاوەدانکاریی نیشتەجێبوون، کە لە بازنەی پرۆگرامەکانی ئەنجوومەنی ئاوەدانکارییدا بوو، کاریگەرییەکی بەرجەستەبووی ئەوتۆیان بەسەر لایەنی ئاوەدانکاریی شاری کەرکوکدا نەهێنا.

بە گوێرەی دوایین سەرژمێریی فەرمی، واتە سەرژمێرییەکەی ساڵی (١٩٥٧)، شاری کەرکوك کە لە (٢٢٨٣٠) یەکەی نیشتەجێبوون پێك دەهات، لە رووی چەشنی دابەشبوونی نیشتەجێبوونەوە، بەم شێوەیە بووە: (٦٤) خێزان لە خانووبەرەی گەورە (کۆشك و تەلار)، (١٧٥٥٩) خێزان لە نێو خانووی لە بەردو کەرپووچ دروستکراو، (٤٤٤١) خێزان لە خانووی لە قور دروستکراو، (٥) خێزان لە شووقە، (٤٨) خێزان لە کۆلیت (کۆختە)، (٤٨) خێزان لە دوکان، (٤) خێزان لە دەرودەشت، (٣٠٨) خێزان

لە شوێنانی دیكە، (١٧٨) خێزان شوێنی نیشتەجێبوونیان دیار نییە، (١٧٥) خێزان لە ناو دامودەزگا میرییەكان. لە نێو ئەو ژمارانەی سەرەوەشدا، (٩٩٤٠) خێزان لە یەك تاكە ژوور ژیانیان گوزەراندووە، (٤٣١٤) خێزانیش لە دوو ژوور ژیواریان بووە، (٣,٦٦٢) خێزان خانووەكەیان بریتی بووە لە سێ ژوور، (٢١٤٦) خێزان لە چوار ژوور، (١٠٠٣) خێزان لە پێنج ژوور، (٤٤٠) خێزان لە شەش ژوور، (١٨٤) خێزان لە حەوت ژوور، (٧٤) خێزان لە هەشت ژوور، (١١٥) خێزان لە نۆ ژوورو بە سەرەوە، (٩٥٢) خێزانیش ژمارەی ژوورەكانیان دیار نەكراوە[٣٠].

* سەرچاوەو پەراوێزەكان:

(١) بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: كمال مظهر احمد، الاطار الزمني لتاريخ العراق، ص٢٧.

(٢) بڕوانە: فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص٤٦.

(٣) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، ملفات وزارة الداخلية، رقم الملفة: ٧٣٧/ ٣٢٠٥٠، العنوان: مراسلات لواء كركوك، (١٩٢٣/٨/١٧-١٩٢٥/٩/٩).

(٤) بۆ نموونە بڕوانە: "كركوك" (ڕۆژنامە)، ژمارەی (٣٠٢)، كەركوك، ٢ مايس ١٩٣٠؛ژمارەی (٣٠٤)، ٩ مايس ١٩٣٠؛ ژمارەی (٣٠٧)، ٩ حوزەیران ١٩٣٠.

(٥) م.م.ن، الدورة الانتخابية الثالثة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٣١، محضر الجلسة الخامسة، ص٦٥؛ م.م.ن، الدورة الانتخابية الثالثة عشر، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٥٢-١٩٥٣، محضر الجلسة الثانية، ص٣٥٤.

(٦) عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق او خاطرات الحسني، ص١٥٢.

(٧) عبدالمجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص٩٧.

(٨) بڕوانە: "كركوك" (ڕۆژنامە)، ژمارەی (٣٠٤)، كەركوك، ٩ مايس ١٩٣٠؛ "كركوك" (ڕۆژنامە)، ژمارەی (٣٠٩)، كەركوك، ٣٠ حوزەیران ١٩٣٠.

(٩) م.م.ن، الدورة الانتخابية الثانية عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٥٠، محضر الجلسة الثالثة والعشرون، ص٣٤٢؛ م.م.ن، الدورة الانتخابية الثانية عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٥٠، محضر الجلسة (٤٤)، ص٧٦٦؛ م.م.ن، الدورة الانتخابية الثالثة عشرة، الاجتماع الاعتيادي لسنة ١٩٥٠، محضر الجلسة الرابعة، ص٥٧.

(١٠) بڕوانە: فخري الفخري، مذكرات فخري الفخري (١٩٠٨-١٩٩٥) الوزير وامين العاصمة في العهد الملكي، (اعداد وتقديم وتعليق: د.عماد عبدالسلام رؤوف)، بغداد، ٢٠٠١، ص١٣٤؛ نبيل عكيد محمود المظفري، المصدر السابق، ص١١١.

(١١) بڕوانە: م.م.ن، الدورة الانتخابية السابعة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٣٧، محضر الجلسة الثلاثين، ص ص٤٤٧-٤٤٨؛ م.م.ن، الدورة الانتخابية الثانية عشرة، الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٤٨، محضر الجلسة (١٣)، ص١٧٧.

(١٢) موسيس ديرهاكوبيان، المصدر السابق، ص٣٠.

(*) دەبێت سەرنج بۆ ئەوە ڕابكێشرێت كە بەر لە ساڵی (١٩٣٢) دراوی عێراق ڕووپیە بووە نەك دینار، بەڵام لەبەر ئەوەی سەرچاوەی خشتەكە زانیارییەكانی پشتی بە

دینار بەستووە بۆیە ئێمەش وەك خۆی وەرمانگرتووە.

(١٣) لە بیستەكاندا شارەوانی كەركوك فریای پاككردنەوەی شار لە زبڵو خاشاكە كۆبۆوەكانی نێو كۆڵانو شوێنە گشتییەكان نەكەوتووەو بە زەحمەت توانیویەتی ئەركەكانی جێبەجێ بكات. ئەگەر وا نەبێت، لابردنو گواستنەوەی خاشاكی كۆڵانەكانو شۆر حەمام نووسەرێكی هان نەدەدا بۆ دەربڕینی پێزانینیان بۆ شارەوانی. بڕوانە: "العراق" (جريدة)، العدد (٨٧٠)، بغداد، (٢٧ آذار ١٩٢٣).

(١٤) عبدالمجيد فهمي حسن، المصدر السابق، الجزء الثاني، ص ص٩٩-١٠٠.

(١٥) بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص ص٤١- وما بعدها.

(١٦) بڕوانە: فاضل ملا مصطفى، مجلس اللواء العام، ص ص٥٦-٥٧.

(١٧) مراسل، في كركوك: اعمار وتجديد، ص٤٤.

(١٨) بڕوانە: فاضل ملا مصطفى، جهود جبارة وراء كركوك الحديث، "أهل النفط"(مجلة)، العدد (٥٦)، كركوك، آذار ١٩٥٦، ص ص٣٢-٣٣.

(١٩) المجموعة الاحصائية السنوية العامة لسنة ١٩٥٧، ص ص٢٠٢، ٢٣٧.

(٢٠) المصدر نفسه، ص ص١١٩-١٢٠.

(٢١) S. H. Longrigg، Iraq، P ٣٨٢. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص٦٣٠)

(٢٢) فاضل ملا مصطفى، جهود جبارة، ص٣٢.

(٢٣) بڕوانە: "الاسواق التجارية" (مجلة)، العدد (٢٧٨)، بغداد، ١٤ حزيران ١٩٥٨، ص٢.

(٢٤) فهمي عرب آغا و فاضل محمد ملا مصطفى، ماذا في كركوك، ص٥٥.

(٢٥) عبدالرزاق الحسني،تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثامن، ص١٨٢.

(٢٦) دەربارەیان بڕوانە: فاضل محمد ملا مصطفى، مجلس اللواء العام، ص ص٥٦-٥٧؛ مراسل، في كركوك اعمار وتجديد، ص ص٤٤-٤٥.

(٢٧) عبدالرزاق الحسني،تأريخ الوزارات العراقية، الجزء التاسع، ص ص٢٠٤-٢٠٥.

(٢٨) ستيفن همسلي لونكريك و فرانك ستوكس، المصدر السابق، ص١٦١.

(٢٩) مراسل، في كركوك اعمار وتجديد، ص٤٤.

(٣٠) المجموعة الاحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص ص ٢٤٨-٢٤٩، ٢٤٤-٢٤٥.

*** مێژووی یەکە بەڕێوەبەری و کارگێڕییەکانی قەزاو ناحییەکانی پارێزگای کەرکوك:**

*** قەزای کەرکوك:**

سمکۆ بەهرۆز

قەزای کەرکوك بەیەکێك لەقەزا گرنگەکانی پارێزگای کەرکوك دەژمێردرێت و بایەخێکی تایبەتی هەیە لەهەموو لایەنەکانەوە، لەبەر ئەوە هەردەم جێگەی بایەخ و ئاوڕدانەوە بووە، بۆ ئەوەی بتوانرێت سوودی سیاسی خۆی لێ وەربگیرێت، بەکار بهێنرێت وەکو دەسکەلایەك لەلایەن خاوەن دەسەڵاتی سیاسییەوە.

"هەر لەبەر ئەمەشە کە هەردەم جێگەی گرنگی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بووە، بەتایبەتی لەدوای دۆزینەوەی نەوت لە ساڵی (١٩٢٧)دا، کە لەگەڵ خۆیدا بووە، بایەخی ئەم شارە لە ڕووی بازرگانی و ئەتنۆگرافییەوە، هەر بۆیە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٧–١٩٨٧) دادەنرێت بەڕێژەی بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتووانی قەزاکە بەڕێژەی (٤٪)، لەلایەکی ترەوە زۆری دانیشتووانی ئەم قەزایە کوردن و هەردەم تووشی شاڵاوی کاولکاری و لەناوچوون بوون و کۆکراونەتەوە لە ئۆردوگای نیشتەجێ کردن، کە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر کۆچ بکەن بۆ دەرەوەی پارێزگاکەو لەکاتی کاری بەزۆر کۆچ پێکردندا نزیکەی (٢١٨) گوندیان کۆچ پێ کردووە لەنێوان ساڵانی (١٩٦٩–١٩٨٨)، کە دەگاتە (١١,٦٩٤) خێزانی کورد، کە دەگاتە (٣٧٪)ی کۆی ئەو گوندە کۆچ پێکراوانەی پارێزگاکە.."[1].

"لەسەرووەوە هاوسنوورە لەگەڵ زێی بچووك، کە دەستپێدەکات لەدێی کیتکەوە، درێژدەبێتەوە لەگەڵ هێڵی سنووری ڕووبارەکە بۆ سەرچاوەی زێیەکە لەڕووباری (دیجلە)، لەڕۆژئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ ڕووباری (دیجلە)، سنووری ئەم هێڵە لەسەرچاوەی زێی بچووکەوە، لەڕووباری دیجلەوە دەستپێدەکات هەتا (فەتحە)، ئینجا درێژدەبێتەوە لە ڕووی زنجیرە چیای (حەمرین)، هەتا خاڵی (عین خالد) و (عین نخیلە) لەناوەڕاستی چیای حەمرین لەسەر ڕێگای (کەرکوك – تکریت).

لەخوارەوە هاوسنوورە لەسەر هێڵی سنوور لە(عین خالد)و (عین نخیلە) هەتا گردی (مغارە)، کە کەوتووەتە لای دەستەڕاستی دۆڵی (کوردەرە)، کە زەوییەکانی حەویجە دەبڕێت بەهێڵێکی ڕاست، لێی ئەشکێتەوە بۆ ناوچەیەك پێی دەوترێت (صقال گوتان)، بەدرێژبوونەوەی، بە سنووری جیاوەبووی نێوان هەریەکە لە ناحیەی (داقوق) و (قەرەحەسەن)دا، دەڕوات بەسەرووی گوندی (طویلعە)، گوندەکانی (مەتارە)و (عین حاجی)و (جەمیلە) لەلای قەرەحەسەن بەجێ دەهێڵێت، کە کۆتایی دێت لەشوێنی یەکگرتنی ڕووباری (سلوهان)و (ڕۆخانە)، کە سەر بەدۆڵی ڕۆخانەیە.

لە ڕۆژهەڵاتەوە سنوورەکەی دەستپێدەکات لەدۆڵی ڕۆخانەوە، کە سنووری لەگەڵ دۆڵێکە کە بە (خرپاپیر) بەناوبانگەو ئەم دۆڵە لە سنووری قەزای (چەمچەماڵ) لە خواروو‌ی گوندی (قەرەوەیسی) کۆتایی دێت، لەدوایدا سنوورەکەی بەرزدەبێتەوە بەرەو سەروو بەهێڵێکی ڕاست کە گوندی (باشیولا) لەلای دەستەچەپەوە بەجێدەهێڵێت لە ناحیەی قەرەحەسەن، کە دەڕوات بەنێوان هەردوو گوندی (کودەکی)و (هەزار کانی) یەکەمیان بەلای چەمچەماڵ و دووەم بەلای ناحیەی قەرەحەسەن بە جێدەهێڵێت لەدۆڵی ڕووباری خاسە لەخوارووی دێی (کوراك) کۆتایی دێت، ئینجا دادەبەزێت بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەو دۆڵە، لەو خاڵەی کە دەکەوێتە خوارووی دێی (بەختەخان)، لەوێوە بەرزدەبێتەوە بۆ سەروو بەشێوەیەکی بەردەوام هەتا کۆتایی ڕووباری زێی بچووك و لەتەنیشت گوندی (کتیك)"[2].

"ڕووبەری قەزاکە (٦٩٨٣١) کیلۆمەتر دووجایە، ژمارەی دانیشتووانی (٧٩٣١٤) کەسە، گەورەترین ناحیە (مەلحەیە)، کە ڕووبەرەکەی (٢٠٤٠) کیلۆمەتر دووجایە، لە ڕووی دانیشتووانەوە هەریەکە لە ناحیەی (مەلحە)و (ئاڵتون کۆپری) نزیکەی (١٨) هەزار کەس دەبێت ناحیەی (قەرەحەسەن) (١٤) هەزار کەس و ناحیەی (شوان) (١٢) هەزار کەس و ناوشاری کەرکوك و دەوروبەرەکەیەشی نزیکەی (١٦٣١٤) کەس دەبێت"[3].

"ژمارەی گوندەکانی مەرکەزی قەزای کەرکوك (١٠١) گوندە کە لە ناحیەی قەرەحەسەن، (٥٦) گوندو ناحیەی (ئاڵتون کۆپری) (٦١) گوندو، ناحیەی حەویجە (٢٢٦) گوندو ناحیەی شوان (٧٦) گوند"[4].

دەربارەی ڕێژەی شارنشین و گوندنشین لەقەزاکە بەم جۆرەیە، کە شارنشین (٢١١١٧٩) کەس و، گوندنشین (٦٤٧٥١) کەس، کە ڕێژەی ناحییەکانی قەزاکە بەپێی ئەم لیستەی خوارەوەیە:–

| ژ | قەزاو ناحیە | شارنشین | گوندنشین | کۆی گشتی |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | قەزای کەرکوك | ٢١١١٧٩ | ٦٤٧٥١ | ٢٧٥٩٣٠ |
| ٢ | ناحیەی مەرکەزی قەزا | ١٩١/٢٩٤ | ٦٣٥٦ | ١٩٧٦٥٠ |
| ٣ | ناحیەی قەرەحەسەن | ٢١٤٤ | ١٣٧٦٥ | ١٥٤٠٩ |
| ٤ | ناحیەی ئاڵتون کۆپری | ٤٥٦٣ | ٩٢٩٨ | ١٣٨٦١ |
| ٥ | ناحیەی شوان | ٦٣٢ | ١٥٦٩٢ | ١٦٣٢٤ |
| ٦ | ناحیەی دوبز | ٦٩١٧ | ١١٣٨٦ | ١٨٣٠٣[5] |

لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم باسی هەریەکە لەناحییەکانی قەزای کەرکوك بکەم لە ڕووی ژمارەی دانیشتووان و ڕووبەرو گەرەك و شەقام و باخچەو بەشە کارگێرییەکانی ناو ناحیەکە.

بەڵام دەبینین ناحییەکانی مەرکەزی قەزای کەرکوك هەردەم گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، بۆ نموونە ناحیەی (حەویجە) لەسەردەمێکدا سەر بە قەزای مەرکەز بووە، لە سەردەمانێکی تردا بووەتە قەزاو لە قەزای مەرکەز جیابووەتەوە.

*** کەرکوك:**

”هەر یەکە لەو گەڕۆکانەی کە سەریان لەشاری کەرکوك داوە، وەسفی ئەوەیان داوە کە، شارێکی جوان و دڵگیرو سەرنج ڕاکێشە، شارێکە هاوچووە لەگەڵ شاری هەولێر لە ڕووی ئەوەی وەکو شارێکی کوردستانی سەیر بکرێت“[٦]. ”هۆی دروست بوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ناوچەیەکی خاوەن بوونی ئاوی سازگارە. ”بێجگە لەو شوێنە ئابوورییە گرنگە کە هەیەتی و، بووەتە سەرئێشەیەکی گەورە بۆ گرنگی شوێنە سیاسییەکەی.

زۆری دانیشتووانی کوردەو ژمارەیەکی کەمی جولەکەو عەرەب و تورکمان و ئاسووری تێدایە. شاری کەرکوك دەکەوێتە کۆتایی لووتکەی چیای قەرەحەسەنی ڕۆژهەڵات، کە دەڕوانێتە سەر دەشتاییەکی فراوان، کە قەڵا دەڕوانێتە سەر شێوی خاسەو ڕووباری خاسە، لەبەر ئەوە شارەکە کەوتووەتە سەر ڕووباری خاسەوە، دەتوانرێت بکرێتە سێ بەشەوە:-

بەشی سەرەکی لەو سێ بەشە، دروست کراوە لەسەر گردێکی بەرز لەسەر ڕووبەرێکی بەرەوخوار کە دەڕوانێت بەسەر خاسەدا، لەسەر ئەم گردە شارێکی شوورەکراوو دروست کراو لەشێوەی قەڵاو لەناوەوە ژمارەیەکی زۆر خانوو و مزگەوت و شوێنەواری کۆنی تێدا هەبووە.

بەشی دووەمی شارەکە جیاوازە لەبەشەکانی تری لەبەرئەوەی لەزوودا ناوچەیەکی بەرگری بووەو، ژمارەی دانیشتووانی لەهەموو بەشەکانی زیاترە، کە درێژدەبێتەوە لەدەشتاییەکانی دەوروورووبەری قەڵا، کە ژمارەیەکی چاك خان و چایخانەو بازاڕی جۆربەجۆری تێدایە کە تێکەڵاو لە موسوڵمان و ئەرمەن و سریان و نەستوری تێدا هەیە، لەزوودا ژمارەی دانیشتووانی ئەم بەشە (١٠) هەزار کەس بووە.

بەڵام بەشی سێیەم، نزیکەی میل و نیوێك لەهەردوو بەشەکەی پێشووەوە دوورە، ئەم بەشە بچکۆلەیە خانووەکانی پەرش و بڵاوەو ژمارەی دانیشتووانی لە هەزار کەس تێپەڕ ناکات.

بەڵام لە ئێستادا ئەم بەشەی زۆر فراوان بووەو ڕێژەیەکی زۆری ژمارەی دانیشتووان لەوێدا نیشتەجێ بوونەو حکومەتی بەعس لە بەرنامەیدا بووە بۆ ئەوەی شارەکە ئاوەدانی لە ناوچە کورد نشینەکان بووەستێنێ، بایەخی بەم بەشەدا داوە.

لەکۆندا کۆی هەر سێ بەشەکە نزیکەی (١٠) مزگەوت و (٢٤) قاوەخانەو چایخانەو (١٠) خان و دوو گەرماوی تێدا هەبووە. لە کۆندا ژمارەی خانووەکانی نزیکەی (٤٠٠٠) خانوو بووە، کە لەبەردو قوڕ دروست کراوە. بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی گوندەکانی قەزای کەرکوك (٨٨) گوند بووە، لە ساڵی (١٩٥٧)دا نزیکەی (٤٦٤) گوند بووە، کە تەنها لەدەوروبەری شاری کەرکوك (١٠٢) گوند بووە.

ڕووباری خاسە شارەکەی کردووەتە دوو بەشەوە، کە بەشی ڕۆژهەڵات و بەشی ڕۆژئاوایە، شوێنەکەی لێژ دەبێتەوە لەسەرەوو بۆ خواروو، کە بەشی ڕۆژهەڵاتی دەست دەکات بەلێژبوونەوە بەرەو ڕووی ڕووباری خاسە، بەڵام بەشی ڕۆژئاوا لێژدەبێتەوە لەڕووبارەکەو تارادەیەك شارەکە ئاوەڕۆیەکی سروشتی هەیە بەرەو ڕووباری خاسە لەبەشی ڕۆژهەڵات و، لەلای خواروو لەبەشی ڕۆژئاوای شارەکە. بەرزترین شوێنی (١٢٧٥) پێیە، لەسەر ڕووی دەریا، کە بەشی سەرووی ڕۆژهەڵاتەو، نزمترین بەشی (١٠٥٠) پێیە لەئاستی ڕووی دەریا.

بەڵام ڕووباری خاسە لەهاویندا ئاوی نییە، ئەگەر هەیبێت زۆر بەکەمییەو، لەزستاندا، ئاوی پێدا دەڕوات بەهۆی بارینی باران لەچیاکانی دەوروبەرییەوە، چەند وردە ڕووبارێکی وەکو ڕووباری (قۆریە)و (زێویە) هەیە، کە هەردووکیان لەسەرچاوەیەکەوە، کە لە گوندی (یارەلی) لەیەکتر جیادەبنەوە، لەڕووباری (قۆریە) دوو لقی تر جیادەبێتەوە کە یەکێکیان (تسعین)و ئەوی تریان (پێڵاوەیە). ”بەشی یەکەمی شارەکە کە وتمان قەڵایە ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی (٤٣٥٣) کەس دەبێت بەپێی سەرژمێری شارەوانی کەرکوك لە ساڵی (١٩٧٠)، ڕووبەری گشتی قەڵاکە (١٨٧٢٧٠) مەتر دووجایەو، ئەو ڕووبەرەی کە بەخانوو داگیر کراوە (١٣٦٤٥٠) مەتر دووجایە. ڕێژەی قەوارەی خێزان (٦،٦) کەسە لەهەر خێزانێکداو، ژمارەی خێزانەکان (٦٦٤) خێزانەو ژمارەی خانووەکانی (٥٦٥) خانووە، نزیکەی (٩) مزگەوت و دوو کڵێسەی تێدا هەیە. دەتوانین زۆربەی بەشی قەڵا بەناوچەیەکی نیشتەجێی دانیشتووانی دابنێین، بێجگە لەهەندێك شوێنی ئایینی و فێرکاری، لەلای سەروییەوە دەورە دراوە بەباخچەیەکی گشتی کە لە ساڵی (١٩٥١)دا دروست کراوە.

## سەرژمێری گوندەکانی سەر بە قەزای کەرکوك(*)

| ز | ناوی گوند | سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) | | | سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) | | | سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) | | | سەرژمێری ساڵی (١٩٩٧) | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ |
| ١ | تۆپزاوەی حوسێن بەگ | ٦١٩ | ٦٦١ | ١٢٨٠ | ٥٦٤ | ٥٨٨ | ١١٥٢ | | | | | | |
| ٢ | تۆپزاوەی سدیق بەگ | – | – | – | ٧٩ | ٧٥ | ١٥٤ | | | ٢٠٢ | | | |
| ٣ | پەنجا عەلی | ١٩٦ | ٢٢٨ | ٤٢٤ | ١٥٦ | ١٨٢ | ٣٣٨ | | | ٩٧ | | | |
| ٤ | بڵاوە | ٣٣٨ | ٣٥١ | ٦٨٩ | ٣٣٥ | ٣٦٩ | ٧٠٤ | | | | | | |
| ٥ | شۆڕاو سدیق بەگ | ١٦١ | ١٦٨ | ٣٢٩ | ٥٠٠ | ٤٥٨ | ٩٥٨ | | | | | | |
| ٦ | گورگە چاڵ | – | – | ٣٨٥ | ١٩٧ | ١٨٢ | ٣٧٩ | | | | | | |
| ٧ | گۆگجە | ٢٥٩ | ٢٦٣ | ٥٢٢ | ٢٧١ | ٢٤٦ | ٥١٧ | | | ٧٦٢ | | | |
| ٨ | یاروەلی | ١٣٤ | ١٣٦ | ٢٧٠ | ٧٧ | ١٧٣ | ٢٥٠ | | | ٧١ | | | |
| ٩ | تازە خورماتوو | ٩٣٩ | ٩٧٩ | ١٩١٨ | ١٠٨٥ | ١٠٩٠ | ٢١٧٥ | | | | | | |
| ١٠ | بەشیر | ٧٨١ | ٩١٨ | ١٦٩٩ | ٨١١ | ٨٤٢ | ١٦٥٣ | | | | | | |
| ١١ | ترکەڵان | ١٦٨ | ١٨٨ | ٣٥٦ | ٤٢٨ | ٤٢٣ | ٨٥١ | | | | | | |
| ١٢ | تەل جەواڵ | ٧٤ | ١٣٤ | ٢٠٨ | ٢٥٥ | ٢٢٧ | ٤٨٢ | | | | | | |
| ١٣ | چەرداغلوو | ٢٣٧ | ٢٣١ | ٤٦٨ | ٢١٧ | ٢٣٩ | ٤٥٦ | | | | | | |
| ١٤ | قزلیار | ١٧٤ | ٢١٨ | ٣٩٢ | ١٤٤ | ١٦٨ | ٣١٢ | | | | | | |
| ١٥ | یایچی | ٣٤٧ | ٣٩٧ | ٧٤٤ | ٥١٤ | ٥٤٢ | ١٠٥٦ | | | | | | |
| ١٦ | کۆچەکی گەورە | ١٣٧ | ١٢٧ | ٢٦٤ | ٨٥ | ٨٤ | ١٦٩ | | | ٢٤٠ | | | |
| ١٧ | کۆچەکی بچووك | – | – | – | ٤٤ | ٤٦ | ٩٠ | | | ١٠٦ | | | |
| ١٨ | دووحێلە | – | – | – | ٧٧ | ٧٤ | ١٥١ | | | ٦٢ | | | |
| ١٩ | باجوان | ٩٧ | ١٢٣ | ٢٢٠ | ١٤٠ | ١٤٥ | ٢٨٥ | | | | | | |
| ٢٠ | هەنجیرە | ١٠٩ | ١٢٥ | ٢٣٤ | ٦٣ | ٦٥ | ١٢٨ | | | | | | |
| ٢١ | ئەلبوسەباح | ١٣٣ | ١٨٢ | ٣١٥ | ١٢٢ | ١٣٢ | ٢٥٤ | | | | | | |
| ٢٢ | قەرە تەپە | ١٤٠ | ٢٩٩ | ٤٣٩ | ١٦١ | ١٦٩ | ٣٣٠ | | | | | | |
| ٢٣ | قوتانی گەورە | ٣٧٣ | ٣٧٥ | ٧٤٨ | ١٣٢ | ١١٢ | ٢٤٤ | | | | | | |
| ٢٤ | قوتانی بچووك | – | – | – | ٤٣ | ٤٠ | ٨٣ | | | | | | |
| ٢٥ | قوتان خەلیفە | – | – | – | ٧٧ | ٧٣ | ١٥٠ | | | | | | |
| ٢٦ | عەلاوە مەحمود | ٧٨ | ١٣٥ | ٢١٣ | ١٠٥ | ١١٢ | ٢١٧ | | | | | | |
| ٢٧ | دیبەگ تەپە | ١٨٢ | ٢٤٨ | ٤٣٠ | ٨١ | ٩١ | ١٧٢ | | | | | | |
| ٢٨ | خەبازە | ٧٤ | ١٥٤ | ٢٢٨ | ٥٩ | ٥٧ | ١١٦ | | | | | | |
| ٢٩ | مەلا عەبدوڵڵا | ٥٤ | ١٧٧ | ٢٣١ | ١٢٨ | ١٨٨ | ٣٧٠ | | | | | | |
| ٣٠ | مەریەم بەگ | ٦٤ | ١٤٧ | ٢١١ | ٨٣ | ٨٥ | ١٦٨ | | | | | | |
| ٣١ | حەدیدین | ١٨٧ | ٢٠٨ | ٣٩٥ | – | – | – | | | | | | |
| ٣٢ | هندییە | ٧٦ | ١٦٦ | ٢٤٢ | ١٢٢ | ١٢٩ | ٢٥١ | | | | | | |
| ٣٣ | سێکانیان | ١٠١ | ١٠٠ | ٢٠١ | ١١٩ | ١٣٤ | ٢٥٣ | | | | | | |
| ٣٤ | چوبلیجە | ٩٦ | ١١٨ | ٢١٤ | ٩٣ | ٨٧ | ١٨٠ | | | | | | |
| ٣٥ | چراغ | – | – | – | ٥٥ | ٧٤ | ١٢٩ | | | | | | |
| ٣٦ | خان | – | – | – | ٢٦ | ٣١ | ٥٧ | | | | | | |
| ٣٧ | ناسرییە | – | – | – | ٢٢ | ٢١ | ٤٣ | | | | | | |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٨ | مەنسوریە | – | – | – | ٣٨ | ٣٠ | ٦٨ | | | | | | |
| ٣٩ | کەواز عەرەب | – | – | – | ٩١ | ١٠٣ | ١٩٤ | | | | | | |
| ٤٠ | مەراتەی گەورە | – | – | – | ٦٢ | ٦١ | ١٢٣ | | | | | | |
| ٤١ | شەرفییە | – | – | – | ٢٨ | ٣٨ | ٦٦ | | | | | | |
| ٤٢ | کەوازی کورد | – | – | – | ٤٩ | ٤٥ | ٩٤ | | | | | | |
| ٤٣ | مەراتەی بچووك | – | – | – | ٣٤ | ٥٨ | ٩٢ | | | | | | |
| ٤٤ | خاتوونەی بچووك | – | – | – | ٣٧ | ٣٦ | ٧٣ | | | | | | |
| ٤٥ | خاتوونەی گەورە | – | – | – | ٥٥ | ٥٣ | ١٠٨ | | | | | | |
| ٤٦ | خاتوونەی خواروو | – | – | – | ٢٨ | ٢٦ | ٥٤ | | | | | | |
| ٤٧ | فەخار | – | – | – | ١٩ | ٢٣ | ٤٢ | | | | | | |
| ٤٨ | سلێمانییە | – | – | – | ٩١ | ٩٤ | ١٨٥ | | | | | | |
| ٤٩ | قەرە پاڵ | – | – | – | ١٦ | ١٦ | ٣٢ | | | | | | |
| ٥٠ | سوور | – | – | – | ٢٤ | ٢٨ | ٥٢ | | | | | | |
| ٥١ | نوێشین | – | – | – | ١٨ | ١٦ | ٣٤ | | | | | | |
| ٥٢ | دوگماتی گەورە | – | – | – | ٢٠٣ | ١٨٧ | ٣٩٠ | | | | | | |
| ٥٣ | شەمسە | – | – | – | ١١١ | ١١٨ | ٢٢٩ | | | | | | |
| ٥٤ | نەجم گەلاوی | – | – | – | ١٢ | ١٥ | ٢٧ | | | | | | |
| ٥٥ | دوگماتی بچووك | – | – | – | ٨٨ | ٨٩ | ١٧٧ | | | | | | |
| ٥٦ | مەحمود دوگمان | – | – | – | ٥٨ | ٦٥ | ١٢٣ | | | | | | |
| ٥٧ | حەساری ئەحمەد بەگ | – | – | – | ٦٧ | ٩٩ | ١٦٦ | | | | | | |
| ٥٨ | سەقزلی | – | – | – | ١٠٧ | ١٠٢ | ٢٠٩ | | | ٣٤٧ | | | |
| ٥٩ | سوورە دێ | – | – | – | ٥٧ | ٥٣ | ١١٠ | | | ١٩٨ | | | |
| ٦٠ | عەلی ئاوا | – | – | – | ٤٨ | ٤٥ | ٩٣ | | | | | | |
| ٦١ | ئیمام عەلی | – | – | – | ٢٨ | ٢٠ | ٤٨ | | | ١٠٤ | | | |
| ٦٢ | عەلە غێر | – | – | – | ٣٥ | ٥٠ | ٨٥ | | | | | | |
| ٦٣ | تالاو – مورە | – | – | – | ٣١ | ٢٩ | ٦٠ | | | | | | |
| ٦٤ | فاخیرە | – | – | – | ٣٠ | ٣٧ | ٦٧ | | | | | | |
| ٦٥ | خەڕابەی عەزیز | – | – | – | ٥٩ | ٦٦ | ١٢٥ | | | | | | |
| ٦٦ | قازان | – | – | – | ٤٧ | ٥٣ | ١٠٠ | | | | | | |
| ٦٧ | سووسەی گەورە | – | – | – | ٦٥ | ٧١ | ١٣٦ | | | | | | |
| ٦٨ | جەوەڵ بۆر | – | – | – | ٥٨ | ٥٥ | ١١٣ | | | ٧٥ | | | |
| ٦٩ | حەساری ئەحمەد نازم | – | – | – | ٩٧ | ١٠٧ | ٢٠٤ | | | | | | |
| ٧٠ | سەعدیە | – | – | – | ١٢ | ٩ | ٢١ | | | | | | |
| ٧١ | فەیسەڵی | – | – | – | ١٣ | ١٣ | ٢٦ | | | | | | |
| ٧٢ | حەلوەی گەورە | – | – | – | ٩٩ | ٩٦ | ١٩٥ | | | | | | |
| ٧٣ | کوردە میر | – | – | – | ٨ | ٨ | ١٦ | | | | | | |
| ٧٤ | ڕەحیم ئاوا | – | – | – | ٥٣ | ٥٩ | ١١٢ | | | | | | |
| ٧٥ | حەسار بەکر ئەفەندی | – | – | – | ٢٢ | ٢٦ | ٤٨ | | | | | | |
| ٧٦ | حەسار حاجی عەبدوڵڵا | – | – | – | ١٩ | ٢٠ | ٣٩ | | | | | | |
| ٧٧ | سەبع تلول | – | – | – | ١٢ | ٩ | ٢١ | | | | | | |
| ٧٨ | تەق تەق | – | – | – | ١٦ | ١٣ | ٢٩ | | | | | | |
| ٧٩ | قۆریە تیمار | – | – | – | – | – | – | | | ٢٩٨٨ | | | |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨٠ | ئەبو گەسە | – | – | – | ٥١ | ٤١ | ٩٢ | | | | | | |
| ٨١ | ئەبو فشكە | – | – | – | – | – | – | | | | | | |
| ٨٢ | بویتەر | – | – | – | ٩٩ | ٩٥ | ١٩٤ | | | | | | |
| ٨٣ | عەڵەس حەمری | – | – | – | ١٣ | ١٦ | ٢٩ | | | | | | |
| ٨٤ | عوەینەی حوسێن بەگ | – | – | – | – | – | – | | | | | | |
| ٨٥ | عوەینەی سەیید عەلی | – | – | – | ٨٨ | ١٣٢ | ٢٢٠ | | | | | | |
| ٨٦ | حەمیرە | – | – | – | ٧٦ | ٧٤ | ١٥٠ | | | | | | |
| ٨٧ | سۆنەگۆلی | – | – | – | ٨٥ | ٨٩ | ١٧٤ | | | -- | | | |
| ٨٨ | تالبەندەلی | – | – | – | ١٦٥ | ٤١ | ٢٠٦ | | | | | | |
| ٨٩ | كوردلیە | – | – | – | ٦ | ٤ | ١٠ | | | | | | |
| ٩٠ | عومەر غافل | – | – | – | ٦ | ١٣ | ١٩ | | | | | | |
| ٩١ | جەدیدەی حوسێن بەگ | – | – | – | ١١١ | ١٠٨ | ٢١٩ | | | | | | |
| ٩٢ | جەدیدەی مایل ٢٥ | – | – | – | ٣٠ | ٣٠ | ٦٠ | | | | | | |
| ٩٣ | توێلعە | – | – | – | ١٤ | ١٣ | ٢٧ | | | | | | |
| ٩٤ | مەحەتە | ٤٤٧ | ٢٢٠ | ٦٦٧ | – | – | – | | | | | | |
| ٩٥ | كریت لو | ٢٥٣ | ٣١٢ | ٥٦٥ | – | – | – | | | | | | |
| ٩٦ | تسعین – تسن | ١٤١١ | ١٣٩٢ | ٢٨٠٣ | – | – | – | | | | | | |
| ٩٧ | سەدە | – | – | – | ٤٩ | ٤٥ | ٩٤ | | | | | | |
| ٩٨ | قەسیر | – | – | – | ٢٠ | ١١ | ٣١ | | | | | | |
| ٩٩ | مورە | – | – | – | ٥٣ | ٥٨ | ١١١ | | | | | | |
| ١٠٠ | تەل ئەلوەرد | | | | ٥٧ | ٤٦ | ١٠٣ | | | | | | |
| ١٠١ | مەفتول | | | | ٢١ | ٢٠ | ٤١ | | | | | | |
| ١٠٢ | دەب | – | – | – | ٨٦ | ١١٠ | ١٩٦ | | | | | | |
| ١٠٣ | كرحە حوسێن كەلەش | – | – | – | ١٠٧ | ١٢٢ | ٢٢٩ | | | | | | |
| ١٠٤ | كرحە خەناجر | – | – | – | ٢٧ | ٢٦ | ٥٣ | | | | | | |
| ١٠٥ | مەنسیە | – | – | – | ٥٠ | ٤٧ | ٩٧ | | | | | | |
| ١٠٦ | حەمل | – | – | – | ٤٨ | ٥٠ | ٩٨ | | | | | | |
| ١٠٧ | ئەسفەر | – | – | – | ٧٨ | ٧٠ | ١٤٨ | | | | | | |
| ١٠٨ | ئەبو شەحمە | – | – | – | ١٢ | ١٦ | ٢٨ | | | | | | |
| ١٠٩ | زیاع | – | – | – | ١٠٤ | ٩٦ | ١٩٧ | | | | | | |
| ١١٠ | كەمیران | – | – | – | ٤٩ | ٥٠ | ٩٩ | | | | | | |
| ١١١ | تەل ئەلرابیعە | – | – | – | ٦ | ٨ | ١٤ | | | | | | |
| ١١٢ | ئەبو شەحمە سەدرییە | – | – | – | ٢٩٢ | ٢٠١ | ٤٩٣ | | | | | | |
| ١١٣ | خوردات | – | – | – | ٢١ | ٢٦ | ٤٧ | | | | | | |
| ١١٤ | توێم كەرحە | – | – | – | ٢٠ | ٢٤ | ٤٤ | | | | | | |
| ١١٥ | جەدیدە ئەلموەیجە | – | – | – | ٨ | ٨ | ١٦ | | | | | | |
| ١١٦ | نەواقل | – | – | – | ٤٨ | ٤٢ | ٩٠ | | | | | | |
| ١١٧ | مەرعی | – | – | – | ٥٦ | ٦٢ | ١١٨ | | | | | | |
| ١١٨ | جەدیدە | – | – | – | ٤٣ | ٥٥ | ٩٨ | | | | | | |
| ١١٩ | بەرغلی گەورەو بچووك | – | – | – | ١٢٧ | ١٣٨ | ٢٦٥ | | | | | | |
| ١٢٠ | سەتیح | – | – | – | ١٤٧ | ١٥٨ | ٣٠٥ | | | | | | |
| ١٢١ | ڕەمڵ عاسی | – | – | – | ٦١ | ٦١ | ١٢٢ | | | | | | |
| ١٢٢ | مەزرەع ڕەمڵ | – | – | – | ٣٨ | ٣٧ | ٧٥ | | | | | | |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٢٣ | ڕمەڵ شەرقی | – | – | – | ٢٠ | ٢٥ | ٤٥ | | | | | | |
| ١٢٤ | لسان ئەلڕەمڵ | – | – | – | ٨١ | ٧١ | ١٥٢ | | | | | | |
| ١٢٥ | تەل ئەلخەدیجە | – | – | – | ٧٣ | ٨٨ | ١٦١ | | | | | | |
| ١٢٦ | عەوادیە ئەلدوگمان | – | – | – | ٢٢ | ٢٣ | ٤٥ | | | | | | |
| ١٢٧ | خەباری | – | – | – | ١٤ | ٨ | ٢٢ | | | | | | |
| ١٢٨ | ئەلکوبە | – | – | – | ٧٠ | ٨٣ | ١٥٣ | | | | | | |
| ١٢٩ | ئەبو کەعوبە | – | – | – | ٤١ | ٣٩ | ٨٠ | | | | | | |
| ١٣٠ | عوەینە غەرە | – | – | – | ٤٧ | ٥٠ | ٩٨ | | | | | | |
| ١٣١ | مریات کەرحە (ڕەشادیە) | – | – | – | ٢٣٩ | ١٦١ | ٤٠٠ | | | | | | |
| ١٣٢ | زیبات | – | – | – | ٥٦ | ٧٥ | ١٣١ | | | | | | |
| ١٣٣ | قاشوغە | – | – | – | ١٦ | ١٨ | ٣٤ | | | | | | |
| ١٣٤ | ئەبو دەعاغ | – | – | – | ٣٥ | ٣٩ | ٧٤ | | | | | | |
| ١٣٥ | ڕەفیعە | – | – | – | ٥٩ | ٦٦ | ١٢٥ | | | | | | |
| ١٣٦ | وەستانیە | – | – | – | ٣٦ | ٣١ | ٦٧ | | | | | | |
| ١٣٧ | دوکشمانی گەورەو بچووك | – | – | – | ٧٨ | ٨٦ | ١٦٤ | | | | | | |
| ١٣٨ | فەهار | – | – | – | ١٨ | ٣١ | ٤٩ | | | | | | |
| ١٣٩ | بریمە | – | – | – | ٧١ | ٧٠ | ١٤١ | | | | | | |
| ١٤٠ | ڕەمڵە | – | – | – | ٣٠ | ٣٥ | ٦٥ | | | | | | |
| ١٤١ | عەدلیە | – | – | – | ٢٤ | ٢٦ | ٥٠ | | | | | | |
| ١٤٢ | خانووەکانی کارگەی خشت | – | – | – | ٦٩ | ٩٢ | ١٦١ | | | | | | |
| ١٤٣ | نەبتزی گەورە | – | – | – | ٢٨ | ٢٥ | ٥٩ | | | | | | |
| ١٤٤ | کارگەی مریشك | – | – | – | ١١ | ٧ | ١٨ | | | | | | |
| ١٤٥ | نەبتزی بچووك | | | | ٤٢ | ٥٣ | ٩٥ | | | | | | |
| ١٤٦ | گومبەتلەر | – | – | – | ٣٤٣ | ٣١٠ | ٦٥٣ | | | | | | |
| ١٤٧ | سەیادەی گەورە | – | – | – | ١٣٥ | ١٤٦ | ٢٨١ | | | | | | |
| ١٤٨ | سەیادەی بچووك | – | – | – | ٦ | ٥ | ١١ | | | | | | |
| ١٤٩ | ڕەبیزە | – | – | – | ١٤٧ | ١٣٤ | ٢٨١ | | | | | | |
| ١٥٠ | فەتش | – | – | – | ٣٤ | ٣٥ | ٦٩ | | | | | | |
| ١٥١ | تویم | – | – | – | ٩ | ١٣ | ٢٢ | | | | | | |
| ١٥٢ | حەلوەی بچووك | – | – | – | ١١ | ٧ | ١٨ | | | | | | |
| ١٥٣ | ئوم زەمیرە | – | – | – | ٧ | ٩ | ١٦ | | | | | | |
| ١٥٤ | تەحویلە | – | – | – | ٢٤ | ١٦ | ٤٠ | | | | | | |
| ١٥٥ | کارگەی خشتی هۆبی | – | – | – | ١٠ | ٩ | ١٩ | | | | | | |
| ١٥٦ | کارگەی ڕەحیم | – | – | – | ٥ | – | ٥ | | | | | | |
| ١٥٧ | ئوم لەکالك | – | – | – | ٢ | ٢ | ٤ | | | | | | |
| ١٥٨ | مەنسوریەی تازە | – | – | – | ١٨ | ٢٥ | ٤٣ | | | | | | |
| ١٥٩ | کۆس ئەلحەقیان | – | – | – | ٢٩ | ٢٦ | ٥٥ | | | | | | |
| ١٦٠ | جەفار زغێتون | – | – | – | ٦٦ | ٨٠ | ١٤٦ | | | | | | |

(*) بەپێی سەرژمێرییەکانی ساڵانی (١٩٤٧)و (١٩٥٧)و (١٩٧٧)و (١٩٩٧).

"دەربارەی ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) بریتییە لە (٢٩٨١١) کەس"[١٠]، یان لەسەرچاوەیەکی تردا ڕێژەی دانیشتووانی بە (٢٩٨٠٤) کەس داناوە کە تەنها ژمارەی مەرکەزی قەزاکەی بە (١١٩٣٦) کەس داناوە.

بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥)، بریتییە لە (٣٢.٩٢٣ کەس، کە (١٤٠٦٠) کەسی لەناو چەمچەماڵو (١١٤٢٢) کەسی لە ناحیەی ئاغجەلەرو (٧٤٤١) کەسی لە ناحیەی سەنگاو[١١]. بەڵام لەسەرژمێری ساڵانی (١٩٧٠)دا (٤٢٣٩٧) کەس بووە. کە (١٨٥٥٠) کەس لەمەرکەزی قەزاو (١٣٥٣٧) کەس لە ناحیەی ئاغجەلەرو (١٠٣١٠) کەس لە ناحیەی سەنگاو[١٢].

دەربارەی ژمارەی ئەو گوندانەی کە سەر بەم قەزایەیە نزیکەی (٢١٩) گوند دەبێت، گرنگترین گوندەکانی (ئاغجەلەرو عەسکەرو گۆگتەپە)یە.

ئەو هۆزو عەشیرەتانەی کە لەم قەزایەدا کۆبونەتەوە بریتییە لەهۆزی (هەمەوەند)و هۆزی (جاف)و هۆزی (شوان)و هۆزی (شێخ بزێنی).

دەربارەی ئەوەی کە ئەم قەزایە زۆرتر پشت بەباران دەبەستێت کە تەنها بەشێکی کەمی نەبێت پشت بەئاودێری دەبەستێت ئەویش بەهۆی ئەو کەمە ڕووبارانەی کە لەم ناوچەیەدا هەیە وەکو ڕووباری (باسەرە)، ئەمە لەپارێزگای سلێمانییەوە هەڵدەقوڵێت، کە شوێنێکی دیارە لەنێوان مەرکەزی قەزاکەو ناحیەی سەنگاو، لەگەڵ ڕووباری (خرخاسە) کە لەگوندی (ئیبراهیم) لەمەرکەزی قەزاکەوە هەڵدەقوڵێتو مەرکەزی شاری کەرکوک دەبڕێتو دەتوانین (زێی بچووک) دابنێین بەڕووباری ئەم قەزایە چونکە لەبەر ئەوەی بەناحیەی ئاغجەلەردا دەڕوات.

لەم قەزایەدا گەلێك بەرزی تەپۆڵکەو قایمگەی بەرز هەیە کە گرنگترینیان چیای (سەگرمەیە)، ئەم چیایە شوێنێکی دیارە لەنێوان ناحیەی سەنگاوو قەرەداغ لەپارێزگای سلێمانی.

ئەوەی لەکشتوکاڵی ئەم پارێزگایە بەرچاو دەکەوێت بریتییە لەگەنمو جۆو نۆکو نیسكو برنجو شانداریو کونجیو ماشو سەوزە، هەروەها توتن تۆو دەکەن لەشوێنە بەرزەکانی پارێزگاکە، میوەی وەکو هەنجیرو هەنارو ڕەزی تریێ لێ شین دەدرێتو بەری تا ڕادەیەك چاکی هەیە.

هەروەها وا بەدەردەکەوێت کە لەم قەزایەدا هەندێك کەرەستەی کانزایی وەکو (مسو ئاسنو ڕەساس)، لەگەڵ کۆمەڵگەی نەوتی تێکەڵ بەگاز بەرچاو دەکەوێت، بەڵام تاکو ئێستاکە کاری پێویست نەکراوە بۆ دەرهێنانی ئەم کەرەستە کانزاییانە..[١٣].

((چەمچەماڵ بەگوێرەی زانیاری هاوولاتییان، پێش (١٥٠) ساڵ پایتەختی ناوچەکە نەبووە بەڵکو گوندێکی زۆر بچووك بووەو تەنانەت (١٢) ماڵ بووە... لەکاتی حوکمڕانی هەمەوەندەکان باپیرەی (فەقێ قادری هەمەوەندی) بەناوی (ڕەسوڵ) قورعەی لەناو ماڵەکانی دەوروپشتی چەمچەماڵ کردووە (١٣) دێی لەدەورو بەری چەمچەماڵ دەبێتو ڕەسوڵ قورعەیان بۆ دەکات، لەهەر دێیەك لەو (١٣) گوندانە ماڵێکی بارکردو هێنای بۆ (چەمچەماڵ)، هەروەها دەگێڕنەوەو دەڵێن پێش خێڵی (هەمەوەند)، چەند ماڵێك لەچەمچەماڵ هەبووەو پێیان دەگوت (خێڵی شەیتان)و مەحمود حەمەخان ناسراو بە حافظ) بووە.

چەمچەماڵ لە ساڵی (١٩١٠ . ١٩١٤)دا، لەدەوری (٢٥ . ٢٦) ماڵ بووە دوکانەکانی بێ دەرابەبوون ئەشیاکانیان لەشوێنێکی تایبەت نمایشیان دەکرد بە ڕۆژ، ئێوارانیش ئەیانبردە ماڵەوە، مووچەخۆرەکانی عوسمانلی بەجلی کوردی عەشایەرییەوە دەوامیان دەکردو لەپاڵ مووچە خۆریدا کاسبی تریشیان دەکرد وەکو دوکان داریو کشتوکاڵیو شتی تر[١٤].

((... لە ساڵی (١٨٥١) عوسمانییەکان چەمچەماڵیان کرد بە(قەزا) واتە (قضاء چەمچەماڵ)و بەستیانەوە بە (سنجەقی سلێمانی)، هەروەها عوسمانییەکان (میرزا قادری فەقێ ڕەسوڵ هەمەوەندی)یان بەیەکەم قایمقام دەست نیشان کرد. پاش ماوەیەك هەمەوەندەکان میرزا قادریان لابردوو (ڕەشید قادر حەیدەر هەمەوەندی)یان لەشوێنی دانا بەڵام ئەمیش وەکو میرزا قادر زۆر لەپۆستەکەی نەمایەوەو ئەوەبوو کاربەدەستەکانی عوسمانلی چەمچەماڵیان گەڕانەوەو کردیانەوە بە (دێ)و سیفەتی قەزایان لێ کێشایەوەو چەمچەماڵیان بەستەوە بەقەزای (بازیان) هەتا ساڵی (١٩٢٢)، لە ساڵی (١٩٢٢)دا حکومەتی عێراق دامەزراو چەمچەماڵیان کردەوە بەقەزاو بەستیانەوە بەلیوای کەرکوك واتا پارێزگای کەرکوك. یەکەم قایمقام لەسەردەمی حکومەتی عێراق (حەمومین ئاغای هەمەوەند) بوو[١٥].

ئەمەش دەقی ئەو دامەزراندنەیە:

((الی حضرة سعادة جناب محمد أمين آغا الهموندي يسرني تبليغكم بأمر معالي السيد وزير الداخلية القاضي بأسناد وظيفة قائمقام قضاء چمچمال اليكم. أرجو لجنابكم العالي التوفيق في خدمة مدينتكم وسكانها تحت ظل صاحب الجلالة ملك البلاد فيصل الأول المعظم والله ولي التوفيق[١٦].

مجيد باشا

متصرف لواء كركوك

دەزگای قایمقامێتی واتە (دایەرەی قایمقام) لە قشڵە بوو لەگەڵ دایەرەی پۆلیس نزیك ماڵی حەسەن فەقیانە. ئەو قشڵەیە عوسمانییەکان دایان مەزراندبوو هەتا ساڵی (١٩٣٧) ئەوەبوو لەسەردەمی قائممەقام (جەلال سائیب) قایمقامییەتیان گواستەوە بۆ بینایەکی نوێ کە ئێستاکە کراوە بەرابەری ئینحسار (انحصار التبغ) دایەرەی قایمقام لێرە مایەوە هەتا ساڵی (١٩٥٦) کاتێ (سادق کەممونە) قائممقام بوو... دایەرەکە هاتەوە بینایەکە هاوبەش لەگەڵ پۆلیسخانە مانەوە بەیەکەوە هەتا ساڵی (١٩٦٦).

لە ساڵی (١٩٦٦)و لەسەردەمی قایمقامێتی (محەمەد سەعید مەحمود) گوێزرایەوە بۆ (دار العدالە)، کە ژمارەیەك لەدەزگاکانی میری تێدا بوون.

لە ساڵی ١٩٨٠ لەسەردەمی (کامیل حەسەن کەڵەمێرد) دیسانەوە قائیمقامیەت گوێزرایەوە بۆ بینایەکی تایبەتی سەربەخۆو لەوێ مایەوە هەتا ساڵی (١٩٩١) پاش ساڵی (١٩٩١) لەسەردەمی (عەلی عەزیز عەباس) دەزگای قائیمقامیەت گوازرایەوە بۆ بینایی شارەوانی هەتا ئێستا کە هەر لەوێ نیشتەجێن[١٧].

"لە ساڵی (١٩٦٣)دا هەموو ناوچەکانی قەزاکە لە سەردەمی حەرەس قەومییەکاندا بەر هێرش و پەلامارو تاڵان و سووتاندن کەوت، لەوانە دێیەکانی چەشمە بەردین، پیریادی، گۆشقوت، قودرەتە، گورگەیی، برایماغا، فەیزاوە، وەسمان خەزان و چەندانی تر.

بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨) لە (٦)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٧٥) قەزای چەمچەماڵ خراوەتە سەر پارێزگای سلێمانی، لەنێوان (١٩٨٦، ١٩٨٧، ١٩٨٨)دا گشت گوندو شارۆچکەکانی وێرانکران و سووتێنران پتر لە (٩٨٦٦) خێزانی کورد راگوێزران بۆ ئۆردوگای دوور لە زێدو هەواری ئەسڵی خۆیان، هەروەها هەموو خوێندنگاو مزگەوت و بنکە تەندروستییەکانیش خاپوورو تەختکران.

لەبەر ئەوەی ئەنجامی ئامارەکانی دانیشتووان لەنێوان ساڵی (١٩٧٠-١٩٨٧) ئاماژە بە دابەزینی ژمارەی لادێ نشینەکانی ئەم قەزایە دەکەن ساڵانە بە رێژەی لە (٢,٤٪) دوای ئەوەی گشت هەوڵەکانی بە عەرەبکردنی قەزاکە بێ سوود بوو، حکومەتی عێراق بریاریدا لە پارێزگای کەرکوکی دابرێت و بیخاتە سەر پارێزگای سلێمانی، لە دوای راپەرینەوە ناوچەیەکی ئازاد کراوە، دێیەکانی ئاوەدان کراونەتەوە، تا ئەو شوێنەی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە.

لە ناونووسی ساڵی (١٩٥٧)دا ئەم دێیانەش لەسەر قەزای چەمچەماڵ تۆمار کرابوون (قەرەوەیس، گورگەیی سەرخاسە، گورگەیی خاسە، گورگەیی بەرزان، ساتی، سەیدانی خواروو و سەروو، بنەی خواروو و سەروو و ناوەراست، خان گەشە، هەزارکانی)، بەڵام لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)دا زۆربەیان لەسەر ناحیەی قەرەحەسەن (لەیلان) ناونووس کراون، جگە لە هەر سێ ئاوایی (گورگەیی خاسە، هەزارکانی، خانە گەشە) ناویان نەماوە"[١٨].

*** ناوی قائیمقامەکانی چەمچەماڵ لەنێوان ساڵانی (١٩٢٢ - ٢٠١٥):**

محەمەد ئەمین ئاغای هەمەوەند (حەمومین ئاغا) (١٩٢٢ - ١٩٢٢) ماوەی ساڵێك.
محەمەد ئەمین زەکی بەگی مێژوونوس (١٩٢٢ - ١٩٢٣).
سدیق قادری (١٩٢٣ - ١٩٢٤).
ناجی بەگی هورمزی (١٩٢٤)
رەشید سدقی (١٩٢٤ - ١٩٢٥).
سەعید وەنداوی (١٩٢٥ - ١٩٢٧).
ئیبراهیم ئەدهەم (١٩٢٧ - ١٩٢٩).
ئەمین قیردار (١٩٢٩ - ١٩٣٠).
کازم حوسێن نەجەفی (١٩٣١ - ١٩٣٣).
عەلی جەبار ئەلناسری (١٩٣٣ - ١٩٣٤).
ئیبراهیم ئەدهەم (١٩٣٤)
مستەفا یەعقوبی (١٩٣٤).
نوری خەلیل بەغدادی (١٩٣٤ - ١٩٣٥ ).
فەرحان ئەلجبوری (١٩٣٥ - ١٩٣٧).
عەلی ئەلعەزاوی (١٩٣٧ - ١٩٣٨).
جەلال سائیب (١٩٣٨ - ١٩٣٩).
دیوانی حامد دەبوونی (١٩٣٩).
رەسول پشدەری
وەلید ئەیوبی
رەشید ئەلیاس بەدری
بەشیر حەدید (١٩٣٩ - ١٩٤٠).
نازم ئەلوەنداوی (١٩٤٠ - ١٩٤١).
مەحمود کازم ئەلعزاوی (١٩٤١ - ١٩٤٢).
حەسەن عەبدولمەجید ئەلکەرخی (١٩٤٢ - ١٩٤٤).
رەشید نەجم ئەلحلی (١٩٤٤ - ١٩٤٥).
شاکر فەتاح (١٩٤٥ - ١٩٤٧).
حوسێن عەونی
شێخ حەسیب تاڵەبانی
عومەر میران (١٩٤٧ - ١٩٤٨).
عومەر محەمەد ئاغا (١٩٤٨ - ١٩٤٩).
خەلیل زێدان (١٩٤٩ - ١٩٥١).
محەمەد عەلی ئەلشێخ (١٩٥٣ - ١٩٥٥).
ئیبراهیم ئەمین (١٩٥٥ - ١٩٥٦).
سادق کەمۆنە (١٩٥٦ - ١٩٥٧).
ئەکرەم عبدولمەجید چاو شلی (١٩٥٧ - ١٩٥٨).
عەبدولموتلەب ئەلقەتتان (١٩٥٨ - ١٩٦٠).
عەلی تاڵەبانی (١٩٦٠ - ١٩٦٢).
عەبدلمەجید قەرەغولی (١٩٦٢ - ١٩٦٣).
کامیل نەسیف ئەمین (١٩٦٣ - ١٩٦٤).
حازم توحلە (١٩٦٤ - ١٩٦٦).
محەمەد سەعید مەحمود (١٩٦٦ - ١٩٦٨).
بەکر عەبدولکەریم حەوێزی (١٩٦٨ - ١٩٧٠).
حەسەن پشدەری (١٩٧٠ - ١٩٧١).
عەبدلستار تاهیر شەریف (١٩٧١ - ١٩٧١).
محەمەد ئەمین عەبدوڵڵا (١٩٧١ - ١٩٧٤).
بورهان شوانی (١٩٧٤ - ١٩٧٥).
ئیحسان عەبدوڵڵا (١٩٧٥ - ١٩٧٧).
فەوزی ئەحمەد (سەلیم) (١٩٧٧ - ١٩٧٨).
زوهدی ئەحمەد محەمەد دەلۆیی (١٩٧٨ - ١٩٨٠).
کامیل حەسەن کەڵەمێرد (١٩٨٠ - ١٩٨١).
یەحیا عەبدولعەزیز بەرزنجی (١٩٨١ - ١٩٨٧).
عەلی عەزیز عەباس (١٩٨٧ - ١٩٩١).
بورهانەددین نەقشبەندی (١٩٩١ - ١٩٩٢).
جەبار یاوەر (١٩٩٢ - ١٩٩٢).
رەفعەت عەبدوڵڵا (١٩٩٢ - ١٩٩٣).
جەبار یاوەر (١٩٩٣-١٩٩٤)
سیروانی کوێخا نەجم شوانی (١٩٩٣ - ١٩٩٥).
محەمەد شێخ عیزەددین حەسەن (١٩٩٥ - ١٩٩٦).
کاکە رەش سدیق ئەحمەد (١٩٩٦ - ١٩٩٦).
سەید فەتحوڵڵا کاکەیی (١٩٩٦ - ١٩٩٦).
کاکە رەش سدیق ئەحمەد (١٩٩٦ - ١٩٩٨).
عەبدوڵڵا عیزەددین (١٩٩٨-٢٠٠٠)[١٩].
شێرزاد عەبدولحافیز شەریف (٢٠٠٢)

تاریق ڕەشید عەلی (٢٠٠٢-٢٠٠٤)
نەجمەدین عەبدوڵڵا عەباس (٢٠٠٤-٢٠٠٦)
نەوزاد حەمید محەمەد (٢٠٠٦-٢٠١٠)
عەلی ڕەئوف غەفوور (٢٠١٠-٢٠١١)
تاریق ڕەشید عەلی (٢٠١١-٢٠١٣)
ئامانج محەمەد کەساس جەباری (٢٠١٣-٢٠١٧)
ڕەمك ڕەمەزان (٢٠١٧-بەردەوامە).

*** ناحیەی ئاغجەلەر**

*** سنووری ئەم ناحیەیە بەم جۆرەیە:-**

لە سەرووە ڕووباری زێی بچووکە، دەبێتە سنووری لەگەڵ پارێزگای هەولێر، لە خوارەوە سنووره لەگەڵ بنکەی قەزای چەمچەماڵ، لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ناحیەی سورداش لە پارێزگای سلێمانی، لەخوارووی ڕۆژهەڵاتەوە ناحیەی بازیانە، بەڵام لەڕۆژئاواوە ناحیەی (شوانە)[٢٠]. ئەم ناحیەیە لەمەرکەزی قەزاکەوە (٤٦) کیلۆ مەتر دووره لەسەرووەوە بەلای ڕۆژهەڵاتەوە.

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی چەند ڕاوبۆچوونێك هەیە کە هەریەکەی بەجۆرێك باسی لێوە دەکات:-

هەندێك لەو باوەڕەدان کە بنەڕەتی ناوەکە (اقجە)یە بەمانای (سپی)و، (لر) بۆ ئامرازی کۆ بەکار دەهێنرێت بەڵام هەندێکی تر دەڵێن، بنەڕەتی بێژەیی ووشەکە (باغجەلر) بەمانای بێستان دەکات بەزمانی (تورکی) ئەویش بەهۆی زۆری لە ناوچەکەدا ئەو ناوەی بەسەردا سەپێنراوە[٢١].

بەڵام لەیاداشتەکانی (مامون بگ کوری بێگە بگ)دا بەمانای ((اغجە قلعە)) هاتووە،[٢٢] ئینجا نازانرێت تا چەندێك شوێنی ئاغجەلەری ئێستا دەکات.

بنەڕەتی ووشەی (آغجە یان آقجە) لەزمانی تورکیدا بەمانای پارچەیەکی زیوییە لەبەر سپێتی، کە (اغجەلر) بەمانای پارچەی کشتوکاڵی دەکات (القطعة الزراعية)[٢٣].

ئەم ناحیەیە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا سەر بە لیوای سولەیمانی بووە، بەڵام لێی دابراوەو دراوەتە قەزای چەمچەماڵ، لەدوایدا دووبارە دراوەتەوە سلێمانی[٢٤] بەڵام تا ناوەڕاستی هەفتاکان سەر بەپارێزگای کەرکوك بووەو لەچوارچێوەی قەزای چەمچەماڵ.

ئەگەر سەیری مێژووی ئەم ناوچەیە بکەین دەبینین خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژەو، گەلێك پاشماوەی سەردەمە کۆنەکانی لێ دۆزراوەتەوە، کە بەڵگەی کۆنی ناوچەکە دەگەیەنێت.

مامۆستای مێژوو دکتۆر (جەمال ڕەشید) باسی دەسنووسێك دەکات کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی (ئاغجەلەر) لەسەردەمی یۆنانییەکان.

((دەسخەتێك دۆزراوەتەوە بەڕێنوسی ئارامی وێنەیەکی لاماوەو بۆ ئەو قۆناغە دەگەڕێتەوە، ئەم دەسنووسانە گرنگترین بەڵگەی مێژوویین بۆ کوردو بەگەنجینەیەکی گورج و گۆڵانە کە لێی بکۆڵدرێتەوە...))[٢٥].

دەربارەی پێوانەی زەوی ئەم ناحیەیە (٦١٩) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، کە دەکاتە (٢٤٧٦٠٠) دۆنم - مەشارە.

دەربارەی ئاوو هەوای ئەم ناحیەیە، تا ڕادەیەکی چاك بەلای مام ناوەندییدا دەڕوات و، هەواکەی سازگارو بێ نەخۆشییەو شوێنی هەیە وەکو گوندی (کەرەدێ) کە جێگەی گەشت و گوزارە، کە کەوتووەتە لای چیای (بوغدیان))، بەڵام جێگەکەی تووشەو ئوتۆمبیل ناگات پێی و، لە مەرقەدەکانی کە خەڵکی دێنە سەری مەرقەدی (هەرزانی)یە، دەکەوێتە سەر ڕێگای ئاغجەلەر هەروەها ئەم ناحیەیە بەناوبانگە بە شوێنی ڕاوکردن، جۆرەها تەیرو تواڵی وەکو کەوو سوێسکەو ئاژەڵی وەکو گۆرهەڵکەنەو کەروێشکی تێدا بەرچاو دەکەوێت، جۆرەها میوەی وەکو هەنجیرو ترێ و هەنارو لۆزی تێدا شین دەبێت ...[٢٦].

"لە ناونووسی ساڵی (١٩٥٧)دا (٦٢) دێی لەسەر ئامار کراوە، لە سەرژمێری ساڵی (١٩٦٥)دا (٦١) ئاوایی، گوندو دێهاتەکانی بە ناوەندی ناحیەکەشەوە چەندان جار کاول و وێرانکراوەو سووتاوە، خەڵکەکەی دەربەدەر کراوە، لە مانگی ئایاری ساڵی (١٩٨٨)دا چەندان ئاوایی ئەم ناحیەیە کیمیاباران کرا لەوانە: دێی عەسکەر، گۆپتەپە، مۆتلیچە، بووە هۆی شەهیدکردن و بریندار کردنی سەدان ژن و منداڵ و پیرو لاو.

دەستی ڕەشی ئەنفال گەیشتە چەندان خێزانی بێ تاوانی ئەم ناحیەیە، لەنێوان ساڵی (١٩٨٧-١٩٨٨)دا دوای خاپوورو تەختکردنی زۆربەی ئاوایی و دێهات و چەندان ناوەندی ناحیەو شارۆچکەی کوردستان و بە تایبەتی هی پارێزگای کەرکوك، بە خانوو و ماڵ و شوێنی خواپەرستی لە مزگەوت و کڵێسا و دێرو خوێندنگا و ئەو بنکە تەندروستییە کەمانەی کە هەبوون، جگە لە سووتاندنی ڕەزو باغ و خەڵەو خەرمان و دارو درەخت و دەوەن و تەقاندنەوەی کانیاوەکان و کوێرکردنەوەی شوێنەوارییان و کوشتن و برین و تاڵان و بێ سەرو شوێن کردن و ئاوارەکردنی سەدان خەڵکی مەدەنی، دانیشتووانی ناحیەی ئاغجەلەرو دێیەکانیشی بە ناچاری و بە زۆرداری لە ئۆردوگاکانی سەر ڕێگای گشتی نێوان کەرکوك - سلێمانی لە تەکیەی بەردەڕەبەند بازیان و شۆڕش نیشتەجێکران، بێ کارو کاسبی و بژێوی، دوور لە هەوارو زێدو خاك و زەوی و زارەکانیان، سەرباری هەموو ئەوانەش لە کاتی دەرکردن و کۆچپێکردنە زۆرە ملێیەکەشدا، تاڵان دەکران لەسەر دەستی ئەوانەی کە سەرپەرشتی پرۆسەی تەرحیل کردنەکەیان دەکرد، لە گەورە ئەفسەرو لێپرسراوە حیزبی و دەزگاکانی ئەمن و هەندێ موستەشاری کورد"[٢٧].

*** ناحیەی سەنگاو:-**

**ئەمیش یەکێکە لەناحییەکانی قەزای چەمچەماڵ "...کە (٣٨) کیلۆمەتر دوورە لەمەرکەزی قەزاکەوە"[٢٨].**

**سنووری ئەم ناحیەیە بەم جۆرەیە:-**

**لەرۆژهەڵاتەوە ناحیەی قەرەداغە لەپارێزگای سلێمانیو، لەرۆژئاواوە ناحیەی قادرکەرەمە لەقەزای دووز خورماتوو، لەسەروو سەرووی رۆژئاواوە زەوییەکانی پارێزگای سلێمانیو ناوچەی مەرکەزی چەمچەماڵە، لەخوارووی رۆژهەڵاتو خوارووەوە ناحییەی پێبازە لەقەزای (کفری). پێوانەی ئەم ناحیەیە (٨٢٣) کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، کە بەرامبەر (٢٤٩,٤٠٠) دۆنم - مەشارەیە.**

**دەربارەی بنەڕەتی ئەم ناحیەیە، ئەوەیە کە هەندێك بە(سەنگاو، سنگاس، شنگاو، سەنگ - او) بەکاردەهێنرێت بەڵام لەوانەیە بنەڕەتی ناوەکە سوباری بووبێتو گۆڕانی بەسەردا هاتبێت ...**

**گرنگترین کشتوکاڵی:- گەنمو جۆو کونجیو نیسكو هەرتوومانەو تووتنە، لەگەڵ هەنجیرو ترێو هەنار لەگەڵ هەندێکی کەم لەمیوەی تر بەڵام بەرێژەیەکی کەمتر.**

**لەکۆندا ئەم ناحیەیە سەر بەقەزای (گیل - گل) بوو، بەڵام کاتێك ئەم قەزایە هەڵگیرا، درا بەقەزای چەمچەماڵ.[٢٩] و بنکەی ئەم ناحیەیە گوندی (گوك تەپە)یە لەناوچەکەدا.**

**هەروەها شوێنێکی بەناوبانگی گەشتو گوزارەو جێگای دڵگیری هەیەو، شوێنێکی گرنگی ڕاوە بۆ ڕاوکردنی جۆرەها گیانلەبەر.**



**"لەنێوانساڵی (١٩٨٧ - ١٩٨٨) هەموو گوندەکانی تەختو کاولکرا بە ناوەندی ناحیەکەشەوە، هەروەها بەر هێرشی عەمەلیاتی ئەنفال کەوتووە، لە ناونووسی ساڵی (١٩٥٧)دا (٨٧) دێی لەسەر تۆمار کراوە، کۆی دانیشتووانی ناحیەی سەنگاوو دێیەکانی (٩٥٤٠) کەسە لە ئامارە نا تەواوەکەی ساڵی (١٩٦٥) (٨٦) ئاوایی بە سەرەوەیە لە دوای (٨)ی شوباتی ساڵی (١٩٦٣)دا سەردەمی حوکمی حەرەس قەومییەکان هەموو عێراق کەوتە بەر هێرشو پەلاماری نارەوای ئەم دەسەڵاتدارانە بە تایبەتی کوردستان.**

**ئەم دێیانە بەم ناوانەش لەسەر زاری خەڵکن: مەسۆی حەمەی فەرەج (ئاوەسپی)، مەسۆی ئەحمەد ڕەحیم (سەرچەم)، تەپە سووری بچووك (جەبار)، تەپە سووری حاجی حەمە ڕەزا (تیلەکۆ)، ئاوە بۆرەکەی سەروو (سەعید میرزا)، زەلە (ژاژە)، سووتاو (خێل مەنسور)، پونگەلەی دووەر (سەعید ناسر)، ئاوە بۆرەکەی حاجی حەمە شەریف (خواروو)، کەلەڕەشی سلێمان (گەورە)، پونگەلەی حاجی سەعید، عەینکەی سەعیدە ڕەش، قەلوەزە ڕەش (کانی باجگە)، دێی سەید وەلی لە ناونووسی ساڵی (١٩٥٧)دا هەیە لە ئاماری ساڵی (١٩٧٧)دا نەماوە، هەردوو ئاوایی سەیدەی سەروو و خواروو لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا لەگەڵ ناحیەی قەرەحەسەن (لەیلان) تۆمار کراون"[٣٠].**

### سەرژمێری قەزای چەمچەماڵ - سەنگاو - ئاغجەلەر[31]

| ز | ناوی گوند | سەرژمێری سالی (١٩٤٧) | | | سەرژمێری سالی (١٩٥٧) | | | سەرژمێری سالی (١٩٧٧) | | | سەرژمێری سالی (١٩٩٧) | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ | نێر | مێ | کۆ |
| ١ | گورگەیی فەتاح | – | – | – | ٤٣ | ٣٥ | ٧٨ | – | – | – | ٤ | ٤ | ٨ |
| ٢ | چەشمە بەردینە | – | – | – | ٣١ | ٣٢ | ٦٣ | – | – | ١٣٤ | – | – | – |
| ٣ | وەسمان غەزال | – | – | – | ٣٩ | ٢٩ | ٦٨ | – | – | ٨٢ | – | – | – |
| ٤ | گۆشقووت | – | – | – | ٧١ | ٥٥ | ١٢٦ | – | – | ٢٣٣ | – | – | – |
| ٥ | فەیزاوا | – | – | – | ٢٣ | ٢٤ | ٤٧ | – | – | ٨٢ | ١٨ | ٢٠ | ٣٨ |
| ٦ | نورە | ١٠٦ | ١١٨ | ٢٢٤ | ١٠٦ | ٩٤ | ٢٠٠ | – | – | ٤٢٣ | ١١٨ | ١٠٩ | ٢٢٧ |
| ٧ | تەپە دێ | – | – | – | ٩٥ | ٧٩ | ١٧٤ | – | – | ١٩٨ | ٥ | ٢ | ٧ |
| ٨ | جافان – جافان | – | – | – | ٥٩ | ٤٩ | ١٠٨ | – | – | ١٠٩ | – | – | – |
| ٩ | سەوزکە | – | – | – | ٦١ | ٥١ | ١١٢ | – | – | ١٧٨ | ٣٥ | ٢٥ | ٦٠ |
| ١٠ | قەرەوەیس | ١٠٤ | ١٧٢ | ٢٧٦ | ١٥١ | ١٧١ | ٣٢٢ | – | – | – | – | – | – |
| ١١ | شێرەدەرە | ١٠٥ | ١٤١ | ٢٤٦ | ٧٩ | ٨٣ | ١٦٢ | – | – | ١٨٧ | – | – | – |
| ١٢ | گۆران | – | – | – | ١٨٩ | ١٣١ | ٣٢٠ | – | – | ١١٦ | ٤٨ | ٤١ | ٨٩ |
| ١٣ | فەرقان – فەرقە | ٨٠ | ١٢٦ | ٢٠٦ | ٩٥ | ٧٩ | ١٧٤ | – | – | ٢٥٠ | – | – | – |
| ١٤ | کورە داوێ | – | – | – | ٣٥ | ٣٦ | ٧١ | – | – | ١٠٩ | ٣٧ | ٤٨ | ٨٥ |
| ١٥ | هەگەز | – | – | – | ٤٦ | ٥٩ | ١٢٣ | – | – | ١٣٢ | ٥٠ | ٣٧ | ٨٧ |
| ١٦ | قەڵا چوغە | ٩٤ | ١٣٢ | ٢٢٦ | ١١٠ | ٩٥ | ٢٠٥ | – | – | ٣١٣ | ٨٩ | ٧٣ | ١٦٢ |
| ١٧ | زنان | – | – | – | ١٠٠ | ١٠٢ | ٢٠٢ | – | – | ٢٥٣ | ٣٠ | ٣٤ | ٦٤ |
| ١٨ | قاسم بەگزادە | – | – | – | ٦١ | ٦٠ | ١٢١ | – | – | ١٥٦ | ٤٢ | ٣٦ | ٧٨ |
| ١٩ | کونە کۆتر | – | – | – | ٢٣ | ٢٩ | ٥٢ | – | – | ٧١ | ١٩ | ٢٠ | ٣٩ |
| ٢٠ | ئەحمەد لەوەند | ١٠٨ | ١٤٢ | ٢٥٠ | ١٣١ | ١١٣ | ٢٤٤ | – | – | ١١٦ | ٦٥ | ٦٨ | ١٣٣ |
| ٢١ | چراغە ڕووتە | ١٢٤ | ١٥٣ | ٢٧٧ | ١٦٠ | ١٤٥ | ٣٠٥ | – | – | ٤٢٩ | ٩٦ | ٧١ | ١٦٧ |
| ٢٢ | مەلا حوسێن | – | – | – | ٢٣ | ٣٠ | ٥٣ | – | – | ١٢٢ | ٧٣ | ٦٢ | ١٣٥ |
| ٢٣ | مەحمود فاتە | – | – | – | ١٤ | ١٣ | ٢٧ | – | – | ٢٤ | – | – | – |
| ٢٤ | ژاڵە | ١١٦ | ١٥٨ | ٢٧٤ | ١٠١ | ١٠٠ | ٢٠١ | – | – | ٢٧٨ | – | – | – |
| ٢٥ | قوڵە | – | – | – | ٩٤ | ٩٣ | ١٨٧ | – | – | ٣٣١ | ٢٩ | ٢٣ | ٥٢ |
| ٢٦ | عەلی زەنگەنە | – | – | – | ٢٠ | ٢٠ | ٤٠ | – | – | ٦٧ | ٤٢ | ٤٦ | ٨٨ |
| ٢٧ | سۆفی حەسەن | – | – | – | ٧٨ | ٨٤ | ١٦٢ | – | – | ١٣٥ | ٤٣ | ٥٨ | ١٠١ |
| ٢٨ | کانی مستەفا | – | – | – | ٨٠ | ٩٠ | ١٧٠ | – | – | ٢٤٧ | ٨٠ | ٦٨ | ١٤٨ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٩ | خاڵدان | ٩٤ | ١١٤ | ٢٠٨ | ١٢٩ | ٩٧ | ٢٢٦ | – | – | ٣٧٦ | ١٢٩ | ١٣٨ | ٢٦٧ |
| ٣٠ | باینجانی خواروو و سەروو | – | – | – | ١٧ | ١٥ | ٣٢ | – | – | ١٧٨ | ٥٥ | ٣٦ | ٩١ |
| ٣١ | چۆڵمکی سەروو | – | – | – | ٥٠ | ٥٤ | ١٠٤ | – | – | ٢٣٦ | – | – | – |
| ٣٢ | چۆڵمکی خواروو | – | – | – | ١٥ | ١٧ | ٣٢ | – | – | ٢١ | – | – | – |
| ٣٣ | هەڕاوە | ١١٦ | ١٥١ | ٢٦٧ | ١٤٣ | ١٢٨ | ٢٧١ | – | – | ٢٥١ | ٦٢ | ٦٩ | ١٣١ |
| ٣٤ | خوامراد | – | – | – | ١٠٦ | ١٠٢ | ٢٠٨ | – | – | ١٤٥ | ٣١ | ٣٣ | ٦٤ |
| ٣٥ | کانی سارد | – | – | – | ٥٧ | ٥٣ | ١١٠ | – | – | ٦٦ | ٥٥ | ٥٨ | ١١٣ |
| ٣٦ | چاڵە ڕۆمی | – | – | – | ٧٦ | ٧٢ | ١٤٨ | – | – | – | – | – | – |
| ٣٧ | قودرەتە | – | – | – | ٦١ | ٧١ | ١٣٢ | – | – | ٩٦ | ٣٩ | ٤٢ | ٨١ |
| ٣٨ | کانی چنار | – | – | – | ٩٩ | ١٠٦ | ٢٠٥ | – | – | ٨١ | ١٠ | ١١ | ٢١ |
| ٣٩ | لکاوە | – | – | – | ٤٩ | ٤٧ | ٩٦ | – | – | ٨٥ | ١٦ | ١٠ | ٢٦ |
| ٤٠ | گورگەیی شامار | ١١٦ | ١٠٧ | ٢٢٣ | ١٤٣ | ١٤٧ | ٢٩٠ | – | – | ٣٨٠ | ٨٦ | ٩٠ | ١٧٦ |
| ٤١ | گورگەیی چاوسوور | – | – | – | ١٠٨ | ١١١ | ٢١٩ | – | – | ٢٥٣ | ٤٢ | ٤٧ | ٨٩ |
| ٤٢ | گورگەیی کاکە عەبدوڵڵا | – | – | – | ٦٩ | ٧١ | ١٤٠ | – | – | ٣٧ | ٢٩ | ٣٠ | ٥٩ |
| ٤٣ | کانی کوجەڵە | – | – | – | ٥١ | ٤٧ | ٩٨ | – | – | ٢٧ | – | – | – |
| ٤٤ | هەمزە | – | – | – | ٦٤ | ٦٤ | ١٢٨ | – | – | ١١٨ | ٣١ | ٣٦ | ٦٧ |
| ٤٥ | چاڵاوا | – | – | – | ٥٧ | ٥٨ | ١١٥ | – | – | ١٢٣ | ٣٤ | ٤٢ | ٨٦ |
| ٤٦ | دانە سۆفی | ١١٠ | ١٤٣ | ٢٥٣ | ١١٦ | ١١٣ | ٢٢٩ | – | – | ٣١٨ | ١٢٢ | ١١٤ | ٢٣٦ |
| ٤٧ | ئیبراهیم ئاغا | – | – | – | ٣٤ | ٤١ | ٧٥ | – | – | ١٠٥ | – | – | – |
| ٤٨ | بنگرد | ١١٩ | ١٤١ | ٢٦٠ | ١٣٩ | ١٣٨ | ٢٧٧ | – | – | ٥١٩ | – | – | – |
| ٤٩ | تەپەی سەروو | – | – | – | ١٨ | ٢٢ | ٤٠ | – | – | – | – | – | – |
| ٥٠ | تەپەی خواروو | – | – | – | ٨٧ | ٧٧ | ١٦٤ | – | – | – | – | – | – |
| ٥١ | تەپەی ناوەڕاست | – | – | – | ١٥ | ١٣ | ٢٨ | – | – | – | – | – | – |
| ٥٢ | سەیدانی خواروو –سەیواوی خواروو | – | – | – | ٢٦ | ٢٥ | ٥١ | – | – | ١٤ | – | – | – |
| ٥٣ | سەیدانی سەروو – سەیواوی سەروو | ١٢٦ | ١٣٥ | ٢٦١ | ٦٦ | ٦٣ | ١٢٩ | – | – | ٥٨ | – | – | – |
| ٥٤ | خان گەشە | – | – | – | ١٣ | ١٣ | ٢٦ | – | – | – | – | – | – |
| ٥٥ | ساتی | – | – | – | ٨٥ | ٨٥ | ١٧٠ | – | – | – | – | – | – |
| ٥٦ | گورگەیی بارزان | – | – | – | ٢٢ | ٢٠ | ٤٢ | – | – | – | – | – | – |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥٧ | هەزار کانی | – | – | – | ٩ | ٦ | ١٥ | – | – | ١٥١ | ٣٥ | ٤٣ | ٧٨ |
| ٥٨ | گورگەیی سەرخاسە | ٢٥٨ | ٢٥٣ | ٥١١ | ٨٥ | ٨٥ | ١٧٠ | – | – | – | – | – | – |
| ٥٩ | تەکیەی کاکە عەبدوڵڵا | – | – | – | ٧٦ | ٨٠ | ١٥٦ | – | – | ٢٦٣ | – | – | – |
| ٦٠ | گورگەیی خاسە | ٢٥٨ | ٢٥٣ | ٥١١ | ١٧٢ | ١٥٢ | ٣٢٤ | – | – | – | – | – | – |
| ٦١ | موتلیجە | – | – | – | ١١١ | ١١٧ | ٢٢٨ | – | – | ٣٠٦ | ٢٠٦ | ١٩٣ | ٣٩٩ |
| ٦٢ | ئەلی مەسور– عەلی مەنسور | ١٩٣ | ٢٠٤ | ٣٩٧ | ١٩٥ | ١٦٥ | ٣٦٠ | – | – | ٣٦١ | ٨٦ | ٨٠ | ١٥٦ |
| ٦٣ | قەرەتامۆر | ٢١٥ | ١٩٠ | ٤٠٥ | ١٦٩ | ١٣٣ | ٣٠٢ | – | – | ٢٨٩ | ١١٢ | ٩٣ | ٢٠٥ |
| ٦٤ | موفەر – مظفر | – | – | – | ١٥٦ | ١٤٩ | ٣٠٥ | – | – | ٣٧٣ | – | – | – |
| ٦٥ | شۆراو | – | – | – | ٥٦ | ٧٠ | ١٢٦ | – | – | ٢٣٩ | ٨٥ | ٨٨ | ١٧٣ |
| ٦٦ | پیریادی | ١٠٠ | ١٣١ | ٢٣١ | ٩٤ | ٧٩ | ١٧٣ | – | – | ٢٧٩ | | | |
| ٦٧ | تەکیەی کاکەمەند | ٩٧ | ١٤٣ | ٢٤٠ | ٢٠٤ | ١٦١ | ٣٦٥ | – | – | ٢٧٨ | ٤٣٧ | ٢٠٤ | ٦٤١ |
| ٦٨ | گەرگەڕ | – | – | – | ٥٠ | ٥١ | ١٠١ | – | – | ١١٢ | ٣٩ | ٣٢ | ٧١ |
| ٦٩ | خڕبەندەلو | – | – | – | ٦٥ | ٥٢ | ١١٧ | – | – | ١٥٠ | ٥٩ | ٥٤ | ١١٣ |
| ٧٠ | چنارتوو ئازادی + | – | – | – | ١٠٦ | ١٠٤ | ٢١٠ | – | – | ٢٢٦ | ٤١ | ٥١ | ٩٢ |
| ٧١ | قۆجەلەر | ٩٠ | ١١٥ | ٢٠٥ | ٧٥ | ٦٩ | ١٤٤ | – | – | ١٨١ | ١٣٥ | ١٢٣ | ٢٥٨ |
| ٧٢ | کانی بی | – | – | – | ٧٠ | ٧٤ | ١٤٤ | – | – | ٢٠٦ | ٧٢ | ٥٢ | ١٢٤ |
| ٧٣ | گەورەدێ | ١٨٨ | ٢١٧ | ٤٠٥ | ٢١٥ | ١٩٢ | ٤٠٧ | – | – | ٣٨٣ | ١٦٥ | ١٥٠ | ٣١٥ |
| ٧٤ | بلوکێن | – | – | – | ١٢٣ | ١٢٣ | ٢٤٦ | – | – | ٣٥٩ | ٥٠ | ٤٢ | ٩٢ |
| ٧٥ | کانی بۆگەنە | – | – | – | ٢١ | ١١ | ٣٣ | – | – | – | – | – | – |
| ٧٦ | مایلە – سایلە | – | – | – | ٤١ | ٤٠ | ٨١ | – | – | ١٠٩ | ٥٥ | ٥٨ | ١٢٣ |
| ٧٧ | سووتکە | – | – | – | ٢٦ | ٢٦ | ٥٢ | – | – | ٨٥ | ٣٣ | ٣٦ | ٦٩ |
| ٧٨ | عەسکەر | ١٩٢ | ٢٣١ | ٤٢٣ | ١٩٨ | ٢١٥ | ٤١٣ | – | – | ٤٤٧ | ٢٣٦ | ٢٩٠ | ٥٢٦ |
| ٧٩ | دەلاوەی کوردان | – | – | – | ٦٨ | ٦٨ | ١٣٦ | – | – | ١٦٣ | ١١١ | ٩٤ | ٢٠٥ |
| ٨٠ | دەلاوە ڕووتە | – | – | – | ٦٨ | ٦٧ | ١٣٥ | – | – | ١٨٦ | ٨٠ | ٩٥ | ١٧٥ |
| ٨١ | دەلاوەی شێخ ساڵح | – | – | – | ٢٨ | ٢٥ | ٥٣ | – | – | ٤٨ | ٨٣ | ٦٧ | ١٥٠ |
| ٨٢ | گۆزە بۆرە | – | – | – | ٤١ | ٤٦ | ٨٧ | – | – | ١٠٩ | ٥٥ | ٣٤ | ٨٩ |
| ٨٣ | کانی هەنجیرە | – | – | – | ٨٩ | ٧٩ | ١٦٨ | – | – | ٣٣١ | – | – | – |
| ٨٤ | شێخ پاڵەوان | – | – | – | ١٠٥ | ٩٧ | ٢٠٢ | – | – | ٢٣٢ | ١٢١ | ٨٦ | ٢٠٧ |
| ٨٥ | تەوەکەڵی بچووک | ٢٥٧ | ٢٥٠ | ٥٠٧ | ٧٤ | ٦٧ | ١٤١ | – | – | ٢٣٣ | ١١٩ | ٨٢ | ٢٠١ |
| ٨٦ | تەوەکەڵی گەورە | | | | ١٨٦ | ١٩٣ | ٣٧٩ | – | – | ٥٧٥ | ٤٩ | ٤٨ | ٩٧ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٨٧ | كانی سپیلكە | – | – | – | ٣٢ | ٣٠ | ٦٢ | – | – | ٧٨ | ٧٢ | ٧٢ | ١٤٤ |
| ٨٨ | قشڵاخ | – | – | – | ٦٦ | ٨٤ | ١٥٠ | – | – | ١٩٩ | ٣٧ | ٦٩ | ١٠٦ |
| ٨٩ | شێخ وەیسی | – | – | – | ٩٧ | ١١٤ | ٢١١ | – | – | ٢٩١ | ٦٦ | ٦٨ | ١٣٤ |
| ٩٠ | باوەفەتی سەروو | ١٣٣ | ١٤١ | ٢٧٤ | ١٨٨ | ١٩٧ | ٣٨٥ | – | – | ٥٠٩ | ٥٤ | ٦٣ | ١١٧ |
| ٩١ | كۆچكە نەخشینە | – | – | – | ٨١ | ٨٢ | ١٦٣ | – | – | ٢٠٨ | ٩٨ | ١١٤ | ٢١٢ |
| ٩٢ | باوەفەتی خواروو | – | – | – | ٣٨ | ٣٠ | ٦٨ | – | – | ١١٩ | ٧٨ | ٨٧ | ١٦٥ |
| ٩٣ | توورکە | – | – | – | ٣٢ | ٣٩ | ٧١ | – | – | ٩٥ | ٣٢ | ٢٣ | ٥٥ |
| ٩٤ | تەق تەق | – | – | – | ٢٤ | ٢٢ | ٤٦ | – | – | ٨٦ | ٣٥ | ٣٩ | ٧٤ |
| ٩٥ | گەزەڵان | ١٠٢ | ١٣٤ | ٢٣٦ | ١١٩ | ١٠٧ | ٢٢٦ | – | – | ٢٧٤ | ٥٦ | ٥٩ | ١١٥ |
| ٩٦ | كانی عارەبان | – | – | – | ٨٢ | ٦٩ | ١٥١ | – | – | ٢٢٠ | ٨٣ | ٦٤ | ١٤٧ |
| ٩٧ | چیا سەوز، چیا سوور | – | – | – | ١٣٢ | ١٠٠ | ٢٣٢ | – | – | ٢٥٦ | ٨١ | ٩٨ | ١٧٨ |
| ٩٨ | هەیدەر بەگ | – | – | – | ١٢٧ | ١٢٦ | ٢٥٣ | – | – | ٣٦٤ | ١٤٦ | ١٦٥ | ٣١١ |
| ٩٩ | قەڵاچۆغەی شێخ كەریم | – | – | – | ٣٤ | ٢٥ | ٥٩ | – | – | ١١٤ | ١٢٩ | ١١٠ | ٢٣٩ |
| ١٠٠ | قەڵاچۆغەی شێخ سەلام | – | – | – | ٥٣ | ٥٧ | ١١٠ | – | – | ١١٧ | ٨٨ | ٧٣ | ١٦١ |
| ١٠١ | گۆپتەپە | – | – | – | ٢٣٣ | ٢١٩ | ٤٥٢ | – | – | ٧٢٧ | ٣٢٤ | ٣٩٠ | ٧١٤ |
| ١٠٢ | كانی هەنجیری شێخ بزێنی | – | – | – | ١٥٣ | ١٥٣ | ٣٠٦ | – | – | – | ١٥٦ | ١٩٠ | ٣٤٦ |
| ١٠٣ | گەڵناغاج | – | – | – | ١٣٠ | ١٢٩ | ٢٥٩ | – | – | – | | | |
| ١٠٤ | سەرچنار | – | – | – | ٨٦ | ٧٨ | ١٦٤ | – | – | ١٧٩ | ٨٣ | ٨٨ | ١٧١ |
| ١٠٥ | شێخانی شێخ بزێنی | – | – | – | ٥٧ | ٦٣ | ١٢٠ | – | – | ١٨٦ | ٩٧ | ٨٨ | ١٨٥ |
| ١٠٦ | جەلەمۆرد | ١١٤ | ١٢٦ | ٢٤٠ | ١٧٠ | ١٤٣ | ٣١٣ | – | – | ٣٩٧ | ١٦٨ | ١٣٩ | ٣٠٧ |
| ١٠٧ | توتەقەل | – | – | – | ٦٧ | ٩١ | ١٥٨ | – | – | ٢١٢ | ٤٩ | ٦٥ | ١١٤ |
| ١٠٨ | چۆغلیجە | – | – | – | ٦١ | ٥٥ | ١١٦ | – | – | ٨٧ | ٤٣ | ٣٤ | ٧٧ |
| ١٠٩ | قەسرۆك | ٨٢ | ١٣٢ | ٢١٤ | ١١١ | ١١٨ | ٢٢٩ | – | – | ٣٤٩ | ٢٥٠ | ٢٨٥ | ٥٣٥ |
| ١١٠ | قامیشە | – | – | – | ٨٧ | ٨٠ | ١٦٧ | – | – | ٢٢٣ | ١٨٥ | ١٤٨ | ٣٤٣ |
| ١١١ | گردخەبەر | – | – | – | ٩٧ | ٩٩ | ١٩٦ | – | – | ٢٧١ | ١٤٨ | ١٨٢ | ٣٣٠ |
| ١١٢ | مامڵێس | – | – | – | ٥٢ | ٦٠ | ١١٢ | – | – | ١٩٩ | ١٣١ | ١٤٥ | ٢٧٦ |
| ١١٣ | ئاغجەلەر | ٣٣٣ | ٢٩٤ | ٦٢٧ | ٦٣ | ٦٩ | ١٣٢ | – | – | – | – | – | – |
| ١١٤ | دارە قووتە | ١١٣ | ١٤٢ | ٢٥٥ | ٧ | ٥ | ١٢ | – | – | ١٧٣ | ٨١ | ٨١ | ١٦٢ |
| ١١٥ | مووردەی سەروو | – | – | – | ١٢٤ | ٩١ | ٢١٥ | – | – | ٢٠١ | – | – | – |
| ١١٦ | ئاوبارە | – | – | – | ٧٢ | ٧٦ | ١٤٨ | – | – | ١٤٤ | ٥٣ | ٥٢ | ١٠٥ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١١٧ | مووردەی خواروو | – | – | – | ١٠٨ | ٩٩ | ٢٠٧ | – | – | – | ١٢٢ | ١١٤ | ٢٣٦ |
| ١١٨ | کانی گەوەر | – | – | – | ٢٩ | ٢٧ | ٥٦ | – | – | ٨٣ | – | – | – |
| ١١٩ | میر حەمە خان – محەمەد خان | – | – | – | ٥٧ | ٦١ | ١١٨ | – | – | ١٦٠ | ١٥ | ١٢ | ٢٧ |
| ١٢٠ | تلیان | ١٥٩ | ١٧٨ | ٣٣٧ | ١٧٨ | ١٨٢ | ٣٦٠ | – | – | ٦٤٧ | ١٥٩ | ١٢٨ | ٢٨٧ |
| ١٢١ | تیژە | – | – | – | ٧٤ | ٩٦ | ١٧٠ | – | – | ٦٠ | ٨٥ | ١٠٠ | ١٨٥ |
| ١٢٢ | قوراوە | – | – | – | ٣٢ | ٢٦ | ٥٨ | | | | ٣١ | ٣٢ | ٦٣ |
| ١٢٣ | بێدر | – | – | – | ٧٠ | ٦٩ | ١٣٩ | – | – | ١٤٠ | ١٣ | ١٦ | ٢٩ |
| ١٢٤ | ئەسکەندەر بەگی | – | – | – | ١١٤ | ١٣٢ | ٢٤٦ | – | – | ٣١٧ | ١٥٠ | ١٤٤ | ١٩٤ |
| ١٢٥ | شۆرجە | – | – | – | ٦٦ | ٧٠ | ١٣٦ | – | – | ٣٦ | – | – | – |
| ١٢٦ | بۆڵ قامیش | – | – | – | ٥٦ | ٦٥ | ١٢١ | – | – | ٢١١ | ٦٣ | ٨٦ | ١٤٩ |
| ١٢٧ | شێخان سوور قاوشان | – | – | – | ٨ | ٨ | ١٦ | – | – | ٢٢ | – | – | – |
| ١٢٨ | هەمزە ڕۆمی | – | – | – | ٤٠ | ٣١ | ٧١ | – | – | ٦٠ | ٥٠ | ٤٥ | ٩٥ |
| ١٢٩ | هەنارە | – | – | – | ٥١ | ٣٤ | ٨٥ | – | – | ١٤٣ | ٨ | ٨ | ١٦ |
| ١٣٠ | کانی دۆلکە | – | – | – | ١٦ | ١٩ | ٣٥ | – | – | – | – | – | – |
| ١٣١ | کریچنە – کەرەپچنە | – | – | – | ٢١٥ | ٢٤٠ | ٤٥٥ | – | – | ٣٥٤ | ١٥٢ | ١٢٤ | ٢٧٦ |
| ١٣٢ | ژاڵەی کریچنە – ژاڵەی کەرەپچنە | – | – | – | ٥٤٩ | ٥٣٣ | ١٠٨٢ | – | – | ٢٨٧ | ٦٨ | ٦٢ | ١٣٠ |
| ١٣٣ | ڕەبات – ڕەبەت | – | – | – | ١٨٢ | ١٧٧ | ٣٥٩ | – | – | ٢٩٠ | – | – | – |
| ١٣٤ | داربەڕوو | – | – | – | ٣٩ | ٣٥ | ٧٤ | – | – | ٣٨ | ٢٤ | ٢٥ | ٤٩ |
| ١٣٥ | کێڵە بەرزە | – | – | – | ٣٩ | ٤٠ | ٧٩ | – | – | ٨٥ | ٥٣ | ٦٣ | ١١٦ |
| ١٣٦ | قەڵاگە | – | – | – | ٢٢ | ٣٦ | ٥٨ | – | – | ٦٧ | ٢١ | ٢٤ | ٤٥ |
| ١٣٧ | بانی مۆرد | – | – | – | ٧٢ | ٧٧ | ١٤٩ | – | – | ٢٨٩ | ٨٠ | ٨٤ | ١٦٤ |
| ١٣٨ | شەریف ئاوا | – | – | – | ٣٢ | ٢٤ | ٥٦ | – | – | – | – | – | – |
| ١٣٩ | دەرواری بچووک | ٩٦ | ١٦٠ | ٢٥٨ | ٤٧ | ٣٧ | ٨٤ | – | – | ٧٥ | ٨١ | ٧٧ | ١٥٨ |
| ١٤٠ | دەرواری گەورە | | | | ٣٩ | ٤٠ | ٧٩ | – | – | – | ٣٣ | ٢٦ | ٥٩ |
| ١٤١ | سی گمکان | – | – | – | ٤٣ | ٥٢ | ٩٥ | – | – | – | – | – | – |
| ١٤٢ | هەنجیرە | – | – | – | ٢١ | ١٣ | ٣٤ | – | – | ٤٢ | – | – | – |
| ١٤٣ | کانی بەکتاش – کانی باتیاش | – | – | – | ٢٤ | ٢٨ | ٥٢ | – | – | ٧٤ | ١٣ | ١٥ | ٢٨ |
| ١٤٤ | هەزار کانی | – | – | – | ٨٣ | ٨١ | ١٦٤ | – | – | – | – | – | – |
| ١٤٥ | کارێز – ڕەبات | ١٦٣ | ٢٠٨ | ٣٧١ | ٢٥ | ٣٣ | ٥٨ | – | – | ٥٦ | ٥٠ | ٦٠ | ١١٠ |
| ١٤٦ | زندانە | – | – | – | ٨٥ | ٨٣ | ١٦٨ | – | – | ١٥٥ | ٩٠ | ٦٣ | ١٥٣ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٤٧ | تیمار | – | – | – | ٤٥ | ٤٠ | ٨٥ | – | – | ١١٥ | ٤٥ | ٥٠ | ٩٥ |
| ١٤٨ | کچانی سەرروو و خواروو | ١٣٢ | ١٤٥ | ٢٧٧ | ٤٠٣ | ٣٤١ | ٧٤٤ | – | – | ٥٢٢ | ١٦٨ | ١٤٩ | ٣١٧ |
| ١٤٩ | کلۆزە ڕەش | – | – | – | ٣٠ | ٢٦ | ٥٦ | – | – | – | ١٤ | ١٦ | ٣٠ |
| ١٥٠ | گلان – دووبلان | – | – | – | ٢١ | ١٩ | ٤٠ | – | – | – | ٣٨ | ٤٣ | ٨١ |
| ١٥١ | سەیدوەلی | – | – | – | ٢٩ | ٣٢ | ٦١ | – | – | – | ١٩ | ١٥ | ٣٤ |
| ١٥٢ | قەڵای گۆپتەپە | – | – | – | ٤٦ | ٤٧ | ٩٣ | – | – | ٣٧٧ | ١١٦ | ١١٠ | ٢٢٦ |
| ١٥٣ | گلەڕەشی بچووک | – | – | – | ٤٢ | ٣٦ | ٧٨ | – | – | ١٤٦ | ٣٠ | ٣٩ | ٦٩ |
| ١٥٤ | کانی خاکی | – | – | – | ٦٢ | ٥٨ | ١٢٠ | – | – | ١٦٤ | ٥٣ | ٤٥ | ٩٨ |
| ١٥٥ | دۆلکە | – | – | – | ٤٣ | ٤٢ | ٨٥ | – | – | ٤٤ | ٧ | ٧ | ١٤ |
| ١٥٦ | دیرەشەی بچووک – دەروێشانی بچووک | – | – | – | ١٥ | ١٨ | ٣٣ | – | – | ٢١ | ١٧ | ٢٠ | ٣٧ |
| ١٥٧ | دیرەشەی گەورە – دەروێشانی گەورە | – | – | – | ٣٧ | ٢٩ | ٦٦ | – | – | ٩٩ | ٦٠ | ٦٤ | ١٢٤ |
| ١٥٨ | گۆمە زەرد | – | – | – | ٥٠ | ٣٩ | ٨٩ | – | – | ١٠٧ | ١٢٠ | ١٣٠ | ٢٥٠ |
| ١٥٩ | تەپەسوورەی بچووکی جەبار | – | – | – | ٤٢ | ٢٩ | ٧١ | – | – | ٤٠ | ٣٦ | ٣٩ | ٧٥ |
| ١٦٠ | تە پە سو و رە ی حەمە ڕەزا | – | – | – | ٤٠ | ٣٩ | ٧٩ | – | – | ١١٢ | ٧٨ | ٦٩ | ١٤٧ |
| ١٦١ | هەشە زینی | ١٦١ | ١٩٤ | ٣٨٥ | ٢٥٢ | ١٥٩ | ٤١١ | – | – | ٣٦٩ | ١٣٨ | ١٢٥ | ٢٦٣ |
| ١٦٢ | جنۆکەی حەمە تاڵ | – | – | – | ١١ | ٩ | ٢٠ | – | – | ١٤ | – | – | – |
| ١٦٣ | جنۆکەی مەدحەت | – | – | – | ١٤ | ١٨ | ٣٢ | – | – | ٢٠ | – | – | – |
| ١٦٤ | جنۆکەی عەبدوڵڵا | – | – | – | ٢٣ | ٢٣ | ٤٦ | – | – | ٣٧ | – | – | – |
| ١٦٥ | جنۆکەی گەورە | – | – | – | ٤٧ | ٣٤ | ٨١ | – | – | ٦٥ | – | – | – |
| ١٦٦ | میرەی سەرزەدار – میرەیی حەوزەوار | – | – | – | ٤٣ | ٣٥ | ٧٨ | – | – | ٥١ | – | – | – |
| ١٦٧ | مـیرەیـی حـەمـە حەسەن | – | – | – | ١٩ | ٢٥ | ٤٤ | – | – | ٦٢ | ٩ | ٦ | ١٥ |
| ١٦٨ | باغە گردەلە – باغە گردۆڵە | – | – | – | ٣٤ | ٣٠ | ٦٤ | – | – | ١١٣ | – | – | – |
| ١٦٩ | گۆگتەپەی دێم | ١٣٣ | ١٣٧ | ٣٧٠ | ٣٦ | ٣٦ | ٧٢ | – | – | – | – | – | – |
| ١٧٠ | سـەر قـەڵا + دوویالان | – | – | – | ٥٦ | ٨٠ | ١٣٦ | – | – | ٢٦٢ | ٩٨ | ١١٢ | ٢١٠ |
| ١٧١ | فاتکەی گەورە | – | – | – | ٢٥ | ٣٢ | ٥٧ | – | – | ١٦٨ | – | – | – |
| ١٧٢ | فاتکەی بچووک | – | – | – | ٥٥ | ٥٨ | ١١٣ | – | – | | – | – | – |
| ١٧٣ | کارێز بەردەلوو | – | – | – | ١١٠ | ١١١ | ٢٢١ | – | – | ٢٥٦ | ٦٨ | ٦٢ | ١٣٠ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٧٤ | پێنج ئەنگوستی گەورەو بچووك | – | – | – | ١٠٨ | ١٠٠ | ٢٠٨ | – | – | ١٠٤ | – | – | – |
| ١٧٥ | چەمرێزی بچووك | – | – | – | ٣٥ | ٣٧ | ٧٢ | – | – | ٧٦ | ١٤ | ٢٠ | ٣٤ |
| ١٧٦ | چەمرێزی گەورە دەرزیلە (خواروو) | – | – | – | ٤٣ | ٣٣ | ٧٦ | – | – | ١٣٦ | ٦ | ٤ | ١٠ |
| ١٧٧ | دەرزیلە | – | – | – | ١٨ | ١٦ | ٣٤ | – | – | ٣٠ | – | – | – |
| ١٧٨ | شەلاوی کۆن و تازە | – | – | – | ٦١ | ٦٨ | ١٢٩ | – | – | ١٤٦ | – | – | – |
| ١٧٩ | درۆزنە | ٧٢ | ١٧٣ | ٢٤٥ | ٨١ | ٧٥ | ١٥٦ | – | – | ٢٣٣ | – | – | – |
| ١٨٠ | سووسەی بەرکەچ – مەسۆیی بەرکەچ | – | – | – | ١٦٣ | ١٤٧ | ٣١٠ | – | – | ٢٤٥ | ١٢٩ | ١١٥ | ٢٤٤ |
| ١٨١ | سووسەی حەمە فەرەج – مەسۆیی حەمە فەرەج | – | – | – | ٤٠ | ٣٣ | ٧٣ | – | – | ١٦٩ | ٣٩ | ٤٠ | ٧٩ |
| ١٨٢ | سووسەی رەحیم – مەسۆیی سەرچەم | – | – | – | ٩٠ | ٨٨ | ١٧٨ | – | – | ٢٢٤ | ١٠١ | ١٠٨ | ٢٠٩ |
| ١٨٣ | تەپەسی بچووك (خواروو) | – | – | – | ٢٦ | ١٨ | ٤٤ | – | – | ٥٦ | ٢٥ | ١٥ | ٤٠ |
| ١٨٤ | تەپەسی گەورە (سەروو) | – | – | – | ٩٣ | ٩٢ | ١٨٥ | – | – | ١٢١ | – | – | – |
| ١٨٥ | کویك | – | – | – | ٥٥ | ٥٤ | ١٠٩ | – | – | – | ٨١ | ١٠٤ | ١٨٥ |
| ١٨٦ | موراد ئەلی | – | – | – | | | | – | – | ٣٢ | – | – | – |
| ١٨٧ | حەسەن کەنۆشی گەورە | – | – | – | ٣٥ | ٣٧ | ٧٢ | – | – | ٨٤ | ٤٩ | ٥٦ | ١٠٥ |
| ١٨٨ | حەسەن کەنۆشی بچووك | – | – | – | ١٦ | ١١ | ٢٧ | – | – | ٨٢ | | | |
| ١٨٩ | تەپە عەرەب حاجی مارف | – | – | – | ٧١ | ٥٨ | ١٢٩ | – | – | ٢١٠ | ٤٩ | ٥٥ | ١٠٤ |
| ١٩٠ | تەپە عەرەب نەریمان | – | – | – | ٣٤ | ٢٧ | ٦١ | – | – | ١١٥ | ٢٩ | ٤٩ | ٧٨ |
| ١٩١ | عەینکەی گەورە | – | – | – | ٥١ | ٤٨ | ٩٩ | – | – | – | – | – | – |
| ١٩٢ | کەلان | – | – | – | ٦٩ | ٦٥ | ١٣٤ | – | – | ١٧١ | – | – | – |
| ١٩٣ | عەزە ئاوا | – | – | – | ٢٩ | ٣٤ | ٦٣ | – | – | ١٠٢ | ٢٤ | ١٤ | ٣٨ |
| ١٩٤ | کەریم ئەجەل | – | – | – | ١٧ | ١٩ | ٣٦ | – | – | ٤٩ | ٢٩ | ٣٥ | ٦٤ |
| ١٩٥ | بنکەی زاڵواو – پونگەڵەی زاڵواو | – | – | – | ٢١ | ٩ | ٣٠ | – | – | ٥٤ | – | – | – |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٦ | ئاوە بۆرەکەی بچووک (خواروو) | – | – | – | ١٨ | ١٣ | ٣١ | – | – | ٤٨ | ٧ | ٥ | ١٢ |
| ١٩٧ | حەمە بارام – مەحە بارام | – | – | – | ٢٥ | ٣٦ | ٦١ | – | – | ٥٨ | ٨٥ | ٧٩ | ١٦٤ |
| ١٩٨ | عەینکەی بچووک | – | – | – | ١٠ | ٩ | ١٩ | – | – | – | | | |
| ١٩٩ | گوێژە | – | – | – | ٧ | ٤ | ١١ | – | – | ١٩ | ٣٥ | ٣٣ | ٦٨ |
| ٢٠٠ | زاڵواو | – | – | – | ٥٣ | ٤٨ | ١٠١ | – | – | ١١٣ | ٢٣ | ١٧ | ٤٠ |
| ٢٠١ | ئاوە بۆرەکەی گەورە | – | – | – | ٣٠ | ٢٩ | ٥٩ | – | – | ٥٧ | ٢٣ | ٢٦ | ٤٩ |
| ٢٠٢ | ژاڵەی مەملحە | ٦٩ | ١٤٩ | ٢١٨ | ١١٥ | ١٢٩ | ٢٤٤ | – | – | ١٩ | ١٥٦ | ١٤١ | ٢٩٧ |
| ٢٠٣ | دێ رەشە | ٧٩ | ١٧٤ | ٢٥٣ | ٢١٢ | ٢١٢ | ٤٢٤ | – | – | ١٥٠ | ٥٢ | ٦١ | ١١٣ |
| ٢٠٤ | مەملەحەی گۆم | – | – | – | ٧١ | ٨١ | ١٥٢ | – | – | ١٢٠ | ٧٩ | ٨٦ | ١٦٥ |
| ٢٠٥ | مەملەحەی خوێلێن کۆن | – | – | – | ٨٢ | ٨٢ | ١٥٤ | – | – | ١٧٤ | ٤٧ | ٥٢ | ٩٩ |
| ٢٠٦ | گەڕاوی گەورە | – | – | – | ٣٧ | ٢٥ | ٦٢ | – | – | – | ٣١ | ٣٧ | ٦٨ |
| ٢٠٧ | کانی مامە | – | – | – | ٤٣ | ٣٨ | ٨١ | – | – | ٨١ | ٤٢ | ٤٢ | ٨٤ |
| ٢٠٨ | دوودەر | – | – | – | ٣٢ | ٢٤ | ٥٦ | – | – | ١٠٠ | ٤٦ | ٤٥ | ٩١ |
| ٢٠٩ | فەقێ حاجی | – | – | – | ٤٤ | ٤٤ | ٨٨ | – | – | ١٣٢ | ٧٥ | ٧٧ | ١٥٢ |
| ٢١٠ | پونگڵەدوور | – | – | – | ٢٦ | ٣٥ | ٦١ | – | – | ٨٤ | ٣٣ | ٢٣ | ٥٦ |
| ٢١١ | ژاژە سووتاو– زەلە سووتاو | – | – | – | ٦ | ١٠ | ١٦ | – | – | ١١٢ | ٥١ | ٤٧ | ٩٨ |
| ٢١٢ | شا حەسەن | – | – | – | ١٣ | ١٢ | ٢٥ | – | – | ٦٦ | ٧ | ٥ | ١٢ |
| ٢١٣ | گەراو حاجی شەریف | – | – | – | ٩ | ٨ | ١٧ | – | – | ٣٣ | ٢٩ | ٣٦ | ٦٥ |
| ٢١٤ | چاڵگە | ٢٢٧ | ٢٥٥ | ٤٨٢ | – | – | – | – | – | ٦٢ | ٢٣ | ٣٠ | ٥٣ |
| ٢١٥ | گۆران شوان | – | – | – | – | – | ٣٢٠ | – | – | ١٨٧ | – | – | – |
| ٢١٦ | یەختە خان | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٩١ | ٦ | ٧ | ١٣ |
| ٢١٧ | کانی بناو | – | – | – | ٤٣ | ٤١ | ٨٤ | – | – | ٩٧ | – | – | – |
| ٢١٨ | تشکا | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦٣ | – | – | – |
| ٢١٩ | جۆلەمێرگی سەروو | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٣٦ | – | – | – |
| ٢٢٠ | ماڵۆڵە | – | – | – | – | – | ٥٥ | – | – | ٧٣ | ١٠٢ | ٢٠٧ | ٣٠٩ |
| ٢٢١ | کانی کەوە | – | – | – | ١٠٢ | ٩٨ | ٢٠٠ | – | – | ٢٤١ | ٦٣ | ٤٩ | ١١٢ |
| ٢٢٢ | ژاڵەی دەربەند | ١١٦ | ١٥٨ | ٢٧٤ | – | – | – | – | – | ٢٨٥ | ١٣٩ | ١٤٤ | ٢٨٣ |
| ٢٢٣ | عەلی میکائیل | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥٩ | – | – | – |
| ٢٢٤ | مام عەبدوڵڵا | – | – | – | – | – | – | – | – | ٩٥ | ٤٠ | ٤٦ | ٨٦ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٢٥ | گڵن ئاغاج | – | – | – | – | – | ٢٥٩ | – | – | ٢٤٠ | ١١٨ | ١٢٨ | ٢٤٨ |
| ٢٢٦ | کانی گەوهەرە | – | – | – | – | – | ٥٦ | – | – | ٨٣ | ٦٣ | ٦٠ | ١٢٣ |
| ٢٢٧ | کانی هەنجیرەی ساڵحۆك | – | – | – | ٨٩ | ٧٩ | ١٦٨ | – | – | ٢٤٢ | ٩١ | ٦٧ | ١٥٨ |
| ٢٢٨ | پەنگەڵە | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٠٥ | – | – | – |
| ٢٢٩ | قادر ئاوا | – | – | – | – | – | – | – | – | ٩٠ | ١٠ | ١٠ | ٢٠ |
| ٢٣٠ | گەڕە چیا | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦٩ | ٤١ | ٣٩ | ٨٠ |
| ٢٣١ | خێڵی ئاغا | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٥١ | ٥٨ | ٦٤ | ١٢٢ |
| ٢٣٢ | سێ گۆمەتان | – | – | – | ٤٣ | ٥٢ | ٩٥ | – | – | ٨٣ | ٢١ | ١٣ | ٣٤ |
| ٢٣٣ | کەوەڵە | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٦ | ١٤ | ١٧ | ٣١ |
| ٢٣٤ | عەینکەی حەمە شاسوار | – | – | – | – | – | – | – | – | ٨١ | ٢١ | ١٢ | ٣٣ |
| ٢٣٥ | عەینکەی سوێرە ڕەش | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٧ | – | – | – |
| ٢٣٦ | دۆبڕاو | – | – | – | ٣٦ | ٣٣ | ٦٩ | – | – | ٨٧ | ٤٥ | ٥٧ | ١٠٢ |
| ٢٣٧ | تاڵەبان | ١٢٢ | ٢٢٠ | ٣٤٢ | ١١ | ١٢ | ٢٣ | – | – | ٤١١ | ٥٦ | ٤٣ | ٩٩ |
| ٢٣٨ | دارتوو | – | – | – | – | – | – | – | – | | ٣٨ | ٣٤ | ٧٢ |
| ٢٣٩ | تەژگە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٣٠ | ٣٥ | ٦٥ |
| ٢٤٠ | هەگەزی سەروو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٣٥ | ٣٠ | ٦٥ |
| ٢٤١ | باسەڕە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٧ | ٣٦ | ٦٣ |
| ٢٤٢ | نورەی خواروو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٢ | ١٧ | ٣٩ |
| ٢٤٣ | تەك باسان | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٦٧ | ٦٩ | ١٣٦ |
| ٢٤٤ | قەسرەكان | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٨٨ | ٧٥ | ١٦٣ |
| ٢٤٥ | گەڕاو | – | – | – | | | | | | | ١٦ | ٩ | ٢٥ |
| ٢٤٦ | گوڵمكەوە | – | – | – | ١٥٢ | ١٣١ | ٢٨٣ | – | – | ٣٧٤ | – | – | – |
| ٢٤٧ | بەكر سەمان | – | – | – | | | | | | | – | – | – |
| ٢٤٨ | قەڵای سەنگاو | ٢٥١ | ٢٧٣ | ٥٢٤ | – | – | – | – | – | – | ١٣١ | ١٣٩ | ٢٧٠ |
| ٢٤٩ | خدری سەروو (كۆن) | – | – | – | ٥١ | ٥٤ | ١٠٥ | – | – | ٢٢٨ | ٤٥ | ٤٢ | ٨٧ |
| ٢٥٠ | كەڵەڕەشی سلێمان | – | – | – | | | | | | | ٢٥ | ٣٥ | ٦٠ |
| ٢٥١ | خدری خواروو (تازە) | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٧١ | ٨٢ | ١٥٣ |
| ٢٥٢ | تیلەكۆی حەمە ڕەزا | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٧٠ | ٧٢ | ١٤٢ |
| ٢٥٣ | هەرمۆڵە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥٦ | ٦٧ | ١٢٣ |

| | | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٥٤ | تۆپخانە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥٣ | ٦٥ | ١١٨ |
| ٢٥٥ | مەملەحەی خوێڵێن تازە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٥٧ | ٤٠ | ٩٧ |
| ٢٥٦ | جنۆكەی قازی شەل | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٣٥ | ٤٠ | ٧٥ |
| ٢٥٧ | میراوەلی - مراكەلی | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٣٢ | ٢٣ | ٥٥ |
| ٢٥٨ | تیلەكۆ | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٣ | ٢٨ | ٥١ |
| ٢٥٩ | جنۆكەی فەتاح (خواروو) | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٦ | ٢٣ | ٤٩ |
| ٢٦٠ | كێلە سپی | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٠ | ٢٤ | ٤٤ |
| ٢٦١ | سێوەی سەروو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٢ | ١٢ | ٣٤ |
| ٢٦٢ | گوڵباخی خواروو | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٥ | ١٧ | ٣٢ |
| ٢٦٣ | میرەی حەوزەوار | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٧ | ١١ | ٢٨ |
| ٢٦٤ | قادر ئاوای مەملەحە | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٢٢ | ٢٢ | ٤٤ |
| ٢٦٥ | لەك قادر هیدایەت | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٥ | ١٢ | ٢٧ |
| ٢٦٦ | جنۆكەی غێدان (سەروو) | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ١٢ | ١٣ | ٢٥ |
| ٢٦٧ | پونگەڵەی حاجی سەعید | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٩ | ١٢ | ٢١ |
| ٢٦٨ | دارتووی فاتیح ئاغا | – | – | – | – | – | – | – | – | – | ٩ | ٦ | ١٥ |
| ٢٦٩ | ماڕۆڵە | ١٢٤ | ١٤٩ | ٢٧٣ | ٢٦ | ٢٩ | ٥٥ | – | – | – | – | – | – |
| ٢٧٠ | كەڕاد | ١١١ | ١١٥ | ٢٢٦ | – | – | – | – | – | – | – | – | – |



*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:-**


١- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٢٨)، ئەیلولی ١٩٩٩، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٤). د. زەنون پیریادی، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (چەمچەماڵ لە چلەکان و پەنجاکاندا)،

٢- (العراق الشمالي)، محەمەد هادی دەفتەری، عەبدوڵڵا حەسەن، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٦٠)، بڵاوکراوەکانی (النهار)، بەغدا.

٣- (تاريخ العراق بين الاحتلالين، العهد العثماني الاخير)، پارێزەی عەباس عەزاوی، بەشی هەشت، لاپەڕە (١٩٨)، سالی ١٣٧٦ کۆچی - ١٩٥٦ زایینی، کۆمپانیای (التجارة في الطباعة).

٤- (ناوچەی چەم چەماڵ، لەنێوان ساڵانی هەردوو شەڕی جیهانیدا ١٩١٨-١٩٣٩)، فەرهاد عەبدولعەزیز، چاپخانەی (زینە)، کەرکوك، ٢٠١٣، لاپەڕەکانی (١٧-١٨).

٥- (چەمچەماڵ بەر لە مەملەکەتی ئاشوور تا حکومەتی هەرێم)، سەروەر ئەحمەد کەریم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە (٧٨).

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٠-٢٢).

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٢-٢٣).

٨- (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٠ - ٢٦١).

٩- بەپێی سەرچاوەی ساڵی (١٩٥٤)، لاپەڕە (٢٢).

١٠- بەپێی سەرچاوەی ساڵی (١٩٤٧).

١١- (منجزات لواء كركوك لسنة ١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٦٥)، بەغدا، ساڵی ١٩٦٥، لاپەڕە (١٥).

١٢- (العراق الشمالي)، د. شاکر خەسباك، لاپەڕە (٢٧٥).

١٣- (العراق الشمالي)، محەمەد هادی دەفتەری، عەبدوڵڵا حەسەن، هەمان سەرچاوەی پەراوێزەکانی پێشوو، لاپەڕە ( ٢٦١ - ٢٦٢ - ٢٦٣).

١٤- پاشکۆی ڕۆژنامەی (العراق - عێراق)، ژمارە ٤٣٨، یەك شەمە، ١٥ی حوزەیران، ١٩٩٧، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٤). دکتۆر زەنون پیریادی، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (چەمچەماڵ و دێهاتەکانی).

١٥- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٢٨)، ١٤ی ئەیلول، ١٩٩٩، لاپەڕە (٦)، (چەمچەماڵ لەچلەکان و پەنجاکاندا)، بەشی سێیەم.

١٦- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٥٣)، هەمان لێکۆڵینەوەی پەراوێزی پێشوو، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٤).

١٧- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٣٣)، هەمان لێکۆڵینەوەی پەراوێزی پێشوو، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٩).

١٨- (پارێزگای کەرکوك لە ناو پاکتاوکردنی ڕەگەزییدا)، محەمەد سەعید سۆفی، ٢٠٠٣، لاپەڕەکانی (٢٦٥-٢٦٦).

١٩- گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١٣٨)، ١٤ی تەموز، ٢٠٠٠ لاپەڕە (٩).

٢٠- (العراق الشمالي)، محەمەد هادی ئەلدەفتەری، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٥).

٢١- (اصول اسماء المدن والموقع العراقية)، جەماڵ بابان، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٩، لاپەڕە (٢٣).

٢٢- (مذكرات مامون بگ بن بيگه بگ)، وەرگێرانی: محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی و شکور مستەفا، بەغدا، ١٩٨٠، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراقی، لاپەڕە (٢٨).

٢٣- (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٤).

٢٤- (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٨).

٢٥- (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری)، د. جەماڵ ڕەشید ئەحمەد، بەغدا، ١٩٨٨، لاپەڕە (٧٦).

٢٦- (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٦).

٢٧- (پارێزگای کەرکوك لە ناو پاکتاوکردنی ڕەگەزییدا)، محەمەد سەعید سۆفی، ٢٠٠٣، لاپەڕە (٢٨٠).

٢٨- (العراق قديما وحديثا)، عەبدولرەزاق ئەلحوسێنی، چاپی حەوتەم، بەغدا، دار اليقظة العربية، ١٩٨٢، لاپەڕە (٢٢٦).

٢٩- (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٦٩ - ٢٧٠).

٣٠- (پارێزگای کەرکوك لە ناو پاکتاوکردنی ڕەگەزییدا)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٧١-٢٧٢).

٣١- بەپێی سەرچاوەی ساڵانی (١٩٤٧)، (١٩٥٧)، (١٩٧٧)، (١٩٩٧).

*** قەزای کفری:-**

قەزای کفری یەکێکە لەو قەزا گرنگانەی ناوچەی کەرکوک، کە دەورێکی گرنگی هەیە لەمێژووی کۆن و نوێی ناوچەکە، هەمیشە جێگەیەکی بەر چاوی هەبووەو حیسابی ووردی بۆ کراوە لە تەرازووی رووداوەکاندا، ئەگەر چاوێك بەرووداوە مێژووییەکاندا بخشێنین دەبینین مێژووییەکی بەرچاوی هەبووە، هەر لە سەردەمەکانی پێش مێژووە، لە سەرەتاکانی سەردەمە مێژووییەکاندا جێگەیەکی دیاری هەبووەو کەوتووەتە بەر بەرداشی رووداوەکان، لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلامیشدا، سەنگی خۆی هەبووە لە رووداوەکان و ناوچەیەکی گرنگی ئاقارە بەڕێوەبەرییەکەی بووە.

هەر بەو پێودانگە لەمێژووی نوێی ناوچەکەدا، رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەشۆڕشی بیستدا، کە شۆڕشەکەی ((ئیبراهیم خانی دەلۆ)) نموونەی ئەو راستییەیە، ئینگلیزەکان هەردەم حیسابی ووردیان بۆی کردووە.. گرنگی ئەم قەزایە لەوەدایە کەوتووەتە سەرە رێی ناوچەکانی کوردستان بە خوارووی عێراقەوە لەگەڵ سەرەرێی شوێنەکانی سلێمانی و دیالەدا، بووەتە دروست بوونی بناغەیەکی پتەوو بەردەوام، ژیان تێدا گەشەی کردووە، هیچ کاتێك تووشی فەوتاندن یان لەناوچوون نەبووە، تا بەوەی لە رووی بەڕێوەبەرییەوە بایەخی پێنەدرێت، بەڵگەمان لەبەردەوامی فرە بەکارهێنانی ناوەکەیی و بنەرەتی تایبەتمەندی بێژەتکردنێتی.

"ئەم قەزایە کەوتووەتە لای رۆژهەڵاتی پارێزگای کەرکوك کە هاوسنوورە لەسەرووی رۆژهەڵاتییەوە بەپارێزگای سلێمانی، لەخوارووی رۆژهەڵاتەوە پارێزگای (دیالە)یە، لەخوارووی رۆژئاواوە پارێزگای بەغدایە.. سنووری ئەم قەزایە لەرۆژهەڵاتەوە رووباری (دیالە)یە لەرۆژئاواوە ناحیەی قادرکەرەمە لەگەڵ مەرکەزی قەزای (دووز-خورماتوو)، لەسەرووەوە قەزای حەویجەو ناحیەی سەنگاوە، لە خوارووەوە بەشێك لەرووباری دیالەیە، کە تەواو دەبێت بەسنووری چیای حەمرین"[١].

((ئەم قەزایە لەکەرکوکەوە (٧٨) میل دوورە))، زیاتر کەوتووەتە لای خوارووی رۆژهەڵاتی پارێزگاکەوە[٢]، لە کتێبی (موطن الآثار والحضارة)دا ئاوا باسی کفری دەکات:.

"لەدوورییانی نێوان دووزو سلێمان بەگەوە ئەچێتە کفری، ئەو ماوەیە نزیکەی (٣٣) کیلۆمەترە، بەدەستە چەپەدا ئەروانێتە شاخێك جۆرە بەردێکی تێدایە وورد دەکرێ و رەوانەی کارگەی چیمەنتۆی بەغدا دەکرێت.

کە لە کفری نزیك دەبیتەوە گردێکی زۆر گەورە دەکەوێتە دەستە راستەوە، ئەو گردە گردی (ئەسکی کفری)یە، کفری کەوتووەتە پاینی شاخی (باوەشاسوار)، .. شاخەکە زۆر بڵند نییەو بەردەکەی وەك بەردی شاخی (حەمرین) وایە. چاوگەیەکی نەوت نزیك کفری هەیە نەوتی پێدا ئەچۆرێت، چاوگەیەکی قیریش لەو نزیکە هەیە.."[٣].

هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ پێوانەی زەوی ئەم قەزایە بە (٥٢٧٥) کیلۆمەتری چوارگۆشە کە بەرامبەر (٢,١١٠,٠٠٠) مەشارە - دۆنمە[٤] دەکەن، یان هەندێکی تر پێوانەی بە (٥٢٢١) کیلۆمەتری چوارگۆشە داناوە[٥]، دەربارەی ژمارەی دانیشتووانی چەند راوبۆچوونێك هەیە کە هەریەکەی بەجۆرێك پێوانەی بۆ کردووە:

لە ساڵی (١٩٤٨)دا ژمارەی قەزاکە بە (٤٩٣٥٩) کەس دانراوە[٦]، لە ساڵی (١٩٥٤) ژمارەی قەزاکە بە (٤٩٣٥٩) کەس دانراوە[٧]، لە ساڵی (١٩٥٩) بە (٤٩٣٤٩) کەس دانراوە[٨]، بەڵام ساڵانی (١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٦٥) بە (٦٣٧٧٠) کەس دانراوە[٩]، هەروەها سەرچاوەیەکی وەکو (العراق الشمالي) سەرژمێری قەزاکەی بە (٧٠٠٠٠) هەزار کەس داناوە.

دەربارەی بنەرەتی ناوی (کفری) گەلێك راوبۆچوونی جیاواز.. جیاواز هەیە، کە هەندێك لەو سەرچاوانە بنەرەتی ناوەکە دەگەڕێننەوە سەردەمە زووەکانی مێژوو، بەڵام هەندێکی دی دەیگەڕێنێتەوە سەردەمەکانی ئەو ماوەیەی مێژووی بڵاوبونەوەی ئیسلام لەناوچەکەدا، بەڵام هەربۆچوونێك هەڵگری جۆرەها راڤە کردنە بۆ بنەچەی ناوەکە.

مامۆستا مستەفا نەریمان ئاوا باسی بنەرەتی دەکات:

((کفری وەك ووشەیەك لەعەرەبیدا گەلێك مانا دەبەخشێت وەك (کفر، کفرا) داپۆشینی شتێك، (کفر، کفرانا) دژی باوەڕ هێنان بەخوا. (کفر) زەوییەکی دوور لەخەڵکە (کفور) ئاوایی (الکفر) شەوەزەنگ. (کفر) لادێ، لەسریانیدا (کفرا).

ئەگێڕنەوە کە جێگەو شوێنی کفری ئێستا جەنگەڵ بووە داری گەز (کەفر)ی تیا رِوواوە بۆیە وتراوە:

ناوی ئەم شارە لە (کوفر)وە نییە. لەداری (کفر)و بوو بەم (کفری)یە.

هەروەها مامۆستا دەڵێت :

((سۆمەرییەکان بە (کیماش)و بابلی و ئاشورییەکان بە(کیرۆ)و عەرەبەکانی ئەو چاخەش بە(کفری) ناویان هێناوە"[١٠].

مامۆستا (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی) ئاوا باس دەکات:

((لەنزیك کفری جۆرێك قیرێك هەیە لەنزیك گوندی (ناسالح)، کە دەڵێن (الکفر)و ناوچەکە بەوە ناونراوە، کە (ابي شمیل) دەربارەی (القیر) سێ ناوی هێناوە وەکو (الکفر، القیر، الزفت)، کە (الکفر) دەتوێتەوەو ئینجا پاپۆری پێ دادەپۆشن بۆ ئەوەی ئاو نەدزێت.. و (الزفت) بەکاری دەهێنن بۆ داپۆشینی (الزقاق)[١١].

مامۆستا جەمال بابان ئاوا باس دەکات:-

"نازانین بەتەواوەتی بنەرەتی ناوەکە چییە، بەڵام خەڵکی شام بەگوند دەڵێن (کفرا)، کە بێژەی (کفر) زۆر بەکاردەهێنرێت وەکو (کفر تیکس)و، لە میسر (کفر باوبط) و لە فەلەستین (کفر توثا)، لەموسڵ (کفر زمار - کفرا عزا) بەکاردەهێنرێت"[١٢].

مامۆستا موکەرەم تاڵەبانی دەڵێت:-

"ناوهێنانی ئەم ناوچەیە بە(کفری) بەهۆی زۆری داری (کفر)، کە زۆر زۆرە لە رۆخەکان و شیوەکانی، لەهەندێك کتێبی کۆندا ناوی هاتووە بەوەی جۆرە قیرو خەڵوزی بەردی هەبووە بەو ناوەوە کە زیاتر لەناوچەی (ناسالح) هەبووە..."[١٣].

يا مامۆستا (عەبدولرەزاق ئەلحەسەنى) وا باس دەكات:-

"كفرى، وزان كرسي ناوى دووەمى (الصلاحيه)يە كە يەكێكە لەناوچەكانى عێراق.."(١٤).

لە (العراق الشمالي)دا كۆنى ئەم شارە ئاوا باس دەكات:

"بە كورتى قسە ئەوەيە كە ئەم ناوە زۆر كۆنە كە لەوانەيە هاوسەردەمى ئاشوورى و بابلييەكان بێت. ئەگەر ئەوەى دەيگێڕنەوە راست بێت، گوايە (نەبو خوز نەسر)ى پاشاى بابلى كاتێك تورە بووە لێيان هەستاوە بەگرتنى هەريەكە لە(شدراغ) و (ميشلخ) و (عبد ناغو) كردوويانێتە نێو ئاگرە بەگرەكەى (بابا گورگور) لەنزيك كەركوك. ئەميش ئەوە دەگەيەنێت ئەم ناوچانە لەژێر ركێفى بابلييەكان بووە يان جێگەى بەربەرەكانى نێوان (بابلى) و (ئاشوورى)يەكان بووە، كە هەر جارەى بەدەست يەكێكەوە بووە"(١٥).

بەلام بۆچوونێكى تر هەيە لەلايەن مامۆستاى هێژا دكتۆر جەمال رەشيد كە بنەڕەتى ناوەكە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمێكى زۆر زوو:

((بێژەى (گر) لەزمانى كورديدا ماوەتەوە كە ماناى (بلێسەى ئاگر) دەگەيەنێت، هەروەها دووبارە كردنەوەى (گرگر)، تەنها پا داگرتنە لەسەر جەوهەرى ئەو دياردەيە لە سرووشت. لەسەر هەمان شێواز گەلێك ناوچە بەو دياردانە بەناوبانگە كە بەناوبانگ بوونە بە (ئەسفلت) لەخوارووى ئەم ناوچەيە كە پێى وتراوە (كيپرات – Kiprat)، كە ئەمە نوسراوەتەوە لە لەشكر كێشييەكانى (سيلهاك ئەنيشوشيناك)ى عيلامى، لەدوايدا شێوەى (كوپرۆ)ى وەرگرتووە لە تۆمارەكانى ئاشوورى هاوشێوەى (خورتو) كە ئەمە بەدەركەوتووە لە تۆمارە عيلامييەكان بەرامبەر بە (خورمووتوم)ى ئەكەدى، هەردووكيان بە (كفرى) و (خورماتو) دەوترێت لەكورديدا، ئەم ناوانە دادەنرێت بەناوى (سوبارى) كۆن، كە تاكو ئێستاكە ماوەتەوە.."(١٦).

*** ئەو سەرنجانەى كە لام گەلاڵە بووە دەربارەى بنەڕەتى ناوى (كفرى):**

١. ئەوەى كە جێگەى راستييەو نكوڵى تێدا نييە، ئەوەيە كە بنەڕەتى ناوى كفرى زۆر كۆنەو، خۆى لە چوارچێوەى ناوێكى سوبارى كۆن دەدۆزێتەوە، بەلام لەسەردەمەكانى لەوەو دوا بێژەتى ناوەكە گۆڕانى بەسەردا هاتووەو هەريەكە لەئاشوورى و بابلييەكان گۆڕيان پێكردووە بەپێى بێژەتى زمانەكەيان، ئەمە واى كردووە سووانى ووشەيەك يان داتاشينى ووشەيەكى دى گۆڕانى بەسەر بنەڕەتى ووشەكەدا هێناوە، ئەميش خۆى دەبينێتەوە لەتەرازووى گۆڕانە سياسى و مێژووييەكانى گۆرەپانەكە، خۆى ناوچەكە لەسەردەمانێكدا ئاقارێكى سەربەخۆو مەملەكەتێكى دابراوى بەڕێوەبەرى و كارگێرى خودموختارى خۆى بووە، بۆيە تارادەيەك كەمە سەربەخۆييەكى زمانەوانيشى وەرگرتووە، بووەتە پارێزگارى بنەڕەتى ووشە سوبارييەكەو تەنها گۆڕانە لەجێگەگۆڕكێى ووشەكان رووى داوە نەك لەناوەرۆكى زمانەكە.

٢. بەكارهێنانى ووشەى (الصلاحية) لە بەرامبەر كفريدا لەسەردەمى دەوڵەتى عوسمانيدا تەنها شێواندنێكە بۆ لادان لەبنەڕەتى ووشە كۆنەكەو شێواندنى مێژووى ئەو ئاقارە كوردييە.

٣. بەكارهێنانى ووشەى (الكَفَر، الكُفر)، هەردووكيان لەسەردەمەكانى بلاوبوونەوەى ئيسلامدا جێگير كراوە، كە ئەويش لەبەر ئەوەى ئەو شوێنانەى كە بەزۆردارەكى ئيسلامى تێدا بلاوكراوەتەوە بە (الكفر) لادەر لەئايين ناوزەد كراون، يان جێگەى بلاوبوونەوەى ئايينى مەسيحى بوونە بۆيە بەو ناوەوە شوێنەكە بەناوبانگ بووە.

٤. بەكارهێنانى (كفر) لەجێگەى گوند بەناوهێنانێكى هەڵەيەو ئەوەى لەسريانيدا (كفرا) لەجێگەى خۆيدا نييە چونكە ئەو ووشەيە لە گۆكردنى كفراى فلان گوند، نەك تەنها بەكارهێنانێكى رووت بۆ گوند.

٥. دەربارەى (كەفر) كە گوايە جۆرە درەختێكە لەناوچەكەدا هەبووە. يان هەندێك (كفر، كەفر) بەگەز بەكاردەهێنن بەلام هەردووكيان جياوازيان هەيە، كە گوايە بنەڕەتى ناوەكە لەو درەختانەوە هاتووە، بەلام گەلێك شوێن (كەفر، كفر، گەز)يشى هەيەو بەو ناوەوە ناوبانگى دەرنەكردووە، بۆ جياوازى لەبنەڕەتى هەردوو ناوەكە بڕوانە (فەرهەنگى كشتوكاڵ)، كە بەم جۆرە باسيان دەكات:

**كفر:**

"تەرو دارى تەرو، درەختێكە بەزۆرى لەگوێى چەمدا سەوز دەبێت گەلاى باريكەو گوڵێكى شين كارى هەيە، بەرێكى رەش و وورد دەگرێت ئەو بەرەى دەرخواردى هەرشتێ بدرێت ئيتر سك وزا ناكات".

**گەز:**

درەختێكە گەلاى وورده وەكو گەلاى درەختى سەرو، ساقى دارەكەى وەكو دارى بەلالوك مۆركارە بالاى زۆر بەرز نابێ لەچەم و گوێى ئاودا سەوز ئەبێت(١٧).

دەربارەى ناحييەكانى ئەم قەزايە، هەريەكەى لەماوەيەكى ديارى كراودا، سەر بەقەزاى كفرى بووە، بەلام لەكاتێكى تردا لێى دابراوەو كەم كراوەتەوە يان لەسەردەمانێكى تردا لێى زياد كراوە.

لەماوەى فەرمانڕەوايى ويلايەتى شارەزوور لەنێوان سالانى (١٨٧٧ – ١٩٠٨) بريتى بووە لەناحييەكانى دوزخورماتوو داودەو قەرەتەپە.

لە ماوەى سالانى (١٩٢٠ – ١٩٣٦) بريتى بووە لە ناحييەكانى دووز، قەرەتەپە، قەلاى شێروانە. لە سالى ١٩٤٨ بريتى بووە لەناحييەكانى كفرى و پێباز و قەرەتەپە و شێروانە، لە ماوەى نێوان سالانى حەفتاكاندا بريتى بووە لەناحييەكانى قەرەتەپەو جەبارە، لەسالانى (١٩٦٠ – ١٩٦٢) بريتى بووە لە ناحييەكانى قەرەتەپەو پێبازو شێروانە. كە ئەمە بەردەوام بووە تا سالانى ١٩٦٥. لەحەفتاكان لە رووى بەڕێوەبەرييەوە خراوەتە سەر پارێزگاى (ديالە) و ئەم ناحيانە سەر بەقەزاكە بووە وەكو (جەبارە، سەرقەلا، كۆكس، قەرەتەپە).

لەلایەن کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستانەوە هاوکاری دەکرێن بۆ ئەوەی خانووەکانیان بەشێوەیەکی نوێ دروست بکەنەوە لەم شوێنەی ئێستا لێی نیشتەجێن ئێستا گوندی قەرە سالم نزیکەی (١٥) ماڵی لێ نیشتەجێیەو بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵداری بەڕێوە دەچێت.

بەر لە ئەنفال ئەم گوندە (٧٥) ماڵ دەبوون لە ساڵی (١٩٨٥) جارێك ئەم گوندە نیوەی سووتاوەو نیوەکەی تریش رووخاوە لە ساڵی (١٩٨٧) دووبارە گەڕانەوە، خەڵکی ئەم گوندە بەتەواوی ئەم گوندە جێ دەهێڵن. شەهیدەکانی ئەم گوندە لەساڵی (١٩٨٨) نزیکەی (٤٠) کەس دەبن کە ئەنفال کراوە.

گوندەکانی دەوروبەری گوندی قەرە سالم بریتین لە: (بیرەسپان دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی، کاولەسوارە، ساتی، دەرماناو) بە یەکێکە لە گوندە هەرە گەورەکانی شێخ بزێنی دادەنرێت، تاپۆی ئەم زەوییە هەموو بەناوی عارەبەکانەوە تۆمار کرابوو، هەتا ئێستاش هەر بەناوی ئەوانەوەیە، لەدوای گەڕانەوەیان هیچ خزمەتگوزارییەکی نەبووە لەو کاتەدا، بەڵام دواتر پشتگیرییەکەی گەورە کراون لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بۆ دوو بارە دروست کردنەوەی گوندەکەیان.

ئەم گوندە لە ساڵانی (١٩٨٧) رووخاوە، لەساڵی (١٩٩٦) دووبارە هاتنەوە ئاوەدانیان کردەوە لە دەم زێیەکە.

لە دوای پرۆسەی ئازادی لە ساڵی (٢٠٠٩) ئاوەدانیان کردەوە بەتەواوی گەڕانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان و نزیکەی (٧٥) ماڵ دەبوون.

*** گوندی عەمشە:**

یەکێکە لەو گوندانەی سەر بە قەزای دووبزی پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە (٧) کیلۆمەتر لە قەزای دووبزەوە دوورە، هەروەها بە دووری (٣٥) کیلۆمەتر دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری کەرکوکەوە، گوندی عەمشە مێژووییەکی کۆنی هەیەو بەر لە (٤٠٠) ساڵ لەلایەن هۆزێکی هەمەوەندەوە ئاوەدان دەکرێتەوە.

گوندەکانی دەوروبەری (لەڕۆژهەڵاتەوە گوندی مەرغی و نەبی ئاوە، لەو لاشەوە لە گوندە عارەبەکان مەشیرفەو قەرەچەم)، لە کەسە ناودارەکانی ئەم گوندە بریتین لە: (کوێخا کاکە رەش- شێخ تاهیر کەریمو ساڵح ئیبراهیم کە باپیرەگەورەیان بووە).

ناوی ئەم گوندە لەچییەوە هاتووە (لە راستیدا ناوی گوندی ئەمشە)یە گوندی عەمشە یەکەم جار کە هاتوونە بۆ شەو گەیشتوونەتە ئەم شوێنە بۆ بەیانی دەبینن کانی هەیە دوایی نیشتەجێ بوونە بەناوی (ئەمشەو) ناونراوە سەرەتا هاتوونە چوارماڵ دەبوون، گوندی ئەمشە گۆڕەپانێکی سەرەکی بووە بۆ هەمەوەندەکان، بڕی (١٧) شەهیدیان هەیە وشەهیدی سەنگەریشیان هەیە، لە شەهیدەکانیان (زوبێر ئەحمەد کەریم، قوڵی).

جێگای دێی عەمشەی پێش ڕۆژی (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) بە دووری ٦ کیلۆمەترێك بە سەرەوە ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی دووبز، لە سەرووی ڕێگای کەرکووك- دووبز، ڕۆژهەڵاتی دێی عەمشە سنووری دێی قەڵا عەربەتە، سەرووی سنووری دێهاتەکانی ناحییەی پردێیە، ڕۆژئاوای سنووری دێی قەرەدەریە، خوارووی سنووری مەرعییە، لە کەرتی ٧ کشتوکاڵیدایەو ٩١٣١ دۆنم زەوی هەیە.

لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) دانیشتووانەکەی ٢٣٧ کەس بوون لەوانە ١١٤ نێر و ١٢٣ مێ، لە سەردەمی چۆڵکردنی دێیەکە دانیشتووانەکەی خۆی لە ٤٠ خێزانێك داوە، بە جوتیاری و گاوانی و ئاژەڵداری ژیاون و گوزەرانێکی باشیان هەبووە، لەو ساڵانەی دوایی و پێش دەرکردنیان چەند کەسێك لە دانیشتووانەکە لە دەزگا حکومییەکاندا دادەمەزرێن.

دێی عەمشە وەکو دێهاتەکانی تری ئەم سنوورە لە ڕۆژی (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) لەلایەن حکومەتی بەعسەوە دەرکراوەو تاڵان کراوەو سووتێندراوە، وەك دەگێڕنەوە لە ساڵی (١٨٠٠)ی زایینیی بە دواوە بنەماڵەی کوێخا ڕەسوڵ ئەحمەد هەمەوەند دانیشتووی دێی (سەیدەنورو باوەفەتی) سنووری قەزای چەمچەماڵ بە فەرمان و ڕێپێدانی شێخ کەریم شێخ ئەحمەد شێخ سلێمانی ساڵەیی کە لەودەم سەرپەرشتی ناوچەی ساڵەیی دیوی پردێ و دووبزو دەوروبەری کردووە، هاتوونە لە جێگاو شوێنی دێی عەمشە لەسەر کانیاو و لەوەرگاو پاوەندی ئەو سنوورە ڕەشماڵی ڕەشۆکیان هەڵداوەو چیغ و ناچیغ و دارو ڕەشماڵیان مێخەکیان کوتاوەو ئاژەڵدارییان کردووەو کێڵگەیان کێڵاوە، بەر لەوان خێڵێکی عەرەب لەوێ دەبن و دەم سپی ئەو خێڵە ئافرەتێك دەبێ بەناوی عەمشە ئەو شۆرە ژنە ئەو کانیاوەی پاراو کردووەو ئاوی خواردنەوەی بۆ خێزان و مەرو ماڵات لەو کانییە دابین کردووە، بەرەی مام کوێخا ڕەسوڵ ئەوان دەردەکەن و جێگایان دەگرنەوە، تا ئەمڕۆ ئەو جێگایە دێی عەمشەی پێ وتراوە، پاش ئەوەی کوێخا ڕەسوڵ و براو کەسوکاری ئەو هەوارە ئاوەدان دەکەنەوە، بەرەودوای ئەوان چەند بنەماڵەو خێزانی تر هاتوونە بە تەنیشتی ئەوانەوە خانوبەرەیان کردووەو ئاژەڵداری و کشتوکاڵی خۆیان بە بەرهەم هێناوە، لەوانە ئەوەی زاندراوەو بیری پیاو چاکان ماوە هەر یەکە لە بنەماڵەی حاجی حەمەدەمین زاراو مام مستەفای ئەمین و براییەکانی چەند ماڵ و خێزانی کوردەواری لەگەڵیاندا نیشتەجێ دەبن.

پاش ئەوەی لە ساڵی (١٩٦٣) دانیشتووانەکەی پەرەگەندە دەبن ڕژێم لە دوای ساڵی (١٩٦٤) خێڵێکی عەرەبی دلێم دێنێ و لە خوارووی ڕێگای سەرەکی کەرکووك- دووبز نیشتەجێی دەکاو ئەو جێگایەش هەر دێی عەمشەی ناو ناوە، زەوی و زاری کوردانیان بەسەردا دابەش دەکا تا ساڵی (١٩٧٠) بەو شێوەیە دەمێننەوە، پاش بەیانی (١١)ی ئاداری ئەو ساڵە لەلایەن ڕێکخراوی (الاعمار الشمال) ٢٤ خانوو بەناوی دانیشتووانی عەمشەی کۆن لە خوارووی ڕێگای کەرکووك- دووبز دروست دەکا، بەڵام دابەش نەکرا بەسەر کەسێك لە خەڵکە ڕەسەنەکە تا ساڵی (١٩٧٤) مایەوە، لەوەدوا حکومەت بەمەبەستی بەعەرەب کردنی سنوورەکە چەندین خێزانی عەرەبی هاوردەی لە هەردوو مەزهەب شیعەو

سوننەی هێناو لەو دێیەدا نیشتەجێی کرد. ئەوانەی زیاتر ناوداربوون لەو هاوردانە دانیشتووی دێی عەمشە هەرمیەك لە خەلەف حەمادی شەهاب دلێمیو مزعل لازم نعنیعازەی خەلکی سنووری پارێزگای کوتو نووری شەهاب عەرەبی سنوورەکەو یونس ئەلتەمیمی عەرەبی سنوورەکەو چەندین خێزانی تری عەرەبی تێدا بووە، هەرچی کێڵگەو زەویو زاری کوردی دەرکراو هەبوو بەسەریاندا دابەشی کردبوو. زەویو زاری خوارووی ڕێگای دووبز- کەرکووك لە سنووری دێی عەمشە لە ساڵی (١٩٨٨) بە دواوە بوون بە بەرلو و زیاتر بەرەواج ترو دڵگیرتربوو لە دڵی عەرەبدا.

ساڵی (٢٠٠٣) پاش نەمانی بەعس کەسێك لە داگیرکەران لەوێ نەمانو بە پرە پر توانیان ماڵو منداڵ دەربازکەنو هەر خێزانەو تا ئێستاش لە کۆنە مەعسکەران کەوتوون، دانیشوانی دێی عەمشە وەکو دێهاتەکانی تری ئەم سنوورە بەر ئاوردانەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستانو کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان کەوتووەو ٧٤ خێزانی ئەو دێیە هەر خێزانەو بڕی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بەمەبەستی دروستکردنی خانوبەرەو گەرانەوەیانو ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە هەروەها لەلایەن ئیدارەی هەولێر ٤٧ خێزان هەر خێزانەو بڕی ١٥ ملیۆن دیناری عێراقی پێدراوە بۆ هەمان مەبەست.

وەکو گوتمان جێگای عەمشەی کۆن لە سەرووی ڕێگای کەرکووك- دووبز لە ناو هەڵەتەکەدا بوو،، بەڵام ئێستا بووە بە سێ گەرەكو لە باکوورو باشووری ئەو ڕێگایە، ئاوو کارەباو جادەو خوێندنگای بۆ دابین کراوە، لەوە زیاتر ئەوەی بە حکومەتی کوردی بکرێ بۆیان دەکرێ، تا ئەم دەمە ٥٠ خێزانێك گەرانەتەوە دێیەکەو لەوانە کەم خێزان هەیە بە جوتیاریو ئاژەڵداری بژین بە زۆری مووچەخۆرن.

*** گوندی جولحان:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە دەکەوێتە ناوچەی شوانەوە، لە رووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی شوانە، بە دووری نزیکەی (٤٠) کیلۆ مەتر دەکەوێتە باکووری شاری کەرکوکەوە ئەم گوندە چەندین جار وەکو گوندەکانی تری ئەم ناوچەیە سووتێنراوە لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٧ – ١٩٨٨) ئەم گوندە سووتێنراوەو لە جێگەیدا عەرەب نیشتەجێ کراوە ولە ئێستادا (٢٠) ماڵ گەرێندراوەتەوە. ئەم گوندە بە ئاژەڵداریو کشتوکاڵ خەریك بوونەوەو لە رابردوودا مەرەزەشی لێکراوە و کارێزو کانیاوی زۆری هەبووە.

لە ساڵی (١٩٧٩) یەکەم قوتابخانە لەم گوندە دا کراوەتەوەو دووبارە لە ساڵی (٢٠٠٠) دا دیسان قوتابخانەی بۆ کراوەتەوە لەم گوندەدا ئاسیاوێکی زۆر کۆنی تێدایە، بە ناوی (گوڵە نان) جگە لەم ئاسیاوانە شەش ئاسیاوی تر هەیە بە ناوەکانی جووتە، حەمە لوورە، سمایل عیزە، باش عەیانە، ئەمانە هەمووی لەسەر ئاو هەڵمینە کە بەشێکی زۆری لادێیەکانی دەورووبەری هاتوونە بۆ ئەم ئاسیاوانە، ئەم ئاسیاوانە تا ساڵانی (١٩٧٦) کاریان کردووە کابرایەك بەناوی ڕەشەحانە لە دوای ئەو مام مەجید فەتحوولڵایە کاریان لەم ئاسیاوە کردووە.

نیمکانی دەورووبەری ئەم گوندە بریتییە لە تۆمار، گورگان، برایم زانە، پاپیلان، ئۆمەربەگ، گۆگجە، تۆپزاوە، قەففار.

بنەرەتی ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە پیاوێك لەم گوندە بووە کە کچەکەی ناوی گولخان بووە، لە دوایدا بووەتە جولحان.

*** گوندی شۆراوە:**

گوندی شۆراوە سەر بەناحییەی تەکیەی کاکە مەندی قەزای چەمچەماڵە، بە دووری نزیکەی (٧٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، ئەم گوندە بەر لە ئەنفال (٢٧) ماڵی لێ بووە، بەڵام ئێستا دوا بەدوای ئاوەدانکردنەوەی لە ساڵی (١٩٩٢)دا نزیکەی (١٥) ماڵی لێ نیشتەجێ بووە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵدارییە، ئەم گوندە بە شۆراوە ناونراوە چونکە زۆری ئاوەکەی شۆرە کەم ئاوی شرینی هەیە هەر، بۆیە ناونراوە شۆراوە خودی ناوەکە (شۆر، ئاو)ە، بەڵام گوندی شۆراوە چەندین خزمەتگوزاری بۆ ئەنجام دراوە.

ئەم گوندە لە ساڵی نەوەتەکان ئاوەدانکراوەتەوە گوندەکانی دەورووبەری (خالدان، هەوار، کانی مستەفا) لە رووی مێژووەییەوە بەپێی ئەو زانیارییانەی پێمان گەیشتووە دەگەرێتەوە بۆ (٤٠٠ – ٤٥٠) ساڵ پێش ئێستا لەساڵی پەنجاکان رادیۆ هاتووەتە ئەم گوندە لە ساڵی نەوەتەکان تەلەفزیۆن هاتووە، دانیشتووانەکەی نزیکەی (١٤ – ١٥) ماڵ دەبێت ژمارەی دانیشتووانەکەی ١٨٠ کەس دەبێت.

بڕی (١٤ – ١٥) پێشمەرگەیان هەیە، هەتا ئێستا هەرچالاکن لە ڕێکەوتی (١٧)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٠)دا لە شاخی گوندی شۆراوە کارەساتێکی دڵتەزێن ڕوودەدات لە شەرێکی دەستو یەخەدا لەگەڵ کۆپتەرەکانی بەعسدا (١٦) پێشمەرگە شەهید دەبن (رابیعە شەریف) یەکێکە لە بەساڵا چووانی گوندی شۆراوە لە ساڵی (١٩٨٨)دا لەگەڵ خەڵکی گوندەکە بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەون راپێچی ئۆردووگای دووبز دەکرێت پاش چەند مانگێك لە بەندینخانەی دووبز لەگەڵ ژنێکی تر بە ناوی خاوەر لە بەندینخانەکە هەڵدێنو خۆیان دەگەیەننە کەرکوك.

*** گوندی (عەلی - حەفتەغار):**

ئاوایی عەلی یەکێکە لەو سێ گوندەی کە بە یەکەوە گوندی حەفتەغار پێك دێنن ئەم گوندە لە رووی ئیداریشەوە سەر بە قەزای داقوقەو بە دووری (١٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری رۆژئاوایەوە هەروەها بە دووری (٦٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری شاری کەرکوکەوە ئاوایی عەلی نزیکەی (٣٠٠) ماڵی لێیەو بە کشتوکاڵو ئاژەڵدارییەوە خەریکن هەر لە کۆنەوە لێرە نیشتەجێ بوونەو ژیاون.

ئەم گوندە لە سەرەتادا ناوی حەفتەغار بووە، بەڵام دوای مردنی (نامیق ئاغا) (عەلی) کوڕی هاتە ئێرە بووە بە ئاغای گوندەکە بە ناوی ئەو ئاغایەوە ناونراوە (عەلی ئاغا).

دانیشتووانی ئەم گوندە نزیکەی (٣٥٨) خێزانەو (١٠١) جوتیاری هەیە یەکێك لە نەریتەکانی ئەم گوندە کە تاکو

ئێستاش بەردەوامە (خێرە بارانە)یە کەپارە کۆدەکەنەوە وەدیەدەن بە ڕەشەو وڵاخ و دابەشی دەکەن بە سەر خەڵکی گوندەکە ئەگەر هەرماڵێك لەو ڕۆژە بێتە گوندەکە ئەگەر بۆ ئیش بێت یان بۆ بازرگانی ئەوا خێرەکە بەسەر ئەویش دابەش دەکرێت.

لە پاشماوەکانی ئەم گوندە (تەپەی حەمە سیاو، تەپەی عەلی ئاغا، تەپەی حەسەن گوڵ نان). چەند پارچە گۆزەو کوپە لەم شوێنانە دۆزراوەتەوە.

ڕژێمی بەعس (٢٧ – ٢٨) ماڵی تەرحیل دەکات و عارەبی هاوردە هاتووەتە شوێنیان، بەڵام لەدوای پرۆسەی ئازادی لە ساڵی (٢٠٠٣) ئەو عارەبانە ڕۆیشتوون،، بەڵام زەوییەکان هەر بە ناوی ئەوانەوەیە ئەم گوندە خزمەتگوزاری و پرۆژەی چاکیان بۆ کراوە،، بەڵام ئەوەی بۆی نەکراوە پرۆژەی ئاوە.

*** گوندی قۆجەلەر:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە (١٥) کیلۆمەتر دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاغجەلەرەوە سەر بە ئیدارەی ئاغجەلەرە، کاتی خۆی سەر بە لیوای کەرکوك بووە، ناوی ئەم گوندە ناوێکی تورکییە لە سەردەمی عوسمانییەکان بە مانای پیاوی پیردێت مێژووی ئەم گوندە زۆر کۆنەو چەند قەبرسانێکیان بۆ ماوەتەوە چەند گۆزەو کەرتە گۆزە لەم گوندە دۆزراوەتەوە، سنوورەکەی دەبەسترێتەوە بەلای خۆرهەڵاتەوە بە گوندی  کانی بی، دواتر بە دەستی چەپ خەرەبان دەلۆ، چنار توو، لەلای خۆرئاواشەوە بە دەستی ڕاست گوندی گەرگەر، موتیلجە، دواتر دێتە ئاغجەلەر.

بەهۆی ئەوەی ئەم گوندە دەکەوێتە ناوچەی بەکر شاخاوی هەر لە کۆنەوە شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە بووە لە پێش ئەنفال ئەم گوندە (٤٠) ماڵ زیاتر دەبوو بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بووە، لە دوای ئەنفال ئەم گوندە ئێستا نزیکەی (٣٥) ماڵی هەیە لە ساڵی (١٩٦٢ – ١٩٦٣) بەڕێز مام جەلال هاتووەتە ئەم گوندە لە مزگەوتی ئەم گوندە بووەو ویستویەتی بێتە ناحییەی ئاغجەلەرو بیگرێتەوە لە سوپای بەعس توانی بە هێزێکی زۆرەوە لەژێر دارێك کە بەناوی (داری مام جەلال)ەوە بە ناوبانگە سەرپەرشتی هێزکانی کردووە کە سەنگەرەکانیان هەتا ئێستا ماوە کە نزکەی (٤٠) ساڵ لەمەوبەر ئەو دارە دارێکی جوان بووە، لەسەر شاخەکە گردێکی تر هەیە بەناوی قارەمانەکان لەو کاتەدا ناویان لێناوە (شاخی قارەمان) ئەم گوندە بەناچاری چۆڵ کرا، چونکە تاڵان کراو ڕووخێنرا، بۆیە خەڵکەکەی بە زۆر چۆڵیان کرد.

ئەم گوندە پرۆژەی چاکی بۆ کراوە، بەڵام گوندەکەیان بێ بەشە لە (کارەبای نیشتمانی، خراپی ڕێگاو بان، کەمی ئاو).

*** گوندی سەربیرە:**

گوندی سەربیرەی ساڵەیی سەر بە ناحییەی ئاڵتون کۆپریە لە پارێزگای کەرکوك، ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کاتی خۆی شوانێك لە سەرئەم بیرە خەوتووەو گوێی لە دەنگی ئاو بووەو خەڵکی گوندەکانی دەورووبەری بانگ کردووە وزانیویانە کە ئاوی تیایەو بیرە، بۆیە ئەم گوندە بەوەوە ناونراوە سەربیرە، چونکە شوانەکە لە سەر بیرەکە خەوتووەو گوێی لێ بووە.

ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٨٨) ڕووخاوە لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق گەڕانەوە بژێوی ژیانیان لە سەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ کردن بەڕێوە دەچێت لە .کاتی ئەنفال کە ئەم گوندە چۆڵکراو عارەبی هاوردە هاتووەتە جێی و ناوی گوندەکانیان گۆڕیوەو زەوی و زارەکانیشیان داگیرکردووەو دواتر گوندەکە لە دوای پرۆسەی عێراق گەڕاوەتەوە دەستی خەڵکە ڕەسەنەکەی.

*** گوندی گوڵی تە پە:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە زۆربەی دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی ساڵەیین، گوندی گوڵی تەپە لە ڕووی ئیداریشەوە سەر بە قەزای داقوقە، ئەم گوندە بە دووری نزیکەی (٧٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری پارێزگای کەرکوکەوە، هەروەها (٧) کیلۆمەتر لەسەر ڕێگای (کەرکوك– بەغدا)، دوورە گوندی گوڵی تەپە لەسەر دەستی پیاو ماقوڵ (ئەحمەد حمە سیاو) لە ساڵی (١٩٣٠)دا ئاوەدان دەکرێتەوە پێشتر ئەم گوندە نزیکەی (٧٠) ماڵ بووە، بەڵام ئێستا ئەم گوندە (٧، ٨) ماڵی لێ ماوە، ئەوانیش بە ئاژەڵداری خەریکن گوندی گوڵی تەپە دوو گوندی لێ جیابووەتەوە بە شێوەیەکی جوان و سەردەمییانە لەسەر ڕێگای کەرکوك دووزخورماتو دروستیان کردووە بە ناوی تازە دێیەوە ئاوەدانیان کردووەوە، گوندەکانی دەورووبەری (تەپە سەوز، پارە پارە، جیملاوە، حەفتەغار، چەند گوندێکی عارەب وەك گوندی (ئەلبوسراج، حلێوە).

بنەڕەتی ناوەکەی لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، کە خۆی لە سەرەتادا ناوەکەی (گوڵی تەپە) بووە،، بەڵام ئەوان کردوویانە بە (کوڵی تەپە)، شوێنێکی کۆنە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانییەکان، بۆیە هەر بە تەپە ناونراوە، لە ساڵی (١٩٧٤) عارەبی هاوردە هاتوونەتە ئەم گوندەو زەویەکانیان داگیرکردووە،، بەڵام لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق زەوییەکانیان بۆ گەڕاوەتەوە، بژێوی ژیانی ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەڕێوە دەچێت پێشمەرگە دێرنەکانی ئەم گوندە (محەمەد حەسەن) لە ساڵی(١٩٨٥) شەهیدکرا لە ناوچەی خدروەلی.

*** گوندی کارێزەی خاڵخاڵان:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە دەکەوێتە بناری چیای خاڵخاڵانەوە، لە ڕووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی شوانی پارێزگای کەرکوکە ئەم گوندە بە دووری نزیکەی (٨٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری شاری کەرکوکەوە، بەر لە ئەنفال (٨٠ – ٨٥) ماڵی لێ بووە،، بەڵام ئێستا (١٩) ماڵی لێ نیشتەجێیە، گوندی کارێزی خاڵخاڵان بەهۆی بوونی زۆری کارێزەوە بەوە ناوە ناونراوە،، بەڵام مەخابن ئێستا لە کۆی (٦) کارێز تەنها (١) کارێز وشکی نەکردووە، لە ساڵی (١٩٩٢) ئاوەدانکراوەتەوە، گوندەکانی چواردەوری (ناسرو میسر،

کانی رەش، تەپە کورە، دووشیوان، تەرمقە، تورکمانباغ.. بەڵام کارێزەکان ئێستا وشك بوونە ئەویش بەهۆی وشکە سالییەوە، پێشتر بە هۆی زۆری ئاوی کارێزەکەوە باغ و مەرەزەیان لەپەرەوە کردووە ئەم کارێزانەش بە هێزی چەند پیاوێکی بە هێزو کارامە دروست کراوە. بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بووە، بەڵام ئێستا بەهۆی کەمی ئاو کشتوکاڵ ناکەن لە ناودارەکانی ئەم گوندە (کوێخا کەریم، مام فەتاح، کوێخا جوامێر) بووە.

*** گوندی کانی مستەفا:**

گوندی کانی مستەفا سەر بە ناحییەی تەکیەی کاکەمەندی قەزای چەمچەماڵە، کە بەدووری نزیکە (٧٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری شاری کەرکوکەوە، بەر لە ئەنفال ئەم گوندە نزیکەی (٦٠) ماڵی لێ نیشتەجێ بووە، بەڵام ئێستا دوای ئاوەدانکردنەوەی لە ساڵی (١٩٩٢) نزیکەی (٢٠) ماڵی لێ نیشتەجێیە کە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە، گوندی کانی مستەفا یەکێکە لە گوندە قەرەباڵغەکانی هەمەوەند،، بەڵام بەهۆی نەبوونی خزمەتگوزارییەوە وەك کارەبای نیشتمانیو خراپی رێگاوبانەوە، ساڵ بە ساڵ ماڵەکان روو لە کەمییە، مێژووی ئەم گوندە زۆر کۆنە دەگەرێتەوە بۆ کاتی تورکەکان، ئەم گوندە سێ جار لە لایەن حکومەتی بەعسو حەرەس قەومییەکانەوە رووخاوەو سووتێنراوە.

*** گوندی گەورە دێ:**

گوندەکە دەکەوێتە سنووری لیوای کەرکوکی کۆن ئێستا سەر بە ناحییەی ئاغجەلەری سەر بە قەزای چەمچەماڵە لە پارێزگای سلێمانی، گوندی گەورە دێ بە دووری (١٠٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری شاری کەرکوکەوە شوێنێکی بەرزو شاخاوییەو زەوییەکی بەرزو بە پیتی هەیە بۆ رەزو ئاژەڵداری هەرچەندە بە هۆی وشکە سالییەوە تووشی کەم ئاوی بووە.

سنووری گوندەکانی دەوروبەری (کەڵەشێرە، سەرچاوە، کانی بی کۆن، سەری پیران).

ناوی ئەم گوندە بە دوو شێوە دەگێرنەوە، یەکەم کاتی خۆی گاور حوکمی کردووە لەم گوندە، بۆیە بە ناوی (گاورە دێ) ناونراوە دواتر کراوە بە گەورە دێ، لە سنووری ناحییەی ئاغجەلەر چوار گوندی هەبووە کە رێژەیی دانیشتووانەکەی زۆر بووە ئەوانیش (گەورە دێ، تیلیان، عەسکەر، تەوەکەڵی). کاتی خۆی بژێوی ژیانیان لەسەر ئەو بووە کە (نیسك، ترێ، چواڵە)یان بردوو بۆ شارو فرۆشتوویانەو بردوویانە بۆ گوندەکانی دیکە گۆڕیویانەتەوە بە جۆو گەنم بۆ بژێوی ژیانیان،، بەڵام ئێستا (ترێو ترشو قەزوانو چواڵە)یان هەیە،، بەڵام ئەمانە بژێوی ژیانیان دابین ناکات لەم کاتەدا، نزیکەی (٢٥) ماڵ لەم گوندە نیشتەجێیە، بەڵام لە ساڵی (١٩٩١) نزیکەی (٥٠) ماڵ دەبوون، ئێستا لەبەر نەبوونی بژێوی ژیان زۆربیان گوندەکانیان جێهێشت بەهۆی کەمی ئاو لە گوندەکە ناتوانن کشتوکاڵ بکەن تەنها ئەو دارانەی

حەجێنن کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێت، بڕی ئاوەکەیان تەنها بەشی کاری رۆژانەی ماڵ دەکات ئەویش لە رێگەی شارەکانی ترەوە ئاوی بۆ راکێشراوە چونکە بیرەکانی ئەو گوندە ئاوی نییە.

لە ناودارەکانی ئەم گوندە (سەید مەحمود محەمەد، حاجی کاکەرەش، حاجی حەکیم، مامۆستا سەید عەبدوڵڵا، مەلا سەید ئەحمەد، مەلا سەید قادر) کاتی خۆی مەلا سەید بورهان (١٠ – ١٥) فەقێی هەبووەو وانەی تیا وتووەتەوە. نزیکەی (٢٥) شەهیدیان هەیە (٥) ئەنفالیان هەیەو چەند جارێك ئەم گوندە سووتاوەو رووخاوە.

ئەم گوندە هێلانەی پێشمەرگە بووە و سێ جار نەهامەتی بەسەر داهات لە ساڵی (١٩٦٣) لەلایەن حەرسە قەومییەکانەوە سووتێنراوە دووبارە لەلایەن حکومەتەوە بۆ دواجار لە کاتی ئەنفالەکە دووبارە چۆڵ کراوەتەوە.

*** گوندی باشبلاخ:**

گوندی باشبلاخ سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە (١٠) کیلۆمەتر لە قەرەهەنجیرەوە دوورەو (٧) کیلۆمەتر لە رێگای سەرەکی (کەرکوك – سلێمانی) دوورەو بە دووری (٣٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە رۆژهەڵاتی کەرکوکەوە، گوندی باشبلاخ لە دووبەش پێکهاتووە، باشبلاخی سەروو، باشبلاخی خواروو، باشبلاخی خواروو بەر لەوەی لە (٥)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) لەلایەن رژێمی فاشی بەعسدا بڕووخێنرێت زیاتر لە (٤٠) ماڵی نیشتەجێ بووە، هەروەها باشبلاخی سەرووش (٥٠) ماڵی لێ بووە.

دوا بەدوای پرۆسەی ئازادی عێراقو رزگارکردنی شاری کەرکوك خەڵکە رەسەنەکەی باشبلاخ دەگەڕێنەوە زێدی بابوو باپیرانیانو ئاوەدانی دەکەنەوە، ئێستا باشبلاخی خواروو (١٥) ماڵی لێیەو باشبلاخی سەرووش (٧) ماڵی لێ نیشتەجێیە، بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵو ئاژەڵدارییە، سنووری ئەم گوندە دەکەوێتە (قەرەوەیس، خاڵە بازیانی، زەنگەنە، کەولە).

قوتابخانەی باشبلاخ لە دوای پرۆسە ئازادی لە ساڵی (٢٠٠٥)ەوە دامەزراوە.

*** گوندی گوڵم کەوە:**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان لە رووی ئیدارییەوە سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە بە دووری (٤٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، لە رووی مێژووییەوە هەر لە ساڵی (١٩٦٣) تا وەکو شاڵاوی بەد ناوی ئەنفال چەندین جار رووخێنراوەو سووتێنراوەو ئاوەدانکراوەتەوە، دواجار لە ئەنفال کە دەرووخێت وخەڵکەکەی دەربەدەردەکرێت (٧٨) کەس لە ژنو پیاو منداڵ ئەنفال دەکرێت هەروەها زیاتر لە (٣٠) شەهیدی دەستی بەعسیان هەیە کە (٢٥) کەس بە کۆیتەر شەهید بووە.

گوندی گوڵم کەوە لە دوای راپەرینی ساڵی (١٩٩١) گەلی

كوردستان ئاوەدان دەكرێتەوەو چەندین ماڵ دەگەڕێتەوە زێدی بابوو باپیرانی خۆیان، بەڵام مەخابن لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە ماڵەكان وردە وردە كەم دەكەن تاكو ئێستا نزیكەی (١٥) ماڵی لێماوە بژێوی ژیانیان لە سەر كشتوكاڵ و ئاژەڵداری ئەم گوندە دابەش دەكرێت بەسەر چوار بەش (گوڵم كەوە) كە گوندە سەرەكییە كەیە، (ئاوباریك)، (داربیلیە)، (محەمەد فاتە) سنووری ئەم گوندە (كڵاوقوت، مام رەش، پەلكەرەش) ئەم گوندە تاكو ئێستا چوارجار رووخاوە لە ساڵی (١٩٨٨) ئەم گوندە (١٧٠) ماڵ بووە رووخاوە.

*** گوندی گڵناغەج:**

یەكێكە لە گوندەكانی ناوچەی شێخ بزێنی كە دەكەوێتە سەر زێی بچووك لە رووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی ئاغجەلەرە لە قەزای چەمچەماڵ ئەم گوندە بە دووری نزیكەی (٧٠) كیلۆمەتر دەكەوێتە باكووری شاری كەركوكەوە، گوندی گڵناغەج لە دووبەش پێكهاتووە گڵناغەجی گەورەو گڵناغەجی بچووك كە بەهەردوو گوندەكە نزیكەی (٤٠) ماڵی لێیە وبژێوی ژیانیان لەسەر كشتوكاڵ و ئاژەڵدارییە.

لە شاڵاوە درەندەكەی ئەنفالدا ئەم گوندەش وەك گوندەكانی تری شێخ بزێنی و كوردستان بەر شاڵاوی ئەنفال دەكەوێت و دەرووخێنرێت و (١١٠) كەس لە ژن و منداڵ و پیر ئەنفال دەكرێت گوندەی گڵناغەج لە رووی سروشتییەوە هەتا بڵێی دیمەنێكی جوان و ئاو هەوایەكی سازگاری هەیە هەروەها زەوییەكی بەپیتی هەیە بۆ كشتوكاڵ وشوێنكی گونجاوە بۆ ئاژەڵداری.

ناوی ئەم گوندە لە چیەوە هاتووە (گڵناغەج ناوێكی توركیە جووڵ ناجاغ هاتووە واتا گوڵێكی جوان یان درەوشێنكی جوان هاتووە) ئەمە لە سەردەمی عوسمانییەكاندا.

بۆ یەكەم جار قوتابخانەی سەرەتایی لە ساڵی (١٩٦٠) لەم گوندە دانراوە، گوندی گڵناغەج ئەشكەوتێكی لێیە بە ناوی (زری بان) لە ساڵانی رابردوودا لە سەرەتای شۆرشی گەلی كوردستان دا بارەگای پێشمەرگەی بووە هەر لەم ئەشكەوتەدا چەندین پێشمەرگەو سەركردە رۆژانێكی زۆریان تیا بەسەر بردووە، لەوانە سەرۆك مام جەلاڵ.

*** گوندی ساڵەیی بان شاخ:**

یەكێكە لەو گوندانەی كە زۆربەی دانیشتووانەكەی لە عەشیرەتی ساڵەیین، كە دەكەوێتە ناوچەی زاوییەوە، ئەم گوندە بە دووری (٥٠) كیلۆمەتر دەكەوێتە رۆژهەڵاتی خورماتوو، گوندی ساڵەیی بان شاخ پێشتر سەر بە ناحییەی نەوجول بووە،، بەڵام ئێستا سەر بە ناحییەی زنانەییە چونكە ناحییەی نەجوول لە ساڵی (١٩٨٨)دا دەرووخێنرێت تاكو ئێستا ئاوەدان نەكراوەتەوە هەر، بۆیە حكومەتی هەرێمی كوردستان لە دوای راپەرینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) گەلی كوردستان گوندی زنانە ئاوەدان دەكاتەوەو لە جیاتی نەوجول دەیكات بە ناحییەو دەیبەستێتەوە بە قەزای كفرییەوە.

سنووری چواردەوری ئەم گوندە (ئیمام محەمەد، چەوری)، بژێوی ژیانیان لەسەر كشتوكاڵ و ئاژەڵداری بەرێوەدچێت و لە شاڵاوی بەد ناوی ئەنفال لە ناوچەی گەرمیان (٧٤ - ٧٥) كەس ئەنفال كراوە، ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٩٢) بەدواوە ئاوەدان دەكرێتەوەو نزیكەی (٧٠) ماڵی لێ بووە،، بەڵام مەخابن لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراقەوە زۆربەی ئەو ماڵانەی گەرابوونەوە دووبارە گوندەكە چۆڵ دەكەن و دەگەڕێنەوە شار، بۆیە ئێستا چەند ماڵێكی لێ ماوە.

*** گوندی كرپچنە:**

یەكێكە لەو گوندانەی كە دەكەوێتە بناری چیای سەگرمەوە لە رووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی سەنگاوە ئەم گوندە بە دووری نزیكەی (١٠٠) كیلۆمەتر دەكەوێتە باكووری رۆژهەڵاتی شاری كەركوكەوە، بەر لە ئەنفال زیاتر لە (١٠٠) ماڵی لێ نیشتەجێ بووە گوندێكی قەرەباڵغ و ناودار بووە ئەویش بە هۆی ئارامگای شێخ عەبدولكەریم كەسنەزان و بنە ماڵەكەیان بووە لە گوندەكەدا كەوا ئێستا شوێن كەوتوانی ئەم كەسایەتییە ئایینییە لە ناوچەكانی كوردستانی باشوورو رۆژهەڵاتەوە زیارەتی دەكەن.

گوندی كرپچنە لە دوای راپەرین لە ساڵی (١٩٩٣)دا جارێكی تر ئاوەدان دەكرێتەوە، ئێستا زیاتر لە (١٥) ماڵی لێیە، ناوی ئەم گوندە لە چیەوە هاتووە (كاتی خۆی ئەم گوندە تووی لێبووە، كە ئەو توانە كرمی ئاورێشمی هەبووە ئاورێشمی چنیووە) بەو ناوەوە وتویانە (كرم چنە)، كاتی خۆی كابرایەكی زانا هاتووە وتویەتی كرپچنە لە عەرەبی جەنەوە هاتووە واتا لە ناوی (جنە)وە هاتووە مێژوویەكی كۆنی هەیە ئەم گوندە مەرقەدێكی لێ هەیە بە ناوی شێخ عەبدولكەریم كەسنەزان.

*** گوندی سنوور:**

یەكێكە لەو گوندە كوردنشینانەی بە دووری (٤٠) كیلۆمەتر دەكەوێتە باشووری كەركوكەوە، ئەم گوندە لە رووی ئیدارییەوە سەر بە قەزای داقوقەو (٤٠) كیلۆمەتر لێیەوە دوورە، گوندی سنوور گوندێكی گەورەیەو نزیكەی (٤٤٠) ماڵی لێ نیشتەجێیە لە ساڵی (١٩٩٤)دا (١٦٠٠) دۆنم زەوی جوتیارانی خەڵكی گوندی سنوور بەسەر عارەبە هاوردەكان دابەش دەكەن لەسنوورەكەدا نیشتەجێ دەبن تاوەكو پرۆسەی ئازادی عێراق و رزگاركردنی شاری كەركوك ئیتر عارەبە هاوەردەكان گوندەكە چۆڵ دەكەن و زەوییەكانیش دەگەڕێننەوە بۆ خەڵكە رەسەنەكەی خۆی، بەڵام تاوەكو ئێستا گرێبەستی زەوییەكان بەناوی عارەبە هاوەردەكانەوەیە، بۆیە جوتیاران گوندی سنوور داوكاری بەزووترین كات خاوەندارێتی زەوییەكانیان بگەڕێتەوە ناویان و بەناوی عارەبە هاوردەكانەوە بسرێتەوە.

مێژووی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە بۆ پەنجا ساڵ لەمەوبەر لە ئێستا ئەم گوندە گوندێكی تاڵەبانییە نزیكەی (٣٠) ماڵ دەبن كاتی خۆی ئەم گوندەو گوندەكانی تر هی (شێخ نەسرەددین كوری شێخ عیزەددین)ە ناونانی ئەم گوندە بەوەناونراوە دەكەوێتە سەر سنووری نێوان كاكەییەكانی دەڤەری

تاڵەبانی، کۆتا گوندە دەکەوێتە سنووری کاکەییەکان بۆیە ناونراوە (سنوور)، ئەم گوندە سەرجەم دانیشتووانی کورد تاك تاك ماڵی عارەبی لێیە، لە ساڵی (١٩٨٥، چەند ماڵێك تەرحیل کراون چونکە کوڕیان پێشمەرگە بووە. بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و کرێکاری بووە ٣٦٠ دۆنم زەوی پێش پرۆسەی ئازادی لە خەڵکی ئەم گوندە سەندراوە دراوە بە عارەبەکان، بەڵام دواتر عارەبەکان دوای پرۆسە هەستیان کردووە ئەو زەوییانە هی خۆیان نییەو جێیان هێشت ئەم گوندە خزمەتگوزاری باشی بۆ کراوە لە قوتابخانەی سەرەتایی وناوەندی و پرۆژەی ئاو و کارەبا.

*** گوندی کانی کەوە:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە دەکەوێتە نێوان (سەنگاو – قەزای چەمچەماڵ)، کە بە دووری نزیکەی (٧٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە. ئەم گوندە مێژووییەکی کۆنی هەیەو هەر لە دێر زەمانەوە چەندین کەسایەتی ناودارو شێخ و مەلاو پیاو چاکی تیا ژیاوە، هەروەها لە ڕووی پیشەیی و کاری دەستییەوە چەندین وەستایی دەست ڕەنگینی تیا هەڵکەوتووە. بەتایبەتی لە بواری ئاسنگەری و جۆلاییەوە هەر، بۆیە گوندێکی بەناو بانگ بووە لە ناوچەکەدا.

بەر لە ئەنفال زیاتر لە (٦٠) ماڵی لێ بووە ئێستاش لە دوای گەڕانەوەیان بە تایبەتی لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١)ی گەلی کوردستان نزیکەی (١٢) ماڵ دەبن کە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەڕێوە دەچێت.

ناوی ئەم گوندە وەك بیستراوە کانییەك هەبووە کەوێکی لەسەر بووەو وتویانە ئەو کانییە هی ئەو کەوەیە، بۆیە دەڵێن (کانی کەوە).

*** گوندی پەڵکە ڕەش:**

یەکێکە لە گوندەکانی ناحییەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە بەدووری (٥٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، بەر لە ئەنفال نزیکەی (٨٠) ماڵی تێدا ژیاوە،، بەڵام وەك گوندەکانی تری کوردستان بەر شاڵاوی بەدناوی ئەنفال دەکەوێت و دەرووخێنرێت و خەڵکەکەی ئاوارە دەکرێن.

گوندی پەڵکە ڕەش لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) گەلی کوردستان جارێکی تر خەڵکە ڕەسەنەکەی دەگەڕێنەوە گوندەکەو ئاوەدانی دەکەنەوە، حکومەتی کوردستان چەندین خانووی بۆیان دروست کردووە،، بەڵام ئێستا ئەم گوندە تەنها (١٠– ١٢) ماڵی لێ ماوە زۆربەیان جارێکی تر گەڕاونەتەوە شار.

ناوی ئەم گوندە لە چیەوە هاتووە (پەڵکێ هەبووە لە گردی ئەو گوندە ڕەش بووە واتا دارەکە پەلکەکەی ڕەش بووە)، هەر، بۆیە بەو ناوەوە ناسراوە، سنووری ئەم گوندە (تلیان، فەقێ میرزا، تیژە). خەڵکی ئەم گوندە لە عەشیرەتی شوان، زەنگەنەشی تیایە.

ئەم گوندە دووجار سووتاوە جارێك لە شەستەکان بوو جارێکی تریش لەکاتی ئەنفال نزیکەی (٨) کەس شەهیدیان هەیە (٣) ئەنفالیان هەیە دواتر لە ساڵی (١٩٩١) ئاوەدانکراوەتەوە. لەو کاتەدا (٨٠) ماڵ گەڕایەوە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەڕێوە دەچێت.

*** گوندی قایتەوەن:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە دەکەوێتە ناوچەی گەرمیانەوە، لە ڕووی ئیدارییشەوە سەر بەناحییەی قادرکەرەمە، قایتەوەن لە دوو بەش پێکهاتووە قایتەوەنی بچووك و قایتەوەنی گەورە، کە ئاوی ڕۆخانە لەنێوانیان تێدەپەڕێت.

گوندی قایتەوەن لە دوای ڕووخانی لە کارەساتی ئەنفال جارێکی تر لە ڕاپەڕینی بەهاری گەلی کوردستان لەساڵی (١٩٩١) جارێکی تر ئاوەدانی دەکەنەوەو زیاتر لە (٢٠) ماڵی بۆ گەڕاوەتەوە.

دوای پرۆسەی ئازادی عێراق بەهۆی نەبوونی قوتابخانەو خراپی ڕێگاوبان زۆربەی ماڵەکان دەگەڕێنەوە شار ئێستا قایتەوەنی گەورە تەنها (٦) ماڵی لێ ماوە، زۆربەی دانیشتووانی ئەم گوندە لە عەشیرەتی زەنگەنەن.

ناوی ئەم گوندە لە چییەوە هاتووە (کەسایەتییەکی گەورەی ئەم گوندە کراوە بە قائد هەر، بۆیە قایتەوەن لەوەوە هاتوە) سنووری ئەم گوندە لەگەڵ (جەباری، جاف، هەمەوەند)ە.

بژێوی ژیانی ئەم گوندەش زیاتر لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ کردنە، هەرچەندە بە هۆی وشکە ساڵییەوە لەم چەند ساڵەی دوایدا هیچ سوودێکیان لێ نەبینیوە.

ئەم گوندە خاوەنی (٤٥) ئەنفال و (١٢) شەهیدە، نزیکەی (٢٥) پێشمەرگەیان هەبووە، یەك جار ڕووخاوە ئەویش لە ساڵی (١٩٨٨) پێش ئەنفال ئەم گوندە (٥٥) ماڵ بووە. گوندەکانی دەوروبەری (قەڵا کامیل، بەکر باجەڵان، ژاڵەی مەملەحە، قەیتون).

*** گوندی کلاوقوت:**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان، کە بەدووری (٥٠) کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە، لە ڕووی مێژووییەوە گوندێکی کۆنەو نزیکەی (٥٠٠) ساڵ دەبێت لەلایەن بنەماڵەی (گودرین)ەوە ئاوەدانکراوەتەوە، هەربۆیە لە ناوچەکەدا گوندێکی ناسراو و بەناوبانگە.

ناوی ئەم گوندە لەوە هاتووە کە قەڵایەك هەیە لە سەر شاخەکە هەربەو ناوەوە ناونراوە، ئەم گوندە سنوورەکەی (دەلۆ، مام ڕەش، قەففار، داربەسەرە) لە ساڵی (١٩٦٣) ئەم گوندە بەتەواوی سووتا، لەساڵی (١٩٥٨) یەکەمین قوتابخانەی لێ دروست کراوە.

بژێوی ژیانیان لە سەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەڕێوەچووە، خەڵکی گوندی کلاوقوت وەك نەریتێکی ساڵانە لە (١)ی ئایاری هەموو ساڵێك سەیرانە ئاهەنگێك بە هۆی دروست بوونی سندوقی خەیرییەوە دەگێڕن، داهاتی ئەم سندوقە بۆ نەخۆش و هەژاری ماڵانی گوندەکە بەکارئەهێنن، لەناو گوندی کلاوقوتدا کۆمەڵێ خەڵکی جیاواز دەژیان کە شێوازی ژیانیان و ڕەفتاریان لەگەڵ خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری

جیاواز بووە لە ژێر رێنمای و سەرپەرشتی کەسێك بووە بەناوی (حەمە سوور) کە لە ساڵی (١٩٨٦)دا کۆچی دوای کردووە کە لەسەر تەریقەتی (حەقەکان) بووە.

*** گوندی پوزڵ:**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی جەباری پێشتر بەشێك بووە لە گوندی حەمك دواتر جیابوونەتەوە گوندێکی سەر بەخۆیان دروست کردووە لە خوارووی حەمك بەناوی پوزڵ، ئەم گوندە بە دووری نزیکەی (٧٠) کیلۆمەترە لە رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە.

گوندی پوزڵ پێش ئەنفال نزیکەی (٤٥) ماڵی لێ نیشتەجێ بووە، بەڵام لە شاڵاوی بەد ناوی ئەنفالدا وەك گشت گوندەکانی تر دەرووخێنرێت و چەندین کەس لە گوندەکە بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەون و چەندین کەسیشیان لێ شەهید بووە.

سنووری ئەم گوندە (چیمەن، حافتاچشمە، قۆجەلی) ئەم گوندە گیایەکی هەبووە بە ناوی پوزڵ لەم سنوورە زۆر بووە بەهۆی ئەوەی زۆر بووەو هاتوونە لێرە نیشتەجێ بوونە ناویان ناوە پوزڵ و لە ساڵی (١٩٤٥) ئاوەدانیان کردووەتەوە، ئەم گوندە لەلایەن رژێمەوە رووخاوە، بەڵام دوای چەند مانگێك گەڕاونەتەوە دووبارە ئاوەدانیان کردووە لە ساڵی (١٩٨٨) دووبارە رووخایەوە، لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق جارێکی تر ئاوەدان دەکرێتەوەو چەندین پرۆژەی خزمەتگوزاری بۆ جێبەجی دەکرێت وەك پرۆژەی (بیری ئیرتیوازی، قوتابخانە، کارەبای نیشتیمانی) ئەمەش بە هۆی هەوڵی ئەنجوومەنی گوندەکەیە.

*** گوندی بنە:**

گوندی بنە یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان لە رووی ئیداریشەوە سەر بە ناحیەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکووکە، گوندی بنە بە دووری نزیکەی ٣٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکووك، گوندی بنە کاتی خۆی لە سێ گوند پێکهاتووە (بنەی گەورە، بنەی ناوەراست، بنەی خواروو) کە دەکەوێتە بناری مەقانەوە.

ئەم سێ گوندی بنەیە بەر لە ئەنفال نزیکەی ٩٠ ماڵی لێ نیشتەجێ بووە کە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بووە، ئێستاش گوندی بنە لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق و رزگار کردنی شاری کەرکوك لەلایەن خەڵکە رەسەنەکەیەوە ئاوەدانکراوەتەوەو نزیکەی ٢٠ ماڵی لێیە.

سەرەتا ئەم گوندە ئاوەدانکرایەوە بنەی گەورە بوو، سەرەتا کە دروست بووە خەریکی ئاژەڵداری بوونە لە کاتی عوسمانییەکانەوە ئەم گوندە ئاوەدان بووە. لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومی ئەم گوندەی تاڵان کردو سووتانیشیان هیچیان تیا نەهێشت، خەڵکەکە گوندەکەیان چۆڵ کردو چوونە گوندەکانی کانی عارەبان و چەم خاسە، ئەمە لە سەردەمی حەرەس قەومییەکاندا، خەڵکی ئەم گوندە هەموو کات ئامادە بوونە بۆ شەڕو بەشداریان کردووە کە پێشمەرگە هاتەوە خەڵکی ئەم گوندە خۆی خزانە ناو شۆڕش و دەست بە کار بوونە. لە ساڵی (١٩٨٧) بۆ ئاخر جار رووخێنرا.

پیاو ماقوڵانی ئەم گوندە: (کوێخا رەفیق، حاجی حەمە سوور، حاجی عەزیز، حاجی حەمە ساڵح، مەجید کاکل)، ئەوانەی ئێستا ماون: (حاجی عەبدوڵڵا، کاك عوسمان، مام حەمید).

پێگەی جوگرافی ئەم گوندە پێنج هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵی هەیە، سنووری ئەم گوندە: بن گرد ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی، گورگەیی دەکەوێتە رۆژئاوای، برایم ئاغا نۆ کیلۆمەتر دوورە لە قەرەهەنجیرەوە، پێش ئەنفال بنە ٨٠ ماڵی تیابووە، بە هەر سێ بنە ٩١ ماڵی تیابووە.

*** گوندی درۆزنە:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە سەر بە ناحیەی سەنگاوی قەزای چەمچەماڵی پارێزگای کەرکوکە. ئەم گوندە بە دووری ٣٥ کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری ناحیەی سەنگاوەوە. هەروەها بە دووری زیاتر لە ١٠٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە. گوندی درۆزنە بەر لە ئەنفال نزیکەی ٦٠ ماڵی لێ بووە. لە دوای گەڕانەوەی خەڵکە رەسەنەکەی بۆ زێدی باو باپیرانیان لە ساڵی (١٩٩١) دا ئاوەدانیان کردووەتەوە کە ئێستا گوندەکە ١٢ ماڵی لێ نیشتەجێیە کە بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵی بەرێوە دەچێت.

وەکو سنووری ئەم گوندە: گوندی درۆزنە بریتییە لەوەی کاتی خۆی ئەم گوندە ناونراوە بە درۆزنە لە کانییەکەوە ناونراوە. ئەم کانییە کاتەکانی لە کاتی بەهاران یان درەنگ ئەتەقێ یان زوو ئەتەقێ یان وشك ئەکاوو دووبارە ئەتەقێ، لەسەر ئەمە ئەم گوندە ناونراوە (لای کانییە درۆزنەکە) کە درۆزنە ناوی کانییەکەیە.

سنووری گوندەکانی دەورووبەری (مەسۆی بەرگەچ، مەسۆی سەر چەمەر، مەسۆی بچکۆلە) ئەمانە بەلای چەپمان، بەلای راستمان (جامرێز، شەلەیی). سەرچاوەی ئاوە سپی ئاوێکی بەردەوامە هەموو کاتەکان هەر هەیە، کاتی خۆی لێرەدا چوار ئاشی ئاویان هەبووە لە سنووری گوندەکە.

ئەم گوندە لە تیرەی (سەیدی بەرزنجەن)، بەڵام بەهۆی ئەوەی ناوچەکەیان جافە سەیدیان پێ نالێن، پێیان ئەڵێن شێخەکانی درۆزنە یان نەنکیان دەلۆ بووە هەندێك جار بانگیان ئەکەن ئەڵێن شێخەکانی دەلۆ.

کاتی خۆی ئەم گوندانە لە شاخی ئاژاخ لە پشتی سەرچاوەی ئاوە سپییەوە بە ئەم دیوی بەر دەلۆ بووە ئەمە سنووری دەلۆ بووە. دەلۆی تیانیشتەجێ بووە. ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت رایان کردووە چوونەتە ناوچەی کفری و خانەقین ئەم گوندانە ماونەتەوە. بەهۆی ئەوەی نەنکیان دەلۆ بووەو خاڵوانیان بوون وتوویانە بابچنە ئەو گوندانەی ئێمە ئێوەش بۆ خۆتان ئاوەدانی بکەنەوە ئەوانیش هاتوون لای ئەم کانییە درۆزنە کە ئێستا گوندەکەیان بەو ناوەیە لێرە ئیتر زنجیان کردووە، دەوار بووە ئەو کاتە هەڵیان داوەو نیشتەجێ بوونە.

سەرچاوەی ئاوە سپی ئەو شوێنەیە کە ئاوەکەی لێ دەردەچێت لە سەرچاوەکەی ئەو رەنگە سپییەی نییە، بەڵام

کاتێ دێت بەژێر ئەو شاخ و موغارە ئەمە مادەیەکی تیایا پێی ئەڵێن کبریت لەگەڵ ئەوە تێکەڵ ئەبێت وەکو تێکەڵ ئەبێت ئەو ڕەنگەی ئەگۆڕێت و بۆنێکی لێوە دەرئەچێت. دواتر مادەیەکی تری تیایە قیرە، بۆ نموونە لەوەیە بچێتە سەر ئاوەکە سەیر بکەی قیر وا لەسەریەتی قیرێکی ڕەشە کە ئەچێتە ناوی ئەنووسێتە گیانەوە. ئەم ئاوە خەلك بەتایبەتی لە ترشاو هەیە هەر لەو ئاوە خەلك لێی دەبات بۆ حەساسیەت بەکاردێت بۆ مەعیدە بەکار دێت بۆ خواردن زوو هەزم کردن. هەتا ئاوە سپیش بۆ خواردنەوە ئەشێت.

بژێوی ژیانیان لەسەر جووت کردن و کاروان بووە، بۆ کاروان نزیك سێ شەو سێ ڕۆژ ئەڕۆیشتن هەتا کاروانێك ئەکرا لێرەوە گەنم و شت ئەبرا ئەیان دا بە نەوت و شەکرو چا، خەڵکی وا هەبوو بە شووشە نەوتی ئەهێنا خەڵکی ئەم گوندە بە کاروان بۆ کفری چوونە. درەو کردنی ئەم گوندە هەر بە دەست بووە، جووت کردنیش هەر بە گا بووە.

شایەنی باسە گوندی درۆزنە دەکەوێتە نزیك سەرچاوەی ڕووباری ئاوە سپیەوە هەروەها لە نزیك گوندی درۆزنە چەند بیرە نەوتێك دۆزراوەتەوە بەقسەی خەڵکی گوندەکە ئەم کۆمپانیا نەوتانەی کە لەوێ کار دەکەن هیچ سوودێکیان بۆ گوندەکە نەبووە بەڵکو تۆز و خۆڵی ئەو بار هەڵگرتنەی کە ڕۆژانە بەناو گوندەکەدا تێدەپەڕن کار بۆ کۆمپانیاکە دەکەن دەچێت بە سەروو چاویان و بێزاری کردوون.

لە پێش ساڵی (١٩٨٨) گوندەکە نزیکەی (٥٥ – ٦٠) ماڵ دەبوو دواتر لە ساڵی (١٩٩١) ئاوەدانیان کردەوە. لە دوایدا نزیکەی (٣٠– ٣٢) ماڵ دەبێت،، بەڵام ئێستا لەبەر بێ ئاوی و وشکە ساڵی کەم بووە، ئەم گوندە هیچ شتێکی نییە جگە لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کشتوکاڵیشی زۆر نییە، بەڵام ئێستا ئەم گوندە سیانزە ماڵە.

* **گوندی سوورە دێ:**

گوندی سوورە دێی خواروو یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان، لە ڕووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە بە دووری ٢٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك. گوندی سوورە دێی خواروو دەکەوێتە سەر بەنداوی ڕووباری خاسە، ئەم گوندە لە (١٢)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦) لەلایەن ڕژێمی فاشی بەعسەوە دەرووخێنرێت خەڵکەکەی ئاوارەو دەربەدەر دەکرێت کە ئەو کاتە نزیکەی ٤٥ ماڵی لێ نیشتەجێ بووە، کە بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بووە. گوندەکانی دەوروبەری بریتین لە (کۆچەك، گۆگجە، تۆپ زاوا، قەففار، شۆریجە)، ئەو پرۆژانەی کە بۆ ئەم گوندە کراوە بیری ئاوە کە لە ساڵی (٢٠٠٦) کراوە بۆیان لەگەڵ مۆلیدەیەکی کارەبا.

گوندی سوورە دێی خواروو لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق ئاوەدان دەکرێتەوە چەند ماڵێکی بۆ دەگەڕێتەوەو بەکاری ئاژەڵدارییەوە خەریکن، کێشەی سەرەکی ئەم گوندە نەبوونی ڕێگاوبانە بەتایبەتی نەبوونی پرد بۆ پەڕینەوە لە چەمی خاسە.

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتوە کاتی خۆی گردەکانی ئەم گوندە سوور بوونە، بۆیە گوندەکەش هەر بەو ناوەوە ناو نراوە سوورە دێ.

* **گوندی شۆریجەی سەر خاسە:**

گوندی شۆریجەی سەر خاسە کە دەکەوێتە سەر چەمی خاسە یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان لە ڕووی ئیداریشەوە دەگەڕێتەوە سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکوك ئەم گوندە بە دووری ١٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە، هەروەها نزیك بە بەنداوی خاسە.

گوندی شۆریجەی سەر خاسە لە دووبەش پێکهاتووە: شۆریجەی خواروو کە بە بنەماڵەی شاسوار ناسراوە هەروەها لەگەڵ شۆریجەی سەروو کە بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵکردنە.

لە ساڵی (١٩٦٣) کاتێك حەرەس قەومی و حکومەت لێرەوە نزیك بوو داویانەتە سەر گوندەکەداو سووتانیان، هەتا ماوەیەك هەر لە هەڵەت و دەشت و دەر بوون کشتوکاڵیان هەر لەسەر ئاو بوو، دواتر هاتنەوە چاکیان کردەوە بەشێوەیەکی باشتر، دووبارو لە ساڵی (١٩٦٧) سووتاندیانەوە، هەموو ماڵەکان وێران بوون و سووتان.

ئەم گوندە لەگەڵ شۆریجە یەك گوند بووە لە ساڵی (١٩٤٧)، لە (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٦) ئەم گوندە بە تۆپ و تەیارە وێران کرا.

دوای ڕاپەڕین گەراونەوتەوەو نزیکەی سێ مانگ لێرە بوونە، بەعس دووبارە دایەوە بەسەریانداو ڕووخاندی، هەتا پرۆسەی ئازادی هاتنەوەو ئاوەدانیان کردەوەو نزیکەی نۆ ماڵ دەبوون،، بەڵام بەهۆی خراپی ڕێگاو بان و نەبوونی قوتابخانەو خزمەتگوزاری بەشێکی زۆر لە خەڵکەکەی دێیەکەیان چۆڵ کرد.

لەم گوندە لە وەرزی هاوین (تەماتە، خەیار، باینجان، بیبەر، ترۆزی، شووتی، کاڵەك) و کشتوکاڵی دانەوێڵەو گەنم و جۆ ئەو شتانەیان کردووە لەگەڵ ئاژەڵداری. زۆربەی زەوییەکانیان بەر پرۆژەی ئاوی خاسە کەوتووە.

دوو ماڵ هەبوو لە هەیبەوە جیابوونەتەوە و هاتوونەتە خوارەوە شەخسێ هەیە لێرە ناوی (ئیمام سەرواڵە)یە هاتوونەتە ئیمام سەرواڵە لەوێ نیشتەجێ بوونەو چەند ساڵێك لەوێ بوونە ئەمە بە نزیکەی ٣٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوە، لەوێش ماوەیەك ماوەتەوە ئاو و کانی لێ هەبووە دواتر کانییەکە نەماوە، گواستوویانەتەوە بۆ (شێخ خەرمان – ڕەمەزان) لەوێش نزیك (١٥– ٢٠) ساڵێك بوونە. وە لەوێش دووبارە ئەو ئاوە نەماوە، هاتوونەتە خوارتر گوندێ تازەیان داناوە بە ناوی (ئاوایی کۆن) خۆمان وای پێ دەڵێن لەوێش نزیك ١٠٠ ساڵێك ماونەتەوە دواتر هاتوونەتە دیار چەمی خاسە ئەم چەم خاسەیە کەوا ئێستا ئەی بینن ناوی ئەم گوندەش لەوەوە هاتووە کەوا شۆڕبوونەتەوە بۆ خوارەوە ناویان ناوە شۆڕیجە چەمی خاسەش هەر زوو گوێم لە باو باپیرانمان بووە وتوویانە ئاویان لەم چەمە خواردووەتەوەو

ئاوێکی سازگارو خۆش‌و چاك بووە ناویان ناوە (بەخوا ئاوی خاسە)، بۆیە بەوە ناو نراوە (چەمی خاسە) هەر لە راستیدا وایە ئاوەکەی خۆش و چاکە.
لەبەر ئەوەی گوندی شۆریجەی سەرخاسە لەگەڵ چەند گوندێکی تردا دەکەوێتە بەر پرۆژەی دروستکردنی بەنداوی مەزنی رووباری خاسە ئێستا لەسەرووی گوندەکەوە بە شێوەیەکی بەرز خەریکی ئاوەدانکردنەوەی گوندێکی نوێن.
ئەم گوندە دەکەوێتە نێوان گوندی (سوورە دێ، هەیبە، کۆچەك) سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیر نزیك ١٠ کیلۆمەتر لە کەرکووکەوە دوورە.
لە کاتی هەشتاکان نزیك ٢٥ ماڵ بووە، ئێستا نزیك ٧٠ ماڵ دەبێت.

*** گوندی عەبدوڵڵا غانم:**

یەکێکە لەو پێنج گوندەی کە بە ناوچەی تاڵەبانی ناسراوە، لە رووی ئیداریشەوە سەر بە قەزای داقوقی پارێزگای کەرکوکە، ئەم گوندە بە دووری پێنج کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری قەزای داقوقەوە، هەروەها بە دووری ٤٥ کیلۆمەتریش دەکەوێتە باشووری شاری کەرکووکەوە، ئێستا گوندی عەبدوڵڵا غانم زیاتر لە ١٠٠ ماڵی لێ نیشتەجێیە، کە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ‌و ئاژەڵدارییە،، بەڵام مەخابن بە وتەی خەڵکی گوندەکە ماڵەکان بەردەوام لە کەمبوونەوەدان واتا بەرەو شار کۆچ دەکەن، بۆیە داواکارن دەستی خزمەتگوزاری‌و ئاوەدانی زیاتر بگاتە گوندەکەیان بۆ ئەوەی خانەوادەکان کۆچ نەکەن‌و گوندەکە چۆڵ نەکرێ،
ئەم گوندە هاو سنوورە لەگەڵ گوندەکانی عەشیرەتی کاکەیی، گوندی عەبدوڵڵا غانم یەکەمین جار لە ساڵی (١٨٠٠)ەوە ئاوەدانکراوەتەوە لە گوندی مەتارە بووە، شوان کارێك لەم گوندە هەبووە بە ناوی عەبدوڵڵا غانمەوە هەر وتوویانە بچن بۆلای عەبدوڵڵا غانم، دواتر هەر لێرە بوونە خۆی‌و کورەکەی ناوی ئەم گوندەش لەوەوە ناو نراوە، ئەم گوندەش وەکو گوندەکانی تر لە شۆرشی تەعریب کردن بێ بەش نەبووە، ئەم ناوچەیە لە ساڵی حەفتاکان خەڵکە رەسەنەکەی لێ دوور خرایەوە بە بریاری حکومەتی ئەو کاتەی بەعس.
لە پیاو ماقوڵانی ئەم گوندە (شێخ عاسی، مەجید حەمە شاوان)، دانیشتووانی ئەم گوندە هەموو کوردە، تەنها یەك ماڵی عەرەبی لێ هەیە ئەویش هەر لە کۆنەوە لێرەن، ئەم گوندە خزمەتگوزاری چاکی بۆ کراوە، وەکو قیرتاو کردن‌و بیری ئیرتیوازی،، بەڵام ئاوەکەیان سوێرە.
لە ساڵی (١٩٥٩) قوتابخانە لەم گوندە دامەزراوە بەردەوام بوو هەتا ساڵی ١٩٧٣ خوێندن لەم گوندە بە کوردی بوو، دواتر لە سەردەمی حکومەتی بەعسدا کرایەوە بە عەرەبی تا ساڵی (٢٠٠٣).

*** گوندی هەیبە:**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان لە رووی ئیداریشەوە سەر بە ناحییەی قەرەهەنجیری پارێزگای کەرکووکە. ئەم گوندە بە دووری ٢٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی شاری کەرکووکەوە. هەیبە تا ئێستا چەندین جار سووتێنراوەو رووخێنراوە، سەرەتا بە دەستی حەرەس قەومییەکان لە ساڵی (١٩٦٣) دەسووتێنرێت‌و لە ساڵی ١٩٨٧ جارێکی تر بەدەستی رژێمی بەعس دەروخێنرێت، بەڵام خەڵکە ئازاکەی جارێکی تر ئاوەدانی دەکەنەوە. تاوەکو دواجار لە ئەنفالەکەدا لەگەڵ تەواوی گوندەکانی تری کوردستان دەروخێنرێت خەڵکە رەسەنەکەی ئاوارەو دەربەدەر دەکرێت.
گوندی هەیبە پێش ئەنفال نزیکەی ٩٠ ماڵی لێ بووەو ئێستاش ١٤ ماڵی لێ ئەبێت کە بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری‌و کشتووکاڵە.
دواتر ئەم گوندە گوێزراوەتەوە بۆ تەق تەق کە ئێرە ئەبێتە سەرچاوەی ناوی گوندی هەیبە دواتر هەر ئێرەیان بە باشتر زانیوەو گەراونەتەوەو ئاوەدانیان کردووەتەوە، لە دواییدا درێژەیان بە ژیانی خۆیان داوە لێرە ئەم ناوچەیە باخ‌و ئاوی زۆری لێ هەبووە هەتا ساڵی (١٩٨٧)یش هەر مابوون، پر بوو لە میوە. ئەم چەمە ئاوی زۆر زۆر بووە کاتی خۆی دوو ئاسیاوی لێ هەبووە، نزیکەی (٩٠ – ١٠٠) ماڵ دەبوو،، بەڵام ئێستا نزیکەی ٣٦٠ ماڵ دەبێت.
لە ساڵی (١٩٦٣) عەبدولسەلام عارف بریارێکی دەرکرد بە سووتاندنی هەموو لادێیەکانی کوردستان کە ئەم گوندەش بەر ئەو سووتاندن‌و تالانە کەوت.
پیاو ماقوڵانی ئەم گوندە ( حاجی عەودل حەمە ساڵح، کوێخا حوسێن، عەلی خورشید، حاجی محەمەد، حاجی نووری، حەمە سوور).
لە ساڵی (١٩٨٧) دووبارە گوندەکەیان رووخایەوە ئەم ناوە هەمووی چۆڵ بووە هەتا ١٩٩١.
ناوی ئەم گوندە بە دوو شێوە دەگێرنەوە، یەکەمیان لەوانەیە بە هۆیە وەکو جێگایەکی پشوودان کە کاروانەکانی تەوێڵەو بیارەو سەرگەڵوو ئەهات لێرە پشوویان دەدا. دووەمیان ئەڵێن ئافرەتێك هەبووە کەڵە ژن ناوی هەیبەت بووە، شاژنێکی چاك بووە تێگەیشتوو بووە زانا بووە ئیتر گوندەکەیان بەناو ئەوەوە ناوە ناوە.
لە سەرەتاپی ساڵی (١٩٨٢)دا لە (١)ی کانوونی دووەمی هەمان ساڵ شەرێکی مەزن لە گوندی هەیبە روودەدات کە شەوێك ٣٦ پێشمەرگە لەم گوندە بوو بۆ بەیانییەکەی جاش هاتن نەیان زانی پێشمەرگەی لێیە ئۆتۆمبیلی جاشەکان لە شاخەدا هاتنە خوارەوە، پێشمەرگەیەك لەو سەر شاخە حەرەس بوو فیشەکێکی بە دەرگایەکی گوندەکەوە نا تاوەکو خەڵکەکە ئاگادار بکاتەوە کە لە ناو گوندەکە بوون. ئیتر جاش لە هەموو لایەکەوە هاتن لەگەڵ پێشمەرگە شەر بوو هەتا (٣– ٤) عەسر شەر بەردەوام بوو. شەهیدەکانی ئەم گوندە: ( شەهید تاریق‌و رەفیقی برای، سەردار عەلی‌و زولفەقاری برای، یوسف تاهیر، قاسم تاهیر).
گوندی هەیبە زۆربەی خزمەتگوزارییەکانیان بۆ ئامادە کراوە وەك بنکەی تەندروستی‌و کارەباو پرۆژەی ئاوی خواردن،، بەڵام ئەوەی کەماوە بکرێت‌و داواکاری خەڵکی گوندەکەیە قیرتاو کردنی رێگاوبانەکەیان‌و دروستکردنی قوتابخانەی

سەرەتایی بۆ منداڵەکانیان.
ژمارەی کشتوکاڵی ئەم گوندە (٢١٥)یە لە هەشتاکان نزیە ٩٢ ماڵ بووە، ئەم گوندە لە ٢٠٠٣ ئاوەدان بووەتەوە. سنووری ئەم گوندە (هەیبە دەکەوێتە ناوەراستی هەردوو چیمەنی گەورەو بچووك، شۆریجە، سوورە دێی سەروو. سوورە دێی خواروو، دەلۆ، ساتی، زوڵفە). سنووری ئەم گوندە مەزندە دەکرێت بە (٥٠٠٠٠– ٦٠٠٠٠) دۆنم. لە دوای پرۆسەی ئازادی (٢٥– ٣٠) ماڵ بوونە.

*** گوندی بسطاميلی - بێستان ملە - بێستان ملی:**
وا ڕێی پێ دەچێت کە بنەڕەتی ناوەکە (بێستان – ملە) یان (بێستان – ملی) بووبێت،، بەڵام تورکمانەکان وشەکەیان تێکداوەو کردوویانە بە (بسطاميلی)، کەزۆر لەبنەڕەتەکەوە دوورە.
محەمەد جنید بەیاتلی ڕای وایە کە گوایە:
".. کە بنەڕەتی ناوەکە (بستانلی) بووە بەمانای خاوەنی بێستان، چونکە لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەیە بەناوبانگە بەبێستانکردنی هاوینە لەسەر ڕۆخەکانی ڕووباری (ئاوەسپی) هەروەها ناوی ئەم گوندە لەسەرژمێری ساڵی ١٩٤٧دا بەشێوە (بستانلی) هاتووە."
شوێنی ئەم گوندە کەوتووەتە لای خواروی ڕووباری (ئاوە سپی) لەشوێنێکی بەرزی ڕۆژئاوای قەزای دووز بەدووری (١٧) کیلۆمەتر، کە لە سەرووە هاوسنوورە لەگەڵ ڕووباری (ئاوەسپی)و گوندی (حلێوە)، ڕۆژئاوای لەگەڵ گوندی (حەبیب دەرەسی)و گوندی عبود (بسطاملی بچووك) لەخوارووە (گردی شاهین)و دێی (دونبلان)و لەڕۆژهەڵاتەوە گوندی (چەرداغلوە)، هەروەها دەورە دراوە بەدێیەکانی (چەرداغلو) بەدووری (٣) کیلۆمەترو (پیرئەحمەد) بەدووری (٣) کیلۆمەترو (عەبود) (١٢) کیلۆمەترو (صیاد)، (١١) کیلۆمەترو (قەرەنان) (٥) کیلۆمەترو (ئەلبوحەسەن)، (٧) کیلۆمەتر.
رووبەری زەوی ئەم گوندە نزیکەی (١٦,٥٦٩) دۆنم دەبێت دەتوانین زەوییەکەی بکەینە دووبەشەوە بەشێکی زەوی کشتوکاڵییە، کە یان بەر بارانە یان بە ئاودێری بەشی دووەمی لەوەرگایە...
هەروەکو لەراپۆرتی نهێنی بەریتانیاوە هاتووە لە ساڵی (١٩١٧)دا ژمارەی خێزانەکانی (بسطاملی) (٢٠٠) خێزان بووە،، بەڵام لەهەشتاکاندا نزیکەی (٥٠٠) خێزان بووە.

*** گوندی لەیلان:**
لەیلان ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتی لەیلان کە لەم گوندەداو لە گوندەکانی تر نیشتەجێن.
بەڵام ڕایەکی تر هەیە کە گوایە دووبرا هەبوونە، زۆر دەوڵەمەند بوونەو هەردووکیان (لاڵ) بوونەو پێیان وتون دێی (لالان)،، بەڵام کاتێك عوسمانییەکان هاتونەتە ناوچەکە، ناوەکەیان گۆڕیوەو کردویانە بە (لەیلان)، چونکە بەزەحمەت بێژەی پیتی (ڵ)یان پێکراوە، بۆیە وشەکەیان لە (لالان)ەوە کردووەتە لەیلان.
بەڵام لە کوردیدا ووشەی لەیلان بە مانای (بریقەدار) یان درەوشەدار) دێت، لە زمانی کۆنی زەردەشتیدا ووشەی لەیلان) بە مانای (شوێنی دوورە دەست یان دوورە شار) دێت. بۆیە زۆر ڕێی پێ دەچێت کە ناوەکە بۆ ئەو سەردەمە بگەرێتەوەو لە دواییدا لە بێژەتکردنی زماندا گۆڕانکاری دروست بووبێت کە عوسمانییەکان هاتوونە ناوەکەیان لە چوارچێوەیەکی کوردییەوە گۆڕیوە بۆ زمانی تورکی و ئیسلامی عوسمانی.
لە سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧)دا سێ لەیلان هەبووە کە لەیلانی سەروو، ژمارەی (٨٧٣) کەس بووە کە (٤٢٧) نێرو (٤٤٦) مێ بووە، لەیلان خواروو (٣٢٦) کەس بووە، کە (١٥٨) نێرو (١٦٨) مێ بووە،، بەڵام لەیلانی بەرتەکیە (٢٤٨) کەس بووە، کە (١١٦) نێرو (١٣٢) مێ بووە.
بەڵام بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ کۆی گشتی لەیلان بریتی بووە لە (١٣٠١)کەس بووە، کە (٦٥٦)کەس نێرو (٦٤٥) کەس مێ بووە.
لە لەیلان چیایەك هەیە بەناوی چیایی لەیلان (چیای دۆڵان)، خەڵکی ناوچەکە بەچیایی ئەسکەندەر ناوی دەبەن، کە گوایە ئەسکەندەر لەوێ نێژراوە، لەوانەیە هەر ئەسکەندەر ناوێکی تر بوو بێت لەوێ نێژراوە یان فەرمانڕەوایی کردبێت.

*** گوندی تەرجل - تەرجیل:**
گوندێکی گەورەی قەرەحەسەنە کەناوی (تەرجیل) لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە سەر ناوی عەشیرەتێکی کوردی، کە نیشتەجێی دیاربەکر بوونە لەکوردستانی سەروو، لەوانەیە هەندێك لەخەڵکی ئەم عەشیرەتە لەتورکیاوە هاتبێتە ئەم ناوچەیەو ئەم گوندە بەناویانەوە ناونراوە.
دووری لە ناحییەکەوە نۆ کیلۆمەترە، کە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، (٥٦٣) کەس بووە کە (٢٨٩) نێرو (٢٧٤) مێیە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٤٨٤) کەسە، کە (٢٣٩) نێرو (٢٤٥) مێ، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥، (٤٨٤) کەس بووە.

*** گوندی فرقان - فەرقان:**
دێیەکی گەورەی قەرەحەسەنە، لەم دێیە هەندێك لەعەشیرەتەکانی ڕۆژبەیانی (روز بەهانی) دادەنیشن، کە بە سەرۆکەکەیان دەڵێن (فەرروخان روزبە) یان ( فەرروخان)، بۆیە بەپێی سەردەم ناوەکە هەڵگەڕاوە بۆ (فەرقان)، شارێکیان هەیە لەئێران بەناوی (فەرروخان).
دوو کیلۆمەتر لە کەرکوکەوە دوورە، لە ساڵی (١٩٤٧)دا (٦٤٥) کەسی لێ بووە، کە (٢٨٤) نێرو (٣٦١) مێ بووە، لە ساڵی ١٩٥٧،(٤٣٨) کەس بووە کە (٢٠٥) نێرو (٢٣٣) مێیە.

*** گوندی ئۆمەرە گەدە:**
(٣٥) کیلۆمەتر لە کەرکوکەوە دوورە، بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) (٢٩٩) کەسە، (١٥٣) نێرو (١٤٦) مێیە، لە ساڵی (١٩٥٧)دا (٣١٢) کەس بووە کە (١٦٨) نێرو (١٤٤) مێ بووە.
ناوچە ئاوەدانەکانی کە هەبووە: چیای گردە قومل، چیای خلەنێرە، چیای گاشێت، چیای شەهیدەکە، نەزەرگەکە،

کەلەك ناو، چیای گوڵە قای کراو، چیای بزەڵە، چیای پردەکە، هەردی بزەڵە، هەردی گلە سەرەکە، گردی هەمەواتك، هەردی چاوشین، هەردی کانی سارد، هەردی هێلانە قەلەکە، هەردی لانە کۆتر، ئاسیاوی شێخ تایر، ئاسیاوی عەبدوڵڵای عەباسی، ئاسیاوی تەیمەزاری -تەنورە، تەنگی عەلی جامان.

*** گوندی باداوە - باوە:**

(١٥) کیلۆمەتر لەکەرکوکەوە دوورە، لە ساڵی (١٩٤٧)دا (١٣٩١) کەس بووە، کە (٥٤٧) نێرو (٨٤٤) مێیە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٨٦٤) کەسە کە (٤٣٤) نێرو (٤٣٠) مێیە.

کەوتووەتە نێوان لەیلان و قادرەکەرەم، بنەرەتی بێژەی باداوە، هەروەکو مامۆستا زەبیر بلال ئیسماعیل دەڵێت: باداباد، کە ئەمە پێکهاتووە لەبێژەی باد بەمانی (هەوا)و (اباد) بەمانای بینا (عمارە)یان ئاوەدان کە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە (باد اباد)، یانی ئاوەدان بوو لەهەوا، لەبەر ئەوەی ئەم گوندە کەسێکی دیاری کراو دروستی نەکردووە، خۆی وردە وردە، ئاوەدان بووەتەوە، هەتا وای لێهاتووە ناوەکە لە تۆمارەکانی عوسمانییەکاندا شێوەی (باد ئاباد)ی وەرگرتووە.

*** گوندی قەرەهەنجیر:**

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، (٣٧٨) کەسە، کە (١٩٥) نێرو (١٨٣) مێ بووە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٤٣٠) کەس بووە، کە (٢٢٧) نێرو (٢٠٣) مێ.

ناوچە ئاوەدانەکانی قەرەهەنجیر بریتییە لە: کانی خۆرەتاو، کانی نیسار، دۆڵی گوڵاو، دۆڵی خاڵە مردوو، دۆڵی عەرکەوڵا، دۆڵی ئەسحابەکە، دۆڵی گۆم هەیەر، دۆڵی نیسار شەقام، دۆڵی حاجی مردوو، دۆڵی کۆراو، دۆڵی کەرە هەوار، دۆڵی ئاغا مل قەوی، دۆڵی بان حەسەن بەگ، ئیمام سەرووالە.

ناوی مەلاکان: (مەلا عومەر، مەلا عەبدوڵڵا) کە لە ساڵی ١٩٦٣ هاتوتە قەرەهەنجیر، مەلا ئەحمەد ئەمین کە لە ساڵی ١٩٧٤ هاتووەتە قەرەهەنجیرو لەبنەرەتدا دزەیی بووە، مەلا فاروق لە ساڵی ١٩٨٠ هاتووەتە قەرەهەنجیر کە گوایە خەڵکی قەرەهەنجیرە لە وادی تەرکبیل‌و قاروەلییەوە هاتونەتە ئەم قەرەهەنجیرەی ئێستا. لەبنەرەتدا تورکەکان ناویان ناوە قەرەهەنجیر ئەویش لەجۆری هەنجیرەکەی بووە، بەڵام زۆر رێی پێدەچێت ناوەکەی لە کار هەنجیرەوە هاتبێت لەبەر ئەوەی خەلکەکەی خەریکی بەهەمهێنانی هەنجیری رەش بوونە، کە تاوەکو ئێستاش پاشماوەی داری هەنجیری لێماوە.

کوێخاکانی قەرەهەنجیر بریتی بوون لە: کوێخا سەمین، کوێخا خەسرەو سەمین، کوێخا خورشید کاکەخان، کوێخا عەلی فەتاح).

*** گوندی سیامەنسور:**

بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی دانیشتووانی بریتی بووە لە (٣٣٦) کەس، (١٥٣) نێرو (١٨٣) مێ، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٤٣٨) کەس بووە، کە (٢٢٢) نێرو (٢١٥) مێ بووە.

بنەرەتی ناوەکە (سیاە منصور)، ناوی هۆزێکی کوردییە لە ئاقاری زنجان، ئەو شێوە زمانەی کە قسەی پێدەکەن (گۆرانی)یە، هەندێکیان هەر لەکۆنەوە هاتونەتە عێراق‌و ئەو گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوە لەگەڵ دێیەکانی دەورووبەری، کەلەدواید هەندێك لەسەرۆکی عەشیرەتی تاڵەبان دەستیان گرتووە بەسەر ناوچەکەیاندا.

*** گوندی تۆپزاوەی حوسێن بەگ:**

دەربارەی بنەرەتی ناوەکە چەند راوبۆچوونێك هەیە کە مامۆستا جەماڵ بابان وا بۆی دەچێت:

"ناوەکەی ئارامییەو بنەرەتەکەی (تاب–زاوا) کە مانای چاکی شێوە،، بەڵام لەزمانی کوردیدا، وەرگێرانی وشەیی ئەم ناوە (گوبز–اوا)، (توبز–اوا) کە مانای ئەو شوێنەیان ئەو گوندەی کە ئاوەدانکراوە کە لەبنەرەتدا(دوبز–اوا) بوو بێت کە مانای ئەو گوندەی کەوتووەتە سەر رووبار یان لقی رووبار".

بەڵام مامۆستا جەمال رەشید وا بۆی دەچێت:

"لەو نێوە جوگرافییەی سەردەمی هورییەکان، کە تا ئەمرۆش لەناوچەی کوردەواری هەرماون، نێوی (توپزە) کە ئەمرۆ تۆپزاوەی پێدەڵێن، برگەی یەکەمی دەبێتە بەشێك لەنێوانی جوگرافیایی دێ وەکو (تۆپ–پیپا)، (تۆپ–کی–شینی)".

بەڵام لێرەدا لەوانەیە رایەکەی مامۆستا جەمال رەشید راستتر بێت، چونکە هورییەکان زیاتر باڵا دەستیان هەبووە بەسەر ناوچەکانی کوردستان تاوەکو ئارامییەکان، بۆیە ناوی (تۆپ زاوە) لەزۆربەی شوێنە ئاوەدانەکانی هورییەکان لەکوردستاندا هەیە، ئەم گوندە دووری لە قەزاکەوە ١٠ کیلۆمەتر، ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ (١٢٨٠) کەسە کە (١١٤٧) کەسی نێرو (٦١٩) کەسی مێ، بەڵام بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ بریتی بووە لە (١١٥٢) کەس، کە (٥٦٤) کەسی نێرو (٥٨٨) مێیە.

*** گوندی شۆراو سدیق بەگ:**

(٦) کیلۆمەتر لە پارێزگاکەوە دوورە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، (٣٢٩) کەس بووە، کە (١٦١) نێرو (١٦٨) مێ بووە، لەسەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا (٩٥٨) کەس بووە کە (٥٠٠) کەسی نێرو (٤٥٨) کەسی مێ بووە.

ژمارەی خانووەکان ٥٠٠ ماڵ دەبوو، زۆری خەڵکەکەی لەکۆمپانیای نەوتی کەرکوك ئیشیان دەکرد، لەگەڵ هەندێکی بە جوتیاری، ئەم گوندە سدیق بەگ ئاوەدانی کردووە، لەسەردەمی تورکەکانەوە، مردووە کچەکەی جێگەی گرتووە، بەناوی شەفیقەخان، کە حوکمی شۆراوو گورگە چاڵی کردووە. ناوی ئەم بیرە نەوتە تا ئێستا پێی دەڵێن بیری شۆراو، دەگەرێتەوە سەردەمی عوسمانییەکان.

ناوچە بەناوبانگەکانی شۆراو: شەخسی شێخ سمایل، کانی شیرمە، چەم حەوزەکە، گردی شناوە، تەپە قووت لەسەر رێگای ئالتون کۆپری، چەم گاوردامی، لۆدەی دایك پاشا، چەم گۆمە حەسیرەکە، شیوە گەراوەکە، شیو جەهەنەم، زەوی سەکۆ، ئەیبری قایە، قایە قران، نیسکەو چولکە، هێستر

تۆپیو، زەوی کەڵەکاوی، زەوی زایر...، بەڵام ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٦٣)دا ڕووخێنرا.

*** گوندی یارەلی:**

(١٠) کیلۆمەتر لە پارێزگاکەوە دوورە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ (٢٧٠) کەس بووە، کە (١٣٤) نێرو (١٣٦) مێ بووە، لە ساڵی (١٩٥٧)دا ژمارەی دانیشتووانی (٢٥٠) کەس بووە، کە (٧٧) نێرو (١٧٣) کەسی مێ بووە.

ناوچە بە ناوبانگەکانی یارەلی: شیوەکانی مێرووله. گرد قەڵغانلو، شاخە سوورە، بەرنەجار، شیو سەیلاو. پاڵەگەورە. کەل سایە، گرد کونە ڕێوی، تەلانی حەمە ئاغا. زەوی جولەکە. تەپەی شاڵچی، قەرنە تەپە، ئاسیاوگاور. بەرحەیدەر بەگ، کەل گاور، خۆش، شاخ فاتەخان، گۆڵ ئینگلیزەکان. دەشتی عەتار، کفرەدۆڵ، کونە کەمتیار، تەپەقووت. ئامۆزا کوژراو، سەیلاو، سەنگەسار، قەرەتاج، ئاسیاوی باشدە گیرمان، گرد باشدە گیرمان، سێ کەڵەك، پەچەقایە، مەرقەد ئیمام غەبیو مەرقەد یارەلی.

مەلا بانگاوبانگەکان: مەلا عەبدوڵڵا، پێش ساڵی (١٩٥٨) لە دێ مەلا بووە، مەلا ڕەشید پیرداود کە لەبنەرەتدا دزەیی بوو، مەلا سەید ئەحمەد کە لەبنەرەتدا خەڵکی قووش قایەبووە، حکومەت لە ساڵی ١٩٦٣دا کوشتیان.

کوێخاکانی: کوێخا حاجی منار خەلیفە، کوێخا ئەحمەد غەفور، کوێخا مدحەت ئاغا. چایخانەکان بریتی بووە لە: چایخانەی مەنار، چایخانەی سەید قادر.

*** گوندی ترکەلان:**

(١٠) کیلۆمەتر لە پارێزگاکەوە دوورە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، (٨٤٠) کەس بووە کە (١٦٨) نێرو (١٨٨) مێ بووە، بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، (٨٥١) کەس بووە، کە (٤٢٨) نێرو (٤٢٣) مێ بووە.

شوێنەکەی پێی دەوترێت (یۆرغان تەپە-وێران شار) کە دەکەوێتە لای خوارووی ڕۆژئاوای کەرکوکەوە، ئەم گردە لەکاتی خۆیدا شارێکی ئاوەدان بووە لەناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین لەسەردەمی هورییەکان کە پێی وتراوە نوزی، بەردەوام بووە تا سەردەمی ئاشورییەکان، بەڵام لەسەردەمی ئەکەدییەکان بەناوبانگ بووە بە گاسور.

شوێنەکان، تەپە جەلاو، مەرقەد سەید موسا، مەرقەد سەید عەلی، کارێز مەحمود ئاغا، کارێز سەید عومەر.

*** گوندی کۆچەکی گەورە:**

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، (٢٦٤) کەسە کە (١٣٧) نێرو (١٢٧) مێیە، لە ساڵی (١٩٥٧)دا (١٦٩) کەسە، کە (٨٥) نێرو (٨٤) مێیە.

ناوچە ئاوەدانەکانی: بابۆك، قەلانجە، ئاسیاوسەنگەسار، ئاسیاو شێخ مەحمود، شیوتۆرکە، کوونە کەمتیار، گرد پاڵەگەورە، شاخ بەلاڵوك، شیو بایخانەکە، کانی چك، شیو پەڵکانە، چاڵەوا، قەڵای عەلی قووت.

*** گوندی زەردك:**

مامۆستا جەمال ڕەشید دەڵێت:

"لە نووسراوەکانی بێستووندا نێوی سەرۆکی هۆزی (نەساگاریت)ی ماد (چیژان تاخما) کە لەناوچەی هەولێردا بەرهەڵستی دارای هەخامەنشی کردووە، بە ئەکەدی لەهەمان نوسراودا بەشێوەی (شیشیرانتاخمو، شیشیرانتاخما) بەرچاو دەکەوێت و دەنگی (س) لەنێوەی هۆزەکەشدا بە دەنگی (ز) گۆڕاوەو نێوەکەی بووەتە (زیگیرتو، زیکیرتو)، بەهەمان جۆر نێوی قەڵای (سردەککە) بەشێوەی (زردییەکە) دەگۆڕێت، کە ئەمڕۆ لەکوردی دا بووەتە (زەردەك).

بۆیە زیاتر ڕێی تێدەچێت کە بنەرەتی ناوەکە بگەڕێتەوە ئەو کاتە، ئەویش بەڵگەی نزیکی ئەو گوندەیە لەناوچەی هەولێر.

*** گوندی دوویز:**

بنەڕەتی ناوەکە لەزمانی کوردیدا (دووبز)ە، کە پێکهاتووە لەدوو بەش (دوو-بز) کە بز بەمانای لق دەگەیەنێت، کە مانای ئەوە دەگرێتەوە کە دوو لق لەوێدایە، ئەویش زێی بچووك دەبێتە دوو بەشەوە (لقەوە).

زمانی ئەم ناوچەیە بەلوتکە دەڵێن (یۆز) ئینجا لەوانەیە (دوو یۆز) بوو بێت، کە دەکەوێتە نێوان دوو لوتکەی شاخەکەدا.

یان لەوانەیە لە (دوو - بست)ەوە هاتبێت، چونکە ناوچەیەکی بچووك لەنێوان هەردوو لقەکەدا.

*** گوندی ترکەشکانی خواروو:**

یەکێکە لەو گوندانەی کە سەر بە ناحییەی لەیلانی پارێزگای کەرکووکە. ئەم گوندە نزیك بە کارگەی چیمەنتۆی لەیلانە کە بە دووری ١٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە خوارووی شاری کەرکووك. گوندی ترکە شکان لە دوو بەش پێکهاتووە، ترکە شکانی خواروو، ترکە شکانی سەروو، ترکە شکانی خواروو پێش ئەنفال نزیك ٨٠ ماڵی لێ بووە، کە بژێوی ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە، ئێستاش لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق و ڕزگارکردنی شاری کەرکووك لەلایەن خەڵکە ڕەسەنەکەیەوە ئاوەدانکراوەتەوەو زیاتر لە ٤٠ ماڵی لێ نیشتەجێیە، مێژووی ئەم گوندە ئەگەڕێتەوە بۆ ٢٥٠ ساڵی پێش ئێستا، ئەم گوندە لە چەند عەشیرەتێك پێکهاتووە، زەنگەنە، بەیات، پاڵانە.

ناوی ئەم گوندە لەوەوە هاتووە کاتی خۆی تورك لێرە شەڕی کردووەو شکاوەتەوە، بۆیە ناویان ناوە ترکە شکان- تورك شکان، لەوانەیە ناوەکەی بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شەڕی سەفەوی و عوسمانییەکان.

*** گوندی یەنگیجە:**

یەکێکە لە گوندەکانی قەزای داقووق لەگەڵ گوندەکانی (عەبدوڵڵا غانم، عەنانە- سنوور، کلێسە)و بە ناوچەی تاڵەبانیش ناسراون، ئەم گوندە لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە قەزای داقووقی پارێزگای کەرکووکە، سێ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە، هەروەها بە دووری نزیکەی چل کیلۆمەتر دەکەوێتە

باشووری شاری کەرکووکەوە. ئەم گوندە زیاتر لە ٤٠٠ ماڵی لێ نیشتەجێیەو نزیکەی ٣٠٠ کەسی تێدا دەژێت، گوندی یەنگیجە دوو قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان و کچانی تێدایەو قوتابخانەیەکی ناوەندی و ئامادەیی تێدایە، کە زۆربەی مامۆستاکانیشیان خەڵکی گوندەکەیە خوێندنیش هەر بە زمانی شیرینی کوردییە.

ناوی ئەم گوندە ناوێکی تورکی کۆنە بە مانای (شەوێکی تازە) دێت کە لێرە خەوتوونە ناویان ناوە یەنگیجە.

وەك من لە بیرم بێت ئەم گوندە چەند تیرەیەکی تێدا دائەنیشێت وەك (گۆمەیی، زەنگەنە، جاف، دلێم کە برا عەرەبەکانن). ئەم گوندە هەتا ساڵی ١٩٥٩ قوتابخانەی تێدا نەبووە، خانووەکانی هەمووی قوڕ بووە لە ساڵی (١٩٥٦) یەکەمین قوتابخانەی بۆ کراوەتەوە.

زەوی و دەشتەکانی حەویجە بە دەستی خەڵکی ئەم گوندەوە بووەو بووە بە لەوەرگایەك بۆ ئاژەڵەکانیان.

هیچ عەرەبێك لەم گوندە نیشتەجێ نەبووە، خەڵکی ئەم گوندە لە وەرزی بەهاردا دەچنە حەویجەو لەوێ دەوار هەڵدەدەن و لەوێ خەریکی مەڕو ماڵات دەبن تاکو بەهار تەواو دەبێت دواتر دەگەڕێنەوە بۆ گوندەکەی خۆیان.

ئەم گوندە دوو شوێن هەیە بەم ناوەوە کەیەکێکی لە قەزای دووزو ئەوی تر لەناحییەی داقوقە لەسەرژمێری ساڵی ١٩٤٧دا، ٣٥٨ کەس بوو، ١٥٦ نێر، و ٢٠٢ مێ، لەسەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا ٥٥٠ کەس بووە کە ٢٩٥نێرو ٢٥٥ مێیە.

"...ئەم گوندە لە ساڵی ١٩٥٤ دروست کراوە لەلایەن (غانم) ناوێك لەنزیك گردی (پیر ئەحمەد)، لەسەر ڕێگای (کەرکوك- بەغداد)، کە لە نزیکی ئەم خانووە خانێك هەبوو بەناوی (خان گولو)، تاکو ئێستا پاشماوەی هەر ماوە، لە ساڵی (١٩٥٢)دا یەکەم قوتابخانەی یەك پۆلی لێکرایەوە، لە ساڵانی (١٩٥٥- ١٩٥٦) قوتابخانەیەکی تری لێ دروست کرا، کە پێکهاتبوو لە شەش پۆل لەگەڵ شوێنی خەوتنی مامۆستایان، لە ساڵی ١٩٥٧ بنکەیەکی تەندروستی لێکرایەوە، لە ساڵی (١٩٦٠)دا قوتابخانەی سەرەتایی کچانی لێکرایەوە، لە ساڵی (١٩٧٠) قوتابخانەی (التربیة الاساسیة)ی لێکرایەوە.

لە ساڵی (١٩٦٩)دا، یەکەم تیپی تۆپێنی لێکرایەوە کەیەکەم تۆپێنیان لەگەڵ تیپی (مەلا سەفەر) لەقەزای دووز کردو هەردوولا یەکسان بوون.

*** گوندی ئەلی مەسور - عەلی مەنسور:**

کەوتووەتە باشووری شاری چەمچەماڵەوە دوو سەعات بەپێ دوورە لە چەمچەماڵەوە، (شیوە سوور) کەوتووەتە نێوانیان، هەروەها بەگوندی (پیریادی)دا دەڕۆی بۆ (ئەلی مەسوور) پاش حەفتاکان شەقامی قیرتاو کرا لە چەمچەماڵەوە بۆ سەنگاو بەناو شیوە سووردا، بەڵام شەقامەکە ناڕوات بەناو دێی (عەلی مەسوور) بەڵکو بەقەراغیدا دەڕوات.

(ئەلی مەسوور) دێیەکی ناخۆش بوو، بەهاران کێچی وا زۆری هەبوو کەس نەیدەتوانی لەناو دێیەکە بمێنێتەوە، بۆیە لەوەرزی بەهاردا خەڵکەکە دەچوونە دەشتی (بەرزایی) دۆشنیامەت و لەوێ هەرکەس چیغی هەڵدەدا دوو مانگ لەوێ رایان دەبووارد ئەمجا دەڕۆیشتنەوە بۆ ناو ئاوایی.

ئەلی مەسوور بێ ئاو بوو، هاوین کانییەکیان هەبوو بەناوی (کانی پەڵکاوە) ئاوەکەی ناساز بوو و پڕ بوو لە (زاڵو).

سێ خێڵی جیا.. جیا لە (ئەلی مەسوور) دەژیان و هەمیشە شەڕو ناخۆشی و پیاو کوشتن لەنێوانیان بەردەوام بوو. کوێخای دێیەکە کوێخا حەوێز بوو، لەپیاوە ماقوڵەکانی (دەروێش چەچان)و (عەلی محە) بوو.

ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) بریتی بووە لە (١٩٣) نێرو (٢٠٤)مێ کە کۆی گشتی (٣٩٧) کەس بووە،، بەڵام بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) بریتی بووە لە (١٩٥) نێرو (١٦٥) مێ کە کۆی گشتی (٣٦٠) کەس بووە.

*** گوندی قەرەتامۆر:**

هاوسێیە لەگەڵ (عەلی مەسوور)و لەتەنیشتییەوەیە کە نزیکەی هەشت ماڵێك دەبوو، خەڵکی قەرەتامۆر لەئاوی شیوە سوور ئاو دەخۆنەوەو کانیشی تێدا هەیە.

ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧)، (٢١٥) نێرو (١٩٠) مێ بووە، کە کۆی گشتی (٤٠٥) کەس بووە،، بەڵام بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) بریتی بووە لە (١٦٩) نێرو (١٣٣)مێ و (٣٠٢) کەس کۆی گشتی بووە.

*** گوندی موفەر - مظفر:**

گوندی سەیدەکانی پیریادی بووە لەپاشان هەمەوەند داگیری کردو مشویر حەمە ئاغاو براکەی سلێمان حەمە ئاغاو هەروەها فاتح موشیر ئاغا باجیان لەدانیشتووانی گوندەکە وەرگرتووە هەتاوەکو سەردەمی شۆڕشی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨).

لە چلەکان و پەنجاکانا موفەر (٦٠ - ٧٠) ماڵ دەبوون، دووکان و باغی گەورەی تیادا هەبوو، باغەکەی (مامە سەید کەریم)و باغەکەی (سەید حەکیم) هەردوو باغەکان بەتەنیشت یەکەوە بوون لەسەر ڕێگای (قەرە حەسەن)، زۆر کارێزیان هەبوو هەروەها دارتووەکانی هەردوو باغەکە زۆر بەناوبانگ بوون چونکە زۆر گەورە بوون، هەنجیرو قۆخ و هەڵوژەیەکی زۆری تیادا هەبوو، هەروەها بەناوبانگ بووە بە(تەماتە)و (باینجان)و (بامییە).

بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) ژمارەی دانیشتووانی بریتی بووە لە (١٥٦) نێرو (١٤٩) مێ، کە کۆی گشتی (٣٠٥) کەس بووە.

*** گوندی شۆراو:**

دێیەکی بچووك بووە لە (بازیان)، کەوتووەتە تەنیشت دێی (خاڵدان)، گوندێکی کۆنەو هی کەریمە ڕەشی هەمەوەندە ئاوەکەی شۆڕەو نزیکەی (٢٥) ماڵ دەبوون، لەچلەکانداو لەپەنجاکاندا ئاغاکەی کەریمە ڕەشی ڕەسوڵ بوو.

بەپێی سەر ژمێری ساڵی (١٩٥٧)، ژمارەی دانیشتووانی بریتی بووە لە(٥٦) نێرو (٧٠) مێ و کۆی گشتی (١٢٦) کەس بووە.

*** دێی قەرەدەرە:**

قەرەدەرە دێیەکە لە دێهاتەکانی سنووری دووبز بە ٥ کیلۆمەترێك دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دووبزەوە. لە سەرەوەی ڕێگای سەرەکی نێوان کەرکوك- دووبزە و لەکەرتی کشتوکاڵی ٤، ٥، ٦ دایە ١٨٥٧٨ دۆنم زەوی هەیە. لەسەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧ سەرجەم دانیشتووانەکەی ٥٢٧ کەس بوونەو ٢٢٠ نێر ٣٠٧ مێ، هەموو دانیشتووانەکەی ئیسلامو کوردن و سوننە مەزهەبو لەسەر عەقیدەو ڕەوشتی ئیمامی شافعین.

ئەو دێیانەی ئەکەوێتە سەرووی ڕێگای کەرکوك- دووبزو خواروی زورگی کانی دومەلانەوە، لە ڕۆژی (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) لەلایەن دەسەلاتدارانی حکومەتی عێراق و چەکدارانی عەرەبی حەرەس قەومییەوە سووتاوەو ماڵو موڵکی کوردان تاڵان کراوە. دانیشتووانەکەی دەربەدەری کوچەو کۆڵانی شارو شارۆچکەکان کراوە، بە هەر حاڵ قەرەدەرە لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمەوە بە قەرەدەرەی شێخ تاهیر ناوبراوە، شێخ تاهیر.

(شێخ تاهیر شێخ سەعید ساڵەیی):

کوری شێخ سەعیدی کوری شێخ سەعدەدینی ساڵەییەو لە ساڵی ١٨٨١ لە دایك بووەو لە (٢٣)ی تەموزی ساڵی (١٩٥٩) لە دێی قەرەدەرە مردووەو هەر لە گۆرستانی دێیەکەدا نێژراوە، لە سەردەمی ژیانیدا هەردەم خاوەن قۆناغو دیوەخان و چاوتێرو نان دەرەبووەو، هاوسەردەمی شێخ مەحمودی نەمرو سەید ئەحمەدی خانەقاو خدری پاشای هەولێر بووە، بەچەند سوارێکەوە لەگەڵ شێخی نەمر بەشداری شەری جیهانی یەکەمی لە شوعێبەی بەسرا کردووە.

وا زاندراوە قەرەدەرە پێش ناوەراستی سەدەی نۆزدە ئاوەدانکراوەتەوە هەڵبەت ئەو ئاوەدانکردنەوەیە یەکەم جار نەبووە، لە دەوروبەری دێی قەرەدەرە چەند شوێنەوارێکی کۆنە دێی تر هەیە.

هەرچەندە قەرەدەرە لە پێشدا ناوی شیوەرەش دەبێ و ئاسەواری ئەم دێیانەی بەدەوردا بووە لەوانە: حەماومردی، کەلەشخان، هەورەشین، حوسێن جەلە، دێیەکی تر لەسەر ڕێگای کتکە-قەرەدەرە ناوی لەبیرکراوە، ئەو دێیە بنەماڵەی سەفەر جانکەی ساڵەیی لێی دانیشتووەو ژیاوە، دیارە بەهۆیەك لەو هۆیانەی باس کراوە ئەم دێیانە چۆڵکراوەو چەند بە چۆڵی ماون نەزاندراوەو پاش چەند وەختو سەردەمێك لە پێش ساڵی (١٨٤٥) بنەماڵەو خێزانی ئەو جوامێرانە بەهۆی دۆستایەتی و تێکەڵاوی و خزمایەتییەوە دێن و شیوەرەش ئاوەدان دەکەنەوە لەوانە بنەماڵەی شێخ سەعید شێخ سەعدەدین و محەمەدی برای بەخێزانییەوەو بنەماڵەی محەمەد رەشان ساڵەیی و سلێمان مەحمود ساڵەیی و باو باپیرانی خالید محەمەد سەعیدو سمایل میکائیل جبرائیل و عەبدوڵلای فەقێ محەمەد ساڵەیی و کاکەی مام زۆراب و لەگەڵ چەندین بنەماڵەی سەرپەرزی تر ناویان لە بیری خەڵکەکە نەماوە هاتوونەو لەو دۆڵو کەندو شیوی ڕەشدا هەر یەکەو لە پەنا پەسیوێکەوە کونجێك دەکەن و سەر بەیەکەوە دەنێن و لە ترسی زوڵم و زۆری زۆرداران بە برسێتی و نەبوونی و شەونخونی، قۆڵ و بازوی لێ هەڵدەماڵن و شەویان بەپاڵ ڕۆژەوە ناوەو ئارەقیان ڕژاندووەو خۆیان ژیاندووە، خۆشی و تەبابی و خاوێنی ئەو دێیە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دەنگی داوەو زۆر باسی لێوە کراوە تا دێی شیوە ڕەش بە قەرەدەرەی تورکی گۆردراوەو ناوبراوە.

دانیشتووانی ئەو دێیە تا هەڵاتنی ساڵی ١٩٦٣ خۆی لە ١٨٠ خێزان و ماڵێك بە سەرەوە داوە، وەك دەیزانین لەو مێژووە حکومەتی عێراقی بە هێزێکی زۆری سەربازو حەرەس قەومی ڕوو لە دێیەکە دەکەن و پاش بەرگرکردنێکی کەم لە لایەن دانیشتووانی دێیەکەوە نەتواندرا بەر پەرچی ئەو هێرشە بدەنەوەو لە ئەنجامدا هاوڵاتییەك بە ناوی قادر حەمە سەعید ئەحمەد شەهید دەبێ و هاوڵاتی نەجمەدین عەبدوڵڵا بریندار دەبێ دێیەکە چۆڵ دەکەن و لەلایەن سوپاو حەرەس قەومییەکانەوە دێیەکە تاڵانکراوەو سووتێنراوە دانیشتووانەکەش دەربەدەر بوونەو زۆر لەوان تا لە ناوچوونی ڕژێمی بەعس نەگەرانەوە ئەو هەوارە، لە پاش چۆلکردنی دێیەکە داردەستەی بەعس چەند تیرێك لە هۆزی جبورو دلێمی نەتەوەی عەرەب بۆ سنوورەکە دێنن و دێی قەرەدەرە بێ بەش نابێ لە عەرەبی هاوردە، هەردوو شێخی ئەو دوو تیرەیە بە ناوی موزهر ناسر ئەلجبوری و شێخ سەببار ئەلدلێمی و داردەستەکەیان لە خوارووی ڕێگای سەرەکی کەرکوك- دووبز، جێنشین دەکرێن و کێڵگەو زەوی و بانی ئەو سنوورە دەکێڵن تا ساڵی (١٩٧٠) لەوێ دەمێننەوە، لەو مێژووە بەدواوە لەسەر بودجەی بەناو (اعمار الشمال) ٧٠ خانووبەرە بۆ دانیشتووانی ئەو دێیە کە لە ساڵی (١٩٦٣) دەرکرابوون دروست دەکرێ دوور لە شوێنی کۆنە دێیەکە بە دوو کیلۆمەترێك لە خوارەوە، لە پاش تەواوبوونی ئەو خانوانە لە ساڵی (١٩٧٣) دابەش کرا بەسەر خەڵکی ڕەسەنی دێیەکە هەرچەندە زۆر لەو خێزانانە دێیەکەیان جێ هێشتبوو خانووی بەرنەکەوت، وەك لەو سەردەمە دواتر ئەوانی خانویان بەرنەکەوتووە بۆ قۆناغێکی ترماوە.

لە بەهاری ساڵی (١٩٧٤) بە دواوە حکومەت وەك بە بیانووبێ هەر جارەو چەند خێزانێکی عەرەبی سنوورەکەی بۆ دەناردن و ئاژەڵدارییان دەکردو زەوی و کێڵگەی کوردی بەسەردا دابەش دەکردو تا جێگای کوردانی سەغڵەت کرد، هەر لەو ساڵەدا ڕژێم خێزانێکی زۆری عەرەبی خوارووی عێراقی بۆ دەوروبەری کەرکوك هێناو چەند خێزانێکی لەوانە بەر دێی قەرەدەرە دەکەوێ و ئەو هاوسێیەتییەی کوردو عەرەب زۆر ناخایەنێ دانیشتووانە ڕەسەنەکە چۆڵی دەکاو عەرەبی سوونەو شیعە دەبن بە خاوەن زەوی و بانی دێی قەرەدەرە.

ناوەراستی ساڵانی هەشتاکان بە زۆری زەوی و زارو کێڵگەی خوارووی ڕێگای کەرکوك- دووبز لە سنووری دێهاتەکانی دووبز بەر پرۆژەی ئاودێری دەکەوێ و لە بەنداوی دووبزەوە ئاوی دەگاتێ و دەبێت بە بەراو زیاتر دڵگیرو خۆشەویست تر دەبێ لە دڵی ئەوانەی کە بە موڵکی باو باپیرانی خۆیانی

دەزانن لە داگیر کەران.. ئەم دەسەلاتەو ئەو سەلتەنەتە رابردوویانی لەبیر بردبۆوە تا ناوەراستی بەهاری سالی (٢٠٠٣) رۆژیان لە ناوەراستی ئاسمان دابوو ئەستێرەیان دەدرەوشایەوەو شیرو شمشێریان هەوری رەشی دەهێنایە خوارە.

هەر لەگەڵ رووخانی رژێمی بەعس لە رۆژی (١٠)ی نیسانی سالی (٢٠٠٣) داگیرکەرانی سنوورەکە دێی قەرەدەرە هەریەکەو بەلایێکدا قۆچاندی و کەس فریای کەس نەدەکەوت و هەر باب و خێزانی خۆی پێ پارێزگاری دەکرا، دێیەکە چۆڵدەکەن و خەلکە رەسەنەکەی دانیشتووانی پێشوی قەرەدەرە ئەوەی بە ژێیان مابوو هەر زوو گەرانەوە کۆنە هەواری کاولکراو، بێ ئەوەی کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر ماڵ و حالی جێهێشتراوی داگیرکەران تا پاش چەند رۆژێك و پاش هێوربوونەوەی وەزعەکە هاتوونەتەو بردوویانە.

سالی (٢٠٠٥) لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی و لەسەر بودجەی کۆمەلەو رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان و لە دێی قەرەدەرە (١٦٢) خێزان کۆمەك کراوە هەر خێزانی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بە مەبەستی دروستکردنی خانوبەرەو گەرانەوەی دانیشتووانە رەسەنەکە بۆ زێدی باو باپیرانیان، ئەمە جگە لەوەی (٣٩) خێزانی تری رەسەنی دێیەکە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر کۆمەك کراون و هەر خێزانەو بری ١٥ ملیۆن دیناری عێراقی پێ دەدرێ بۆ هەمان مەبەست.

*** دێی قەلا عەربەت:**

قەلا عەربەت، پێی دەوترێ حاجی عەلی محەمەد عەبدوللا بەهرام (بارامە کوردە) کە خۆی و باوکی لە دایك بووی ئەو دێیەن، وا زانراوە ئەم قەلای عەربەتە بەناوی ئەو کۆنە قەلایەوە نراوە کە شوێنەوارەکەی بە تەنیشت دێی قەلا عەربەتی بەر لە رۆژی (٦)ی حوزەیرانی سالی (١٩٦٣) بووە (شوێنەواری ئەو کۆنە قەلایە تا ئەم سەردەمەش زۆر بە باشی بەرچاو دەکەوێ)، دیواری هەموو ژوورەکانی ئەو قەلایە تا سالی (١٩٥٢) مەترێك بەرزی بەسەرەوە مابوو لەو دەم مندالان رۆژانە بە بەرچاومانەوە یاریان لەسەر دەکرد وەك گۆرەپانێکی بەرینی مندالان وابوو، لە سالی (١٩٥٥) محەمەد سالح سۆفی دانیشتووی دێیەکە بەردی ئەو دیوارەی هەموو بە قۆنتراتچییەکی کەرکووکی فرۆشت و دووبارە ئەو بەردانەیان کردووەتەوە بە بیناسازی لە کەرکووك وەك زانیویە، پانی دیواری قەلاکە (٨٠) سم بووەو پانی قەلاکە (٤٥-٥٠) مەترێك بووەو درێژی خۆی لە (١٠٠) مەترێك داوە، وەك مەزەندە کراوە (١٤- ١٥) ژووری تێدا بووە، لە خواروی رۆژهەلاتی قەلاکەوە بە ٢٠ مەترێك کانییەکی پڕ ئاوی لێیەو لەسەرەتای هاوینی ٢٠٠٨ ئاوی لەبەر دەرۆیی و سالانی زوو ئاوی زۆر لەم سال زیاتر بوو، وەك مام حاجی عەلی کوردە دەلێ: بە ٢٠٠ مەترێك لە سەرووی ئەو کانییەوە کانی زەوی (زەهاو)ی لێیە ئاوی ئەو کانییە کەمترە، بەلام وەك دەلێن ئاوی هەردەم لێ نەبراوە، کوێخا شەریف پیاوێکی بەتەمەن و دانیشتووی دێیەکە، وەك کاك حاجی باسی دەکا بەر لە سالی (١٩٠٠) لە سەردەمی دەسەلاتی عوسمانییەکان کوێخا شەریف کوپێکی ئالتوون لە زەوی زەهاو دەدۆزێتەوەو لە ترسی دەسەلات دارانی تورك نەیزانیوە چۆنی سەرفوسون بکات و بەناوی بێنێ، لەوە دوا خۆی گەیاندووەتە پیاوێکی دارودەستەی عوسمانی بە ناوی (حوسێن ئاغای قەرە) دانیشتووی کەرکوك بەیەکەوە تاوتوێی دەکەن و بەحەکیمانە دەی خۆن و هەردوولا سوودی لێ وەردەگرن، کاك حاجی عەلی لە رێگای حەسەنی کوری کوێخا شەریف کە هاوتەمەنی خۆی بووە لایەکی لەو کوپەیە دەبینێ کە ئالتوونەکەی لە ناودا دۆزراوەتەوە، لەوەش پاش حوسێن ئاغای قەرە خۆی دەکات بە خاوەنی ئەو دێیەو وا خۆی لای خەلکانی ئەو دێیە پیشان داوە کە زەوی و زاری ئەو دێیە تاپۆی بە ناوی ئەوەوەیەو کوێخا شەریفی کردووە بە راوێژکاری خۆی لە دێیەکەدا.

دێی قەلا عەربەت پێش ئاوەدانکردنەوەی لەو جێگایە لە دوو جێگای تر لە دەوری ئەو قەلایەدا شوێنەواری کۆنە دێی قەلا عەربەتی لێ بووەو بە سالاچووان لەوەوپێش زۆر باسیان لێوە کردووە وتوویانە جێگای ئەم دێیە هەوارە بەچۆلی نەبیندراوە هەردەم ئاوەدان بووە، قەلا عەربەت لە سەرووی دێی مەرعی و قوشقایە دایە لەناو هەلەتی زوورگی دوومەلانە، لە کەرتی کشتوکالی (٩)یە و (١٧٧) دۆنم زەوی هەیە.

لە سەرژمێری سالی (١٩٥٧) سەرجەم دانیشتووانی دێیەکە ٤٥٣ کەس بوونە ٢٢٦ نێرو ١٤٥ مێ، رۆژهەلاتی دێی قەلا عەربەت سنووری دێی قووتان خەلیفەیە، سەرووی سنووری دێهاتەکانی پردێیە، رۆژئاوای سنووری دێی عەمشەو مەرعییە، دێیەکە بەر لەوەی لەلایەن حکومەتەوە چۆلبکرێ خۆی لە ٣٠ خێزانێك بەسەرەوە داوەو ژیانێکی باشیان بە جوتیاری و کشتوکال و ئاژەلداری و خواردنەوەی ئاوی هەردوو کانی (قەلاو، زەهاو) بە بەختەوەری و بێ خەم نانیان بۆ خێزانی پەیدا کردووەو بەستی ماندوویان لەسەر زگی تێر داناوە تا بەنارەوا لەگەڵ حکومەتی عێراق لێیان قەوماوە، خەلکە سەربەرزەکەی ئەو دێیە لەو دەمەی دێیەکەیان چۆل کراوە تا لە ناوچوونی رژێمی بەعس کەسێك لەوان نەیتوانیوە بۆ جارێك رووبکاتەوە دێیەکەو بەو عەقارو سنوورەدا بروا، ٣٠ خێزانێکی دێی قەلای عەربەت وەك دانیشتووانی دێهاتەکانی تری سنوورەکە بەر هەلمەتی کۆمەلەو رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە دەکەن هەر خێزانەو بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدەدرێ بۆ دروستکردنی خانووبەرە لە کۆنە هەوارو گەرانەوەیان بۆ دێیەکە هەرچەندە ٣٠ خانوو دروست دەکەن، بەلام لەیەك خێزان بەولاوە نەگەراوەتەوە دێیەکە، لەگەڵ ئەوەی رێگای قیری کۆمپانیای نەوت دەمێکە بەناو دێیەکەدا دەروا، لەم سەردەمە بە هەولی بەرپرسانی کۆمیتەی رێکخستنی دووبزو لەلایەن مەلبەندی دووی رێکخستنی کەرکوکی ی. ن. ك. ئامێری بەرهەم هێنەری کارەبا و بیری ئاوی خواردنەوەی چەند خێزانێکیان بۆ دابین کراوەو هەر لەوە پاش بیری ئاوی خواردنەوەی ئیرتیوازی بۆ دێیەکە هەلکەندراوەو برياريشە هێلێکی کارەبای سەرەکییان

بۆ دابین بکرێ لەلایەن دەزگا پەیوەندیدارەکانەوە.

*** دێی قوتان خەلیفە:**

دانیشتووانی سنوورەکە بەتایبەت بەساڵاچووانی دێی قوتانەکان لایان وایە وشەی قوتان لە گردۆڵکەی قوتە قوتەکانی هەڵەت و هەردی سەروو رێگای کەرکوك- دووبزو خواروی زورگی کانی دوومەڵانەوە هاتووەو بەناوی ئەو گردە قوتانەوەیە ئەم چەند دێیە قوتانی ناونراوە، قوتانی گەورە زۆر کۆنەو کەسێك لە دانیشتووانی ئەو سنوورە مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نەزانیوەو نەزاندراوە.

لەو بارەیەوە میر قوتان بەر لە هاتنی ئیسلام بۆ سنوورەکە ئاوەدانی کردووەتەوەو بنیاتی ناوە، ئەوەشی بە ئاماژەی کتێبی (ستارەی تابان دەر عشائر کوردستان) نووسینی (محەمەد تاجانی) بە زمانی فارسی، دێی قوتان خەلیفە کەوتووەتە سەرووی رۆژهەڵاتی دێی قوتانی گەورەو لەناو شیو و دۆڵی هەردوو گردی زورگی دوومەڵان دایەو لە کەرتی کشتوکاڵی یەکەو (٧٥٦٤) دۆنم زەوی هەیە.

لە سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) سەرجەمی دانیشتووانەکە ١٥٠ کەس بوونە لەوانە ٧٧ نێرو ٧٣ مێ، ئەم دێیە لە دەورووبەری ساڵانی (١٨٤٠- ١٨٥٠) مام خەلیفەی کوڕی سمایل بەگی شوان لە دێی سمایل بەگی ناحییەی شوانەوە بۆ ئاژەڵداری دێ و لە هەڵەو دۆڵ و شیوی سەرووی دێی قووتانی گەورەو خواروی زورگی دوومەڵانەوە لەسەر ئەو کانی و کانیاو و پاوەندوو لەوەرگایەدا بەتەنیشت گردی خەزنە (خەزنەکە) هەوارە بەهار هەڵدەدەن و ئەو دۆڵە ئاوەدان دەکەنەوە لەوێ دەمێننەوەو هەواریان لێ خۆشدێ و خانوبەرە دەکەن و قوتان خەلیفەی ناو دەنێن، سمایل بەگی باوکی بەر لەو دێی سمایل بەگی سنووری شوان ئاوەدان دەکاتەوە، مام خەلیفە کە لە دێی سمایل بەگەوە دێتە خوار دوو کوڕی خۆی بە ژن و ماڵی لەگەڵ هاتووەو خاوەن ماڵاتێکی زۆر دەبن و ئەو هەوارە ئاوەدان دەکەنەوەو لەوە پاش چەند ماڵ و خێزانی تر دێن بە تەنیشتیانەوە جێنشین دەبن، لەوانە بنەماڵەی مام حەسەن عەلی بە (حەسەنە لاڵ) ناودەبراو بنەماڵەی حەمە رەمەزان و چەندین خێزانی تری کوردەواری ناودار هاتوونەو لەگەڵیان جێنشین بوونە.

گردی خەزنە کە دەکەوێتە لای رۆژهەڵاتی دێیەکەوە، وەك دەگێڕنەوە بەر لە ئاوەدانکردنەوەی ئەو دێیە خەڵکان زێڕو ئاڵتونێکی زۆریان لە دەورووبەری ئەو گردە دۆزیوەتەوەو لەوەوە ناونراوە گردی خەزنەکە، لەسەر گردەکە شوێنەواری چەند گۆڕێکی لێ بەدی کراوەو بە ساڵاچوان بینیویانە، بەڵام کەسێك نەیزانیوە گۆڕی کێن کێ لێنێژراوە، لای رۆژئاوای دێیەکەو لە سنووری نێوان قەڵا عەربەت و قوتانی خەلیفەو قوشقایەی کۆن ئیمامێکی لێبووە بەناوی عەساف جازی (عصاف حجازي) ئەم عەساف حجازییە بە درێژای رۆژگار لە دەمو زاری کوردان سوواوەو عەساف جازی لێ ماوە، و هەر ئەوەندە زاندراوەو بیستراوە ئەم عەساف ناوە لە حیجازەوە هاتووەو لەو سنوورە مردووە، بە بەختی ژنان هەر ژنێ منداڵی نەدەبوو دەچوو بۆ زیارەتی ئەو گۆڕەو بەسەریدا بازبازێنی کردووەو لە پاشان زگی بووە، دانیشتووانی ئەم دێیە خنجیلانە کوردەوارییە زیاتر لە ١٠٠ ساڵێکە لەسەر ئەم شیو و دۆڵ و کەندو کانیاوەدا بە ئاژەڵداری و جوتیاری لە زستانی ساردو هاوینی گەرمدا ژیاون و ژیانیان بەسەر بردووە.

لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق و لە ساڵی (٢٠٠٥) دانیشتووانی دێیەکە بەر کۆمەکی رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان دەکەون و ٦٩ خێزان هەر خێزان و بری (٥٠٠٠) دۆلای پێدراوە بۆ دروستکردنی خانوو لە دێیەکەو گەڕانەوەیان و ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە. لەگەڵ ئەوەی ئاوی خواردنەوەی بۆ دابین کراوە لەلایەن پەرەپێدانی پارێزگای کەرکوك و رێگای قیری کۆمپانیای نەوت بەناو دێیەکەدا دەڕواو تا ئەم دەمە ٤ خێزان گەڕاونەتەوەو کەسابەتی ئاژەڵداری و جوتیاری دەکەن. سەبارەت بەو دێیانەی رۆژهەڵاتی دێی قوتانی گەورەو خەلیفەکە کەوتونەتە سنووری موحەرەماتی نەوت.

لە رۆژهەڵاتی سنووری هەردوو دێی قوتانی گەورەو قوتانی خەلیفە ئاسەواری کۆنە دێیەکانی هەنجیرە، خان باجوان، چۆپلیجە هەیە کە بەر لە ساڵی (١٩٦٣) ئەم دێیانە ئاوەدان بووەو کوردی تێدا ژیاوە،، بەڵام لەوەدوا لەگەڵ دێیەکانی تری ئەو بنارە چۆڵ کراون، لە پرۆسەی ئازادی عێراق بەدواوە لەلایەن کۆمەڵە و رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکانەوە (١٢١) خێزانێك لە دانیشتووانی ئەو دێیانە کۆمەك کراون و بەرامبەر بە کۆنە مەعەسکەری کەرکوك (فیلق) لە سەرووی رێگای کەرکوك- دووبز زەوییان بۆ دابین کراوەو هەر خێزانێك بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بە مەبەستی دروستکردنی خانووبەرە بەهۆی ئەوەی زەوی و زاری سنووری ئەو دێیانە کەوتووەتە ناو محەرەماتی نەوتەوە، نەدەبوو بچنەوە جێگاو شوێنی خۆیان، لەوانە ٣٥ خێزانی دێی هەنجیرەو ١٥ خێزانی دێی خان و ٧١ خێزانی هەردوو دێی باجوان و چۆپلیجە، ئێستا خانوبەرەی باشیان لەوێدا دروست کردووەو زۆر خێزانی ئەو دێیانە وا لەوێدا نیشتەجێن.

*** دێی قوتانی گەورە:**

سنووری ئەم دێیە لای رۆژهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ سنووری موحەرەماتی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك (بابا گوڕ گوڕ)، دێیەکە ئەکەوێتە سەرووی رێگای کەرکوك- دووبز، سنووری دێی قوشقایە لە رۆژئاوای قوتانەو خوارووی سنووری دێی عەلاوە مەحمودە.

وەك باس دەکەن لە سەردەمی دەسەڵاتدارانی تورك شارێی سوپای عوسمانی بە تەنیشت دێی قوتانی گەورەوە رۆیوە لەنێوان کفری و خورماتوو وپردێ و هەولێرو بەولا ترەوە، بۆ هێنان و بردنی پێداویستی سوپاکە.

قوتانی گەورە لە کەرتی کشتوکاڵی ٣ دایەو ٤٢٩٦ دۆنم زەوی هەیەو لە سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧) سەرجەم دانیشتووانی دێیەکە کە ژمارەیان ٢٤٤ کەس دەبێ و ١٣٢ نێرو ١١٢ مێیەو لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا ئەم دێیە ژمارەیان گەیشتۆتە ٧٤٨ کەس لەوانە ٣٧٣ نێرو ٣٧٥

مێ وەکو وتراوەو بیستراوە ئەم دێیە سێ جار چۆڵکراوەو لە جێگایەکی تر ئاوەدانکراوەتەوە، دەڵێن یەکەم جار لە کۆتایی ساڵانی (١٧٠٠) یا لە سەرەتای ساڵانی (١٨٠٠)دا چۆڵکراوە، بەڵام چەنێ بە چۆڵی ماوە نەزاندراوە، لەوەدوا کە ئاوەدانکراوەتەوە، قوتانی باینجانییەکانی هەمەوەندی پێوتراوە ئەو قوتانەش بۆ و کەی چۆڵکراوە نەزانراوە. پاش چەندە وەختو ساتێك مام قادر گەوهەر دەلۆیی بە خاو خێزانییەوە بۆ ئاژەڵداری لە سنووری ئێستا ئێران– عێراق لە ناوچەی نەوت شاو، نەوت خانەی ئەمرۆی قەزای خانەقینەوە دێنو لە نزیك ئاسەواری کۆنە دێی قوتانی باینجانییەکان لە لەوەرگاو پاوەنی ئەو شیوو دۆڵەو لەسەر ئاو و کانیاوی حەمامێك هەڵیان داوەو ئاژەڵیان لەوێ بەناو هێناوەو لەوەری ئەو هەردوو دەشتەیان بەدڵ بووە لەوێ ماونەتەوە، دێیەکەیان بە ناوی کۆنە دێی قوتانەوە ناوناوە (قوتانی گەورە) لەوە دوا ئەم بنەماڵەو خێزانانە هاتوونەو هاوسێیەتی ئەوانیان کردووە لەوانە بنەماڵەی مام قادر عەبدوڵڵا بە (قادر عەبۆ) ناو براوەو بنەماڵەی وەلی مام برایمی دەلۆیی و مام ئەحمەد حەنیف بلباس باوك (مامە دەمە)و مام ڕەشید خەلیفە هەمەوەندی باوك (مام جوامێر)و چەند ماڵو خێزانی تری کوردەواری و خانەدان لە دێیەکەدا نیشتەجێ دەبنو بە ئاژەڵداریو جووتیاریو کشتوکاڵو کرێکاری نانو ژیانی ئەو سەردەمەیان پێکەوەناوە، لە سنووری ئەو دێیە لەلایەن کۆمپانیای نەوتەوە ٢٠ چاڵی نەوتی لێ دۆزراوەتەوەو هەڵکەندراوەو لەوە بەدوا ٢٠ کەسێك لە خەڵکی دێیەکە لە کۆمپانیای نەوت دادەمەزرێنو کاردەکەن.

دانیشتووانی دێی قوتان تا ساڵی (١٩٥٢) بە ئاوی کانیاوی حەمامۆك پێداویستی ژیانییانو مەڕو ماڵاتیان دابین کردووەو لەوە بەدوا کۆمپانیای نەوت وێستگەیەکی کۆکردنەوەی نەوت لە سنوورەکە دروست دەکاو دانیشتووانی دێیەکە بە هەمووان بۆرییەکی ئاو بۆ ناو دێیەکە دێننو پێداویستی ئاوی خواردنەوەی ڕۆژانەیان دابین دەکەن.

لە کاتی چۆڵکردنو سووتاندنی دێیەکە لەلایەن دوژمنو بکوژی مرۆڤەوە زیاتر لە ٨٥ خێزانی تێدا ژیاوە، پاش پرۆسەی ئازادی عێراق بەدواوەو لە ساڵی (٢٠٠٥) لەلایەن کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان ٦٩ خێزانی ئەو دێیە بەر کۆمەك دەکەویو هەر خێزانێكو بڕی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدەدرێ بۆ دروستکردنی خانوبەرە بە مەبەستی گەڕانەوەیانو ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە، لەوەودوا ٦٩ خانوبەرە بەرز دەکەنەوەو لەلایەن ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر ٢٠ خێزانی تری دانیشتووی ئەو دێیە هەر خێزانەو بڕی ١٥ ملیۆن دیناری عێراقی پێدراوە بۆ هەمان مەبەست، لە ئێستادا ٨٩ خانوو بەرز کراوەتەوەو ٥ خێزان گەڕاوەتەوە دێیەکە.

وەك دەزانین پاش ئەوەی ساڵی (١٩٦٣) دێهاتەکانی ئەم سنوورە زۆری بەر شاڵاوی حەرەس قەومی کەوتووەو دێهاتەکان چۆڵکراوەو ساڵی ١٩٦٤ حکومەت عەرەبێکی دلێمی زۆری بۆ ناوچەکە هێناو بەم دێیانەدا دابەشی کردووە خێڵێکی عەرەبی دلێم بەر دێی قوشقایە دەکەونو کێڵگەو زەویو زاری سنووری دێی قوتانی گەورەش دەدرێ بەوان، شێخو دەم سپی ئەو خێڵە ناوی شێخ عەلی دلێمی دەبێ، شەهید مامە دەمەش پاش ئاگادار کردنەوەی سەرووی خۆی لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول هەڵساوە بە ئامادەکردنی ئۆتۆمبیلێك نزیك لە شێوەی ئۆتۆمبیلی پۆلیسی ئەو سەردەمو نزیك لەو بۆیاخە بۆیاخی کردووەو جلوبەرگی شەش پۆلیس پەیدا دەکاو خۆی جلوبەرگی (مفوض)ی پۆلیسی ئەو سەردەم لەبەردەکاو پاش ئێوارەیەکی دڕەنگ بەو ئۆتۆمبێلەو پێنج پۆلیسو چەکی پۆلیسی ئەو سەردەمەوە خۆی دەکات بە دیوەخانی شێخ عەلی لە دێی قوشقایەو خۆی بە شێخ دەناسێنێ کە سەرۆکی مەفرەزەی پۆلیسی ناحییەی دووبزەو دەڵێ وا خەبەر بە پۆلیسی دووبز دراوە کە دوێنی شەو درەنگ چەند تەقەیەکی نادیار لەم سنوورە کراوەو بە دارودەستەو جەماعەتی تۆ زاندراوە ئەبێ هەر چەكو چەکدارێکت هەیە بێن لەم دیوەخانەدا کۆببنەوەو بۆ دووبزیان دەبەمو جەنابیشت لەگەڵماندا دێی، شێخ زۆری لا ستەم دەبێو نارەزای خۆی دەردەبڕێ، مامە دەمە عەرەبی لەهجەی حەویجەی زۆر باش زانیوەو هەستی پێ نەکراوە کە عەرەب نییە بە زوبانی خۆی بە شێخی دەسەلمێنێ هەموو چەکدارەکان کۆببنەوەو تاقییان دەکاتەوەو کام چەکی تەقەی کردووە تەنها خاوەند ئەو چەکە دەبا بۆ دووبز لەگەڵ جەنابی شێخ دا، شێخ بەوە قایل دەبێو دەنێری هەموو چەکداران لەوێ کۆدەبنەوەو بەناوی تاقی کردنەوەی کام چەك تەقەی پێکراوە هەر چەکی باشە ئەیداتە لاوە تا دوایی سەرۆکی مەفرەزە مامە دەمە بە شێخ دەڵێ هەموو خاوەن ئەو چەکانەی شکی لێ دەکرێ تەقەی پێکراوە با سواری ئۆتۆمبیلەکە بنو دەیانبەم بۆ بنکەی پۆلیسی دووبز ئەوەش دیسان نارازی دەبێو دەڵێ کەس نایێت تەنها خۆم نەبێ مامە دەمەش مەبەستی هەر ئەو و چەکە باشەکان دەبێو پێی دەڵێ باش لەبەر خاتری جەنابت ئەوان با نەیەن تەنها خۆت وەرە لەگەڵ ئەو چەکانەی شکی ئەوەی لێدەکرێ کە تەقەی پێکراوە، مامە دەمە لەبەینی خۆیو شۆفێرەکەوە سواری دەکاو ئەو چەکە باشانەی هەڵی بژاردووە گوایە تەقەی پێکراوە لە ئۆتۆمبیلی دەخاو لەدێ دەردەچن ڕوو لە دووبز هەندێك دەڕۆن پاشان لادەداتە سەر ڕێگای خۆڵ ڕوو لە هەڵەتو زورگی دوومەڵانو بەرەو دێهاتەکانی دوورە دەستی حکومەت دەڕۆن شێخ هەست دەکا ئەمە پیلانەو دەکەوێتە جولەو مامە دەمەش ڕای دەگرێو بەرەو شاری خامۆشانو کفن پۆشانی دەنێریو ئەو چەکانەش لەو دەم زۆر بەسوود دەبێو هێزی پێشمەرگە سوودی باشی لێ دەبینی.

*** دێی قوتانی بچووك:**

قوتانی عەرەبیشی پێوتراوە، لە دەورووبەری ساڵی (١٩٢٠) پاش گرانیو جەنگی جیهانی یەکەمو پاش ڕێگا پێدانی هەردوو دەم سپیو پیاو ماقوڵانی دێی قوتانی گەورە عومەر بەگ نەوتچی کە زۆری زەویو زاری ئەو دێیە تاپۆی ئەو بووەو مام محەمەد ڕەمەزان قادر، هەردوو برا محەمەد عومەرو عەزیز عومەر لە تیرەو هۆزی عەبدەلی نەتەوەی

عەرەب بە حەمە لێلەو عەزە لێلە ناودەبران و ناسرابوون. بە ناوی دایکییانەوە بانگ دەکران، بۆ ئاژەڵداری هاتوونەو لەو سنوورە لە دۆڵ و شیوو کەندەکانی سنووری دێی قوتانی گەورە رەشماڵیان هەڵداوەو سەردەمێك لەوێ ماونەتەوەو هەر ئەو جوامێرانە رێیان داون لە ناو زەوی تاپۆی عومەر بەگ خانو دروست کەن و لەوێدا بمێننەوە. ئەمە بەر لە هاتنی کۆمپانیای (لاین) بۆ عێراق بە مەبەستی رووپێوی و پێوان و نەخشە رێژی زەوی و زاری سەرانسەری عێراق.

بنەماڵە عەرەبەکان چەند پارچە زەوییەکی کورد لە سنووری دێی قوتانی گەورە دەکڕن و لە کاتی هاتنی (لاین) بۆ سنوورەکە لەسەر خۆیانی تاپۆ دەکەن و لەوەدوا ئەو جێگای رەشماڵ و ماڵانە لە نوسراوی فەرمی دەوڵەت ناونراوە (قوتانی گچکە)و، بەڵام زۆری زەوییەکانی ئەو سنوورە تاپۆی بەناوی عومەر بەگەوە مابۆوە.

قوتانی گچکە بە چەند سەت مەترێك ئەکەوێتە رۆژئاوای قوتانی گەورە لە سەرووی رێگای کەرکوك- دووبز لەکەرتی کشتوکاڵی ٢ دایەو ٥٤٦٤ دۆنم زەوی هەیە، لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)دا سەرجەمی دانیشتووانی دێیەکە ٨٣ کەس بوونەو ٤٣ نێرو ٤٠ مێ، لە ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ چۆڵکردنی دێیەکانی ئەو بنارە ئەو چەند ماڵە عەرەبە هەر لەوێ دەمێننەوەو کەسێك بە لایاندا نەچووە خۆیان ئاغاو خۆیان کویخا تا کۆتای ساڵی ١٩٧٥ پاشان بە ئەمرو بڕیاری بەعس لەوێ دەگوازرێنەوە بۆ خوار رێگای کەرکوك- دووبز بە پەنجا مەترێك، لەو دەم ١٣ خێزانێك بوونەو سنووری دێیەکەیان فراوان تر بۆوە هەر چەند ئەوەندەی نەبردووە چەندین خێزانی عەرەبی هاوردەی خوارووی عێراقیان هێناوەو بە تەنیشتی ئەوانەوە لەو خانوانەی سەردەمی خۆی لەبابەت کۆمەڵگا دروست کرابوو لەلایەن رێکخراوی (الاعمار الشمال)دا نیشتەجێ کرد، ئەو جێگایەشیان ناونا (دێی قوتانی عومەر بەگ)، ئێستا لەم سەردەمە تەنها بەرەی محەمەدو عەزیز ٢٢ خێزان بەسەرەوە دەبن.

* گوندی زەهرا:

ئەم دێیە هەرچەندە لە پێشدا خانووەکانی دروست کراوە،، بەڵام دانیشتووانەکەی لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٤)و سەرەتای ساڵی (١٩٧٥) رژێم لەقەزای عەفەجی پارێزگای دیوانییەی خوارووی عێراقەوە بە مەبەستی بە عەرەب کردنی ناوچەکە هێناوەو لەو کۆمەڵگاو دێهاتە تازە دروستکراوانەی خۆیان بەم ناوانە ناویان ناوە وەك کۆمەڵگەی (نەسری ئالبدێر)و دێی (زەهرای ئالبدێر) کۆمەڵگای (شەلامچەی ئالبدێر)، بەو شوێنانەدا دابەشی کردوون و کێڵگەی ئاودێری هاوینەو زستانەی بەسەرییاندا بەش کردووەو شێخ و ناوداری دانیشتووی ئەم دێیە (زوبێد کەریم عوگڵەو محەمەد نەففات جەبباره)ن و زیاتر لە ٥٠ خێزانێك ئێستا لە دێیەکەدا ماون، دانیشتووانی ئەم سێ کۆمەڵگایەی لە سەرەوە ناوی هاتووە لەگەڵ نەمانی بەعس لە رۆژی (٩)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣) تاقی لە سنوورەکە نەماو ماڵ و حاڵیان هەمو جێهێشت و پاش ئارامی و هێوربوونی ناوچەکە گەڕانەوە بۆ جێگای خۆیان، دانیشتووانی ئەم دێیە زۆربەیان بە جوتیاری و ئاژەڵداری لە ناو موڵکی عومەر بەگدا دەژین و مردویان بمرێ لەم سنوورە ناینێژن و ئەیبەنەوە وڵاتی خۆیان، هەر لەو رۆژەی حکومەت هێناویانی بۆ سنوورەکە ئاو و کارەبای بۆ دابین کردوون و رێگای سەرەکی کەرکوك-دووبز بە تەنیشتیانەوە دەڕواو خوێندنگای سەرەتایی لە دێیەکەدایە لەگەڵ دێی قوتانی عومەر بەگ تەنها رێگایەکیان نێوانە.

* گوندی قوشقایە:

(قوش-قایە) وازاندراوە لە سەردەمی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانییەکان ئەو ناوەی لێنراوە، بەر لەو ناو چی ناو بووە نەزاندراوە، ئەوەی بە چاوبینراوەو لەوەپێش بەساڵاچووان و پیاوانی بە تەمەنی ئەو دێیە بیستویانەو وتراوە جێگاو شوێنی دێی قوشقایەی پێش رۆژی (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) بەر لەوەی باوباپیرانی ئەوان ئاوەدانی کەنەوە شوێنی کۆنە شار بووەو جێگای قشڵەو گومەت و شوێنەواری کۆنە دامو دەزگای ناحییەی لێ بەرچاوکەوتووەو دیار بووە، پیاوانی بە تەمەن وا دەگێڕنەوە لە سەردەمی تورك لە دەوروبەری ساڵانی (١٨٩٠) یەکێك لەو گومەتانە زۆر بە باشی ماوەو بنەماڵەی مام عەزیز شەریف شوان یەکەم جار هاتوونەتە دێیەکەو لەبەر بێ جێگاو شوێنی لەو گومەتەدا نیشتەجێ بوونە، تا چۆڵکردن دێیەکەش هەر بە گومەتەکەی عەزیز شەریف ناودەبراو بەناوبانگ بوو، ئەو گومەتانەی دەزگای حکوم بووە لەوەپێش، مام سمایل محەمەد دانیشتووی رەسەنی دێیەکە ئەڵێ دیواری بناغەی کۆنە ناحییەکە مابو ئێمە لە تەمەنی منداڵی رۆژانە یاریمان لەسەر دەکرد، لە ناوەڕاستی دێیەکە گۆڕو مەرقەدی شێخ سوڵتان ناوێکی لێیەو دانیشتووانی دێیەکە بۆ سەرئێشەو لەرزو تا چوونەتە سەری و زیارەتیان کردووەو ئاژەڵیان تووشی نەخۆشی بهاتبایە بە دەوری گۆڕەکەیدا ئەیان گێڕاو بەرەو ماڵیان دەبردەوەو بڕیاری خێرێکیان بۆ داوەو نەخۆشی لە ئاژەڵەکەدا نەماوە، بە وتەی مام سمایل،، بەڵام کەس نەیزانیوە ئەو شێخ سوڵتانە کێیەو لە کوێوە هاتووە، کێڵگەو زەوی و زاری ئەم دێیە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی بەپێی ئەوەی تورکە نەوتچییەکانی کەرکوك لە دامو دەزگا حکومییەکان دەسەڵاتدار بوونەو توانیویانە سەرتاپای ئەو زەوییانە بەسەر بنەماڵەی (نازم بەگی حوسێن پاشای نەوتچی) تاپۆ بکەن، لە ساڵی (١٩٥٤) (برایم بەگ) و (تایر فەندی) کوڕی هەموو زەوییەکان لە حوسێن بەگ ئامۆزای نازم بەگی حوسێن پاشای نەوتچی دەکڕنەوەو تا ئەم رۆژ تاپۆی بە ناوی ئەوانە.

قوشقایە لە کەرتی (١٠)ی کشتوکاڵیدایەو (١٣٤٦٧) دۆنم زەوی هەیەو لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) هەمووان (٤٦٢) کەس بوونە، لەوانە (٢٢١) نێرو (٢٤١) مێ.

قوشقایە ئەکەوێتە پادەشتی گردۆڵکەی قوتە قوتەکانی بناری زورگی دومەڵانەوە، لە سەرووی رێگای کەرکوك- دووبز، رۆژئاوای سنووری دێی مەرعییە، خوارووی سنووری دێی چەغماغەو سابونچی و ئیدریسە، رۆژهەڵاتی

سنووری دێی قوتانی گەورەو بچووکە، لە دەورووبەری سەرەتای سەدەی نۆزدەم بنەماڵەی (مام قادر حەسەن) جێگاو شوێنی ئەو کۆنە ناحییەیە ئاوەدان دەکەنەوە،، بەڵام ئەو کۆنە ناحییەیەچی ناوبووەو چەندێك بە چۆڵی ماوە لەوە پێش و کێی لێی ژیاوە نەزاندراوە، وا دەردەکەوێ لە پاش ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە دەسەڵاتدارانی عوسمانی هاتوونە قوشقایە، ناوناوە لەوەودوا ئەم خێزان و بنەماڵانە هاتوونە لەگەڵ ئەواندا دانیشتوونە، بنەماڵەی (کوێخا محەمەد کوێخا حەسەن شوانی)و بنەماڵەی (عەزیز شەریف شوانی) و بنەماڵەی (مام سلێمان)و (بایزی) برای (بە سلێمانە کۆر ناوبراوە) لە تیرەی هۆرمزیار بوونەو بنەماڵەی (عەلاوی حوسێن وەیسەی لەك)و بنەماڵی (مام بەهرام بارانی زەنگنە) و چەند خێزانێکی تر لەو دێیەدا بە جوتیاری و ئاژەڵداری ژیاون تا گەشەکردنی کۆمپانیای نەوت، لەوەودواو لە ساڵی (١٩٥٢) دوو بیری نەوت لە سنووری دێیەکە دەدۆزرێتەوەو عەمبارێکی ئاو لەلایەن کۆمپانیای نەوتەوە لە سەرووی دێیەکەوە لەسەر گردۆلکەیەك هەڵدەکەندرێ و دایدەنێن، چەند کەسێك لە کۆمپانیای نەوت دادەمەزرێ و ئاوی خواردنەوەی دانیشتووانەکە بەر لە دروستکردنی ئەو عەبارە لە کنی و بیر بووە،، بەڵام لەوەدوا بە بۆری تا نزیك دێیەکە ئاو هاتووەو خەڵکەکە لەوێ ئاوی خواردنەوەی بردووە.

لە ساڵی خوێندنی (١٩٦١-١٩٦٢) خوێندنگای لێکراوەتەوەو بەر لە کاولکردنی دێیەکە لە رۆژی (٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) دانیشتووانەکەی خۆی لە (٤٧) خێزان داوەو لەو مێژووەو لەگەڵ دێهاتەکانی ئەو سنوورە بەر شاڵاوی بەدناوی حەرەس قەومی عەرەبی دەکەوێ و دێیەکە دەسووتێنرێ و چۆڵدەکرێ.

لە ساڵی (١٩٦٤) حکومەت چەند خێڵێکی عەرەبی دلێمی هێناوە لە دێی قوشقایە داناوەو لە ساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) بە دواوە بەناوی گەڕانەوەی خەڵکە دەرکراوەکانی دانیشتووانی دێهاتەکانی ئەو سنوورە رێکخراوی بەناو (ئیعمار ئەلشیمال) هەڵساوە بە دروستکردنی چەندین کۆمەڵگا لە سنوورەکەو ٤٠ خانوویەك بە سەرەوە بە ناوی دێی قوشقایە لە خواررووی رێگای کەرکوك-دووبز بە ١٠٠ مەترێك دروست کرد، لە ساڵی (١٩٧٤) لە چەند لاوە عەرەبی سنوورەکەو هاوردەی بۆ هێناوە، ناودارانو دەم سپی ئەو خێڵانە لە داگیرکەرانی ئەو دێیە (کەریم عەبد ساری) عەرەبی سنوورەکەو (زیاب حەمود خدر ئەلبو حوسێن) عەرەبی سنوورەکەو (موعللە عەبد شویش) عەرەبی هاوردە بە ١٨ خێزانەوە.

داگیرکەران هەموو دەمێك وەك ئەوەی لە بەهاردا بژێن، بە کێڵگەو زەوی بەراوی کوردو ئاوی پرۆژەی بەنداوی دووبز زۆر باش و دەوڵەمەند بوون، تا پرۆسەی ئازادی عێراق لە بەهاری ساڵی (٢٠٠٣) هیچ خێزانێکی عەرەبی هاوردە لە سنوورەکە نەما، بەڵام خەڵکە سەرەتەکەی پێشوو زۆریان نەماون و ئەوەی کە ماون لەوانە توانای نەماوەو لێکەوتووەو پیر بووەو هەرزەکارانیش ئەو ئارەزوویان نەبو، کە چی لە پاش ئارامی و هێوربوونەی وەزعی سنوورەکە هاوردەکان هەموو گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان لەوەدواو لە کاتی گەڕانەوەی خەڵکە رەسەنەکەی دێی قوشقایە بە مەبەستی نیشانەکردنی جێگای دێیەکەو خانووبەرە لەسەر زەوی خۆیان دوور لەوان، کە چی بوو بە کێشە لەنێوان کوردە دەربەدەرەکەی دانیشتووی پێشووی دێیەکەو عەرەبی داگیرکەری دانیشتووی ئێستای هەمان دێ.

هەرچەندە لە پاش ئەو رووداوە ٧٥ خێزانی رەسەنی دێیەکە کۆمەك دەکرێن لەلایەن رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان و هەر خێزانەو بری (٥٠٠٠) دۆلاری دەدرێتی و هەر لەو جێگایەی کێشەکەی لەسەر روویدا ٧٥ خانوو دروست کراوەو تا ئێستا ٧ خێزان گەڕاوەتەوە دێیەکە.

*** دێی مەرعی:**

دوو بۆچوون هەیە لەسەر وشەی مەرعی یەکەم وا زاندراوە مەرعی لە (مرعی)ی عەرەبییەوە هاتووە، لەوەڕگاو پاوەند دەگەیەنێت بە کوردی، دووەمیان وەك وتراوە مەرعی ناوی پیاوێکی عەرەبەو لەمەوبەر باس لە شۆرەژنی عەرەب (عەمشە) ناوێکمان کردووە کە کانیاوی عەمشەی پاراوکردووەو سەرپەرشتی خێڵێکی عەرەبی کردووە، وەك زاندراوە مەرعی برای ئەو شۆرە ژنەیەو ئەو لە عەمشە ئاژەڵ داری کردووەو مەرعیش لە کۆنە هەواری ئێستای مەرعی ئاژەڵداری کردووە، لەگەڵ عەمشەی خوشکیدا لە سنوورەکە نەماون، ناوی دێی مەرعی ئەبێ لەو مەرعی ناوەوە هاتبێ، لە پاش دەرکردنی ئەو خێڵە عەرەبە وەك لە باسی دێی عەمشە ئاماژەمان پێ کردووە کورد هاتووەو جێگایانی گرتووە، ئاوەدانکردنەوەی ئەم دێیەش هەر لەو سەردەمە بە پاشەوە حەمە بەکری زەنگنەو هەردوو کورەکەی ئەحمەدو کەریم لە (دێی- ئاوایی) عەلی زەنگنەوە هاتوونەو مەرعییان بە مەڕومالاتو خێزانەوە دەرکردووەو خۆیان لەسەر ئەو کانیاوە دانیشتوونەو مەڕو ماڵاتی خۆیان لەو بنارە بە خێوکردووە، جێگای کۆنە دێی مەرعی بە سێ سەد تا چوار سەد مەترێك ئەکەوتە سەرووی رێگای سەرەکی کەرکوك- دووبز، سەرووی مەرعی سنووری دێی عەمشەیە، رۆژهەڵاتی سنووری دێی قوشقایەو قەڵا عەربەتە، خوارووی سنووری دێی چەغماغەو ئیدریس تەمرە، رۆژئاوای سنووری دێی چەغماغەو عەمشەیە، لە ساڵانی (١٨٢٠) بە دواوە بنەماڵەی حەمە بەکر ئەم دێیە لەسەر شوێنەواری کۆنە دێیەکی تر ئاوەدان دەکەنەوە،، بەڵام نەزاندراوە ئەو کۆنە دێیە چی ناوبووەو کێی لێ ژیاوە، تەنها ئەوە دەگێرنەوە بە دووری کیلۆمەترێك کەم تر لای رۆژهەڵاتی دێیەکەوە شوێنەواری کۆنە شارێکیان بینیوە، لەو کۆنە شارەدا شوێنەواری زیندانێك بیندراوە تا ئەو دەمەی دێیەکە چۆڵکراوە ژوورو دەرگاو دیواری بە باشی مابووەوەو بەرچاوکەوتووە، لە لای سەرەوەی زیندانەکە لە شێوەی کونێك شۆردەبێتە ناو ژێرزەمینێك، ئەو جێگایە تا کورد لە سنوورەکە مابوو بە زیندانەکە ناو دەبرا.

لە پاش بنەماڵەی حەمە بەکر بنەماڵەی فەقێ حەسەن و براکانی بەرامبەر بەوان لەو بەری شیوەکەوە خانووبەرە چاك دەکەن و دەبن بە هاوسێی ئەو خێڵەو وەك برا هەموو

پێکەوە لە دێیەکە بە جوتیاریی و مەڕو ماڵات بە خێوکردن و کەسابەتی تر ژیان دەگوزەرێنن.

دێی مەرعی لە کەرتی کشتوکاڵی (٨)ەو (٤٤٨٤) دۆنم زەوی هەیەو لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) سەرجەم دێیەکە ٤٦ کەس بوونە کە ٢٢ نێرو ٢٤ مێ.

لە پاش چۆڵ کردنی دێیەکە لەگەڵ دێیەکانی سنوورەکە حکومەتی ئەو کاتە ٢٠ خێزانی عەرەبی دلێمیو تەمیمی پارێزگای رومادی بۆ سنووری دێی مەرعی هێناو و لە خواروی رێگای کەرکوك–دووبز بە چەند سەد مەترێك نیشتەجێی کردوون، سەرۆکی ئەو خێڵە بە ناوی (ئیبراهیم عەوواد ئەلتمیمی) بووە، تا ساڵی (١٩٦٨) لەوێدا لە رەشماڵو خانوو کەپری قوڕدا ئاژەڵدارییان کردووە.

دەسەڵاتدارانی بەعس لەسنووری ئەو دێیە لە ساڵی (١٩٧٠) تا ساڵی (١٩٨٠) چوار کۆمەڵگای دروست کردووە لەوانە کۆمەڵگایەك بە ٣٠٠ مەترێك لە خواروی کۆنە دێی مەرعییەوە بەناوی کۆمەڵگای (حەتینی سەروو) دابەشی کرد بەسەر خێزانی هەمە چەشنی عەرەبدا، هەر لەگەڵ دروستکردنی ئەو کۆمەڵگایە بە دوو کیلۆمەترێك لە خوار رێگای سەرەکی نێوان کەرکوك–دووبز، کۆمەڵگایەکی تری لەو چەشنەی دروست کرد بە ناوی کۆمەڵگای (ئەلنەسر)و لە ساڵی (١٩٧٤–١٩٧٥) دابەشی کرد بەسەر هۆزی ئالبدێری عەرەبی هاوردەی شیعە مەزهەبی قەزای عەفەجی پارێزگای دیوانییەی خواروی عێراق، کۆمەڵگای سێیەم لە سەرووی کۆمەڵگای ئالبدێر بە ٣٠٠ مەترێكو خواروی رێگای کەرکوك بە کیلۆمەترێك زیاتر بە ناوی کۆمەڵگای (حەتینی خواروو)و دابەش کرا بەسەر خەڵکی هەمە چەشنەی عەرەبو تورکمان، کۆمەڵگای چوارەم بە کیلۆمەتریك زیاتر لە خواروی رێگای کەرکوك–دووبز بەرامبەر بە کۆمەڵگای سێیەمو بەناوی وەزارەتی بەرگی عێراقی بۆ نیشتەجێ بوونی ئەفسەرانی سوپای فەیلەقی دووی سەربازی کەرکوك دروست کرابوو.

لە ساڵانی نەوەتەکانی سەدەی رابردوو کۆمەڵگای ئەفسەران چۆڵ کراو کرا بە شوێنی دەزگای سەربازی، هەندێك لەو خانووانە ئەمڕۆ بنکەی سوپای عێراقییە، هەر لەم سنوورەو لەسەر رێگای سەرەکی کەرکوك–دووبز لە ساڵی (١٩٧٠) بە دواوە حکومەت وێستگەی بەهێزکردنی رادیۆی کوردی بەغدای دروست کردو لە ساڵی (١٩٧٤) کردی بە وێستگەی تەشویشی سەر رادیۆی شۆڕشە کوردییەکان.

لە سنووری دێی مەرعیو قوشقایە چەندین سەربازگەی زەبەلاحو بەندینخانەی سەربازی هەبوو، هەر لەو سنوورە چەند کارگەی گەچی تێدایە.

لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق ئاوردانەوەی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی کۆمەك کردنی ٣٩ خێزانی ئەو دێیەی کردووەو هەر خێزانێك بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدەدرێ بە مەبەستی گەڕانەوەیان بۆ دێیەکە، لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٩) پێنج خێزان گەڕاوەتەوە دێیەکەو ئاوو کارەبای بۆ دابین کراوە.

*** دێی عەلاوە مەحمود:**

وەك دەماو دەم هاتووەو تەمەنداران و بەساڵاچووانی دێی عەلاوە مەحمودی ئەم ڕۆ وا گوێبیست بوونەو زانیوویانە زیاتر لە ٣٥٠ ساڵ لەمەو بەر دووبرا بەناوی عەلیو مەحمود لایانیش وایە ئەو دوو برایە جوولەکە دەبن لەسەر ئاینی (پ. غ) موسا (د. خ)و بێ ژنو منداڵ لە جێگاو شوێنی گولی (ئاغا) کە ئێستا کەوتووەتە نێوان جادەی سەرەکی کەرکووك– دووبزو دێی عەلاوە مەحمودەوە، ئەو دوو برایە کونجە خانووییەکیان کردووەو لەوێدا نیشتەجێ بوونە، خەڵکانی سنوورەکە هەر یەکێك بەو ئەقارەدا ڕۆیوە لایداوەتە لای عەلەو مەحمود بۆ حەسانەوە، دیارە لەو سەردەمەو لەو سنوورە لای عەلەو مەحمود وەك قۆناغێكو جێگای حەسانەوەی کاروانچی دێهاتە دوورەکان بووە، پاش مردنی ئەو دوو برایە، ئەو شوێنە وەکو شوێنەوارێك ناوبراوە شوێنی عەلەو مەحمودی پێوتراوە، چەندێك لەوە دوواتر وەك مەزندە کراوە لە ساڵانی ١٨٢٠ بەدواوە دووبرا بەناوی عیدانە کوردەو کەریم قەیتولی مەڕو ماڵاتو ئاژەڵی خۆیان دێننو نزیك بە کۆنە هەواری عەلەو مەحمود لە بەهارێکی سەوزو تەڕدا ڕەشماڵو چیغی لێ هەڵدەدەنو لەوێدا دەمێننەوە.

چەند وەختێك لەوەدوا عەبدوڵڵا کلیی عەرەب بەخێزانییەوە هاتووەو هاوسێیەتی ئەو دوو برایەی کردووەو کێڵگەی بەناو هێناوەو ئاژەڵداری بەپالەوە ناوەو لە ڕەشماڵدا ژیاوە، پاش سەردەمێكو لەوە بەدوا ئەو جێگایە ناو دێنن دێی عەلاوە مەحمود (عەلەو مەحمود– علو محمود)و پاشان ئەم خێزانانە ڕوو لەوێ دەکەن، هەریەك لە بنەماڵەی کویخا حەمید ڕەمەزان محەمەد هەمەوەندیو عەبدوڵڵای مەلا کەریمو مام سوڵتانی عەبدوڵڵا عەلیو براکانیو بنەماڵەی حەمە ڕەش سەمینو چەندینی تر لەو خێزانە سەربەرزانە بە نەبوونیو دەست کورتیو بە جوتیارییو سەپانیو ئاژەڵداری لەو دێیەدا ژیاون، سەردەمی ڕۆژگاری تورکو دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە زۆری ئاغا و کویخای دێیەکانی سنووری پارێزگای کەرکوك یا تورك بووە یا خۆی بە تورکەوە هەڵواسیوەو سواندووە، لەو ڕێگایەوە دەسەڵاتی بەسەر جوتیارو شوانو گاواندا ڕۆیوە، ئەمەو جگە لە دەسەڵاتدارانی بەرزتر لەو سەردەمە، وەکو دەگێڕنەوە ساڵح پاشای کەرکوك (موتەسەریف– پارێزگار)ی کەرکوك باوك نازم بەگو سابت بەگ ئێستا لە هۆزی نەوتچین، زەویو زارو عەردوبانێکی زۆریان هەبووە لە سنووری دێهاتەکانی سنووری ناحییەی پارێزگای کەرکوکی ئەو سەردەمەو ئێستای دووبز لەگەڵ جەوشو حسارێکی گەورە لەسەردەمی خۆی جێیان هێشتووە لە دێی عەلاوە مەحمود تا ساڵی (١٩٦٠) زۆر بە باشی جێگای دییار بووە، بە ساڵاچوانو تەمەنداران زۆر باشیان لەبیرەو تا ئێستا شوێنی ئەو حەسارە دەزانن، ئەوەش دەگێڕنەوە ساڵح پاشا لە بنەماڵەو خێزانێکی کوردەو لەگەڵ ڕۆژگاردا گونجاوەو خۆی لە تورکان هەڵسواوەو هەر لەبەر ئەو هۆیە ئەو دەسەڵاتو پلەو پایەیەی بەدەس هێناوە، لەوە پاش هۆزو تیرەی نەوتچی خۆی داناوە.

دێی عەلاوە مەحمود بە کیلۆمەترێك زیاتر ئەکەوێتە خوارووی ڕێگای سەرەکی کەرکوك– دووبز، هاوسنووره لەگەڵ دێی باجوان لە ڕۆژهەڵاتەوە، دێ قەرەتەپەو چراغ لە خوارەوە، دێی قوتان لەسەرەوە، سنووری دێی قوشقایەو ئیدریس تەمرو سابونچی لە ڕۆژئاواوە، ئەم دێیە لە کەرتی (٥)ی کشتوکاڵییەو ٨١٥٥ دۆنم زەوی هەیە، لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ سەرجەم دێیەکە ٢١٧ کەس بوونەو ١٠٥ نێرو ١١٢ مێ‌و لەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانەکەی ٢٢٢ کەس بوونە لەوانە ٨٧ نێرو ١٣٥ مێ، ئەم ڕەسەنانە تا ساڵی ١٩٨٧ لە جێگاو شوێنی خۆیان لە دێیەکە نیشتەجێ بوونەو ٨٠ خێزانێك دەبوون لەگەڵ چەند خێزانێکی عەرەبی هۆزی ئەلبوحەمدان ساڵەهای ساڵە ژیاون‌و لەوەو پاش لەگەڵ چەند دێیەکی کوردی تر لە سنوورەکە دەرکراون‌و چەند خێزانێك لەوانە بەرەو پارێزگای ڕومادی دەچێ‌و ئەوانی تر بۆ کۆمەڵگای بنەسڵاوەی هەولێر چوونە.

ئەم خەڵکە نەبەردو قارەمانانە تا ساڵی ٢٠٠٣ لە کوچەو کۆڵانی شاران کەوتوونەو ژیاون لەگەڵ نەمانی بەعس‌و پرۆسەی ئازادی عێراق خەڵکە ڕەسەنەکەی هەروەك بروسك بەیەك‌و دووێك دەگەنەوە کۆنە هەواری کاول کراوو، هاوردەو داگیرکەران لەو ڕۆژەدا خۆیان بەتاوان بار زانیوەو لەشەرمەزاریدا لەوێ نەماون‌و پاشان بە پێچەوانەی داگیرکەران هەرچی خانوبەرەی ئەوان دروستیان کردبوو لەسەر خاکی کورد، خەڵکی بە وێژدانی کورد لێیانی دەکرن نەك داگیری کەن، لەوە دوا لە ساڵی ٢٠٠٥ لەلایەن ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەوە ١٨٨ خێزانی ئەو دێیە کۆمەك دەکرێ هەر خێزانەی بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدەدرێ بە مەبەستی گەرانەوەو دروستکردنی خانوو، لەم مێژووە کە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٩)یە ١٩٧ خێزان لە دێی عەلاوە مەحمود نیشتەجێن لەوانە ٩٣ خێزانی عەرەبی سنوورەکەو ١٠٤ خێزانی کورد، لە رووی خزمەتگوزاری هەرچەند لەسەردەمی پێش پرۆسە ئاو و کارەبای هەبووە،، بەڵام لەوەودوا لەلایەن دەزگای پەرەپێدانی پارێزگاکانەوە ئاوو کارەباو ڕێگای قیرو خوێندنگاو بنکەی تەندروستی بۆ دابین کراوە، زەوی‌و زاری سنوورەکە کە لەوەپێش لە پرۆژەی ئاودێری کەرکوك کرابوو بە بەراو بە زۆری زەوی‌و زاری ئەو سنوورە بەراوەو لە پرۆژەی بەنداوی دووبز ئاوی دەگاتێ، نیشتمان‌و کورد پەروەرانی ئەو دێیە وەکو دانیشتووانی تری دێهاتەکانی ئەم سنوورە لەگەڵ بەرزبوونەوەی بڵێسەی گڕی هەردوو شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی نوێ گەلەکەمان دووره پەرێز نەوەستان، لەو ڕێگا پیرۆزەدا خوێنی گەشی خۆیان بەخشیوە.

*** دێی چراغ:**

تەمەنداران‌و بەساڵاچووانی دێی چراغ تەنها ئەوەندەیان لە باو باپیران زانیوەو گوێبیست بوونە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتدارانی تورك بەر لەوەی خەڵکی ئێستای لێ نیشتەجێبن ئەم دێیەیان بەناوی (چراغ)ەوە ناوناوە،، بەڵام نەیان زانیوە کێی لێی ژیاوە، دێی چراغ دێیەکی چەند ماڵەی عەرەب‌و کوردی تێکەڵاو پێکەوە بەبێ هیچ گرفتێك تا ساڵی (١٩٦٣) ژیاون‌و هەروەها زاندراوە سەردەمێکی زۆر پێش جەنگی جیهانی یەکەم.

بنەماڵەی حوسکە خەلەف عەرەبی تیرەی عەبدالی هۆزی ئەلبوحەمدان هاتوونەو لەم جێگایەدا بنەکەو ڕەشماڵ‌و چیغیان هەڵداوەو کێڵگەیان کێڵیوەو ئاژەڵیان بەناو هێناوە، لەوە پاش بنەماڵەی حەمە بچکۆل (محەمەد فەتاح) لە دێی ئاڵڵایی سنووری تاسلوجەی پارێزگای سلێمانییەوە هاتوونەو بەتەنیشت خێزان‌و بنەماڵەی مام حوسکە خەلەفەوە، وەکو برا هاوسێیەتی دەکەن‌و پێکەوە دەژین.

زەوی‌و زاری چراغ لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی عێراق سەرتاپای تاپۆی بەناوی نازم بەگی کوری سالح پاشای نەوتچی کەرکوك بووە، لەوە پاش لەلایەن (وەزارەتی کشتوکاڵ)وە لە کەرتی کشتوکاڵی ٥ دایەو لەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانەکەی ١٢٩ کەس بوونە لەوانە ٥٥ کەس نێرو ٧٤ کەس مێ.

دێی چراغ لە ڕۆژهەڵاتەوە هاو سنووره لەگەڵ دێی عەلاوە مەحمود، باکووری دێی ئیدریس تەمرو سابوونچیە، ڕۆژئاوای سنووری دێی کەتتاحییەو ڕەملە، باشووری دێی قەرەتەپەی سنووری ناحییەی پایچییە، چەند خێزانێکی کوردی بەرەی حەمە بچکۆل تا ساڵی ١٩٨٧ لە دێیەکەدا نیشتەجێ بوونەو لەوە دوا لەگەڵ چەند دێیەکی تری سنوورەکە ڕژێم ڕاگوێزی کردووەو هەر خێزانەی بە کۆچەو کۆڵانێکی شاراندا پەرتەوازە بوو، تا ئەم سەردەمەش خێزانێکی ئەو بەرەبابە نەگەڕاوەتەوە دێیەکە، دێی چراغ هەرچەندە ڕێگای قیری بەسەرەوەنییە، بەڵام ئاو و کارەبای بۆ دابین کراوە لە سەردەمی بەعسەوە.

ئێستاش ٢٠ خێزانێکی تێدا نیشتەجێیەو زەوی‌و زاری بەراو دەکێڵن‌و گوزەرانیان زۆر باشە، لەگەڵ ئەوەی داورودەستەی بەعس لە ساڵی ١٩٧١ بەدواوە کۆمەڵگایەکی ٤٠ خانوویی بە تەنیشت دێی چراغەوە بەناوی کۆمەڵگای (مەیسەلون) دروست کردوو لە ساڵی ١٩٧٥ خێڵێکی عەرەبی شیعەی هۆزی بەنی تەمیمی هاوردەی پارێزگای کوتی خوارووی هێناو لەو کۆمەڵگایە دایناوەو زەوی‌و زاری کوردانی بەسەردا دابەش کرد، ناوداری ئەو خێڵە (تالی ناسر حەمدی)یە، ئەم هاوردانە لە پرۆسەی ئازادی عێراق دێیەکە چۆڵ دەکەن‌و هەموو گەڕانەوە جێگاو ڕێگای کۆنی خۆیان، لەو دەم نا ئارامییەك هەبوو لە ناوچەکە کورد وەکو پێویست نەیتوانی ئەو هەلە لە دەست نەداو بچێتەوە جێگاو شوێنی خۆیان، و پاش ئارام بوونەوەی باری عێراق بەگشتی‌و ناوچەی کەرکوك بەتایبەتی عەرەبە هاوردەکان هەر هەموو گەڕانەوە ئەو جێگایانەی کە لەوە بەر داگیریان کردبوو، دانیشتووانی دێی چراغ زیاتر لە ٢٠ خێزانێك دەبن‌و هەر هەموو نەتەوەی مام خەلەف عەبدالن، دانیشتووانی (مەیسەلون) ئەوانیش ٢٠ خێزانێك بەسەرەوە دەبن شیعەن، لە رووی خزمەتگوزاری‌و کارەباو ئاو و خوێندنگایان بۆ دابین کراوەو هیچ کەم‌و کوڕییەکیان نییە تەنها جادەی قیر نەبێ، زەوی‌و کێڵگەی بەپیت‌و بەرەکەتیان هەیەو هەموو جۆرە دانەوێڵێك تۆو دەکەن‌و بەرهەمی باش بەدەست دێنن‌و ماڵات بەخێو دەکەن‌و گوزەرانیان زۆر چاکە.

*** دێی نادراوە:**

ساڵی ١٩٤٧ نادر عەلی خدر لە دێی چراغی ئەم سنوورە هاتووەو لە جێگای دێی ئەمرۆی نادراوە بیری ئاو خواردنەوەی هەڵکەنیوەو لەوێدا نیشتەجێ بووە. نادراوەی ناوناوە، باپیری نادر ئەکاتە خدر قادر خدر کەلەموری. مام خدر قادر لە دەورووبەری ساڵی (١٨٧٠) وەك دەڵێن لەدێی ئەڵڵای تاسلوجەی پارێزگای سلێمانی بەخاو خێزان‌و مەڕو ماڵاتەوە هاتووەتە دێی چراغی دەورووبەری کەرکوك سەردەمێکی زۆر لەوێ ماوەتەوەو پاشان نادری عەلی خدر بە خێزانەوە هاتووەتە دێی نادراوەی ئەمرۆ.

نادراوە کەوتووەتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی دووبزو خوارووی ڕێگای سەرەکی نێوان کەرکوك– دووبز، هاوسنووره لەگەڵ دێی شیرناو لە ڕۆژئاواوەو چەغماغەو مەرعی لە ڕۆژهەڵات‌و خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە، قەرەدەرە لە باکوورەوە، لە هۆیەی کشتوکاڵی دووبز کەرتی کشتوکاڵی بۆ دانەندراوەو لە سەرژمێرییەکان سەبارەت بەوەی تازەدێ بووە ناوی لەناواندا نییە، هەر لە سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی دێیەکەوە تەنها ئەو بەرەبابەی لێ نیشتەجێ بووە.

ساڵی (١٩٨٧) ئەم دێیەش لە چەندین دێی تری سنوورەکە ڕاگوێزراوە، لەو دەم دانیشتووانەکەی خۆی لە ١٦ خێزانێك داوە، سەرجەم ئەو خێزانانە نەوەی ئەم سێ برایەن ڕەشید، عەلی، محەمەد کوڕانی خدر قادر، هەر لەگەڵ پرۆسەی ئازادی عێراق ئەم دڵسۆزو خاك‌و نیشتمان پەروەرانە گەڕانەوە کۆنە هەواری کاول کراو لە دەشتێکی بەر بەرەڵڵا لەژێر چادرو ساباتدا ژیاون تا ئاوردانەوەی هەرێمی کوردستان‌و ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان، لەوە پاش کۆمەکی ٢٢ خێزانی دێیەکە کراوەو هەر خێزانەو بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بەمەبەستی کار ئاسانی بۆ گەڕانەوەی خێزانەکان، ئێستا ١٧ خێزان گەڕاوەتەوە دێیەکە، زەوی‌و زاری دێیەکە زۆری بەراوەو لە پرۆژەی ئاودێری بەنداوی دووبزەوە ئاوی بۆ هاتووە، کێڵگەو عەردو بانێکی بەپیت‌و بەرەکەتی هەیەو جێگای پرۆژە ئاودێرییەکە بەتەنیشتی دێیەکەدا دەچێتە خوارێ‌و لە لێوار پرۆژەکە ڕێگایەکی چەو ڕێژ هەیە، دانیشتووانی دێیەکە سوودی هاتووچۆکردنیان لێوەر گرتووە، ئاوی خواردنەوەو کارەبای بۆ داین کراوەو خوێندنگای تێدایە، لەپاش پرۆسەی ئازادی عێراق‌و گەڕانەوەی خەڵکە ڕەسەنەکەو زیادبوونی خێزانەکان ئەم کورد پەروەرانە لە دوولا خانووبەرەیان دروست کردووە، لەمرۆدا کراوە بە دوو دێ، بەناوی نادراوەو دێی ڕزگاری، دانیشتووانی ئەم دوو دێیە بەرەبابن‌و هەموو ئامۆزای یەکن، دانیشتووانی دێی ڕزگاری بەهەمان شێوە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی هەولێر ١١ خێزان کۆمەك کراون‌و هەر خێزانێك بری ١٥ ملیۆن دیناری عێراقی پێدراوە بەمەبەستی گەڕانەوەی خەڵکە ڕەسەنەکە بۆ زێدی باو باپیرانیان، سێ خێزانی دێی ڕزگاری تا ئەم مێژووە گەڕاونەتەوە دێیەکە.

*** دێی شیرناو:**

ئەم دێیە بەناوی کانییەکی ئاوی شیرینەوە لە دەورووبەری دێیەکەوە ناونراوە، لە سنووری دێیەکە چەند کانیاوێکی لێ بووە لە هەمووان شیرین‌و سازگار تر ئەو کانییەیە دێیەکەی بەناوەوە ناونراوەو هەر ئاوی ئەو کانییە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی دێیەکەبووە تا ساڵانی بەر لە گرانی واتە دەورووبەری جەنگی جیهانی یەکەم، لەوە پاش ئاوی ئەو کانییە کەم دەکاو بیری دەست هەڵێنج یان هەڵکەنیوەو پەنایان بۆ چارە ڕێگای تری بەدەست هێنانی ئاو بردووە، ئاوەدانکردنەوەی کۆنە دێی شیرناو لەلایەن بنەماڵەی مەحمود حەسەن لە جێگای ئاسەواری کۆنە دێییەکی تر کە جێگاکەی ئەکەوێتە نێوان سنووری دێی ئێستای شیرناو و دێی تەقتەقە، چۆڵ کردنی ئەو کۆنە دێیە ئەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەدواوە، تا ئەو دەمە وەچەی مەحمود حەسەن لەوێدا نیشتەجێ بوونەو پاشان بەر لە سەدەی بیست ئەو جێگایە بەجێ دێڵن لەجێگای ئێستای دێی شیرناو بنەماڵەی خەلیل کافرۆشی خانوبەرە دروست دەکەن‌و ئەو جێگایە ئاوەدان دەکەنەوە، تا ئێستا ئەو جێگایەی پێشوو بە کۆنە کەلاوەی مەحمود حەسەن ناودەبرێ، وەك باس کراوەو خەڵکان گوێبیستی بوونە کۆنە کەلاوەی مەحمود حەسەن کوڕی سمایل عوزێری (جاف) لەو دێیەو لەم سنوورە ژیاون‌و نیشتەجێ بوونە، لەپاش بنەماڵەی کافرۆشی بنەماڵەی یاسین قادر (یاسین خەجێ)و محەمەد نووری، کەریم حاجی شەریف گاوانی (کەریمە کەر)، عەبدوڵڵای حاجی مەولود (عەوڵڵا کۆر)، سالح دەروێش کەریم، حەسەم زارای کانی مستەفایی، حەمە عەلی، عەوڵڵای عەزیز تورکەیی، حەمەی ڕەزا شۆخی، حاجی مەولود محەمەد گەردی‌و چەندین خێزانی کوردەواری تر لەم دێیە دانیشتوونە، بە خواردنەوەی ئاوی شیرن‌و شوێرو تاڵ بە گەرمای هاوین‌و سەرمای زستان‌و سەوزایی بەهار بە جوتیاری‌و سەپانی‌و کۆکردنەوەی دار سەربەرزانە ژیاون‌و هاوسێیەتی نەتەوەی عەرەبیان کردووەو جۆرەها مامەڵەیان لەگەڵ یەکدابووە تا ڕژێمی بەعس دەریپانی کردووە، شیرناو ئەکەوێتە باشووری شارۆچکەی دووبز، هاسنووره لەگەڵ دێی قەرەچەم لە باکوور، نادراوەو چەغماغە لە ڕۆژهەڵات، سنووری تەقتەق لە باشوور، مامەو ئەبو خورجە لە ڕۆژئاوا، لە سنووری ئەم دێیە ٨ چاڵی نەوتی تێدا بووەو چوار چاڵی تر لەوەدوا دۆزراوەتەوەو ئێستا ١٢ چاڵی لێیە، هەر هەموو ئەو چاڵانە نەوتی لێ دەردەکرێ‌و دەڕوا، بەڵام بێسودە بۆ دانیشتووانە ڕەسەنەکەی، تەنها ئەو سوودەی لێ بیندراوە لە ساڵی (١٩٧٥) سێ جوامێری دانیشتووانی دێیەکە بە تاوانی ئەوەی مینیان لەژێر بۆڕیە نەوتەکانی ئەو سنوورە داناوە لە ناحییەی دووبزی ئەو سەردەم بە بەرچاوی دانیشتووانی دوبزەوە پەتی سێدارەیان بەملدا کراو لە سێدارەدران.

دانیشتووانی ڕەسەنی ئەم دێیە تا ساڵی (١٩٧٥) لە دێیەکەدا بوونەو لەوەدوا سەران‌و کاربەدەستانی بەعس لەگەڵ چەندێکی تری سنوورەکە ڕاگوێزی کردن، تەنها بەدەرکردن فەرامۆشی نەهات بەڵکو ناسنامەی هەموو

ڕەوانەی چەمچەماڵ کرد بۆ ئەوەی خەڵکەکە جارێکی تر ڕوو لە دواوە نەکەن‌و هیچ بیانووی گەڕانەوەی سنوورەکەیان نەمێنێ.

شیرناو لەگەڵ دێی ئەبو خورجە لە کەرتی دووی کشتوکاڵی دایەو لەسەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) سەرجەم دانیشتووانەکەی (٢٦٠) کەس بوونە لەوانە ١٢٢ نێرو ١٣٨ مێ، لە ساڵی (٢٠٠٣) پاش پرۆسەی ئازادی عێراق خەڵکانی ئەو دێیە بەنیازی گەڕانەوەی دێیەکە چەند جوامێرێکی دێی شیرناو بێ‌و چان سەردانی دام‌و دەزگا حکومی‌و حیزبی دووبزیان کردووە بۆ بەدەست هێنانی هەرجۆرە یارمەتێك‌و کارئاسانێك سەبارەت بە گەڕانەوەی دانیشتووانەکەی ئەو دێیە، لە ساڵی ٢٠٠٥ لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئیدارەی سلێمانی‌و لەسەر بودجەی کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان کۆمەکی ٥٦ خێزانی ئەو دێیە کراوە هەر خێزانی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە، لەوەودوا ٥٦ خانوو لە دێیەکە بەرز دەکەنەوەو ئاوی خواردنەوەو کارەبای بۆ دابین کراوەو ڕێگای قیری کۆمپانیای نەوت بە تەنیشت دێیەکە دەڕوا تا ئەم مێژووە هیچ خێزانێکی ئەو دێیە نەگەڕاوەتەوە، ئەوەشمان لەبیر نەچێ خەبات‌و نەتەوەو نیشتیمان پەروەری دانیشتووانی ئەم دێیە پارسەنگ ناکرێت بە هیچ تەرازوییەك بەرامبەر بە هەموو شێوە خزمەتگوزارێك، وەك ڕوون‌و ئاشکرایە فیداکاری‌و لە خۆبردووی عەگیدانی سنوورەکە، تایبەت دێی شیرناو لەریزی هەرە پێشەوەدایەو هەر لەگەڵ سەرەتای ئاشکرابوونی شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی بوێی گەلەکەمان نەبەردان‌و قارەمانی ئەم دێیە خۆیان گەیاندووەتە بەرەکانی جەنگی ڕەوای کوردی، لەورێگا پیرۆزەدا ئەم لەخۆ بوردووانە بەخوێنی گەشی خۆیان سووری دەکەن بەردو هەردی وڵاتیان.

*** دێی ئەبو خورجە:**

خەرەجە (خرجە) وشەیەکی عەرەبییە و کوردییەکەی دەرکەوتن، هاتەدەر، دەرچوو، ئەگەیەنێ هەڵبەت لەم سنوورەو لەوسەردەمە کانیاوێکی زۆر هەبووە لەبناری زوورگی کنگراوەو سنووری ئەو دێیە نوێیە خەڵکان گەڕاون تا بزانن کام لەو کانیاوانە ئاوی زۆرترە، پاش ئەوەی چەند کانییەك لێدەدەن‌و هەڵدەقەنن تاقی دەکەنەوە لەوانە کانییەك ئاوی زۆری لێ دەردەچێ و هەڵدەقوڵێ بەزوبانی عەرەبی ئەڵێن (خرجە- خورج الماء) لەوەدوا دێیەکە بەناوی ئەبو خرجە، ئەبو خەرجە ناودەنێن، پاش چەند ساڵ‌و عەیامێك جرج لە خانووبەرەی ئەو دێیەی دواوەو ژێر دیواری هەڵکەنیوەو ناچار ئەو جێگایەیان بەجێ هێشتووەو چۆڵکردوو نیزگ بەو جێگایە بۆ دووەم جار خانووبەرە چاك دەکەن‌و بۆ جارێکی تر دووبارە چۆڵی دەکەن‌و سێیەم جار لە جێگای ئێستەی دێی ئەبو خورجە خانووبەرە دادەمەزرێننەوە، ئەو خێزان‌و بنەماڵەی ئەو سێ جارە ئەو دێیەی لە دەورووبەرری‌و کانیاوە ئاوەدان کردووەتەوە بنەماڵەی نۆفەل مستەفا عەبد عەبدوڵڵای تیرەی مەلالی هۆزی ئەلبوحەمدان بووەو سەردەمێك کێڵگەو زەوی‌و زاری ئەو سنوورەیان کێڵاوەو

پاشان بە حەسەنە فەندی ئاوچیان فرۆشتووەو لە ساڵی ١٩٤١ ئەو بنەماڵەیە بەرەو دێی سخەرەو کەچەڵنەپەی خوار کەرکوك چوونە، حەسەنە فەنی لەوە پاش ئەو زەوییانە بە سەید مەعروف خاڵی شێخ حوسێنی خانەقای بەخشیوە، ساڵی ١٩١٨ بنەماڵەی مستەفای ئەحمەدە ئەلجومعەی شەممەری لە دێی دووبزو قەرە چەمەوە هاتوونەو لەدێی ئەبو خورجە نیشتەجێ بوونەو لە پاشان چەند ساڵ‌و عەیامێك چەند بنەماڵێکی عەرەبی ئەلبوسحتاگ لە دێیەکانی دەورووبەرەوە دێن لەگەڵ بەرەی مستەفای ئەحمەدە ئەلجومعەدا لە ئەبو خورجە نیشتەجێ دەبن‌و لەسەرەتای ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو بەفەرمان‌و ڕەزامەندی سەید ئەحمەدی خانەقا چەند خێزانێکی کورد دەچن لەدێی ئەبو خورجە تا ساڵی ١٩٦٣ لەوێدا نیشتەجێ دەبن، لەوەدوا بەهۆی ململانێی نەتەوەیی بە ئاسانی نەیان توانیوە لەگەڵ نەتەوەی عەرەبدا لەدێیەکاندا بژین سەبارەت بەو کێشەیە لەدێیەکە دەڕۆن هەر خێزانەو پەراگەندەی شارێك دەبێ، ئەمە ناوی ئەو سەرۆك خێزانە سەربەرزانەن کە لەو دێیەدا بوون‌و ساڵی ١٩٦٣ بەدواوە دێیەکە جێ دێڵن، (سابیر فەقێ سمایل، عومەر سمایل مەنیج، سەلیم کەریم).

دێی ئەبو خورجە هاوسنوورە لەگەڵ دێی قەرەچەم‌و بای حەسەن لەباکوور، دێی مشێرفەر مامە لەرۆژئاوا، تەقتەق‌و شیرناو لە باشوور، نادراوە لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئەم دێیە لەکەرتی دووی کشتوکاڵییە ٧٣٩٣ دۆنم زەوی هەیەو لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانەکەی ٨٨ کەس بوونە لەوانە ٤٣ نێرو ٤٥ مێ، ئێستا دانیشتووانی دێیەکە خۆی لە ٢٢ خێزانێك دەدات‌و هەر هەموو عەرەبن‌و ئاژەڵداری دەکەن‌و هەندێ لە زەوییەکانیان بەراوەو کشتوکاڵ بەبەرهەم دێنن‌و موچە خۆریان تێدایە، خەڵکی ئەو دێیە تا سەرەتای ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو ئاوی کانیاوی سنوورەکەیان خواردووەتەوەو بەو ئاوە ژیاون لەوەدوا بە هۆی ئەو چاڵە نەوتانەی سنووری دێیەکە کۆمپانیای نەوت ئاوی بۆ چاڵەنەوتەکان ڕەوانە کردووە بە لوولەو بۆری ئەوانیش لەو ئاوەیان بۆ دێیەکە هێناوەو لەو ئاوە دەخۆنەوە، جگە لەوەی بیری ئاوی ئێرتوازیان بۆ هەڵکەندراوە لەلایەن میرییەوە، بەڵام ئاوی تاڵە، جادەی قیرو چەورێژی کۆمپانیای نەوت بە تەنیشتی دێیەکەدا دەڕواو هەر لە سەردەمی بەعسەوە کارەبا بۆ ئەو دێیە دابین کراوەو خوێندنگای تێدایە.

لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق خاك‌و گەل پەروەرانی ئەو دێیە لەنەتەوەی کورد پاش ٤٠ ساڵ دوورەوە کەوتن لە سنوورەکەی دۆستایەتی‌و هاوسێیەتی نەتەوەی عەرەب دووبارە دەکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستەش ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان کۆمەکی ٢٣ خێزان دەکات‌و هەر خێزانەی بری (٥٠٠٠) دۆلاری دەدرێتی بۆ دروستکردنی خانووبەرەو گەڕانەوەیان بۆ کۆنە هەوار هەرچەندە تا ئەم دەمە یەك خێزانێکی دڵسۆزو قارەمان گەڕاوەتەوە دێیەکەو ٢٢ خانووی نیوە چڵ بەچۆڵی ماوە.

*** دێی مشێرفە:**

مشێرفە ئەکەوێتە سەر لاشانێك- لاپالێك- بەرزاییەکەو ئەروانێتە دەشتایی مەلحەو عەلەغێرو چیای قەرەچوغ‌و قەرەبۆتك کەندیيناوە. دیارە وشەی (مشیرفە- مشرفە) عەرەبییەو کوردییەکەی (ئەرشوانێ، سەرپەرشتیار، زاڵ) دەگەیەنێ وەك دەڵێ مشرفەی ناو بووەو لە دەمەو زار سوواوەو مشێرفەی لێ بەجێ ماوە.

مشێرفە لە دەوروبەری ساڵانی (۱۹۱۰)ی سەدەی رابردوو بنەماڵەی ساڵحە ئەلجومعەی برای ئەحمەدی ئەلجومعەی ئەبو خورجە (ساڵح جومعە ئەلشەمیری) ئەم دوو برایە دوورو نزیك لەیەکەوە بارگەو بارمەتی ئەو سەردەمییان خستووەو رەشماڵ‌و چیغیان لێهەڵداوەو بە ئاژەڵدارییەوە خەریك بوونەو منداڵ‌و خێزانیان ژیاندووە، لەوە پاش‌و دوای چەند وەختێك بنەماڵەی جەفال غەزال‌و عەباس مەحجوب هاتوونەو بەتەنیشتی ئەوانەوە نیشتەجێ بوونە. لەسەر ئەو باڵ‌و بەرزاییەدا هاووسێیەتی مام ساڵح یان کردووە، نەوەو وەچەی ئەو پیاوانە ئێستا ۲۰ خێزانێك بەسەرەوە دەبن.

مشێرفە بەکیلۆمەترێك ئەکەوێتە سەرووی رۆژئاوای دێی ئەبو خورجە، سەرووی مشێرفە سنووری دێی بای حەسەنە، رۆژئاوای سنووری دێی مەلحەو جەدیدەیە، خوارووی سنووری دێی مامەیە، لەکەرتی کشتوکاڵی یەکی هۆبەی کشتوکاڵی ناحییەی مەلحەی پێشودایە ئێستا سەر بە هۆبەی کشتوکاڵی دووبزە هەر بەو ژمارەیە ۳۳۸۲ دۆنم زەوی هەیە لە سەرژمێری ساڵی ۱۹۵۷ دانیشتووانەکەی ۸۹ کەس بوونە لەوانە ٤٩ نێرو ٤٠ مێ لە سنووری دێیەکە چەندین چاڵی نەوتی تێدایەو دانیشتووانەکە سوودیان لێ بینیوەو چەند کەسێکی دانیشتووی دێیەکە لە کۆمپانیای نەوت کاردەکەن‌و چەندی تر پاسەوانی چاڵە نەوتەکانن، لەبەر ئاوی پرۆژەی ئاودێری بەنداوی دووبز کشتوکاڵ دەچێنن‌و ئاژەڵداری بەپالەوە دەکەن.

*** دێی جەدیدە:**

لەسەردەمی رۆژگاری سەیید ئەحمەدی خانەقا، نێوان هەردوو زوورگی بروان‌و کنگراوەو پانی‌و بەرینی دەشتی مەلحەو عەلەغێری لەژێر دەستیا بووەو بە ئارەزووی خۆی خەڵکی هێناوەو بردووە بەتایبەت ئەو خەڵکانەی لە سنووری دێهاتەکانی ئەو نیشتەجێ بوون، وەك دەبینین لە ساڵی (۱۹۳۵) خێزان‌و بنەماڵەی ساڵح عەبدوڵڵای نەتەوەی عەرەبی ئەلبو سحاگ دەنێرێ‌و جێگای ئێستای دێی جەدیدەی پێ ئاوەدان دەکاتەوەو لەپاش چەند وەختێك هەردوو ماڵ‌و خێوانی جەففال غەززالی دانیشتووی دێی مشێرفەو عەبدوڵڵا حومەیری دانیشتووی دێی بای حەسەن دەنێرێ لەگەڵ ئەو خێزانە لەوێدا نیشتەجێ دەبن‌و ئەو جێگایە ناو دەنێن دێی جەدیدە، پاش چەند وەختی تر ئەو دوو خێزانەی دوای هەریەکەو بۆ دێیەك رەوانە دەکات‌و تەنها ماڵ‌و خێزانی مام ساڵح لە دێیەکەدا دەمێنێتەوە تا ئەم سەردەمە ئەو بنەماڵەیە بە تەنها لەوێدا دەژین، لەم رۆژەدا ۲۰ خێزانێك دەبن‌و هەموو لەو بەرەبابەن، زەوی‌و زارێکی بەپیت‌و بەرەکەتیان بەدەستەوەیەو لەوێش ئەو زەوییانە بەناوی سەیید ئەحمەدەوە دەبێ و لەوەدوا بە (سەنەد تەملیك) حکومەت بە کورانی ساڵحە عەبدوڵڵای داوە تا ئەمڕۆ، ئاژەڵ‌و مەرومالاتی زۆریان هەیەو گوزەرانیان باشەو ئاو و کارەباو خوێندنگایان هەیە لە دێیەکەدا، دێی جدیدە بەچەند سەت مەترێك ئەکەوێتە خوارووی رێگای سەرەکی نێوان کەرکوك- موسڵ، لە خوارووی رۆژهەڵاتی دێی مەلحەیە، لەکەرتی کشتوکاڵی مەلحەدا نوسراوەو لە سەرژمێری ساڵانی (۱۹٤۷- ۱۹۵۷)دا ناوی ئەو دێیە نەهاتووە.

*** دێی تەقتەق:**

وەکو رەسەن‌و بەساڵاچووانی دێی تەقتەق دەگێڕنەوە لە پێشدا دێیەکە لهێبانی ناوبووە، یا لەسەر ئاسەواری کۆنە دێیەك ئاوەدانکراوەتەوە ئەو کۆنە دێیە لهێبانی ناوبووە، پاشان لە رووی ئەوەی ئەو شوێن‌و جێگایە هەندە چۆڵ و عەردو بانێکی وشك‌و برینگ‌و بێ سەوزایی‌و دارو درەخت‌و رەق‌و تەق بووە ئەوانیش تەقتەق یان ناوناوە.

دێی تەقتەق هەر لەسەرەتای ئاوەدانکردنەوەی تەنها یەك بیری ئاو خواردنەوەی سازگاری هەبووە ئەوەش زۆر ساڵ وابووە ئاوی ئەو بیرە کەمی کردووەو خەڵکەکە بە فەنا چوونە تا ئاویان پەیداکردووەو بەم شێوەیە مارەتەوە تا ساڵانی پێش هاتنی پرۆژەی ئاودێری بۆ سنوورەکە، ئاوی بیرەکە وشك دەکاو دانیشتووانەکەی زۆر لە هیلاکەت ئاوی خواردووە لە بۆری‌و لوولەکانی چاڵە نەوتەکانی ئەو سنوورە یا لە زێی بچووك‌و دێهاتەکانی دەوروپشت بە پشتی گوێدرێژ ئاو دێنن‌و پەیدای دەکەن، لەوەدوا ئاوی پرۆژە ئاودێرییەکە بەکەناڵی سنووری دێیەکەدا دەرواو دانیشتوای دێی تەقتەق سوودی لێوەردەگرن، لە سنووری ئەم دێیە ئاسەوارو پاشماوەی دوو دێ هەیە یەکەمیان دوو کیلۆمەترێك لە باشووری دێیەکە لەسەر گردێکی دەست کردی کۆن، ئەو گردە بە گردی بروشە ناودەبرێ، پانی‌و بەرینی ئەو گردە دۆنمێك زەوی بەسەرەوەیەو ئاسەواری قەڵایەکی زۆر مەحکەم‌و بیری ئاو لەسەر ئەو گردە بەدی کراوەو لەدەوروبەری گردەکە ئاسەواری دێیەك هەبووە تا ئەو دەمەی دانیشتووانی دێی تەقتەق لە دێیەکە مابوون‌و دەرنەکرابوون‌و چەندین جار شوان‌و بەرخەوان‌و سەپان‌و گاوان، گۆزەو گودیلەو جەرەی شکاو نەشکاویان لەوێدا دۆزێتەوەو ئاسەوارەکان بەجوانی بەرچاو کەوتوون، دووەمیان بەهەمان دووری یەکەم لای سەرووی رۆژئاوای دێیەکە گردی لاسوورەی پێ دەوترێ‌و لە دەوروبەری ئەو گردە ئاسەواری کۆنە دێیەکی تر بەرچاو کەوتووەو بیندراوە، ئەو ئاسەوارەش بەهەمان شێوە گۆزەو گودیلەو جەرەی شکاو نەشکاوی لێ دۆزراوەتەوە، وەك دەڵێن تا دانیشتووانی دێیەکە دەرنەکرابوون ئەو ئاسەوارە زۆر بەجوانی ئەبیندرا.

بۆ ئاوەدانکردنەوەی دێی تەقتەق وەك زاندراوەو بیستراوە لە ئەختیاران‌و تەمەندارانی پێش ئەمڕۆ، لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەسەرەوە عەلی دابەستی لەبەرەی حەمە ساڵەیی لە دێی سەریری سنووری (پردێ)

وە هاتووەو ئەو جێگایەی ئاوەدان کردووەتەوەو تەقتەق یان ئاوناوە، لەوەدوا خزمان و دۆستانی هاتوونەو بەتەنیشت ئەوەوە خانوبەرەیان دروست کردووەو لەوێدا نیشتەجێ بوونە، هەر عەردوبانێ بۆ کێڵگە بەکارهاتووە لەو سنوورە کێڵیویانەو بەئاویان هێناوەو مەرداری و ئاژەڵدارییان کردووەو، هەرچەندە لەو دەم دانیشتووانی ئەم دێیەو هەموو دێهاتەکانی تری ئەم سنوورە زۆر دەست کورت و بێ دەرەتان بوونە،، بەڵام بەبێ هیچ گرفتێك هاوسێیەتی و هاوسنووری نەتەوەی عەرەبیان کردووەو لەوێدا ژیاون تا ساڵی (١٩٨٧) لەوە پاش لەلایەن بەعسەوە دەرکراون.

ئەو خێزان و بنەماڵانەی هاتوونە بە تەنیشتی نەوەی حەمە ساڵەییەوە نیشتەجێ بوونە بنەماڵەی ئەم جوامێرانەن، حەمە وەسمان، حەمە مستەفا عەولا، ساڵح رەحمان مەولود، لە ساڵی ١٩٨٦ بەدواوە ئاوی پرۆژەی ئاودێری کەرکوك لە بەنداوی دووبزەوە بەو کەناڵ و پرۆژە ئاودێرییەدا هاتووەتە خوار، دەزگای ئاودێری چەند وێستگەیەکی ئاودێری لە سنووری دێی تەقتەقدا دامەزراندوەو زۆری زەوی و زاری دێیەکە ئاوی ئەو پرۆژەیەی پێگەییوەو لە دێمەوە بووە بە بەراو، دێیەکە بووە بە خاوەنی ئاوی شیرین و خەڵکان لەوەدوا بەدوای ئاوی خواردنەوەدا نەگەڕاون و ئەو خەونەی باو باپیرانیان هاتووەتە دی کە زۆری کێڵگەی دێیەکە بە ئاوی بارانی دەست کرد ئاودەدرێ و بە چاو دەبینرێ، کەچی تەنها ئەو یەك دوو ساڵە ئەو ئاوە حەڵاڵە بە کورد ڕەوابینراوە نۆشی کردووە لەو سنوورە لەودوا دەرکراوە، لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی دانیشتووانی ئەم دێیە زۆر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی میری بوون و بەدوای سەرجەم داواکارییەکانی داچوونەو بەهیچ شێوەیەك دوانەکەوتوونە لە هەر کارەی بەسەرییاندا سپێردرابێ بەر لە جەنگی نێوان عێراق و ئێران و لەوە دواش.

بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ بە تاوانی پێناسەی کوردی دەسەڵاتدارانی بەعس دێیەکە چۆڵ دەکەن و خەڵکە ڕەسەنەکەی ڕاگوێزی کوچەو کۆڵانی شاران دەکەن، خەڵکەکەش ئەوەی بەرەو پارێزگای ڕومادی دەچێ ئەوانی تر ڕوو لە هەولێرو سلێمانی دەچن، لەوەدوا هەرچی کێڵگەو زەویان هەبوو دابەشی سەر عەرەبی سنوورەکەو هاوردە کراوە، تەقتەق بە (٣٠٠- ٤٠٠) مەترێك ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی پرۆژەی ئاودێری کەرکوك کە لە بەنداوی دووبز بەرەو خوار دەبێتەوە.

ڕۆژئاوای تەقتەق سنووری دێی مامەو خەرابەرووتە، باشووری سنووری دێی خەرابەرووت و سمایلاوەیە، ڕۆژهەڵاتی سنووری دێی کۆنە ڕێوی و چەغماغیە، باکووری سنووری دێی شیرناوەو لە کەرتی (١٧)ی کشتوکاڵییەو ١٦٣٢٤ دۆنم زەوی هەیە.

لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانەکەی ١٦١ کەس بوونە لەوانە ٧٩ نێرو ٨٢ مێ خەڵکی نەتەوە پەروەری ئەم دێیە، سەرەڕای نەبوونی و بێکاری و بێ خزمەتگوزاری و لەسەر هەموانەوە تاوانی بەعسی سەرشانیان، هەردەم ئاگاداری بەرپابوونی شۆڕشی گەلەکەیان بوونەو هەموو دەمێك خۆیان بە مەریدو دەرویشی ئەو شۆڕشە زانیوە، خوێن گەرمانی ئەو دێیە لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی نەتەوەی کورد خۆیان گەیاندووەتە بەرەکانی پێشەوەی جەنگی ڕەوای گەلەکەمان.

ساڵی ٢٠٠٥ لەوەدوا لەلاین حکومەتی هەرێمی کوردستان و کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکانەوە کۆمەکی ١٢ خێزانی ئەو دێیە کراوە مام یوسف وەك هەر خێزانێکی تری ئەو دێیە کۆمەك دەکرێ و خانووبەرە بۆ خێزانی دابین دەکاو لەوە پاش ٦ خێزانی تری دێیەکە دەگەڕێنەوە بە تەنیشتێوە نیشتەجێ دەبن، لە ڕووی خزمەتگوزاری، ئاو و کارەباو خوێندنگای بۆ دابین کراوەو ڕێگای چەو ڕێژ تا ناو دێیەکە چووە، تەنها لە ڕووی ئەمن و ئاسایشەوە کێشەیان هەیە.

*** دێی برایمە شێخ:**

ئاوەدانکردنەوەی ئەم دێیە لە ساڵی ١٩٩٧ بەدواوەیە، تەنها ماڵە حاجی ئیبراهیم محەمەد مەحمود سەعدی بەرزنجی پاش ئەوەی لە سەردەمی باپیرێوە هاتوونە لە دێی کونەڕێوی نیشتەجێ بوونەو چەند وەخت و عەیامێك چەندین پارچە زەوی بە سەنەت تەملیك دەکێڵن و لەژێر گاسنیان دەبێ، لەگەڵ دەرکردنی دێهاتە کوردییەکانی ئەو سنوورە ساڵی ١٩٨٧ بنەماڵەو خێڵی شنجر کە عەرەبی دانیشتووی دێی کونەڕێوین چەند پارچەیەکی ئەو زەوی و زارەی بە دەستی حاجی ئیبراهیم محەمەدو دوو براییەکانییەوە دەبێت لێی داگیر دەکەن و لێیانی دەسێنن و بۆ خۆیان دەیکێڵن، لەدوای چەندین جار شکات و شکات کاری حاجی برایم بۆی نەسەندراوەتەوە، ناچار دێیەکە جێ دێڵن، لەوە دوا لە ڕێگای دۆست و برادەرانەوە ڕێگایان پێدراوە لەلایەن حکومەتی ئەو سەردەمەوە بە دووری دوو کیلۆمەترێك لە ڕۆژئاوای دێی کونەڕێوی تەنها ماڵە لە پارچە زەوییەکی تر بەدەستیانەوەیەو هەر ئەوان سەرف و سوونی دەکەن لەوێدا بیری ئیرتوازی لێ دەدەن و خانووبەرە لە قوڕو شەقڵەی دار دروست دەکەن و نیوە ماڵێك لەوێ دادەنێن تا نەمانی بەعس، لەوە دوا لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان و کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکانەوە کۆمەکی ٤ خێزانی ئەو بنەماڵەیەو ٣ خێزانی بەرەی سەید یاسینی دانیشتووی دێی تەقتەق دەکە کە بەر لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لەوێ ژیاون، دەکرێ ئەوانیش بە تەنیشت خانووەکانی بەرەی حاجی برایمەوە خانوبەرە دروست دەکەن دێیەکە ناو دەنێن دێی برایمە شێخ، لەوە پاش لەلایەن پەرەپێدانی پارێزگای کەرکوکەوە کارەبای بۆ هاتووە، ئێستا چەند خێزانێکی لێ نیشتەجێیە.

*** دێی مامە:**

مامە، ناوە بۆ پیاو لە کوردەواری منداڵ ناو دەنێن مامە بەتایبەت لە سنووری پارێزگای کەرکوك و هەولێر مامە لە هۆزی سییانی کوردەوارییە، چەند وەخت و ساتێك لەمەوبەر دانیشتووی دێی سەرگەرانی ناوچەی کەندێناوەی هەولێر بووە، بەدوای لەوەڕو لەوەرگادا هاتووەتە دێهاتەکانی سنووری مەلحەو لە بناری زوورگی بروان لەوەرگای باشی

بەرچاو کەوتووەو رەشماڵو چیغی خۆی لێهەڵدەوەو ئەو بەهارو پاوەندەدا دەمێنێتەوەو مەڕو ماڵاتی بەخێو کردووە. لەوەودوا چەند بەهارێك بەردەوام هاتووەتە ئەو جێگایەو لەوە پاش جێ هێشتووەو لە سنوورەکە نەماوە. خەڵکان لەوەدوا ئەو جێگایە بە جێگای هۆبەو بنکەی مامە ناو دەبەن.
لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەم لە دەورووبەری ساڵانی (١٨٤٨- ١٨٥٢) کوڕانی خاڵە عەبدوڵلای قادری محەمەد مارفی تیرەی چاو لەحەوای هۆزی شێخ بزێنی لە دێیەکانی هەنجیری برایم ئاغای ناحییەی ئاغجەلەرەوە دێنە ئەم سنوورەو لە هەر رێگایەکەوە بێ ئەم هەوارو بنکەو لەوەرگایە ئەدۆزنەوەو لە کۆنە هەواری مامە هەڵیان دلوە بارگەو بارمتەیان خستووەو مەڕو ماڵات بەردەدەنە ئەو لەوەرگاو پاوەنی زۆرگی بناری برزانە.
کوڕانی خاڵە عەبدوڵلای قادری محەمەد مارف پێنج برا دەبن عەزیز (عەزە بۆز)ی پێوتراوە، قادر. حوسێن. محەمەد (حەمە خڕە)ی پێوتراوە، غەفور، ئەو برایانە لەو هەوارە دەمێننەوەو خانوبەرە دروست دەکەن و ئەو جێگایە بە دێی مامە ناو دەنێن، لەوەدوا بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم و ساڵی گرانی چەند خێزان و بنەماڵەی رەسەنی کوردەواری روو لە دێی مامە دەکەن و بەوێدا نیشتەجێ دەبن، ئەوانەش ئەم بنەماڵانەن: حاجی سەعید سۆفی ئەمین، مام یوسفە لەك، خاڵە شەریف مەرگەیی، مام مستەفای شەریف هەلاج، محەمەد عەولای شەمسە.
لەوەدوا لە ساڵانی سییەکانی سەدەی رابردوو بەرەزامەندی و رێپێدانی سەیید ئەحمەدی خانەقا بنەماڵەو خێزانی عەولا عومەیر (عەبدوڵلا عومەر)ی نەتەوەی عەرەبی هۆزی تەی (الطي) هاتوونە بە تەنیشتی کوردانەوە نیشتەجێ بوونە، ئەختیاران و بەساڵاچووانی ئەو دێیە وا دەگێڕنەوە ئەو سەردەمەی کە هاتوونە لەو جێگایە نیشتەجێ بوونە ئاسەواری کۆنە دێیکیان بەرچاو کەوتووە لە تەنیشت و جێگای گۆڕستانی ئەمڕۆی مامە، چەندین جار کوپەو گوزەو گودیلەی شکاو و نەشکاوییان لە کاتی گۆڕهەڵکەندندا دۆزیوەتەوە،، بەڵام لەو خەڵکانە کەسێك نەیزانیوە چەنێك لەمەو بەر ئەو جێگایە ئاوەدان بووەو چ نەتەوەیەکی لێ ژیاوە.
لە جەنگی جیهانی یەکەم کاك نەجیم حاجی حەسەن عەزیز (عەزە بۆز)و کاك عەبدوڵلای شەمسە دانیشتووی دێی مامە لەگەڵ سەیید ئەحمەدی خانەقا بە شداری لەشکری مەلیکی کوردان شێخ مەحمود دەکەن بۆ شەڕی تورك و ئینگلیز لە شوعێبەی بەسرا.
دێی مامە لە سنووری دێهاتەکانی ناحییەی مەلحە بووەو ئێستا لە سنووری دێهاتەکانی قەزای دووبزەو بە (٥٠٠- ٦٠٠) مەترێك ئەکەوێتە خوارووی رێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵ، رۆژئاوای سنووری دێی عەلە غێر، باشووری زنجیرە گردۆلکەکانی زوورگی براون و سنووری دێی خەرابەڕووتە، رۆژهەلاتی سنووری دێی تەقتەقە، سەرووی سنووری دێی ئەبو خورجەو مەلحەیە، لەگەڵ دێی عەلەغێر، لە کەرتی (٣) ی کشتوکاڵی دایەو ٣١٧٥١ دۆنم زەویان هەیەو بە هەردوو دێیەکە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانی دێیەکە ٣٤٦ کەس بوونە لەوانە ١٥٥ نێرو ١٩١ مێ، لە ساڵی ١٩٧٥ لەو کاتەی دێیەکە راگوێز کراوە خۆی لە ٥٥ خێزانێك دەدات.

* دێی عەلە غێر:
عەلە غێر دێیەکە لە دێیەکانی سەیید ئەحمەدی خانەقا، سەیید ئەحمەدی خانەقاو سەیید ئەحمەدی عەلە غێر پێ وتراوە. بۆ وشەی دێی عەلە غێر زانیارییەکی بەڵگەدار نییە تەنها ئەوە نەبێ ئەختیاران و بەساڵاچووانی ئەم سنوورە بە کوردو عەرەبەوە، لەوانە مەلا ساڵحی تیرەی ئەلبو سەباحی دێی گوبێبەو حاجی توعمە مستەفای ئەبو خورجەو یوسف مام حەمە دەمین کویخا ئەحمەدی تەقتەق و برایمە شێخ محەمەد مەحمود بەرزنجی لایان وایە دێی عەلە غێر لەلایەن سەیید ئەحمەدەوە ئاوەدانکراوەتەوە لەسەر ئاسەواری کۆنە دێیکی تر، ئەو کۆنە دێیەش هەر عەلە غێری ناوبووە، هەروەها ئەوەش دەڵێم ئاوەدانکردنەوەی ئەو کۆنە دێیە لەلایەن عەلی ناوێکەوە ئاوەدانکراوەتەوە تەنها ماڵە عەلی لەوێدا نیشتەجێ بووە، لەو غێر عەلە کەسێکی تر لەوێ دانەنیشتووە، ئەو غێر عەلییە بووە بە عەلە غێر، حاجی توعمە مستەفا بە عەلی کوڕی ئەمین کوڕی عەلی ناوێکی لە باو باپیرانێوە بیستووەو وایزانیوە، ئەو عەلییەش بە عەلی قاچە ناوبراوە لەو سەردەمە، وەك دەڵێ ئەبێ بۆ یەکەم جار ئەو عەلییە عەلە غێری ئاوەدان کردبێتەوە، مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نەزاندراوە، مام ئەحمەد سۆفی عەلی و مام مستەفا محەمەد دانیشتووی دێی عەلە غێر بەر لە چۆڵ کردنی دێیەکە هیچ لەبارەی وشەی عەلە غێر نازانن تەنها ئەوە دەڵێن بیستوویانە سەردەمێکی زۆر لە پێش ئاوەدانکردنەوەی عەلە غێر لەلایەن سەیدە حمەدەوە کوڕی سمایل عوزێری واتە هۆزی جاف لەم سنوورە نیشتەجێ بوونەو، بەڵام چەنێك بە چۆڵی ماوە تا ئاوەدانکراوەتەوە نەزاندراوە.
حەیدەر ئەبو بەکر حەمە ساڵح مام برایم محەمەد مستەفا (مام برایم- بە برایم حەپەت) ناودەبرا، دانیشتووی رەسەنی دێیەکە ئەڵێ لە باو باپیرانی خۆم زانیوە ٢٠٠ ساڵێك لەمەو بەر باپیرە گەورەیان لە کۆنە دێی تۆپزاوە بە پشتی گوێدرێژ خشتی هێناوە، بۆ جێگای ئەم دێیەو خانووی لێ دروست کردووەو بە عەلە غێری ناو ناوە، وەك دەستی بۆ جێگای کۆنە دێی تۆپزاوە درێژ کرد جێگای ئەو ئاسەوارەیە کە بە دوو کیلۆمەترێك زیاتر ئەکەوێتە رۆژئاوای عەلە غێرەوە، هەرچەندە ئەو دێیە بەو ناوە تەنها لەوم زانیوەو لە کەسی ترم گوێ لێنەبووە،، بەڵام لەکاتی سەردانەکەمدا بۆ دێی توێلعە خەڵکانی ئەوێ جێگای ئەو کۆنە دێیەی کاك حەیەر ئەبو بەکر دەستی بۆ درێژ کردووە ئاماژەی پێدا ئەوان بە ئاسەواری کۆنە شارێکی دەزانن و باس لەوە دەکەن بەر لە (٣٠- ٤٠) ساڵێك لەمەوبەر ژوورێکی تەواو لە کەرپوچ دروست کراویان لەژێر زەوی لەوێدا دۆزیتەوە، چەند ماڵێك لە دانیشتووانی دێیەکە کەرپوچی ئەو ژوورەیان هێناوەتەوە دێیەکە.
لەکاتی سەردانیم بۆ دێی عەلە غێری ئەمڕۆ تەنها ماڵو

خێزانی کاك حەیدەر ئەبو بەکری لێیە، لە خواروی دێیەکەوە ئاسەواری کۆنە دێیەك نزیك لە بناری زوورگی براون بەدی دەکراو لەوانە جێگای دوو بناغەی خانووبەرە بە جوانی ئەبیندراو پارچەی کوپەو جەرەی شکاوی زۆر تێدا بوو، خەڵکانی ئەو سنوورە نازانن ئەو کۆنە دێیە کێی لێ ژیاوەو کەی ئاوەدان بووە.

عەلە غێر لە خواروی ڕێگای سەرەکی کەرکوک- موسڵە، ڕۆژهەڵاتی سنووری دێی مامەیە، سەرووی سنووری دێی مەلحەو جدیدەیە، ڕۆژئاوای سنووری دێی توێلعەیە، باشووری گردۆلکەکانی زوورگی براونە، بەپێی زانیاری و بۆچوونی زۆر لە دانیشتووانی ئەو سنوورە ئەو خەڵکانەی لە سەردەمی شێخ حوسێن شێخ قادری سەرگەلوی و سەیید ئەحمەدی کوڕی بەر لە کۆتای سەدەی نۆزدەهەم ئەم دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوە، ئەم بنەماڵە سەربەرزانەن، ئۆمەر حاجی ئاوماڵی و سمایل حاجی سێگردەکانی و کوێخا قادری سێکانی و یاسینی برای و مام خدری عەبدوڵڵا حەسەن و عومەری برای، مام شەریف ڕەجەب و محەمەد مستەفا بە (حەمە حەیران) ناودەبراو حەمە سالحی عەولای شەمسەو کوێخا یاسین محەمەد نادرو عەلي برای بە عەلی هەمەوەند ناسرابوو، ئەمانەو چەندین بنەماڵەو خێزانی سەربەرزی تر ئەو دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوەو لەوێدا ژیاون.

عەلە غێر (سەیداوەشی) پێ دەڵێن سەبارەت بەوەی سەیدە حەمەد ئاوەدانی کردووەتەوە، لەوەدوا بە فەرمانی سەیدە حەمەد عەبدوڵڵا عومەرو سالح عومەر کە هەردووك برانەو لە تیرەی گۆلکەیی هۆزی (الطي) عەرەبن هاتوونە لە عەلە غێر بۆ مەرو ماڵات بەخێوکردن نیشتەجێ بوونە، پاش چەند ساڵێك عەبدوڵڵا عومەر بە خێزانەوە دەچێتە دێی مامەو لەوێ دەمێنێتەوە، دانیشتووانی عەلە غێر بەکاری جۆراو جۆری سەردەم دەستی ماندویان ناوەتە سەر زگی تێرەوە، لە کاکە سەید بەولاوە تەنها لە خودای مەزن ترساون ئەگەر نا سڵیان لە کەسی تر نەکردووەتەوە، جوتیاری و سەپانی خۆیان کردووەو زەکاتی تاپۆیان بە سەید داوەو ئاژەڵدارییان بە پاڵەناوە.

عەلە غێر لەگەڵ دێی مامە لە کەرتی (٣)ی کشتوکاڵی دایەو هەردوو دێیەکە ٣٨١ کەس بوونە لەوانە ١٨١ نێرو ٢٠٠ مێ، نەوەو وەچەی ئەو نەبەردانە تا ساڵی ١٩٧٥ لە دێیەکەدا ژیاون لەوەدوا لەلایەن دەسەڵات دارانی بەعسی لەناوچووەوە ڕاگوێزە کراون هەر خێزانەو پەراگەندەی شارێك بووەو قەیدو نفوسی خەڵکەکەیان ڕەوانەی چەمچەماڵ کردووە، لە پرۆسەی ئازادی عێراق بەدواوە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی لەسەر بودجەی کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان کۆمەکی ١١٥ خێزانی ڕەسەنی دێیەکە کراوەو هەر خێزانەو بڕی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بە مەبەستی ئاوەدانکردنەوەی دێیەکەو گەڕانەوەی دانیشتووانە ڕەسەنەکەی هەرچەندە لەوەدوا ١١٥ خانو بەرزەوە دەکەن،، بەڵام تا ئەم مێژووە تەنها یەك خێزان گەڕاوەتەوە دێیەکە، ئەوەشمان لەبیر نەچێ کەلە پیاوانی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەم دێیە لەگەڵ بەرزبوونەوەی مەشخەڵی شۆڕشی نەتەوەکەمان خۆیان گەیاندووەتە ڕیزی پێشەوەی پێشمەرگایەتی.

*** دێی توێلعە:**

دێی توێلعە عەرەب نیشینەو لە هۆزی ئەلبو حەمدان و تیرەی ئەلبودۆلەن. دوا دێیە لە خواروی ڕۆژئاوای شارۆچکەی دووبز لەسەر زێی بچووك، لە ڕۆژئاوای دێیەکەو ئەو بەری زێیەکە کۆتایی بە تەپەو بەرزی و گردۆلکەکانی چیای قەرەبۆتك و قەرەچوغی قەراج و کەندێناوە دێ، لەم بەریشەوە لەناو دێیەکەوە دەست بە سەرەتای بەرزبوونەوەی زوورگی براون (بتێرە) دەکات کە بەرەو خواروی ڕۆژهەڵات ١٥ کیلۆمەترێك بە سەرەوە تاشیوی نەوتی ڕێگای سەرەکی کەرکوك-حەویجە دەچێت، ڕۆژئاوای دێی توێلعەی زێی بچووکەو ئەو بەری زێیەکە دێهاتەکانی سنووری ناحییەی سەر گەڕانی پارێزگای هەولێرە، باشووری سنووری دێی مەحکوڕو مەنسییەیە، ڕۆژهەڵاتی سنووری دێی مامەو جەدیدەیە، سەرووی سنووری دێی مەلحەیە.

وشەی توێلعە (طویلعة) عەرەبییەو کوردییەکەی دەرچوون، دەرکەوتن، بەرچاوکەوتن دەگەیەنێ، دانیشتووانی ئەم دێیە بەر لەوەی ئەم جێگایە ئاوەدان بکەنەوە بە دووری کیلۆمەترێك لە باکووری جێگای ئێستای دێیەکەوە لە شوێنێکی چاڵیی و زەنەکاودا دەژیان، ئەو دێیە (جوێفە)ی ناوبووە، جویفە عەرەبییەو کوردییەکەی (بۆگەن) دەگەیەنێ لە دەورووبەری ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم ئەم خێزان و بنەماڵانەی دانیشتووی دێی جوێفە ئەو شوێنەیان چۆڵکردووەو دێی توێلعەیان ئاوەدان کردووەتەوەو (طلیعة- طویلعة)یان ناو ناوە سەبارەت بەوەی لە جێگای نزمەوە سەر دەکەونە بەرزایی و هەر لە دوورەوە ماڵەکان دەرکەوتوون و دیاربووە، ئەو خێزان و بنەماڵانەی دێیەکەیان ئاوەدان کردووەتەوە ئەمانەن، حوممادی سالح چۆپان، سالحە خەنجەر، عەلی سوەید، جەفالە حەسەن، عەنتەرە ئەلیاسین، عومەیر مەحمودە ئەلیوسف، سالح حوسێنە ئەلعباس، دانیشتووانی ئەو دێیە لەو سەردەم دەم دوور بوونە لە ڕێگاو شارو شارستانییەت تەنها بە ماسی گرتن و ماڵات بەخێوکردن ژیاون، لەوە پاش کەسەر کەوتوونە جوتیاری و ئاودێری و کەسابەتی تریان کردووە جگە لەو کارانەی لەوە پێش کردوویانە، لەم سەردەمەش بەهۆی ئامێری ئاودێری ئاویی و دەشتای سەرووی توێلعە تەماتەو شووتی و کاڵەگ و خەیارو باینجان و بامییەو شتی تر ئەچێنن و بەرهەم دێنن، چەند خێزانێکی دانیشتووی دێیەکە موچە خۆرن و زۆر لە سەردەمی بەعس گوزەرانیان چاکترەو ڕێگای قیر تا ناو دێیەکە لەوە پێش چووە، کارەباو ئاوی هەر لەوە پێش بۆ دابین کراوەو لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە خوێندنگای هەیە.

لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانی ئەم دێیە هەموو ٧٦ کەس بوونە لەوانە ٣٤ نێرو ٤٢ مێ، بەڵام لەوەچەی دانیشتووانی ڕەسەنی دێیەکە زۆریان دێیەکەیان جێ هێشتووەو لە هەردوو دێی نیگاری گەورەو بچووکی سنووری قەزای حەویجەی ئەمڕۆ نیشتەجێن، لەم سەردەمە

دانیشتووی دێیەکە خۆ لە ٢٠٠ خێزانێك ئەدات. لە خوارووی ڕۆژهەلاتی دێیەکەوە لەسەر گردۆلکێکی قووت مەزاری شێخ چۆپان ناوێکی لێیەو لەزۆر لاوە خەلکان دێن بۆ زیارەتی. لە شێخ چۆپان بەولاوە کەسێك هیچی لێ نازانێ.
بە دووری دوو کیلۆمەترێك بە سەرەوە لە ڕۆژهەلاتی دێی توێلعە ئاسەواری کۆنە شارێك هەیە تا پێش سالانی ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو زۆر بە باشی شوێنەواری ئەو کۆنە شارە بەدی کراوەو خەلکی دێیەکە ژوورێکی لە خشت دروست کراویان لێ دۆزیوەتەوە، وەك دەلێن ٤٠ سالێك لەمەو بەرو دەزگای ئاسەواری پارێزگای کەرکوکیان لێ ئاگادار کردووەتەوە لەو کات، جگە لەوەش چەندین جار شوان و گاوان و جوتیار خشتی سوورەوەکراوە گۆزەو گودیلەی شکاو و نەشکاویان لەو جێگایەدا دۆزیوەتەوەو کەسێك لەو خەلکانە زانیاری ئەو ئاسەوارەیان نییە.

*** دێی مەنسییە:**

مەنسییە عەرەبییەو کوردییەکەی لەبیرکراوە، بزر کراوە، نادیار دەگەیەنێ، ئەم دێیە ئەکەوێتە ناو زۆرگ و هەلەت و بەرزی و نزمێکەوە بە تایبەت لە دووای نەگەڕێی نادۆزیتەوە، بەو هۆیەوە ئەو ناوەیان لێناوە، هەموو ئەم دانیشتووانەکەی لە خێزانێکەوە تا شەش خێزان دەڕوات، کەم وابووە لەوەندە خێزانە زیاتر تێپەڕ بووبێت، هەردەم تیرەی ئەلبو حوسێنی هۆزی ئەلبوحەمدانی لێ نیشتەجێ بووە لەبەر ئەو هۆیەش کەس مێژووی ئاوەدانکردنەوەی نازانێ و نازانن چ بنەمالێك ئاوەدانی کردووەتەوە، مەنیسییە، ڕۆژئاوای سنووری دێی مەحکوڕو سنووری دێیەکانی قەزای حەویجەیە، باشووری دیسان سنووری دێیەکانی حەویجەیە، ڕۆژهەلاتی زوورگی براونە، سەرووی سنووری دێی توێلعەیە، لە کەرتی (٦)ی کشتوکالیدایەو ئێستا ٤٤٧٣ دۆنم زەوی هەیە لە سەرەتای دۆزینەوەی نەوت لەم سنوورە چەند چالێکی نەوت لە سنووری ئەو دێیە دۆزراوەتەوە، بەلام تا ئێستا نەوتی ئەو چالانە بەکار نەهاتووەو داخراوەو هۆیەکەی نەزاندراوە.

*** دێی خەرابەڕووتە:**

لە مانگی ئەیلولی سالی (١٩٣٧) سەیید ئەحمەدی خانەقا بەنیازی ئاوەدانکردنەوەی دێیەکی تازە لە بناری زوورگی براون بۆ ئەو مەبەستە ڕەبیع محەمەد خدر نەتەوەی عەرەبی هۆزی ئەلبوسحاگ بەخێزانەوە بۆ دەورووبەری زەوی و گردی خرابەڕووتە دەنێرێ، ئەو کێلگەو گردە ئاسەواری کۆنە بیرێك و کۆنە دێیەکی لێ بووە، وەك دەلێن تا ئەم سەردەمەش شوان و گاوان و جوتیاری ئەو دێیە چەندین جار گۆزەو گودیلەو کوپەی شکاو و نەشکاویان تێدا دۆزیوەتەوە، مام ڕەبیع لەو سنوورە بیرێکی ئاو خواردنەوە هەلدەکەنی و خانوبەرەی لێ بەرز کردووەتەوەو نیشتەجێی ئەو کێلگەو گردی خەرابەڕووتە بووە، لەوەودوا خزمان و کەسوکاری دێن و بە پالی ئەوەوە خانوبەرە دروست دەکەن و هاوسێیەتی مام ڕەبیع دەکەن و ئەو جێگایە بەناوی ئەو زەوی و گردە کۆنە بیرە ناو دەنێن دێی خەرابەڕووتە، ئەو خزمانەی هاتوونە بە تەنیشتی ئەوەوە نیشتەجێ بوونە ئەم خێزان و بنەمالانەن، حوسێن ئەحمەدە ئەلحوسێن، خەلەفە ئەلموسا، محەمەد نەسوەدە ئەلخدر، حوسێنە سالم، ئەمانە هەموو لە هۆزی ئەلبوسحاگن و کەسوکاری مام ڕەبیع محەمەد خدرن، هەموو کێلگەو زەوی ئەو سنوورە لەلایەن سەیید ئەحمەدەوە سەرف و سوون کراوەو بە هەر کەسی بدایە دوایە ئەو دێیە بە دێی سەیید ئەحمەدی عەلە غێری ناودەبراو ناسرابوو پێش ئەمڕۆ.
هۆزی ئەلبوسحاگ لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیست بەدواوەو پاش شەڕی نێوان تیرەی ئەلبو عەسساف هۆزی عوبێدو هۆزی ئەلبوسحاگ ئەم خێلە لە دێیەکانی عرێشەو ڕوممانەو وەحیدەی سنووری قەزای حەویجەی ئەمڕۆوە دێن و لە دێهاتەکانی ئەم سنوورە (خۆیان دەخەنە پال سەیید ئەحمەدی خانەقاو شێخ تاهیری قەرەدەرە)، (ئەم نووسراوەی نێوان هەردوو کەوانی یەکەم لە بە سالاچوانی کوردانم زانیوە)، نیشتەجێ دەبن و لەوەدوا بە دێهاتەکاندا پەرتەوازە دەبن، بەرەی مام ئەسوەد لە دێی ئیدریس غەزعەل تا ئەمڕۆ نیشتەجێن ناوداری ئەو خێلە بوونیان سولتان ئەسوەدو حەمودی سولتان ئەسوەد عەبد حمود جەبر بووە، لەم ڕۆژەدا وەچەیان ماوە، ئێستا لەم سەردەمەدا چەندین تیرەو بەرەباب لە هۆزی ئەلبوسحاگ لەم سنوورە کەوتووەتەوە، لەوانە تیرەی ئەلمە حمود، ئەلبو غانم، ئەلبو جاسم، ئەلبو جاسر، ئەلبو شەرەف و هی تر، ئەمانە هەموو لەناو قەزای دووبزو دێهاتەکانی خەرابەڕووتەو ئەبو خورجەو مشێرفەو ئیدریس خەزعەل و شوێنانی تر نیشتەجێن، هەموو عەرەبی سوونە مەزهەبن، لەم سنوورەو دۆستایەتی نەتەوەی کوردیان زۆر بەلاوە باش بووە تا سالی ١٩٦٣ لەو سەردەم هەندێك لە خەلکی ئەو هۆزە کەم تەرخەمییان نەکردووە لە تالانی نەتەوەی کورد بەتایبەت لە سنووری هەردوو ناحییەی دووبزو پردێ (نووسەر)، وەك شێخ جومعە ڕەبیع باس دەکات: لە شارەکانی خوارووی عێراق و شوێنانی تر ئەم هۆزە هەیەو زۆر لەوان شیعە مەزهەبن، ئەوانەش لەشارەکانی بەغداو یوسفیەو مەحمودییەو حیللەو قاسم و ناسریەو بەسرادا هەن جگە لە دەورووبەری کەرکوك و شوێنانی تر لە عێراق، لەم سەردەمە زەوی کێلگەی ئەم دێیە زۆری بەراوەو بە ئامێری ئاودێری سەردەمییانە ئاو ئەدرێ، دانیشتووانەکەی لە پاش ئەوەی بەرهەمی زەوی ئەو کێلگانە هەلدەگرن و بەناو دێنن و گوزەرانیان زۆر باشەو زۆریش لەوان موچە خۆرن لە سەردەمی بەعس یەکێك لە خەلکی ئەم دێیە تاپلەی (ئەندام مەکتەب لە ڕیزەکانی بەعسدا چووە)و لەو نزم تریان زۆر هەبووە، ئاژەلداریش دەکەن، جگە لە ئاوی پرۆژەی ئاودێری بیری ئیرتوازی لە دێیەکەدا هەیەو کارەبایان لەسەردەمی بەعسەوە بۆ دابین کراوەو ڕێگای چەوڕێژ تا ناو دێیەکە دەچێ و خوێندنگایان هەیە، دێی خەرابەڕووتە بە دوو کیلۆمەترێك ئەکەوێتە خوارووی ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسل، ڕۆژئاوای سنووری دێی مامەیە، باشووری زوورگی براونە، ڕۆژهەلاتی سنووری دێی سمایلاوەو تەقتەقە، سەرووی دێی تەقتەق و مامەیە، لەسەرژمێری سالی

١٩٥٧ دانیشتووانی ئەم دێیە هەموو ١٣٦ كەس بوونەو لەوانە ٦٩ نێرو ٦٧ مێ، بەڵام لەم سەردەمە دێیكی قەبەو دانیشتووانێكی زۆری تێدایە بەهۆی ئەوەی هەر یەكەو دوو ماڵی هەیە لە دێیەكەو لە ناو قەزای دووبز، بۆیە نەتواندراوە ئاماری تەواو بكرێ، بەڵام وا مەزەندە كراوە لە ١٥٠ خێزان بەسەرەوە لە دێیەكە دایە.

*** دێی سەلام:**

دانیشتووانی ئەم دێیە نوێیە هەموو لە هۆزی زۆبەعی عەرەبی توركمان زوبانن و بەر لە ناكۆكی نێوان هۆزی زۆبەع و تیرەی ئەلبەسەباحی هۆزی ئەلبوحەمدان لە ساڵانی بەر لە ناوەراستی ساڵانی نەوەتەكانی سەدەی رابردوو لە دێی سابونچی دەژیان و نیشتەجێ بوون، لەو مێژووە بە پاشەوە بە رەزامەندی هەردوو لایەن و سەرۆك هۆزە عەرەبییەكانی سنوورو ناوچەكەو دام و دەزگا حكومی و بەرپرسانی حیزبی بەعس لەو سەردەمە دێی (سەلام)یان ئاوەدان كردووەتەوەو لەو شوێنەدا نیشتەجێن تا ئەمرۆ، ئەو خێزان و بنەماڵەی دێی سەلامیان ئاوەدان كردووەتەوە لەوێدا نیشتەجێن ئەمانەن، یونس حوسێن، حاجی سابیر حوسێن، عومەر سەمین، یاسین عەبدوڵڵا عومەر، تەها عەبدوڵڵا عومەر، هیدایەت جەلال، قەحتان نەجم قادر، سەلاح محەمەد جەلال. جێگاو شوێنی دێیەكە لە ناو سنووری دێی سابونچی دایە، بەڵام زەوییەكە تاپۆی عەبدولجەبار محەمەدی زۆبەعیە، دێی سەلام ئەكەوێتە نێوان دێی سابونچی و عەلەس و ئیدریس تەمرەوە، رێگای قیر بەناوەراستی دێیەكەدا دەرواو ئاو و كارەبای بۆ دابین كراوە.

زەوی و كێڵگەی دێی سابونچی بەزۆری بەراوەو لە پرۆژەی ئاودێری كەركوك بەنداوی دووبز ئاوی دەگاتێ، جوتیاری و ئاژەڵداری دەكەن و مووچەخۆریان كەمەو گوزەرانیان زۆر باشە دانیشتووانی دێیەكە ١٥ خێزانێك بەسەرەوە دەبن و هەموو كەسوكاری یەكترن.

*** دێی عەلەس:**

وشەی (علس) عەرەبییەو كوردییەكەی تەنها ماڵە، تاقە ماڵە، سەربەخۆ دەگەیەنێ، سەردەمێكی زۆر لەمەو بەر وەك خۆیان باس دەكەن و دەڵێن لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ئەم دێیە لەلایەن بنەماڵەی عەلی محەمەد علێوی تیرەی ئەلحەمدە ئەلمحەمەدی هۆزی ئەلبوحەمدانی دانیشتووی دێی كونەرێوی ئاوەدانكراوەتەوە، تەنها ماڵە لە ناو كێڵگەو عەردو بانی خۆی خانوبەرەی دروست كردووەو نیشتەجێ بووە، لەوەدوا هەردوو خێزانی جەمیل دەروێش و ئیسماعیل تابە هاتوونە بە تەنیشتی ئەو خێزانە نیشتەجێ بوونەو پاش چەندین ساڵ ئەو دوو خێزانە ئەوێیان جێ هێشتووەو لە دێی دوورم نیشتەجێ بوونە، دانیشتووانی ئەم دێیە ئێستا لە ٤٠ خێزانێك بەسەرەوەن و هەموو نەوەی كەسێكن بەناوی محەمەد علێوی ئەكاتە باپیری علێوی عەلی محەمەد. دانیشتووانی دێی عەلەس ئاژەڵداری و كشتوكاڵ بەبەرهەم دێنن و موچە خۆریان تێدایەو زەوی و كێڵگەی بەراوی بەپیت و بەرەكەتیان هەیەو گوزەرانیان باشەو رێگای قیر بەناو دێیەكەدا دەرواو ئاوو كارەبای بۆ دابین كراوەو خوێندنگا لەسەر خەرجی خۆیان دروست كردووە.

لە سنووری ئەم دێیە ئاسەوارێكی كۆنی لێیە بەناوی (تل الحیاوی) ئەم گردە دەست كردە تا ئەمرۆ گۆزەو گودیلەو جەرەو كوپەی شكاو و نەشكاوی تێدا دەدۆزنەوەو كەس هیچی لێ نەزانیوە، ئەم دێیە ئەكەوێتە نێوان سنووری دێیەكانی كونەرێوی و دوورم و سابونچی و سەلامەوە، لە كەرتی كشتوكاڵی سەرژمێری ناوی نەهاتووە.

*** دێی (دوورم - دوورم):-**

بۆ وشەی دوورم بۆچوون هەیە لای ئێمەی كورد،، بەڵام دانیشتووانی دێی دوورم كە سەردانیم كردوون و لە زۆر بە ساڵاچووانی ئەوانم پرسیوە بەلای ئەو بۆ چوونی كورداندا نارۆن، تەنها ئەوە ئەڵێن نازانین وشەی دوورم لە چییەوە هاتووە، بۆچوونەكانی كوردەواری خۆمان ئەمانەن: جێگاو شوێنی ئەو دێیە زۆر بووە لە شاری كەركوك و پردێ، هیچ رێگایەكی بەسەرەوە نەبووە لەو دەم بە پیادە لە هەر رێگایەكەوە بۆی دەچووی دوور بووە، وابیستراوە، لە یەكێكی دانیشتووی ئەو دێیە دەپرسن لە كۆ دادەنیشی ماڵت لە كۆیە ئەویش وتوویەتی لە دوورم، لەوەوە دوورم یان ناو ناوە، بۆ چوونی دووەم لەوە دایە (دوو رم) بێ (رم لە كوردەواری كە رەسەی شەرە وەك هەموو دەیزانین) عەرەب (رئە) قەڵەوەكەی هەڵگرتووەو یەكێك لەواوەكانی قوتداوە تەنها (دورم)ە كەی ماوە.

دوورم لە كەرتی (١٥)ی كشتوكاڵییەو ٩٣٤٩ دۆنم زەوی هەیە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ سەرجەم دانیشتوانەكەی ٢٩٤ كەس بوونەو ١٥٤ مێ و ١٤٠ نێر، ئاسەواری كۆنە دێی دوورم زۆر كۆنەو كەسێك لەدانیشتووانی ئەم سنوورە مێژووەكەی نازانێ و نازانن كەی ئاوەدان بووەو كەی چۆڵكراوەو چەنێك بە چۆڵی ماوەو كێی لێ ژیاوە، ئەوەی زاندراوە لە جێگاو ئاسەواری كۆنە جێی دوورم بەر لە سەدەی بیست چەند بنەماڵەی خێڵەكانی ئەلبو وەششات و سەیدەكانی دووخی و ئەلبو عەنانی لێ نیشتەجێ بووە، و لە وەدوا ئەوێ چۆڵ دەكەن و هەندێك لەوان دەچنە دێی مزێریرو هەندێك بۆ دێی برێمەو حەویجە دەچن، لە دەورووبەری ساڵانی (١٩١٩-١٩١٤) بنەماڵەیەكی خێڵی ئەلبوزاحم لە هۆزی ئەلبوحەمدان هاتوونەو نیزگ بە ئاسەوارو كۆنە دێی دوورم خانوو بەرەیان دروست كردووەو لەوێدا نیشتەجێ بوونە، لەوە دوا خزمان و كەسوكار دەوریان داوەو كردویانە بە دێ و لە سەرەناوە كۆنەكە دورم یان ناوناوە، ئەوانەی كە لەم سەردەمە لەوێ نیشتەجێن. بنەماڵەی ئەو خێڵان لە هۆزی ئەلبوحەمدان- ئەلبوزاحم، عەبدال، كلێبات، ئەلرەشیدات، هەموو (٦٥- ٧٠) خێزانێك دەبن، ئاژەڵداری و كشتوكاڵ بە ناودەنێن و موچە خۆریان كەمەو ئاوی خواردنەوەو كارەباو خوێندنگایان بۆ دابین كراوە لە سەردەمی بەعسەوە.

گۆرستانی دێیەكە زۆر كۆنەو لەم سنوورە كەس مێژووی یەكەم گۆر نازانێ، لە هەموو سەردەمەكان لە كاتی

هەڵکەندنی گۆڕ کۆنە گۆڕو پاچە گۆزەو گونیلەی شکاوی لێ دەدۆزنەوەو لەو ساڵانەی پێشوو لە سەردەمی شەڕی ئێران– عێراق‌و لە کاتی هەڵکەندنی گۆڕێك یەکێك لە گۆڕ هەڵکەنەکانی ناو گۆڕەکە دەکەوێتە خوارێ‌و زۆریە نارەحەتی تادەری دەنێن‌و ئەو گۆڕە پڕدەکەنەوەو گۆڕی تر هەڵدەکەنن، هەر لە نیزگ دێیەکە ئاسەوارێك هەیە (خربەت هەوا)ی پێدەڵێن، خربە، خرابە، ووشەیەکی عەرەبییەوەو کوردییەکەی شوێنی تێکدراو کاولکراوی پێدەوترێ. لەوەوە تا ئێستا چەندین جار شوان‌و گاوان‌و جوتیاران گۆزەو گودیلەی شکاوو نەشکاو یان تێدا دۆزێتەوەو ناشرانن خربەت هەوا لەچییەوە هاتووە.

*** دێی بای حەسەن:**

وشەی (بای حەسەن) وەك دانیشتووانی دێی حەسەن‌و خەڵکانی سنوورەکە باس دەکەن دەستەواژە، راڤە، زاراوەیێکی زانایانی کۆمپانیای نەوتەو بۆ سنوورو چاڵەنەوتەکان بەکاری دێنن، بۆ نموونە، لە زۆر جێگا لە جادە نەوتییەکان نوسراوە (بئر رقم ٨ باي حسن الجنوبي – بئر رقم ٩ باي حسن الشمالي) تا دوایی.

دانیشتووانی دێی بای حەسەن وەك دەگێڕنەوە بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم دانیشتووانی دێیەکە چەند ماڵ‌و خێزانێك بوونەو لە سەرەوەی ئێستای دێی بای حەسەن نیشتەجێ بوونە،، بەڵام ئەو جێگایە دێی (مێل – الميل)ی پێ وتراوە، میل عەرەبییەو کوردییەکەی (لا، لار، لاپاڵ، لایێکی بەرز لایێکی نزم) دەگەیەنێت، لەوە پاش لە بەرێ ئاوی ئەو جێگایە جێ دێڵن‌و دێنە خوارەوە بۆ دەم زێ‌و نیزگ بە گۆڕستانی ئەمڕۆی بای حەسەن، لە لاپاڵێك خانوو و سابات دروست دەکەن‌و لەوێدا نیشتەجێ دەبن ئەو جێگایەش هەر دێی مێلیان پێوتوە، لەگەڵ سووڕانی چەرخی ڕۆژگار هێدی هێدی خەڵك لە زیاد بووندا بووەو ئاوی زێی بچووك بەرەو لای دێیەکە هاتووەو دانیشتووانەکە جێگا کۆنەکەیان جێ هێشتووەو بەرەو جێگای ئێستای دێیەکە هاتوونە.

لە کاتی هاتنی کۆمپانیای نەوت بۆ سنوورەکە، لە سنووری دێی مێل چاڵێکی نەوتی زەبەلەح دەدۆزێتەوەو بای حەسەنی باشووری ناودنێن، ولەوە دواناوی دێی مێل دەگۆڕن بەبای حەسەن، ئەو بنەماڵەو خێزانەی ئەم دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوە لەم تیرەو خێڵانەن مەحمود ئەلهیندی ئەلحەمدانی، عەلی مەحمود مەشعان ئەلحەمدانی، حوسێن رەمەزان ئەلکەزا، عەباس ئەلخەمیس ئەلدهێمات، عەواد عەبدوڵلا ئەلحوسێن ئەلعەگار، حەسەن چەلاچ ئەلتمێمی.

لەوردەمەی دێی مێلی سەروو یان جێ هێشتووەو لە دێی مێلی خواروو دانیشتونە ٢٠ خێزانێك بە سەرەوە بوونە، لەم ڕۆژەدا ١١٠ خێزان بە سەرەوەن، خانووبەرەی دانیشتووانی دێیەکە لە ئاگری چاڵە نەوتەکانەوە ٣٠٠ مەترێك دوورە، تا ئەمڕۆ خانوو بەرەی دانیشتووانی ئەو دێیە لە قوڕو دارو شەقڵە دروست کراوە.

لە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق بە دواوە سێ دێ لە دێی بای حەسەن جودا بووەتەوە بەم ناوانە ناونراون بای حەسنی عەبد نەسومد خۆی‌و براییەکانی لەوێ دانیشتەجێن، (معسكر، باي حسن الجديد)، ئەو خێزانانەی لە کۆنە معەسکەری ڕێگای، دوویز– بای حەسەن، نیشتەجێن هەموو ئەو خێزانانەن کە لە سەردەمی بەعس لە دێیە کوردەکان بوونەو لەگەڵ پرۆسەی ئازادی عێراق بەدواوە لە بەر بێشوێنی لەو جێگایە تا ئەمڕۆ نیشتەجێن.

بای حەسەن لە کەرتی (١٨)ی کشتوکاڵیدایەو ٧٧٩١ دۆنم زەوی هەیە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ سەرجەم دانیشتووانەکەی ٣١١ کەس بوونە لەوانە ١١٦ نێرو ١٩٥ مێ، دێی بای حەسەن بە پێنج کیلۆمەترێك زیاتر ئەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای شارۆچکەی دووبز لەسەر زێی بچووك، ڕێگای قیر بەناو دێیەکەدا دەڕواو ئاوی خواردنەوەی لەبۆڕییە ئاوەکانی کۆمپانیای نەوت ڕاکێشراوەو کارەبای لەسەردەمی بەعسەوە بۆ دابین کراوەو خوێندنگای تێدایەو دانیشتووانەکەی ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵ بە بەرهەم دێنن‌و مووچە خۆریان تێدایەو کاری سەرپێیش دەکەن گوزەرانیان باشە.

*** دێی مەلحە:**

دوو بۆ چوون هەیە لەسەر وشەی مەلحە هەندێك جار لە دانیشتووانی ئەم دێیە لایان وایە بەر لە هاتنی سوپای ئیسلام بۆ سنوورەکە، شارێك لە جێگای کۆنە دێی مەلحە هەبووەو کەرخەی پێوتراوە هەڵبەت کەرخە ووشەییەکی کوردییەو هەر شتێك لە کوردەواری کۆن بێت‌و بچێتەوە پێی دەڵێن کاڵ بووەتەوە کەرخ بووەتەوە، وشەی کەرخ بووەتەوە زیاتر لە سنووری پارێزگای هەولێر بە کاردێ‌و هەردەم لەدەموزار دایە، لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا دانیشتووانی دێی ئێستای مەلحە (قرية الملح) ناوی دەبەن ئەو بۆچوونە دەردەکەوێ ئەو شارە کوردنیشین بووبێ، بۆچوونی دووەم باس لە مەلحە دەکاو دەڵێ: "لە پێشدا شۆڕیجەی ناوبووە شۆڕیجەو شۆڕەت هەردووك جێگای خوێاوی دەگەیەنێ"، لەم بۆچوونەشدا نیزگ لە کوردنشینەکەی کەرخە، لەو سەردەمەی عەرەب هاتووەو لەوێدا نیشیتەجێ بووە بیستویانەو زانیویانە لەوە پێش شۆڕیجە– کەرخەی ناوبووە، شۆڕیجەو شۆڕەکات‌و خۆێلێن یان شێکردووەتەوە، بەمانای ئەملەح‌و مەلحە هاتووە، هەر ئەو سەرچاوەیە دەڵێ لە ناو ناحییەی مەلحە مەرقەدی ئیمام ئیسماعیلی تێدایە، بە تەنیشت مەرقەدەکەوە ئاسەواری کۆنە شارێك بەدی دەکرێ‌و بانگۆێکی تێدایە درێژییەکەی ٢٥ مەتر دەبێت، هەروەها بوونی چەند دۆڵ‌و ڕووباری کۆن‌و پەرت‌و بڵاو لە زۆر شوێنی ئەو ناوچەیەدا بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدەن کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لە پێشدا دەستێکی باڵایان هەبووە لەکاری ئاودێری، ئەو جۆگاو ڕووبارە ئاودێریە کۆنانە هەندێکی دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی عەباسی‌و هەندێ تری لە پێش ئەو ماوەیەدا هەڵکەندراوە وەك ڕووباری (فیل) ڕووباری (ئەلعەباس) کە تا ئێستاش هەر بەو ناوانەوە ناو دەبرێن، بوونی پردێکی بەردینەی کۆن لەسەر یەکێك لەو کەندەو شیوەکانی ئەو سنوورە دروست

کراوە ئەوەش بەڵگەی پاشماوەی سەردەمی ئاشورییەکانە، زۆر ئاسەواری کۆنی تر لە سنوورەکەدایەو دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمەکانی پێش مێژوو هەرچەندە جێگاو شوێنی ناحییەی مەلحەو ئەو کۆنە شارەو پردە بەردینەکەو جێگای هەردوو دێی مەلحەی سەروو و خواروی کۆنی بەر لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو بە درێژای ڕۆژگار لەگەڵ لافاوی زێی بچووکدا چۆتە خوارێ و ئەو جێگایە ئێستا بەستەو حاوییەو دارو درەختی لێ ڕواوە.

مەلحە ساڵی ١٨٧٢ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی ناحییە بووە لەوە پێش کەی کراوە بە ناحییە نەزاندراوە، لەو سەردەمەوە بە ناحییەیی ماوە تا ساڵی (١٩٣٧)و هەندێك لە ساڵی (١٩٤٨)ی دەزانن کە ئیدارەی ناحییەکە لە دێی مەلحەوە گوازراوەتەوە بۆ دێی تەلعەلی لە سنووری قەزای حەویجەی ئەمڕۆ بەناوی (ناحية محلة لعلي) ناونراوە تا ساڵی ١٩٤٨ حەویجە سەر بەو ناحییە بووە، لەوە پاش دێی حەویجە دەکرێ بە ناحییەو تەلعەلی کراوەتە دێ مەلحە بە ١٠ کیلۆمەترێك ئەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای مەڵبەندی قەزای دووبز.

بە چەند سەت مەترێك لە لێواری ڕۆژهەڵاتی زێی بچووکەو بە چەند سەت مەترێکی تر لە خوارووی ڕێگای سەرەکی نێوان کەرکوك- موسڵە، مەلحە زەوی و زارێکی زۆر بە پیت و بەرەکەتی هەیە، لە کەرتی (٤)ی کشتوکاڵی دایەو ٨٣٨٩ دۆنم زەوی هەیەو لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ مەلحە ناحییە دەبێ و ٢١ دێی لە خۆگرتووەو ژمارەی دانیشتووانەکەی ١٥٣٢٦ کەس بووە لەوانە ٥٩٣١ کەس نێرو ٩٣٩٥ مێ و لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دوو دێ بووە، مەلحەی سەرو (عەرەب) ١٧٦ کەس بوونەو لەوانە ٩١ نێرو ٨٥ مێ، مەلحەی خوارو (کوردان) ١٠٥ کەس بوونە لەوانە ٥٢ نێرو ٥٣ مێ.

مەلحە تا کۆتایی دەسەڵاتی پاشایەتی لە عێراق بە مەلحەی سەیید ئەحمەدی خانەقا ناودەبرا، سەیید ئەحمەد کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ قادر کوڕی سەیید ئەحمەد کوڕی شێخ سەرداری سەرگەڵۆییە، باوکی سەیید ئەحمەد سەردەمێکی زۆر لەم دێیە دانیشتووەو خاوەنی زەوی و زارو کێڵگەو عەردو بانێکی زۆری دێهاتەکانی ئەم سنوورە بووە، پاش ئەوەی سەیید ئەحمەد دەبێ بە خاوەند دەسەڵات و لە کۆتایی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە عێراق، زۆر لە زەوییەکانی ژێر گاسنی دەکرێت و لەسەر خۆی تاپۆ دەکات، سەیید ئەحمەد لە دێی مەلحە خانوو بەرەو دیوەخان و حەوشەو حەسارو جێگای حەسانەوەی تایبەتی خۆی دەبێ لە تەکیەو خانەقای لە شاری کەرکوك، جەمال شێخ نووری لە گۆڤاری کۆمەڵایەتی سەردەم ژمارە (٨- ٩)دا نووسیویەو دەڵێ دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی ساڵی ١٨٤٢ میرنشینی بادینان کە پایتەختی لە ئامێدی بوو لەناو بردو تواندەوە، ئیسماعیل پاشای بادینی پاشای ئەو میرنشینە بوو کردی بە پاشای میرنشینی شارەزوور لە ساڵی ١٨٦١، (ئیسماعیل کوڕی محەمەد تەباری)، بەو پێیەی لە وەقفییەکەی داهاتووە لە بەرواری (١٩)ی سەفەری ساڵی ١٨٦٠ خانەقایەکی بۆ شێخ قادری کوڕی سەید ئەحمەدی کوڕی شێخ سەرداری سەرگەڵوی خەلیفەی مەولانا خالدی نەقشەبەندی لە شاری کەرکوك دروست کردووە، ئەمەش گەورەترین و بەناوبانگترین تەکیەی کەرکوك بووە لەو سەردەمەو تا ئێستاش بە تەکیەی سەیید ئەحمەدی خانەقا ناسراوە، هەروەها لە بەرامبەر دەرگای ئەو تەکیەدا خانوویێکی زۆر گەورەی بۆ شێخ دروست کردووەو جوانکاری تێکردووەو رووبەرەکەی ٣٠٠٠ مەتری دووجارەیەو تا ئێستاش نەخشو نیگاری جوان و پایەی مەرمەری تێدا ماوە، ئیسماعیل پاشا ئەم تەکیەو خانووەی بەخشیوە بە شێخ قادری سەرگەڵوی لە عەقارو خەرجی تەکییەکە ناو و مێژووی ناوبراوی لەسەرناوە سەیید ئەحمەد چەندین سوار چاك و پیاو ماقوڵ و چاپوکی سنوورەکەی کۆکردووەتەوەو دوای خۆی داوە لەگەڵ شێخی مەحمودی نەمر بۆ شعێبەی بەسرا چوونە بە مەبەستی غەزاو شەڕی کافرو ئیسلام (وەك خەڵکی ناوچەکە دەگێڕنەوە)، ناحییەی مەلحە لەو سەردەمەو لەسەردەمی دەسەڵاتی پاشایەتی عێراق خەڵکێکی زۆر رووی لێ کردووە چی بۆ کەسابەت و بژێوی ژیان و چی قاش قونج بووەو داوا کراوە لەلایەن دەسەڵاتی میرییەوە یا لە ترسی سەربازی یا لەبەر هۆی تر، سەیید ئەحمەدی خانەقا پاش داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە دەکرێ بە ئەندامی ئەنجوومەنی ئیدارەی پارێزگای کەرکوك و لەو لیستە یەکەم ناو ناوی سەیید ئەحمەدە، دیارە لەو سەردەمەی مەلحە ناحییە دەبێ دوو گەڕەك هەبووە لە مەلحە گەڕەکی سەروو گەڕەکی خوارووی پێ وتراوە، پاش ئەوەی ناحییەکە لەوێ نەماو گوازراوەتەوە، مەلحە لە دوو گەڕەکەوە بووە بە دوو دێ، دێی مەلحەی سەروو زۆری دانیشتووانەکەی لە نەتەوەی عەرەب بوونە، مەلحەی خواروو دانیشتووانەکەی بەزۆری لە نەتەوەی کورد دەبن، مەلحەی خواروو تا ساڵی ١٩٦٣ کوردی تێدا نیشتەجێ بووە لەوە پاش دەسەڵات دارانی حەرەس قەومی بەچەند ساڵێك ئەوێ چۆڵ دەکەن و خێزانێکی کورد لەوێ نامێنێ، بە درێژای ڕۆژگار ئاوی زێی بچووك جێگای و شوێنی کۆنە شارەکەو گەڕەکەکان و هەردوو مەلحەی کۆنی بردووەتە خوارێ و ئەو جێگایە ئێستا بەستەو دارو درەختی بێکەڵکی لێ دەڕوێ، لە سەردەمی ڕۆژگاری سەیید ئەحمەد تا دەسەڵاتی بەعس ئەم خێزان و بنەماڵە کوردانە لە مەلحەدا دەژیان و نیشتەجێبوون، بنەماڵەی کەریم عەبدوڵڵا (کەریمە کەر)ی پێی دەوترا و بنەماڵەی سۆفی ئۆمەرو حەمە ساڵح کاکە خان و بەکر واحێد خەلیل و ئەحمەد ڕەزای شێخ بزێنی و حەمەدەمین حەمە ساڵح و سەید عوسمان سەید ئەمین بەرزنجی و چەندین خێزانی تر لە هۆزە کوردییەکان و عەرەبییەکان هاتوونە لە پاڵ مامە سەید دانیشتوونە، لەو مێژووە بە پاشەوە کورد لە سنوورەکە بەرەو کەمی چووە، دانیشتووانی ئێستای دێی مەلحە هەموو نەتەوەی عەرەبن و سوونە مەزهەبن و بە زۆری لە تیرەکانی هۆزی ئەلبو حەمدان و ئەوانی تر لە عەرەبی ئەلعزەو ئەلبوسەحاگ و بنەماڵێکی سەیدی بەرەسەن دانیشتووی دەورووبەری حەویجەو عەرەبی تری جۆراوجۆری تێدایە، بەڵام ماڵ و خێزانی ئەو بنەماڵە سەیدە لە دێیەکە جیابوونەتەوەو لە ناو زەوی خۆیان خانووبەرەیان

کردووەو ناویان ناوە دێی سەید دانوك.

دێی مەلحە هەر لە سەردەمی بەعسەوە کارەباو ئاوی بۆ دابین کراوەو خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندی و بنکەی تەندروستی تێدایەو ڕێگای قیر بە تەنیشتی دێیەکەدا دەچێتە خواری و ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵ بە سەرووی دێکەدا دەڕواو ئاوی زێی بچووکیش لای ڕۆژئاوی دێیەکەوە دەچێتە خواری و ئەو خەڵکە زۆری موچە خۆرەو ئەوی تری بە ئاودێری و بەروبوومی کشتوکاڵ و ئاژەلداری و کاری جۆراو جۆر دەژین، دانیشتووانی دێی مەلحە لە ئێستادا ١٨٥ خێزانێك دەبن و کۆی گشتی دانیشتووانەکە ٧٥٣ کەسە لەوانە ٣٨٥ نێرو ٣٦٨ مێ، لە پرۆسەی ئازادی عێراق بەدواوە دانیشتووانی دێی مەلحەی خواروی کۆن لە نەتەوەی کورد بەر لە ساڵانی حەفتاییەکانی سەدەی ڕابردوو بە نیازی گەڕانەوەیان بۆ سنوورەکە هاموشۆو سەردانی بەرپرسانی دەزگا حکومی و حیزبییەکانی دووبزیان دەکرد تا لە ئەنجامدا بە هەوڵی لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە دووبزو لەسەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ڕێکخراو و کۆمەڵەی فریاکەوتنی ئاوارەکان کۆمەکی ٦٦ خێزانی ئەو دێیە کراوەو هەر خێزانەو بڕی (٥٠٠٠) دۆلاری پێدراوە بۆ دروستکردنی خانوبەرەو گەڕانەوەیان بۆ دێیەکە، هەرچەندە ٦٦ خانوبەرە دروست دەکەن لە ڕۆژهەڵاتی زێی بچووك لەسەر ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵ کەچی تا ئەم مێژووە خێزانێك لەوانە نەگەڕاوەتەوە دێی مەلحەی تازەی کوردانی سەروو ئەو گەرەکە خانووە هەموو لەسەر نیوە ماوەتەوەو چۆڵەو تەواو نەکراوە.

*** دێی سمایلاوە:**

سمایلاوە دووا دێی سنووری دووبزە لە باشوورەوەو بە کیلۆمەترێك زیاتر ئەکەوێتە خواروی ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵ، ڕۆژئاوای سنووری دێی خەرابەڕووتەو زوورگی براونە، باشووری سنووری دێی سەخەرەی ناحیەی مەلا عەبدوڵلا (مەلتەقا)یە، ڕۆژهەڵاتی سنووری دێی مەلا عەبدوڵلای هەمان ناحیە، سەرووی سنووری دێی دوورم و تەقتەقە.

سمایلاوە لە ناوەڕاستی ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردوو کوێخا ئیسماعیل محەمەد عوسمانی ساڵەیی (محەمەد حەلیم) ئاوەدانی کردووەتەوە، هەموو زەوی و زاری ئەو دێیە بەناوی سەیید نووری ناوێکی تورکمانی دانیشتووی کەرکوکە، لەپاش نەمانی سەیید نوری کوڕو کوڕەزای سەرپەرشتی بەناو هێنانی ئەو زەوییانە دەکەن، لە دوای کوێخا سمایل چەندین ماڵ و خێزانی کورد چوونەو بە تەنیشتی مام کوێخاوە نیشتەجێ بوونەو هاوسێیەتییان کردووە، لەوانە هەر یەك لە مام قادر عوسمان پالانی و مەجید ساڵح مستەفا ساڵەیی و ڕەحمان سەلیم حەمە حەلیم ساڵەیی و مەلا ساڵح محەمەد مەعروف و تەنها خێزانێکی نەتەوەی عەرەب بەناوی مەحمود جبوری، ئەمانە چەندین خانەوادەی سەر بڵندی تر لەم دێیەدا بوونە، خێزان و وەچەی ئەم جوامێرانەی سەرەوە ناویان هاتووە تا ساڵی ١٩٦٣ لە دێیەکە دانیشتوونە، جوتیاری و مەڕداری و سەپانی و گاوانیان کردووەو کێڵگەو زەوی مام سەیدیان کێڵاوەو تاپۆو زەکات و ئیجاریان هەر بەو داوە، لەوەودوا بە سۆنگەی ململانێی نەتەوەی کوردو عەرەبەوەو لە ترسی حەرەس قەومی لەو سەردەمە دێیەکە چۆڵدەکەن و هەر خێزانەو ڕوو لەلایەك دەکات، تەنها ماڵی مەحمود جبووری لە دێیەکە دەمێنێتەوە، لەدواییشدا لە دێی دوورمی هاوسنووری دێی سمایلاوە ئەم ماڵ و خێزانانە هاتوونەو لە دێی سمایلاوە نیشتەجێ بوونە، جێگای کوردان دەگرنەوەو زەوی و زاری سەیید نووری یان کێڵاوە، هەر یەك لە عەلی ئەلئیبراهیم، حوسێن ئەلعێدان، جەمیل سۆغەر، سوڵتانە ئەلئەسوەد، ئەکرەم ساڵح، ئەمانە هەموو لە نەتەوەی عەرەبی تیرەی ئەلبوزاحمی هۆزی ئەلبوحەمدانن، ئەم ماڵ و خێزانانە تا پرۆسەی ئازادی عێراق لە دێیەکەدا نیشتەجێ بوونە، لەوەودوا کوردان بە نیازی گەڕانەوەیان بۆ دێیەکەو پاش ململانێ و بگرەو بەردەیەکی زۆر ئەو بنەماڵانەی لە ساڵی ١٩٦٣ بە دواوە هاتوونە لە دێیەکە نیشتەجێ بوونە لەوێ دەگوازرێنەوە بۆ خوار ڕێگای سەرەکی موسڵ- کەرکوك،، بەڵام هەر لە سنووری ئەو دێیەدا خانووبەرە دروست دەکەن.

خەڵکانی ڕەسەنی دێی سمایلاوە لە نەتەوەی کورد لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی سلێمانی لەسەر بودجەی کۆمەڵەو ڕێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان ٦٧ خێزان کۆمەك دەکرێ بە نیازی ئاوەدانکردنەوەی دێیەکە، خەڵکان دەست بەکاربوون بۆ دروستکردنی خانووەکان هەر خێزانەو بە پێ توانا قۆناغێکی کارەکەی جێبەجێ دەکاو، بەڵام هەر لەگەڵ دەست پێ کردنی قوناغی یەکەمی کارکردن و بناغەدانان چەندین جار هەڕەشەیان لێ کراوە لە ڕێگای تەلەفۆنی مۆبایلەوە، تا ڕۆژێك بەڵێندەرکەی کاری خانووەکانی دێیە نوێیەکەی ئەنجام دەداو تیرۆرکراوە کارەکە تا ئێستاش بە نیوەچڵی وەستاوە.

سمایلاوە پاش پرۆسەی ئازادی عێراق بووە بە دوو سمایلاوە، سمایلاوەی کۆن لە خواروی ڕێگای کەرکوك- موسڵە، سەرەتا کورد ئاوەدانیان کردووەتەوە، سمایلاوەی نوێ لە سەرووی ڕێگای نێوان کەناڵی پرۆژەی ئاودێری دووبزو ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵ، هەردوو سمایلاوە ئاوەدانەو عەرەب نیشینە، جگە لەوەی کێڵگەو زەوی و زارێکی تەخت و بەپیت و بەرەکەتیان هەیەو جۆرەها کشتوکاڵی لێ بە بەرهەم دێنن و ئاژەڵ بەخێو دەکەن و زۆر لەوان مووچە خۆرن، دانیشتووانی سمایلاوەی کۆن تا ساڵی ١٩٧٧ لە ئاوی بیر ئاویان خوردووەتەوەو خوێندنگا لە دێیەکەدا نەبوەو لەوەودوا بیری ئیرتیوازییان بۆ هەڵکەندراوەو خوێندنگاییان بۆ دروست کراوە، لە سەردەمی بەعسەوە کارەبایان بۆ دابین کراوەو ڕێگای دێیەکە لە ڕێگای سەرەکی کەرکوك- موسڵەوە چەورێژ کراوە تا ناو دێیەکە.

سمایلاوە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ سەرجەم دانیشتووانەکەی ١٣٩ کەس بوونەو ٦٧ نێرو ٨٢ مێ، لەنێوان سنووری سمایلاوەو دێی سەخەرە گردێکی دەستکردی

لێیەو جێگای چەند دۆنم زەوی دەبێ، بە گردی خێڵەکی ناو دەبرێ تا ئەم سەردەمەش دانیشتووانی سنوورەکە گۆزەو گودیلەو کوپەی شکاو و نەشکاوی لێ دەدۆزنەوە، تا ئێستا خەڵکانی ئەو سنوورە بە تایبەت نەتەوەی عەرەب (تەل خیلەکی) پێدەڵێن، لەمەشدا زۆر روونە کە ئەم ناوچەو سنوورە جێگاو مەقامی کورد بووەو کوردی لێ ژیاوە ئەگەر خێڵەکی بێ یا نیشتەجێ.

* دێی کونەرێوی:

وشەی کونەرێوی هەر لە خۆیدا کوردییە هەرچەندە دانیشتووانەکەی ئێستا لە نەتەوەی عەرەبن، بە ساڵاچووان و ئەختیارانی ئەم دێیە لایان وایەو زانیویانە سەرەتا ئەو خەڵکەی شوێنی دێی کونەرێوی ئێستایان ئاوەدان کردووەتەوە نزیك ئاسەواری جێگای کۆنە دێیەکی تر ئاوەدانکراوەتەوە زۆری کون رێوی لێ بووەو لەوەوە ناونراوە کونەرێوی، یا ئەبێ ئەو کۆنە دێیە کونەرێوی ناوبوبێ، خەلیل یاسین خدرو عەبدوڵڵا شنجر عەباس هەردوو دانیشتووی دێی ئێستای کونەرێوین و لایان وایە لەسەرەتای سەدەی بیست یا بەر لەو مێژووە هەردوو سەرۆك خێزان خدر عومەر عەزیزو عەلی عەباس عومەر لە دێی تەلجۆڵی ناحییەی رەشاد کە ئێستای سەر بە قەزای مەڵبەندی کەرکوك هاتوونەو ئەم دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوە،، بەڵام مەلا ساڵحی سەباحی مێژوو دۆست دانیشتووی دێی گوبێبەی ئەم سنوورە ئەڵێ: یەکەم بنەماڵەو خێزان کە هاتووەتە دێی کونەرێوی لە جێگای ئاسەواری کۆنە دێی کونەرێوی ئاوەدان کردووەتەوە، حەیاوی باوکی مەحمود دەلحەیاوی ئەلعەززە بووە، هەرچەندە خەلیل یاسین و عەبدوڵڵا شنجر باس لەوە دەکەن و دەڵێن خربەت ئەلحەیاوی لەم سنوورەیەو، بەڵام نازانن لە چ دەورو سەردەمێکدا بووەو کێی لێ ژیاوە، کۆنە دێی کونەرێویش کەسێك لە بە ساڵاچووانی دانیشتووانی سنوورەکە نەیان زانیوە لە چییەوە ئەو کۆنە دێیە ناونراوە کونەرێوی و کێ لێ ژیاوەو چ سەردەمێك ئاوەدان بووەو کەی چۆڵکراوە.

ئەو بنەماڵانەی ئێستا لە دێیەکە نیشتەجێین وەچەی ئەو جوامێرانەن، خدر عومەر عەزیز، عەلی عەباس عومەر، عەبوش عەبدوڵڵا، مستەفا زیاب، بیلال خەڵەف، ئێستا خەڵکانی دێیەکە خۆ لە ٥٠ خێزانێك بەسەرەوە دەداو لە ساڵی ١٩٧٥ بیری ئاو خواردنی بۆ هەڵکەندراوەو لە ساڵی ١٩٧٨ خوێندنگای بۆ دروست کراوە.

رۆژئاوای دێی کونەرێوی سنووری دێی تەقتەق و دێی برایمە شێخە، باشووری سنووری دێی سمایلاوەو دوورمە، رۆژهەڵاتی سنووری دێی ئیدریس تەمرە، سەرووی سنووری چەغماغەو نادراوەو شیرناوە، هەر چەند لە کەرتی کشتوکاڵی ناوی ئەم دێیە نەهاتووە، لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ دانیشتووانەکەی هەموو ٩٧ کەس بوونە لەوانە ٥٥ نێرو ٤٢ مێ.

* دێی قەرە چەم:

قەرەچەم وشەیەکی توورکییەو لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لەم سنوورە ئەو ناوە لەم دێیە نراوە، لەو دەم لەسەر زێی بچووك و زۆر نزیك بەم جێگایەی دێی قەرەچەمی لێ ئاوەدانکراوەتەوە، چەمێکی زۆر تووش و ناقۆڵا و قەبەی هەبووەو هەموو ئاژەڵێك نەیتوانیوە بەو چەمەدا بروا، تورکە دەسەڵاتدارەکان کە ئەو چەمە دەبینن بەو ناوەوە دێیەکە ناو دەنێن (قەرە چەم)، واتە چەمی رەش، بەستی رەش.

ئەختیارانی ئەو دێیە ئەگێرنەوە لە پێشدا جێگای ئەم دێیە لە جێگای ئێستای دێیەکە بەسەرەوە تر بووە، کەواتە لەنێوان گۆرستانی قەرەچەم و دێی قەرەچەمی ئەمرۆ بووە ئەو کۆنە دێیە (ئەبو سەیفەنی) پێوتراوە لەوەودوا دێیکە دەگوێزنەوە ئەم جێگایەو قەرەچەمی ناو دەنێن.

قەرە چەم لە کەرتی (٣)ی کشتوکاڵییەو ٥٥٨٦ دۆنم زەوی هەیە، لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ سەرجەم دانیشتووانەکەی ٢٢٩ کەس بوونە لەوانە ١١٥ نێرو ١١٤ مێ.

دێی قەرە چەم بە دوو کیلۆمەترێك بەسەرەوە ئەکەوێتە باشووری رۆژئاوای شارۆچکەی دووبز، باکوورو رۆژئاوای دێی قەرەچەم زێی بچووك و دێهاتەکانی سنووری ناحییەی سەرگەرانە، رۆژهەڵاتی جۆگای پرۆژەی ئاودێری کەرکوك و سنووری دێی قەرەدەرەیە.

لەم سنوورە تەنها لە دێی قەرەچەم گامێش بەخێو دەکرێ، وەك خۆیان باس دەکەن کاری بەخێوکردنی گامێش دەگەرێتەوە ١٧٥ ساڵ لەمەوبەر، باوباپیرانی ئەوانەی ئەمرۆ لێرە گامێش بەخێو دەکەن لە سنووری پارێزگای دیالەوە بەرەو سنووری پارێزگای کەرکوکیان هێناوە، دانیشتووانی دێیەکە تێکەڵاون لەتیرەو هۆزە عەرەبییەکان وەك ئەلبوسەحاگ شەممەرو گامیشەوان (جماسین) و جحێشی و ئەلکەزاو هی تر.

ئەو ماڵ و خێزانانەی لە سەردەمی تورکەوە لەم دێیەدا نیشتەجێن ئەمانەن بنەماڵەی محەمەد کەرراو، ئیبراهیم جەددوع عومەر ئەلجحێشی، محەمەد جەددوع سلێمان ئەلجحێشی، عەبدوڵڵا حوسێن ئەلجەماس، عەبدوڵڵا سەبح خالید ئەلفەنەش، ساڵح ئەلعیدو چەندین خێزانی تر هەن لە دێیەکەداو نیشتەجێن.

دانیشتووانی دێیەکە سەرقاڵی بەخێوکردنی مەرو مانگاو گامێش و جوتیارین هەندێك لەوان مووچە خۆرن، خانووبەرەی دێیەکە تا ساڵانی (٢٠٠٥- ٢٠٠٦) بە سەرەوە قورو دارو شەقڵە بوو، لەوەودوا یەکە یەکە بەرەو گۆران دەچێ، زۆر دەمێکە رێگای قیر بەناو دێیەکەدا دەرواو ئاوی خواردنەوەی لە لوولەو بۆرییەکانی کۆمپانیای نەوتەوە وەرگیراوە، کارەباو خوێندنگای لەسەردەمی بەعسەوە هەیەو لەم ساڵانەی دوایی مزگەوتی لێ دروست کراوەو ١٠٠ خێزانێك بەسەرەوەن، تەنها خێزانێکی کوردی کەم بینا لە دێی قەرەچەم نیشتەجێ بوو بەتاوانی ئەوەی پێناسەی کوردە راگوێزکراو لە دێیەکە دەرکراو خانووەکە بەر شۆفەلدرا.

*** دێی چەغماغە:**

چەغماغی تورکی، بڵاچەی کوردی، لە تاریکیدا دوو بەرد پێکدادەی بڵاچەڵێ دەدات و ئاگر دەکاتەوە. وەك دەڵێن چەغماغە لەوەوە هاتووە، ئەختیارو بەساڵاچوونی ئەم دێیە وایان زانیوە سەردەمێکی زۆر لەمەوبەر یەك دوو کەس لە خەڵکە رەسەنەکەی دانیشتووانی دێرینی ئەم سنوورە شەوێکی تاریك لەسەر گۆڕستانی ئێستای چەغماغە شتێکیان لێ وون دەبێ و زۆر بە دوایدا دەگەڕێن. لەناکاو بەردێك لەژێری پێی یەکێکیان دەردەچێ و بە بەردێکی تر دەکەوێ بڵاچێکی، چەغماغێکی. لێ هەڵدەسێ و ئەو جێگایە دەکەن بە نیشان و دەبێ بە جێگای چەغماغەکەو بڵاچەکە، دەگێڕنەوە جێگای دێی چەغماغە بەر لەوەی باوباپیرانی دانیشتووانی ئێستای چەغماغە بێنە ئەم دێیە، دێیەکە لە بەری گۆڕستانەکە بووە، دیسان وەك زاندراوە لە دەوروبەری ۱۵۰ ساڵێك لەمەو بەر قادر قۆرغ و عەلی مامە خالۆزاو میمکزای یەك دەبن و هەردوولا خاوەنی مەڕو ماڵات و ئاژەڵ بوونەو هاتوونە لە جێگای دێی ئێستای چەغماغە رەشماڵیان هەڵداوەو بارگەرو بارمتەی خۆیان خستووەو لە سنووری گۆڕستانەکە ١٤ ماڵێکی کوردی هۆزی لوڕی لێ بووەو سەردەمێك پێکەوە ژیاون و پاشان نێوانیان خراپ دەبێ و لوڕەکان بار دەکەن و لەوێ دەڕۆن.

ئەم دێیە ئەکەوێتە خوارووی رێگای سەرەکی کەرکوك–دووبز، رۆژهەڵاتی سنووری دێی ئیدریس تەمرە، سەرووی سنووری دێی نەسری ئالبدێرو نادراوەیە، رۆژئاوای سنووری دێی شێرناو و تەقتەقە، باشووری سنووری دێی کونە رێوییە، لە کەرتی کشتوکاڵی (١١)یەو (٣٩٨٢) دۆنم زەوی هەیە، لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧) هەموو دانیشتووانەکەی (٢١٢) کەس بوونە (١٠٥) نێرو (١٠٧) مێ.

قادر قۆرغ لە هۆزی بابانییەو پاش ماوەی بابانەکانە لە دێی بیبانی سنووری ناحییەی پردێ هاتووەو لەم سنوورە نیشتەجێ بووە، عەلی مامە لە هۆزی سیبانی دەشتی کەندێناوەی پارێزگای هەولێرە، خاوەنی مەڕو ماڵاتێکی زۆر بووە، بەر لەوەی عەلی کوڕی بێتە ئەم سنوورە خۆی بە خێزان و مەڕو ماڵاتەوە لە سنووری دێیەکانی شێخ ئەحمەدی خانەقا لە دەشتی مەلحە لە لەوڕگایەك بارمتەو رەشماڵی لێ هەڵداوەو ئەو جێگایە بەناوی مامەوە تا ئەمڕۆ ناونراوە (دێی مامە).

دانیشتووانی دێی چەغماغە تا ساڵی (١٩٧٥) بە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و بە خێوکردنی ئاژەڵ بە بێگەردی دەستی ماندو لەسەر زگی تێر ژیاون، لەوەپاش دەسەڵاتدارانی دژی مرۆڤایەتی لانەی لێ تێکداون و دەری کردوون هەر خێزانەو دەربەدەری کوچەو کۆڵانی شاران بوونە، لەو سەردەمە دێیەکە راگوێزو دەرکراون، لە ساڵی (١٩٧٥) ئەو دێیە خۆی لە ٦٠ خێزانێك داوە، لەوەوپاش سەرانی بەعسی عەرەبی تیرەی گۆلکەی هۆزی تەی (الطيء) بۆ هێناوەو پاشان هەر چی زەوی و زارو کێڵگەی کوردانی چەغماغە هەبووە بەسەر عەرەبی هاوردەو عەرەبی ئەم سنوورەدا دابەشی کردووە.

هەر لەگەڵ پرۆسەی ئازادی عێراق و داخ لە دڵای ئەم دێیە وەك هەڵۆ بە چاو چوقانێك دەگەنەوە کۆنە هەواری کاولکراو، سەر لە نوێ ئاوەدانی دەکەنەوە، لەوەپاش لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان و لەسەر بودجەی رێکخراوی فریاکەوتنی ئاوارەکان (١٥٥) خێزان کۆمەك دەکرێ و هەر خێزانەو بری (٥٠٠٠) دۆلاری پێدەدرێ بە مەبەستی دروستکردنی خانووبەرەو گەرانەوەی خەڵکە رەسەنەکە بۆ زێدی باوباپیرانیان، لەوەپاش لەلایەن ئاوەدانکردنەوەی ئیدارەی هەولێر یەك خێزان کۆمەك کراوەو بری ١٥ ملیۆن دیناری عێراقی پێدراوە بۆ هەمان مەبەست، ئەمانەو جگە لە یارمەتی رێکخراوە خێرخوازییەکان و حیزب لایەنەکان و دامو دەزگای قەزای دووبزو پەرەپێدانی پارێزگاکانەوە خزمەتگوزارییەکانیان بۆ دابین کراوە، لەم مێژووە ٦٥ خێزانێك گەڕاوەتەوە دێیەکە.

*** دێی خاڵدان:**

خاڵدان وەك گوندێکی سەر بەقەزای چەمچەماڵ دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی قەزاکەوە ئەو ناوچەیەی تێدا هەڵکەوتووە پێی دەوترێت ناوچەی هەمەوەند کە (٣٠ کم) لەقەزاکەوە دوورە هەرچەندە پێی دەوترێت ناوچەی هەمەوەند، بەڵام پێش ئەوەی هەمەوەند بێتە ئەم ناوچەیە ئەم گوندە ئاوەدانکراوەتەوە لەلایەن کوڕانی ساڵح قادر ئەحمەدو محەمەد.

خاڵدانییەکان وەکوو بنەماڵەیەکی گەورەی نێو عەشیرەتی زەنگەنەیە مێژووی ئاوەدانکردنەوەو بنیادنانی گوندەکەیان پێ سپێردرابوو.

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە بەمنیان دا ئەوانیش کۆك بوون لەسەر ئەوەی کەخاڵدان لەعەشیرەتی زەنگەنەیە وە لەزەنگەنە دابراون چوونەتە گوندی خاڵدان و وە خاڵدانیان ئاوەدان کردووەتەوە بۆ زیاتر وەرگرتنی زانیاری سەردانی خوالێخۆشبوو محەمەد عەلی ئاغای زەنگەنەم کرد لە ئوتێلی شارەزاد لە کەرکوك پێم راگەیاند جەنابت وەکو سەرۆکی عەشیرەتی زەنگەنەیت چ زانیارییەکت هەیە کە خاڵدانی ئەڵێن ئێمە لەعەشیرەتی زەنگەنەین لەوەڵامدا وتی ئەوەی زانیاری بێت لەلای من خاڵدانی لەعەشیرەتی زەنگەنەیە.

لەدوای پرۆسەی ئازادی عێراق لە ساڵی ٢٠١٢ لەبارەگای ناوەندی کۆمەڵایەتی کەرکوك چاوم کەوت بە بەرێز مەلا ئیسماعیلی مەلا وەیسی زەنگەنە پێم راگەیاند چ زانیارییەکت هەیە لەسەر گوندی خاڵدان کەخەڵکەکەی ئەڵێن لەعەشیرەتی زەنگەنەین لەوەڵامدا ووتی: بەڵێ ئەزانم خاڵدانی زەنگەنەیە باپیرە گەورەی خاڵدانی داوای ئافرەتێکی کردووە لەگوندی هەرێنە لە خزمی خۆی بووە وە بیکات بەهاوسەری خۆی لەهەمان کاتدا پیاوێکی تری لەخزمی خۆی لەخێڵی زەنگەنە داوای هەمان ئافرەتی کردووە کەبیکات بەهاوسەری خۆی لەئەنجام مشت و مڕ کەوتووەتە نێوان هەردوو لایانەوە کێشەی نێوانیان خەریکبووە گەورە بێتەوە، ناخۆشی لێبکەوێتەوە پیاوە ریش سپی و ماقوڵانی ئەو سەردەمە هەوڵی پێکهاتنیانیان داوە پێیان باش بووە تیرو پشکیان بۆ بکەن کە ئەوکاتە تیرو پشك پێی وتراوە خاڵ لەئەنجامی

تیرو پشك و ( خاڵ ) ئافرەتەکە بەر باپیرە گەورەی خاڵدانی کەوتووە کەناوی ساڵح قادر بووە دواتر ئەو پیاوەی تر وازی لەئافرەتەکە هێناوەو ملکەچی پیاو ماقوڵانی ئەو سەردەمە بووە ئافرەتەکە بووە بەهاوسەری ساڵح قادر باپیرە گەورەی خاڵدانی هەر ئەوەیش بووە کە پێی وتراوە ساڵح خاڵ چونکە خاڵەکە بەرئەو کەوتووە کەکۆچی کردووە بۆ گوندی خاڵدان و ئاوەدانی کردووەتەوە هەر بە ساڵح خاڵ ناسراوە واتا پێی وتراوە ماڵی خاڵەکان دواتر گوندەکە ناونراوە خاڵدان بەپێی زانیارییەکان واتا وشەی خاڵدان لەوشەی خاڵەوە هاتووە.

ناوبراو ساڵح قادر دوو کوڕی هەبووە یەکەمیان ناوی محەمەد بووەو دووەمیان ناوی ئەحمەد بووە کە گوندی خاڵدانیان بنیات ناوە محەمەد لای خوارەوەی خاڵدان بووە، ئەحمەدیش لای سەرووی خاڵدانەوە بووە بەپێی ئەو زانیارییانەی کەلە ریش سپی خاڵدانییەکانم وەرگرتووە نەوەکانی محەمەدی کوڕی ساڵح قادر بریتی بوونە لەم خانەوادانە: خانەوادەی کوێخا کەریم خاڵدان، مەلا فەتاح برای، ئامۆزاکانی حاجی تۆفیق، حاجی ساڵح مەحمود، حاجی شەریفە سوور، عەبدول، کاکەولا، یاسین، حەسەن حوسێن محەمەد، نەوەکانی سەمین ئەمین شافی، ناسرو فەرهادو ئەمین، هەروەها خاڵدانییەکانی گوندی شۆراو خانەوادەکانی کاکەوەیس قادر، حەمە خان یەعقوب، محەمەد یەعقوب، ئامۆزاکانی حاجی وەلی، حاجی دەروێش، قادر قارەمان، حاجی سمایل، خانەوادەکانی محەمەد سۆفی ساڵح، حاجی ساڵح سوور، کە ئەم خانەوادانە گوندی شۆراویان ئاوەدان کردووەتەوە.

هەروەها خاڵدانییەکانی گوندی قەرە سالمی سەروو ناوچەی پردێ، هەروەها رەحیم غەفور شەریف کە باوکی کۆچی کردووە لە خاڵدانەوە بۆ شاری کەرکوك لە گەرەکی شاترلوی کەرکوك نیشتەجێ بووە، رەحیمی کوڕی لەگەڵ کوڕەکانی لەساڵی ١٩٤٤ گوندی رەحیم ئاوای ئاوەدان کردووەتەوە کە ناسراوە بە کوێخا رەحیم.

نەوەکانی ئەحمەد ساڵح قادر ئەم خانەوادانەی لێکەوتووەتەوە حاجی میرزا، کوڕانی رەحیم و سەعید و حوسێن ساڵح دەروێش قادر، محەمەد دەروێش قادر، کەریم شەریف، نەجم ئەحمەد خدر، ئیبراهیم ئەحمەد خدر نەوەکانی ئەحمەد خدر گوندی سیامەنسووری کۆن و شۆریجەی قەرەحەسەنیان ئاوەدان کردووەتەوە.

خانەوادەکانی شۆریجە و سیامەنسوور چەند بنەماڵەیەکیان کۆچیان کردووە لەگوندی شۆریجەوە بۆ گوندی چەخماخە و ئاوەدانیان کردووەتەوە هەروەها خانەوادەی فەتاح رەشید، رەحیم رەشید قادر لەخانەوادەی ئەحمەدن هەر لەگوندی خاڵدان جێنشین بوون[٢].

لێرەدا پێویستە ئەوەیش روون بکەینەوە کوڕانی ساڵح قادر محەمەد و ئەحمەد کە گوندی خاڵدانیان ئاوەدان کردووەتەوە بەپێی زانیارییەکان لە ساڵی ١٠٣٥ کۆچی کاتی حکومی (میر سمایلی زەنگەنە) فراوان بووەتەوە خەڵکی زەنگەنە جگە لەگوندی خاڵدانیش کەلەنەوەی عەشیرەتی زەنگەنەیە زۆر گوندی کە لە دەورووبەری ناوچەی هەمەوەندو جەباریو قەرەحەسەنو شوان خەڵکی زەنگەنەی تێدا جێنشین بووە

دوای ئەوەی کوڕانی ساڵح قادر محەمەد و ئەحمەد لەم گوندەدا جێنشین بوونە، نەوەکانیان زۆر بووە بووە بەگوندێکی فراوان دووبنەماڵەی تر هاتوونەتە ئەم گوندی خاڵدانە لێرە جێنشین بوونە یەکەمیان حەمەی حەمە ئەمین ناسراوە بەحەمە ئەمین فیشەك داگر، حاجی سلێمان ئەرخەوان ئەم دووبنەماڵەیەیش وەکو بنەماڵەکانی محەمەد و ئەحمەد کوڕانی ساڵح قادر سەرقاڵی ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بوونە تا ئێستا بەشێك لەنەوەکانیان لەگوندی خاڵدان ماونەتەوەو ژیانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری ئەبەنە سەر ئەم دوو بنەماڵەیە بنەماڵەی حەمەی حەمە ئەمین فیشەك داگر، حاجی سلێمان ئەرخەوان چەندەها خانەوادەیان لێهەڵکەوتووە وەکو حەمەی حەمە ئەمین، حاجی حەسەن حەمە ئەمین، حاجی عەزیز، حاجی عەبدولکریم، حاجی شەریف، حاجی عەلی حەمە ئەمین بنەماڵەی حاجی سلێمان ئەرخەوان چەندەها بنەماڵەی باش و رێك و پێکیان لێ هەڵکەوتووە وەك: حاجی محەمەد سلێمان و کوڕانی، حاجی عەلی و کوڕانی، حاجی حوسێن و کوڕانی، حاجی محەمەد سلێمانو کوڕانی، حاجی ئەحمەدو کوڕانی، ئەم دوو بنەماڵەیەو نەوەکانیان لەگەڵ خانەوادەکانی محەمەد و ئەحمەد کوڕانی ساڵح قادر چەندەها خزمایەتی ژن و ژن خوازی هەیە لەنێوانیاندا ئەم چوار بنەماڵەیە تائێستا پەیوەندییەکی بەتین هەیە لەنێوانیاندا هەر چوار بنەماڵەکە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لەبەرگری کردن لەهەر جۆرە پیلانێکی عەشایەری کەویستبێتیان گوندی خاڵدان داگیر بکەن بەتایبەتی عەشیرەتی هەمەوەند چەند جارێك ویستویانە گوندی خاڵدان داگیر بکەن، بەڵام خاڵدانییەکان بەهەموو بنەماڵەو خانەوادەکان بەرگریان لەمانەوەی خاڵدان کردووە تا ئێستایش گوندی خاڵدان تاپۆی ئەم چوار بنەماڵەیەیە.

### * گوندی یەحیاوە:

"ئەم گوندوە کەوتووەتە خوارووی شاری کەرکوکەوە لە دووری (٢٢) کیلۆ مەتر، لەسەر رێگای شاری کەرکوكو ناحییەی قەرە حەسەنو ناحییەی لەیلان، هاوسنوورە لە سەرووەوە لە شاری کەرکوك، لە خوارووەوە لەگەڵ ناحییەی لەیلان، لە رۆژهەڵاتەوە هاوسنوورە لەگەڵ ئەو زنجیرە چیایەی کە هاوتەریبە لەگەڵ رێگای گشتی، لە رۆژئاواوە هاوسنوورە لەگەڵ گوندی قەرالوو و گردی یاسین تەپە.

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی گەلێك راوو بۆچوونی جیاواز جیاواز هەیە، هەندێك وای دەبینن کە لە دوو ووشەی (یەحیا) و (ئاوا) پێکهاتووە لە دواییدا گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو بووە بە (یەحیاوە).

لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان سوپای سەفەوی بە سەرکردایەتی (شا ئیسماعیل)ی سەفەویو سوپای سوڵتانی عوسمانی بە سەرکردایەتی (موڕادی چوارەم) کە دەرئەنجامەکەی بوو بە هۆی راکردنی سوپای (شا ئیسماعیل)ی سەفەویو رزگارکردنی شاری بەغدا، لە دواییدا سوپاکەی عوسمانی گەڕایەوە بۆ ناوچەکانی سەرووی میزۆپۆتامیاو لە ناوچەی دەشتایی لەیلان بارو بنەیان هەڵدا.

لە دوای ساڵانێکی زۆر بە تایبەتی لە ساڵی ١٠٤٨ ی زایینی والی (یەعقوب پاشا) بڕیاری دا بە سەرکردەی سوپا لە ناوچەی لەیلان بە ناوی (قایش محەمەد پاشا بە دروستکردنی شارۆچکەیەك لە خولرووی لەیلانی ئێستاوە بە ناوی (قایش پاشا) کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی ئەو فەرمانڕەواییە.

لە دوای ماوەیەك (سوڵتان مورادی چوارەم) گەڕایەوە بۆ شاری کەرکوك لەگەڵ کۆمەڵێك لە پارێزەرانی سوپای تورکی وەکو (بەکر بێگ، بابا دان بێگ، شەرەف بێگ. چەتال باشی) و گەلێکی تر،، بەڵام لە هەمان ماوەدا سەرکردەی سوپاکە (رەجەب پاشا) بڕیاریدا بە هێزەکەی بە دروستکردنی خانوویەکی گەورە بۆ نیشتەجێکردنی خێزانەکەی لە لەیلان بە ناوی (یەحیا بێگ)،، بەڵام دوای ماوەیەك ئاژاوە کەوتە نێوانیانەوەو (یەحیا بێگ) بڕیاری دا بە دروستکردنی شارەدێیەك لە دووری (١) کیلۆ مەتر لە لەیلانەوە کە لە دواڕۆژدا بوو بە (یەحیا ئۆبا)، بەڵام خۆی ڕاستتر ناوەکە (یەحیاوا)یە.

بەپێی ئەو سەرچاوانەی لەبەردەست دایە لە سەرژمێری ساڵی (١٩٥٧)و (١٩٧٧) ئەوە دەخەنە ڕوو کە ژمارە دانیشتووانی ئەم گوندە هەزار کەس بووە لە نێرو مێ کە نزیکەی (١٨٠) خێزانی گرتۆتەوە، لە دوای زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانی بەشێکی زۆری کۆچیان کردووە بۆ نێو شاری کەرکوك.

ئەم گوندە بەناوبانگە بە پیتی زەوی‌و خۆڵەکەی‌و ڕێژەی خوێی تێدا کەمەو بۆ کشتوکاڵ بە تایبەتی کشتوکاڵی هاوینەو زستانە، هەروەها شوێنێکی لە بارە بۆ لەوەڕگای مەڕو بزن‌و مانگا، هەروەها بەرووبوومەکانی گەنم‌و جۆ ئەم گوندەی پێ بەناوبانگەو هەموو ساڵێك ڕێژەیەکی چاك بارانی لێ دەبارێت، هەروەها شوێنێکی لەبارە بۆ ڕواندنی تری‌و هەنجیرو لۆکەو برنج‌و گەنمە شامی، هەروەها ڕێژەیەکی باش لە نەوتیش لەژێر زەوییەکەیدا هەیە، هەروەها گەلێك سەرچاوەی ئاوی هەیە لە شێوەی ئاوگرو ڕووبارو بارینی بارانێکی زۆر لە گۆماوەکاندا.

ئاوو هەوای ئەم گوندە زستانی ساردو هاوینی ووشك‌و گەرمەو لە مانگەکانی بەهارو پایزدا مام ناوەندییەو کەوتووەتە ژێر پاڵەپەستۆی هەوای ڕۆژئاوایی کە لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە دێت، لە هاویندا پلەی گەرمای تا (٤٥) پلەی سەدی بەرز دەبێتەوە، سروشتی زەوییەکەی تەختایی‌و بەشێك لە گردۆڵکەی تێدایەو لەلای ڕۆژهەڵاتییەوە زنجیرە چیایەك هاوسنووریتی لەسەر ڕێگای گشتی کە دەیبەستێتەوە بە شاری کەرکوکەوە".

### * گوندی (تووتەقەڵ):

لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە لەدەربەندی بازیانەوە زێ بەزێ هەتا پردێی ئێستاو چەمچەماڵ‌و قەرەهەنجیرشی بەتەنها یەك ناحییە هەبووە ئەویش ناحییەی بازیان بووە، لەوسەردەمانەدا بنەماڵەیەك یان هۆزێك بەگژ جەندرمەکانەوە دەچنەوە سەرییان بۆ نەوی ناکەن ئەوانیش لە بروسکەکانیان بۆ ئەستانە دەنووسن ئەمانە شێخ بزێنین، لە کاتێکدا شێخی بازیان بوون، لەساتك‌و ئاوماڵەوە بنەماڵەی مەلا عەباس تا بازیان ڕاپەڕینی خۆیان دەکەن دواتر بەشێکیان، یان زۆریان دوور دەخرێنەوە بۆ ناوچەی هایمەنەی خۆرئاوای ئەنقەرەی تورك کە لە ئێستادا (٧٢) گوندو (٤) ناحییەو قەزایەك هەیە بەناوی شێخ بزێنییەوە، لە باکووری خۆرئاوای کەرکوکیش لە دووبڕی بچووك شێخ بزێنی سەرووەوخواروو هەیە تا بناری چیای خاڵخاڵان‌و شیوە سوور.

(تووتەقال – تووی تاقە یال)، کە سێ سەد ساڵێك بەر لە ئێستا بنەماڵەیەك لە گوندی هەڵەدنی دۆڵی جافایەتی بنەماڵەیەکی لەسەر زێی بادینانەوە هاتوونە ئاوەدانیان کردووەتەوە، سەرەتا لە (کەیلان) بوو دواتر لە چەمی خانوان‌و لە ساڵی (١٩١٧) گواستوویانەتەوە بۆ شوێنی ئێستا، شاخی خاڵخاڵانیش کە (١٣٠٠) مەتر لە ئاستی دەریاوە بەرزە لە گوندی (سماقە)وە تا گوندی (ناسرومسر) درێژبووەتەوە.

ئەفسانەکانی کە لەو مەملکەتە دەگێڕنەوە کە گوایە ژنێك هەبوو ناوی (خاڵخاڵ) بوو خوشکی پیرەمەگرونە بوو دەست ڕۆشتووی‌و قەڵەم ڕەوی تا کەرکوك بووە شێخەڵەکەی لە سێ کوچکەی جەبەڵ مۆر دووکارێزەو مەرخوادەیە. گەلێك شوێنەوارو پاشماوەی جۆراوجۆری تێدایە لە ئەشکەوت‌و پارچەی جۆراوجۆر.

ناوەکەشی لە وەدا خۆی دەبێنیتەوە کە داری توویەکی گەورەی تێدا بووە، بۆیە ووتراوە (تووی تاقە یال) گەلێك شوێنەواری تێدایە کە بۆ ٢٠٠٠ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە وەکو قەڵای سەڵتە ئەحمەد، گردی برایم حارس، زێندان، وەسمان عاشوور، کلکەی قەتارچی. لەم گوندەدا نەخۆشی سوریژ بڵاوبووەتەوەو نزیکەی (٢٢) بە بانەوەی کشتووە.

لەساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هاتوونەتە ئەم دێیەو هەموو شتێکی ئەم گوندەیان بردووە. دێیەکانی دەوروبەری تووتەقەڵ بریتییە لە سەرچنارو شێخان‌و جەلەمۆردو مەر خواردە.

ئاوایی تووتە قەڵ لە کەرتی (٥) کشتوکاڵییە لە ساڵی (١٩٧٠) وە زەوییەکانی بەگرێبەست دراوە بە جووتیار بە ناوی (٤٠) جوتیارەوە بووە. بەرووبووی گەنم‌و جۆو برنجیان تێدا کردووەو چەمێکی زۆریان هەبووە، بۆیە برنجی تێدا کراوەو داری مۆردی زۆر تێدا بووە لە ئێستادا (١٦– ١٧) ماڵی تێدا ئاوەدانکراوەتەوە.

### * گوندی حەساری بچووك (حەساری وەلی پاشای):

یەکێك لە گوندەکانی ناحییەی پردێ، خرایە سەر ناحییەی ڕێدارەوە گوندی حەساری بچووك بووە، سێ سەر خێڵی کوردن‌و کە یەکێکیان یونسی زەینەڵ قوباد دەبێت سێ سەد ساڵێك لە دەست کاربەدەستەکانی ئێران کە سەرشۆڕی سەری پێ دانانێت‌و بەرەو باشوور دێت، خێڵێکی تریان دەچێ بەرەو گوندی عەبدوڵلا غانم‌و گوندی سنوور لە ناحییەی داقوق، خێڵێکی تریان بەرەو خۆرئاوای سلێمانی لە ناوچەی تاسلوجە لەوێ جێگردەبن، یونسی زەینەڵیش بەرەو ئاوایی مەحمود فاتەی نزیك ئاوایی گوڵم کەوەی سەر

خاسە لە ناوچەی کەرکوك بڵاوەی لێ دەکەن، قۆناغێکی تری خێڵەکەی یونسی قوباد چەمی ئاوداری هەڵمین دەچنە نزیك قەبرستانی حەساری گەورەو لە دوایدا لە خر دەپەڕنەوەو لە وەلی پاشایی باروبنەی لێ دەخەن لە نزیك کەلی سمایل بەگی خۆیان بە هۆزی مەمنی حیساب دەکەن، گوندەکە (١٨) کیلۆ مەتر باکووری خۆرهەڵاتی کەرکوك یەکەم ڕێگای ڕێدارە.

بنەماڵەی یونس، زەینەڵ، قوباد، لە ئێرانەوە هاتوونە ولە کوردستانی باشوور نیشتەجێ بوونە، قۆناغ بە قۆناغ ئەم دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوە، بۆ نزیکەی (٣٠٠) ساڵێك دەبێت، یان زیاترلە سەرەتادا ئەم گوندە سەر بە ئاقاری پردێ بووە، بەڵام لە ئێستادا سەر بە ناحییەی شوانە.

پیاوێك هەبوو ناوی وەلی پاشا بوو فەرمانڕەوایی ئەم مەملەکەتە بووەو ئەم ناوچەیی بە خانو داش قەڵاو خەندەق و گەرماوی هەبووەو شارێکی ئاوەدان بووەو لە سەرەڕێی کاروان چی بووەو ناوچەیەکی بە ناوبانگ بووە.، بۆیە پێی ووتراوە حەسار لە بەر ئەوەی لە زوودا حەساری هەبووە، بە تایبەتی لە کاتی هەمەوەندا خەندەقیشی هەبووە بۆ خۆپاراستن.

(خری ئاودار) لەم گوندە بووەو بەردەوام لە رابردوودا ئاوی هەبووەو سوودی بۆ دێیەکە بووە، جاران تا دەرەو گەنم ئاوی تێدا بووە بۆ خواردنەوەی ئاوی دێیەکە.

لە ساڵی (١٩٦٣) سوویا هێرشی کردە سەر ئەم گوندەوە، ئەم گوندەیان وێران کردووەو خەڵکەکەی ئاوارە بوون،، بەڵام کاتێك سوپاکە چوونە پاپیلان پێشمەرگەو خەڵکەکە پاشەکێشی پێ کردن. لە سەردەمی حەرەسی قەومییەکاندا لەم ناوچەیە (١٠١) کەسی لێ کوژراوە لە بەرامبەر بەرگری خەڵکەکەدا، کە ئەمە وای کرد پاشەکێشی بکەن.

ئەم گوندە (٣٠٠٥٠) دۆنم زەوی کشتوکاڵییەو زۆربەی گوندەکە بە کشتوکاڵییەوە خەریك بوونەو تێکرای زەوییەکان بەسەر (٢١) جوتیاردا دابەشکراوەو پێنج باخی گەورەی تێدایەو لە ساڵی (١٩٦٢) یەکەم قوتابخانەو یەکەم مامۆستای نەجمەدین گوڵدەریی بووە، (٢٥٠٠) ئاژەڵی تێدایەو وواڵخی بەرزشی هەیە. ئێستا لەم گوندە (١٥) ماڵی تێدا دەژیو لە رابردوودا ٥٠ ماڵی تێدا بووە.

لە ساڵی (١٩٨٨)دا کەوتووەتە بەر شاڵاوی ئەنفالو خەڵکەکەی ئاوارەی ئۆردووگای بەنیسەڵاوە بوون و عەرەبیان تێدا نیشتەجێ کراو بە فێڵ تاپۆکەیان کردە سەر عەرەبەکان.

*** گوندی (دەلۆی سەر خاسە):**

(٤٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا سێ برا لە کفرییەوە هاتوونەتە ئێرەو نیشتمانی دەلۆیان ئاوەدان کردووەتەوە، لە ڕۆژهەڵاتی کەرکوك ناوچەی شوان لە رووی جوگرافیاوە دەکرێتە دوو بەشەوە، شوانیش بە خۆی هۆزێکی گەورەی کوردە، شوانی سەر خاسە دەکەوێتە سەر رووباری خاسەی کەرکوك، شوانی کێشك کە بەشێکە لە کەرکوك دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای، حەوسەدو پەنجا ساڵێك پێش ئێستا ئەم هۆزە هاتوونەتە کەرکوكو لە حەوت گوندێکدا نیشتەجێ بوونە، کۆمەڵێك گوندن کە لە بانی مەقانەوە هەتا کەرکوك کە بە گوندی یاروەلی و کوردەمیر کۆتایی دێت، یەکێك لەم ئاوایانە گوندی دەلۆیە لە ئاقاری شواندا.

هۆزی دەلۆ خۆی هۆزێکی گەورەی کوردە، لە جەوەڵ باخ و کفری نیشتەجێ و پێش چوار سەد ساڵێك سێ برا هاتوونەتە ئەم شوێنە. لە دەلۆوە بۆ ئاوە سپی بە کۆچ و کۆچڕەوی دەگەنە ناوچەی دەلۆی سەر خاسە، هاتوونەتە ناوچەی یارەمەی نزیك قەڵاو قووت، ناوی قەتارە توو بووە، دواتر دەچنە خانە کۆن پاش هەشتا ساڵێك لە بان مەسقەڵان جێگیر دەبن هەندێ شوێنەواری کۆنیان هەیە خانە بلوری، کە بۆ سەردەمی ئەراپخا دەگەڕێتەوە.

هەر لێرەوە دەلۆیەکان چەکیان هەڵگرتووەو پشتگیریی ئیبراهیم خانی دەلۆیان کردووە لە شاری کۆنی کفری لە نوشستی شۆڕشەوە ئیبراهیم خان دەچێتە ئۆمەرمەندانی بناری حەمرین بە هۆی نەخۆشی گرانەتاوە کۆچی دوایی دەکات، ئێستاش مەزارەکەی لەوێیە.

بنەڕەتی ناوەکەش (دەلۆ – دەلق) هاتووە کە گوایە ئەم هۆزە دە بەش دە لقیان هەبووەو بڵاوە بوونەتەوە. ئەم دەلۆیانەی کەرکوك پێیان دەڵێن دەلۆی سەر خاسە.

حەرەس قەومییەکانی لە ساڵی (١٩٦٣) ئەم دێیەیان تاڵان کردووەو گوندەکەیان سووتاند.

لەم گوندەدا گەنم و جۆ برنج و میوەی جۆراوجۆری لێ هەبووە لە رابردوودا برنج بەرهەمێکی باشی هەبووەو کاڵەك و ترۆزی شوێنێکی چاکی ئەم گوندە بووە، ئەم گوندە هەشت هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵی هەیەو لە ساڵی (١٩٨١) قوتابخانەی بۆ دروست کراوە یەکەم مامۆستایان ناوی میقداد بووە.

بنەماڵەیەکیان لە (١٨٠) ساڵەوە لە یەختە خانەوە دەکشێن بەرەو کەرکوك، لە دەلۆ نیشتەجێ دەبن.

ئێستا نزیکەی (٤٥٠) ماڵی تێدایە، نزیکەی (١٠٠٠) کەس دانیشتووانی دەبێت. دوو شەری گەورەی تێدا کراوەو لەسەردەمی بەعس، (٣٠) ئەنفال کراویان هەیە (٢٦) گەنج و دوو ژن و (٦) شەهیدان هەیە کە (٨) کەسیان لە سێدارە دراوە کە سیانیان بران.

مەحمود بەگی دەلۆ، دۆستایەتی هەبوو لەگەڵ شێخ ڕەزای شاعیر، شێخ ڕەزاش هاوینانان هاتووەتە ئەم دێیە. لە ساڵی (١٩٨١) مەفرەزکانی پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێ، چالاکییەکانیان لەم گوندەو دەورووبەریدا دەستی پێکردو چەندین بەرگرییان لەم گوندەدا کردووە ولەم گوندە هەشت شەهیدیان هەیە.

*** گوندی (بەیانلو):**

لە دووری ٧ کیلۆ مەتر لەباکووری خۆرهەڵاتی لەیلانەوەیە جەبەلی مەتارە لە باکوورو باشووری خۆرئاواوە درێژ دەبێتەوە لە ناوچەی تاوغ و خورماتوو لەگەڵ ناوچەی قەرەحەسەن سنووریژ دەکات، لە رووی جوگرافییەوە ئەم ناوچانە دەکاتە دووبەشەوە، لە باکوورو باشووری خۆرهەڵاتەوە جەبەلی مەقانە کە ناوچەی جەبارییە لە قەرەحەسەن، ناوەندی کارگێڕییەکەی لەیلانە، ژمارەیەك

گردی دەسکردی پێش ئیسلامی تێدایە وەکو گرد تمجایو تەپەی شێخ کەمال و تەپەی زاواو تەپەلو و تەپەی ئاوە شوێرو تەپە قووت، هەتا ئێستا بە پێوەن و پەیوەندییەکی جوگرافی بە قەڵاکەی کەرکوکەوە هەبووە.

یەکێك لە ئاوایییەکانی خورهەڵاتی ناحییەی لەیلان گوندی بەیانلوە کە لە بناری جەبەل بەرچەگلە، پێشتر نیشتەنی چەم سولکاتی کەلاوەکانی شێخ عوبێد تالەبانی بوون. پاش (١٥٠) ساڵ جێ گۆرکێی پێوە کراوە، کە بەیانیان خۆر لە مەقانەوە کازیوەی داوە لە ناو تەم تووەمانا لێڵ بووە ئیدی بووە بە بەیانلو، بۆیە کە ڕۆژ بووەتەوە لە تاریکستانی دەرچوونە و بووە بە دەمەوبەیان ناوەکەی لەوێوە سەرچاوەی گرتووە.

سێ سەدە پێش ئێستا ئەم ناوچەیە شوێنکەوتووانی یارسانی تێدا ژیاوە واتا کاکەییەکان و دواتر تالەبانی و هۆزەکانی لەك و ساڵەیی و زەنگەنەو هەروەها لەگەڵ لوڕی تێدایە.

قەمەر دەدەم کانیاوێکی سازگار بووە لە بەیانلو شوێنی کۆبوکۆبوونەوەی ڕیش سپییەکان بووە لەودەمانەدا ئێستاش نەورۆزی لێ پیرۆز دەکەن لە داری بیی و پەلەك، ئەم گوندە لە رابردوودا شوێنی کاروان سەرابووە و لە هەموو شوێنەکانەوە هاتوو چۆی لەسەر بووە.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هاتوونەتە ئەم گوندەو تالانێکی زۆریان کردووە دوو کەسی گوندەکە بەرگریان کردووە لەم گوندەداو دوو کەسیان کوشتووە.

ئەم گوندە زەوییەکی زۆر بەپیتی هەیە ولە سەرەتادا مەرەزەی تێدا کراوە، بەڵام لە دوایدا خەڵکەکەی دەستیان داوەتە کشتوکاڵی زستانەو هاوینە، زەوییە کشتوکاڵییەکانی نزیکەی (١٩٠٠٠) هەزار دۆنم دەبێت، لە ساڵی (١٩٨٢) شەڕێکی گەورە لەنێوان پارتی و پێشمەرگە لەگەڵ تیپی چواری جەباری ڕووی داوەو ئەمە گوندە (٢٠) شەهیدی هەیە".

*** گوندی کانی گوڵ:**

ئێرە مەملەکەتی نێو جافانە لە گەرمیان گوندی (کانی گوڵ) یش لە ناوچەی باوە نوورە، هەر لێرەوە ڕێگای جاف بووە کە گەرمیان و کوێستانیان کردووە. ڕووباری بەناوبانگی کوردەواری ڕووباری سیروان لە دەوری زمناکۆو چیای خروشکەوە دەست پێ دەکات و ناوچەی شەرەفبەیانی لە دەڤەرەو وڵاتی خانەقینی لەوبەر ناوچەی دێوەری جاف لەمبەر سنووررێژ دەکات.

ئەوان واتە ئێلی جاف لە ناوچەی جوانرۆو سولالەی باوەجانییەوە لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری کوردستان (٣٠٠- ٣٥٠) ساڵێك بەر لە ئێستا کۆچیان کردووەو گەرمیانیان کردووە بەواری زستان و لە ناوەراستی مانگی گوڵانا ئەم گەشتە کراوە کە بەناوبانگ بووە لە کوردستان و چەند سەد ساڵێك پەیڕەوکراوە هەتا ئێستایش ئەم نەریتە لە کوردستاندا ماوە.

تیرەتی گەرمیانیان بە جێهێشتووەو تەدارەکی گەشتی بەناوبانگی کوێستانیان قۆناغ بە قۆناغ بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات، مێگەل و گایەل و ڕانیان پێش خۆیان داوە لەومرگاو پاوەنیان لەو ناوچانە دەستەبەر کردووە لەو سەروو بەندە سێ برا لە نەوەی ڕۆغرایی و باشکی و ترخانی لە کۆچە ڕێی ئاوایی مراوەوە هاتوونەتە جێ دارو پایزەوار.

غەفورو قەومەکەی لە ئاوایی یاقە کۆسەر جێگربوونەوە هاپۆ رەسوول لە ئاوایی ئیمام محەمەد نشیتەجێ بووە لە نزیك گۆرەسپی، برای سێیەمیان حەمەرەشید ناو خاس هاتووتە سەر کانیاوێکی شیرینی و سەرتۆپی گوڵ بووە لە کانی گوڵی پێواز لە ناوەندی گەرمیان نیشتەجێ بووە، ئەم بۆ (٢٠٠- ٢٥٠) ساڵێك پێش ئێستا دەگەڕێتەوە.

بەڵام ئەم ناوچەیە تێکرا ناوچەیەکی مێژوویییە کە پایتەختیان لە ئاوایی بووە دەگەڕێتەوە بۆ (١٦٠٠) ساڵ پێش زایینی کانی گولێکی تریش هەیە هی مەلا ڕەشیدە لە بزێنان لە شارباژێر کە جیاوازە لەم کانی گوڵە.

ئەم گوندەو ناوچەیە کۆنە ساڵە، چونکە (١- ٢) هەزار ساڵ ژیانی تێدا هەبووە، گەلێك شوێنەواری جۆراوجۆری تێدا بووە، بۆ نموونە جێوار گەلێك گۆزەو ئالتون و پاشماوەی ئێسك و پروسکی مرۆڤی تێدا دۆزراوەتەوە، پایزەواریش یەکێك بووە لەو شوێنەوارەی گۆزەو ئێسك و پروسکی تێدا دۆزراوەتەوە، قەبرسانی لەکانیش لە خوارترە کە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی (لەك) کە لە کۆندا ئەم شوێنەیان ئاوەدان کردووەتەوە، پارە دارو گالە ڕێگایش لە شوێنە کۆنەکانیان بووە.

زۆربەی هاتووچۆی ئەم گوندەش بۆ کفری بووەو لە ڕووی بازرگانییەوە نزیکەی پێنج ڕۆژی خایاندووە ئاوایییەکانی دەوروبەری کانی گوڵ بریتی بووە لە مراواو چەمی شوێر لە خوارەوەو ئیمام حەمەو توورکەو تالەوان و گۆرێزکەو بەربایل و شێخ تەویل و گردە ڕەش و سێ کەلەشێرەکان و پاریاولاو مۆرەوایە.

ئەم گوندە ناوچەیەکی ئاودارو شوێنێکی بەرچاوە لە کشتوکاڵ و مەرداریدا لە ڕابردوو و ئێستادا.

*** گوندی (کۆرو مۆر):**

یەکێکە لە گوندەکانی بنار گل سەر بە ناحییەی قادرکەرەمە بە دووری نزیکەی (١٠) کیلۆ مەتر دەکەوێتە باشوورییەوە هەروەها بە دووری (٧٥- ٨٠) کم لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە، بەر لە ئەنفال نزیکەی (٦٠) ماڵی نیشتەجێی بووە،، بەڵام لە ئێستادا نزیکەی (٣٠) ماڵی گەراوەتەوە.

بنەرەتی ناوەکەی لە مێژوودا بە سێ ناو هاتووە، یەکەمجار لە سەرەتای دروست بوونی بەناوی گوند (کۆشك) بەناوبانگ بووە، ئێستا کۆشك دەکەوێتە خوارووی ئەم گوندە کە تاکو ئێستا شوێنەواری تێداماوەو لە سەرەتادا شارێکی فراوان بووەو هەموو دەزگا کارگێرییەکانی تێدا بووە.

بەڵام دوای ماوەیەك (ئالی خان) یەکێکە لە گەورەکانی عەشیرەتی گل لەگەڵ (جان وەیس بەگ) وفەرهاد بەگ و بەهرام بەگ دێی سێ چوار گوندێك لەم ناوچەیە ئاوەدان دەکەنەوە ئەم دێیە لەسەرەتادا ئالی خان ئاوەدانی دەکاتەوە ناوی ئەو کاتەی ئالی خان بەگ دەبێت دوای لە کاتی ئیشکردندا شتێك دەدۆزنەوە، وەکو مۆرێکی بچووك مۆری لوولەی بووە

جاران، لەو کاتەدا پیاوێکی بەسالاچوو دەڵێت ئەمە مۆرێکی (کۆرو مۆرە) بەمانای مۆرێکی کۆن ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی ئیمارەتی ئەردەلانییەکان.

لە ماوەی تەمەنیدا ئەم گوندە سێ جار سووتاوەو تالان کراوە تا گەیشتۆتە سەر ئەنفال، لە سالی (١٩٧٤) فرۆکە بۆ یەکەم جار لەم گوندەی داوەو زیانێکی زۆری پێگەیاندووە (١٤) شەهیدی سەنگەرو (١٧) شەهیدی سڤیل (٢٤- ٣٠) ئەنفال کۆمەلێك عەشیرەتی وەکو گلو شێخانو زەنگەنەو جەباری تێدا هەبووە.

*** گوندی (هەکز):**

ئەو گوندە لە ناوچەیەکی هەمەوەندایە لەنێوان گەلی سەلبات‌و شاخی شۆراودایە کاتی خۆی لە میربوداقەوە لە بابانەکانەوە بەکۆچرەو هاتوونەتە ناوچەکەو ئاوەدانیان کردووەتەوە ئاوایی هەکز لە پێشدا لە خانە کۆن بووە، کە ئاو و کانیاوی هەبووە، بەشێکیان هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستاو بەشێکیان لە چەمچەمال نیشتەجێ بوونە لە تەنیشت گوندی (مۆفەر) بووە هەروەها ئەم گوندە سەرەرێی کاروان سەراو هاتووچۆ بووە لە رابردوودا لە ترسی جەردەو حکومەت ئاگرێکی کزیان هەلکردووە پێیان ووتووە (هەکز) بە مانای (کز).

لە ئاوایی هەکز هەندێك شوێنەواری کۆن هەیە وەکو دارسەراوە، قەبرسان، ئاشەکۆنە، حاجی ئەسمەر گوایە کەسێك هەبووە ناو ئەسمەر بووە، خەلکی دێیەکەش گەلێك پارەو ئێسك‌و کوپەی جۆراوجۆری تێدا دۆزراوەتەوە.

لە سالی (١٦٥٠)ی زاینی ئەم گوندە لەلایەن کوێخا ئەحمەدو کوێخا عومەر (ئۆمەر) باپیرەیان حەوت برا بووەو بەناوەکانی قارەمان‌و نەریمان‌و رەشیدو حەمە رەش‌و فەرەج‌و عەودل‌و عەبدولقادر، فەرەج دەچێتە (سنە) لە کوردستانی رۆژهەلات.

لە سالی (١٩٦٥) حەرەسی قەومییەکان هێرش دەکەنە سەر (هەکز) خەلکەکە چوونەتە لای دێی قەلاچووغە گەلێك تالان‌و سەرمالی‌و خەلکەکەیان هەمووی پێچاوەتەوە.

دێیەکانی دەوروبەری هەکز بریتییە لە: کورەداوێ قەلاچووغە، خالدان‌و باینجان‌و قەرەتاموورە.

لە دێی هەکز دوو جۆر زەوی هەیە زەوییەکیان تاپۆیەو زەوییەکیان گرێ بەستە، بە کۆی گشتی (٣٠٠٠) هەزار دۆنم زەوی کشتوکالیان هەیە هەش سەت دۆنمی گرێ بەستەو باقی تاپۆیە هەر جووتیارێك (٤٠) دۆنمی بەرکەوتووە لە کەرتی کشتوکالی ٥٠ دایە.

*** گوندی (عەنانە):**

یەکێکە لەو چەند گوندەی کە بەناوچەی تالەبانی دەناسرێت لە رووی کارگێرییەوە سەر بە داقوقە ئەم گوندە (١٥) کیلۆمەتر لە قەزای داقوقەوە دوورە. بە دووری (٦٠) کیلۆ مەتر لە دووری پارێزگای کەرکوکەوە.

گوندی عەنانە نزیکی (٣٠) مالی لێ نیشتەجێ بووەو بە مالدارییەوە خەریك بووە، ئەم گوندە هاوسنوورە لەگەل دێیە عەرەبە نشینەکانەوە، هەروەها بە کشتوکالەوە خەریکن. شێخ خێروللا کوری شێخ فەیزوللا ئەم گوندەی ئاوەدان کردووەتەوە تاکو ئێستا پاشماوەی خانووەکەی لەم گوندەدا ماوە.

دەربارەی بنەرەتی ناوی (عەنانە) لە دوو بۆ چوونەوە هاتووە کە گوایە لە (عانە) کە جۆرە پارەیەك بووە لەوانە بە عانە.. عانە ئەم گوندە پارەی بۆ کۆکرابێتەوەو دروست کرابێت. بۆ چوونێکی تر دەلێت گوایە ئافرەتێکی کورد هەبووە ناوی (عەنانە) بوون زۆر خان‌ومان‌و رێکوپێك بووە لەبەر ئازایەتی ئەوەوە ناوی دێیەکە ناونراوە. شیوی کۆردەرە تا عەنانە نزیکە (٢٠٠٠) هەزار دۆنمە بە دەستی عەرەبەکانەوەو داگیر کراوە.

***گوندی (بانشاخ):**

ئەم گوندە لە ناوچەی داوێیە لەسەر ئاوە سپی، یەکێك لەم هۆزانە کە هاتوونەتە ئەم ناوچانە هۆزی (وەنداوێیە – وەناو) ی یەکێك لە پیاوەکانی پیرداود، مام داود بووە لە قەلاچەرمك ژیاوە حەوت کوری هەبووە.

لە جەول غەرە و جەول مازوخ‌و جەول قاجر بلاوبوونەتەوە، هەندێك ئاماژە بەوەدەکەن کە لە ئیلام حەوت مالەی بانەسیران هەبووە ئەوانیش یەکێکن لە هۆزە گەورەکانی کە کەلوورن ئەم داودە لەوێوە هاتوون، داوێ‌و گل‌و میساوی‌و گۆمەیی‌و رەواتی‌و بانەوەری‌و شێخەونی‌و زەنگەنەی تێدا دەژین.

شێخ ئەحمەد ناوێکش لە قەلای دمدم دەبێت لەسەردەمی شا عەباس کە کاتێك خانی لەپ زێرین تێك دەشکێنێت، ئەم شێخ ئەحمەدە پەراگەندە دەبێت‌و ئاوارە دەبێت دێتە داوێ، بەگزادەکانیش لە شاخاتوونی کە مەرقەدەکەی لە ئاوبارێکی ناو گلە کاتێکش سەفەوییەکان بەغدا داگیردەکەن عوسمانییەکان پەنا بۆ کورد دەبەن (٥٠٠) سوارەی کورد بە سەرۆکایەتی هیلال‌و موورادو مەنسور دێنە سەلاحییەو ناوچەی جەوەل مەنسوور ئەو ناوچانە ئاوەدان دەکەنەوەو دەیپارێزن کە نزیکەی (٧٠) شەهیدیان لەو ناوچەیە.

ئاوایی قەلای بانشاخ، یان قەلای مەدحەت یەکێکە لەو ئاواییانەی ناوچەی داوێ لە سنووری خوورماتوو کە (٥٠٠) سالێك بەر لە ئێستا ئاوەدانکراونەتەوە.

وەناوییەکان لەم گوندەدا گەلێك شوێنەوارو قەلایان لەنێو گوندەکەدا بەجێماوە. هەروەها لەم گوندەدا جوولەکەیش ژیاوە گوندەکانی دەوروبەری ئاو شاخ بریتی بووە لە باشتەپە، گەرگەرەکان، چان، نامیق، ئاوایی رەزا، قووم پەلکە، شۆراو، دووراجی‌و ئاوایی مەحمود.

لە سالی (١٩٨٥) شەری بەناوبانگی زینانە رووی داوە لە ناوچەی گەرمیان‌و بەشێکی زۆری خەلکەکە پەراگەندە بوونە بەشێکی زۆری ئەم گوندە لە کنگربان نیشتەجێ بوونە.

لە سالی (١٩٨٤)دا چالاکییەکی پێشمەرگە لەگەل سوپای بەعس رووی داوەو (٢٥) پێشمەرگە شەهید بوونە ئەم گوندە لە کەرتی کشتوکالی (٥٥) دایە کە بەناو (٣٨) جوتیارەوە تۆمار کراوە کە هەریەکەی (٧٠) دۆنمی بەناوەوەیە لەم گوندەدا کارێزێکی زۆر کۆنی تێدا بووە کە لە رۆژهەلاتەوە هێناویانە، زۆری زەوییەکانی لەسەر باران کشتوکالیان

کردووە. لە ساڵی (١٩٦٣)دا حەرەس قەومییەکان هێرشیان کردە سەر ئەم گوندە، بەڵام لەگەڵ (١٣) پێشمەرگەدا ڕووبەڕوو بوونەتەوە و شپرزەیان کردوون.

*** گوندی (ژالان):**

(٣٠٠) سێ سەد ساڵێك بەر لە ئێستا چولر برا لە هۆزی سمایلی کە کوڕانی عەلی ڕۆغزائی دەبن پێنج کوست دەکەنە زستانە هەواری خۆیان یەکێکیان ناوی خدر دەبێت ئەو ژالان و کونە کۆتر دەکات بە مەملەکەتی خۆی (جوبریل)ی سمایل کۆزەی هەوارە ڕەقەو موورادی سمایل پەلەووشكو کاکەخانی سمایل ئاوایی کاکەبرا دەکەن بە مەملەکەتی خۆیان هەر لەو ناوەشدا لەناو ڕەشەدەوار دەبن سەد ساڵێك بەر لە ئێستا حەمەدی عەبدول قادری مەحمەلی ئاوایی ژالانی سەر هەوا سەڵی ئاوەدان دەکاتەوە.

لە ساڵی (١٧١٤)ی زاینیدا سولتان موورادی چوارەم نازناوی موورادی بە خشیوەتە زاهیر بەگی جاف کە پێکەوە بەشداری ڕزگار کردنی بەغدا دەکات ئەمانەش بەشێکن لەو زاهیر بەگە.

لە ساڵی (١٩٤٧)دا کوولەیەکی زۆر لەم ناوچەیەی داوەو لە ساڵی (١٩٤٩)دا بەفرێکی سوور باریوەو نەخۆشی سووریژە زۆری خەڵکەکەی کوشتووە.

دێیەکانی دەورووبەری:- دێ خەڵوە، پەڵەووشك، کووڵە جۆ، گۆمەزەردە، کاکە براو وارەیە.

لە ساڵی (١٩٧٨) قوتابخانەی تێدا کراوەتەوەو مەلا کەریمی حەمیدی ئاغای زەنگەنە دەبێتە مامۆستاو دەوری هەبووە لە شۆڕشی کوردایەتی لە نێو ئەم گوندەدا. کە برای عەبدولمەجید زەنگەنە بووە لە دوایدا لە گوندی قەیتول شەهید بووە.

لەم گوندەدا (٤٤) ئەنفال و شەهیدی هەیە، لە کەرتی کشتوکاڵی (٧٤)ەوە تۆمارکراوەو زەوییەکەی دێراوەو بۆ دانەوێڵەو خەلە بەکاردەهێنرێت و لە ڕابردوودا گەلێك کانیاو و کارێزی هەبووە.

لە ئێستادا نزیکەی (١٢) ماڵ دەبن‌و ئاوەدانکراوەتەوە لە پایزی ساڵی (١٩٧٩)دا یەکەم مەفرەزەکانی شۆڕشی نوێ هاتوونەتە ئەم گوندە، هەر لەم گوندەدا داستانێکی بە ناوبانگ تۆمار دەکەن دژی ڕژێمی بەعس.

*** گوندی (شانشینی):**

یەکێکە لە گوندەکانی ناحییەی پردێ، کە دەکەوێتە ناوچەی ساڵەیی گوندی شانشینی لەسەر زوورگی چیاکانی دومەڵان لەو سەردەمانەدا نەوەکانی ساڵح ئاوەدانیان کردووەتەوە کە نزیکەی ٣٦ گوندیان ئاوەدان کردووەتەوە، سێ هۆزی تێدایە کە ساڵەییە بنیاتنەری گوندەکەن، هەروەها بابۆڵینی لە هۆزی گەورەی ئاکۆیین ئەوی تریشیان هەشەزینین. لە گوندی جەڵەمۆردی بناری شاخی خاڵخاڵانەوە هاتوون.

لەم گوندەدا گەلێك شوێنەواری کۆنی تێدا دۆزراوەتەوە، مێژووی ئەم گوندە بۆ (٢٠٠- ٣٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوەو بنەڕەتی ناوەکەشدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (شا) جێنشینی ئەم شوێنە بووە، یان لەوانەیە بەهۆی خۆشی شوێنەکەی لە بەهاراندا ئاو و سەوزایی هەبووە کە پیاوی گەورەو شایان هاتوونەتە ئەم شوێنە. یان ماوەیەك کە مەغۆلەکان لە پردێ شکاون هاتوونەتە ئەم گوندە.

ئاواییەکانی دەورووبەری گوندی شانشینی نەبیاوە قەزنەفەرە، بەرامبەر یارمجە، کەڵووڕو گورزەیی، ئەو دیویشیانەوە قەڵا هەرمەتە.

گوندی شانشینی کۆن پێش (٥٠٠- ٦٠٠) ساڵێك لەسەر چیای کانی دۆمەڵان بووە بەهۆی بوونی زۆرگی زۆرو شوێنگەیەکی ئاوی زۆری هەبووە، کانیاوی زۆرو شیرینی وەکو کانی شوانکارەو زەهاوی‌و شاخ‌و زورگ هەبووە (١٠٠) سەد ساڵێك پێش ئێستا داکشاونەتە خوارەوەو هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستایان.

سێ هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵی هەیە نزیکەی (١٢٥٠) هەزار سەر مەڕی تێدایەو زەوییەکەی زۆر بە پیتە بۆ کشتوکاڵ.

*** گوندی (حوسێنی ئیسلام):-**

ئەم گوندە کەوتووەتە ناوچەی قەرەحەسەن، لە ناحییەی لەیلانە لە بناری تەپەی (دەربازان)، دەکەوێتە باشووری گوندی خاڵۆ بازیانییەوە کە درێژە پێدەری شارێکی ژیاری گەورە بووە بە ناوی (گۆماویل)، گۆزەو خشتیان هەبووە سەرەڕێی کاروان سەرای نێوان بەغداو ئێران بووە، هەروەها شوێنی ئیمام محەمەدی کاکەییەکان بووە.

دەڵێن پیاوێك بە ناوی حوسێنەوە کە لە یارسانەکان بووە بووەتە موسڵمان، بۆیە پێیان ووتوە (حوسێنی ئیسلام)، بۆیە ناوەکەی لەوەوە هاتووە، لەبن جەوەڵی دار خورما لە بنی خانووی دۆنگز ژیاوەو خەڵوەتی گرتووە، تا ئێستاش شوێنی بن کۆنە هەواری ماوە لە شیو ئاوە پیس. هەندێکیش دەڵێن دووبرا بوونە لە ناوچەی شوانەوە هاتوون لە سەردەمی کۆچی کوێستان‌و هاویناندا ئێل‌و هۆزە کوردەکان، قەومێك لە شێخ بزێنییەوە دێنە ئەم ناوچەیەو لە ئاوای (دسکەرە) لە شارەزوور برێ لە قەومانی جاف ڕۆغزایی بۆ قرخ‌و تاڵەبان کۆچ دەکەن‌و لە جافانی تاڵەبان ماون دواتر بارووبنە دەگوازنەوە بۆ جافانی لای کەوەڵەو لە سەدەی نۆزدەهەم لە ئاوای حوسێن ئیسلام جێگیر دەبن، زستانە هەواریان لەو ناوچەیە هەڵدەخەن ئەمانە تێکرا (٢٥٠) ساڵێکی خایاندووە.

هەریەکە لە هۆزی جاف‌و زەنگەنەو شێخ بزێنی‌و کاکەیەیی لەم گوندە دان، گەلێك شوێنەواری کۆنی تێدایە وەکو شوێنی ئاوەپیس، قەڵایی، کوێرەکان.

لە ساڵی (١٩٤٦) تەرزەیەکی زۆر باری ولە ساڵی (١٩٤٧) کولەیەکی زۆر لەم گوندە دای بە سەریدا لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان گوندەکەیان سووتاند ئاواییەکانی دەورووبەری حوسێن ئیسلام بریتیی بووە لە خیربەگ، قشڵاوکۆن، بان لەیلان، خاڵۆ بازیانی، حەسار، کەوڵە، جافانە، قازان بڵاخە، مەملییە، فەرقان، قایش پاشا، پەڵکانە، شوانە، لە ساڵی ١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٦٥، ١٩٧٠، ١٩٨٨ سووتێنراوە، ئەم گوندە (١٠) ئەنفالکراوی تێدایە لەگەڵ (٦) شەهید.

*** گوندی (لفتی ئاغا):-**
یەكێكە لە گوندەكانی ناوچەی داوتی، لە ناحییەی نەوجولە لە قەزای كفری، زیاتر (١٠٠) كیلۆ مەتر لە كەركوكەوە دوورە بە دووری (٧٥) كیلۆ مەتر دەكەوێتە باكووری رۆژهەڵاتی قەزای خورماتووەوە، دەكەوێتە سەر رووباری (ئاوە سپی) ئەم گوندە پشت بە كشتوكاڵو مەرداری دەبەستێتو لە ئێستاد (٣٣) ماڵ گەراوەتەوە ئاوەدانیان كردووەتەوە.
گوندەكانی دەوروبەری بریتییە لە وارانی خواروو، وارانی سەروو، چەوری، ساڵەیی، پەلكانەی یاسین، باشتەپە، عەرەب ئاغا، ئۆمەرسۆق، هەیەرە سوور، نەوجوول، منارە.
ئەم گوندە كەوتووەتە ناوەرۆكی داودە، كە بە ناوی كۆشكەبیرەوە بووە، بەڵام لە دوایدا بووەتە (لفتی پاشا) كە مێژووی ئەم گوندە زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ دەگەرێتەوە بنەرەتی ناوەكەشی بۆ لوفتە ناوێك دەگەرێتەوە كە ئەم گوندەی لەگەڵ براكەی ئاوەدان كردووەتەوە، لە سەردەمی گرانییەكەدا یارمەتییەكی زۆری گوندەكانی دەوروبەری كردووە تا لە ناخۆشیە رزگاریان بووە.
بنەرەتی ناوەكەشی بۆ لوفتە ناوێك دەگەرێتەوە كە ئەم گوندەی لەگەڵ براكەی ئاوەدان كردووەتەوە، لەسەردەمی گرانییەكەدا یارمەتی زۆری گوندەكانی دەوروبەری داوە.

*** گوندی (تركە شكانی ژوورو - توورك شكان):-**
ئەم گوندە لە بناری جەوەڵ بۆرە لە ناوچەی قەرە حەسەن كە سەر بە ناحییەی لەیلانە لە پانزە كیلۆ مەتری خۆرهەڵاتی كەركوكەوە دوورە، كە بە بنەرەتی ناوەكەی (توورك شكان) ە لە سەردەمی عوسمانییەكانەوە كە هۆزەكانی دەلۆو زەنگەنەی تێدا نیشتەجێ بوونە.
لە چلەكانی سەدەی رابردوو سی خێزان لە تركەشكانی ئاوایی خوارووەوە لە بناری شاخی مەتارە هەڵدەكشێن بەرەو جەوەڵ بۆر لەوێ نشیتەجێ دەبنو هەر بەناوی ئاواییەكەی خۆیان ناوی دەنێن تركەشكان دەشڵێن یەكێك لە نەوەكانی میر سمایل میری زەنگەنە لە قەیتول بناری جەوەڵ مەتارەی ئاوەدانكردووەتەوەو بە ناوی زاهیری جوامێرو هەر لە تۆڵەی سەرنەگوم كردنی میر سمایل پێش (٣٠٠ - ٤٠٠) ساڵێك شەرێكی گەورە لەگەڵ عوسمانی دەكەنو لەوێدا دەیشكێنن.
ئەم گوندە هێڵی سنوورە لەگەڵ گوندە عەرەبەكان كە لە سیاسەتی تەعریب كردن هێنراونەتە ئەم ناوچەیەو هەردەم هێرشیان كردووەتە ئەم ناوچەیەو بەردەوام تالآنو سووتاندویانە بەتایبەتی لە ساڵەكانی (١٩١٧ -١٩١٨، ١٩٦٣، ١٩٨٨).
لە شەستەكان سەدەی رابردوو حەرەس قەومییەكان لە عەشیرەتی عوبێد هێرشیان كردووەتە سەر ئەم گوندەو تالآنیان كردووەو سێ كەسیان لەم گوندە دا سەربریووە لە ساڵی (١٩٦٥ - ١٩٦٧) دووبارە هاتوونەتە ئەم گوندەو تالآنیان كردووە.
لە ساڵی (١٩٧٤) سوپای عێراق ئەم گوندەی داگیركردوو چەند كەسێكی گولەباران كرد.
ئاواییەكانی دەوروبەری: تەرجل، قازان بلاخ، حەسەن ئاوایی، جیبات، لەیلان، یەحیاوا، قەرەلو، یارمجە، هەروەها ئەم گوندە رێگای كاروانچی بوو لە هاتووچۆ بۆ كەركوكو دەووربەری، سەرچاوەیەكی زۆری گەچی تێدا هەبووەو ئێستاش كورەی گەچی تێدا هەیە.
ئەم گوندە لە كەرتی كشتوكاڵی (٥٣)یە بە ناوی (١٧) جوتیارەو هەریەكەی لەنێوان (٦٠ - ١٠٠) دۆنمی بە ناوەوەیە لە سەرەتادا نزیكەی (٢٠) ماڵی تێدا هەبووە لە پێش ئەوەی ئەنفال بكرێن، لە ئێستادا (٥٥) ماڵی تێدا هەیە.

*** گوندی (حەساری گەورە):-**
یەكێكە لە گوندەكانی ناوچەی ساڵەیی، لە رووی ئیدارییەوە سەر بە ناحییەی (پردێ) یە، بە دووری شانزە كیلۆ مەتر دەكەوێتە باكووری كەركوكەوەو لە عەشیرەتی بیبانین.
ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە لە لایەن رژێمی بەعسەوە خەڵكەكەی دەربەدەر كراون كە ئەوكاتە زیاتر لە (١٠٠) ماڵی تێدا بووە لە دوایدا بە مەبەستی بە عەرەبكردنی گوندەكە عەرەبیان لەم گوندە نیشتەجێ كردووە، تاكو پرۆسەی رزگاركردنی عێراق بەردەوام بوونە، ئێستا نزیكەی (٤٠٠) ماڵی تێدا هەیە.
گەلێك رۆشنبیرو نووسەری تێدا بووە، حەكیم كاكەوەیس، جەلیل كاكە ویس، حەمە كریم عارف، لە ساڵی (١٩٥٩) قوتابخانەی تێدا دروست كراوە.
لەم گوندەدا چایەخانەو گەرماوی ژنانو پیاوانی تێدا هەبووەو قوتابخانەو پێویستییەكانی تری ژیان وەكو مەكینەی ئاش دەربارەی بنەرەتی ناوەكەی لە سەرەتادا بەشێك لە خێزانەكان لە ناوباخەوە جیابوونەتەو هاتوونەتە ئەم شوێنەو حەسار یان شوورەیان بەدەوریدا دروست كردووە.
لەم گوندەدا بایەخێكی زۆریان بە كشتوكاڵو ئاژەڵداری دەداو لە رابردوودا مەرەزەیان دەكرد.

*** گوندی (لالەبان):-**
ئەم گوندە لە ناوچەی گەرمیانە لە ناحییەی قەرە تەپە لە كفری كە بە لالەبان یان لالە بۆن عەرەبیش ناوی نابوو (للبن) سێ سەد ساڵێك پێش ئێستا یارانی یارسان، باوە خوبیارو دایە خووبیاری تێدا بووە، شێخ باوەی یارسانیش لە جەلەولاو باوە شاسوار لە كفریو باوە مەحمی لە خانەقینی، باوە گورگور یارسان بووە، بۆیە ئەم گوندەش هەر لەسەر دەستی ئەوان ئاوەدانكراوەتەوە سنوورەكانی لە رۆژهەڵاتەوە ناوچەی پاڵانییە لە باكوورەوە شێخ لەنگەرو ناوچەی تالەبانو لە خوارەوە قەرەتەپەو لە رۆژئاواوە زەنگەنەیە، ئەم ناوچەیە بە زەند ئاباد بە ناوبانگە لەبەر ئەوەی زەند ئاودانی كردووەتەوە. كە نزیكەی (١٥) ئاوایی دەبێت كە زەندی تێدا دەژین، هەروەها كەلهوریشی لە رابردوو دا تێدا ژیاوە.
ناوەكەشی دەگەرێتە بۆ ئەوەی كە گوڵێكی تێدا بووە بە ناوی لالە بۆن كەدوای بووەتە لالەبان ئاواییەكانی دەوروبەری قیچ قەراغ، بان سەندوق، تازە شار كۆكس، قووبە، كولە جۆ، قەڵا، بنە باغ، تەپەكزن.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان ئەم گوندەیان سووتاندو تالانیان کردووە. تا ماوەیەکی زۆریش عەرەبیان هێناویەتە ئەم گوندە تا پرۆسەی ئازادی. لەم گوندە دا گەنمو جۆو برنجو هەموو جۆرە سەوزەیەکی هاوینەی تێدا کراوەو ئاوی زۆر بووە، لەگەڵ بوونی رێژەیەکی زۆر لە خورماو پرتەقاڵو قۆخو سێوی تێدا هەیە بۆ بەرهەمهێنان.

لەم گوندەو ناوچەکانی دەورووبەری گەلێك تەپەی دەستکرد هەن کە مێژوویان زۆر کۆنو دوورەو هەندێکی لە شوێنی بەرز دروست کراوە لە ترس دوژمنو بۆ بەرگری کردن لە خۆیان، هەندێکشیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانییەکان پرۆژەیەکی ئاودێری لە ناوچەکە راکێشراوە کە بەم گوندەشدا تێدەپەڕێت کە بە پرۆژەی قەرەتەپە بە ناوبانگە.

*** گوندی (زینانە):-**

یەکێکە لە گوندە گەورەکانی ناوچەی داوێو گەرمیان کە بە دووری ٣٠ کیلۆ مەتر دەکەوێتە رۆژهەڵاتی خوورماتوو هەروەها ٣٠ کیلۆ مەتر لە قەزای کفرییەوە دوورە.

لە ساڵی (١٩٩٢) ئەم گوندە ئاوەدان دەکرێتەوەو بە بریارێکی حکومەتی کوردستان مەرکەزی ناحییەی نەوجول دەگوازرێتەوە بۆ زینانە لە ئێستادا زینانە بووەتە ناحییە لە رووی ئیدارییەوە سەر بە قەزای کفرییە.

لە ئێستادا نزیکەی ٧٠ ماڵی لێ نیشتەجێ بوونە، مێژووی ئەم گوندە زۆر کۆنە، بنەرەتی ناوەکەشی لە زیندان – زینانەیە کە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا زیندانی تێدا بووەو تاکو ئێستا پاشماوەی ئەم زیندانە ماوەتەوە، مێژووی بۆ ٧٠٠ ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە. گەلێك پاشماوەی شوێنەواری جۆراوجۆری تێدا دۆزراوەتەوە، ئەم شوێنە پێویستی بە کنەو پشکنینە بۆ بەدەستهاتنی مێژووی زیاتر لەم گوندەدا گەلێك چالاکیو خەباتی پێشمەرگەی تێدا روویداوە وەکو شەڕی یا داستانی زینانە بە ناوبانگە، کە نزیکەی ١٠٠٠٠ هەزار کەس لە سوپای بەعس بەشداری ئەم شەڕەییان کردووە کە نزیکەی ١٠٠٠ کەسیان لێ کوژراوە، لەم داستانە دا ٤ پێشمەرگە شەهید دەبێت لەگەڵ ٢ هاووڵاتی گوندەکە.

ئەم گوندە بەکاری کشتوکاڵیو ئاژەڵداری بە ناوبانگەو دەوری بینیوە لە بەپیتی زەوییەکەییوبوونی ئاو لەم شوێنەدا.

*** گوندی ئاسرو میسر:-**

ئەم گوندە دەکەوێتە بناری خاڵخاڵانەوە، لە رووی ئیدارییەوە سەر بەناحییەی شوانە، ئەم گوندە بە دووری (٨٠) کیلۆ مەتر لە باکووری شاری کەرکوکەوەیە.

ئەم گوندە پێش پرۆسەی بەد ناوی ئەنفال نزیکەی ٣٠ ماڵ دەبوون، یەکێك بوو لەوگوندانی کە سەرەرێگای بازرگانی بووەو گەلێك کانی تێدا هەبووە لەو سەردەمانەدا. بنەرەتی ناوەکەی لەوەدا هاتووە کە دووبرا بووە بە ناوەکانی ئاسرو میسر کە ئەم گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوە ئەم گوندە بەناوبانگ بووە بە کشتوکاڵو مەرداری لە بەخێوکردنی ئاژەڵدا دەوریان بینووە ئەم گوندە حەوت جار هەر لەسەردەمی حەرەس قەومییەکاندا سووتاوەو خەڵکەکەی دەربەدەربوونە لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٦) مەفرەزەکانی پێشمەرگە لەم گوندەدا چالاکیان ئەنجام داوە.

*** گوندی قەسرۆك :-**

قەسرۆك کەوتووەتە ناوچەی شێخ بزێنی سەروو، لە بناری خاڵخاڵان، ئەم شێخ بزێنییانە لە کوردستانی رۆژهەڵاتەوە هاتوونەتە ئەم شوێنە، ئەم گوندە شوێنەوارێکی زۆرو بەرچاوی لێیە وەکو قەڵایی (سەڵتە ئەحمەد، شاخی کەرکە، ساتوو قەڵا، گردخەبەر، ساوەر کولێنی).

بنەرەتی ناوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە شاخی کەرکە قەسرێکی تەواو جوانی لێ دروستکراوە ووتراوە قەسرۆك (قەسر+ کۆك) بە مانای چاكو کۆكو تەواو بوو. لەسەرەتادا ئەم گوندە باشەڵانو دارستانێکی زۆری لێ بووەو شوێنێکی زۆری کورەی خەڵووزی لێ بووە و بەرەو کەرکوك بازرگانیان لێ کردووە.

قەسرۆك گوندێکی شێخ بزێنی سەرووە، گەلێك کۆنە لەنێوانی پاوانە رووتەو سوورکی لەقلەکانو شاخی شیووی پاوەنو گردی سوورکی ئەسحابانو قەڵای سەڵتە ئەحمەد و شاخی کرکری جوڵندیو گردی دووبرا دایە لە قەرەناوەوە بێیت بەبەستی دارئەختیارەوە گوزەر دەکەیتو دێیتە ناوییەوە، کەلە گۆیتەی شەهید تێپەڕ دەبێت لە دەربەندێ دێیتە نێو ئەم مەزرایەوە.

قەسرۆك (٦٥٠٠) دۆنم زەوییە، (٤٥٧) دۆنمیان بەراوەو، دوو هەزار دۆنمیان پشتاوەو بەسەر جوتیاردا دابەش کراوە کە نزیکەی (١٢٠) جووتیار دەبێت، نزیکەی (٣٠٠٠) بەردەڵانو پاوەنە، کە نزیکەی (٤١٢) باخەو (١٥٠٠) دۆنمی گەنم وەشێندراوەو نزیکەی (١٥) حەوز ماسی تێدایە.

قەسرۆك سێ جار رووخێنراوەو سووتێنراوە لە ساڵی (١٩٦٣)دا لە سەردەمی حەرەسی قەومییەکان تالانکراوە لە ساڵی (١٩٧٤) شەهیدو دەربەر کراوە لە ساڵی (١٩٨٨) دووبارە دەربەر کراوە بۆ هەتایی رووخێنراوە کە نزیکەی (١٢٠) ماڵی تێدا بوو کە لە ئێستادا (٢٠) ماڵی تێدایە نزیکەی ٥٠٠ سەرمەڕو ٧٠٠ رەشەووڵاخی تێدایە لە ساڵی (١٩١٦) جەندرمەکانی عوسمانی هێرشی دەکەنە سەر ئەم ناوچەیەو تالانی گەنمو جۆی دەکەن کاتێکی کە دەگەنە گوندی قەسرۆك بەرەورووویان دەبنەوەو بەرگریان لێ دەکەن،، بەلام بەداخەوە حەوت کەسی ئەم گوندە شەهید دەبنو بەشێکی زۆری جەندرمەکان دەکوژن.

*** گوندی تلیان:-**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی شوان لە رووی کارگێڕییەوە سەر بە ناحییەی ئاغجەلەری قەزای چەمچەماڵە، گوندی تلیان نزیکەی (٢٥) کیلۆ مەتر لە چەمچەماڵەوە دوورەو، نزیکەی (٧٠) کیلۆ مەتر دەکەوێتە باکووری پارێزگای کەرکوکەوە.

بەر لە پرۆسەی ئەنفال ئەم گوندە (٨٠) ماڵی لێ هەبووە، بەلام لە ئێستادا نزیکەی (١٥) ماڵی تێدایەو لەسەر

کشتوکاڵو ئاژەڵداری دەژین.

گوندەکانی دەوروبەری: مەحمەخان کەوتووەتە باکووری ڕۆژئاوای، فەقێ میرزاو کانی گەوەر کەوتووەتە ڕۆژئاوایەوە، کانی عەرەبان کەوتووەتە باشوورییەوە، تەوەکەڵ و ئاغجەلەریش کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتییەوە.

لە سەرەتادا هاتووچۆ لەم گوندە بەرەو ئاغجەلەر ڕۆیشتووە، بەڵام لە ئێستادا ڕێگاکەی گۆڕاوە.

چەند ڕاوبۆچوونێك هەیە دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی کە گوایە پێشتر لەم بەرو ئەو بەری ئەم چەمەدا بووە شوێنەکەی زۆر لێژبووەوتەپاو تەلانە، لە دوای ساڵی (١٩٧٠)ەوە هاتوونەتە ئەم شوێنە کە گوایە تلی بووەو زۆر لێژبووە.

هەروەها هەندێك دەڵێن گوایە دوو عەرەب میوانیان بووەو دوو (ئاژەڵیان– طليان) سەر بڕیووە، بۆیە ووتوویان گوندی (طليان – تليان).

مێژووی ئاوەدانی ئەم گوندە بۆ (٥٠٠) ساڵ دەگەڕێتەوە ئەویش لەبەر ئەوەی گەلێك گۆڕستانی مێژوویی تێدا هەبووە وەکو پاینی ئاغا، هەوار حەمە، کونە کۆتر، کونە بزن، دوو جاریش ئەم گوندە چۆڵ بوونە جارێکیان لە سەردەمی بابانەکانو چوونەتە ناوچەی ئەمارەتی سۆران بۆ ئەوەی لە قەڵەمرەوی بابانەکان دەربچن، بەشێك لەو خەڵکانە لە گرد عازەبانی لای هەولێر ماونەتەوەو دەڵێن ئێمە لە بنەڕەتدا خەڵکی تلیانین، هەروەها لە هەولێرو کۆیەش خەڵك هەیە.

پێش ئەوەی قوتابخانەی فەرمی بکرێتەوە هەر لە بیستەکانو سییەکان مەلا محەمەدی دزەیی خوێندنو مەلایەتی کردووە مەلا شێخ نەجمەدین شاعیر بووە لێرە، مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسوفو مەلا مەعسومی کۆیی لێرە خوێندوویانە، لە ساڵی (١٩٣٤) مەلا محەمەدی دزەیی ڕۆیشتووەو مەلا عەلی پەلکانە هاتووە تا ساڵی (١٩٤٦) لێرە مەلا بووە لە ساڵی (١٩٤٧) مەلا محەمەد تۆفیق لەم مەدرەسەیە پێگەیشتووە لە ساڵی (١٩٥٢) مەلا سەید ئیسماعیل لە کارێزەوە هاتووەتە ئێرەو گۆڕەکەشی لێرەیە تا (١٩٦٧) مەلا بووە، لە ساڵی (١٩٥٧) قوتابخانەی فەرمی لێکراوەتەوە ئەوە تاکۆتایی ڕژێمی بەعس کە تا ساڵی (١٩٨١) بەردەوام بووە مامۆستاکانی ئەم قوتابخانەیە:- عوسمان عەلی شەریف، مامۆستا بەکر، مەلا مەجید خەڵکی گەورەدێ، عومەر ساڵح، مامۆستا هاشم عەلی مەجید کفری، مامۆستا مەجید خەڵکی حەسار بوو، عەبدوڵڵا حەیدەر خەڵکی چەمچەماڵ بوو، مامۆستا جۆرج بترۆس، مامۆستا فاتیح لە شۆڕیجەی کەرکوك، مامۆستا فەهمی کەرکوکی بوو،، بەڵام لە ساڵی (١٩٨١- ١٩٨٤) دووبارە قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە لە ساڵی (١٩٩٤) دووبارە قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە.

* گوندی دووڕاجی:-

ئەم گوندە لە ناوچەی داوێیە، ناوچەی داوێ ناوچەیەکی کشتوکاڵی پان و بەرینە، لە ڕووی ئاوی ژێر زەوییەوە زۆر دەوڵەمەندە. ئەم داوێیە لە حەفتە غاری خۆر ئاوای خورماتووە دەستپێدەکات تا قەڵاوی سەر ئاوە سپی، بەسێ کەرت دابەشکراوە: داوێی خوار جادە، داوێی پەتەکی، داوێی سەرچەم.

پێنج سەد ساڵێك لە پێش ئێستادا داود ناوێك لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە بە خۆی و حەوت کوڕە کەیەوە دێتە ئاوە سپیو ئاوەدانی دەکاتەوە بە چیاکانی مازووخ، خۆرنەوەزن، جەوڵی قاجر، جەوڵی غەڕەو، ئاوەسپی دەورەدراون.

ئەم ناوچەیە گەلێك شوێنەواری هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هوری – میتانییەکان، کە شارستانیان لە خورماتوو بوونە.

بنەڕەتی ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە لە داوێیەوە بە درەخت دەڵێن ڕاجە لە بەرئەوەی دوو داری تێدا بووە، بۆیە ووتویانە (دووڕاجە – دووڕاجی) ئاواییەکە (٣٥٠) ساڵێك پێش ئێستا ئاوەدا بووەتەوەو گەلێك شوێنەواری تێدایە وەکو قشڵاخی کۆنو قەوڵاخانە هەروەها کۆشکی گەورەی حەمە خورشید ئاغای تێدا دروست کراوە ئەم حەمە خورشید ئاغایە بە خۆی و (٦٠) چەکدارەوە بەشداری شەڕی ساڵی (١٩٢٠)ی ئیبراهیم خانی دەلۆی کردووە لە ناوچەکەدا. هەروەها شوێنێکی گەورەی کاروان سەرای هەبووە. لە ساڵەکانی (١٩٤٧) مەلا کاکە حەمەی سەیفوڵڵای کاك مەلیك لەوێ و لە سێ ئاواییە قوتابخانەی ئاینی کردووەتەوە.

لەم ئاواییە جوولەکەی کوردیشی تێدا ژیاوەو، وەکو برا ژیانیان بردووەتە سەر، لەسەر جەوڵ غەڕە سونگڵ هەیە، کە سونگڵ کەلێکە وەختی خۆی بە قازمە بڕاوە، ڕێگایان کردووەتەوە تا هاتوونەتە سەر جەبەڵەکە، قاڵی بازاڕ قەیسەری بووەو تاکو ئێستاکە بەردەوامە، هەروەها گەڕاوی تێدایە کە نەوتی تێدایە، تەوڵخانە شوێنێکی بەرزە کە تا کەرکوك حوکم دەکات.

لە ساڵی (١٩٦٣) لە سەردەمی حەرەس قەومییەکان ئەم گوندەیان بۆردوومان کردووە، لە ساڵی (١٩٧٤) سێ کرێکاری گوندەکە دەچنە بەغدا بۆ کار (نازم گزار) دەیانگرێتو دەیانکوژێت بە ناوەکانی : حەسەن، سەید کەریم، عەلی.

ئاوییەکانی دەوروبەری دووڕاجی لە خوارەوە قورچایی، غەڕە، کە ئێستا چۆڵە، دووبەلەگە، بەلەگەی خواروو بەلەگەی ژووروو، زنانە، چەوری، ساڵەیی، قەڵا.

ئەم گوندە تاوسانی زۆر بووەو لە هاویندا خەڵکێکی زۆری کوشتووە لە ودیوی هێڵی باران بارینەوە بووە

ئەم گوندە بە ناوبانگ بوو بە دروستکردنی خانووی جەماڵی کە لە قامیشو قووڕ دروست کراوەو کراوە، پیاوێکی ئازای تێدا بووەپێیان ووتوە (حەمە بە بووك) کە گەلێك قسەی لە سەر دەگێڕنەوە ئەم گوندە لە ژمارەی (٨٥) کەرتی کشتوکاڵییەو نزیکەی (٤٤٠٠) دۆنم زەوییان هەیە، بە ناوی (٣٨) جوتیارەوەیە، دووجۆر کانیاویان هەیە شیرینو سوێر.

گەلێك گژوگیای جۆربە جۆری هەیە وەکو:- قاپە کەوڵە، مارگیر، زەل، ژاڵ، کۆڵەزدان، کونارەکە، کاروان کوژە، لە باڵندەش:- پۆڕ، سوێسەکە، کۆتر، هەروەها ئاسکەشی تێدا

هەیە.

بەر لە ئەنفالەکان (٨٠) ماڵی هەبووە. بەڵام لە ئێستادا (١٤) ماڵی تێدا هەیە گەڕاونەتەوە، کە (١٥٣) ئەنفالیان هەیە لە ساڵی (١٩٨٦) چالاکییەکی گەورە لەم گوندەدا ڕووی داوە، لە ساڵی (١٩٨٧) فڕۆکەکانی بەعس نۆ کەسی لێ شەهید کردووە، نزیکەی (١٠) شەهیدیان هەیە.

*** گوندی مۆرخواردەی سەروو:-**

یەکێکە لە گوندەکانی شوانی کێشکە لە ناوچەی شوان، دانیشتوانەکەی لە هۆزی زەنگەنە ولە بنەڕەتی میر سلێمانن، کە لە سەدەی پانزەهەم مەملەکەتی زەنگەنەی پێك هێناوەو پایتەختەکەی گوندی قەیتول بووە. ئەمان خۆیان بە نەوەی مەلا مەحمودی قرخ دەزانن، کاتێك کە مەملەکەتی زەنگەنە دەڕووخێنن پەرتەوازە دەبن، بە شێکیان دەچنە چەمچەماڵ و پەڵکەڕەش و شوان و بەشێکیان لەناو مۆردێکدا نیشتەجێ دەبن و مۆردخواردە ئاوەدان دەکەنەوە، کە دوایش زۆر دەبن هەڵدەکشێن بەرەو چیای خاڵخاڵان دەڕۆن و مۆردخواردەی سەروو و خواروو پێکدەهێنن. کە لە (٢٥٠) ساڵ پێش ئێستادا ئەم گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوەو زۆری هاتووچوو بازرگانیان لەگەڵ کەرکوك بووە. وەستا ڕەزا ناوێك هاتووەتە ئەم گوندەو خەڵکی ئێران بووە ماوەیەك لێرە ماوەتەوەو کارێزو ئاشێکی گەورەیان دروست کردووە.

ئەم گوندە بە ناوبانگ بووە بە سێووو هەنجیرو هەنارو قۆخ و نۆك و گەنم و جۆ.

لە ساڵی (١٩٦٣) حکومەتی بەعس تاڵان و سووتاندی ئەم گوندەی لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە جێبەجێ دەکات، هەر لە ساڵی (١٩٦٢)ەوە بنکەی پێشمەرگەی تێدا بووەو لە شۆڕشی نوێشدا چالاکی و پێشمەرگەی تێدا هەبووەو یەکێك لە داستانەکانی لەم گوندەدا ڕوویدا. ئەم گوندە (١٧) شەهیدو (٢٨) ئەنفالی تێدایە.

لەم گوندەدا هەر لە چلەکانەوە حوجرەی فەقێ و خوێندن کراوەتەوەو هەر یەکە لە مەلا ئۆمەرو مەلا سالح مودەرسی خوێندنیان کردووە لە ساڵی (١٩٧٧) قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە. ئەم گوندە نزیکەی (١٠٠) باخی جۆراوجۆری تێدا هەبووە، خەڵکی لە بەهاران و هاویناندا خەڵکەکەی بە زۆری سەری لێدەدەن.

*** گوندی (قوومپەڵك – شێخە وازی ):-**

ئەم گوندە مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە کە بۆ ساڵی (١٦١٠)زایینی دەگەڕێتەوە لەسەر دەستی شێخ حوسێن دامەزراوە کە لەو کاتەی قەڵای داود لە کوردستانی ڕۆژهەڵات ڕووخاوە کۆچیان کردووە بۆ ئەم ناوچەیە، ماوەیەك لە ناوچەی مەرگەوەڕ ماوەنەتەوە، لە دواجار لەبەر ناکۆکی نێوانیان سێ برا بوونە هاتوونەتە ناوچەی داودە وەکو بار هەوار بوونە لە ناوچەی قشڵاغەکە، لە دوای چەند ساڵێك هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستا لەبەر ئەوەی شوێنێکی ستراتیژی هەیەو کەوتووەتە شوێنی سێ ئاوەوە وەکو ئاوە سپی، ئاوی مام محەمەد، ئاوی مەسل بڵاخەو شوێنێکی تەختی هەیە.

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی لەوەو هاتووە کە شوێنەکەی شوێنێکی قوومی بووەو زۆری پەڵك لە شوێنەکەدا بە قوومپەڵك ناونراوە، هەروەها ئەم گوندە هەشت تیرەی تێدا نیشتەجێ بوونە وەکو داوێ، زەنگەنە، گل، جاف، شێخە وەنی. هەروەها نزیکەی شەش تا حەوت شوێنەواری تێدایە وەکو: کەلە منارە، کە سێ کیلۆ مەتر لە گوندەکەوە دوورە گوایە لە ڕابردوودا شەڕێکی گەورە لەم شوێنەدا ڕووی داوەو کەلەسەرێکی زۆر لەم شوێنە کەوتووە، بۆیە وتویانە کەلە منارە.

هەروەها تەپەزیخ، قشڵاخی جەوهەر، گۆڕستانی ئیمام محەمەد، بۆرە زەند، قەڵا کۆنەکە، هەروەها ئاشێکی کۆنی تێدا بووە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زوو کە لە خۆرئاوای دێیەکە دایە، لەسەر ڕووباری ئاوەسپیە کە مێژوویەکەی بۆ ساڵی (١٧٠٠)زایینی دەگەڕێتەوە دووەم ئاشیش دەکەوێتە ڕۆژهەڵات و باشووری گوندەکە کە بۆ ساڵی (١٨٠٠)ی زایینی دەگەڕێتەوە، کە تاکو ئێستا پاشماوەی شوێنەوارەکانیان ماوە.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٩١) نزیکەی ١٢ ماڵ گەڕاونەتەوە،، بەڵام لە ئێستادا هەشت ماڵی کوردو ٢ ماڵی عەرەبی تێدایە کە بەشێکی خەڵکی گوندەکە بەکرێیان داوە.

هەر لە پەنجاکانەوە لەو گوندە حوجرەی خوێندنی تێدا کراوەتەوە مەلا ئەبو بەکر یەکێك بوو لە زانا ئاینییەکانی ئەم گوندە لە حەفتاکان قوتابخانەی فەرمی تێدا کراوەنەتەوە کە تاکو ساڵی (١٩٨٥) بەردەوام بووە، هەروەها گەلێك شاعیرو دکتۆری چارەسەری نەخۆشی تێدا بووە بە چارەسەری ڕووەکی و دەست گرتنەوە بەناوبانگ بوونە.

*** گوندی گەرگەر:-**

ئەم گوندە دەکەوێتە گوندەکانی ناوچەی قەڵا سێوکە، لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە ناحییەی ئاغجەلەری سەر بە چەمچەماڵە، بە دووری پێنج کیلۆ مەتر دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناحییەی ئاغجلەر، هەروەها بە دووری هەشتا کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوکەوە.

ئەم گوندە لە پێش ئەنفال نزیکەی (٣٠) ماڵی تێدا بووەو لە دوای پرۆسەی ئازادییەوە هەشت ماڵی بۆگەڕاوەتەوە ئەم گوندە ئاودارو بە گژوگیایە ولە ڕابردوودا ئاوێکی زۆری هەبووە.

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی لەوەدا هاتووە گەرگەر کە دەگەڕێتەوە بنەڕەتی هۆزی گەرگەر کە لێرەدا کۆچڕەوییان کردووە بەرەو ناوچەکانی تر. گەلێك قوولەو شوێنەواری کۆنی تێدا بە جێ ماوە.

یان لە بوونی دووگەلی لە شوێنەکەدا ناوەکەی سەرچاوەی گرتووە ئەم گوندە ئاوێژە بووەو ئاوێکی زۆری هەبووەو لە ڕابردوودا (٢٠٠) دۆنم مەرمزەی لێ کراوەو تووتن و تەماتەی بە زۆری لێکراوە، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ئاوییان لێی بردووە بۆ ئاغجەلەر لەبەر زۆری ئاوەکەی، لە ڕابردوودا سێ ئاشی لێبووە وەکو ئاشی شێخ دەروێش،

ئاشی شێخ فەتاح، ئەم ناوچەی شوانە هاتوونە گەنمیان لێرە هاریووە، گەلێك میوەی وەکو قۆخ و هەنارو سێو و قەیسی و هەلوژەوتووڕشی هەبووە،، بەلام لە ڕووی گەنم و جۆوە بەرهەمی کەم بووە لە چاو بەرهەمەکانی تر.

لە سەردەمی عوسمانییەکان دێیەکە لە شوێنێکی کۆن بوونە و لە دوایدا هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستا کە لە خوار ئەم شوێنەی ئێستا بوونە.

*** گوندی قەلا قۆچالی:-**

یەکێکە لە گوندەکانی جاف لە ناحییەی (تیلەکۆ) کە تیرەی شێخ سمایلی جاف تێدا نیشتەجێیە، ئەم ئاواییە پێشتر یارسانەکانی تێدا ژیاوە لە جەوەلی ئیمام شاسوارەوە ئەم مێژووە ڕوونە، بەهۆی چەمی هەوا سەلی کوردی تێدا ژیاوە گەلێك کوپەو ئێسك و پروسکی تێدا دۆزراوەتەوە.

لە سەدەی شانزە بەرەو ژوورەوە عێلی جاف تێدا ژیاوە لە ملە سوورەی وارگەی سێ ماڵەوە جەوەلی کانی ماران و ژالانی ڕۆبیان و کانی دولدول و ئاوران و بنەوانان، زستانان هەواری تیرەکانی جاف و لە ناوەڕاستی بەهاری هەموو سالێك خێل بەرەو ژوور گەشتە بەناوبانگەکەی ڕوویداوە بەرەو کوێستانەکان.

لە سالی (١٩١٩) کەریمی خاسە ناوێك لە گرێزەی شارەزوورەوە بە خۆو عێل و عەشرەتەوە هاتووەتە بنار شاخێکی قووچ لەسەر چەمی هەوا سەلیم لە پێشدا لە ناو کەپر نیشتەجێ بوونە دواتر بە خشت و قوور خانوویان دروست کردووە لە دوایدا هاتووەتە ئەم شوێنەی ئێستا.

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی بریتییە لە (قەلا - قۆچ - لی) بە مانای قەلای قوچ - قووت، لەسەر چەمی هەوا سەلی.

لە شوێنەوارەکانی ئیمام شاسوار، کە گاشەبەردی گەورەی تێدایە، ئەم ناوچەیە هەوارگەی زۆری جاف تێدا هەبوو.

گوندەکانی دەوروبەری قەلا قۆچالی بریتی بووە لە:- کولە جۆ، تەپە سەوز، ژالان، ملە سوورەیە، پیازە جارە، درۆزنە.

لە سالی (١٩٨٢) قوتابخانەی تێدا کراوەتەوەو یەکەم مامۆستا مەحمود گەلالی بووە، نزیکەی (١٠٠٠) مەڕوو بزنی تێدایە زەوی کشتوکالی (٧٥٠) دۆنم زەوی تێدایە بە ئاوی (١٥) جوتیارەوەیە هەر جوتیارێك (٥٠) دۆنمی هەیە، ئاوی کەمەو تا ڕادەیەك بێ ئاوە، بە بیری ئیرتوازی دەژێن.

گەلێك بالندەو ئاژەلی جۆر بەجۆری تێدایە وەکو ئاسکەو مامزو کورکورە و سوێسکە.

بۆ ماوەی سێ جار ئەم گوندە ڕووخێنراوە لەلایەن بەعس لە شەستەکان و سالی (١٩٨٧)و سالی (١٩٨٨) نزیکەی (١٢) کەس لە ئەنفال و شەهیدیان هەیە.

*** گوندی (خێربلاخ - خیر بلاخ):-**

ئەم گوندە دەکەوێتە خۆرهەلاتی کەرکوك لە ناوچەی قەرەحەسەن لە ناحییەی لەیلان.

جەول ئاساز سەرەتای زنجیرە چیای مەتارەیە بەزەنبوورو دەوەلان درێژ دەبێتەوە، هەتادەم کەرکوك، ئەم ناوچەی قەرەحەسەنە لە باکوورەوە وەسمان لەکەو شێخ جێگری و کەوەلەو زەنگەنەوە پێشتر پایتەختی قەرەحەسەن لە ئاوایی خالەبازییانی بوو، هەر لەو پێش لە سییەکان ناحییەی تێدا بووە، جوگرافیای سەر زەمینەکەی گردۆلکەی تێدا بووەو دۆل و سەر تۆپی باخ و میوەی تێدا هەبووە، زەوی بەیارو وەردی خەلە بووە، حوکمرانی ئێستای قەرەحەسەن لەیلانە، ئاوایی خیر بلاخ لە باکووری خۆرهەلاتی ناحییەکە بووە، لە بنار جەول قەتار تەپەو کوو ناوگوورگ، بەپێی هەندێك شوێنەوار کورد هەر لە سەردەمی ئەرابخاوە لەم ناوچەیە ژیاون.

خیر بلاخ خری زۆرە، سێ سەدو پەنجا سالێك پێش ئێستا پۆلێکی ئێلی جاف لە شارەزوور و ناوچە سەختەکان و کەرکوك بلاوبوونەتەوە.

تیرەیەکی تیلە کۆ لە تەك عەلی موراهی تیلەکۆ خۆیان دەگەیەننە دەربەند باسەرەو لە ژالەی دەربەند هەوارنشینی دەکەن و دوای دێنە ناوچەی قەرەحەسەن و جافداری دەکەن هەتا سەردەمی قادری کورەزای لەگەل دارا بەگی ناوچەی داوێ سەروکاری بۆ دەکات و لە شێخ فایقی تالەبانی ئەو زەوییانە دەکڕێ و وای لێ دەکات بێتە خێر بلاخ.

بنەڕەتی ناوەکەی لە (خر - خیر - بلاخ)ەوە هاتووە لە بەر ئەوەی خر یان بەردی بەردەم کارێز یان ئاوەکەی زۆر بووە، بۆیە بەم ناوەوە ناو نراوە یان لە وانەیە خێر بلاخ بوو بێت کە لە بەر زۆری ئاوەکەی پێی ووتراوە.

ئەم گوندە ناوچەیەکی سەرە ڕێی هەبوو کە بە جەواری ڕێ بە ناوبانگ بوو بۆ هاتووچۆ بۆ کەرکوك و بازرگانیان کردووە.

لە سالی (١٩٤٧) ئەم گوندە تووشی نەهامەتی و هێرشی کوللە بووەو هەموو گوندەکەی وێران کردووە کە ئەوەندە زۆر بووە کوللەکە بەری خۆرەکەی گرتووە. هەروەها خەلکێکی زۆری جوولەکە هاتووچۆی ئەم گوندەیان دەکرد بە کاری بازرگانی و کڕین و فرۆشتن.

ئاواییەکانی دەوروبەری خیر بلاخ بریتییە لە ئاوایی عەلیاوا و فەرقان و بەیانلوو مامشەو باوەیەو سیامەنسوورو شۆریجە.

قەلایەکی کۆن لە نێو خیر بلاخ و نەزراو دا هەیە، دەماودەم دەگێڕنەوە کە پیرەژنێك ناوی بەلقیس بووە لە ئاوای هەزار مێردێ بنار گلە زەردەوە لە سلێمانییەوە لە تەك خێلە کەیدا کە خۆی سەر خێل بووە هاتووەتە ئەم قەلایە لەوێ زێڕو خشل و لەعلی شاردووەتەوە کاتێکیش کۆچی دوای کردووە لەوێدا نێژراون، نۆ گۆڕ لەسەر ئەم قەلایە هەیە، ئاونیشانیان هیچ نییەو ئاماژەی هیچ سەردەمێکی پێوە نییە، چەمی هەوا سی و چەمی قەرەقاچ و چەم نەزراوەو چەم چالە ئاسك. لە دەوروبەری ئاوایی خێر بلاخی، کارێزی گەورە گەورەی تێدا هەبووە.

حەرەس قەومییەکان وەکو هەموو گوندەکانی تری کوردستان لە شەستەکاندا تالانیان کردووە و سووتاندوویانە.

زەوییەکانی خیر بلاخ (٥٠٠) دۆنمی کراوە بە خەلە،

گەنمو جۆ لەم وولاتە بە بەختە، کاتێکش کە نەعامەتی رووی تێکردوون بە خاو خێزانەوە کۆچیان کردووە بۆ ناوچە ئاوەدانەکان هەندێ ساڵیش لاکێلیان بووە. زۆربیان دەوارنشین بوون، هەروەها قەتاری ئاسیاوی بە ناوی تێدا بووە کە جوولەکە لێرە بوونەو ئاسیاویان دروست کردووە.

ئەم ئاواییە لە کەرتی کشتوکاڵی (١٥)یە بە ناوی (١٠) جوتیارو هەر جووتیاری (٣٧) دۆنم نیوەی خەڵەو نیوەی بەیار دەکەن نزیکەی (٥٠٠) دۆنم لەوەرگای هەیە. کاری لاکێلیانیش کردووە.

قوتابخانە لە ساڵی (١٩٨٠) کراوەتەوە یەکەم مامۆستا بەختیار هادی سەعید خەڵکی هەولێر بوو. بەڵام لە بەغدا دادەنیشت، هەروەها پیشەی ئالبەندی هەبووە لەم گوندەو کوورتان دووریش هەبووە، هەروەها قاڵە گولنازیش کاری جۆلایی لبادی کردووە لەم گوندەدا، لە رابردوودا مەرمەزەو باخی تێدا هەبووە، مەرومالاتێکی زۆری تێدا هەبووە.

ئەم گوندە یەك ئەنفالو شەش شەهیدی هەیە ولە دوای ساڵی (١٩٨٨)ەوە رووخێنراوەو خەڵکەی ئاوارە بوونە.

*** گوندی ( پەنجە عەلی - پەنجا عەلی ):-**

نزیکەی ١٦ کیلۆمەتر لە پارێزگاکەوە دوورەو ژمارەی دانیشتووانی بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ (٤٢٤)کەسە کە (١٩٦) کەسی نێرو (٢٢٨) کەس مێیە. لە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧دا (٣٣٨) کەسە، (١٥٦) کەسی نێرو (١٨٢) کەس مێ بووە.

بنەرەتی ناوەکە، لەدووبەش پێکهاتووە کە (پەنجا - عەلی) یە، لەوانەیە پەنجا ناو عەلی هەبوو بێت لە گوندەکە، بۆیە بەناوییەوە ناونراوە.

هۆی ناونانی پەنجا عەلی دەگەرێتەوە بۆ (هەرچەندە ئەم قسەیە باوەر پێنەکراوە) گوایە ئیمام عەلی لە سەردەمی غەزای ئیسلامدا چووەتە ناو شاخەکانی پەنجا عەلیو جەبەل (بۆر)و ئەو ناوچانە، لەهەر شوێنو جێگایەك کاری کردبێت شوێنی دەستو پەنجە پیرۆزەکانی دیاربووە، لەناو دەربەندی شاخی پەنجا عەلی لە قەد شاخەکە لە کون شاخەکەوە (جۆگەلە ئاوێك) دەرچووە (سرووشتانە زەوییەکە کون بووە ئاوەکە رێ دروست دەکاتو دووبارە ئاوەکە کەر بۆخۆی دروست دەکاتو بە بەردەوامی ئاوی لێ رۆیشتووە بە تایبەتی بەهاران تا کۆتایی هاوین) لەسەر جۆگەلە ئاوەکە کەسێکی نەناسراوی دەسبەتاڵیو نەکاراو فێڵباز بە ناو پیرۆزی شوێنەکەوە ئیمامێکی بچووکی لەسەر جۆگەلە ئاوەکە دروست کردووە، لەسەر ئیمامەکەیش لە شێوەی پەیکەر بە گەچ پەنجەی دەست دەکات روو لەسەرچاوەی جۆگە لە ئاوەکە (واتە بەهێزی پەنجاو شمشێرەکەی ئیمام عەلی ئەو ئاوە دەرچووە) ئەو کەسەی ئەو چیرۆکەی بۆ بژێوی ژیانی خۆی رێکخستووەو ئەو کەپرەی بە بەرزو پیرۆزو باسکردووە خەڵکی ئەو سەردەمانەیش هەژارو نەزانو خۆشباوەر بوونە، ئەوەی ناوی ئەو ئیمامەی بیستووە بە دیارییەکی زۆرو باشەوە بۆ سەردانی هاتووە، چەند کەسانێکیش خۆیان بە خزمەتچیو پاسەوانی ئەو ئیمامە داناوە، پێش ئەوە بە باشی ژیاوون. (بە منداڵی خۆمیان (بەندەتان) بەناو زیارەتەوە بۆ ئەو ئیمامە بردووە بەڵام ئەو کاتە نە پاسەوانو نە خزمەتچی لێ نەمابوو، لە دەوری ساڵانی (١٩٥٥ دەبوو) کە بۆ یەکەم جار بۆ سەردانی چووومە مێژووی دروستکردنی ئیمامی پەنجا عەلی: مێژووی بیناکردنەکەی نادیارە بەڵام مەزنە دەکرێت مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەو ساڵانەی ئیمامەکانی دیکەی ناو کەرکوكو دەوروبەری کەرکوك بینا کرابێت (وەك ئیمامی زین العابدین وجاغ - وەجاغ گوێزل بابا ئەبو علوك ئیمام حەسەن).. هتد.

گوندی پەنجا عەلی یەکێکە لە گوندەکانی سەر بە ناوەندی شاری کەرکوك، کەوتووەتە رۆژهەڵاتی کەرکوکەوە، لەگەڵ ماڵە ئاوارەکانی پەنجا عەلی هاوسنوورە، پەیدابوونو دروستبوونی بۆ ساڵانی (١٨٠٠) بۆ (١٨٠٥) دەگەرێتەوە.

لە گوندی پەنجا عەلی دوو کارێز ئاو هەبوو، یەکەمیان کە لە پێش ئەوەکەی دیکە دروستکراوە بەناو (کارێزەکەی مەلا تۆفیقەوە بوو) ئەوی دیکەیان بە ناوی کارێزەکەی (شێخ محەمەد رەئووف تاڵەبانییەوە) بوو، سەرچاوەی هەردوو کارێزەکە لە بنار شاخەکەی گوندەکەوە دەستپێدەکاتو لە کۆتایی گوندەکە دوا بیر لە شێوەی (کەندر) کۆتایی دێت، نێوان بیرێك بۆ بیرێکی دیکە (١٠٠م) دەبوو یەکەم بیر کە لەسەرچاوەکەوە دەستپێدەکات لە هەموویان قووڵتر بوو، قوڵی بیرەکان تا دەهات کەمتر دەبوو، ئاوەکەیشی زیاتر بۆ خواردنەوەی ئاژەڵو کشتوکاڵ بەکاردەهێنرا.

مێژووی دروستکردنی کارێزەکان دەگەرێتەوە بۆ ساڵانی (١٨١١) بۆ (١٨١٥)، واتە بە چەند ساڵێك پاش پەیدابوونی گوندی پەنجا عەلی.

لە هەموو ماڵێکی گوندی پەنجا عەلی بیرێکی ئاو هەبوو، ئاوی هەموو بیرەکان سوێر بوو بۆ خواردنەوەی ئاژەڵ قورگرتنەوەو بۆ شووشتن بەکار دەهێنرا.

لەبەرامبەر بیرەکە (کۆل) دەکرا بۆ خواردنەوەی ئاژەڵو کاری پێویست، قووڵی بیرەکان (٢٠م بۆ ٣٠م)وە بوو، دەرکردنی ئاوی بیرەکان بە چەرخو بەکرەو گوریسو (دەولێکی لاستیکی ئەستوور) بوو، بۆ دەرکردنی ئاوەکە زیاتر ولاغ بەکار دەهێنرا، جارجار لە ناچاری، پیاوو ئافرەت بە شانو باڵ خۆیان گوریسەکەیان دەبەستە خۆیانەوەو ئاویان دەردەهێنا.

کانی ئاوە شیرینەکەی دەربەندی گوندی پەنجا عەلی:-

ئەم کانییە بە (٣٠٠م) لە ئیمامەکەوە بەرەو ناو دەربەندی شاخەکەوە دوور بوو، ئاوەکەی شیرین بوو، چاوگەی ئاوی خواردنەوەی خەڵکی گوندەکە بوو نێوان گوندەکە (مەسافەکەی) بۆ کانی ئاوەکەی دەربەندەکە (٥ - ٦کم) دەبوو، جەرەیان لەسەر ولاغ دەبەستو دەچوون بۆ ئاو، لەم دوایانەدا لە بری جەرەو گۆزە بوو بە " هنداوی - بەرمیل) بچووك، لە ژوور ئەم کانی ئاوە لە قەد شاخەکە درزو کەلێن هەبوو لەو درزانەوە ئاو بە تکەتك دەهاتە خوارەوە پێیان دەووت کانی (چك چکە) ئاوەکەی زۆر ساردوو شیرینو خۆش بوو، بەڵام چەند ساڵێکە ووشکی کردووە، کۆلو بیر: لە ژوور ماڵەکانی گوندەکەوە چەند بیرێکی ئاو کرابوون، لە

بەردەم بیرەكە كوڵ دەكرا، ئەمانە ئاونرابوون (كوڵ و بیرەكان) ئاوەكەی تەنها بۆ ئاژەڵ و قورگرتنەوە بوو كۆمە ئاو: لە ژوور ماڵەكانەوە بۆكۆكردنەوەی ئاوی باران گۆمێ گەورە لەلایەن بنەماڵەی حاجی (نەجمەددین)وە بەناو گۆمەكەی حاجی (خەندان) كرابوو، ئاوەكەی تاكو كۆتایی هاوین دەمایەوە بۆ شووشتن و هەندێ كاری پێویست بەكار دەهێنرا، هەموو بیری كارێزەكان و بیرەكانی دیكەی گوندەكە لە مێژا پڕ كراونەتەوە.

*** گوندی ( شاووگ ):-**

ئەیگێرنەوە كەسەی ئیمام یەكێكە لەوانەی لە چوار سەیدەكەی بەرزنجە، سێ سەد ساڵێك بەر لە ئێستا دەگاتە هەردەكانی زەنگەنە ولە كەڵوەزەكانی (یوێڵە) دەچێتە خەڵوەتەوەو كچێكی میری زەنگەنەنە دەبێتە هاوسەری، لە ئاوایی قەشقەی ئەوبەری ڕۆخانەش دەگێرنەوە، سەید ئەحمەدی قەشقە یەكێكە لەوەچەكانی سەید ئیمام لەدەم رووباری ڕۆخانە دەوار هەڵدەداو لەوێ دەمێنێتەوە.

ئەورەحمان شەشەی دەم سپی هۆزی زەنگەنە، بە ڕێكەوت كە لەدەڵۆ عەباسی ناوچەی جەلەولا میرنیشینی دەبێت لە قەیتولەوە تا حەمرین قەڵەمرەوی زەنگەنە دەبێت، شەوێ لای سەید ئەحمەدی سەید جافەرو دەمێنێتەوەو خوشكێكی خۆی پێشكەشی عەبدولرەحمان شەشەی زەنگەنە دەكات لەگەڵ (١٠٠) مەرو برێ دەواری رەش و ماین و ماڵداری لە تەك خوشكەكەیدا دەنێرێ بۆ دەڵۆ عەباس ئەویش لەبری ئەوە ئاوایی شاووگی دەكاتە خەڵات لە زەوی چوار شەریكە بوو، ئیدی شاووگ ئاوەدان دەبێتەوە.

لە ساڵی (١٩٤٢) ئاوایی شاووگ لە قشڵاغە كۆنی سەر زەوی چوار شەریكە دەگوازنەوە بۆ سەر ڕۆخانە هەر ماڵەو دەوارێك هەڵدەدا لەوێ تا وورده وورده خانوو لەوێ دروست دەكەن. ئاوایی شاووگ لە هەر دوو هەڵەتەكانی باكوی خۆرهەڵاتی ناحیەی قادر كەرەم، هەمووی چەم و دۆڵە، چەمی تریشكەو قەڵاگەو سێ چەمان، زەوییە رەش، قەبر ڕۆخیاو، بان باوە سێنی سەر زەمینێكی دژوارە. ئەمەش سروشتەكەی لێوان لێو كردووە لە تووڕەبوون و بووەتە جێگەی پێشمەرگەو كوێستان و گەرمیانی مرۆڤ لەم ناوچەیە.

حومام دەرەوكەڵەگەت دوو شوێنی كۆبینەی هەزار ساڵی ئاوایی بووە.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەكان هێرش دەكەنە سەرییان و لە ساڵی (١٩٨٧) دووجار دەكەوێتە بەر هێرشی ڕژێمی بەعس.

ژنێك لە شاووگ ناوی سەوڵەبووە بە گژوگیای ئەو هەردانە برینی سارێژ كردووە.

شاووگ لە كەرتی كشتوكاڵی ژمارە (٥٣)یەوە (٥٠٠٠) هەزار زەوی لەوەرگاو شاخەوانیان هەیە، (٢٠٠٠) هەزار زەوی بەیاری جوتیار، ئەمە جگە لە بەراو.

*** گوندی ( جەوە جەوە ):-**

میرەكانی بابان لە سەروو بەندی دەسەڵاتی ئیمارەتی بابان قەڵەمرەوی خۆیان تا ناوچەكانی كەركوك و خانەقین و سلێمانی و موسڵ فراوان كردووە، لە ناوچەی كەركوك لە ساڵەیی و بیبانی و قەرەحەسەن دەسەڵاتی خۆیان بڵاوكردووەتەوە ولە هەندێك جێگا سوپای ئیمارەتیان جێگر كردووە.

مامە قاڵەی نۆكەڵان، سەردەستەو متمانە داری بابان بووە، (٢٥٠) ساڵ بەر لە ئێستا لە خۆ ئێڵ و سوپایەكی بچووكەوە لە جەوە جەوەی ناو شوانی تەك ڕێدار جێگیر دەبن.

ئەو دەمانەی (جەوە.. جەوە) ئاوەدانكراوەتەوە جۆگەیەكی زۆری هەبووە، بۆیە پێیان ووتوە جەوە جەوە جۆگەی تەزرەو، جۆگەی جولی و جۆگەی دۆڵە دۆڵەو جۆگەی كوردەرو سەیداو پانكاوی، ئاوی زۆر بووە، سازگار بووە پێشتر ئەم ئاواییە لە شیوە تۆپل بوو دار توویەكی زۆرو ئاوێكی سازگارو گۆڕستانێكی گەورەی تێدایە كە بۆ (٥٠٠) ساڵێك دەگەڕێتەوە.

كانیاوی شاخینەو كارێزی سەرووكانی و كانی بوارە ئاواییەكەیان ئاوێزگە كردووە.

ئەم گوندە لە ناوچەی شوانی سی ویەك كیلۆ مەتری باكووری خۆرهەڵاتی كەركوكە واتا لە شوانی كێشكە، ئاوەدانی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەشت سەد ساڵی، شوان ناوێ لەو هۆزە كە نزیكەی (٨٨) گوندی لەم ناوچانە لەگەڵ نەوەكانیان ئاوەدان كردووەتەوە.

دەربارەی شێوەزاری ئەم گوندەو جیاوازی لەگەڵ شێوەزارەكانی گوندەكانی دەورووبەری ئەوە دەسەلمێنێت كە بنەرەتیان لە بابانەكان بووە. هەروەها لەناو گوندەكە دۆڵی ئینگلیز هەبوو كە ئینگلیزەكانی تێدا نیشتەجێ بووەو سوپاكەیانی تێدا بووە.

لە ساڵی (١٩٧٨) قوتابخانە لەم گوندە دەكرێتەوە كە دوو مامۆستای خەڵكی شۆڕیجە دەبنە مامۆستا بە ناوەكانی پەخشان و ڕووناك.

گوندەكانی دەورووبەری جەوە جەوە بریتییە لە قولی بەگ و ڕێدارو سمایلبەگی و حەسەن قەپاغ.

لە شەری جیهانی یەكەم عوسمانییەكان رەشبگیری و نەفیر عامی گشتی دەكەن و خەڵكێكی زۆر بۆ شەرەكەیان كۆدەكەنەوە كە گوندی جەوە جەوەش بێ بەش نابێت لەم دەردەو تا ئێستا سێ گەنجیان براوە بۆ بەرەكانی شەڕی عوسمانی نەگەڕاونەتەوە.

لەساڵی (١٩٦٣)ش حەرەس قەومییەكان داوییەتیانە سەر ئەم گوندەو سووتاندوویانە، یەكێك لە پیاوەكانی ئەم گوندە مەولود فەقێ بووە كە بە برنەوێكەوە بەرەنگاریان دەكات و دوانیان لێ دەكوژێت و پاشەكشێیان پێ دەكات.

زەوییەكانی ئاوایی جەوە جەوە دوو بەشن، بەشێكیان تاپۆن و بەشێكیان گرێ بەستە، لە كەرتی كشتوكاڵی ژمارە (٣٧)ە، (٢٠٠٠) دۆنم هی جوتیاری و (٥٠٠٠) هەزار دۆنمیش لە وەرگاوشاخەڵانە، لەو شاخانەی گردی جێژنی و كەل گوڵەباخ و تەختەپانە كە ئێستا دەكرێتە گەنم وجۆ لەگەڵ

دۆڵ ئینگلیزو سمایل ئەمانە لەوەرگانە. هەروەها هەموو کانیاوەکانیان ووشکیان کردووەو پیرە دارتووەکان بێ ناون. لەکاتی ئەنفالەکەدا لە ساڵی (١٩٨٨)دا نزیکەی ٣٥ ماڵ بووە لە ئێستا (٩٢) خێزانە، تاکو ئێستا (١١ شەهیدیان داوە وییەك ئەنفالیان هەیە.

### * گوندی شەوگێڕ:-

ئەم گوندە یەکێکە لەگوندەکانی ناوچەی شێخ بزێنی. کە دەکەوێتە سەرزێی بچووك، لە رووی ئیداریەوە سەربەناحیەی شوانە، بەدووری ٦٠ کیلۆمەتر دەکەوێتە باکووری کەرکوکەوە ئەم گوندە هەرلەشەستەکانی سەدەی رابردووە چەند جارێك سوتێنراوە و تالان کراوە لەرابردوودا نزیکەی٧٠ ماڵی تێدا هەبووە لە ئێستادا دە ماڵی تێدایەو١٧ شەهیدیان هەیە و هەرلە ساڵی(١٩٩١)ەوە ئاوەدان کراوەتەوە. ئەم گوندە لەسەر کشتوکاڵی و ئاژەڵداری دەژێن. دێیەکانی دەوروبەری پەلکانە دەکەوێتە دەستە راستی گوندەکە، کەولەسوارو تورکی دەکەوێتە دەستەچەپی گوندەکەوە، لەسەرووی گوندی عەلی بەیان

ئەم زێیەی کەلەم گوندەدا دەروات، دەورێکی سەرەکی هەیە بۆ ئاوداری ئەو گوندەو ناوی ژێر زەوی دەوڵەمەندە.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەسی قەومییەکان دووکەسیان لەم گوندە کوشتووە و گوندەکەیان تاڵان و سووتاندووە.

لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولیش تۆپ باران کراوەو ١٠کەسیان لێ شەهیدبووە لەشۆڕشی تازەشیدا تا ساڵی ١٩٨٨ چەند جارێك رووخێنراوە لەساڵی١٩٨٨ حەڤدە شەهیدیان هەیە ئەنفالیشیان هەیە کە زۆربەی ژن و منداڵ بوون.

### * گوندی (تم تمە):

ئەم گوندە کەوتۆتە گەرمیان لە ناحیەی شێخ تەویل لە پێواز دوودەروازەی سروشتی لە بەری سەنگاوەوە شان بەشانی چیای (ئاشداغ) لە خۆرئاواو زنجیرە چیای (سەگرمە) لە خۆرهەلات، پانتاییەکی جوگرافی بە هەردەو گردۆڵکەو شیو و دۆڵی گەورە پێکهاتووە، ژمارەیەك دێهات لە خۆدەگرێت کە بانی خێڵان‌و دەروازەو کەلی پەیکولی‌و تاخی زەردەو ئاواییەکانی بەرکەل‌و ساکان‌و چرچە قەلاو تەپە گەرووس‌و تەنی بابا عەمرە دەگرێتەوە، لەدەم ئاوایی (تەپە گەرووس) رێگایەکی خۆلینی بەرەو هەردەو شیوەکانی (بەراوڵا) ئاوا دەبێت لەم جەوەلی چوار ملان ئاوایی (تم تمە)یە.

٢٥٠ساڵێك بەر لە ئێستا دوو برا بە ناوی حەمە یاوەر ونەحە یاوەر، قەومێکیان لە خێڵی قەمەر لە خەنەقی شارەزوورەوە بە کۆچ‌و بار خۆیان دەگەیەنە زستانە هەواری شاکەل‌و خۆیان لە تەك (تم تمە) کە هەر دەم تەم تومان بووە باروبنەیان دەخەن هەرکە بەهاران بووە ئەم خێڵە گەلالێن لە هۆزی جاف، رانیان پێش خۆیان داوەو کەلی پەیکولی نێوان زەردەوگولان ئاوایی قەران بوون‌و لەوێشەوە بۆ (شلێر) و مەریوانی رۆژهەلات ملی رێگایان گرتۆتە بەر هەتا بارانی پەلە، ئەوجا خێڵ بەرەو خوار دەبێتەوە هەر کە پەلەی دا هەموو هۆزەکانی جاف پەیرەویان کردووە تا ساڵی (١٩٢٠).

تا بەوەی دوو پیاوی لێ بووە بە ناوەکانی عەبەی رەشان‌و حەمە سووری لەنگ، کە زاڵم بوونەوەو لە ملەی نوختە سەرانەیان لە خەڵکی سەندووە لە مەڕو ماڵات لە هۆزی (جاف) ئەم گوندە کاروان سەرایان بۆ کفری‌و کەلار رۆیشتووە.

ئاواییەکانی دەوروبەری (تم تمە) وەکو: دەرەلیکاو، بەراول، دارە وەلی، گۆرەشە، گولمکەوە، بەکر باول کۆچەرێیەك لە تیلە کۆی قەلەندەرو گۆرێسك لە ناو جافەوە دێ لە زێخی بەرامبەر ئاوایی (تم تمە)دا رەت دەبێت، کە هۆزی جاف بە جیا.. جیا هاتوون، ماڵیان بارکردووەو مەڕ لە پێشەوە هاتوون ئەم ناوانەیان ئاوەدان کردووەتەوە ئاوایی (تم تمە) خانوو ئاوەدان کراوە بە کە لەکەو بەنەیجە ئەوکات بەستوویانە بەزەل‌و قەرەمەیان بەکارهێناوە.

ئاوایی (تم تمە) دوو هەزار خەلەیان هەیە، پێنج هەزار لەوەرگاو، شاخەلانیشیان بۆ مێگەل هەیە ونزیکەی ٢٠٠٠هەزار ران مەڕیان هەیە. لە ساڵی (١٩٨٨)یش ئەم گوندە ئەنفال کراوەو ٣ شەهیدیان هەیە، لەگەل (١٢) ئەنفال.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەمە ئەمینی ئەحمەد یاوەر پێشمەرگە دەبێت، ئەو لەگەل هەندێك لە هەڤاڵەکانی لە قاتەکەی کفری لەوێ رووبەرووی سوپای رژێمی بەعس دەبنەوە، پاش شەرێکی درێژ خایەن، حەمە ئەمینی لەتەك برێك لە پێشمەرگەکان شەهید دەبن، ئەوجا تەرمەکەی لە درۆزنە دەنێژن، کە ئەمە دەبێتە سەرەتای شۆرش‌و لە ساڵی (١٩٧٠)، حەوت کەسیان لێ شەهید دەبێت. لە ساڵی (١٩٧٨) چەخماخەی شۆرشی نوێ سەری هەڵداوەو مەفرەزەکانی هاتوونەتە ئێرە.

### * تەکیەی جەباری:-

ناوی تەکیەی جەباری لە دانانی تەکێیەکەوە هاتووە کە لەسەر دەستی شێخ (شەرەفەدینی کوڕی شێخ عەبدولجەبار) ەوە دامەزراوە بە ناوی تەکیەی (عەبدولجەبار)، بەلام مێژووی دامەزراندنەکەی تاکو ئێستا نەزانراوە، لەگەل ئەوەشدا ئەم تەکیەیە بووەتە شوێنێك بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم زەکاتەکانی ناوچەی جەباری وەکو (بیت المال) مامەلەی لەگەلدا کراوە، کە بۆ مەبەستی دابینکردنی پێداویستی هەژارو نەدارو میوان‌و کاروان سەراو تەکیەو مزگەوتەکان بەکارهاتووە.

تەکیەی جەباری دەکرێت بە ناحیە لە سەردەمی ئینگلیزەکان، یەکێکە لەو ناحیانەی دەکەوێتە سنووری قەزای چەمچەماڵەوە دوای دروستبوونی لەسەر قەزای چەمچەماڵ دانراوە، دواتر خراوەتە سەر شاری کەرکوك پاشان جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ سەر قەزای چەمچەماڵ، ئەمەش پاش پێکهێنانی بە واژۆی (قۆچان ئەغنام) لە رێکەوتی (١٣ی مارتی ساڵی ١٩١٩)، دانانی (سەید محەمەدی جەباری) بە بەرێوەبەری ناحیەکە، کە بە یەکەم بەرێوەبەری ناحیەکە هەژمار دەکرێت، دوای ئەوەی شێخ مەحمود یاخی دەبێت لە حکومەت‌وئینگلیزەکان، سەید محەمەدی جەباریش لەگەل کۆمەلێك چەکداری ناوچەکە یاخی دەبێت لە حکومەت‌و دەست لە بەرێوەبەری ناحیەکە هەلدەگرێت، پاشان حکومەت بەرێوەبەرێکی تازە دادەمەزرێنێت بە ناوی (موشیر حەمەی سلێمان) کە بە

(موشیر ئاغا) ناسراوە لە هۆزی هەمەوەند بووە، ئەمیش بۆ ماوەیەك لەوێدا دەمێنێتەوە پاشان حکومەت بەڕێوەبەرێکی تازە بۆ شوێنگرەوەی (موشیر ئاغای هەمەوەند) دەنێرێت، بە ناوی (یونس ئەفەندی)یە هەڵسووکەوتی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە زۆر خراپ بووە، کاتێك سەید محەمەدی جەباری ئەم هەڵسووکەوتە دەبینێت، کۆمەڵێك لە چەکدارەکانی بۆسە بۆ (یونس) دادەنێن لە چەمێك بە ناوی (چەم قەرامالی) لە لای گوندی (قۆچەلی) سەر بە ناوچەی جەباری، هەر لەوێدا یونس ئەفەندی دەکوژن ئەم ڕووداوە لە کۆتا هەفتەی مانگی ئایاری ساڵی (١٩٢٢) ڕوویداوە، ئیتر لە دوای ئەوەوە تەکیەی جەباری ناحیەکەی دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەی قادر کەرەم، کە لە ئێستا ناوی (ناحیەی قادر کەرەم)ەو سەر بە قەزای چەمچەماڵە.

تەکیەی جەباری لە سەردەمی ئینتیدابی ئینگلیزەوە لە عێراق تاوەکو ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس چوار جار تووشی ڕووخاندن وکاولکاری وتاڵان بووە.

بۆ یەکەم جار لەنێوان ساڵانی (١٩١٩ – ١٩٢٢)، ساڵی (١٩٦٣) لەگەڵ هاوزەمانی هاتنە سەر دەسەڵاتی حیزبی بەعس بە سەرکردایەتی عەبدولسلام عارف، لە ساڵی (١٩٥٨) پاش کودەتای لەسەر عەبدولکەریم قاسم هاتە سەر دەسەڵات، جارێکی تر لە ساڵی (١٩٥٨) تەکیەی جەباری تووشی ڕووخاندن و کاولکاری دەبێتەوە، دواین جاریش لە ساڵی (١٩٨٨) لەگەڵ دەست پێکردنی پرۆسەی شاڵاوی ئەنفال لە کوردستان، ناوچەی جەباری بەگشتیو تەکیەی جەباریش بە تایبەت، کەوتە بەر ئەم پرۆسە بەد ناوەو دانیشتوانەکەی تووشی هەڵاتنو ئەنفالکردن بوونەوە، تا پرۆسەی ئازادی لە ساڵی (٢٠٠٣)دا ئەم گوندە لە ژێر کۆنترۆڵی ڕژێمی بەعسدا بووە، کە سەر بازگەی تێدا هەبووە، لە ونێوەندەشدا تاکو ساڵی (١٩٩١) خاوەنی شەش شەهیدو دوانزە ئەنفالکراو بووە. بەپێی گێڕانەوەکان لەسەردەمی ئینگلیزەکان نزیکەی شەست ماڵ لەم گوندەدا هەبووە، لە ساڵی (١٩٦٣)دا نزیکەی (٤٠ – ٤٥) ماڵی تێدا ژیاوە، لە ساڵی (١٩٨٥– ١٩٨٨) تا پرۆسەی ئەنفال (٦٠) ماڵی تێدا بووە.

تەکیەی جەباریش هاوشێوەی زۆربەی شوێنەکانی تری کوردستان، ناوچەکەیان لە بار بووە بۆ بەرهەمەکانی سەوزەو میوەهات لەوانەش (تەماتە، بامێ، پاقلە، هەنجیر، ترێ) لەگەڵ بەرهەمی (توتن) کە بۆ قەزای چەمچەماڵو قەزای خورماتووو شاری کەرکوك هاوردەکراوە لەلایەن کڕیارو بازارەکانی ئەو شوێنانە ساغ کراوەتەوە، هەروەها گەنمو جۆ یەکێکی تر بووە لەبەرهەمە سەرەکییەکانی ناوچەکە، هەروەها بەرهەمەکانی ئاژەڵیو پەلەوەری هەبووە لەوانەش بە خێوکردنی (مەڕ، بزن، مانگا، مریشك، قەل) بووە، کە بەرهەمی سەرەکیان بووە، لە ڕابردوو برنجیان چاندووە لە دێر زەمانیشەوە بەخێوکردنی مەڕو ماڵات کاری سەرەکی دانیشتوانی ناوچەکە بووە، بەهۆی لە باری ژینگەو کەشو هەوای ناوچەکەوە بۆ بە خێوکردنی ئەو جۆرە ئاژەڵو پەلەوەرانە هەر یەك لە بەرهەمەکانی (هێلکە، پێست، شیر، ماست) لەدوای پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی خۆیان بۆ ناوچەکانی تر هاوردەکراوە.

سەرچاوەی ئاوی سەرەکی تەکیەی جەباری لە شەش جۆگەلە و سێ کانیو دووکارێز بوو، ناوی جۆگەکان بە دوو چەمدا دەڕۆیشتن ئەوانیش: چەمی شێخ ئەلیاسو چەمی کەڵەکەناو، ناوی چەمی شێخ ئەلیاس ڕەنگێکی لێڵو ناڕوونی هەبوو، بەڵام چەمی کەڵەکەناو ئاوێکی سازگارو ڕوونی هەبوو.

سەرچاوەی ئاوی چەمی کەڵەکەناو پێی دەوترێت (ناوباخ)، لە بەشی خوارووی ناوباخەوە جۆگەیەکی تری تیادایە دروست دەبوو پێی دەوترا (مەڵك)، چەمی شێخ ئەلیاس لە دوو سەرچاوە ئاوی بە ناودا دەڕۆیشت، ئەوانیش بەسەرچاوەکەی سەرووی دەووترا (جۆگەی گەورە)و بە سەرچاوەکەی خوارووی دەووترا (جۆگەی بچووك)، جگە لەو جۆگانە جۆگەیەکی تر هەبوو پێی دەوترا (دارە خورما).

تەکیەی جەباری جگە لە ئاوی چەمەکان، سەرچاوەی ئاوی کانیو کارێزی هەبوو، سێ کانی لە تەکیەدا هەبووە بە ناوەکانی (کانی سەر ڕێگا، کانی حەمك، کانی بەرتەلان)، لەگەڵ ئەوەشدا دوو کارێز هەبوو ئەوانیش بە ناوەکانی (کارێزی درکە، کارێزی بەگلی).

ئاسیاو و ئامێرێك هەبوو بە ئاو ئیشی دەکردو بۆ مەبەستی دروستکردنی (ئارد، ساوەر) بەکار دەهات، لە هەمان کاتیشدا بۆ هارینی چەڵتوك بە کاردەهاتو برنجی خۆماڵی کوردی لێ ئامادە دەکرا.

لەسەردەمی ئینتیدابی بەریتانی چوار ئاسیاو هێنرایە ئەم ناوچەیە، کە خاوەنەکانیان بریتیبە لە: (ئەمین سەید کەریم، سێمین، شێخ حوسێن، ئەمین، مەحمود مەجید) ئەم ئاسیاوانە تاکو ساڵی (١٩٥٠) کاریان کردووە، دواتر بەهۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی ئاو لە ناوچەکەو کۆنی ئامێرەکانەوە لە کار کەوتوون، جگە لە دانیشتوانی تەکیەی جەباری دانیشتووانی گوندەکانی تری ناوچەی جەباری سوودیان لەم ئاسیاوانە دەبینی.

لە ساڵی (١٩٦١) بۆ یەکەمجار لەسەر دەستی (حەمە عارف کوڕی مەلا مەحمود) ئاسیاوی گازوایل، هێنرایە تەکیەی جەباری دانیشتووانی تەکیەی جەباری وەکو سەرجەم ناوچەکانی تری کوردستان چەندین کەلوپەلو پێداویستی ماڵو ئاژەڵداریو جووتیاریو کشتوکاڵی هەبووە، بەزیرەکی لێهاتووی خۆیان دروستیان کردووە وەکو (کەنوو، تەنوور، مەقاڵە، جاجم، پۆپەزم، مەشکە، کونە، هیزە، دیوەك، قورەمە، ئاخوڕو کوڵ).

تەکیەی جەباری بە درێژایی شۆڕشو ڕاپەڕینەکانی کوردستان لانکەو پاڵپشتی بە هێزی پێشمەرگەو گیان فیدایانی ڕێگای خاكو نیشتمان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە دەرگاو ماڵەکانیان واڵا بووە.

بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی (سەرکردە عادل عیزەت) لە ساڵی (١٩٦٢) یەکەم بنکەی هێزی پێشمەرگەی لێ دادەمەزرێت و درێژە بە کاروانی خەباتو شۆڕشگێڕی ئەدەن لە ناوچەکە. تەکیەی جەباری بەو پێیەی نزیك بووە لە قەزای چەمچەماڵەوە هەر زوو ناوەندی پەروەردەو فێرکاری

تێدا کراوەتەوە، ئەویش لەنێوان ساڵانی (١٩٥٩ - ١٩٦٠)، پاش چوار ساڵ لە دامەزراندنیشی لە ساڵی (١٩٦٣) لەگەڵ ڕووخاندن و سووتاندن و تاڵانیکردنی گوندەکە کەوتە بەر ڕووخان و سووتان.

لەگەڵ کردنەوەی خوێندنگاکەش بۆ یەکەم جار یەکەم مامۆستای بە ناوی (عادیلی کوڕی شێخ فایەق باوە) بۆی دادەمەزرێت و وانەی تێدا دەڵێتەوە، دوای ئەویش مامۆستا (سابیر) بووە.

لە ساڵی (١٩٧٠) قوتابخانەکە دروست دەکرێتەوە و چوار مامۆستا لەو خوێندنگایە وانە دەڵێتەوە. لە سەرەتادا دوو مامۆستا دەبن پێکەوە بە ناوەکانی: (محەممەد سالح، حوسێن عەلی)، دوای ئەوانیش هەریەکە لە مامۆستا (کەمال، مەجید، عەزیز) پێکەوە وانە دەڵێنەوە تاوەکو ڕووخاندنی بۆ دووەم جار. ژمارەی خوێندکارانی ساڵی یەکەمی (١٢ کوڕ و ٤ کچ) بووە، ساڵی دووەمی (١٧ کوڕ و ٦ کچ) بووە. ساڵی سێیەمی (٢٧ کوڕ و ١٣ کچ) بووە. ساڵی چوارەم (٤٠ کوڕ و ٢٠ کچ) بووە.

### * گوندی (تۆپ عەسکەر)

لە ئاوایی (گردە گۆزینە)ی کەلاری گەرمیانەوە، پردێکی دووروودرێژی ئاسنین بەسەر ڕووباری شیرینی سیروانی کوردەواریی دامەزراوە، لەوێوە هاتووچۆی خانەقینی لێوە کراوە، بەری ئەو بەری ڕووبار، خاکی (بن کورەیە) گڵەکەی لە سەردەمی شارستانی (حەوش کوڕ) لەگەڵ ئەمارەتی باجەلانەوە بۆ خشت سوورەوە کردن شایستە بووە، ناوچەکە مێژوویەکی کۆنی کوردەواری هەموو قۆناغەکانی تێدا دیاریکراوە، (بن کورە) لە ئاوایی (دەورەوە) جەوەل مرواری شان بەشانی بە پانتایی هەتا (قۆرە توو) ناحیەی ئەو مەملەکەتە درێژبووەتەوە.

یەکێك لە ئاواییەکانی (بن کورە)، ئاوایی (تۆپ عەسکەرە) لەم ئاواییەوە ڕێگای خۆڵینی بووە، داود بەگی جاف، پردێکی بەرد داری دروست کردووە پێیان ووتوە (تۆپ قایە) هەمووشی دار بووە ڕێ کراوە. تا قەڵای (شێروانە) هاتووچۆ بووە، لە سەردەمی داگیر کەرەکانی تووڕکدا تۆپیان لەسەر تەپەی (وەیس) جێگرکردووە بە ئاراستەی کەلار لە ناوچەی (بن کوورە) ژمارەیەك هۆزی کوردەواری گەورەی وەکو:- تاڵەبانی، هۆزی باجەلان، دەلو، گێژ، گەڵاڵی، هۆزی لەك، زەنگەنەو، داوێی، جمووری کورد، دەربەند فەقەرە، میرەنگی واڵەویی، بیانی، لەگەڵ سییانی هەیە لەگەڵ ڕۆژ بەیانی.

لە سەرەتای ساڵی (١٩٢٠) دووبرا بەناوەکانی ڕەحیمە سووروو ڕەحمانە سوور، لە ناو هۆزی (گێژی) کوردانەوە لە ناحیەی قەرەتەپەوە لە ئاوایی (نارینەوە) کۆچیان کردووە و گوندی (تۆپ عەسکەریان) ئاوەدان کردۆتەوە لەگەڵ ئەمان فەرەج گەڵاڵی و حەمەی سەلەو کەریم فەتاحی وەناوی یان وەنداوی تێدا نیشتەجێ بوون، سەرژمێری ساڵی (١٩٣٤) یان کردووەو حەڤدە ماڵ بوونە.

یەکێك لە شوێنەوارییەکانی (تەپە وەیسە) کە شوێنی کورە بووەو خشتی زۆری لێ دۆزراوەتەوە کە بۆ (٢٠٠٠) هەزار ساڵی پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، لەگەڵ دیواری خشتی سوورەو کراو ئاسیاوی تێدا هەبووە.

لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هێرش دەکەنە سەر ئەم گوندەو خەڵکەکەی قەتلوعام دەکەن.

ئاواییەکانی دەورووبەری (تۆپ عەسکەر) بریتییە:- خیری، شێخ غەریب، شێرەوەن، خەیاڵ، ساڵح ئاغا، پشت پەنگ کەنی زەرد، حەوش کووڕ، مەرکەن، ناحیەی قۆرە توو.

### * گوندی خدر شیرین

چیرۆکی دەماوم دەم زۆرە لەسەر ناوچەی شوان، خۆرهەڵاتی شاری کەرکوك جێگەی ئێلی بە ناوبانگی شوان.

ناوچەی شوان بە دووبەشی جوگرافی دابەش دەبێت، بەشێکی کە لەسەر ڕووبارەکەیە بە شوانی سەر خانە بەناوبانگە، بەڵام ئەوەی دەکەوێتە بنارەوە، بە شوانی کەشك بەناوبانگە.

سێ سەد ساڵێك بەر لە ئێستا دووبرا، سمایل و شاوان لە دەورووبەری چیای سەرەکەشی شاهۆی ناوچەی کرماشانی خۆرهەڵاتی کوردستانەوە لە ئێلی گەرووسی جیا دەبنەوە بە خۆو ڕەشماڵەوەو مێگەل و خاوخێزانەوە، هۆبە هۆبە بە مەر لەوەڕاندنەوە، ئاوێزگە باروبنە لەسەر خاسە دەخەن، شاوان مێژووی نارروونەو کەسی نازانێت بۆ کوێ ڕۆیووە، بەڵام سمایل هەشت کوڕی هەبووە، یەکێك لەو کوڕانەی ووجاغ کوێر بوون پاش عەیامێك سمایل بەگی ئاوەدان دەکەنەوەو دەبێتە پایتەختیان ئاواییەکانی حاجی جەرجیس و ئەحمەد ڕەجەب و ئاوایی مەمان، ئاوایی قووتان و ئاوایی جانقز دەخەنە سەر مێژوونەخشەو هەر یەکە لە کوڕەکانی دەچنە سەر ئەو ئاواییانە.

یەکێك لە ئەمیرەکانی ئیمارەتی بابان بەو ناوەدا گوزەر دەکەن، ڕوودەکاتە سمایل بەگی، بە نەرێتی جوانی و پیرۆزی کوردەواری پێشوازییان دەکەن، ئەوجا میری بابان لە تۆڵەی ئەم میوانداریە، یەکێك لە کوڕەکانی سمایل بەگی دەکات سەرکردەی لەشکری ئیمارەتی بابان .

یەکێك لە گوندەکانی ناو شوان (خدر شیرینە) خدر خەڵکی سێکانانی لای سەر گەڵووە، دووسەد ساڵێك بەر لە ئێستا بە مەر لەوەڕێنی دەچنە گەردی لەوێ شیرینی بەرەی عەرەب ئاغای گەردییان، ئاوایی بەحرکە دەهێنێت و بەرەو ناو شوان لەم ئاواییە نیشتەجێ دەبن بەڵام ئەم ئاواییە مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارو دوو سەد ساڵێك، وە خدر شیرینیش لە ئۆمەرمەندا مردووە.

ئاوایی خدر شیرین، زەوییەکانیان تاپۆی ڕەشی هەیە زیاتر لە ١٥٠٠ کێڵگەی زەوی بەرهەمهێنانی دانەوێڵەی هەیە بە ناوی (٢٣) جووتیارەوە تاپۆ کراون لەنێوان گردو بەرزاییەکانی گرد حەرەس و گری مردەو کەڵکەواڵ و گرد خەبەردایە، زەوییەکانیان دەشتی ناوران و خەرابەو زەردکی ئاغامەن و رازیانەو هەواری مۆردەو سێ قەبرسانی کۆنی لێیە مەغریبستانی شێخ بەکر، گۆڕستانی هەواری مۆردو گۆڕستانی کەتانە.

ئەم گوندە لە کەرتی کشتوکاڵی (٤٥)ە ، کە (١٠٠٠) دۆنم زەوی هەیە، شوێنی لەوەڕگا نزیکەی (٣٠٠٠) دۆنم دەبێت

کانیاوەکانی بریتییە لە: کاورە، کەتانە، دۆلکارێز، کەلکەل، نزیکەی (٢٠٠٠) هەزار سەر مەرو مالاتی هەیە لە سالی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هێرشیان کردووەتە سەر ئەم گوندە، لە سالی (١٩٦٩)یش ئەم تاوانەیان دووبارە کردووەتەوە، لە سالی (١٩٧٤) وەلی سەید خان هێرش دەکاتە سەر بەعسییەکان کە پێشمەرگە بووەو چالاکییەکی گەورەیان ئەنجام دەدات.

لە سالی (١٩٨٨) ئەم گوندە نزیکەی (٣٠) مال بووەو خەلکەکەی ئەنفال کراوەو گوندەکەیان رووخاندووەو نزیکەی (٦) شەهیدیان هەیە، کە سیانیان شەهیدی سەنگەرن.

*** گوندی (دارە قووتە)**

ئەم گوندە دەکەوێتە رۆژئاوای ئاغجەلەرەوە، هەروەها بە دووری (١٠٠) کیلۆ مەتر دەکەوێتە باکووری کەرکوکەوە، بەر لە ئەنفال نزیکەی (٤٢) مالی لێ نیشتەجێ بووە، نزیکە (٧٢) کەسیان لێ ئەنفال کراوە و هەشت شەهیدیان هەیە لە سەنگەر لە ئێستادا هەشت مالی لێ نیشتەجێیە.

بنەرەتی ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە دارێکی لێ بووە قووت بووە، کە لە هەموو شوێنێکەوە دیار بووە.

سنووری گوندەکانی دەوروبەری دارەقووتە بریتی بووە لە ئاوبارەیە، مۆرخواردەی خوارووە، مۆرخواردەی سەرووە، جەلەمۆرد، مام وەیسیە، شێخانە، کە دەکەوێتە بناری خالخالان لە رووی ئیدارییەوە سەر بە ناحیەی ئاغجەلەرە.

ئەم گوندە لەسەر کشتوکال و مەر داری ژیاوەو لە ئێستادا ئەم گوندە زۆر بێ ئاوە، ئەم گوندە سێ جار چۆلکراوەو لەلایەن بەعسەوە تالان کراوە.

*** گوندی کانی سارد**

یەکێکە لە گوندەکانی هەمەوەند لە رووی ئیدارییشەوە سەر بەناحیەی تەکیەی سەر بە قەزای چەمچەمالە بە دووری نزیکەی (٧٠) کیلۆ مەتر لە رۆژهەلاتی پارێزگای کەرکوکەوە.

ئەم گوندە بۆ یەکەم جار لەلایەن رژێمی بەعسەوە لە سالی (١٩٨٧) دەرووخێنرێت، بەلام خەلکەکەی لە ماوەی چەند مانگێکدا ئاوەدانی دەکەنەوەو دەگەرێنەوە تا سالی (١٩٨٨) کە لە پرۆسەی ئەنفالدا جارێکی تر دەروخێنرێت و دانیشتووانەکەی دەربەدەر دەکرێت، لە سالی (١٩٩١) دووبارە خەلکەکەی ئاوەدانی دەکەنەوە.

گوندەکانی دەوروپشتی بریتییە لە : ئەمنە سوورە لە خوارەوە، باینجان لە تەنیشتەوە، ژوورتر چۆلمەك و هەراوەیە، پشتەوە خوامراوە، لە سەرووە ئاتاشگایەو لکاوەیە ئەم گوندە لە چوارچێوەی هۆزی هەمەوەندەو گوندە کە گشتی هەمەوەندن کە گوندەکانی دەوروبەریشی هەمەوەندن. لە بنەرەتدا هەریەکە لە مەلا تاهاو براکەی فەتاح ئەم گوندەیان ئاوەدان کردووەتەوە کە بۆ نزیکەی دووسەد سالێك دەگەرێتەوە.

بنەرەتی ناوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە کانییەکی ساردی تێدا هەبووە، بۆیە بەو ئاوەوە بە ناوبانگ بووە کە لە ئێستادا کانیاوەکە ووشکی کردووە.

کانی سارد کەوتۆتە بە ناوبانگترین شوێنی شوێنەوارەوە کە ئەویش گوندی (چەرموو)ە کە مێژووکەی بۆ (٧٠٠٠) هەزار سال پێش زاینی دەگەرێتەوە لە تیمێکی شوێنەواری ئەمریکی سەرپەرشتیان کردووە بۆ کنەوپشکنینی.

لە سەرەتادا گوندەکە (٦- ٧) مال بووە، بەلام لە دوای ئەوەد و یەکەوە نزیکەی دوانزە مال گەراوەنەتەوە ئەم گوندە لە رابردوودا گەلێك داری بەرداری وەکو قۆخ و قەیسی و سێوو گەلێکی تری هەبووە لەگەل کشتوکال و مەرداریدا.

*** گوندی گلاباد:-**

ئەم گوندە کەوتۆتە ناوچەی گەرمیان، لە سنووری حەمرین، لە بناری جەول (بتێرە)، لە ناحیەی جەبارە سەر بە کفری جەوەل (بتێرە)، جەوەلێکی کوردەوارییە لە مەنەلییەوە دەستپێدەکات لە تەك حەمرین رەت دەبێت هەتا دەم کەرکوك لەوێشەوە بۆ موسلەکەی کوردان، ئەم شوێنە لە ناوەندی قەرەتەپەیە، لە خۆر هەلاتییەوە جەوەلی (زەرداو)و (باوە شاسوار)و شاخی (غەرەیە)، لە ناوەندی (بێشك تەپە)و گردی (ئاسکی کفری)و (گاخۆرو تلیشان ناحیەی جەبارەیە، نیشتمانی هۆزە کوردەکانی دەلۆو زەنگەنەو گێژو جافە، لە لێشاوی هاتنی هۆزە عەرەبەکانی ئەدیو سنووری کوردستان کە حەمرینە لەنێوانی وولاتی کوردەواری و عێراق عەرەبی، بە پالپشتی عوسمانی و دواتر حکومەتی نوێی عێراق لە سالی (١٩٢١) دامەزرا، ئەوان کۆچیان کرد بۆ ئەم دیو سنووری حەمرین، لە خۆر ئاوایی باشووری کوردستانەوە ناوچەکانی (حەویجە) داگیر کرا لە لایەن عەرەبە تەعریبکراوەکان لە باشووری باشووری کوردستانیشەوە، لەلایەن ئەو عەرەبانەوە داگیر کرا.

ناحیەی جەبارەی کوردان لە لایەن (سنجارەکان) داگیریان کردو کە (٢٤) ئاواییە.

ناوچەی خۆرئاوای جەبارە، گوندی (گلابادە)، جا گلاباد سێ ئاواییە، گلاباد لەگەل گلابادی (ئەورەحمانی کارێزە)، لەگەل گلابادی (لاوە).

(٢٣٠- ٢٣٥) بەر لە ئێستا دووبرا لە چوار ئاسیاوی (دەلۆ) لە مەسۆی بەرگەچی ناحیەی سەنگاوەوە بە خۆو ئێل و پەزولەوەر قۆناغ بە قۆناغ بە ناو جاف و کفریا دێنە ئەم (گلابادە)، کە لە وسەردەمەدا ئەم مەملەکەتە تەنها کوردی لێ هەبووە ئەو دووبرایە بە ناوەکانی ئەمین دەرۆیش و عەلی دەرۆیش بوونە هاتوونەتە ئێرە.

گلی نیشتمان لەوێ لەگەل هۆزی دەلۆ نیشتەجێ دەبن ئەودەم هۆزەکانی گێژەکانی کوردو زەنگەنەو جاف لە قەرەتەپە لە حەوزی حەمرین نیشتەجێ دەبن.

دەلۆی گلاباد و ناوچەی کفری و خانەقین یەکدەگرن و بەرابەرایەتی برایم خانی دەلۆ، لە سالی (١٩٢٠) رادەپەرن دژی ئینگلیزەکان، کە بیست و یەك رۆژ فەرمانرەوای شاری کفری دەکەن.

بنەرەتی ناوەکە بە مانای گلی نیشتمان دێت کە گلا بە مانای گل، (ئاباد)یش بە مانای نیشتمان دێت.

لەم ئاواییە کانیاوێکی گەورەی لێیە پێی دەڵێن (قووڵ قووڵە. ئەمە هەڵدەقوڵێ لە بەری چەمی گەورەو چەمی زنص. چالیان بۆ بۆیسان لێداوەو بەکەرو شەلتە پەینی ئاژەڵیان هێناوەو کردویانەتە بن برکەکانو ئینجا لە قووڵ قووڵە ئاویان بە کەروبار گواستووەتەوە، هەروەها دار کنار و خوورمای هەیە لەگەڵ دار گەز، کە دار کنارە کە بەرمکەشی دەخوورێت. هەروەها لە چەمەکە شامیو کاڵەکو شووتیو خەیار یان دەکرد.

لە پەنجاکانی سەدەی پێشوو لە ئاسکی کفری وێستگەیەکی شەمەندەفەر هەبوو کە لە کەرکوکەوە دەهات لە نزیك کارێزە دەوەستاو خەڵکی قەرەتەپەو جەبارەی کورد کەلوپەلیان دەبرد بۆ بەغدا بۆ ساغکردنەوە، هەروەها لە هەوارمانەوە هاتوونەتە ئەمە شوێنە گوێزو مێوژیان دەهێناو شتی تریان دەبردەوە بۆ وڵاتی خۆیان ئەم ناوچەیە بە ناوبانگ بووە بە ئاسکەو حوبارەو مێشەسیو پۆرو سوێسکە کە فرۆشتوویانە بۆ ناوچەکانی تر.

جوولەکان زۆر لەم ناوچەیەدا هاتوو چۆیان کردووە بە ناوەکانی کوبانی عەبدوڵلاو سولێمان کە لە پیشەی عەتاریو بەنیان ڕەنگ دەکرد.

زەوی گڵابادی (١٨٠٠) دۆنم زەوییە، بەناوی دوانزە جووتیارەوە تۆمارکراوە، لە کەرتی کشتوکاڵی بیستو دووە مەر بزنو ڕەشە وڵاخی تێدایە.

لە حەفتاکاندا قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە بە زمانی عەرەبی بەڵام لە دوای پرۆسەوە، بە زمانی کوردی قوتابخانەی بۆ کراوەتەوە.

*** گوندی وارانی:-**

یەکێکە لە گوندەکانی داوێ، ناوچەی داوێ لە خورماتووە دەست پێ دەکات تا شاخی (قاجار)، لە باکوورو خۆرهەڵاتەوە مازووخو داوێی کوردستانییە، ئاوەسپی یەکێکە لە رووبارە بە ناوبانگە و لە خۆرنەوازانەوە لە بەر هەردوو شاخی مازووخو شاخی قاجار بە داوێدا گوزە دەکات، داوێ یەکێکە لەو سنوورانەی ناوچەکە (٤٠٠) ساڵێك بەر لە ئێستا ئەحمەد دوو تۆیی بە خۆیو ١٧کورو عێڵەوە لە ئاواییەکانی دوو توێی وشەر دێنە خۆرئاوای وڵاتی جوانرۆیەوە بەهۆی فشاری قاجارانییەکانەوە پەنا بۆ حەبیوڵلە خانی قوبادی سەرداری قوبادیو باوەجانی دەبات ئەمانە عیلی باوانێن کە تیرەیەکە لە جاف جوانرۆ لە گوندەکانی گۆراوەکێو پشتماڵەو سێ موراو بانەگانی گەورەو، چەم نزارو سوورمەو کۆزەرانو سەرابیسەسو گەناو نیشتەجێ دەبنو بەهارو هاوینانش چوونەتە کوێستانەکانی شاخی بەناوبانگی کوردەواری شاهۆو ناوچەی سەریاسو پاوە، ناکۆکی دەکەوێتە نێوان خێڵی باوەو دەسەڵاتدارانی ئێران، ئێل بار دەکەن بۆ ناوچەی پشت ئەودیوی (بەمۆ) بۆ گوندەکانی چوار دارانو کانی وێسکە ویەلەسە و باروینە دەخەن. دواتر برێکیان روودەکەن ئاوایی عازەبانی دەربەندیخانو، جەلیلە وجێوەڵە، ئەوانەی عازەبان پێیان ووتراوە وارانی، هەندێکشیان لە نزیك ڕاهۆڵ لە قەسری شیرن لە بنەماڵەی عەوڵا خدری دووتوێی.

خێڵی باوانێن بریتییە لە بنەماڵی قازیو باباییو ئەڵماسی، وجەمشێریو باوە لێوو داوێو ئەویجانی لەگەڵ بنەماڵەی وارانی.

یەکێك لەو حەڤدە کورەی ئەحمەد دوو توێی ناوی وارانی دەبێت دەچێتە گوندی عازەبانی لای ئەو دیو دەربەندیخان پاشان نەریمان کوری وارانی دەچێتە لای میرسمایل لەگەڵ ئیبراهیم ئاغاو پاڵی پێدا دەدەن بۆ پاراستنیان لە سپی سەر واران هەشت کوری هەبووە: ئیبراهیم، نەریمان، بەهمەن، جەمشێر، هەروەها قەبرسانیان لە سپی سەروگرد عازەبان وارانی هەیە.

ئیبراهیم وارانی کوری ئەحمەد دوو توێی دەچێتە وارانی لەلای قشڵاخە کۆنەکە لەوێ دەمێنێتەوە، هاتنیشیان بۆ ئەم شوێنانە لە ترسی دووژمن بووە بە تایبەتی قشڵاخ کە لەناو هەردوو شاخی ناوچەکە دابووە، لە دوایدا هاتوونەتە سەر ئاوەسپی کە بارەکە گونجاو بووەتەوە.

لەساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هێرشێکی گەورەیان کردووەتە سەر ئەم گوندەو بەناوبانگ بووبە (سووپای کەرکوژە) کە هەموو کەری گوندەکەیان کوشتووە بۆ ئەوەی هاتووچۆی پێ نەکەنو گوزەرانی ژیانیان نەکەن.

هەروەها بازرگانیان لەگەڵ خاڵسو کەرکوكو بەیاتو خوورماتوو کردووە، تووتنو خورمایان ئاڵوێر دەکرد لەگەڵ شارباژێر و ناوچەکانی تر.

ئاواییەکانی دەورووبەری وارانی بریتییە لە: لفتیە ئاغاو چەوریو زنانەو گەرمكو خۆرنەوازان هێڵە سوور عومەر سۆفیو قاجەرو ماروخ.

ئەم گوندە دەکەوێتە (٢٠) کیلۆ مەتری خۆرهەڵاتی خوورماتووە لە سەرچەمی ئاوە سپییە، بەر لە ئەنفالەکان ((٤٢) ماڵ بوونە لە وارانی حەوت بنەماڵە شوێنەواریان نامێنێت لە شاڵاوی ئەنفالی بەدناو.

ئەحمەد سەمین یەکێك بووە لە خەڵکی وارانی لە پێشمەرگەکانی شۆرشی شێخ مەحمود کە لە ساڵی (١٩٣١) شەری کردووە لەگەڵ ئینگلیزەکان، بۆیە بە برینداری دەیهێننەوە بۆ گوندی وارانی و لە کەلۆزە (مەکۆ) دەیشارنەوەو هەر لەوێ دەمرێت بە کەلۆزی ئەحمەد بە ناوبانگە تاکو ئێستاکە، هەر لەو گوندە فرۆکەیەکی ئینگلیز کەوتۆتە خوارەوە لەنێوان لفتی ئاغاو وارانی.

لە ساڵی (١٩٨٠) حکومەتی بەعس هێرشی کردووەتە سەر ئەم گوندە و شەری لەگەڵ پێشمەرگە کردووە، هەر لەم گوندە نزیکەی (١٢٠) ئەنفالی هەیە، کە لە (١٩٨٨) ئەنفالی بەدناو بەسەر ئەم گوندەی هێناوەو تاڵانی کردووە.

لەم گوندە گەنمو جۆو برنجو کونجی لێکراوەو رۆڵێکی باشیان هەبووە لە ئاژەڵداری، بەتایبەتی لە دەشتی باسکە بۆر زەوییەکەی زۆر بەپیتەو کانیاوو ئاوی زۆر بووە لە رابردوودا، یەکێك لە ساڵەکان ئاوە سپی لافاوی کردووەو گەیشتووەتە ئەم گوندەو خەڵکەکەی ڕەویان کردووە.

لە ساڵی (١٩٧٧) یەکەم جار قوتابخانە کراوەتەوەو یەکەم مامۆستا تورکمان بووە خەڵکی خوورماتوو بووە، بەڵام لەدوایدا خالید گەرمیانی قوتابخانەو مامۆستاکانی

دەرکردووە لەبەر ئەوەی بیروباوەری بەعسی بڵاودەکردووە.
گوندی وارانی لە کەرتی کشتوکاڵی (٦٩)یە نزیکەی (٣٠٠٠) هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵی هەیە.

*** گوندی (ئۆمەر سۆفی)**

یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی داوێ لە خورماتوو، لە ناحیەی نەوجوول، لە بناری چیای قاجرە.
لە ئێستادا (٢٠) ماڵی لێیە لە بناری چیای قاجر گوندێك هەیە کە پێی دەڵێن (ئۆمەر سۆفی)، کەوتووەتە پشت سەر چەمییەکان کە سەرچەمییەکان مەبەستیان سەر رووباری ئاوە سپییە کە بریتییە لە گەرمك و لوفتی ئاغا و باش تەپەو گرگرەکان و چەچان و قوم پەڵکە.
سێ برا لە ناوچەی (دەم شێر)ی کرماشانەوە، لە هۆزی ئۆمەر ئاغا جانی، بە قۆناغ چوار سەد ساڵ بەر لە ئێستا بەران و نێڵ و دەوار و ماینەوە هاتوونەتە چرچە قەڵاو گۆمە زەرد، هاتوونەتە بنار (گل)، کە ئاسەوارو شوێنەوارەکانیان ماوە، ئەم سێ برایە زەینال و ئۆمەرو حەمام بووە لە جەبەل قاجر دەکەونە ئەمدیوەو تەنها خانوو دادەمەزرێنن و دوای دەچنە قشلاخی کۆن کە چەم و بێشەلان و ئاوی زۆری لێ هەبووە.
بنار قاجر شارستانی کۆنی تێدا هەبووە، کە خەرابە شارێکی کۆن بووە، لەگەڵ دێی ئەحمەد بەگ ئەمیش زۆر کۆن بووە، یەکەم جار دەچنە (کەل تەنها خانوو)، هەروەها (گۆزە داریش شوێنێکی تری کۆنە)
لە ساڵی (١٩١٦) جەندرمەی عوسمانییەکان داویانەتە سەر ئەم گوندەو تاڵانیان کردووە، بەڵام کە لە جاری دووەمدا هاتوونەتەوە خەڵکەکە لێیان راپەریوون و دەریان کردووە لە ساڵی (١٩٤٧) ئەم گوندە تووشی گرانی بووە. هەروەها هارە کولەیش لەو ساڵە لێیداوە.
دەربارەی بنەرەتی ناوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی ئۆمەر کوری سۆفییە کە باپیرە گەورەیان بووە.
لە ساڵی (١٩٥٩) بۆ یەکەم جار پاسی تەختە هاتووەتە ئەم گوندەو تا ماوەیەکی چاك لە ناوچەکانی داوێ هاتووچۆی پێکراوە بۆ خورماتوو.
لە ساڵی (١٩٦٣)یش حەرەس قەومییەکان داویانەتە سەر ئەم گوندەو تاڵانیان کردووە. لە ساڵی (١٩٦٣) بنکەی شۆرشی ئەیلوولی لێ بووە، بۆیە تاڵان کراوە، لە ساڵی (١٩٦٧)یش دووبارە زەوییەکانی ئەم گوندە درێژ دەبێتەوەو فرەن لە ووشترو شکیاو درێژ دەبێتەوە تا هەیەرە سوور تا ئاوایی تاڵاو و لەك.
(٢٧٠٠٠) هەزار زەوی کشتوکاڵ و (١٨٠٠٠) هەزار زەوی لەوەرگاو شاخەڵانیان هەیە، گەلێك گژوگیاو بەراوو کانیاویان هەیە، کارێزێکیان هەیە کە تاچاڵی بەراوەکە نۆبیری لێدراوە، وەستا جەمشێری کوردستانی رۆژهەڵات ئەم بیرەی لەبەر (١٥٠) ساڵێك لێداوە.
ئەم گوندە بەسەر کەرتی کشتوکاڵی (٦٣)یەوە بەسەر (٤٠) جووتیارەوە تاپۆ کراوە، بەروبوومەکانیان زۆری گەنم و جۆ. هەروەها خەریکی مامەڵەی تووتن چێتی بوونە لەگەڵ شارباژێر. چەمەکانی ئەم گوندە بریتییە لە:- چەم ئاوە شوێرو چەم سەرکەڵ و چەم بنەوانەیە.
نزیکەی (٥٠) ماڵ ئەنفالی تێدایەو لە ئەنفالدا بەر تاڵان و سووتاندن چووە.
رەشید تووتنچی یەکێك بووە لە قارەمانەکانی ئەم گوندەو لە دژی حەرەس قەومییەکان راپەریووە کە خۆیی و (١٨) لە پێشمەرگەکان دژیان شەریان کردووەو هەشتیان لێ دەکوژن و یەکێکیان بەدیل گرتووە، مامۆستا محەمەد یەکێك بووە لە تێکۆشەرەکانی ئەم ناوچەیە.

*** (گوندی پیریادی - پیرحەیاتی)**

هەریەکە لە پیریادی، پیرحەیاتی، رەنگدانەوەیەکی مێژوویی دووروودرێژی هەیە کە بۆ سەردەمانێکی زۆر دوور دەگەرێتەوە، یان لەوانەیە پاشماوەی ئەو ئاینە کۆنانەی کوردستانی گەورە بێت، بەڵام لە دوایدا تێکەڵی کەلەپووروشارستانی ئایینی ئیسلام بووەو بووەتە بەشێك لە خزمەتی ئەو ئاینە.
ئەگەر سەیری رێچکەی بڵاوبوونەو گەشەکردنی پیریادییەکان بکەین دەگەینە ئەو راستییە کە هەڵگری گەلێك کەلە پووری ئایینی کوردەوارین کە تاکو ئێستاکە لە پەیرەو ژیانی رۆژانەیاندا هەڵگری ئەو خاسییەتانەن، کە هەردەم لە هەڵسووکەوتیاندا رەنگدانەوەی خۆی هەیە. یان لە پەیرەوە ئاینییەکانی ئیسلامدا جوانکاری خۆیان بەدەر دەکەوێت.
لە کۆندا ئەم پیریادیانە لەوناوچانە گەشەیان کردووە یان لە ژینگەیەکیاندا سەری هەڵداوە کە شوێنکاری ئاینیە کۆنەکانی وەکو زەردەشتی و کاکەیی نێو کوردستان بوونە روون نییە لە چۆنییەتی پەیوەندییەکان، بەڵام ئەوە یەکلا دەبێتەوە کە تێکهەڵکێشی کەلەپووری یەکتری بوونە.
پیر، یاد، حەیات، هەریەکە لەم دەستەواژانە مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە، کە بنەرەتی ناوەکان بۆ سەردەمانێکی زووی مێژووی دەگەرێتەوە.
پیر گەورە، یان پیاوی گەورە، یان ردێن سپی، یان پیاوی خاوەن دیدەو بە ئەزموون.
حەیات: ژیان، زیندوو، جۆرێك لە نەمر.
یاد: رابردوو، بیر و هزر.
پیریادی، پیری حەیات، رەنگدانەوەی پیاوی بە ئەزموون و هەمیشە نەمرزیندوو کە چاکەکانی بەردەوام بە دەردەکەوێت.
"... بنەماڵەی (سەیدی پیریادی) لە رەگەزدا نەوەی برایەکی (بابا سەید زەنون پیریادی) بوون لە سەرەتادا لە گوندی (تەکیە)ی نزیك بە دەربەندیخان نیشتەجێ بوون و تەکیەو مزگەوتیان لەوێ دامەزراندووە، بۆیە ناوی گوندەکەیان (تەکیە) ناونراوە، بەڵام پاش چەند ساڵێك سەیدەکانی (تەکیە) بریاری بارکردن دەدەن و لە گوندی (پیریادی) نزیك بە چەمچەماڵ دەحەوێنەوە نەوەی (بابا سەی زەنون) لە گوندی پیریادی تەکیەو مزگەوتی خۆیان دادەمەزرێنن و هەندێکیان باردەکەن و بڵاودەبنەوە لە ناوچەکە بە تایبەتی لە گوندی (مۆفەر)و (چەشمە بەردین)و (قۆرەتە)و (عەلی مەنسوور) (١).
ئەوماوەیەی کەلە (تەکیە)ی دەربەند بازیان بوونە، بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵات باوەریان پێیان هێناوەو

لە دەوری تەکیەکەیان نزیکبوونەتەوە. بەشێکیان لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوونە.

" عوسمانییەکان (٤٥) گوندی ناوچەی چەمچەماڵیان فەرمان دەکەن یان (وەقف) بۆ سەر بنەماڵەی سەیدی پیریادی بۆ ئەوەی تەکیەو مزگەوتیان بەڕێوەبەرن کە چەمچەماڵ یەکێك بووە لەو (٤٥) گوندە لەو سەردەمانەدا... (٢).

دوای فراوانبوون و گەشەکردن و ناوبانگ دەرکردنیان و بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بەربلاو گەشە بکەن بە هەموو لایەکدا دەکەونە تەکیە دروست کردن و بلاوبوونەوە کە بەشێکیان چوونەتە قەرەداغ، چیمەن، مۆفەر، هەر ناوچەیەك تەکیەی خۆی هەبووە.

(گەڕەکی پیریادی دێرینترین گەڕەکە لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی ئەوبەری (خاسە) واتە بەری قەلا ئەم گەڕەکەش ئاوا کراوەتەوە.

" ئەو کاتە گەڕەکی (پیریادی) ئاقارێکی فراوان بووە، کە ناوی گەڕەکە کە بە ناوی دانیشتووانی پیریادییەوە ناونراوە کە پیریادییەکانی چەمچەماڵ یەکەم ماڵ بوونە بناغەی ئەم گەڕەکەیان دامەزراندووە، چونکە لە کۆنەوە خەڵکی چەمچەماڵ و گوندی (پیریادی) کاروانیان بۆ کەرکوك کردووە بە کەرو ووڵاخ و دارو غەلووزو گەنمو برنج و توتنیان هێناوە بۆ کەرکوك، کە بەشێکیان لەناو ئەم ئاقارە نیشتەجێ بوونە.

لەبەر ئەوە چەند هۆکارێك هەبووبێت بۆ کۆچکردنیان بۆ کەرکوك:-

١- لەوانەیە هۆکاری ئاینی بووبێت، کە دەوری بینووە لە بلاوکردنەوەی باوەڕەکەیان بۆ کردنەوەی تەکیە بووبێت.

٢- لەوانەیە هۆکاری بازرگانی بووە بۆ کارکردن و ئیش کردن لەم شارە، هەر لەبەر ئەمەیە کاریان کردووە لە گەلێك کاری دار فرۆشی و تەنوور دروست کردن و خۆشکردنی بیناکارییدا.

گەلێك لەسەرچاوەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە پیریادییەکان تێکەلاوییەکی جوانیان هەبووە لەگەڵ تورکمان و جولەکەکان و گەلێك لە هۆزەکانی تری ئەو ئاقارە.

بۆ نموونە تێکەلاویان لەگەڵ جوولەکەکان زۆر بە هێز بووە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هاوبەش بوونە لە گۆڕستانی جوولەکەکان لە ناشتنی مردووەکانیان، یان وەکو مەلا عابید کە لە بنەرەتدا جوولەکە بووە کاتێك کەسوکاری مردوونە ئافرەتێکی گەڕەکی پیریادی بە خێوی کردووەو گەورەی کردووە کە لە دوایدا بووەتە موسلمان و تا مردنی لە مزگەوتی (مەلا عابیدا) بووە.

سالانە لەم گەڕەکەدا پێشبرکێی قورئان خوێندن و مەقام و تەراویح کردووەتەوەو ناوبانگیان لە بەغداو موسل بلاوبووەتەوە.

* دابوونەرێتی بیروباوەری پیریادی:-

١- هەردەم هەولی ئەوەیان داوە کە هەژارو لێقەوماوان دالدەبدەن لە هەموو سەردەمەکاندا بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر.

٢- بایەخیان زۆر بە دەوروبەیان داوەو خاوەن پەیوەندی پتەو بوونە.

٣- لەگەڵ هەموو چین و توێژەکاندا هاوگونجاوو بوونەو خۆیان گونجاندووە.

٤- زمانی پاراویان هەبوو لەگەڵ خەڵکی و تێگەیشتن لێیان.

٥- زمانی ئاینیان دەوری بینووە لە بلاوبوونەوەو ڕێزگرتنیان.

٦- خاوەن پیشەبوونەو سادەییان دەوری بینووە لە سەرکەوتنی پیشەکەیان، ناوبانگ دەرکردنیان.

٧- کەسایەتی و پیاوی ناوداریان تیا هەڵکەوتووە کە خزمەتی مرۆڤایەتیان کردووە.

٨- پاراستنی کوردەواری خۆیان لە پاڵ بیروباوەڕە ئاینییەکەیان کە هەردەم هەولیان داوە بە زمانێکی کوردی پاراو خزمەتی ئاینییەکە بخەنە ڕوو.

٩- جیاوازی نەکرد لە یارمەتی لە هەموو توێژو ئاینیی و زمان و نەتەوە.

١٠- گەلێك زاناو مەلای ئاینیان تێدا هەڵکەوتووە کە نموونەیان مەلا عەبدوڵای خەرپانە لە گوندی خەرپان لە ناوچەی هەورامان.

١١- هەڵکەوتنی پیاوی سیاسی و ڕۆشنبیر لە هەموو بوارەکاندا.

* شەجەری تەریقەتی ( پیریادی - قادری )

سەید زەنوون (زەنوور)
فەتحوڵلا سەید زەنوون
عەبدولکەریم فەتحوڵلا سەید زەنوون
حوسێن عبدولکەریم
حەبیب حوسێنی عەبدولکەریم
شوکور ئەڵلا حەبیب
بابە محەمەد شوکور ئەڵلا
بابە ئیبراهیم بابە محەمەد
یەحیا بابە ئیبراهیم
خالید یەحیا بابە ئیبراهیم
یەحیا خالید
ئەحمەدی گەورە
یەحیا ئەحمەدی گەورە
حوسێنی یەحیا
کەریم حوسێن
حەسەن کەریم
سەید عەلی حەسەن

* گوندی ( پارە.. پارە ):-

ئەم گوندە لە ناوچەی داوێی گەرمیانە، لە بناری حەمرین، لە دەڤەری (خورماتوو). کەوتووەتە ٢٥ کلیۆ مەتری خۆرئاوای خورماتووە، کە دەکەوێتە ناوچەی داوێی خوار جادە، یان داوێی گەرمیان.

هۆزی داودە بەرێبەری حەقی بەگ داودە لە ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە بە ٨٠ خێزانەوە هاتوونەتە باشووری کوردستان کە سێ سەد سالێك بەر لە ئێستادا ڕووی داوە، کاتێکش (حەقی بەگ) سزای کوشتی بۆدەردەچێت لەلایەن ئێرانەوە پەنا دەباتە بەر کوردستانی باشوور بۆ دالدەدانی لە

میرنشینی زەنگەنە دالدە دەدرێت لەلایەن (میر سمایلەوە) كە خووشكێكی خۆی لە حەقی بەگی داودە مارە دەكات.
داوێ بریتییە لە هەشت گوند، كە دوایی گەرمیان دارابەگ سەرپەرشتی كردووە، داوێی كوردستانی عەزیز بەگ سەرپەرشتی كردووە.
گوندی پارە پارە لە ساڵی (١٩١٤) لەلایەن هۆزی ساڵەییەوە لە خۆر هەڵاتی شاری كەركوك لەلای پردێوە هاتوون بەناوەكانی سالح رەمەزان و محێدینی برای و سێ كەسی تر، ئەم شوێنەیان ئاوەدان كردۆتەوە، پاشان هۆزەكانی لەك و زەندو زەنگەنەو ساڵەیی و گل و جاف و جەباری بۆ هاتووەو وەكو برا پێكەوە ژیاون.
پارە پارەییەكان بەهارە هەواریان لە گوندەكانی باخی حەسەن تەپەیی ناوچەی سورداش بووە، لەناوەڕاستی بەهارەوە لە جەوەڵ مەتارەوە بەرەو قەرە حەسەن بان جەباری ڕێڕەوی هۆزایەتییان گرتووەو گاو هێستریان بار كردووەو تا خواروو نەوەستاون لە بارانی پایزدا باریان هەڵخستووەو بە پێست و خوری و بە بەرهەمەكانیان لە مەڕو ماڵات ژیاون.
لە ساڵی (١٩٥٣) ژنێك بۆ یەكەم جار ئامێری دوورمانی هێناوەتە ئەم گوندە، هەر ئەو ساڵە عەزیزی عەلی شاباش رادیۆیەك لە كەركوك دەكرێت دەیهێنێتەوە بۆ گوندەكە، مەكینەیەكی باراش كە بەنەوتی رەش كاری كردووە، ئاشەوانەكەشی خەڵكی هیندستان بووە.
هەر لە دەورووبەری ئەم ناوچەیە چوار گردی دەستكرد هەیە، كەتوورەكە ڕێژەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئەراپخا) یە وەكو: تەپە مۆیل، تەپە پارە پارە، تەپە شێخ رەزاو تەپەی سیچان، ئەم بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەم ناوچانە هەر لە سەردەمانێكی زووەوە ژیان و مێژووی تێدابووە.
لە ساڵی (١٩٥٦) كۆمپانیایەكی ئینگلیزی هەستاوە بە لێدانی بیری ئیرتوازی و ئاوی بۆیان فەراهەم كردووەو ژیانی تێدا گەشاوەتەوە، لە ساڵی (١٩٦٧) مامۆستا ئومێد ناوێك لە كەركوكەوە قوتابخانەی لە پارە پارە كردۆتەوە.
لەساڵی (١٩٨٧) بەعس سەدو یەك خێزانی پارە پارەی لە ئۆردوگای (صمود) نیشتەجێ كردووەو گوندەكەی رووخاندووە.
زەوییەكانی بەنداوی عوزێم تا حلێوی بچووك دەڵێن گوایە تاپۆی دوو ئافرەت بووە بەناوەكانی لانۆو بانە كە ٧٥ هەزار دۆنم زەوی كشتوكاڵییە كەلە كاتی خۆیدا بەزۆر لێیان سەنراوەو دەربەدەركراون.
لە ساڵی (١٩٨٠) حكومەت فرۆكەخانەی كردۆتەوە زەوی خەڵكەكەی داگیركردووە كە ١٢٥٠ دۆنم زەوی كشتوكاڵی بووە.
پارە پارە لەكاتی كشتوكاڵی (١٦/١)یە بەناوی حەفتا جوتیارەیەك چەمی مۆری چایی لە فرەوەلی و سمودەوە دێت و بۆ تەپە سەوزو ئینجا بۆ پارە پارە، چەمی دووەم، لەژوور قوولو تەپەوە دێت لەبەین جینگلاوەو پارە.. پارە تێكەڵ دەبێت لە زەرگەوە دەچێتەوە حەمرین، ئەم چەمانە بۆ مەڕو ماڵاتیان بەسوودە.
ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٧٩)ەوە ڕێكخستنی و چالاكی پێشمەرگە دەوری هەبووە لە شۆڕشی نوێدا.

* گوندی (زەرداوی گەورە):-
ئەم گوندە كەوتووەتە ناوچەی حەمرین، لە گەرمیان، لە ناوچەی جەبارە، سەر بەكفری.
ناحیەی قەرەتەپە لە باكووری دەریاچەی حەمرینە لە شاری مێژوویی كوردستان كفری، (١٧٥٠) كیلۆمەتر چوار گۆشەیە لەنێوانی هێڵی پانی (٣٤) پلەو ولە درێژی (٤) پلە دایە، هۆزە رەسەنەكانی كوردی دەواری لە دێرزەمانەوە تێدا دەژین وەكو هۆزی پالانی، دەلۆ، بەرزنجی، وەناوی، جاف، داوێ، گێژ، گل، بەیات، زەنگەنە، باجەلانی.
لە ساڵی ١٩٥٧ (١٢٧) ئاوایی بوونەو، لە ساڵی (١٩٦٥) بووەتە ٧٨ ئاوایی و ئێستا (٦٢) ئاواییە، هۆزەكانی عەرەب لەودیو سنووری حەمرینەوە بە پشتوانی حیزبی بەعس و سوپای عێراق ئەم ئاواییانەیان داگیركردووە.
لە ساڵانی ١٨٠٠ بووەتە ناحیەو عەودل عەزیز ئاغای زەنگەنە كراوە بە بەڕێوەبەری ناحیەو لە دوای ساڵی (١٩٧٥)ە وە ئەم ناوچەیە دەلكێنن بە پارێزگای دیالەوە ولە كەركوكی دادەبڕن.
یەكێك لە ئاواییەكانی كە لەنێوان جەوەڵ حەمرین و جەوەڵ زلیخە بەرزایە ئاوایی زەرداوی گەورەی تاڵەبانییەكانە، شێخ عەبدولرەحمانی تاڵەبانی كوڕی شێخ ئەحمەدی تاڵەبانی كوڕی شێخ مەلا مەحموودی زەنگەنە بە وەلی گەورەی تاڵەبانییەكانە كە لە كەركوكەوە لە وەرزی شێخ ئەچوو بۆ زیارەتی گەیلانی لێرە لەم گوندە دا دەمایەوەو، پاشان پێشنوێژی بۆ دەكردن و دوای بوو بە شێخی ئاوایەكەوەو بوو بە مولكی تاڵەبانییەكان.
ئەم ئاواییە لەگەڵ ئاسكی كفری بە هەزاران ساڵ دروست كراوە كە مێژوویەكی دوورو درێژی هەیە لەگەڵ ناوچەی زەنگاباد. ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٣٧) قوتابخانەی تێدا كراوەتەوە كە ڕێگای نێوان كەلارو كەركوك بووە.
ئەم گوندە گەلێك قەڵاو تەپەی تێدا هەبوو، وەكو تەپەی تلیشان، تەپەی بیلە، تەپەی غەزال، تەپەی شۆرتەپە، خەرابەش هەیە، لەگەڵ ئەوەی پێشتر ئەم گوندە لەبان چەم زەرداو بووە لە دوایدا هاتووەتە ئەم شوێنەی ئێستای ئەم چەمە لە كفری لە قوچەچاپانەوە دێت كە جاران ئاوی تێدا هەبوو تا حەفتاكانی سەدەی رابردوو كە مەرەزەو كونجییان تێدا كردووە.
دەربارەی بنەڕەتی ناوەكەی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە جۆری رەنگەكەی زەرد بووەیان وەكو ئاڵتون گرنگ بووە بۆ ناوچەكەو ئاواییەكە.
ئاوایی زەرداوی گەورە زرمە دێیەكە لە خۆرئاوای باشووری وڵاتی كوردستان، زەوییەكانی بریتییە لە سێلاو جەژنی و خەراپەو كوناری و خورنكەواونی و بانە بۆرو زەوی زاخەو دەشت موراد. چەمەكانی بریتییە لە ئاوە شۆرو گاور جەوەو جۆگەی غەزال و كورد جەوەو چەمی چارلغ و تلیشان و بەیراغ دارە.
دێیەكە كەرتی كشتوكاڵی (١٣)یە بەناوی (٥٨) جوتیارەوە

هەریەکەیان (١٢٠) دۆنم زەوییان هەیە.
لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان هێرشیان کردووەتە سەر ئەم گوندە، کە هەندێ کەس شەهید بوو.
لە سەرەتادا ڕێکخستنەکانی شیوعی و لە دوایدا پارتی و لە ئێستا شۆڕشی نوێ لەم گوندە دا دەوریان بینیووە

* **گوندی (زەنقر):-**

ئەم گوندە لە قەزای داقوقە، لەسەر چەمی کۆزەرە. لە گەرمیانی ناوچەی کاکەیی.
شارۆچکەی داقوق، یەکێکە لە شارۆچکە کوردییەکان. کە مێژووییەکی دوورو درێژی هەیە. کە لە ڕابردوودا تەنها نەتەوەی کوردی تێدا ژیاوە. بەڵام لەسەردەمی عوسمانییەکاندا هەندێك تورکی عوسمانی تێدا نیشتەجێ کراوە، لە ساڵی (١٩٣٦) ئەم شارۆچکەیە بووەتە ناحیە، لە ساڵی (١٩٥٢) کراوەتە قەزاو، هۆزەکانی داودەو کاکەیی و تاڵەبانی و هۆزی تری تێدا نیشتەجێ بوونە. کە سەرتۆپی گوندەکانی کاکەیین تا ئێستا نۆزدە گوندی تەعریب کراوەو عەرەبی تێدا نیشتەجێ کراوە، یەکێك لەو گوندانە (زەنقر)ە. بنەرەتی ناوەکەی (زەن – قر)، زەن واتا ژن، قران یان تاڵانکردن، کاتێك پیاوو گەنجیان لەسەرکار بووە، ژن و منداڵیان کارەساتیان بەسەردا هاتووە لەلایەن عەرەبە فاشییەکان و ژنێکی زۆریان قڕ تێکراوەو کوژراوە.
سەرەتای ژیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئەرابخا)، کە کۆمەڵێك تەپۆڵکە دۆزراوەتەوە، لێرە قەڵای (زەنقر)ی مێژوویی هەیە، لەم قەڵایە گەڵێك گۆزەو ئێسك و پروسکی تێدا دۆزراوەتەوە، تێکرای ئاوایی بە شێوەزاری ماچۆیی قسە دەکەن، هەروەها لەم گوندە شوێنەواری (تەپەلوو) هەبووە، لەگەڵ (تەپەقووت) و تەپەی مامە سەمەد، پاشماوەی سەردەمی گۆتییەکانی تێدا دۆزراوەتەوە، هەروەها شوێنەواری دێرەکان هەیە کە هی سەردەمی مەسحییەکان، جوولەکەش لەم گوندەدا ژیاون و بە مەرداری کاریان کردووە.
ئەم گوندە دەکەوێتە (٧) کیلۆ مەتری باشووری خۆرئاوای قەزای داقوقەوە، لە ڕابردوودا جووتیارانی ئەم گوندە جۆگەکەیان لە ئاویی ڕۆخانە هەڵگرتووە، بەڵام لە دوایدا پرۆژەیەکی جوانی ئاوایی لە ناوچەکە دروست کراوەو لە کەرەتی کشتوکاڵی (٥٣)، سێ هەزارو نۆ سەدو سی و شەش هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵیان هەیەو دوو هەزاری زەوی ئاودێرەو حەوزی ماسی زۆری هەیەو پەنجاو شەش خێزان لەم گوندەدا نیشتەجێن.
لەڕابردوودا شوێنی قەتار بێژانی وەکو عارف دەلۆ، مەلا حوسێن، مام شەوکەت، شوکور جەیران، مام ئەلماس بوونەو ناوبانگیان تا دەورووبەریان پەرەی سەندووە.

* **گوندی (پاریاوڵە):-**

هۆزی گەورەو بەناوبانگی کورد، هۆزی جاف یەکێکە لە هۆزەکانی ناوچەکە، دەگێڕنەوە پیر میکائیلی شەش ئاو گۆز لە ساڵی (٧٣٨)ی کۆچی لە گوندی دەدوانی جوانرۆ، سەرکردەی ئێلی جاف بووە، لەو کاتەوە ڕۆشنایی کەوتووەتە سەرئەم هۆزەو بەپێی جوگرافیا، هۆزی میکائیلی موڕادی کە لە کوردستانی باشوور دەژێت، لە ساڵی (١٠٤٨)ی کۆچی هاریکاری سوڵتان موڕادی چوارەمی عوسمانی بوون لە ڕزگارکردنی بەغدا، بۆیە پێیان ووتووە جاڤ موڕادی.
جاڤ گۆران کە لە ڕۆژهەڵات دەژین، پاشان جاڤ جوانرۆ، کە پێشتر پێیان ووتراوە، جاوانی کورد، یان (جاوان) کە بووەتە (جوانرۆ) کە شارێکی گەورەی کوردستانی خۆرهەڵاتەوە، پایتەختی ئێلی بەناوبانگی جافە کە زیاتر لە (٥٥) تیرەیە.
تیرەی شاتەری و ووردە شاتەری لە بنەی جاف دەژین لەنێوان کفری و دەربەند لە مێژوودا گەورەترین گەشتی زستانەی کردووە. لە هاویندا بەرەو خۆرهەڵاتی کوردستان بەهۆی گاو ئێستیرو ووڵاخەوە بەرەو کوێستانەکان ڕۆیشتوون و لەگەڵ پەڵەدا گەڕاونەتەوە شوێنەکانیان لە وارۆزۆکانیان لە جەوەڵی پەڵە ووشك و جەوەڵی خۆرنەوازانی باوە نوورو حەمە ڕاشکیاو ملەی کڵاو سیاو چاڵە پان و کەلە ڕەق و خری نەیجە تاش، ئەمانە هەواری زستانی شاتەری بووە، هەوارەکانیش گنگرەی گەرمك و لەگەڵ هەواری مل خوریا و لەگەڵ هەواری کەوڵی هۆمەروودارگەی کەلە ڕەق و تاڵە پان و کانی ئەولاو جەوەڵی وسك، پاریاوڵە لەنێوانی ئەم هەوارە دانەیایەو دوو سەدو پەنجا ساڵێك بەر لە ئێستا لەلایەن جافەکان و شاتەرییەوە ئاوەدانکراوەتەوە.
ئەگێڕنەوە دەڵێن (ساحێو خان) کە لە نەوەی سمایلی کڵاو قووچەو هاتووەتە ئەم ئاواییەو تەکیەی تێدا کردووەتەوەو شێخ ساڵحی شەهید خەڵوەی تێدا کردووەتەوە و چل ڕۆژی ڕەبەق بە خورماو مێوژ ژیاوە.
ئاوایی پاریاوڵە چەند تیرەو هۆزێکی تێدا دەژین وەکو شاتەری و میکائیلی و وەڵی.
دەربارەی بنەرەتی ناوەکەی، دەڵێن گوایە شوێنەکەی فراوان بووە، یان دەڵێن ساڵێك ئاوڵە لەم شوێنەدا بڵاوبووەتەوە بەمانای شوێنی (پار ئاوڵە) یان پارێن یان لەوەڕگای زۆر بووە.
دەڵێن قەڵایەك لێرە بووە بەناوی قەڵای بارام جووجگە، کە لە زوودا عەمبارێکی گەورەی لەسەر ئەم قەڵایە کردووەو ئاشی خرپەیان هەبووە لەگەڵ چەمی ئاشان، هەروەها گەڵێك شوێنەواری مێژوویی تێدا هەبووە.
هەر لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە ئەم ئاواییە کەوتووەتە بەر هێرش و سیاسەتی بەعەرەبکردنی بەعس و خەڵکەکەی دەربەدەر بوونە، بەتایبەتی لە ساڵی (١٩٨٨) بە تەواوەتی وێرانبوونەو بەر ئەنفال کراون. هەر لەسەرەتای شۆڕشی نوێدا چالاکی پێشمەرگە بەردەوام ڕێکخستنەکانی خۆی برەوی هەبووەو سیروان تاڵەبانی بەبەردەوامی چالاکی هەبووە.
ئاوایی (لەواوان) پارەیاوڵەی بچووکە، کەریم ڕەسوڵ و

چوار براکەی لە تیرەی شاتەرین، حەفتا ساڵ بەر لە ئێستا ئاوەدانیان کردووەتەوە، ئەم ئاواییە لەسەر ڕێگای سەرەکیە، پاریاوڵە واتا زەوی گەورەو فراوان و لەوەڕگای زۆر.

*** گوندی ( دار بەسەرە )**

گوندی دار بەسەرە، کەوتووەتە سەر ڕووباری (ڕۆخانە) لە بناری جەوەڵ (ناسان)، لە ناوچەی شێخان، لە دەڤەری قادر کەرەم لە خورماتوو.

دەکەوێتە پانزە کیلۆمەتری باشووری ناحیەی قادر کەرەم، دوو سەدو پەنجا ساڵ پێش ئێستا شێخ محەمەد گەرمیانی و هەردوو براکەی بە خۆو ئێڵ و موریدەوە تاوڵ و دەوار لەچەم شۆراو لە باکووری ئاواییەکە هەڵدەدەن و لە پاشان لە دیار چەم باسەرە ئاوەدانی دەکەنەوەو لە گوندی (دار بەسەرە) نیشتەجێ دەبن، گەلێك پاشماوەی چاخی بەردین لەم ناوچەیەدا دۆزراوەتەوەو گۆڕستانی زۆری تێدایە، بەشێکی زۆری مێژوویی تێدایە.

جەبەڵ (ناسان) لە کۆمپانیای زەمبورەوە دەستپێدەکات لەسەر باسەرەو تا (کۆرومۆر)ی بنار گل، بۆیە پێی دەڵێن (ناسان) لە بەرئەوەی هیچ سەرچاوەیەکی بژێوی نەبووەو سەرچاوەی کشتوکاڵی نەبووەو تەنها بۆ ئاژەڵداری بەکارهاتووە وەکو لەوەڕگاو لە سەررووی داربەسەرە لە بان شۆراو گەلێك شوێنەواری تێدا دۆزراوەتەوە.

ناوچەی شێخان نزیکەی بیست و دووئاوایی دەبێت، کە تا سەررووی قادر کەرەم درێژ دەبێتەوە.

لە ساڵی (١٨٣٦)ی زایینی قورئانێکی دەست خەت بە خامەی مەلا محەمەدی مەلا یوسفی زەنگەنە نووسراوەتەوە، ئەم کەسایەتییە ئایینییە لەلایەن عوسمانییەکانەوە بۆ ناحیەی کۆشك ناردوویەتە ئەم شوێنەو بەناوبانگ بووە.

ئەم گوندە گەلێك ئاسیاوی لێ بووە بۆ هاڕینی ئاردو پێویستی ناوچەکە، وەکو ئاسیاوی مەلا عەبدوڵڵا، ئاسیاوی شێخ محێدین، ئاسیاوی سەید قادر، لە دێیەکانی دەورووبەری هاتوونە بۆ ئەم ئاسیاوانە.

کەسایەتی سیاسی ئیبراهیم ئەحمەد، مارف بەرزنجی، مارف خەزنەدار، مستەفا عەسکەری، شێخ مارف بەرزنجی، شێخ فاتیحی مەلا داود، سەریان لەم گوندە داوەو چالاکی سیاسی خۆیان هەبووە لەم دەڤەرەدا.

ئەم گوندە لە کەرتی کشتوکاڵی (٥٢)ە کە چوار هەزار دۆنم زەوی تاپۆی ڕەشەو دوو هەزاریان کردووە بە دەغڵ و دان و کشتوکاڵ، زیاتر لە ٦٠٠٠ هەزار لەوەڕگاو بەردەڵانی هەیە.

بەناوی نۆ بنەماڵەوەیە زەوییە کشتوکاڵییەکانیان، دوو هەزار سەرمەڕی هەیە بنەڕەتی ناوەکەی داربەسەرە لە ناوی دیار باسەرەوە هاتووە، بەڵام وردە.. وردە تووشی سووتاندن بووەو بووە بە (باسەرە).

هەر لە ساڵی (١٩٦٣- ١٩٨٥) چەند جارێك تاڵان و بەشێکی زۆریان شەهید دەکرێت و تووشی ڕووخاندن دەبێت نزیکەی ١٠ شەهیدو شانزە ئەنفالی هەیە لە دوای ئەنفالی هەشتاکانی کە هەموو کوردستانی گرتەوە.

*** گوندی ( بان سەندوق )**

ئەم گوندە کەوتۆتە ناوچەی جەوەڵ (سەرسەرە)، لە ناوچەی زەندئاباد لە ناحیەی کۆکس لە شاری (کفری).

ڕووباری سیروان لە چیاکانی کوردستانی خۆرهەڵاتەوە هەڵدەقوڵێ و لە ناوچەی هەورامانەوە دەڕژێتە باشووری کوردستانەوە، درێژی ڕووبارەکە ٤٤٥ کیلۆ مەترەو دوو بەنداوی دەربەندیخان و حەمرینی لەسەرە دواتر دەڕژێتە وڵاتی عێراقی عەرەبییەوە ئەم ڕووبارە جوگرافیای حەلوان واتا ناوچەی خانەقین و سەرپێڵی زەهاو لەگەڵ ئەمبەر باوەنوورو کەلارو کفری و پاڵانی دەکات بە دوو بەشەوە، لەدەم جەوەڵی (سەرسەرە) جوگرافیای دانشیتوانی گەورەی هۆزی (زەند)ە کە کەریم خانی زەند حکومەتێکی گەورەی لەسەر خاکی نەتەوەکانی ئێران دروست کردبوو لە ساڵی (١٧٥٠)ی زایینی، پاش چل و چوار ساڵ حوکمڕانی لە ساڵی (١٧٩٤)ی زایینی حکومەتی وەکیل ڕعایەی ئێران کەریم خانی زەند کە دوا پاشایان لوتف خانی زەند بووە لەسەر دەستی محەمەد ئاغا خانی قاجاری بەشێوەیەکی دڕندانەو کۆتاییەکی خوێناوی ڕووخاو، بڕیاری دا هەموو کچ و ژنی کوردی ئەو مەملەکاتە کوردییە ئەنفال بکاو بیدات بە سوپا خوێن مژەکەی و کەوتە قڕکردن و تاڵان کردن و بیست هەزار چاوی لاوی کوردی هەڵکۆڵی، ئەمە بووە هۆی ئەوەی هۆزی زەندو لەك و لوور وڵاتەکە بەجێ بهێڵن و بەرەو ڕووسیاو ئەفغانستان و ئاسیای بچووك و باشووری کوردستان کۆچ و ڕەوبکەن.

لە ئاوی سیروان بڕێکی زۆریان دەپەڕنەوە تا لە سایەی کوێخا سەپوك خانی زەند لە پاڵانیوە تاجەوەڵی کوڵەجۆ ژمارەیەك ئاوایی لە ساڵی (١٨٠٠)ی زایینی بەدواوە ئاوەدان دەکەنەوە یەکێك لەو ئاواییانە بان (سەندوق- یان -بان سەنوق)بووە.

تەپە کەڵان، گاور کردە، سێ تەپان، یەکێکن لە شوێنەوارە بەناوبانگەکانی ئەم ئاواییەوەو توورکەڕێژ کراوەو بۆ نزیکەی ٢٠٠٠ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە.

باوە خووبیارو شێخ باوە دوو شوێنەواری پیاوی چاکی یارسەنەکان بووە، هەروەها شیو ئاسیاو شوێنەواری شارێکی گەورەی تێدا هەبووە، دایك دوێت لە ژوور ئاواییەوە هەیەو گەلێك ئەفسانەیان لێ دەگێڕنەوە بنەڕەتی ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە گوایە سەندوقی گوولە تۆپی لێ دۆزراوەتەوە یان لەوانەیە دێیەکە لە شێوەی سەندوق دروستکراوە.

لە کۆتایی ساڵی (١٩٣٥) دووبرا، حەسەن و حەبیب هەردووکیان لە ئێڵی بەناوبانگی دزەیی دەبن لەناوچەی دەشتی قەراج و دیبەگەو مەخموور جێ دەهێڵن و بەسەپانی و شوانی خۆیان دەگەیەنە ئاوایی غێدانی نزیك (سەوز بڵاخ) لە ناوچەی بن کوڵەی خانەقین، بەڵام حەسەن بەرگەناگرێ، پاش چەند ساڵێك دەگەڕێتەوە سەر زێدی خۆی و بەتەنیا حەبیب دزەیی دەمێنێتەوە، ژنێك لە هۆزی دەلۆ دەهێنێت (بن کورە) جێ دەهێڵن و لە سیروان دەپەڕێتەوە بۆ ناوچەی جێنیشینی تاڵەبانییەکان، لە ساڵی (١٩٤٢)ی زایینی دەبێت کەنیشکێکیان دەبێت ناوی دەنێن (زەکیە) لە ئاوای

(سیامەڕۆ) ئەگیرسێنەوە، پاشان دەچنە ئاوایی قەرە بلاغ. برا حەمە کەنیشك گەورە دەبێت، محەممەد برای ئاوای ژن دەکات، ئیدی لە تەك سابیر کە ئەویش کە لە دایك بووی ١٩٤٢ دەبێت ژن بە ژن دەکەن پاشان لە ئاوایی بان سەندوق لە پەنجاوە نیشتەجێ دەبن.
لەبان سەندوق پەرلەمانتاری وەکو بورهان عەلی بەگی جاف و سەرۆکی داواکاری گشتی، حاکم نزارو پزیشکی وەکو کاوە زەندی تیا هەڵکەوتووە.
ڕووباری سیروان گەلێك جۆگەی، یان ڕووباری بچووکی لێ هەڵگیراوە، لەبەری گەرمەسێر لەناوچەی (بن کوورە) جۆگەی باڵا جۆو لەبەری زەنابادیش (جەوەی کۆکس) کە زیاتر لە دە ئاوایی سوودی لێ دەبینن، چوار قاپی گەورە بۆ ئەم جۆگەیە کراوەتەوە زیاتر لە (٤٣) بەشە ئاو یان مەخزەنیان لەسەرە بیست و دوو هەزار زەوی کوردەواری بەراو دەکات کە زۆربەیان بۆ مەرەزەیە ئەمە وێڕای باخ و داری لێیە لەوبەشە ئاوی بان سەندوق هەیە کە ٦١ جوتیاری ئەو ئاواییە کشتوکاڵ و مەرەزەو شینایی و باخی لەبەرە، هەر جوتیارێك ١٢ دۆنم زەوی بەراوی بەردەکەوێت لەم ئاواییە، ئەمە وێڕای ئاواییەکانی تر.
لە ساڵی (١٩٤٧) قوتابخانەی لێ کراوەتەوەو مامۆستا لە کفری و کەلارو هاتوون و دەرسیان تێدا ووتۆتەوە.
لەسەردەمی بەعسدا (١٣٠) ماڵی ڕادەگوێزن و ئەم ئاواییە کاولدەکەن.

*** گوندی (بنگرد-بانی موغان-بانی مەقان):-**

ئەم گوندە لە دەروازەی شوانی سەر خاسەیە، لە بناری بەرزاییەکانی بانی مەقان (موغان) لە ناحیەی چەمچەماڵ.
بانی مەقان بەناوبانگترین شوێنە کە ٨٣٠ مەتر لە ئاست دەریاوە بەرزەو لووتکەکانی دەگەنە (١١٠٠)مەتر دەگەڕێتەوە بەختیاری سەروو خواروو لە ڕووی جیۆلۆجییەوە، دەوڵەمەندترین ناوچەی کۆکەرەوەی ئاوە کە بەناوبانگترین گوندی (بنگردە).
شوێنێکی گرنگی هەبووە سەرە ڕێگاکانی نێوان ئێران و بەغداو کوردستان بووە کە هەموو هۆزەکانی کورد سوودیان لێ بینیوەو پێدەچێت کە بنەرەتی ناوەکەی (بانی مەقان) لە بانی موغانەوە هاتبێت کە شوێنێکی گرنگی ئاتشکەی زەردەشتەکانی لێ بووە لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی، سنوورەکەی لە سەنگاوەو دەستپێدەکات تا قەرەهەنجیر کۆتایی دێت.
لەم گوندەدا دووخانی بەناوبانگی هەبوو بە ناوی خانی بنگردو خانی گورگ کە جێگە یان شوێنی کاروان سەرابووە لەنێوان شارەزوور و ناوچەکەدا.
بنگردی کۆن مێژووەکەی دەگەڕێتەوە (٥٦٠- ٦٠٠) ساڵ کە وەختی خۆی شارە دێ بووەو بازارو سەرای تێدا هەبووە، بەڵام دوایی کە نەخۆش تاعون بڵاوبووەتەوە خەڵکەکە کۆچیان کردووەو هاتوونەتە ئەم شوێنەی ئێستایان کە ئاووزگە بووە بۆ ئەوەی لە نەخۆشییەکە ڕزگار یان بێت.
لەم گوندە نزیکەی ١٦ تیرەو هۆز هەیە کە بریتییە لە لەك، لوور، هەمەوەند، دزەیی، بابان، هورمزیار، جاف، زەنگەنە، باشۆکی.
ئەم گوندە لە ساڵی ١٩٦٣، ١٩٧٥، ١٩٨٦، ١٩٨٨، سووتێنراوەو لە دواجاردا بەتەواوەتی سووتێنراوە.
مام تۆفیق هەبووە لەم گوندە جەراح بووەو گەلێك زانا بووە لە بواری شکاوی و دەرمانی سروشتی، هەروەها عەبدوڵڵا جولای هەبوو کە بەناوبانگ بووە لە جولایی، هەروەها پیاوێك هەبوو ئاشی هەبوو کوێر بووەو لێزان بووە ناوی مەجیدە کوێر بووە.
ئەم گوندە بەناوبانگە بە گەنم و جۆو لە ڕابردوودا مەرەزەشی لێ کراوەو لە پێش ڕووخاندن ٩٥ ماڵ بووەو لە ئێستادا (٢٥) ماڵی لێ هەیە.

*** گوندی خە پە کوێر**

ئەم گوندە کەوتووەتە هەردەکانی کفرییەوە، لە ناحیەی ئاوەسپی، لە کفری.
وواڵت و ناوچەی جوانی کفری، هەر بە ناوی ئێڵ و جوگرافیای دانیشتووانەکەیەوە ناونراوە، هەر ناوچەیەك ناوی ئێڵی خۆی هەیە، جەوڵ مازوخ بەودیوا ئەوە وواڵتی (داوێ)و ئێڵی بەناوبانگی داوێیە لەلای ڕۆژئاواوە هەردەی زەنگەنەیە لە هەزار کانی وەندی مام، وواڵت دەستپێدەکات، وواڵتی زەنگەنە، ئاوایی بنەکەی خەپە کوێر دوا ئاوایی زەنگەنەیە لە ڕۆژئاواوە، لە ئاوایی عەلەیانی خواروەوە، چەمێك دێتە ڕێ چەمی سیلاح دارە، بەرێگایەکی زۆر قوورو ناخۆش تێپەڕ دەبێت، هەتا دەگەیتە ئاوایی ئەژنۆت دەشکێت لەگەڵ وواڵتی کفری کە بەر لە دوو هەزارو هەشت سەد ساڵ دروست بووە، ژمارەیەك ئاوایی ناو داوێ و لەك و ناو جاف و زەنگەنە لەو سەردەمانەدا دروست کراون بۆ بەرگری و پاراستنی وواڵتی کفری.
بنەکە لە تۆمارەکانی حکومەت بەناوی (شانەزەرد) تۆمارکراوە یەکێکە لە گوندە دێرینەکانی کفری، (٢١٥) ساڵ بەر لە ئێستا کویخا غەفووری نەوەی (میر سمایل) لە ئاوایی کانی زەرد لەنێوان ئاوایی قیرچەو ئاوایی (مشکی بانی) بنار جەوەڵ (زەنوور) لەگەڵ عەبدولرەحمان ئاغای گۆێتەپەی دێی دەی سەنگاو سەرکردەی ئێڵی زەنگەنە دێنە بنەکەو بۆ پاراستنی ئیمارەتی قەیتوول دەمێنەوەو تەپەکانی بان مزگەوت و تەپەکانی حوشترو زەوارەڕێ و تەپەی شەوارەڕێی خۆیان قایم دەکەن ئەمجا دەواری کوردەواری لەسەر کانیاوەکانی خاڵۆ محێدین وکانی ژوورین و بەراوی ئەحمەد ئاغا و کانی ئاوایی، لەوێ ژیان دروست دەکەن و هابۆ ساڵح مام حەمیدو دووریش چەرمی ئەم ئاوایی بنکەن و قەومی یەکتریشن و ئاوەدانی دەکەنەوە ماوەیەکی بەرچاو زەوارەڕێ بووە بۆ هاتووچۆو بازرگانی بۆ هەموو شوێنەکان.
ئەم گوندە بەناوبانگە بەوەی کە گەلێك شوێنەوارو پاشماوەی جۆراو جۆری لێ دۆزراوەتەوە.
ئەم گوندە لە ساڵی (١٩٦٣) لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە تاڵانکراوەو سووتێنراوە، خەڵکی گوندەکەیان کشتووە شانی گردێك بەرامبەر بنەکەیە بە گردی شانە زەردەکە بەناوبانگە،

زەوارو کاروانچییەکان بە ئاوایی شانەزەردیان باسکردووەو سەرە ڕێی کاروان سەرا بووە لە سلێمانییەوە بۆ کرماشان‌و بەغدا، چایەخانەکەی (حەمە میرە) شوێنی حەوانەوەیان بووە، ئەحمەد نەوات‌و عەلی پیرۆت، ئاشی ئاگریان لە شەستەکان بۆ ئاواییەکە هێناوە.

ئەم گوندە لە کەرتی کشتوکاڵی (٥٣)یی یە، بەسەر ٤٠ جووتیاردا دابەشکراوە کە نزیکەی ٧٥٠٠ دۆنم زەوییان هەیە، هەر جووتیارێك نزیکەی ١٢ دۆنمی هەیە.

لە ئەنفالدا ٢٣٣ ئەنفالیان هەیە، بەشێك لە خەڵکی گوندەکە خۆیان ڕادەستی سوپا نەکردووەو ماونەتەوە لە گوندەکە.

*** گوندی (ساری تە پە - تۆخماخلو)**

کەوتووەتە پێنج شەش کلیۆمەتری کەرکوك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی، دەکەوێتە شانزە کیلۆ مەتری ناحیەی (لەیلان)، دەکەوێتە بناری جەوەڵ (زیندانە) لە قەرە حەسەن.

لەیلان ووشەیەکی کوردییە بەواتای (سەراب–تەراویلکە) واتا لێلان، ناوی یەکێکە لە ناحیەکانی کەرکوك کە لە دووری نۆزدە کیلۆ مەتری باشووری خۆرهەڵاتی ئەم شارەیە.

ئەم ناحیەیە لە چەمی (کۆردەرە)وە دەستپێدەکات‌و لەنێوان دوو شاخدایە، بەناوی جەوەڵ (مەتارە)و جەوەڵ بۆر، کە پێکهاتووە لە سی‌ونۆگوند، لە سەردەمە زووەکاندا هۆزە عەرەبەکان دێنە ئەم ناوچەیە بۆ لەوەرگا، بەڵام ناگەڕێنەوەو لەم گوندانە نیشتەجێ دەبن وەکو (ڕەجیبات – ساری تەپە) کە عەرەب لە ئێستادا لەم گوندانەدا میوانە، ئەم ناوچەیە گەلێك شوێنەوارو پاشماوەی مێژوویی کۆنی تێدایە وەکو قەڵاشی (مامشە)و قەڵای (باوە) یان پاشماوەکانی باشووری (تەرجیل).

یەکێك لە گوندەکانی ناحیەی لەیلان گوندی تۆخماخلوە لەسەر ڕووباری (کۆردەرە). کە ئێستا بە چەند هۆزێکی داگیرکەری عەرەبی دەورە دراوە لە ١٤ کیلۆ مەتری باشووری (لەیلانە).

هۆزە کوردەکان لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدە، هەواری زستانەیان کردووە لەو هۆزانە هۆزی (میکایلی) جافە لە بەرەی عەبدولڕەحمانی ئایشی میکایلییە کە تا سنووری حەمرین گەرمیان‌و کوێستانیان کردووە، لە هەمانکاتدا دالدەی عەرەبی ئەو دیوی سنووری حەمرینیان داوە بەڵام لە دوایدا ناوچەکەیان داگیر کردووە.

مام (عەبەدەی) یەکێکە لە کورەکانی عەبدولڕەحمانی ئایشی شەش کوری دەبێت یەکێکیان ناوی (فەتحی) دەبێت، عەرەبە جەردەکان ئەو دەمانە دەیکوژن، بڕ نابن‌و دێتە مەتارەی سەر جەبەل زەنبوور، دێنە ئاوایی (تۆخماخلو).

دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی (تۆخماخلو)، بنەرەتی ناوەکە توورکییە بە مانای (تۆخماخ) بە واتای (چەکوشی – یان کووتەکی) گەورە، یان لەوەیە ناوچەیەکی بەردەڵانی گەورە بووبێت.

عەبدولڕەحمان ئایشەو برایەکەی بەناوی (کامەران) لە دەورووبەری سەنگاو و دەورووبەری مەرداریپیان کردووەو لە دوایدا هاتوونەتە سەر دەرەی لای (کەوەڵە) لای شێخ عەبدوڵڵای کەوەڵەی تاڵەبانی ماوەیەکی زۆر لەلای شێخ عەبدوڵڵا ماوەتەوەو لە شەوێکدا بڕیار دەدات بار بکات لە ڕێگا مار پێوەی دەدات بە ژنەکەی دەڵێت. (خەزنە) بمگەیەنە (باوەقا)و دەیباتە بۆلای ئیمامەکە بەڵام لە دوایدا مارێکی تر لە شوێنی زامەکە دەدات‌و دوای ماوەیەك چاك دەبێتەوە، لە دوایدا تا حەمرین جیا دەبێتەوەو کامەران دەچێتە (یاروەلی) و (کۆچەك) هەر لەو دەورە کۆچ دەکات لە دەوری (بەشیر) شوێنێك هەیە بەناوی گۆم (کامەران).

(عەبەدێ) شەش کوڕی دەبێت بە ناوەکانی (فەتحی، سالح، عومەر، زاهیر، غێدان، عوسمان)، هەرچەندە (فەتحی) پیاوێکی ئازا بووە منداڵان لە ترسیدا خەویان پێکەوتووە، بەڵام بەدەستی ناپاکی عەرەب کوژراوە لەلایەن چەتەکانەوە، پێنج براکە لەیەك دادابڕێن، سالح دەبێتە پۆلیس‌و چوارەکە دێنە لای (مەتارە)و بەعس حەرەس قەومی دێنێتە سەریان بۆ تاڵان کردنیان، ئاوارە دەبنە (تەل مەغارە)و گوندی (تۆخماخلو)، ئاوایی (تۆخماخلو) لە کەرتی کشتوکاڵی ژمارە دەیە کە هاوبەشە لەگەڵ (ساری تەپە) بەناوی بیست‌و دوو جووتیارەوەیە هەر جووتیارێك هەشتا دۆنم بە ناوییەوەیە، هەموو زەوییەکانیان پێ دەشتە، چەمی (کۆردەرە) بەناو ئاوایەکەدا دەڕوات، کە چوار بلۆکەو هەر بلۆکێ پێنج سەد دۆنمە، نۆ بیری ئیتروازی هەیە لەناو زەوییەکان، هەندێکی شیرناوەو هەندێکی شوێرە، ڕێژەی باران بارینی مام ناوەندییە بۆ گەنم‌و جۆو پێگەیاندنی.

لەم گوندە بیست دوو ماڵەو نزیکەی (١٩٢)کەس لەنێو گوندەکەدا هەیە.

لەم گوندەدا سێ شەهیدیان هەیە لە ڕووبەڕووبوونەی داعش، نزیکەی سیانزە پێشمەرگەیان هەیە.

*** گوندی (مام ڕەش)**

ئەم گوندە کەوتووەتە بناری شاخی ماسقەلان، لە ناوچەی (شوانی کەشك)، لە ناحیەی (ڕێدار).

لە کۆتایی سەدەی شانزەهەم هۆزی گەورەی کورد، هۆزی شوان لە ناوچەکانی (دار الامان)نیان یان (دارەمان)ی دەورووبەری شاری (ئیلام)ی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە قۆناغ بە قۆناغ بڵاوبوونەتەوە بە باشووری وڵاتەکەی خۆیان لە (تەپە گەرووسی) دەورووبەری باوە نووریش لەوێ نیشتەجێ بوون دوایی هاتوونەتە کەرکوك، لەوێ ناوچەیەکی گەورەیان ئاوەدانکردووەتەوە کە پێی ووتراوە (کۆشکللی)و نیشتەجێ بوون لەگەڵ تیرەکانی زەنگەنەو جاف‌و لەك‌و هۆزەکانی تری کورد.

بەشێکی تری هۆزی شوان هاتوونەتە نزیکی جەبەل دومەڵان بە هەمان ناوی شارەکەی خۆیان دارەمان ئاوەدان دەکەنەوە پاشان دێنە ئاواییەك پێی دەڵێن سمایل بەگی کە حەوت بەرەبرا دەبن ئاوایەکانی ناروجەو، جانقزو مەمان‌و، حاجی بەیخان قوولی بەگ، جەوە جەوە، ئاوەدان دەکەنەوە.

بەر لەمانیش ناوچەکە تەنها کاکەیی‌و یارسانی تێدا هەبووە، کە تاکو ئێستاکەش هەندێك شوێنەواری دێرینیان ماوەتەوە لەو شوێنانە کە بەڵگەی ئەو ڕاستیانەیە.

مام ڕەش یەکێکە لەئاواییەکانی شوانی کەشکەو لە دووری ٢٤ کیلۆ مەتر لە باکووری خۆرهەڵاتی ناحیەی ڕێدارمومیە تایەفەیەك بەناوی (میرە) لەوێ بوونە، وەکو خانەدانی ناوچە کەبوونە ماوەیەك لەگەڵیاندا ناکۆکییان هەبووە. بەهۆی ڕقەبەرییەوە دابەش بوونەتە سەر ڕەحمانی و ڕەمەزانی. خەڵکی ئەم ناوچەیە بەگۆرانی ماچۆیی قسەیان کردووە.
بنەڕەتی ناوی مام ڕەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە گوایە لەمام ڕەش بەکار هاتووە کە لەوانەیە ناوی کەسێکی دیار بووە، لە پێش ئەوەی بێنە ئەم ناوچەیە دووناوچەی گواستۆتەوە لە میرە سەن و یارەسەن دوای لە کەیلکان. لەوێوە بۆ ئەم شوێنە کە لە بنەماڵەی بابانەکان بوونە. لە ئێستادا چەند بەرەبابێکی تێدایە بەناوەکانی:- میرزا، خاڵە، ئەولا ژاڵە، حاجی قادر، مەلا ڕەحمان، ئەحمەد بەگی. فارس. لەوانەیە (مام) یەکێك بێت لە پێگە گرنگەکانی زەردەشتی یان کاکەیی.
گەلێك شوێنەوار لەم گوندەدا بەدەرکەوتووە وەکو (قزل گوومەت)، هەروەها گۆزەو پارچە شوێنەواری لێ دۆزراوەتەوە، هەر لەو ماوەیەدا ئێسك و پروسکی ئاژەڵێك وەکو داینەسۆر دۆزراوەتەوە.
محەمەد ئەفەندی کەڵەمرەش کەسایەتییەکی بەناوبانگ بووە کە هاتووەتە ئەم شوێنە لە ناحیەو لە بنەڕەتدا خەڵکی سلێمانی دەبێت.
ئاوایی (مام ڕەش) لەنێوانی جەوەڵ مەسقەلان و بەرزاییەکانی قەڵادایە، بەشێوەی سیستەمی فیدراڵی ئەوکاتە گونجاوە چوار ئاوایی تری لەگەڵ بووە کە شافرێن و کانی قووڕەو کۆرگەل، کە مام ڕەش پایتەختی بووە.
لە چلەکاندا حوجرەی فەقێی تێدا هەبووە، مەلا شێخ تاها و مەلا نەجمەدینیان تێدا هەڵکەوتووە.
لە ساڵەکانی شەستەکان و حەفتاکان و هەشتاکان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە چەندان جار سووتێنراوەو خەڵکەکەی دەربەدەر کراون.
پانتاییەکی فراوانی لە سەوزایی شیاو هەیە، لەوەڕگاو شاخەڵانی هەیە، بەشی حەفتاو دووکەسیان تاپۆی ڕەشە. بەر لە ئەنفال قوتابخانەی تێدا هەبووە.
کاتێك حەرەس قەومی مام ڕەش دەسوتێنێت، یەکێك لە پیاوە ئازاکانی ناوی (مام سمایل) دەبێت، کۆڵ نادات و دێتە ناو زەوی و خاکەکەی خۆی لە گۆگل لەوێ مام ڕەشێکی تر بنیات دەنێنتەوە، تا ساڵی (١٩٨٨)، بەڵام لەدوای ئەوەی ناحیەی شوان هەڵدەوەشێتەوە، ئەم گوندەش کاول و وێران دەبێت.
لە ئەنفالدا ٢ کەس بێ سەروو شوێن و نۆزدە ئەنفالیان هەبووە، شەهیدی سەنگەر ٢٢ پێشمەرگە لەم گوندە هەیە لەگەڵ زیاتر لە پەنجا پێشمەرگە شەڕ دەکەن لەگەڵ داعش.

*** گوندی مامڵێسی:-**

ئەم گوندە کەوتووەتە بناری خاڵخاڵان، لە ناوچەی ئاغجەلەر لە دەڤەری شێخ بزێنی.
یەکێکە لە گوندە هەرە کۆن و مێژووییەکانی ناحیەی ئاغجەلەر، کە هاوزەمانی گوندی (گرد خەبەر)و (ساتوو قەلا)ی ئەو بەرزییە لە دەشتی کۆیە. ئەشکەوتی بەردە قەل و نۆلی کەلەبابە زێرینەو گردی چاڵە خەزنەو گردی (لەر) و ئەمانە هەموویان شوێنەواری دێرینن و شایەتی بۆ ئەو دەمانە دەدەن.
ئەو دەمانە ئەم ئاواییە هۆزی مامڵێسییەکانی تێدا نیشتەجێ بوونە بەهۆی (چاوە قووڕکێ) چۆڵیان کردو لە هاوزەمانی ئەم چۆڵکردنە یەکێك لە ئاواییەکانی کە لەنێوان ئاوایی دارە قووت و شێخانە پێیان ووتوە دێی (فرە ماڵان) ئەویش بە تەواوەتی لەو سەدەیەدا لە ناوچووە، پاشان کە ئەمانە لە ناوچوون برێك هۆزی تری کوردەواری بەناوی جۆلاو شێخان و شێخ بزێنی و بابانەکان هاتوون بەر لە ١٥٠ ساڵێك ئەم شوێنانەیان ئاوەدان کردووەتەوە.
یەکێك لە هۆزەکانی کە ئێستا نیشتەجێ گوندی مامڵێسی بابانەکان، لەسەردەمی بابانەکانەوە ئەم هۆزە لەم ناوچانەی کەرکوك نیشتەجێ بوونە.
ئەم گوندە خاوەنی ١٢ شەهیدو ١٥ ئەنفالکراون و ٨١ پێشمەرگەیان هەیە، لە ساڵی (١٩٧٦) نەعمانە گۆج یەکێکە لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی ئەم گوندە برسیکەی شۆڕشی نوێیان بە خەڵکی داوە لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەی تر.
ئەم گوندە نزیکەی ٨٠٠ دۆنمی هەیە بۆ کشتوکاڵ بە ناوی ٤٠ جوتیارەوە، نزیکەی ٩٠٠ دۆنمی لەوەڕگای هەیە، گەلێك چەماوو کانیاوی هەیە بۆ سەرچاوەی ئاو، نزیکەی ١٢ مێگەل مەڕی هەیە کە دەکاتە ٣٦٠٠ سەرمەڕ ئێستا نزیکەی (٢٣) ماڵی تێدا هەیە.

*** گوندی (میرە سوور):-**

قەرە حەسەن پانتاییەکی فراوانی لە خۆرئاوای کەرکوك هەیە. مەڵبەندی ناحییەکەش شارۆچکەی (لەیلانە)، بەڵام لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو مەڵبەندی ناحیەی قەرەحەسەن لە گوندی (خالۆ بازیانی)بووە، ئێستا چل وچوار گوندە لە باکوورەوە سنووری لە گوندی قەرەوەیسە لە سەر ڕێگای جەباری و، بەرەو باکووری خۆرئاوا باشبلاخ و قەرە هەنجیرە، لە خۆر هەڵاتەوە تاوێر بەرزو مامشەیە، لە باشووریشەوە وولاتی کەرکوکەوە.
یەکێك لەو ئاواییە دێرینانەی کە دروستیان کردووە گوندی (میرە سوور)ە کە پێشتر (تەیمەز ئاوای) خواروی ناو بووە لە تەك جەبەڵ دارە گەرەی لای شێخ جیری لە سەر گردی ئاڵقە پساو، گردی قەڵە بلاخ و پاڵەوان، شوێنی نیکابانی بووەو شتی ئەنتیکەی تێدا دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی گۆتییەکان، پاشان لە چەند لایەکەوە چەند تیرەیەکی کوردەواری هاتوونەتە ئەم ناوچەیە چوار سەد ساڵێك بەر لە ئێستا لە لوڕستان و بەختیاری و مەلایەری ناوچەی کرماشانی پایتەختی لوڕی کوردستانەوە تیرەیەك لە سیروان پەڕیوەتەوەو گەرمیان و کوێستانیان کردووەو لە دوایدا هاتوونەتە کەرکوك و هەولێرو موسڵ و بەشێکیان لە گوندی (میرە سوورە) گیرساونەتەوە.
پاشان تیرەیەکی هۆزی جافیش هاتوونەتە ئەم گوندە هەر

لە گەڵیاندا تیرەیەکی بەناوبانگی زەنگەنەش هاتوون و دواتر شێخانی بەرزنجی تێدا نیشتەجێ بوونە لەگەڵ شێخانیش بنەرەتی ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە گوایە میرێکی ناوچەکە ڕەنگی سوور باو بووە، بۆیە گوندەکە بە ناوییەوە ناونراوە، بەڵام پێشتر ناوی تەیمەزاوە بووەو شوێنەکەی لەلای چەمی گوندە کە بووە، بەڵام لەدوایدا گواستوویانەتە ئەم شوێنە.

هەر لەم گوندە ئاسیاوێکی بەناوبانگی هەبووەو خەڵکی گوندەکە سوودیان لێ بینووەو بە ئاوکاری کردووە ناوی ئاشی شێخ تالیب بووە. لەم ناوچەیە شوێنەواری دێرین هەبووە، گردێك هەبووە بەناوی (ئەلقە سەپا)، کە گەلێك کووپەو گۆزەی تێدا دۆزراوەتەوە، هەروەها (یالە قارەمان) هەیە، هەروەها شوێنێکی تر پێی دەڵێن (قەڵە بلاخ).

لە ساڵانی شەستەکانیش وەکو هەموو گوندەکانی تر کەوتووەتە بەر شاڵاوی حەرەس قەومییەکان و بەعس، بەردەوام سووتا و تاڵان کراوە.

سنووری دێیەکانی دەوروبەری گوندی (میرە سوور) بریتییە لە تەیمەزاو ئۆمەرەگەدە شێخ جیگری، خوارەوە بزەڵەیە، شوانەیە، ئۆسمان لەکەیە، بۆ جەباری حەفتاچەشمەمەو هەنارەیە. لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا ئۆمەرەچەتە هەبووە، خەڵکی سیامەنسوور بوو، پیکابێکی هەبوو، هاتووچۆی خەڵکی بە ناوچەی کردووە لە دوایدا جەباری حەمە سەعید باوایی پیکابی تەختەی هێناوە بۆ هاتووچۆ بۆ کەرکوك.

دووچەم لە خۆر هەڵاتەوە، ئاوی ئۆمەرەگەدەو تەیمەز ئاوا دێنێ و بە قامیش و پەڵك و گەزەکانا گوزەر دەکات، دوو چەمی تریش لە باشوورن، چەم مێخەشێن و چەم بەلەگەیە کانیاوەکانی عەزە شێردەرەو کانیاوی چاوماراوی کانی ژاڵە و کانی مەکۆ، کاتی خۆی یاخییەکان کردوویانە بە مەکۆو کانی و مەکۆیان بۆخۆیان دروستکردووەو تفەنگیان تێدا شاردووەتەوە، ئەمانەش سەرتۆپی و میوەو باخی هەنارو هەڵوژەو قەیسی بووە، بەڵام لە ئێستا زۆریان ووشکیان کردووە.

لە خوار جەوەڵەکانەوە ئاوڕێژ بەرە پەڵکانەی قەرەحەسەن دەچێتە بەنداوێك، پانی بەنداوەکە دوو هەزارو پەنجا مەترەو درێژییەکەی دوو هەزارو سێسەد مەترە، قووڵی بەنداوەکە بیست و دوو مەترە لە ئاوایی شوانەو بزلەو شێخ جیری سەرووخوارو لەگەڵ مەقانەوە ئاوی تێدەرژێت، دەبێتە هۆی ژیانەوەی گەلێك کانیاوی گوندەکانی دەوروبەری ئەم ئاواییە (٤٠٠٠) هەزار دۆنم زەوی هەیەو ١٠٠٠٠ هەزار شاخەڵان و لەوەرگای تێدایە لە کەرتی کشتوکاڵی ژمارە (٤٤) ەو بە ناوی (٧) جووتیارەوەیە، پێشتر ڕەوە ئاسکی تێدا بوو کە تێکەڵ مەڕو ماڵاتەکانیان بووە هەروەها جۆرەها تەیرو توالی کێوی تێدا هەبووە.

ئەم گوندە تووشی ئەنفالکراوە و تاڵانکراوە و سووتێنراوە و چەندین چالاکی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی و حیزبی شیوعی دەوریان بینووە لەم ناوچەیەدا.

*** گوندی چیمەنی سەروو:-**

ئەم گوندە کەوتووەتە سنووری ناحیەی قەرەهەنجیر لە پارێزگای کەرکوك، لەسەر پانتایی (١٠٠٠) مەتر چوار کۆشەیەو بری (٥٥) پارچە زەوی دەیمەو (٣٨) پارچە زەوی بەرئاوی لە خۆگرتووە. ناوی چیمەن لەو چەمو ئاو گژوگیاو چایەرەوە هاتووە کە لە ناوچەکەدا هەبووە.

ئەم گوندە دەورە دراوە بە هەیبەی سەر شوان لە باکووری ڕۆژئاوا، شۆریجەی سەرخاسە لە ڕۆژئاوای، چیمەنی گەورە لە باشووری ڕۆژئاوای، جەبەڵبۆرو مەملییە لە باشووری، زەنگەنەو کەوەڵە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی، خاڵەبازیانی لە ڕۆژهەڵاتی، ناحیەی قەرەهەنجیر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی.

مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و بەشی یەکەمی سەرەتای سەدەی بیست، بەواتا ئەوەی لەگەڵ دامەزراندنی حکومەتی نوێی عێراق لە ساڵی (١٩٢٠)ی زایینی.

بەڵام پێکهاتەی ئەو خێڵانەی ئەم گوندەیان بنیات ناوە بۆ ماوەی زیاد لە دووسەد ساڵ لە شوێنە جیاجیاکانی گوندەکە بوونیان هەبووە. شوێنە بەناوبانگەکانی دەوروبەری گوندەکە بریتی بووە لە:- دەشتی کانی، دەشتی عەلی تیرکاتی، خەزنەتەپە، دەشتی گەزەنگی، دۆڵی کەلاوە، سەرکەل، هەواری میلخر.

ناحیەی قەرەحەسەن یان ناحیەی خاڵۆبازیانی، ئەو ناحیەیە کە لە ساڵی (١٩٢٥) تا ساڵی (١٩٣٧) بەردەوام بووە، کە بنکەکەی لە خاڵۆ بازیانی بوو لەوەو دوا ئەو ناحییە هەڵوەشێنرایەوەو گوازرایەوە بۆ قەرە حەسەن ئەم گوندەش سەر بە قەرەحەسەن بووە و تا ساڵی (١٩٧٧) بەردەوام بووە.

لەساڵی (١٩٨٧)دا حکومەتی بەعس شاڵاوی کردووەتە سەر ئەم گوندەو نزیکەی (١٣) هاووڵاتی شەهید بوونەو لەدوایدا گوندەکەیان خاپوور بووە.

لەو زەویە بەر ئاوانەدا خەڵکی گوندەکە باخ و باخاتێکی جوانیان بە بەرهەم هێناوەو لەگەڵ ئەو گردۆڵکە شاخانەدا سیمایەکی جوانیان بە گوندەکەوو سنووری گوندەکەدا بەخشیووە.

ئەم گوندە لەماوەی ژیانیدا چەند جارێك تووشی گرانی بووە بەتایبەتی لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، کە خەڵەو خەرمانی هەموو گوندەکە بە تاڵان بردراوە، لە ساڵی (١٩١٩) ە شدا تووشی گرانی بچووك بووەتەوە کە تا ساڵی (١٩٣٠) بەردەوام بوو، گرانی سێیەمیش لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا ڕووی داوە لە ساڵی (١٩٩١- ١٩٩٧) کە نزیکەی حەوت ساڵی خایاندا.

*** (چیمەنی کاکل – چیمەنی گەورە):-**

ئەم گوندە بەدووری ١٠کم کەوتووەتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوکەوە و لە ئێستادا خەریکە دەبێتە گەڕەکێك لە کەرکوك.

چیمەن مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە کە نزیکەی بۆ دەوری ساڵی (١٨٦٠)ی زایینی دەگەڕێتەوە، لە سەرەتادا هەموویان لە زەوییەکانی خوارەوە بوونە، بەڵام وورده.. وورده پەرش و بڵاوبوونەتەوەو هەندێکیان هاتوونەتە سەر ڕێگای کەرکوك و بەشێکیان لەناو زەوییەکانی خۆیان خانوویان کردووه.

گوندەکانی دەورووبەری چیمەنی گەورە بریتی بووە لە :- دوحێله، یارەلی، کۆچەك، شۆریجەی سەرخاسە. هەیبە، جلفە، زەنگەنە، جەبەل بۆر.

گەلێك هۆزی وەکو تاڵەبانی و باجەلانی تێدا هەیەو لە هەموولایەکەوە هۆزەکان هاتوونەتە ناویانەوە.

سەرچاوەی ئاوەکانیان چەمی چیمەنە، کەبەناو گوندەکەوا دەڕوات و دەرژێتە نێو ڕووباری (خاسە)وە.

ئەم گوندە گەنم و جۆو لە ڕابردوودا برنجیان کردووەو لە ئێستادا گوندەکە بە بێستان و بەرووبوومی زستانەو هاوینەوە خەریکن.

ئەم گوندە لەلایەن هەریەکە لە کۆیخا حەسەن، عوسمان مەحموود قادر، کاکل عوسمان محەمەد، ئاوەدان کراوەتەوەو، تاکو ئێستاکە نەوەیان لە گوندەکەوا هەیە.

ئەم گوندە هەر لە ساڵ ١٩٦٣ تا ١٩٨٨ چەند جارێك ڕووخێنراوە و سووتێندراوە لە دواجاردا لە پرۆسەی ئەنفال بە تەواوەتی ڕووخێندراوە و عەرەبی تێدا نیشتەجێ کراوە و لە ڕابردوودا نزیکەی ١٨٠ ماڵی لێ بووە، بەڵام لە ئێستادا هەشتا ماڵ ئاوەدانیان کردووەتەوە و بە کوشتوکاڵ و سەوزەوە خەریکن و زەوییەکی بە پیتی هەیە.

*** گوندی (چیمەنی جەباری)**

ناوچەی جەباری دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی کەرکوکەوە، لە ئێستادا سی و پێنج ئاوایییە، لە سەدەکانی پانزەهەم ئێڵی جەباری لە ناوچەیەکی کەرکوك نیشتەجێ بوونە، هەر بە ناو ئێڵەکەوە ناوچەی جەبارییان ئاوەدان کردۆتەوە ناوچەکەش بە ناوی عەبدولجەبار لە نەوەی عەوێزی فەیرووز خانی کورد لە سێ نەوە پێکهاتوون بانگۆلی، کاسەی سمایلی، کوڕی سەید زانی قوچ و سەید مستەفای باوانی و مەلا فەتاح جەباری و سەید مەحمود و سەید هەواس و سەید ئەحمەد، کە مەعروف ڕەساق لە مانن.

تەکیەی جەباری دەگەڕێتەوە بۆ سەید حوسێنی شەرەفەدینی جەباری لەوانە سەید قادر ئیبراهیم و سەید ئەحمەد وەری و سەید گەردەلووك و سەید هەمینی و سەید قۆچەلی.

گۆلەمەو و دەچنەوە سەر سەید عەبدولکەریمی سەید حەسەنی شەرەفەدین کە بەرەبابەکانی هەواس و شەرەفەدین و مورتەزان.

ناوچەی جەباری (١٦٥) هەزار دۆنم زەوی کشتوکاڵییە، سەر زەمینەکەی بەرزی و نزمی و شیوو پێگەلان و دەشت دەکەوێتە نێوان قادر کەرەم و قەرەحەسەن و چەمچەماڵەوە.

یەکێك لە سەرکردە ناودارەکانی ئەم ئێڵە سەید محەمەدی جەبارییە، بەخۆیی و دوو سەد سوارەوە بەشداری کردووە لەگەڵ شێخ مەحموود لە ڕاپەڕینی شوعەیبە و ڕاپەڕینەکانی کوردستان بەتایبەتی لە شەڕی ئاو بارێك.

یەکێك لە ئاوایییەکانی ناوچەی جەباری چیمەنی ناوچەی جەبارییە کە ناوەکەی لە مێرگی چیمەوە سەرچاوەی گرتووە ولە یەکێك لە نەوەکانی سەید عەبدولجەبار، دەستی ژمارەیەك لە ئێڵی دووراجی ناوچەی داوێی گرتووەو دەیانحەوێنێتەوە، وەلی کامەلە لە گوندی تاڵەبانی (قرخ) لە بناری جەوەلی سەلباتوو، کە وەفات دەکات وەچەکانی لە ساڵی (١٩٤٠)ەوە، دەچنە گوندی کولەکانی شێخان و پاشان لە ساڵی (١٩٥٩) دێنە ئاوای چیمەنی جەباری وتاکو ئێستاکە لەوێدا نیشتەجێن.

ئاوایییەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (ئەراپخا) کە شوێنەوارەکانی قەڵا موگلی و قەڵا کۆن و گۆزە کووت، هەواریی یەك شەوە، شارێکی گەورەی ئەو سەردەمە مێژوویانە بوونە، کە لە سەردەمێکدا ئاوەدان بوونە.

لەم گوندە دا هەریەکە لە ئێڵەکانی جەباری و زەنگەنەو تاڵەبانی و شێخان و سیامەنسووری و قەڵاوێزی و پیرخدری تێدا بوونە.

گوندەکانی دەورووبەری چیمەن بریتییە لە خوارەوە مامشەو ساڵەیی و باوایە، بەلای وەشتەوە تاوێر بەرزو پیر زل و حەسەن خانە و شۆریجە و سیامەنسوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە پیوزەل و نەوروزو داربەسەرەیە.

ئەم ئاوایییە لە کەرتی کشتوکاڵی نۆیەو بەناوی بیست و دوو جوتیارەو هەر جووتیارێك حەفتا دۆنم زەوی هەیە، ئەگەر ساڵێك هات بێت (٢٠٠) تەن بەرهەم گەنم بەرهەم دێنێت، نزیکەی هەزار سەر مەڕی تێدایە.

ئەم گوندە حەوت شەهید و پانزە ئەنفال کراوی هەیەو هەردەم مامە ڕیشە و خالید گەرمیانی چالاکییان لەم ناوچانەدا هەبووە و لە ڕژێمی بەعسیان داوەو زیانیان لێداوە.

*** گوندی ژاڵەی دەربەند:-**

گوندێکە دەکەوێتە لای ڕاستی دەربەند باسەرەوە، بەدیوی ڕۆژئاوایدا، بە گوێرەی سنوورەکەی دەکەوێتە سێگۆشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی چەمچەماڵ (هەماوەند)ەوە لەگەڵ سنووری (بازیان) و (قەرەداغ) و (سەنگاو)دا لە یەکدەدەن.

گوندەکانی دەورووبەری بریتییە لە:- قوولە، تیلەکۆ، دێلێژە، دەربەند سووتاو، سۆفی سەن، مەلا حوسێن، هەشەزێنی، (ژاڵە) سنوورێکی پان و بەرینی هەیە، لە سنووری هەموو گوندەکانی دەورووبەری زیاترە بۆ ئەوەی جیابێتەوە لە گوندەکانی (ژاڵە)ی ڕەبات و (ژاڵە)ی مەملەحە و (ژاڵە)ی خواروو، (ژاڵە)ی سەروو لای سلێمانی، وشەی (دەربەند باسەرە)، یان تەنها (دەربەند)یان پێوە لکاندووە، بووەتە (ژاڵە).

ناوەکەی وا بەدەردەکەوێت لەبەر ئەوەیە کە ئەو چەمەی بە

تەنیشتیدا تێدەپەڕێت، دار ژاڵەیەکی یەکجار زۆری هەیە، ئەمبەر و ئەوبەری چەمەکە بەدرێژایی دە کیلۆمەتر، هەر لەسەر چاوەوە تا دەگاتەوە چەم چەوتە، بەڵکو چەمی (دوو ئاوان، کە ئاوەکەی دەرژێتە باسەرەوە تێکرا بە داری (ژاڵە) ئەو دارە تاڵە هەمیشە سەوزە چێنراوە، لە بەهاراندا بە تایبەتی، گوڵی هەمە چەشنە، سپی، سوور، زەرد، زۆر گوڵی پەمەیی دەگرن و ئەو چەمە دەرازێنێتەوە.

ژمارەی دانیشتووانی لەپێشدا زۆر کەمبووە، بەرەبەرە زیادی کردووە، لەسەرەتادا لە چلەکان، ژمارەی ماڵەکانی (٢٠) ساڵ بووە، لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بە گوێرەی پشکی گۆشتی قوربانی کە لە مزگەوت دابەشدەکرا (٤٠) ماڵ بووە، پێش ڕووخاندنی لەلایەن ڕژێمی بەعس، نزیکەی (٦٠) ماڵ بووە، دوای ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٩١) کە گەڕاونەتەوە ژمارەی ئەو ماڵانەی کە گەڕانەوە (٦٠) ماڵ بوو، ئێستا ئەگەر خەڵکەکەی هەر هەموو کۆببنەوە و بگەڕێنەوە ماڵەکان دەگەنە نزیکەی (٧٥-٨٠) مـاڵ، بـەڵام بەهـۆی وشکە ساڵییەوە ژمـارەی ماڵەکان کەمبووەتەوە بۆ (٢٢)ماڵ.

شوێنـەوارەکـانی ئـەم گوندە بریتییە لـە:- قـەڵای گـاران، قوولەکە، خانەکە، نەخشە هەڵکەندراوەکەی دەربەند باسەرە. بەراستی بـەرواری ئاوەدانکردنەوەی دێی (ژاڵـە) بە وردی نازانرێت کەی بووە و سەرەتا کێ ئاوەدانیکردووەتەوە، بەڵام بەپێی ڕووداوە مێژووییەکان ناوچەیەکی ئـاوەدان بووە و گەلێك شوێنەواری تێدا هەبووە.

## * گوندی (تیژە)

یـەکێـکە لە گونـدەکـانی نـاحیـەی (ئـاغجەلـەر) لـە قـەزای چەمچەماڵ. لە بناری شاخی (کێوچەرمەڵە)یە ئەم شاخە (٨٤٥)مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، بەڵام بەشێکە لە شوانی سەر خاسە.

سێ سەد ساڵێك بەر لە ئێستا (گودرین دەشتی) پیاوێکی دلێری کوردستانی باکوور لە جـەزیـرەی (بـۆتـان)، سەری بۆ عوسمانییەکان شۆڕنەکردووەو بە خۆو خێڵو عێڵەوە، ڕەشمـاڵو ئـەسپو مێگەلەکەی جـەزیـرەی بـۆتـان بەجێ دەهێـڵـنو لـە هـۆزی شەرەفخانی بەدلیسی بـووەو بـەرەو باشووری کوردستان جووڵەی کردووەو دوو کوڕی هەبووە بەناوەکانی: وەیسەو هاتووەتە ناوچەی (کێوەچەرمەڵە)، ئەمیان نۆ کوڕی هەبووەو چوونەتە ئاواییەکانی (ناسرو میسر)و گونـدی (هـەڵـەدنـی) نـاوچـەی جـافـەتیو گوندی مالومەی (بناری ئاسنگەران)و (چوار قورنە)و (دارەمـان)و (دانە سۆق)و (تلیان)و (سەیدان)، دووەمیان ناوی (حەسەن) بووە چووەتە (کەڵەکی یاسین ئاغا)و (ئاوایی شەربۆتی) ئـاوەدان کـردووەتـەوەو کوڕەکانی ئاوایی (گەڵۆك)و (تـرپـە سپی)و (دریـن)و (دووسـەرە)و (قاتی سـێ)و (گـەوران)و (کۆراوو)و (بەلکێل)و (کەڵکانلوو)و (موشیران)و (کەولەسۆر) و ئاوایی (تلیان)یان ئاوەدان کردووەتەوە.

لە ساڵی (١٩٣٣) حەمە عارف بنەچەی وەیسەی بنەماڵەی شەرەفخانی بەدلیسی ئاوایی (تیژەی) ئاوەدان کردووەتەوە. (گردە قەشە)، شوێنێکی گرنگی دانیشتنی پیاوانی تیژە بووە، هـەروەهـا خاکەکەی تایبەت مەندی خـۆی هەبووە، خەڵاتە زێرینەش شوێنکی شوێنەواری بووە، لە کوپەوپارچە ئاڵتونی تێدا دۆزراوەتەوە، لەوە دەچێت کە مەنزڵی خەڵکی بووبێت بـەڵام (شیو گـوومـە) تاکو ئێستاکە شوێنـەواری خانوویی تێدا ماوە کە بە بەردو قسل دروست کراوە، (گۆم کارگەش) لەسەر چەمی گەورەی تیژەیە، گۆلی (سەرتاف)و گۆلی (یەغمەشە) دووگۆڵن سەرچاوەی ئاوی شیوەسوورن، ئەم دوو گۆڵە هیچ سەردەمێك ووشکی نەکردووە.

ئاواییەکانی دەوروبـەری تیژە بریتیە لـە:- لـە باکووری ڕۆژهـەڵاتو باشووری ڕۆژهـەڵات کانی عـازەبـان، قـوراوە، گەزەڵان هاوسنوورییانە ڕۆژئاواو باکووری ڕۆژئاواش کێوی چەرمەڵە جیایان دەکاتەوە.

لـەگـەڵ گوندەکانی (بێـدەر)و (کـانی هـەنجیر)و لێرەشـەوە (تلیان) یەك پارچەینو زەویان یەکە لە ڕۆژئاواشەوە (فەقێ میرزا) وەئەوسەریش (پەلکە ڕەشە).

زەوی شیاوی چاندن لە گوندی تیژە شەش هـەزار دۆنمە لـە زەمـانـی زوو جـووت کـردن بـە (گـا) بـووە، بەسـەر سی جووتیار دابـەشـکـردووە، کـەلـەودەمـەدا پێیان ووتـوە سی ماڵەی تیژە بنەماڵەیەکی گودرن دەشتەی جەزیرەی بۆتان لە هۆزی بەدلیسن، شامەولودی وەیسەیە لە ساڵی (١٩٠٠) کەوتووەتە بۆسەی چەتەوە، ئازایانە لێیان هاتووەتە دەستو سەردەستـەی چەتەکانی بریندار کـردووەو خـۆی دەرباز کردووە، جاناویان ناوە شامەولود.

لە چلەکانی سەدەی ڕابردووشدا ئەحە کوردەو حەمە گەڵگۆی نەوەی وەیسە بووەتە چەتە لە تەك مەجید شانیشینی لە جـەوەل دۆمـەڵانی بان ساڵەیی لـە ساڵی (١٩٢٢) شـەڕی دەربەندی بازیان پشتی مەلیکی کوردستانیان گرتووە دژی ئینگلیز لە ساڵی (١٩٦١)یـش، هەشت کەسیان لە دەربەند بەچوار تفەنگەوە دژی عەبدولکەریم قاسم شەڕیان کردووە ئەم گوندە پەنجا هەزار دۆنم لەوەڕگاو بەردەڵانی هەیە ئەم گونـدە لـەسێ بـەرەبـابـن وەکـو بـەرەی عـەزەسـوورو بـەرەی محەمەد عـارفو بـەرەی حەمە عەلی، هـەروەهـا مەقامێکی پیرۆز لەسەر جەبەل (کێوچەرمەڵە) هەیەو خەڵك بۆ سەردانی کردن لە شوانو هەمەوەندو قەرەحەسەن هاتووچۆیان بۆ کردووە.

لە ساڵی (١٩٥٩) گۆرانی بێژی گەورەی کورد حەسەن زیرەك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەم گوندە ماوەو گۆرانی چڕیووە لەگەڵ کوێخا جەلالی تێژە.

ئاوایی تیژە ئاوێزگە بووە زۆری کانیاوەکانی بریتی بووە لە کانی چاییو کانی ناوەڕاستو گۆل کاردۆو گۆل سەریافو یـاخـمـەشـا، ئـەمـانـە هـەمـووی ئـاوو چـەم بـوونـە، چەمی سـەرقووشو چەمی هـەرزن بـەراو بـووە، گردەکانی بریتی بوو لە دەوشـانو گرد زێرینەو گرد قەشە بە چواردەوری ئاواییەوەن.

حوجرەی فەقێیان تێدا هەبووە مەلا (لالـۆ) گەلێك فەقێی پێگەیاندووەو ڕژێمی بەعس لە گوندی (تۆپزاوە) شەهیدیان کردووە.

هـەروەهـا لـەم گـونـدە (گـێـنـۆ) هـەیـە کـە کـەتـیرەیـان لـێ

دروستکردووە، ئەم گوندە لە شۆرشی ئەیلول رۆڵێکی گەورەیان بینووەو شەهیدیشیان داوە لەساڵی (١٩٧٨) دووساڵ دوای هەڵگیرسانەوەی شۆرشی، نوعمانە گۆج ناونیشانە رۆشنەکەی شۆرش لێرە بووەو لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە هاتوونەتە ئەم گوندەو شۆرشیان ئاوەدان کردووەتەوەو رێکخستنی کۆمەڵەی رەنجدەران لێرەدا گەشە دەکەن، کە سیانزە کەسی ئەم گوندە دەبنە پێشمەرگەو بیستو سێ شەهیدیان هەیەو لە ئێستادا پەنجاو شەش پێشمەرگەیان دژی داعش هەیە.

**گوندی (باشتەپە):**

ئەم گوندە دەکەوێتە ناوچەی (داوێ)وە لە ناحیەی (ئەوجوول) لە قەزای (خورماتوو) لەسەر ئاوەسپی.

ناحیەی ئەوجوول لە ساڵی (١٨٠٢) لەلایەن چوار بنەماڵەی کورد، ئاوەدان دەکرێتەوە، کە حەقی بەگی داوێ لە ناوچەکەدا ژیاوە و ئاواییەکانی داوێیان ئاوەدان کردووەتەوە لەگەڵ هۆزەکانی لەك و زەنگنە و گل و ساڵەیی و جاف پێکەوە ژیاون.

یەکێك لە ئاواییەکانی ئەو ناوچەیە ئاوایی (باشتەپە)یە، لەسەر رووباری (ئاوەسپی)، ٢٠٠ ساڵێك بەر لە ئێستا (مارف ئاغا) کە سەرکردەیەکی گەورەی کورد بووە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، لەو سووپایە یاخی بووە و لە باشتەپە قەڵایەك دروست دەکات و ئاوەدانی دەکاتەوە، سەرخۆش ئەبۆ و مەحموود قایە و ئەحمەد قایە، درێژە بە ئاوەدانکردنەوەی دەدەن.

لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا ئاشێکی ئاوی تێدا بووە خاوەنکەی کەریم ئاغای زێنانە بووە، لە ساڵی (١٩٦٣) حەرەس قەومییەکان ئەم ئاواییە و ئاواییەکانی سەرچەم، تاڵان دەکەن و دەیسووتێنن، پێشمەرگە لێیان دێتە دەست (١٦) حەرەس قەومی دەکوژن و ژمارەیەك ئۆتۆمبیل دەسووتێنن.

بنەرەتی ناوەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە گردێکی باش و گەورەیە و شوێنێکی باشی هەبووە بەسەر ناوچەکەدا، یان پێیان دەڵێن باشتەپەی سەرخۆش، کە چوار برا بوونە هاتوونەتە ئەم شوێنە، کە سەرخۆشو گاڵتەچیو دڵخۆش بوونە.

* سەرچاوە:


١. (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواریی)، د.جەمال رەشید ئەحمەد، بەغدا، ١٩٨٨.

٢. (اصول أسماء المدن والمواقع العراقية)، لاپەرە (١١٣).

٣. بەرنامەی (ژیانی لادێ) کە لە کەناڵی ئاسمانی (کەرکوك) ەوە پەخش دەکرێت، ئامادەکردنی (محەمەد سەیید).

٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ کۆمەڵێك لە کەسایەتی لادێیەکانی کەرکوك.

٥- پاشکۆی (عێراق)، ژمارە (٤٤٦)، (١٠)ی ئابی ساڵی (١٩٩٧) لاپەرە (٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (چەمچەماڵو دێهاتەکانی).

٦- بەپێی سەرچاوەی سەرژمێری ساڵانی (١٩٤٧)، (١٩٥٧).

٧- پاشکۆی (عێراق)، ژمارە (٤٣٨)، (١٥)ی حوزەیرانی ساڵی(١٩٩٧)، لاپەرە (٤).

٨- پاشکۆی (عێراق)، ژمارە (٤٤٢)، (١٣)ی تەموزی ساڵی (١٩٩٧)، لاپەرە (٦).

٩. (دووبز لە چەند تەوەرێکدا)، فاتیح قادر عوسمان، ٢٠١١،

١٠. گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژمارە (٤)، ساڵی (١٩٩٩)، لاپەرە (٣٩).

١١. (العراق الشمالي)، محەمەد هادی ئەلدەفتری، عەبدوڵلا حەسەن، چاپخانەی (شەفیق)، بەغدا، لاپەرە (٢٤٩).

١٢. گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (١٢٨)، ئەیلولی ساڵی (١٩٩٩)، لاپەرە (١٤)، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی: (چەمچەماڵ لە چلەکانو پەنجاکاندا)، دکتۆر زەنون پیریادی.

١٣. (مێژووی گوندی خالدانو خانەوادەکانی)، محەمەد ئەمین سەمین خالدانی، کەرکوك، ٢٠١٣، لاپەرە (١٤-١٧).

١٤. (قرية يحياوە، صفحات من الماضي والحاضر)، حوسێن حەسەن بەکر ئۆغلو، (فضولي) بۆ چاپو بلاوکردنەوە، کەرکوك، ٢٠١١، چەند لاپەرەیەکی جۆراوجۆر.

١٥. بەرنامەی (ژیانەوەی کوردستان)، لە کەناڵی ئاسمانی (گەلی کوردستان)، ئامادەکردنی: دلشاد ئەحمەد.

١٦- گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (١١)، شوباتی ٢٠٠٤. لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- محله پیريادى بكركوك اسسها اهالى قريه پيريادى فى چمچمال، نووسینی:- د. زەنوون پیریادی، لاپەرە (١٣٥- ١٣٦).

١٧- رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (١٠٢٨) لە رۆژی 28ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٨٨) لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- پیریادی نووسینی د. زەنوون پیریادی.

١٨- گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (٩٨)، ساڵی ١٩٩٧.

١٩- تەکیەی جەباری لە بیرەوەرییەکانی حاجی سەید عومەر، پشتیوان مووسا، چاپخانەی تاران، ٢٠١٥.




گوندی شێخ جگری



گوندی خدر ڕەیحان



ناحییەی ئاوەسپی (خان)



ناحییەی قادر کەرەم



کۆمەڵێك لە کەسایەتییەکانی هۆزی زەنگەنە لە قادر کەرەم



گوندی دەرماناو

*** بەشێك لەئەتنۆگرافیای باکوورو باکووری رۆژهەلاتی کەرکوك :-**
**د. محەمەد شوانی**

مەبەست لە باکوورو باکووری رۆژهەلاتی کەرکوك لەم باسەدا ئەو دەڤەرەیە کە دەکەوێتە نێوان (زێی بچووك لە باکوور،زنجیرە گردۆلکەکانی کانی دومەلان یان ڕێگای دوبز کەرکوك لە ڕۆژ ئاوا، ڕووباری خاسە لە باشوور و زنجیرە چیای خالخالان لە رۆژهەلات )ئەم ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان ئەم سنوورەوە، لە بارەی پێکهاتەی خێلەکییەوە بریتییە لە شوان و سالەیی و شێخ بزێنی خواروو نزیکەی ١٥٠ گوندە و لە رووی کارگێڕییەوە هەندێکیان سەر بە قەزای ناوەندی کەرکوك و هەندێکیان سەر بەشوان و سەر بە پردێ و قەرەهەنجیر و چەمچەمال و تەقتەقن .
گوندەکان بریتین لەمانەی خوارەوە :

| زنجیرە | ناوی گوند |
|---|---|
| ١ | قەرەبەگ |
| ٢ | شێخەیی |
| ٣ | دەرماناو |
| ٤ | قەرەسالم خواروو |
| ٥ | تولکی |
| ٦ | کاولە سوار |
| ٧ | قەرەسالم سەروو |
| ٨ | پەلکانە |
| ٩ | شەوگێڕ |
| ١٠ | عەمدۆن |
| ١١ | مەرزیخەی خواروو |
| ١٢ | مەرزیخەی سەروو |
| ١٣ | کانی ڕەش |
| ١٤ | جگیلە |
| ١٥ | کەپەنك |
| ١٦ | سماقە |
| ١٧ | دارئەختیار |
| ١٨ | سەقزلی |
| ١٩ | دارەمان |
| ٢٠ | بیبانی |
| ٢١ | یارمجە |
| ٢٢ | گەلۆزی |
| ٢٣ | سەربیر |
| ٢٤ | ڕۆژبەیانی |
| ٢٥ | بیرەسپانی گەورە |
| ٢٦ | بیرەسپانی بچووك |
| ٢٧ | کارێز |
| ٢٨ | بیرالك |
| ٢٩ | قادر باغر |
| ٣٠ | گۆلدەرەی بچووك |
| ٣١ | گۆلدەرەی گەورە |
| ٣٢ | حەسار |
| ٣٣ | دووبزنی |
| ٣٤ | حەساری تەها |
| ٣٥ | تۆراغ |
| ٣٦ | قولی بەگ |
| ٣٧ | جەوەجەوە |
| ٣٨ | ئالی بەیان |
| ٣٩ | حەسەن قەباغ |
| ٤٠ | نێبەسەرە |
| ٤١ | شیوەسوور |
| ٤٢ | ئیلینجاغ |
| ٤٣ | ئۆمەرمەندان |
| ٤٤ | قەرەناو |
| ٤٥ | تورکمان باغ |
| ٤٦ | دووشیوان |
| ٤٧ | تەرەقە |
| ٤٨ | کارێزە |
| ٤٩ | ناسرومیسر |
| ٥٠ | فەقی میرزا |
| ٥١ | تەپەکوڕە |
| ٥٢ | مام ڕەش |
| ٥٣ | عەلی موسا |
| ٥٤ | تورکە |

| | |
|---|---|
| ٥٥ | خدرشیرین |
| ٥٦ | كانی فەقێ |
| ٥٧ | ناڕوجە |
| ٥٨ | ئەحمەد ڕەجەب |
| ٥٩ | حاجی جەردیس |
| ٦٠ | سمایل بەگی |
| ٦١ | حاجی بەیخانی ژووروو |
| ٦٢ | حاجی بەیخانی خواروو |
| ٦٣ | مۆرد |
| ٦٤ | برایم زانە |
| ٦٥ | قەمەر |
| ٦٦ | جانقز |
| ٦٧ | گەنیاك |
| ٦ | گوندسۆڤ |
| ٨ | گورزەیین |
| ٦٩ | چەڵتوكە |
| ٧٠ | پاپیلان |
| ٧١ | جولحان |
| ٧٢ | گورگان |
| ٧٣ | تۆمار |
| ٧٤ | كەڵاوقوت |
| ٧٥ | دەلۆ |
| ٧٦ | پیریجان |
| ٧٧ | عەلیاوە |
| ٧٨ | قەفار |
| ٧٩ | ئۆمەربەگ |
| ٨٠ | مەمان |
| ٨١ | حەساری كوێخا عەزەدین |
| ٨٢ | قزڵقایە |
| ٨٣ | وەلی پاشایی |
| ٨٤ | قادرعەلی |
| ٨٥ | ڕەحیمەقوتە |
| ٨٦ | گۆران |

| | |
|---|---|
| ٨٧ | ساتی |
| ٨٨ | ئاوباریك |
| ٨٩ | گوڵم كەوە |
| ٩٠ | سەیدانی سەروو |
| ٩١ | یەختەخان |
| ٩٢ | گەڕاو |
| ٩٣ | داربیلە |
| ٩٤ | هەمزە |
| ٩٥ | سوورەدێی سەروو |
| ٩٦ | سوورەدێی خواروو |
| ٩٧ | تۆبزاوە |
| ٩٨ | گۆگجە |
| ٩٩ | كۆچەكی سەروو |
| ١٠٠ | كۆچەكی خواروو |
| ١٠١ | یاروەلی |
| ١٠٢ | سۆنەگۆلی |
| ١٠٣ | شۆراو |
| ١٠٤ | سێكانی |
| ١٠٥ | گورگەچاڵ |
| ١٠٦ | كوردەمیل |
| ١٠٧ | خانەكە |
| ١٠٨ | كەڵوری خواروو |
| ١٠٩ | كەڵوری بنار |
| ١١٠ | شانشین |
| ١١١ | گورزەیی |
| ١١٢ | نەبیاوە |
| ١١٣ | كتكە |
| ١١٤ | قەرغەتوو |
| ١١٥ | ڕێدار |
| ١١٦ | محمودفاتە |
| ١١٧ | تۆبزاوەی سەدیق بەگ |
| ١١٨ | گەلەكە مردی |
| ١١٩ | شافرین |

| | |
|---|---|
| ١٢٠ | داربەسەری سەروو |
| ١٢١ | داربەسەری خواروو |
| ١٢٢ | گورگەیی بارزان |
| ١٢٣ | بنەی سەروو |
| ١٢٤ | بنەی ناوەند |
| ١٢٥ | بنەی خواروو |
| ١٢٦ | هەزارکانی |
| ١٢٧ | تلیان |
| ١٢٨ | تیژە |
| ١٢٩ | مەحمەخان |
| ١٣٠ | سەیدانی خواروو |
| ١٣١ | چالاو |
| ١٣٢ | کانی کوچولە |
| ١٣٣ | مامشە |
| ١٣٤ | مەرعی |
| ١٣٥ | هەنجیرە |
| ١٣٦ | قەرەدەرە |
| ١٣٧ | قەلاعەربەت |
| ١٣٨ | قوشقایە |
| ١٣٩ | قوتانی خەلیفە |
| ١٤٠ | قوتانی گەورە |
| ١٤١ | باجوان |
| ١٤٢ | عەلاومەحمود |

١-شوان :

شوان وەکو خێڵ یەکێکە لە خێڵە دێرین و بە ناوبانگەکانی کورد،وەکو ناوچەش یەکێکە لەو ناوچانەی پارێزگای کەرکوك لەسەردەمی عوسمانییەکانەوە یەکەیەکی کارگێڕی بووە،سەردەمێك ناوەندی ناوچەکە لە گوندی تۆمار و سەردەمێك لە حاجی بەیخان و دوواتریش تا ئێستا لە گوندی ڕێدارە، دەربارەی ناوی شوان دیدو بۆچوونی زۆر خراوەتەڕوو، هەندێکیان بنەچەی خەڵکەکەو هەندێکیان کارو پیشەو هەندێکی دیکەش هەڵکەوتو ڕووبەری خاکەکەی کردووەتە بنەما بۆ پەیدابوونی ناوی شوان لەسەر ئەم دەڤەرە، نووسەری ڕوسی (ڤێلچێڤیسکی) دەڵێ:- (لە سەرووتری کەرکوك لەو شوێنەی مەرو مالات بەخێوکردنی کۆچەری لە ڕۆژانەکاندا باوە هەر لە کۆنەوە خێڵێکی کورد یان ڕاستتر گروپە خێڵێکی کوردی دەژیو، ناوێکی زۆر تایبەتی هەیە، (شوان )واتە شوانی مەرومالاتی ورد، هاوسێی خێڵێکی بچووکی نیشتەجێن، بەناوی شێخ بزێنی[٤]، ئەم پێی وایە ناوی شوان بەرئەنجامی پیشەی خەڵکەکەیە کە بەخێوکردنی ئاژەڵە،ئەدمۆندز دەڵێ:- ئەو ناوچەیە لەوەرگای نایاب و زۆر باشە بۆ مەرومالات، لێرەشدا شوان بەمانای لەوەڕاندنی مەرومالاتە[٥]،ئەمیش هەمان بۆچوونی ((ڤێلچێڤسکی)هەیە لەمەر ناوی شوان .

مێجەر سۆن لە گەشتەکەیدا بەناوی (میرزا عولام حوسەین شیرازی)یەوە دەڵێ:- (لە ڕۆیشتنماندا بۆ سلێمانی هەتا بەخاکی هەمەوەندەکاندا تێئەپەڕین، لە کەرکوکەوە شەفیق ئەفەندی بڕیاری گۆڕینی ڕێگەکای دا، سەرەتا کەمێك بەرەو باکوور هەڵکشاین بەنێو زنجیرەیەکی گردۆڵکەی نزمدا پێشرەویکردین، دواتر بەزەوی شواندا تێپەڕین، شوان خێڵێکی بەهێزە، بەلام بێ وەیو خەریکی ئاژەڵدارین هەروەکو لە ناوەکەیاندا هاتووە)[٦]، دەزگەی هەواڵگری بەریتانی لە نووسینەکەیاندا بەناوی (چەند تێبینییەك لەسەر خێڵەکانی باشووری کوردستان لەنێوان زێی گەورەو سیرواندا،پارەێزەری بەرێز جەمال بابانیش لە کتێبەکەیدا دەربارەی ناوی شارو شوێنە ئاوەدانییەکانی ئێراق،ناوی ناوچەی شوان دەگەڕێنێتەوە بۆ ناوی خێڵەکەو دەڵێ:- (شوان لە ناوی سەرەکیترین خێڵی ناوچەکەیەوە وەرگیراوە) [٨] ناوچەی شوان وەکو یەکەیەکی کارگێڕی یەکێکە لە ناوچە هەرە کۆنەکانی پارێزگای کەرکوك، (مستەر ریچ) لە گەشتەکەیدا بۆ سلێمانی لە گەرانەوەیدا لە ڕۆژی (١٨٢٠/١٠/٢٢) لە ناوچەی شوانەوە هاتووە بۆ پردێ [٣٢]، لە قاموسی ئەعلامی تورکیشدا کە نووسەرەکەی شەمسەددین سامی بەگو لە سەردەمی عوسمانییەکاندا نووسراوەو، بەیەکێك لە بەڵگەنامە نیمچە ڕەسمییەکانی تورکیا دادەنرێت، لە باسی یەکە کارگێڕییەکانی پارێزگای کەرکوکدا ناوی شوان وەکو ناوچەیەکی کارگێڕی لە لاپەرە (٣٨٤٦)دا هاتووە، وەکو ناوچەیەکی سەر بەئەمارەتی بابان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا سەر بەقەزای بازیان بووە، کە چەمچەماڵ مەڵبەندی کارگێڕی قەزاکە بووە[٣٣]، لە سەرەتای هاتنی ئینگلیزەکانیشدا سۆن دەڵێ: (خێڵی شوان لە ڕووی کارگێڕییەوە هەر لە کاتی عوسمانییەکانەوە سەر بەو ناوچەیە بوون کە بەناوچەی شوان ناسراوە، لە کاتی داگیرکردنی ناوچەکەدا بەڕێوەبەری نەمابوو،

١-تۆمار :

گوندێکە لە گوندە هەرە دێرینەکانی ناوچەی شوان، دەکەوێتە نزیکەی (٣٥)کیلۆمەتر باکووری ڕۆژهەلاتی کەرکوك،ناوەندی ناوچەو کارگێڕی ناوچەکە بووە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا،پێ دەچێت هەر لە بنەڕەتدا ناوی ئەم گوندە لە (تۆمارگەوە) هاتبێت،بە مانای تۆمارکردنی ناو و زانیارییەکانی سەر دانیشتووانی ناوچەکە لەم گوندەدا،چونکە بەڕێوەبەری ناوچەو دامودەزگاکانی میری تێدابووە، دووا بەڕێوەبەری ناوچەش بە ناوی (سلێمان) خەڵکی شارەبان بووە،لەشەڕی جیهانی یەکەمدا هەڵاتووەو



گوندی مامشەی دێرینی ناحیەی ( لەیلان – قەرەحەسەن ) ی لیوای کەرکوك، ساڵی ١٩٥٨

ناوچەکە بێ بەڕێوەبەر ماوەتەوە،تا ئەم ساڵانەی دووایش شوێنەواری سەراو خانووبەرەی فەرمانگەی بەڕێوەبردنی مابوو، ،تا لە ساڵی ١٩٨٧دا تێکدرا،ئەو کاتە نزیکەی (٧٥) خێزانی لێ نیشتەجێ بوو، لە دووای ٢٠٠٣ەوە ئاوەدان کراوەتەوەو ئێستا نزیکەی (٢٠)خێزانی بۆ گەڕاوەتەوە .

٢–حاجی بێخانی ژووروو:
گوندێکی دێرینی ناوچەی شوانە لە کەرکوك،سەرۆك خێلێی شوانی تێدا نیشتەجێ بووە چەندین جێگەو شوێنی شوێنەواری تێدایە،گرنگترینیان قەلایەکی دەست کردەو نازانرێت مێژووەکەی بۆ کەی دەگەڕێتەوە، لەسەرەتای هاتنی ئینگلیزەکاندا بۆ ماوەیەکی کەم ناوەندی بەڕێوەبەردنی ناوچەی شوان بووە،لەبەر ئەوەی دەسەلاتی دەڤەرەکەیان بە بنەماڵە و سەرۆك خێلی ناوچەکە داوە تا بە شێوەیەکی فەرمی بەڕێوەبەری ناوچەیان بۆ گێڕاوەتەوە،لە بارەی ناوی گوندەکەوە دەلێن لە کۆندا ڕێگای کەرکوك کۆیە بەم گوندەدا تێپەڕیوەو خانێکی لێ نەبووە بۆ پشوودان و حەوانەوەی کاروانچیان بۆیە زۆرجار لە ماڵی حاجیەکی نیشتەجێی ئەو شوێنەدا ماونەتەوە بە (حاجی –بێ خان) ناویان بردووە،گوایە خان و شوێنی حەوانەوەی نیە .

٣–رێدار :
یەکێکە لە گوندە دێرینەکانی کەرکوك و لە ساڵی ١٩١٩ەوە بووە بە ناوەندی ناوچەی شوان، لە بنچینەدا ناوەکەی لەودوە هاتووە کە لەسەر رێگای دارستانەکانی سەرووی ناوچەکە بووە و گوندە نیشتەجێکانی پێ دەشتەکان لەوێوە بۆ داربڕین ڕۆیشتوون،بۆیە لەسەرتاوە یەك بەرەبابی تێدا نیشتەجێ نەبووە وەکو ئەوەی لە زۆربەی گوندەکانی تری ناوچەکەدا دەبینرێت،ئەم بە پێچەوانەوە دانیشتووانەکەی چوونەتەوە سەر پێنج بنەماڵەی لەیەك جیاواز و هەریەکەو لە شوێنێکەوە هاتوون،لە ساڵی خوێندنی ١٩٣٩–١٩٤٠ ەوە قوتابخانەی سەرەتایی لێ کراوەتەوەو لە ساڵی ١٩٥٥یشەوە جادەی قیری بۆ هاتووە،تا بە بڕیاری ژمارە (١٢١)لە ٢١/٦/ ١٩٨٧چۆڵ کرا و خەڵکەکەی بۆ ئۆردووگاکانی (دارەتوو) و (بنەسلاوە) لە هەولێر گوێزرانەوە،ئەو کاتە نزیکەی ٢٣٥خێزانی لێ نیشتەجێ بوو، لە دووای ٢٠٠٣ ئاوەدان کراوەتەوە و ئێستا نزیکەی (١٥٠)خێزانی بۆ گەڕاوەتەوە .

٤–سمایل بەگی :
ناوی ئەم گوندە لە (ئیسماعیل) و (بەگیە)وە هاتووە،کە کوڕ و دایك بوونە، دوواتر ئیسماعیل خێزانی دروست کردووەو حەوت کوڕی بووە،گوندەکانی (ئەحمەد ڕەجەب، حاجی جەردیس، حاجی بێخانی ژووڕو، قوتانی خەلیفە، بەشێك لە گوندی جانقز، مەمان، بەشێك لە گوندی عەلاو مەحمود، بەشێك لە گوندی باوەقووبی بناری کۆیە،عێلی بن عەلی لە هیت نزیکەی ١٥٠ خێزان دەبن و تەعریب بوون، ) لە بنچینەدا کوڕی ئەم ئیسماعیلەن،خۆی لەم گوندەدا نیشتەجێ بووە و بەناوی (سمایلی بەگی)یەوە نراوە،لە ڕۆژی ١٢/٣/١٩٨٧ تێکدرا و خەڵکەکەی ئاوارەی ناوچە جیاجیاکانی ئێران و ئێراق بوون،تا لە دووای ٢٠٠٣ەوە بە نزیکەی پێنج کیلۆمەتر خوار شوێنە کۆنەکەی خۆی کۆمەڵگایەکیان بۆ دروست کراو زەویان بەسەر (١٢٠٠) خێزاندا دابەش کرد بەلام ئێستا نزیکەی (٢٠٠) خێزانی بۆ گەڕاوەتەوە .

*** چەند ڕاستییەکی شێوێنراو لەبارەی دامەزراندنی لیوای زەنگابادەوە لەساڵی ١٨٥٣.**

د. جەبار قادر

توێـژەرێـکـی تـورکـمـان بـە نـاوی فـازیـل بـەیـات، دوو بـەڵـگـەنـامـەی عـوسـمـانـی لـە بـارەی دامـەزرانـدنـی لـیـوای زەنگابادەوە بڵاوکردووەتەوە. ئەم لیوایە کفری، خورماتوو، قەرەتەپەو زەنگابادی یا زەنگاواتی دەگرتە خۆ. هەر یەك لەم شارۆچکانە ناوەندی قەزایەك بوون‌و تا ساڵی ١٨٥٣ سەر بە ئیالەتی شارەزوور بوون، کە کەرکوك ناوەندی بوو.



ئەم توێژەرە کەسێکی ئەکادیمییەو شارەزاییەکی زۆر باشی لە بەڵگەنامە مێژووییەکانی سەردەمی عوسمانیدا هەیە، کۆمەڵێ بەرهەمی ئەکادیمی لەم بوارەدا بڵاوکردووەتەوە کە ئاستی شارەزایی دەردەخەن. بەداخەوە بەیاتیش وەکو زۆر لە نووسەران‌و توێژەرانی تورکمانی لە پەتای دەردە کوردە ڕزگاری نەبووە. هەندێ لەم بەڕێزانە ئەگەر بۆیان بلوێت ناوی کورد لە مێژوودا دەسڕنەوە. یەکەم ڕستەی نووسینەکەی بە وتەیەکی نادروست لە باری مێژوویی‌و جوگرافییەوە دەستپێدەکات، کاتێ هەموو ئەم شوێنانە بە شارۆچکەی تورکمانی ناو دەبات.

بەڵگەنامەکان باس نامەو نامەکاری لەنێوان وەزارەتـی دارایی‌و سەرۆکایەتی وەزیران‌و دەرباری سوڵتانی عوسمانی ئەکەن، واتا باس لە پرۆسەی دامەزراندنی لیواکە ئەکەن، هەرچەندە لە بەڵگەنامەکاندا ئاماژە بە قایمقامییەت کراوە. پێدەچێت بەر لە دەرچوونی قانونی ویلایەتەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە ساڵی ١٨٦٤ جیاوازییەکی زۆر لەنێوان لیواو قایمقامییەت نەکرابێت. ئەنجومەنی ژمێریاری لە وەزارەتی دارایـی ساڵی ١٨٥٣ ڕاسپاردەیەکی بۆ کۆکردنەوەی ئەم قـەزایـانـە لـە یەکەیەکی کـارگـێڕی نوێدا بـۆ سەرۆکایەتی وەزیـران بـەرزکـردووەتـەوە. ئـەم یەکە کارگێڕییە بە هۆی پێگەی جوگرافییەوە گرنگییەکی تایبەتی هەبووە، چونکە دەکەوتە نێوان هەردوو ویلایەتی بەغداو شارەزوورەوە.

هەبوونی یەکەیەکی کـارگـێڕی بۆ پاراستنی ئاسایشی ڕێگەی سەرەکی نێوان هەردوو ویلایەت پرسێکی گرنگ بوو. بە هۆی ئەوەی هۆزە کۆچەرەکان بەو ناوانەدا بڵاوببونەوە، بۆیە ئەرکی سـەرەکـی قایمقام کۆنترۆڵکردنی جموجوڵی ئەو هۆزانە بوو. ئەدەبوو ئەم یەکە کارگێڕییە نوێیە ئەرکی دارایـی زیـاتـر بخاتە سـەر شانی دەوڵـەت. دوای ئـەوە لە ئەنجومەنی ژمێریاری وەزارەتی دارایی لێکۆڵینەوە لە سەر پرسەکە کرا، لەگەڵ ڕاسپاردەکاندا بەرزکرایەوە بۆ سەدری ئەعەزەم (سەرۆك وەزیران)، ئەویش ڕەزامەندی لە سەرداو بۆ سوڵتان عەبدولمەجیدی بەرزکردەوە، کە ئەمیش فەرمانێکی سوڵتانی لە ١٨ سەفەری ١٢٧٠ کە بۆ دامەزراندنی دەرکرد (دەکاتە ٢٠ نۆڤەمبەری ١٨٥٣). ئەندامی ئەنجومەنی شاری کـەرکـوك عـومـەر ئەفتچی زادە، کە بنەماڵەکەی جێگەی متمانەی دەوڵەت، کرا بە قایمقام‌و محەمەد ئەفەندییەکیش کرا بە نووسەرو مەحمود ئەفەندیش بە ژمێریار. ناوەندی لیوای نوێ شاری کفری بوو، کە لە دەسپێکدا بڕیار وابوو ناوی لیواکەش هەر کفری بێت، بەڵام دوایی بە باشتر زانرا ناوی زەنگابادی لێ بنرێت. وەکو هەر یەکەیەکی کارگێڕی تر باس لە دامەزراندنی هێزی دەرەك بۆ پاراستنی ئاسایش کراوەو گرنگی بە کۆکردنەوەی باجیش دراوە، کە دوو ئەرکی سەرەکی دامەزراوە عوسمانییەکان بوو لە ویلایەتەکان.

یەکێ لە ڕاسپاردەکان باس لە دامەزراندنی دوو نووسیار دەکات کە دەبێت یەکێکان عەرەبی زان بێت‌و ئەوی تریشیان فارسی بزانێت. ئەم ڕاسپاردەیە بۆخۆی پرسێکی ئەوتۆ نییە مرۆڤ زۆری لەسەر ڕاوەستێ لێ ئەو ئەنجامەی توێژەر لە سەری بنیاتی ناوە، مایەی تێڕامانە، ئەم دوو نووسیار یا وەرگێڕە بەسە بۆ توێژەری بەڕێز بۆ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی لێبڕاوە، کە مەبەستمە لەم نووسینە کورتەدا بیخەمە ڕوو.

ئـەو بـە بـێ هـیـچ بەڵـگـەیـەکـی مـێـژوویـی پـێـیـوایـە، کە دانیشتوانی ئەم ناوچانە هەموو تورکمان بوونە، بەڵام هەندێ عـەرەب لەنێویان ژیـاون‌و لە دەورو بەریش هەندێ هۆزی عەرەب لە کۆچ‌و بەهار و هـەواردا بوونە، هەندێ خەڵکیش بە فارسی قسەیان کردووەو بازرگانی کردنیش لەگەڵ ئێراندا وای کردووە فارسی زانێك پێویست بێت، لەم بۆچوونەیدا جووەکانی ئەو شارۆچکانەشی لە بیر نەکردووە، کە گوایە هەر بە تورکی قسەیان کـردووە. دوای ئەم هەموو کەین‌و بەینە دەێتە سەر مەبەستی سەرەکی، کاتێ دەڵێت باسی زمانی تر نەکراوەو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بە بۆچوونی توێژەر کە لەم خەڵکانە زیاتر کەسی تر لەم ناوچانە نەژیاون، مەبەستەکە ڕوونە کە کورد لەو ناوە نەبووە.

لە وەڵامی ئەم بۆچوونە نا زانستییەدا پێم باشە ئاماژە بە چەند ڕاستییەك بکەم بەر لە هەر شتێك دەیان گەڕیدەی ڕۆژئاوایی‌و ڕۆژهەڵاتی بەر لەو ساڵەو دوای ئەوەش سەردانی ئەو ناوچانەیان کـردووەو هەموو بە یەك دەنگ ئاماژەیان بەو ڕاستییە مێژووییە کـردووە کە زۆربـەی هـەرەزۆری دانیشتوانی ئەو دەڤەرانە هۆزو خێڵ‌و بنەماڵە کوردییەکان پێکیاندەهێنان، هیچ سەرچاوەیەکی عوسمانیش لاف وای لێنـەداوەو ساڵنامەکانی دەوڵـەتـی عوسمانی تایبەت بە ویلایەتەکانی بەغداو مووسڵ، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهـەم‌و دەسپێکی سـەدەی بیستەمدا بڵاوبوونەتەوە باسی دانیشتووان‌و هۆزەکانی ئەو ناوچانەیان کردووە، کە تەواو پێچەوانەی ئەم قسانەی توێژەرە تورکمانەن.

تەنها لە ناوەندی شارو شارۆچکەکاندا هەندێك لە دانیشتووان کورد نەبوونە زیاتر خەریکی کاری پیشەوەری و بازرگانی بوونە، ئەندامانی هۆزە کوردییەکان بە تایبەتی کۆچەرەکان و بە چاوێکی سووکەوە سەیری ئەو پیشەو کارانەیان ئەکردو خۆیان زۆر لەوە گەورە تر دەبینی بە کاری واوە خەریك بن.

بە پێچەوانەی ئەوەی بەڕێز بەیات پێی گەیشتووە. خەڵکی دەڤەرەکە کورد بوونەو ئەوانەشی لە گەڵیاندا ژیاون بە هۆی تێکەڵاوی و پیشەکانیانەوە ناچار بوونە کوردی بزانن. باشترین نموونەش بۆ بۆچوونە جوومەکانی کوردستان بوون. بەڵام بۆ پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتی بەغدا. ونیرانییەکاندا پێویستی بە عەرەبی زان و فارسی زان هەبووە. خۆ ئەگەر بەو پێوەرە بێت دەبێت تورکمانیش لەو دەڤەرانە نەبووبێتن. چونکە باسی زمانی تورکمانی نەکراوە. هەموو کەسێکیش دەزانێت ئەو دەمەو ئێستاش جیاوازی نێوان تورکمانی و تورکی چەندێ گەورەیە، ئەوەی بەشێك لە نووسەران و خوێنەوارانی تورکمان زمانی خۆیان گۆڕیوە بۆ تورکی شتێکی ئەوتۆی لە پرسەکە نەگۆڕیوە، چونکە ئێستاش خەڵکە ئاساییەکە هەر بە تورکمانی قسە ئەکەن، نەك تورکی سەپێنراو بە سەر منداڵەکانیاندا. ڕاستییەکی تریش ئەوەیە، کە زمانی تورکی فەرمی دەزگاکانی دەولەت بووە، فارسیش زمانی دەولەتی دراوسێ و نەیار بووو بە هۆی پەیوەندی بازرگانی و ئەمنی ئەم دەڤەرەو وڵاتی ئێران نەدەکرا پشتگوێ بخرێت، هەرچی زمانی عەرەبیشە، هەم زمانی ئەو ئاینە بوو کە دەولەتی عوسمانی خۆی کردبوو خاوەنی و هەم هەموو جیهانی عەرەبی لەژێر دەستدا بوو، سەرباری ئەوەش لە خوار ئەم دەڤەرانەوە ناوچە عەرەبییەکانی سەر بە ویلایەتی بەغدا دەستیان پێدەکرد، بۆیە باسکردنی زمانی عەرەبی کارێکی ئاسیی بوو، ئەوەی پەیوەندی بە زمانی کوردیشەوە







هەیە، ئەوا هەم خەڵکەکە لە هیچ دەزگایەکی دەوڵەتێدا بەکار بهێنرێت. دەقی نووسراویش بە کوردی تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم دەگمەن بووە، هەرچی مەلاو خوێنەوارێکی کوردیش هەبووبێت، ئەوا عەربی و فارسی و تا ئەندازەیەك تورکیشی زانیوەو نەبووە نەریت کە بە کوردی بنووسن و بخوێنن، بۆیە باسنەکردنی زمانی کوردی نابێت کەسێکی توێژەرو ئاگادار بەو ئاراستە نادروستەدا ببات.

## * گۆرانە ئابوورییەکانی کەرکوك لەروانگەی سەردەمە مێژوویییەکانەوە

د. بەختیار سەعید – سەربەست کەرکوکی
د. دلشاد عومەر عەبدولعەزیز – ئاریان جەمال
سمکۆ بەهرۆز – فەیسەل عەلی

### تەوەری یەکەم

*** سەردەمەکانی پێش مێژوو:**

*** سەرەتا ئابوورییەکانی پێش مێژوو:**

"دەتوانین بگەینە ئەو راستییە کە کوردستان هاوگونجاوی باری ئاووهەوایەکی لەباربووە بۆ پێشبڕکێ کردنی لە شارەزایی لەکشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژەڵدا لەبەشەکانی تری گۆی زەوی چونکە ئەوەی کوردستان بەدەستی هێناوە لەپێش مێژوودا، بەسەرهەڵدانی شارستانییەکی تەواو لە دەشتاییە نیشتووەکاندا، لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینیدا.. ئەمە بەبارێکی رێکەوت دانانرێت کە بڵێین کوردستان باوەشی سەردەمی بەردینی نوێیە یان جێگەی سەرهەڵدانی سەردەمی بەردینی کانزایی بێت.. چونکە باری ئاووهەواو سروشتو ئەو مێژوویەی کە رووی داوە لە دەشتاییو چیاییەکانی، زیاتر هاوگونجاو تر بووە بۆ سەرهەڵدانی لە دەشتاییەکان وەکو ئەوەی لە شوێنێکی تری جیهاندا سەرهەڵبدات.."[1].

"لەبەر ئەوەی کوردستان لەم رووەوە (٣٥٠٠) ساڵ پێش ئەوروپا کەوتبوو، (٩٠٥) هەزار ساڵ پێش ئەوە ژیانێکی سەختو ناهەمواری بووە.."[2]. ناوچەی کەرکوك بەبەشێکی گرنگی ئەو شارستانییەتە دادەنرێت، کە تێدا باڵادەستی ناوچەکەی تێدا رەنگی داوەتەوە، هەر لە (بەردە بەڵکە)وە تا (چەرموو)و (مەتارە)و (قادیش).

*** چاخی بەردینی دێرین (کۆن):**

لەسەرەتادا ئەوەی لە (بەردە بەڵکە)دا بەرچاومان دەکەوێت سەرەتایەکی شارستانی مرۆڤی ئەو ناوچەیە، چونکە ژیان تا ئەوکاتە نەگەیشتۆتە ئەوەی بتوانێت بەرەو ژیانێکی ئابووری تەواو هەنگاو بنێت.. بەڵام لەوانەیە ناوچەی تر هەبێت کە سەرەتاکانی هاوچەرخی (بەردە بەڵکە) وەك خۆی بێت، بەڵام تا ئێستا زانیاری تەواومان بەدەست نەگەیشتووە. "چونکە مرۆڤ هەوڵی داوە، پشت بەوە ببەستێت کە راوی کردووەو بەدەستی هێناوە. یان ئەوەی کۆی کردووەتەوە، لە دوای خۆی ئەو کەرەستانەی بەجێهێشتووە کە بەکاری هێناوە بۆ بەرگری کردن لە خۆی لە شوێنی نیشتەجێبوون"[3]، "بەڵگەش ئەو کۆمەڵە ئامرازانەن کە لە (بەردە بەڵکە) دۆزراونەتەوە. لەبەر ئەوە سەیر دەکەین، ئابوورییەکی (مشەخۆری – طفيلي) بووە، لەسەر شێوازێکی ئاژاوەگێری ژیانی رۆژانەی بردووەتە سەر، رۆژ بووە هەوڵی مانەوەی داوە بۆ بەربەرەکانی لە ژیاندا.. پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەنێوانیاندا نەبووە، هەر یەکێك هەوڵی داوە کە خۆی تێر بکات بێ ئەوەی بیر لەوانەی تر بکاتەوە، لەبەرئەوە کۆمەڵ نەبووە بە مانایەکی راست، ژینگەکەشی وای لێکردووە لە گەرمایی و شێداری سروشتەکەی بتوانێت خۆراکی خۆی بەدەست بهێنێت، پاچی دەستی بەکارهێناوە زیاتر بۆ ئەوەی رەگی رووەکی پێ دەربکات، وەکو ئەوەی ئاژەڵەکەی پێ بکوژێت بە پلەی دووەم هاتووە.."[4].

ناوچەکەیان ناوچەیەکی داپۆشراو بووە بەجۆرەها درەخت ودارو چڕی، جۆرەها ئاژەڵی کێوی تێدا ژیاوە" کە توانراوە گەلێك ئاژەڵ لە (بەردە بەڵکە) بدۆزێتەوە وەکو (فیلی هیندی) و (ئەسپی ئاوی)و (بزن)و هەروەها دۆزینەوەی ددانو ئێسکی (گوێ درێژی کێوی)و ئێسکی (ئاسکە).. هەروەها ئێسکی (ئاسکەی سوور)یش دۆزراوەتەوە کە ئەمەو (بزنی کێوی)و (دەشتی)و (شاخداریش) هەر چەندە، شوێنەواریان ئێستاکە لە ناوچەکەدا نەماوە"[5] کە ئەو کاتە هەبوونە، لەبەر ئەمە دەتوانین بگەینە ئەوەی کە سەردەمی (بەردە بەڵکە)، سەردەمی ئابوورییەکی هەڵشە بووە لە هەموو رووییەکەوە، زیاتر مرۆڤ تاکرەوی و خۆ.. خۆی بووە و، تێدا زیاتر بەدوای تێرکردنی ورگێدا گەراوە، وەکو ئەوەی بیر لە جێگیرکردنو بەخێوکردنی ئاژەڵو کشتوکاڵ بکاتەوە.. لەبەر ئەمە زیاتر ئاوەزی بۆ ئەوە چووە کە ژیانی رۆژانەی بەسەر بەرێت تا بەوەی بیر لە رێکخستنی ژیانی بکاتەوە "چونکە بەخێوکردنی منداڵیش زیاتر سۆزی دایکایەتییە کە هەڵی گرتووە"[6]، وەکو ئەوەی پەیوەنییە کۆمەڵایەتییەکە، بەرەو رێکخستنو پەروەردەکردن هەڵیگرتبێ. "ئەگەر سەیری پاچە دەستییەکانیان بکەین، لە سەردەمی (بەردە بەڵکە) دا لێکچوون هەیە لەگەڵ ناوچەکانی رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەراستدا، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ کۆچی راوچییانی لێکچووی وەکو راوچییانی (بەردە بەڵکە)، بۆ ئەو ناوچەیە، لەوانەیە ئەم ناوچانە (وەکو ئەوەی لێکۆڵەرەوەکان بۆی دەچن) هێڵی تەریبی جوگرافیایی کۆچڕەوی بووبێت، کە ئەمە زیاتر بەروونی بەدەردەکەوێت لە سەردەمی (بلایسیتۆنی) دا"[7]. "لەبەر ئەوە مرۆڤی سەردەمی بەردینی کۆن بێکەس نەبووەو کارەکانی لە چەند شوێنێکی تر دۆزراوەتەوە، کە ئەمە وا دەگەیەنێت پەیوەندی هەبووە لەگەڵ مرۆڤی سەردەمی بەردینی کۆنی ناوچەکانی تردا، وەکو ناوچەکانی (سوریا–فەلەستین)، لەبەر ئەمە ئەو لێکچوونەی هەیە لەو پیشەسازییە بەردینانەی کە لە هەردوولادا هەبووە رێکەوت نەبووە، مرۆڤی عێراقی کۆن، پەیوەندی بازرگانی هەبووە لەگەڵ نیمچە دوورگەی (ئەنادۆل)و بەرزاییەکانی (ئێران) دا دەبینین ئەو کەرەستانەی دۆزراوەتەوە لێکچووە وەکو ئەوەی لە ئەشکەوتی (بێستون) لە رۆژئاوای (ئێران)دایە یان لێکچوونێکی تەواو هەیە لەزۆری کەرەستەکانیان وەکو ئەوانەی لە ئەشکەوتی (گورایین)ی تورکیا دۆزراوەتەوە کە هەموویان هاوگونجاون لەگەڵ ئەشکەوتەکانی (هەزارمێرد) و (شانەدەر)دا.."[8] لەوانەیە گەلێك شوێنی تر لە ناوچەی کەرکوکدا بدۆزێتەوە، کە هاوسەردەمی بەردینی کۆن بێت، بەڵام تاکو ئێستاکە پشکنینی پێویست نەکراوە بۆ بەڵگەی دیار بۆ دیاریکردنی ئەو راستییە.

*** قۆناغی بەردینی ناوەراست:**

"ماوەی ئەم چەرخەو رووداوەکانی (پلاستیۆنی) دەگرێتە خۆ بە هۆی پاشماوە وردەکانیشێوە بە چاخی (مایکرۆلیکیش) ناسراوە چونکە ئەو ئامرازانەی ئادەمیزاد لەو سەردەمەدا لەبەردو ئێسقان دروستی کردوون پێشکەوتنێکی ئاشکرای پێوە دیارە لە رووی نە فەوتاندنو بایەخ پێدانەوە"[٩]. چاخی بەردینی ناوەراست هەمەرەنگیو تایبەتمەندێتی خۆی هەبوو، لەبەرئەوەی مرۆڤ دەورێکی دیاریکراوی هەیە بۆ بەشداریکردنی کاروباری رۆژانەی کە کەوتووەتە سەری لە چوارچێوەی خێزاندا، هەروەها گەشەکردنی زەوی رووەکی و، لە دوای کۆتایی هاتنی سەردەمی بەستەلەکی کۆندا خواردنیش گۆرانی تێدا هات، کە ئەمە وایکرد. مرۆڤ پشت ببەستێت بەدوو جۆرە خواردنی رووەکیو ئاژەلی.. بەهۆی ئەو پانتاییە رووەکیەی کە بلاوبووەتەوە لەسەرتاپای جیهاندا[١٠].

ئەوەی لێرەدا دەتوانین دیاری بکەین، لە سەردەمی بەردینی ناوەراستدا، ناوچەی (کەریم شایەر)ە، کە پانتاییەکەی دوو (ئێکر)ن دەبێت "نزیکەی چوار هەزار مەتری چوارگۆشە یان (٤٨٤٠) یاردەی چوارگۆشە دەبێتو دەتوانین (کەریم شایەر) دابنێین بە بنکەیەکی نیشتەجێبوونی نیوە کۆچەری.. کە سەردەمێکی سەرەتاییە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەتەواوەتی ژیانی نیشتەجێبوونی بگرێتە خۆی"[١١]، ئەمە دەمانگەیەنێتە ئەوەی بلێین گەشتی نێوان هاوینو زستانیان کردووە، کە لە هاویندا چوونەتە دەشتاییو لە زستاندا خۆیان لە ئەشکەوت مەلاس داوە[١٢] خەلکی (کەریم شایەر)، هەولی کۆکردنەوەی گەنمی کێوییان داوەو هەولی هەلگرتنیان داوە بۆ کاتی تەنگانەو گواستویانەتەوە بۆ پەناگەکەیان کە ئەشکەوت بووە، بێ ئەوەی بگەنە بەرهەمهێنانی خواردن، کە ئەمەلە دوای ئەواندا روویدا، لەبەر ئەوە دەتوانین ئەشکەوتێکی وەکو (پالە گەورە) بەشوێنی زستانی مرۆڤی (کەریم شایەر) دابنێین[١٣]. جۆری ئەو کەرەستانەی، لەو ناوچەیەدا دۆزراوەتەوە هەمووی لەبەردی رەق دروستکراوە، بریتی بووە لە گەلێك کەرەستەی بەکارهێنراوی ژیانی رۆژانەیان کە بۆ پێویستی بەکارهاتووە، جۆری کەرەستەکان بریتی بووە لەبەردی دەستارو شفرەی (داس)و بێلی بەردی[١٤].. هەروەها (تەوری بەردی)و (بالتە)یش بەکارهاتووە، زیاتر داسەکە بۆ برینی زەلو قامیش دەوری بینیوە لە کاری بیناکاری لە شوێنەکەیدا، هەروەها ئەو ئاژەلانەی کە بەخێویان کردووە زیاتر ئەوانە بووە کە بۆ مالیکردن دەستی داوە، هەرچەندە بەتەواوەتیش مالیی نەکرابێت[١٥]. ئەو کەرەستانەی شتی پێ دروستکراوە بەردی ئەستێ (صوان) بووە کە کەرەستەیەکی باوی ئەو کاتە بووە بۆ دروستکردنی گەلێك شتو کەرەستەی بەردی وردی جۆربەجۆر[١٦].. لەبەر ئەوە زیاتر ئاوەزیان بۆ دەورووبەرییان بری کردووە وەکو ئەوەی بیرکەنەوە لە هەنگاوی تر لە رووی بازرگانییەوە، تا بەهێنانی لە ناوچەکانی تر کە لە دوای ئەواندا ئەم کەرەستەو ئامرازانە گۆرانی بەسەردا هات.. بۆیە بەسەدەیەك لە بواری گەشەکردنی کشتوکالو بازرگانیو پیشەسازی دادەنرێت، کە لەپێش ئەواندا ئەم شتانە تەنها رێکەوت دروستی کردبوو. لەبەر ئەوە دەتوانین (کەریم شایەر) بەهەنگاوێکی سەرەتایی دابنێین بۆ ئەو قۆناغە، چونکە دەکەوێتە نێوان سەردەمی (پالە گەورە)و (چەرموو)دا[١٧].

*** چاخی بەردینی نوێ:**

لە دوای ناوچەکانی (کەریم شایەر) قۆناغێکی تر گەشەی کرد، ئەویش ماوەی بەردینی تازەیە، کەتێیدا گوندی (چەرموو) بالادەستە (لەبەرئەوەی گوندی چەرموو بەنموونەی یەکەمین نیشتەجێبوونی جوتیاری دادەنرێت لە کوردستانی عێراقدا، کە کۆنترین نموونەی نیشتەجێبوون بووە لەو سەردەمەدا لە جیهاندا[١٨]، ئەم دێیە لەسەردەمی بەردینی کۆنەوە مۆلگای ئادەمیزاد بووە، لەسەردەمی بەردینی نوێشدا دەغلودانیان تۆوکردووە.. یەکەمین دێی کشتوکالیو شوانکارییو بەنەژادی یەکەمین لانکەی رەسەنترین شارستانیەت لە هەموو جیهاندا[١٩] دەژمێردرێت لە ئەنجامی هەلدانەوەی پشکنینی ئاسەواری ئەم گوندەدا دەردەکەوێت لەسەر رووبەری زەوییەکی (١٤٠٠م)[٢٠] دامەزرابوو. لەبەرئەوە گوندی (چەرموو)وەها لەقەلەم دراوە کە (٤٧٥٠) سال پێش زایین دروستکراوە یان (٦٥٠٠) سال پێش زایین[٢١] هیچ گومانێکی تێدا نامێنێت کە فەرمانی ئابووری ئەم دێیە بەرادەیەکی گەورە کشتوکال بووە، خۆ ئەگەر ئەوەش بلێین کە (٩٥)٪ی ئەو ئێسکانەی لەوێدا دۆزراونەتەوە ئێسکی گیانلەبەری مالی بووە وەکو (بزن)و (مەر)و (سەگ)و (بەران)و (مانگا)، ئەوا چاکتر بۆمان روون دەبێتەوە کە ژیانی ئەم گوندە ژیانی کشتکاری بووە، واتە مرۆڤی (چەرموو) خۆراکی خۆی بەرهەمهێناوەو ئەو سەردەمەیش کە تێیدا ژیاوە قۆناغی زووی (سەرەتایی) وەبەرهێنانی خۆراك بووە..[٢٢] کشتوکال تاکرەو بوو، هەر خێزانێك بایی خۆیو ئاژەلەکانی تۆوکردووە، پیشەگەری پسپۆر نەبووە، هەموو ئامێرو ئامرازەکانی خۆی دروستی کردووە، بەلام ئافرەت سەرەرای مندال بەخێوکردن دانەوێلەی کۆکردووەتەوەو گاوگۆتالی خزمەتکردووە، پیاویش راوی کردووە، دەغلودانەکەی پاراستووەو کەرەستەی دروستکردووە.. کاتی جووتکردن، تۆوکردنو درەوکردنیشیان زانیووە، پشتیان بەوەرزەباران بەستووە، ئەو ئێسکە ئاژەلانەی لە (چەرموو) دۆزراونەتەوە دوای راگرتنی سەگ، بزنیان بەخێوکردووەو[٢٣] خواردنی سەرەکی (چەرموو) بوو[٢٤]، هەروەها پاشماوەیەکی زۆری (بەران) دۆزراوەتەوە کە بەراورد بکرێت لەگەل پاشماوەکانی تردا، لەوانەیە لە ئاستی پاشماوەی (مەر) بووبێت، هەرچەندە بەلگەمان نییە کە هەولی مالیکردنیان دابێت تەنها ئەو ددانەبچکۆلانە نەبێت کە لەچینەکانی سەرەوەی (چەرموو) دۆزراونەتەوە[٢٥]، دەتوانین بلێین کە (چەرموو) ناوچەیەکی راوشکار بوو بۆ مرۆڤ چونکە دەورووبەرە گژوگیاییەکەیو دارستانو زنجیرە چیاکانی دەورووبەری وایانکردووە کە شوێنی راوی (مانگای کێوی)و (ئاسکە)و (شێر)و (ورچ)و

(بەرازی کێوی)و (گورگ)و (ڕێوی) کردووە، هەرچەندە کە ئێستا بەشێکی لەمانە نەماوە لەبەر نەبوونی درەختو گژو گیا لەناوچەکدا[٢٦].

(گەنم)و (جۆ)و (نیسك)یان تۆوکردووە، لە پێناوی وزەی چەوریشدا (بستە)یان چاندووەو بەرووشیان چنییووە، لە پێشا جۆرە گەنمێکی بەژی (بری)یان تۆوکردووە، پاشان جۆرێکی باشتریان بەرهەمهێناوە کە بە (ئیمەرۆیت)[٢٧] ناسراوە، گوڵە گەنمەکەیان لەو شێوەیە بووکە تۆوەکەی دوو ریز بووە، کە زیاتر لەگەنمی بەژی نزیك بووە[٢٨]. هەروەها هەوڵی چاکترکردنیان داوە لە جۆری ئەو گەنمانە[٢٩]. جۆرە جۆیەکیشیان تۆوکردووە کە بە (هەلیدتۆ) ناسراوە[٣٠]. دوو جۆرە (جۆ)یان تۆوکردووە گوڵەکەی دوو ریز بووەو ئەویتر شەش ریز بووە[٣١]. لەو ئامێرو ئامرازە کشتوکاڵییانەی (چەرموو) کە دۆزراونەتەوە بریتی بووە لە: (پاچ)، (تەشوێ)، (دەستار)، (ئاوان)، (جۆتی)و دەسکەکەی، (هەوجار)، (مێ کووت)، (دنگ)، (کەندوو)، (داسوولکە)، (بێل)، (داس)، کە لە قوڕو بەشێکی لەبەردە ئەستیو بەردی نەرم دروستکراون بەزۆریش گەورەو رێکوپێکنو نارێکیشیان تێدایە. هەندێکیش شێوەی ئەندازەیان هەیە، شەنەیەکی بەردینی چوار لقیان لێ دۆزیوەتەوە، لقەکانی لە شێوەی دەمە داس دان بەجۆرە تیرێك نێوان کلکەکەیو لقەکانی قایم کراون، بەڵام کلکەکەی نەدۆزراوەتەوە[٣٢].

یەکەم پەرستنێك کە سەرنجی ڕاکێشاوە، لە کۆمەڵگای کشتکاری، پەیوەندییەکی بەتینی بووە بە زەوییەوە، ئەویش پەرستنی خوداوەندی دایك بووە. لە چەرمووا گەلێك کۆتەڵی قووڕین دۆزراوەتەوە کە بەڵگە لەو خوداوەندە دەکەن، لەبەرئەوەی پەرستنی دایك تایبەتە بەبیروباوەڕی کۆمەڵگای جووتیارییەوە لەو سەردەمانەدا[٣٣]. لە سەردەمی (چەرموو)دا گۆڕانێکی گرنگ ڕوویدا ئەویش سەرهەڵدانی ئاڵووگۆڕی کەرەستەی ئامرازەکان بووە کە لەسەردەمەکانی پێش ئەواندا بەرچاو ناکەوێت "چونکە دەبینین ئەو ئامرازانەی کە لە پێشدا دروستکراوە هەموویان لە بەردی ئەستی بووە کە کەرەستەیەکی باوی ئەو سەردەمە بوو، لەو ناوچانەدا بەدەستی کەوتووە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەو کەرەستەو ئامرازە بەردینانەی (چەرموو) کە دۆزراوەتەوە تێیدا (شووشەی بورکانی) لە دروستکردنیاندا بەکارهاتووە لەبەر ئەوە هەریەکە لە(چەرموو)و (کەریم شایەر) جیاوازییان هەیە لە دروستکردنی کەرەستەو ئامرازەکانیان لەبەر بوونی شووشەی بوورکانی، نزیکترین شوێن بۆ هێنانی شووشەی بوورکانی، چەند میلێك دوورە لە (چەرموو)، لە باکوور لە نزیك نیمچە دوورگەی (وان)ە، دەگەینە ئەوەی کە ئەم شووشەیە هێنراوە بۆ (چەرموو)، ئەمەش قوناغێکی نوێیە کە بازرگانیو ئاڵووێرە لە چەرمووودا"[٣٤]، "لە ڕوانگەی (ئارکیۆلۆژیشەوە)، لێ تۆژەروەکان بەرایی ئەم چاخەیان بە پیشەسازی گڵێنە لە چاخە بەردینییەکانی دی جیاکردووەتەوە، تا ئەوەی گڵێنە بوو بەهۆی جوداو ناسینەوەی هەوارنشینەکانی چاخی بەردینی نوێ خۆیشی"[٣٥].

*** هۆیەکانی گەشەکردنی ژیانی کشتوکاڵی لە چەرمودا:**

١. بوونی ئاووهەوایەکی گونجاو لە بارینی بارانێکی زۆر، ئەمە وایکردووە مرۆڤ بیر لە نەبوونی کانیو ڕووبارێکی زۆر نەکاتەوە بیری لە دەستکەوتنی ئاو نەکردووەتەوە بۆ پێویستییەکانی ژیانی، کە ئەم هۆیە نەبوایە لەوانەبوو نەبوایەتە یەکەم گوندی کشتوکاڵیو ئەو ئاوبانگەی نەبوایە.

٢. بوونی چڕی دارو دارستانو گژوگیاو کۆتەڵی زۆر لە ناوچەکە، ئەمە وایکردووە بارێکی گونجاو بووە بۆ بیرکردنەوەی بۆ ئەوەی بتوانێت چاکترین بەروبوومی کشتوکاڵی هەڵبژێرێتو تاقی بکاتەوە، هەروەها مۆڵگەی پەروەردەکردنی ئاژەڵ ڕاو بووە، ئەمەیش وایکردووە ڕاوکردنەکەی مسۆگەر بێتو کۆچ نەکات بۆ ناوچەکانی تر بەدوای ڕاودا.

٣. بوونی سەردەمێکی لێك نەپچڕاو هەر لەچاخی بەردینی کۆنەوە بۆ چاخی بەردینی نوێ، کە ئەمە وایکرد خەڵکی (چەرموو) بەربەرەکانی بکەن بۆ ژیانێکی باشترو بتوانن بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ بن چونکە بوونی ئەم بەربەرەکانییە هەرچەندە کە دەورووبەرەکەیان دەوری بینیبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا تواناو ئاوەزی خەڵکی (چەرموو)یش دەوریان بینیوە بۆ چاکترکردنی ژیانیان، کە بوونی بەدەردەکەوێت لە چینە کۆنەکانی کە لەچەرمووودا دۆزراوەتەوە.

٤. بوونی بازرگانی هۆیەکی دیاریکراوە لە گەشەکردنی ناوچەکەدا، گواستنەوەی شارستانییەکەیانو شارەزابوونیان بە شارستانی ناوچەکانی دی، وایکرد کە ببێتە هۆیەکی گرنگی گەشەکردنو پەلهاویشتن بۆ ناوچەکانی دەورووبەریان، چونکە ئەو بەڵگانە وا دەسەلمێنن کە چاککردنی گەنمو جۆو بوونی جۆری چاك تێیدا هەنگاوێکە بۆ ڕاکێشانو بایەخدان بە ناوچەی (چەرموو).

٥. ڕاکێشانی کەرەستەو ئامرازی تازە، بایەخدان بەخۆیان لە دروستکردنیان، هەنگاوێکە بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر ئاوەزی خۆیان بخەنە کار بۆ چاکترکردنی باری ژیانیانو جۆری کەرەستەکانیان.

٦. بەرهەمهێنانی بژێوی کشتوکاڵو ماڵیکردنی ئاژەڵ، هۆی لەرادەبەدەر، پڕ بایەخ بوونی ئادەمیزادیان لە ژیانی کێویایەتیو چۆڵپەرستیو چاخەکانی بەردینی کۆن بۆ ژیانێکی پێشکەوتوو گواستەوە، ڕاستیش ئەوەکانی ئاخرونۆخری چاخی بەردینی نێوڕاست زەمینەی ئەو شۆڕشە ئابوورییەیان خۆش کرد[٣٦].

٧. جێگیربوونیانو دروستکردنی خانووی سەرەتایی هەنگاوێك بوو بۆ ئەوەی واز لەسەردەمی چاخەکانی پێشوو بهێننو بیر لە جێگیربوون بکەنەوەو بیرکردنەوە لە بیناکاری جۆرێکە لەو هۆیانەی دەتوانین بڵێین کە بتوانن هەرەس بەهەموو ئەو گرفتانە بهێنن کە ڕێگا لە نیشتەجێبوونیان بگرێت.

* ناوچە ئاوەدانەکانی هاوسەردەمی (چەرموو و نموونەی چەرموو):

دەتوانین گەلێك شوێنی ئاوەدانی ئەو سەردەمانەی چەرموو و دوای چەرموو دیاری بکەین کە لەکاتی خۆیدا ئاوەدان بووە یان دەستی گەشەکردنی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵانی پێکەیشتووە.

ئەو ناوچە ئاوەدانە کشتوکاڵییانەی کە بەدەستمان گەیشتوە.. گردی (قادیشی گەورە)و (قادیشی بچووك) کە بریتی بوونە لە چەند گردێکی دەوروبەری (گاسوور - نووزی).. هەروەها دۆزینەوەی گردی (مەتارە) لە نزیك (تازەخورماتوو)و (کەرکوك)دا. دەگەڕێتەوە سەردەمە ئاوەدانەکانی (حەسونە)و (سامەرا)و (عوبێد)، لە دەوروبەری(٥٠٠٠ - ٤٠٠٠) ساڵ پێش زایین "کە پاشماوەکانیشی لەگەڵ پاشماوەکانی حەسونە زیاتر پێك دەچن"[٣٧]، لەگەڵ دۆزینەوەی گردی (ماحوز - مادهۆز)، بریتییە لە دەشتاییەکی تەخت لەنێوان (کەرکوك)و (حەویجە)دا لە دەوری سەردەمەکانی پێش زایین، لە کاتی هەڵکۆڵین و پشکنیندا، کەناڵێکی (قناة) ئاودێری لێ دۆزراوەتەوە.

دەتوانین ئەم ناوچانەی سەرەوەی دەوروبەری کەرکوك دابنێین بەناوچەیەکی ئاوەدانی سەردەمەکانی پێش مێژوو لە رووی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و ئاودێرییدا، هەرچەندە کە تا ئێستا سەرچاوەکانمان جێگەی تێروتەسەلی باسەکەمان نییە. ناوچەیەکی وەکو (مەتارە)، بەناوەندی شارستانییەتی (حەسوونە) و(سامەرا) دادەنرێت، هەروەها شوێنێکی بەناوبانگی بەرهەمهێنانی (جۆ) لە (مەتارە)دا مانای گوێزرانەوەی ئەو بەرووبوومە بووە لە (چەرموو) وە بەرەو ناوچەکانی تری دەوروبەری (کەرکوك)، چونکە بوونی ئەو بەروبوومانە لەو ناوچەیەدا مانای گوێزرانەوەی ئەو بارە ئابوورییە بووە بۆ ناوچەکانی تر.

"زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە دەگەیەنن کە (جۆ) لە ناوچەی (چەرموو)و (مەتارە)وە گوێزراوەتەوە بەرەو خوارووی (عێراق)، کە ئەمەش سەرەتایەکی بازرگانی ناوخۆیی ئەو کاتە بووە بەرەو خوارووی عێراق"[٣٨]، "چونکە لەبەرئەوەی نرخی هەرزانتر بووە لە (گەنم)و لە پێش گەنمیش بەدوو هەفتە دێتە بەرهەم و دەدورێتەوە"[٣٩].

* بەرووبوومە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکان و پیشەسازییەکانی پێش مێژوو:

* بەروبوومە کشتوکاڵییەکان:

١. (گەنم): دەتوانین بڵێین کە هەردوو شێوەکەی دۆزراوەتەوە لە گەنمی بژی (بری)و گەنمی خۆماڵی، هەروەها دوو جۆرە گوڵی گەنم دۆزراوەتەوە، کە یەکێکیان گوڵەکەی دوو ریزبووەو ئەویتریان شەش ریزە بووە.

٢. (جۆ): لە هەموو ناوچەکاندا جۆ هەبووە لە دوو شێوە ریزی گوڵ، کە یەکێکیان دوو ریزبووەو ئەویتریان شەش ریز بووە. کە بەرهەمێکی بەنرخ بووە لە دوای گەنم.

٣. نیسك.

٤. نۆك.

٥. بستە-چەورکە.

٦. ماش.

٧. قامیش و زەل.

٨. بەڕوو.

* بەرووبوومە ئاژەڵییەکان:

١. مەڕ.

٢. بزن: کە بزنی (کێویش) هەبوو، هەندێکی شاخ درێژ بوو.

٣. سەگ.

٤. گورگ.

٥. رێوی.

٦. ورچ.

٧. ئاسك: کە جۆری ئاسکی کێویش یان شاخداریش هەبووە، نموونەی ئاسکەی رەنگ سووریش هەبووە.

٨. فیلی هیندی.

٩. گوێ درێژ.

١٠. بەراز: نموونەی کێویش دۆزراوەتەوە.

١١. گا و مانگا: لەگەڵ جۆری مانگای کێویش.

* بەروبووم و کەرەستەی پیشەسازی:

مرۆڤ لەوکاتەدا نەگەیشتبووە ئەوەی کە بەرهەمە پیشەسازییەکان بەکاربهێنێت بەشێوەیەکی فراوان و بتوانێت بەو کەرەستانە بەرهەمەکانی خۆی پێ بەرهەم بهێنێت، زیاتر پەلی بۆ ئەوانە هاویشتووە کە لەبەردەست بووە.

ئەوەی بزانین جۆرە قیرێکیان بەکارهێناوە بۆ لکاندن هەروەها (بەردی بورکانی، شووشەی بورکانی)یان بەکارهێناوە لە دوای چاخی بەردینی ناوەڕاستەوە، سەرهەڵدانی پیشەی گڵێنە و دروستکردنی لە (چەرموو)دا هەنگاوێك بوو بۆ ئەوەی جۆری نموونەی گڵێنەی لە گەلێك شوێندا بدۆزرێتەوە لە (چەرموو)و (تەپە سەراب) لەلای (کرمانشان) دەگەڕێنەوە هاوسەردەمی چەرموو[٤٠].

سەرهەڵدانی چاخی (بەردینی - کانزایی) لە ناوچەکانی (حەسوونە)و (سامەرا)و (عوبێد)دا، بوو بەهۆی پێکەوەلکان و ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەم و کەرەستە کانزاییەکان لەگەڵ ناوچەکانی (مەتارە)و (ماحوز)و (قادیشی گەورە) و (قادیشی بچووك)، هەر بەهۆی ئەمەوە بووە کە بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئاڵوگۆڕە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی سەردەمەکانی پێش مێژوو.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧٠)، کانونی یەکەم، ١٩٨٨ ساڵی حەوتەم، لاپەرە (١٤٢)، عەبدولفەتاح عەلی یحیا، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی (کردستان مهد حضارة العصر الحجري الحديث، القسم الثاني والأخير).
٢. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، ساڵی (١٩٨٧) لاپەرە (٨٩)، فوئاد حەمە خورشید، مەریەم عەزیز، (کوردستان لە دوای چاخی سەهۆڵبەندانەکە).
٣. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٣، تشرینی یەکەم، ساڵی ١٩٨٣، لاپەرە ١٣٥، کەمال نوری معروف، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (مواقع اثرية في كردستان بەردە بەڵکە).
٤. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٣، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٣٦.
٥. (حضارة العراق)، کۆمەڵێك نووسەر، بەرگی دووەم، ساڵی ١٩٨٥، بەغداد، لاپەرە (١٨٩-١٩٠).
٦. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٣، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٣٥.
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٣٦.
٨. (العراق القديم)، جۆرج رۆ، وەرگێرانی: حوسێن عەلوان حوسێن، پێداچوونەوەی دکتۆر فازل عەبدولواحید عەلی، ساڵی ١٩٨٤، (دار الثقافة للنشر)، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا، لاپەرە ٧٤.
٩. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٣٧، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٦٣.
١٠. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، کانونی دووەم، ساڵی دووەم، ١٩٨٣، لاپەرە ١٤٥، کەمال نوری مەعروف، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی (مواقع الأثرية في كردستان).
١١. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧٧.
١٢. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٤٦.
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٤٦-١٤٧).
١٤. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٧٧.
١٥. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٤٦.
١٦. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٤٧.
١٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٤٧.
١٨. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٧، هەمان سەرچاوی پێشوو لاپەرە ١٤٦.
١٩. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، کانوونی یەکەم، ساڵی ١٩٧٦، لاپەرە ٣٥، رەزا شوان، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی: (یەکەمین لانکەی رەسەنترین شارستانییەت).
٢٠. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١١٤، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٨٦.
٢١. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٨٩.
٢٢. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٩٠.
٢٣. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٥.
٢٤. گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەمو دووەم، جلدی بیستو نۆهەم، ساڵی ١٩٧٣، لاپەرە٧.
٢٥. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٢.
٢٦. (آثار بلاد الرافدين)، سیتون لوید، وەرگێرانی سامی سەعید ئەحمەدی، بڵاوکردنەوەی (دار الرشيد للنشر)، ساڵی ١٩٨٠، چاپخانەی (دار الطليعة للطباعة والنشر).
٢٧. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣٥.
٢٨. (حضارة العراق)، بەرگی دووەم. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٥٤.
٢٩. (تاريخ حضارة وادي الرافدين في ضوء مشاريع الري والزراعة والمكتشفات الأثارية والمصادر التاريخية)، دکتۆر ئەحمەد سووسە، بەرگی یەکەم، بڵاوکراوەی (دار الحرية للطباعة)، بەغداد، لاپەرە ١٠٨.
٣٠. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، لاپەرە ٣٥.
٣١. گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەمو دووەم، جلدی بیستو نۆ، ساڵی ١٩٧٣، لاپەرە ٧.
٣٢. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٥٥-٥٦)، لاپەرە ٣٥.
٣٣. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٧٠، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٤١.
٣٤. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٦، هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ١٤٧.
٣٥. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٣٧، لاپەرە ٦٤.
٣٦. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦٣.
٣٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٦٥.
٣٨. (حضارة العراق)، بەرگی دووەم، لاپەرە ١٦٣.
٣٩. هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١٦٣.
٤٠. (تاريخ الشرق الأدنى القديم ايران والأناضول)، دکتۆر سامی سەعید ئەلئەحمەدی، رەزا جەواد ئەلهاشمی، (وزارة التعليم العالي والبحث العلمي)، لاپەرە ٤٢.

**تەوەری دووەم**

*** سەردەمە مێژووییەکان:**
*** هاوسەردەمی گۆتی.. لۆلۆیی.. سۆمەری.. ئەکەدی:**

دوای ئەوەی لە سەردەمەکانی پێش مێژوودا بناغەی یەکەم گوندی کشتوکاڵی سەری هەڵدا، لە ناوچەی (چەمچەماڵ)ی سەر بە کەرکوك، هەروەها گەشەکردنی شارستانییەتی (حەسوونە، سامەڕا، عوبێدی سەروو. مەتارە. قادیشی گەورەو قادیشی بچووك)، ئەمانە هەموی هەنگاوبوون بۆ گەشەکردنی باری ئابووری لە سەردەمە مێژووییەکاندا، ئەو شارستانییەتیە گوێزرایەوە بۆ هەموو ناوچەکانی دەوروبەری شاری کەرکوك. تێیدا مرۆڤ گەلێك هەنگاوی خێرای نا بۆ ئەوەی بتوانێت باری ژیانی چاك بکات و، هەوڵ بدات کە کەرەستەی نوێو جوانکاری تازە بهێنێتە گۆڕێ کە لەگەڵ باری نوێدا بگونجێت.. چونکە یەکەم جوانکارییەك کە دروستی کرد تۆوکردن بوو ئینجا فێربوونی زمان کە هەنگاوێکی تربوو بۆ ئەوەی بتوانێت تێیدا زمان دیاری بکات لە دیاریکردنی کەرەستەکانو جیاکردنەوەیان لە یەکتری.
"هەر لە کاتی شارستانی (چەرموو)شدا، شارستانییەتی خوارووی میزۆپۆتامیا لە (حەسونە)ی نزیك (موسڵ) (تل صوان)ی نزیك (سامەڕا)دا دەستپێدەکات کە وێنەیەکی شارستانی (چەرموو)ن. کاری گڵێنەو گڵکردن لە کۆنینەکانیان دەدۆزرێتەوە کە بێگومان ئاشکرایە وێنەی شارستانی (چەرموو)ەو دیارە ئەو نەتەوانەی (چەرموو) هەر لە ژووروی میزۆپۆتامیادا گیر نەبوونو بڵاونەبوونەتەوە بۆ گوێی رووبارەکان بەرەو خوار"[١].
جا بەو پێودانە.. شارستانییەتی (گۆتی)یەکان هەبێتو نەبێت بەرەو چاکتر گۆڕانو لە درێژی دانی شارستانییەتی پێشەوەی (چەرموو)، چونکە کۆمەڵگای کشتوکاڵی (چەرموو) بەرە.. بەرەو هەنگاو بەهەنگاو بەرەو چاکتر گۆڕاوەو بوو بە کۆمەڵگەیەکی شارستانیترو پێشکەوتوترو ئەنجام شارستانێتی گۆتییەکانی لێهاتەدی، گۆتییەکان جۆرە سوێندخۆریو یەککرتنێکی خێڵەکیو هۆزایەتییان ساز دابوو ملکەچی فەرماندەیەکی (ئۆروستوقراتی) بوون کە بۆ ماوەیەکی کورتی دیاریکراو بە پاشا هەڵیانبژارد[٢].
لەبەر ئەوە هاتنە خوارەوەی گۆتییەکانو دابەزینیان بۆ ناوچە تەختاییە بەپیتەکانی (کەرکوك)،و (ئەراپخا)یان کردە بنکەی فەرمانڕەواکەیان[٣].. توانیان ماوەیەکی چاك قەڵەمڕەوی ناوچەکانی (کەرکوك)و وولاتی (ئەکەد)و (سۆمەر) بکەن، بتوانن بەربەرەکانی بکەن بۆ مانەوەییان لەناوچەکەدا.
ئەو بناغە سەرەتاییە کشتوکاڵییەی سەردەمەکانی پێش مێژوو کە روویدا دەبوایە گۆڕانی بەسەردا بهێنرێت بۆ بارێکی باشتر چونکە مانەوە لەو قاوغە تەسکەدا، بارە ئابوورییەکەی نووشست دەهێنێتو ناتوانێت گەشەی گونجاو بکات.

*** چەند هۆیەك دەور دەبینین بۆ ئەو گۆڕانە ئابوورییە لەوانە:**

*** گۆڕینی باری ئاوو هەواو ژینگەی سروشتی[٤]:**
ئەو ئاوو هەوایەی کە لە سەردەمەکانی (چەرموو)دا رەخسابوو، تا رادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتو ژینگەکە بەرەو جیاوازی ئاوو هەوا گۆڕدرا، ئەمیش وای کرد مرۆڤەکانی سەردەمەکانی پێش مێژوو بیر لە جێگەی نوێ بکەنەوە لە بارتر بێت بۆ سازادانی ئابوورییەکی لەبار، ئەویش بە بەکارهێنانی ئاوەز لەلایەن مرۆڤەوە بۆ چاککری باری ئاوو هەواکەی دەوروبەری.

*** پاڵە پەستۆی ئابووری وای کرد مانەوە لەسەر یەك پیشە مەحاڵ بێت[٥]:**
لەبەر ئەوەی ئەو پیشە کۆنانەی کە لە سەردەمەکانی پێش مێژوودا گەشەی کرد، پێویستی سەردەمێکی دیاری کراوبوو، کە لەگەڵ سەردەمی چەرمووودا دەگونجا، بەڵام سەردەمە مێژووییەکان پێویستیان بە پیشەی ترو گونجاو تر بوو تا بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ سەردەمە مێژووییە بڵاوەکانی تردا.

*** "هەروەها بە تاقیکردنەوە روویدا، کە چاکتر وایە کار بکرێت بۆ پیشەیەك کە زۆرتر هاوگونجاو بێت:**
لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە مرۆڤی تێدا دەژێت، چونکە مرۆڤ ئارەزووی گۆڕینی شێوازەکانی ژیانی ناکات ئەگەر بێتو پێویستیو ئارەزووەکانی جێبەجێ بکات بۆیە شێوازەکان دەگۆڕێت تا بۆ ئەوەی ئارەزووەکانی بێتە دێ.."[٦].
ئەوەی لە سەردەمە مێژووییەکاندا سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە گۆڕانە مێژووییەکان پێویستیان بە شێوازی نوێو جۆر بە جۆر بووە بۆ ئەوەی بتوانێت هاوسەنگ بێت لەگەڵ ئارەزووەکانیدا، چونکە ئەو کەرەستەو ئامرازە کۆنانەی سەردەمی (چەرموو) جیاواز بوو لەگەڵ سەردەمی (گۆتی، لۆلۆیی، سۆمەری)یەکاندا، پێویستی بەوە دەکرد کە مرۆڤ هەوڵبدات ئەو شێوازانە بگۆڕێت بۆ بارێکی هەمە چەشنەو باشتر.

*** لەبەر ئەوە هاتنی (گۆتی)یەکان بۆ ناوچەکە چەند هۆیەکی ئابووری هەبووە:**
١. ناوچەکە شوێنێکی کشتوکاڵیو دەشتایی بە پیتو بەرەکەت بووە، لەبەر ئەوە لەناوچەکانی سلێمانیو چەمچەماڵەوە کشاون بەرەو ئەو تەختاییە بە پیتو بەرەکەتە. ئەوەی زیاتر بناغەی ئەم هۆیە دەسەپێنێت جێگیر بوونیانە لە دەشتاییەکانی لای زێی بچووك، ئەو کاتە ئەو شوێنە بە پیتو بەرەکەت بووە، یان ناوچەی (گاسوور) کە لە دوایدا (سۆمەریو ئەکەدی)یەکان داگیریان کرد، چونکە بوونی ئەو ناوچە بە پیتە وای کردووە ببێتە گۆڕپانی بەربەرەکانی گۆتیو سۆمەریو ئەکەدییەکان.

هەروەها بوونی ئاو لە ناوچەیەکی وەك (زێی بچووك) ئەو کاتە شوێنێکی بە پیت بووە، یان ناوچەی (گاسوور) گرنگی شوێنەکەی بۆ ئاودێریو بوونی ئاو ڕاستی بۆچوونەکەمان دەسپێنێت.

٢. لەوانەیە لە سەرەتادا هێزێکی سیاسی بەهێز نەبووە یان هەبووە ئەو توانا بەهێزەیان نەبووەو گۆتییەکان بە سەریاندا زاڵ بوونە، چونکە ئەگەر هێزێکی گەورە هەبووایە ئاوها بە ئاسانی گۆتییەکان پەلاماری ناوچەکەیان نەدەداو داگیریان نەدەکرد.

٣. بوونی پاڵەپەستۆ لە ناوچەکانی سەرووی کەرکوكو زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان وای کردووە کە لە ناوچەکانی سلێمانییەوە بکشێن بەرەو ناوچە دەشتاییەکانی دەوروبەری کەرکوك.

٤. گەڕان بەدوای کەرەستەو پیشەی تازە بابەتی تر، بۆیە لە هەوڵدا بوون بۆ بەدەست هێنانی کەرەستەی ئابووری تر.

٥. دەگەینە ئەو ڕاستییە کە بوونی گۆتییەکان لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا هۆیە ئابوورییەکەی زیاتر دەوری بینیوە لە سەرەتادا تا بەوەی لە دوایدا فراوان بوونە سیاسییەکە دەوری بینیوە، کاتێکیش لایەنی سیاسی فراوان بوونەکە بوو بە هۆی کاولکردنی شارەکانو ڕووخاندن، بوو بە هۆی بێزار بوونی خەڵکەکە لە گۆتییەکان.

"سەرجۆنی ئەکەدی یەکێکە لەو پاشا بەهێزانەی کە بتوانێت دەروونێکی وا لەنێوان (سۆمەریو ئەکەدی)یەکان دروست بکاتو زمانی (ئەکەدی) وەکو زمانی (سۆمەری)یەکان بەکار بهێنێ لە تۆمارکردنی نووسراوە میرییەکاندا"[٧].

"سەرجۆن هەموو شارەکانی سۆمەری خستە ژێردەستی خۆیەوەو خۆی کەوتە فەرمانڕەوایی کردنی شارەکانو لە ناودانی ئاژاوەو گێچەڵی (سەلاڵەتی سۆمەری)"[٨].

پاش ماوەیەك هێزێکی سەربازی گەورەی پێك هێنا، لە دوایدا کەوتە هێنانی هێز بەرەو ناوچەکان، لە ڕووباری (دیجلە) پەڕیوە بەرەو (ئێران)، لەسەر ڕووباری (فورات)ەوە بەرەو (سوریا)و هێزێکی تری کۆکردەوە بەرەو سەرووی (میزۆپۆتامیا) لەسەر درێژی ڕووباری (دیجلە) تاکو گەیشتە (موسل)[٩]. لە دوایدا ڕووی کردووەتە بەشە وڵاتەکەی (گۆتی)یەکان، هەروەها (سەرجۆن) لەشکری ئەوانیشی شکاندووەو لەوناوەدا دەسەڵاتی گۆتییەکانی نەهێشووە.

سەرچاوەیەکی زۆر گەیشتووە پێمان باسی ئەوە دەکات کە چۆن ڕژێمەکەی گەیشتۆتە شاری (گاسوور)[١٠].

ئەو سەرچاوانەی کە لە (گاسوور) پێمان گەیشتووە باسی سەرچاوەکانی پیشەسازیو بازرگانی دەکات کە (سەرجۆنی ئەکەدی) زۆر بایەخی پێداوەو تەنانەت گەیشتۆتە (هەولێر)و دەستی گرتووە بەسەر ڕێگا بازرگانییەکانی کە بۆ خوارووی عێراق دێت[١١]. لە دوای مردنی (سەرجۆنی ئەکەدی) دراوسێکانیان هەڵسانو وڵاتی خۆیان فراوان کرد لە قەڵەمڕەوی ئەکەدییەکاندا.

بۆیە (لۆلۆپی)یەکان دەسەڵاتیان بەسەر دەشتی (شارەزوور) دا لە نزیك (سلێمانی) گرتو لە خوارووی ئەواندا گۆتییەکان دەسەڵاتیان گرتە سەر ناوچەی (هەمەدان)و دەوروبەریو ناوەڕاستی چیای (زاگرۆس)ەوە.

لە سووچی خوارووا هۆزە سەرکێشەکانی (عێلام) هەبوو، هەر یەك لەم هۆزانە نێوانیان لەگەڵ (ئەکەدی)یەکاندا باش نەبوو لەبەر ئەوەی دەسەڵاتیان دەڕۆیی بەسەر (ئەنادۆڵ)و (ئەرمینیا)و (ئازەربایجان)دا کە دەهات بۆ (میزۆپۆتامیا). بۆیە ڕێگا بازرگانییەکانیان دەگرت کە دەهاتن بۆیان، وەکو کانزاکانی (مس)و (زیوو)و (زنگ). بە تایبەتیش کاتێك ڕێگای هێنانی (برۆنز) بەسترا، هیچ ڕێگایەك نەمایەوە لە بەردەم ئەکەدییەکاندا ئەویش ئەوەیە یان دەبێت ڕێگایەکی تر بدۆزنەوە بۆ مسۆگەرکردنی هێنانی ئەم کانزایە (عومان یان خوارووی یان ڕۆژهەڵاتی ئێران بە نموونە)، یان هێزێکی سەربازی گەورە بخەنە ڕێگا بەرەو سەروو[١٢].

(نەرام سین) وەکو باپیرەی (سەرجۆن) هەمان ڕێچکەی گرت لە چالاکی سەربازی لە سنوورەکانی دەوروبەری (میزۆپۆتامیا)دا چالاکی سەرەکی دەست پێکرد دژی (لۆلۆپی)یەکانو گەورەترین سەرکەوتنی بە دەست هێنا[١٣] چونکە لە سەرکەوتنەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە چۆن بە لەشکرێکی زۆرەوە ناوچە چیاییەکانی سەرووی ڕۆژهەڵاتی عێراقی داگیر کردووە،تەنها مەبەستیان داگیرکردنی داهاتە پیشەسازییەکان بووە[١٤].

لێرەدا بۆ ئەوەی زیاتر بگەینە ڕاستیە ئابوورییەکان لە کاتی داگیر کردنی (گاسوور) لە سەردەمی ئەکەدی – سۆمەرییەکاندا دەگەینە ئەم ڕاستیانە:

١. ژمارەیەکی زۆر پارچە دۆزراونەتەوە لەو ناوچەیە بەڵگەیە لە پەیوەندییە بازرگانییەکانو ئاڵوگۆڕی سەردەمی ئەکەدییەکان لە ناوچەکەدا.

٢. هەروەها لەتۆمارەکانیاندا دەستنیشانی گەلێك دەزگای بازرگانی دەکات لە وڵاتی (ئەنادۆڵ).

٣. دۆزینەوەی زۆری کەرەستەی کانزاییو مۆری لوولەکیو گڵێنە کە هاوچەرخ بووە لەگەڵ چینەکانی گردی (بەراك) لە خوارووی لە هەمان کاتدا لێکچوون هەبووە لەنێوانیاندا[١٥].

٤. دۆزینەوەی نەخشەیەکی تۆپۆگرافی گەلێك لایەنی ئابووریو شوێنی ئاوەدانو ئاودێری نە دۆزراوی تێدا دیارە لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوك.

*** بەرووبوومە ئابوورییەکانی هاوسەردەمی گۆتی، لۆلۆپی، سۆمەرییەکان:**

١. گەنم.

٢. جۆ:

هەر وەکو ئەوەی دەبینین کە دوو خوداوەندی برا چۆن جۆیان لە چیاوە هێناوە، کە خوداوەند (ئەنلیل) لە عەمباری خستووە[١٦].

٣. نیسك.

٤. نۆك.

٥. ماش.

٦. هەنجیر:

هەر لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا دوو جۆرە هەنجیر باوو بووە کە یەکێکیان بە هەنجیری (سۆبارتۆ) بە ناوبانگ بووە

لەبەر ئەوەی لە کوردستانەوە هێناویانە [١٧]. یان لەوانەیە بە ناوی ئەو هۆزانەوە ناوونراوە کە لە سەرووی میزۆپۆتامیا نیشتەجێ بوونە، بۆیە هەنجیرەکەشی بە ناوی ئەوانەوە بە ناوبانگ بووە.

٧. هەنار.

٨. سێوە.

***هەروەها دەربارەی کانزاکان:**

"ئەکەدییەکان (مسیان) لە ناوچەی (کیماش Kimash) هێناوە، کە کەوتووەتە بەرزاییەکانی خوارووی کەرکوک، لەوانەیە ناوچەی چیای حەمرین بێت. هەروەها جۆرێکی تریان هێناوە لە ناوچەکانی چیای (تۆرس)"[١٨].

لە ناوچەی (حەمرین)دا بەپێی ئەو سەرچاوانەی پێمان گەیشتووە، شارەزاییان هەبووە لە کەرەستەی پزیشکی دا[١٩]. هەر لە سەردەمانێکی زووەوە بەکارهێنانی قیریش بەناوبانگ بوو لە ناوچەکانی دەوروبەری کەرکوک.

*** هاوسەردەمی (ئاشوری- میتانی):**

"دەتوانین کەوتنی (ئور)، لە کۆتایی هەزارەی سێیەمی پێش زایینی بە خاڵی وەرچەرخاندنی مێژووی گەورە دابنێین لە عێراقی کۆندا.. چونکە لەبەر ئەوەی تەنها کەوتنی سەلالەتێك یان ئیمپراتۆرییەك بەس نییە بەڵکو کۆتایی سیاسییەتی سۆمەرییەکانە وەکو نەتەوەیەکی فەرمانڕەوا لە میزۆپۆتامیا دابەش بوو بەسەر چەند مەملەکەتێکی تێکەڵاو لە بچووك وگەورە، گرنگتریان کە دروست بووە (ئەیسن)و (لارسا) لە خوارەوە، (ئاشور)و (ئاشنونا) لە سەروو"[٢٠]، هەروەها سەرهەڵدانی سامییە رۆژئاواییەکان، دەنگدانەوەیەکی قوڵ و بەردەوامی هەبوو لەسەر باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری عێراقی کۆن، چونکە بوو بە هۆی دابەشبوونی فەرمانڕەوای تازەو گۆڕینی هەموو پاشماوەی دەوڵەتە بچووکەکانی شارە کۆنەکان، کە ئەمە وای کرد مرۆڤ و ئاژەڵ و زەوی نەبێتە تەنها موڵکی خوداوەندەکان، هەر وەکو ئەوەی لە سەردەمی ژیانەوەی سەلالەکان و فەرمانڕەوایانی (ئور)ی سێیەمدا رووی دا. چونکە پاشا تازەکان کەوتنە دابەشکردنی زەوییەکی زۆرو بەکرێدانی زەوی پاشایەتی یان زەوی پەرستگاکان، باج وسەرانە لەسەر زۆر لە شارەکان هەڵگیراو، زۆر کرا لە دانیشتووان بۆ ئیش کردن، کۆمەڵگەی جوتیاری بچووك.. بچووك سەری هەڵدا، دانیشتووان سەربەستن و بازرگانی بەرهەمهێنانی سەری هەڵدا[٢١]. ژیانی ئابووری تەنها لە دەستی چینی پاشایی و پەرستگا نەما[٢٢].

هەر یەکە لە دوو مەملەکەتەکەی سەروو (ئاشوور) و (ئەشنونا)، هەردەم ناکۆکی لەنێوانیاندا بوو لەسەر فەرمانڕەوایی رێگا بازرگانییە گەورەکان، کە بە بەشێکی سەرووی (میزۆپۆتامیا)دا دەڕۆیی[٢٣].

(ئەشنونا) دەکەوێتە نێوان رووباری (دیجلە)و (چیای زاگرۆس)، لە رۆژهەڵاتی رووباری (دیالە) بە دەیان میل، لەبەر ئەوە ئەڵقەی لێکدانە لە رێگای پێکەوە بەستنی بەشی سەرووی میزۆپۆتامیا لە گەڵ وڵاتی (عیلام).. پەیوەندییەکی ئابووری و شارستانییەتی بەتینی هەبووە لەگەڵ وڵاتی (عیلام)دا[٢٤]. دەسەڵاتیان درێژ بووەتەوە، بەرەو سەروو کە ناوچەی (کەرکوک)یش دەگرێتەوە[٢٥].

لە دوایدا فەرمانڕەواکانی (ئەشنونا) توانیان (رابیقوم)و (ئاشوور)و (قەبرە) لە (هەولێر)و (ئەشناکۆم) لەسەر رووباری (خابور) داگیر بکەن.. کە هەموو ئەم کردەوانە بۆ داگیر کردنی ئەوەیان بوو تا بتوانن بە تەواوەتی دەست بگرن بەسەر (دۆڵی دیجلە)و (جەزیرەی سەروو)و پاییەکانی چیاییەکانی کوردستان، دروست کردنی پردێك لەسەر (فورات) بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر ئەو رێگا بازرگانییە گەورەیەدا کە سەروو بە رۆژهەڵاتەوە دەبەستێت بە پایتەختەکەیانەوە لەسەر رێگای گشتی بەرەو (سوسە). بەڵام ئەم دەسەڵاتە فراوانییە زۆر درێژەی نەکێشا لەبەرئەوەی مەملەکەتی تر سەری هەڵدا بوونە بەشە فەرمانڕەوایی لەو بەربەرەکانییە بازرگانییەدا لەوانە (بابل)و (لارسا)و (ئاشوور)و (ماری)[٢٦].

دروست بوونی ئاشوور، بەرزبوونەوەی وەکو هێزێکی سەربازی و سیاسی گەورە وای کرد رووداوێکی گەورە بێت لەو سەردەمەدا کە دەوڵەمەند بوو بە رووداوی تازە.. لە شوێنێك دروست بوو، سەری هەڵدا کە رێگای پێکەوە بەستنەوەی وولاتی (سۆمەر)و (ئەکەد) بە کوردستان یان ناوچەی (جەزیرەی سەروو)، چونکە هەر لەسەردەمەکانی (سەرجۆن)و (نەرام سین)و پاشاکانی (ئوور) شوێنێکی ستراتیژی گرنگی هەبووە.. بەڵام (ئاشوور) توانی سەربەخۆیی وەربگرێت لە کاتی رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی (سۆمەری) هەر وەکو زۆربەی شارەکانی تر.

(شەمشی ئەدەدی یەکەم)، توانی (ماری) بخاتە سەر دەوڵەتەکەی و دەتوانین بڵێین دابنرێت بە دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ئاشووری یەکەم (١٨١٤-١٧٨٢)ی پێش زایینی، لەبەر ئەوە (ئاشووری)یەکان توانیان دەست بگرن بەسەر هەموو (دیجلە)و (فورات)دا، فەرمانڕەوایی هەموو سەرووی میزۆپۆتامیایان کرد، لەبەر ئەوە هاتە ناو وڵاتی سەرووەوە (ئاگری بالخ و خاپوور)و هێزەکانی درێژکردەوە بە درێژایی دۆڵی زێ و دەوروبەری (کەرکوك).. لەبەر فراوانی دەسەڵاتی (ئاشوور)ییەکان وای کرد کە (ئەشنونا)ی بێ بەشکرد لە رێگای هێنان و بردن لێی برا، بۆیە ئەمە بوو بە ناوچەیەکی بەربەرەکانی لەنێوان (ئەشنونا)و (ئاشوور) دا، گەلێك جار (ئەشنونا) بە یارمەتی هۆزی (ترۆکۆ) لە کوردستان بەدەرکەوت بەتایبەتی لە دەوروبەری (کەرکوك) [٢٧].

بەڵام وورده.. وورده (ئاشوور)ییەکان توانیان دەست بگرن بەسەر ناوچەکەداو فەرمانڕەوایی بەشێکی فراوانی ناوچەی سەرووی میزۆپۆتامیا بکەن و بتوانن ببنە هێزێکی بە دەسەڵات و خاوەن فەرمانڕەوایی هێڵە بازرگانییەکانی (عێراق)و (سەرووی) میزۆپۆتامیا. هەر لەو ماوەیەدا سەرهەڵدانی دەسەڵاتی (بابلی)یەکان وەکو هێزێکی تری گەورەی خوارووی میزۆپۆتامیا هەنگاوی ناو، بوو بە جێگەی بەربەرەکانی لەگەڵ ئاشوورییەکاندا، بوو بە هۆی ئەوەی کەوا بکەن هەریەکە لەسەر حیسابی ئەوەی تر دەسەڵاتی

خۆی فراوان بکاتو هەوڵی زیادکردنی قەڵەمڕەوەکەی بدات لەسەر ڕێگای هێڵە بازرگانییەکان. (کەرکوك) هەردەم جێگای بەربەرەکانی نێوان ئەم هێڵە بازرگانییانە بووە لەنێوان (ئاشوور)ی‌و (بابلی)یەکاندا، وای لێ هاتووە وەکو ناوچەیەکی ناوەند هەر جارەی لەلایەن دەسەڵاتێکەوە فەرمانڕەوا بکرێت، سەرهەڵدانی (کاشی)یەکانو (گۆتی)یەکانیش لەم بەربەرەکانییەدا وای کرد ببێتە هۆی ئەوەی هێزی تر فرسەت ببینن‌و بتوانن ئەو بێ هێزییەی هەردوولا بقۆزنەوەو قەڵەمڕەوەکەیان بە هێز بکەن، ئەمەش بە ڕوونی بە دەردەکەوێت لە دەسەڵاتی (میتانی–هووری)یەکاندا لە ناوچەیەکی وەکو (کەرکوك).. توانیان تاماوەیەکی چاك دەست بگرن بەسەر ناوچەکەدا، چونکە بەهێزی (بابلی)یەکانو بێ هێزی ئاشوورییەکان لەسەردەمی ئاشووری ناوەڕاست، وایکرد ناوچەیەکی بەتاڵو لاواز لە هەموو لا دروست ببێت، ببێتە هەنگاوی خێرا بۆ (هوری–میتانی)یەکان تا دەست بگرن بەسەر ناوچەکەداو خۆیان بەهێز بکەن، کە ئەمە زۆر بە ڕوونی بە دەردەکەوێت لە گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی میتانییەکانی ناوچەکانی کەرکوك.

*** نەخشە تۆپۆگرافییەکەی کەرکوك:**

"مێژووی نەخشەکە دەگەڕێتەوە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی، نەخشەکە بە زاراوەی (ئەکەدی) تایبەتی نوسراوە لەگەڵ بەکارهێنانی بێژەی (هوری–حوری)، تیادا شوێنێکی فراوانی تێدا دیاری کراوە لە چیاو ڕووبارو گوند، دادەنرێت بە کۆنترین نەخشە لە جیهاندا.."[٢٨].

نەخشەکە تەنها لەسەر ڕووەکەی نەخش کراوە، پشتەوەی بە بۆشی بەجێ هێڵراوە، لە ناوەڕاستی نەخشەکەدا بازنەیەك هەیە کە نووسینێکی لە ناودایە، هەر بازنەیەکی نەخشەکەش شارێك پیشان دەدات، ناوی شارەکە لە ناوی دا نووسراوەتەوە، هەر لە ناوەڕاست لە دەستەچەپی بازنەکەدا ئەم نووسینە هەیە، (BURLO BUR MA٤–A ١٠، BAN کەم) واتا: (١٨٠+١٨٠–٦=٣٥٤ (گان) یاخود (ئیکۆ)ی زەوی چێنراو (گان)یان (ئیکۆ)یەکەیەکی ڕووپێوە، دەکاتە نزیکەی (٣٣٠٠) مەتر دووجار بەمەش هێندەکەی سەرەوە دەکاتە کەمێك زیاتر لە (٣٠٠٠) (ئیکەر)، یاخود نزیکەی (١,٢) کیلۆمەتر دووجار[٢٩].. کە دەکاتە نزیکەی (٤٦٠) مەشارەی عێراقی[٣٠].

"لەوە دەچێت نووسینی دەستە ڕاستی بازنەکە قسەکانی پێشوو تەواو بکات (Sha-at-Ă-za-la) واتا: هی (ئازالا)، ناشزانرێت ئەگەر ئەم (ئازالا)یە شارە یان ناوی کابرایەکە، چونکە ناوەکە لە دەرەوەی بازنەکەی تەنیشتی نوسراوەتەوە، لەکاتێکدا هەموو شارەکانی نەخشەکە لە ناو بازنەکەدا نووسراوەتەوە، لە لای ڕاستی چەقی نەخشەکە ناوی شارێك هەیە کە تەنها هێمایەکەمان باش دیارن ئەوانیش (Bi-ni-za) ڕۆژئاوا (IM-MAR-IU): لە شارەکانی نەخشەکە تەنها یەکێکیان بە تەواوی ماوە ئەویش لەلای ڕۆژئاوایە ناوی ئەم شارەش بەم جۆرەیە (Mash-gan-baol-IĎ-La) واتا (ماشکان بار ئیبلا) ئەگەر بە (سۆمەری) بیخوێنین، یان (ماشکان دوور ئیبلا، Mash-kan-dur-ib-la) بە (ئەکەدی)، ئەشتوانرێت ئەم ناوە بە (شوێنی قەڵای ئیبلا) وەربگێڕدرێت کە ئەم ناوە نزیکە لە ناوی (ئیبلا Ebla) بۆیە لە سەرەتادا بەو زانرابوو، هەبوونی ناوی (ئازالا)یش ببوە هۆی قایم بوونی ئەم بڕوایە.. لە دەقە خوورییەکانی (نوزی) ناوی شارێکی تێدایە! (دوور ئۆبلا) (Dur-ubl) بە پاڵ ئەمەش شارێکی تر هەیە لە دەقێکی سۆمەری کۆندا ئەویش (Dur-ib-la) ئەشتوانرێت ناوی یەکەم بەشاری (ماشکان دوور ئیبلای) نەخشەکەمان بزانرێت، ئەمەش دڵنیامان دەکات لەوەی کە نەخشەکە هی ناوچەیەکی نزیك (گاسوور)ە.

بەرامبەر لاکەی سەرەوە لایەکی ترمان هەیە کە بێ گوومان لای ڕۆژهەڵاتی (IM-KUR)، دوای هێمای دووەم، واتا (کور)و دوای بۆشاییەك نووسینێکی تر هەیە کە بە (با.. Ba) دەست پێ دەکات بەڵام هێماکانی تر شکاون. لە سووچی دەستە چەپی ئەم لایەش، ناوی شارێکی تر دەبینرێت کە لەوانەیە (گوزیا – ad – gou zi) بێت، ناوێکی ڕاستی هەیە لە دەقێکی تری (نوزی)دا، بەڵام لەم نەخشەیەدا تەنها هێمای (ad) بە ڕوونی ماوە"[٣١].

لە سنووری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای نەخشەکە زنجیرە چیایەك دەبینرێت.. لەوانەیە ئەو هێڵە پچڕ.. پچڕەی ناو لاکێشەکە بێت.. هەروەها هێڵ درێژبووەتەوە لە بەشەچەپی نەخشەکە لەسەردرێژی ڕووی سەرووی، وادیارە ئاوەڕۆی ڕووبارێکی سەرەکی بێت کە ڕێی پێ دەچێت ڕووباری زێی بچووك بێت، کە دەڕوات لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا هەروەکو ئێستاکە وایە. ئەو جۆگەیەی کە نەخشەکەی بڕیووە درێژبووەتەوە لە سووچی چەپی ژێرەوەی نەخشەکە بۆ سووچی ڕاستی سەرەوەی نەخشەکە، لەوانەیە ڕووبارێکی کۆن بێت کە لەو ناوچەیەدا هەبووە لە سەردەمی عەباسییەکاندا کە بە ڕووباری (عەباسی) زانراوە، ئێستا لە بەرامبەریدا جۆگەی (حەویجە) دەڕوات، کە ئەم جۆگەیە ناونراوە بە (ڕا–هی–اوم)، مانای (پیت) ئەو (بەرهەم هێنی)، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین سێ لقی بچووك جیابووەتەوە لە جۆگەکە هەموویان ئاو لە ڕووبارە سەرەکییەکە وەرگرن کە ئەمە هاوگونجاوە لەگەڵ ئەو بارە کۆنەی ئاودێرییدا کە لەکاتی دروست کردنیدا چەند لقێکی بچووکی لێ دروست دەکرێت، هەریەکەی بۆ وەرزێکی دیاری کراوە.

بوونی چەند لقێکی لە ڕووباری (عەباسی)ی دەبینرێت کە لە کۆندا هەبووە، پاشماوەی ماوە هەروەکو ئەو ڕووبارەی بە ناوبانگە بە ڕووباری (فیل). بەڵام ئەو لقەی ئاو وەردەگرێت لە جۆگەکە بریتییە لەو لقەی کە درێژ بووەتەوە لە سووچی ڕاستی سەرەوەی نەخشەکە بۆ خوارە، کە لەوانەیە ڕاکێشراوە لە جۆگەکە بۆ ئاودێری کردنی زەوییەکی فراوان لە خوارەوەی نەخشەکە لە دوای زنجیرە چیاکانی ڕۆژئاوا..[٣٢].



نەخشەیەکی تۆپۆگرافی لە نوزی





جۆرێك لە تەندوور لە نوزی



مۆرە لوولەکییەکانی نوزی




جۆرێك لە تەندوور لە نوزی



مۆرە لوولەکییەکانی نوزی

*** سەرنجەكان دەربارەی نەخشەكە:**

١. دڵنیایی لەوەی نەخشەكە هی ناوچەیەكی نزیك شاری (كەركوك)ە، كە بەنیازی ئەوە نەخشەكەی بۆ كێشراوە.. زیاتر ئەوی دڵنیامان دەكات لە بوونی ناوەكان كە لەسەر نەخشەكە ماون.

٢. بایەخ دان بە ئاودێری لەو ناوچەیەدا، هەوڵی ئەوەیان داوە بۆ چاندنی زەوی كشتوكاڵی كە لەو سەردەمانەدا باوبووە.

٣. سەلماندنی ئەوەی ئەو ناوچەیە، ناوچەیەكی بە پیت بووەو دەشتی كشتوكاڵی گرنگ بووە.

٤. بوونی نەخشەیەكی دەگمەن‌و كۆن دەیسەلمێنێت كە ئەو ناوچەیە شارستانییەتێكی گرنگیان هەبووە، شارەزاییەكی چاكیان هەبووە، لەبایەخ دان بە كشتوكاڵ‌و ئاوەدانی‌و ئاودێری.

٥. نەخشەكە ئەوە دەخاتە روو، بایەخێكی ئابووری هەیە لە رووی ئەوەی نەخشەكەی بۆ كێشراوە، چونكە لەوانەیە زەوی‌و زارێكی زۆری كشتوكاڵی ئەو ناوچەیە لەلایەن فەرمانرەواییەكەوە بەرێوە برابێت بۆیە وا بایەخ بەو ناوچەیە دراوە لە دیاریكردنیدا.

*** سەردەمی ئاشوری ناوەراست (دەسەڵاتی میتانییەكان):**

دەتوانین سەردەمی ئاشوری ناوەراست بە سەردەمێكی دیاری كراو دابنێین لە مێژووی كەركوكدا، چونكە ژمارەیەكی زۆر پاشماوەو رەقیمی قوری لێ دۆزراوەتەوە ئەوە دەسەلمێنن ناوچەیەكی ئاوەدانی بازرگانی‌و ئابووری‌و كشتوكاڵی گرنگ بووەو كارتێكردنی چاكی هەبووە بەسەر ناوچەكانی دەوروبەرییەوە.

"لە پێش ئەماندا، ئەكەدییەكان ژمارەیەكی زۆر كێڵگەی كشتوكاڵیان هەبوو كە دانیشتووانی ناوچەكە دەیان كێڵا، بەرامبەر بە بەشێكی دیاری كراو، لە كاتێكدا بەشی خەڵكەكەیان دەدا بە كەرەستەو پێویستی تۆو ئاژەڵ‌و پێویستی تری كشتوكاڵی"[٣٣].

بەڵام لە سەردەمی (هوری)یەكاندا بوو بە پەناگەیەكی تێكەڵاوی سەربازی لە دانیشتووانی هوری‌و ئەكەدی ناوەكەی لە (گاسوور)ەوە گۆرا بۆ (نوزی)[٣٤].

لێرەدا دەتوانین بڵێین كە (نوزی)و (كووروخانی)و (ئەراپخا) هەموویان ناوچەی ئاوەدانی ئەو سەردەمانە بوونەو بەردەوامی سەردەمەكانی (ئەكەدی.. سۆمەری)یەكان بوونە، چونكە هەڵكەوتنی (نوزی)و (كووروخانی) شوێنێكی ئاوەدانی كشتوكاڵی بوونەو سەر بە (ئەراپخا) بوونە، بەڵام تاكو ئێستا سەرچاوەكانمان كەمە دەربارەی (ئەراپخا) لەبەر ئەوەی تاكو ئێستا دەستی هەڵكۆڵین نەگەیشتووە پێی بە شێوەیەكی تەواوو گونجاو، "شوێنی پاشا لە (ئەراپخا) بووە لە (ئال – ئیلانی) تا ئێستا تۆمارەكانی پاشایەتی نەدۆزراوەتەوە تا بۆ ئەوەی زیاتر لێكۆڵینەوەكانمان دەوڵەمەند بكات، پاشا گەورەی دادوەرو سەركردەی سەربازی بووە"[٣٥]، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی فراوان بووە "كۆشكی بەرێوەبردن‌و ژمارەیەكی زۆر كێڵگەو دارستان‌و بێستانی سەوزی هەبووە، بەڵام بە خێوكردنی ئاژەڵ‌و كاری پیشەگەری سەرچاوەی سەرەكی داهات بووە"[٣٦].

"نزیكی دوو هەزار دەسنووسی رەقیمی لە دەوروبەری نوزی دۆزراوەتەوە لە تەپۆڵكەی (أ – ب)، كە لە تەپۆڵكەی (أ)دا خانووی میر (شلواتیشۆپ) بووە، كە بریتی بووە لە زۆری تۆمارەكانی لە دەسنووسی ئابووری، لەم دەسنووسانە وا دیاری دەكات ئەم میرە موڵكی فراوانی بووەو ژمارەیەكی زۆر كارمەندو نووسەرو شوان‌و پیاوی دەوەن‌و ئێشكگرو كۆیلەو هی تری هەبووە، زەوییە كشتوكاڵییەكان پێكهاتووە لە دارستان‌و كێڵگەی میوەو بە سەدان سەرمەرو ئاژەڵ"[٣٧].

*** بەرووبوومو كەرستە ئابوورییەكانی هاوسەردەمی (ئاشوری – میتانی)یەكانی (نوزی)و (كووروخانی):**

لەو بەروبوومە كشتوكاڵی یانەی باوبووە لەو سەردەمەدا بە پلەی یەكەم (جۆ) بووە. كە زۆر بووە، ئنجا گەنم، هەروەها (كونجی)و (خاشخاش–كۆكەنار)و (كەتان)یش باو بووە لە (نوزی)دا[٣٨]، هەریەكە لە (گەنم)و (جۆ) بەرهەم هێنراوە هەر لە سەردەمەكانی پێش مێژووە، ناوچەیەكی ئاوەدانی ئەم بەرووبوومانە بوو. داری جۆربەجۆری میوە چێنراوە، كێڵگەیەكی زۆری سەوزەو دارستان بەكار هاتووەو بەرووبوومەكانی وەكو (سێو)و (هەنجیر)و (قۆخ)و (هەنار)و (خورما)و (پیاز) باو بووە لەو سەردەمەدا[٣٩].

*** دەربارەی هونەری پیشەسازی:**

"دەبینین چنین‌و ئاڵتون چێتی سیفەتێكی ئەو ناوچەیەیە كە ماوەیەكی زۆرە ئارامیان گرتووە و، كشتوكاڵیان هەنگاوێكی چاكی ناوە لەپێش كەوتندا، لە نموونەی ئەو چنراوانە چنراوی كەتان (كیتی)و چنراوی خوری (برمی) كە ناوچەیەكی وەك (تركەڵان) پێی بە ناوبانگ بووە، لە رووی بازرگانییەوە كە لە بەڵگەیەكی ناوەراستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی هاتووە كە چۆن ئاڵوگۆركراوە بە چنراوە ناوخۆییەكان، كە لەنێوانیاندا چنراوە خورییە رەنگاو رەنگەكان، بەرامبەر ژمارەیەك لە دروست كراو لەنێوانیاندا رەنگی ئەرخەوانی (تاكتلو) لە (كەنعان)و (لوبنان– فەلەستین)، لە هەمان دەسنووسدا باسی ئەو بەرهەم هێنەرە ناوخۆییە دەكات بە (تبارو) بە مانای خوری بۆیەكراو، لە تۆمارەكانی (سەرجۆن)دا باسی لێ كراوە لە كاتی خۆیدا سەرچاوەكەی (ئۆر راتو)و (خنجی) بووە كە مانای وایە ئەو رەنگە ئەرخەوانییە بە ناوبانگ بووە هەر لە زووە لە (قەفقاز) دا كە (قرمز)ی لێ دەهێنراوە"[٤٠].

لە كۆتای هەزارەی دووەمو سەرەتای یەكەمی پێش زایینی پەیوەندییەكانی بازرگانی دەوڵەتان پەرەی سەند لەنێوان وڵاتانی رۆژهەڵاتی خواروو.. لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتای هەزارەی دووەمی پێش زایینی چالاكییەكانی شارەكانی ژێر دەسەڵاتی ئاشووری پەرەی سەند، پێشكەوتنێكی چاكی بە خۆیەوە دی لە رووی بازرگانییەوە كە هەریەكە لە (زیو) بە شێوەیەكی ئاسایی‌و (ئاڵتون)و (مس) بە پلەی

كەمتر دەوری پارەیان بینی لەم بازرگانییەدا هەریەكە لە (قورقۆشم)و (مس) لەو لیستانە دەنوسرا كە لە لیستەی كانزا بەنرخەكان بوو كە دابەش بوونیان وەكو (زیوو) وابوو. (ئەراپخا) یەكێك بووە لەو شارانەی كە (برۆنزی) هەبووە كە كورەی (مناجم) تایبەتی هەبووە بۆ دەرهێنانی، هەرچەندە (ئالتون) پێوانەیەكی نەگۆربووە بۆ ئالوگۆركردن و دان لە مێژووی (میزۆپۆتامیا)دا بەڵام (زیوش) بەكارهێنراوە وەكو پێوانەیەكی نەگۆڕ، كە تەنها لە دوو سەردەمدا. سەردەمی بابلی ناوەراست و ئاشووری ناوەراست نەبێت. (ئالتون)و (زیوو) هاوسەنگ بوونە لە كێش، لە ئاشوری ناوەراستدا (قورقۆشم) پەیوەستی ئالوگۆڕ بووە لە وڵاتی ئاشووردا[٤٣].

***دەربارەی بەرووبوومە ئاژەڵییەكان:**

"لە نووزی دا بەخێوكردنی ئاژەڵ.. سەرچاوەیەكی سەرەكی داهات بووە"[٤٤] ناوچەكانی وەكو (كەركوك) لەسەردەمی میتانییەكاندا ناوچەیەكی ئاوەدانی بەخێوكردنی ئاژەڵ بووەو هەزاران سەر مەری هەبووە، ئەمەش بە روونی بە دەردەكەوێت لە تاڵان كردنی ئاشوورییەكان لە ناوچەكانی (نوزی)و (كووروخانی) دا، كە یەكێك بووە لە شارە تاڵان كراوەكان لە رووی بەرهەمهێنانی ئاژەڵدا، لەبەر ئەوەی ناوچەیەكی دەشتایی و بەپیتی لەوەرگای كشتوكاڵی بووە لەو سەردەمانەداو لەسەردەمەكانی دوای ئەواندا..[٤٥].

بەڵگەیەكی زیاتر كە بۆچوونەكەمان دەسەلمێنێت، ئەوەبووە (میتانی)یەكان دەستێكی باڵایان هەبووە لە رێگای بەخێوكردنی ئاژەڵدا، كە لە پێش نامەی (حیتی)یەكاندا بە سەد ساڵ لە ناوچەیەكی وەكو (نوزی)دا باوبووە، هەر چەندە لە هیچ شوێنێكی عێراقدا نامەیەكی گرنگی وەكو ئەوەی (نوزی) نەدۆزراوەتەوە، ئەمەش بەڵگەیە (نوزی) ناوچەیەكی گرنگی ئەم لایە بووە لە بەخێوكردن و پێگەیاندنیدا[٤٦].. هەروەها (میتانی)یەكان دەستێكی باڵایان هەبووە لە بەخێوكردن و پێگەیاندنی (ئەسپ)دا.

هەریەكە لە خەڵكی (نوزی)و (كووروخانی)، هەوڵی بەكارهێنانی تەنووریان داوە، كە نموونەیەكی (نوزی) دۆزراوەتەوە لە سنووری سەدەی پانزەهەم و چواردەهەمی پێش زایینی لە شێوەی قوچەكی ناتەواو یان لوولەكی، گەلێك جار پێكهاتووە لە دووچین، دیوارەكانی كونی تێدا هەیە، تا بۆ ئەوەی هەوا بكێشێت، لە خوارەوەیش كونێكی گەورەی تێدا هەیە بۆ پركردنی لە سووتەمەنی..[٤٧] لە (كووروخانی)یشدا گەلێك نموونەی لەوە زۆرتری (نوزی) دۆزراوەتەوە لە شێوەی گەورەو بچووكی جۆربەجۆر[٤٨]، "ناوچەیەكی وەك (كووروخانی)، دادەنرێت بە ناوچەیەكی بە پیتی كشتوكاڵی كە زیاتر پشت بە باران دەبەستێت هەر لەسەردەمە زووەكانەوە، تا ئێستا ئەم ناوچەیە كەوتووەتە ئەو شوێنەی پشت بە باران دەبەستێت.

گرنگی ئەم ناوچەیە لەوەدایە ئەویش بە هۆی بوونی رێرەوی رووبارێكی كۆنە بەناوی (دۆڵی نەوت)، كە زۆربەی ئەو زەوییانە دەبرێت كە لەكۆندا جێگەی نیشتەجێ بوون بووە.. چونكە تا ئێستا ئەو رووبارە ئاوی بارانی پێدا دەروات كە لە بەرزایی و گردەكانی دەوری كەركوكدا دێتە خوارەوە، تا ئێستا جوتیاران بۆ ئاودێری كردنی زەوییە كشتوكاڵییەكان بەكاری دەهێنن، لەبەر ئەوە بوونی (دۆڵی نەوت) پاڵپشتە بۆ ئەوەی كە ئەم ژمارە زۆرەی ئۆردووگا نیشتەجێ بووانەی تێدا دروست بێت. گرنگی ئەم ناوچەیە لەوە دایە كە نزیكە لەو ناوچە سەر رێگایانەی كە دەچێت بۆ ئەو ئاوەرۆیانەی چیا دەبرێت لە لای رۆژهەڵاتی رووباری (دیجلە)، ئەمە زیاتر بایەخ دەدات بە ستراتیژی ئۆردووگا كۆنەكان و گرنگی بازرگانی و پێویستی ئەم ناوچەیە لە (نەوت)و (قیر)دا ئەوەندەی تر ناوچەكە گرنگی دەدات لە رووی ئابوورییەوە.."[٤٩].

ئەم ناوچەیە گرنگی هەیە لە رووی مێژوویی و سیاسییەوە بۆ ئەو نەتەوە (هۆری-حۆری)یانەی كە لێرەدا نیشتەجێ بوونە، زەوییەكی كشتوكاڵی گرنگ بووە لە كۆتایی هەزاری سێیەمی پێش زایینی بێجگە لە گرنگی شارستانییەكەی. بوونی ماڵ و كووختی تایبەت بە جوتیاران و كرێكارانی ئەوانەی كە ئیشیان كردووە لە لای خاوەن (كۆشكی سەوز) بەڵگە لەوە دەكات ناوچەیەكی ئابووری گرنگ بووە، لە هەمان كاتدا نیشتەجێ بوونی (كۆشكی سەوز) دەیسەلمێنێت، ناوچەیەكی دەرەبەگی گەورەی خاوەن دەسەڵاتی كۆمەڵایەتی و ئابووری و لەوانەیە ئایینی بووبێت، بە هۆی بوونی پەرستگاوە[٥٠].

*** یاساو پێرەوەكانی چۆنێتی بەكارهێنانی زەوی كشتوكاڵی و موڵكدارێتی تاكە كەسی لە ناوچەكانی (نوزی)و (كووروخانی) و (ئەراپخا)دا لەسەردەمی (ئاشووری ناوەڕاست و هوری- میتانی) یەكاندا:**

لێرە بە دواوە هەوڵدەدەم بە شێوەیەكی فراوان بكەومە شی كردنەوەی ئەو یاسا كشتوكاڵی و كۆمەڵایەتییانەی كە لە (نوزی)و (ئەراپخا)و (كووروخانی)دا باو بووە، هەر چەندە ئەو دەسنووسانەی (كووروخانی) كەمتر بەڵام دەتوانین بگەینە ئەو راستییانە كە تا رادەیەكی هاوشێوەیی و لێك چوون هەیە لەنێوان هەردوولادا، لەهەمان كاتدا نەدۆزرانەوەی دەسنووسەكانی (ئەراپخا)، وای لێمان كردووە تارادەیەك بۆشایی دروست كردووە لە ئاست كاری بەراوورد كاریدا.

"لە (نوزی)دا، هیچ زەوییەك ناتوانرێت لەهەر هاووڵاتییەك بسێنرێت، كە دەوڵەت پێی بەخشیووە، یان راست بكرێتەوە، یان موڵكدارییەكەی بگۆردرێت بۆ یەكێكی تر، چونكە لەبەر ئەوەی ئەگەر زەوی بە شێوەیەكی بیردۆزانە بیری لێ بكرێتەوە دەگەرێتەوە بۆ پاشا، بە ئارەزووی خۆیەتی كە دەتوانرێت بیدات بەیەكێ لە پای ئەو كارە دەرەبەگییانەی دەیكات.. هەروەها بەخشین و كاری دەرەبەگایەتی پشتاوپشتە لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی دی، لەبەر ئەوە زەوی لە چوارچێوەی خێزانەكە ناچێتە دەرەوە، بەڵام سوورخواردنێك هەیە لە دەرەوەی ئەم یاسایەدا، ئەویش بە مەسەلەی بەخێوكردن (التبني). لە هەمان كاتدا لە وڵاتی (بابل)دا زەوی دەگەرێتەوە بۆ دەوڵەت ئەگەر هاتوو ئەو كەسە توانای ئەوەی نەبوو كە هەڵسێت بە جێبەجێ كردنی كاروبارەكانی، مردبێت و كەسێك نەبێت جێگای بگرێتەوە.

بەڵام دانیشتووانی (نوزی) بە جۆرێکی تر دەوریان لە یاسا داوە ئەویش بە ڕێگای بەخێوکردن، کە خاوەنی زەوییەکە دەیکات بەرامبەر ئەو کەسەی کە دەیەوێت زەوییەکەی پێبدات یان کاتێك قەرزدار زەوییەکەی دەست دەکەوێت بەرامبەر بەو قەرزە هەتا بۆی دێتەوە ئینجا وەریدەگرێتەوە (٥١).

"یان وەکو ئەوەی بە دەستمان گەیشتووە لە (نوزی)دا لە بازرگانێکی دەوڵەمەند لە سەدەی پانزەهەمی زایینی دا، کە هەڵساوە بە بەخێوکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەمەندو هەژار بەبێ جیاوازی و وەکوییەك بەڵام ئەمان بەرامبەر ئەمە هەڵسان بە پێشکەش کردنی دیاری بۆ ئەو باوکەی بەخێویانی کردووە، بریتی بووە لە پارەو کێڵگەی کشتوکاڵی یەکسان لە نرخاندا لە بەر ئەوە باوك بە هۆی ڕێگای بەخێوکردن زۆر ماف فراوانی دەست دەکەوێت، لەهەمان کاتدا دەتوانێت کۆتایی بە بەخێوکردنەکە بهێنێت ئەگەر ئارەزووی لێبێت، منداڵە بەخێوکراوەکە بگەڕێنێتەوە، چونکە ئەو خێزانەی کە بەخێوی کردووە بە ئاسانی وازی لێ دێنێت و دەگەڕێتەوە لای کەس و کاری.."(٥٢).

*** لە تۆمارە تایبەتییەکانی (نوزی)دا دوو جۆرە دەسنووس هەیە دەربارەی قەرزو بەخێوکردن و بارە کشتوکاڵییەکان:**

*** جۆری یەکەم:**

بریتییە لەدەسنووسی قەرزی (تدنۆتۆ) کە درێژخایەن دەبێت، دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت لەلایەن کەسێکی بارمتەکەرو باوەڕپێکراو، قەرزدار دەتوانێت کاربکات بۆ ئەوەی ئەو سوودە بەدەست بهێنێت هەتا بەوەی کۆی ئەو قەرزە بنەڕەتە بداتەوە، دەتوانێت قەرزدەر سوود لەو موڵکەی قەرزدار وەربگرێت هەتا ئەو کاتەی قەرزدار قەرزەکەی دەداتەوە، بۆیە تا ئەو لەژێر کاری قەرزداردا دەبێت، دەتوانێت کاری پێ بکات.

*** جۆری دووەم:**

بریتییە لە دەسنووسی قەرزی شێوە (مۆرۆتۆ) کە ئەم وشەیە گۆڕاوە بۆ (ئەحۆتۆ)، کە مانای گۆڕینی مافە بۆ سامانە نەگۆڕەکان بە ڕێگای بەخێوکردنی (موڵکداری تازە) وەکو کوڕ وبرا. بەڵام لە (ئەراپخا)دا زۆر شتی پارچە کشتوکاڵییەکان لەسەر ئەم شێوەیە ڕووی نەداوە، چونکە هەر زەوییەك لە (ئەراپخا)دا موڵکدارییەکەی دەربەستییە (الالتزام) بە (تاجەوە)، قەدەغەیە فرۆشتنی(٥٣).

هەموو کار ڕاییکردنەکانی پارچە کشتوکاڵییەکان لە جۆری دووەم پێکهاتووە لەسەر بنەڕەتی بەکارهێنانی بەخێوکردنی بەڕاست، کە هەر هاووڵاتییەکی سەربەست ماف بە دەست هێنانی بارمەتی هەیە لە ماڵەکەیدا، کە ئەویش بە ڕێگای بەخێوکردنی کەسێك کە دەبێتە میراتگری ڕەوای (شەرعی) ئەو(٥٤).

"لە حاڵەتەکانی بەخێوکردنی بەڕاست دەبێتە هۆی دیاریکردنی قەبارەی زەوی کشتوکاڵی و شوێنەکەی و هەر موڵکدارییەکەی تری بە خێوکراو کە باسی لێ نەکراوە.

لەسەر بەخێوکەر ئەوەیە کە گوێ ڕایەڵی بەخێوکراوبێت، وخواردنی بداتێ و جلوبەرگی بۆ بکڕێت و (پۆشتەی بکات)، بە دوایدا بگەڕێت ئەگەر ڕفێنرا، کاتێکیش دەمرێت بۆی بگیرێت و بینێژێت. لە کاتی گۆڕینی (موڵکداریەتی ڕاست) بۆ بەخێوکراو دەبێتە ئەوەی کە ڕزگاری بێت لە هەموو دەربەستییەکی (پابندی) هەبووە لەوە پێش.

لە (ئەراپخا)دا زەوی موڵکی (تاجە)وە بەپێی یاسا ڕێگای ئەو کەسانە دەدات کە تەنها هەڵسن بە گۆڕینی پارچەکانیان (لەگەڵ وێنەی خزمەتی موڵکایەتی) بۆ ئەندامانی خێزانەکانیان و بەس، لەگەڵ بەراووردکردنی داب و نەرێتی باری وڵاتەکانی دراوسێی (نوزی) دەردەکەوێت، هەریەکە لەخزم و دراوسێ دادەنرێت بە هەڵبژێری یەکەم بۆ کڕینی زەوی وزار، ئەگەر بفرۆشرێت"(٥٥)، بەڵام ئەو ڕێڕەوەی کە وڵاتی (نوزی) گرتوویەتی لە گۆڕینی موڵکدارێتیی، دەتوانین بڵێین بەڵگەیە بۆ بوونی کۆمەڵگایەکی خێزانی فراوان بۆ موڵکداری ڕەوایی (شەرعیی) زەوی، بەڵام (کۆشیکر) لەو باوەڕەدایە کە بەخێوکردنی هەرکەسێك وەکو کوڕ یان برا کار ڕایکردنێکی شێوە درۆیی تەواوە، چونکە ناتوانین شرۆڤەی ئەوە بکەینەوە بۆ بوونی دوو بابەتی پەیوەندی خزمایەتی بە ناو دروست کراو یان درۆ..(٥٦).

ئەگەر دەستمان پێکرد بە تێکەیشتن لە بوونی کۆمەڵگایەکی خێزانی فراوان لە (نوزی)دا، بوونی جیاوازی لەنێوان دەسنووسەکان لە جۆری (مۆرۆتۆ)و جۆری (حۆتۆ)، دەتوانین بە ئاسانی شی بکەینەوە کە بڵێین دامان نا کە ڕێڕەوی گۆڕینی موڵکدارێتی گۆڕینێکی تەواو دروست کراو نییە، چونکە دەسکاریکردنی ئەم جۆرە کارانە دەبێتە هۆی پرسین دەربارەی ئەو داواکارییانەی کە بەرز دەبێتەوە لەلایەن نەتەوەکانی موڵکدارە تازەکە دژی میراتگری موڵکدارەکەی پێشوو بە هۆی نەکێڵانی ئەو زەوییەی کە باوکیان بە دەستی هێناوە لە ڕێگای بەخێوکردنی درۆوە.. هۆی داواکردنەکە بۆ بە دەستهێنانی ئەو زەوییە کە بۆیان جیاکراوەتەوە، هەروەها نەوەکانی بە خێوکەر مافیان هەیە لەو زەوییانەی کە لە باوکیانەوە بۆیان ماوەتەوە، بەڵام ئەگەر لە واقیعی کارەکە بۆی بڕوانین بەبێ ئاژاوە ئەو جۆرە مافە بەدەست ناهێنین تا بۆ ئەوەی بتوانن ئەوە بسەلمێنن کە میراتگری بەخێوکراو بەشداریان نەکردووە لە زەوییە کشتوکاڵییەکە(٥٧).

لە کاتێکدا هەتا میراتگری زەوییە کشتوکاڵییەکە بەشداری نەکەن، ناتوانرێت مافیان داگیر بکرێت، کە باوکیان موڵکدارییەکەی داوە بە کەسێکی تر لە ڕێگای بەخێوکردنەوە، کە تەنها بە بەرزکردنەوەی بۆ دادگا دەتوانن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەجێ هێنانی یاسای باو دەیانکات بەنیوە موڵکدار کە دەبێتە هۆی ڕاوەستانی کار پێی بەشێوەیەکی ڕەسمی(٥٨). لەبەر ئەوە هەریەکە لە کوڕو برای بەخێوکەر ماف ئەوەیان هەیە لەو پارچە زەوییەی میراتگری خێزانەکەی تر، بەدەستی هێناوە بە بردنەوە بە بارمەتی لە کێڵانی ئەو پارچەیە لەلایەن ئەندامانی خێزانەکانی موڵکدارەکەی پێشوو. بەڵام ئەمانە هەمووی دیاری نەکراوە، وەباسی لێ نەکراوە چونکە هەمووی بەشێوەیەکی باوی ئەو سەردەمەی

نێوانیان بوو، یاسا کاتێك جێبەجێ کراوە کە بووبێتە ڕوودانی ئاژاوە لەنێوان یان لایەنێك دەرچێت لە پەیوەندی کارەکەی هەردوولا لە پێشدا لەسەری ڕێکەوتوون بوونی دوو ڕێرەو لە گواستنەوەی موڵکدارێتیی زەوی وزار (بە بەخێوکردنی موڵکداری تازە وەکو کوڕو برا). دەتوانین وەری بگرین-بەهەر دوو بەختییەك بێت-بە چاوی ئیعتیبارەوە. لە ڕاستیدا ئەو واقیعەوە بە دەردەکەوێت کە بەشێکی لەو زەوی خێزانە فراوانە تا ئێستا موڵکێکی هاوباشە. کە ئەم ڕاستییە بە دەرکەوتووە لە داواکارییەکاندا. کە پەیوەستە بە گۆڕینی موڵکی نەگۆڕ، کە ئاژاوەی هاوبەشێتی لەسەرێتی، ئەم جۆرە کارانە نابێت ئەگەر ئەو ماوەیەی کە دەبێت بگوازرێتەوە موڵکدارییەکەی پارچە زەوی بێت. بەڵکو ماف لەو بەشە دیاری کراوەیە لە قازانج کە سوور دەخوات لەو زەوییە موڵکدارییە بە سیفەتێکی تەواو هاوبەش..[٥٩]. ڕێگا دەبێت بە بوونی شێوازی یاسایی بۆ گۆڕینی موڵکدارییەکی زەوی لە جۆری (مۆرۆتۆ) لە یەکێك لە حاڵەتەکاندا لە جۆری ئەحۆتۆ لە حاڵەتێکی تردا ئەگەر هاتوو لایەنەکانی پەیوەندکار هاوبەش بوونە[٦٠].

* چەند نموونەیەکی یاسایی و پێڕەوی کشتوکاڵی لە (نوزی)و (کووروخانی)و (ئەرا پخا)دا:

١. دووبرا یان دوو ئەندامی کۆمەڵگا فراوانەکەی خێزان کە (تۆمی کوری تەحیا)و (کەلیاکوری ئەکولتی) هەردووکیان (تەخیب تەللا)یان بە خێوکرد بە ناوی براوە بۆیان، لە کاتی گۆڕینی یەکێك لە موڵکدارەکانی کێڵگەکەیان.. بەڵام (تەخیب تەللا) توانی بە ڕێگای بەخێوکردن وەکو کوڕ، هەر یەکە لە بێستانەکانیان بەدەست بهێنێت، هەروەکو ڕوون و ئاشکرایە کە کێڵگە لە گەلێك کاتدا موڵکێکی هاوبەشە، بەڵام لە هەمان کاتدا لەوانەیە بێستان موڵکێکی تایبەتی براکان بێت[٦١].

٢. "بەڵگە هەیە بۆ دۆزینەوەی موڵکدارێتیی جیاوەبوو، لە دەسنووسەکانی تایبەت بە خێزانی (خلسبوح)ی جیاوە بوو بە شێوەیەکی نیوە بەش، چونکە (غۆربازە)، خاوەنی کێڵگەیەکی زۆرە، قەرزی داوە بە کۆمەڵێك بە بەشدار لەگەڵ براکەی (مات – تیشۆب)، بە شێوەیەکی جیا لەگەڵ براکانی تر کە خاوەنی زەوییەکی هاوبەشی ترن، لەنێوان خۆیاندا بۆ ئەوەی (غۆربازە) بەشەکەیان بەدەست بهێنێت لەو سامانە کۆمەڵییە، هەستا بە بەستنەوەی یەکێك لە براکانی بەناو (بنی حربا)، ئەویش پێدانی قەرز پێی، لە سەرەتادا قەرزێکی پێ بەخشی لە یەکێك لە کێڵگەکان لە دوایدا قەرزێکی تری دا پێی تا وای لێ کرد هەموو سامانەکەی لەو بەشەی خۆی ببات، کە تاوای کرد پێی خۆی داگرێت (غۆربازە) بە بەخێوکردنی (بنی حربا) بە شێوەی برا.

ئەم جۆرە برایەتییە هیچ پێکەوە بەستنێکی خوێنی ناگەیەنێت، چونکە لە ڕاستیدا (بەنی حەربا)، برای (غۆربازە) یە دوای ئەوەی بەخێوی کرد بە ناوی براوە وای کرد کە بێستانیکی برایەکی تری بە دەست بهێنێت بە ناوی (تیکی تەللا) بۆ خۆی کە لە دوایدا کەسێك هاتە ناوەوە بۆ داواکردن لەگەڵ براکەی (مات – تیشۆب)، کە خانووییەکی هاوبەشیان هەبوو بۆ داگیر کردنی ئەو بێستانە، کە ئەمە لەوانەیە وابکات (غۆربازە) بە هۆی ئەم ئاژاوەیە هەڵبسێت بە گۆڕینی ئەو بێستانە کە کەوتووەتە نزیکی زەوی (تیکی تەللا)، ئەوەی تر زەوی (مات–تیشۆب) بە زەوییەکی نزیکی تر لە زەوییەکەی باوکی کە لەوە پێشتر دەگەڕێتەوە بۆ پێنج برا لە خێزانێکی تر.."[٦٢].

٣. "ئەو تۆمارانەی دۆزراونەتەوە لە شوێنی دانیشتنی گردی (ا)، دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی (کشیری) زۆربەی کارەکانیان لەنێوان خزمەکانیانە، ئەمە یارمەتیمان دەدات بۆ دەرخستنی نەخشەی پێشکەوتنی، کە هاتووە بەسەر پەیوەندییەکانی موڵکدارێتی خێزانێکی فراوان کە موڵکەکانیان پێکهاتبوو لە (قەڵات–ومنتو)، دەگەڕێتەوە بۆ (کشیری) خۆی (ئاکۆیا کوری کشیری) توانی کە دووکێش لە (مس) لە پارچە زەوی براکەی (کریرۆم) بەدەست بهێنێت بۆ ماوەی سێ ساڵ، هەردوو دەستەی پەیوەندکار لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون، ئەگەر ئەو زەوییە ببێتە هۆی فرت و فێڵ و دزی بە هۆی قەرزەکەی (کریرۆم)، لەم بارەدا دەبێت زەوییەکی تری بدرێتێ بە (ئاکۆیا) لە تەك ئەو زەوییەدا لە جیاتی ئەو پارچەیەی بەزۆر داگیر کراوە. بەڵام لەسەر (کریرۆم) پێویستە کەواز لە یەکێك لە کێڵگەکانی بهێنێت بۆ یەکێك بە ناوی (ئەتخبشنی) بەڵام (زایك) کوری برای، کوری (ئاکۆیا) توانی ئەم پارچە زەوییە بخاتە سەر موڵکەکانی بۆ ئەوەی هەموو قەرزەکانی مامەی بداتەوە، تا ئەو کاتە دەتوانێت ئەو زەوییە بەکاربهێنێت، کە مامەی (کریرۆم) بتوانێت هەموو قەرزەکەی بگەڕێنێتەوە کە لە سەرێتی، بە هۆی ئەمەوە (زایك) گیروگرفتێکی چارەکرد کە قەرزدەرێکی دوورخستەوە کە ناگەڕێتەوە بۆ خێزانەکەی، موڵکەکەی فراوان کرد لەسەر حیسابی خزمێکی گەورەی.

لە زۆر کاتدا ناوی (کریرۆم) دێت لە ناو ئەو ناوانەی بە ناوی شایەتەوە لەو کارانەی کە پەیوەندی بە براکەی (ئاکۆیا) وە هەیە، لە یەکێك لەو کارانەدا کێشەی بارمتەی یەکێك لەو کێڵگانەی مۆڵگای (کشیری)یە بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەلایەن بارمتەکەر بە ناوی (ئەخیل–تیشۆب) کوری (یۆخیا) بەرامبەر بارمتەی ڕێژەیەك لە (جۆ)و (خارسین)و (سەر) کە ئاکۆیا پێشکەشی دەکات. لەو کاتەی کە (ئەخیل–تیشۆب) نابووت بوونەکەی (إفلاس) ڕاگەیاند چاری نەما هەستا بە بەخێوکردنی (زایك) کوری قەرزدەر بە گواستنەوەی گشت کێڵگە و ماڵەکانی، لە هەمان کاتدا بەڵێنی ئەوەی دا کە هیچ کەسێك بە خێو نەکات بێجگە لەو، مەرجی ئەوەی دانا کە لە کاتی مردنیدا هەستێت بە گواستنەوەی هەموو کارە فەرمانبەرییەکانی (ئەلاوێری) بۆ کوڕەکەی ئەگەر کوڕی بوو لەو کاتەدا، لەهەمان کاتدا لەسەر (زایك) قەرزدەری (ئەخیل–تیشۆب) پێویستە ببێتە میراتگری لەوەو دوای بە پلەی (تردنو) بەرامبەر ئەوە لەسەر (زایك) پێویستە کە بایەخ بە (ئەخیل) بدات و جلووبەرگی بۆ پۆشتە بکات. بە هۆی ئەو چالاکییانەی کە (ئەکۆیا) هەڵسا پێی وای لێ کرد ناوی (قەڵات.. موڵکە)ی، (ئەکشیری) بگۆڕدرێت بە ناوی قەڵاتی (ئەکۆیا)، لە جیاتی ئەم چالاکییە ئابوورییانە.

ئەمە لە دوایدا زیاتر پەرەی سەندو وای لێ هات کە لایەنی تر بێتە ناو کاروباری ئابوورییەکەوەو لەسەر حیسابی ئەوی تر خۆی فراوان بکات (فخشلمو)و (نوروشاری)و (فخیا) ئەمە وای کرد تا ماوەی سەردەمێکی دوورودرێژ ئەم خێزانانە بتوانن دەسەڵاتیان بەسەر کۆمەڵگا خێزانییە فراوانەکەدا قەڵەمرەو بکەن‌و کاروباری ئابوورییەکانیان لە سنوورێکی فراوان بهێڵنەوە، کە لە چوارچێوەی خێزانەکەدا نەچێتە دەرەوە.."[٦٣].

٤. پارچە دراوێکی مسیم دا بە (تای).

ئەگەر (تای) سەرپێچی لەسەر رێکەوتنەکە کرد بەهۆی دراو داواکار یان داد خوار دووئەوەندە دەدات بە (موستای).

ئەگەر جۆی (موستای) نەیدات بە (تای).

لە دوایدا قەرزدار دەبێت بەرامبەر بە (تۆو) حبوب ئەم پارچەیە نووسراوە لە (ئانونا) لە شاری خوداوەند[٦٤].

لەوانەیە کەسەکانیان لێکچوون هەبێت لەنێوانیاندا بەڵام ئەگەر سەیرێکی دەستنووسەکە بکەین دەبینین تەواو نییەو مانایەکی راست نادات بە دەستەوە.

٥. وەسیەتی (ئۆناب تای) کوری (تایا).

بۆ کچەکەی (سلواتوری) هەستا بە پەیمانێک یان وەسێتێک بەم شێوەیە (ئۆناب تای) دەڵێت:-

کچەکەم (سلواتۆری) وەکو کور بە کارم هێنا هەموو کێڵگەو ماڵێکم هەموو قازانج‌و دەستکەوت‌و کۆیلەکانم‌و بەشێک لە خواردەمەنییەکانم لەشاری (ئەنزۆکالی)و شاری (ئەفزوری) لە ناوچەی (فامکورامی) لە شاری (ماتیها) ئەم رێکەوتنە ئەوەی تێدا نووسراوە هەموو ئەوەی لەشارو ناوچەی گەورە وبچووک‌و مۆڵکەکانم لە شار لە ناوچە جۆر بەجۆرەکان بەجێ دەهێڵم بۆ کچەکەم (سلواتوری)، (ئۆناب تای) دەڵێت:-

ژنەکەم (ساکۆتۆ) وەسیەت گرە لەسەر کچەکەم (سلواتۆری) کاردەکەم مادام (ساکۆتۆ) دەژێت (سلواتۆری) سەرپەرشتی (ساکۆتۆ) دەکات تا مردن (سلواتۆری) بۆیی دەگیرێت دەینێژێت‌و ئەگەر سلواتۆری گوێ رایەڵی (ساکۆتۆ) نەکات پێویستە دایبنێت لە ماڵ (ناپاری) (لێرە بە دواوە نەماوە) پێویستە بریندار ی نەکات"لەمە بەدواوە ماناکان تەواو نییەو پچڕ.. پچڕ[٦٥].

٦. ئاوها دەڵێت (ئەکبا) کوری (ئەخلی-تیشۆب):

وەرمگرت.

(١٠) کێش لە جۆ بۆ (هاشۆر) کوری (سیماکاری) لەسەر ئەم جۆیە من بەرپرسم ئەگەر رێکەوتنەکە بشکێت (٣٠) کێش (جۆ) دەگەیەنم لەو جۆیە بۆ (هۆشەر) تا رادەیەک مانەکەی تەواو نییە بەڵام ئەوە بە دەردەخات کە لە جیاتی (١٠) کێش جۆ (٣٠) کێش جۆ دەدات بە (هاشور)[٦٦].

٧. ( ٣) کێش لە جۆ بۆ (دیورایە)ی کۆیلە، (٣) کێش لە جۆ بۆ (ئەرمۆیە) کوری (هوتیا)، (٣) کێش لە جۆ بە (واردنیا)، (٢) کێش لە جۆ لە (تویکای) کوری (زکایا)، (٢)کێش لە جۆ لە (ئاریب ئەپنی)، (٢) کێش لە جۆ لە (ئەرەب ئەپنی)، (٢) کێش لە جۆ لە (کای تیلا)ی کۆیلە، (٢) کێش لە جۆ لە (ئەتیامانی) کوری (زولا)، (١) کێش لە جۆ لە (تیا) کوری (ئیتیامان)، کۆ (١٧) کێش لە جۆ لە (شلوی تیشۆب)، هەموو ئەمانەم وەرگرت وەکو قەرز دوای دروێنە (١٧) کێش لە جۆی بەرێوەبەر بۆ (شلوی تیشۆب) پێویستە بیگەرێنمەوە بۆ شاری خوداوەند کە بەر پرسیاری پیاوە بەرامبەر پیاو.."[٦٧].

٨. "ئەوەی لە تۆمارەکانی (تلبنایا)دا هاتووە رێکەوتی بە بەخێوکردنی کچێکە، دانانی وەکو کوری بەپێی یاسا (مورتو توکلتاتوتۆ)، مەرج دان‌و رێگەدانی بە دایکی بەخێوکەر کە شووکردنی کچەکەی بەهەرپیاوێک هەتا هاتووە ئەو پیاوە کۆیلەیەش بێت. بەشێکی تری ئەم رێکەوتنە خۆئامادەکردنە بۆ بەخێوکەر لە کاتێکدا ئەگەر پیاوی کچە بەخێوکەرەکە مرد، رێگەی دەدرێت شووبکات بە پیاوێکی تر، ئەگەر هاتوو ئەم کارە راییکردنە (دە) جاریش دووبارە بکرێتەوە، کە ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت یەکێکە لە کارەکانی یاسا کە لەسەری رۆیشتوونە ئەمە وا دەکات ببێتە بێوەژنێکی سەربەست‌و سەربەخۆ لە وانەی کە بەخێویان کردووە بەشێوەی رەوا (شەرعی) هەروەها مافی دایکی بەخێوکەری کچەکەیە کە هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵی کچە بەخێوکەرەکەیدا بکات، بەڵام بەنیسبەت ئەو داواکارییە یاساییانەی بەرز دەکرێتەوە کۆتایی دێت لە گەلێک کاتدا بە قۆرت‌و ئاژاوە.."[٦٨].

*** سەرنجە ئابوورییەکانی هاوسەردەمی ( هوری ـ میتانی ):**

زۆری ئەم پەیوەندییە ئابوورییانەی کە لەم سەردەمەدا رووی داوە زیاتر داب‌و نەریتی یاسایی باوی ئەو سەردەمە دەوری خۆی تێدا بینیوە، وەکو ئەوەی دادگاو دام‌و دەزگا میرییەکان دەوری تێدا ببینێت لە پەیوەندییەکاندا.. چونکە ئەو کێشانەی رووی داوە چوارچێوەی داب‌و نەریتەکە زیاتر لە قازانجی ئەواندا بووە، بۆیە زۆرجار کێشەی زەوی کشتوکاڵی چارەسەرکردنەکەی لەنێوان خۆیاندا قازانجی زیاتر دەبێت وەکو ئەوەی بکاتە دادگاو دام‌و دەزگاکانی. بوونی دوو چین، چینی دەوڵەمەندو خاوەن زەوی وزار، چینی بێ دەسەڵات‌و ژێرکەوتوو، لەژێر کارتێکردنی یاساکانی قەرزدا، کە هەموو شتێکی خاوەن موڵک قبووڵ دەکات‌و ملکەچێتی. "قەدەغە بوونی مامەڵەکردن بە زەوی لە (ئەراپخا)دا، چونکە هەمووی دەگەرێتەوە بۆ پاشایەتی‌و (تاج).."[٦٩].

بوونی رێکەوتنی ئابووری لەنێوان دوو کەسدا، هەروەها شکاندنی هەر لایەنیکی لەم رێکەوتنەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی دووقات یان سێ قاتی ئەم کەرەستەیە بدات لە جیاتی ئەوەی رێکەوتنەکەی شکاندووە.. "زۆری ئەو کارانەی کە لە (نوزی)دا سەری هەڵداوە لەسەر ئابوورییەکی کۆیلانەبووە (الإقتصاد والرق)، تێدا چەوسێنەرو چەوسێنراو تێدا رەنگ دەداتەوە کە هەر دوو لایەنەکە بە روونی بەدەر دەکەوێت، چەوسانەوەی تێدا هەیە، بە هەموو جۆرێک لەلایەن خاوەن دەسەڵاتەوە، ئەمە وای لێ دەکات بڵێین دەسەڵاتی سیاسی ئەو دەورەی نەبینیووە لەسەر فراوانی دەسەڵاتی خۆی لەبن برکردنی ئەم کێشەیەدا.. چونکە لە کاتی کەوتنە ژێری بێ دەسەڵاتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو شتێک قبووڵ بکات‌و مل کەچی بێت.."[٧٠].

زەوی کشتوکاڵی‌و بەرووبوومەکەی لە (گەنم)و (جۆ) دەوری گەورەی بینیووە لەو رێکەوتنە ئابوورییانەدا، لەبەر ئەوەی

ناوچەیەکی فراوانی بەپیتی کشتوکاڵی لەناوچەکەدا هەروەها مانەوەی یەك لەدوای زەوی کشتوکاڵی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، هەرچەندە کە کێشە ئابوورییەکەشی تێدا فراوان بێت. دەتوانین ئەو ئابوورییەی ئەو سەردەمە بە ئابوورییەکی شیاوی سەردەمێکی دیاری کراوی (هوری-میتانی) دابنێین، تێدا کۆمەڵێك یاسا باڵا دەستە کە نموونەی کۆکی ئەو سەردەمە دەخاتەروو لە بەرەوپێشچوونی پلەکانی ژیاندا، لەهەمان کاتدا دەتوانین بەراووردی بکەین لەگەڵ (ئاشووری)و (بابلی)یەکاندا، چونکە هەموو یاسا ئابوورییەکانی ئەو سەردەمانە، تارادەیەك لێك چوون و بەراووردی تێدا ڕەنگ دەداتەوە، بەتایبەتی لەنێوان یاساکانی (حەمورابی)و (هوری-میتانی)دا، کە زیاتر ئەوە دەخاتە ڕوو، لێوەرگیران و مامەڵەکردنی یاسا ئابوورییەکان لێك چوونی تێدا هەبێت کە زیاتر پێویستی بە لێکۆڵینەوەو توێژەری شارەزا هەیە بۆ بەراووردی ئەم یاسایانە لەنێوان سەردەمەکانی (بابلی)و (ئاشووری)و (هوری-میتانی)دا.

ئەو یاسایانەی کە بەدەستمان گەیشتووە یان ئەوانەی کە تا ئێستا نەدۆزراونەتەوە، دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە بە بەردەوامی زنجیرە سەردەمێکی لێك دانەبڕاو نەپچڕاو بن و هاو سەردەمێکی بەشێکی تێدا لەو یاسایانە بەکارهاتووەو تابەوەی گونجاوی ئەو یاسایانە بە کارهاتووە، کە لەگەڵ کۆمەڵگا ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەدا کۆك بووەو کێشەکانی چارەسەرکردووە، بۆیە کە گەیشتوونەتە سەردەمی (هوری-میتانی)، باڵادەستی چوار دەوری سەردەمەکەی خۆی بووە لە جێبەجێ کردنی یاسا ئابوورییەکاندا.

سەرهەڵدانی دوو کۆشکی گەورە لە (نوزی)و (کووروخانی)دا زیاتر ئەوە دەسەلمێنێت کە دەزگایەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی بووە[٧١]، چونکە تۆمارەکانی نوزی گەلێك لایەنی شاراوەی بۆمان خستۆتە ڕوو کە ئەمە لە کووروخانیدا هێشتا بە کەمی بەدەرکەوتووە، هەروەها بە هۆی سووتاندنی هەردوو کۆشکەکە لەلایەن ئاشوورییەکانەوە گەلێك تۆماری ئابووریمان لە دەست داوەو هەروەها (ئەراپخا)یش هێشتا دەستی هەڵکۆڵین نەگەیشتووە پێی.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەو سەردەمەدا ئەوەیە کە ئابوورییەکەی ئابوورییەکی کۆیلانە بووە، بووەتە هۆی ئەوەی بایەخ و گەشە بە (دڵنیایی - الائتمان) بدەن، ئەمە وا دەکات ببێتە کۆیلێیەتی قەرزدەرو دەرنەچوون لەژێر کارتێکردنی ئەو یاسایانەدا.

"لە زۆربەی بارەکاندا هۆی ئەو گەشەکردنە سەرەتاییەو دڵنیایی شی بکەینەوە بەوەی: کە توانای گەشەکردنی بەرهەمهێنانی کەلوپەل زۆر سنووردار بووە، لەبەر ئەوەی تێکچوونی شیرازەی نێوان ماڵ و کۆمەڵگا فراوانەکە بە هۆی ئابوورییەکی (سەر بە سەر - العین بالعین)و هاوکاریکردنی ناوخۆییەکەی لە هەمان کاتدا وای کرد ماڵ پشت بە دڵنیایی ببەستێت بە سیفەتێکی ڕاستەوخۆ لە زۆر کاتدا"[٧٢].

هەر ئەم دەرهاویشتەیە وای کرد بەکارهێنانی چەوساندنەوەو کۆیلایەتی ببێتە سیفەتێکی ئەو سەردەمە، لەگەڵ خۆیدا گەلێك زەوی و زاری فراوانی دروست کرد، لەژێر دەستی دەسەڵات داری زەوی و زار بە ڕێگای بەکارهێنانی قەرزی توندوتیژی جۆربەجۆر کە کۆتاییەکەی بە داگیرکردنی ئەو زەوییانەیە.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:-

١. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٦٢)، ساڵی ١٩٨٨، لاپەرە(١٤) کانوونی دووەمو شوبات، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (سۆمەرییەکان ئاری بوون، نووسینی دکتۆرە پاکیزە رەفیق حلمی).
٢. لەبەر نەبوونی پاشماوەی بەرگی سەرچاوەکە ناونیشانیمان نەزانیوە.
٣. (تأریخ حضارة وادي الرافدین، في ضوء مشاریع الري والزراعة والمکتشفات الآثاریة والمصادر التاریخیة)، دکتۆر ئەحمەد سووسە، بەرگی یەکەم، بلاوکراوەی (دار الحریة للطباعة)، بەغدا، لاپەرە (٣٩٦).
٤. گۆڤاری (آفاق عربیة)، ژمارە (٤)، ساڵی سیانزەهەم، لاپەرە (١٠٧)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (قراءة في عصور ما قبل التاریخ في (العراق القدیم)، نووسینی ئەکرەم محەمەد عەبد کەسار).
٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٧).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٧).
٧. (العراق القدیم)، جۆرج رۆ، ساڵی ١٩٨٤، لاپەرە (٢٠٨-٢١٠).
٨. (حضارة العراق وآثاره - تاریخ مصور) نیکۆلاس بوستنیت، وەرگێرانی سەمیر عەبدولرەحیم چەلەبی، ساڵی ١٩٩١، بەغدا، بلاوکراوەکانی دار المأمون، لاپەرەکانی (٧٤-٧٥).
٨. (العراق القدیم)، جۆرج رۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢١٠-٢١١).
١٠. (مێژووی نەتەوەی کورد)، دکتۆر کاوێس قەفتان، لاپەر (٥٧).
١١. (مقدمة في تاریخ الحضارات)، تاها باقر، بەرگی یەکەم، لاپەرە (١٠٢).
١٢. (العراق القدیم)، جۆرج رۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١٤).
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١٥).
١٤. (مقدمة في تاریخ الحضارات)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٢).
١٥. (آثار بلاد الرافدین)، سیتون لوید، لاپەرەکانی (١٧١-١٧٣).
١٦. (حضارة العراق)، بەرگی دووەم، لاپەرە (١٦٣).
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٦٥).
١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢٤٤-٢٤٥).
١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٢٧).
٢٠. (العراق القدیم)، جۆرج رۆ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٥).
٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٧).
٢٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٨).
٢٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤٦).
٢٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٥٣).
٢٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٥٤).
٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٥٥).
٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢٥٦-٢٦٢).
٢٨. (تأریخ حضارة وادي الرافدین)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٥٢-٤٥٧).
٢٩. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٦٣، ساڵی ١٩٨٨، لاپەرەکانی (٦٢-٦٣)، لێکۆڵیەوەیەکە بە ناونیشانی: (کۆنترین نەخشەی جوگراڤ لە نوزییەوە)، فازل قەرەداغی.
٣٠. (تأریخ حضارة وادي الرافدین)، دکتۆر ئەحمەد سوسە، لاپەرە (٤٥٤).
٣١. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ٦٣، لاپەرە (٦٣).
٣٢. (تأریخ حضارة وادي الرافدین)، د. ئەحمەد سوسە، لاپەرە (٤٥٤).
٣٣. (العراق القدیم، دراسة تحلیلیة لأحواله الإقتصادیة والاجتماعیة)، نووسینی کۆمەڵێك لە زانایانی شوێنەواری لە سۆڤێت، وەرگێرانی سەلیم تاها تکریتی، وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٧٦، بەغدا، چاپخانەی (دار الحریة للطباعة)، لاپەرە (٣٦١).
٣٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٣٦١-٣٦٢).
٣٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٣).
٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٢).
٣٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٣).
یان پێی ووتراوە رووەکی بەنگ، لە شیراوەکەی تلیاك دروست دەکرێت بروانە: (القاموس العلمي عربي، انکلیزي، کوردي)، کەمال جەلال غەریب، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، بەغدا، ساڵی ١٩٧٩، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراقی، لاپەرە (٢٨٩).
٣٨. (العراق القدیم، دراسة تحلیلیة لأحواله الإقتصادیة والاجتماعیة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦١).
٣٩. سەرچاوە ئاشوورییەکانیش باسی جۆرە دار خورمایەك دەکەن بە (دار خورمای باکوور) ناوی دەبەن، وا دەردەکەوێت ئەم جۆرە دارخوورمایە تایبەت بووە بە کوردستانەوەو لە ناوچەکانی تر شین نەبووە، تەنانەت جۆرێکی دیکەشیان باس کردووە پێی گووتراوە (دارخورمای شاخ):
- گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٣٧)، ساڵی ١٩٩٦، لاپەرە (٧٤).
- هەروەها لە یەکێك لەو مۆرە لوولەکییانەی کە لە نوزیدا دۆزراوەتەوە وێنەی دارخورمایەك لە مۆرەکەدا هەیە بروانە: بریتییە لە وێنەی دارخورمایەك، لەم لاو لەولایەوە دوو پیاو هەیە لە رووەکەی بە ئاسکە نەخشکراوە کە درێژی مۆرەکە (٢,٤ سم × ١,١ سم)، دەگەرێتەوە هەزارەی دووەمی پێش زایینی.
سەرچاوەکەی:
کتێبی (کنوز من العراق من العصور القدیمة حتی الاسلام)، متحف راوتشتراوخ بوست لمدینه کولونیا، ٢٧ حوزەیران تا ٢٠ ئەیلول، ساڵی ١٩٦٤، لاپەرە ٧٣.

– هەروەها مۆرێکی لوولەکی ترکە دەگەرێتەوە هەمان سەردەم بریتییە لە: پیاوێکی راوەستاو بەرامبەر دارخوورمایەك، لە تەنیشتەکانییەوە ئاسکە هەیەو لەژێرەوە نەخشو نیگاری ئەندازەیی هەیە، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٣).
٤٠. (العراق القديم، دراسة تحليلية لأحواله الإقتصادية والاجتماعية)، لاپەرەكانی (٣٩٥–٣٩٦).
٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٠٣).
٤٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٤٠٤–٤٠٥).
٤٣. هەمان سەرچاوە.
٤٤. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٢).
٤٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٤١٢–٤١٣).
٤٦. (حضارة العراق)، بەرگی دووەم، ١٩٨٢، بەغدا، لاپەرە (٣٥٦).
٤٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٢٤٤–٢٤٥).
٤٨. گۆڤاری (سۆمەر)، بەرگی یەکەم، جلدی سی و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧، لاپەرە (٤١).
٤٩. گۆڤاری (سۆمەر)، بەرگی یەکەم، جلدی سی و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧، لاپەرە (٤٥).
٥٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٤٦–٤٧).
٥١. (حضارة العراق)، بەرگی دووەم، بەغدا، ١٩٨٢.
٥٢. (الحياة اليومية في بلاد بابل وآشور)، جۆرج کونتینو، وەرگێرانی: سەلیم تاهای تکریتی و رۆهان عەبدو تکریتی، ساڵی ١٩٧٩، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، لاپەرە (٤١).
٥٣. (العراق القديم، دراسة تحليلية لأحواله الإقتصادية والاجتماعية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٥).
٥٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٦٥–٣٦٦).
٥٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٦).
٥٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٨).
٥٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٦٨–٣٦٩).
٥٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٩).
٥٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٦٩–٣٧٠).
٦٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٩).
٦١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٦٩–٣٧٠).
٦٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٧١–٣٧٣).
٦٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (٣٧٥–٣٧٨).
٦٤. گۆڤاری (سومر)، ژمارە دیار نییە، بە زمانی ئینگلیزی، نووسینی ایرنست لنجمان (Ernest R. Lacheman) بە ناونیشانی (دەستنووسەکانی نوزی و عەرەفە لە مۆزەخانەی عێراق)، هەر یەکە لە برایان مامۆستا نادر میخا زۆراو ئەندازیار محەمەد عەزیز لە ئینگلیزییەوە بۆمیان وەرگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی،هەر نموونەیان زۆربێت.
٦٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (١١٦–١١٨).
٦٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (١١٩–١٢٠).
٦٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی (١٢١–١٢٢).
٦٨. (العراق القديم)، لاپەرەكانی (٣٨٢–٣٨٣).
٦٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٦٥).
٧٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٨٣).
٧١. گۆڤاری (سومر)، بەرگی یەکەم، جلدی سی و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧، ژمارە ٤٦.
٧٢. (العراق القديم – دراسة تحليلية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٨٤).

**تەوەری سێیەم**

*** هاوسەردەمی ئەخمینی.. سلۆقی.. پرسی.. ساسانییەکان:**

زانیارییەکانمان لەم سەردەمانەدا زۆر کەمن لەبەر نەبوونی سەرچاوەی پێویست کەپەنجە بۆ باری ئابووری شاری کەرکوك رابکێشێت، هەرچەندە زانیارییەکانمان کەم بن، بەڵام رەنگدانەوەی ژیانی ئابوورییەکەی زۆر بەروونی دیارە چ لە رووی بڵاوبوونەوەی ئاینی زەردەشتی و مەسیحیەت هەروەها راگوێزتنی شارستانییەتی (فارسی)و (یۆنانی) و (رۆمان)ی. لەگەڵ ژیارو ژیانەکەدا بارێکی نوێو تازە خوازانەی خولقاند کە تا سەردەمەکانی ئێستاشمان رەنگی داوەتەوە لەناو بارە ئابوورییەکە. چونکە توانەوەی هەموو ئەمانە لە بۆتەی ئەو سەردەمانەدا وای کرد ببێتە دروست بوونی مۆرکێکی خۆماڵی و باوو گونجاو.. رەنگدانەوەی پیرو باوەری زەردەشتی و چەوسانەوەیان لە بارە سیاسییەکەدا وای کرد کە بۆچوونە ئابوورییەکە بە شتێکی پیرۆز دابنرێت لە گوندو لادێکاندا. لە دوای هەرەس هێنانی (بابل)و (ئاشووری)یەکان وەکو هێزێکی فراوانی (میزۆپۆتامیا)، کە سەرهەڵدانی فارسەکان لە ناوچەکەداو فەرمانرەواییان تا ماوەیەکی زۆر لە عێراقدا، وای کرد سەردەمێکی جیاواز دروست بکات کە تا هاتنی ئیسلامەتی و تا ماوەیەکی چا کی بڵاوبوونەوەی ئەو ئاینەو کارتێکردنی شوێنەوارەکانیان لە بارەکانی ئاودێری و کشتوکاڵی و پرد دروست کردندا.

"لەسەردەمی (ئەخمینی)یەکاندا وڵات دابەشکرابوو بەسەر بیست (دەهقانە)، لەسەر هەر یەکە لەم (دەهقانە) جێگرێکی دانابوو بۆ بەرێوەبردنی کارگێری (دەهقانە) کە، بۆ کۆکردنەوەی باجی سەپێنراو بەسەریدا"[1].

لە کاتی هاتنە سەر حوکمی (ئەخمینی)یەکان هەموو شارەکانی سەروو (بەشی ئاشووری) لەنێوان ساڵانی (٦١٤-٦٠٩)ی پێش زاینیی تووشی رووخاندن و کاولکردن بوو بوو، تەنها (هەولێر) نەبێت، کە هەر هەمووی پێکهاتبوو لەگوندی بچووك.. بچووك..[2].

ئەوەی زیاتر شارستانیەتەکەی تووشی نووچ دان و داروخان کرد لە شارستانی میزوپۆتامیا، ئەو بارە ئابوورییە تازەیە بوو هاتە ئاراوە کە هاوگونجاو نەبوو لەگەڵیدا، لەبەر ئەوەی شادەماری سەرەکی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینییەکان بریتی بوو لە رێگای پاشایاتی درێژەوە بوو لە (ساردس) بۆ (سووسە)، بەڵام ئێستا رێگا دەبرێت لە پایی چیاکانی نزیکی (بابل)و بازرگانی لەگەڵ (هیند)و (رۆژهەڵات) بەگشتی بەدەستی (ئێرانی)یەکانەوە بوو بەو پێیەی نزیکترن لەو وڵاتانەوە، سوریا لە (میزۆپۆتامیا) جیاکرایەوە، کۆکردنەوەی باج و سەرانە لە سەرووی عێراق و خوارووی لەسەر مەزربانییەی نوێیەمی ئیمپراتۆریەتەکە بوو و دەبێت هەموو ساڵێك هەزار (تالنت) لە زیو بدات بە (باج)

بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی کۆشکی پاشایەتی فارس، لەگەڵ رازیکردنی کارمەندانی کارگێری باج و سەرانە کە زۆر قورس بوونە[3].

"هەرلەسەردەمە زووەکانی (بابلی)و (ئاشووری)یەکاندا هێڵە بازرگانییەکان دەرۆیشتن بە ناوچە سەرەکییەکانی (نەینەوا)و (هەولێر)و (ئەراپخا)و (کەرکوك) ئینجا بۆ (بابل)، کە ئەم رێگا بازرگانییە رێگای پاشایەتی بووە لە سەردەمی (ئەخمینی)یەکاندا، چونکە لەبەر ئەوە هێڵی پێکەوە بەستنەوەیە لەنێوان لێوارەکان و شارەکانی (ئاسیای بچووك) بۆ (برسیبۆلس)[4] لە کاتی هاتنی (ئەسکەندەری گەورە)دا ژیانێکی نوێی دا بە وڵات جیاواز لەوانەی پێشوو[5] هەستا بە بەستنەوەی گشت شارەکانی (هیلینی) بەرێگای بە ناوبانگی کە دەیبەستێتەوە (ئاسیای ناوەند) بە (میزۆپۆتامیا)، لە هەمان کاتدا دەستی کرد بە گەشەکردنی گواستنەوەی شتوومەکی بازرگانی[6]. لە سەردەمی (سلۆقی)یەکاندا ژیانێکی ئابووری و دانیشتووانی تازەیان هێنایە گۆڕێ، کە لەو سەردەمەدا کارتێکردنێکی گەورەی کردە سەر شارە کۆنەکانی عێراق، شارێکی وەکو (کەرکوك)، دووبارە گەشەی پێکرایەوەو (سلۆقس) هەستا بە رووخاندنی شوێنە کۆنەکەی (قەڵا)، دووبارە دەستی کردەوە بە دروست کردنی لەسەر شێوازێکی ئابووری و سەربازیانە کە لەگەڵ ژیانی ئەو سەردەمەدا بگونجێت، لە خوار قەڵاوە کەوتە دابەشکردنی زەوی وزاری کشتوکاڵی بۆ نیشتەجێکردنی خەڵك و دەستی کرد بە دروست کردنی رێگای بازرگانی و بەستنەوەی بەشارەکانەوە لە دوای مردنی ئەسکەندەر لە کۆتایی سەردەمی سلوقییەکاندا، تەمو مژی ئاژاوەو گێچەڵی سیاسی سەری هەڵدا، کە هۆیەکی گرنگی نەبوونی ئاسوودە بوو لەو وڵاتەدا، لە ناو خۆیشدا بوو بەهۆی گەشەنەکردنی ئاودێری و کشتوکاڵ، بەهۆی سەردەمی ئاژاوەگێرییەوە، بوو بە گرنگی سەرهەڵدانی پیرۆی هۆزایەتی لە وڵاتداو زۆربوونی ژمارەی پاشاو گەورە پیاوان کە دەسەڵاتێکی نیوە سەربەخۆیان وەرگرت بێ ئەوەی دەسەڵاتی سەرەکی دەستی بروات بە سەریاندا[7]، کە لەگەڵ خۆیدا زیانێکی گەورەی دا لە هەموو بوارەکانی ئابووری و تووشی نووچ دان و فەوتاندنی (داهات) هات و کەرکوك یەکێك بوو لەو شارانەی کە کەوتنە ژێر ئەو بارەو بووە قوربانی قۆناغە سیاسییەکەی ئەو کاتە.

"لە سەردەمی سلوکییەکاندا هەندێك لە پارێزگارەکان دەیانتوانی سکە لێبدەن و دراوەکانیان لە زیو دروستبکەن، جێگەدراوەکانی ئەسکەندەر دەیانویست بە سەر ناوچەیەکی گەورەی رۆژهەڵاتدا دەسەڵات پەیدا بکەن. بۆ ئەم کارەش ئامادەبوون کە شێوەی ژیان و داب و نەریتی یۆنانیان بەسەر ناوچە داگیرکراوەکاندا بسەپێنن بە تایبەتی شێوەی بەرهەمهێنان لە ئاسیا زیاتر بڵاوبکەنەوە، ئەو شێوەیەش کۆیلەداریبوو.

فراوانکردنی شارەکانیش بە بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە بەرهەمهێنانە یارمەتی ئەوەی دەدا لەناو شارەکاندا کارە پیشەییەکان و بازرگانی و کاروباری بەرێوەبردن ئەنجام

بدەن، لە دراوسێیەتی دێهاتەکانیشەوە گەلێك زەوی‌و زاری فراوان بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ بە یۆنانییەکان درابوو. ئەم کارەش بووە هۆی ئەوە کە ژمارەی کۆچکربووەکان زیاتر بن"[8].

"لەسەردەمی (پرسی)و (ساسانی)یەکاندا. هەوڵیان داوە بە هەموو جۆرێك دەست بگرن بەسەر داەو دەزگاکانی وڵاتداو بەکاری بهێنن لە بەرژەوەندی خۆیان‌و لە هەمان کاتدا دەستیان کرد بە ئاوەدان کردنەوەی پرۆژەکانی ئاودێری کۆن‌و دروست کردنەوەی بەربەستەکان. کە تا ماوەیەکی چاك پشت گوێ خرابوو، ئەوەی زیاتر بایەخیان پێ دەدا، دەسەڵاتی ناوەندییان دەوری هەبوو لەم کارانەدا. هەروەها بەهۆی ئاسوودەیی سیاسی‌و بێجگە لە بەکارهێنانی کارتێکردنی بیروباوەڕی زەردەشتی کە بوو بووە ئاینێکی رەسمی دەوڵەتەکە لەسەردەمی ساسانییەکاندا، زیاتر رێنماییەکانی بوو لە بایەخ دان بە زەوی‌و کشتوکاڵ"[9]، ساسانییەکان گیروگرفتی زەوییان چارەکرد. ئەویش بەوەی هەموو زەوی کشتوکاڵی موڵکی دەوڵەتە، دەگەڕێتەوە بۆ (پاشا)، کە بەدەستی هێناوە بەهۆی داگیرکردنی ئەو شوێنانەوە. دەستیان کرد بە دابەش کردنی زەوی بەسەر ئەو جوتیارانەی دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانی دیاری کردووە.و مافی ئەوەیان هەیە چۆن بەکاری بهێنن، لەبەر ئەوەی (باج)و (سەرانە)ی زەوی دەدەن، شێوە (پیرۆ- نظام)یەکی تایبەتییان دانا بۆ دابەشکردنی ئاو بەسەر جوتیاراندا بەشێوەیەکی رێکوپێك‌و دادوەرانە[10].

"پرسییەکان بایەخێکی زۆریان داوە بەدەست بەسەرگرتنی ئەو رێگایانەی کە رۆیشتووە بۆ سەرووی (عێراق)و شارە ئاوەدانەکانی (ئاشووری کۆن)"[11]، هەروەها بایەخیان دا بەدروست کردنی (خان)، تایبەت بەحەوانەوەی بازرگانەکان، دروست کردنی وێستگە لە(عێراق)دا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئاژەڵەکان‌و گالیسکەکانیان، تا بۆ ئەوەی بەپەلە ئەم رێگایانە ببڕن.[12] نموونەی بیناکاری‌و شوێنەواری ئەم جۆرە خانانە زۆرن لە ناوچەکانی کەرکوك کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو مێژووەی ئەو کاتەی کەرکوك.. کە بەڵگەمان ناوچەکانی (کفری-کەرکوك)و (خورماتو-کەرکوك)و (کفری-بەغدا). (نوشێروان)، هەستا بەگەورەترین کار ئەویش بە هێنانی کەرەستەی پێویست بۆ چاککردنی پردو رێك خستنی رێگاو بان‌و چاککردنی رێگای (باج) کۆکردنەوە، دانانی رێنومایی لە چاك کردنی خەڵك‌و خۆش گوزەرانیدا[13]، گەلێك پاشماوەی ئاودێریمان بۆ بەجێ ماوە لە سەردەمەکانی (پرسی)و (ساسانی)یەکاندا لە ناوچەکانی (حەویجە)و (مادهۆز- ماحوز)و (کفری)و (کەلار)و (تازە) و (خورماتوو)دا کە بەڵگەن بۆ بوونی رێبازێکی ئاودێری رێکوپێك، بەکاریان هێناوە بۆ ئاودێری زەوی کشتوکاڵی‌و پاراستنی لە لافاوو هەڵسانی ئاو.

*** شێوەی بەرهەمهێنانی ئابووری لە سەردەمی ئەشکانییەکان:**

گەشتیاری‌و بازرگانی دوو بناغەی دابینکەری ئابووری سەردەمی ئەشکانییەکان بوون، زۆربەی کۆمەڵگا لە رێگەی کشتوکاڵەوە پێداویستی ژیانیان بەدەست دەهێنا، بەپێی بەڵگەو ئەو شوێنەوارانە کە دۆزراونەتەوە لەو سەردەمەدا موڵکداری بریتی بووە لە:

١. زەوی‌و زاری تایبەتی دەربار.
٢. ئەو زەوییانەی تەرخان کرابوو بۆ پەرستگاکان.
٣. ئەو زەوییانە کە بە شێوەی (تیول) بۆ دابینکردنی خەرجی سنووردانان‌و شاروانییەکان‌و قەڵادارەکان پێیان دەدرا.
٤. زەوییە گەورەکان کە بە میرات بۆ بنەماڵەکان دەمانەوە.
٥. موڵکی بچووکی وەکو باخ‌و باخاتی موڵکداری بچووکی ئازاد[14].

ئاژەڵداری بەشێکی گەورەی دیکەی کارو ئەرکی دێ نیشنەکان بوو: (مەڕ، بزن، گا، بەراز، ئەسپ، وشتر)یان پەروەردە دەکرد، هەموو جۆرەکانی سەرانەو ماڵیان‌و باج‌و گەلێکی تر لە دانیشتووان وەردەگیرا.

لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا، زمانی یۆنانی یەکێك بوو لە زمانە باوەکان کە برەوێکی تایبەتی هەبوو، بەڵام زمانی پەهلەوی‌و ئەشکانی برەوێکی زیاتر هەبوو، ئەم زمانە کە زمانی دانیشتووانی باکووری خۆرهەڵاتی ئێرانە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەشکانییەکاندا گەلێك پێشکەوتوو بوو، لە نووسیندا، ئەم زمانە هەر وەکو زمانی فارسی دێرین بە خەتی ئارامی بەکار دەهێنرا.

هەموو بەڵگە بازرگانییەکان لە بابلدا هەم بە ئارامی‌و هەم بە سریانی دەنووسرانەوە، دانیشتووانی نێوان دوو رووبار بە زمانی نەتەوەیی خۆیان دەدوان، بەڵام وورده وورده زمانی یۆنانی برەوی نەما[15].

لە نووسراوە زانستی‌و مێژووییەکاندا خەت‌و زمانی پارتی‌و پەهلەوی ئەشکانیان، تەنها بە پەهلەوی خوێندراونەتەوە کە بە مانای موڵکی پارتی دێن بەڵام هەندێك لە شارەکانی نێو دوو رووبار هەر وەکو جاران لە خەتی مێخی بابلی سوودیان وەردەگرت[16].

*** شێوەی بەرهەمهێنانی ئابووری لە سەردەمی ساسانیان:**

لە سەردەمی ساسانییەکاندا کشتیاری یەکێك بوو لە شێوەکانی بناغەی بەرهەمهێنان، چونکە لە ئایینی زەردەشتدا باشترین رێگای ژیان کشتیاریە، دەوڵەتی ساسانی خۆی بە پارێزەری ئایینی زەردەشت دادەنا.

تێدەکۆشان بە هەڵکەندنی جۆگەو هەڵکەندنی کارێزو دەرهێنانی ئاو و دروستکردنی بەنداوی ئاو، ئاو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزنەوە کە هۆیەکەیش بوو بۆ بەرهەمهێنانی زەوری‌و زار، کە پەیوەندییان بە خاوەن

مولکە گەورەکانەوە هەبوو، کە لەژێر ئاڵای نەتەوەیی، بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان و بەرگریکردن لە دەوڵەت زیاتر تێدەکۆشان، کە بەرهەمی باشترو زیاتر بەدەست بهێنن، خۆیان ماندوو بکەن.

ئەم رژێمە دیاردەیەکی نوێ بوو کە لە دوای ئەشکانییەکان دەرکەوت و هاتەکایەوە، لە راستیدا دەتوانین ئەوە بە شێوەیەکی نوێی بەرهەمهێنانی ئابووری و رامیاری و تەنانەت بە مەزهەبیشی بژمێرین[١٧].

بەم شێوەیە بەرهەمی کشتیاران بەپێی ئەو جۆرە کە یاسا دەستنیشانی کردبوو، مالیات وەردەگیرا کە ئەندازەی ئەو مالیاتانە بەپێی فراوانی و چەندایەتی زەوی و زارو بەرهەمەوە بوو، وەکو باو بوو شەش یەك و سێ یەکی بەرهەم بە ناونیشانی مالیات بە دەوڵەت دەدرا، چونکە لەو رۆژگارەدا دەوڵەت بە زۆری وا بەستەی مولکدارە گەورەکان بوو کە زۆربەیان لە دەرباردا دەستیان دەرۆیشت لە زەوییەکانی ئەوانەدا، کشتیاران سەرگەرمی کارکردن بوون کە ئەوانیش پابەندی زەوی و مولك بوون.

کشتیارانیش نزمترین چینی کۆمەڵگا بوون کە سەرۆکێکیان هەبوو بە ناوی (واستر یوشان سالار) کە بەپێی کارەکەی دەبا تێبکۆشێت و مالیات وەربگرێت و بیدات بە بەرپرسەکەی[١٨].

لەنێوان چینەکانی مولکداران و جوتیاراندا کەسانێکی دیکە هەبوون کە بە شێوەیەکی مامناوەندی لە دێهاتەکاندا دەژیان،س ئەمانە بە مولکداری بچووك دەژمێردران و مالیاتیان لەسەر نەبوو بەم کەسانەیان دەوت: (دهقان)، زاراوەی (دهقان) لە بناغەدا دەهگان بووەو تەعریبکراوە، بە مانانی خاوەن دێ یان سەرۆکی دێ دێت (کویخای دێ)، چونکە مالیاتیان نەدەدا لە قەرەبووی ئەوەدا دەبا لە کۆکردنەوەی مالیاتدا یارمەتی (واستر یوشان سالار)یان بدایە، بەم ئەرکەیان ژیانی ئەمانە لەژیانی جوتیاران باشتر بوو[١٩].

لە رۆژگاری ساسانیاندا بازرگانی گەشەی کردبوو، ئێرانیش بەپێی باری جوگرافیایی تایبەتی خۆی کە هەیبوو، ناوەندێکی بازرگانی بوو لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، بەم شێوەیە کە ئەو کاڵا بازرگانیانە کە لە چین و هیندو ئاسیای ناوەندییەوە بە نیازی خۆرئاوا رەوانە دەکران، دەبوایە بە ئێراندا یان بەو مەمالیکانەدا کە سەر بە ئێران بوو تێپەڕێت[٢٠].

لە سەرچاوەکانی وەکو بەرهەم و باج کە لە سەردەمی ساسانیان وەردەگیرا، وەکو باجی تایبەتی بە شێوەی سەرانە لە ئارادا هەبوو، بەم شێوەیە کە هەموو کەسانێك کە تەمەنیان لە بیست ساڵەوە تا پەنجا ساڵ بوو، لە سەرییان بوو کە باجی سەرانە بە دەوڵەت بدەن.

ئەم باجە کە (مالیات)یشیان پێدەوت، ئەڵبەتە ئەندازەی باجەکەش پەیوەندی بە دارایی و واریداتی کەسایەتییەکانەوە هەبووە، هەندێکجار دوانزە دەرهەم و هەندێکجاری دیکەش هەشت دەرهەم و شەش و چوار دەرهەم نووسراوە، باجی سەرانەیان تایبەتی لە سەرەتای هەموو ساڵێکەوە دیاری دەکرا[٢١].

*** کارتێکردنی ئایینی زەردەشتی و مەسیحی لەسەر ئابووری (کەرکوکدا):**

ئەوەی رەنگی داوەتەوە لە سەردەمی (ساسانی)یەکان بوونی ئایینی زەردەشتی بە ئاینێکی رەسمی دەوڵەتەکەو پەیرەوکردنی هەریەکە لەبرگەکانی لە جێبەجێکردنی لایەنە جۆر بەجۆرەکانی ژیاندا، بەتایبەتی ئابوورییەکە.

بڵاوبوونەوەی خێزانە سکاییە زەردەشتییەکان و موغە زەردەشتییەکان لە کەرکوك دا دەروازەیەکی فراوان بوو بۆ بڵاوبوونەوەی رێرەوی ئابووری ئەم ئایینە پیرۆزە لە بوارەکانی کشتوکاڵ و ئاودێری و جیاکردنەوەی ئاژەڵی زیان بەخش و سوود بەخش و پەروەردەکردنی بەپێی فێرکراوەکانی زەردەشتی، بۆیە بمانەوێت و نەمانەوێت کارتێکردنی بەجێ ماوە تا ئەم سەردەمانەی ئێستامان لە برگەی تۆبەکردنی کەسێك بەرامبەر (ئاهورامەزدا) تا لێی خۆش بێت، دەبێت هەستێت بەم کارانەی خوارەوە بۆ ئەوەی تاوانەکەی لەسەر لابچێت:

١. یارمەتی ئەو جوتیارانەی کە کەرەستەی کشتوکاڵییان نییەو نیوە چڵە، دەبێت بیانداتێ.

٢. پاکردنەوەی زەوی لە پیسی و ئەو کەرەستە زیان بەخش و ئامادەی زەوییەکە بۆ کێڵان و تۆوکردن.

٣. هەڵگرتنی جۆگەو گەیشتنی ئاو بۆ ئەو زەوییانەی کە تینوویانە.

٤. پرکردنەوەی زەوی لە درزو قڵیشی زەوی.

٥. ووشك کردنی زەوی نزم و گۆماو بەستوو لە ئاو.

٦. دروستکردنی پردو رواندنی رووەك و درەخت.

٧. کوشتنی ئاژەڵ و گیانەوەری زیان بەخش لە مرۆڤ و ئاژەڵی ماڵی و بەروبوومی کشتوکاڵی..[٢٢].

ئەگەر سەیرێکی ئەو برگانەی سەرەوە بکەین دەتوانین چەند تێبینییەك سەرنج بدەین لە بەراوردکردنی ژیانی ئەمرۆی ناوچەی کەرکوك کە کاریگەرییەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەر ئایینی زەردەشتی:

١. بوونی کشتوکاڵ بە کۆڵەکەی ئابووری ناوچەکە.. پشت بەستنی بەگەلێك گوندو لادێی کشتوکاڵی دروست بوو لەسەر ئەو بناغەیە.

٢. سەیرکردنی پیرۆزی کشتوکاڵی و بەرێز سەیرکردنی لەلایەن خەڵکەوە، رێزگرتن و نەفەوتاندنی بەروبوومی کشتوکاڵی.

٣. زۆری لادێکان لەو شوێنانەدا ئاوەدان بووەتەوە کە زەوی کشتوکاڵی و جۆگە، رووباری تێدا هەیە.. زیاتر تۆوکردن و کشتوکاڵەکە دەوری بینیووە لە دروست بوونی گوندەکەدا.

٤. دروست کردنی پردو رواندنی درخت رەمزێکی باوی جوتیاری (کەرکوکە)، ئەویش بەبوونی دروست کردنی دارستان و سەوزایی لە هەموو گوندەکاندا، و پیرۆزی رەنگدانەوەی رەنگی سەوزو شین لە ئیسلامدا خۆی لە ئایینی زەردەشتی دەبینێتەوە.

٥. لە گەلێك کاتدا ئاو کەم بووە مرۆڤی ناوچەی کەرکوك

هەوڵی هەڵکەندنی کارێزی داوە لە شوێنێکی دوورەوە بۆ ناو گوندەکە، چونکە بوونی ئەو ڕێژە زۆرەی کارێز لە گوندو شارەکەندا ئەو بۆ چوونەمان دەسەلمێنێت.

٦. شارەزابوونی لادێکان لە ئەزموونی کشتوکاڵیو بەرەو چاکتر کردنی بەرووبوومی کشتوکاڵی.

٧. گەلێك جار هەوڵی چاککردنی زەوی بێ فەڕی داوە بۆ زەوی کشتوکاڵی بەبەرهەمو چاککردنی.

٨. یارمەتی دانی جووتیار لەگەڵ جووتیار لە کەرەستەی ئامرازی کشتوکاڵیو هەوڵدان بۆ داپۆشینی کەمو کورییەکانی یەك دێ.

هەر لەو سەردەمانەدا بڵاوبوونەوەی ئاینێکی تر دەوری بینی ئەویش ئایینی مەسیحی بوو "کە لە-سەدەی یەکەمی زایینی دا. کریستیانی لە ڕێگەی شامو ئاسیای بچووکەوە هاتووەو لە ناو (پارت)دا بەشێوەیەکی کەمو لە ناوچەی (هەولێر)و (کەرخ-سلوخ) کەرکوكو (حەلوان). پێگەی بە هێزیان بووە، (سانت تۆماس) مزگێنی دەری ئەم ئایینە بووە لە زەوی (پارتەوە) گەیوەتە (هیند)"[23].

"سەیر دەکەین کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس)، سەیرکردنێکی تایبەتی هەیە لە رووبەرووبوونەوەی (سوو-الربا)، کە ئەمە کارتێکردنێکی گەورەی هەبووە بە مێژووی ئابووری ناوچەکانی رۆژئاوای (میزۆپۆتامیا)دا، چونکە (کتێبی پیرۆز) دژی ئاکارەکانی رەوشتی (بابلی) بووە لە رووی بیرو بۆچوونی ئابوورییەوە نەك لە رووی بیروبۆچوونی وێژەییەوە"[24]، بەڵام ئەگەر سەیری بەراوورد بکەین لەنێوان زەردەشتی و مەسیحییەتدا دەبینین کە باوەڕی (مەسیحییەت) گەشەی نەکرد وەکو ئەوەی ئایینی زەردەشتی، چونکە زەردەشتی ئایینی رەسمی دەوڵەتی ساسانییەکان بوو، سەردەمە کارگێڕییەکانیان لەژێر کارتێکردنی جێبەجێکردنی برگەکانی ئاینییەکەدا بووە. "هەر لە سەرەتای پەیدابوونی ئایینی مەسیحییەت بەرهەڵستییەك لەنێوان کڵێسەو مووگەکانی ئایینی زەردەشتی لە دەوڵەتی ساسانیدا پەیدا بوو بوو، لە سەرەتادا زۆربەی مەڵبەندی (مەسیحییەت لە وڵاتە شاخاوییەکانی کوردا بووە، لەبەر ئەمە کە زۆربەی زۆرداریو چەوسانەوە کەوتبووە سەردانیشتووانی ئەو وڵاتە (فەنەك، بازەبدا، باقەردا، مەیافارەتین، هەولێر، کەرکوك)، ئەو چەوساندنەوەیە لە سەردەمی حوکمرانی (شاپووری یەکەم) و (ئەردەشێری دووەم)دا گەیشتە پلەیەکی بەرز، کە هەزاران لەو دانیشتووانە وەکو مەسیح هەڵواسران.."[25]. هەر ئەم بەربەرەکانییانە وای کرد کە کارتێکردنی بەسەر ئابووری ئەو ناوچانەدا بە دەربکەوێتو کاریکاتە سەر گەشەنەکردنی ژیانی ئابووری ئەو ناوچانە وەکو پێویست، چونکە گەلێك جار دەبووە هۆی کاولکردنی زۆری زەوی کشتوکاڵی ناوچە تاڵان کراوەکان، ئەگەر بهاتایە دەسەڵات دار ڕێگەیانی بدایە، هەروەکو ئەوەی رووی دا لە گوندی (لاشووم-لاسین) لە ناوچەی خورماتوو.


* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (تأريخ حضارة وادي الرافدين، في ضوء مشاريع الري الزراعية)، بەشی دووەم، لاپەرە (١٧٤).

٢. (العراق القديم)، جۆرج رۆ، لاپەرەکانی (٥٤٩-٥٥٠).

٣. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٥٥٠).

٤. (المرشد الى مواطن الآثار)، فوئاد سەفەر، تاها باقر، گەشتی پێنجەم، لاپەرە (٢).

٥. (العراق القديم)، هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە (٥٥٢).

٦. هەمان سەرچاوە.

٧. تاريخ حضارة وادي الرافدين في ضوء مشاريع الري الزراعية والمكتشفات الآثاري والمصادر التاريخية، د. احمد سوسة، بەرگی دووەم، دار الحرية، لاپەرە (١٧٢).

٨. (دێرینەناسیو هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنشیو ئەشکانیو ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وریا قانیع، لاپەرە (٣٨٢).

٩. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٧٢).

١٠. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٧٣).

١١. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٧٢-١٧٣).

١٢. (تأريخ فن العمارة العراقية عبر العصور)، شەریف ئەلراس، لاپەرە (١٩٦).

١٣. (تجارة العراق قديماو حديثاً بحث تاريخي إقتصادي)، يوسف رزق غنيمه، چاپی یەکەم. چاپخانەی (العراق)، بەغدا، ساڵی (١٩٥٢)، لاپەرە (٢٤).

١٤. (دێرینەناسیو هونەر لە سەردەمە مێژووییەکانی دەوڵەتی مادو هەخامەنشیو ئەشکانیو ساسانی)، عەلی ئەکبەر سەرفراز، بەهمەن فەیرۆزمەندی، وریا قانیع، لاپەرە (٥٣٥).

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣٦).

١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣٧).

١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣٤).

١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣٧).

١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣٨).

٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٣٧).

٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٤٥).

٢٢. گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کوردی) جلدی سێیەم، ژمارە (٢) بەغدا، ساڵی ١٩٧٥، لاپەرە (٥٩٢).

٢٣. (ئاین و باوەر لە کوردستاندا)، کەریم زەند، ساڵی ١٩٧١، سلێمانی، چاپخانەی (کامەران)، لاپەرە (١٤).

٢٤. (بلاد ما بين النهرين)، ليواو نيهايم، لاپەرە (١٠٩).

٢٥. (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری)، دکتۆر جەمال رەشید، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ساڵی (١٩٨٨)، لاپەرە (٤٤٩).

**تەوەری چوارەم**

*** ئەم بەشەی تەرخانە بۆ لێکۆڵینەوەی گۆڕانە ئابوورییەکان لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام تا ڕووخانی دەوڵەتی (عوسمانی)و هاتنی ئینگلیزەکان بۆ (عێراق):**

گۆڕانێکی نوێ ڕوویدا، بوو بە هۆی هەرەس هێنانی هەموو سەردەمەکانی پێش خۆیو قۆناغێکی نوێی دروست کرد، کە لەگەڵ خۆیدا گەلێك ڕاوبۆچوونی تازەی قۆستەوە، بەربەرەکانییەکی دروست کرد، تا لە دوا ڕۆژدا بوو بە هۆی هەرەس هێنانی دەوڵەتی ئیسلام، چونکە دروستبوونی ڕاوبۆچوونی ڕێرەوی (مذهب)ی جیاوازو جیا بوو لە چوار چێوەی ئیسلام، خواستەکانی ئیسلامی قۆستەوەو خستیە سەر چوارچێوەیەکی سەردەمانەی تێکەڵاو بە بارە ڕامیاریی و ئابوورییەکە.

ئەوەی لە سەرەتاکانی ئیسلامەتیو قورئاندا پێڕەوکراو ڕێی ڕاستی بۆچوونەکانیان بانگێشتە دەکرد، لایەنە ئابوورییەکە بەلایانەوە زۆر گرنگ بوو، کردیانە دەروازەیەکی گرنگ بۆ بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام، چونکە ئەگەر ئابوورییەکەیان نەخستایەتە ئەو بووەتەیەوە، ئەو ئیسلامەتییە بەو جۆرە بە پەلە گەشەی نەدەکرد کە کردی لە ماوەیەکی کورتدا.. ئیسلامەتییەك ڕامیاڵێنێکی گشتی هەموو لایەنەکانی سەردەمەکانی پێشوو بوو، کە هەم ڕایماڵیو هەم گەلێك لایەنی ژیانی ئەو سەردەمانەی پێش خۆی قۆستەوە.. کە زیاتر ئەو قۆستنەوانە لەو لایەنە خۆی دیتەوە کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا دەگونجاو ئاواتەکانیانی جێبەجێ دەکرد.

ئەگەر بارە ئابوورییەکە نەخرایەتە بەردەم شەرکەرێکی موسڵمان بۆ مەسەلەی بەرگری کردن لە ئیسلام ئاوا بەو شێوە زەقەوە بەرەو پێش نەدەرۆییو بەرگری لە (قورئان) و ئاینەکەی نەدەکرد، چونکە دابەش کردنی زەویو سامانی کشتوکاڵیو پیشەسازی ناوچە زەوتکراوەکان وای دەکرد کە پاڵنەرێت بۆ ئەوەی ناوچەی زیاتر بگرن تا دەسکەوتی زیاتر بە دەست بهێنن.

یەکەم هەنگاوێك کە ئیسلامەتی کردی لە داگیرکردنی ناوچەکەدا، ئەویش بەکارهێنانی شێوازێکی تازە لە داڕێژانی زەویو ئاودێریو چاکیو خراپی زەوییەکە چونکە هەڵتەکانی ئەو ئابوورییەی پێشوو هەرواسانا نەبوو، بۆیە هەوڵیانداو لە سەرەتادا کە ئەو یاسایانەی باوبوو تارادەیەك لەگەڵ یاسا ئابوورییەکانی ئیسلامدا مووتروبە بکات یان بهێڵێتەوە بۆ ماوەیەکی تر تا شارەزاییەك وەرگرێتو پەرەی پێ بدات، دەرچوون لەناوچەیەکی بیابانی وشکەوە بۆ ناوچەیەکی دەشتو دەرو کانیو ڕووبارو سەوزایی، پێویستی بە کات هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بگونجێتو بتوانێت یاسای ئابووری نوێی بۆ بگونجێنێت.

"عەرەبەکان چونکە خۆیان هێشتا شارەزای کشتوکاڵ نەبووبون هاتوون موڵکی خاوەنو زەوی ئەمیرییان بەسەر خەڵکە کۆنەکەدا دابەش کردووە، دڵیان خۆش کردوونو لەسەر ئەوەش موڵکانەو زەکاتی سوکیان لێ سەندوون.."[1]، "کاتێك هێزی عەرەبی ئیسلامی هاتوونەتە (عێراق)و داگیریان کردووە زۆری دانیشتووانەکەی جوتیار بوونەو پیشەیان کشتوکاڵی بووە لە گوندەکان دانیشتوون.. ڕێگەیان نەداوە لە گوندەکان کۆچ بکەنو لەسەردەمەکانی پێش ئیسلام کەوتبوونە ژێر کارتێکردنی پەیرەوی (نظام) یەکی دەرەبەگی ووشکەوە. کە دەوڵەت دەیپاراستو باڵادەست بوو بەسەریداو ئەوانەی ئەم کارانەیان لەسەردەمی (ساسانی)یەکان جێبەجێ دەکرد دەستو پەیوەندی پاشاو خزمەکانیان بوون.."[2].

(عومەری کوری خەتاب) هەستا بەرێکخستنەوەی زەویو زاری کشتوکاڵیو باجێکی نوێی دانا لەسەر کشتوکاڵ کە پێیان دەوت (خراج) کە بڕیاری لەسەر دەدرا بەپێی ئەو ڕووبەرە زەوییەی کە بگونجێت بۆ کشتوکاڵو ئەو یەکە ڕووبەرەی (وحدة المساحة) کە خەراجەکەی لەسەر دیاری دەکرا پێی دەوترا (جەریب) کە بریتی بوو لە (٦٠×٦٠) کە دەکاتە (٣٦٠٠) چوارگۆشە، کە بەرامبەرە بە پێوانەی ئێستا (١٥٤٠)م٢،و (باج) لەسەر هەموو زەوییەکی کشتوکاڵییەکە بچێنرێت یان نەچێنرێت.

"ڕێژەی (خەراج) دەگۆڕێت بەپێی جۆری کشتوکاڵەکە کە لەسەر یەك (جەریب) گەنم چوار دەرهەم دانرابوو، لەسەر (جۆ) دوو دەرهەم، لەسەر دارخورماو میوەهات (الكروم)و لۆکەو جەت شەش دەرهەم دانرابوو. (خەراج) کەم کرابۆوە لەسەر ئەو زەوییانەی کە دوورن لەشارەوە یان کەم بەرهەمی، ئەوا کەمتر لەو ڕێژانەی سەرەوەیان دەدا، هەروەها جوتیار (خەراج)ی لێ نەدەسەنرا ئەگەر کشتوکاڵەکە سەوزە بووا یان تەنها بەشی خۆی بکردایە بەرهەم هێناکەش کەم بوایەو ڕێژەکەی گۆڕاو بووایە لەبەرهەمهێناندا هەروەها ئەو زەوییانەی کە بەکار نەدەهات بۆ کشتوکاڵ یان ئاو دایپۆشیبوو، بووبوو بە گۆڵاو یان ئەو زەوییانەی کە ئاسیاوو ڕێگاو خانووی تێدابوو (خەراج)ی لەسەر هەڵگیرابوو"[3].

"ڕێگە درابوو بە جووتیار کە(خەراج) لەماوەی ساڵێکدا ئەگەر نەیبێت بە سێ جار (اقساط) بیدات، یان هەندێك جار (خەراج) کۆدەکرایەوە (بەگەنم) لەجیاتی پارە ئەگەر جووتیارەکە پارەی نەبێت. "خەراج سوودی دەگەڕایەوە بۆ جوتیارەکە چونکە لەبەر ئەوەی ڕێژەی نەگۆڕ بوو، جووتیار ئەگەر بەرهەمەکەی زیاد بکردایە یان نەکردایە دەکەوتە سەر ئەستۆی خۆی لەکارکردندا..، چونکە هەر کەمتەرخەمییەك دەگەڕایەوە ئەستۆی جوتیارەکە"[4].

(کەرکوک) ناوچەیەکی سەر بەدەوڵەتی (ساسانی)یەکان بووە لەبەر ئەوە ئەو یاسا ئابووریو سەربازییانەی لەوە پێش کارتێکردنی خۆی هەبووە، کاتێك ئیسلامەتی بڵاوبووەتەوە لەو ناوچەیەدا، بەهەمان شێوەی (عێراق) کەوتووەتە ژێرکارتێکردنی یاسا ئابوورییەکانی ئیسلام، چونکە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە لە ڕووی ئابوورییەوە، خاوەنی بەرهەمهێنانی (گەنم)و (جۆ)و میوەهات بووە، لەبەر ئەوە جێگای چاو تێبڕینی دەوڵەتی ئیسلامی بووە، هەر ئەمەش وای کردووە تا ماوەیەکی زۆر جێگەی

بەربەرەکانی بێت لە بڵاوبوونەوەی (ئیسلام لەناوچەکەدا. بڵاوبوونەوەی (زەردەشتی)و جێی نزرگەی مەسیحی بێت لەو ناوچەیە وایکرد گەلێك هەڵگری رێڕەوی ئایینی ئەم ئاینانە، ئابوورییەکی زەردەشتی لەسەر کشتوکاڵ وای کرد تووشی بەربەرەکانی بێتو بە تۆبزی یاساکانی ئیسلامی تێدا بڵاوبکرێتەوە.

کاتێك ئیسلامەتی بڵاوبووە بیری لەوە کردەوەکە زەوی لەژێر دەسەڵاتی جووتیار نەك شەرکەردا بمێنێتەوە کە ئەمەش بە بەرژەوەندی ئیسلامدا خۆی قۆستەوە، "لەسەردەمی (عومەری کوری خەتاب)دا یاسایەکیان دەرکرد بەهێشتنەوەی زەوی کشتوکاڵی لەژێردەستی جووتیاروە بەرامبەر ئەمە (خەراج) دەدەن بە دەوڵەتی ئیسلام، چونکە دابەشکردنی بەسەر جوتیاران دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو زەوییە جووتیار تێدا کار بکاتو بەرامبەر ئەوە ( باج) بدات.و دەرکەوت دەبێتە سەچاوەیەك بۆ ژیانی شەرکەر، شەرکەر بەشداری دەکات لە فراوان کردنی سنووری دەوڵەتی ئیسلامدا. کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئاسایش بهێڵێتەوەو جوتیار بپارێزێت، چونکە بەکارهێنانی زەوی کشتوکاڵی لە لایەن شەرکەرەوە دەبێتە هۆی جێگربوونیو وازهێنان لە کاری سەربازیو شەر، خۆ خەریك کردنی خۆی بە کێڵانی زەوی کشتوکاڵی.."[5].

لە کاتی هاتنی (عەباسییەکان) بۆ (عێراق) بوو بە هۆی گۆرینی موڵکدارێتی زەوی لە (ئەمەوی)یەکانەوە بۆ (عەباس)ییەکان پاش ئەوەی (عەباس)یەکان دەستیان گرتە سەر دەسەڵاتی رامیاری دەوڵەتی عەرەبیو ئیسلامیدا زۆری ئەم زەوییانە موڵکدارییەکەی دەگەرایەوە سەر زەوی (سواف)و زەوی (بطائح)[6]. "خەلیفەی عەباسی توانای دابرینی پارچەی زەویو زاری هەبوو بۆ خەڵكو هەموو جۆرەکانی میریو لە چینەکانی کۆمەڵ"[7]، "بەڵام لە مەسەلەی پرۆژەکانی ئاودێریدا هەر لە سەردەمی فەرمانرەوایی (هیشام کوری عەبدولمەلیك)دا بایەخ دراوە بە جوڵانەوەی ئاودێری لە ناوچە دەشتییەکانی (میزۆ پۆتامیا)دا لە سەروو خوارووی، هەوڵی ئەوەیان داوە. کە بایەخی پێ بدەنو گەشەی پێ بکەن.

لەسەردەمی دەوڵەتی (عەباسی)دا بەهەمان شێوە بایەخیان داوە بە ئاودێریو رێکخستنی ئاوەرۆ دابەش کردنیدا. سەرچاوەکان لە ناوچەی (کەرکوك)دا ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو شیوانەی ئاو وەردەگرن لە رووباری زێی بچووك هەندێکی لەسەردەمی عەباسییەکاندا هەڵکەندراوە.. بەناوبانگ ترین لەو رووبارە لە ناوچووانە هەردوو رووباری (فیل)و (عەباس) کە ئێستاکە ناودەدرێن بە چاڵاوی (فیل)و چاڵاوی (عەباس)"[8].

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لە سەردەمی (ئەمەوی)و (عەباسی)یەکاندا بایەخدانە بە هەڵکەندنو راکێشانی ئاوو ئاودێری لە ناوچەیەکی وەکو (کەرکوك) چونکە پاشماوەی گەلێك لەم کارانە بەرچاو دەکەوێت لە بەربەستو رووبارو جۆگەو دروست کردنی ئاوەرۆ، لەبەر ئەوەی ناوچەکە زیاتر پشتی بە باران بەستووە، هەڵگرتنی ئاوو بە بەکارهێنانی بەشێوەیەکی رێکوپێك پێویستییەکی گرنگ بووە.

*** بازرگانیو بەرووبوومە کشتوکاڵیو ئاژەڵییەکانی سەردەمی (ئەمەوی)و (عەباسی)یەکان:**

لەو بەروبوومە کشتوکاڵییانەی کە باوبووە لە ناوچەکەدا بریتی بووە لە (گەنم)و (جۆ)و (برنج)و (نیسك)و (نۆك)، هەروەها بەناوبانگ بووە لە سەوزەهاتو میوەداو کەمو زۆر بەرهەمی هێناوە. لەبەرووبوومی ئاژەڵیشدا (مەڕ)و (بزن)و (مانگا)و (گوێ درێژ)و (ئەسپ)، لە بەکارهێنانی خوریشدا سوودی وەرگرتووە لە دروست کردنی جلوبەرگو پیشەسازی چنینداو هەوڵی ئاڵوگۆر کردنی ئەم خورییەی داوە لە گەڵێ لە ناوچەکانی (عێراق)و (کوردستاندا)، هەروەها بەهۆی بوونی ئاو لە ناوچەکەدا، بەکارهێنانی ئاسیاوی جۆربە جۆر بەکارهاتووە کە بەئاو سووڕاوە، هەموو کەرەستەو شتەکانیان لە دارو بەردو دروست کردووە، هەتا ئەم ساڵانەی دوایش شوێنەواری ئەم ئاسیاوانە مابوو کە دەگەرێتەوە سەردەمی (ئەمەوی)و (عەباسی)یەکان.

دەربارەی رێگا بازرگانییەکانیش (کەرکوك) ناوچەیەکی پێکەوە بەستووی خواروو و ناوەراستی (عێراق)ە لە سەرووە بە (موسل) کە ئەمە وای کردووە ناوچەیەکی سەرەڕێیی بازرگانی بێت لە هاتووچۆی هێنانو بردنی شتومەکدا، لەبەر ئەوە دوورو نزیك دەوری خۆی بینیوە لە جووڵانەوەی بازرگانیدا، ئەویش بە هێنانو بردنی شتومەك چ لە شاری (موسڵە) وە، یان لە ناوچەکانی ناوەراستی (عێراق)ەوە بۆ خوارووی (عێراق)، وەهێنانی ئەوشتومەکانە بۆ ناوچەکانی سەروو[9].

*** شێوەکانی دەرەبەگایەتیو چۆنییەتی دابەش کردنی (باج)و (سەرانە) لە سەردەمی عەباسییەکاندا:**

ئەگەر سەرنجی شێوەکانی دەرەبەگایەتی (الإقطاع) بدەین لەو سەردەمە دەبینین چەند تایبەت مەندییەکی هەیە جیاواز لە سەردەمەکانی پێشوو، کە دیاردەی ئەم دەرەبەگایەتییە– زیاتر گەشەی کرد لە کۆتایی دەوڵەتی (عەباسی) دا، لە دواییدا بوو بە هۆیەکی گرنگی داروخانی دەوڵەتەکە.

"دەرەبەگایەتی شێوازێکی باوی بەرێوەبەرییەکانی عەباسییەکان بووە لە هەندێك کاتدا لەشێوەی دڵنیایی، کە دەبێتە پاراستنی داهاتی دەرەبەگایەتییەکە بۆ خۆیو دەمێنێتەوە لەژێردەستی. یان دەرەبەگایەتی شێوەیەکی تایبەتی هاتنە سەرکاری کاروبارە بەرێوەبەرییەکانە، جیاوازە لە گەڵ دڵنیاییو خاوەن زەوی بەر پرسیارە لەسەر ناردنی داهاتی دەرەبەگایەتییەکەی بۆ حکومەت دوای ئەوەی کە بەشی خۆی هەڵدەگرێت، هەر وەکو ئەوەی ناوچەی (داقوق)"[10]، سەرۆکی دەوڵەت دابری سەرەکی دەرەبەگایەتییە، خەلیفە لەو سەردەمە بووە لە (عێراق)دا. دەرەبەگ دەسبەرداری بەردەوامی نابێت بۆ فەرمانرەوایی لە لایەن ئەوەی بۆی دابراوە لەمە، ئەوە هەڵدەستێت بە دانانی کەسانی تر لە بەرێوەبردنی لە فەرمانرەوایەکەی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەرەبەگ تەنها سوود وەرگرتنی ئەوەی بۆی دابراوە لە داهاتی دەرەبەگەکە بێ ئەوەی بەشداری

فەرماندەیی بکات بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان. جۆری دەربەگ دەوەستێتەوە سەر توانای دابڕی دەرەبەگایەتییەکە، کەوا دەبێت دەرەبەگایەتییەکە دەرەبەگایەتییەکی موڵکداری بە مانای دڵنیایی کردنی ماف میران‌و مانەوەی یەك لە دوای یەك، وبەر خورداری کردنی داهاتەکەی بۆ خۆی مادام ئەوەی کە پێی بەخشیوە ڕەزامەندی لە سەرێتی[11]. بۆ نموونە لە سالی (٦٤٤هـ-١٢٤٦م) (سنقرە درێژە) کە مرد، خاوەنی (داقوق) بوو لەسەردەمی (معتصم باللە) باوکی پێی بەخشرابوو لەسەردەمی (ناسر الدین باللە)، بەڵام کاتێك مرد هەموو ئەم پارچانە گوێزرانەوە بۆ جێگرەکانی خەلیفە[12].

"لە سەردەمی (بویهیەکان)و (سلجووقییە)کاندا تووشی گەلێك بێ ئارامی‌و ئاژاوە بوو، ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی ڕووخاندن‌و کاولکردنی لادێ‌و شارو بێ هێزی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ‌و چالاکی بازرگانی، دەست بڵاوی فەرمانرەواکانیان‌و زۆر کردنی باجی جۆربەجۆر لەسەر خەڵکەکە"[13].

"ئەوەی کە سەرنج ڕادەکێشێت لە سەردەمی دەسەڵاتی (بویهی)و (سەلجوقی)دا لە (عێراق) داهێنانی (دەرەبەگایەتی سەربازی بوو)، کە ترسناکترین موڵکداری بوو کارتێکردنێکی خراپی بەسەر چالاکی کشتوکاڵیدا لە (عێراق)دا دروست کرد، کە (معز الدولة) بە ئارەزووی خۆی زەوی دەدا بە بێ حیساب بەسەربازەکانی کە هیچ شتێکی وایان نەدەدا بە خەزینە، لە جیاتی ئەوە بە ئارەزووی خۆیان زەوییەکانیان بەکاردەهێناو لەلایەن بریکارەوە (وکیل) بەڕێوە دەبراو هیچ تۆمارێکیان نەبوو بۆ داهاتەکانیان، کە ئەمە بە درێژایی دەسەڵاتی بویهییەکان درێژەی کێشا (٩٤٥ز-١٠٥٥ن).

لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا (١٠٥٥-١١٧٩) پاکتر نەبوو لە سەردەمی بویهییەکان، چونکە دەرەبەگایەتی سەربازی شێوەیەکی تەواوی وەرگرت کەبوو بە سیاسەتێکی میرانەی دەوڵەت‌و بۆ خۆیان ماف ئەوەیان وەرگرت کە دەسەڵاتیان هەیە بەسەر جووتیارو کێڵەردا. لە سەردەمی دەسەڵاتی (ناسر الدین باللە)دا (١١٨٠م-١٢٢٥م) عێراق ڕزگاری بوو لە دەرەبەگایەتی سەربازی (سەلجوقی)و ئەم خەلیفەیەوە ئەوانەی کە لە دوایەوە هاتن دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی ئەو بنەڕەت‌و یاسایانەی باو بووە لەسەردەمی عەباسییەکاندا دەربارەی موڵکداری زەوی، بەخشینی (اقطاع)ی زەوی بە تایبەت بۆ ئەو کەسانە کە هەڵدەستن بە کارگوزاری چاك بۆ دەوڵەت لە وەزیرەکان‌و گەورە کارگێڕییەکانی دەوڵەت، هەروەها بۆ کۆمەڵانی خەڵك. لەو سەردەمەدا (اقطاع) زەوی بەخشرا بە هەندێك لە پیاوانی سەربازی بۆ ئەوانەی هەستابوون بە کارگوزاری سەربازی چاك بۆ دەوڵەت.. هەروەکو ئەوەی ڕوویدا لەسەردەمی (ناسر الدین باللە )دا، (١١٩٠) زاینی بە بەخشینی چەند (اقطاع)یك بۆ ئەمیر (فەلەکەددین) کە بەناوبانگ بوو بە درێژ لە (داقوق) و (تکریت) بەرامبەر بە ئازایی‌و سوارچاکی‌و گێڕانەوەی هەندێك ناوچەی دابڕاو لە (عێراق) لە وڵاتی (فارس)"[14].

سەردەمی ئیلخانییەکان هیچی چاکتر نەبوو لە سەردەمەکانی تر (چونکە لەبەر ئەوەی زیاتر باجێکی قورسیان خستە سەر خەڵکەکە بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکانیان‌و جێبەجێ کردنی لە چوارچێوەیەکی بێ سنوور. لەو باجانە باجی میران‌و باجی باربووکردن‌و باجی پێشوازی سەربازەکان‌و باجی مردووەکان‌و گەلێکی تر[15]. بۆ ڕێگە گرتنی ڕێگاو تاڵان کردنی بازرگانەکان‌و ناکۆکی گرنگترین گیروگرفت کە بازرگانی لەژێر باریدا دەیناڵاند لەو ماوەیەدا بریتی بووەلە دەوری هۆزەکانی عەرەب‌و کورد لەنێوان ئیلخانییەکان‌و مەمالیك‌و چاوبڕینی دەوڵەت بۆ دەوڵەمەندەکان‌و یەك نەگرتنی پارە لەسەر تاپای دەوڵەتەکەدا[16] ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیری ئەم سەردەمانە بکەین لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا بە تایبەتی ناوچەی (داقوق) کەوتبووە ژێر کارتێکردنی یاسا جۆربەجۆرەکانی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانەوە، و دوورو نزیك تووشی دارووخان بوو لە بارەکانی کشتوکاڵی‌و ئاودێریدا چونکە بایەخ نەدان بەبارە ئابوورییەکانی وای کرد کە ووردە.. ووردە بەرووبومە ئابوورییەکان تووشی فەوتاندن بێت‌و باج ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاد بکرێت بەسەر خەڵکەکەدا.

"ئەوکاتە عێراق کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی هەر لەسالی (١٥٣٤) دا. عوسمانییەکان هەستان بە ڕۆیشتن لەسەر ڕێڕەوی موسڵمانەکان، بە دانانی ئەوەی هەموو زەوی (ئەمیری) موڵکی دەوڵەتە، هەستان بە دانانی شێوەیەکی تازە بۆ بەڕێوەبردنی زەوی کە شێوەی بەخشین‌و دەرەبەگایەتی‌و دابڕانی زەوی دەوڵەت بەرامبەر بەکار گوزارییە سەربازییەکان"[17].

لە ناوچەکانی موسڵ‌و هەولێرو کەرکوك هەستان بە دروست کردنی شێوازێکی دەرەبەگایەتی عوسمانی ڕیشاژۆ (الراسخ)[18] "ئامانجی دەوڵەتی (عوسمانی)، ئەوەی پەیوەندی هەبوو بە پەیڕەوی زەوی کشتوکاڵ، بریتی بووە لە دروست کردنی هێزێکی سەربازی‌و بەدەست هێنانی سەرچاوەی ژیان بۆی‌و بۆ کارمەندە شارییەکان. دوای داگیر کردنی (عێراق) هەستا بەروو پێوکردنی هاودامێنی زەوی‌و زارە کشتوکاڵییەکان، بەڵام ئەمە هیچی نەگۆڕی لە ڕێگای دابەش کردنی زەوی، شتێکی تازەی لە پێڕەوی باجی کشتوکاڵی نەهێنایە گۆڕێ یان لە پەیوەندی لەنێوان ئەوانەی کە دەسەڵاتی هەبوو بەسەر زەوی لەگەڵ ئەوانەی کاریان تێدا دەکرد.."[19]، "دەوڵەت دادەنرا بە خاوەنی هەموو زەوی‌و زاری (ئەمیری) و دەسکارییەکی ڕەهای هەمووی دەکرد، و هەڵستا بە دابڕینی ئەم زەوییانە بۆ کارمەندان‌و سەربازەکانی بەرامبەر بەکارە خزمەت گوزارییەکان بۆ دەوڵەت، بەڵام ئەمە ئەوەی نەدەگەیاند کە بێتە موڵکیان بەڵکو ماف ئەوەیان دەدرا کە هەستن بە کۆکردنەوەی باجە کشتوکاڵییەکان، لەتەك ئەمەدا دەسەڵاتدارانی (عوسمانی) هەستان بە بەخشین (دەرەبەگایەتی-اقطاعیات)ی زەوی کشتوکاڵی بۆ گەورەکارمەندان‌و هەندێك فەرمانرەواو سەربازەکان.

دەتوانین دەرەبەگاتییەکان لە دەوڵەتی (عوسمانی) بکەینە سێ بەشەوە:-

* یەکەم:- (دەرەبەگی بچووك) کە بەناوبانگە بە (تمار) کە (٢٠,٠٠٠) ئەقچەیە.

* دووەم:- (دەرەبەگی ناوەند) کە بەناوبانگە بە (زەعامەت)

کە (٢٠,٠٠٠ - ١٠٠,٠٠٠) ئەقچە.
* سێیەم:- (دەرەبەگی گەورە) کە بەناوبانگە بەتایبەت بە دەسکەوتی لە (١٠٠,٠٠٠) هەزار (ئەقچە) زیاترە.
ئەمە زیاتر دیاری کراوە بۆ والییەکان و سوڵتانەکان خۆیان. (لەبەرامبەر ئەمانە دەسەڵات داری (عوسمانی) ماق ئەوەی هەیە بەسەر خاوەن (دەرەبەگ)، دەبێت هەردەم ئامادەبێت بۆ بەشداری کردنی لەشەڕ لە کاتی پێویستداو پێویستە لەسەری هەڵسێت بەئامادەکردنی ژمارەی پێویست لە سوارچاکی شەرکەر بەرامبەر ئەمە ڕێژەیەکی هاوگونجاویان داناوە لە کۆکردنەوەی شەرکەر لەگەڵ دەرامەتی ئەو دەرەبەگەدا، کە هەر شەرکەرێك بەرامبەر، بە (٥٠٠) هەزار (ئەقچە)یە، ئەمە وادەگەیەنێت کە هەڵدەستن بە قەبلاندنی ئەو زەوییە، ڕێژەی ئەو دەرامەتە دابەش دەکەن، بەسەر ژمارەی شەرکەرەکاندا، ئەمە بەڕێژەی هەر دەرەبەگێك بە دیار دەکەوێت بۆ کۆکردنەوەی شەرکەر بۆ دەوڵەت"[٢٠]، (دەرەبەگە بچووکەکان) دەبەخشرێت بە سەربازەکان یان هەندێك جار بەسەرۆك هۆزە بچووکەکان و کارمەندە بچووکەکان بەرامبەر ئەو مووچەیەی دەیاندرێتێت، بەڵام (دەرەبەگە ناوەندەکان) دەدرێت بە گەورە ئەفسەرەکانی سوپاو گەورەکارمەندانی دەوڵەت، بێجگە لەم زەوییانە زەوی موڵکداری تایبەتی کە بۆ خاوەنەکانیان بەجێ دەهێڵرێت وەکو موڵکداری تایبەتی، بەڵام بەرامبەر ئەوە باج دەدەن. بەڵام ئەم باجە کە بووەو لە چاو زەوی دەرەبەگی و زەوی (وەقف)ەکاندا جۆرێکی تری زەوی لەو سەردەمانەدا هەبوو ئەویش زەوی گشتی (الأراضي المشاعة)، کە تاکە کەسێك موڵکداری ناکات بەڵکو لەلایەن دانیشتووانی گوندەکەوە بەڕێوەبراوە وەکو (لەوەڕگا) بەڵام لە زۆر کاتدا دەسەڵاتدارانی (عوسمانی) داگیریان دەکردو لە جوتیارو خۆیان بەڕێوەیان دەبرد[٢١].
لە ناوچەکانی (موسڵ)و (هەولێر)و (کەرکوك) لەسەدەی حەڤدەهەمی زایینی دا بریتی بووە لەشەش دەرەبەگایەتی لە جۆری (تایبەت)و (٢٧٤) لە جۆری (زەعامە)و (تیمار).. بەڵام ئەوەی تایبەت مەندێتی ناوچەکەی دیاری کردبوو، زۆری باران بارینی و نزیکی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە شوێنە بەڕێوەبەرەییەکانی ناوەندییەوە، کە ئەمە وای کردووە تارادەیەکی چاك ئاسوودەیی هەبێت و کشتوکاڵ و نیشتەجێ بوون گونجاوبێت[٢٢]، هەروەها پێکەوە بەستنی کوردی لەگەڵ شێوازی دەرەبەگایەتی (عوسمانی)دا لەسەر بنچینەی ئەوە بووە کە سەرۆکەکانی ئەو خێزانانە هەڵساون بەکاری (سەنجق بەگ) لەژێر دەسەڵاتی پاشا لە (کەرکوك)و (بەغدا)و (موسڵ) بەرامبەر کارە گوزارییە سەربازییە تاکە کەسیپەکانیان[٢٣] بەڵام شێوازی هۆزایەتی لە ناوچەکانی (موسڵ)و (ولایەتی شارەزوور) زیاتر بە دەردەکەوێت لە شوێنەکانی تر لە چۆنییەتی هەڵس و کەوت کردن بە زەوییەوە، چونکە نابینن لە بوونی (زەعامە)و (تیمار)ەکان سەر بەخۆ لە دەرەبەگایەتی تایبەتی، چونکە زەوی و زار دەگەڕێتەوە بۆ خێزانە فەرمانڕەواکان، هەروەها کۆکردنەوەی باجیش لەسەر بنەڕەتی (زەعامە)و (تیمار) نییە. بەڵکو لەسەر شێوازی دەربەستی (الالتزام) تا لە ژیان مابێت یان (موڵکانەیە)[٢٤].
لە کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمی زاینیدا دەوڵەتی عوسمانی هەوڵیدا پێشکەوتنی پێڕەوی خۆبەستنەوە (نظام الالتزام) بەو شێوەیەی کە داهات چارەسەربکات پێیان دەوت (موڵکانە)، بەڵام ئەمە هیچ شتێکی باری رووخاوی ژیانی جوتیاری چارەسەر نەکرد..[٢٥]، پێڕەوی خۆبەستنەوە دەگەڕێتەوە سەردەمی سوڵتان (محەمەد ئەلفاتیح) بەڵام لە سەردەمی سوڵتان (سلێمان قانونی) شێوەیەکی فراوانی وەرگرت[٢٦]. دەسبەرداری باج (تلزيم الضرائب) بۆ ماوەیەکی کەم دەبێتە هۆی ووزەبری (استنزاف) داهاتی جوتیار، بەڵام بەخشینی دەسبەرداری بۆ مانەوەی ژیان هەستا بەکەم کردنی کەم کێشەی ئەو باجە لە سەری و بەدەست هێنانی قازانجێکی بەجێ لە ماوەی ئەوکاتە درێژەدا.
لە ئەنجامی ئەم شێوازەدا بووە هۆی دروست بوونی چینێکی تازە لەنێوان دەوڵەت و خەڵکەکە، کەکۆکردنەوەی باج ئەو فەرمانانەی دەگرێتە ئەستۆ بەپێی ڕێکەوتنێکی تایبەتی لەنێوان دەسبەدارەکاندا (الملتزمين) دوای کارایکردنی لەسەر یەك زیاد کردنەکە (المزايدە)، هەروەها داوا کردنی والییەکان بەدەست تێنەوەردانیان لەم کارە بە تایبەتی لە ناوچەکانی وەکو (عێراق) کە ژینگەکەیان ژینگەیەکی هۆزایەتییە، پێویست بەوە دەکات بە ناردنی هێزی سەربازی بۆ بەربەرەکانی هۆزەکان و قەناعەت پێ هێنانیان بە دانی باج. بەڵام دەسبەردارەکان لە زۆر کاتدا سەردەکەوتن بەوەی بەرێکەوتنێك لەنێوان خۆیان و سەرۆك هۆزەکاندا کە لەمەدا دەسبەردارەکان نیوەی ئەوەیان دەدا بە سەرۆك هۆزەکان کە لە جوتیارەکانیان دەست دەکەوت لە چاندنی زەوییەکەدا[٢٧].
لە ئەنجامی ئەو بەڕێوەبەرییەی زەویوزار لە عێراقدا بە ڕێگەی دەسبەرداری (الالتزام)، بوو بەهۆی فەوتاندنی زەوی و زارو لە ئاودانی کشتوکاڵ، بەهۆی بایەخ نەدانی دەسبەردارەکان بە ئاوەدان کردنەوەی زەوی و زارو تەنها بیریان لە ماوەی دەسبەرداریەکانیان دەکردەوە[٢٨].
مەدحەت پاشا (١٨٦٩-١٨٧٢)ی زایینی هەستا بە نوێ کردنەوەی کشتوکاڵ و فراوان کردنی زەوی کشتوکاڵی لە ڕێگای لابردنی باج لەسەر هێنانی کەرەستەی کشتوکاڵی نوێ بابەت و دابەش کردنی تۆوی چاك بەسەر جوتیاراندا[٢٩]. هەروەها بەخشینی زەوی و زار بۆ گەورە کارمەندانی دەوڵەت و پیاوانی سوپا[٣٠].
بەڵام ئەوەی ئەو کردی تەنها ڕوودانی زیادکردنی بەرهەمهێنانی بەرووبومێکی دیاری کراوە لەسەر حیسابی بەرووبوومێکی دی، ئەمەش بوو بەهۆی کەم هێنانی بەرهەمێکی تر لەسەر حیسابی ئەوەی تر، زیاتر بەرەورووی ئەو داوا کارییانە دەبووە کە بازاری دەرەکی داوای دەکرد، ئەمانە هەمووی لەگەڵ پێشکەوتنی دەوڵەتەکانی تردا نەدەگونجا[٣١].
ئەم پیاوە (مدحەت پاشا) هەستا بە دروستکردنی پردو گەلێك دامودەزگای تر لەشاری (کەرکوك)، بەڵام هەموو

ئەمانە شتێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا لە پێشکەوتنی باری ئابووری شارەکەدا، چونکە زۆری ئەو پرۆژانە سەربازی بوون تا بەوەی ئابووری بێت.
دەوڵەتی (عوسمانی) لە شارەکەدا سیاسەتێکی تایبەتی دابەشکردنی زەوی‌و زاری بەسەر دارو دەستەکەیدا پەیرەو دەکرد، هەولی دەدا ئەوانە لە خۆی نزیك بکاتەوە کە تواناى سەر کووت کردنی خەلکەکەیان هەیەو، بەستنەوەیان لەژێر دەسەلاتی دەولەتدا. "هەروەکو لەوەدا دەبینین کە زەویو زارێکی زۆریان بەخشیبوو بە (ئاوچی)یەکان لە کەرکوکداو دەسەلاتیان دەرۆیی بەسەر دەزگاکانی دەولەتو کاروبارە کار گوزارییەکانی شارەکە،و ئەوە لە دوای ئەوە بۆیان بە میرات مابۆوە"[٣٢].
بۆ نموونە خێزانی (ئاوچی)یەکانیش بەپێی ئەوان زەوییەکان دابەش کردبوو بەسەر چەند کارمەندێکەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری زەوییەکانیان. ئەمانە لە هەمان کاتدا هەلدەستان بە جێبەجێ کردنی کاروباری زەوی لە رووی کۆکردنەوەی بەروبوومە کشتوکالییەکان‌و گەیشتنی ئەم بەرووبوومانە بۆ خاوەن مولك. بۆیە لە شارەکەدا رژێمێکی دەرەبەگایەتی زیاتر بەڕێوە دەبراو چەند دێیەك یان کۆمەلە زەوی‌و زارێکی چەند لادێیەك لەلایەن ئاغایەکەوە یان چەند ئاغایەکەوە بەڕێوە دەرۆیشت.
ئەگەر سەرنجێکی ئەم سەردەمەی (عوسمانی)یەکان بدەین دەبینین کۆچڕەوی هۆزە عەرەبەکان بۆ ناوچەی (کەرکوك) کە خۆی دەبینێتەوە لە هۆیە ئابوورییەکەدا، بۆ ئەوەی بتوانن زەوی‌و ئاوی پێویست بەدەست بهێنن بۆ بژێوی ژیانە ئابوورییەکانی، لەو هۆزانە هۆزی (عوبێد)و هۆزی (جبورە) هەروەکو ئەوەی هۆزی (عوبێد) ناوچەکانی خۆیان لە سەرووی بەغدا لە (دوجیل) بە جێ هێشت‌و لە (دیجلە) پەرینەوە هاتنە (حەویجە)[٣٣].
بەربەرەکانی هۆزو عەشیرەتەکانی ناوچەکەش لە گەلێك جاردا دەوری هەبوو لە جێبەجێ نەکردنی یاساکانی (عوسمانی) بۆ نموونە هۆزێکی وەکو (هەمەوەند) لە دەوروبەری (چەمچەمال)و (شوان)دا هەردەم سەرچاوەی شەڕو گێچەل بووەو وای لێیان کردووە کە هەولبدەن بۆ سەرکوت کردنیان‌و راگوێزتنیان لە ناوچەکەدا. گەلێك جار بەسترابوەوە بە بەهێزیو بێ هێزی عەشیرەتەکەوە، ئەگەر بەهێز بووایە ئەوا دەسەلاتی داری (عوسمانی) دەخستە زەلالەتەوەو ئەگەر بێ هێز بوایە ئەوا بە هەموو جۆرێك سەرکوت دەکرا.

* باج‌و بەرووبوومە ئابوورییە جۆراوجۆرەکانی سەردەمی عوسمانییەکان:

لەو بەرووبوومە کشتوکالییانەی لەسەردەمی عوسمانییەکاندا باوبووە بریتی بووە لە:
(گەنم)و (جۆ)و (نیسك)و (نۆك)و (پاقلە)و (ماش)و (برنج) و (لۆکە)و (میوەهات) بە هەموو جۆرەکانیانەوە لە (هەنار)و (پرتەقال)و (سێو)و (هەرمێ)و (کالەك)و (شووتی)و (ترۆزی) و (ئاروو)و گەلێك بەروبوومی تر. لەلایەن ئاژەلەوە (مەڕ)و (بزن)و (ئەسپ)و (گوێدرێژ)و (گامێش)و گەلێك ئاژەلی مالی تر بینراوە. لەبەروو بوومە پیشەسازییەکان کە باو بووە:- (نەوت)و (قیر)و (بەرد)و (خوێ)، بەلام هیچی بە شێوەیەکی رێکوپێك بەکار نەهاتووە، بۆ نموونە (نەوت) لە سالی (١٩٢٧)دا بەرهەم هێنراوەو بەشێوەیەکی فراوان بەکار هاتووە، چونکە گەلێك کات بوەتە سەرئێشە بۆ خەلکەکەی‌و ئاژاوە نانەوە لە ناوچەیەکی وەکو (کفری) جاران تورکەکان قیریان لێ دەردەهێنا، ئەمە تا شەڕی جیهانی هەر لێی دەردەهێنرا. جۆرەها بەردی جۆربەجۆری خانوو بەکار هێنراوەو (گەچ)و (نوورە) بۆ دروست کردنی خانوو بەکار هاتووە بەکارهێنانی (خەلوز)و (خەلوزی بەردیش) لە گەلێك ناوچەدا بۆ سوتاندن بەکار هاتووە.
خوێ هەر لەسەردەمە زووەکانەوە لە گەلێك ناوچەی کەرکوك بەکار هاتووە بە تایبەتی لە ناوچەکانی (کفری)و (حەمرین) دا. دەربارەی سەرچاوەی ئاو لەو سەردەمەدا زیاتر پشت بە باران بەستراوە بەلام کارێزو کانیاو دەوری خۆی بینیوە لە بەرهەمهێنانی بەروو بوومی کشتوکالی لە سەردەمی عوسمانییەکان لە شاری کەرکوکدا هیچ پرۆژەیەکی ئاودێریمان بەرچاو ناکەوێت، تەنانەت سەرچاوە ئابوورییە کۆنەکانیش پشت گوێ خراوە لەو سەردەمەدا چەند پرۆژەیەك دروست کرا کە زیاتر سەربازی بوو بەتایبەتی لە ناوچەکانی (کەرکوك)و (پردێ).
لە سالی (١٨٦٠) بلاوبوونەوەی (کولێرا) لە سەرتاپای عێراقدا کارتێکردنێکی زۆری کردە سەر باری ئابووری وولات. لە سالی (١٩٠١)و (١٩١٣)دا بەفرێکی زۆر باری لە سەرتاپای عێراق کە کارێکی گەورەی کردە سەر بەرووبوومی کشتوکالی، (کەرکوك) یەکێك بوو لەو شارانەی کەوتە بەر ئەو زریانە.
"لە کۆتایی دەولەتی عوسمانیدا برسێتییەکی گەورە رووی دا لە پایزی (١٩١٧) تا هاوینی سالی (١٩١٨)ی خایاند، ئەمە وای کرد ژمارەیەکی زۆر خەلك لە سەربازی رایکردو ژمارەیەکی زۆر مردن لە برسێتیدا. بەهۆی ئەم بارەوە، راکردن لە سەربازی، (خەلیل پاشا) سەرکردەی سووپای شەش هەستا بە بەرەلا کردنی (٥٠٠٠) سەرباز لە خەلکی (کەرکوك)و (سلێمانی) بۆ ئیش کردن لە کشتوکالیدا"[٣٤].

*** ئەو باجانەی لەو سەردەمانەدا باو بووەو لە شارێکی وەکو کەرکوك وەرگیراوە:**

*** (باجی جووتانە):**
ئەمە لەسەر زەوی کشتوکالیدا ناوە لە کاتی تۆو کردن‌و جوت کردندا.
*** (چالانە):**
ئەمە زیاتر لە بەرووبوومی هاویندا بەکار هاتووە کە چالەکانیان ژماردووە لە وەرگرتنی باج دا.

*** (باجی مەرانە - سەرانە):**
ئەمە لە ژمارەی ئاژەلەکان وەرگیراوە بە رێژەی (٤٠) سەر یەك

سەر وەرگیراوە.

* ( باجی کەرانە ):

ئەمە زیاتر لەو کاروانانە دەسەنرا کە دەهاتن بۆ شار.

* ( باجی مریشکانە ):

کە لەسەر ڕێژەی ژمارەی مریشکەکان وەرگیرا.

"کاتێك عوسمانییەکان هاتن کەوتنە گۆڕینی باجی دەیەکی و باجی زەکات کە لەنێوان (١٠٪ و ٢٠٪) بوو کە لە بەرووبوومەکە وەردەگیرا بەپێی جۆری بەرهەمەکە لە ڕێگای ئاودێرییەکەی، بەڵام باجەکان لەو سەردەمەدا زۆر کاریگەر بووەو لەژێر ناوی جۆربەجۆر وەرگیراوە"[٣٥].

*بازرگانی ناوخۆیی و دەرەکی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا:

"ناوچەیەکی وەکو (کەرکوك) لە ڕووی بازرگانییەوە شوێنێکی گرنگی هەبووە، چونکە کەوتووەتە ناوچەیەکی ناوەندی پارێزگاکانی عێراق، بووەتە بەستنەوەی سەرووی عێراق بە خواروو ناوەڕاستەوە. ئەمە وای کرد بووبێتە ناوچەیەکی سەرەڕێی بازرگانی هەروەکو ناوچەکانی (کفری)و (داقووق)، کە زیاتر ناوچەیەکی وەکو (کفری) گەشەی کردووە لەو سەردەمەدا پەلوپۆی کێشا، بەڵام گەشەکردنەکەی لەسەردەمی (عوسمانی)یەکان وای کرد ببێتە ناوچەیەکی ئاڵوگۆڕ کردنی بازرگانی، لەبەر ئەوە سەیر دەکەین لەو ڕێگا ووشکاییە سەرەکییانەی لە عێراقدا هەبووە، بۆ بەکارهێنانی گواستنەوەی بازرگانی ڕێگای (بەغدا - بەسرە)و (بەغدا - موسڵ)و (بەغدا- حەلوان)و (بەغدا - کەرکوك) بوو لەگەڵ پردێ"[٣٦]. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ناوچەکە شوێنێکی گرنگی بازرگانی بووە لە گواستنەوەی بەرووبوومی بازرگانی ناوخۆو دەرەوە، کە بازرگانییە ناوخۆییەکەی لەگەڵ (موسڵ)و (سلێمانی)و (هەولێر)و (دیالە) داو بازرگانییە دەرەکییەکەش لەگەڵ گەیشتنی ئەو بەروبوومانە بەرەو هێڵە سنوورییەکانی عێراق و ئاودیو کردنی بۆ وڵاتەکانی تر بووە.

"بەڵام بەشێوەیەکی گشتی سەیری بازرگانی ناوخۆ بکەین لە دوای داگیرکردنی (عوسمانی)یەکان لە عێراقدا دەبینین هەر دواکەوتنی سەردەمەکانی پێشووە، چونکە هۆی دواکەوتنی گواستنەوەو نەبوونی ئاسایش لە ڕێگاکاندا بێ دەسەڵاتی (عوسمانی) لە پارێزگاری کردنی پێویستی ڕێگاکان و هەژاری کۆمەڵانی خەڵك و نزمی ئاستی ژیانیان دەوری گرنگی لە دواکەوتنی ژیانی بازرگانی ناوخۆدا هەبووە، هەروەها دانانی باجی ناوخۆیی لەنێوان شارێك بۆ شارێك ئەوەندەی تر ئاستەنگی خستبووە بازرگانییەکەوە، ئەگەر لەشار دەرچوونایەتە شارێکەوە دەبوایە باج و سەرانەت بدایە، تەنانەت گەلێك جار لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی دی ئەمە ڕەچاوکراوە. هەروەها هەر شارێك جیاوازی هەبوو لەگەڵ شارێکی تر لە ڕووی ئەو باجەو کێش و پێوانانەی بەکار دەهێنرا لە ئاڵوگۆڕ کردنی بازرگانی ناوخۆدا.."[٣٧].

"لەو سەردەمانەدا بنکە بازرگانییەکانی عێراق دوو شوێن بوو کە یەکەمیان (موسڵ) بوو لە سەروووەوە و لە خواروو (بەسرە) بوو، کە هەموو شارەکانی تر ئاڵوگۆڕی بازرگانییان لەگەڵ ئەم شاراندا دەکرد"[٣٨].

شارێکی وەکو کەرکوك، موسڵ نزیکترین شوێن بوو لە ڕووی هێنان و بردنی ئاڵوگۆڕە بازرگانییە ناو خۆییەکاندا دەیتوانی بە زووترین کات کە بە پەلە بازرگانییەکانی بگەیەنێتە موسڵ بۆ ڕەوانەکردنی بۆ دەرەوە، ئەمە زیاتر یارمەتی دەدا لە پێکەوە بەستنی (کەرکوك) بە بازرگانی دەرەوە، چونکە نزیکی لە ناوچە سنوورییەکانەوە ئەمەی زیاتر گەشە پێدەداو دەیکردە هۆیەکی جووڵانەوەکەی"[٣٩].

"لە ساڵی (١٨٦١)دا دەوڵەتی (عوسمانی) هەوڵی دروست کردنی دەزگایەکی کارگێری بروسك و گەیاندنی دروست کرد بە درێژکردنەوەی تێلی تەلەگراف، کە کارگەی پێشکەوتنێکی بە پەلەی دروست کرد، عێراقی کرد بە چوار هێڵی (تەلەگرافەوە)، کە (کەرکوك) لە هێڵی یەکەم بوو کە (فاو-بەسرە-قورنە-بەغدا-کەرکوك-هەولێر-موسڵ) لەسەر ئەم هێڵە بوون"[٤٠].

**سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١. (مێژووی نەتەوەیی کورد)، کاوس قەفتان، لاپەرە ١٥٣.
٢. (العراق في التاريخ)، کۆمەڵێك نووسەر، ١٩٨٣ لاپەرە (٣٤٢).
٣. هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی (٣٤٣-٣٤٤).
٤. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٣٤٥).
٥. هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی (٣٤٨-٣٤٩).
٦. حضارة العراق، بەرگی پێنجەم، ١٩٨٥، لاپەرە (٢٣٩).
٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٤٠).
٨. (دليل مشاهير الألوية العراقية).
٩. (حضارة العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٠. (العراق في عهد المغول)، لاپەرەکانی (١٠٠-١٠١).
١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٠).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٢).
١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٠٧).
١٤. (حضارة العراق)، بەرگی پێنجەم، لاپەرەکانی (٢٤١-٢٤٢).
١٥. (العراق في عهد المغول)، لاپەرەکانی (١٠٧-١١١).
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٤٤).
١٧. (تاريخ مشكلة الأراضي في العراق ١٩١٤-١٩٣٢)، عیماد ئەحمەد ئەلجەواهری، ١٩٧٨، لاپەرە (١٦٥).
١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٨-١٩).
١٩. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەرە (٧٢).
٢٠. هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی (٧٣-٧٤).
٢١. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٧٤).
٢٢. (تاريخ مشكلة الأراضي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٨-١٩).
٢٣. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (١٩).
٢٤. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٠).
٢٥. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەرە (٧٥).
٢٦. (تاريخ مشكلة الأراضي)، هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٢).
٢٧. هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی (٢٥-٢٦).
٢٨. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٣٢).
٢٩. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەرەکانی (٩١-٩٢).
٣٠. (تاريخ مشكلة الأراضي)، هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٤٢).
٣١. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەرەکانی (٩١-٩٢).
٣٢. (دليل المشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دەیەم، لاپەرەکانی (١-٣).
٣٣. (تاريخ مشكلة الأراضي، لاپەرە (٥٩).
٣٤. (تاريخ القوات العراقية تاسيس الجيش العراقي)، بەرگی یەکەم ١٩٨٦، لاپەرە (١٥٨).
٣٥. (تاريخ مشكلة الأراضي في العراق)، لاپەرەکانی (٥٠-٥١).
٣٦. (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، لاپەرە (٨٢).
٣٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٨٢-٨٣).
٣٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨٣).
٣٩. (تجارة العراق قديما وحديثاً. بحث تاريخي إقتصادي)، يوسف الله غنيمة. ١٩٥٢، لاپەرەکانی (٢٣-٢٤).
٤٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## تەوەری پێنجەم

ئاریان جەمال

### * ئابووری داقوق لە سەردەمی عەباسییەکاندا :

شارۆچکەی (داقوق)، شوێنێکی بەرچاوی ئابووری هەبووە لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا، بە تایبەتی لە ماوەی فەرمانڕەوایی عەباسییەکاندا.

کشتوکاڵ دادەنرێت بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی ئابووری دانیشووان، بە تایبەتی ئاقاری (باجەرمی) کە (داقوق) بنکەیەکی گرنگی بووە، ناوچەیەکی کشتوکاڵی بووە، بە هۆی بوونی گەلێك بنەمای بەرچاو دەوری بینووە لە بواری کشتوکاڵیدا، وەکو گونجاوی ئاووهەواو زۆری ئاوو خاکی بە پیت، هەروەها هاوگونجاوی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاست بوو[1]، یارمەتیدەر بوو بۆ بارینی بارانی زستانە، لە پاڵ بە دەرکەوتنی هەر چوا وەرزەکەی لە ئاووهەوای ناوچەکەدا، کە بنەمای سەرکەوتنی کشتوکاڵو هەمە چەشنی بەرووبوومەکانێتی.

بوونی ڕووبارێك لە داقوق کە بە ناوییەوە بە ناوبانگ بووە[2]، هەروەکو ئەوەی (ابي الفداء)، ئاماژەی کردووە دەربارەی بە پیتی خاکەکەی:

"شارۆچکەیەکە کە بە پیتە، بێستانو سەرچاوەی ئاوی هەیە کە لە چیای حەمرینەوە هەڵدەقوڵێت.."[3].

هەروەها (مستەوق ئەلقەزوینی) ئاماژە بە پیتی خاکەکەی دەکات:

"شارۆچەکەیەکە ئاوو هەواکەی مام ناوەندییە، سازگارترە لە ئاووهەوای عێراقی عەرەبی.."[4].

گرنگترین بێستانەکانی داقوق بە ناوبانگە بە بێستانی (زەیتون)، بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاوبوونەتەوە، هەروەها بێستانی دارخورمایش بەشێکی بەرچاوی هەبووە، ئاماژە دەکات بە ڕووداوێکی ساڵی (٩٣٧) زاینیی، کە گوایە: باوبۆرانێکی بە هێز هەڵیکردووە لە داقوق، گەلێك ماڵو دارخورماو زەیتونی لە بنەوە هەڵکەندووە، خەڵکێکی زۆر لە ماڵ چوونەتە دەرەوەو بە کۆمەڵ مردوونە[5].

(ئەلعەمری) ئاماژە دەکاتە شارۆچکەی داقوق کە گوایە: شارۆچکەیەکە شوێنێکی بەرچاوی هەبووە لە دارخوورماو کشتوکاڵدا[6]، گەنمو لۆکەی لێ کراوە، بە هۆی زۆری ئاوو هەروەها بە پیتی خاکەکە[7].

لەو پیشانەی کە لە داقوقدا بە ناوبانگ بووە پێی، پیشەسازی (زەیت) بووە کە لە داری زەیتون دەرهێنراوە، ئەویش لەبەر دەوڵەمەندی هەر یەکە لە شارۆچکەی (داقوق)و (دیر العاقول) کە بەناوبانگ بوونە بە داری زەیتون[8]. هەر لە هەمان کاتدا پیشەی ڕستن، یەکێك بووە لەو پیشانەی کە لە داقوقدا بوونی هەبووە، هەروەکو ئەوەی (ئەلسەفدی) دەیگێڕێتەوە کە گوایە (موسا کوڕی عەلی کوڕی بەندەر) لە ساڵی (٣٢٧)ی زاینیی پەروەردە بووە لای کەسێکی مەسیحییەكو فێری ڕستن بووە[9].

پیشەی گۆزەکاری یەکێك لەو پیشەسازییە گرنگانەی (داقوق)، لەبەر ئەوەی هاوپەیوەستی ڕاستەوخۆی هەبووە لەگەڵ چالاکی ڕۆژانەو پێویستی دانیشتووان، لە ڕووی پیشەسازیو جۆری بە کارهێنانیدا، گەلێك بەڵگەی شوێنەواری جۆراوجۆر دۆزراونەتەوە ئاماژە بە جۆرەها گۆزەی ماوەی سەردەمی ئیسلامی دەکات لە جۆری شووشەییو نا شووشەییدا، بە شێوەیەکی باش شێلراوە، هەروەها گەلێك چرادانو قاپو قاچاخی هەمە ڕەنگ[10]. بوونی گۆزەکاری شووشەیی بەڵگەی بە توانایە لە پێشکەوتن ئەو پیشەیەدا.

لەو پیشەسازیانەی کە بوونی هەبووە لە (داقوق)، پەیوەندییەکی تەواوی هەبووە لە ژیانی ڕۆژانەوە، ئەویش پیشەسازی کانزایی بووە (ئاسن)، (ئیبن ئەلفووتی) لە ژیاننامەی (غرس الدين ابو محمد يحيى ابن احمد الدقوقي) دەیگێڕێتەوە کە گوایە (شێخێك بووە کە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە دقوقا لە (اللج) دانیشتووە..) تا ئەوەی دەڵێت: (..کە ئاسنگەربووە)"[11]، لەم دەقەدا دەردەکەوێت کە ئەم پیشەیەی ئاسنگەری لە داقوق بوونی هەبووەو گرنگی دەگەڕێتەوە بۆ پیشەسازی دروست کردنی ئەو ئامرازە شەڕیانەی وەکو شمشێرو خەنجەرو سەرەڕمو تیرو زرێ پۆش، هەروەها پیشەسازی سەتڵو چەقۆو زنجیرو بزمار، لە پاڵ گەلێك پێویستی گرنگی تردا.

سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن بە بوونی چاوگەی نەوت لە داقوق[12]. ئەم نەوتە بەکار دەهێنرێت لە گەلێك پیشەسازیو پیشەدا، وەکو پیشەسازی کانزایی کە ئاسنگەرەکان بۆ توانەوەی ئاسنو پیشەسازی پێویستییەکانی ئاسن بەکاری دەهێنن لە پیشەسازی گۆزەو بەکارهێنانی چرادانو ڕووناکردنەوە.

چینێك بوونی هەبوو کە بایەخیان بەم پیشەیە داوە بۆ پاککردنەوەی نەوتەکە، هەر چەندە بە شێوەیەکی سەرەتایی بووە، بۆ جێبەجێ کردنی پێویستییەکانی.

هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویمان بەرچاو ناکەوێت، تەنانەت لە لای گەڕۆکەکانیش بە شێوەیەکی بەرچاو دەربارەی پەیوەندی داقوق لە بواری بازرگانیدا یان دەربارەی ئەو ڕێگایانەی کە دەیبەستێتەوە بە شارەکای ترەوە، یا لەو کەلووپەلو پێویستیانەی کە ئالووگۆڕی پێ بکرێت، تەنها بە شێوەیەکی سەرپێی لە هەندێك لە ڕووداوە مێژووییەکاندا ئاماژەی پێ کراوە.

گرنگترین ڕێگاکانی داقوق بە شارەکانی تر بەم شێوەیە بووە[13]:

١. ڕێگای بەغدا – داقوق:

گرنگی ئەم ڕێگایە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە داقوق دەبەستێتەوە بە خیلافەتی عەباسییەوە، ئەم ڕێگایە دەست پێ دەکات لە دەرگای خوراسان لە بەغدای ڕۆژهەڵات، دووری

ماوەکەی (٤) فەرسەخە[١٤]، دەگاتە شاری (نەهرەوان)، چەند لقێکی لێ دەبێتەوە کە یەکێك لە لقەکانی داقوقە لەسەر رووبار (٨) فەرسەخە[١٥]، (نەقشبەندی) جۆری رێگاکەی دیاری نەکردووە کە لە نەهرەوانەوە بۆ داقوق دەروات. بەڵام راستر وایە کە ئەم رێگایە لە نەهرەوانە دەروات بۆ (باجسرا) لە دوایدا بۆ (باقوبا) لە دوایدا بۆ (صولی) ئینجا بە پرددا دەروات بۆ (مامونیە)و (شاذروان)و (محەمەدیە) تا بە یەکگشتنی رووباری داقوق لەگەڵ رووباری (نەهرەوان)، لە دوایدا دەگاتە شارۆچکەی داقوق.

(لتسرنج) بەم شێوەیە ئاماژە دەکات:

"لە سەردەمی کۆندا، نەهرەوان بە شێوەیەك فراوان بوونی هەبوو، ئاوی رووباری داقوق لە وەرزی بەهاردا لافاوی هەڵکردووەو رۆیشتۆتە نەهرەوانەوە"[١٦]، یان لە نەهرەوانەوە بۆ (باقوبا) یان لە (طفر)[١٧]ەوە بۆ داقوق. رێگای یەکەم زۆر رێی پێ چووە لەلایان قافڵە بازرگانییەکانەوە، چونکە زۆری رێگا بازرگانییەکان لە عێراق بە لێواری رووبارەکاندا رۆیشتووە تا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئاسان لە رووبارەکان ئاو وەربگرێت[١٨].

٢. رێگای (داقوق – اربل):

رێگایەکی بازرگانی گرنگە، بە تایبەتی لە دوای ئەوەی (اربل) بنکەی (ئەتابەکی بەکتکینیە) بووە، لە کاتێکدا کە داقوق بازنەی گەیشتن بووە لەنێوان (بەغدا)و (اربل)[١٩].

هەر لەبەر ئەمە (سبط ابن الجوزي) ئەم رێگایەی گرتۆتە بەر کاتێك رۆیشتووە بۆ بەغدا ئینجا بۆ شام لە ساڵی (١٢٠٤)ی زایینیی، کە لە بەغداوە گەیشتۆتە (داقوق) لە وێوە بۆ (اربل) ئینجا بۆ موسڵ[٢٠].

(مسکویە) لە رووداوی ساڵی (٩٤٦) زایینیی ئاماژەی بەوە کردووە:

کاتێ (ابي علي بن محتاج) (ابراهیم بن احمد بن اسماعیل) ی مامی (نوح بن نصر الساماني)[٢١] کە لە موسڵ بووە، ناردوویەتی بۆ خوراسان، بۆیە (ابراهیم) رێگای موسڵی گرتووە بۆ تکریت و ئینجا (داقوق) لەوێوە بۆ (خوراسان)[٢٢].

ئەم نووسینە ئاماژەیە بۆ دوو رێگا:

٣. رێگای (تکریت – داقوق):

٤. رێگای (داقوق – خوراسان):

بەستنەوەی (داقوق) بەم رێگایەوە گرنگییەکی گەورەی بە دەست هێناوە کە لە داقوقەوە دەروات بۆ (خانیجار) ئینجا بۆ (ئەنبار) لە دوایدا بۆ (خانەقین) لەوێوە بۆ رێگای (خوراسان)[٢٣].

دەوڵەتی عەباسی بایەخێکی گەورەی بەم رێگایە داوە هەروەکو ئەوەی لە ساڵی (٩٣١)ی زایینیی ئاماژەی پێکراوە: "ضم المتوسطین الی بدر لیکونوا في شحنة طریق خراسان والانبار والراذانان ودقوقا وخانبیجار"[٢٤].

ئەمە ئاماژەیەکی بەرچاوە لە گرنگی ئەم رێگایە چونکە رێگای پێکەوە بەستووی خوراسان و موسڵ بووە.

٥. رێگای (داقوق – شارەزوور):

داقوق دادەنرێت بە رێگایەکی گرنگ بۆ ناوچە چیاییەکان هەر وەکو ئەوەی (شبیب بن یزید) ئەم رێگای گرتۆتە بەر لە کاتی رۆیشتنی لە رەشە خاکەوە بۆ شارەزوور[٢٥].

هەر چەندە کە سەرچاوە مێژووییەکان و جوگرافییەکان ئاماژەیان بە سەرچاوە ئاژەڵییەکان لە داقوق نەکردووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دانیشتووانی ئەم شارە بایەخیان بە بەخێوکردنی ئاژەڵ نەدابێت.

لە وەسپێکی (اقلیم الجزیرة)دا کە داقوق لەو ئاقارەدایە هاتووە (دەوڵەمەندە بە خەڵك و لادێ و کۆشك و ئاژەڵداری)[٢٦].

کورد بایەخیان داوە بە پەروەردەکردنی ئاژەڵداری و بەشێکی زۆر شارەزابوون لەم بوارەدا[٢٧]، ئەوەی یارمەتی بە خێوەکردنی ئاژەڵداری دەدات لەم ناوچەیە زۆری دەسکەوتنی گژوگیایە[٢٨].

هەروەها بوونی لەوەرگا پاڵی ناوە بە هاتنی هۆزە عەرەبە کۆچەرییەکان بۆ هاتنیان لە وەرزی هاویندا بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان، هەروەکو ئەوەی کە هۆزی (بني شیبان) ناوی هاتووە[٢٩]، لە هەمان کاتدا بەخێوکردنی ئاژەڵ پیشەیەکی تەواوکراوی کشتوکاڵەو ناتوانرێت لێی جیا بکرێتەوە[٣٠]، کە سوودی لێ دەبینێت لە بواری پێویستییەکانی کشتوکاڵ و گواستنەوە لە پاڵ سوودی بەرهەمەکانی وەکو شیر و گۆشت و پێست و خوری و گەلێکی تر[٣١].

### * سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. بڕوانە سەرچاوەکانی:

– (کەش و هەوای هەرێمی کوردستانی عێراق، جوگرافیای هەرێمی کوردستانی عێراق)، ئازاد نەقشبەندی، هەولێر، ١٩٩٨، لاپەرەکانی (٦٩)، (٧٢).

– گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢٧)، ساڵی (١٩٨٤)، لاپەرە (١٤٠)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مناخ اواخر الزمن الرابع والانسان القدیم في جبال كردستان)، هـ. ا. رایت، وەرگێرانی فوئاد حەمە خورشید.

– (جوگرافیای کوردستان)، عەبدوڵڵا غەفور، لاپەرە (٤٦).

٢. بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە (داقوق، دراسة في تاریخها السیاسي والحضاري، ١٦-٦٥٦ هـ / ٦٣٨-١٢٥٨م)، ئاریان جەمال ئیسماعیل هەرزانی، لاپەرەکانی (١٠-١١).

٣. (تقویم البلدان)، لاپەرە (٢٨٦).

٤. (نزهة القلوب في المسالك والممالك)، المستوفي القزویني، لاپەرە (٢٤).

٥. (المنتظم)، ابن الجوزي، بەرگی ٧، لاپەرە (٢٣٨).

– (البدایة والنهایة)، ابن کثیر، بەرگی ١١، لاپەرە (٣٣٩).

٦. (مسالك الابصار في ممالك الامصار)، العمري، لیکۆڵینەوەی (عبد الله بن یحیی السریحي)، بەرگی ٢، لاپەرە (٥٤).

٧. بۆ زیاتر بڕوانە:
- (العراق الشمالي)، محمد هادي الدفتري. بغدا. ١٩٥٥. لاپەڕە (٢٢٧).
- گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (١٤). لاپەڕە ٨). لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مێژووی سەردەمە ئابوورییەکانی ناوچەی کەرکوك)، ئەژی.
- (مێژووی کۆنی کەرکوك لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی نوزیدا). دکتۆر کامەران کویخا جەلال، هەولێر. ٢٠٠٨. لاپەڕەکانی (١٣١-١٣٦).
٨. (العامة في بغداد في القرنين الثالث والرابع الهجري). فهمي سعيد، لبنان، ١٩٩٣، لاپەڕە (١٩٢).
٩. (اعيان العصر واعوان النصر)، بەرگی ٤. بەیروت. ١٩٩٨، لاپەڕە (٢١٠٨).
هەر چەندە ئەو دەقە ئاماژە دەکات بە ماوەیەکی دواوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە بەڵام بەڵگەیە لە بوونی ئەم پیشەیە لە داقوق.
١٠. بۆ زیاتر بڕوانە: (داقوق تاریخها)، الربیعي، لاپەڕە (٦١-٦٤).
١١. بڕوانە:
- (تلخيص مجمع الاداب)، بەرگی ٤، ق ٤، لاپەڕە (١١٧٠).
- (مدن كرديه قديمه، تاريخها وجغرافيتها ورجالها وعلمائها وادبائها)، محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، سلێمانی، ١٩٩٩، لاپەڕە (٣١).
١٢. (نزهة القلوب في المسالك والممالك)، المستوفي القزويني، بوونی کێڵگەی (جەمبور) کە دووەم کێڵگەی گەورەیە لە کەرکوك کە کەوتووەتە سەرووی داقووەوە لە دووری (١٠) کم.
- (إقتصادي بترول العراق)، طارق شكري محمود، بەغدا، ١٩٧٥، لاپەڕە (١٦٨).
١٣. بڕوانە نەخشەی داقوق.
١٤. فەرسەخ: بریتییە لە (٣) میل، کە درێژترین فەرسەخ نزیکەی ٦ کیلۆ مەتر دەبێت، بڕوانە:
(المكاييل والاوزان الاسلامية وما يعادلها في النظام المتري)، فانترهنتس، وەرگێڕانی كامل العسلي، لە بڵاوکراوەکانی (جامعه الاردن)، عەممان، ١٩٧٠، لاپەڕە (٩٤).
١٥. (الكرد في الدينور وشهرزور)، النقشبندي، لاپەڕە (٢٩٨).
١٦. (بلدان الخلافة الشرقية)، لاپەڕە (١٢١).
١٧. طفر: ناوچەیەکە لەنێوان (باقوبا)و (داقوقا) لە کاروبارەکانی ڕازان، کە هیچ ئاوو لەوەڕگاو شوێنی نیشتەجێبوون تێدا نییە، کەسیش ئەم ڕێگایەی نەگرتووە لە بەغداوە بۆ (اربل)، (معجم البلدان)، یاقوت الحموي، بەرگی ٦، لاپەڕە (٢٦٢).
١٨. (تجارة العراق في العصر العباسي)، حسن على المسيري، کوێت، ١٩٨٢، لاپەڕە (١٨١).
١٩. (معجم البلدان)، یاقوت الحموي، بەرگی ٤، لاپەڕە (٣٠٣).
٢٠. (مرآة الزمان)، بەرگی ٨، لاپەڕە (٥١٦).
٢١. (نوح کوڕی نەسر کوڕی ئەحمەد ئیسماعیل) ئەمیری سامانییەکان بووە لە پاشای بوخاری، پاشایەکی بە بەزەیی بووە. فرمانڕەوایی خوراسان و وڵاتی دوای ڕووباری کردووە لەنێوان ساڵانی (٣٣١-٣٤٣)ی کۆچی، (وفيات الاعيان)، ابن خلكان، بەرگی ٣، لاپەڕە (٨٣).
٢٢. (تجارب الامم)، بەرگی ٢، لاپەڕە (١٠١).
٢٣. ئەم ڕێگایە بەکار هاتوو هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە بۆ گەیاندنی کەلوپەلە بازرگانییەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، (وڵاتی شام و دەریای ناوەڕاست)، بە پێچەوانەوە:
- (مێژووی کۆنی کەرکوك)، دکتۆر کامەران کویخا جەلال، لاپەڕە (١٧٧).
- گۆڤاری (کەرکوك)، ژمارە (٢٠)، ساڵی ٢٠٠٤، لاپەڕە (٧٦)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مێژووی داقوق فەرمانڕەوایانی کورد)، هاشم عاسی کاکەیی.
٢٤. (تحفة الوزراء)، الصابي، لاپەڕەکانی (١٧-١٨).
٢٥. بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە (داقوق، دراسة في تاريخها السياسي والحضاري، ١٦-٦٥٦ هـ / ٦٣٨-١٢٥٨م)، ئاریان جەمال ئیسماعیل هەرزای، لاپەڕە (٣٢).
٢٦. (صورة الأرض)، ابن حوقل، لاپەڕە (١٩٦).
٢٧. (الكرد، دراسة سوسيولوجية وتاريخية)، باسيل نيكتن، وەرگێڕانی: دکتۆر نوری تاڵەبانی، ٢٠٠٦، لاپەڕە (١١٢).
٢٨. (الثروة الحيوانية في العراق وسبل تطويرها)، حافظ ابراهيم محمود، موسل، ١٩٧٩-١٩٨٠، لاپەڕە (١٠٨).
٢٩. بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بابەتە بڕوانە (داقوق، دراسة في تاريخها السياسي والحضاري، ١٦-٦٥٦ هـ / ٦٣٨-١٢٥٨م)، ئاریان جەمال ئیسماعیل هەرزای، لاپەڕە (١٧).
٣٠. (الكرد وبلادهم عند الرحاله المسلمين)، حەکیم ئەحمەد مام بەکر، لاپەڕە (١٩٢).
٣١. بڕوانە ئەم سەرچاوانە:
- (الثروة الحيوانية في العراق وسبل تطويرها)، حافظ ابراهيم محمود، موسل، ١٩٧٩-١٩٨٠، لاپەڕە (٣٣).
- گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژمارە (١٤)، لاپەڕە (٨)، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی: (مێژووی سەردەمە ئابوورییەکانی ناوچەی کەرکوك)، ئەژی.

**تەوەری شەشەم**

*** بارودۆخی ئابووری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا:**

د. بەختیار سەعید

***کشتوکاڵ:**

**١. شێوازی موڵکداری زەوی:**

لە دەوڵەتی عوسمانیدا زەوی‌و زار بەپێی شێوەی موڵکداری لە چەند جۆرێك پێك دەهات: یەکێك لەو جۆرانە زەوی میری (اراضي اميرية) بوو، ئەم جۆرە زەوییانە موڵکی دەوڵەت یان میری بوون. هەروەها زەوی تایبەت (ملك صرف) ئەم جۆرە زەوییانەش موڵکی تایبەتی خەڵك بوون. جۆرێکی تر لە زەوی موڵکی بریتی بوو لە زەوییە وە قفییەکان، ئەمانە وەقفی دام‌و دەزگا ئاینییەکان بوو، جۆرێکی تر زەوی جێهێڵراو (المتروكة) بوو، ئەمانە بۆ خزمەت گوزاری گشتی بەکاردەهاتن، هەروەها جۆرێکی تر پێی دەوترا زەوی مردووە (الأموات) ئەمانە زیاتر لە جۆری زەوی بێ پیزو بێ کەڵك بوون[١]. شایەنی باسە جۆرە زەوییەکی تر لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو بە ناوی (خەواسی هەمایونی) ئەمانە موڵکی سەڵتەنەتی عوسمانی‌و سوڵتانەکان بوون[٢]. لە رووی هەبوونی ئەم جۆرە زەوییانە لە کوردستان (قاسملو) ئاماژە بەوە دەکات کە هەر شەش جۆری زەوی کە ناوبراون لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە کوردستاندا هەبوون[٣]. سەبارەت بە زەوی موڵکی تایبەت لە دەڤەری کەرکوکدا دەبینین لە سەدەی نۆزدەدا بوونی هەبووە. چەند بنەماڵەیەکی ئەم شارە لەوانە (قیردار)و (یاقوب زادە) دەوڵەمەندو خاوەن موڵك بوون. هەروەها نەقشبەندییەکانیش لەنێوانیاندا سەید ئەحمەدی نەقشبەندی خانەقا موڵکێکی زۆری هەبوو[٤]. بێگومان بەشێك لەم موڵکانە زەوی کشتوکاڵی بوون[٥].

جێگەی ئاماژەیە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا موڵکدارە بچووکەکان بەشی هەرەزۆری زەوییەکانیان لەژێر دەستدا بووە‌و هەروەها ئەمانە لە زۆربەی شوێنەکاندا خاوەن موڵك‌و دەست رۆیشتوو بوون زۆربەی کات زەوییەکانیان لە (٥٠) دۆنم کەمتر نەبووە، ئەمانە خاوەن ئەو زەوییە بەپێزانە بوون کە دەکەوێتە نێوان کەرکوك‌و هەولێرەوە[٦]، هەروەها دەبینین لە ناوەراستی سەدەی هەژدەدا هەریەك لە گوندەکانی تەرجیل[٧]و بەشیرو لەیلان‌و تسعین[٨]و چەند گوندی تر زەوی تایبەتی بوون، خاوەنی ئەم زەوییانە لە کەسایەتیە دەست رۆیشتووەکانی ناو شاری کەرکوك بوون[٩]. بێگومان بە لایەنی کەم بەشێك لەم زەوییانە تاوەکو سەدەی بیستەمیش هەر لە شێوەی زەوی‌و زاری موڵکی تایبەتی ماونەتەوە.

زۆرێك لەو کەسایەتی‌و بنەماڵانەی کەوا خزمەتیان بە دەوڵەتی عوسمانی دەکردو خاوەن پلەوپایە بوون لە ناو دەوڵەت، دەسەڵاتدارانی عوسمانی پاداشتیان دەدانەوەو جیاووکی تایبەتیان پێدەدان لەوانە بنەماڵەی نەفتچی زادە کە چەندین کەس لە تاکەکانی ئەم بنەماڵەیە بۆ ماوەیەکی زۆر پلەوپایەی موتەسەلیمی کەرکوك یاخود جێگری موتەسەریفی کەرکوکیان لە دەستیدابووە، هەر بۆیە خاوەنی دەسەڵاتی زۆر بوون‌و دەوڵەتی عوسمانیش جیاووکی گرنگی پێدابوون لەوانە سەرپەرشتی کردنی بیرە نەوتییەکان لە بابەگورگور[١٠].

سەبارەت بە خاوەندارێتی زەوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا تێبینی ئەوە دەکرێ کە تاوەکو ناوەراستی سەدەی نۆزدە لەم بوارەدا جۆرێك لە نارێکی‌و بێ یاسایی بەدی دەکرا. دەوڵەت خۆی بە خاوەنی زەوی دەزانی، ئەوانەش کە حکومەت بەپێی چەندین بۆند زەوی پێ دابوون خۆیان بە خاوەنی زەوی دەزانی. لە لایەکی تر لە لایەکی تر پێش پەیدابوونی موڵکداری تاپۆ زۆربەی زەوییەکان موڵکی خێڵ‌و دەرەبەگەکان بوون[١١]. هەروەها کرین‌و فرۆشتنی زەوی بەبێ ئاگای دەوڵەت بەرێوەدەچوو[١٢]. لەمەدا روون دەبێتەوە کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا کشتوکاڵ‌و مەسەلەی خاوەندارێتی زەوی بەدەست چەندین کێشەو گیروگرفت دەیانناڵاند هەر ئەمە پاڵی بە دەوڵەتی عوسمانییەوە نا لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا بیر لە چارەسەرکردنی کێشەی موڵکداری زەوی بکاتەوە.

دەوڵەتی عوسمانی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زەوی‌و زار لە کانوونی دووەمی (١٨٥٩ز)دا یاسای تاپۆی دەرکرد[١٣]. ئەم یاسایە لە سەردەمی مەدحەت پاشا لە ساڵی (١٨٧١ز) دا جێبەجێکرا. بەپێی ئەم یاسایە دەوڵەت زەوی بە ناوی خاوەنەکەی تۆماردەکرد وەچەسپاندنی مافی ئەو کەسە بۆ زەوی یەکەی لای دەوڵەت بوو، بۆ ئەم مەبەستەش دەوڵەت فەرمانگەکانی تۆمارکردنی زەوی (دائرة التسجيل العقاري) لە ویلایەتەکاندا کردەوە لەوانەش ویلایەتی موسڵ[١٤].

هەر چەندە یاسای تاپۆ رەنگدانەوەی قوڵی لەسەر بواری موڵکداری زەوی هەبوو بەڵام کەم‌و کورتی لە بواری جێبەجێکردنی یاساکەو بەناوکردنی زەوی هەبوو. هەر بۆ نموونە ئەو زەوییانەی بێ خاوەن بوون بە ناوی سوڵتانەوە تۆمارکران، ئەمە بێجگە لەوەی بەپێی یاسای تاپۆ نەدەبوو گوندێك بە تەواوی بە ناوی کەسێکەوە تۆمار بکرێت بەڵام ئەم یاسایەش پێرەونەکراو لێی لادرا[١٥]. لە لایەکی تر ئەوانەی خاوەن جۆرە ئیمتیازێکی زۆر بوون لە بواری موڵکداری زەوی‌و رووبەرێکی فراوانی زەوییان لە دەست دابوو، هەوڵیان دا لەم بوارەدا وەکو جاران بمێننەوە، هەر بۆیە بەشێکی زۆری زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بە ناوی خۆیانەوە تۆمارکرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی رووبەرێکی فراوانی زەوی بکەوێتەوە دەست سەرۆك هۆزەکان کە لە ئاکامدا چینی خاوەن موڵکە گەورەکان پەیدابوون، سەرەتایەکیش بوو بۆ دروست بوونی جیاوازی چینەکان لەناو کۆمەڵگەدا[١٦].

لە راستیدا لە کوردستان لە دوای لە ناوچوونی میرنشینە کوردییەکان دەسەڵاتی راستەقینە کەوتە دەست ئاغاو بەگ‌و سەرۆك هۆزەکان، رژێمی تاپۆش زیاتر یارمەتی دەری ئەم

چینانە بوو لە بواری موڵکداری زەوی[١٧] بۆیە لە ناوچە کوردییەکاندا جوتیارەکان لەژێر باڵی ئاغاو شێخەکاندا بوون. ئەمانە گوندەکانیان بەڕێوە دەبردو کێشەی جوتیارەکانیان چارەسەر دەکرد، بەم پێیەی ئاغاو شێخەکان پەیوەندیان بە پیاوانی دەوڵەتەوە هەبوو بۆیە کاتێك یاسای تاپۆ هاتەگۆڕێ ویستیان سوود لەم پەیوەندیانە وەربگرن. لە لایەکی تر نەزانیو دوورەپەرێزی جوتیارەکان بووە هۆی ئەوەی ئەو دوو توێژەی سەرەوە بەشی هەرەزۆری زەوییەکان بە ناوی خۆیانەوە تۆمار بکەن هەر چەندە ئەمە دژی یاسای تاپۆ بوو، کە لە ئەنجامدا ئەمانە بوونە خاوەن زەویو دەیانتوانی بە تەواوی زەوییەکان بەکاربێنن[١٨].

هەر سەبارەت بە مەسەلەی موڵکداری زەوی تێبینی ئەوە دەکرێ کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا (١٨٧٦-١٩٠٩ز) زەوی تایبەتی سوڵتان کە بە(اراضي السنية) دەناسرا لە زیادبوون دابوو، بە جۆرێك لەو سەردەمەدا سوڵتان بە گەورەترین خاوەنداری زەوی دەژمێردرا، هەر بۆیە دەبینین زەوییە تۆمارکراوەکانی لە ویلایەتی بەغدا گەیشتە (٥٤٦,٢٠٠) هیکتار چوارگۆشە کە لە بە پیزترین زەوییە کشتوکاڵییەکان بوون. هەروەها لە نزیك موسڵو دەشتەکانی نێوان زێی گەورەو زێی بچووكو ناوچەی بەکرەجۆ لە سلێمانی زەویو زاری هەبوو، زەوی بەرفراوانیشی لە ناوچەی مەخموری رۆژئاوای هەولێر هەبوو[١٩].

لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی ساڵی(١٨٩٠-١٨٩١ز) دەردەکەوێ خورماتوو کە قەزایەکی کەرکوك بوو دەچووە ناو خانەی زەوییەکانی سوڵتان[٢٠]. هەر لەم بارەیەوە دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە بە گوێرەی زانیارییەکانی ساڵنامەی ساڵی ١٨٩٤ز فەرمانگەی تۆماری زەوی سوڵتانی (تسجيل اراضي سنيه شعبة سی) لە شاری کەرکوکدا هەبووە[٢١]. بێگومان بوونی ئەم فەرمانگەیەش مانای هەبوونی زەوییەکانی سوڵتان دەگەیەنێت لەم دەڤەرەدا.

یەکێکی تر لەو دیاردانەی کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا زۆر بایەخی پێدرا بوژانەوەی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان بوو[٢٢]. لەو چوارچێوەیەشدا هەندێ زەوی بەسەر شێخەکاندا دابەش کرا[٢٣]. بێگومان ئەو زەوییانەی دەدرا بە شێخو دەروێشەکان دەبوونە زەوی تایبەت.

هەروەها لە ساڵانی پێشتریش کاری لەم جۆرە ئەنجام دەدرا، ئەوەتا ئیسماعیل تەیار لە ساڵی (١٨٦٠ز)دا بووەتە موتەسەریفی کەرکوكو دەستی کرد بە دابەشکردنی زەوی بەسەر شێخو سۆفییەکان، هەر بۆیە هەندێ لە شێخو سۆفییەکان لەم سەردەمەدا ڕوویان کردە کەرکوك بۆ نیشتەجێبوون[٢٤]. بێگومان ئەم کارەش دەبووە هۆی زیاد بوونی تەکیەو خانەقاکان، ئەوەتا شەمسەدین سامی لە ساڵی (١٨٩٦ز)دا ئاماژە بەوە دەکات کە ١٥ تەکیەو خانەقاو ٣٦ مزگەوت لە شاری کەرکوکدا هەبوون[٢٥].

سەرباری ئەمانە هەندێ زەویو زاری (وەقف)یش لە دەڤەرەکەدا هەبوون، ئەمانەش ئەو زەوییانە بوون کە داهاتەکانیان بۆ مزگەوتو خانەقاو شوێنی پیرۆزو خزمەتگوزارییەکان تەرخان کرابوون، بۆ نموونە دەبینین لە سەدەی هەژدەهەمدا چەند گوندێکی گەورەی کەرکوك کراونەتە وەقفی شوێنە پیرۆزەکانی مەککەو مەدینە (الحرمين الشريفين) وەکو زەوی گوندی ئۆجۆش کە بەرهەمەکەی دەگەیشتە (٢٠٤,٨٠١) ئاقچە[٢٦]. دەکرێ بڵێین ئەم زەوییە وەقفیانە بۆ سەدەی نۆزدەش ماونەتەوە لەبەر ئەوەی سروشتی زەوییە وەقفییەکان بە جۆرێك بوون لەبەر مەسەلەی پیرۆزی زۆر دەستکاری نەدەکران. بە گوێرەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی ئاماژە بەوە دەکەن کە لە چارەکی دوایی سەدەی نۆزدەدا (٣٠٥) پارچە زەوی وەقف لە دەڤەری کەرکوکدا هەبوون[٢٧]. بێگومان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرزی ڕێژەی زەوییە وەقفییەکان لە دەڤەری کەرکوکدا. هەر بۆیە لە شاری کەرکوکدا فەرمانگەی وەقفی هەبوو[٢٨]. بێگومان یەکێك لە کارەکانی ئەم فەرمانگەیە سەرپەرشتی کردنی زەوییە وەقفییەکان بووە.

بە گوێرەی زانیارییەکانی ساڵنامەی موسڵ هەر یەك لە زەوییەکانی موڵکداری تایبەتو زەوییە میرییەکان بە ڕێژەیەکی بەرفراوان بوونیان هەبووە لە دەڤەری کەرکوکدا، بە جۆرێك سەرچاوەیەکی باشی داهاتی باج بوونە بۆ دەوڵەت[٢٩]. بەڵام لە ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵدا هیچ جۆرە زانیارییەك لەسەر داهاتی زەوییەکانی سوڵتانیو وەقفیو زەوییە مردووەکان تۆمار نەکراوە، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو جۆرە زەوییانە لە سەنجەقی شارەزوور (کەرکوك)دا نەبووە بەڵکو هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە داهاتی ئەم جۆرە زەوییانە بۆ خەزێنەی دەوڵەت نەبوو.

### ٢. کشتوکاڵو بەروبومی کشتوکاڵی؛

زەویو زار بنەمای سەرەکی کشتوکاڵ کردنەو هەروەها ئەم کردارە ئابوورییەش دیاری دەکات. بۆیە دەتوانین بڵێین دەڤەری کەرکوك لەم بوارەدا لە ئاستێکی خراپ دا نەبووە، چونکە زۆربەی ئەو گەڕیدانەی کە لەم سەردەمەو پێشتریش سەردانی کەرکوکیان کردووە پەنجەیان بۆ بە پیتیو چاکی زەویو زاری کەرکوك درێژکردووە.

لەم بوارەدا لە سەدەی شازدەهەمدا گەڕیدەی هۆڵەندی (راوۆلف) دەڵێت: "کەرکوك لە دەشتایەکی زۆر بە پیز هەڵکەوتووە"[٣٠]. هەروەها (نیبور)یش کە لە سەدەی هەژدەدا سەردانی کەرکوکی کردووە دەڵێت: "دەکەوێتە دەشتایەکی جوانو پڕ خێرو بەرەکەت"[٣١]. دواتریش گەڕیدەی فارسی ئەبو تالب خان کە لە ساڵی (١٧٩٩ز)دا هاتۆتە ناوچەکە دەڵێت: "شارەکە لە دەشتایەکی فراوان هەڵکەوتووە خاوەن دیمەنێکی جوانە کە لە مەودایەکی دوورەوە دەبینرێت"[٣٢].

خەڵکی ئەم ناوچەیە لە بەرەبەیانی مێژووەوە چالاکی کشتوکاڵ کردنو بە خێوکردنی مەڕو ماڵاتیان ئەنجام داوە[٣٣]. هەروەها لە ڕووی کەشو هەواوە دەڤەری کەرکوك هەلومەرجی باشی هەیە بۆ کشتوکاڵ بە تایبەت لە هاویندا کەشو هەوای کەرکوك مام ناوەندییە، ئەمە بێجگە لە زۆری

ئاوو رووبارو كارێزو بوونی دەشتایی‌و خاكی بە پێز كە یارمەتیدەری گەورەن بۆ پەرەسەندنی كشتوكاڵ لەم دەڤەرەدا[٣٤].

لە بارەی ئەو بەروبومە كشتوكاڵییانەی لە ناوچەی كەركوكدا بەرهەم دەهێنران هەندێ لە سەرچاوەكان زانیاری گرنگیان بۆ تۆمار كردووین بە تایبەتی ساڵنامەكانی ویلایەتی موسڵ. لە ساڵنامەی (١٨٩٢ز) هاتووە كە بەرهەمی كشتوكاڵی سەرەكی كەركوك گەنم‌و جۆیە، هەروەها لۆكەش لەم دەڤەرەدا بەرهەم دەهێنرێت. جێگەی سەرەنجە ئەم بەروبومانە بە تایبەتی گەنم‌و جۆ بە پێداویستی سەرەكی ژیان دادەنرا لە ناوچەكەدا، بێگومان لۆكەش لە بەروبومە دراوییەكان دەژمێردرێت. هەر سێ بەربوومەكەش وەك كاڵای بازرگانیش بایەخیان هەبوو.

هەر بۆیە بە گوێرەی زانیارییەكانی ساڵنامەی ناوبراو ئەم بەرهەمانە بە رێژەیەكی هێندە زۆر بەرهەم هێنراون تا ئەو رادەیەی كە لێی دەناردرایە دەرەوەی ناوچەكە[٣٥]. گەریدە پۆرتەر كە لە ساڵی (١٨٢٢ز)دا هاتۆتە كەركوك لە بارەی بەروبومە كشتوكاڵییەكانی شارەكەوە دەڵێت: "لە گوندەكانی دەوروبەری كەركوك بە رێژەیەكی زۆر پاقلەو شوتی‌و خەیار بەرهەم دەهێنرێت"[٣٦]. گەریدەی ئینگلیزی (میجەر سۆن)یش لەم بارییەوە دەڵێت: "كەركوك بەناوبانگە بە بێستان‌و بەرهەمهێنانی سەوزەو گەنم‌و جۆ"[٣٧].

جێگەی ئاماژەیە هەر بەپێی ساڵنامەی (١٨٩٢ز) چەندین جۆری سەوزەو میوە لە ناوچەی كەركوك بەرهەم دەهێنرا لەوانە بامیەو باینجان‌و كولەكەو مێوو كاڵەك‌و شووتی‌و ترۆزی‌و تەماتە[٣٨]. هەروەها ساڵنامەی (١٨٩٠-١٨٩١ز) باسی چەند بەروبومێكی تری میوەجات دەكات كە لە ناوچەی كەركوك بەرهەم هێنراون لەوانە سێوو لیمۆو نارنج‌و هەنجیرو زەیتون ئەمە سەرەرای بەروبومی تری وەك پەموو خوری‌و كونجی‌و ماش‌و كشمیش‌و وتووتن‌و پاقلەو برنج‌و فاسۆلیاو گەنمەشامی‌و قەیسی[٣٩].

جگە لەم بەروبومانەی كە باسمان كرد ساڵنامەی (١٨٩٤ز) هەندێ بەروبومی تری كشتوكاڵیمان بۆ باس دەكات كە لە ناوچەی كەركوك بەرهەم دەهێنرا وەك پرتەقاڵ‌و كەباد ئەمە سەرەرای بوونی خورما لە شارەكەدا. ئەوەی جێگەی سەرەنجە ئەم ساڵنامەیە ئاماژە بەوە دەدات كە لە دەڤەری كەركوكدا شینایی زۆرە ئەمەش بە هۆی بوونی كانیاوەكانی قوریەو تسعین‌و زاویەو بێلاوەو تبغان[٤٠].

سەرەرای ئەمەش كشتوكاڵ كردن لە دەڤەری كەركوكدا بە دەست هەندێ كەم‌و كورتییەوە دەیناڵاند لەوانە نەبوونی سیستەمێكی رێكوپێك لە بواری چاندنی كشتوكاڵی، هەروەها خراپی هۆیەكانی گواستنەوە كە رێگربوو لە بەردەم كشتوكاڵ‌و بازرگانی لەم شارەدا چونكە پشت بە ئاژەڵی بار دەبەسترا بۆ گواستنەوەی بەروبوومەكان، بۆیە لە ساڵنامەی ساڵی (١٨٩٤ز)دا پێشنیازی ئەوە كراوە كە هێڵی شەمەندەفەر بۆ كەركوك رابكێشرێت بۆ ئەوەی بازرگانی‌و بواری ئابووری روو لە بەرزبوونەوە بكات[٤١].

ئەوەی تێبینی دەكرێت زۆربەی ئەو گەریدانەی سەردانی شاری كەركوكیان كردووە باس لە بوونی كشتوكاڵ‌و داروردەخت لە دەڤەری كەركوكدا دەكەن، ئەوەتا گەریدەیەكی ئینگلیزی لەم بارەیەوە دەڵێت: "كەركوك یەكەم شوێن بوو دارمان تێدا بینی لەوەتەی موسڵ مان بەجێهێشت، دارەكانی زیاتر خورما بوون لە چاو دارەكانی تر"[٤٢]، جێگەی ئاماژەیە ناوبراو بەر لەوەی سەردانی كەركوك بكات، سەردانی هەندێ ناوچەی تریشی كردبوو لەوانە هەولێر، هەرچەندە پێدەچێت گەریدەی ناوبراو لەم بارەیەوە زێدەرۆیی كردبێت، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گەواهی ناوبراو ئاماژەو گوزارشی گرنگمان دەداتێ لەسەر بوونی دارو سەوزایی لە ناوچەی كەركوك.

لەلایەكی ترەوە لە هەردوو ساڵنامەی (١٨٩٠-١٨٩١ز) و ساڵنامەی (١٨٩٢ز)دا هاتووە كە لە دەڤەری كەركوك (٦٤)باخ‌و (٩٨)باخچە هەبوون[٤٣]. بەلام لە سەرچاوەی عوسمانی تردا هاتووە كە لە دەڤەری كەركوكدا (١٢٨٤) باخچەی بچووك‌و (١٨٠)باخچەی گەورەی تێدایە[٤٤]. لە راستیدا ئەگەر لە سەرچاوەی دووەمدا زێدەرۆیش كرابێت بەلام ئەم زانیارییانە بە شێوەیەكی گشتی بۆمان روون دەكەنەوە كە ناوچەكە دەوڵەمەند بووە بە بواری كشتوكاڵی، هۆی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی كە لەو رۆژگارەدا ژیانی مرۆڤ تارادییەكی زۆر پشتی بە چالاكی كشتوكاڵی‌و دواتر ئاژەڵداری دەبەست.

جێگەی ئاماژەیە لە شاری كەركوكدا فەرمانگەی تووتن (رژی دائرە سی) هەبووە[٤٥]، بێگومان ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت كە ئەم فەرمانگەیە سەرپەرشتی لەسەر بەرهەمی تووتنی كردووە لە شاری كەركوكدا.

جگە لە باخ‌و باخچە بەردارەكان لە شاری كەركوك خەڵكی ئەم شارە هەندێ داری بێ بەرییان چاندووە وەك داری سپی چنارو سورەچنارو بی‌و پەڵك. هەر بۆیە خەڵكی ناوچەكە سوودیان لەم جۆرە دارانە وەرگرتووە بۆ دارتاشی‌و فرۆشتن‌و سووتاندن‌و دارەرای خانوو[٤٦]. هەروەها گەریدەیەكی هۆڵەندیش كاتێك سەردانی كەركوكی كردووە ئەوەمان بۆ باس دەكات كە لە سەرەتای شارەكەدا باخێكی جوان هەبووە، كە باخێكی پان‌و بەرین‌و پر لە دارو درەخت‌و سێبەر بووە هەروەها كەناڵی ئاوی بۆ داین كراوەو پر بوونە لە گوڵ‌و گوڵزار[٤٧]. لە لایەكی ترەوە شەمسەدین سامی لە فەرهەنگەكەیدا هەمان ئەو راستیانەی پێشترمان بۆ دووپات دەكاتەوە دەڵێت: "بەهۆی زۆری سەرچاوەی ئاوەوە دەوروبەری شاری كەركوك باخ‌و باخچەی زۆرەو پرتەقاڵ‌و لیمۆو هەنارو خورماو چەندین بەروبومی تری لێ بەرهەم دەهێنرێت"[٤٨].

دیارە بە هۆی گرنگی‌و بوژاوەیی بواری كشتوكاڵی شاری كەركوك‌و ناوچەكانی دەوروبەری بووە كە دەوڵەت بانكی كشتوكاڵی (زراعت بانقەسی) لە شاری كەركوكدا كردووەتەوە، ئەمەش لە زانیارییەكانی ساڵنامەی (١٨٩٤ز) دا بۆمان تۆماركراوە[٤٩]. لە راستیدا بوونی بانكی كشتوكاڵی لە لایەك واتای سوود وەرگرتنی جوتیاران لەم جۆرە بانكانە دەگەیەنێت، لە لایەكی تر مانای بوژانەوەی بواری كشتوكاڵیە.

جێگەی باسە بە هۆی كزی بوارەكانی تری وەكو پیشەسازی

لەم ڕۆژگارەدا کشتوکاڵ کردن بنەمای سەرەکی ئابووری بووە. بەڵام سەرچاوە مێژووییەکان باسی ئەوەمان بۆ ناکەن کە تا چ ڕادەیەك جوتیاران لەم جۆرە بانکانە سوودمەند بوون هەروەها ئایە ئەم جۆرە بانکانە تا چ ڕادەیەك چالاك بوون بۆ خزمەتی بواری کشتوکاڵی.
لە کۆتایدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە کشتوکاڵ و دارو درەختەکان یەکێك بوون لەو بوارە گرنگانەی کە دەوڵەت ساڵانە باجێکی زۆری بە هۆیانەوە دەست کەوتووە(٥٠). بێگومان ئەمەش مانای بوژانەوەی بواری کشتوکاڵی دەگەیەنێت لە دەڤەری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا.

### ٣. ئاژەڵداری:

یەکێك لەو لایەنە گرنگانەی کە مرۆڤ هەر لە کۆنەوە سوودی لێ وەرگرتووە ئاژەڵداری بووە، لەبەر ئەوەی ئاژەڵ سەرچاوەیەکی گرنگی خۆراك بووە بۆ مرۆڤ، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ سوودی زۆری لە ئاژەڵ بینیوەو بەکاری هێناوە وەك هۆیەکانی گواستنەوە. هەر بۆیە لە کۆمەڵگەی کوردەواریشدا هەر لە زووەوە کاری ئاژەڵداری کراوەو بەخێوکردنی ئاژەڵیان زانیوە، کە خۆی دەبینێتەوە لە بەخێوکردن و ڕاگرتنی مانگاو مەڕو بزن و گوێدرێژو ئەسپ و پەلەوەری وەکو مریشك و قازو مراوی(٥١).
چەند هۆکارێکی تر یارمەتیدەر بوون بۆ چالاکی ئاژەڵداری لە ناوچەی کەرکوکدا وەکو ناوچە کوردییەکانی تر، لەوانە گونجاوی پلەی گەرماو بوونی ڕێژەیەکی باش لە ئاوی سەر زەوی و ژێرزەوی، ئەمە سەرەڕای بوونی لەوەڕگای بە پیت و پان و بەرین(٥٢). بۆیە دەبینین لە سەدەی نۆزدەدا بەروبوومە ئاژەڵییەکانی وەکو کەرەو خوری و پێستە، چاوگی سەرەکی ئابووری کورد بووە کە ڕۆژانە بەکاریان دەهێناو سەرچاوەی سەرەکی بوون بۆ دابین کردنی ژیانیان(٥٣).
زۆربەی ئەو گەریدانەی لە سەدەی نۆزدەدا سەردانی کەرکوکیان کردووە جەخت لەسەر دەوڵەمەندی ناوچەکە دەکەنەوە بە بەروبوومی ئاژەڵداری، ئەوەتا پۆرتەر کاتێك سەردانی کەرکوکی کردووە لە بارەی ناوچەکەوە دەڵێت: "بە زۆری ئاژەڵی تێدا پەروەردە دەکرێ"(٥٤). هەروەها شەمسەدین سامی باسی ئەوە دەکات کە ئەم شارە کارخانەی دەستی تێدایە بۆ پێستە خۆشکردن و گوریس بەرهەمهێنان(٥٥). بێگومان ئەم دوو پیشەیە پشت بە بەروبوومی ئاژەڵداری دەبەستن کە بریتین لە پێستەی ئاژەڵ و مووەکەی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم شارە سوودی لە بەروبوومە ئاژەڵییەکانی خۆی وەرگرتووە بۆ پیشەگەری، بەڵگەیەکی تری بایەخدانی خەڵکی ناوچەکە بە پیشەی ئاژەڵداری ئەوەیە کە خەڵکی کەرکوك بە شێوەی بەرفراوان سوودیان لە پاشەڕۆی ئاژەڵ وەرگرتووە بۆ سووتەمەنی ماڵان و گەرم کردنی حەمامەکان هەرچەندە ئەمەش لە ڕووی تەندروستییەوە شیاو نییە(٥٦).
خەڵکی شاری کەرکوك لە بواری ئاژەڵداریدا بە شێوەیەکی باش بایەخیان بە مەڕو بزن و ئەسپ و هەندێ جۆری تر داوە(٥٧). هەروەها لە دەورووبەری شارەکەدا بەخێوکردنی ئاژەڵ ئەنجام دراوەو بازاڕی کڕین و فرۆشتنی ئەسپ و ماینی عەرەبی لەم شارەدا گەرم بووە، لە لایەکی تر سوودی زۆر لە ئاژەڵ وەرگیراوە بۆ کاری کشتوکاڵ و جووتکردن(٥٨).
لە ساڵنامەی (١٨٩٢ز)دا هاتووە کە لەم لیوایە (واتە کەرکوك) هۆکاری سەرەکی بووە بۆ گواستنەوە هێسترو بارگیرە لەگەڵ گوێدرێژ. هەر بە گوێرەی زانیاری ئەم ساڵنامەیە لە باشووری شاری کەرکوکدا عەشیرەتی عوبەیدو چەند عەشیرەتێکی تر هەن کە ئەمانە لەسەر بەخێوکردنی مەڕوماڵات ژیان بەسەر دەبەن(٥٩). هەروەها بە گوێرەی ساڵنامەی (١٩١١-١٩١٢ز) شاری کەرکوك بەزۆری بەخێوکردنی مانگا بەناوبانگە(٦٠).
جێگای ئاماژە بۆ کردنە لە سەدەی نۆزدەدا کوردستان مەڵبەندی گەورەی ناردنە دەرەوەی ئاژەڵ بووە بۆ بازارەکانی ناوچەکە، ئەوەتا لەم ماوەیەدا تەنها ئەستەمبوڵ و حەلەب و بەغدا هەر ساڵەی سێ ملیۆن سەر مەڕی کوردستانیان بۆ دەهات، بەندەری سامسونیش لە تورکیا بە تەنها بیست ملیۆن هێلکەی بۆ دەچوو(٦١). هەروەها لە سەدەی نۆزدە لە هەندێ لە شارە کوردییەکاندا (لە نێویاندا کەرکوکیش) کاری بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم بڵاوبووە کە خاوی ئاوریشمیان لێ بەرهەم دەهێنا(٦٢). جێگەی باسە کەوا دەسەڵاتدارانی عوسمانی ڕێژەیەکی باش داهاتیان دەسکەوتووە لە باجی مەڕوماڵات لە دەڤەری کەرکوکدا(٦٣)، ئەمەش مانای دەوڵەمەندی ناوچەکە دەگەیەنێت بە سامانی ئاژەڵی.

### ٤. جوتیاران:

لە ڕاستیدا سەرچاوە مێژووییەکان زانیاری وردو تەواویان لەسەر بارودۆخی جوتیاران لە دەڤەری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا بۆ تۆمار نەکردووین، هەر بۆیە ئەو زانیارییانەش کە لەبەردەستدان کەم و پەرش و بڵاون.
کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری هۆکاری سەرەکی بوون بۆ ژیان و گوزەرانی دانیشتووان، هەر بۆیە لەو ڕۆژگارەدا ڕێژەی هەرەزۆری دانیشتووانی ئیالەتی شارەزوور جوتیار بوون(٦٤).
بێگومان دەڤەری کەرکوکیش کە خاوەن گەرم و گوڕی بازاڕی ناوخۆیی و بازرگانی دەرەکی بوو کە لە داهاتوودا باسیان دەکەین، هەموو ئەو بەرهەمانەی کە لە بازاڕی ناوخۆیی و بازرگانی دەرەکیدا بەکاردەهێنران لە بوارەکانی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و سامانە سروشتییەکاندا بەدەست دەهاتن، بێگومان تەواوی ئەم شتانەش بە بازوو مەچەکی جوتیاران بەرهەم هاتوون، ئەمە بێجگە لەوەی کە جوتیاران لە لایەن کاربەدەستانی عوسمانییەوە باجێکی زۆریان لێ وەردەگیرا(٦٥) ئەم باجانە لە چەندین بواری جۆراوجۆردا وەرگیراون وەك باجی مەڕو ماڵات و کشتوکاڵ و باجی ئاژەڵی کەڵەو بارهەڵگرەکان و باجی زەوی و زارو چەندین ڕەسمی جۆراو جۆرو.. هتد(٦٦).
هەر چەندە جوتیاران لە بارودۆخێکی سەختدا دەژیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك بوون لەو چینانەی هەردەم بەرگریان لە خاکی کەرکوك کردووە دژی هێرشی داگیرکەران کە ویستوویانە شاری کەرکوك داگیر بکەن، ئەوەتا بە گوێرەی زانیاری یەکێك لە سەرچاوە مێژووییەکان لە کاتی هێرشی

ئێرانییەكان بۆ سەر كەركوك و گەمارۆدانی شارەكە لە ساڵی (١٨٢١ز)دا توێژی جوتیاران گەورەترین بەرگریان لە شارەكە كردووو بە هیچ شێوەیەك ئامادەی خۆ بەدەستەوەدان نەبوون بۆ داگیركەران، كە لە ئاكامدا ژمارەیەكی زۆریان لێ لە سێدارەدان[٦٧].

*** پیشەگەری و چەند لایەنێكی تر:**

**١. لایەنی پیشەگەری:**

پیشەگەری بە یەكێك لە چالاكییە گرنگەكانی ئابووری دەژمێردرێ. لە پاڵ چالاكی كشتوكاڵی و بازرگانیداو پەیوەندییەكی بە تینی لەگەڵ ئەم دوو بوارەدا هەیە. لەبەر ئەوەی شاری كەركوكیش لە سەدەی نۆزدەدا لە بواری كشتوكاڵی و ئاژەڵداری و هەروەها لە بواری بازرگانیشدا تارادەیەكی باش بوژاوە بوو، هەر بۆیە لایەنی پیشەگەریش لەم شارەدا گەشەی كردبوو.

سەبارەت بە بواری پیشەگەری لە شاری كەركوكدا سەرچاوە مێژووییەكان هەندێ زانیاری گرنگ و نایابیان بۆ تۆماركردووین، بەپێی زانیارییەكانی ساڵنامەی (١٨٩٢ز) چەند بوارێكی پیشەگەری وەكو دروست كردنی پێڵاوو پێستەخۆشە كردن لە شارەكەدا هەبوون[٦٨]، بەڵام بە گوێرەی زانیارییەكانی ساڵنامەی (١٨٩٤ز) پیشەگەری وەكو كورتان دوورو دارتاشی و پیشەی دروست كردنی قاپوقاچاغ و رستن و چنین لە شارەكەدا هەبوو[٦٩].

شەمسەدین سامی باسی هەندێ پیشەی تریش دەكات لە شارەكەدا لەوانە (٢٠) كارخانەی دەستی دروستكردنی كوتاڵ و كەتان، ئەمە جگە لە پیشەی پێستەخۆشكردن و دروستكردنی گوریس[٧٠]. دیارە كاری رستن و چنین و دروستكردنی قوماش لەم شارەدا برەوی هەبووەو باو بووە[٧١].

هەروەها گەریدە پۆرتەر باسی ئەوە دەكات هەرچەندە شاری كەركوك یەكێكە لە شارەكانی وڵاتێكی موسڵمان بەڵام پیشەی بەرهەمهێنانی عەرەق لەم شارەدا هەیە، رێژەیەكی یەكجار زۆر عەرەق بەرهەم دەهێنرێت[٧٢]، ئەوەتا گەریدەیەكی فارسی كاتێك هاتۆتە شاری كەركوك ئاماژە بەوە دەكات كە زۆربەی خەڵكی كەركوك مەی دەخۆنەوە[٧٣]، جێگەی ئاماژە بۆ كردنە جولەكەكانی شاری كەركوك هەرچەندە پیشەگەری بۆیاغ كردن و چنینی دەستیان ئەنجام دەدا، بەڵام رۆڵی گرنگیان هەبوو لە دروست كردنی عەرەقدا[٧٤].

ساڵنامەی موسڵی (١٩١١-١٩١٢ز) بە وردی چەندین پیشەگەری تری گرنگی باسكردووە، كە لە شاری كەركوكدا ئەنجام دراون، لەوانە پیشەی بەرگ دوورین و ئاسنگەری و پیشەی چاك كردنەوەی چەك(چەخماخسازی)و سەعاتچێتی و سفرسازی قاپووقاچاغ، ئەمە جگە لە پیشەی تری وەكو دارتاشی و رستن و چنین و پیشەی دروست كردنی پێڵاوو كورتان دوورین و جۆلایی و تەلارسازی[٧٥].

جێگەی باس كردنە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا پیشەگەری ناوخۆیی لە دەوڵەتی عوسمانیدا رووبەرووی شاڵاوی هاتنی شتومەك و كەلوپەلی ئەورووپی بە تایبەتیش بەریتانی بووەوە، ئەمەش بووە هۆی لاوازبوون و پاشەكشەی پیشەگەری لە دەوڵەتی عوسمانیدا[٧٦].

لەگەڵ ئەو بارودۆخەی لە سەرەوە باسمان كرد، دەتوانین بڵێین كاری پیشەگەری لە شاری كەركوكدا لە سەدەی نۆزدە لە سنوورێكی تەسك و دواكەوتوودا بووە، ئەو دروست كراوانەش كە هەبوون زیاتر پیشەی دەستی بوون تەنها بۆ پركردنەوەی پێداویستە ناوخۆییەكان بوون[٧٧]. ئەمە بێجگە لەوەی بە درێژایی سەدەی نۆزدە هیچ جۆرە كارگەیەكی ئەوتۆی پیشەسازی لە كەركوكدا نەبوو كە ئامێری پێشەكەوتوی تێدا بەكاربهێنرێ، بەڵكو تەواوی كارە پیشەگەرییەكان پشتیان بە كاری دەست بەستووە.

بە گوێرەی ساڵنامەی (١٩١١-١٩١٢ز) لە شاری كەركوكدا سەندیكای پیشەگەری هەبوو[٧٨]. بوونی ئەم جۆرە سەندیكایانەش كە رۆڵی خۆی هەبوو لە رێكخستن و سەرپەرشتی كردنی پیشەگەران بەڵگەی بوونی ژمارەیەكی بەرچاوی پیشەگەرانە لە شاری كەركوكدا.

**٢. سامانی سروشتی:**

نەوت یەكێكە لەو سامانە سروشتیانەی ناوچەی كەركوك كە سەرچاوە مێژووییەكان، بە شێوەیەكی تایبەت گەشتنامەی گەریدە بیانییەكان بەر لە سەدەی نۆزدە ئاماژەیان بە هەبوونی كردووە لە باباگورگور، ئەوەتا لە ناوەراستی سەدەی هەژدەدا گەریدە نیبور ئاماژە بە بوونی ناوچەیەك لە نزیك كەركوك دەكاتەوە بە ناوی باباگورگور كە چەندین چاڵە نەوتی تێدایە[٧٩]. دواتر گەریدەی فەرەنسی ئۆلیڤیە لە ساڵانی (١٧٩٤-١٧٩٦ز)دا جەخت لەسەر بوونی نەوت لەو شارە دەكاتەوە، و باسی ئەوە دەكات كە خەڵكی شاری كەركوك نەوتیان وەك سەرچاوەیەك بۆ رووناكی بەكارهێناوە[٨٠]. گەریدەی هۆڵەندی لیكلاما لە ساڵی (١٨٦٥ز)دا باسی سەرچاوەی نەوت و ئاگری باباگورگوری كردووە[٨١]. شەمسەدین سامیش لە ساڵی (١٨٩٦ز)دا بۆی تۆمار كردوین و دەڵێت: "كەركوك نەوتێكی زۆری هەیە"[٨٢].

هەروەها لە ساڵنامەكانی عوسمانیش ئەم زانیارییانە دووپات كراونەتەوە، بە گوێرەی ساڵنامەی موسڵی (١٩١١-١٩١٢ز) نەوت لە ناحیەی گل و خورماتوو هەبووە[٨٣].

شایەنی باسە نەوت یەكێك بووە لەو سامانە سروشتیانەی لە لایەن خەڵكی دەڤەری كەركوكەوە لە چەند بوارێكی تردا بەكارهێنراوە وەك گەرمكردنەوەو بواری تەندروستی مرۆڤ و بواری بەیتاڵی ئاژەڵ[٨٤]، شایەنی باسە نەوتی كەركوك یەكێك بووە لەو بەرهەمانەی كە بۆ مەبەستی سەربازیش لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەكارهێنراوە[٨٥].

بەڵام سەبارەت بە چۆنییەتی دەرهێنانی نەوت گەریدەكان هەندێ زانیاریان لەم بوارەشدا بۆ تۆماركردووین، ئەوەتا ئۆلیڤیە لەم بارەیەوە دەڵێت: "خەڵكی شاری كەركوك بیری نەوتیان بە قوڵایی پێنج تا دوانزە پێ هەڵدەكەندو رۆژانە نەوتیان لێدەردەكردو كۆیان دەكردەوە تا ئەو كاتەی لەسەر پشتی گوێدرێژ دەیان برد بۆ ناو شاری كەركوك"[٨٦].

بێگومان لێرەدا دەتوانین بڵێین کە گواستنەوەی ئەو نەوتە بۆ شاری کەرکوك بۆ مەبەستی بەکارهێنان یان بازرگانی بووە. هەروەها نیبوریش لەم بارەیەوە دەڵێت: "بۆ گەیشتن بە نەوت لە کەرکوکدا تەنها بە هەڵکەندنێکی کەم دەگەیتە نەوت"[٨٧]. بەڵام خەڵکی ئەو ناوچەیە بۆ دەرهێنانی نەوت هۆکاری سەرەتاییان بەکارهێناوەو هەروەها بە هۆی کوندەو جەرەوە دەیانگواستەوە بۆ ناو شار[٨٨].

شایەنی باسە قیریش یەکێك بووە لەو سامانە سروشتیانەی کە لە دەڤەری کەرکوکدا هەبووە، بە جۆرێك لەگەڵ هەر چاڵە نەوتێکدا چەندین سەرچاوەو چاڵی دەرهێنانی قیریش هەبوون[٨٩]. شایەنی باسە قیریش یەکێك بووە لەو سامانە سروشتیانەی لە چەند بوارێکی جیاجیادا بەکارهاتووە لەوانە بۆ گەرم کردنەوە کە زیاتر لە لایەن هەژارەکانەوە بەکارهاتووە[٩٠]، هەروەها بۆ ناوپۆش کردنی کەشتیش بەکارهێنراوە[٩١].

دوای ئەوەی گەریدە ئەوروپییەکان لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەو نۆزدەدا لە گەشتەکانیاندا وەکو ئاماژەمان پێدا جەخیتان لەسەر بوونی نەوتێکی زۆر لە ناوچەی کەرکوك کردەوە، کاتێك لە ئەوروپا بە هۆی پەرەسەندنی پیشەسازی داواکاری لەسەر نەوت پەیدابوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی نەوتی کەرکوك ببێتە جێگەی چاوتێبرینی ئەوروپییەکان و ببێتە ئامانجێك بۆ نێردە گەڕۆکەکانیان بۆ ناوچەکە[٩٢]. ئەوە بوو لە ساڵی (١٨٨٠ز) ئەڵمانەکان نێردەیەکی تەکنیکیان، کە لە چەندین ئەندازیاری ئەڵمان پێکهاتبوو ناردە کەرکوك کە هەندێ لێکۆڵینەوەی جیۆلۆجی نوێ کرد، لە ئەنجامدا ئەوەیان دووپات کردەوە کە کەرکوك ناوچەیەکی نەوتی گەورەیە، نەوتەکەش لە رووی زەوییەوە نزیکە.

ئەڵمانیا یەکەم وڵاتی ئەوروپی بوو هەوڵی بەدەست خستنی نەوتی ویلایەتی موسڵیدا بە کەرکوکیشەوە[٩٣]. لە لایەکی تر لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا لە ساڵی (١٨٩١ز)دا سوڵتانی ناوبراو داوای لە ئەندازیاری جیهانی لە بواری نەوت (گولبەنگیان) کرد کە چەند راپۆرت توێژینەوەیەك دەربارەی گەنجینە نەوتییەکانی ئەم دەڤەرە ئەنجام بدات، سەرەنجام ئەندازیاری ناوبراو بە چاوخشاندن بە راپۆرتەکانی پێش خۆی و بە پێشکەش کردنی راپۆرتێك و دووپاتی ئەوەی کردەوە کە کوردستان گەنجینەیەکی شاراوەی نەوتی ئێجگار گرنگە[٩٤]. دوای ئەمە هەوڵی ئەوروپییەکان لە ناوچەکە زیاتر چڕ بووەوە بۆ زیاتر زانیاری و سوود وەرگرتن لە گەنجینەی گەورەی نەوت لە دەوڵەتی عوسمانیدا، هەر بۆیە لە ساڵی (١٨٩٥ز)دا ژمارەیەك ئەندازیاری فەرەنسی کەوتنە هەوڵ دان بۆ وەرگرتنی رەزامەندی سوڵتان بۆ دەرهێنانی نەوتی خاو لە هەردوو ناوچەی خورماتوو و بابەگوڕگوڕ، بەڵام لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، ئەمەش بە هۆی پەرەسەندنە سیاسییەکانی ناوچەکەو چالاکی رکەبەرێتی نێوان کۆمپانیا نێو دەوڵەتییەکان و دەوڵەتی عوسمانی لە پێناو بەدەست هێنانی ئیمتیازی نەوت لە چوارچێوەی پرۆژەی راکێشانی هێڵی ئاسنین بۆ بەسرە[٩٥].

شایەنی باسە ئەم هەوڵانەی ئەوروپییەکان بۆ بەدەستهێنانی نەوتی دەڤەری کەرکوك و دەوروبەری کە لەسەر ئاستی جیاجیادا دەدران کاریگەری لەسەر سوڵتانی عوسمانی هەبوو، هەر بۆیە سوڵتانی عوسمانی لە ساڵی (١٨٩٩ز)دا لە بڕیارێکدا تەواوی زەوییە دەوڵەمەندەکانی بە نەوت و قیر لە هەریەك لە مەندەلی و خورماتوو بابەگوڕ گوڕی بە موڵکی هەمایۆنی راگەیاند[٩٦].

بەڵام بە هۆی ئەو بارودۆخە سیاسییەی کە ئەو کات جیهانی پێداتێپەر دەبوو، هەریەك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەڵمانی لێك نزیك ببنەوە، هەر ئەمەش رێگەی خۆشکرد بۆ سەردانی ئیمپراتۆری ئەڵمانی لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بۆ ئەستەمبول و ئەم سەردانە رێگەی خۆشکەرێکی باش بوو بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیازی رێگەی ئاسنی بەرلین بەغدا جێگەی باسە ئەم هێڵە دوای ئەوەی چەند دەڤەرێکی ئەناتۆڵیای دەبڕی پاشان دەگەیشتە موسڵ و دواتر بەغدا، لێرەدا ئامانجی ئەڵمانەکان ئەوەبوو کە پیترۆڵی خاوی کوردستانی باشوور لە رێگەی کەنداوەوە بنێرنە دەرەوە[٩٧]. هەر بۆیە پێویست بوو ئەم پرۆژەیە هێڵەکانی بە کوردستاندا تێپەڕ ببێت[٩٨]. ئەمەش مانای گەیشتنی ئەڵمانیای دەگەیاند بە بیرو سەرچاوە نەوتییەکانی کەرکوك و دەوروبەری کە لە سەرەتای سەدەی بیستدا توانیان ئەم ئیمتیازە لە دەوڵەتی عوسمانی بەدەستبهێنن[٩٩].

جێگەی باسە ناوچەی کەرکوك جگە لە نەوت و قیر بە چەندین سامانی سروشتی تر دەوڵەمەند بوو، لەوانە خوێ و ئاوی کانزای وەك دوو بەرهەمی سروشتی بەرهەم دەهێنران[١٠٠]. هەروەها بە گوێرەی ساڵنامەی ویلایەتی بەغدای (١٨٧٦-١٨٧٧ز) ساڵانە بەرهەمی خوێ لە خورماتوو دەگەیشتە (٦٠٠,٠٠٠) ئۆقیە، و بەرهەمی خوێی چیایی حەمرین ساڵانە دەگەیشتە (٢٠٠,٠٠٠) ئۆقیە[١٠١]، هەروەها لە ناوچەی خورماتووش خوێیەکی زۆر بەرهەم هێنراوە[١٠٢].

*** بازرگانی:**

**١. بایەخی کەرکوك لە رووی بازرگانییەوە:**

مەسەلەیەکی بەڵگە نەویستە کە بازرگانی رۆڵی خۆی لە ژیانی مرۆڤدا گێڕاوە لەم چوارچێوەیەشدا مرۆڤ هەوڵی داوە ئەو شتانەی کە لە خۆی زیادە بیان فرۆشێ و ئەویش کە پێویستن بۆ ژیانی رۆژانەی بیان کڕێ و پەیدای بکات. هەر ئەمەش پاڵ بە مرۆڤەکانەوە دەنێت بۆ ئەوەی ئەو شتانەی لە پێداویستی و بەکارهێنانی ناوچەکەوە زیادن بیان گوازێتەوە بۆ هەرێم یان ناوچەیەکی ترکە پێویستیان پێیەتی بۆ ئەوەی قازانجی دەست کەوێ.

لێرەدا دەتوانین بڵێین دەوڵەمەندی کەرکوك بە بەرهەمهێنانی بەروبومی کشتوکاڵی و سامانی ئاژەڵی بووەتە هۆی گەرم بوون و بوژانەوەی بازاری ناوخۆی شارەکەو دروست بوونی بازاری دەرەکی. لەم چوارچێوەیەدا خەڵکی دەڤەری کەرکوك هەوڵیان داوە ئەو شتومەکانەی کە لە خۆیان زیادە بنێرنە دەرەوەو ئەوانیش کە شارەکەیان پێویستی پێیەتی بۆ ناوخۆ هاوردەی بکەن. لە لایەکی تر دەتوانین بڵێین بایەخی بازرگانی کەرکوك بووە هۆی ئەوەی ببێتە بازارێك بۆ

فرۆشتن و ساغ کردنەوەی بەرهەمی ئەم بەشەی کوردستان.
لە سەدەی نۆزدەهەمدا بازرگانی یەکێك لەو لایەنە گرنگانە بوو کە بایەخی کەرکوکی تیادا بەدەرکەوت، ئەوەتا گەڕیدەی فەرەنسی ئۆتێر کە دووجار لە سالآنی (١٧٣٥-١٧٣٩ز)دا هاتۆتە شارەکە دەڵێت: "کەرکوك لە دوو بەش پێکهاتووە بەشی یەکەم قەڵایە کە ژمارەیەکی زۆر دانیشتووانی شارەکەی تێدایە، بەشی دووەمیان ناوچەی دەوروبەری قەڵایە ئەم بەشەی دووەمیان سەنتەری بازرگانی شار پێك دەهێنێت"[103]. هەروەها گەڕیدەی جولەکە بنیامین کە لەنێوان سالآنی (١٨٤٦-١٨٥١ز)دا سەردانی کەرکوکی کردووە ئاماژە بەوە دەدات کە شاری کەرکوك بنکەی کارکردن و بازرگانییە[104]. بەم شێوەیە زۆربەی ئەو گەڕیدانەی لە سەدەی هەژدەو نۆزدەدا هاتونەتە کەرکوك گەواهی لەسەر چالاکی بازرگانی شارەکە دەدەن.
دیارە شوێنی کەرکوك رۆڵی کاریگەری هەبووە لەسەر چالاکی بازرگانی شارەکە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەرکوك لەم روانگەیەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە بەو پێیەی شارەکە کەوتووەتە نێوان هەردوو هەرێمی شاخاوی و دەشتایی، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی دەڤەری کەرکوك ببێتە خاڵی پێك گەیاندنی ئەم دوو هەرێمە[105]، ئەم شوێنە ستراتیژییەی کەرکوك بووە هۆی ئەوەی شارەکە ببێتە سەنتەرێکی بازرگانی گەورە بۆ ئاڵوگۆڕ پێکردنی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی نێوان هەردوو هەرێمی چیایی و دەشتایی، ئەمەش وایکردبوو بزوتنەوەیەکی بازرگانی فراوان لەم شارەدا لە چاو شارەکانی تری هاوسێیدا دەربکەوێت[106]، ئەوەتا (ریچ) گەواهی ئەوە دەدات کە کاروانە بازرگانییەکان رووەو کەرکوك نێردراون و تەواوی بەروبوومی ئەم بەشەی کوردستانی (مەبەستی کوردستانی باشوورە) بۆ چووە[107].
ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کەرکوك ببێتە سەنتەری چالاکی بازرگانی لە دەڤەرەکەدا. هەر بۆیە شەمسەدین سامی بایەخ و بوژانەوەی بازرگانی کەرکوکی گەڕاندووەتەوە بۆ شوێنەکەی کە بووەتە هۆی ئەوەی چەندین رێگەی بازرگانی بێتەوە سەر شارەکە[108].
لە لایەکی تر باری ئاوەدانی شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا رۆڵی گرنگی هەبووە لە بوژانەوەی بازرگانی شارەکە بە جۆرێك لە سەدەی ناوبراودا لە ناو شاری کەرکوکدا بازارێکی ناوخۆیی هەبوو کە (١٢٨٢) دوکانی لەخۆ گرتووە، ئەمە بێجگە لە بوونی ژمارەیەك کاروان سەراو گەرماوو شوێنی خزمەتگوزاری تر، لە لایەکی ترەوە لە رووی ژمارەی دانیشتووانەوە دەبینین شارەکە (٣٠,٠٠٠) کەسی تێدا بووە، ئەمە بێجگە لە فرەنەتەوەیی شاری کەرکوك کە دانیشتووانەکەی لە کوردو تورکمان و عەرەب و جولەکەو کریستیان پێکهاتبوو[109]، بێگومان ئەمەش دەبووە هۆی رەنگاوبوونی شارو بەشداری کردنی هەموو ئەم نەتەوانە لە پرۆسەی بازرگانیدا بە جۆرێك هەریەکەیان دەست رەنگینی خۆیان لە بوارێکدا هەبوو.
جێگەی باسە یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە کاریگەری هەبووە لەسەر بایەخی بازرگانی شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا ئەوە بوو کە شاری ناوبراو لەو سەردەمەدا یەکێك بوو لە شارە گەورەکانی کوردستانی باشوور، ئەوەتا یەکێك لە گەڕیدەکان لەم بارەیەوە گووتویەتی: "تا ئێستا کەرکوك گەورەترین شارە لە دەشتایی رۆژهەڵاتی دیجلەدا"[110]، بێگومان ئەمەش هۆکارێکی یارمەتی دەربووە بۆ زیاتر ئاوەدان بوونی شارەکەو دواتر پەرەسەندنی بازرگانی لە شاری ناوبراودا. هەروەها چەند هۆکارێکی تر کاریگەری لەسەر بایەخی بازرگانی شاری کەرکوك هەبووە بەتایبەتی رێگا بازرگانییەکان کە لێرە بەدوا باسیان دەکەین:

**- رێگا بازرگانییەکان:**

رێگە بازرگانییەکان رۆڵی کارایان هەبووە لە پەرەسەندنی کەرکوك و دروست بوونی چالاکی بازرگانی کردن لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا. یەکێك لەو رێگە بازرگانیانەی کە بە کوردستاندا تێپەڕیوەو هەردوو شاری بەغداو موسڵی بەیەکەوە بەستۆتەوە رێگەی رۆژهەڵاتی دیجلە بووە، ئەم رێگەیە لە بەغداوە تێدەپەڕی بۆ کەرکوك، شایەنی باسە ئەم رێگەیە لە بنەڕەتدا بە هەرێك لە دەلی عەباس و قەرە تەپەو کفری تێدەپەڕی و پاشان بۆ خورماتوو و داقوق، دواتر لە کەرکوکەوە بەرەو ئاڵتون کۆپری پاشان هەولێرو لە رێگەی زێی گەورەوە دەگەیشتەوە موسڵ[111]، هەروەها هەندێ جار کاروانە بازرگانییەکان بە هەولێردا تێنەدەپەڕین بەڵکو لە رێگەی شەمامکەوە دەچوونە زێی گەورەو لەوێشەوە بۆ موسڵ[112]. لێرەدا دەبینین ئەم رێگەیە وەك تۆڕێك لە رێگەی ناوخۆیی وایە کە چەندین شارو شارۆچکەی ناوچەکەی پێکەوە گرێ داوە، دیارە ئەم رێگەیە لە لایەن گەڕیدە بیانییەکانیش پەسەندبووە، ئەوەتا نیبور لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەم رێگەیە تەواو ئەمین و ئارامە، تا ئەو رادەیەی کە ئەگەر بەم رێگەیەدا سەفەرت کرد پێویست ناکات چاوەڕوانی کاروانێکی گەورە بیت لەگەڵیدا بڕۆی، ئەمە بێجگە لەوەی لەم رێگەیەدا چەندین شارو ئاوەدانی دێتە پێش کە کاروانچی دەتوانێت لێیان لابدات و پشووی تێدا بدات"[113].
هەر بە هۆی ئەم رێگەیەوە دەڤەری کەرکوك بە رێگەی پردی ئاڵتون کۆپری بە هەریەك لە هەولێرو موسڵەوە دەبەسترایەوە، ئەم رێگەیە لە کەرکوکەوە بەرەو پردێ و لەوێشتەوە بەرەو قوشتەپەو هەولێر تێدەپەڕی، دواتر کاروانچی دەیتوانی لە هەولێرەوە بە رێگەی کەلەکەوە بچێتە شاری موسڵ[114].
شایەنی باسە زێی بچووك کە بە شارۆچکەی پردێ دا تێپەڕ دەبوو، هەندێ جار بەکاردەهات بۆ گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی بۆ بەغدا لە رێگەی دیجلەوە هەروەها لە شاری کۆیەوە رێگایەك هەبوو دەچوو بۆ کەرکوك[115]. دوای ئەوەی بە پردێدا تێدەپەڕی. بەڵام سەبارەت بە رێگەی بازرگانی نێوان کەرکوك و سلێمانی کە ئەم دوو شارە پەیوەندی بازرگانی بەتین لەنێوانیاندا هەبووە -کە لە داهاتوودا رووونی دەکەینەوە- ئەوا بازرگانانی کەرکوك بۆ گەیشتن بە سلێمانی سەرەتا دەچوونە شوان و لەوێشەوە بۆ دەربەندی بازیان و پاشان دەچوونە تاسلوجە دواتر دەچوون بۆ سلێمانی[116].
هەروەها پێویستە لێرەدا ئاماژە بە شوێنی ناوەندی شاری

کەرکوك بدەین لەنێوان شارەکانی سلێمانی و هەولێرو موسڵ و دیالەدا، هەر بۆیە شاری کەرکوك بەردەوام پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەم شارانەدا هەبوو، بێگومان ئەم شوێنەی کە کەرکوك هەیبوو لە بواری بازرگانیدا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەتا بازرگانانی موسڵ بۆ گەیشتن بە سلێمانی ڕێگەی کەرکوك- سلێمانیان هەڵبژاردووە لە چاو ڕێگەی هەولێر- سلێمانی، ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕێگەی نێوان هەولێرو سلێمانی زۆر دوور بووە[١١٧].

لەم باسەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا شاری کەرکوك بە هۆی تۆڕێك لە ڕێگای بازرگانییەوە بە ناوچەکانی دەوروبەرییەوە گرێدرابوو، ئەمەش وای کردبوو ناوچە کوردییەکان بەیەکەوە بەستراون و چەند سەنتەرێکی بازرگانی لە شارە کوردییەکاندا دروست ببن لەنێوانیاندا کەرکوك[١١٨]. شایەنی باسە سلێمانی یەکێك بووە لەو دەروازانەی کە یارمەتی دەربووە بۆ گەیشتنی کەلوپەلی بازرگانی دەڤەری کەرکوك بۆ وڵاتی ئێران، کەلوپەلی بازرگانی دەڤەرەکە لە ڕێگەی دەشتی سلێمانی بۆ هەڵەبجەو کرماشان و سنەو زەهاو نێردراوە، یان هەندێ جار کاڵای بازرگانی کەرکوك بە هۆی ڕێگەی خانە قینەوە گەیشتۆتە کرماشان[١١٩]. بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە کەوا شاری کەرکوك بە هۆی تۆڕێك لە ڕێگا بە دەوروبەرەکەیەوە بەسترا بووەوە، هەروەها ناوچەی کەرکوك لە ڕێگەی موسڵ و بەغداوە دەیتوانی پەیوەندی بە بەندەرەکانی دەریا ناوەڕاست و ئەستەمبوڵ و کەنداوی فارسی بکات[١٢٠].

- هۆیەکانی گواستنەوە:

سەرچاوە مێژووییەکان بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە هۆیەکانی گواستنەوە لەو سەردەمەدا سادەو ساکار بوون، بە تایبەتی ئاژەڵ بەکارهێنراوە بۆ گواستنەوەو شتومەك و کاڵای بازرگانی، ئەوەتا بە گوێرەی زانیارییەکانی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی (١٨٩٢ز) هۆیەکانی گواستنەوە لە سەنجەقی کەرکوك هێسترو بارگیرو گوێدرێژ بوو لەگەڵ بەکارهێنانی ووشتر[١٢١]، هەروەها بە گوێرەی گووتەی نیبور گوێدرێژ یەکێك بووە لەو جۆرە ئاژەڵانەی کە لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە بەکارهێنراوە بۆ گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلەکان[١٢٢].

جێگەی باسە لەو سەردەمەدا کاروانەکان لە کاروانی بچووك و کاروانی گەورە پێکدەهاتن، بەڵام هەر کاروانێك چەند بەشێکی سەرەکی لەخۆ دەگرت لەوانە سەرۆك کە سەرپەرشتی جوڵەو ڕۆیشتنی کاروانەکەی دەکردو پێی دەوترا (کاروان باشی). هەروەها چەند پیاوێکی تر لەناو کارواندا هەبوون کە خزمەتی کاروانەکەیان دەکرد بە تایبەتی سەرپەرشتی ئالیکدانی گوێدرێژو ئەسپەکان لەکاتی ڕۆیشتن و کاروان خستندا کە پێیان دەوت جڵەوکێشی بار، ئەمە بێجگە لە بوونی بازرگان و ڕێبوار، ئەو شتومەك و کەلوپەلانەی کە کاروانەکە لەخۆی گرتبوو، شایەنی باسە هەر کاروانێکیش چەند پاسەوان و سەربازی لەگەڵدا بوو بۆ پاراستنی لە ڕێگەو بانەکاندا لە چەتەو ڕێگر[١٢٣].

لە لایەکی تر لە ڕێگەی زێی بچووك کە بە شارۆچکەی ئاڵتون کۆپریدا تێپەڕدەبوو، کەڵەك بەکاردەهات بۆ گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی بۆ بەغدا لە ڕێگەی دیجلەوە، ئەمە بێجگە لە دابەزینی ئەو شتومەك و کەلوپەلە بازرگانییانەی کە لە کۆیەوە بە هۆی کەڵەکەوە دەگەیشتنە ناوچەی ئاڵتون کۆپری[١٢٤]. ئەمە بێجگە لەوەی ئاڵتون کۆپری کە ناحیەیەکی سەر بە کەرکوك بووە سەنتەری پۆستەو بروسکە (تلغراف) هەبوون بۆ گەیاندنی پەیام و نامەکان بۆ بەغداو پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی[١٢٥].

جێگەی باسە کەڵەکیش لە کۆمەڵێك هەمبانەی پڕ هەوا پێك دەهات کە بەیەکەوە توند دەکران بە هۆی بەکارهێنانی داری درێژو دانانی کۆڵەکە. لەسەر ئەم هەمبانانەش تەختە دار دادەنران کە بەکاردەهێنران بۆ بارکردن و گواستنەوەی شتومەك و کەلوپەلی بازرگانی لە ڕێگەی ئاوەوە. شایەنی باسە جێگەی داگرتن و بارکردنی کەلوپەلەکانیش زۆر بوون کە لە شێوەی ژوور دروست دەکران و سەرییان دەگیرا، ئەمەش بە مەبەستی خۆپاراستن لە باران و تیشکی خۆر[١٢٦]. ئەوەتا گەریدە ڕاوۆلف کە خۆی سەردانی ناوچەکەی کردووە گەواهی ئەوە دەدات کە لە شارۆچکەی ئاڵتون کۆپری کەڵەکیان دروست کردووە ئەمەش بە هۆی بەکارهێنانی پێستی بزن[١٢٧].

- ئەو هۆکارانەی کاریان لەسەر بازرگانی کەرکوك کردووە:

لەگەڵ ئەوەی کە بازرگانی کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا تارادەیەك گەشاوە بووە و چەندین هۆکارو پاڵنەر کاریگەرییان لەسەر بوژانەوەی بازرگانی و بوارە ئابوورییەکانی تر هەبوو لە کەرکوکدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند هۆکارێك هەبوون کاریگەری خراپیان لەسەر بازرگانی کەرکوك داناوە لە سەدەی ناوبراودا.

لە سەرەتادا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە خراپی هۆکارەکانی گواستنەوە کاریگەری بەسەر بازرگانی دەڤەری کەرکوکەوە هەبوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی گواستنەوە تەنها ئاژەڵ بوو، بێگومان ئەمەش یارمەتی دەر نییە بۆ پەرەسەندنی بازرگانی لە ناوچەکەدا بە شێوەیەکی بەرفراوان، ئەوەتا ساڵنامەی (١٨٩٤ز) ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر لە داهاتوودا هێڵی شەمەندەفەر بە کەرکوکدا تێپەڕبێت ئەو کات فراوانی بازرگانی و بەرزبوونەوەی ئاستی ئابووری کەرکوك مسۆگەرە[١٢٨]. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە هۆیەکانی گواستنەوە بووەتە هۆی خاوی و پەرەنەسەندنی بازرگانی بە شێوەی بەرفراوان.

یەکێکی تر لەو کێشانەی کە کاریگەری خراپی بەسەر بازرگانییەوە هەبوو ئەوەبوو کە لەو سەردەمەدا ڕێگەکان بەدەست کێشەی نەبوونی ئاسایش و هەبوونی ڕێگری و تاڵان و دزو جەردەوە دەیان ناڵاند، ئەمەش کاریگەری خراپی بەسەر بازرگانییەوە بەجێ دەهێشت[١٢٩]. هەر بۆیە بازرگانان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشە پێکەوە کاروانی بازرگانیان دروست دەکردو خۆیان پاسەوانیان لێ دەکردو پیاوانی چەکدار سەرپەرشتی جوڵەی کاروانەکانیان دەکرد

بۆ پاراستنی شتومەك‌و گەشتیاران بۆ گواستنەوەیان لە ناوچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی تر. ناوچە كوردییەكانیش یەكێك بوون لەو ناوچانەی كە ئەم دیاردەیەی تێدا بڵاوبوو كە بازرگانان پێڕەویان دەكرد بۆ سەلامەتی كاروانە بازرگانییەكان[١٣٠].

وادیارە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا دوای سەرهەڵدانی ئاژاوەی هۆزەكان بە تایبەتی جوڵانەوەی هەمەوەندەكان دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە دەڤەری كەركوكدا، ئەم بارودۆخەش كاریگەری لەسەر ڕێگەو بانەكان هەبووە، ئەوەتا گەریدەیەكی هۆڵەندی كە خۆی هاتۆتە ناوچەی كەركوك‌و باسی نائارامی ئەو دەڤەرەمان بۆ دەكات‌و دەڵێت: "... ساڵانی ١٨٩٠-١٨٩١ هەموو ڕێگەكانی ئەم ناوچەیە گیرابوون، ئەو كاروان‌و پۆستەیەی كە دوو هەفتە جارێك لە بەغداوە دەهات ئەبوایە (١٢٠٠) جەندرمە بیانپارێزێ..."[١٣١]. بێگومان ئەمەش مانای ئەوپەڕی نا ئارامی ڕێگەو بانەكانی ئەو ناوچەیە دەگەیەنێت، هەر بۆیە گەریدەی ناوبراو لە دیمەنێكی تردا لە بارەی دەست درێژی ڕێگرەكان بۆ سەر كاروانە بازرگانییەكان دەڵێت: "كاتێك لە خورماتوو كەوتینە ڕێ، دوای دوو كیلۆمەتر لە ڕۆیشتن هەواڵێكی دڵتەزێنمان بیست، كاروانێك لە موسڵەوە هاتبوو بەڵام چەتەو ڕێگران هەڵیانكوتابووە سەریان‌و دوو كەس‌و سێ ووشتریان لێ كوشتبوون، هەر بۆیە كاتێك كاروانچییەكان دەستیان كردبووەوە جەندرمەكان گوێیان لە تەقە دەبێ‌و بە هاوارییانەوە دەچن‌و ڕزگاریان دەكەن"[١٣٢].

جێگەی ئاماژەیە ئەو پردەی سەر زێی بچووك لە ئاڵتون كۆپری دروست كرابوو یارمەتی دەرێكی گرنگ بووە بۆ بازرگانی‌و پەڕینەوەی كاروانە بازرگانییەكان بەڵام ئەو جۆرە پردانە كەم‌و كورتیان زۆر بووە، ئەوەتا گەریدەیەك لەم بارەیەوە دەڵێت: "... ساڵانە ئەم پردە نزمە چ زیانێك بە كاروان‌و هاموشۆكەران دەدات، چ زیندەوەرو ئاژەڵێكی تێدا دەخنكێ، لەبەر ئەوەی قەراغ‌و لێواری پردەكە بەرزنین بەزۆری ووشتر لێوەی بەرئەبێتە خوارێ‌و لە ئاوەكەدا ئەخنكێ، بەڵام ووڵاغە بەرزەكان بەدەگمەن بەرئەبنەوە، وەك بۆم باسكرا خەڵكێكی زۆر بە نووسین‌و پێشنیار ڕاسپاردەو داوایان لە كاربەدستان كردووە هەردوو لای پردەكە چەند پێیەك بڵند بكەن ئەمەش تەنها پەنجا لیرەی زێری تێدەچێ كەچی هەموو داواكارییەكی لەم شێوەیە پشت گوێ خراوە"[١٣٣]. بێگومان ئەوەش مانای بایەخنەدانی كاربەدەستانی عوسمانی دەگەیەنێت لە دەڤەری كەركوك بەو ڕێگەو پردانەی كە بایەخی گرنگیان بۆ بواری بازرگانی هەبووە.

یەكێكی تر لەو كێشانەی كە كاریگەری خراپی بەسەر بواری بازرگانییەوە هەبوو، خۆی دەبینیەوە لەوەی كە زۆرجار دەوڵەت‌و والییەكانی ویلایەتەكان بە زۆرداری پارەیان بە قەرز لە بازرگانەكان وەردەگرت، ئەمەش كاریگەری خراپی لەسەر بازرگانان دروست دەكرد، لەبەر ئەوەی زۆربەی كات بازرگانان زۆر بە زەحمەت پارەكانیان لە دەوڵەت وەردەگرتەوە[١٣٤]. دیارە ئەم هەڵسوكەوتانە لە پاڵ نەبوونی ئاسایش لە دەڤەرەكەدا پاڵی بە خەڵكی خاوەن سامان ناوە بۆ ئەوەی پارەكانیان بشارنەوەو هیچ پرۆژەیەكی پێنەكەن، یەكێك لەو گەریدانەی كە خۆی سەردانی كەركوكی كردووە وەسفی تێڕوانینی خەڵكی ئەم شارەمان بۆ دەكات دەربارەی پارەو بازرگانی كردن، وەدەڵێت: "بیرو بۆچوونی زاناو ئابووریناسان لە جێگەی خۆیدا بووە كە گووتویانە لە وڵاتە هەژارەكاندا پارەو پوڵ‌وماڵێكی نەختینەی زۆر بە دەست میللەت‌و خەڵكەوەیە، بەڵام بە شێوەیەك دەتوانرێ بە شاردنەوە ناوبرێ ئەو شتەی كە لە گەشتەكەمدا من بە چاوی خۆم بینیم ڕاستی ئەو بیروبۆچوونەی دەسەلماند"[١٣٥]. ناوبراو لە دیمەنێكی تردا دەڵێت: "مرۆڤ دەپرسێ ئەمانە ئەم هەموو پارەیەیان بەچی پەیداكردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە زۆر هەژارو دەست كورت دیاربوون كە هەروەك مشكی كڵێساوابوون"[١٣٦].

### ٢. پەیوەندییە بازرگانییەكان:

یەكێك لەو دیاردە ئابوورییانەی كە لە دەڤەری كەركوكدا بەدیدەكرێ لە سەدەی نۆزدەدا، بریتییە لە بازرگانی ناوخۆیی‌و بازرگانی دەرەكی. جێگەی باسە بازرگانی ناوخۆیی شارەكە خۆی دەبینێتەوە لەو كڕین فرۆشتنەی كە لە ناوخۆیی شارەكە ئەنجامدەدرا، بەڵام بازرگانی دەرەكی ئەو بازرگانیە بوو كە لەگەڵ ناوچەكانی دەورووبەریدا بەڕێوەدەچوو بە تایبەتی لەگەڵ شارەكانی سلێمانی‌و موسڵ‌و بەغدا، ئەمەش بە مەبەستی ناردنەدەرەوەی ئەو شتومەك وكاڵایانەی كە لە پێداویستی ناوخۆی شارەكە زیادن‌و هێنانی ئەو كاڵایانەی كە بازاری ناوخۆی شارەكە پێویستی پێیەتی، وەك لە داهاتوودا ڕوونی دەكەینەوە.

#### - بازرگانی ناوخۆیی:

لە باسەكانی پێشەوە ئەوەمان ڕوون كردەوە كە كەركوك بە هۆی چەندین ڕێگاوە پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ دەورووبەریدا هەبووە. بە هۆی ئەم ڕێگایانە كە كەركوكیان بە دەرەوە دەبەستایەوەو دەیتوانی بازرگانی لەگەڵ ناوچەكانی دەورووبەریدا بكات. لە لایەكی تر زۆربەی ئەو گەریدانەی هاتونەتە شارەكە گەواهی لەسەر گەرم‌و گوری بازاری ناوخۆی كەركوك دەدەن، ئەوەتا یەكێك لەو گەریدانە لە بارەی بازاری ناوخۆیی كەركوكەوە دەڵێت: "بەشی دووەمی شاری كەركوك دەشتاییە بە دەوری قەڵاكەیەوە كە چەندین كاروان سەرای سەرەكی تێدایە لەگەڵ قاوەخانەو بازار"[١٣٧]. ئەمەش بۆ خۆی گەواهیەكی گرنگە لەسەر بوونی بازاری ناوخۆ، هەروەها ڕیچ بە شێوەیەكی زۆر ئاشكرا وەسفی پێگەی بازرگانی كەركوكمان بۆ دەكات‌و دەڵێت: "... سەبارەت بە بەروبومی كوردستان زۆر دواین، شاری كەركوك ئەو بازارەیە كە هەموو بەروبوومی ئەم بەشەی كوردستانی بۆ دەبردرێ"[١٣٨]. وا دیارە هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گرنگی شاری كەركوك لە چاو شارەكانی تری ئەم بەشەی كوردستان لەو ڕۆژگارەدا، بە جۆرێك ئەو سەردەمە كەركوك وەك پایتەختی ئەم بەشەی كوردستان وابوو. هەروەها پۆرتەر كە لە ساڵی (١٨٢٢ز)دا هاتۆتە كەركوك لە بارەی

بازاڕی کەرکوک دەڵێت: "بازاڕی کەرکوک تەسکەو تاریکە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو جۆرە پێداویستییەکی مرۆڤ لەو شارەدا دەست دەکەوێت"[١٣٩]. ئەمە سەرەڕای گەواهی گەڕیدەیەکی هۆڵەندی کە لە بارەی گەرمەو گوڕی بازاڕی ناوخۆی کەرکوکەوە دەڵێت: "دوکانو بازاڕو چایخانەو کاروان سەراو شەقامەکانی کەرکوک وا نیشان دەدەن کە لەم شارەدا کاروکاسبیو بازرگانیو کڕینو فرۆشتنی گەرمەو گوڕ لە برەودایە"[١٤٠]. هەروەها لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی (١٩١١-١٩١٢ز)دا هاتووە کە بازاڕی شاری کەرکوک بەوە دەناسرێ کە بازاڕێکی ڕێکوپێکی هەیە[١٤١].

بەڵام بەپێی ساڵنامەی هەمان ویلایەت لە ساڵی(١٨٩٤ز) لە شاری کەرکوکدا بازاڕێکی ناوخۆی گەورە هەبوو کە بریتی بوو لە (١٢٨٢)دوکانو مەغازەو یەك بازاڕی قەیسەری، ئەمە بێجگە لە بوونی ١٢ خان[١٤٢] (کاروان سەرا) کە بۆ بازرگانانی دەرەوەی شار ئامادەدەکران تاوەکو لە کاتی مانەوەدا خۆیانو وڵاغەکانیان تێدا بحەوێنەوە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە شاری کەرکوک لە ناوخۆدا بازاڕێکی گەشاوەو گەرمی هەبوو کە بێگومان ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر دروست بوونی بازرگانی لەگەڵ دەورووبەردا.

سەبارەت بەو شتومەكو بەرهەمانەی کە لە بازاڕی ناوخۆی کەرکوکدا مامەڵەیان پێوەکراوە ئەوا دەبینین لە چەندین شتومەكو بەرهەمی جیاجیا خۆی دەبینێتەوە، ئەوەتا بە گوێرەی گوتەی گەڕیدەیەکی ئینگلیزی دووکانی پێڵاو فرۆشی هەبوو کە پێڵاوی بەغدایی تێدا دەفرۆشرا، هەروەها دوکانی کورتان فرۆشو گۆشت فرۆش هەبوون[١٤٣].

بەرهەمی ماسی یەکێك بووە لەو بەرهەمانەی کە زۆربەی کات لە دەڤەری کەرکوکدا هەبووە، ئەمەش بە هۆی تێپەڕبوونی زێی بچووك بەو ناوچەیەدا بە تایبەتی بە شارۆچکەی پردێ دا. ئەوەتا گەڕیدەیەکی ئینگلیزی کە لە ساڵی (١٧٥٨ز)دا بە شارۆچکەی پردێ دا تێپەڕ بووە، لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەم زێیە ماسی نایابی تێدایە کە کێشی هەندێکیان دەگاتە ٢٠٠ ڕەتڵ"[١٤٤].

شایەنی باسە تەواوی کاڵاو بەرهەمانەی لە دەڤەری کەرکوک دەنێردرانە دەرەوە لە بازاڕی ناوخۆی شارەکە زیاد دەبوون، بە جۆرێك لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەو شتانەی دەنێردرانە دەرەوە کە لە داهاتوودا باسیان دەکەین هەر ئەو شتومەكو بەرهەمانە بوون کە بازاڕی ناوخۆی کەرکوکیان پێ گەرم کرا بوو.

**- بازرگانی دەرەکی:**

یەکێك لە ڕواڵەتەکانی بازرگانی کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا بازرگانی دەرەوەیە، کە لەم چوارچێوەیەدا بەرهەمە زیادەکانی شارەکە دەنێردرانە دەرەوە، بە گوێرەی زانیاری (ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی) لە سەدەی ناوبراودا کەرکوك بەروبوومی کشتوکاڵیو ئاژەڵداری دەناردە دەرەوە ئەمەش وەکو شتومەکی چنراوو بەدەست دروست کراوەکان[١٤٥].

لە لایەکی تر کەرکوك هەوڵی داوە ئەو شتانەی کە شارەکە پێویستی پێبوو لە دەرەوە وەرییان بگرێت، ئەوەتا کاتێك بەغدا چەندین شتومەکی لە دەرەوە دەهێنا هەندێك لەو بەرهەمانە لە ڕێگەی بازرگانەکانەوە دەهێنران بۆ کوردستان هەندێ لەو شتومەکانە بریتی بوون لە شەکرو ئاوریشمو جلوبەرگی درو نەرم[١٤٦]. بێگومان دەبێ کەرکوکیش بەشی خۆی لەم شتانە لە بازرگانە بەغدادییەکان کڕیبێت بە تایبەتی ئەو کاڵایانە بە کەرکوکدا تێدەپەڕین کە ئەمەش مانای بازرگانی کەرکوك لەگەڵ بەغدا دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی ئەم شتانە لە کەرکوك بەرهەم نەدەهێنران، شارەکەش پێویستی پێیان هەبووە، چونکە بە گوێرەی ساڵنامەی (١٩١١-١٩١٢ز)دا ئەو شتومەكو پێداویستیانە لە ناوچە کوردییەکاندا کردراون کە خۆیان نەیان دەتوانی بەرهەمی بهێنن کە بریتی بوون لە شەکرو قاوەو قوماشو ئاوریشمو هەندێ دروست کراوی هیندیو چەكو تەقەمەنی[١٤٧]، بە گوێرەی ئاماژەی نیبور دەڤەری کەرکوك ژمارەیەکی زۆر ئاشی ئاوی لێبوو، هەر بۆیە ڕێژەیەکی زۆر لە بەرهەمی ئارد دەنێردرا بۆ بەغداو لە بەرانبەردا خورمای بەسرەو بەرهەمی تر دەهێنران[١٤٨]. هەندێك لە خەڵکی هەژاری بەغدا قیریان دەکڕی کە لە ناوچەکانی دەورووبەری کەرکوك دەردەهێنرا کە بۆ ڕووناك کردنەوە بەکاریان دەهێنا[١٤٩]، لە لایەکی ترەوە لە کەرکوکەوە ئاوریمشی خاو دەنێردرا بۆ بەغدا بۆ ئەوەی لە کارگەکانی ئەو شارەدا بەکاربهێنرێن بۆ دروست کردنی کوتاڵی ئاوریشم[١٥٠]، لە بەرانبەردا خەڵکی کەرکوك قوماشی لۆکەو ڕاخەری ناوماڵیان لە بەغدا وەرگرتووە[١٥١]. مێجەرسون کە لە ساڵی (١٩٠٧ز)دا هاتۆتە کەرکوكو ناوچەکە ئاماژە بەوە دەکات کە بازرگانی کردن بە ئاوریشمو کوتاڵی دروستکراو لە لۆکە لە هەموو کوردستانو تەنانەت کەرکوکیش دەکرا[١٥٢].

لە ڕاستیدا بازرگانی شارە کوردییەکان تەنها لەگەڵ ناوچەکانی دەورووبەری خۆیاندا نەبووە بەڵکو کوردستان سەرچاوەی چەندین بەروبوومی گرنگی ئاژەڵیو کشتوکاڵی بوو بۆ ئەستەمبوڵو شام، ئەستەمبوڵ کە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو ساڵانە نزیکەی یەك ملیۆنو نیو ئاژەڵی لە مەڕو بزنو مانگا لە ناوچە کوردییەکانەوە بۆ دەچوو، هەر بۆیە دەبینین ساڵانە کوردستان نزیکەی سێ ملیۆن سەر ئاژەڵی دەناردە ئەستەمبوڵو شامو بەغدا، وە نەبێت ئەو شتومەکانەی لە ناوچە کوردییەکان لە سەدەی نۆزدەدا دەنێردرایە دەرەوە تەنها سامانی ئاژەڵی بووبن بەڵکو سامانی کشتوکاڵیو سروشتیش دەنێردرانە دەرەوە، وەك خوری تووتنو دارهەنگوینو سەوزەواتو گەنمو جۆو هتد[١٥٣]. بێگومان دەڤەری کەرکوکیش کە دەوڵەمەند بوو بە بەروبوومی کشتوکاڵیو ئاژەڵی دەبێ پشکی خۆی لەم ناردنە بەرکەوتبێ، ئەوەتا بە گوێرەی زانیارییەکانی (ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام) باسی ئەوە دەکات کە شاری کەرکوك سەنتەرێکی بازرگانیو بازاڕێکی کشتوکاڵی گرنگ بوو، بۆ گەنمو جۆو بەروبوومی ئاژەڵی بۆ دەڤەری دەورووبەری[١٥٤].

هەر سەبارەت بە بازرگانی دەرەکی کەرکوك دەبینین پەیوەندی بازرگانی لەنێوان کەرکوكو موسڵ تا ڕادەیەکی

باش گەرم و گوڕ بووە، ئەمەش بە گوێرەی زانیارییەكانی سالنامەی موسڵی (١٩١١-١٩١٢ز) [١٥٥]. لە لایەكی تر شاری موسڵ بە هۆی ئەو شوێنە گرنگەی كە هەیبوو بووە بازاڕێك بۆ شارەكانی كەركوك و سلێمانی و شارەكانی تری دەڤەرەكە[١٥٦]. جێگەی ئاماژەیە پەیوەندی بازرگانی نێوان موسڵ و كەركوك توندو تۆڵ بوو بە جۆرێك لە سالانی كەمی باران بارین و بەرووبوومی كشتوكالیدا موسڵ پشتی بە ناوچە كوردییەكانی تر دەبەست لەنێوانیاندا كەركوك[١٥٧].

جێگەی باسە كە زۆربەی گەڕیدەو سەرچاوە رەسمییەكانی دەولەتی عوسمانی جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كەوا شاری كەركوك بەرووبوومێكی زۆری كشتوكالی ناردووەتە دەرەوە، كە بێگومان ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەم بەرووبوومانە لە پێداویستی شارەكە زیاد بوونە، ئەوەتا گەڕیدە پۆرتەر ئاماژە بەوە دەكات كە بەرهەمی سەرەكی ئەم شارە گەنم و جۆیە، بەلام برنج بە رێژەی كەمتر بەرهەم دەهێنرێت، ئەمە بێجگە لەوەی گەڕیدەی ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە شاری كەركوك بە بەرهەمهێنانی لۆكەش بە ناوبانگە و ئەوەی لە خۆی زیادە لەم بەرهەمە دەنێرێتە دەرەوە[١٥٨]. هەر بۆیە لە سەدەی نۆزدەدا بەرهەمەكانی گەنم و جۆ دەنێردرانە دەرەوەی شار[١٥٩]. هەروەها بە گوێرەی سالنامەی ویلایەتی بەغدای (١٨٧٧ز) نێردەی كەركوك لە بەرووبوومە كشتوكالییەكاندا رێژەیەكی بەرزی تۆماركردووە، بە جۆرێك لە سالی ناوبراودا ناوچەی كەركوك (٦,٠٠٠,٠٠٠) ئۆقیە[١٦٠] گەنم و (٢,٠٠٠,٠٠٠) ئۆقیە جۆو (١٣,٣٣٣)ئۆقیە نیسك و (٤,٤٥٠) ئۆقیە نۆك و(٤٠,٠٠٠) ئۆقیە مازووی ناردووەتە دەرەوە[١٦١].

بێگومان لێرەدا دەتوانین بڵێین هەریەك لە موسڵ و بەغدا پشكی خۆیان لەم هەناردانەی كەركوك بەركەوتووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆربەی پەیوەندی بازرگانی دەرەوەی كەركوك سنووردار بووەو بە زۆری لەگەڵ بەغداو موسڵ و سلێمانیدا ئەنجام دەدرا[١٦٢]. هەروەها شوێنی كەركوك و موسڵ كە لە نزیكی یەكتر بوون كاریگەرییان لەسەر بازرگانی یەكترو ناوچەكەش هەبووە، ئەوەتا ئەو كاروانە بازرگانیانەی لە ئامێدی و دهۆك و موسڵەوە دەهاتن، دەچوون بۆ شارەكانی كەركوك و هەولێرو دەڤەری شارەزوور[١٦٣]. لە لایەكی ترەوە بازرگانانی دەڤەری بادینان لە رێگەی موسڵەوە پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵ كەركوكدا هەبووە، بە گوێرەی راپۆرتی كونسولی ئەلمانی لە سالی (١٩٠٧ز)دا بازرگانانی كەركوك بایی(٩٠٠٠)لیرەی عوسمانی[١٦٤] بەرووبوومی جۆراوجۆریان لە بازرگانانی بادینان كڕیووە، بەلام لە هەمان سالدا بازرگانانی دەڤەری بادینان بایی (٥٦,٠٠٠) لیرە لە بەرووبوومی مەڕو خوری و پێستی ئاژەلیان لە كەركوك كڕیووە[١٦٥].

شایەنی باسە ناوچە كوردییەكان لە رێگەی موسڵەوە هەندێ شتومەك و بەرهەمی ئەورووپیان پێگەیشتووە، كە بازرگانانی موسڵ لە رێگەی دەریای ناوەراستەوە بۆیان دەهات لەوانە ئاسن و راخەرەكان و عەبا[١٦٦]، ئەمە بێجگە لەوەی هەندێ كەلوپەلی تری وەك شەكرو ئاوریشم و جلوبەرگی درو نەرم لە بازرگانانی بەغدا دەكڕان، بە جۆرێك بازرگانانی بەغداش لە رێگەی هیندەوە دەیانهێنا[١٦٧]، خەلكی ناوچە كوردییەكان قاوەیان لە بەغدا وەردەگرت، كە ئەوانیش لە ناوچەكانی دەرەوە دەیان هێنا[١٦٨]. بە گوێرەی گوتەی گەڕیدە ئۆلیڤیە هەریەك لە بەغداو موسڵ و كەركوك جۆرە ماددەیەكیان دەنارده دەرەوە بە ناوی(النیل) كە بۆ بۆیاغ كردن بەكاردەهات[١٦٩].

كەركوك لە سەدەی نۆزدەدا بازرگانی لەگەڵ شاری هەولێردا هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەم شارە لە سەدەی نۆزدەدا لە چاو شارەكانی تری وەكو كەركوك و سلێمانی بچووكتر بوو[١٧٠]، بەلام پەیوەندی بازرگانی لەنێوان هەولێرو كەركوكدا هەبووە، كاتێك نیبور سەردانی ناوچەكەی كردووە دەلێت: "ئەو كاروانەی لە كەركوكەوە لەگەڵ ئێمە هات لە هەولێر سەفەرەكەی كۆتایی هات، دواتر دەلێت: پاشان گوێمان لێ بوو دوای ئەمە كاروانێكی تریش هات لەگەڵ ئەم كاروانەی پێشووتردا یەكیان گرت"[١٧١]. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی نێوان كەركوك و سلێمانی زۆر گەرم و گوڕترو فراوانتر بووە.

شاری سلێمانی یەكێك بووە لەو ناوچە كوردیانەی كە لە سەدەی نۆزدەدا پەیوەندی بازرگانی فراوانی لەگەڵ دەڤەری كەركوكدا هەبوو، ریچ باسی بازرگانی نێوان كەركوك و سلێمانیمان بۆ دەكات و دەلێت: "كەركوك ئەو بازاڕیە، نەك هەر لە لایەن كوردەكانی دەرەوەی كەركوكەوە، بەلكو لە لایەن ئەو كەركوكیانەشەوە كە بۆ ئەم مەبەستە (كڕین و فرۆشتن) بۆ سلێمانی دێن و پارەی پێشەكی بە جوتیارەكان دەدەن بۆ چەلتوك و هەنگوین و شتی تر، ئەو مازووەی كە لە قەرەداغدا بە زۆری بەرهەم دەهێنرێت، ئەم مازووە بۆ كەركوك و لەوێشەوە بۆ موسڵ دەنێردرێت"[١٧٢].

هەروەها نوسەرێكیش باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە پەیوەندی بازرگانی نێوان كەركوك و سلێمانی هەردەم بەهێزو زۆرتر بوو لە چاو بازرگانی كردن لەگەڵ شاری موسڵ[١٧٣]. هەر بۆیە بازرگانی سلێمانی بەردەوام لەگەڵ كەركوكدا لە پەرەسەندندا بووە، ئەوەتا بازرگانانی سلێمانی جلوبەرگیان لە شاری كەركوكەوە دەكڕی، لەبەرانبەریشدا شاری ناوبراو بەرووبوومە كشتوكالییەكانی وەكو گەنم و تووتن و سەوزەوات و بەرووبوومی ئاژەلی وەك مەڕو مانگاو هەندێ بەرهەمی پیشەگەری دەستی وەك جاجم و بەرمالی نوێژكردن دەنێرێتە كەركوك و بەغدا وموسڵ[١٧٤]. هەر بۆیە دەبینین هەریەك لە بەرهەمەكانی تووتن و كەتیرەو مازووو سابوون لەو بەرهەمە گرنگانە بوون كە دوای ئەوەی كەركوك لە سلێمانی وەردەگرت، لە رێگەی بازرگانییەوە دەچوونە بەغدا[١٧٥]. هەروەها بە گوێرەی گەواهی ریچ بازرگانی نێوان كەركوك و سلێمانی هەمیشە بەردەوام بووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی كەركوك بازاڕێكی بە رەواج بووە بۆ ئەم بەشەی كوردستان، لە شاری سلێمانییەوە بەرهەمەكانی نیسك و نۆك و ماش و پاقلەو هەنگوین و ترش و میوەو برنج و رۆن و لۆكەو مەرومالات و مازوو بۆ كەركوك دەنێردراو لەوێشەوە پێلاو هەندێ كۆتالی لۆكەی ئەستور دەهێنران[١٧٦].

یەكێك لەو شتە گرنگانەی كە دەمێنێتەوە لێرەدا باسی بكەین بریتییە لە بەشداری دانیشتووانی جولەكەو كریستیان لە بواری بازرگانیدا لە شاری كەركوك، سەرچاوەیەكی مێژوویی

جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە جولەکەو کریستیـانەکانی شاری کەرکوك وەکو چینی بۆرژوازی شارەکە بوون- رۆڵێکی دیاریان لە بواری بازرگانیدا گێراوە. ئەمە بێجگە ئەوەی کە خاوەن موڵکی گەورە بوون[١٧٧]. سەرچاوە مێژووییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە جولەکەکان دەستیان بەسەر بازرگانی ناوەوەو دەرەوەی کەرکوکدا گرتبوو[١٧٨]. هەر بۆیە دەبینین هەریەك لە بازرگانە کریستیان و کوردو تورکمانەکان بازرگانە بچووك و ناوەندییەکانیان پێك دەهێنا. بەڵام ئەمانیش رۆڵی زۆر کاریگەرییان لە بازرگانی کەرکوکدا هەبوو[١٧٩]. بێگومان فرەرەنگی بوونی بازرگانان لە کەرکوکدا بە هۆی بوونی چەند نەتەوەیەك لە شارەکەدا هۆکارێك بووە بۆ بەهێز بوونی بازرگانی ناوەوەو دەرەوەی کەرکوك.

*** باج و رەسم و داوەکان:**

**١. باج و رەسم:**

شایەنی باسە دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە شێوەیەك تەماشای ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان کردووە کە سەنتەرێکن بۆ کۆکردنەوەی باج، هەر بۆیە ئەوان پارەو پولێکی زۆریان لە رێگەی باجەکانەوە کۆدەکردەوە[١٨٠]. ئەوان لە هەموو ئەو نەتەوەو تایەفانەی لەژێر دەستیان بوون باجیان وەردەگرت، زۆرجار ئەگەر کۆکردنەوەی باجەکان دوابکەوتنایە سزادانی توند پێرەودەکرد بە تایبەتی بەرانبەر جوتیاران[١٨١].

سەبارەت بە باج یان جۆری ئەو باجانەی کە دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەدا لە ناوچەی کەرکوك وەریان گرتووە، ئەوا دەتوانین بڵێین ناوچەی کەرکوکیش وەکو ناوچەکانی تری ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە سیاسەتی باجگری ئەم دەوڵەتە بەدەر نەبوو. لەم چوارچێوەیەدا عوسمانییەکان چەندین جۆرە باج و رەسمیان لە خەڵکی ناوچەی کەرکوك وەرگرتووە، لەوانە باجی کشتوکاڵی کە خۆی دەبینێتەوە لە باجی سەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکان و باجی مەروماڵات. سەبارەت بە باجی بەروبوومە کشتوکاڵییەکان کە پێی دەوترا دەیەك (عشر) ئەوا لە ساڵانی (١٨٩٠-١٨٩١)دا داهاتەکەی (٨٢,٠٠٦) قروش بووە[١٨٢]، بەڵام لە ساڵی (١٨٩٢)دا رێژەکەی بووە بە(٤٨,٢٨٧) قروش[١٨٣]، بەڵام رێژەی ئەم جۆرە باجە لە ساڵی (١٨٩٤)دا بەرزبووەتەوە بۆ (١,٣٨٧,٠٧٠) قروش[١٨٤].

شایەنی باسە ئەگەر خەڵکی ناوچەکە بری باجی سەر بەروبوومە کشتوکاڵییەکەی بە بەرهەمی کشتوکاڵی نەدایە ئەوا لە بری ئەوە پارەیان لێ وەردەگرت کە پێیان دەوت لە بری دەیەك (بدل اعشار)، ئەمەش برێکی زۆری داهاتی بۆ دەوڵەت دەسەبەردەکرد، لە ساڵی (١٨٩٠-١٨٩١)دا بری (٢,٢٧٣,٥٦٩) قروشە[١٨٥]، بەڵام داهاتی ساڵی (١٨٩٢) بە بری (١,٨٩٦,٢٤٩) قروشە[١٨٦].

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت پێدەچێت خەڵکی ناوچەی کەرکوك لە بری پێدانی بەرهەمی کشتوکاڵی بە باجگرانی دەوڵەت زیاتر پارەیان دابێت، وادیارە ئەمەش لە پێناوی پارێزگاریکردن بووە لەو بەرهەمە کشتوکاڵییانەی کە بەرهەمیان هێناوە. هەر بۆیە دەبینین رێژەی داهاتی باجی لە بری دەیەك زیاترە لە باجی دەیەك.

دارستان و باخاتەکان جۆرێك بوون لەو بەروبوومە کشتوکاڵییانەی کە لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە دەڤەری کەرکوك باجی لێ وەگیراوە، ئەوەتا بە گوێرەی ساڵنامەی (١٨٩٠-١٨٩١) باجی دارستان (٢٨,٨١٠) قروش بووە[١٨٧]، بەڵام لە ساڵی (١٨٩٢) برەکەی (٢٦,٠٠٠) قروش بووە[١٨٨]، بەڵام بە گوێرەی ساڵنامەی (١٨٩٤) نزم بووەتەوە بۆ (١٦,٠٠٠) قروش[١٨٩].

سەبارەت بە باجی مەروماڵات ئەوا بە گوێرەی ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ رێژەیەکی بەرزی تۆمارکردووە، ئەوەتا لە ساڵی (١٨٩٠-١٨٩١)دا ئەم داهاتە لە دەڤەری کەرکوکدا (٢,٢٠٠,٧٨٦) قروش بووە[١٩٠]، بەڵام لە ساڵی (١٨٩٢)دا برەکەی دابەزیووە بۆ (١,٩٧٦,١١٤) قروش[١٩١]، بەڵام رێژەی ئەم باجە لە ساڵی (١٨٩٤)دا بەرزبووەتەوە بۆ بری (٢,٣٣٩,٨٤٠) قروش بووە[١٩٢]. ئەگەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ سەنجەقی سلێمانیدا ئەوا دەبینین لە ساڵی (١٨٩٤)دا لە دەڤەری سلێمانی بری (٨٥٤,٠٠٠)[١٩٣] قروش باجی مەروماڵات وەرگیراوە. هەر بۆیە ئەگەر بەوردی تێبینی بکەین دەبینین بری ئەو باجەی لە دەڤەری کەرکوك وەرگیراوە دوو ئەوەندەی ناوچەی سلێمانی بووە، کە بێگومان ئەمەش مانای دەوڵەمەندی بواری ئاژەڵداری ناوچەی کەرکوك دەگەیەنێت. ئەمە بێجگە لەوەی بەشێکی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە ناوچە شاخاوییەکانی سەر بە سلێمانی وەکو کەرکوك کۆنترۆڵ نەدەکران و هۆزە کۆچەرییەکان بە ئاسانی ملیان بۆ دەوڵەت نەدەدا، هەر بۆیە دەوڵەت نەیدەتوانی بە ئاسانی باجیان لێوەربگرێت.

دیارە کاربەدەستانی عوسمانی باجیان لە ئاژەڵی بەرزو بارگیریش وەرگرتووە، ئەوەتا بە گوێرەی ساڵنامەی (١٨٩٠-١٨٩١) رێژەی ئەو جۆرە باجە (١٥,٠٠٠) قروش بووە[١٩٤]، بەڵام لە ساڵی (١٨٩٢)دا رێژەکەی بەرزبووەتەوە بۆ (٢٥,٠٠٠) قروش[١٩٥].

دەوڵەتی عوسمانی باجی بەسەر بازرگاناندا سەپاندبوو. هەر بۆیە کاتێك کاروانێکی بازرگانیشدا دەهاتە ناو شاری کەرکوك یان بە پێچەوانەوە کاربەدەستانی باجگری دەوڵەتی عوسمانی باجیان لێی وەردەگرت، جێگەی ئاماژەیە ئەم جۆرە باجە بە زۆری لە دەروازەی شارەکاندا وەردەگیرا، گەریدە فرایزەر کە خۆی لە ساڵی (١٨٣٤)دا هاتۆتە کەرکوك لەم بارەیەوە دەڵێت: "کاتێك ئێمە گەیشتینە کەرکوك لە شوێنێکدا ئێمەیان راگرت لەبەر ئەوەی لەو دەرگایەوە کاروانە بازرگانییەکانی کەرکوك دەردەچوون، هەر لەو جێگەیەشدا کارمەندانی دەوڵەت بری باج و رەسمی داواکراویان لێ وەردەگرتن"[١٩٦]. لە لایەکی تر یەکێکی تر لەو جۆرە باجانەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە بواری بازرگانیدا وەریدەگرت باجی پەرینەوە بوو. ئەم جۆرە باجانەش کاربەدەستانی عوسمانی لە کەرکوك دا لە پردێ وەرییان دەگرت لە بازرگانان، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە پردێ سەنتەرێکی بازرگانی و کلیلی چەندین رێگەی تر بوو[١٩٧]. ئەوەتا گەریدەیەکی هۆڵەندی کە خۆی سەردانی هەریەك

لە کەرکوک‌و ئالتون کۆپری کردووە لەم بارەیەوە دەڵێت: "کاربەدەستانی عوسمانی ساڵانە ٨٠ هەزار مارک کرێی پەرینەوە بەسەر پردی ئالتون کۆپری وەردەگرن"(١٩٨). نیبور باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هیچ ڕێگەیەك ئەوەندە هەرزان‌و کەم تێچوو نییە لە ڕووی گومرگەوە بەقەد ڕێگەی (کەرکوك - ئالتون کۆپری - هەولێر).

بەلام بەو مەرجەی بازرگان بە ڕێگەی زێدا (زێی بچووکدا) بڕوات، کە کاربەدەستانی عوسمانی بڕێکی کەم پارەی لێ وەردەگرن بە ناوی باج(١٩٩).

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین کە شاری کەرکوك لە سەدەی نۆزدەدا بزوتنەوەیەکی بازرگانی گەشاوەی تێدابوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی دەڤەری کەرکوك دەکەوتە سەر چەند ڕێگەیەکی بازرگانی(٢٠٠). جێگەی باسە ئەو باجەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە کاتی هاتنەناوەوەی کەلوپەلی بازرگانیدا وەریدەگرت بۆ بازرگانانی دەرەکی (٣٪) بوو بۆ بازرگانانی ناوخۆی بە ڕێژەی (٧٪) یان (١٠٪) وەردەگیرا، ئەمە بێجگە لەوەی بازرگانانی بیانی یەکجار باجیان دەدا، بەلام بازرگانانی ناوخۆی چەندین جار باجیان لێ وەردەگیرا(٢٠١). ئاشکرایە ئەمەش بە هۆی ڕژێمی ئیمتیازاتەوە کە بوو دەوڵەتە بیانییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەستیان هێنابوو.

جوتیاران یەکێك بوون لەو چینانەی کە دەوڵەتی عوسمانی باجێکی زۆری بەسەریاندا سەپاندبوو، جیمس فیلکس جۆنز کە ئەندامی لێژنەی بەریتانی ڕووسی بوو بۆ چارەسەکردنی کێشەی سنووری نێوان عوسمانی‌و قاجاری لە ساڵی (١٨٤٤ز)دا ئەوەمان بۆ تۆمار دەکات کە چۆن دەسەڵاتدارانی قاجاری باجێکی زۆریان بەسەر چینی جوتیارەکانی هەرێمی کرماشاندا سەپاند بوو بە هەمان شێوەش عوسمانییەکان باجێکی زۆریان بەسەر چینی جوتیارەکاندا سەپاند بوو لە ناوچەکانی کەرکوك‌و خانەقین(٢٠٢).

بواری موڵکداری زەوی‌و زەوییە میرییەکان یەکێك بوو لە بوارە گرینگانەی کە دەوڵەتی عوسمانی بە هۆی باجگرییەوە ڕێژەیەکی بەرز باجی وەرگرتوە، بە گوێرەی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵی(١٨٩٠-١٨٩١ز) باجی موڵکداری زەوی تاپیەت (زەوی تاپۆ) (١,٧٠٢,٩٠٤) قروشە، بەلام داهاتی زەوییە میرییەکان (١٤,٥٧٠) قروشە(٢٠٣). داهاتی باجی زەوی موڵکداری تاپیەت لە ساڵی (١٨٩٢ز)دا بە تێکرای (١،٥٣٦،٧٦٠) قروشە، داهاتی زەوییە میرییەکان لە هەمان ساڵدا(١١،٣٤٥) قروش بووە(٢٠٤).

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم داهاتی باجە لە ساڵنامەی موسڵی ساڵی (١٨٩٤ز)دا بە ڕێژەیەکی زۆر کەمی کردووە بە جۆرێك داهاتی زەوی موڵکداری بری (٣٠,٠٠٠) قروشەو داهاتی باجی زەوی میری لەگەڵ هەندێ باجی خێرا سەپێنرا خۆی دەگەیەنێتە (١٢,٠٠٠) (٢٠٥) قروش. ئەوەی لەم جۆرە باجەدا تێبینی دەکرێ بەرزی ڕێژەی باجی زەوییە موڵکدارییەکانە لە چاو زەوی میری، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین زەوییە موڵکدارییەکان بە ڕێژەی زۆرترو فراوانتر لە دەڤەری کەرکوکدا هەبوون لەچاو زەوییە میرییەکان، ئەمە بێجگە لەوەی زەوییە موڵکدارییەکان مایەی داهاتێکی زۆر بوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی لە چاو جۆرەکانی تری باج‌و ڕەسم کە لە بوارەکانی تر وەرگیراون.

لە لایەکی تر کاربەدەستانی باجگری دەوڵەتی عوسمانی چەندین جۆر ڕەسمیان لە خەڵکی دەڤەری کەرکوك وەرگرتووە، لە ساڵی(١٨٩٠-١٨٩١ز) بڕی ئەو ڕەسمە (٣٢٩,٨٥٢) قروشە(٢٠٦)، بەلام داهاتی ڕەسمی جۆراو جۆر لە ساڵی (١٨٩٢ز) (٥٥٦,٨٧٠) قروش بووە(٢٠٧)، بەلام هەمان داهات لە ساڵی (١٨٩٤ز)دا برەکەی (٢٩٩,٠٠٠) قروشە(٢٠٨). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ڕەسمە لە زیادبوون‌و کەم بوون دابوو بەپێی هەلومەرج‌و بارودۆخەکان.

دەوڵەتی عوسمانی لە چەندین بواری تری جۆراو جۆردا باجی لە خەڵکی ناوچەی کەرکوك وەرگرتووە، کە هەوڵدەدەین لەم خشتەیەدا بیان خەینەڕوو:

| جۆری باج | بڕی داهات لە ساڵنامەی (١٨٩٠-١٨٩١ز)دا بە قروش | بڕی داهات لە ساڵنامەی (١٨٩٢ز)دا بە قروش | بڕی داهات لە ساڵنامەی (١٨٩٤ز)دا بە قروش |
|---|---|---|---|
| باجی سەربازی(بدل عسکری) | ١٠٤٨١٧ | ١٠٢٥١١ | ٢٠٤٧٠٠ |
| باجی کانزا | ٥٠٠٠ | – | – |
| داهاتی دادوەری | ٣٧١٨٧ | ٣٥٧١٨ | ٣٠٠٠٠ |
| باجی داهات(وێرکۆ) | ٥١٦٤٩٣ | ٥٨٨١٠٧ | ٢٣٥١٨٠٠ |
| هەندێ داهاتی تری باجی جۆراو جۆر | ٢٧٤٣٦ (٢٠٩) | ٢٢٣٤٠ (٢١٠) | ٢٨٠٠٠ (٢١١) |

سەبارەت بە کۆکردنەوەی باجەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا ئەوا تا ناوەراستی سەدەی نۆزدە لە ڕێگەی قۆنتەراتچی یان مولتەزم (الملتزمون) کۆدەکرانەوە، ئەمانە باجی کۆکردنەوەی ناوچەکانیان پێ دەدرا، ئەمەش چ لە ڕێگەی ڕێکەوتن یان موزایەدەوە بە دەستیان دەهێنا، بەلام ئەمانە بە ئارەزووی خۆیان دەستکاری ڕێژەو قەبارەی باجەکانیان دەکرد، ئەمە بێجگە لە چەوساندنەوەی خەڵکی بە هۆی نەبوونی چاودێری لە سەرییان. لە لایەکی تر ئەم قۆنتەراتچیانە زۆرجار سەرۆکی هۆزەکان یان شێخەکان بوو کە ئەوپەڕی توندوتیژیان بەکاردەهێنا لە کۆکردنەوەی باجەکاندا ئەمەش بە مەبەستی زیاتر قازانج بۆ خۆیان، بێگومان ئەم قۆنتەراتچیانە بە تەواوی لە دەوڵەتدا دەستیان دەڕۆی‌و لێپرسنەوەیان لەگەڵدا نەدەکرا(٢١٢). بەلام لە سەردەمی چاکسازیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی‌و بەدەرچوونی خەتی شەریفی گوڵخانە لە ساڵی (١٨٣٩ز)دا ڕژێمی ئیلتزامی ڕەتکردەوەو باجگرانی دەوڵەت ئیتر باجیان کۆدەکردەوە(٢١٣).

شایەنی باسە کەرکوکیش لە رژێمی باجگری حوونەتی عوسمانی بەدەرنەبووە، هەربۆیە بە هەمان شێوەی ناوچەکانی تر کرداری توندو تیژی لە کۆکردنەوەی باجەکاندا لە دەڤەری کەرکوکیشدا پیرەوکراوە. دیارە دەسەلاتدارانی عوسمانی بە توندی دژی هەر لایەنێك یان کەسێك بوونە کە بووبێتە رێگر لەبەردەم کۆکردنەوەی باجەکاندا. ئەمەش مانای بەکارهێنانی سیاسەتی توندوتیژییە لە کۆکردنەوەی باجەکاندا. هەر بۆیە دەبینین کاتێك دەسەلاتدارانی ئیالەتی بەغدا لە سەردەمی داود پاشادا یەکێك لە کاربەدەستانی خۆیان رەوانە دەکەن بۆ کۆکردنەوەی باج و رەسمەکان لە ناوچەی کەرکوك، بەلام یەکێك لە کاربەدەستانی پێشوتری کەرکوك بە ناوی عومەر ئەفەندی دژایەتیان دەکات ئەوانیش لە بەرانبەر ئەمەدا لە سێدارەی دەدەن و دوای کۆکردنەوەی باج شارەکە بەجێدەهێلن[٢١٤]. بێگومان ئەم جۆرە سیاسەتەی کە عوسمانییەکان لە بواری کۆکردنەوەی باجەکاندا پێرەویان دەکرد کاریگەری خراپی لەسەر بواری ئابووری وولات هەبووە، کە لە ئاکامیدا رێژەیەکی زۆر لە پارە بە ناوی باجەوە لە خەلکی ناوچەکە سێنراوە.

جێگەی باسە بە گوێرەی سالنامەکانی دەولەتی عوسمانی لە شاری کەرکوکدا فەرمانگەی باج[٢١٥] و فەرمانگەی رسومات[٢١٦] هەبوو بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆکردنەوەی رەسم و باجەکان، ئەمەش مانای وایە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لە دەڤەری کەرکوك بە شێوەیەکی رێکتر باجەکان کۆکراونەتەوە لە چاو سەردەمەکانی تردا. بە هۆی نەمانی رژێمی ئیلتیزام لەو سەردەمەدا.

لەبارەی سەرجەمی داهاتی دەولەتی کە لە چەندین بواری جۆراو جۆردا وەرگیراون لە دەڤەری کەرکوکدا هەروەکو پێشتر ئەوەمان روون کردووەتەوە، ئەوا بە گوێرەی سالنامەی (١٨٩٠-١٨٩١ز) داهاتەکەی (٧,٥٣٢,٥٧٠) قروشە[٢١٧]، بەلام سەرجەمی داهاتە باج و رەسمەکان بۆ سالی (١٨٩٢ز) لە سەنجەقی کەرکوکدا (٦,٩٨٣,٧٢٦) قروشە[٢١٨]، بەلام تێکرای ئەم داهاتە بۆ سالی (١٨٩٤ز) بە بری (٦,٦٩٨,٤١٠) قروش بووە[٢١٩]. لە راستیدا ئەگەر بەوردی تێبینی ئەو ئامارانە بکەین ئەوا دەبینین دەولەتی عوسمانی رێژەیەکی زۆری لە باج و رەسم لە سەرجەم بوارە جیاجیاکان لە دەڤەری کەرکوکدا وەرگرتووە، هەر بۆیە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەل سەنجەقی سلێمانیدا زیاتر ئەم راستیەمان بۆ روون دەبێتەوە، بۆ نموونە سەرجەمی رێژەی داهاتی سەنجەقی سلێمانی بۆ سالی (١٨٩٤ز) برەکەی تەنها (٢,٦٥٤,٠٥٣) قروش بووە[٢٢٠]، واتە داهاتی باجی کەرکوك لەم سالەدا بە رێژەی (٤,٠٤٤,٣٥٧) قروش لە سلێمانی زیاتر بووە، بێگومان لێرەدا دەتوانین بلێین کە چالاکی لە سەرجەم بوارە ئابوورییەکاندا لە دەڤەری کەرکوك لە چاو ناوچەی سلێمانی زیاتر بووە، لە لایەکی تر بوونی ئەم رێژە زۆرە لە باج و رەسم لە ناوچەی کەرکوکدا مانای ئاوەدانی و فراوانی دەڤەرەکە دەگەیەنێت لە چاو سلێمانیدا. ئەمە بێجگە لە هەندێ هۆکاری تر کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردووە. بەلام ئەگەر داهاتی هەمان سالی دەڤەری کەرکوك لەگەل موسلدا بەراورد بکەین ئەوا دەبینین بری داهاتی سەنجەقی موسل لە سالی (١٨٩٤ز)دا دەیکردە (٨,١١٥,٦٨٥) قروش[٢٢١]، ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت کە داهاتی ناوچەی موسل بە بری (١,٤١٧,٢٧٥) قروش لە دەڤەری کەرکوك زیاترە. بەلام داهاتی موسل لە سالی (١٨٩٠-١٨٩١ز)دا (٧,٢٣٣,٢٤٨) قورشە[٢٢٢]،و داهاتی هەمان سەنجەق بۆ سالی(١٨٩٢ز) دا بە بری (٦,٤٩٩,١٥٢)قروشە[٢٢٣]، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە لەم دوو سالەی دواییدا داهاتی رەسم و باجەکانی سەنجەقی کەرکوك لە موسل زیاترە. هەر بۆیە دەتوانین بلێین کە جیاوازییەکی زۆر بەدی ناکرێ لەنێوان بری داهاتی سەنجەقی موسل و کەرکوك، بێگومان ئەمەش مانای ئاوەدانی و بووژاوەیی بوارەکانی ئابووری ناوچەی کەرکوك دەگەیەنێت.

جێگەی باسە یەکێکی تر لەو لایەنە گرنگانە کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێبدەین بریتییە لە بری ئەو تێچووەی کە دەولەتی عوسمانی بۆ دەڤەری کەرکوکی خەرج کردووە بە مەبەستی خزمەتگوزاری لە دەڤەری ناوبراودا. بەلام لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دەولەتی عوسمانی ئەو داهاتەی کە لە رێگەی باجەوە لە ناوچەکە دەستی دەکەوت، رێژەیەکی کەمی بۆ ناوچەکە خەرج کردووەتەوە، بەلام لە بەرانبەردا رێژە زۆرەکەی ئەو داهاتە رەوانەی خەزێنەی دەولەت کراوە.

بە گوێرەی سالنامەی (١٨٩٠-١٨٩١ز)دا سەرجەم ئەو داهاتەی کە دەولەتی عوسمانی بۆ دەڤەری کەرکوك خەرجی کردووە (٣,٠٩٧,٩٢٨) قروشە، بەلام ئەگەر بە وردی تێبینی بکەین تەنها بواری سەربازی و جەندرمە زۆرترین رێژەی ئەو خەرجیەی بەرکەوتووە کە برەکەی (١,٥٨٦,٢٣٨) قروشە، بەلام هەریەك لە بوارەکانی خوێندن و تەندروستی هیچ جۆرە داهاتێکی تێدا خەرج نەکراوە[٢٢٤].

لە سالی (١٨٩٤ز)دا کاربەدستانی عوسمانی لە بری (٩,١٢٢,٣٤٩) قروش کە بۆ دەڤەری کەرکوك خەرج کراوە لە بوارە خزمەتگوزارییەکاندا، بەلام ئەگەر بە وردی لە رێژەی داهاتی خەرج کارو بروانین دەبینین تەنها بواری سەربازی و جەندرمەو هێزی یەدەگ بە رێژەی (٦,٥٣٨,٨٦٣) قروشی بۆ تەرخان کراوە، بەلام بوارە گرنگەکانی تری وەکو خوێندن و تەندروستی هیچ جۆرە داهاتێکیان بۆ خەرج نەکراوە[٢٢٥]. هەر بۆیە دەتوانین بلێین کە کاربەدەستانی عوسمانی لە سەنجەقی کەرکوکدا زۆربەی ئەو داهاتەی بۆ ناوچەکە خەرجیان کردووەتەوە بۆ بواری سەربازی بووە بۆ مەبەستی مانەوەی دەسەلاتیان بەسەر ناوچەکەدا نەوەك بوارەکانی تری خزمەتگوزاری و ئاوەدانی و تەندروستی و خوێندن، ئەمە بێجگە لەوەی بەشی هەرە زۆری ئەو پارەیە بۆ خەزێنەی دەولەت نێردراوە کە ئەمەش مانای پێرەوکردنی سیاسەتی رووتاندنەوەو دادۆشینی خەلك دەگەیەنێت.

### ٢. دراوو کێشان و پێوانە:

پارە یەکێکە لە هۆکارەکانی ئالوگۆری بازرگانی و هۆکارێکی گرنگی ئەنجام دانی ئالوگۆری بازرگانیە. لەم بارەیەوە

جێگەی سەرەنجە کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا دراوو پارەی بەکارهێنراو زوو دەگۆڕان‌و زۆر جار کێشەی بۆ خەڵك دروست دەکردو بە گوێرەی پێداویستی ئەوان نەبوو، ئەمە بێجگە لە جۆراو جۆری دراوەکان لە ناوچەکاندا[٢٢٦].

لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا لە کەرکوك‌و ناوچەکانی دەوروبەردا چەندین جۆرە دراو بەکارهاتووە، لەوانە (قروش)، ئەم دراوە یەکێك بوو لە دراوە جێگیرەکانی دەوڵەتی عوسمانی. ئەم دراوە دراوێکی زیوی بوو یەکەم جار لە ساڵی (١٦٨٨ز)دا لێدرا، ئەمەش دوو جۆری هەبوو قروشی ساغ‌و قروشی چروك (واتە خراپ)[٢٢٧]. جێگەی سەرەنجە نرخی یەك قروشی عوسمانی هاوتای (٩،٠٨)ی فلسی عێراقی بوو کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا بەکاردەهات، بەڵام نرخی یەك قروش یەکسان بوو بە نیو پێنسی ئینگلیزی[٢٢٨].

ئاقچە یەکێك بوو لەدراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کە لە سەردەمی مەغۆلەکانیش بەکارهاتووەو عوسمانییەکانیش بەکاریان هێناوە کە پێی دەوترا ئاقچەی عوسمانی، بەهای ئەم دراوە دەیکردە چارەکە مسقالی زێر[٢٢٩]، هەروەها دراوی ناوبراو بە ڕێژەی (٩٠٪) پێکهاتەکەی زیو بوو، بەڵام دواتر بە هۆی دابەزینی بەهاکەی لە ساڵی (١٨٢٧ز)دا لە لێدان وەستا[٢٣٠]، جێگەی ئاماژەیەك کە ئاقچە لە هەندێك ویلایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا پێی دەوترا فلوسی عوسمانی[٢٣١].

جگە لەم دراوانە چەند دراوێکی تری زیوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە چەرخی هەشتی[٢٣٢]و دراوی مەجیدی، ئەم دراوەی دوایی لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدا (١٨٣٩-١٨٦١ز)دا لێدرا، سەبارەت بە بەهاکەی نرخی یەك مەجیدی (٢٠) قروش‌و نیو مەجیدی ١٠ قروش‌و چارەکە مەجیدییەك ٥ قروش بوو[٢٣٣]. هەروەها دراوی (پارە)ش یەکێك بوو لەو دراوە زیوییەکانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەم دراوە لە کەرکوك‌و ناوچەکەدا بەکارهاتووە، سەبارەت بە بەهاکەشی ئەوا (١٠) پارە بەرانبەر بوو لەگەڵ یەك قروشی خراپ‌و (٥) پارەش دەیکرد نیو قروش[٢٣٤].

دراوی فلوسی مسی یەکێك بووە لەو دراوە عوسمانییانەی کە لە دەڤەری کەرکوکدا بەکارهاتووە. سەبارە بە بەهای ئەم دراوە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا ئەوا نرخی (٥) فلوس دەیکردە یەك پارە[٢٣٥]. هەرچی لە بارەی دراوی زێری بەکارهاتوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا لیرەی زێر هەبوو، ئەم دراوە لە کەرکوك‌و ناوچەکە بەکارهاتووە، دەربارەی نرخەکەشی یەك لیرەی زێر دەیکرد (١٠٠) [٢٣٦] قروش. هەروەها چەند جۆرە دراوێکی تری زێر لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بەکارهاتوون لەوانە زڕ ئەستەمبوڵ‌و زنجیرلی‌و ڕۆمی[٢٣٧]. شایەنی ئاماژە بۆکردنە کەوا بەکارهێنانی دراوی تورکی لە کوردستاندا لە چوارچێوەیەکی فراوان نەبووەو بەتایبەتی خەڵکی ناوچەکە مامەڵەیان بە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی شمەکیش (المقايضة)کردووە، نیبور لەم بارەیەوە دەڵێت: "ویستم ماوەی دانیشتنم لە موسڵ بە هەل وەربگرم، دەستم کرد بە گەڕان بەدوای بوونی دراوی ڕۆمانی‌و یۆنانی‌و فارسی، بەڵام خەڵکی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەتوانیت لە ناوچەی کوردستان ئەم جۆرە دراوانەت دەست بکەوێت لەبەر ئەوەی لەو ناوچانەدا دراوی تورکی بەکەمی بەکاردەهێنرێت"[٢٣٨]. شایەنی باسە لە ناوچە کوردییەکاندا بێجگە لە دراوی عوسمانی دراوی فارسیش بەکارهاتووە[٢٣٩].

سەبارەت بە یەکەکانی کێشان‌و پێوانە کردن لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەتوانین بڵێین ئەم یەکانە جێگیر نەبوو، بەڵکو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕان[٢٤٠]. بەڵام سەبارەت بە دەڤەری کەرکوك ئەوا دەبینین لە سەدەی نۆزدەدا چەندین یەکەی کێشانەو پێوانە کردن بەکارهێنراون، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

- حۆقەی کەرکوك = ٥٦٦ گرام، ٢ کیلۆ = ٥،٦٥٣٦ باوەند.

باتمان = ٦ ١/٢ حۆقەی کەرکوك.

- تەغاری گەنم = ٥٠٠،٣٥٠ کیلۆ گرام = ١١٠٢،٤٠٥ باوەند.
- تەغار جۆ = ٢٨٤،٨٨٣ کیلۆگرام = ٤٨٨ باوەند.

جەرەی ئاو کە پێی دەوترا جەرەی لەیلان (ليلان جرەسی) بەکاردەهات بۆ فرۆشتنی نەوت کە دەیکرد نزیکەی ٤ گالۆن[٢٤١].

پێوانەی باڵ بەکاردەهات بۆ پێوانەکردنی درێژی، ئەمەش بە زۆری بۆ پێوانەکردنی قوماش بەکاردەهات کە درێژییەکەی لە(٦٥)سم زیاتر نەبوو[٢٤٢]، فەرسەخیش[٢٤٣] بەکاردەهات بۆ پێوانەکردنی زەوی‌و دوورییەکان، بە جۆرێك یەك فەرسەخ بە پێوانەی ئێستا دەکاتە شەش کیلۆمەتر[٢٤٤].

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

(١) بڕوانە:

- د. عماد احمد الجواهري، (ملاحظات عن الاقطاع وحيازة الأراضي في كردستان في العصور الاسلامية المتأخرة)، مجلة (كاروان)، العدد ٣٤، ١٩٨٥، الصفحة ١٤٢.
- د. علي سلطان، (تأريخ الدولة العثمانية)، منشورات مكتبة طربلس العلمية العالمية، دون تاريخ، الصفحة ١٨١.
- ا. م. منتشاشفيلي، (العراق في سنوات الانتداب البريطاني)، ترجمة: هاشم صالح التكريتي، مطبعة (بغداد)، بغداد، ١٩٧٨. الصفحات ٦٥-٦٦.

(٢) عبدالرحمن شرف، (فذلكه تاريخ دولت عثمانيه)، اون يكنجي طبعي، قرەبيت مطبعه سى، (استانبول: ١٣٢٨هـ/١٣٢٦رومي)، الصفحة ٨٤.

(٣) د. عەبدولڕەحمان قاسملۆ، (کوردستان‌و کورد لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی ئابووری)، وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا حەسەن زادە)، چاپی دووەم، چاپخانەی (مناره)، هەولێر، ٢٠٠٦، لاپەڕە ١٤١؛ هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عماد احمد الجواهري، (تأريخ مشكلة الأراضي في العراق ١٩١٤-١٩٣٢)، دار الحرية للطباعة، (بغداد: ١٩٧٨)، الصفحة ١٨-١٩.

(٤) سیسیل جۆن ئێدمۆندس، (کورد تورك عەرەب)، وەرگێڕانی: حەمیدی گەوهەری، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەڕە ٣٢٣-٣٢٤.

(٥) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.جبار قادر غفور، (كركوك نصف قرن من التتريك والتعريب)، مجلة (سردم

العربي)، العدد ٤، السليمانية: ٢٠٠٤، الصفحة ٣٦
(٦) حنا بطاطو، (العراق الطبقات الاجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية. ترجمة: (عفيف الرزاز)، الجزء الاول، الطبعة الثانية، مؤسسة الابحاث العربية، ١٩٩٥، الصفحة ٧٧.
(٧) تەرجیل: یەکێکە لە گوندەکانی سەر بە قەرەحەسەن. بڕوانە: محەمەد سەعید سۆفی، (پارێزگای کەرکوك لە ناو پاکتاوی رەگەزیدا)، چاپخانەی بەرهەم. سلێمانی. ٢٠٠٣. لاپەرە ١٥٨.
(٨) تسعین: بە گوێرەی گوتەی گەریدە ئۆلیڤیە (تسعین-تسن) گوندێکە لە نزیك کەرکوك و یەك فەرسەخ- (٦ کم) لێیەوە دوورە.
بڕوانە: اولیفیة، (رحلة اوليفية إلى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦م)، ترجمة: د. يوسف حبي، مطبعة (المجمع العلمي العراقي)، بغداد، ١٩٨٨، الصفحة ٦٧، لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە ئێستا (تسعین-تسن) گەرەکێکە لە شاری کەرکوك.
(٩) خليل علي مراد، تاريخ العراق الاداري والإقتصادي...، ص٣٠٦.
(١٠) حنا بطاطو، المصدر السابق، الصفحة ٢٤٧.
(١١) اسماعيل رسول، (التطور الإقتصادي في كردستان العراق)، مجلة (شمس كردستان)، العدد الاول، بغداد، ١٩٧١م، الصفحة ١٩.
(١٢) محمد توفيق حسين، (نهاية الاقطاع في العراق، بحث في احوال الفلاح وقانون الاصلاح الزراعي)، الطبعة الاولى، (دار العلم للملايين)، بيروت، ١٩٥٨م، الصفحات ٩٢-٩٤.
(١٣) ئەم یاسایە بۆ رێکخستنی مافی موڵکدارێتی زەوی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەرچوو لە (١٣)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٨٥٩)ز، کە ٣٣ ماددەی لە خۆدەگرت. بەپێی ئەم یاسایە مافی موڵکدارێتی زەوی بۆ خاوەن زەوی دەسەلمێنرا بە دیاریکردنی شوێن و رووبەری زەوی و پێدانی سەنەد بە خاوەن زەوی لە لایەن دەوڵەتەوە.
بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: دكتور سيار كوكب علي الجميل، (تكوين العرب الحديث ١٥١٦- ١٩١٦)، الطبعة الاولى، (دار العربية للطباعة والنشر)، الموصل، ١٩٩١، الصفحة ٣٤٦ ومابعدها.
(١٤) نمير طه ياسين، (بدايات التحديث في العراق ١٨٦٩-١٩١٤)، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٤م، الصفحات ٩٦-٩٧.
(١٥) ا.م منتشاشڤیلی، (کورد کورتەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی- ئابووری- رۆشنبیری و گوزەران)، وەرگێڕانی لە رووسییەوە: د.عزەددین مستەفا رەسوڵ، چاپکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ١٩٩٩م، لاپەرە ١١٦.
(١٦) محمد توفيق حسين، المصدر السابق، الصفحة ٩٨.
نمير طه ياسين، المصدر السابق، الصفحة ٩٨-٩٩.
بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: لوتسكي، (تأريخ الاقطار العربية الحديث)، ترجمة: عفيفة البستاني، دار الفارابي، الطبعة السابعة، بيروت، ١٩٨٠م، الصفحة ١٦.
(١٧) بڕوانە سەرچاوەکان:
- حنا بطاطو، المصدر السابق، الجزء الاول، الصفحات ٢٩، ١٠٣.
- دکتور جەلیلی جەلیل، (کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی)، لاپەرە ٥٣.
(١٨) محمد توفيق حسين، المصدر السابق، الصفحات ٩٨-٩٩.
هەروەها بڕوانە: د. عماد احمد الجواهري، (ملاحظات عن الاقطاع و حيازة الاراضى في كردستان في العصور الاسلامية المتاخرة)، مجلة (كاروان)، العدد ٣٤، ١٩٨٥، الصفحات ١٤٦-١٤٧.
(١٩) د. عبدالفتاح علي البوتاني، (دراسات ومباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر)، الجزء الاول، مطبعة (حاجي هاشم)، اربيل، ٢٠٠٧م، الصفحة ١٢٠، شایانی باسە یەك هیکتار یەکسانە بە (١٠٠٠٠م²) بڕوانە هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.
(٢٠) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨ هـ)، الصفحة ١٣٩.
(٢١) بڕوانە: سالنامه ولايت موصل ١٣١٢ هـ)، الصفحة ١٦٢.
(٢٢) فيصل محمد الأرحيم، (تطور العراق تحت الحكم الاتحاديين ١٩٠٨-١٩١٤)، مطبعة (الجمهورية)، الموصل، ١٩٧٥، الصفحة ٩٠.
(٢٣) بڕوانە: گۆران ئیبراهیم سالح، (کەرکوك لە سەردەمی عوسمانیدا لەنێوان ساڵانی ١٨٧٦-١٩٠٩ز)، دەزگای چاپ و پەخشی (حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٧ز، لاپەرە ١٢٢.
(٢٤) د. عمر ابراهيم توفيق، (التركمان في العراق)، من منشورات مكتب الفكر ولتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، ٢٠٠٥، الصفحة ٥٣.
(٢٥) شمس الدين سامي، (قاموس الاعلام)، المجلد ٥، (مهران مطبعه سي)، استانبول ١٣١٤ رومي-١٨٩٦م، الصفحة ٣٨٤٦.
(٢٦) خليل علي مراد، (تأريخ العراق الاداري والإقتصادي في العهد العثماني ١٠٤٨-١١٦٤هـ/١٦٣٨-١٧٥٠م)، جامعة بغداد- كلية الاداب، ١٩٧٥، الصفحات ٣٠٧-٣٠٨؛ سەبارەت بە دراوی ئاقچە، ئەم دراوە یەکێك لە دراوە بەکارهاتووەکان بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەهای ئەم دراوە دەیکردە چارەکە میسقاڵێك زێڕ. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە بابەتی، (دراو و کێشان و پێوانە) هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا.
(٢٧) فەیسەڵ دەبباغ، (کوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا)، وەرگێڕانی لە تورکی عوسمانییەوە بۆ کوردی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (ئاراس)، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەرە ١٣١.
(٢٨) بڕوانە: (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢ هـ)، الصفحة ١٦١.
(٢٩) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨ هـ)، الصفحة ١٠٦.
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠ هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٣٠) ليونهارت راوولف، (رحلة المشرق إلى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين ١٥٧٣)، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٨،

الصفحة ١٩٨.

(٣١) كارستن نيبور، (رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر)، ترجمة: الدكتور محمود امين حسين، راجعه وعلق عليه ووضع الحاشية: سالم الآلوسي، بغداد، ١٩٦٥، الصفحة ٨٥.

(٣٢) ابي طالب خان، (رحلة ابي طالب خان إلى العراق واوروبه ١٢١٣هـ/١٧٩٩م)، ترجمة: مصطفى جواد، بغداد، د.ت، الصفحة ٣٦٣.

(٣٣) گوندی چەرموو کە بە دووری (٣٥) کم لە رۆژهەڵاتی کەرکوك هەڵکەوتووە بە کۆنترین گوندی کشتوکاڵی دەژمێردرێت کە شوێنەوارەکەی بۆ سەردەمی چاخی بەردینی کۆن و نوێ دەگەڕێتەوە، طه باقر، (عصور ماقبل التاريخ وادي الرافدين على ضوء تنقيبات الاثرية في كردستان العراق)، مجلة (المجمع العلمي الكردي)، العدد ١، ١٩٧٣، الصفحة ٦٠٥ ومابعدها.

(٣٤) بڕوانە:

- فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٣١-١٣٢.
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحات ٢٩٨-٢٩٩.

(٣٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحه ٢٠٦.

(٣٦) بەرگواستن لە: بدرخان سندي، (المجتمع الكردي من المنظور الاستشراقي)، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢م، الصفحة ٤٩٢.

(٣٧) ميجرسون، (رحلة متنكر إلى بلاد مابين النهرين وكردستان)، ترجمة: فؤاد جميل، الجزء الاول والثاني، الطبعة الاولى، بغداد، ١٩٧٠، الصفحات ١٥٦-١٥٨.

(٣٨) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحه ٢٠٦.

(٣٩) بڕوانە:

- (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٤٠.
- (سانامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٣٠٠.
- فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣١.

(٤٠) بڕوانە:

- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٩-١٠٠.
- بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، (گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا)، وەگێڕانی لە ئەڵمانییەوە: حەمید عەزیز، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤، لاپەڕە ٢٩.

(٤١) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٣٠٢.

(٤٢) جيمس بكنغهام، (رحلتي إلى العراق ١٨١٦)، ترجمة: سليم طه التكريتي، الجزء الاول، مطبعة (اسد)، بغداد، ١٩٦٨، الصفحة ١٤٣.

(٤٣) بڕوانە:

- (سالنامه ولايت موصل (١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٣٩.
- (سالنامه ولايت موصل (١٣١٠هـ)، الصفحة ٢٠٥.

(٤٤) فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣١.

(٤٥) (سالنامه ولايت موصل (١٣١٢هـ)، الصفحة ١٦٣.

(٤٦) عەبدوڵڵا عەبدول کەریم مارف بەرزنجی، (کارکۆك لە مێژوودا)، چاپی یەکەم، چاپخانەی (خۆیبون)، دانیمارك، ٢٠٠١ز، لاپەڕە ٨٢.

(٤٧) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٩.

(٤٨) قاموس الاعلام، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.

(٤٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ١٦٢.

(٥٠) بۆ زانیاریی لەم بارەیەوە بڕوانە بابەتی (باج و ڕەسم) لە هەمان ئەم لێکۆڵینەوەیەدا.

(٥١) هادي رشيد الجاوشلي، (المظاهر الإقتصادية في تراث منطقة كردستان)، معمل ومطبعة (الجاحظ)، بغداد، ١٩٨٧، الصفحات ٤٢-٤٣.

(٥٢) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحات ٢٩٩، ٣٠٢.

(٥٣) بڕوانە:

- فيصل محمد الأرحيم، المصدر السابق، الصفحات ٨١-٨٢.
- اسماعيل رسول، المصدر السابق، الصفحة ١٦.

(٥٤) بەراگواستن لە: د. بدرخان السندي، المصدر السابق، الصفحة ٤٩١.

(٥٥) قاموس الاعلام، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.

(٥٦) عەلی مەحمود محەمەد، (کەرکوك شاری قەڵا و ئاگر وخوێن)، چاپی یەکەم، چابخانەی (ئەرابخا)، کەرکوك، ٢٠٠٦، لاپەڕە ٨٩.

(٥٧) فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣٢.

(٥٨) گۆران ئیبراهیم ساڵح، (کەرکوك لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لەنێوان ساڵانی ١٨٧٦-١٩٠٩)، دەزگای چاپ و پەخشی (حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٧، لاپەڕەکانی ١٦٥-١٦٦.

(٥٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحات ٢٠٥-٢٠٦.

(٦٠) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٧.

(٦١) بڕوانە:

- د. کمال مەزهەر، (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی چینی کرێکاری کورد)، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە ٧٢، بەغدا، ١٩٧٩، لاپەڕەکانی ٩-١٠.
- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەو شتومەك و بەرهەمانەی کە لە ناوچە کوردییەکانەوە دەنێردرانە دەرەوە بڕوانە:
- د. سعدي عثمان حسين، (كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والإقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل)، مطبعة (سيما)، السليمانية، ٢٠٠٦، الصفحة ٢٧٣ ومابعدها.

(٦٢) بڕوانە:

- نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٧٤.
- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٦.

(٦٣) بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە بابەتی (باج و ڕەسم) لەم لێکۆڵینەوەیەدا.

(٦٤) ا.م.منتشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحه ٧٦.

(٦٥) سەعد بەشیر ئەسکەندەر، (سەرهەڵدان و ڕووخانی سیستەمی میرنشینی لە کوردستان)، وەرگێڕانی: جەوهەر کرمانج، چاپخانەی (دانان)، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەڕە ١٧٥.

(٦٦) بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: بابەتی :باج و رەسم: هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا.
(٦٧) ستيڤن هيمسلي لۆنگريك، (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث)، ترجمة: جعفر الخياط. بيروت. ٢٠٠٤. الصفحة ٢٩٤.
(٦٨) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ). الصفحة ٢٠٥.
(٦٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ). الصفحة ٣٠٠.
(٧٠) قاموس الاعلام، المصدر السابق. الصفحة ٣٨٤٦.
(٧١) فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو. لاپەرە ١٣٢.
(٧٢) وەرگیراوە لە: بدرخان سندي. المصدر السابق، الصفحة ٤٩٢.
(٧٣) محمد بن احمد الحسيني المنشيء البغدادي، (رحلة المنشيء البغدادي)، ترجمة عن الفارسية: المحامي عباس العزاوي، دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٠). الصفحة ٦٤.
(٧٤) ا. م. منتيشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحة ٩٣.
(٧٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٦.
(٧٦) بڕوانە:
- ا.م.منيشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحة ٩٣.
- كاميران عبد الصمد احمد الدوسكي، (كوردستان العثمانية في النصف الاول من القرن التاسع عشر)، الطبعة الاولى، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، الصفحات ٤٩-٥٠.
- نمير طه ياسين، (بدايات التحديث في العراق ١٨٦٩-١٩١٤)، جامعة المستنصرية، ١٩٨٤. الصفحات ٢٠-٢١.
(٧٧) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٧.
(٧٨) م.ن، الصفحات ٢٤٠-٢٤١.
(٧٩) رحلة نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨٦.
(٨٠) بڕوانە:
- اوليڤيه، (رحلة اوليڤيه إلى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦)، ترجمة: د. يوسف حبي، مطبعة (المجمع العلمي العراقي)، بغداد، ١٩٨٨، الصفحات ٦٨-٦٩.
- جيمس بكنغهام، المصدر السابق، الصفحة ١٤٣.
(٨١) Lyclama، voyage en Russia، an caucase eten persedans mesopotamie et lekurdistan، IV Tome، MD CCLXX. Tome I، S. ٧٩-٧٨.
نقلاً عن: كتاب كركوك مدينة القوميات المتآخية، الصفحة ٦٣١.
(٨٢) قاموس الاعلام، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.
(٨٣) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٧.
(٨٤) بڕوانە:
- نيبور، المصدر السابق، الصفحات ٨٣-٨٤.
- اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ١٥٨.
(٨٥) بڕوانە: سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٠.
(٨٦) بڕوانە: رحله اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ٦٧.
(٨٧) بڕوانە: رحلة نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨٦.
(٨٨) بڕوانە: سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٠.
(٨٩) نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨٦.
(٩٠) اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ١٥٨.
(٩١) نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨٣.
(٩٢) عبد الحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، (الأصول التاريخية للنفط العراقي)، مراجعة: د.صاحب ذهب، الجزء الاول، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٣، الصفحة ٧٦.
(٩٣) پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، (شاری کەرکوک لەنێوان ساڵانی ١٩١٧-١٩٢٦)، توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی (حەمدی)، سلێمانی، ٢٠٠٧)، لاپەرە ٨٥.
(٩٤) دانیال یەزگین، (نەوت و سیاسەتی نێودەوڵەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا)، وەرگێران: کەمال رشید شەریف، بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیرو هۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٣)، لاپەرەکانی ١٢-١٣.
(٩٥) عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، م.س، ص٩٣.
(٩٦) م.ن، الصفحات ٩٧-٩٨.
(٩٧) کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین (کامەران مەنتك)، (کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢)، چاپی یەکەم، چاپ و ئۆفێستی دەزگای (سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٠)، لاپەرەکانی ٦٠-٦١.
(٩٨) د. كمال مظهر أحمد، (كوردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى)، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، الطبعة الثانية، مطبعة (دار آفاق العربية للطباعة والنشر)، بغداد، ١٩٨٤)، الصفحة ٢٣١.
(٩٩) بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ململانێی نێوان وڵاتە زلهێزەکان بۆ بەدەستهێنانی نەوت لە کوردستاندا لە سەدەی بیستەمدا بڕوانە:
فوئاد حەمە خورشید، (کەرکوک لە بەڵگەنامەکاندا)، وەرگێران: نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، چاپی یەکەم، چاپخانەی (منارە)، هەولێر، ٢٠٠٧، لاپەرەکانی ١٠٧ دواتر.
(١٠٠) شمس الدين سامي، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.
(١٠١) (سالنامه ولايت بغداد ١٢٩٤هـ)، الصفحة ١٤١، نقلاً عن: د. عبد الفتاح علي البوتاني، المصدر السابق، الصفحة ١١٢.
(١٠٢) نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨٣.
(١٠٣) ج. اوتير، (رحلة إلى تركيا وبلاد فارس)، باريس، ١٧٤٨، الصفحه ١٥٠، نقلا عن: د.هلكوت حكيم، (كركوك في كتابات الرحالة الفرنسيين)، بحث ضمن كتاب: (كركوك مدينة القوميات المآخية)، الصفحة ١٤٣.
(١٠٤) Benjamin II، cinqueannees de voyages en Orlient، ١٨٥١-١٨٤٦، Paris، p.٧٩-٧٨.
(١٠٥) د. شاكر خصباك، (العراق الشمالي، دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية)، مطبعة (شفيق)، بغداد، ١٩٧٣م، الصفحة ٩١.
(١٠٦) عمر ياسين الجباري، (الاهمية التاريخية والجغرافية لمدينة كركوك واثرهما على القيم الانسانية السائدة بين ابنائها)، بحث ضمن كتاب: (كركوك مدينة القوميات المتآخية)، الصفحة ٦٩.

(١٠٧) کلۆدیوس جێمس ریچ، (گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠)، وەرگێڕان: محەمەد حەمە باقی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، لاپەڕە ١٤٢.
(١٠٨) قاموس الاعلام، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.
(١٠٩) بڕوانە:
- م.ن، الصفحه ٣٨٤٦.
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحات ٢٩٨-٢٩٩.
(١١٠) بكنغهام، المصدر السابق، الصفحة ١٤٤.
(١١١) المنشئ البغدادي، المصدر السابق، الصفحة ٥٠.
(١١٢) ستيفن لونگريك، المصدر السابق، الصفحة ١٥.
(١١٣) رحلة نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨١.
(١١٤) بڕوانە:
- بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٣٠-٣١.
- ستيفن لونگريك، نۆڵدە ١٥.
- نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٩١-٩٥.
(١١٥) بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە: کلۆدیوس جێمس ریچ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٣٠٤-٣٠٥.
(١١٦) بڕوانە:
- هـ. س، لاپەڕەکانی ٢٩٧-٣٠١.
- المنشيء البغدادي، المصدر السابق، الصفحة ٦٥.
(١١٧) محمد عبد الله عمر، (الامن القومي الكوردي للأراضي محافظة كركوك الزراعية)، مجلة (هاواری کەرکوك)، العدد ١، اربيل، ١٩٩٨، الصفحات ١٣٩-١٤٠.
(١١٨) ماجد عبدالرضا، (المسألة الكردية في العراق إلى ١٩٦١)، مطبعة (دار الجاحظ)، بغداد، ١٩٧٠، الصفحة ٢٦.
(١١٩) بڕوانە:
- د. عماد عبد السلام رؤوف، (الموصل في العهد العثماني، فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/١٧٢٦-١٨٣٤م)، مطبعة (الآداب)، النجف، ١٩٧٥، الصفحة ٢٩٨.
- د. عبد العزيز سليمان نوار، (تاريخ العراق الحديث، من نهاية حكم داود باشا إلى نهاية حكم مدحت باشا)، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٨)، الصفحة ٢٨٨.
(١٢٠) سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٥٧.
(١٢١) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ٢٠٦.
- (سالنامه ولايت موصل (١٣٢٥هـ)، الصفحة ٢١٤.
(١٢٢) رحلة نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٨١.
(١٢٣) سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٦١.
(١٢٤) کلۆدیوس جیمس ریچ، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٣٠٤-٣٠٥.
(١٢٥) (سالنامه ولايت موصل (١٣١٢هـ)، الصفحة ١٦١.
(١٢٦) سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٦١.
(١٢٧) رحلة المشرق، المصدر السابق، الصفحة ١٩٩.
(١٢٨) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٣٠٢.
- (سالنامه ولايت موصل (١٣٢٥هـ)، الصفحة ٢١٤.
(١٢٩) بڕوانە:
- لوتسكي، المصدر السابق، الصفحة ٢٣.
- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: بابەتەکانی (هۆزی هەمەوەندو دەوڵەتی عوسمانی)و (کێشەی نێوان هۆزەکان) لە بەرگی دووەم.
(١٣٠) بڕوانە:
- عبد ربه سكران الوائلي، (اكراد العراق ١٨٥١-١٩١٤، دراسة في التاريخ الإقتصادي والاجتماعي والسياسي)، جامعة القاهرة- كلية الآداب، ١٩٨٧، الصفحة ٦٠.
- بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکان ٨ و دواتر.
(١٣١) بارۆن ئێدوارد نوڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٤.
(١٣٢) هـ.س، لاپەڕە ٢٣ و دواتر.
(١٣٣) بارۆن ئێدوار دۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٠-٣١.
(١٣٤) طارق نافع الحمداني، (ملامح سياسية وحضارية في تاريخ العراق الحديث والمعاصر)، الطبعة الاولى، دار العربية للموسوعات، بيروت، ١٩٨٩، الصفحة ١٣٩.
(١٣٥) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٠.
(١٣٦) هـ.س، لاپەڕە ٢٠.
(١٣٧) جيمس بكنغهام، المصدر السابق، الصفحة ١٤٢.
(١٣٨) گەشتنامەی ریچ...، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٤٢.
(١٣٩) وەرگیراوە لە: بدرخان السندي، م. س، الصفحة ٤٩١.
(١٤٠) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٩.
(١٤١) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحات ٢٤١-٢٤٤.
(١٤٢) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحات ٢٩٨-٢٩٩.
- شمس الدين سامي، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.
(١٤٣) بڕوانە:
- ميجرسون، المصدر السابق، الجزء الاول، الصفحات ١٦٠، ١٧٥-١٧٦.
- ميجرسون، المصدر السابق، الجزء الثاني، الصفحات ١٠٨-١٠٩.
(١٤٤) د. سەعدی عوسمان، (گەشتی دکتۆر ئێڤز بە کوردستاندا)، وەرگێڕان و پەراوێز بۆ نووسین، گۆڤاری (مەتین)، ژمارە ١١٩، دهۆك، ٢٠٠١، لاپەڕە ١٣.
(١٤٥) The new Encyclopaedia Britannica، vol.v، USA ١٩٧٧، p.٨٣٤.
(١٤٦) بڕوانە: جيمس ريموند ولستيد، (رحلة إلى بغداد في عهد الوالي داود باشا)، ترجمة: سليم التكريتي، مطبعة (ثويني)، بغداد، ١٩٨٤، الصفحة ٩٨.
(١٤٧) بڕوانە:
- (سالنامة ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٩١.
- اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ١٧٠.
(١٤٨) رحلة نيبور...، المصدر السابق، الصفحة ٨٦.
(١٤٩) اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ١٥٨.
(١٥٠) م. ن، الصفحة ١٧٧.
(١٥١) م. ن، الصفحة ١٥٨.

(١٥٢) رحلة متنكر...، المصدر السابق، الصفحة ١٦٣.
(١٥٣) بڕوانە:
- ستيڤن لونگريك، المصدر السابق، الصفحات ٥٧-٥٨.
- ا. م. منتشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحات ٩٧-٩٨.
- عبد ربه سكران الوائلي، المصدر السابق، الصفحة ٦١.
(١٥٤) The Encyclopaedia of Islam، op. cit، vol.v، Art (Kirkuk)، p. ١٤٦.
(١٥٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٦.
(١٥٦) بڕوانە:
- د. ابراهيم خليل احمد، (الحياة الاجتماعية في ولاية الموصل)، مجلة (المؤرخ العربي)، العدد ٣٩، ١٩٨٩، الصفحة ٢٥.
- اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ٥١.
(١٥٧) ياسين افندي العمري ابن خيرالله الخطيب الموصلي، (زبدة الاثار الجلية في الحوادث الأرضية)، حققه وعلق عليه: د. عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة (الاداب)، النجف، ١٩٧٤، الصفحة ١٧.
(١٥٨) د. بدرخان السندي، المصدر السابق، الصفحة ٤٩٢.
(١٥٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ٢٠٦.
(١٦٠) بەپێی پێوانەی ئەو سەردەم یەك ئۆقیە یەكسانە بە (٢ كیلۆو ٥٦٦ گرام). بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: بابەتی(دراوو كێشان وپێوانە) هەر لەم لێكۆڵینەوەدا.
(١٦١) (سالنامه ولايت بغداد ١٢٩٤هـ)، الصفحه ٣٠٣، نقلاً عن: عبدالفتاح علي البوتاني، المصدر السابق، الصفحة ١١١.
(١٦٢) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣٢٥هـ)، الصفحة ٢١٤.
- (سالنامه ولايت موصل ١٣٣٠هـ)، الصفحة ٢٤٦.
(١٦٣) اوليڤيه، المصدر السابق، الصفحة ٦٢.
(١٦٤) بۆ زانیاری لە بارەی ئەم جۆرە دراوە بڕوانە: بابەتی (دراو وكێشانو پێوانە) هەر لەم لێكۆڵینەوەدا.
(١٦٥) كاميران عبد الصمد احمد الدوسكي، (بهدينان في اواخر العهد العثماني ١٨٧٦-١٩١٤)، الطبعة الاولى، مطبعة (خاني)، دهوك، ٢٠٠٧، الصفحة ٣٦١.
(١٦٦) سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٢.
(١٦٧) جيمس ولستيد، المصدر السابق، الصفحة ٩٨.
- سعدي عثمان، المصدر السابق، الصفحة ٣٨١.
(١٦٨) رحلة اوليڤيه...، المصدر السابق، الصفحة ١٧٠.
(١٦٩) م. ن، الصفحة ١٦٦.
(١٧٠) د. عبدالجبار قادر غفور، (اربيل في السالنامات العثمانية)، مجلة (كاروان)، العدد ٩١، ١٩٩٠، الصفحة ١٢٢.
(١٧١) رحلة نيبور...، المصدر السابق، الصفحة ٩١.
(١٧٢) گەشتنامەی ڕیچ...، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەكانی ١٤٢-١٤٣.
(١٧٣) جمال بابان، (سلێمانی شارە گەشاوەكەم)، بەرگی چوار، زنجیرەی كتێبی دەزگای چاپو پەخشی (سەردەم)، سلێمانی، ٢٠٠٢، لاپەرە ١١١.
(١٧٤) بڕوانە:
- (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحات ١٤٩-١٥٠.
- (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحات ٢٢٤-٢٢٥.
(١٧٥) مامۆستا جەعفەر، (شاری سلێمانی ململانێی گروپە كۆمەڵایەتییەكان ١٨٢٠-١٩٢٠)، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، ٢٠٠٦، لاپەرەكانی ١٦٦-١٦٧.
(١٧٦) گەشتنامەی ڕیچ...، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٢٧٨.
(١٧٧) ا. م. منتشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحة ٩٠.
(١٧٨) بڕوانە:
- عبد ربه سكران الوائلي، المصدر السابق، الصفحة ١٣٠.
- نمير طه ياسين، المصدر السابق، الصفحة ٢٢.
- د. كمال مظهر احمد، (كركوك وتوابعها، حكم التأريخ والضمير، دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق)، الجزء الاول، مطبعة (رينوين)، كوردستان، دون التاريخ. الصفحة ٥٧.
(١٧٩) كمال مظهر احمد، المصدر السابق، الصفحة ٥٧.
(١٨٠) د. طارق نافع الحمداني، المصدر السابق، الصفحة ١٣٨.
(١٨١) بڕوانە:
- د. جەلیل جەلیلی، (كوردەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی)، لاپەرە ٦٧.
- بۆ زانیاری لەبارەی هەندێ لەو باجە جۆراوجۆرانەی كە لە ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا وەرگیراون بڕوانە:
- عباس العزاوي، (تأريخ العراق بين احتلالين)، الجزء ٧، الصفحات ٢٧٨-٢٨٠.
- عباس العزاوي، (تأريخ الضرائب العراقية من صدر الاسلام إلى آخر العهد العثماني)، مطبعة شركة التجارة والطباعة، بغداد، ١٩٥٩، الصفحات ١١٣-١١٤.
(١٨٢) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(١٨٣) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(١٨٤) (سالنامه ولايت موصل١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(١٨٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(١٨٦) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(١٨٧) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(١٨٨) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(١٨٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(١٩٠) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(١٩١) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(١٩٢) (سالنامه ولايت موصل(١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(١٩٣) م.ن، الصفحة ٢٩٥.
(١٩٤) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(١٩٥) (سالنامه ولايت موصل (١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(١٩٦) جيمس بيللي فريزر، (رحلة فريزر إلى بغداد في ١٨٣٤)، ترجمة: جعفر الخياط، الطبعة الاولى، مطبعة (المعارف)، بغداد، ١٩٦٤، الصفحة ٧٢.
(١٩٧) لەم بارەیەوە بڕوانە: نيبور، المصدر السابق، الصفحة ٧٥.

(١٩٨) بارۆن ئێدوارد نۆڵدە، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ٣١.
(١٩٩) رحلة نيبور...، المصدر السابق، الصفحة ١٠١.
(٢٠٠) شمس الدين سامي، المصدر السابق، الصفحة ٣٨٤٦.
(٢٠١) لوتسكي، المصدر السابق، الصفحة ٢٢.
(٢٠٢) سەعد بەشیر ئەسکەندەر، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٧٥.
(٢٠٣) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(٢٠٤) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٢٠٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(٢٠٦) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(٢٠٧) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٢٠٨) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(٢٠٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(٢١٠) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٢١١) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(٢١٢) لە بارەی رژێمی ئیلتزامو کۆکردنەوەی باجەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا بڕوانە:
- د. علي سلطان، المصدر السابق، الصفحات ١٨٨ ومابعدها.
- أ. م. منتشاشفيلي، المصدر السابق، الصفحة ٧٣.
- احمد علي الصوفي، المصدر السابق، الصفحات ٢١٤-٢١٦.
(٢١٣) عماد احمد الجواهري، المصدر السابق، الصفحة ١٤٦.
(٢١٤) سليمان فائق بگ، (تأريخ بغداد)، ترجمة: موسى كاظم نورس، مطبعة (المعارف)، بغداد، ١٩٦٢، الصفحة ٧٨.
(٢١٥) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٨١.
(٢١٦) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ١٦٣.
(٢١٧) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٦.
(٢١٨) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٢١٩) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(٢٢٠) م. ن، الصفحة ٢٩٥.
(٢٢١) (سالنامەو ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٥.
(٢٢٢) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٧.
(٢٢٣) (سالنامه ولايت موصل ١٣١٠هـ)، الصفحة ١٥٤.
(٢٢٤) (سالنامه ولايت موصل ١٣٠٨هـ)، الصفحة ١٠٧.
(٢٢٥) بڕوانە:
(سالنامه ولايت موصل ١٣١٢هـ)، الصفحة ٢٩٦.
- هەروەها بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە سالنامەی (١٨٩٢ز) لاپەرە ١٥٥.
(٢٢٦) فيصل محمد الارحيم، المصدر السابق، الصفحات ١٧٦-١٧٧.
(٢٢٧) بڕوانە:
- غانم محمد علي، (النظام المالي العثماني في العراق ١٢٥٥-١٣٣٣هـ/١٨٣٩-١٩١٤م)، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة الموصل- كلية الآداب، الموصل، ١٩٨٩، الصفحات ١٦٥-١٦٦.
- ستيفن لونگريك، المصدر السابق، الصفحة ٥٧.
(٢٢٨) كاميران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، الصفحات ٥٤-٥٥.
(٢٢٩) عباس العزاوي، (تأريخ النقود العراقية لما بعد العهود العباسية من سنة ٦٥٦هـ/١٢٥٨م إلى سنة ١٣٣٥هـ/١٩١٧م)، طبع شركة التجارة والطباعة، بغداد، ١٩٥٨، الصفحات ١٤١-١٤٢.
(٢٣٠) غانم محمد علي، المصدر السابق، الصفحة ١٦٥.
(٢٣١) علي شاكر علي، (تأريخ العراق في العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠م، دراسة في احواله السياسية)، الطبعة الاولى، مطبعة اوفيست (الشعب)، نينوى، ١٩٨٥، الصفحة ٢٠٢.
(٢٣٢) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: عباس العزاوي، المصدر السابق، الصفحات ١٤٥، ١٥٢-١٥٣.
(٢٣٣) غانم محمد علي، المصدر السابق، الصفحة ١٧١.
(٢٣٤) بڕوانە:
- غانم محمد علي، المصدر السابق، الصفحة ١٦٥.
- خليل علي مراد، المصدر السابق، الصفحة ٤٤١.
(٢٣٥) بڕوانە:
- م. ن، الصفحة ١٨٦.
- علي شاكر علي، المصدر السابق، الصفحة ٢٠٣.
(٢٣٦) بڕوانە:
- غانم محمد علي، المصدر السابق، الصفحة ١٧٢.
- ستيفن لونگريك، المصدر السابق، الصفحة ٥٧.
(٢٣٧) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: عباس العزاوي، المصدر السابق، الصفحات ١٣٨ ومابعدها.
(٢٣٨) رحلة نيبور...، المصدر السابق، الصفحة ٧٧.
(٢٣٩) ستيفن لونگريك، المصدر السابق، الصفحة ٥٧.
(٢٤٠) م. ن، الصفحة ٥٧.
(٢٤١) بڕوانە:
- علي شاكر علي، (كركوك في العهد العثماني في القرنين الثامن العشر والتاسع عشر ملاحظات اولية)، بحث غير منشور بحوزة صاحبه.
- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە:
- علي شاكر علي، (ولاية الموصل في القرن السادس عشر دراسة في اوضاعها السياسية والادارية الإقتصادية)، جامعة الموصل- كلية الآداب، ١٩٩٢، الصفحة ٢٠٤.
- اوليفيه، المصدر السابق، الصفحة ٢٤.
(٢٤٢) علي شاكر علي، المصدر السابق.
(٢٤٣) فەرسەخ: وشەیەکی فارسیە، لە بنەرەتدا وشەکە (فرسنك)ە، ئەم پێوانەیە پێوانەیەکی کۆنەو لە لایەن ئێرانییەکانو سەردەمی ئیسلامیشدا بەکارهاتووە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ياقوت الحموي، م.س، ج١، ص٣٥).
(٢٤٤) فالترهنتس، (المكاييل والأوزان الاسلامية وما يعادلها في النظام المتري)، ترجمة: كامل العسلي، الطبعة الاولى، عمان، ١٩٧٠، الصفحة ٩٤.

*** تەوەری حەوتەم**

*** راپۆرتی کشتوکاڵی لە سەرەتای هاتنی ئینگیزەکان بۆ کەرکوک:**
وەرگێرانی: سەربەست کەرکوکی
کەمترین شت لە پرۆسەی بەرهەمی ساڵانەی کشتوکاڵیدا. کەمیی ئاژەڵی جووتکردن، ئامرازی کار- بابەتی ئاسن‌و تۆو و دەستی کار بووە. ئەمەی دووایییان. واتە دەستی کار، لە چوار وەرزەکەدا وردە وردە ژمارەیان زیادی کردووە. هەر چەندە وەك سەرژمێری ١٩٠٥ ئاماژەی کردووە. ژمارەی دانیشتووانی لادێ هێشتا هەر لە ٤٠٪ زیاتر نییە.
ئەمساڵ ژمارەیەك ئاژەڵی جووتکردن کڕراوە. لە بەغداوە لەلایەن جووتیارانەوە هێنراون. هەندێکیان لە خالس‌و مەندەلییەوە هێنراون، هەروەها حکوومەتیش لە هیندستانەوە (کەڵ)ی هێناوەو ئامادەی کردوون بۆ جووتیاران. لە کفری ٦٤ دانەو لە کەرکووك ١٦٠ دانەیان دابەش کراوە. چەندین جار، ئاسن‌و خاکەنازو گاسن لە بەغداوە هێنراون، بە مایەی خۆی فرۆشراون بە جووتیاران. بەداخەوە لەوە دەچێ کەمی ئاسن حاڵەتێکی گشتی بێ لە ناوچەکەدا. بۆ ئامادەکردنی قەرزی تۆوکرین بۆ جووتیاران، بەداخەوە لە ساڵی (١٩١٩)دا هەوڵێك نەدراوە، لەبەر دوو هۆ بووە:
– لەبەر گرانی گواستنەوە، نەدەکرا تۆو بهێنرێ، بەڵام ئێستا ئەو شتانە دەکرێ بە شەمەندەفەر بگوێزرێنەوە.
– بەری کارەکان (بەرهەمەکان) زۆر هاندەر نەبوون، چونکە بەپێی ئەو باروودۆخەی کە ئەو تۆوانە پێویستییان پێی هەبوو، شتێکی نوێ بۆ شارەزایی جووتیارەکان نامۆ بوون. ئەگەر بەرهەمەکان باش نەبن، دانەوەی قەرزەکان دەکەونە حاڵەتی مەترسی.
ئەم مەترسییە، بە روونی لە دانەوەی قەرزەکانی کفریدا لە ساڵی ١٩١٨ ئاشکرا بوو، مەبەست دانەوەی قەرزی گەنمەکەی ئەهوازە. ئەم ماندوێتییە سەربەسەری تێ چوو، بۆیە ناردنی پارە لەلایەن حکوومەتەوە لە بری ئەو قەرزانە تەنیا چارەسەرییەك بووە. ئەم قەرزە هەتا نووسینی ئەم راپۆرتە هێشتا بە تەواوەتی نەدراوەتەوە. هەرچۆنێ بێ لەوە دەچێ قەرزی ماڵی شیاوی جیاوازی هەبێ‌و بە ئاسانی وەربگیرێ. بۆ قەرزەکانی ساڵی (١٩١٨) هەندێکی زۆر کەمیان بەبێ چارەسەر ماوەتەوە.
ساڵی (١٩١٩) بری یەك لەك (واتە ١٠٠ هەزار رووپێ) ٣٥ هەزاری لە کفری‌و (٦٥)یش لە کەرکووك بۆ ئاسانکردنی کاروباری کشتوکاڵی خەرج کراوە[1].
کاروباری کشتوکاڵ لە ساڵەکەدا بە گشتی ئاسایی بووە. پەروەرشی کشتوکاڵی بەهارانە بە هەموو گوڕو تینییەکەوە کراوەو، دەبێ بەرهەمێکی چاکی میوەجاتی هاوینە بەرهەم بێنێ. باخەوانیی بەرهەمی زستانە، لە بەهارەوە تا ئێستا هەر بەردەوامە. تۆو چاندنی زستانە لەم پایزەدا ٢٥٪ کەمتر کراوەو، بە شێوازی ئاسایی خۆی ئامادە نەکراوە. جیاوازی بەرهەمی زەوی ئامادەکراو و هی ئامادەنەکراو، زۆر دیارو ئاشکرایەو، جیاوازییەکە لە ناوچەیەکەوە بۆ ئەوەی تر لەنێوان ٣٠٪ بۆ (٣٠٠٪)ە. کشتوکاڵی زستانە- دروست (٣٠٪)ی ئەو شوێنانەی گرتۆتەوە کە بە شێوازی کۆن تۆو چاندنیان تێدا کراوە، ئەمانە تا مانگی مارت مژدە دەر بوون، بەڵام بەداخەوە تووشی چوار دەردی چاوەڕواننەکراو بوون:
– نەبوونی باران بۆ ماوە ١٥ رۆژ لە مانگی ئازاردا.
– هەندێ لەو تۆو و دانەوێڵانەی کە لە دەرەوەرا هێنرابوون، تووشی ئافاتی کرمی سوور بوون.
– شەستە باران‌و تەرزەیەکی بەتاو بەرهەمی کشتوکاڵی ٥ گوندیان لەناوبرد.
– هەروەها سووتانی هەندێ خەڵەو خەرمان بە شێوازێکی چاوەڕواننەکراو، هەڵبەتە بە هەڵە یا بە دەستی ئەنقەستی دوژمنکارانە لە ناوچەکانی قەرەحەسەن‌و شوان.
بەڵام هەر چۆنێك بێ، رێژەی بەرهەمەکان مامناوەندی بوو. بەپێ بۆچوونی خەڵکانی ناوچەکە بەرهەمەکە زۆر کەمی کردووە، گوایە لە (١ بە ٧)ەوە بۆ (١ بە ٣) نزم بووەتەوە. بە بۆچوونی ئێمە، لەم زرووفەدا، ئەگەر (١ بە ٢)ش بوایە هەر باش دەبوو.
کشتوکاڵی هاوینە زۆر کەم بوو بەڵام لە رێژەی قاتیبووندا نەبوو. جۆرە نەخۆشییەك کەوتە ناو زۆربەی سەوزەوات. چەڵتووکی مەرەزەکان لەبەر بێ ئاوی، لە هەندێ شوێندا هەر بە سەوزی بەجێ هێڵران.
بە گشتی، دەبێ وا تەماشای ساڵەکە بکرێ کە ساڵێکی ئاساییەو، بکرێتە بنەمایەك بۆ هەر پلان‌و پرۆژەیەکی تازەی داهاتوو.
ناشتنی تەمامی میوەجات‌و دارخورما لەسەر زەوییە ئەمیرییەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی، گرنگی زۆری پێ دراوە، لەپاش گفتوگۆیەك لەناو ئەنجوومەنی ناوچەکە، پشتیوانی لێکرا. بەڵام لەوە دەچێ هیچ هەلومەرجێکی راستەقینەی نەبێ، ئەمەش دەبێ ببەسترێتەوە بە کێشەی ئاو، بە خەرجییەکی زۆری سەرەتای کارو هەروەها بە کەش‌و هەواو سەرماو سۆڵەی لەپڕی زستان.

*** ئاودێری:**
لەم بارەوە ئەم دەڤەرە، دەڤەرێکی بێ گرنگییە، هەروەك ئەوانەی عێراقە، بێ ئەندازە کەم ئاودێرە. ئاودێری‌و ئاوەڕۆ لابەلاکان، یا دابەشکراوەکان، تا دوا دڵۆپەی ئاو بەکاردەهێنرێن. لەم دەڤەرەدا کە دەڤەرێکی دێمییە، ئاو زۆر کەم‌و دەگمەنە، کاڵایەکی زۆر زۆر بە نرخە.
بەڵام مەسەلەی جۆگەلێدان‌و کێشەو بگرەو بەردەکانی پاش ئەم دروستکردنانە، کە هەر ئەو کێشانەن لە دێرزەمانەوە هەن، هەروەك خۆیان ماونەتەوە. لە راستیدا نابێ بگوترێ لە ساڵی (١٩١٩)دا هەنگاوی باش نراوە بۆ جۆگەو بنەمای ئاودێری دروستکردن. بۆ کێشەکانی پاش ئەوانەش، یا بەکەم وەرگیراوە، یا گوێی نەدراوەتێ. ئەو ناوچانەی کە دەشێ مەسەلەی ئاودێرییان گرنگ بێ، دوو ناوچەن، یەکەمیان ناوچەی حەویجەو، دووەمیان زەوییەکانی کفری‌و قەرەتەپەیە، کە بە زەوی (سانیە) ناسراون.
هەزاران کیلۆمەتری دووجا بەرەو خوارووی کەناری چەپی

زێی بچووك، زەوی بە پیتە کە لە کاتی خەلیفەدا (مەبەستمان کاتی دەوڵەتی عووسمانییە -وەرگێر) کێڵراوەو ئاودێریی تێدا هەبووە، ئەمڕۆکە بەیارێکی وشكو برنگە. بەشێکی زۆر لە بناغەکانی ئەو جۆگە کۆنانە ماون، بەڵام شوێنە بەرزەکانی و دەربەندی جۆگەکان ئێستا بەکار نایەن، چونکە ڕێرەوی (زاب) تا ڕادەیەکی لەبەرچاو کەوتووەتە قوڵاییەوە. دەبێ کارێکی ئاسان بێ دەروازەی نوێ بنیات بنرێ و کەناڵە کۆنەکان پاك بکرێنەوە، تا ناوچەکانی حەویجە ئاودێرییان پێ بکات. بەڵام ئەم کارە ئاسانە، خەرجی زۆرە. لەوانەیە خەرجییەکەی، با بڵێن ٣٠٠ هەزار تا ٥٠٠ هەزار پاوەندی بوێ، تا بگاتە ئەو ئاستو ڕادەیەی کە سوودی هەبێ بۆ ٦٤ هەزار جووتیار. لەوەش دەچێ هەمان برە پارەی بووێ بۆ کڕینی مەکینەو ئامرازی کشتوکاڵ[٣]. ئەمە دەکرێ بەوە مسۆگەر بکرێ کە عەشیرەتە ڕەوەندەکانی ناوچەکە، جێنشین بکرێن یا (فەلاحین)ی ناوچەکانی تر هان بدرێن بۆ هاتن، یا بەبێ چاوەڕوانی کوردە ئێرانییەکان بانگ بکرێن، تا بێن بۆ ناوچەکە[٣]. ئەگەر نا ئەم بیرۆکەیە هەر هیچ نەبێ، دەکرێ هەڵبگیرێ و ساڵانە لێی بکۆڵرێتەوەو سەرنجی تازەی بدرێتێ.

لەوێ، هەر لەو ماوەیەدا، هەندێ وردە کار کراوەو جۆگەیەکی بچووکی ١٠ کیلۆمەتری پاكو فراوان کراوە. خەرجی ئەم کارە خەرجییەکی گەورەی نا حکوومی بووە. ئەم پرۆژەیە لەلایەن ئەو چوار ئەندازیاری ئاودێرییەوە کە ئەمساڵ سەردانی کەرکووکیان کردووە، تەماشا کراوە.

لە ناوچەی کفری جۆگە درێژەکەی (سانیە) کە بابەتی ڕاپۆرتێکی جیاوازی درێژە، پێویستی بە چاودێریی ساڵانە هەیە. ئێستا ئاوی کەمتر دەدات لەوەی کە ١٠ ساڵ پێشتر دەیدا. مەبەست ئەو کاتەیە کە مرۆڤ دەیتوانی لە دیالەوە بە (کەلەك) بگاتە قەرەتەپە، زەوییەکانی (Bazaiz) کە جاران شینو پڕ ژیان بوون، ئێستا وشكو دێمین. چاککردنەوەو فراوانکردنەوەی ئەم جۆگەیە، نزیکەی ٨,٠٠٠ ڕووپیی لە بەهاردا بۆ خەرج کراوە. هەر لە ئێستاوە بیر لەوە کراوەتەوە کە خەرجی گەورە تەرخان بکرێ، بۆ ئەوەی دەروازەی پێنج جۆگەی هەرە گەورە، چاكو فراوان بکرێتەوە. ئەم کارانە لە ساڵی داهاتوو دەست پێ دەکات[٤].

* داهات:

* داهاتی زەوی:

(أ) تا سەرەتای ساڵی (١٩١٩) کۆکردنەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی (هاوینە) هەر بەردەوام بوو. لە ناوچەی کەرکووك، برنج، گەنمەشامی (شامداری)، هەرزن (کزن) دروێنە کراون، لەو عەمبارانەدا هەڵگیراون کە لە کەرکووك، مەلحە، ئاڵتوون کۆپری، تاووق، پاشان لە شوان دروست کراون. دانەوێڵەکان بە شێوەیەك دروێنەکراون، کە بەشێکی دراوە بە سوپا، بەشێکی بە هاووڵاتیان فرۆشراون، بەشەکەی تریشی بۆ ئالفی ئەسپی جەندرمەکان بەکارهێنراون[٥].

شایانی باسە، ئەوەی ماوەتەوە لە بەرهەمی هاوینە، بە مۆڵی (کاش) باجەکەی وەرگیراوە. دواکەوتنی ئێمە بۆ چوونە ناو شوێنەکانی دەڤەرەکەو نارێکی بەڕێوەبەرێتیمان، بوونە هۆی بەپەلە خەملاندنو بەفیڕۆدانو بەزایەچوونی کارێکی زۆری بێ بەرهەم لە بەش (شوعبە)کاندا. هەر چۆنێك بێ، بەرهەمی هاوینەی ساڵی (١٩١٨) بۆ ئێمە بێ ئەندازە زەرەرو بە فیڕۆدان بووەو بەس، هەروەها هەندێ بەرهەمی کشتوکاڵ وەك پێویست نەهاتنە دروێنەکردن.

بەپێی بڕیارەکان، زۆربەی داهاتی زستانی ساڵی (١٩١٩) دەبوو بە مۆڵی وەرگیرێ. داهاتی مانگی ئاپارو نیسان، مەزەندە کراوە. لەو کارانەی کە پێویستە جێبەجێ بکرێن، ڕاپۆرتێکی تەواوی ئەم بابەتەیە، کە دەبێ ڕەوانەی لای سکرتێر (وەزیر)ی داهاتو باج بکرێ. ڕێژەی تەحویلکردنی باج بەم شێوەیە دەستنیشان کراوە، بۆ گەنم ٣٠٠ ڕووپێ، بۆ جۆ ٢٠٠ ڕووپێ و، دانەوێڵەکانی تری زستانە نزیك بە هەمان ڕێژەو، بەڵام هەندێ کەمتر لە نرخی فرۆشتنی ناو بازار.

مەسەلەی باجی (kochans)[*]، کە کەمێك دواخرا، بەهۆی دواخستنی دانانی نرخی تەحویلکردن، لە کۆتایی مانگی حوزەیراندا تەواوکرا. پێش ئەمە، پێداویستەکانی کاروباری سەربازی بوو بەهۆی ئەوەی کە بە باش بزانرێ باجی بەرهەمی جۆ، بۆ بەکارهێنانی سەربازی، هەر بە کاڵا وەربگیرێ. هەروەها دەبێ بڵێین، لە ناوچەی کەرکووك لە کۆی ٧ بەش (شوعبە)، دوو بەشو نیو گەمارۆی خراپە سەر. بەڵام ئەم جۆرە دەستکارییە لە ناوچەی کفری نەکرا. چەندین عەمبار لە ئاڵتوون کۆپری و کەرکووك دامەزرێنران، لە ئاڵتوون کۆپری ٣٣ تەن کۆکرایەوەو، لەلایەن عەسکەرەوە دەستی بەسەردا گیرا، لە کەرکووك ٢١٥ تەن کۆکرایەوە. ئەو پارانەی کە کۆکراونەتەوە، لەم خشتەیەدا دەردەکەون:

تێبینی:

ئەو باجانە ناگرێتەوە کە بە کاڵا وەرگیراون، سەهەموو ئەو باجانە دەگرێتەوە کە بە مۆڵی و بە بە کاڵا وەرگیراون.

| ناوچە | کەرکووك | کفری | دەڤەرەکە |
| --- | --- | --- | --- |
| جۆری دانەوێڵە | گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر | گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر | گەنم، جۆ، دانەوێڵەی تر |
| داواکراو: ڕووپێ | ١,٢٧,٨٣١١٣ | [*]١,٤٩,٧٠٠ | ٢,٧٧,٥٣١١٣ |
| وەرگیراو تا ١٩١٩/١٢/٣١: ڕووپێ | ١,٢٣,٧١٠٦٠ | ١,٤٨,٧٢٩٦٠ | ٢,٧٢٤٣٩١٢ |
| پارەی دواخراو: ڕووپێ | ٣,٦٤٧١٢ | ٩٧٠١٠ | ٤,٦١٨٩٠ |
| پارەی ماوەکە ١٩٢٠/١/١ دەدرێ | ٤٧٣٨٠ | - | ٤٧٣٨٠ |
| بودجە: ڕووپێ | ١٥٠,٠٠٠ | ٦٠,٧٠٠ | ٢١٠,٧٠٠ |

دەکرێ نرخی گشتی ئەو باجانەی کە بە شێوەی کالا لە بەرهەمی زستانە وەرگیراون، بە بڕی ٥٠,٢٠٠٠٠ ڕووپێ مەزەندە بکرێ. بە مۆڵی بڕی ٢٢٧,٥٣١١٣ ڕووپێ کۆکراوەتەوە، واتە بە گشتی ٣٢٦,٧٣١١٣ ڕووپێ کێشە کۆکراوەتەوە.

بەرهەمی هاوینە دڵخۆشکەر نەبوو، باخەوانە کەساسەکان هەموو ئەوەیان باس کردووە کە بەرهەمی ئەمساڵیان هیچ خێرێکی تێدا نەبووە. بۆ داهاتی باج پەنا بردرایە بەر مەزەندەو قەبڵاندن، لەناو (جبوور)دا بۆ هەر کێڵگەیەك بڕی ٤٠ ڕووپێ قەبڵێنراوە. لە شوێنە تێکەڵەکانی تورکدا هەر ٩ کەویچ هەرزن، چوار مەجیدیو نیوەی بۆ قەبڵێنراوە.

بەراوەکان بە سێ شێوە قەبڵێنراون، بە مەزەندە، بە حیسابی خاکەناز– هەر خاکەنازو بڕێ پارە، کە ٥ یان ٦ ڕووپێیە بۆ هەر خاکەنازێك کە لەسەر جێوە یا لە بێستانێکدا بەکاردێ، یاخود بەشێوەی ژمارەی ئەو چاڵانەی کە لەناو زیخەڵانو چەوڵگەکاندا هەڵکەندراونو سەوزییان تێدا ڕوواوە، بە گشتی ٥ ڕووپێ بۆ هەر ١٠٠ دانە چاڵ دانراوە.

سەبارەت بەم بابەتە، ئەو سیاسەتە بەکارهێنرا کە خەڵکەکە لەوەوپێش پێی ڕاهاتبوو، هەر ئەوەندە گۆڕا کە بەدڵی پیاوماقووڵان نەبوو، چونکە ئەو بڕە پارانە کە بە شێوەیەك دەشکێنراون کەمییەك قەبڵێنراون، لەچاو ئەوەدا کە ئەفەندییە توورکەکان وەریان دەگرت، زۆر کەمن. لەوە دەچێ قەبڵاندنەکانی ئێمە بە گرنگ وەرگیرابن، بەڵام کارمەندانی باج وەرگرتنو قۆڵچییەکان هەندێ دەستکارییان کردووە. لە ناوچەی کەرکوك، تەنیا یەك مەزەندەلێدەرو تەخمینکاری دەرەکی خەریکی کار بوو، لە کفری دوو کەس دژ بەو پارە تەخمینکراوانە بوون، بە ئارەزووی خۆیان تەخمینی باجیان کردووە. پێویستی بەوە کردووە بۆ پشکنین کۆمیتەی دووەم ڕەوانە بکرێ بۆ ئەو شوێنانە. ئەم حاڵەتە بە تایبەت لە شوعبەی ئاڵتوون کۆپری ڕووی دا، لە ئەنجامدا کارمەندی تەخمینکردنەکە خانەنشین کرا. لە (قەرەتەپە) لە وەرگرتنی باجدا، هەڵسو کەوتی نارێك ڕووی دابوو. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە لێپرسراوی کارەکە دەربکرێ.

خشتەی داهاتوو، باری ئێستای داهاتو باجی هاوینە پیشان دەدات:

تێبینی:

تێبینیو بۆچوونە گشتییەکان، سەربارەت بە بەرهەمی کشتوکاڵی زستانە ١٩٢٠، لەژێر ناونیشانی (کشتوکاڵ)دا دەرکەوتوون.

| ناوچە | کەرکووك | کفری | دەفەرەکە بە گشتی |
|---|---|---|---|
| جۆری داهات | برنجو دانەوێڵەی تر | برنجو دانەوێڵەی تر | برنجو دانەوێڵەی تر |
| داواکراو تا ١٩١٩/١٢/٣١ | ٣٢,٧٤٢٠٥ | ٢٥,٤٤٢٠٧ | ٥٨,١٨٤١٢ |
| وەرگیراو تا ١٩١٩/١٢/٣١ | ١٢,٧٥٨١٥ | ٢٥,٤٤٢٧٠ | ٣٨,١٠١٠٦ |
| دواخراو- ڕووپێ | ٧١٢٠٨ | – | ٧١٢٠٨ |
| باجی ماوە تا ١٩٢٠/١/١ | ١٩,٣٧٠١٤ | – | ١٩,٣٧٠١٤ |
| بودجە: ڕووپێ | ٢٠,٠٠٠ | ٩٤,٥٨٠ | ١,١٤,٥٨٠ |

*** باجی مەڕوماڵات (کۆدە):**

(ب) ئەمەی خوارەوە بابەتی ڕاپۆرتێکی جیاوازی مانگی ئابە. ئەو ژمارانەی کە لەم خشتەیەدان، لەوانەیە دووبارەبوونەوە بن:

تێبینییەکان:

هەندێ لەم باجە هی ساڵی ١٩١٨– ١٩١٩ یە:

| ناوچە | کەرکوك | کفری | سەرجەم |
|---|---|---|---|
| باجە داواکراوەکان | ٦٧,٦٨٨٠٠ | ٥٤,٦٢٨٠٠ | ١,٣١,٣١٦٠٠ |
| باجی دواخراو ڕووپێ | ٢,١٠٢٠٨ | – | ٢,١٠٢٠٨ |
| باجی وەرگیراو تا ١٩١٩/١٢/٣١ | ٧٤,٤٤١٣١ | ٥٤,٦٢٨٠٠ | ١,٢٩,٠٧١١٣ |
| باجی ماوە لە ١٩٢٠/١/١٣ دا | ١٥,١١١ | – | ١٥,١١١ |
| بودجە: ڕووپێ | ١٠٠,٥٠٠ | ٥٣,٠٠٠ | ١,٥٣,٥٠٠ |

ئەم پڕە کەمەی باجی مەڕوماڵات، بەهۆی هاتووچۆی عەشایری عەرەبەوە بوو، کە بە زۆری وشترو مەڕەکانیان لە پەرداختکردنی باج دەرباز کردووە. سکرتێری دارایی ئەوەی بۆ ساڵی ١٩٢٠ پێشنیار کردووە کە دەبێ بڕی پارەی باجی مەڕوماڵات بۆ هەر عەشیرەتێك وەك (ئیلتیزام) دەستنشان بکرێ، ئەگەر لیوا ئەو باجە لە (مولتەزیم)ی عەشیرەتەکە وەربگرێ[٦]. بەگوێرەی عەشیرەتە کوردەکان، ڕێگەچارەیەك بدۆزێتەوە کە شێخە ڕەسمییەکان (Official Shaikhs) هان بدرێن بۆ بایەخدان بەم مەسەلەیە، بۆ ئەوەی وەك بودجەی حیساباتی ١٩١٩ ڕێك بێ[٧].

* وردە داهات:[8]

(پ) حکوومەت بۆ ئەو بەرهەمانەی کە داهاتیان کەم‌و وەرگیرانی باجیان گران‌و زەحمەت بووە، دوای دەیەکی کردووە. بۆیە ئەم باجە بۆ ماوەی دوانزە مانگ بە ئیلتیزام جێبەجێ کراوە. لە ڕاستیدا نارێکی‌و نامۆیی کاری تورکەکان لەم مەسەلەیەدا، کە هەمیشە هۆیە ڕاستەقینەکانی شاردراوە بوون. هەرگیز هاوشێوازی سیستەم‌و لە یەکچوونی چەندایەتی باج لە ناوچەکاندا نەبووە. ئەگەر مرۆڤ بڕوانێتە نەخشەی ئەو ناوچانەی دەیەکیان بۆ دانراوە، ئەو حاڵەتانەی بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێ.

ئێستا لە کەرکووك باجی ئەم شتانەی خوارەوە بە ئیلتیزام وەردەگیرێن: تفر، بارەدار، داری سووتاندن، تۆزی جلوبەرگ سپیکردن، گەچ، بەرووو دوو جۆر لە گوڵ‌و گیای خوم دروستکردن[9]. لە ئاڵتوون کۆپری، بارەدار، پێستەی دروستکردنی کەڵەك، لە تاووق دار، لە کفری گوێزی عەرەب‌و تۆزی جلوبەرگ سپیکردن، زۆربەی ئەم شتانە کەمن، بەڵام بەگشتی ئەو سەرئێشەیە دەهێنن، و خەڵکەکەش ڕاهاتوون‌و پێی قەڵس‌و توورە نین. لەکاتی نووسینی ئەم ڕاپۆرتەدا ناوەندی ئەم مەتریالانە، هەموو بۆ باجی ساڵی ١٩٢٠-١٩٢١ ڕاگەیەنراون.

لەمانە زیاتر، چاڵە نەوتەکانی دەڤەرەکە، باجیان لێ دەکەوێتەوە. ئەو چاڵانە کە لە دووری ٤ میلی باکووری ڕۆژئاوای کەرکووکن، بەپێی کۆنە بەڵگەی نووسراوی عوسمانی، دراوە بە بنەماڵەی نەوتچی‌و، حکوومەت خۆشحاڵە بەوەی کە باجی دەیەکی لە نەوت دەرهێنراو یەکراست وەردەگرێ. ئەم باجە لە ساڵی (١٩١٩)دا بری ٣٧٣,٣٦٠ ڕووپێ بووە[10]. پێش ئەوەی هەر گۆڕانکاری‌و هەر ڕێکخستنێك دابنرێ بۆ کۆکردنەوەی باجی بابەتە، لەوە دەچێ هەندێ زانیاری ناوچەیی‌و تاقیکردنەوەی پێویست هەبووبێ.

چاڵەکانی (گل) لە ناوچەکانی عەشایری ژێر دەسەڵاتی شێخ حەمیدن، هەتا مانگی ئازار بۆ خۆی بەجێ هێڵران، تا بەپێی ئارەزووی خۆی کاریان تێدا بکات‌و لە بەشی پێداویستییەکانی لەشکر بەرهەمی ئەو چاڵانە بدات. بە بەراوردکردن لەگەڵ باجی چاڵەکانی ناوچەکانی ترداو بۆ ئەوەی لە ئاکامدا لەدەست نەچێ، مانگی ئازار تەگبیرو ڕێکخستنێك کران. بەو پێیە دەبێ ئەوە بەردەوام بێ لە بەکارهێنانی چاڵە نەوتەکانیداو، هەر مانگێکیش بری ٥٠٠ ڕووپێ بداتە حکوومەت. هەرچەندە مەرجەکانمان ئاسان بوون، بەڵام تایبەتمەندی ناوچەکەو هەندێ کێشەی عەمەلی‌و پێویستییەکانی کارەکە. ئەم ڕێکخستن‌و تەگبیرەیان بە کارێکی زۆر شیاوو بەجێ دانا. لەوانەشە ئەم تەگبیرو پلانە تازە بکرێتەوە.

ساڵی ١٩١٩ ئەم چاڵانە نزیکەی ٣٠٠٠ ڕووپێ داهاتیان هەبوو، بەڵام ئەو چاڵانەی بە حەوت میل لە خوارووی (دووز)ەوەن، یەکراست لەلایەن فەرمانبەرانی پارەتیدەری حاکمی سیاسی کفرییەوە بەڕێوەچوون. لە ساڵەکەدا بەرەو پێشەوەچوون‌و گەشەسەندن بە ئاشکرا لەم بوارەدا هەبووە.

ئێستا ١٣ پیاوو ١٩ کەرو بارمان لەوێ کار دەکەن‌و، نەوتەکەشی بە بەردەوامی پارەیەکی باش دەهێنێ، کە لەوانەیە گەیشتنی هێڵی شەمەندەفەر کاریگەریی هەبێ بۆ نرخەکەی. سەرجەمی قازانجی ئەمساڵ لەم کەرەستەیە، ٤٣,٩٨٧ ڕووپێیە. گۆڕینی لێپرسراوی کار لە مانگی کانوونی یەکەمدا، دەشێ هەندێ گرنگی زیاتر بخاتە سەر بەرژەوەندییەکانمان. لەم بوارەدا ئەوە ئاشکرا بووە کە کاری سەرپەرشتیی یەکراست، بەرهەمی زیاتر دەبێ. باجی وەرگیراوی نەوت لە ساڵەکەدا بەگشتی ٤١٧,١٩٦٠ ڕووپێیە.

* داهاتی قەرزەکانی دەوڵەتی عوسمانی:

(ت) ئەم باجانە لەناو کفری لەلایەن کارمەندانی باجەوە کۆکراونەتەوە. لە کەرکووك لە هەمان کۆنە شوێنی دائیرەی باجی عوسمانی، بە هەمان فەرمانبەرانی کۆنە بەڕێوەبەرێتی جیاواز دانرا. فەرمانبەرانی باج وەرگرتن کارەکانی خۆیان لە بەڕێوەبەرێتییەکی دوورەدەستی لاچەپدا جێبەجێ دەکەن.

باجی عەرەق‌و مەشرووب لە قەرەتەپەو کفری بە مەزەندە وەرگیراوە، لە (توون) هەر بە ڕێژەی ساڵی ١٩١٧ وەرگیراوەو هەروەك خۆی ماوەتەوە.

لە کەرکووك باجەکان ڕاستەوخۆ و یەکسەر، لەکەسانی قەرزار وەرگیراوەکان، بێگومان ئەم شێوازە بە (ئیلتیزام)ە داهاتی باج زیاتر ناکات. باجە وەرگیراوەکان، لە خوارەوە بە شێوازی خشتەیەك نیشان دراون. داهاتی مۆڵەتی ماسیگری‌و ڕاوکردن‌و تووتن فرۆشتن، ڕاستەوخۆ دەرکراوەو وەرگیراوە، بەڵام کۆی باجەکانیان زۆر کەمە[11]. سیستەمی باجی پوولی پۆستە، لە یەکەم ڕۆژی کانوونی یەکەمەوە خرایە کار. تەنیا لە مانگێکدا لە کەرکووك ٤٣٢,١٠ ڕووپێ‌و لە کفری ١٥٠ ڕووپێ داهاتی ئەم باجە بووە. کۆی داهاتەکە ٥٨٢,١٠ ڕووپێ بووە.

خۆی لە دەڤەرەکەدا باشترین داهاتی هەبووە. حەوزی خۆی لە کفری بە ٣٧٣,٠٠٠ ڕووپێ بەکرێ دراوە، لە ناوچەی حەویجە بە ٤٠٠,٠٠ ڕووپێ. لەم ناوچەیەی دواییدا بە زەرووری زانرا، لەبەر کاروبارو دۆخی نائاسایی گواستنەوە کە ڕاستەوخۆ بەهۆی بەکارهێنانی سەربازییەوە دروست ببوو، نزیکەی ٨٠,٠٠ ڕووپێ کەم بکرێتەوە.

خشتەی خوارەوە داهاتەکانی ئەم بابەتە لە ساڵی ١٩١٩دا پیشان دەدات:

| ناوچە | کەرکووك | کفری | دەڤەرەکە |
|---|---|---|---|
| خوێ | ٢٠,١٧٠٠ | ٢٢,٧٤٥١٢ | ٤٢,٩١٥١٢ |
| عەرق | ١٥,٩٨٩,١٠ | ٤,٧٣٠,٠ | ٢٠,٣٥٩,١٠ |
| تووتن و تونباك | ٦٨,١٢ | ١٨١,٧ | (٢٥٠,٣) |
| مەشرووب | ٣٨٢,١٣ | – | ٣٨٢,١٣ |
| پوولی و پۆست | ٤٣٢,١٠ | ١٥٠,٠٠ | ٥٨٢,١٠ |
| راوی تر | ٢٧٥,٨ | – | ٢٧٥,٨ |
| راوە ماسی | ٣٢٤,٤ | ١٥٠,٠ | ٤٧٤,٤ |
| سەرجەم | ٣٧,٦٤٣٩ | ٢٧,٥٩٧٣ | ٦٥,٢٤٠١٢ |

*** گومرگ:**

بەڕێوەبەرێتی گومرگی دەڤەرەکەدا، جگە لە کاروباری پاسەگەکانی پشکنینی تووتن و هەندێ کاڵای تر، کە لە کوردستانەوە بەرەو بەغدا رەت دەکرێن، بایەخێکی ئەوتۆی نیە[١٢]. دائیرەی گومرگی لە ئاڵتوون کۆپری و کەرکووك و کفری هەن. یەکەمیان مامەڵە لەگەڵ قاچاخی کەڵەك و ئەو کاڵاو کەرەستانەی کە لە ناوچەی سلێمانییەوە دەهێنرێن بۆ مووسڵ، دەکات. پاشان بۆ زەمانەتی زیاتر کۆنترۆڵکردنی ئەم دائیرەیە دراوە بە حاکمی سیاسی ئەربیل.

لە کەرکوکەوە، کاڵاو کەرەستەیەکی زۆری سلێمانی و ئێرانی بەرەو عێراق دەبرێن. کفری دائیرەی گومرگی خۆی هەیە. هەرسێ دائیرەکە، هێڵێکی ناوخۆیی لە خانەقینەوە بەرەو ئەربیل پێك دەهێنن. لە ساڵەکەدا فەرمانبەرانی گومرگ، هەروەك خۆیان ماونەتەوە. خاڵبەندییەکانی پارەی وەرگیراوی ئەم بوارە کراونەتەوە بە پاشکۆ:

( پارەکان بە رووپێن )

| کەرەستەکان | کەرکووك | ئاڵتوون کۆپری | کفری | گشتی |
|---|---|---|---|---|
| تووتن | ١٥,٦٧٦٠٠ | ٢,٩٥٥,٠٠ | ٦,٧١٨,١٥ | ٢٥,٣٤٩,١٥ |
| بنێشت | ٢٣٩,١٤ | – | – | ٢٣٩,١٤ |
| بەڕوو | ١٤,١٠ | ٣٧٦,٤٠ | – | ٣٩٠,٥٠ |
| بۆیە | ٢٤٨,٩٠ | – | – | ٢٤٨,٩٠ |
| کاغەزی سیگار | ٣٥٢,٥٠ | ١٠٤,٣٠ | – | ٤٥٦,٨٠ |
| فەرش | ٩٨٦,٠٠ | ٤٥,٩٠ | – | ١,٠٣١,٩٠ |
| قوماشی کشمیری | ٣٣,٤٠ | ٣٩,١٢٠ | – | ٧٣,٠٠ |
| پێست | ٦,٤٠ | – | – | ٦,٤٠ |
| وردەواڵەی ئاسن | ٥٧٩,٠٠ | ١١٤,٠٠ | ٨٢٦,٠٠ | ١,٥١٩,٠٠ |
| فرۆشتنی کاڵای زەوتکراو | ١٦٢,٨٠ | – | ١,٨٩٢,٤٠ | ٢,٠٥٤,١٢ |
| تونباك | ١٠١,٠٠ | – | – | ١٠١,٠٠ |
| خەنە | ٢٠٠,٦٠ | ٢٤,١٢٠ | – | ٢٢٥,٢٠ |
| چینی | ٣٧,٤٠ | ٤,٤٠ | – | ٤١,٨٠ |
| کەرەستە و کاڵای تر | – | ٤٥,٠٠ | ٢٩٧,٦٠ | ٣٣٨,٦٠ |
| بە کرێدانی عەمبار | ١٥١,٩٠ | – | – | ١٥١,٩٠ |
| سەرجەم | ١٨,٧٨٨,٠٠ | ٣,٦٠٨,١٢٠ | ٩,٧٣٠,٩٠ | ٣٢,١٢٧,٥٠ |

*** پوختەی داهاتەکانی باج:[١٣]**

(ج) لەوانەیە باشتر بێ تێکرای داهاتەکانی ساڵی ١٩١٩ لە دەڤەرەکەدا، لە خشتەیەکدا پیشان بدرێ، (هەرچەندە ناتوانرێ بە شێوەیەکی کامڵ و بێ کەم و کەسر بەهاکانی ناو دەفتەری حیسابات نیشان بدرێن):

| ناوچەکان | کەرکووك | کفری | دەڤەرەکە بە گشتی |
|---|---|---|---|
| داهاتی زەوی | ٢,٥٦,١٨٤٠ | ٢,٥٢,٩٢٦٠ | ٥,٠٩,١١٠ |
| مەڕومالات | ٧٤,٤٣٣,١٣ | ٥٤,٦٢٨,٠ | ١,٢٩,٠٦١١٣ |
| داهاتی بچووك و شتی تر | ٣١,٦٠٩,٨ | ٨١,٣٥٢,١١ | ١,١٢,٩٦٢٦ |
| قەرزی گشتی | ٣٧,٦٤٣,٩ | ٢٧,٥٩٧,٣ | ٦٥,٢٤٠,١٢ |
| گومرگ | ٢٢,٣٩٦,١١ | ٩,٧٣٠,٩ | ٣٢,١٢٧,٤ |
| جەزاو شتی تر | ١٨,٥٩٣,٨ | ١٤,٠٤٩,٠ | ٣٢,٦٤٢,٨ |
| سەرجەم | ٤٤٠,٨٦١,١ | ٤٤٠,٣٨٣,١٠ | ٨,٨١,١٤٤١١ |

ئەم برە پارەیە کە (٨٨١,١٤٤,١١) ڕووپێیە، داهاتی لیستی دادگاو دائیرەکانی تێدا نییە[١٤]. ئەمە بەرهەمی یەکەم سالی کارکردنە، هی سالێکی بێ برەو و کەم داهاتە، سالی ١٩٢٠ داهات دەبێ لە ٣٠٪ تا ٧٠٪ زیاد بکات.

| ژ | سەرچاوەی داهاتەکان | ڕووپێ |
|---|---|---|
| ١ | باجی زەوی، کشتوکالو مەڕومالات | ١٩٨,٢٧,٢٩٠ |
| ٢ | گومرگ | ٢٢٠,٢٤,٠٠٠ |
| ٣ | دادگاکان | ٥٠٠,٠٠٠ |
| ٤ | داهاتی تەندروستیو پاکوتەمیزی | ٣٥٠٠٠,٠٠ |
| ٥ | پەروەردەو مەعاریف | ١٨٢,٠٠ |
| ٦ | پۆست | ٣٢,٧٥٦,٥٠ |
| ٧ | تەلەفۆنو تەلەگراف | ٢٠,٧٤٥,٠٠ |
| ٨ | بەندیخانەکان | ٢,٨٤٢,٠٠ |
| ٩ | داهاتی چاپەمەنی حکوومی | ٩,٤٠٨,٧٠ |
| ١٠ | داهاتی هەمە جۆر | ٧٨٠,٠٠ |
| | سەرجەم | ٤٩٥,٣٦٥,١٠ |

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**

١. شایەنی باسە هەر بەپێی ئەو ژمارانەی کە لە بەشی حەوتەمی ئەم ڕاپۆرتەدا هاتووە بەرامبەر بە یەك لەك ڕووپێیە خەرجکراوەی حکوومەت، دەسەلاتدارێتی ئینگلیز نزیکەی چوار لەك، یان ٩١٥، ٣٨٥ ڕووپێ باجی کشتوکالی هاوینەو زستانەی لە جووتیارانی دەڤەرەکە وەرگرتووە. لە سەرتاپای ویلایەتەکەشدا، سەرجەمی ١٩٨٢٧ لەك ڕووپێ داهاتی باجی کشتوکالو مەڕومالاتی بۆ دەسەلاتەکەی کۆکردووەتەوە.

٢. ئەم پێشنیارەی لەم ڕاپۆرتەدا هاتووە بۆ کاروباری ئاودێریی ناوچەی حەویجە، یەکەم بیرۆکەو بۆچوونی پلاندانانی ئەو پرۆژەیەیە کە بە پرۆژەی حەویجە ناونراوە.

٣. من پێم وایە هەر لەگەل بیرکردنەوەدا لەم پرۆژەیە، ئینگلیز لەبیری هێنانی عەرەبی ناوچەکانی دیکەی میسۆپۆتامیادا بووە، بۆ ئەم ناوچە گرنگەی کەرکووك. بۆیە هەر لە دەقە ئینگلیزییەکەی ڕاپۆرتەکەدا بۆ وشەی farmaers، لەباتی ووشەی جوتیاران، ووشەی (فەلاحین)ی بەکارهێناوە پاشان وشەی کوردی بەکارهێناوە، لەکاتێکدا دەبوو بیر لەو هەولە بکەنەوە کە ڕەوەندەکانی ئیسماعیل عوزێری هان بدرێن بۆ نیشتەجێبوون لەو ناوچانەدا، چونکە حەویجە لە ڕاستیدا ناوچەی لەوەڕگەی سەرەکیی مەڕومالاتی ئیسماعیل عوزێرییەکان بووە. دەبێ ئەوش لەبیر نەچێ کە بەڕێوەبەرێتی ئاوو ئاودێری لە سالی (١٩١٩)ەوە بە سەرپەرشتی (کۆلۆنێل ئەتکنسون) لە بەغداوە بەڕێوە چووە. ئەم بەڕێوەبەرێتییەش تا کۆتایی سالی ١٩١٩ لەژێر دەسەلاتی ئیدارەی عەسکەری بریتانیدا بووە. ئەرکە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرێتییەکە، چارەسەرکردنی تەنگوچەلەمەو کێشەکانی لافاو چاککردنەوەی جۆگەو ئاوەڕۆکانو چارەسەرکردنی کێشەکانی دابەشکردنیان بووە. (بڕوانە: لاپەڕە (١٠٨)ی (Iraq ١٩٩٠–١٩٥٠)ی لۆنگریك).

٤. لە ڕاپۆرتە سالانەکەی (١٩٢٠)ی (مسزبێل)دا هاتووە، کە دەسەلاتی بریتانی لەو سالەدا بۆ کاروباری ئاودێریو چاککردنەوە، نزیکەی ٥٢ لەك ڕووپێی خەرج کردووە.

٥. داهاتی زەوی، مەبەست لە داهاتی کشتوکالییە، سالی ١٩١٩و ١٩٢٠ بۆ دەسەلاتدارێتی عەسکەری بریتانی دوو شێوە داهات بوو:

– داهاتی درووێنەکردنو فرۆشتن یا بەکارهێنانی هەموو ئەو کێلگەو باخو بێستانانەی کە لەلایەن عوسمانییەکانو لایەنگرانی دەولەتی عوسمانییەوە بەجێ هێلرابوو. ئەوانە یەکراست لەلایەن لەشکرەوە درووێنە کرانو بەرهەمیان کۆکرایەوە، یاخود بێ درووێنە فرۆشران.

– دووەم داهاتی کشتوکال، ئەو باجانە بوون کە لە جوتیارەکان یا خاوەند مولکە کشتوکالییەکان وەردەگیران. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە، دەولەتی عوسمانی لە هەموو تەمەنی دەسەلاتدارێتی خۆیدا، باجی بۆ مسۆگەرکردنی خەرجی لەشکرەکانی، هەمیشە بە زۆرەملی یا بە خواهش بوویێ، لە جووتیارو خاوەند مولکە کشتوکالییەکان وەرگرتووە هەر سالێ بەرهەمی کشتوکالی کەم بووبێ، باجی حکوومەت کەم بووەتەوە، بۆیە بەو ڕێژەو ئەندازەیە ژمارەی لەشکری عوسمانی کەم یا زۆر کراوە، بڕوانە: لاپەڕە (١٣٥) تا (١٤٠)ی کتێبی (تأريخ مقدارات العراق السياسية).

٦. لە کۆمەلگەیەکی فیۆدالیی وەك ئەو سالانەی کوردستاندا کە دەسەلاتی ڕاستەقینە بە دەستی فیۆدالەکانەوە بوو، ئەوانیش بە هاوکاری لەگەل مەلاو شێخەکاندا کەوتبوونە ڕووتاندنەوەی جووتیارەکان.

قاسملو لە ب ١٤٨و ١٤٩ی کتێبی "الكردو كردستان"دا دەلێ: جووتیار فەرز کرابوە سەری کە دەبێ مەڕانە، فرووجانە، هێلکانە، تەپالانە، ڕۆنانە، گویسانە، مێوانانە، جێژنانە، سەرخۆشانە، سوورانە، بێکارانە بداتە فیئۆدالو داروودەستەکانی. هەروەها سەرفیترەو زەکاتو مجێورانەو نانی فەقێش، بە شێخو مەلاو سوختە بدات. سەرباری ئەوانەش هەر حکوومەتێ ئەگەر دەستی نەگەیشتایە بە گوندو لادێیەکان، ئیتر بە هەر هۆیە بووبێ، کاری وەرگرتنی باجەکانیان بە ناوی (ئیلتیزام)و شتی ترەوە وەك کۆنتراکت دەسپارد بە ئاغاو دەرەبەگو شێخەکان، ئەوانیش خۆیانو ویژدانیان. بەداخەوە تاقیکردنەوە تالەکان هەمیشە ئەوەیان سەلماندووە کە بە دەگمەن دەسەلاتو ویژدان توانیویانە پێکەوە هەلکەنو هاوتەریب بن. ئینگلیزیش کە بەم شێوازە کۆکردنەوەی باجی مەڕومالاتیان کردە ئەستۆی ئاغاکان، وەك مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی دەلێ: ژیانی خەلکەکە تالترو پرکەساسیتر بوو. بۆ نموونە، یەکێکی وەك مراد بەگی

مووبارەك ئاغای عەشیرەتی (گێژ)، کە کرا بە موتەزیم. ئیتر بە خۆیو کۆمەڵێ لیڤی چەکدارەوە، هەر سەعاتەو دەیدایە سەر گوندێك، بڕوانە: (کرکوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية).

٧. بەپێی بڵاوکراوەی ژمارە (٦٢)ی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا کە لە لەندەن، سەبارەت بە کێشەی ئەرمینیاو کوردستان ساڵی (١٩٢٠) بڵاوکراوەتەوە، ساڵانە لە کوردستانەوە (مەبەست گشت کوردستانە -وەرگێڕ) زیاتر لە ٣ ملیۆن سەر مەڕو بزن بەرەو ئەستەنبوڵو حەڵەبو بەغدادو تفلیس ڕەوانە کراوە.

٨. ئەم دەڤەرە (دەڤەری کەرکووك) مێژوویەکی دێرینەی بەرهەمی کانزایی نەوتو بەردە خەڵووزی هەیە. ئەوەتا لە لاپەڕە (١٠)ی کتێبی (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، المرحلة الخامسة)دا، سەبارەت بە کەرکووك گوتراوە: (ئەسکەندەر) مەبەستی ئەسکەندەری مەکدۆنییە، لە پاش شەڕی ئەربێلا، کە هاتە خوارەوە بە شوێنێکدا ڕەتبوو کە نەوتی لێ دەسووتا. وایان لێك داوەتەوە کە ئەوە شوێنی خوازنە (ئەناهیتا)ی ئێرانییە، بڕوانە: تەها باقرو فوئاد سەفەر (المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، المرحلة الخامسة).

٩. لە کفری گوند هەبووە بە ناوی گوندی (نا ساڵح)ەوە کە خەڵکەکەی قیریان لێ دەرهێناوە (هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨). هەروەها سەبارەت بە کانەکانی دەوروبەری کفری، مامۆستا کەمال مەزهەر لە دوو سەرچاوەی خۆیدا، ئەم زانیارییانەمان پێشکەش دەکات: لە لاپەڕە (٢٨)ی کتێبی (الطبقة العاملة العراقية)دا، لە سەرچاوەی (لغه العرب) ی ئاداری ساڵی (١٩١٢)ەوە دەڵێ: پێش شەڕی یەکەمی جیهانی دەوڵەت (مەبەستی دەوڵەتی عوسمانییە- وەرگێڕ) و خەڵکەکە لە هەندێ کانو کانزای وڵاتەکە وەك خەڵوزی بەرد (بەرد خەڵوون)، خوێ، قیر، بەردی مەرمەڕو شتی لەو بابەتە، سوودیان وەردەگرن. ئەو بەردە خەڵووزانەی ساڵانە لە نزیکی کفری دەردەهێنران بە ٣٠٠ تەن دەخەمڵێنران لە سەرچاوەی کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد) یشەوە، بەڕێز دکتۆر کەمال، ئەم زانیارییانەی لاپەڕە (٦١)ی بەرگی دووەمی کتێبی (العراق قديماً وحديثاً)ی (عبدالرزاق الحسنی)مان پێشکەش دەکاتو دەڵێ: "هەر ئەو سەردەمە ژمارەیەك کوردبوونە کرێکاری کانە خەڵووزەکانی نزیکی کفری، کە بەرهەمی ساڵانەیان بەر لە شەڕی یەکەمو کاتی ئەو شەڕەش، هەزار تەن بووە". هەڵبەتە هەردوو سەرچاوە ئەسڵییەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، کە لە کۆی ئەو دوو ژمارەیەیان وەرگرتووە، (الطبقة العاملة العراقية، التكون وبدايات التحرك)، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٢،و (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، لاپەڕە ٢٣٧.

١٠. مافو داهاتی دەرهێنانی نەوت لە ساڵی ١٨٨٩دا بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی عوسمانی لە وەزارەتی داراییەوە کراونەتەوە مافو موڵکی خەزێنەی تایبەتی سوڵتان، پاشان لە پاداشتی خزمەتێکدا، سوڵتان مافی دەرهێنانی نەوتی ناوچەی (باوەگوڕگوڕ)ی بەخشیوە بە (ساڵح پاشا)، کە پاشان بووە بە نائیبی کەرکووك لە پەرلەمانی عوسمانیدا، شایانی باسە، ساڵح پاشا باوکی نازم بەگی نەوتچییە، کە ئەویش ساڵی ١٩١٤ کرایە ئەندامی مەجلیسی مەبعووسانی عوسمانی (Iraq ١٩٠٠-١٩٥٠ Apolitical، Social and Ecinomic History، P ٢٧.).

١١. زۆربەی هەرە زۆری ئەم باجانە، لەو کەرەستەو کاڵایانە وەرگیراون، کە لە وەختی دەوڵەتی عوسمانیدا، وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی، بواری فرۆشتنیان نەدراوە (وەك عەرەقو مەشرووب فرۆشتن) یا باج لەسەر ڕاوەماسی و خوێ، کە هەر لەبەر کاریگەری بیروباوەڕی ئاینی ئیسلام، بە چاك نەزانراوە باجیان لەسەر دانراوێ.

١٢. لە دوا ساڵانی حکومی دەوڵەتی عوسمانیدا، ڕێژەی باجی گومرگ (١٠)ی نرخی کاڵای گومرگکراو بوو، ئینگلیز هەر لە یەکەم هەنگاویاندا بەرەو کوردستان، لەگەڵ داگیرکردنی (مەندەلی)دا یەکەم ئێستگەی گومرگیان لە باجەکانی تر جیاکردەوەو، پاشان مانگی ئاياری ١٩١٨ بەڕێوەبەرێتییەکی تایبەتیان بۆ کاروباری گومرگ دامەزراند (بڕوانە: ل ٤٥ی Review مسزبێلو، لاپەڕە (٨٣)ی کتێبی (Iraq ٩٠٠-١٩٥٠)ی ستیڤن لۆنگریك.

١٣. یەکێ لە خەسڵەتە هەرە زەقەکانی داگیرکردن، کە هەر خۆشی مەبەستو ئامانجی داگیرکردن، ڕووتاندنەوەی وڵاتەکەو خەڵکەکەیەتی. بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبووە کە دەوڵەتی عوسمانی داگیرکەرو پاش ئەویش ئینگلیزی داگیرکەر، خەڵکە ڕەشو ڕووتەکەی کوردستانیان بە ئارەزووی خۆیان ڕووتاندبێتەوە. ئەوەتا لۆنگریك لە لاپەڕە (٨٥)ی کتێبی (١٩٥٠ -١٩٠٠ Iraq)دا سەبارەت بە باجو مووچە لە کاتی عوسمانیدا دەڵێ: "ساڵی ١٩١٥-١٩١٦ کاتێ عوسمانی زانی بەرەو دۆڕانو شکان دەچێ، دەسەڵاتدارانی مووچەو مەعاشەکان. بەنکەنۆتی بێ نرخو بەهایان (لیرە) بەناوی مەعاشەوە دەدا بە مووچەخۆران. بەڵام لە کاتی وەرگرتنی مووچەو باجدا تەنیا لیرەی ڕەشادی (لیرەی ئاڵتوونی)یان قبووڵ کرد.

بەڵام وەنەبێ دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز، خۆیان لە تورکی عوسمانی باشتر بووبن. ئەوەتا لەپاش گەیشتنی ڕاپۆرتی دارایی ساڵی (١٩١٩- ١٩٢٠)ی میسۆپۆتامیا بە لەندەنو ئاشکراکردنی ئەو ڕاپۆرتە، سەرچاوەیەکی وەك ڕۆژنامەی (Daily mail)ی ژمارە (١)ی ڕۆژی (١٢)ی تەمووزی ساڵی (١٩٢٠) بەم شێوەیە باس لەو ڕاپۆرتەدا دەکات: "بەپێی ڕاپۆرتی دارایی ١٩١٩- ١٩٢٠ ئەو باجانە لە عێراقدا کۆکراوەتەوە، پێنج ملیۆنو ٥٠٠ هەزار پاوەند بوو. واتە هەر کەسەی -هەر کەسێکی سێ ویلایەتەکە- دوو پاوەندی داوە. شایانی باسە، لە بریتانیای گەورەدا، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان یەکجار دەوڵەمەند بوو، کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی هەر کەسێکی بریتانی تەنیا ٣،٥ پاوەند، باجی دەدا.

هەروەها وەك دەسەڵاتی ئیستیعماری داگیرکەر، یەکێ لەو بابەتانەی کە زۆر گرنگییان پێ درا، دامەزراندنی سیستەمی مەرکەزی بوو بۆ کاروباری دارایی و چۆنییەتی کۆنترۆڵکردنی داهات. بۆ ئەمەش لە سکرتاریەتی حاکمی مەدەنی گشتی، دوو سکرتاریەتی تایبەت بۆ داهاتو دارایی دامەزرێنران،

یەكەمیان كە (سكرتاریەتی داهاتەكان) بوو بە سەركردایەتی هۆیل Lieutenant. E. B. Howell سكرتاریەتی بەرپرسی داهاتی زەوی، تاپۆ، كشتوكاڵ و شارەوانی و... بوو.
دووەم، سكرتاریەتی دارایی بوو، پشكنینی دارایی، گومرگ، بازرگانی و چاپەمەنییەكانی حكوومەت و چاپخانەكانی كارو ئەركی تایبەت بەم سكرتارییە بوون لاپەڕە (١٠٥)ی كتێبی (١٩٥٠ —١٩٠٠ Iraq)ی لۆنگریك.
١٤. بۆ بەراوردكردن و تێگەیشتنی چۆنیەتی مامەڵەكردنی دەسەڵاتی بەریتانی لە ویلایەتەكانی میسۆپۆتامیادا، پاش خوێندنەوەی خشتەی سەرجەمی داهاتەكان (باج) و داهاتی تاپۆو داهاتی شارەوانییەكانی دەڤەری كەركووك، سەرنجی ئەم خشتەیەی خوارەوەش بدەین كە هی داهاتەكانی بریتانیایە لە هەمانساڵی داراییدا، لەو دوو ویلایەتەی تری میسۆپۆتامیا– مەبەست ویلایەتی بەغداو بەسرەیە:

**داهاتەكانی ١٩١٩-١٩٢٠**

| ژ | سەرچاوەی داهاتەكان | رووپی |
|---|---|---|
| ١ | باجی زەوی، كشتوكاڵ و مەڕومالاّت | ١٩٨,٢٧,٢٩٠ |
| ٢ | گومرگ | ٢٢٠,٢٤,٠٠ |
| ٣ | دادگاكان | ٥٠٠,٠٠٠ |
| ٤ | داهاتی تەندروستی و پاكوتەمیزی | ٣٥٠٠,٠٠ |
| ٥ | پەروەردەو مەعاریف | ١٨٢,٠٠ |
| ٦ | پۆست | ٣٢,٧٥٦,٥٠ |
| ٧ | تەلەفۆن و تەلەگراف | ٢٠,٧٤٥,٠٠ |
| ٨ | بەندیخانەكان | ٢,٨٤٢,٠٠ |
| ٩ | داهاتی چاپەمەنیی حكومی | ٩,٤٠٨,٧٠ |
| ١٠ | داهاتی هەمەجۆر | ٧٨٠,٠٠ |
| | سەرجەم | ٤٩٥,٣٦٥,١٠ |

## تەوەری هەشتەم

*** ڕووداوە ئابوورییەكانی سەردەمی ئینگلیزەكان و دروستبوونی دەوڵەتی (عێراق):**

هاتنی ئینگلیزەكان شتێكی نوێباوبوو لە ڕۆشنبیری و ئابووری و بیناكاریدا، كە زیاتر ئەو تازەكردنەوەیە ئەورووپای راپێچ كردە ناو عێراقەوە، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا بارێكی ئابووری نوێی خوڵقاند كە لەپێش سەردەمی ئینگلیزەكاندا باونەبووەو، بەو جۆرە هەنگاوە ئابوورییەكانی قۆستەوە. لەدوای ئەوەی ئینگلیزەكان هاتنە (عێراق) و داگیریان كردووە شار لە دوای شار توورکە عوسمانییەكانیان دەشكاندو هەرەسیان پێیان دەهێنا.
لە حەوتی نیسانی ساڵی (١٩١٨)دا لەژێر سەركردایەتی (ژەنەراڵ مارشاڵ)دا هێزێكی ئینگلیز گەیشتە (كەركوك)، بەلاّم لە دوای داگیر كردنی شاری كەركوك دووبارە هێزی توورکەكان هاتنەوە (كەركوك) و هێزی بەریتانیایان راونا دوای ماوەیەكی تر دووبارە هێزی ئینگلیزەكان هاتنەوە (كەركوك). "لەیەكەم جاری ئینگلیزەكان لە شاری كەركوكدا هەمەوەندەكان نامەیان بۆ ئینگلیزەكان نووسی: ئامادەن بۆ یارمەتی لەشكری ئینگلیز لە ڕێی پێشكەش كردنی ئاژەڵ و دەغلەوە، چونكە لەو كاتەدا بە ڕاستی گۆشت و نان باشترین دیارییەك بوو كە ئاتاجی بن"[1].
لە كاتی هاتنەوەی توركەكان یەكەم كارێك كە كردیان هەوڵی تالاّنكردنی هەموو ئەو دەغڵ و دانە بوو كە لە كەركوكدا، "بەلاّم كە ئینگلیزەكان كەركوكیان گرتەوە دەستبەجێ دەستیان كرد بە كۆكردنەوەی ئەو دغڵ و (دان) و (مەڕ) و مالاّتانە كە لەشكرەكانی تورك كۆیان كردبۆوە ونەگەیشتبووە سەرخواردنی"[2].
"سوپای بەریتانیاش بێ ئەوەی توركێك بەرەنگارییان بكات، تەكانیاندا ڕۆژی بیست و چواری مانگی (ئاب) ساڵی (١٩١٨) دا شاری (كفری)یان داگیركرد، ساڵێك بوو بە هۆی شەڕی نێوان (تورك) و (ئینگلیز) ڕێگەی (بەغدا) لەم شارەوە لە هەموو كوردستان بڕابوو، زستانی ئەو ساڵەش بێ باران بوو، هەستیان بەمە كردبوو هاتن بۆ دڵنیایی كردنی ئەو خەڵكە چەند ڕۆژێك لەسەر یەك سەمونیان بەسەر ئەو خەڵكەدا دابەش كرد تا چەند ڕۆژێك لەوە پاش ڕێگەی (بەغدا) كرایەوەو بازرگانی جولاّیەوە هاموشۆ كردن دەستی پێ كردەوە، كاروان لە سلێمانییەوە بەرەو خوار بوەوە"[3].
"لە حەوتی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا بەهەمان شێوە (موسڵ)یان داگیركرد"[4]. بۆیە لە دوایی ساڵی (١٩١٨)دا بە تەواوەتی (كەركوك) كەوتە ژێر دەسەلاّتی ئینگلیزەكان و دەسەلاّتی توورکەكان بۆ هەتا.. هەتایی ڕاونا. "ئینگلیزەكان هەستان بە دانانی سیاسەتێكی ئابووری هەر تەنها ڕەنگی نەدایەوە لە شێوە داگیركەرییەكەیان، بەڵكو لە هەمان كاتدا ڕەنگدانەوەی ئەو بارە نا هەموارەی ژیانی گشتی بوو بەتایبەتی ئابووری (بەریتانیا) لە پاش شەڕی جیهانی دا"[5].
"كاتێك هەر ولاّتێكیان داگیردەكرد هەوڵی ئەوەیان دەدا كە

قازانجێکی گەورە بە دەست بهێنن کە لەو وڵاتانەدا بووە. چونکە زیادکردنی لەرادەبەدەری دەبێتە بارێکی گران بەسەر بەریتانیاوە"[٦]. لەبەر ئەوە هەوڵی ئەوەیان ئەدا بە هەموو شێوەیەك وابکەن ئەو خەرجیە لە ناو ووڵاتە داگیرکراوەکەدا بەدەست بهێنن. بمانەوێ و نەمانەوێ داگیرکردنی کەرکوك لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کاریگەری خۆی بینی لەسەر ژیانی ئابووری شارەکەو کەوتە ژێر کارتێکردنی سیاسەتی ئابووری بەریتانیاوە.

*** دەوری رووداوە ئابوورییەکان لەشۆرشی بیستدا:**

شۆرشی (١٩٢٠) زۆر ناوچەی عێراقی گرتەوە لە سەروو بۆ خواروی (عێراق)، سیاسەتە ئابوورییە سەپێنراوەکەی (ئینگلیز) دەوری سەرەکی هەبوو لە سەرهەڵدانی شۆرشەکەداو هەوڵدان لە لێدانی هێزی سەربازی (ئینگلیز) بەهەموو شێوەیەك. "کاتێك ئینگلیزەکان عێراقیان داگیرکرد هەستان بەدانانی کۆمەڵێك باجی جۆر بەجۆر بەسەر خەڵکی عێراقدا"[٧]. "بەپێی ئەو زانیاریانەی کە هاتووە لە نوسراوە بەریتانییەکاندا ئەوە بەدەردەخات کە رێژەی (باج) راستەوخۆ لە ناوچە داگیرکراوەکان زیادی کرد، لە ساڵی (١٩١٨-١٩١٩) بەرێژەی (١-١,٦٥) ئەگەر ئەمە بەراورد بکرێت وەکو ئەوەی هەبووە لە ساڵانی (١٩١١-١٩١٢)دا. لە ساڵی (١٩١٩-١٩٢٠) دا بەرێژەی زیاتر لە دووجار بەرزتر بووەتەوە وەکو ئەوەی لەساڵی پێشوودا.."[٨].

"لەبەر ئەوە دەتوانین نموونەی زۆر بهێنینەوە کەوا ناوچە کوردنشینەکان زیاتر لە ناوچەکانی تر تووشی ناڵەو فیغان بوون لە دەست ئینگلیزەکان ئەویش زیاتر بەهۆی باری سروشتی ناوچەکە بوو کە جیای کردووەتەوە لە ناوچەکانی تر"[٩]. "چونکە ئینگلیزەکان هەوڵی سەپاندنی باجیان دەدایە سەر زەوییە (ئەمیری)یەکاندا بەرێژەی بەرزی (١٦٪) کەبەرزترین رێژە بوو ئەگەر بەراورد بکرایە لەگەڵ ناوچە باراناوییەکانی تردا"[١٠]. "لەبەر ئەوە سەیر دەکەین (کەرکوك) وەکو ناوچەیەکی کوردنیشین تووشی ئەم سەپاندنە بوو بە هەموو جۆرێك لە باجی زەوی کشتوکاڵی و مەروماڵاتو سەرانەی جۆربەجۆری لێ کۆدەکرایەوە، هەوڵدەدرا کە لە سوودی ئینگلیزەکاندا خەرج بکرێت. هەر ئەمە بوو وایکرد کە شۆرشی بیست بتەقێتەوە لە ناوچەکانی (کفری)و (خورماتوو)و (کەرکوك) کە شۆرشە بەناوبانگەکەی (ئیبراهیم خانی دەلۆ) نموونەی ئەم تەقینەوەیەی ساڵی (١٩٢٠)ە"[١١].

لە شۆرشی (١٩٢٠)دا گەلێك کاری کردە سەرباری ئابووری شارێکی وەکو (کەرکوك)، چونکە سەرهەڵدانی شۆرشو ئاژاوەی ئینگلیزەکان لەناوچەکەدا بۆ دامرکاندنەوەی ئەو راپەرینانە بوو بەهۆی سووتاندنی گەلێك زەوی کشتوکاڵی لە ناوچەکەدا، وەکو ئەوەی رووی دا لە (کفری) و(چەمچەماڵ)و (قەرەحەسەن)و (شوان).

*** دەوری هۆیە ئابوورییەکان لە لکاندنەوەی (کەرکوك) بە عێراقەوە:**

شتێکی گرنگ لەو سەردەمەدا روویدا ئەویش لکاندنەوەی ولایەتی (موسل) بوو بە عێراقەوە کە کەرکوك یەکێك بوو لە شارەکانی ئەو ولایەتە، ئینگلیزەکان هەوڵی ئەوەیان دا بەلکاندنەوەی بە (عێراق)و دابرینی لە (تورکیا). ئینگلیزەکان بە چاوێکی ئابوورییانەوە سەیریان دەکرد لەبەر ئەوەی ناوچەیەکی گرنگی کشتوکاڵی و بازرگانی و پیشەسازی عێراقە، رێگای بازرگانی عێراقە بە (تورکیا)و (ئێران)ەوە، سەرچاوەی بەدەست هێنانی بەروبومی بازرگانییە لە ناوچەکەدا، کە شارێکی وەکو کەرکوك پردی ئەم پێکەوە بەستنەوەیە لەنێوان عێراقو تورکیاو ئێران، هەروەها ناوچەیەکی بە پیتە لە رووی کشتوکاڵی وبەرهەمهێنانیدا، لکاندنەوەی ئەو ولایەتە بەکارێکی گرنگ دادەنرێت بۆ عێراق، چونکە دەروازەیەکی گرنگی ئابووری و بازرگانی عێراقە، هەر لەبەر ئەمە بوو، هەوڵێکی زۆریاندا بەوەی سنووری دەسەڵاتی خۆیان لەو ناوچەیەدا قایم بکەن، هەر بەو هۆیەوە گۆرینی رێکەوتن نامەی سیڤەر بەرێکەوتن نامەی لۆزان لەو ئاستەدا خۆی دەبینێتەوە.

هۆیە ئابوورییەکە هۆیەکی گرنگی لکاندنەوەی ئەو ولایەتەیە (موسل، سلێمانی، کەرکوك، هەولێر) بە عێراقەوە بە گرنگترین هۆ دادەنرێت بە تایبەتی لە دوای بۆنکردنی بوونی رێژەیەکی زۆری نەوت تێدا کە دوا رۆژ عێراق و ئینگلیزەکان بتوانن دەریبهێنن ناوچەیەکی وەکو کەرکوك دادەنرێت بەدەوڵەمەندترین شوێن لە رووی بوونی نەوتو چاکی نەوتەکەی و بوونی رێژەیەکی زۆری نەوتەکەی لە هەموو کوردستانو عێراقدا، چاکی نەوتەکەی بەرێژەی یەکەم دێت لە عێراقدا. هەرچەندە لێپرسراوە ئینگلیزەکان بانگەشتی ئەوەیان دەکرد بیریان لەلایەنە ئابوورییەکەی نەکردووەتەوە بۆ لکاندنەوەی بەڵام ئەگەر ولایەتەکەیان لە دەست بڕۆیشتایە تەرازووی سیاسەتی نێودەوڵەتی بە جۆرێکی تر دەسوورا، لەو سەردەمەدا ئینگلیزەکان بەرژەوەندییان لە مەترسی دا بوو بەتایبەتی لەوەدوا خۆی دەبینیەوە کە (کەماڵ ئەتاتورك) لە تورکیا دا هەنگاوی خێرای دەنا بۆ داگیرکردنی ناوچەکەو رزگار کردنی تورکیا لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی تورکی دا[١٢].

*** قەیرانە ئابووری و گرانییەکانی عێراق:**

روودانی قەیرانە ئابوورییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٢٩-١٩٣٣)دا، روودانی گرانی و نەبوونی خواردن لە ساڵانی (١٩٤٧-١٩٤٨)دا دەورێکی کاریگەرییان بینی لەسەر ئابووری سەرتاپای عێراقو دوورو نزیك کاریگەری خۆیان بینی بەسەر شارێکی وەکو کەرکوکدا. "لەبەر ئەوەی ئابووری عێراق لە بنەرەتەوە پشت دەبەستێت بە کشتوکاڵ بۆیە یەکەم لێدانی توندو تیژی ئەو قەیرانە ئابوورییەی خوارد کە بوو بەهۆی دابەزینی داواکراوی دەرەکی لەسەر بەرووبوومە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکانی عێراق، وایلێکرد لەسەری ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی خستنەرووی کەرەستەکانی و دابەزینی

نرخی ئەو کەرەستانەی بە شێوەیەکی وا کە عێراق بە خۆیەوە نەیدیبوو"[١٣].

لە ساڵی یەکەمی قەیرانە ئابوورییەکەدا بوو بە هۆی دابەزینی نرخی وەزنەیەك لە گەنمی کوردی بۆ (٥) ڕوپیەو چارەکە ڕوپیەك، نرخی تەغارێك لە جۆ بوو بە (٤٠) ڕوپیە. وەزنەیەك لەبرنجی عەنبەر بوو بە (٢٦) ڕوپیە برنجی خەزراوی بۆ (١٣) ڕوپیەو (سایر) کەمتر لە (٩) ڕوپیە، تەغاری گەنمە شامی سپی بوو بە (٦٠) ڕوپیەو تەغاری گەنمە شامی زەرد بۆ (٤٥) ڕوپیە، هەرزن بۆ (٤٠) ڕوپیە، وەزنەی نیسك بوو بە (٦) ڕوپیە، وەزنەی ماش بوو بە (٥) ڕوپیە، کونجی بۆ (١٠-١٢) ڕوپیە، ڕۆنی ٢٥ کیلۆیی بووبە (٢٩) ڕوپیە، ڕۆنی ناوەندی بۆ (٢٦) ڕوپیە، ڕۆنی ڕووەکی بۆ (٢٤) ڕوپیە، نرخی هەزار ریخۆڵە بووبە (٣٥٠-٤٥٠) ڕوپیە.

بە هۆی ئەم قەیرانە ئابوورییەوە بوو بە هۆی ئەوەی کە بازرگانێکی زۆری کەلوپەلی بازرگانی زیانیان لێ بکەوێت بەرەو نابووت بوون بچێت (الافلاس)[١٤] لەبەر ئەوەی کەرکوك شارێکی عێراقیو ناوچەیەکی گرنگی سەرەڕێی بازرگانییە کە پەیوەندکارە بە ناوچەی موسڵو بەغداوە، دوورو نزیك کارتێکردنی خۆی کردە سەر ئابوورییەکانی عێراقەوە، وای لێکرد کە بکەوێتە بەر لێدانی ئەو قەیرانە ئابوورییەی نێوان ساڵانی (١٩٢٩-١٩٣٣)و کار بکاتە سەر بەرووبوومە کشتوکاڵیو ئاژەڵییەکانی بە شێوەیەکی گشتیو وای کرد کە جوتیاری ناوچەکە بەشێکی زۆری ڕەنجی کشتوکاڵییەکەی بە فیڕۆ بچێت.

"یەکێك لەو دیاردە تازانەی کە لە ژیانی ئابووری وولاتدا ڕووی دا ساڵەکانی قەیرانەکە ئەویش زۆربوونی بەرهەمهێنان بوو کە بوو بە هۆی لە دایك بوونی نارەزاییەکی گەورە لەنێوان گشت کارەکانی، جوتیارەکان بڕیاری ئەوەیان دا کە بەرووبوومە کشتوکاڵییەکانیان نەدوورنەوەو ڕاگرتنی تۆوکردنی بەرووبوومی هاوینە، لەبەر ئەوە وایان بە چاك زانی کە زەوییەکانیان بێ چاندن بە جێ بهێڵن. "بازرگانەکان هەموو بەرووبوومە کشتوکاڵییەکانیان بەجێ هێشتو وای لێ هات کەکرم بیخواتو زۆربەی لەناوبەرێت".

"حاڵی بازرگانەکانی هێنان چ جیاوازییەکی نەبوو لە گەڵ بازرگانەکانی ناردنە دەرەوەی کەلوپەلە بازرگانییەکان..، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو دابەزینە بووە کە دانیشتووان توانای هێنانیان نەبوو لە دەرەوە"[١٥]. "لە ساڵەکانی قەیرانە ئابوورییەکە کۆمپانیاو کارگەکانی نەوت لە عێراق، هەستان بە گەلێك کارڕایی کردن (الاجراءات) کە لەوانە جێگربوونی شوێن پێی خۆیانو کەمکردنەوەی گیروگرفتەکانیان، لە ڕێگای پالەپەستۆ لەسەر حکومەتی عێراقو عێراقییەکان بە شێوەیەکی گشتی، لە ڕۆژە دیارەکانی قەیرانەکەدا هەوڵیاندا بە سڕینەوەی بەشێکی گەورە لە کەرەستەکانی عێراق لە نەوت بە ئاڵتون بەبیانووی هەڵوەشانەوەی ئەو پابەندە ئاڵتونەی پاوەند"[١٦]. "بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت کە لە ساڵانی (١٩١٣-١٩٣٢)دا کۆمپانیای دەرهێنانی نەوت لە کەرکوك ڕاگیرا، لە ساڵانی ١٩٢٧ تا ساڵی ١٩٣٤[١٧] ڕێژەیەکی دیاریکراوی بەرهەمهێنانی نەوتمان لەبەر دەست نییە تا بزانین چەندێك کاریکردە سەر دەرهێنانی نەوت، ئەمەش تارادەیەك دەگاتە ئەوەی کە کۆمپانیاکان کارەکانی خۆیان ڕاگرت تا بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کارتێکردنی ئەو قەیرانە ئابوورییە. هەر چەندە بە دووکار ڕایاندەگەیاند بۆ پشکنینو دۆزینەوەی بیرو کێڵگەی نەوتی ترە.

"لە کاتی وەزارەتی (سەعیدیە)دا لە (٢٣ی مارتی ساڵی ١٩٣٠)دا حکومەت بڕیارێکی دەرکرد بە ناوی باجی شارەوانییەوە کە بوو بەهۆی ئەوەی کە لە سەرتاپای زۆری ناوچەکانی عێراق دژی بوەستنو خۆپیشاندان زۆری شارەکانیان گرتەوەو وای لێهات کە زۆر شار جووڵەو کڕینو فرۆشتنی لێ ڕاگیرا"[١٨].

بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە ناوچەکانی باکووری عێراق هیچ شتێکی وا ڕووی نەدا، تەنها هەولێر نەبێت یاداشتێکیان بەرزکردەوە بۆ حکومەت کە گازەندەیان کرد دەربارەی گرتنی ئابووری کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەو کارتێکردنە بەو جۆرە نەبووە کە بەشێوەیەکی دیاربێت لە ناوچەکانی کەرکوكو سلێمانیو هەولێرو موسڵ[١٩].

بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە قەیرانەکە کاریگەر نەبووە بەڵکو دیاردەی کارتێکردنەکە شێوەیەکی کەمتری وەرگرت کە هاوگونجاو بووە لەگەڵ باری ئابوورییەکە پشتی بەگەلێك هۆ بەستووە لە ناوچەیەکی وەکو کەرکوکدا کە ئەو دیاردانە لە ناوچەکانی خواروو وناوەڕاستدا بەرچاوناکەوێت بۆ نموونە لە بوونی کەرەستەیەکی زۆری ئابووریو پشت بەستنی پێیو سەرف نەکردنی ئەرکێکی وا، کە تێدا ساناترین شت بەکار نەهێنرێت لە پێگەیاندنیدا کە خۆی لەناو بۆتەی بوونی نەوتەکە دەدۆزێتەوە لە ناوچەکەدا بەڕێژەیەکی زۆر بۆیە زیاتر بایەخی پێ دەدرێت لە ناوچەکانی ترو زیاتر کەرەستە پێویستەکان، هاوگونجاوە لەگەڵ قەیرانەکەدا هەرچەندێکیش کارتێکردنی هەبێت، بەڵام کەمتر لەناوچەکانی تر. لە هەمان کاتیش هەوڵدراوە کە بارە سیاسییەکە ئاسوودە بکرێت زیاتر لە ناوچەکانی خواروو ناوەڕاستی عێراقدا چونکە ئاسوودەکردنی بارە سیاسییەکە لە گەڵ خۆیدا، ئابوورییەکە تارادەیەك دەستە مۆدەکاتو کەمتر کارتێکردنەکەی بەدەردەکەوێت.

"لە ٣٠ مارتی ساڵی ١٩٣٥ دا بایەکی توندو تیژ هەڵیکرد کە سەرتاپای عێراقی گرتەوە، زیانێکی گەورەی دا لەماڵو زەویو بەرووبوومی کشتوکاڵی کە کەرکوکیش لەو زیانە بەدەر نەبوو"[٢٠]. "لەنێوان ساڵانی ١٩٣٩-١٩٤٠ دا بە هۆی ڕوودانی شەڕی جیهانی دووەم ئاڵۆزی ئابووری سەرتاپای عێراقی گرتەوەو حکومەت هەڵسا بە دانانی هەندێك باجی جۆربەجۆر بۆ جێ گرتنەوەی پێداویستییەکانی شەڕ لەکاتی پێویستیدا، لە ئەنجامدا سەرتاپای عێراق کەوتە ناڵاندنی ئەوبارە ناهەموارەی شەڕ، کەرکوك یەکێك بوو لەو شارانەی کەوتە بەر ئەو کارتێکردنە ئابوورییەی شەڕەوە"[٢١].

"لە ساڵی (١٩٤٠)دا بوو بەهۆی بارینی تەزرەیەکی زۆرو بە هێز لەناوچەکانی کەرکوك بەتایبەتی ناوچەکانی دەوروبەری، بووبەهۆی لەناوچوونو دابەزینی بەرووبوومی کشتوکاڵی.."[٢٢]. "لەنێوان ساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٧ ناخۆشترین

ساڵی بووکە عێراقییەکان لە مێژووی کشتوکاڵدا چەشتیان ئەویش بەهۆی کەمی باران‌و زۆری هێرشی کوللە کە بوو بە هۆی زیانێکی گەورەی جۆراوجۆرو زیانبوونی ئارەزوو بۆ ناردنە دەرەوەی گەنم وجۆ بەبێ گوێدانە پێویستی بەکارهێنانی ناوخۆیی وڵات، بۆیە لەمانگەکانی ئەیلول‌و تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹٤۷ وڵات تووشی بێ نانی بوو، خەڵکی لەژن‌و پیاو دەوەستان بۆ وەرگرتنی بەشێکی کەم لەنان کە لەهەندێك کاتدا دەستیشیان نەدەکەوت".

شارێکی وەکو کەرکوك لەسەردەمی پارێزگار (سەعید قەزاز) ۱۹٤٦-۱۹٤۷ دا تووشی ئەو گرانییە بوو. ئەوەی زیاتر کارتێکردنی خۆی بە جێ هێشت لەوشارەدا. "هێرشی کووللە بوو لە زەوی کشتوکاڵی لەنێوان ساڵانی ۱۹٤٦-۱۹٥۰ دا، نزیکەی (٥) ساڵی خایاند، کە تەنها لەنێوان ساڵانی ۱۹٤۷-۱۹٤۸ دووسەد هەزار هکتار زەوی لە ناودا. ئەمە زیاتر وای کرد ببێتە هۆی نەبوونی گەنم‌و جۆو خواردن کەم بێتەوەو گرانییەکی بێشومار ڕوو بدات"[٢٤].

ئەوەی جێگەی ڕێزە (سەعید قەزاز) هەستا بە گەلێك کاری چاك بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە لەو دەردە سەرییە ڕزگار بکات، هەر بۆیە ئەو ساڵە بەساڵەکەی (قەزاز)یان گرانییەکەی (قەزاز)یان کارەکانی (سەعید قەزاز) ناوزەد بکرێت. هەستا بەکردنەوەی فڕنی عانە بایی‌و فرۆشتنی کولێرەی عانەبایی بەخەڵکی کە لەچاو کولێرەی ئەو کاتەدا زۆر هەرزان بوو کە تاساڵانی حەفتاکان دەوری مابوو لە شارەکەدا.. هەروەها هەڵسا بە دابەش کردنی خواردن‌و ڕاکێشانی گەنم‌و جۆیی بازرگانە گەورەکان‌و فرۆشتنی بەنرخێکی هەرزان‌و دانانی نرخی گەنم‌و جۆو خواردەمەنی لەناو شارو چاودێری کردنی ڕۆژ بە ڕۆژی شارەکە تا بۆ ئەوەی ئەوانەی سەرپێچی بکەن سزایان بدات. بە هەموو عەلاف‌و بازرگانەکانی گەنم‌و جۆی ڕاگەیاند هەر سەرپێچییەك بێت خۆی بڕیاری هەڵواسینی دەدات. ئەم کارڕاییی کردنەی کە (سەعید قەزاز) کردیی تارادەیەکی چاك دەوری خۆی بینی‌و تا ڕادەیەکی هاوگونجاو بوونە هۆی دابەزینی نرخی زۆری شتومەك‌و پێویستییە گرنگەکانی شارەکە، بۆ نموونە نرخی قزناخێك گەنم لە دوو دینارەوە بوو بە نیو دینار نرخی قزناخێك جۆ لە یەك دینارە بوو بە چارەکە دینارێك نرخی کوتاڵ‌و قوماش لەنێوان (۱٥-۱٦) پەنجایی بوو نرخی مەترێك کە لە سەردەمی ئەودا دابەزی بۆ شەش تا حەوت پەنجایی، ئەمە لەگەڵ خۆیدا وای کرد ووردە.. ووردە شتەکانی تری وەکو ڕۆن‌و شەکرو برنج‌و نۆك‌و نیسك‌و ماشیش بێتە خوارەوە هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی کەمتر هاتە خوارەوە لە گەنم‌و جۆ"[٢٥].

مامۆستا (نەریمان) بەم جۆرەی خوارەوە باسی ئەو گرانییەی ئەو ساڵانە دەکات: "ئەو ڕۆژگارە زۆر گرانی بوو پێش ساڵێك حکومەت وەزارەتی (تەموینی) بۆ دابەشکردنی ئازووقە دانا بوو ڕەحمەتی (کامل چادرچی) کە نیشتیمان پەروەرێکی دیاری بوو کرابووە وەزیری (تەموینی) بەهۆی بیتاقەی تەموینەوە ئازووقەی وەك (شەکر، چا، قوماش) بەپێی کەسەکانی هەر خێزانێك دابەش ئەکرا لە قەزاو ناحییەکاندا، (بەڕێوەبەر، نووسەر) بۆ ئەم دائیرە نوێیە دانرا، گرانییەکە لەوەدا نەبوو لە سەرەتایی شەڕ کیلۆی شەکر بە (۷٥) فلس بوو بوو بە دیناری چای لە (٤٠٠) فلسەوە بوو بە (٥) دینار، گەنم وەزنەی لە نیو دینارەوە بوو بە (۱٥-۱٦) دینار وەدەستیش نەدەکەوت کوللەش ئەو ساڵە فرکەی دەهات. زۆربەی فەرمانبەرانی تەموین فێری دەست درێژی بوون‌و بیتاقەیان بەپارە دەفرۆشت وەك بیستمان لە ماوەی ئەو دوو ساڵە سەرژمێری عێراق کە چوار ملیۆن بوو، گەیاندبوویانە چل ملیۆن"[٢٦].

"حکومەت بۆ ئازووقەی میللەت گەنمی لە مەخزەنەکاندا کۆ ئەکردەوە کەچی هەندێك لەو مەئموور مەخزەنانە لەوەش دەست درێژییان ئەکرد.. هەندێ لە ئاغاو دەرەبەگ‌و خاوەن عەلوەکانیش عەمبارەکانیان پڕکردبوو لە گەنم یان ئەوەتا بە پارەیەکی زۆر دەیانفرۆشت، یاخود دەیانناردە (بەغدا)و شارەکانی دیکە، ئەمە جەماوەری خانەقینی هێنایە جۆش‌و لە ساڵی (۱۹٤۸) تاویاندا هەرچی گەنمی ئەو جۆرە کەسانە بوو هەموویان بردوو لە ناوخۆیاندا دابەشیان کردو چی ئەبێ بابێ خۆ بەشی ژەمێ دووان نانیان دەستکەوتووە"[٢٧].

"لەنێوان ساڵانی (۱۹٥۱-۱۹٥۳)دا ژمارەیەکی زۆر کووللە هێرشی کردە سەر زەوییەکانی ناوچەی خورماتوو کفری‌و چەمچەماڵ کە بوو بەهۆی فەوتاندنی زەوی وزاری کشتوکاڵی.."[٢٨]. "ئەگەر بەچاوێکی ئابوورییانە سەیری ڕێژەی بەرهەمهێنانی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی نێوان ساڵانی (۱۹٤٦-۱۹٥۳) بکەین دەبینین ڕێژەی بەرهەمهێنانی کەمی کردووە لە چاو ساڵەکانی پێشوو ودوای ساڵی (۱۹٥۳) کە دەگەڕێتەوە بۆ کەمی باران بارین‌و تەزرەو هێرشی کوللەو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کشتوکاڵی لە ناوچەکەدا. لە ساڵەکانی شەستەکان‌و حەفتاکاندا کەم‌و زۆر گرانی‌و بێ بارانی ڕووی داوە، بەڵام ئەو کارتێکردنەی نەبوونەکە لە ساڵەکانی چلەکان‌و پەنجاکاندا ڕووی داوە لە ناوچەکەدا لەبەر ئەوە دیاردەی ئەو گرانی‌و قەیرانە بەڕوونی بەدەرنەکەوتووەو کارتێکرنێکی وا گەورەی نەبووە کە باری ئابوورییەکە تووشی نووشستی ببێت. چونکە تەواوبوونی پرۆژەی (حەویجە) بەشێکی گرنگی ئەو ناوچەیەی لە بێبارانی ڕزگار کردو کشتوکاڵی بووژاندەوە هەر چەندە لەبەر هۆ رامیارییەکە ڕێگای جێبەجێ کردنی بۆ دانرا کارێکی گەورەکرا، ئەویش بە عەرەب کردنی ناوچەکانی کەرکوك بوو.

*** خۆپیشاندانی کرێکارانی گاورباغی لە کەرکوك:**

ساڵانی (۱۹٤٦-۱۹٤۷) گەلێك کێشەی گرنگ ڕوویدا لە ڕووی ئابوورییەوە کاری خۆی هەبوو لەسەر ژیانی ئابووری شارەکەو دەوری بینی لە ڕوودانی گەلێك کارەساتی وەکو گرانی‌و بێ بارانی‌و قات‌و قڕی کە مانگرتنی کرێکارانی گاورباغیش ڕەنگدانەوەی ئەو کێشانەبوون، کرێکاریش دەردی ئەو گرانی‌و ماف خورانەی بوو. "لە بەرواری (۳)ی تەمووزی ساڵی (۱۹٤٦)دا کرێکارانی کۆمپانیای نەوت لە کەرکوکدا مانیان گرت لە ئیش کردن‌و چەند داواکارییەکیان پێش کەش بە کاربەدەستانی ئەو کاتە کرد:

١. زیاد کردنی کرێی بنەڕەتییان، چاوپۆشی لە تەرخانی (مخصصات غلاء المعیشة)، گرانی گوزەرانی.
٢. ئامادەکرنی خانووبەرە بۆیان، یان بەخشین لە بریتی (بدل) کرێی خانوو بۆیان.
٣. تەرخان کردنی هۆیەکانی گواستنەوە بۆ راگوێزتنیان لە کەرکوکەوە بۆ شوێنی کارەکەیان لە کۆمپانیاکە لە رۆیشتن و هاتن.
٤. بەخشینی رێزلێنانی جەنگ (اکرامیە الحرب) هەروەکو کرێکارەکانی (حەیفا) و (عەبادان).
٥. بەخشینی نەوت بۆ سوتاندن.
٦. بەخشینی کرێی گواستنەوە بۆ شوێنەکانیان لە کاتی رۆیشتنەوەیان بە رێگادان (الاجازة).
٧. بەجێ هێنانی یاسای کرێکار، ئەوەی پەیوەندکارە بە بەرێزلێنان و بەخشینی (اکرامیات) و (اعطاء).

بەڵام حکومەت بایەخی دابە کارەکەو، بەداواکردن و زۆرلێکردنی لە کۆمپانیای نەوت بە جێبەجێ کردنی بەشێك لە داواکارییەکانیان کە ئەوەی دەبینرێت لەسەر حەقن، لەبەر ئەوە دەسەڵاتدارە کارگێرییەکانی (کەرکوك) داوایان لە هەندێك لەکرێکارەکان کرد کەوا هەوڵ بدەن بە هێدی و ئاسایی بۆ داواکارییەکانیان تا بۆ ئەوەی کارەکانیان چارەسەر بکەن بەڵام لەسەر ئەمەشەوە کرێکارەکان بەردەوام بوون بۆ رۆژی دوایی لە خۆپیشاندان و مانگرتن، دەسەڵاتدارانی پەیوەندکار هەستان بە کاری بڵاوە پێکردنیان، لە هەمان کاتدا رایان گەیاند کە گوایە تا ئێستا هەوڵی جێبەجێ کردنی داواکارییەکانیان دەدەن و بەردەوام لەگەڵ کۆمپانیای نەوت هەوڵی جێبەجێکردنی دەدەن، بەڵام کرێکارەکان رازی نەبوون بە گەرانەوە تا ئەوکاتەی کۆمپانییەکە ویست و ئارەزووەکانیان بەجێ بهێنێت کرێکارەکان کاتێك زانیان کە وەزیری ئابووری هاتووە، لە رۆژی حەوتی (تەمووزی) ساڵی ١٩٤٦ هەستان بە خۆپیشاندان بۆ جاری دووەم. لەبەرواری (١٢)ی تەمووزی ساڵ (١٩٤٦)دا پارێزگاری کەرکوك روونی کردەوە کە گوایە کۆمپانیای نەوت بەشێك لە داواکارییەکانیان جێبەجێ کردووە، وەکو زیاد کردنی کرێی بنەڕەتی بەرێژەی نێوان (٣٠٪ و ٧٥٪) لەگەڵ زیادکردنی تەرخانی (مخصصات غلاء المعیشة). هەروەها لەگەڵ دیاریکردنی تەرخانی خانووبەرەو، بڕیاری داوە کە سووتەمەنیان بداتێ، بەڵام لە جیاتی ئەوەی گوێ لە داواکارییەکان بگرن بۆ ئێوارەی هەمان رۆژ دەستیان کردبە کۆبوونەوەو مانگرتن کە لەمەدا بووبە هۆی پێکادان لەنێوان کرێکاران و دەسەڵاتدارانی پۆلیس، لە ئەنجامی پێکادانەکەدا بووە هۆی کوشتنی (٥) کەس و بریندار بوونی (١٤) کەس لەگەڵ بریندار بوونی (٦) لە ئەندانانی پۆلیس، هەرچەندە هەندێك سەرچاوە دەڵێن (١٦) کەس کوژراو ژنێك و منداڵێك بوو، زیاتر لە (٣٠) کەس برینداربووە"[٢٩].

"بە هۆی ئەم پێکادانەوە بوو بەهۆی ئەوەی کە بارێکی ناهەمواری لە ناوچەکە و عێراقدا خولقاند، هەموو رۆژنامەکانی ئەو کاتە رەخنەیان لەو دەست درێژییەی دەسەڵاتداران گرت کە دەستیان هەیە لە کوشتنی چەند کرێکارێکدا، بێ ئەوەی گوێ بۆ داواکارییەکان شل بکەن بەهێز وەڵام درانەوە. لە دوای ماوەیەك کۆمپانیای نەوت لە (کەرکوك) هەستا بە جێبەجێ کردنی بەشێك لە داواکارییەکانیان بەڵام قەدەغەی رێگەدانی کرد بەدامەزراندنی (یەکێتی نەقابە) وەکو دروست کردنی یەکێتی نەقابەی کرێکاران لە ترسی ئەوەی بکەوێتە ژێر کارتێکردنی دەسەڵاتی شیوعیەکان"[٣٠].

هەر چەندە لایەن هەمبووبێت دەستی خۆی تێکەڵ کردبێت لە وورووژاندنی کرێکارانی نەوت، بەڵام هۆیە ناوخۆییەکە دەوری سەرەکی هەیە کە زیاتر کرێکارو کارو پیشەو گیروگرفتەکانی دەبنە هۆی یەکەم لەسەرهەڵدانی ئەم مانگرتنەدا، چونکە هەرلە ساڵانی (١٩٢٧-١٩٤٦) تا دەهات ژیانی خراپتر دەبوو لە جیاتی ئەوەی بەرەو چاکتر بڕۆیشتایە، بەرهەمهێنانیش لەزیاد بووندابوو. بەڵام پێویستییەکانی کرێکاری نەوتی کەرکوك بەرەو خراپتر هەنگاوی دەنا، ئەوەی زیاتر دەسەلمێنێت لێدانی بوو لەلایەن دەزگای پۆلیسەوە، ئەمەش خۆی لەوەدا دەدیتەوە کە نەیان دەویست داخوازییەکانیان جێبەجێ بکەن تەنها دەیانویست سوود لە وەخت وەرگرن. نەیاندەویست هەموو داخوازییەکانیان چارەسەر بکەن بە شێوەیەکی بنەڕەتی.

*** شۆڕشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی حەقەکان لە شاری کەرکوکدا:**

"پاش کۆچی دوایی (شێخ عەبدولکەریم) بەشێك لە مەریدەکانی وازیان لە هاوبەشی کردنی کۆمەڵەکەیان هێنا، ژمارەیەکی کەمیشیان دوایی (حەمەسوور) کەوتن و لە گوندی (کڵاو قووت) لە ناوچەی (شوان) نیشتەجێ بوون، زۆربەشیان (مامە رەزا)ی برای شێخ (عەبدولکەریم)یان هەڵبژاردو کردیان بە سەرۆکی خۆیان"[٣١]. وورده وورده لە لادێکانی ناوچەی شوان بڵاوبوونەوە سەرنجی چین و توێژەکانی ناوچەکانی ترو دەورووبەری رادەکێشا، کار گەیشتە ئەوە سەرنجی کاربەدەستان بۆ لای خۆی رابکێشێت و بوو بە هۆی ئەوەی کە ببێتە مەسەلەیەکی گرنگی خوانی باسکردن.

"کاکڵی بزوتنەوەی هەقەش وەك بزوتنەوەیەکی جوتیاران کاکڵێکی دژی رژێمی کۆنەپەرست و نۆکەری حوکمران و سیستەمی دەرەبەگی لادێکانی ئەو رۆژەی کوردستان بووە"[٣٢]. زۆرتری کۆمەڵی (هەقە) لە جوتیاران و رەنجکێشانی لادێ پێکهاتبوو، بۆیە بەرەو ژیانی هاوبەش و تەبایی ناو کۆمەڵ ئەرۆیشتن". زیاتر گۆرانە ئابوورییە - کۆمەڵایەتییەکە رەگی داکووتاو ژیانی جووتیار بووبە ژیانێکی ئابووری گرنگ، ئەمە وایکرد گەشەبە کشتوکاڵ و بەرهەمەکەی بدات و بیروباوەڕی نوێی پێشکەوتن بە دەست بهێنێت کە بتوانێت تەکانێك بداتە بەرەوپێش و گەشە بە بەرووبوومەکەی و چاکتر کردنی بدات "حەقەکان هیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێوانیان نییەو نابێ ببێ چ بەهۆی دەوڵەمەندی و هەژاری و چ بە هۆی رەگەزی کۆمەڵایەتییەوە.. بزوتنەوەی هەقە هەرچەندە لەبنەڕەتدا لە ناو هەژاران و چەوساوەکاندا پەیدا بوو، ژمارەیەکی زۆریش لە کەسانی سەربە چینەکانی تری کۆمەڵی لەخۆی کۆکردبوەوەو بێ جیاوازی خستنە نێوانیان

هەموویان لەیەك ڕیزدا ڕاگرتبوو هەموو وەك برا ڕەفتاریان لەگەڵ یەك دەکرد"[33].

پەرەپێدانی گیانی هاوبەش لە سامان‌و داراییدا بەگشتی بەپێی ئەم پێڕەوە هیچ کەسێکی هەقە خۆی لە ئاستی کۆمەڵەکەیدا بە خاوەن ماڵ‌و سامانی‌و زەوی نەزانیوەو هەرماڵێکی بووبێ وادانراوە هی هەموو کۆمەڵەکەیە نەك تەنها هی ئەو.."[34]. "زۆرجار ڕێککەوتووە جۆرە خواردنێك یان میوەیەك هەڵگیراوە بە کۆمەڵ بخورێ"[35]. ئەم گیانی هاوبەشی‌و یەکسانییە لەم سامانەدا وای کرد کەپەرە بە هێزی جووتیار بدات‌و بەهەمان شێوە بەرهەمەکەی شان بەشانی گەشە بکات‌و جۆرەکەی بەرەو چاکتر بڕوات. "ئەبوو هەر هەقەیەك یان خێزانێکی هەقە بەشێوەی ئابوونەیەکی مانگانە بەشداری بکاو، ئەو ئابوونەیە ئەدرایە دەست سەرتەکیەی گوندەکەیان، برا (سەیارەکان) چی پێویست بوایە بۆ تەکیەی دێ بۆی خەرج ئەکراو، ئەویش ئەمایەوە ڕەوانەی خانەقای (کەڵکەسماق) دەکرا.."[36].

ئەم ئابوونەیە وای کردبوو گەلێك پێویستییەکانی ڕۆژانەیان جێبەجێ دەکردو ئەیخستە سەر بارێکی ڕاستەوە بەهۆی ئەم ئابوونەیە وای لێ دەهات پێویستییەکانی دادەپۆشراو ڕۆژلەدوای ڕۆژ زیادی دەکرد، پێویستییەکان پێویست نەبوو بۆیە لێ یان زیاد دەمایەوەو شوێنێکی تریان پێ ڕاست دەکردەوە، کە لێرەدا هاوسەنگە ئابوورییەکان بەراست دەوستاو لە بارێکی گونجاودا گەشەی دەکردو ڕێڕەوی خۆی دەبری. "لە ڕاستیدا هەقەکان مولحید نەبوون‌و باوەڕیان بەخواو پێغەمبەر (د.خ)و قورئان‌و فەرمانەکانی شەرع زۆر پتەو بوو، خۆیان دادەنا کەخواناسی ڕاستەقینەن‌و هەقپەرستی‌و شێوەی کاسبی‌و ئیش‌و کاریان زۆر ڕێکوپێك بوو، دوور لە تەماعکاری‌و چەوساندنەوەی خەڵکی"[37].

هەوڵی ئەوەیان نادا لە کڕین‌و فرۆشتن‌و بەدەست هێنانی بەرهەمەکەیاندا چەوساندنەوە بەکاربهێنی. ئەمە وای کرد هەم بەرهەم زیادی کردوو هەم سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا لە کاتی مامەڵە کردن لەگەڵیاندا.. چونکە ڕاستییەکان وای کرد ببێتە ئەوەی خەڵکی زیاتر بایەخ بە هەڵس‌و کەوتە ئابوورییەکان بدەن، پاکی بەرهەمەکەیان لە بازاڕدا شایەدی ئەو ڕاستی یە دەدات. "هەقەکان بە شەو کۆدەبوونەوە، ئەرك‌و کاری سبەینێیان لەنێوان ژن‌و پیاوی گووندەکەدا دابەش دەکردو پارە لای (حەمەسوور) بوو، دەیانوت ئەوەی نەخۆش بێ پارەی دەداتێ‌و دەینێرێ بۆ شار ئەوی ژنی نەهێنابێ ژنی بۆ دەهێنێ. ئەم بارەهەرەوەزییە لەو چەند گوندەدا کەسەر بە (حەمە سوور) بوون حاڵ‌و بارێکی خۆشتری دروست کردبوو، پێش خەڵکی تر تراکتۆرو مەکینەی تری کشتوکاڵیان کڕیبوو، هەمووی موڵکی گشتی بوو"[38]، لەبەر ئەوە دابەش کردنی کارو پیشەکانیان لە کۆبوونەوەیەکی شەوانەدا لەسەری ڕێدەکەوتن‌و بەیانی هەریەکە بە لای کارەکەی خۆیدا دەڕۆیی کە بڕیاری لە سەردرابوو لە دوێنێ شەوەوە.

کڕینی کەرەستەو ئامێری کشتوکاڵیش هۆیەکی گرنگی پێش کەوتە کشتوکاڵییەکەیان بوو کە بەڵگە بوو بۆ ئەوەی هەوەسیان لە پێش کەوتن‌و چاك کردنی بەرووبوومە کشتوکاڵییەکانیان دەکردەوە.. چونکە هێنانی تراکتۆر بۆ یەکەم جار بۆ ناوچەکە بوو بەوەی لادێکانی تر چاویان لێبکەن‌و بایەخ بە هەنگاوەکانیان بدەن. "حەمەسوورییەکانی (کڵاو قووت) بە ژن‌و پیاوەوە، هەموو لەیەك ماڵ دەژیان‌و بەیەکەوە کاروکاسبی ئەکەن، هەرچی شتێکیان هەیە لە ئامێری کشت‌و کاڵ‌و ئۆتۆمبیل‌و زەوی‌و مەڕو ماڵات، هەمووی وەك هی هەموویان وایە، دەرامەتێکی باشیان هەیەو بەیەکەوە پەیدای ئەکەن‌و بەیەکەوە ئەیخۆن، مەسرەفی تەکیەش لە دەستکەوتی گشتی دەرئەچێت‌و حەمەسووریش لەبارەی جلوبەرگ‌و خواردن‌و ئیش کردنەوە هیچی لەوانی تر جیا نییەو ژیانێکی یەکسانی ئەژین"[39].

هەر ئەم یەکسانییە گەلێك سیستەمی کۆمەڵایەتی ئابووری ئەو دێیانەی هەقەکانی هەڵتەکاند، وەکو پەیوەندی جوتیار بە ئاغاو دەرەبەگەوە، پەیوەندی جوتیار بە زەوییەوە، پەیوەندی جوتیار بە مافە ئابوورییەکەی بەرامبەر ئاغاو دەرەبەگ هەر ئەمەش ڕەنگی دایەوە لە دادگا کردنەکەی (شێخ عەبدولکەریم)دا کە لەکاتی دادگایی کردنەکەدا هەڵی دایەوە کە خۆی کرد بە خاوەنی جووتیارو بەرگری لە حەقیان. "ئەوانەی ئاگایان لەمەسەلەکەیە تێکڕا لەو باوەڕەدان (شێخ عەبدولکەریم) زۆر چاك ئەیزانی ئەم قسەو دووسەرەی کارێکی وا ئەکاتە سەر چ حکوومەت‌و چ کۆمەڵانی جووتیارەکان‌و ڕەنجبەرەکانی لادێ کە متمانە پەیدا بکەن ئەم ڕێبازەی ئەو گرتوویەتییە بەرەو سۆفیەتی بۆ کردووە بە بنەڕەتی ئایدیای بۆ ئەوەیە جوتیاران لەگەڵی لەوجەوروستەمانە ڕزگار بکات، کە لە سەردەستی ئاغاو بەگە زەوی وزار دارەکان‌و بازرگانە سوو وسەلەم خۆرەکان ئەیان چێشت کە سەوزخڕ توتن‌و چەڵتووك‌و پەسوەکانیان هەرزان بە سەلەم ئەکڕێن‌و قازانجێکی زۆریان لێ ئەخستە گیرفانی خۆیان‌و هەندێکیشیان لێ ئەدا بە (ئاغا)و (بەگەکان)، هەروەها بۆ ئەوەشە ئەو هەموو خەرج‌و باجانەیان لە کۆڵ بکاتەوە کە ئەبوو بەپێی داب‌و نەریتی کۆنی خێڵەکی پێشکەشی ئاغاو بەگەکانیان بکەن وەك بەشی لە شیربایی ئافرەت بەشوودراو وکاری سوخرەو بێکارو مەڕانەو دیاری تری وەکو پەنیرو کەرە ومریشك‌و میوەو شتی واکە بۆ دیوەخانی ئاغاو بەگ ئەبرێ.. لەم مەیدانەدا کۆمەڵێ هەقە دەسکەوتی زۆریان لەو گوندو ناوچە کشتوکاڵییانەدا، کە بەشێکی زۆریان خۆیان تێدابوو، وەدەست هێنا"[40].

لەبەر ئەوە لەو ڕووداوانەی کە لەهەقەکاندا لە ناوچەکەدا ڕووی دا دەگەینە ئەم ڕاستی یانەی خوارەوە:

١. هەقەکان سیستەمە (کۆمەڵایەتی-ئابووری)یەکانیان هەڵتەکاند.

٢. ووروژاندنی چینی ئاغاو دەرەبەگ‌و دەسەڵاتدارانی حکومەت دژیان کە لەدوای ئەوەی کار گەیشتە ئەوەی بێتە یانلێدانی ژیانە ئابووریی وکۆمەڵایەتییەکان.

٣. ئەو دێیانەی کە هەقەی تێدا بڵاوبۆوە بووبەگەشەکردنی لە ڕووی کشتوکاڵی ئاژەڵداری.. چونکە ژیانی تەبایی‌و یەکسانی کۆیانی کردبووەو ڕاستی کارەکەیان لامەبەست

بوو.
٤. زیاد بوونی بەرووبوومە ئابوورییەکان لەو سەردەمەی گەشەی هەقەکان.
٥. هێنانی کەرەستەی نوێ باو لە بەکارهێنانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان، کە ئەمە شتێکی نوێ بوو لەوکاتەدا.
٦. کەمی ماوەی گەشەکردنەکەیان و رێگەنەدانیان تا بۆ ئەوەی جێگەی خۆیان بگرن و گەشەی زیاتر بکەن لە بارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەدا..

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١. (یاداشت)، نووسینی رەفیق حلمی، بەرگی یەکەم. لاپەرەکانی (٥٤-٥٥).
٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٦).
٣. (شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠یان (شۆرشی برایم خانی دەلۆ لە بنج و بناوان و لقو پۆپەوە)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٥، بەغداد، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، لاپەرە (١١٥).
٤. هەمان سەرچاوە.
٥. (دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ساڵ ١٩٧٨، لاپەرە (٢١).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٣).
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤).
٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢٤-٢٥).
٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٤).
١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١١. (شۆرشی ئیبرهیم خانی دەلۆ).
١٢. (تأريخ الوزارات العراقية)، بەرگی یەکەم، چاپی حەوتەم، ساڵی ١٩٨٨، نووسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، لاپەرەکانی (٢٧٨،٢٧٢).
١٣. گۆڤاری (افاق العربية)، ژمارە (٧)، ئادار ١٩٨٣.
١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٢٥-٢٦).
١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٦).
١٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٧).
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٨. (تأريخ الوزارات العراقية)، نوسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، بەرگی سێ یەم، (دار الشؤون الثقافة العامة)، بەغدا، ١٩٨٨، لاپەرەکانی (١٤٦-١٤٧).
١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، لاپەرە (١٥٥).
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی پێنجەم، لاپەرە (١٩).
٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی پێنجەم، لاپەرەکانی (١١٠-١١١).
٢٢. بیستم لە گەورەپیاوان و دنیادیدەکان.
٢٣. (تأريخ الوزارات العراقية)، نووسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی بەرگی حەوتەم، لاپەرەکانی (٢٠٥-٢١٠).
٢٤. (العراق الشمالي)، نووسینی (عوبدوڵڵا حەسەن) و (محەمەد هادی ئەلدەفتەر) ساڵی (١٩٥٨) چاپخانەی (شەفیق) بەغدا.
٢٥. ئەم زانیارییانەم لە سەید حەمید محەمەد ئینجە وەرگرتووە کە خەڵکی دێی بەنگۆڵەیە.
٢٦. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای (رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی)، بەغدا، ساڵی ١٩٩٤، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، لاپەرە (٩٥).
٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٦).
٢٨. (العراق العثماني)، لاپەرە (١٨٥).
٢٩. تاريخ الوزارات العراقية، عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، لاپەرەکانی (١١٥-١١٧)، بەرگی حەوتەم.
٣٠. (تطور الحركة الوطنية العراقية ١٩٤١-١٩٥٢)، نووسینی دکتۆر (ئیسماعیل ئەحمەد یاغی)، (منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة)، بەغدا، ١٩٥٩ چاپخانەی (الارشاد)، لاپەرە (٨٤٢).
٣١. (ئاوردانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە)، مستەفا عەسکەری، پیاچوونەوەی محەمەدی مەلاکەریم دوو پاشبەند مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵاو دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ، بەغدا، ساڵی ١٩٨٣ چاپخانەی (عەلا)، لاپەرە (٣٠).
٣٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥-٦).
٣٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٨).
٣٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٩).
٣٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٣٩-٤٠).
٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٠).
٣٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٥٢).
٣٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٧٠).
٣٩. گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٥)، لاپەرە (٧٠)، کانوونی یەکەم ساڵی دووەم، ١٩٨٣، بە ناونیشانی (مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم)، نووسینی رەشید محەمەد عەلی.
٤٠. (ئاوردانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٦٢-٦٣).

### * تەوەری نۆیەم

### *جۆرەکانی زەوی و زاری کشتوکاڵی (کەرکوك) لە رووی چۆنییەتی چاکی زەوییەکەی و لە رووی یاساییەوە هەر لەسەردەمی ئینگلیزەکانەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان:

**سمکۆ بەهرۆز**

*** مێژووی گەشەکردنی کێشەی زەوی و زار لەشاری کەرکوکدا:**

"لەکاتی خۆیدا دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی ئەوەیدا کە هەستێت بە چاککردنی یاسای زەوی، و هەڵوەشانەوەی شێوازی دەرەبەگایەتی و ئەوەی راگەیاند کە هەوڵ دەدات بە دانانی پرۆیەکی تازە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ زەوی و زار، دەوڵەتی عوسمانی هەستا بە دەرکردنی چەند رێنومایەکی تازە کە یەکێك لەو رێخستنە تازانە یاسای تاپۆ بوو، لە پێناوی رووخاندنی موڵکداری تاکە کەس و هەوڵدانی تازە بۆ دروستکردنی پێشکەوتن و ئاوەدان کردنەوە، لە سەرەتادا لە رووی ئابوورییەوە دەورێکی گرنگی بینی بەڵام کارراپیکردنی بەخشینی زەوی بە خاوەنی کەسوکاری هۆزەکان بە هۆی ئەوەی کە جوتیار سوودی لێنەبینێت، بوو بە هۆی ئەوەی چینێکی گەورەی پادشایی و گەورە کارمەندان و پیاوی سوورپا دروست بکات کە هەموو ئەمانە لەگەڵ پێشکەوتنی وولاتدا نەدەگونجا"[(١)].

"بەمجۆرە موڵکداری دەرەبەگە گەورەکان زۆر بە خێرایی پەرەی گرت و لە ئەنجامی ئەو رێبازەدا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا ئەم چەند شێوە موڵکداریە دەبینرا: موڵکداری دەرەبەگەکان، موڵکداری دەوڵەت، وەقف، موڵکداری عەشیرەتەکان و موڵکداری جوتیاران.

موڵکی جووتیارەکانیش دووجۆر بوو یەکێکیان ئەوەبوو کە خاکی دێیەکە هی چەند ماڵە جووتیارێك بوو کە پێیان دەگوتن ووردە مالیك، ئەوی تریشیان ئەوە بوو کە هەرجووتیارەی پارچە زەوییەکی خۆی هەبوو"[(٢)]. لەبەر ئەوە لە پێش هاتنی ئینگلیزەکان و لەماوەی رۆیشتنی تورکەکان لە شارێکی وەکو (کەرکوك) ئەم جۆرە زەوییانە دەبینراو هەنگاوێك بوو لەبەردەم ئینگلیزەکان بۆ جێبەجێکردنی کێشەکان کە پارچە موڵکداری زەوییەکان بەم شێوەیە بووە:– زەوی و زاری خاوەندارو زەوی میری.. و زەوی وەقف، وەقف کراو.. زەوییە واز لێهێنراوەکان یان بەرەڵڵا.. زەوی ئاوەدان نەکراو.. هەروەها زەوی (عوقر).

"هەر لەکاتی هاتنی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز بۆ (عێراق)، هەستیان کرد بە بایەخی زەوی بەشێوەیەکی (یەکتایی – استثنائي) و دایان نا بە بنەرەتی ژیانی ئابووری و سەرچاوەی هێزی سەرەکی هێزە سیاسیە دیارەکانی لەبەر ئەوە سەیردەکەین بایەخیاندا بە کێشەی هەرزەوییەك لەناوچەکانی عێراقدا.."[(٣)].

خوالێخۆشبوو (رەفیق حیلمی) باسی گەشتەکەی دەکات لەگەڵ (بیل)دا بۆ ناوچەکانی (کەرکوك) و (هەولێر) و (سلێمانی) و گەرانی بەناو هۆزو عەشایەرەکانی ئەو ناوچانەداو چۆنییەتی پرسین و هەڵسەنگاندنی ژیانی رۆژانەیان و باری ئابووری و توانای شەرکردنیانی چۆن کۆکردووەتەوە:

"لەم گەشتەدا (نەخشە)یەکی تەقریبی هەرێمی عەشایەرەکانی ئەکێشاو جێ و رێی هەموو عەشیرەتێك و دێهاتەکانی لەسەر ئەم نەخشەیە دەردەخست.. لە جلوبەرگی ئاغا و نۆکەرەکان، لە هی منالیان ئەفکرو بۆی بلوایە سەیرێکی ناوماڵ و تروتفاقی ئەکردن. سەرنجی ئەدایە وولاخی بەرزەیان، مەرومالاتیان و پلەی هێزو دەسەڵاتی شەرو چەشنی ژیان و رابواردنی کاتی ئاشتیانی یەکە یەکە لای خۆی ئەنووسی"[(٤)].

لێرەدا دەگەینە ئەو راستییە هەنگاوێك لە داگیر کردندا کردوویانە هەوڵدان بووە بۆ بەدەست هێنانی ئامارێکی ئابووری رێکوپێکی ناوچە کوردنیشینەکان و دیاریکردنی رێژەو پێوانەی هەر شارێك لە رووی ئابوورییەوە، یەکێك لەم بایەخانە بایەخدان بوو بە دیاریکردنی سنوورو پێوانەی زەوی هەر ناوچەیەك لە ناوچەکانی (کەرکوك).

"ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لە کێشەی زەوی لە ناوچەی وولایەتی (موسڵ)، (کەرکوك بەشێکی دەگرێتەوە) ئەوەیە کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی پاشماوەی شێوازی دەرەبەگایەتی.. جێگەی هەڵوێستە ئاغای کورد لە ناوچە کورد نیشینەکان و شێخ و موختارەکان لە دێیەکانی تر دەسەڵاتێکی فراوانیان هەیە بەسەر ناوچەکان، لەبەر ئەوەی پەیوەندی عەشیرایەتی پەیوەستە بە شێوازی موڵکداری عەشیرەتەکەو لایەنێکی رێکخستنی ئابووری و کۆمەڵایەتییە لەناوچەکەدا.

بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە پێمان گەیشتووە لە (بەریتانیا) ئەوەدەخەنە روو کە ناودارەکانی (کورد) و(تورك) هەموویان لە (ئاغا)و (شێخ)و (موختار)و (مەلا)، خاوەنی دەسەڵات و زۆری زەوییەکان و ناوچەکان بە ناوییانەوە ناونراوە"[(٥)].

"خێزانی دەسەڵاتدار لە هەرهۆزێك پێی دەوترێت ئاغا کە دەتوانرێت بەراورد بکرێت لەگەڵ بارۆنی دەرەبەگایەتی ئەورووپی کە هیچ کاروپیشەی نییەو دەژێت لەسەر سەرانەو دیاری کە ئەمەش دەگوترێت بەپێی کۆمەڵگاکانی ناوچە کوردنیشینەکان.."[(٦)]. کە ناوچەیەکی وەکو کەرکوك لە کاتی هاتنی ئینگلیزەکاندا تارادەیەکی چاك ژیانی خێڵەکی و ئاغایەتی رەگی داکووتابوو، ناوچەکە لەژێر دەسەڵاتیدا بەرێوە دەبراو کەم و زۆر کارتێکردنی خۆی هەبوو لەبارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەدا. چونکە بنکەی (قاعدة) گشتی ئەوە بوو کە هەرجوتیارێك دەیەکی بەرووبوومەکەی دەدا بەخاوەن دەسەڵاتدارو، هەرخاوەن مەرێك ئاژەڵێکی دەدا وەکو باجی (کودە) هەروەها دەبوو ئەو جوتیارە گەلێك تاوانانەی (غرامة) جۆربەجۆر بدات لە پای هەندێك سەرپێچی ئەمەش بۆ ئەوەی دیوەخانەکەی خەرجییەکان پربکاتەوە، هەروەها داوا دەکرا لە خەڵکی گوندەکە کە هەستن بەکاری جۆربەجۆر لە پێناوی ئەودا بەبێ پاداشت، کە گەلێك جار

ئەگەیشتە ئەوەی كە هەژارەكە یان كرمانجەكە زۆر بە توندی چەوسێندراوەتەوە"[7].

"بەهۆی نەبوونی ئاسایش لە ناوچە كورد نیشینەكاندا وایكردبوو لە هەڵگری خاوەن تاپۆیەكی بچووك كە خۆی بزربكات لەژێر چاودێری نزیك ترین (ئاغا) لە پێناوی پشكێك (حصە-سهم) یا لەوانەیە بەرامبەر بە دابەزینی لە ماڤی تاپۆ بچووكەكەی كە موڵكێتی لە زەوی یەكەی.."[8]. "بۆیە ئەگەر بەشێوەیەكی گشتی سەیری وولایەتی موسڵ بكەین (كە كەركوكیش دەگرێتەوە) دەبینین باری ژیانی جووتیار هیچ باش نەبوو، لە پای پەیوەندییەكانی دەرەبەگایەتی یان دەرەبەگایەتیو بازارەكەی لە پای بەرهەمهێنانی تازەدا (پەیوەندییەكانی بەرهەمهێنانی كە پێڕۆی تاپۆ هێنایە گۆڕێ) وایكرد كە ئاغاكانو موڵكدارەكان هەستن بە دەسەڵاتێكی توندو تیژ لەسەر جووتیارەكان.."[9].

"لە كاتی ئینگلیزەكان گەلێك كێشەی گەورەو قورسو گیروگرفتی جۆربەجۆر هاتە رێگایان كە هەمووی خۆی دەبینێتەوە لە شێوازە هەڵەشێوییەكەی جێبەجێكردنی یاساكانی عوسمانیدا. بەڵام ئەوەی سەرنج رادەكێشێت لە هاتنی ئینگلیزەكان ئەوەبووە لەبەرژەوەندییانە كە لەسەر ئەو بنەرەتە كۆبێتەوە كە یاسای عوسمانی پشتی پێبەستبوو لە پێش هەموویانەوە ماڤ دەوڵەت لە موڵكداری یاسایی لەزۆری زەوییەكانی عێراقدا ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

١. چونكە لەبەر ئەوەی ماڤێكی یاسایی دەدات بە دەسەڵات دارە بەریتانییەكان بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر زۆری زەوی وڵاتدا بڕوات، ئەمەش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە وەكو دەسكەلایەك بەكاربهێنرێت بۆ هێزی ناو خۆیی بۆ جێ خۆشكردنی داگیركردنەكە.

٢. ئەبێتە هۆی كەمكردنەوەی بارگرانی دارایی لەسەر دەسەڵاتی بەریتانیا، چونكە بە هۆی ئەو بەرووبوومە كشتوكاڵییانەی زەوی ئەبێتە دەسكەلایەك بۆ ئەوەی گیروگرفتە ئابوورییەكەی پێ چارەسەربكات، دەبێتە دەرامەتێك بۆ وڵات"[10].

لەبەر ئەوە سەیر دەكەین ئینگلیزەكان هەستان بەوەی ئەوزەویو یاسایانە بخەنە چوارچێوەی یاسایەكی قانونی نوێوە، هەڵسان بەدەركردنی گەلێك یاسای زەویو چۆنییەتی هەڵسوكەوت پێی چ پێش مەسەلەی (تسویە) و دوای مەسەلەی (تسویە-رێككردن-تەختكردن)، خۆی لەوەدا دەبینێتەوە كە هەوڵبدەن بۆ ئەوەی وا بكەن لەبەرژەوەندی دەستو پێوەندەكانی خۆیان مامەڵەی لەگەڵدا بكەن، وەكو ئەوانەی لایەنگری خۆیانو لەگەڵ رێڕەوی سیاسەتەكەیاندا هەنگاوبنێن.

لە ناوچەیەكی وەكو (كەركوك) ئینگلیزەكان وایانكرد كە هێزی عەشیرەت گەرایەتی بە هێزبێتو ئەو زەوییانە سەندرایەوە لە خاوەن زەویو زارە توركەكانی كەركوك، كە لایەنگری دەوڵەتی (عوسمانی) بوون دژی بەرژەوەندی ئینگلیزەكان. وەكو خێزانە توركەكانی ئاوچیو یەعقوبیو نەوتچی بەجێهێشتنی كەركوكو راكردنیان بۆ (توركیا)و بەجێ هێشتنی هەموو ماڵو موڵكیانو داگیركردنی لە لایەن هۆزو عەشیرەتەكانی ناو شاری كەركوكدا.

بەڵام ئەوەی سەرنج رادەكێشێت لە مەسەلەی (تسویە) لە سەردەمی ئینگلیزەكانو هەتا دروست بوونی دەوڵەتی عێراقدا بریتی بووە لە (تەسوییەكی) كاتی نەوەكو بەبەردەوامی ئەوەش لەبەرئەوەی وابكەن كە لەبەرژەوەندی خۆیانەوە سووربخوات، هەڵسان بەوەی دەست بكەن بە رێكخستنی ئەو یاساو پێڕەوانەی لە سەردەمی عوسمانیدا باوبووەو خستنە ناو چوارچێوەیەكی یاساییەوە.

"سەیردەكەین ئەو كارەی كە ئینگلیزەكان هەڵدەستان پێی لە كارڕایكردنی (تسویە)دا بریتی بووە لە پەیوەندی لایەنەكانی كێشەی (تسویە) كە لەگەڵ (ئینگلیزەكان)دا هەوڵدان بۆ راكێشانی گەورە هۆزو موڵكدارەكانی شارو سەركەوتن بۆ چارەكردنی ئەو كێشانەی كە ئامادەیەكی زۆر بە بێ چارەسەر مابووە كە لەمەدا گەورە توركەكانو دژە لایەنگرەكانی ئینگلیز زیانیان لێكەوت"[11].

"لەساڵی ١٩٢١دا یاسایەكیان لەسەر فرۆشتنی زەویو زار دەركرد دەربارەی ئەو كرینو فرۆشتنانە كە تۆمارنەكراوە لە پارێزگای كەركوكدا.. ماوەكەی درێژكرایەوە بۆ سیو یەكەمی كانونی یەكەمی ساڵی (١٩٢١)، كە هەریەكە لە وەزیری دادوەریو سەرۆكی وەزیرانو مەلیك فەیسەڵ ئیمزایان لەسەر كردووە".

یاساكە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

(یاسای فرۆشتنی تۆمارنەكراو لە لیوای كەركوك)

ئێمە پاشای عێراقین. لەسەر ئەوەی وەزیر دادوەری پێشكەشی كردووەو ئەنجومەنی وەزیران رەزامەندی نیشان داوە، بریارماندا هەروەكو ئەوەی هاتووە:

**مادەی یەكەم:**

(ئەم یاسایە پێی دەوترێت (یاسای فرۆشتنی تۆمارنەكراوی لیوای كەركوك لە ساڵی ١٩٢١).

**مادەی دووەم:**

(ئەم یاسایە تەنها لە لیوای كەركوك جێبەجێ دەكرێت).

**مادەی سێیەم:**

ئەوماوە درێژكرایەوە بۆ رێكەوتنی فرۆشتنیو مقاوەلات بۆ رێكەوتنی فرۆشتن، پەیوەندكارە بە موڵكدارییەكان لە دەزگای تاپۆ لە لیوای كەركوك بۆ تۆماركردنی بەپێی مادەی (٢) (د)ی بڵاوكراوەی لایەنگیری فرۆشتنی تۆمار نەكراو لە ساڵی (١٩١٩)دا، ماوەكەی درێژ كرایەوە بۆ سی وییەكی مانگی كانوونی یەكەم ساڵی (١٩٢١).

**مادەی چوارەم:**

لەسەر وەزیری دادوەری پێویستە بۆ جێبەجێكردنی ئەم بریارە. ئەمە نوسرا لە (بەغداد) لە رۆژی دوانزەهەمی مانگی (سەفەر) ساڵی (١٣٤٠) لە پێنجی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٢١"

| | |
|---|---|
| وەزیری دادوەری | سەرۆكی وەزیران |
| ناجی ئەلسویدی | عەبدولرەحمان |
| مەلیك فەیسەڵ [12] | |

"بەپێی یاسای ژمارە (٢٣)ی ساڵی (١٩٢٧) ئەو زەوییانە کە بەناوی سوڵتان (عبدولحەمید)ەوە تۆمار کرابوون پێیان ئەوتن (سنیە).. کەوتنە ژێر دەستی میرییەوەو هەموو کاررایکردنێکی هەڵوەشایەوە، کەرکوکیش نموونەی ئەم جۆرە زەوییانەی تێدا هەبوو، دەگەڕێتەوە سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمید)"[١٣].

"یەکێك لەو زەوییانەی لە شارێکی وەکو کەرکوکدا نموونەی زۆربووەو کێشەی لەسەردروست بوو، زەوی وزاری (عقری) بوو، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمید) دادەنرێت بەزەوی (خەراجی)، خاوەنەکەی ماف موڵکدارێتی هەیە بە تەواوی، خاوەنەکانیان ماف هەڵگرتنی سەنەداتی خاقانیان هەیە.. بەڵام لە کاتی هێرشەکەی (مەدحت پاشا) و ئاوەدانکردنەوەی (عێراق)دا هەستان بە کێشانەوەی ئەم زەوی وزارانە لە خاوەنەکانیان و راکێشانی هەموو ئەو زەوییە (عقری)یانە کە ئەبێت لەنێوان (١/٢٠ و ١/٤٠)ی بەرهەمی ئەم زەوییە نەدرێت بە خاوەن زەوی (عقری)"[١٤].

کاتێك ئینگلیزەکان هاتنە (عێراق) بوونی ئەم زەوییە (عقری) یانە کێشەیەك بوو لەبەردەمیانداو پێویستی بەچارەکردن هەبوو. هەرئەمەش بوو پەرلەمان لە ساڵی (١٩٣٢)دا یاسایەکی دەرکرد بۆ هەڵوەشانەوەی ئەم زەوییانە کە یەکێك لە جێگرەکانی پەرلەمان بەناوی (مستەفا یەعقوبی) لە شاری کەرکوك بەرگری لەم یاسایە کردو دژی زەوی (عقری) وەستا. چونکە ئەو وای دانا گەلێك لەو زەوییانە تەنها بە خوێندنەوەی (قائمە) لە سەردەمی سوڵتان (عەبدولحەمید) بەدەست هێنراوە. هیچ مافێکی یاسایی نییە بۆ مانەوە لەژێر دەسەڵات بۆیە پەرلەمان بڕیاریدا: "کە (عەقر) لە عێراق نییەو بڕیارماندا بەسڕینەوەی بۆ هەتاهەتایی"[١٥].

"میری بەپێی یاسای ژمارە (٥٠)ی ساڵی (١٩٣٢) بڕیاری تەسوییەیدا لە ساڵی (١٩٣٨)دا یاسای ژمارە (٢٩)ی دەربارەی (تسویە) دەرکرد، بۆیە یاسای تەسوییەی زەوی وزاری کردە چواربەشەوە وەکو ئەمانەی خوارەوە:

١. زەوی خاوەندار.
٢. زەوی میری.
٣. زەوی وەقف کراو.
٤. زەوی وازلێهێنراو وبەرەڵلا"[١٦].

"نەخشەی داگیرکردنی زەوی وزارو دابەشکردن و تۆمارکردنی بە ناوی سەرۆکی هۆزو ئەندامانی پەرلەمان و مووچە خۆرە گەورەکانەوە سپێردرا، بەو سەرۆك تەسوییانەی کە لە سووپادا ئیشیان کردبوو بە تایبەتی ئەوانەی ئینگلیزەکان بە دڵیان بوون.. بۆ وێنە (کاپتەن دەبلیو. ئی. لاین) کرا بە سەرۆکی تەسوییەی زەوی وزاری (کەرکوك) و بەڕێوەبەرایەتی لیژنەکانی (هەولێر) و (سلێمانی)شی پێ سپێردرا."[١٧].

"مستەر (لاین) پێویستی سەرشانی خۆی بە گوێرەی پرۆگرامێکی تایبەتی بەجێهێناو، ماف جوتیارانی کوردی خستە ژێر پێوەو هەرچی قەواڵەو تاپۆ کانیان هەبوو هەمووی بەهیچ دەرچوو، زەوییەکی پان و بەرینی بە ناوی سەرۆك هۆزەکانەوە تۆمارکرا"[١٨].

"بەڵام بە جێهێنانی تەسوییە لە زۆر شوێنی کوردستان دواکەوت، تەنها لە پێدەشتەکانی (هەولێر) و (کەرکوك) و (موسڵدا) توانای ئیشکردنی هەبوو"[١٩]. ئەمەش خۆی لەگەڵێك کێشەی جۆربەجۆر دەدیتەوە کە ساڵ وا هەبوو گەلێك ئاژاوەی گەورەی دروست دەکرد لەلایەن (ئاغا) و (دەرەبەگ) و (جوتیار)دا، وای لێ دەهات گەلێك جار جووتیارەکە بە کووشت دەچوو، نموونەی ئەم جۆرە لە ناوچەکەدا زۆر ڕوویدا بە تایبەتی لە ناوچەی لادێکانی، داسەپاندنی یاسای تەسوییە بوو بە هۆی ئەوەی هەتا ببێتە دواکەوتنی بەرهەمهێنان و هیچ جۆرێك لەم یاسایانە دەوریان نەبینی لە چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و زار.

لەدوای ساڵانی (١٩٣٤)دا گەلێك یاسای جۆربەجۆر دەرچوو، بەڵام ئەم یاسایانە دوورو نزیك هیچ دەورێکی ئەوتۆیان نەبینی لە چارەسەرکردنی کێشەی زەوی وزاری ناوچەی (کەرکوك). "لە ساڵی (١٩٤٣)دا گەلێ لیژنەی تەسوییە دانراو کەوتنە گەڕ لەگەڵ ئەوەشدا لیژنەکان ناچاربوون هەندێك زەوی و زار بە ناوی جووتیاری خاوەنەکانیان کەوا لە ژیاندان بنووسن، بەڵام شان بەشانی ئەوەش زەوی وزارێکی زۆرو فراوانیان بەناوی سەرۆك هۆزەکانەوە تۆمارکرد، بەجۆرێکی ئەوتۆ سێ یەکی هەموو زەوییەکانی میری لە ناوچەی کوردستاندا دابەشکرا بەسەرسەرۆك و دەرەبەگەکاندا"[٢٠].

"ئەم بارە مایەوە تا شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەسەرداهات و دوای ئەوە بەرەو دوا یاساکانی چاککردنی کشتوکاڵ بڵاوکرانەوە بە تایبەتی یاسای ژمارە (٣٠)ی ساڵی (١٩٥٨) و یاسای ژمارە (١١٧)ی ساڵی (١٩٧٠)دا"[٢١].

ئەوەی لەم ساڵانەی دوایدا دەربارەی دابەشکردنی زەوی و زار کرا وەکو ڕێرەوێکی بە عەرەب نیشتەجێ کردن، ئەویش دابەشکردنی زەوی و زار بوو بە سەر عەشیرەتەکانی دەشتی (حەویجە)دا. "کەزەوی ئەم پرۆژەیە زەوی وزاری ئەمیرییە کە دەستکرا بە دابەشکردنی بەسەر نیشتەجێ بووەکان لەسەر شێوەی (٨٠) مەشارە بۆ هەریەکێك کە بۆ ئەو زەوییانەی ئاو دەدرێت لە لقی سەروو و لقی ڕۆژئاواو لقی خواروو، بەڵام ئەو زەوییانەی کە ئاو دەدرێت لە لقی ڕۆژهەڵاتی پرۆژەکە (٧٠) مەشارە دابەشکرا بەسەر هەر جووتیارێکدا"[٢٢]. هەروەها ئەمەش لە یاسای (١١٧)ی (١٩٧٠)دا خۆی دۆزییەوە بەوەی کە:- "ئەوەی لە بەندی بیست و یەکی یاساکەدا هەیە ئەڵێ دروستە تا (٣٠٠) دۆنم یان (١٥٠) دۆنم بەراو بکرێ بەگەنم و جۆو بەرهەمی تری زستانە، بدرێ بە ئەستۆگر (ملتزم)یان بەسەرکار یابەکەسێ کە زەوییەکی میری ڕووتی بەدەستەوە بێ لە پرۆژەی (حەویجە)دا"[٢٣]، کە ئەمەش هەنگاوێك بوو بۆ ئەوەی زیاتر خەڵکە عەرەبەکە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بکەن.

بەردەوام بوونی داگیرکردنی زەوی و زاری کشتوکاڵی ناوچەی کەرکوك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەردەوام بوو، هەر جارەی بە گێچەڵێك و بیانوویەك تا بۆ ئەوەی وابکەن لەژێردەستی جووتیاری کوردی رابکێشن و گەلێك جار کار گەیشتۆتە ئەوەی تەنانەت بۆ بژاردنیش (التعویض) نەدراوە پێی ولێی زەوت کراوە.

لەنێوان ساڵانی (١٩٧٥-١٩٨٤) زەوییەکی زۆرکرا بە قەدەغە

کراو چ بە ناوی ئەوەی ئۆردوگای سەربازی لێ دروست دەکرێت یان بە ناوی ئەوەی خزمەت گوزاری تێدا جێبەجێ دەکرێت بە تایبەتی لە کاتی هێنانی عەرەب بۆ ناوشارەکەو دەوروبەری کە زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی کرا بە جێگای دروستکردنی خانوو بۆ هاتووە عەرەبەکانی ناوشاری (کەرکوك)و هەمووی داگیرکرا لەکەس‌و کارەکانیان‌و زەوییەکی زۆری چاکی کشتوکاڵی لەدەست دراو فەوتێنرا بەتایبەتی لەلای گوندی حەسارەکانەوە کە باشترین زەوی کشتوکاڵی بووە.

لە دوای ساڵی (١٩٨٩)دا بەهۆی کارەساتە شوومەکەی (ئەنفال) هەموو زەوییەکانی کەرکوك‌و دەوروبەری کرا بەقەدەغەو بێ بەشکرا لەبەرهەمهێنانی کشتوکاڵی‌و خەڵکەکەی بۆ شوێنێکی نادیار ڕاگوێزرا، کە لەمەودوا ڕێژەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی‌و ئاژەڵی هاتە خوارەوەو هەموو ئەو زەوییانە قەدەغە کرا لە کێڵان‌و تۆوکردن کە ئەمە تا ساڵی (١٩٩١)ی بەم شێوەیەی خایاند، هەستا بە دروستکردنی ئۆردووگاو ڕەبایەی سەربازی‌و تەقینەوەی هەموو کانیاوەکان‌و پرژاندنی کەرەستەی کیمیاوی بۆ سەرزەوییەکان، تا بۆ ئەوەی بەکەڵکی تۆوکردن‌و کێڵان نەیەت جارێکی تر..، ئەو شوێنانەش کە بۆنی ئەوەی دەکرد کە نەوتی تێدا هەیە هەوڵی دەدا خەڵکەکەی ڕاگوێزرێت ئینجا هەوڵی دەرکردنی بدات یان بیرەکانی لێ دەداو دایدەپۆشییەوەو زەوییەکەی زەوت دەکرد.

بەهۆی قەیرانە ئابوورییەکەی نێوان ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٦) دا هەستان بەدابەشکردنی ئەم زەوییانەی کە قەدەغە کراوە لە تۆوکردن‌و کێڵان‌و دانی بەکرێ بەعەرەب بۆ بەرهەمهێنان تا بۆ ئەوەی بەشێك لە ئاستەنگە ئابوورییەکەی پڕکاتەوە بێ ئەوەی بیداتەوە بەخەڵکە بنەڕەتەکەی، بەڵکو هەوڵی داوە بەهەر شێوەیەك بوو بێت بەرهەمەکەی بەدەست بهێنێت، بەڵام ئەمەش لە خۆیدا گەلێك جار کێشەی دروستکردووەو هەتا ئەو کەسانەی زەوییەکانیان بەکرێ گرتووە تەنها ئەو شوێنانەیان ویستووە کە نزیك بووە، ناوچە دوورەکان‌و شوێنەکانی کە حکومەتی پێ نەگەیشتووە هەر بە بەرەڵڵایی ماوەتەوە. یان ئەوانەش کە تۆوکراوەو کێڵراون بەرهەمێکی واینەبووە، ساڵ هاتووە کە کرێ گرتە زیانی کردووە، لەبەرئەوەی گەلێك جار تووشی سووتانبووە چونکە کەوتووەتە شوێنی سنووری قەدەغەکراو، شوێنی ئۆردووگای سەربازی کەلەمەوە ئەستۆگرەکە تەنها زیانی لێکەوتووە.

بە هۆی مانەوەی زەوییەکی زۆر لە ناوچەکانی (خورماتوو) و (لەیلان)و (داقوق)دا بەدەست کوردەکانی تاڵەبانی‌و داودەو کاکەیی دا وای کرد کە بیر لە داگیرکردنی بکاتەوە، بۆ هەرجارەی گێچەڵێك دەدۆزێتەوە بۆ لێسەندنەوەیان‌و دەرکردنی لەژێر دەستیان. لە ساڵی (١٩٩٤- ١٩٩٥)دا هەستا بە دەرکردنی ژمارەیەك کوردی خەڵکی (لەیلان) بۆ ناوچەکانی خوارووی (عێراق)و داگیرکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بەبێ هیچ هۆیەکی یاسایی‌و دابەشکردنی بەسەر عەرەبە نیشتەجێ بووەکان کە هێنراوە بۆ (کەرکوك).

لە ساڵی (١٩٩٤)دا دەستیکرد بە ڕاکێشانی پرۆژەی ئاودێری لەنێوان (داقوق)و (خورماتوو) کە ئەمەش تێدا زەوییەکی زۆری کەوتە بەر ئەم پرۆژەیە یان ئەو ساڵانە نە تۆو کرا یان نەکێڵرا.

هێنانی ژمارەیەکی زۆری عەرەب بۆ ناوچەکانی خورماتوو تازەو (داقوق)و نیشتە جێ بوونیان لە ناوچەکەدا. لەساڵی (١٩٩٥-١٩٩٦)دا کێشەیەکی دروستکرد بە ناوی ڕاگوێزتنی (تاڵەبانی)و (کاکەیی)وە، وەبۆ داگیرکردنی زەوییەکانیان ئەگەر بێت‌و خۆیان بە (عەرەب) ناوزەد نەکەن ئەمەش هەنگاوێك بوو بۆ داگیرکردن. هەروەها دابراندنی بەشێکی گەورەی کوردستان لە عێراق خۆی لەخۆیدا بەشێکی زۆری زەوی کشتوکاڵی کەرکوکیش دابڕاوەو کەوتووەتە هێڵی ڕووبەڕووبوونەوە وەکو ناوچەکانی (شوان)و (قەرەهەنجیر)و (قادرکەرەم)و (چەمچەماڵ)و (خانەقین)و (کفری)و (کەلار)، کە ئەمە تا پرۆسەی ڕزگارکردنی عێراق بەردەوام بوو.

هەرچەندە ئەم ناوچانەی لە ڕووی بەڕێوەبەرییەوە بەدەستی نەماوە بەڵام لە ڕووی بەرهەمهێنانەوە هیچ سوودێکی نییە، چونکە کاتێك دێتە بەرهەم دەست دەکات بە سووتاندنی‌و بە تاڵان بردنی بەرهەمەکەی‌و بەفیڕۆدانی هەموو ڕەنجێکی ئەو ساڵە بۆ تۆوکردن‌و کێڵانی لەو ناوچانەدا.

ئەگەر لە ڕوویەکی ئابوورییەوە سەیرێکی ئەم زەوییانە بکەین دەبینین هیچ ڕێژەیەکی وا گرنگ بەرووبوومی نییە ساڵێك لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەك جیاوازی هەیە چ لە ڕووی باران‌و ئاوو باری سیاسی ڕۆژگارەکەدا، لەبەرئەوە ئەگەر سەیری ئامارەکانی نێوان ساڵانی (١٩٨٩-١٩٩٦) بکەین ڕێژەی بەرهەمهێنانی زۆر کەمەو ساڵ وا هەبووە هاتۆتە سەر (سفر).

### * جۆری زەوی‌و زارەکانی ناحییەکانی (کەرکوك) لە ڕووی یاساییەوە:

لەکاتی مەسەلەی (تەسوییە)دا زەوی (عێراق) کرا بە چوار بەشەوە لە ڕووی یاساییەوە لەوانە :-زەوی خاوەندار (موڵکدار)و زەوی میری‌و زەوی وەقف کراو زەوی واز لێهێنراو بەرەڵڵا.. "کۆی زەوی موڵکدارێتی کشتوکاڵی هەر لەنێوان ساڵانی (١٩٧٩-١٩٩٤) (٢١٦٥٥٠٠) دۆنم بووە"[٢٤].

"لە ساڵی (١٩٥٨)دا کۆی زەوی پارێزگاکە بە شێوەی (تاپۆ) دیاریکراو (١٩٢٥٨٣٦) مەشارەیە، کە ناحییەی (شێروانە) کۆی زەوی بە تاپۆ (٣٧٢,٥٩٥) مەشارەیە لە دوای ئەوەدا (پردێ) دێت کە کۆی زەوی بەخشراو بە (تاپۆ) بریتییە لە (٢٧٢٩٩٠) مەشارە. کۆی زەوی بەخشراو بەتاپۆ لە داقوق (٢٦١,٠٤١) مەشارەیەوە بچووکترین کۆی زەوی بەخشرا بە تاپۆ، ناوچەی (قەرەتەپەیە) کە دەکاتە (٥٥٨٣) مەشارە"[٢٥].

بۆ زیاتر شارەزایی لە ڕێژەی بەخشراو بە زەوی تاپۆ بڕوانە خشتەی ژمارە (١) لە خوارەوە.

**خشتەی ژمارە (١)[٣٦]**

| ز | شوێنەبەڕێوەبەرییەکەی | پێوانەکەی بە مەشارە |
|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١٧٠٨١١) مەشارە |
| ٢ | قەرەحەسەن | (١٣٧٨٥٤) مەشارە |
| ٣ | پردێ | (٢٧٣٩٩٠) مەشارە |
| ٤ | حەویجە | (٣٣١٨٤) مەشارە |
| ٥ | ناحییەی شوان | (١٩٦٢٦١) مەشارە |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (٨٢٦٥٤) مەشارە |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (٥٥٨٣) مەشارە |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (٣٧٢٥٩٥) مەشارە |
| ٩ | قەزای چەمچەماڵ | (١٢٧٩٨٢) مەشارە |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٣٧١٢٢) مەشارە |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٦٤٤١٤) مەشارە |
| ١٢ | ناحییەی خورماتوو | (٩٧٠٧٦) مەشارە |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (٢٦١٠٤١) مەشارە |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرەم | (٦٥٢٦٩) مەشارە |
| | کۆی گشتی: | (١٩٢٥٨٣٦) مەشارە |

بەڵام ئەگەر بێتوو سەیری ئاماری ساڵەکانی (١٩٧٠-١٩٩٤) بکەین دەبینین ڕێژەی زەوی بەخشراو بە (تاپۆ) زۆر کەم بووەتەوەو لە گەلێك شوێندا هەردەوری نەماوە. زەوی بەخشراو بە ئەستۆگر (اللزمة) بریتییە لە کۆی (٩٣٦٦٧١) مەشارە کە قەزای (خورماتوو) کۆی ئەم زەوییانەی بریتییە لە (٢٢٥٠٣٣) مەشارە لەدوای ئەودا (قەرەتەپە) کۆی ئەم زەوییانەی بریتییە لە (٢٢٣٨٢٥) مەشارە. بەڵام ناحییەی (پێبان) لەم جۆرە زەوییانەی نییە[٣٧]. بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە (٢).

**خشتەی ژمارە (٢)[٢٨]**
**دابەش کردنی زەوی بەخشراو بە ئەستۆگر (اللزمة)**

| ز | شوێنی بەڕێوەبەرییەکان | پێوانەکەی بە مەشارە |
|---|---|---|
| ١ | (مەرکەزی قەزای کەرکوك) | (١٢٦,٦٧٥) مەشارە |
| ٢ | (ناحییە قەرەحەسەن) | (٩٤٤٤٣) مەشارە |
| ٣ | (ناحییەی پردێ) | (٢٩١١٦) مەشارە |
| ٤ | (ناحییەی حەویجە) | (٢٢٨١٧) مەشارە |
| ٥ | (ناحییەی شوان) | (٦٢٩٥) مەشارە |
| ٦ | (ناحییەی پێبان) | -- |
| ٧ | (ناحییەی قەرەتەپە) | (٢٢٣٨٢٥) مەشارە |
| ٨ | (ناحییەی شێروانە) | (٥٢٩٢٤) مەشارە |
| ٩ | (ناحییەی چەمچەماڵ) | (٣١٨٨٧) مەشارە |
| ١٠ | (ناحییەی ئاغجەلەر) | (٨٦٧٢) مەشارە |
| ١١ | (ناحییەی سەنگاو) | (١١٤٢٥) مەشارە |
| ١٢ | (مەرکەزی قەزای خورماتوو) | (٢٢٥٠٣٢) مەشارە |
| ١٣ | (ناحییەی داقوق) | (١٥٦٣٦) مەشارە |
| ١٤ | (ناحییەی قادرکەرەم) | (٨٧٩٢٤) مەشارە |
| | کۆی گشتی | (٩٣٦٦٧١) مەشارە |

بەڵام کۆی زەوی میری بریتییە لە (٥٣٨٥٠٤) مەشارە لە قەزای (حەویجە) (٣٢٤٤٥٤) مەشارە دەبێت لەدوای ئەو مەرکەزی قەزای کەرکوك دێت بە ڕێژەی (١٥٣٩٧٧) مەشارە، هەر یەکە لەناوچەکانی (قەرەحەسەن)و (پێبان)و (ئاغجەلەر) لەم جۆرە زەوییانە بەرچاو ناکەوێت.

بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە (٣)ی دابەشکردنی زەوی میری لەپارێزگای کەرکوکدا.

خشتەی ژمارە (٣)[29]

| ز | شوێنە بەرێوەبەرییەکان | پێوانە بە (مەشارە) |
|---|---|---|
| ١ | (مەرکەزی قەزای کەرکوك) | (١٥٣٩٧٧) مەشارە |
| ٢ | (ناحییەی قەرەحەسەن) | -- |
| ٣ | (ناحییە پردێ) | (١٢٦٦) مەشارە |
| ٤ | (ناحییەی حەویجە) | (٣٢٤٤٥٤) مەشارە |
| ٥ | (ناحییەی شوان) | (١٥٧٠) مەشارە |
| ٦ | (ناحییەی پێباز) | -- |
| ٧ | (ناحییەی قەرەتەپە) | (٢٥٥٦٦) مەشارە |
| ٨ | (ناحییەی شێروانە) | (٦٣٤٩) مەشارە |
| ٩ | (ناحییەی چەمچەماڵ) | (٥٠٣٢) مەشارە |
| ١٠ | (ناحییەی ئاغجەلەر) | -- |
| ١١ | (ناحییەی سەنگاو) | (١١٣٤٤) مەشارە |
| ١٢ | (مەرکەزی قەزای خورماتوو) | (١٩٨٤) مەشارە |
| ١٣ | (ناحییەی داقوق) | (٦٦٠) مەشارە |
| ١٤ | (ناحییەی قادرکەرەم) | (٦٣٠٢) مەشارە |
| | **کۆی گشتی** | (٥٣٨٥٠٤) مەشارە |

*** جۆرەکانی زەوییە مەوقوفەکان بریتییە:**

"زەوییە مەوقوفەکان لە جێدا ئەو زەوییانەن کە بەر مزگەوت و قوتابخانەو پیاوە ئاینییەکان کراون و ئەو زەوییانە کڕین و فرۆشتنیان لەسەر نییەو هەرگیز دەستاو دەستیان پێناکرێت. لەپاشان پیاوە ئاینییەکان بەشێکی زۆریان لە زەوی جوتیارەکان داگیر کردوو بە مەوقوفیان دانا.."[30].

١. "ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەیە کە کراونەتە (وقف) بۆ ئەوەی داهاتەکەیان لە مەبەستی ئاینی و کۆمەڵایەتی خەرج بکرێ وەك دروستکردنی قوتابخانەو مزگەوت و لێدانی کارێزو شتی لەو بابەتە. سەربەستی ئەو جۆرە زەوییانە لەدەست پیاوە ئاینییە گەورەکان دایە.

٢. "ئەو زەوییە کشتوکاڵییانەیە کە بە پیاوە ئاینییەکان سپێردراون، بەو شەرتە پاش مردنی خاوەن (وەقف) داهاتەکەیان بۆ نەوەو نەتیرەکەی بێ. لێرەدا مەبەستی خاوەن وەقفەکە هەر ئەوەیە کە زەوییەکە نەفرۆشێ و بۆ نەوەو نەتیرەکەی بمێنێتەوە. یان ئەوەیە کە داهاتەکەیان بە جۆرێکی ڕەواو عادیلانە لە ناو دابەش بکرێ"[31].

مامۆستا (مستەفا نەریمان) بەم جۆرە ڕوونی دەکاتەوە کە (ئەوقاف) ماف خۆی چۆن دەسەپێنێت لەم جۆرە زەوییانە: "لەسەرمان بوو بەوادەی مانگێ چل ڕۆژ دێهاتەکانی ناوچەی گەرمیان و دەوروپشتی (کفری) تەخمین بکەین، چۆنییەتی خەملەکەش ئەوە بوو ئەگەر جوتیارەکان درەوەیان کردبێت ئەچووینە سەرخەرمان و بەپێی (تەن)و تەقدیر دەکرا، ئەگەر هێشتا دروێنە نەکراوە (بەپێوەیە) ئەوە ئەچووینە سەری و بەپێی ڕووبەرو چەشنی دانەوێڵەکە تەقدیر ئەکرا.."[32].

"زەوی وەقف کراو لە ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا لە شارەکە (٦٩٤٢١) مەشارە بووە کە پلەی یەکەم لەم ناوچەیەدا بریتییە لە (٤٥٥١٢) مەشارە لە ناوچەی (قادرکەرەم) وەلەدوای ئەو ناحییەی شێروانە دێت بەرێژەی دووەم کە بریتییە لە (١٣,٠٨١) مەشارە"[33]. (بۆ زیاتر شارەزایی بروانە خشتەی ژمارە (٤) لەنێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٥٩).

بەڵام ئەگەر سەیری کۆی زەوی و زاری (وقف) بکەین لەنێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٩٤)دا دەبینین رێژەی زەوی وەقف زۆر کەم بووەتەوە کە گەیشتۆتە (٥٧٠٠) دۆنم[34]. ئەمەش بەڵگەیە لە کەم بوونەوەی زەوی بەناو (وەقف) کە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ داگیرکردنی لەلایەن کاربەدەستان و پیاوە ئاینییەکانی شارەکە، گەلێك جۆرو ڕێگا بەکار هاتووە بۆ سڕینەوەی ئەم زەوییانە بە (وەقف)و تۆمارکردنی بە ناو پیاوە ئاینییەکانەوە، یان دابڕینی بەشێکی ئەم زەوییانە بۆ دروست کردنی خزمەت کارگوزارییەکان و سڕینەوەی لە خانەی زەوی (وەقف). ئەوەی کە زیاتر ڕێژەی ئەم زەوییانەی کەم کردووەتەوە لە پارێزگاکە چۆڵکردنی زەوییەکی زۆری وەقف لەلادێکان پاش کارەساتی (ئەنفالە) شوومەکە، بوو بە هۆی کاولکردنی هەموو ئەو زەوییانە.

**خشتەی ژمارە (٤)[٣٥]**
**چۆنییەتی دابەشبوونی زەوی (وەقف) لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | پێوانەی بە مەشارە |
|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٤٩٧) مەشارە |
| ٢ | ناحییەی قەرەحەسەن | (١٨٥١) مەشارە |
| ٣ | ناحییەی پردێ | ---- |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | ---- |
| ٥ | ناحییەی شوان | ---- |
| ٦ | ناحییەی پێباز | ---- |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | ---- |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (١٣٠٨١) مەشارە |
| ٩ | قەزای چەمچەماڵ | ---- |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | ---- |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٥٨٩٨) مەشارە |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٢٠٠) مەشارە |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (٢٣٨٢) مەشارە |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرم | (٤٥٥١٢) مەشارە |
| | کۆی گشتی | (٦٩٤٢١) مەشارە |

بەڵام زەوی موڵکدار بریتی بووە لە (٩٨٥) مەشارە لە پارێزگاکە، کە زۆری ئەمە لە ناوچەی سەنگاودایە دەکاتە (٨١٠) مەشارە،وە ناحییەی داقوق دەکاتە (١٧٥) (مەشارە) لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا[٣٦]. "هەروەها کۆی موڵکداری تایبەتی لە ساڵی ١٩٧٩ دا نزیکەی (٩٣٢٩٠٠) دۆنم بووە کە تا ساڵانی ١٩٩٤ یش هەمان ڕێژە بوو"[٣٧]. "هەروەها ئەو زەوییانەی کە تا ئێستا تەسویە نەکراوە نزیکەی (٢٥٨٥٣) مەشارە دەبێت کە بەرێژەی یەکەم لە ناحییەی (پێباز)(٢٢٢٤٥) مەشارە هەیە لە ناحییەی سەنگاو (٣٦٠٨) مەشارە هەیە[٣٨]. بەڵام زەوییەکانی (اصلاح الزراعي) لە پارێزگاکەدا (١٢٢٦٨٠٠) دۆنم بووە کە (٨٤٤١٠٠) دۆنم دابەش کراو (٤٠٢٧٠٠)دۆنم بەکرێ بووە لە ساڵی (١٩٧٩-١٩٩٤)دا[٣٩].

*** جۆرەکانی زەوی و زاری کشتوکاڵی لە ڕووی چاکی و جۆری بەرهەمهێنانەوە:**

لەم بەشەدا هەوڵدەدەم کە زەوی و زارەکان دابەش بکەم لە ڕووی یەکە کشتوکاڵی و بەڕێوەبەرییەکان و زەوییەکانی دابەش بکەم لە ڕووی چاکی و خراپی بەرهەمهێنان و لە ڕووی بەکارهێنانی کەرەستەو ئامرازی ئیشکردن و بەکارهێنانی ئاژەڵ، هەروەها هەوڵی دیاریکردنی زەوی سەوزەو میوەو گژو گیاو بە جێهێڵراوو لەوەڕگاش دیاری بکەم. ئەگەر سەیری دابەشکردنی زەوی کشتوکاڵی بکەین لە ڕووی بەرهەمهێنانەوە دەبینین چەند هۆیەك دەوریان هەیەو دیاریکردنی ئەو دابەشکردنانەی سەرەوە لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێك و لە وەرزێکەوە بۆ وەرزێك. بۆ نموونە ڕێژەی باران بارین و پلەی گەرماو بەکار هێنانی پەینی کیمیاوی و بەکارهێنانی کەرەستەی نوێی باو لە ئیشکردندا.
کۆی موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییەکانی ناوچە بەڕێوەبەرییەکانی کەتێدا کەرەستەو ئاژەڵی تێدا بەکار دەهێنرێت بریتییە لە (١٧٣٣٠) مەشارە لە هەموو پارێزگاکە دا، گەورەترین ناوچەی ئەو موڵکدارییە کشتوکاڵییە ناحییەی حویجەیە کە (٣٩٣٨) مەشارەیە، لەدوای ئەوەدا مەرکەزی قەزای کەرکوك (٢٧٤٠) مەشارەیە، لەدوای ئەوەدا ناحییەی شوانە کە (١٤٧٠) مەشارەیە، ئینجا ناحییەی قەرەتەپە دێت کە (١٣٠٣)مەشارەیە. بچووکترین یەکەی موڵکداری کشتوکاڵ ناحییەی (داقوق)ە کە (١٠٧) مەشارەیە. کۆی گشتی ئەو زەوییانەی کە ئامرازو ئاژەڵی تێدا بەکاردەهێنرێت بریتییە لە (٤٦٤) مەشارەیە کە مەرکەزی قەزای کەرکوك بەرێژەی یەکەم دێت کە (٢٧٤) مەشارەیە، کۆی ئەو زەوییانەی کە نە ئامرازوو ئاژەڵی تێدا بەکارناهێنرێت بریتییە لە (٣٠٥) مەشارەیە[٤٠]. "بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە (٥) ".

**خشتەی ژمارە (٥)(٤١)**
**ئەو موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییانەی کە تێیدا ئامرازو ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت**

| ز | یەکە بەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییەکانی یەکە بەڕێوەبەرییەکان | تێیدا ئامرازو ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت | تێیدا ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت | تێیدا نەئاژەڵ نە ئامراز بەکار ناهێنرێت |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوک | (٢٧٤٠) | (٢٧٤) | (٢٤٣٢) | (٣٤) |
| ٢ | ناحییەی قەرەحەسەن | (٩٥٩) | (٢١) | (٩٢٠) | (١٨) |
| ٣ | ناحییەی پردێ | (٦٤١) | (٦١) | (٥٨٠) | (-) |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | (٣٩٣٨) | (٣٧) | (٣٨٢٠) | (٨١) |
| ٥ | ناحییەی شوان | (١٤٧٥) | (٢) | ١٤٦٠) | (١٣) |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (٢٨٠) | (-) | (٢٧٨) | (٢) |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (١٣٠٣) | (٥) | (١٢٤٤) | (٥٤) |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (٤٥٥) | (٣) | (٤٥١) | (١) |
| ٩ | مەرکەز قەزای چەمچەماڵ | (٩٢٢) | (٦) | (٩٠٣) | (٩) |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٥٠٦) | (-) | (٤٧٨) | (٢٨) |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٧٦٠) | (١) | (٧٥٣) | (٦) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزا خورماتوو | (٢١٣٢) | (٤٩) | (٢٠٤١) | (٤٢) |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (١٠٧) | (٥) | (٩٩) | (٣) |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرەم | (١١١٢) | - | (١٠٩٨) | (١٤) |
| کۆی گشتی | | (١٧٣٣٠) | (٤٦٤) | (١٦٥٦١) | (٣٠٥) |

ئەگەر سەیری کۆی گشتی پێوانەی پارێزگاکە بکەین دەبینین رووبەرەکەی لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا (٧,٨١٧,٢٠٠) مەشارە بووە کە دەکاتە (١٩,٥٣٤) کیلۆمەتر دووجا. زەوی چاکی بۆ کشتوکاڵ بریتی بووە لە (٣,٤٨٧,٧٢٥) مەشارە کە دەکاتە (٨,٧١٩) کیلۆ مەتر دووجا[٤٢].

بەڵام ئەگەر سەیری زەوی کێڵراوی بکەین بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٧) دەبینی بریتی بووە لە (١,٧٣٤,٢٥٩) مەشارە کە ئەم ئامارە لە وەرزی ساڵانی نێوان (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بریتی بوو لە (١,٧٥٩,٦٥٩) مەشارە[٤٣]. رێژەی زەوی و زاری کێڵراو بۆ پێوانەی زەوی وزاری چاکی کشتوکاڵی بەرێژەی (٥٠,٤) بووە[٤٤]. ئەگەر سەیری زەوی بە جێ هێڵراو بکەین لە ئاماری وەرزی ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٧) بریتی بووە (١,٧٤٥,٤٣٩) مەشارە کە ئەم رێژەیە لە ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بریتی بووە لە (١,٧٢٢,٣١٩) مەشارە، ئەمە دەیسەلمێنێت کە رێژەی زەوی بەجێ هێڵراو کەمی کردووەتەوە لە ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بە جیاوازی (٢٣,١٢٠)مەشارە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٨)[٤٥].

ئەگەر سەیری رێژەی زەوی تۆوکراو بکەین لە وەرزی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بەرێژەی یەکەم مەرکەزی قەزای کەرکوك دێت کە بریتییە لە (٢٣٩,٧٣٥) مەشارە، بەڵام لە ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٧)دا ناحییەی شێروانە بە رێژەی یەکەم دێت کە بریتییە لە (٢٢٧,٧٥٧) مەشارە.

زەوی بەجێهێڵراو لە وەرزی (١٩٥٦-١٩٥٧)دا بریتی یە (٢٢٠,٧٣١) مەشارە کە مەرکەزی قەزای کەرکوك بەرێژەی

یەکەم دێت بەڵام لەوەرزی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بریتییە لە (٢١٧,٩١٦) مەشارە کە ناحییەی (شێروانە) بە ڕێژەی یەکەم دێت[٤٦]. "بۆزیاتر شارەزایی لە چۆنییەتی دابەشکردنی زەوی تۆو کراوو زەوی وازلێهێنراو لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٧)دا بروانە خشتەی ژمارە (٦)ی خوارەوە کە هەریەکە لە ناحییەو قەزاکانی پارێزگاکەی تێدا دیاریکراوە".

**خشتەی ژمارە (٦)[٤٧]**

**چۆنییەتی زەوی تۆوکراو زەوی وازلێهێنراو، لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٨)ی پارێزگاکە**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | پێوانەی زەوی و زاری تۆوکراوی وەرزی (٥٧-٥٨) | پێوانەی زەوی و زاری تۆوکراوی (٥٦-٥٧) | پێوانەی زەوی وازلێهێنراوی (٥٧-٥٨) | پێوانەی زەوی و زاری وازلێهێنراوی (٥٦-٥٧) |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٢٣٩٧٣٥) | (٢١٠٥٧) | (٢١٢٠٣٨) | (٢٢٠٧٣١) |
| ٢ | ناحییەی قەرەحەسەن | (٩٦٦٥٤) | (١٠٢٩٦٠) | (١٣٤٥٥١) | (١٢٨٣١٢) |
| ٣ | ناحییەی پردێ | (١١٥٤٦٥) | (١١٧٢٧٣) | (١٨٨٥٤٤) | (١٨٧٩٥١) |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | (٢٠٠٨٢٤) | (١٩٣٥٢٩) | (١٧٥٤٥٢) | (١٨٠٤٦٦) |
| ٥ | ناحییەی شوان | (١٠٦٠٤٥) | (١٠٥٥٧٣) | (٩٧٥١١) | (٩٨١٨٦) |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (٥٢٧٠٢) | (٥٢٤٨٧) | (٥٢١٩٧) | (٥٢٤٨٧) |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (١٤٨٤٨٨) | (١٤٤٢١٤) | (١٠٥٦٧٥) | (١٠٩٣٠٤) |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (٢٢٦٩٢٩) | (٢٢٧٧٥٧) | (٢١٧٩١٦) | (٢١٧٠٠٢) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٩٢٠٣٠) | (٨٤١١٣) | (٧٠٢١٦) | (٧٨٢٣٥) |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٢٤٦٠١) | (٢١٩٨٧) | (٢١٠٥٢) | (٢٣٥٦٩) |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٤٨٢٨٧) | (٤٧٥٠٩) | (٤٦٤١٠) | (٤٧١٣٤) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (١٧٥٩٤٣) | (١٧٥٠٢٦) | (١٤٨٠٤٨) | (١٤٨٧٨٧) |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (١٢٨٣٢٦) | (١٢٨٣٢٦) | (١٥١٥٦٨) | (١٥١٥٨٢) |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرەم | (١٠٣٦٣٠) | (١٠٢٩٣٥) | (١٠١١٤٠) | (١٠١٦٩٣) |
| کۆی گشتی | | (١٧٥٩٦٥٩) | (١٧٣٤٢٥٩) | (١٧٢٢٣١٩) | (١٧٤٥٤٣٩) |

ئەگەر بەراوردێکی ئەو ڕێژەیەی ساڵانی (١٩٥٦-١٩٥٨) بکەین لەگەڵ ساڵەکانی (١٩٨٠-١٩٩٦)دا لە ڕووی زەوی تۆوکراو زەوی بەجێهێڵراو دەبینین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕووبەری تۆوکراو بە کشتوکاڵ کەمی کردووەتەوەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زەوی وازلێهێنراو بەرەڵڵا زیادی کردووە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دابرینی زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی لە پارێزگاکەو دانی پارێزگاکانی (سلێمانی)و (تکریت)و دروست کردنی ئۆردووگایەکی زۆری سەربازی لە زەوییە کشتوکاڵییەکان و هێنانی چینێکی عەرەب کە شارەزاییان نییە لە بەکارهێنانی زەوی کشتوکاڵی و جوتیاری و کاروباری زەوی.

"ئەگەر سەیری ئاماری ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨) بکەین دەبینین ڕێژەی ئەو زەوییانەی کە لەوەرگای سروشتیە بریتییە لە (٣٢٦٧) مەشارە، ناحییەی (سەنگاو) بە ڕێژەی یەکەم دێت کە (٢٦٧٠) مەشارەیە لە دوای ئەو ناحییەی قادر کەرەم دێت کە (١٤٥)مەشارەیە، ئینجا ناحییەی شوان دێت کە (١٤٤) مەشارە دەبێت[٤٨]. (بروانە خشتەی ژمارە ٧).

ئەو زەوییانەی کە گژوگیای تەختەیی لێ ڕوێنراوە بریتییە لە (٣٨٨) مەشارە، ناحییەی قەرەحەسەن بە ڕێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (٢٢٢) مەشارە. ئینجا ناحییەی (شوان) دێت بەڕێژەی (١٤٢) مەشارەیە"[٤٩]. (بروانە خشتەی ژمارە ٧).

"ڕێژەی تۆوکردنی سەوزەمەنی لەساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا (٥٠٪)یە کەزەوی بەجێهێڵراو (٤٩,٤٪) بووە، زەوی چێنراو بەمیوەو ترشەمەنی و دارخورما (٠,٠٩)و زەوی لە وەراندنی سروشتی (٠,٠٩) بووە"[٥٠]. "زەوی و زاری بێستان و باغچە لە ساڵی (١٩٧٨)دا بریتی بووە لە (٩٠٠٠) دۆنم، بەڵام ئەم ڕێژەیە لە ساڵی (١٩٨٩)دا بووە بە (٣٠٠٠) دۆنم، ژمارەی بێستانەکان لەو ساڵەدا (٦٢٦) بێستان بووە"[٥١]. "بەڵام زەوی وزاری ڕووتەن و بەرزیی نییە لە پارێزگاکە هەروەها دارستانی بەرووی چڕی نییە بەڵام دارستانی بەرووی بەکارهێنراو (١٨,٢) لە کیلۆ مەتری دووجادایە ڕێژەی دارستانی بەرووی چڕنەبێت بریتییە (١١٤,٨) بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٦٠)"[٥٢].

*** خشتەی ژمارە (٧)[٥٣]**
**پێوانەی زەوی و زاری لەوەڕگاو**
**گژوگیای تەختەیی لە پارێزگاکە (١٩٥٧-١٩٥٨)**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | لەوەڕگای سروشتی | گژوگیای تەختەیی |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوک | (١١٣) مەشارە | (١٠) مەشارە |
| ٢ | ناحییەی قەرەحەسەن | (٢٢) مەشارە | (٢٢٢) مەشارە |
| ٣ | ناحییەی پردێ | -- | -- |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | -- | -- |
| ٥ | ناحییەی شوان | (١٤٤) مەشارە | (١٤٢) مەشارە |
| ٦ | ناحییەی پێباز | -- | -- |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | -- | -- |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | -- | -- |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٨٩) مەشارە | (١٤) مەشارە |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٥٩) مەشارە | -- |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٢٦٧٠) مەشارە | -- |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٢٥) مەشارە | -- |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | -- | -- |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرم | (١٤٥) مەشارە | -- |
| کۆی گشتی | | (٣٢٦٧) مەشارە | (٣٨٨) مەشارە |

"پێوانەی ئەو زەوی وزارانەی کەدەست دەدات بۆ کشتوکاڵ لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا نزیکەی (٣٤٨٧٨٢٥) مەشارە بووە. مەرکەزی قەزای کەرکوك بەرێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (٤٥١٩٣٥) مەشارە لە دوای ئەوەدا ناحییەی شێروانە دێت بریتییە لە (٤٤٤,٩٤٩) مەشارە. ئەو زەوییانەی کە دەست نادەن بۆ کشتوکاڵ لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩) بریتییە لە (٩٤٤٥) مەشارە، زۆرترین ئەو زەوییانە لە ناوچەی (قەرەحەسەنە) بریتییە لە (٣١٣٢) مەشارە، لە دوای ئەودا (حەویجە) دێت بریتییە لە (٢٩٩٢) مەشارە"[٥٤]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٨).

**خشتەی ژمارە (٨)[٥٥]**
**ئەو زەوی و زارانەی دەست دەدات یان دەست نادات بۆ کشتوکاڵ**
**لەنێوان ساڵانی (١٩٥٨-١٩٥٩)**

| ز | یەکە بەڕێوەبەرییەکان | پێوانەی ئەو زەوی و زارانەی کەوتووەتە نێو موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییەکان | ئەو زەوی و زارانەی دەست دەدات بۆ کشتوکاڵ | ئەوزەوی و زارانەی دەست نادات بۆ کشتوکاڵ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٤٥١٩٦٠) مەشارە | (٤٥١٩٣٥) مەشارە | (٢٥) مەشارە |
| ٢ | ناحەی قەرەحەسەن | (٢٣٤١٤٨) مەشارە | (٢٣١٠١٦) مەشارە | (٣١٣٢) مەشارە |
| ٣ | ناحییەی پردێ | (٣٠٤٣٧٢) مەشارە | (٣٠٣٨٧٤) مەشارە | (٤٩٨) مەشارە |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | (٣٨٠٤٥٥) مەشارە | (٣٧٧٤٦٣) مەشارە | (٢٩٩٢) مەشارە |
| ٥ | ناحییەی شوان | (٢٠٤١٢٦) مەشارە | (٢٠٤٠٦٠) مەشارە | (٦٦) مەشارە |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (١٠٤٨٩٩) مەشارە | (١٠٤٩٩) مەشارە | -- |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (٢٥٤٩٧٤) مەشارە | (٢٥٤٨٥٣) مەشارە | (١٢١) مەشارە |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (٤٤٤٩٤٩) مەشارە | (٤٤٤٩٤٩) مەشارە | -- |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (١٦٤٩٠١) مەشارە | (١٦٢٤٨٦) مەشارە | (٢٤١٥) مەشارە |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٤٥٧٩٤) مەشارە | (٤٥٧٩٢) مەشارە | (٢) مەشارە |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٩٧٤٩٩) مەشارە | (٩٧٤٩٩) مەشارە | -- |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٣٢٤٢٩٢) مەشارە | (٣٢٤٠٩٨) مەشارە | (١٩٤) مەشارە |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (٢٧٩٨٩٤) مەشارە | (٢٧٩٨٩٤) مەشارە | -- |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرم | (٢٠٥٠٠٧) مەشارە | (٢٠٥٠٠٧) مەشارە | -- |
| کۆی گشتی | | (٣٤٩٧٢٧٠) مەشارە | (٣٤٨٧٨٢٥) مەشارە | (٩٤٤٥) مەشارە |

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. (تاریخ مشکلة الأراضي في العراق ١٩١٤ - ١٩٣٢)، نووسینی: عمارە ئەحمەد ئەلجواهیری، ساڵی ١٩٧٨، (وزارة الثقافة)، لاپەرە (٩٥).
٢. (کوردستان‌و کورد)، لێکۆڵینەوەیەکی ئابووری‌و سیاسی، نووسینی عەبدولڕەحمان قاسملۆ.
٣. (تاریخ مشکلة الأراضي في العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩٩).
٤. (یاداشت)، نووسینی ڕەفیق حیلمی.
٥. (تاریخ مشکلة الأراضي في العراق)، لاپەرە (١١٨).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١٦).
٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١١٦-١١٧).
٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١١٧).
٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢١).
١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٢١-١٢٩).
١١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٧٥-١٨٢).
١٢. (تأریخ احکام الأراضي في العراق)، نووسینی (خەلیل ئیبراهیم ئەلخالد)و (مەهدی محەمەد ئەلئەزری)، بەغدا، ساڵی ١٩٨٠، چاپخانەی (دار الحریة للطباعة)، لاپەرە (١٠٥).
١٣. گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٣٥)، ساڵی (١)، لاپەرە (٤٢)، چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا، ساڵی ١٩٧١، بە ناونیشانی (مێژووی زەوی لە کوردستان)، نووسینی مستەفا مەجید. بەشی دووەم.
١٤. (تأریخ مشکلة الأراضي في العراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٨٧).
١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩١-١٩٤).
هەروەها بڕوانە:-(تأریخ الوزارات العراقیة).
١٦. گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٣) ساڵی (١) ١٩٧١، لاپەرەکانی (٣٦-٣٧).
١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٩).
١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (٣٩-٤٠).
١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٣).
٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە(٤٤).
٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٤٨).
٢٢. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٧٣).
٢٣. گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٨) ساڵی ١٩٧١، لاپەرە (٨٨)، بە ناونیشانی (لێدوانێکی یاسایی دەربارەی یاسای نوێی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ)، نوسینی فایق هۆشیار.
-هەروەها بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:-
- گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٦)، ئۆکتۆبەر، ساڵی ١٩٧٣، لاپەرەکانی (٥٠-٥٥)، بە ناونیشانی (دەربارەی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ)، نووسینی محەمەد عەقراوی.
٢٤. بڕوانە (بڵاوکراوە ئابوورییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٧٩، ١٩٩٢، ١٩٩٣، ١٩٩٤).
٢٥. (وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة، قسم الإقتصاد الزراعي، النشرة الاحصائية الزراعية العامة ١٩٦٠)، کە باسی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)و (١٩٥٨-١٩٥٩) دەکات.
٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٠. (کوردستان‌و کورد)، نووسینی دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملۆ، لاپەرە (١٥٥).
٣١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٥٦).
٣٢. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٣. (مجموعة الاحصائية الزراعية لعام ١٩٥٧-١٩٥٨).
٣٤. (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٨١).
- (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٩٣).
- (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٩٤).
٣٥. (النشرة الاحصائية الزراعة لعام ١٩٦٠)، کە باسی ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) دەکات.
٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٧. (مجموعة الاحصائية ساڵی ١٩٩٤).
٣٨. (النشرة الاحصائية الزراعية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣٩. بڕوانە:
- (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٧٩).
- (النشرة الاحصائية لعام ١٩٩٤).
٤٠. (النشرة الاحصائية الزراعية لعام ١٩٥٧-١٩٥٨)، لاپەرە (١٥٠).
٤١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٥٠).
٤٢. (الاکراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية)، نووسینی دکتۆر شاکر خەسباك، چاپخانەی (شفیق)، بەغدا، ساڵی ١٩٧٢، لاپەرە ١٣٢.
٤٣. (النشرة الاحصائية لعام ١٩٥٧-١٩٥٨)، لاپەرە (١٤٠).
٤٤. (الاکراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٣٢.
٤٥. (النشرة الاحصائية لعام ١٩٥٧، ١٩٥٨)، لاپەرە (١٤٠).
٤٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٤٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٤٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٤٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٥٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢٢).
٥١. بڕوانە:
- (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٧٩).
- (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٨٩).
٥٢. (مجموعة الاحصائية لعام ١٩٦٠).
٥٣. (النشرة الاحصائية لعام ١٩٥٧-١٩٥٨)، لاپەرە (١٤٠).
٥٤. (النشرة الاحصائية لعام ١٩٥٨-١٩٥٩)، لاپەرە (١٣٨).
٥٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٨).

### تەوەری دەیەم

*** سەرچاوە ئاوییەکانی شاری کەرکوك (باران. جۆگەو رووبارەکان، بیرو کانیاو، کارێز):**

ئاویش وەکو سەرچاوەیەکی گرنگ دەوری خۆی هەیە لە ئابووری شارەکەدا بە تایبەتی لەلایەن بەرهەمە کشتوکاڵییەکاندا، هەر ئەمەش وای کردووە لە کوێ ئاوهەبێت ئاوەدانی و لادێ هەبێت و ژیانی ئابووری گەشەبکات. ئەگەر لە رووی سروشتییەوە سەیری شارەکە بکەین دەبینین خاوەنی سەرچاوەیەکی گرنگی ئاوە. بەڵام تاکو ئێستا پرۆژەیەکی وانەکراوە بتوانێت ئەو سەرچاوە ئاوییانە بە فیرۆ نەچێت، لەکاتی پێویستدا بەکاربهێنرێت بۆ کاتی بێ ئاوی وکشتوکاڵ، یان هەوڵ بدرێت ئاوی پاك و خاوێن مسۆگەر بکرێت. هەرئەم سەرچاوە ئاوییەیە هەوڵدراوە هەردەم بەکار بهێنرێت وەکو دەسکەلایەك بۆ نیشتەجێبوونی خەڵکی هات بۆ شارەکەو ببێتە هێزێکی سیاسی ناوچەکە. "لە ساڵی (١٩٥٨)دا تەنها رێژەی کۆی گشتی ئاوی پاکی بەکارهێنراوی شارەکە (١٨٨٨٦) مەتر سێ جایە، وە لە ساڵی (١٩٦٠)دا (٢٤٠٤٠) مەتر سێ جایە.."[١].

*** باران:**

باران دادەنرێت بە سەرچاوەیەکی گرنگی سەرچاوە ئاوییەکان بە تایبەتی سوودی بۆ بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان هەیەو دەروازەیەکی گرنگی پێگەیاندنی بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان. بوون ونەبوونی باران دەوری هەیە لە پێگەیاندنی ئەو بەرهەمانە، بە تایبەتی گەنم و جۆ. "نابێت بە سەیری تێ بگەین کە یەکێکی وەك (داود بەگی جاف)بە (رەفعەت بەگی) ووتووە کە کاسبییەکەی تۆ وەکو قوومارە. (رەفعەت بەگ)یش لەوەڵامدا ووتوویەتی: کردومە بەپیشە هەموو ساڵێك قومار لەگەڵ خودادا دەکەم (بۆ گاڵتە) زۆر جار لێمدەباتەوە بەڵام قەت نائومێد نابم. مەبەستی ئەو ساڵەی باران نەبێت و زەوی بێ باران بێت خۆی گرەوی قومارەکە دەباتەوە، هەر بە هۆی بارانەکە ساڵ وایکردووە جووتیار تووشی نەهامەتی و بێتاقەتی بکات لە هەڵگرتنەوەی بەرهەمەکەیدا"[٢]. (دێمەرۆ.. رەنجەرۆ) بەسەر ئەو هەرێمانەدا هەڵدەدرێت کە بە زۆر تووشی کەم بارانی، ووشکە ساڵ دەبێت و رەنجی ساڵێکی تەواوی جوتیاران بە فیرۆ بچێت. سەری ساڵ بە دەست بەتاڵی و رەنجەرۆیی لەسەرخەرمان دەگەرێتەوە.

دەشتی کەرکوك لەبەر ئەوەی دەکەوێتە بەشی گەرمیان و بارانی ساڵانەی ناوەندە، لەنێوان (٢٧٠-٤٠٠) مللیمەتر، لەبەر ئەمە سەرکەوت و داکەوتی، بەرهەمی کشتوکاڵی هەڵبەزو دابەزێکی زۆر دەکات[٣]. "ئەو زەوییانەی دێمەو پشت بە باران دەبەستێت بریتییە لە (٢٩٦٩٢٩٨) مەشارە لە کۆی (٣٤٨٧٨٢٥) مەشارە، قەزای کەرکوك بەرێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (٤٤٩٩٢٢) مەشارە، لە دوای ئەو ناحییەی شێروانە دێت بریتییە لە (٤٣٣٩١٥) مەشارە لە دوای ئەودا (پردێ) دێت بریتییە لە (٣٠٣٧٩٧) مەشارە"[٤]، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ناوچەکانی (کەرکوك) بە زۆری پشت بە باران دەبەستێت بە رێژەی یەکەم بەتایبەتی ئەو ناوچانەی دەیمەو هیچ ئاوەرۆو ئاودێرییەکی تێدا نییە. "بڕوانە خشتەی ژمارە (٩)".

ناتوانین رێژەیەکی دیاریکراوی بەرهەمی کشتوکاڵی دیاری بکەین لەبەرئەوەی رێژەی باران لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێك لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەك جیاوازی هەیە، بۆیە پێوانەکردنی بەرهەمێکی کشتوکاڵی دەبێت لەگەڵ رێژەی بارانی ئەو ساڵەدا بەراورد بکرێت.

**خشتەی ژمارە (٩)[٥]**

**پێوانەی ئەو زەوییانەی دەیمەو پشت بە باران دەبەستێت**

| ز | ناوچە بەرێوەبەرییەکان | پێوانەی ئەو زەوییانەی دەیمە بە (مەشارە) |
|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٤٤٩٩٢٢) مەشارە |
| ٢ | ناحەی قەرەحەسەن | (٢٢٢٥٢١) مەشارە |
| ٣ | ناحییەی پردێ | (٣٠٣٧٩٧) مەشارە |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | (٢٥٣٢٣٥) مەشارە |
| ٥ | ناحییەی شوان | (٢٠١١٨٣) مەشارە |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (١٠٤٥٣٩) مەشارە |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (١٤٠٠١١) مەشارە |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (٤٣٣٩١٦) مەشارە |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٠٥٦٠٣٣) مەشارە |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (٤٤٣٦٧) مەشارە |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٩٦٧٣٧) مەشارە |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٢٦٩٦٢٦) مەشارە |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (٩١٩٥٤) مەشارە |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرم | (٢٠١٤٥٨) مەشارە |
| کۆی گشتی | | (٢٩٦٩٢٩٨) مەشارە |

چونکە بێ بەراوردکردنی رێژەی بارانەکە ناتوانین پێوانەیەکی پێویست لە بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان بەدەست بهێنن. بارینی بارانی ناوەختیش کاری خۆی کردووە لە گەڵ بارینی وەختی پێگەیاندنی بەرووبوومی کشتوکاڵی لەگەڵ بارینی بارانی (مایس)دا. "بۆ شارەزایی ئەم رێژەی باران بارینە لە کاتی پێگەیاندو کاتی (مایس)دا بروانە خشتەی ژمارە (١٠) لە دیاریکردنی رێژەی ئەوبارانە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٧٣)"[٦].

ڕووداني بارانی ترشەلۆکیش دەوری خۆی بوو لە فەوتاندنی زەوی کشتوکاڵی بەتایبەتی ناوچەی کەرکوك شوێنێکی گرنگی بەرهەمهێنانی نەوتە، وەکو ئەوەی لە (عێراق)دا ڕووی دا لە ساڵی (١٩٩١) بوو بەفەوتاندنی زەوی زارێکی زۆری کشتوکاڵی.

**خشتەی ژمارە (١٠)[٧]**

| ڕێژەی باران بارین لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٧٣) ز | ساڵ | بارانی ماوەی شین دان | بارانی ماوەی پێگەیاندن | بارینی مانگی مایس |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٥٠ | (٢٢,٠٠٠٠) | (٦٢,٥٠٠٠) | (٤٥,٣٠٠٠) |
| ٢ | ١٩٥١ | (٤٤,٠٠٠٠) | (٤٣,٥٠٠٠) | (٦,٦٠٠٠) |
| ٣ | ١٩٥٢ | (٥١,٩٠٠٠) | (٥١,٦٠٠٠) | (١٢,٥٠٠٠) |
| ٤ | ١٩٥٣ | (٥٢,٠٠٠٠) | (٩١,٣٠٠٠) | (١,٩٠٠٠) |
| ٥ | ١٩٥٤ | (٥٧,٩٠٠٠) | (٩٥,٨٠٠٠) | (٢,٧٠٠٠) |
| ٦ | ١٩٥٥ | (٦١,٣٠٠٠) | (٥٠,١٠٠٠) | (١٦,٥٠٠٠) |
| ٧ | ١٩٥٦ | (٢٨,٠٠٠٠) | (٣٧,٦٠٠٠) | (٠,١٠٠٠) |
| ٨ | ١٩٥٧ | (٣٨,٤٠٠٠) | (١٠٠,٣٠٠٠) | (١١١,٤٠٠٠) |
| ٩ | ١٩٥٨ | (٥٤,٩٠٠٠) | (٣٣,٦٠٠٠) | (٤,٥٠٠٠) |
| ١٠ | ١٩٥٩ | (١٤,١٠٠٠) | (٥٤,٣٠٠٠) | (٧٧,٥٠٠٠) |
| ١١ | ١٩٦٠ | (٨٠,٨٠٠٠) | (٤٠,٤٠٠٠) | (١,٣٠٠٠) |
| ١٢ | ١٩٦١ | (٧٣,٣٠٠٠) | (٥٩,٠٠٠٠) | (٧,٢٠٠٠) |
| ١٣ | ١٩٦٢ | (٣٣,٦٠٠٠) | (٤٩,٣٠٠٠) | (١,٠٠٠٠) |
| ١٤ | ١٩٦٣ | (٥٩,٩٠٠٠) | (٦٨,٦٠٠٠) | (١٤٩,٢٠٠٠) |
| ١٥ | ١٩٦٤ | (٢٦,٤٠٠٠) | (٤٧,٨٠٠٠) | (٠,١٠٠٠) |
| ١٦ | ١٩٦٥ | (١٦,١٠٠٠) | (٧٨,٦٠٠٠) | (٨,٠٠٠٠) |
| ١٧ | ١٩٦٦ | (٢٠,٣٠٠٠) | (٦١,٤٠٠٠) | (٠,٢٠٠٠) |
| ١٨ | ١٩٦٧ | (١٠٩,٢٠٠٠) | (٦٠,٧٠٠٠) | (١٩,٣٠٠٠) |
| ١٩ | ١٩٦٨ | (٧١,٦٠٠٠) | (٥١,٧٠٠٠) | (٥٦,٤٠٠٠) |
| ٢٠ | ١٩٦٩ | (٧٥,٩٠٠٠) | (٨٤,٤٠٠٠) | (٣٠,٤٠٠٠) |
| ٢١ | ١٩٧٠ | (١٨,٠٠٠٠) | (٤٣,٩٠٠٠) | (٠,٦٠٠٠) |
| ٢٢ | ١٩٧١ | (٣٦,٢٠٠٠) | (٧٢,١٠٠٠) | (٠,٧٠٠٠) |
| ٢٣ | ١٩٧٢ | (٤٣,٣٠٠٠) | (٨٠,٠٠٠٠) | (٤٨,٧٠٠٠) |
| ٢٤ | ١٩٧٣ | (١٤,١٠٠٠) | (٥٠,٩٠٠٠) | (٩,١٠٠٠) |

*** جۆگەو ڕووبارەکان:**

"ئەوڕووبارانەی کە لە پارێزگاکە دا هەن ڕووباری قەرەتەپەو ڕووباری کشکویلو ڕووباری تمنست ئاباد‌و ڕووباری قیەو ڕووباری سەیدەلانو ڕووباری کوکوزو ڕووباری حاجیلەرو ڕووباری فدعمو ڕووباری زریەو ڕووباری ئاوجوانو ڕووباری باسەرەو ڕووباری خاسەو ڕووباری ڕۆخانەو ڕووباری ئاوەسپیو ڕووباری داقوقو ڕووباری زێی بچووکە"[٨].

"ڕووباری خاسە لەناوەندی شارەوە دەڕواتو دەیکاتە دووبەشەوە، یەکیان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە کە کۆنە قەڵایەوە دووەمیان لای ڕۆژئاوایە تازەیە پێی دەوترێت دەشتایی کەرکوك"[٩]. "چەند ووردە ڕووبارێکی تر هەیە وەکو ڕووباری قۆریەو زێویە هەردووکیان لەسەرچاوەیەك ڕووبارێکنو جیادەبنەوە لە گوندی یارەولی لە ڕووباری قۆریە دوو ڕووباری تر جیا دەبنەوە کە یەکێکیان (تسنە)، ئەوەی تریان (پێلاوە)یە"[١٠].

"ئەم ڕووبارانە ناتوانین بەشوێنی یەکەم دابنێین لەبەرئەوەی بەرێژەی یەکەم پشت بەباران دەبەستن، لەبەر ئەوەی زۆری ئەمانە لە ڕۆژگارەکانی هاویندا ووشك دەکەن یان دەبرێت وەیان ئاوەکەی کەم دەکاتو زۆر کز دەبێت، کە لە گەڵێك جاردا داروودەوەندەکانی دەورووبەرییان تەڕناکات، بەڵام ئەو ڕووبارەی پشتی پێ دەبەسترێت بۆ ئاودێریو پانتاییەکی فراوانی زەویو زار ئاودەدات زێی بچووکە"[١١].

"لە (٤٪)ی ئاوی (دیجلە) لە زنجیرە چیاکانی کوردستانە، ئەو دوایش لە پەلەکانی تری، ڕووبارەکانی زێی گەورەو زێی بچووكو لقەکانی عوزێمو خاسەو ڕۆخانەو ئاوەسپیو چەمی کفری.. لقەکانی دیالەو سیروانو تانجەرۆو ئەلوەنەوە بە ئەمانە هەموویان لە چیاکانی کوردستانی سنووری (تورکیا)و (ئێران) هەڵدەقوڵێ"[١٢]. "ساڵانە بە (خاسە)و (ڕۆخانە)و (ئاوەسپی)و (چەمی کفری)و (دوانزە ئیمام)، (٠,٧) ملیار مەتر سێ جا (مکعب) ئاوی پێدادەڕوات"[١٣].

"هەر بۆ نموونە دەبینین ڕێژەیەکی زۆر ئاو بەکار دەهێنرێت بۆ ساردکردنەوەی دەزگای کەهرۆ گەرمی خورماتوو کە مەکینەکانی سارد دەکاتەوە لەم دەزگایە (٥,١)مەتر سێ جایە(مکعب)ە لە سانییەکدا (٥١,٧) ئەم ئاوە لە ناو دەچێت لەم کار ڕەوەدا بە هۆی هەڵم بوونی ڕێژەی ئاوەکە.."[١٤].

"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٩٣)دا ڕێژەی بەرهەمهێنانی ئاو (٣٥) ملیۆن مەتر سێ جایە کە بەرێژەی (٢) ملیۆن سێ جا بەخۆڕایی دابەش دەکرێتو ڕێژەی (٥) ملیۆن مەتر سێ جا دەبێت کە بزر دەبێت، (٢٨) ملیۆن مەتر سێجا لەم ڕێژەیە بە شێوەیەکی کۆتایی دەمێنێتەوە"[١٥]. ئەو ڕووبارانە لەوەدا زیاتر بەکاردەهێنرێن بۆ کشتوکاڵی هاوینە تاوەکو ئەوەی زستانە، چونکە زیاتر بەرووبوومە هاوینەییەکان لەسەر ڕۆخی ئەم ڕووبارانەدا بڵاوبووەتەوە وەکو بەرووبوومی کاڵەكو شووتیو ترۆزیو ئاروو و لۆبیاو پیاز وتەماتەو باینجانو کولەکەو بامیە.. بۆ نموونە ترۆزی لە ناوچەکانی

سەرخاسەو کۆچەكو کالەكو شوتی لە دەشتی حەویجەو داقوق و خورماتوودا دەکرێت".
"ئەو زەوییانەی کە بە بەراو ئاو دەدرێت نزیکەی (٥١٦,٨١٩) مەشارە دەبێت بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٨-١٩٥٩) دا، ناحییەی حەویجە (١٢٣,٦٢٥) مەشارەیەوە، لەدوای ئەودا (قەرەتەپە) دێت (١١٣,٩٤٢) مەشارە دەبێت"[16]. (بروانە خشتەی ژمارە (١١) بۆ زیاتر شارەزایی).

خشتەی ژمارە (١١)[17]
**چۆنییەتی دابەش بوونی ئەو زەوییانەی بە بەراو ئاو دەدرێت (١٩٥٨-١٩٥٩)**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | زەوییە بەراوەکان |
|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٢٠١٣) |
| ٢ | ناحییەی قەرەحەسەن | (٨٤٩٥) |
| ٣ | ناحییەی پردێ | (٧٧) |
| ٤ | ناحییەی حەویجە | (١٢٣٦٢٥) |
| ٥ | ناحییەی شوان | (٢٨٧٧) |
| ٦ | ناحییەی پێباز | (٣٦٠) |
| ٧ | ناحییەی قەرەتەپە | (١١٣٩٤٢) |
| ٨ | ناحییەی شێروانە | (١١٠٣٤) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٦٤٥٣) |
| ١٠ | ناحییەی ئاغجەلەر | (١٤٢٥) |
| ١١ | ناحییەی سەنگاو | (٧٦٢) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٥٤٤٧٢) |
| ١٣ | ناحییەی داقوق | (١٨٧٧٣٥) |
| ١٤ | ناحییەی قادرکەرەم | (٣٥٤٩) |
| | کۆی گشتی | (٥١٦,٨١٩) |

"ئەو زەوییانەی کە بە ترۆمپا (مضخة) ئاو دەدرێت نزیکەی (١٥٠٢) مەشارەیە، قەرەتەپە بە ڕێژەی یەکەم دێت برتییە لە (٩٠٠) مەشارە لە دوایدا حەویجە دێت بریتییە لە (٦٠٢) مەشارە.
بەڵام ئەو زەوییانەی ئاودەدرێت بە ناعور یان چەرخی ئاوی نزیکەی (٢٠٥) مەشارە دەبێت، (داقوق) تەنها زەوییە بەوشێوەیە ئاودەدرێت کە بریتییە لە (٢٠٥) مەشارە"[18].
"لەساڵی (١٩٣٦)دا حکومەت دەستیکرد بەکار لە پرۆژەی (حەویجە)، ئەویش بەراکێشانی جۆگەیەك لە زێی بچووکەوە، لە خوارووی ڕۆژئاوای شاری (کەرکوك)، زەوییەکی فراوانی بە پیتەو بە بەرەکەتە، بەڵام سوودی لێ وەرنەگیراوە لەبەر ئەوەی تەنها لە ڕابردوودا پشتی بە باران دەبەست لە کۆندا بە هۆی ڕووباری (فیل)و (عەباس)دا ئاودراوە بەڵام ئێستا ئەم ڕووبارانە نەماوە.. لەبەر ئەوە سوودی لێ نابینرێت لەم سەردەمەدا. ئەم زەوییەی (حەویجە) زۆرفراوانەو پێوانە دەکرێت بە نزیکەی (٣٠٠) هەزار مەشارەیە بە بەراو ئاو دەدرێت، کە ئاو وەردەگرێت لە زێی بچووك..، لەبەر ئەوەی زەوییەکانی پرۆژەی (حەویجە) پێکهاتووە لە پێکهاتەی بەردی ڕەقەن لە قووڵی لەنێوان نیوەو دوومەتر لە سەر ڕووی زەوییەوە، کە ئەمە وادەکات ئاوەکە نەچێتە چینەکانی ژێرەوە، لەبەر ئەوە بۆ پاڵپشتی ئەم پرۆژەیە دەستکرا بەراکێشانی کۆمەڵێك تۆڕی چاك بۆ (دەڵاندن-مبازل)، تا بۆ ئەوەی زەوییەکان بە ئاو دانەپۆشرێت بیکات بە زەلکاو گۆلە ئاو وەکو ئەوەی ڕووی دا لە ساڵی (١٩٤٠)دا"[19]. لە ئەنجامدا بوو بە هۆی دروستکردنی کۆبوونەوەی ڕێژەیەکی زۆری ئاو لەسەر زەوییەکان‌و چی ئەو بارانەی دەبارییە سەرزەوییەکان، ئەمە وای کردووە هەتا نەخۆشی (مەلاریا) بڵاوبکاتەوەو ببێتە هۆی مردنی ژمارەیەكو کۆچ کردنی جوتیارە کشتکارەکانی سەر پرۆژەکە. پرۆژەکە ڕاستەوخۆ ئاو لە زێی بچووکەوە وەردەگرێت لە شوێنێك پێی دەوترێت (بطمة)، بەهۆی ڕێکخەرێکی یەك دەروازەیی پێکهاتووە لە جۆگەیەکی سەرەکی کە لەدوایدا دابەش دەبێتە چوار لقی سەرەکییەوە: بریتییە لە لقی خواروو لقی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا، ئەم لقانە چەند لقێکی تری زۆری لێ دەبێتەوە بۆ پرۆژەکەی (حەویجە). ڕێکخەری پرۆژەکە بە شێوەیەکی وا دروست کراوە کە لە چرکەیەکدا (١٥) مەتر سێ جا ئاوی لێوە دەڕوات. درێژی جۆگەی سەرەکی پرۆژەکە (٧٠٠-٢٨) کیلۆ مەترە وەلقی سەروو جیا دەبێتەوە لە کیلۆمەتری (٥٠٠-٢١) لە کیلۆمەتری (٥٠-٢٨) سێ لقی سەرەکی لێی جیا دەبێتەوە کە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو خوارووە.
بنکەی بازنەیی ئاودێرییەکە مەرکەزی ناحییەی (مەلحە)ی تازەیە دوورە لە (کەرکوك) نزیکی ٦٤ کیلۆمەتر کە ڕێگای مەرکەزی ناحییەو بازنەی ئاودێرییەکە لە پرۆژەکەوە قیرتاو نەکراوە[20].
لە ساڵی (١٩٥٧)دا حکومەت بیری لەوە کردەوە خەڵکێکی زۆر بهێنێت بۆ شارەکە بۆیە بیرکرایەوە لە پرۆژەی ئاودێری دەشتی (کەرکوك). "بۆ نەهێشتنی ئەم بارە، پێویست بوو ئەم هەرێمە لە دەشتێکی دێمە ڕۆوە بکرێتە هەرێمێکی ئاوی کشتوکاڵی پەرەسەندوو، لەبەر ئەمە بڕیاردرا پرۆژەی ئاودێری (کەرکوك) جێبەجێ بکرێت"[21]. "ئەوەی شایانی باسە پرۆژەی (کەرکوك) دەکەوێتە خوارووی بەستی دووکانەوە، نزیکەی ملیۆنێك دۆنم لە دەیمەکاڵەوە دەکاتە ئاوی ئەم پرۆژە گەورەیە.. ڕێکردنی (٣٠٠ مەتر دووجا/تا) ئاوی هەیە کە دەشتی (حەویجە)و (داقوق)و (خورماتوو)و (کفری) ئاودەدات"[22]. "زەوی ئەم پرۆژەیە دەشتێکی درێژە دەکەوێتە خوارووی لووتکەکانی چیای (زاگرۆس)و زێی بچووكو چەمی کفری‌و ڕووی چیای حەمرین، فراوانی ئەم پرۆژەیە لە هەرێمی پێش کەرکوکدا (٧٦٤٠٠٠) دۆنمە، هەروا دەشتی (حەویجە) بریتییە لە (١٧٢٠٠٠) دۆنم بەراو دەکاو (٣٠٠٠٠) دۆنمی تریش دەکاتە ئاوی، هەروا لە پاش

تێپەڕبوونی لە چیای (حەمرین) لە هەردوولای ڕووباری (عوزێم) (٤٨٢٠٠٠) دۆنمی تریش دەكاتە ئاوی، كە هەمووی دەكاتە (١٤٤٨٠٠٠) دۆنم، هەردەكانی بەینی زێو شاری كەركوكیش بەهۆی پامپ و بارانی دەستكرد ئاودەدرێ.

ئەم پرۆژەیە، لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە شرۆڤە كراوەو نەخشەی بۆ كێشراوەو هەر لە بناغەوە بەستی (دوكان) عەماراوێكی تایبەتی ئەم پرۆژەیەیە بۆ گۆڕینی ڕێگای ڕووباری زێی بەستی (دووبن) لە جێگای (كونە كۆتر) لەسەر زێی بچووك دروست كراوە، هەروا ڕێكخەری سینەیی لە چركەیەكدا (٣٠٠) مەتر سێ جا ئاو تێ ئەپەڕێنێ ئەمە لە ساڵی (١٩٦٤)دا دروست كراوە، جۆگای گەورەی ئەم پرۆژەیە لە چركەیەكدا (٣٠٠) مەتر سێ جار ئاوی پیادێ لە بەستی دووبزەوە تا شیووی نەوت (٣٧) كیلۆ مەترە پەلێكی لێ جیادەبێتەوە، بۆ دەشتی (حەویجە)ودرێژای ئەم پەلە (٤٥) كیلۆ مەترە، هەروەها جۆگای گەورەی لە (مەلا عەبدوڵلا)وە بۆ (تازە)و (داقوق)و (خورماتوو) دەچێ.

ئەو ئاوەی كە دەچێ بۆ دەشتی (قرفە) لە (عوزێم) دەرژێتە ڕووباری (ئاوەسپی)و پاشماوەكەیشی بەرەو چەمی (كفری) ئەڕواو درێژای دەگاتە (١٦٦) كیلۆمەتر.

بابەت هەردەكانی خۆرئاوای ژووروی (كەركوك) بریتییە لە نزیكەی (١٠٠) هەزار دۆنم بە هۆی چوارپامپی گەورە بە بارانی دەستكرد ئاو ئەدرێ، جۆگەكانی ئەم پرۆژەیە لە جۆگا گەورەكەوە ئاو وەرئەگرێ بەهۆی دەرگای ئۆتۆماتیكەوە كاردەكات، هەروەها جۆگەكانی كە زۆربەی بریتین لە جۆری چەمەنتۆو ئەسبێست و لەژێر خاكدا ئەشارێتەوە لە (٨٠٪)ی ئەم ئاوانە دەگەیشتە سەر زەوی كشتوكاڵ و لە ئایندەیشدا ڕەنگە بكرێتە بارانی دەستكرد (٦٩٪)ی زەوی ئەم پرۆژەیە زەوییەكی ئایابە، وەوا دانراوە كە (١٠٪)ی بكرێتە دارستان و ئەودوایش بە (گەنم)و (جۆ)و (سەوزە)و (چەوەندەر)ی شەكرو (پەتاتە)و (لۆكە)و (گەنمەشامی)و (پاقلە)و (میوەهات) بچێنرێت.."[٢٣].

بەڵام تاوەكو ئێستاكە بەشێكی گەورەی ئەم پرۆژەیە جێبەجێ نەكراوەو نەتوانراوە بە شێوەیەكی دروست كاری تێدا بكرێت كە هاوگونجاوی ئەو ڕێژە ئاوە بێت بۆ ئاودێری.

*** بیرو كانیاو:**

"زۆربەی كورد لە كوردستانی باشوور ئاوی خواردنەوەو هەر جۆرە پێویستییەكی ئیش و كاری ڕۆژانەی لە (كانیاو) بووەو جگە لە چەند شارو دێیەك زۆربەی شارو دێیەكان لەسەرییان لە نزیكی كانیاوەكان دروست كراون.."[٢٤]. زۆربەی لادێكانی دەوروبەری شاری (كەركوك) بیرو كانیاوی هەیەو ماڵێك نییە لە لادێ بیری نەبێت بۆ پێویستی ماڵ و ئاودانی ئاژەڵەكانی، كانیاویش زیاتر لە بەهاراندا دەتەقێتەوە لەگەلێك شوێنی ئەم ناوچەیە بۆ چاندنی بەرووبوومی هاوینە بەكار دەهێنرێت، بەتایبەتی لەو شوێنانەدا كە باران و بەفری لێبارییوە. گەلێك كانیاو ئاوەكەی زۆرەو ساڵ دوانزەی مانگ ئاوی لەبەر دەڕوات و لادێ كە بۆ پێویستییەكانی ڕۆژانەیان بەكاری دەهێنن و جۆگەی بۆ هەڵدەبەستی بۆ گەیشتنی بۆ ناو گوندەكە. "هەندێ كانیش كە (گەراو) بوون یان (گەرماو) كەڵكیان لێ وەردەگیرێت بۆ چارەسەركردنی هەندێ نەخۆشی"[٢٥]. وەكو گەراو نموونەی ئەم جۆرە كانییانە زۆرە لە ناوچەكەدا وەكو: كانی (باوەقەتاڵ) لەدێی باوەقەتاڵ و ئاوەكەی دێی قەیتوڵ كە بە گەراوی قەیتوڵ بەناوبانگە یان گەراوەكەی دێی دەلۆ كە بە ترشاو دەلۆ یان كانی هەنجیر بەناوبانگە. هەروەها نموونەی ئەم جۆرەكانیاوانە لە ناوچەكانی (كفری)و (شوان)یش دا بەناوبانگە.

"ئەیگێڕنەوە كە زیاتر لە پێش (٣٠٠) ساڵ دا لە شاری (كەركوك) تەكیەیەك دروست كرا، شوێنەكەی بێ ئاو بوو، بەڵام كانییەك هەبوو كەوتبووە ڕۆژهەڵاتی تەكییەكەوەو ڕێگا نەبوو ئاوەكەی بگەیەننە تەكییەكە بە هۆی بوونی شاخێكی نزم، هەتا ئێستا دانیشتووانی شاری (كەركوك) ئەوە ئەگێڕنەوە كە چۆن زۆربەی موسڵمانان كۆبوونەوەو شاخەكەیان بڕیو ڕێگایان بۆ ئاوی كانییەكە كردەوە. هەتا ساڵی (١٩٣٦)و دوای ئەوسایش خەڵكی ناوچەی تەكییەكە بە تەكیەی تاڵەبانی ناودەبراو ئاوی پێویستیان لە حەوزی دروستكراوی ناو تەكییەكە بەكار ئەهێناو ژنان ئاویان لەسەر شان و سەرییان هەڵدەگرت بۆ پێویستی ماڵەوەیان"[٢٦]. لە (١٥)ی ئابی ساڵی (١٩٩٠)دا كانییەكی گەورە لە ناوچەی چەمچەماڵ تەقیەوە كە دەركەوت ئاوەكەی مادەی كبریتی تێدابێت و ئاوەكە بەو شیوەدا ڕێ دەكات.. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە هۆی تەقینەوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ نەمانی گوندەكانی دەورووبەرو داخستنی كانیاوەكانی بە چەمەنتۆ كە ئەمە وای كردووە ڕێگا بۆ خۆی بكاتەوە لە ناوچەیەكی نزم بتەقێتەوە"[٢٧]. بیریش بە شوێنێكی گرنگ دادەنرێت بۆ دەرهێنانی ئاو بە تایبەتی لە ناو ماڵاندا بۆ ئاودانی ئاژەڵەكانی ناوماڵ و پێویستییەكانی ماڵ وەماڵی گوندێك نییە كە بیری نەبێت و سوودی لێ نەبینێت لەپێویستییەكانی ڕۆژانە. بیریش لە ماوەی چەند ساڵێكدا چەند جارێك پاك دەكرێتەوەو كەسی تایبەت هەیە كە هەڵدەستێت بەم كارە..

لەگەڵێك شوێنیشدا (ناعور) لێدەدەن بە تایبەتی لە باخ و باخاتەكاندا كە پێویستی بە ئاوێكی زۆر بێت.

*** كارێز:**

دادەنرێت بە دەروازەیەكی گرنگی ئاو لە ناوچەی كەركوك لەبەرئەوەی بەبەردەوامی ئاوی لەبەردەڕوات و ڕێژەیەكی زۆر ئاوی لێ بەدەست دەهێنرێت بۆ بەرووبومی كشتوكاڵی و كارە خزمەتگوزارییەكان وەكو مزگەوت و گەرماو وئاش و ماڵان.. ئەگەر سەیری ناوچەكە بكەین دەبینین ڕێژەیەكی زۆر كارێزی تێدا هەیە بە تایبەتی لە ناوچەكانی خورماتووو قادركەرەم و كفری و ناوچەی قەرەحەسەن. وا ڕێدەكەوێت دێیەك یان دوو دێ كارێزێكی هاوبەشیان لەنێوانیاندا هەیە، یان دوو ئاسیاو بە یەك كارێز كاردەكات لەبەر بە تەوژمی ئاوەكەی. وەكو ئاسیاوی (سپی)و (پاریاوڵە) كە هی (مەلا عەبدوڵلا) بوو[٢٨].

كارێز لە هاویندا ساردو لە زستاندا ئاوێكی گەرمی هەیە كە ئەمەش زیاتر پێویستی كارێز هەڵكەندنی گرنگ كردووە.

بۆ ئەوەی راستی قسەکەمان بخەینە روو لە رووی گرنگی کارێزەوە دەبێت بەراوردی رێژەیەکی ئەو کارێزانە بکەین لە گەل ژمارەی گوندەکاندا، دەبینین کە دێیەکی کەم دەمێنێتەوە کە کارێزی تێدا نەبێت.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٦٠)، لاپەرە (١٣٦).

٢. گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٣٦) ساڵی ١٩٩٥، لاپەرە (٤٢)، بە ناونیشانی (ئاورێک لە شاری خورماتووو)، نوسینی محەمەد سەعید خان).

٣. پاشکۆی گۆڤاری (شۆرشی کشتوکاڵی – ثورة الزراعية)، ژمارە ١، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٨)، لاپەرە (١٣٩)، بەناونیشانی (دەشتی کەرکوک لە دێمەرۆوە بۆ ئاوی)، نووسینی دکتۆر موکەرەم جەمال.

٤. (مجموعة الاحصائية لسنه ١٩٥٧-١٩٥٨)، لاپەرە (١٣٩).

٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٩).

٦. (انتاج واستهلاك الحنطة في العراق ١٩٥٠-١٩٨٠)، نووسینی سەنا عەبدوڵلا ئەلعمری، ساڵی ١٩٨٠، بەغدا، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) لاپەرە (٣٧٨).

٧. هەمان سەرچاوە پێشوو، لاپەرە (٣٧٨).

٨. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٧٠).

٩. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم، لاپەرە (٩٦).

١٠. (العراق قديما وحديثاً)، نووسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم، (١٤٠٢ هـ -١٩٨٢)، بەغدا، بڵاوکراوەکانی (دار اليقظة العربية)، چاپخانەی (دار الكتب بيروت) لە لوبنان، لاپەرەکانی (٢٢٠-٢٢١).

١١. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٧٠).

١٢. گۆڤاری (کۆری زانیاری عێراق)، دەستەی کورد، بەرگی بیست و سێیەو چوارەم، بەغدا، ١٩٩٢، لاپەرە ١٢٥، چاپخانەی (کۆری زانیاری عێراق)، نووسینی موکەرەم تاڵەبانی.

١٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٢٧).

١٤. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣١).

١٥. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٩٤)، لاپەرە (١٧٤).

١٦. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٥٨-١٩٥٩)، لاپەرە (١٣٩).

١٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٩).

١٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٩).

١٩. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٧١).

٢٠. (العراق الشمالي)، لاپەرەکانی (١٧١-١٧٢).

٢١. پاشکۆی گۆڤاری (شۆرشی کشتوکاڵی)، ژمارە (١)، لاپەرەکانی (١٦-١٧).

٢٢. گۆڤاری (کۆری زانیاری عێراق)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی (١٢٩-١٣٠).

٢٣. پاشکۆی گۆڤاری (شۆرشی کشتوکاڵی)، ژمارە (١)، لاپەرەکانی (١٦-١٧).

٢٤. گۆڤاری (رەنگین)، ژمارە (٥١)، ساڵی (١٩٩٣)، لاپەرە (٨)، بەناونیشانی (کانیاو لەژیانی کوردەواریدا)، نووسینی ناهیدە جەمال تاڵەبانی.

٢٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩).

٢٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٩).

٢٧. (یاداشتەکانم رۆژانە)، دەسنووس. کە لەنێوان ساڵانی (١٩٨٤-١٩٩٦).

٢٨. لە هەندێ بەساڵاچووەکانی ناوچەکە باسی دەکەن.

## تەوەری یانزەیەم

*** گەشەکردنی ئاڵوویرە ئابووریو بازرگانییە ناوخۆییو دەرەکییەکانی شاری کەرکوک:**

ناوچەیەکی گرنگە لە رووی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵو ئاژەڵداریو، لە دوایدا دۆزینەوەی نەوت ئەوەندەی تر شارەکەی بایەخ پێدا لە رووی بازرگانیو گەشەی بەرووبوومی پیشەسازیدا، بووەتە بنکەیەکی گرنگی بازرگانی چ لە رووی پارێزگاکە یان لە بەراوردکردنی بازرگانی لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەریدا.

ئەگەر سەیری شارەکانی وەکو (کفری)و (پردێ)و (چەمچەماڵ) بکەین دەبینین سەرەڕێی کاروانسەرای بازرگانی بوونە هەر لەسەردەمەکانی زووەوە تا ئەم سەردەمانەی ئێستامان، چونکە هێڵی پێکەوە بەستنەوەیە بە شارەکانی سلێمانیو موسڵو دیالەو ئێرانو تورکیا.

ئاڵوگۆڕکردنی هەمووجۆرە بەرهەمێکی بازرگانی لە بەرووبوومی کشتوکاڵو کوتاڵو ئاژەڵیو کەرەستەو پیشەی دروستکراو. هەریەکە لەوشارانە بنکەی کۆکردنەوەی بەرهەمە بازرگانییەکان بووەو لەوێوە ئاو دیوو کراوەتە سنوورەوە هەرئەمەش وایکردووە کە شارێکی وەکو (کفری) رۆژ لە دوای رۆژ گەشەی کردووەو بووەتە بنکەیەکی گرنگی بازرگانیو گەلێک بنکەو مۆڵگەی بازرگانی تێدا بوو.

"کفری خۆی شوێنی بەیەك گەیشتنی رێگاکان بووە لەنێوان ئاسیاو ئەوروپادا، کەزۆر لە بازرگانە بیانیو گەشتیارە رۆژهەلات ناسەکان لە ماوەی جیاجیادا سەرییان لەم شارەداوەو لەسەر ئەم شارەیان نووسیووە دەربارەی خانەکانو بەرووبوومە کشتوکاڵیو ئاژەڵییەکانیانو دووکانو مەخزەنەکانیان هەموو دەم پڕبووە بە جۆرەها کەلوپەلی هێنراو لە ئەوروپای سەروو و رۆژهەلات لە رێگای قەفقاسەوە لە رێگای (تەبرێز)و (ئورمیە) لە ئازربێجانی ئێرانو مەهاباد لە کوردستانی ئێران، رێگای کاروانەکان دەبێتە دووبەشەوە، بەشێکی دەڕوات بەشاری سلێمانیو ئینجا دەربەندی (سەگرمە) لە (قەراغ) بە ناوچەی (زەنگنە) بۆ (کفری)، بەشێکی تر لە سەرەرەشەوە دێت بۆ (رانیە) بەرێگای دەربەند ئینجا (کۆیسنجەق) بۆ (کەرکوك) دەگات بە رێگای (سلێمانی-کەرکوك) بەرەو (کفری) بۆ یەککەشتی بە بەشی یەکەم بەرەو (خانس) ئینجا (بەغدا)"[1].

"لە بازارەکانی کفریدا جۆرەها کەلوپەل پیشان دەدرا کە تێدا جۆرەها کەلوپەلی رۆژهەلاتیو رۆژئاواییو ناوخۆیی تێدا هەبوو وەکو (سەماوەر)و (وارشۆ)و (قۆری ئیستراخان)و (چۆخی ئینگلیزیو فەرەنسی)و شووشەی هێنراو لە (ڤینا) و کانزای هێنراو لە ئەلمانیاو خەنەو شاڵو قاڵی هێنراو لە ئێرانو خەزەفو حەریر لە چینو بەهارات لە هندو فەیروزو مەرجانی هێنراو لە ئەندەنووسیا"[2].

"هەرکاتێك بە بارو بارخانەی قورسو کوتاڵی ئاڵو والآوە بە باری خورماو تووتنو پێستەو خواردەمەنیو ووشکەوە کراوەوە بەرەو ژوورو بەرەو خوار بڕۆیشتایە ئەوا شەوێك دوان لە کفریدا باریان ئەخستو تێکەڵ بە دانیشتووانی کفری ئەبوون.."[3].

"لە ساڵی ١٨٥٠ لە کفریدا قەیسەرییەکی گەورە دروست کرا نزیکەی سەدو پەنجا دوکانی تێدابوو..ئەوسا ئەو قەیسەرییە پڕبوو لە دووکانی بازرگانو وردە والآفرۆشو جل دروو سەراجو کەوش دروو مزگەوتو هەلاجو پالآن دروو جگە لە چەند چێشتخانەو قاوەخانەیەك لەناو کۆلآنەکانی نزیك بە بازار چەند نالبەندو بۆیەخانەو جۆلآ هەبوون، چەند مالێك لە (کفری) بە سابوون دروست کردن ناوبانگیان دەرکردبوو.."[4].

لە کفریدا چەند کاروانسەرایەکی گەورە بۆ حەسانەوەی قەتارچیو بازرگانەکانی سەر ئەو رێگەیە هەبوو لە هەموویان گەورەتر (خانی پاشا) بوو کە (مەجید پاشا)ی بابان دروستیکردبوو.."[5]. "لە سییەکانو چلەکانیش بازاری (کفری) بەهۆی هۆزی (جاف)و دێهاتەکانی دەوروپشتییەوە جمەی ئەهات، هۆزی جاف کە بەشێکیان کۆچەربوون لەوەرزی پایزەوە ئەهاتن لە (شاکەل)و (شێروانە) هەلیان ئەدا بەروبومو مالآتیان لە (کفری) ساغ ئەکردەوە وەك (رۆن، خوری، موو، بەرگن، پێستە، دەوار، هۆر، گوریس، چیخ، گلێم، قالی، گاو مانگاو مەرو بزن). لە بەهارنیشدا کە خێل بەرەو کوردستان ئەبۆوە لە شەکرو چایو جلوبەرگو گەنمو جۆو برنج)یان ئەکری"[6].

هەر ئەم بنکە گرنگەی کفری وایکرد ئالوویر لەگەل شارەکانی (بەغدا)و (دیالە)و (سلێمانی)دا بکرێت وهەموو دەم جێگەی ئەم ئاڵووگۆڕییە بوونی گەلێك کاروان سەرا بووە لە شوێنەکانی نێوان (کفری-بەغدا) و(کفری-کەلار-سلێمانی)و (کفری-دیالە)و (کفری-کەرکوك). شارێکی وەکو (سلێمانی) بەردەوام رێگای هاتووچۆی بازرگانی بووە لەگەل کەرکوکدا.

"بازرگانێتی لەگەل ئەم شارەدا هەمیشەیی بووە، لەکەرکوکەوە پێلآوو هەندێ قووماشی زبری لۆکە هاتووە بۆ (سلێمانی) لە (سلێمانی)یەوە پاقلەجاتو هەنگوین، مازو، ترش، میوە، برنج، رۆن، لۆکە، مەرومالآت نێر دراوە بۆ کەرکوك. لە راستیدا (کەرکوك)، بازاڕێکی بەنرخی بەرهەمەکانی وولآتی (سلێمانی) بووە"[7].

، بەرهەمە حەسیرییەکانی (پردێ) لە سەبەتەو سەلەو گولدانی رەنگاورەنگ، پیشەی ئەو خەلکە بووە لەوێوە بە رێگاکانی وەکو (پردێ-کەرکوك)و (پردێ-هەولێر)و (پردێ-موسل) بەرەو ناوچەکانی تر بەرێکراوەو لە جێگەی ئەوەدا شتومەکی ناوچەکانی (موسل)و (هەولێر)یان هێناوە بۆ شارەکە یان بەرەو ناوچەکانی تری (عێراق) گواستۆتەوە.

لە ناو شاردا زەرەنگەریو ئالتون چێتیو دروستکردنی پێلآو (بەتایبەتی پێلآوی قاپ قاپ کە ژێرەکەی لە تەختە دار بووە)، هەروەها دروستکردنی لبادو قالیو بەرمالو قوماشی جۆربەجۆر پیشەی شارەکە بووەو پیشەی گۆزەکاریو گل چێتیش لە ناو (کەرکوك)و (خورماتوو)دا باو بووە.

ناوچەی (لەیلان)و (باوە) بەناوبەنگ بووە لە دروست کردنی لبادی خوری دا، هەروەها شاڵو گلێمو جاجمو بەرماڵو (کلاش وکەوش)یش لە ناوچەکانی (چەمچەماڵ)و (قەرەحەسەن)و (قادرکەرەم) باوی هەبووە.

جۆری ئەو ڕێگاوبانەی هەبووە زیاتر ڕێگای بازرگانی ووشکایی بووە، چونکە ڕێگای بازرگانی ئاویی نیە لە شارەکەداو ئەوڕێژە زۆرەی ئاوەکە نییە تا بەکار بهێنرێت لە ڕووی بازرگانییەوە، لە شوێنێکی گرنگ نییە تابکرێتە سەر هێڵە بازرگانییەکان، لەبەر ئەوەی پلەی یەکەم کە پشتی پێ دەبەسترێت ڕێگای بازرگانی ووشکاییە.

(کەرکوك) کەوتووەتە سەر ڕێگای سەرەکی سەروو خوارووی عێراق بۆ هەر جمو جۆڵێکی بازرگانی بۆ ناوچەکانی (موسڵ) و (هەولێر)و (سلێمانی) بەم شارەدا گوزەر دەکات. لەوەختی خۆیدا هێڵی شەمەندەفەر لە عێراقدا پێکهاتبوو لە سێ هێڵی سەرەکی لە بەغداوە. هێڵێکی لە خزمەتی ناوچەی خواروودا بوو، بەڵام دوو هێڵەکەی تر لە خزمەتی ناوچەی سەروودا بوو، یەکێك لەو دووهێڵە ئەگاتە هەولێر لە ڕێگای (مقدادیە)و (کەرکوك)وە ئەوەیتر ئەگاتە (موسڵ) لە ڕێگای (سامەرا)وە، بەردەوام دەبێت تا (سوریە). "لەشاری کەرکوکدا تێکرایی ڕۆژانە (معدل اليومي) لەسەر هێڵی (بەغدا–هەولێر)، (١٥٠) تەن لە کەلوپەل هەڵدەگرێتو بەهەمان قەبارە (١٥٠) تەن دادەگرێت، هەروەها ڕۆژانە (٢٠٠) تەن کەلووپەل دێتو دەڕوات بۆ هەولێر"[٨].

ناوچەکانی تر وەکو (سلێمانی)و (موسڵ)، یان لەوانەیە لە گەلێك کاتدا ڕێژەکە لەوە زیاتر بێت کە بەراوردی بکەین لە چاو ڕێژەی ڕۆژانەی ساڵانی حەفتاکانو پەنجاو شەستەکاندا، چونکە هۆیەکانی گواستنەوە زۆر پەرەی پێدراوەو هۆیەکانی هاتووچۆش زیاتر گەشەی کردووە لە چاو جاران.

"هەر لەبەر گرنگی ئەم شارە لە سەردەمی ئینگلیزەکان بڕیاری ڕاکێشانی ڕێگای شەمەندەفەری (کنگربان) بۆ (کەرکوك) دانرا هەرچەندە لەوسەردەمەدا گیرو گرفتێکی زۆری ئابووری لە گۆڕدابوو زۆر زەحمەت بوو بۆجێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە.. چونکە لە کاتی گەشتەکەی (باوەڕ پێکراوی سامی) بەریتانیا بۆ (سلێمانی) ئەوەی خستە ڕوو کە ڕاکێشانی ئەم هێڵە زۆر گرنگە کە کارێکی گەورە دەکاتە سەر کوردستانی خواروو لە ڕووی سیاسییەوە. هەر لەسەر ئەم بنەڕەتە بوو کە (ئەنجومەنی وەزیران) لە کۆبوونەوەی (٢٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٢٤)دا بڕیاری ڕاکێشانی ئەم هێڵەی دا، هەر ئەوەبوو لە ئەیلولی ساڵی (١٩٢٥) ئەم هێڵە ڕاکێشرا لە (کنگربان)ەوە بۆ (کەرکوك) بەڕێژەی (٣٥) میل تا بۆ ئەوەی ئەو هێڵەی نێوان (کەرکوك)و (بەغدا) تەواو بێت.."[٩].

ئەوەی کە پەرەی داوە بە بازرگانی لە شارەکەدا زۆربوونی بەرووبوومە ئابوورییە جۆربە جۆرەکانیەتی لە پێویستی دانیشتووانو ناردنی بۆ دەرەوەی پارێزگاکە، ئەمە لە خۆیدا جووڵانەوەیەکی بازرگانی بە هێزی دروستکردووە، کە ئەوەندەی تر گرنگی دەدات بەشارەکە. "بۆ نموونە: لەساڵانی (١٩٥٧–١٩٥٨)دا (١٣٠١) سەر مەڕو (٨٣٦) سەر بزنو (١٤١) سەرمانگا نێردراوەتە دەرەوە، کە لە پێویستی دانیشتووان زیاد بووە (٣٥٤١) سەرمەڕو (٤٥٠٤) سەربزنو (١٢٨٣) سەرمانگا سەربڕاوە لە کۆی (٤٧٣٠١٢) سەرمەڕو (١٨٧٤١٨) سەر بزنو (٤٨٢٧٣) سەر مانگا"[١٠]، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی هێشتا ڕێژەیەکی زۆر بەرهەمهێنانی ئاژەڵداری لە پارێزگاکەدا زیادە ئەگەر لەگەڵ ژمارەی دانیشتووانیدا بەراوورد بکەین کە هەردەم لە ڕووی زیادبوونی دانیشتوواندا بەرووبوومەکانیش زیادی کردووە. لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە نەك تەنها بەرووبوومە ئاژەڵییەکان بەڵکو بەرووبوومە کشتوکاڵیو کانزاییەکانیش لە ڕێژەی دانیشتووان زیادبووەو نێردراوەتە دەرەوە وەکو (گەنم) و(جۆ) و(نیسك)و (نۆك)و (خوێ)و (برنج)و (پێستە)و (توتن)و (خووری).

"داهاتانەی (ضريبة الفصل) شارەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیاد بووندا بووە بۆ نموونە ئەگەر بووجەی ساڵی (١٩٥٤–١٩٥٥) سەیر بکەن داهاتانە تەنها (٩) هەزار دینار بووە لە کۆی هاتی ناوچەکە نزیکەی (١٦) هەزار بووە، کە لە نێو ئەم ئامارەدا ڕێژەی پارەی بەرهەمهێنانی نەوتی تێدانییە"[١١].

"ئەگەر سەیری بووجەی ساڵانی (١٩٥٧–١٩٥٨) بکەین کە (٥٥٧٤٣١) هاتووی هێنراوی قەبڵێنراو بووە کە (٥٥٧٣٣٧) خەرجی قەبڵێنراو بووە کە (٩٤) پاشەکەوت بووە"[١٢].

"ئەگەر سەیری بەهای کڕینو فرۆشتنو پاشەکەوتو خەرج کراوی بازرگانی تاکیو بازرگانی بەکۆمەڵ بکەین (الجملة) لە ساڵانی (١٩٨٧– ١٩٨٨)دا. کڕینی بازرگانی تاکە کەس (٢١٨,١١٧,٠٠٠) دینار بووە کە فرۆشراوی (٤٢٨,٧٢٥,٠٠٠) دینار بووەو دەرامەتی (١٨٨١٠٠٠) دینار بووە کە خەرجییەکانی بێجگە لە کرێ (٤٧٧٦٠٠٠) دینار بووە.

"بەڵام بازرگانی کۆکراوی (٢٢٠٨٠٠٠) دینار فرۆشراوی (٥١٤٩٠٠٠) دینارو دەرامەتی (١٢١٠٠٠) دینارو خەرجییەکان (٣٨٠٠٠) دینار بووە"[١٣].

بەڵام ئەگەر لە ساڵانی (١٩٨٩–١٩٩٥) سەیری بازرگانی شارەکە بکەین دەبینین لەنێوان هەڵبەزو دابەز دابووەو کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی بارە سیاسییەکەو ئابوورییەکە لە قەیرانەکەی ساڵی ١٩٩١ دا ڕەنگی داوەتەوە. لەبەر ئەوەی ناوچەیەکی نزیکی سەرووی کوردستانی خوارووە بۆیە هەردەم لەم کارتێکردنە بە دوور نەبوو، چونکە دابڕانی (سلێمانی)و (هەولێر)و (بەشێکی کەرکوك) لە دەوڵەتی عێراق وایکرد گەلێك جار بێتە دابڕانی لەبازرگانی ناوخۆو دەرەوە، یان وای کردووە کە کارتێکردنەکەی لەسەر بەرووبوومی ناوخۆدا ڕەنگ بداتەوەو ببێتە هۆی بەرزبوونی نرخی بەرووبوومە ئابوورییەکان لە شارەکەدا.

بەهۆی کاول بوونی لادێکانی دەورووبەریو وەستانی هەموو بەرووبوومێکی ئابووریو ڕاگوێزانی خەڵکەکەی وایکرد لە خۆیدا بێ بەرهەمیو بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك لە زیادبووندا بێتو ڕاگوێزستنی بەرووبوومێکی زۆری ئابووری شارەکە بەڕێگای قاچاغ بەرەو سلێمانیو هەولێرو لەوێوە ئاودیوکردنی بۆ (ئێران)و (تورکیا) وایکرد گەلێك پیشەو کارگە لە کار وەستانو هەرەسیان هێنا ئەویش

بەهۆی لە دەسدانی ئەو کەرەستە ئابوورییە خاوانەی کە لە بەرهەمهێنانیدا کاریان دەکرد. تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی گەلێك لایەنی شارستانی شارەکە تووشی داڕووخاندن بوو بەهۆی ڕاگوێزستنی بەرهەمە خاوەکانو کەرەستە پێویستییەکان بۆ سنوور.. لەگەڵ خۆیدا چاکردنی ئەو لایەنە شارستانییە پێویستی بەسەردەمێکی دوورو درێژ هەیە بۆ ڕاست کردنەوەی.

قەیرانە ئابوورییەکەی ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٦) خۆی لە خۆیدا نەك تەنها لە کەرکوك بەڵکو لە سەرتاپای عێراقدا گەلێك کێشەی ئابووری دروست کردبوو بەهۆی فەوتاندنی هەموو بنەرەتەکانی سەرەوەوخوارەوەی ئابووری شارەکانو وای کرد کە ڕێژەی ئابووری بێتە ڕێژەی (سفر) لە گەلێك شوێندا، فەوتاندنی هەموو ئەو کارگانەی لەسەردەمەکانی پێشوودا دروست کرا بوو، دەوری کاریگەرییان هەبوو لەبەرهەمهێنانی کەرەستەی ئامادەکراو لە دەرەوە کە ئەمە لەگەڵ خۆیدا دەبێتە بەرز بوونەوەی نرخی شتومەك لە شارەکەدا. تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی گەلێك لایەنی شارستانی شارەکە تووشی داڕوخاندن بوو بەهۆی ڕاگوێزستنی بەرهەمە خاوەکانو کەرەستە پێویستییە ئابوورییەکان بۆ سنوور.. لەگەڵ خۆیدا چاکردنی ئەو لایەنە شارستانییە پێویستی بەسەردەمێکی دوورو درێژ هەیە بۆ ڕاستکردنەوەی.

بوژانەوەی (ئێران)و (تورکیا) وەکو دوو هێڵی گرنگ بۆ هێنانی شتومەك بۆ (عێراق) وایکرد کەرکوك ببێتە بنکەیەکی گرنگی بازرگانیو مامەڵە کردنی شتومەك لەگەڵ ناوچەکانی خوارووی عێراقدا، کەرکوك ببێتە جێگای ساغ کردنەوەی ئەو کەلوپەلە بازرگانییانە لە ناویدا، چونکە هێنانی ئەو بەرووبوومانە لەو وڵاتانەوە بۆ عێراقو ناردنی بۆ خوارووی عێراق، کەرکوك نزیکترین شوێنە بۆ ساغ کردنەوەو گواستنەوەی چونکە کەرکوك سەرەڕێی بازرگانییە چ لە موسڵەوە چ لە سلێمانییەوە بۆ خوارووی (عێراق). هەر ئەمەش وایکرد کەهەم بازرگانی تاكو بازرگانی کۆ گەشە بکات لە بازاڕی حەسیرەکە لەسەر ڕێگای (سلێمانی)و ناو بازاڕی (پردێ)یش ببوژێتەوە لەسەر ڕێگای هەولێر. لە گەلێك کاتدا بازرگانییە تاکە کەی بازاڕی حەسیرەکە دەبێت بە بازرگانی کۆو لەوێوە دەفرۆشرێت، چونکە هێنانی ئەو بەرهەمانە بە کۆڵو دەست لە لایەن خەڵکەوەو کەڵەکە کردنی لە بازارەکەدا خۆی لەگەڵ خۆیدا هەر دوو بازرگانییەکە گەشە دەکات. کە لەگەلێك کاتدا نرخی بازرگانییە کۆییەکە وەکو یەکی لێدێت.

ئەو کەلوپەلانەی کە لەوێدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت بریتییە لە (نیسك)و (نۆك)و (برنج)و (ماش)و (فاسولیا)و (قەیسی) و (کشمیش)و (کەلوپەلی قووماشی جۆربەجۆر)و (پێڵاو) و (دۆشاوی تەماتە)و (گەلێك کەرەستەی باوی ڕۆژانە).. هەر هۆی بووژاندنەوە بازرگانییەکە وای کردووە کە گەلێك (گەراجی) جۆربەجۆر گەشەبکات بۆ حەوانەوەی بارهەڵگرەکان لە سلێمانییەوە کە دێنو یان لە کەرکوکەوە بەرەو سنوور ڕێرەو دەکەن یان بۆ خوارو بارهەڵدەگرنو بەپێچەوانەوە هەر لە شوێنی کۆنی بازاڕی حەسیرەکەدا ئاڵوگۆڕکردنی (گەنم)و (جۆ)و (ماش)و (گەنمە شامی)و دانەوێڵەی تری کشتوکاڵی کرینو فرۆشتنی پێدەکرێتو لەوێوە ساغ دەکرێتەوە بۆ ناوچە جۆر بەجۆرەکانی کەرکوكو دەورووبەری. لە ئەنجامی گرنگی ناوچەکە لە رووی بازرگانیو ئابوورییەوە وایکرد ببێتە شوێنێکی پیشەسازی گرنگو گەلێك کارگەو دامو دەزگای پیشەسازی لێبکرێتەوە.

"لە ناوشاری کفری لە کۆندا چەند کارگەیەکی بچووك بۆ دروست کردنی سابوونو قاڵیو پۆپەژمینی دروستکردن هەبوو، لە دەورووپشتی شار حەوت ئاسیاوو ئاشی ئاو هەبووە، لە هەریەکە لەم ئاسیاوانەدا سێ چوارکەس کاریان ئەکرد بەسەرییەکەوە لە کارگە بچووکەکانو باخو باغچەو ئاسیاوەکانو چاخانەکانەو حەمامەکاندا نزیکەی (٢٠٠) کرێکار پترو نزیکەی (٥٠٠) خێزان ئیدارەیان پێدەکردو لە ناو بازاڕو قەیسەری یەکەشدا (٣٠٠) دوکان هەبوو"[١٤].

هەر لە کفریدا: "لە موسڵەوە (عەلی دەباغ) لەسەرەتای سەدەی بیستدا دەباخانەیەکی لەم شارەدا دامەزراندووە، هەروەها (قاسم سەرووەت)کە گەرایەوە کورەیەکی بۆ قسڵ دروستکردن دامەزراند کە لە کفرییەوە (قسڵی) دەنارده (بەغدا)و (عەبدولفەتاح سنوورچی) وەکیلی فرۆشتن بوو وەنازناوی پێ دەگرت، قسڵو نوورە ئەو کەرەستانە بوو لە جیاتی چیمەنتۆ بناغەی خانووی پێ دائەڕێژرا"[١٥].

"هەر لە ساڵی (١٩٢٢) کارگەی دروستکردنی سەهۆڵ کرایەوە لە (کەرکوك)و کاری دەکرد لە بەرهەمهێناندا"[١٦]. تا ساڵی (١٩٥٨) کارگەی شیکردنەوەی لۆکە لەشارەکەدا هەبوو کە لەم ساڵانەی دوایدا گەلێك کارگەی شیکردنەوەی لۆکە کرایەوە. لە ساڵەکانی دوای (١٩٥٨)دا هەندێك کارگەی جۆربەجۆر کراونەتەوە هەر چەندە کەمیش بووبێت وەکو کارگەی چنینو دەرهێنانی نەوتو پاڵاوتن لە نەوتی خاوو دەزگای کارەبای خورماتووو دروستکردنی پێڵاو کارگەی دارتاش کە ناوبانگی هەیە لە دروستکردنی تاخمی داری ڕەنگاو ڕەنگ هەروەها کارگەی بەرهەمهێنانی بیبسیو کۆلاو کارگەی جۆربەجۆری خەراتیو تۆرنەچێتیو ووردکردنو چەند کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی پارچەی کۆنکرێتی دروستکراو کرایەوە.

بەڵام ئەگەر بە چاوێکی ئابوورییانەوە سەیریکەین هەموو ئەم کارگەو دامو دەزگایانە لە ئاستی ئەو سەرچاوە گرنگەی نەوت نەبووە کە لە شارەکەدا دۆزراوەتەوە. چونکە کارگەیەکی وا زۆر نەکراوەتەوە کە لە ئاستی ئەو بەرهەمهێنانەی نەوتدا بێت. "دەزگاکانی کەهرۆ گەرمی (دووبز لە ساڵی (١٩٥٨) دا کەوتە کار ئەم دەزگایە لە چوار (یوتیف)، هەریەکە (١٥) (مێگاوات) کارەبا دەڕوێنێت ئەم کارەبایە لە سێ ڕێگاوە بۆ (بەغدا)و (موسڵ)و (کەرکوك) دەچێت سووتەمەنی ئەم دەزگایە غازی سروشتی بیرە نەوتەکانی کەرکوکە بۆ ساردکردنەوەی ماکینەکانی ئەم دەزگایە (٥,١)م سێ جار (مکعب) لە سانییەکدا بەکاردەهێنێ لەم (٥١,٧) لە ناو دەچێت لە ساڵی (١٩٧٣-١٩٧٤) ئەم دەزگایە (٥٥١٩) سەعات کاری کردووە کە تەنها (٦٣٪)ی توانایەتی"[١٧]. (بڕوانە خشتەکانی ١٢، ١٣، ١٤ دەربارەی گەلێك لایەنی ئابووری شارەکە).

### خشتەی ژمارە (١٢) [١٨]

**ژمارەی کارکەرو کرێو بەهای بەرهەمهێنانو بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنانی ئابووریيە ناوەندیو بچووکەکان لەنێوان ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٤**

| ژمارەی | ژمارەی کارکەرەکان | کرێو جۆرەکانی (١٠٠٠دینار) | بەهای بەرهەمهێنان (١٠٠٠دینار) | بەهای پێویستی بەرهەمهێنان (١٠٠٠ دینار) | جۆری دەزگاکە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٨ | ١٠٨ | ٣٧٨ | ٢٦٨٧ | ١٦٦٢ | ناوەندی[١٩] |
| ٧٢٥ | ١٣٩٣ | ١٥١٧ | ٢٧٤٨٩ | ١٣٥٢٥ | بچووك |

### خشتەی ژمارە (١٣) [٢٠]

**یەکە کارەباییەکانی بەکارهێنراو لە ساڵی ١٩٩٠ - هەزار (میگاوات/سەعات)**

| بەکارهێنانی ماڵی | بازرگانی | دەزگاکانی حکومەت | هێزی پیشەسازی | دابەش کردنی بە خۆرایی | رۆشنایی شەقامەکان | بزربوو |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٠٩ | ١٩ | ٦٠ | ٦٤ | ٢ | ١٧ | ١٥١ |

### خشتەی ژمارە (١٤)[٢١]

**ژمارەی خێزانو ژمارەی کارگەرو بەهای بەرهەمهێنانو پێویستییەکانی بەرهەمهێنانی پیشەماڵیو لادێیەکانی ساڵی (١٩٨٩)**

| ژمارەی خێزان | ژمارەی کارکەر | کرێ دینار | بەهای بەرهەمهێنان (١٠٠٠)دینار | بەهای پێویستی بەرهەمهێنان ١٠٠٠دینار |
|---|---|---|---|---|
| ٦٩٥ | ٩٢٧ | — | ٢٠٩٤ | ٨١٦ |

ئەگەر سەیری پیشە دەستییەکان بکەین وەکو ئەوی لە پێش ساڵانی (١٩٨٩)دا هەبووە لەگەڵ ئەوەی لە ساڵانی (١٩٨٩-١٩٩٦)دا هەبوو زۆر جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە چونکە پیشە دەستییەکانی کە لەلادێ کوردەوارییەکاندا دروستدەکرا هەمووی هەرەسی هێناوە لە قاڵیو بەرەو لبادو کورتانو پاڵەو چنینی جلوبەرگی جۆربەجۆر بەهۆی کارەساتی (ئەنفال)ەکەوە ئەوەی تەنها ماوە لەم پیشە دەستییانە بریتییە لە ناوچەکانی (خورماتوو و داقوق)دا کەلە لادێکانی کاکەییو تاڵەبانیدا ماوەتەوە. بەڵام بنەما سەرەکییەکانی ئەم پیشەیە بە تەواوەتی هەرەسی هێنا ئەوەش لەبەر گۆرانکارییە خێراکانی سەردەمو سەرهەڵدانی کەرەستەی تر تا جێگەی ئەم پیشانە بگرێتە بۆ نموونە نەمانی لادێکان بوو بەهۆی ئەوەی پیشەیەکی وەکو (کورتان) نەمێنێت چونکە ئەو پێویستییە گرنگە نەما کە چەند کەسێك خۆی پێوە خەریك بکات.

گرنگترین شوێنی ئاڵوویرە بازرگانییەکان بازارە، ئەگەر لە شارێکی وەکو کەرکوك دەورووبەرەکەی سەیر بکەین بازار لەو پارێزگایەدا چەند خاسیەتێکی سەرەکی هەیە کە جیاوازە لە شوێنی نشوونماکردنی بازار لەشارەکانی تر، کە بریتییە لە:

**١. دروست بوونی بازار لە شارەکەدا لەسەر هێڵە بازرگانییەکان:**

بازار لە شارەکەدا لەسەر هێڵە بازرگانییەکان دروست بووە، وەکو (قەڵا)و (پردێ)و (خورماتوو)و (چەمچەماڵ) هەموو بازارەکانی ئەم ناوچانە کەوتوونەتە سەر ئەو هێڵانەی کە کەرکوکی بەشارەکانەوە بەستۆتە قوورسی بازارەکانی لەو شوێنانەدایە: بۆ نموونە ئەگەر سەیری قەڵا بکەین لە رابردوو ئێستادا دەبینین شوێنی کۆکردنەوەی بازارێکی گەورە بووە لە دەورووبەریدا. تەنانەت دەرگایەکی پێی ووتراوە دەرگای حەلواچییەکان، چونکە ئەگەر سەیری دروست بوونی قەڵا بکەین دەبینین کەوتووەتە سەر رێگای (هەولێر)و (موسڵ) و (سلێمانی) هێڵی قیرتاوکراو بەستوویەتەوە بەشارەکەوە لە هەموو شوێنەکانەوە. هاتووچۆکردن لە هەریەکە لەم ناوچانەدا بەرەو قەڵا گلۆر دەبێتەوەو لەوێ یاری دەکا نموونەشمان بوونی خانێکی زۆر لە دەورووبەریدا راستی قسەکانمان بۆ دەخاتە روو. کە ئەمە لەگەڵ ناوچەکانی (پردێ)و (خورماتوو)یشدا یەك دەگرێتەوە، چونکە پردێ کەوتووەتە سەر رێگای هەولێر-موسڵ، بازرگانیش لەسەر ئەو رێگایەدا دابەش بوونە هەروەکو ئەوەی خورماتوویش هەمان شێوە دروستبوونی بەخۆیەوە گرتووە.

**٢. هەمەچەشنی بازارەکان:**

دەبینین شوێنێکی دیاری کراوی وانییە تەنها بۆ ئاڵوویرکردنی بەرهەمێکی دیاریکراو بەڵکو بوونی هەمەچەشنەیی هەیە لە بازارەکانداو لە هەمان کاتدا رێکوپێکی هەیە لە دابەشکردنی بەرهەمەکان بۆ نموونە بازارێکی وەکو بازاری گەورە، ئاسنگەرو پینەدۆزو کەلوپەل فرۆشو میوە فرۆشو

شتی ووشکەمەنی لە خۆی گرتووەو هەریەکە لە شوێنێکی دیاری کراو دابەش بوونە بەهەمان شێوە بازاری (حەسیر) ەکە شوێنی گەنم فرۆش و ماست فرۆشتن. هەربەهەمان شێوە بازاری قۆریەو ئەحمەد ئاغاو گەراجی (حەویجە)و بازاری گەراجی لەیلان. بەرهەمی ئەم هەمە چەشنییە وای کردووە هەردەم بازار قەڵەبالغ بێت و جمەی بێت لەخەڵك بۆ ئاڵوێر کردن.

**٣. تایبە تمەندی بازارەکان:**

بوونی تایبەتمەندێتی بازارەکانی کەرکوك لە بوونی خان و قەیسەری و ئاخوور لە رابردوودا تا بۆ ئەوەی ئەو بارانەی کە لەوێدا دەخرێت هەڵگیرێت تا ساغ دەکرێتەوەو ئاژەڵەکان لە شوێنی تایبەتی جێگیر بکرێت بۆ نموونە بازاری گەورەو بازاری حەسیرەکە گەلێك خان و ئاخووری لێ هەیە تەنانەت گەرەکێکی وەکو ئاخور حوسێن هەر بەوناوەوە ناوبراوە.

٤. کارتێکردنی بازارەکانی کەرکوك لەژێرکاری بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی نرخ ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەی کەوتووەتە ناوەندی هێڵە بازرگانییەکانەوە.

٥. فەوتاندن و نەمانی گەلێك پیشەی خۆماڵی بازارەکانی کەرکوك و جێگربوونی نەمانی گەلێك پیشەی نوێ باو لە جێگەی ئەمەش زیاتر لەبەر ئەوەیە بە ناوەندی شوێنە بازرگانییەکانەوە پەیوەستەو هەر کارتێکردنێکی نوێ باو کاردەکاتە سەر پیشەکان و بەرەو نەمانی دەبات.

*** سەرچاوەو پەراوێزەکان:**


١. (ابراهیم خان ثائر من کوردستان)، نووسینی موکەرەم تاڵەبانی، بەغدا، ساڵی ١٩٧١، چاپخانەی (ئەسعەد)، لاپەرە (١٨).

٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢).

٣. (شۆرشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، لاپەرە (٥٦).

٤. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٥٧).

٥. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، مستەفا نەریمان، لاپەرە (١٤).

٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٤).

٧. (شاری سلێمانی)، نووسین و کۆکردنەوەی، ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی رەشە، پێداچوونەوەو پێشەکی، دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوول، بەرگی یەکەم، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٢، چاپخانەی (دار الحریة للطباعة)، چاپی یەکەم، لاپەرە (٣٩٦).

- هەروەها بروانە ئەم سەرچاوەیە:

- (الاکراد، دراسة جغرافیة اثنوغرافیة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٢٣).

٨. (قەڵای کەرکوك)، نووسینی دلێر هیدایەت، بەزمانی ئینگلیزی، ساڵی ١٩٧٥، وەرگرتنی نامەی ماجستێرە لە زانکۆی بەغدا، conseruation of an historic taun the Qalaa' of kirkuk

٩. (الطبقة العاملة العراقیة، التکون وبدایات التحرك)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، (دار الرشید للنشر)، ١٩٨١، چاپخانەی (دار الحریة للطباعة)، لاپەرە (٥٧-٥٨).

١٠. (ماذا في کرکوك)، نووسینی فەهمی عەرەب ئاغاو فازڵ محەمەد مەلا مستەفا، ساڵی (١٩٥٧م-١٣٧٧هـ)، لاپەرە (٩٧).

١١. (العراق الشمالي)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٩٢).

١٢. (ماذا في کرکوك)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٣٩).

١٣. (مجموعة الاحصائیة لسنة ١٩٨٧-١٩٨٨).

١٤. (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، نووسینی مستەفا نەریمان، لاپەرە (١٤).

١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢١).

١٦. (الطبقة العاملة العراقیة)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٦٤).

١٧. گۆڤاری (کۆری زانیاری عێراق)، دەستەی کورد، بەرگی بیست و سێ یەم وچوارەم، چاپخانەی (کۆری زانیاری عێراق)، ساڵی ١٩٩٢، بەغدا لاپەرە (١٣١).

١٨. (مجموعة الاحصائیة لسنة ١٩٩٣-١٩٩٤)، لاپەرە (١٦٩)

١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٦٤).

٢٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٧٨).

٢١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ساڵی ١٩٨٩، لاپەرە (١٨٨).

**تەوەری دوانزەیەم**

*** بەرووبوومە ئابوورییەکان:**

*** بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان، بەرووبوومە ئاژەڵییەکان، بەرووبوم و کەرەستە کانزاییەکان:**

*** بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان:**

دەتوانین کشتوکاڵ دابنێین بە کۆڵەکەیەکی گرنگی ئابووری شارەکە چونکە زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی هەیەو ڕێژەیەکی چاکی ئەم زەوییانە دەکرێت بە کشتوکاڵو بەرهەمەکەی لە زۆری ساڵەکان لە خۆی زیاد دەبێت دەنێردرێتە دەرەوە. دەبینین گەلێك بەرووبوومی کشتوکاڵی هاوینەو زستانە هەیە لە ناوچەکە وەکو (گەنم)و (جۆ) و(برنج)و (نۆك)و (نیسك)و (ماش)و (لۆکە)و (پاقلە)و (لۆبیا)و (کونجی)و (گوڵە بەڕۆژە) و (گەنمەشامی) سپیو زەردو (هەرزن) و(توتن)و (پیاز) و (سیر)و میوەی هاوینەو زستانەی وەکو (ترێ)و (قۆخ) و (زەردەلو)و (هەرمێ)و (ئالوبالو)و (هەنجیر)و (شوتی)و (کاڵەك)و (ترۆزی)و (ئاروو) و(تەماتە)و (باینجان)و (کولەگە) و (بامیا)و (بیبەر)و (هەنار)و (سێو)و (بەهێ)و (پرتەقاڵ)و (قەرنابیت)و (شێلم)و (سپێناغ)و (خاس)و (گێزەر)و (تور) و (یەنگی دوونیا) هەرچەندە هەندێك لەم بەرووبوومانە ئێستا لە ناوچەکەدا نەماون و فەوتان، بەڵام تارادەیەکی چاك شوێنی بەرهەمهێنانی بەرووبوومی کشتوکاڵییە چ لەسەر ئاستی (عێراق) چ لەسەر ئاستی کوردستانی خواروودا. لێرەبەدواوە هەوڵدەدەم کە هەریەکەی بەرووبوومەکان باس بکەمو ڕێژەی پێویستی ساڵەکانی بەرهەمهێنانی باس بکەمو خشتەی پێویست بخەمە روو لە دیاریکردنی چۆنییەتی بەرهەمهێنانیدا وەپشتم بەگەلێك ئاماری ئابووری بەستووە هەرلەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٣) وە تا ساڵانی (١٩٩٣-١٩٩٤).

*** بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان بریتییە لە:**

**١. گەنم:**

گەنم دادەنرێت بە بەرووبوومێکی سەرەکی بەرهەمی کشتوکاڵی لە ناوچەکەدا. چونکە سەرهەڵدانی یەکەم گوندی کشتوکاڵی پەیوەستە بەوەی یەکەم بەرهەمێك مرۆڤ بەکاری هێناوەو ژیانی گەشەی پێ کردووە گەنم بووە، لە دوایدا وورده.. وورده هەوڵی داوەکە جۆری گەنمەکەی چاك بکاتو هەوڵی زیاد کردنی ڕێژەی بەرهەمهێنانەکەی بدات، چونکە بوونی (گەنم) و(جۆ) دەورێکی گرنگی بینیووە لە گەشەکردنی ژیانی مرۆڤی ناوچەکەدا، گرنگی گەشەکردنی شارستانییەتی ناوچەکەیە.

بەرهەمهێنانی (گەنم)و (جۆ) هەر لەسەرەتای شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا خۆراکی سەرەکی بووە، لەبەر ئەوە تا ئەم سەردەمانەی ئێستامان هەربایەخی پێ دراوەو دادەنرێت بە بەرووبوومێکی کشتوکاڵی گرنگ، هەر چەندە ساڵی واهەبووە هەموو بەرووبومەکەی بە هۆی نەبوونی باران بە فیڕۆ چووە.

"سەیر دەکەین (گەنم) کشتوکاڵ بە شێوەیەکی گشتی پشت دەبەستێت لەسەر باران بارین، کەرکوك یەکێکە لەو شارانەی کە کەوتووەتە نێوان هێڵی باران بارین لە (٣٠٠-١٠٠٠) ملم ئەم جیاوازییە کار دەکاتە سەر بەرووبوومی دۆنمێك لە (گەنم) هەریەکە لە پارێزگایەکەوە بۆ پارێزگایەکی تری، گەلێك جار لەنێوان پارێزگاکە خۆشیدا"[١].

"چەند هۆیەك هەیە دەوریان هەیە لەسەر بەرووبوومی دۆنمی گەنم، یەکێك لەوانە ڕێژەی ئەو بارانەیە لە کاتی شین بووندا کە پێکهاتووە لە ناوەندی ئەو ڕێژە بارانەی مانگی (تشرین) و (کانونی یەکەم) لە هەر ساڵێکدا. لەگەڵ ڕێژەی ئەو بارانەی لە کاتی شین بووندا پێکهاتووە لە ناوەندی ئەو ڕێژە بارانەی مانگەکانی (کانونی دووەم)و (کانونی یەکەم) لە ساڵێکدا". هەروەها ڕێژەی ئەو بارانەی لە کاتی پێگەیشتندا پێکهاتووە لە ڕێژەی ئەو بارانەی کە دەبارێت لە مانگی (مایس)ی هەموو ساڵێك لەگەڵ کارتێکردنی ناوەندی پلەی گەرما لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ڕابردووە، کارتێکردنی ئامێری کشتوکاڵیش دەوری خۆی هەیە لەبەرهەمهێنانی کشتوکاڵدا"[٢].

"کەرکوك کەوتووەتە ناوچەیەکی بارانی کەم چونکە لە هەموو پارێزگاکانی کوردستان ووشكو کەمتریان باران دەبارێتو ڕێژەی ئەوبارانەش کە دەبارێت لە کاتی پێگەیاندا، دەوری گرنگی هەیە لە چاکی بەرووبوومی گەنمەکەدا.."[٣]. هەر ئەمە کاری هەیە لەسەربێ هێزی باران لە مانگی (مایس) لەسەر بەرووبوومی (گەنم)، چونکە کەوتووەتە نێو پشتێنی بارانی نزم، لەبەر ئەوە هەرەشەی بارانی لێ ناکرێت بە بارینی باران لە مانگی (مایس) بەڕێژەیەك کە زیان لەو بەرووبوومە بدات[٤]. ڕێژەی پلەی گەرماش لە ناوچەکە دەوری هەیە لەسەر بەرووبوومەکە، ڕێژەی ناوەندی پلەی گەرما لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٧٣)دا لەنێوان (١٤-٢٠) دایە کە زۆری ئەم ڕێژەیە لەنێوان (١٤-١٦)دایە لە پێوانەی نێوان ئەم ساڵانە"[٥].

لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم شوێنی بەرهەمهێنانی گەنم بەراورد بکەم لەگەڵ ناوچەکانی کوردستان چ لە رووی زەوی تۆوکراو بە گەنم لەگەڵ ڕێژەی بەرهەمی گەنم لە پارێزگاکەدا. هەروەها بەراوردکردنی بەرهەمهێنانی گەنم لە ناو پارێزگاکە خۆیدا بەراورد دەکەم چ لەسەر ئاستی قەزاو ناحییەکان چ لەسەر ئاستی ناوچەکە. لەم بەراوردکردنەدا پشتم بە ستوە بە ئامارە ئابوورییەکانی ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)و (١٩٦٠-١٩٦٩)و ساڵانی (١٩٨٢-١٩٩٤).

"ئەگەر لەگەڵ پارێزگاکانی کوردستانیشدا بەراوردی بکەین دەبینین هەریەکە لە (موسڵ)و (دهۆك) گەورەترین شوێنی بەرهەمهێنانی گەنمن لە رووی پانتایی تۆوکردن بەگەنم لەم دوو ناوچەیەدا نزیکەی (٥٤٪) دەبێت لە کۆی پارێزگاکانی کوردستان لە دوای ئەو (کەرکوك) دێت بەڕێژەی دووەم کە بەشی لەم زەوییانە نزیکەی (٢٠٪) دەبێت.."[٦]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٥). بەڵام لە رووی بەرووبوومی دۆنمێك (سلێمانی) بەڕێژەی یەکەم دێت ئینجا (موسڵو دهۆك) لە دوایدا کەرکوكو هەولێر.

لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠)دا ڕێژەی ناوەندی بەروبوومی دۆنمێك بەم شێوەیە بووە (١٤٥,٤١، ١٣٣,٦٣، ١٢٢,١٨، ١١٥,٢٢ کیلۆگرام /دۆنم) کە کەرکوك بەڕێژەی (١٢٢,٨) کیلۆگرام بووە لە دۆنمێك. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە ١٦) بۆ زانیاری ناوەندی بەروبوومی لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧-١٩٧٤)و (١٩٥٠-١٩٧٤)"[٧].

بەڵام لە ڕووی ڕێژەی بەرهەمهێنانەوە هەریەکە لە (موسڵ) و (دهۆك) بەڕێژەی یەکەم دێت کە بەشی دەگاتە (٥٢,٥٪) بەروبوومی گشتی ناوچەی کوردستان لەدوایی ئەو دێت (کەرکوك)، (سلێمانی)و (هەولێر).

لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧-١٩٦٨)دا زەوی تۆوکراو بە گەنم (٨١٤) هەزار دۆنم بووە لە ساڵانی (١٩٦٨-١٩٦٩)دا زەوی تۆوکراو (٩٥٨) هەزار دۆنم بووە کە دەرهێنراوی بەرهەمی لە ساڵی (١٩٦٨)دا (١٥٠) هەزار تەن بووە لە ساڵی (١٩٦٩)دا (١١٨) هەزار تەن بووە[٨]. (بڕوانە خشتەی ژمارە١٧).

**خشتەی ژمارە (١٥)[٩]**

**پانتایی‌و بەرهەمهێنانی گەنم لە پارێزگاکانی کوردستان ساڵی (١٩٧٤)**

| پارێزگا | پێوانە دۆنم | % | بەروبووم (کیلۆگرام) | بەرهەمهێنانی چەندیتی | % |
|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ‌و دهۆك | ٣٤٤٢٨٤٩ | ٥٣,٩ | ١٥٨,٩٢ | ٥٤٧١٣٩ | ٥٢,٥ |
| سلێمانی | ٥٨٦٢٣٦ | ٩,٢ | ٢٣٠,٥٠ | ١٣٥١٢٦ | ١٣,٠ |
| هەولێر | ٩٦٣٨٨٩ | ١٥,١ | ١٣١,٢٩ | ١٢٦٥٤٩ | ١٢,١ |
| کەرکوك | ١٣٨٨٠١٤ | ٢١,٨ | ١٦٧,٧٢ | ٢٣٢٨٠٤ | ٢٢,٤ |
| کۆی گشتی | (٦٣٨٠٩٨٨) | (١٠٠٪) | (١٦٣,٢٤) | (١٠٤١٦١٨) | (١٠٠٪) |

**خشتەی ژمارە (١٦)[١٠]**

**ناوەندی بەروبوومی دۆنمێك لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٦)، (١٩٦٧-١٩٧٤)، (١٩٥٠-١٩٧٤)**

| ز | پارێزگا | ماوەی ١٩٥٠-١٩٦٦ | ماوەی ١٩٦٧-١٩٧٤ | ماوەی ١٩٥٠-١٩٧٤ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ١٣٣,٦٣ | ١٦٨,٨٠ | ١٤٤,٨٩ |
| ٢ | کەرکوك | ١٢٢,١٨ | ١٣٩,٩٦ | ١٢٧,٨٧ |
| ٣ | هەولێر | ١١٥,٢٢ | ١٣٦,٥٢ | ١٢٢,٠٤ |
| ٤ | سلێمانیە | ١٤٥,٤١ | ١٨٨,٤٢ | ١٦٠,٩٧ |
| | ناوچەی کوردستان بەگشتی | (١٢٦,٩٦٥) | (١٤٦,١٨٥) | (١٣٣,٠٤٧) |

**خشتەی ژمارە (١٧)[١١]**

| ز | پارێزگا | زەوی تۆوکراو بەهەزاران دۆنم ٦٧-٦٨ | ٦٨-٦٩ | دەرچووی بەهەزاران تەن ٦٨ | ٦٩ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٣٥٢٨ | ٣٧٠٩ | ٥٦٦ | ٥٧٩ |
| ٢ | کەرکوك | ٨١٤ | ٩٥٨ | ١٥٠ | ١١٨ |
| ٣ | هەولێر | ٨٤٧ | ٨٤٥ | ١٤٦ | ٩٢ |
| ٤ | سلێمانیە | ١٩٤ | ٢١٧ | ٣٧ | ٣٠ |

بەڵام ئەگەر سەیری ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٨٢) بکەین دەبینین ڕێژەی بەرهەمهێنانی (١٠٣٢٠٠) تەن بووە کە زەوی تۆوکراوی بەگەنم (٥٥٧٤٠٠) دۆنم بووە کە بەرووبووی کیلۆگرامێك لە دۆنمدا (١٨٥,٠) بووە، بەڵام بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی زۆردابڕا لە کەرکوك دەبینین چ لە ڕووی پێوانەو چ لە ڕووی بەرهەمهێناندا بووەتە ڕێژەی چوارەم لە دوای موسڵ‌و هەولێر‌و سلێمانی[١٢]. ئەگەر سەیری ئاماری ساڵی (١٩٩١)یش بکەین دەبینین بەهەمان شێوە ڕێژەی چوارەمی وەرگرتووە[١٣]. (بڕوانە خشتەی ژمارە (١٨)و (١٩)).

**خشتەی ژمارە (١٨)[١٤]**

**ڕێژەی بەرهەم‌و پانتایی گەنم لە ساڵی (١٩٨٢)**

| ز | پارێزگا | زەوی تۆوکراو (١٠٠) دنم | بەرهەمهێنانی (١٠٠) تەن | بەروبوومی کیلۆ گرام/ دۆنم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٢٠٠٦٠ | ٣٦٣٢ | ١٨١,٠ |
| ٢ | کەرکوك | ٥٥٧٤ | ١٠٣٢ | ١٨٥,٠ |
| ٣ | دهۆك | ١٤٣٥ | ٥٤٣ | ٣٧٨,٦ |
| ٤ | هەولێر | ٦٠٢١ | ٩٩٦ | ١٦٥,٤ |
| ٥ | سلێمانی | ٥٦٥٠ | ١٢٩٤ | ٢٢٩,١ |

**خشتەی ژمارە (١٩)[١٥]**

**ڕێژەی بەرهەم‌و پانتایی گەنم ساڵی (١٩٩١)**

| ز | پارێزگا | زەوی تۆوکراو | بەرهەمهێنانی | بەرووبوومی کیلۆ گرام / دۆنم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٢٣٣٩٨٩ | ٣٣٢٣٣١,٥ | (١٤٢,٤) |
| ٢ | کەرکوك | ١٠٥٥٨٥٧ | ١٤٥١٩٠,٧ | (١٣٧,٥) |
| ٣ | دهۆك | ٤٢٠٢٥٩ | ١١٦١٥٠,٨ | ٢٧٦,٤ |
| ٤ | هەولێر | ١٤٩٨٧١٠ | ٢١٥٧٥٧,٢ | ١٤٤,٠ |
| ٥ | سلێمانی | ١١٥٩٢٦١ | ١٨٠٢٢٧,٧ | ١٥٥,٥ |

"زەوی کێڵراو بەگەنم لەساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) بریتی بووە لە (٩٨٨٤٩٦) هەزار دۆنم کە دەرچووی بەرووبوومی لەو ساڵەدا (٧٣٦٣٩) هەزارتەن بوو. زەوی کێڵراوی (١٩٥٨-١٩٥٩)، (٧٧٦) هەزار دۆنم بووە کە بەرووبوومی لەو ساڵەدا (٧٤) هەزار تەن بووە"[١٦]. لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) بریتی بووە لە (٧٩١٢٤٠) هەزار دۆنمو دەرچووی بەرهەمی (٦٨٨٧٩) تەن‌و (٨٤٠) کیلۆگرام بووە[١٧].

بەڵام لە ساڵی (١٩٦٠)دا زەوی کێڵراوی بەگەنم (٩٨٨,٤٩٦) مەشارە بووە، کۆی یەك مەشارە لەگەنم نزیکەی (٧٤,٥) کیلۆ بووە، چونکە لە ساڵی (١٩٦٠) حاڵی زەوی تۆوکراوی گەنم باش نەبووە بەهۆی ئەوەی کەباران دواکەوت لەسەرەتای وەرزدا، کەمی بارانەکەی بەشی پاراوکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکانی نەکرد. بەڵام جوتیاری بەراو ژیانی مام ناوەندی بووە بەهۆی دابەزینی ئاوی ئاودێر لەسەرچاوە بنەڕەتی‌و لقییەکانیدا بەهۆی کەمی بارینی باراندا، ئەمەش بووبە هۆی دابەزینی ڕێژەی بەرهەمهێنانی لەچاو وەرزی پێشووە بەرێژەی (٧,٥٪). هەرچەندە کە ڕێژەیەکی زیاد هەبوو لەزەوی کشتوکاڵی کە لە (٢٪)ی تێنەدەپەڕاند لە زەوییەکانی وەرزی (١٩٥٨-١٩٥٩)[١٨].

"لە ساڵی (١٩٨٢)دا زەوی تۆوکراو کێڵراو بەگەنم (٥٥٧٤٠٠) هەزار دۆنم بووە کەبەربوومی (١٠٣٢٠٠) تەن بووە بەرووبوومی لە کیلۆگرامێك/دۆنم بریتی بووە لە ڕێژەی (١٨٥,٠)"[١٩]. "لە ساڵی (١٩٩١)دا زەوی کێڵراوی بەگەنم (١٠٥٥٨٥٧) دۆنم بووە کە بەرهەمی (١٤٥١٩٠,٧) تەن بووە کە بەرووبووی کیلۆ گرامێك لە دۆنمێکدا (١٣٧,٥) دابووە"[٢٠].

لە ساڵی (١٩٩٢)دا زانیاریمان کەمە یان نییە دەربارەی زەوی کێڵراوی بە گەنم کە ئەمەش بەهۆی تۆونەکردنی زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی. کە لە ساڵانی (١٩٩٣-١٩٩٦)یش بەهەمان شێوە ڕێژەی بەرهەمهێنان دیارنییە[٢١].(بۆ زیاتر شارەزایی لە ڕێژەی بەرهەمهێنانی گەنم بڕوانە خشتەی ژمارە (٢٠) ی وەزارەتی کشتوکاڵی‌و خشتەی (٢١)ی دەزگای ناوەندی سەرژمێری (جهاز المركزي للإحصاء)، هەر لەنێوان ساڵانی ١٩٥٠-١٩٧٤).

**خشتەی ژمارە (٢٠)[٢٢]**

**چۆنییەتی زەوی تۆوکراو بەگەنم بەپێی وەزارەتی کشتوکاڵ لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٧٤)**

| ز | ساڵ | پێوانەی (دۆنم) | بەرهەمهێنانی (تەن) | بەرووبوومی دۆنمێك کیلۆگرام/دۆنم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٥٠ | (٤٧١٠٠٠) | (٨٥٤٣٤) | (١٨١,٣٩) |
| ٢ | ١٩٥١ | (٩٤٨١٧٣) | (٨٩٧٦١) | (٩٤,٦٧) |
| ٣ | ١٩٥٢ | (٧٢١٨٢٠) | (٥٣٧١٨) | (٧٤,٤٢) |
| ٤ | ١٩٥٣ | (٨١١٩٠٠) | (١٠٩٤٢٧) | (١٣٤,٧٨) |
| ٥ | ١٩٥٤ | (٩٣٤٠٠٠) | (٢١٤٨٢٠) | (٢٣٠,٠٠) |
| ٦ | ١٩٥٥ | (٨٣٨٧٠٠) | (٦٠٩٩٠) | (٧٢,٧٢) |
| ٧ | ١٩٥٦ | (٨٢٧٧٥٠) | (٩٢٧٠٨) | (١١٢,٠٠) |
| ٨ | ١٩٥٧ | (٧٨٣٧٩٠) | (١٨٤٧٣٦) | (٢٣٥,٧٠) |
| ٩ | ١٩٥٨ | (٨٢٠٩٠٠) | (٦٦٧٤١) | (٨١,٣٠) |
| ١٠ | ١٩٥٩ | (٧٧٦٠٢٠) | (٧٤٤٦٧) | (٩٥,٩٦) |
| ١١ | ١٩٦٠ | (٧٩٢٤٠) | (٦٨٨٧٩) | (٨٧,٠٥) |
| ١٢ | ١٩٦١ | (٨٠٤١٦٥) | (١٤٤٥٩٠) | (١٧٩,٠٠) |
| ١٣ | ١٩٦٢ | (٨٧٣٣٥٠) | (١١٨١٢٦) | (١٣٥,٢٦) |
| ١٤ | ١٩٦٣ | (٩٦٨٣٥٠) | (٤٨٣٧٨) | (٥٠,٠٠) |
| ١٥ | ١٩٦٤ | (٦٦٨٨٠٠) | (٤٤٧٦٨) | (٦٦,٩٤) |
| ١٦ | ١٩٦٥ | (٦٨٩٣٠٠) | (٩٣٠٥٥) | (١٣٥,٠٠) |
| ١٧ | ١٩٦٦ | (٧٠٣٠٠٠) | (٧٧٧١٥) | (١١٠,٥٥) |
| ١٨ | ١٩٦٧ | (٧٠٤٠٥٠) | (٥٠٧٣٧) | (٧٢,٠٦) |
| ١٩ | ١٩٦٨ | (٨١٤٤٥٠) | (١٤٩٩٨٧) | (١٨٤,١٦) |
| ٢٠ | ١٩٦٩ | (٩٥٢٧٠٠) | (١١٧٥٦٤) | (١٢٣,٤٠) |
| ٢١ | ١٩٧٠ | (١١١٧٥٠٠) | (٨٩٤٠٠) | (٨٠,٠٠) |
| ٢٢ | ١٩٧١ | (٤٦٩٧٢٧) | (٥١٦٧٠) | (١١٠,٠٠) |
| ٢٣ | ١٩٧٢ | (١٤٨٢٧٨٦) | (٤١٥٨٧٧) | (٢٨٠,٤٧) |
| ٢٤ | ١٩٧٣ | (٧٢٦٠٠٠)- | (٧٣٩٧٠) | (١٠١,٨٩) |
| ٢٥ | ١٩٧٤ | (١٣٨٨٠١٤) | (٢٣٢٨٠٤) | (١٦٧,٧٢) |

**خشتەی ژمارە (٢١)[٢٢]**
**پێوانەی زەوی و بەرهەمهێنانی گەنم لەنێوان ساڵانی (١٩٦٧-١٩٧٤) بە پێی ئاماری دەزگای ناوەندی سەرژمێری**

| ژ | ساڵ | پانتایی کێڵراو | پانتایی دووراو | بەرهەمهێنان | بەروبووم بۆ پانتایی کێڵراو | بەروبووم بۆ پانتایی دووراو |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١٩٦٧ | ٦٨٤٨٠٠ | ٣٦٢٨٠ | ٥٣,٠٠ | ٠,٠٨ | ١,٦٤ |
| ٢ | ١٩٦٨ | ٧٢٣٣٠٠ | --- | ١٠٧٩٢٠ | ١٤٩,٢١ | --- |
| ٣ | ١٩٦٩ | ٧٥٦٦٠٠ | --- | ٥٦٠٩٠ | ٧٤,١٣ | --- |
| ٤ | ١٩٧٠ | ١٢٣٦٠٩٤ | --- | ١٠١٩٩٢ | ٨٢,٥١ | --- |
| ٥ | ١٩٧١ | ١١٣٥٦٠٦ | ٤٣١٩٠٠ | ٤٢٨٠٠ | ٣٧,٦٩ | ٩٩,١ |
| ٦ | ١٩٧٢ | ١٧١٠٤٠٠ | --- | ٤٠٨٥٠٠ | ٢٨٠,٩٣ | --- |
| ٧ | ١٩٧٣ | ١٢٨٢١٠٠ | ١٠٣١٩٠٠ | ٨٣٨٠٠ | ٦٥,٣٦ | ٨١,٢١ |
| ٨ | ١٩٧٤ | ١٢١٠٢٠٠ | ١٢٠٦٣٠٠ | ١٧٨٥٠٠ | ١٤٧,٤٨ | ١٤٧,٩٧ |

ئەگەر سەیری پارێزگاکە بکەین دەبینین بەشێوەیەکی گشتی لە زۆربەی ناوچەکەدا (گەنم) تۆو دەکرێت و بەرهەمێکی سەرەکی هەموو ناوچەکانییەتی، لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم ئامارێکی بەرهەمهێنانی گەنم لە قەزاو ناحییەکانی کەرکوك بخەمەروو بەپێی ئاماری کشتوکاڵی ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦٠). مەرکەزی قەزای خورماتوو بە رێژەی یەکەم دێت کە زەوی تۆوکراوی بەگەنم بریتییە (١٨٠٠٠٠) هەزار دۆنم لەدوای ئەوەدا هەریەکە لە ناحیەی (قەرەتەپە)و (ناحیەی داقوق) دێت کە بریتین لە (٩٠٠٠٠) هەزار دۆنم. لەدوای ئەواندا مەرکەزی قەزای (کفری)و (شێروانە) دێت کە (٧١٠٠٠) هەزار دۆنم دێت.

بەڵام ئەگەر لە رووی بەرهەمهێنانەوە سەیربکەین دەبینین کە مەرکەزی ناحیەی (خورماتوو) بەرێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (١٦٢٠٠) هەزار تەن، قەرەتەپە بریتییە لە (١٠٨٠٠) هەزار تەن[٢٤]. (بۆ زیاتر شارەزایی بروانە خشتەی ژمارە (٢٢-٢٣) دەربارەی رێژەی زەوی و رێژەی تۆو رێژەی بەروبوومی و رێژەی تۆوکردن لەسەر دەرچووی بەرهەمهێنانی)، ئەوەی لەم ساڵانەی ئەم دوایەدا سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە بەرهەمهێنانی گەنم کەمی کردووە زیاتر هۆیە سیاسییەکە دەوری خۆی بینیووە لە فەوتاندنی زەوییەکی زۆری کشتوکاڵی و کەوتنە دەستی دەسەڵاتدارە سیاسییەکان بێ ئەوەی بایەخ بەزەوییەکەبدەن.

**خشتەی ژمارە (٢٢)**

| ز | یەکە کشتوکاڵییەکان | ڕێـــژەی تـۆو کـــردن لـە دۆنمێکدا کیلۆ گرام | | | نـــەوەی تـۆو کراوە بەدۆنم | ڕێژەی بەروبوومی دۆنمـــێـــک (کیلۆگرام) | دەرچووی بەگشتی | | ڕێـــژەی تـۆوی دەرچوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | کیلۆ | تەن | | | کیلۆ | تەن | |
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | ١٩ | ٠٠٠ | ٨٥٥ | ٤٥٠٠٠ | ١٩ | ٠٠٠ | ٨٥٥ | (١:١) |
| ٢ | ناحیەی حەویجە | ١٩ | ٠٠٠ | ٩٥٠ | ٥٠٠٠٠ | ١٩ | ٠٠٠ | ٩٥٠ | (١:١) |
| ٣ | ناحیەی شوان | ١٩ | ٠٠٠ | ٢٦٦ | ١٤٠٠٠ | ١١٤ | ٠٠٠ | ١٥٩٦ | (٦:١) |
| ٤ | ناحیەی قەرەحەسن | ١٩ | ٠٠٠ | ٣٠٤ | ١٦٠٠٠ | ٧٦ | ٠٠٠ | ١٢١٦ | (٤:١) |
| ٥ | ناحیەی پردێ | ٢٠ | ٠٠٠ | ١٢٠٠ | ٦٠٠٠٠ | ١٠٠ | ٠٠٠ | ٦٠٠٠ | (٥:١) |
| ٦ | مەرکەزی قەزای کفری و شێروانە | ٢٢ | ٠٠٠ | ١٥٦٢ | ٧١٠٠٠ | ٢٢ | ٠٠٠ | ١٥٦٢ | (١:١) |
| ٧ | ناحیەی قەرەتەپە | ٢٠ | ٠٠٠ | ١٨٠٠ | ٩٠٠٠٠ | ١٢٠ | ٠٠٠ | ١٠٨٠٠ | (٦:١) |
| ٨ | ناحیەی پێباز | ٢٢ | ٢٨٠ | ١٧٠ | ٧٧٤٠ | ٦٦ | ٨٤٠ | ٥١٠ | (٣:١) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | ٢٠ | ٠٠٠ | ٣٦٠٠ | ١٨٠٠٠٠ | ٩٠ | ٠٠٠ | ١٦٢٠٠ | (٤,٥:١) |
| ١٠ | ناحیەی قادرکەرەم | ٢٠ | ٠٠٠ | ٦٠٠ | ٣٠٠٠٠ | ٦٠ | ٠٠٠ | ١٨٠٠ | (٣:١) |
| ١١ | ناحیەی داقوق | ٢٠ | ٠٠٠ | ١٨٠٠ | ٩٠٠٠٠ | ١٠٠ | ٠٠٠ | ٩٠٠٠ | (٥:١) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | ٢٠ | ٠٠٠ | ١٢٣٠ | ٦١٥٠٠ | ١٤٠ | ٠٠٠ | ٨٦١٠ | (٧:١) |
| ١٣ | ناحیەی سەنگاو | ٢٠ | ٠٠٠ | ٦٦٠ | ٣٣٠٠٠ | ١٤٠ | ٠٠٠ | ٤٦٢٠ | (٧:١) |
| ١٤ | ناحیەی (ئاغجەلەر) | ٢٠ | ٠٠٠ | ٨٦٠ | ٤٣٠٠٠ | ١٢٠ | ٠٠٠ | ٥١٦٠ | (٦:١) |

**لەبەر چاکی گەنم لە ناوچەکەدا ناوبانگی هەیە لە شێوەی گەنمەکەیدا دەبینی ناوچەیەکی وەکو داودە گەنمەکەی بەناوبانگە بە گەنمی (داودە) لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکەی ئەوگەنمە دەکەن لە هۆزی داودەن بۆیە گەنمەکەش بەناو ئەوانەوە ناودەبرێت.. یان بەکارهێنانی گەنمی (سایبری)یش بەناوبانگە لە ناوچەکە دەگەڕێتەوە بۆ (سایبر بەگ)[٢٥].**

**خشتەی ژمارە (٢٣)[٣٦]**
**ڕێژەی بەرهەمهێنانی گەنم لەنێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨) دا**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | زەوی تووکراو (مەشارە) | بەرهەمهێنانی (تەن) |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١٢٦٠٧٨) | (١٥٧٣٢) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٦١٩١٩) | (٣١١٨) |
| ٣ | ناحیەی پردێ | (٧٢٧٨٤) | (٦١٦٨) |
| ٤ | ناحیەی حەویجە | (١١٨٠٥٨) | (٥٠٧٧) |
| ٥ | ناحیەی شوان | (٥٥٨٠٤) | (٣٣٧٩) |
| ٦ | ناحیەی پێباز | (٢٨٤١٣) | (١٦٢٩) |
| ٧ | ناحیەی قەرەتەپە | (٨٠٩٦٠) | (٥٦٥٦) |
| ٨ | ناحیەی شێروانە | (١١٩٥٩٦) | (٧٣٣٣) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٥٢٢٠٤) | (٣٢٦٦) |
| ١٠ | ناحیەی ئاغجەلەر | (١٢٨٤٥) | (٦٠٥) |
| ١١ | ناحیەی سەنگاو | (٢٤٤٩٨) | (٢١٨٠) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (١٠٨٥١٧) | (٣٠٨٤) |
| ١٣ | ناحیەی داقوق | (٦٧٩٦٢) | (١٣٥١٦) |
| ١٤ | ناحیەی قادرکەرەم | (٥٨٨٥٩) | (٢٨٩٦) |
| | کۆی گشتی | (٩٨٨٤٩٦) | (٧٣٦٣٩) |

**خشتەی ژمارە (٢٤)**

**بەرهەمهێنانی گەنم لە پارێزگاكانی عێراقدا لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢-٢٠١٠) بە پێوانەی هەزار تەن**

| پارێزگاكان | ٢٠٠٢ | ٪ | ٢٠٠٣ | ٪ | ٢٠٠٤ | ٪ | ٢٠٠٥ | ٪ | ٢٠٠٦ | ٪ | ٢٠٠٧ | ٪ | ٢٠٠٨ | ٪ | ٢٠٠٩ | ٪ | ٢٠١٠ | ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٩٥٤,١ | ٣٦,٦ | ٦١٦,٥ | ٢٦,٥ | ٣٠,٧ | ٢,٤ | ٣٧٨,٢ | ١٧ | ٥٠٠,٨ | ٢٠,٦ | ٣٢٠,٤ | ١٤,٦ | ١٥,٩ | ١,٣ | ١٨٨,٢ | ١١,١ | ٦٨٩,٧ | ٢٥,١ |
| كەركوك | ٣٥٢,٢ | ١٣,٧ | ٤٤٥,٤ | ١٩,٢ | ٢٣٦,٧ | ١٨,٣ | ٣٤٢,٧ | ١٥,٤ | ٢٤٠,٧ | ٩,٩ | ٢٨٩,١ | ١٣,٢ | ١٦٦,٥ | ١٣,٣ | ٢٦٨,٨ | ١٥,٨ | ٣٦٧,١ | ١٣,٣ |
| دیالە | ١٣٥,٤ | ٥,٣ | ١٧٧,٤ | ٧,٦ | ١٣٣,٦ | ١٠,٣ | ٢٢٠,٥ | ٩,٩ | ٢٥٨ | ١٠,٦ | ٢٣٣ | ١٠,٦ | .١٤٩ | ١١,٩ | ٨٥,٥ | ٥ | ١٤٥,٧ | ٥,٣ |
| ئەنبار | ٦٧ | ٢,٧ | ٦٣,٧ | ٢,٧ | ٢٥,٨ | ٢ | ٣٨ | ١,٧ | ٧٦,٦ | ٣,١ | ٧٩,٧ | ٣,٦ | ٥٧,٤ | ٤,٥ | ٥٤ | ٣,٢ | ١٦٤,٧ | ٦ |
| بەغدا | ٨٣,٦ | ٣,٢ | ٦٠,٨ | ٢,٦ | ٦٣,٣ | ٤,٨ | ٩٧,٢ | ٤,٤ | ٩٥ | ٣,٩ | ٨٠,٦ | ٣,٧ | ٩٦,٤ | ٧,٧ | ٨٦,٦ | ٥,٣ | ٩٨,٩ | ٣,٦ |
| بابل | ٧٦,٢ | ٢,٩ | ١٣٧,٣ | ٥,٩ | ٥١,٤ | ٤ | ٩٣,٤ | ٤,٢ | ٩٢,٨ | ٣,٨ | ٩٩,٩ | ٤,٥ | ١٠٢,٧ | ٨,٢ | ١٣٨,٤ | ٨,١ | ١٦١,٧ | ٥,٩ |
| كەربەلا | ١٢,٦ | ٠,٥ | ٧,٥ | ٠,٣ | ٦,١ | ٠,٥ | ٦,٨ | ٠,٣ | ٥,١ | ٠,٢ | ٤,٦ | ٠,٢ | ٣,٩ | ٠,٣ | ٦,٨ | ٠,٤ | ٩,٣ | ٠,٣ |
| واست | ٣٠٧,١ | ١١,٩ | ٣٠٦,٤ | ١٣,٢ | ٢٨٢,٢ | ٢١,٧ | ٤١٠,٨ | ١٨,٤ | ٢٨٨,٥ | ١١,٨ | ٣١٢,١ | ١٤,٢ | ٢٠٤,٩ | ١٦,٣ | ٢٤٠,٥ | ١٤,١ | ٣١١,٥ | ١١,٣ |
| سەلاحەددین | ١٩٧,١ | ٧,٦ | ١٤١,١ | ٦,١ | ٨٨,٤ | ٦,٨ | ١١٤,٣ | ٥,١ | ١٢٢,٧ | ٥ | ١٤٨,٥ | ٦,٧ | ٦٣,٨ | ٥,٢ | ١٣٠,٨ | ٧,٧ | .٢٣٥ | ٨,٦ |
| نەجەف | ١٤٤ | ٥,٦ | ٨١ | ٣,٥ | ٥٤,١ | ٤,١ | ٧٨ | ٣,٥ | ١٠٧,١ | ٤,٤ | ١٣٥,٣ | ٦,١ | ٨٥,٣ | ٦,٨ | ٨٩,٩ | ٥,٣ | ١٢٨,٦ | ٤,٧ |
| قادسیە | ١٢٥ | ٤,٨ | ١٣٨,٣ | .٥ | ١٤٥,٧ | ١١,٢ | ٢٠٨,٧ | ٩,٣ | ٢٣٧,٩ | ٩,٨ | ٢٣٨,٥ | ١٠,٨ | ١٤٢,٩ | ١١,٤ | ٢١٥,٨ | ١٢,٧ | ٢١٨,٤ | ٧,٩ |
| موسەنا | ٦,٣ | ٠,٢ | ١٥,٦ | ٠,٩ | ١٩,٧ | ١,٥ | ١٣,١ | ٠,٦ | ١٤,٨ | ٠,٦ | ١٤,١ | ٠,٦ | ٧,١ | ٠,٥ | ٢٣,٢ | ١,٤ | ٢٦,٥ | ١ |
| زیقار | ٣٠,٦ | ١,٢ | ٣٧,٣ | ١,٦ | ٥٠,٢ | ٣,٨ | ٦٤,٣ | ٢,٩ | ١٠٤,٧ | ٤,٣ | ١٠١,١ | ٤,٦ | ٧٥,٥ | ٦ | ٧٨,٤ | ٤,٦ | ٩٢,٤ | ٣,٤ |
| میسان | ٧٨,٨ | ٣ | ٧٩,٧ | ٣,٤ | ٩٧,٨ | ٧,٥ | ١٤٨,٢ | ٦,٧ | ١٢٥,٤ | ٥,٢ | ١٢٣,٦ | ٥,٦ | ٦٦,٤ | ٥,٣ | ٧٠,٨ | ٤,٢ | ٨١,٤ | ٣ |
| بەسرە | ١٩,٣ | ٠,٨ | ٢١,١ | ٠,٩ | ١٥,٤ | ١,٢ | ١٤,٤ | ٠,٦ | ١٦٦,٤ | ٦,٨ | ٢٢,٤ | ١ | .١٦,٧ | ١,٣ | ١٩,٦ | ١,١ | ١٦,٩ | ٠,٦ |
| كۆی گشتی | ٢٥٨٩,٣ | ١٠٠ | ٢٣٢٩,١ | ١٠٠,٣ | ١٣٠١,١ | ١٠٠,١ | ٢٢٢٨,٦ | ١٠٠ | ٢٤٣٦,٥ | ١٠٠ | ٢٢٠٢,٩ | ١٠٠ | ١٢٥٤,٥ | ١٠٠ | ١٧٠٠,٣ | ١٠٠ | ٢٧٤٨,٥ | ١٠٠ |

سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (٢٥)**

**خەمڵاندنی بەرهەمهێنانی گەنم بۆ ساڵەکانی (٢٠١٠) و (٢٠١١) بە پێی پارێزگاکان**

| پارێزگاکان | بەرهەمهێنانی گەنم بە (تەن) | بایەخی ڕێژەیی | بەرهەمهێنانی گەنم بە (تەن) | بایەخی ڕێژەیی | ڕێژەی گۆڕانکاری |
|---|---|---|---|---|---|
| | ساڵی (٢٠١٠) | ٪ | ساڵی (٢٠١٠) | ٪ | ٪ |
| موسڵ | ٦٨٩٧٣١ | ٢٥,١ | ٥٩٦٧٢٤ | ٢١,١ | (–) ١٣,٥ |
| کەرکوك | ٣٦٧٠٧٦ | ١٣,٣ | ٣١٣٥٥٢ | ١١,١ | (–) ١٤,٦ |
| دیالە | ١٤٥٧١٢ | ٥,٣ | ٢٨٦٦٦٤ | ١٠,٢ | (+) ٩٦,٧ |
| ئەنبار | ١٦٤٧٤٥ | ٦,٠ | ١٩٤٢٤٢ | ٦,٩ | (+) ١١٧,٩ |
| بەغدا | ٩٨٩٤١ | ٣,٦ | ١٨٣١٣٠ | ٦,٥ | (+)٨٥,١ |
| بابل | ١٦١٧٣٣ | ٥,٩ | ١٨٤١٧١ | ٦,٦ | (+) ١٣,٩ |
| کەربەلا | ٩٣٣٩ | ٠,٣ | ٣٦٣٥ | ٠,١ | (–) ٦١,١ |
| واست | ٣١١٠٥٤ | ١١,٣ | ٣١٤٠٤٨ | ١١,٢ | (+) ٠,٨ |
| سەلاحەددین | ٢٣٥٦٥٧ | ٨,٦ | ٢٢٦٨٠٧ | ٨,١ | (–) ٣٠٨ |
| نەجەف | ١٢٨٦١١ | ٤,٧ | ١٠٦٨٧٥ | ٣,٨ | (–) ١٦,٩ |
| قادسیە | ٢١٨٤٢٦ | ٧,٩ | ٢٠١٨٩٩ | ٧,٢ | (–) ٧,٦ |
| موسەنا | ٢٦٥٢٣ | ١,٠ | ٣١٣٧٩ | ١,١ | (+) ١٨,٣ |
| زیقار | ٩٢٤١٢ | ٣,٤ | ٦٦٢٢٤ | ٢,٤ | (–) ٢٨,٣ |
| میسان | ٨١٤٢٠ | ٣,٠ | ٨٣٥٨٨ | ٣,٠ | (+) ٢,٧ |
| بەسرە | ١٦٩٧٠ | ٠,٦ | ١٥٩٦٢ | ٠,٦ | (–) ٥,٩ |
| کۆی گشتی | ٢٧٤٨٨٤٠ | ١٠٠ | ٢٨٠٨٩٠٠ | ١٠٠ | ٪ ٢,٢ |

– **سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).**

**خشتەی ژمارە (٢٦)**

**بەرهەمی گەنم و جۆ لە ساڵی (٢٠١٠) بە تەن**

| پارێزگاکان | گەنم | جۆ | گرنگی ڕێژەیی (%) | |
|---|---|---|---|---|
| | | | گەنم | جۆ |
| موسڵ | ٦٨٩٧٠٠ | ٥٩٤٤٣٧ | ٢٥,١ | ٥٢,٢٧ |
| کەرکوک | ٣٦٧١٠٠ | ٦٠٢٥٩ | ١٣,٣٦ | ٥,٣ |
| دیالە | ١٤٥٧٠٠ | ٢٤٨١١ | ٥,٣ | ٢,١٨ |
| ئەنبار | ١٦٤٧٠٠ | ٥٤٢٢ | ٥,٩٩ | ٠,٤٨ |
| بەغدا | ٩٨٩٠٠ | ٨١٤٢ | ٣,٦ | ٠,٧٢ |
| بابل | ١٦١٧٠٠ | ٣٠٧٨٦ | ٥,٨٨ | ٢,٧١ |
| کەربەلا | ٩٣٠٠ | ٣٩٨٨ | ٠,٣٤ | ٠,٣٥ |
| واست | ٣١١٥٠٠ | ٧٢٢٠٤ | ١١,٣٤ | ٦,٣٤ |
| سەلاحەددین | ٢٣٥٧٠٠ | ١٠٧٢٠ | ٨,٥٨ | ٠,٩٤ |
| نەجەف | ١٢٨٦٠٠ | ٣٧٤٩ | ٤,٦٧ | ٠,٣٣ |
| دیوانیە | ٢١٨٤٠٠ | ١٣١١٧٩ | ٧,٩٥ | ١١,٥٣ |
| موسەنا | ٢٦٥٠٠ | ٣٠٩٨٧ | ٠,٩٦ | ٢,٧٣ |
| زیقار | ٩٢٠٠٠ | ٨٩٦٩٤ | ٣,٣٥ | ٧,٩ |
| میسان | ٨١٤٠٠ | ٦٦٨٦٤ | ٢,٩٦ | ٥,٨٧ |
| بەسرە | ١٦٩٠٠ | ٣٩٢٧ | ٠,٦٢ | ٠,٣٥ |
| کۆی گشتی | ٢٧٤٨١٠٠ | ١١٣٧١٦٩ | ١٠٠ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (٢٧)**

**توانای هەڵگیراوی دیاری کراو لە بەرهەمی گەنم لە ماوەی پێنج ساڵ لەنێوان ساڵی (٢٠١٠) تا ساڵی (٢٠١٤)**

| پارێزگاکان | توانای هەڵگیراوی سایلۆکان و کۆگاکانی کۆمپانیای گشتی بازرگانی (گەنم و جۆ) | | | گرنگی ڕێژەیی توانای پێنیشاری هەڵگیراوی سایلۆکان (بە تەن) % |
|---|---|---|---|---|
| | توانای هەڵگیراوی ئێستای گەنم لە سایلۆکان (بە تەن) | پێویستی پارێزگا لە گەنم لە ماوەی شەش مانگدا (گەنم+جۆ) (بە تەن) | توانای پێنیشاری هەڵگیراوی سایلۆکان (بە تەن) | |
| کەرکوک | ٢٠٠٠٠ | ٧٧١٤٢ | ١٢٠٠٠٠ | ١١,٧٥ |
| سەلاحەددین | ١٠٠٠٠ | ٧٩٣٨٠ | ١٠٠٠٠٠ | ٩,٨ |
| ئەنبار | ١٠٠٠٠ | ٩١٠٧٤ | ١٢٠٠٠٠ | ١١,٧٥ |
| واست | ٤٢٠٠٠ | ٧٢٤٤٤ | ١٠٠٠٠٠ | ٩,٨ |
| قادسیە | ١٥٠٠٠ | ٧٠٩٦٢ | ١٢٠٠٠٠ | ١١,٧٥ |
| موسەنا | ١٠٠٠٠ | ٤٤٦١٠ | ٦٠٠٠٠ | ٥,٨٨ |
| کەربەلا | ١٠٠٠٠ | ٦١٧٦٤ | ٨٠٠٠٠ | ٧,٨٤ |
| زیقار | ٢٠٠٠٠ | ١١٦١٥٤ | ١٢٠٠٠٠ | ١١,٧٥ |
| میسان | ١٠٠٠٠ | ٦٤٩٩٨ | ٨٠٠٠٠ | ٧,٨٤ |
| بەسرە | ١٢٥٠٠٠ | ١٦٥٦٧٢ | ١٢٠٠٠٠ | ١١,٧٥ |
| کۆی گشتی | ٢٧٢٠٠٠ | ٨٤٤٢٠٠ | ١٠٢٠٠٠٠ | ٪١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**٢. جۆ:**

وەکو گەنم دادەنرێت بە بەرهەمێکی سەرەکی کشتوکاڵی لە ناوچەکە، تارادەیەك لە زۆری ناوچەکانی کەرکوك تۆو دەکرێت، هەموو ئەو هۆیانەی دەوریان هەیە لە گەشەکردنی گەنمدا دەوریان هەیە لەگەشەکردنی جۆیشدا. هەر لەسەردەمەکانی پێش مێژوو (جۆ) شان بەشانی گەنم گەشەی کردووەو بەرووبومێکی سەرەکی خەڵکی ناوچەکە بووە. ئەو ناوچانەی کە گەنمی تێدا بڵاوبوونەوە جۆشی تێدا بڵاوبووەتەوە بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر لە (گەنم).

"ئەگەر سەیری زەوی تۆوکراوی جۆ بکەین لەسەر ئاستی کوردستان دەبینین لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣) لە پلەی دووەمدا بووە لەدوای موسڵ کە (٤٥٨) هەزار دۆنم بووە کە بەرهەمی (١٥٦) هەزار تەن بوو کە بەرێژەی (٠,٣٤٠) بوو بەرهەمی"[٢٧].
لە ساڵی (١٩٦٧-١٩٦٨)دا بەرێژەی دووەم هاتووە کە (٣٧٠) هەزار دۆنم بوو، بەرهەمی (٧١) هەزار تەن بووە لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩)دا رێژەی دووەم بووە کە (٤١٦) هەزار دۆنم بووە بەرهەمی (١٣٧) هەزارتەن بووە[٢٨]. لە ساڵی (١٩٨٢)دا بەپلەی دووەم هاتووە لەسەر ئاستی کوردستان کە (٦١٤٧٠) هەزار دۆنم بووە، بەرهەمی لەو ساڵەدا (١٠٧٢٠٠) هەزار تەن بووە[٢٩]. لە ساڵی (١٩٩١-١٩٩٢)دا بەرێژەی سێیەم هاتووە کە (٢٥٠٣٦,٨) هەزار تەن بووە، بەرهەمی زەوی تۆو کراوی (٧٩٩٦١٠٠٠) هەزار دۆنم[٣٠].

(بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەکانی (٢٨، ٢٩، ٣٠، ٣١) بۆ شارەزایی دەربارەی ئاستی بەرهەمهێنانی جۆ لە ئاستی کوردستاندا).

**خشتەی ژمارە (٢٨)[٣١]**
**پێوانەو رێژەی بەرهەمهێنانی جۆ لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٣)**

| ز | پارێزگاکان | پێوانە (هەزاران دۆنم) | بەرهەم (هەزاران تەن) | بەرهەمی دۆنم (بەتەن) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | سلێمانی | (٥١) | (٧) | (٠,١٣٨) |
| ٢ | موسڵ | (٥٧١) | (١٧٨) | (٠,٣١١٢) |
| ٣ | کەرکوك | (٤٥٨) | (١٥٦) | (٠,٣٤٠) |
| ٤ | هەولێر | (٢١٩) | (٦١) | (٠,٢٧٩) |

**خشتەی ژمارە (٢٩)[٣٢]**
**پێوانەو رێژەی بەرهەمهێنانی جۆ لەنێوان ساڵانی (٦٧-٦٩)**

| ز | پارێزگا | پێوانە بەهەزاران دۆنم | | دەرچووی بەهەزاران تەن | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | ٦٧-٦٨ | ٦٨-٦٩ | ٦٧-٦٨ | ٦٨-٦٩ |
| ١ | موسڵ | (١٠٧٠) | (١١١٧) | (٢٠١) | (٣٦٥) |
| ٢ | کەرکوك | (٣٧٠) | (٤١٦) | (٧١) | (١٣٧) |
| ٣ | هەولێر | (٣٧٥) | (٣٧٣) | (٧٧) | (٧٥) |
| ٤ | سلێمانی | (١٠٨) | (٧٨) | (٢١) | (١٢) |

**خشتەی ژمارە (٣٠)[٣٣]**
**پێوانەو رێژەی بەرهەمهێنانی جۆ لەنێوان ساڵان (١٩٨١-١٩٨٢)**

| ز | پارێزگا | زەوی تۆوکراو (١٠٠دۆنم) | بەرهەمهێنان ١٠٠ تەن | بەرووبوومی کیلۆگرام/دۆنم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (١٧٣٣٧) | (٣٠٧٠) | (١٧٧,١) |
| ٢ | کەرکوك | (٦١٤٧) | (١٠٧٢) | (١٧٤,٥) |
| ٣ | دهۆك | (٣٠٩) | (٧٦) | (٢٤٥,٧) |
| ٤ | هەولێر | (٥٠٩١) | (٨٧٥) | (١٧١,٩) |
| ٥ | سلێمانی | (٢١٦٠) | (٤٥٧) | (٢١١,٤) |

**خشتەی ژمارە (٣١)[٣٤]**
**پێوانەی بەرهەمهێنانی جۆ لەنێوان ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٢)**

| ز | پارێزگا | زەوی تۆوکرو | بەرهەمی ١٠٠ تەن | بەرووبوومی کیلۆگرام/دۆنم |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٤٠٦٥٣٧٢) | (٢٦٦٨٥٤,٨) | (٦٥,٦) |
| ٢ | کەرکوك | (٧٩٩٦١٠) | (٢٥٠٣٦,٨) | (٣١,٣) |
| ٣ | دهۆك | (٦٨٩٠) | (١٢٥٧,٥) | (١٨٢,٥) |
| ٤ | هەولێر | (٦٤٣٥٥٠) | (١٠١٠٩٤,٣) | (١٥٧,١) |
| ٥ | سلێمانی | (٢١١٤٩) | (٢٠٥٥,٤) | (٩٧,٢) |

لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا زەوی تۆوکراو بە (جۆ) (٤٥٨٠٠٠) هەزار دۆنم، کە رێژەی بەرهەمهێنانی (١٥٦) هەزار تەن بووە کە بەرهەمی دۆنمێك بە تەن (٠,٣٤٠) بووە لەسەر ئاستی (عێراق)[٣٥]. زەوی تۆوکراوی جۆ لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا

(٤٩٧) هەزار تەن بووە. کە دەکاتە (٧٥٧٦٣٩) مەشارە بووە کە بەرهەمەکەی (٦٢) هەزار تەن بووە کە دەکاتە (٦٣٠٨١) مەشارە[٣٦].

لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا (٤٢٣) هەزار دۆنم بووە کە بەرهەمی (٤٤) هەزار تەن بووە[٣٧]. "لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا زەوی تۆوکراو بەجۆ کەمی کردووە بەرێژەی (٦,٥٪) لەزەوییەکانی وەرزی رابردوو، لەهەمان کاتدا بەرهەمهێنانی کەمی کردووە بەرێژەی (٤٥,١٪) بەپێوانەی وەرزی بەرهەمهێنانی (١٩٥٨-١٩٥٩)، ئەمەش دەگەڕێتەوە سەرئەوەی زەوی تۆوکراو بەجۆ تووشی بێ ئاوی بوو بە هۆی نەبوونی باران و کەمی ئاوی ئاودێری لەو وەرزەدا"[٣٨].

"لە ساڵی (١٩٦٧-١٩٦٨)دا زەوی تۆوکراوی (٣٧٠) هەزار دۆنم بووە، لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) (٤١٦) هەزار دۆنم بووە کە بەرهەمی ساڵی (١٩٦٧-١٩٦٨) (٧١) هەزار تەن بووە، لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩)دا (١٣٧) هەزار تەن بووە"[٣٩].

"زەوی تۆوکراو بە جۆ لە ساڵی (١٩٨٢)دا (٦١٤٧٠٠) هەزار دۆنم بووە کە بەرووبووم لەو ساڵەدا (١٠٧٢٠٠) هەزار تەن بووە کە بەرهەمی کیلۆگرامێك لە دۆنم (١٧٤,٥) بووە"[٤٠].

"لە ساڵی (١٩٨٩)دا زەوی تۆوکراو (٥٣٩٥٧٠) هەزار دۆنم بووە، بەرهەمهێنانی (٣١٨١٣) هەزار تەن بووە کە بەرووبومی کیلۆ گرامێك لە دۆنم (٥٩,١) بووە"[٤١]. لە ساڵی (١٩٩١) دا زەوی تۆوکراو (٧٩٩٦١٠) هەزاردۆنم بووە کە بەرهەمی (٢٥٠٣٦,٨) هەزارتەن بووە کە بەرووبومی کیلۆگرامێك لە دۆنمێك (٣١,٣) بووە"[٤٢].

بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستی ناوخۆیی پارێزگاکەدا سەیر بکەین دەبینین جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان قەزاو ناحییەکاندا لە رووی بەرهەمهێنانەوە لێرەدا ئاماری ئابووری (١٩٥٧-١٩٥٨) و(١٩٥٩-١٩٦٠) دەکەمە شوێنی بەراورد کردنەکە:

"زەوی تۆوکراو بە جۆ (١١٣٢٠٨) مەشارە بوو لە مەرکەزی قەزای کەرکوك کە بەرهەمی (١٢٨١٥) تەن بووە، لەدوای ئەودا بەپلەی دووەم ناحیەی شێروانەیە کە بریتییە لە (١٠٦٦٤٩) مەشارە بوو کە بەرهەمی لە ساڵی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا (٦٤٢٤) تەن بووە، کە کەمترین ناوچەی تۆوکراوی ناحیەی ئاغجەلەر (١١٢٦٥) مەشارە، بەرهەمی ناحیەکە (٧١٥) تەن بووە"[٤٣]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣٢).

"لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا زەوی تۆوکراو بە جۆ (قەرەتەپە) بەرێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (٥٠٠٠٠) دۆنم کە لە دوای ئەو زەوی تۆوکراو بە جۆ ناحیەی (داقوق) دێت بریتییە لە (٤١٠٠٠) هەزار دۆنم لە دوای ئەو ناحیەی ( پردێ) و (حەویجە) دێت بەرێژەی (٤٠٠٠٠) هەزار دۆنم لە دوای ئەواندا (خورماتوو) دێت بریتییە لە (٣٦٠٠٠) هەزار دۆنم"[٤٤]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣٣).

**خشتەی ژمارە (٣٢)[٤٥]**

**زەوی تۆوکراو بە جۆ لەگەڵ بەرهەمهێنانی جۆ لەنێوان وەرزی (١٩٥٧-١٩٥٨)**

| ز | ناوچە بەرێوبەرییەکان | زەوی تۆو کراوبە مەشارە | بە ر هە می بەتەن |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١١٣٢٠٨) | (١٢٨١٥) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٣٤٢٨٨) | (١٨٩٠) |
| ٣ | ناحیەی پردێ | (٤٢٦٥٩) | (٤٢٨٦) |
| ٤ | ناحیەی حەویجە | (٧٦١٨٧) | (٣٦٩٧) |
| ٥ | ناحیە شوان | (٤٩٧٨١) | (٢٨٥٤) |
| ٦ | ناحیەی پێباز | (٢٤٠٢٤) | (١٤١٤) |
| ٧ | ناحیەی قەرەتەپە | (٦٤٣٦١) | (٤٥٤٠) |
| ٨ | ناحیە شێروانە | (١٠٦٦٤٩) | (٦٤٢٤) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٣٩٦٩٦) | (٢٨٩٤) |
| ١٠ | ناحیەی ئاغجەلەر | (١١٢٦٥) | (٧١٥) |
| ١١ | ناحیەی سەنگاو | (٢٢٧٣٤) | (٢٤٥٣) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٦٧٢٥٣) | (٣٧١٣) |
| ١٣ | ناحیەی داقوق | (٦٠١٦٥) | (١٢٩٣٤) |
| ١٤ | ناحیەی قادر کەرەم | (٤٤٣٧٦) | (٢٤٥٢) |
| | کۆی گشتی | (٧٥٧٦٣٩) | (٦٣٠٨١) |

**١٥. تووتن:**

"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٤-١٩٥٥) زەوی تۆوکراو (٦٨٢) دۆنم بووە"[١٤٧]، "بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) زەوی تۆوکراو بە تووتن (٣١٤) مەشارە بووە بەرهەمی (٥٤) تەن بووە لەو ساڵەدا"[١٤٨]، لەنێوان ساڵانی (١٩٥٦-١٩٦٠)دا ڕێژەی تۆوکردنی (٢٥٠-٥٠٠) دۆنم بووە، لە ساڵی (١٩٦٦)دا (٥٠٠) دۆنم بووە"[١٤٩]، لە ساڵی (١٩٦٧)دا (٦٠٠) دۆنم بووە، لە ساڵی (١٩٦٨)دا (٩٥٠) دۆنم بووە، لە ساڵی (١٩٦٩)دا (٨٦٠) دۆنم بووە"[١٥٠].

"یەکەم کارێك کە ئینگلیزەکان لە عێراقدا پێی هەستان بە تایبەتی کشتوکاڵی (تووتن)ە، بایەخێکی چاکیان داپێی هەر لەڕۆژەکانی یەکەمی داگیرکردنی ناوچەکەدا. لەبەرئەوە هەستان بە دانانی باجی دیاری کراو لەسەر بەرهەمهێنان و خستنە بازاڕییەوە، هەنگاوی یەکەمیان نا بۆ دەستبەسەراگرتنی، ئەمە وای کرد بەربەرەکانی لەلایەن کشتکارەکانی تووتن و ئینگلیزەکان بەهۆی ئەو باجەی بەسەرییاندا سەپێنرا کە لەوەپێش نەسەپێنرا بوو. زۆریان لێ کرا لەهەر کیلۆگرامێك لە بەرهەمەکەیان باجێکی زیاد لە ڕێژە (١٥) جار لەوەی کەدەیاندا. لە ساڵی (١٩١١)دا، ئەمە شێوەیەکی قوورسی لەسەرییان دروست کرد، چونکە لەبەرئەوەی تووتن لەو سەردەمەدا بەسەرچاوەیەکی ژیانی ئابووری گرنگ دادەنرا لە ناوچە کوردنشینەکاندا"[١٥١].

"لەبەرئەوە سەیردەکەین کەرکوك یەکێك بوو لە ناوچەکانەی کەوتە ژێر کارتێکردنی ئەو بارە قورسەی باجەوە چونکە ڕێژەی تووتن لە کەرکوك بەپێی ناوچە کوردنشینەکان بە (١٠٪) پێوانە دەکرێت"[١٥٢]. "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەراوردی بکەین دەبینین بەپلەی چوارەم دێت لە دوای (سولەیمانی)و (هەولێر)و (موسڵ). (بڕوانە خشتەی ژمارە ٧٣).

**خشتەی ژمارە (٧٣)[١٥٣]**
**زەوی تۆوکراو بە تووتن**
**لەنێوان ساڵانی ١٩٥٤-١٩٦٩ لە پارێزگاکانی کوردستان**

| ز | پارێزگا | ساڵی ١٩٥٤-١٩٥٥ | ساڵی ١٩٦٦ | ساڵی ١٩٦٧ | ساڵی ١٩٦٨ | ساڵی ١٩٦٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | سلێمانی | ٢٥٠١٣ | ٤٠٧٥٠ | ٣٩٢٠٠ | ٤٠٧٠٠ | ٤٧٤٥٠ |
| ٢ | هەولێر | ١١٠٢٣ | ١٣٠٠٠ | ١٢٩٥٠ | ١٢٥٠٠ | ٩٨٠٠ |
| ٣ | کەرکوك | ٦٨٢ | ٥٠٠ | ٦٠٠ | ٩٥٠ | ١٥٠٠ |
| ٤ | موسڵ | ٢٢٧٤ | ٣٧٥٠ | ٥٢٥٠ | ٥٢٥٠ | ١٥٠٠ |

"بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا تەنها لە ناوچەی (ئاغجەلەر) شین دراوە بەڕێژەی (٣١٤) مەشارە بەرهەمی لەهەمان وەرزدا (٥٤) تەن بووە"[١٥٤]. "لە ساڵی (١٩٥٦-١٩٥٨) ڕێژەی بەرهەمی زەوی بە تووتن (٢٥٠) دۆنم بووە، لە ساڵی (١٩٥٩)دا (٣٧٠) دۆنمو لە ساڵی (١٩٦٠)دا (٤٠٠) دۆنم بووە"[١٥٥]. بەڵام بێجگە لە ناوچەکانی ئاغجەلەر زۆر کەمەو ناگاتە ئەوەی بەرهەمی هەبێت، بەڵام لەم ساڵانەی دوایدا (١٩٩١-١٩٩٦) ڕێژەیەکی زۆر بەرهەم دەهێنرێت بەڵام ئامارێکی ئابووری ڕێکوپێکمان نییە بۆ دیاریکردنی ڕێژەی بەرهەم و زەوی تۆوکراوی.

**١٦. پیازی ووشك:**

"بەپێی ئاماری ئابووری (١٩٥٧-١٩٥٨)دا زەوی تۆوکراو (٤٨٢) مەشارە بووە"[١٥٦]، "لە ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) زەوی تۆوکراوی (١٩٨٥) دۆنم بووە، بەرهەمی پیاز لەو ساڵەدا (٣٥٩٧) تەن و (٥٠٠) کیلۆگرام بووە"[١٥٧]. "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەراووردی بکەین بەڕێژەی دووەم دێت لەدوای موسڵ کەبەرهەمی موسڵ (٢٢٧٨) دۆنم دەبێت"[١٥٨]. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە ٧٤).

**خشتەی ژمارە (٧٤)[١٥٩]**
**زەوی و ڕێژەی بەرهەمی پارێزگاکانی کوردستان (١٩٥٩-١٩٦٠)**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرایەتییەکان | ڕێژەی تۆوەکە لە دۆنمێکدا کگم | کۆمەڵی تۆوەکە | | زەوی تۆوکراو بە دۆنم | ڕێژەی بەرووبومەکەی دۆنمێك کگم | دەرچووی گشتی | | ڕێژەی تۆو لەسەر دەرچوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | کیلۆ | تەن | | | کیلۆ | تەن | |
| ١ | موسڵ | (٥٤,٧) | (٧٠٠) | (١٢٤) | (٢٢٧٨) | (١٩١٢,٧) | (٢٥٠) | (٤٣٥٧) | (٣٤,٩:١) |
| ٢ | هەولێر | (٦٠) | (٥٦٠) | (١١٥) | (١٩٢٦) | (١١٥٤,٢) | (٠٠٠) | (٢٢٢٣) | (١٩,٢:١) |
| ٣ | کەرکوك | (٦٠) | (١٠٠) | (١١٩) | (١٩٨٥) | (١٨١٢,٣) | (٥٠٠) | (٣٥٩٧) | (٣٠,٢:١) |
| ٤ | سلێمانی | (٦٠) | (٤٨٠) | (٨١) | (١٣٥٨) | (٧٩٦,٢) | (٣٥٠) | (١٠٨١) | (١٣,٢:١) |

"بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا سەیربکرێت لەساڵی ١٩٥٧-١٩٥٨ دەبینین ناحیەی قەرەحسەن بەرێژەی یەکەم هاتووە بریتی بووە لە (١٤٩) مەشارە لەزەوی تۆوکراو بەپیاز بەڵام لەدوای ئەو ناحیەی (شێروانە) هاتووە بریتی بووە (٩٥) مەشارە کەمترین شوێن لە پارێزگاکە لە هەمان ساڵ مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ و مەرکەزی قەزای خورماتووبووە کە هەریەکەیان (١١) مەشارەیان تۆوکردووە"[١٦٠].

بەپێی ئاماری (١٩٥٩-١٩٦٠) پلەی یەکەم لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (حەویجە)یە ڕێژەی زەوی تۆوکراوی (٥٠٠) دۆنمو لەدوای ئەو مەرکەزی قەزای کەرکوك دێت بریتییە لە (٣٥٠) دۆنم بەپلەی سێیەم هەریەکە لە پردێ و قەرەتەپە دێت بریتین لە (٣٠٠) دۆنم. کەمترین شوێن ناوچەکانی (پێبان)و (سەنگاو)و بریتین لە (١٠) دۆنم. لە ڕووی بەرهەمهێنانەوە بە هەمان شێوە ناحیەی حەویجەو ئینجا مەرکەزی قەزای کەرکوك دێت"[١٦١]. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەکانی ٧٥، ٧٦)، لە پارێزگاکەدا هەردوو شێوەکەی پیازی سوورو پیازی سپی دەکرێت کە پیازە سوورەکە تفتەو هەر لە زووەو لەناوچەکە دەکرێت بەڵام پیازی سپی کە شیرینە جۆرەکەی هەر لەم ساڵانەی دواییدا دەست کراوە بە تۆوکردنی چونکە زیاتر خەڵکی بەکاری دەهێنن لەسەر ئاستی پارێزگاکە ڕێژەیەکی زۆر پیازی تەریش بەکاردەهێنرێت (تەرەپیاز) کەزۆرتر لێشی زیاد دەبێت بۆدەرەوە دەینێرن بۆ پارێزگاکانی دەوروبەری یان خواروی (عێراق).

**خشتەی ژمارە (٧٥)[١٦٢]**
**زەوی تۆوکراو بە پیاز لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) دا**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | زەوی تۆوکراو بەمەشارە | پلەی لە سەر ئاستی پارێزگا |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٦٧) مەشارە | پلەی سێ یەم |
| ٢ | ناحیەی قەرەحسەن | (١٤٩) مەشارە | پلەی یەکەم |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٢٣) مەشارە | پلەی حەوتەم |
| ٤ | ناحیەی قەرەتەپە | (٤٥) مەشارە | پلەی چوارەم |
| ٥ | ناحیەی شێروانە | (٩٥) مەشارە | پلەی دووەم |
| ٦ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (١١) مەشارە | پلەی هەشتەم |
| ٧ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (١١) مەشارە | پلەی هەشتەم |
| ٨ | ناحیەی داقوق | (٤٠) مەشارە | پلەی شەشەم |
| ٩ | ناحیەی قادرکەرەم | (٤١) مەشارە | پلەی پێنجەم |
| | کۆی گشتی | (٤٨٢) مەشارە | |

**خشتەی ژمارە (٧٦)[١٦٣]**
**زەویو بەرهەمی پیازی ووشك (١٩٥٩-١٩٦٠)**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەری یەکان | ڕێژەی تۆوووکراو لە دۆنمێك کگم (فیسقە) | کۆمەڵی تۆوەکە کیلۆ | کۆمەڵی تۆوەکە تەن | زەوی تۆوکراو بە دۆنم | ڕێژەی بەروبوومی دۆنمێك کگم | دەرچووی گشتی کیلۆ | دەرچووی گشتی تەن | ڕێژەی تۆوکراو لەسەر دەرچووە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | ٦٠ | ٠٠٠ | ٢١ | ٣٥٠ | ٢٠٠٠ | ٠٠٠ | ٧٠٠ | ١: ٣٣,٣ |
| ٢ | ناحیەی حەویجە | ٦٠ | ٠٠٠ | ٣٠ | ٥٠٠ | ٢٠٠٠ | ٠٠٠ | ١٠٠٠ | ١: ٣٣,٣ |
| ٣ | ناحیەی شوان | ٦٠ | ٠٠٠ | ٦ | ١٠٠ | ٢٠٠٠ | ٠٠٠ | ٢٠٠ | ١: ٣٣,٣ |
| ٤ | ناحیەی قەرەحەسەن | ٦٠ | ٢٠٠ | ١٠ | ١٧٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٢٥٥ | ١: ٢٥ |
| ٥ | ناحیەی یردێ | ٦٠ | ٠٠٠ | ١٨ | ٣٠٠ | ٢٠٠٠ | ٠٠٠ | ٦٠٠ | ١: ٣٣,٣ |
| ٦ | کفری-شێروانە | ٦٠ | ١٠٠ | ٢ | ٣٥ | ١٧٠٠ | ٥٠٠ | ٥٩ | ١: ٢٨,٣ |
| ٧ | ناحیەی قەرەتەپە | ٦٠ | ٠٠٠ | ١٨ | ٣٠٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٤٥٠ | ١: ٢٥ |
| ٨ | ناحیەی پێباز | ٦٠ | ٦٠٠ | – | ١٠ | ١٧٠٠ | ٠٠٠ | ١٧ | ١: ٢٨,٣ |
| ٩ | مەرکەزی ناحیەی خورماتوو | ٦٠ | ٠٠٠ | ٣ | ٥٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٧٥ | ١: ٢٥ |
| ١٠ | ناحیەی قادر کەرەم | ٦٠ | ٨٠٠ | ١ | ٣٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٤٥ | ١: ٢٥ |
| ١١ | ناحیەی داقوق | ٦٠ | ٤٠٠ | ٢ | ٤٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٦٠ | ١: ٢٥ |
| ١٢ | قەزای چەمچەماڵ | ٦٠ | ٢٠٠ | ٤ | ٧٠ | ١٣٠٠ | ٠٠٠ | ٩١ | ١: ٢١,٦ |
| ١٣ | ناحیەی سەنگاو | ٦٠ | ٦٠٠ | – | ١٠ | ١٥٠٠ | ٠٠ | ١٥ | ١: ٢٥ |
| ١٤ | ناحیەی ئاغجەلەر | ٦٠ | ٢٠٠ | ١ | ٢٠ | ١٥٠٠ | ٠٠٠ | ٣٠ | ١: ٢٥ |
| | کۆی گشتی | ٦٠ | ١٠٠ | ١١٩ | ١٩٨٥ | ١٨١٢,٣ | ٥٠٠ | ٣٥٩٧ | ١: ٣٠,٢ |

**خشتەی ژمارە (٧٧)**
**بەرهەمهێنانی پیاز بە پێی پارێزگاکان لە بەهار و پایزی ساڵی (٢٠١٠)**

| پارێزگاکان | ناوەندی بەرهەم هێنانی پیاز (کغم/دۆنم) زەوی تۆکراوە | کۆی پانتایی | بەرهەم /تەن | گرنگی ڕێژەیی بۆ بەرهەم % |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٢٤٤٤,٨ | ٢٤٤٤,٨ | ٢٢٤٧٣ | ٢٥,٤٠ |
| کەرکوك | ٢٦٢٩,٤ | ٢٦٢٩,٤ | ٢٦٨٢ | ٣,٠٣ |
| دیالە | ١٨٣٨ | ١٨٣٨ | ٨٧٤٧ | ٩,٨٩ |
| ئەنبار | ٢٤٧١,٧ | ٢٤٧١,٧ | ٢٢٦٨٠ | ٢٥,٦٣ |
| بەغدا | ٢٤٢٤,٧ | ٢٤٢٤,٧ | ٩٥٤١ | ١٠,٧٨ |
| بابل | ١٢٨٤,١ | ١٢٨٤,١ | ١٧٣١ | ١,٩٦ |
| کەربەلا | ٣٦٦,٧ | ٣٦٦,٧ | ١٢٩٤ | ١,٤٦ |
| واست | ١١٦٣,٢ | ١١٦٣,٢ | ٢٥٥٩ | ٢,٨٩ |
| سەلاحەددین | ١٦٠٠ | ١٦٠٠ | ٢٨٠٠ | ٣,١٦ |
| نەجەف | ١٤٧٦,٢ | ١٤٧٦,٢ | ٦٢ | ٠,٠٧ |
| قادسیە | ١٦١٥,٦ | ١٦١٥,٦ | ٢١٨١ | ٢,٤٧ |
| موسەنا | ١٥٨٣,٣ | ١٥٨٣,٣ | ٣٨ | ٠,٠٤ |
| زیقار | ١٦٦٥,٨ | ١٦٦٥,٨ | ١٠٣٢٨ | ١١,٦٧ |
| میسان | ١٨٨٦,١ | ١٨٨٦,١ | ١٣٥٨ | ١,٥٣ |
| بەسرە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠٠ |
| کۆی گشتی | – | – | ٨٨٧٤٧ | ١٠٠ |

– سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**١٧. سیر:**
"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا کۆی زەوی تۆوکراو بەسیر (٣٥٠) دۆنم بووە بەرهەمی ئەو وەرزە (١٠١) تەن بووە"[١٦٤]، "ئەگەر بەراووردی وەرزی (١٩٥٨-١٩٥٩)و (١٩٥٩-١٩٦٠) بکەین لەسەر ئاستی عێراقدا دەبینین چاندنی زیادی کردووە بەرێژەیەکی زۆر لەوەی لەوەرزی پێشوودا هەبووە، هەرچەندە دەربارەی (کەرکوك) ئامارێکی رێکوپێکمان نییە بۆ بەراووردکردنی لەنێوان هەردوو وەرزەکەدا"[١٦٥]. "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەراووردی بکەین لە وەرزی (١٩٥٩-١٩٦٠)دا دەبینین بەرێژەی یەکەم دەردەچێت کە لە دوای ئەو (موسڵ) بەرێژەی دووەم دێت"[١٦٦]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٧٨).

**خشتەی ژمارە (٧٨)[١٦٧]**
**زەوی و رێژەی بەرهەمی سیر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان**

| ز | پارێزگا | رێژەی تۆوکراو لە یەك دۆنم کگم | کۆمەڵی تۆوەکە | | زەوی تۆوکراو بە دۆنم | رێژەی بەروبومی دۆنمێك کگم | دەرچووی گشتی | | رێژەی تۆو لەسەر دەرچوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | کیلۆ | تەن | | | کیلۆ | تەن | |
| ١ | موسڵ | (٤٥) | (٩٠٠) | (٩) | (٢٢٠) | (٤٢٧,٢) | (٠٠٠) | (٩٤) | (٩,٤:١) |
| ٢ | کەرکوك | (٤٢,٨) | (٠٠٠) | (١٥) | (٣٥٠) | (٢٨٨,٥٧) | (٠٠٠) | (١٠١) | (٦,٧:١) |
| ٣ | سلێمانی | (٤٠) | (٤٠٠) | (-) | (١٠) | (٢٥٠) | (٥٠٠) | (٢) | (٦,٢:١) |

"بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا سەیری بکەین دەبینین مەرکەزی قەزای (کەرکوك) بەرێژە یەکەم هاتووە کەزەوی چێنراو بە سیر (٢٠٠) دۆنم بووە لەدوای ئەو ناحیەی حەویجە دێت بریتییە لە (١٠٠) دۆنم ئینجا ناحیەی قەرەحەسەن بریتییە تەنها لە (٥٠) دۆنم"[١٦٨]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٧٩).

**خشتەی ژمارە (٧٩)[١٦٩]**
**زەویو رێژەی بەرهەمهێنانی سیر لە قەزاو ناحییەکان کەرکوك**

| ز | ناوچە بەرێوەبەرییەکان | رێژەی تۆوکراو لەیەك دۆنم کگم | کۆمەڵی تۆوە رژێنراوەکان | | زەوی تۆوکراو بە دۆنم | رێژەی بەروبومی دۆنمێك/ کگم | دەرچووی گشتی | | رێژەی تۆو لەسەر دەرچوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | کیلۆ | تەن | | | کیلۆ | تەن | |
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٤٥) | (٠٠٠) | (٩) | (٢٠٠) | (٢٨٠) | (٠٠٠) | (٥٦) | (٦,٢:١) |
| ٢ | ناحیەی حەویجە | (٤٠) | (٠٠٠) | (٤) | (١٠٠) | (٣٠٠) | (٠٠٠) | (٣٠) | (٧,٥:١) |
| ٣ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٤٠) | (٠٠٠) | (٢) | (٥٠) | (٣٠٠) | (٠٠٠) | (١٥) | (٧,٥:١) |
| کۆی گشتی | | (٤٢,٨) | (٠٠٠) | (١٥) | (٣٥٠) | (٢٨٨,٥٧) | (٠٠٠) | (١٠١) | (٦,٧:١) |

**١٨. (هەرتەمان - گلێنە - کزن - قاپ کۆڵە - هرتمان - الجلبان:**
"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧- ١٩٥٨) تەنها لە ناحیەی (ئاغجەلەر) دەکرێت کە بریتییە لەیەك مەشارەو بەرهەمی (٠,١) تەن دەبێت"[١٧٠]. بەڵام لەئامارەکانی ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦٠)و (١٩٧٩-١٩٩٤)دا هیچ جۆرە رێژەیەکی تۆوکردنی (کزن) بەرچاو ناکەوێت، لەبەرئەوەی زۆرتر ئەم بەرووبوومە لە ناوچەکانی خواروو دەکرێت و سوودی لێ وەردەگیرێت، "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان سەیری بکەین دەبینین (٢١٨٧) مەشارە تۆو دەکرێت و بەرهەمی (٣٣٢) تەن دەبێت"[١٧١]. (بۆ زیاتر شارەزایی لەرێژەی بەرووبووم لەسەر ئاستی کوردستان بڕوانە خشتە ژمارە ٨٠)، دەبینی کەرکوك بەرێژەی چوارەم دێت کە

سلێمانی ڕێژەی یەکەم لە زەوی تۆوکراو بە (کزن) بریتییە لە (١٩٦١) مەشارەو بەرهەمی (٣٠٥) تەن دەبێت. هەولێر بەپلەی دووەم دێت بریتییە لە (١٣١) مەشارەو بەرهەمی تەنها (١٧) تەن دەبێت.

**خشتەی ژمارە (٨٠)**
**زەوی و ڕێژەی بەرهەمی کزن لەسەر ئاستی کوردستان**

| ز | پارێزگا | زەوی بەمەشارە | بەرهەم بەتەن | پلەی بەرهەمی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٩٤) | (١٠) | پلەی سێ یەم[١٧٢] |
| ٢ | هەولێر | (١٣١) | (١٧) | پلەی دووەم[١٧٣] |
| ٣ | سلێمانی | (١٩٦١) | (٣٠٥) | پلەی یەکەم[١٧٤] |
| ٤ | کەرکوك | (١) | (٠,١) | پلەی چوارەم[١٧٥] |
| | کۆی گشتی | (٢١٨٧) | (٣٣٢) | |

*** میوەو سەوزەمەنییە هاوینەو زستانییەکانی پارێزگاکە:**
کەرکوکیش ناوچەیەکی گرنگی میوەو سەوزەی هاوینەو زستانەیە لە ناوچەکەدا، خاوەنی بەرووبوومێکی زۆرو زەوەندەو، گەلێك جار لێی زیاد بووەو ناردراوەتە دەرەوەی پارێزگاکە.. "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاکانی (سلێمانی، هەولێرو موسڵ) سەیر بکەین دەبینین ڕێژەی زەوی تۆوکراو بە سەوزەمەنی زۆر کەمە، دەگاتە نزیکەی (٢٩١٩٢) مەشارە بەپێیی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) کە دەکاتە ڕێژەی (٩,٨ ٪)"[١٧٦]. "کۆی زەوی سەوزەمەنی لەهەموو عێراقدا، تەنها کەرکوك (٣٣٤١) مەشارە لەسەر ئاستی ئەو پارێزگایانەیە"[١٧٧].

"گرنگترین جۆری سەوزەمەنی لە فراوانی زەوی تۆوکراو (تەماتە)یە بریتییە لە (٤٠٩٩) مەشارەو ئینجا (کاڵەگە) بریتییە لە (٥٢١٤) مەشارە ئینجا (شووتی)یە بریتییە (٤٠٩٩) مەشارە"[١٧٨]، بەڵام ئەگەر ڕێژەی کەرکوك سەیر بکەین لەمانە دەبینین ڕێژەیەکی چاکی هەیە لە تۆوکردنی کاڵەگو شووتی و تەماتە کە لەکاتی پێویست بەدرێژی دێنە سەری. "زەوی تۆوکراو بە میوەو رەز (کروم) لە پارێزگاکانی کوردستان بریتییە لە (٩٣٠٨٩) مەشارە، نزیکەی (١١) ملیۆن درەختی ترێی بەرداری هەیە کە بەرهەمی (٢٨) هەزار تەن دەبێت بەڕێژەی (٢,٦) کیلۆ لەیەك درەختێکدا"[١٧٩]. "زەوی تۆوکراو بەدرەختی میوەو رەزو دارخورما لە کەرکوکدا بریتییە لە (٣٢٢٢) مەشارە، کە درەختی رەزی بەردار لە پارێزگاکە (٧١٠٧٦) درەختە، زۆرترین داری میوە هەنجیرە کە ژمارەی درەختەکانی (٣١) هەزار دار دەبێت ئینجا هەنار دێت بریتییە لە (١٢٢٤٨) درەخت و (١١٨٣٦) هەزار درەختی زەردەلوو (٦٠١٤) سێوو (٩٢٣٠) دار خورما هەیە"[١٨٠].

(بڕوانە خشتەی ژمارە (٨١) دەربارەی دابەشکردنی درەختی میوەو رەز لە ساڵی (١٩٧٨)دا لە شارەکەو هەروەها بڕوانە خشتەی ژمارە (٨٢) دەربارەی زەوی بە بێستان و ژمارەی درەخت و ناوەندی ژمارەی درەخت لەشارەکە هەروەها بەراوردکردنی لەگەڵ پارێزگاکانی کوردستان).
لێرە بەدواوە هەوڵدەدەم هەریەکە لە میوەو سەوزەی هاوینەی شارەکە دیاری بکەم هەرچەندە لەدوای ساڵی (١٩٨٩)، ڕێژەی بەرهەمهێنانی کەمی کردووە ئەویش لەبەر فەوتاندن و کاولکردنی گوندو لادێیەکی زۆری ناوچەکە لە هێرشی (ئەنفال)دا لە کوردستان.

**خشتەی ژمارە (٨١)[١٨١]**

| ز | پارێزگا | درەختی خورما (١٠٠) درەخت | درەختی مزرەمەنییەکان (١٠٠) درەخت | درەختی سێو ناوك رەشەکان ١٠٠ درەخت | درەخت دارستانەکان ١٠٠ درخت | درەختی تر ١٠٠ درەخت | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (-) | (٧٠) | (٣٠٨٧) | (٨٧٨٣) | (١٠٩٩٦) | (٢٢٩٣٦) |
| ٢ | کەرکوك | (١٠) | (١٢) | (١٠٩٨) | (٢٣٦١٦) | (٤٣٦٦) | (٢٩١٠٢) |
| ٣ | دهۆك | (-) | (-) | (٢٨٢٦١) | (١٣٤٥٧٥) | (١١٠٦٠٣) | (٢٧٣٤٣٩) |
| ٤ | هەولێر | (-) | (-) | (٤٠٨١) | (٦١٣٢٨) | (٤٤٢٤٥) | (١٠٩٦٥٤) |
| ٥ | سلێمانی | (-) | (-) | (٣٨٤١) | (٣٨٧٧٥) | (٧٢٩٥٦) | (١١٥٥٧٢) |

**خشتە ژمارە (٨٢)[١٨٢]**

| ژ | پارێزگا | ژمارەی درەخت (١٠٠٠) درەخت ٪ | | پێوانەی بێستانەکان (١٠٠٠) ٪ | | ناوەندی درەختەکان لە مەشارەیەکدا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٢٢٩٤ | ١,٨٤ | ١١ | ١,٤٥ | ٢٠٩ |
| ٢ | کەرکوك | ٢٩١٠ | ٢,٣٣ | ٩ | ١,١٩ | ٣٢٣ |
| ٣ | دهۆك | ٢٧٣٤٤ | ٢١,٩٤ | ٤٨ | ٦,٣٤ | ٥٧٠ |
| ٤ | هەولێر | ١٠٩٦٥ | ٨,٨٠ | ٢٧ | ٣,٥٧ | ٤٠٦ |
| ٥ | سلێمانی | ١١٥٥٧ | ٩,٢٧ | ١٩ | ٢,٥١ | ٦٠٨ |

**١٩. ترێ:**

"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧–١٩٥٨) ژمارەی درەختەکانی (٧١٠٧٦) درەختەو بەرهەمی بەکیلۆ لەو ساڵەدا (٢٩٩٧٤٢) کیلۆ بووە"[١٨٣]. "لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەپلەی چوارەم دێت چ لە ڕووی ژمارەی درەختەکانو چ لە ڕووی بەرهەمهێنانی بەکیلۆ" (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٣).

**خشتەی ژمارە (٨٣)**

| ژ | پارێزگا | ژمارەی درەختەکان | بەرهەمی بە کیلۆ | ئاستی لەسەر پارێزگاکان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | ٥٧٣٦٢٨٧ | ٧٣٣٧٨٠١ | پلەی سێ یەم[١٨٤] |
| ٢ | هەولێر | ٣١٣٩٤٩٠ | ١٠٣٥٨٤٨٦ | پلەی یەکەم[١٨٥] |
| ٣ | سلێمانی | ٢٠١٨٠٠٠ | ١٠١٨٦١٢١ | پلەی دووەم[١٨٦] |
| ٤ | کەرکوك | ٧١٠٧٦ | ٢٩٩٧٤٢ | پلەی چوارەم[١٨٧] |
| کۆی گشتی[١٨٨] | | (١٠٩٦٤٨٥٣) | (٢٨١٨٢١٥٠) | |

"بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا لە ڕووی ژمارەی درەختەکانی ترێ بەپلەی یەکەم ناحیەی (حەویجە) دێت بریتییە لە(٥٢٦٨٦) درەختو بەرهەمی (٢٢٥٣٨٠) کیلۆیە پلەی دووەم مەرکەز قەزای کەرکوك دێت کە (١٣٠٤٠) درەختو بەرهەمی (٢٩٨٧٠) کیلۆیە کەمتر ناوچە ناحیەی (داقوق)ە کەتەنها (٣٠) درەختی تێدا هەیەو بەرهەمی (١٥) کیلۆ دەبێت. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٤، ٨٥).

**خشتەی ژمارە (٨٤)[١٨٩]**

**ژمارەی درەختو بەرهەمی ترێ لە قەزاو ناحییەکاندا**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی درەخت | بەرهەمی بە کیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١٣٠٤٠) | (٢٩٨٧٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (١٣٢٦) | (٢١٦٦٥) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٥٢٦٨٦) | (٢٢٥٣٨٠) |
| ٤ | ناحیەی شوان | (٢٥٥) | (٨١١) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (٣٠١٠) | (١٦٢٧٠) |
| ٦ | ناحیەی شێروانە | (٥٠) | (٢٠٠) |
| ٧ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٦٨) | (٦٠) |
| ٨ | ناحیەی ئاغجەلەر | (٣٩٩) | (٥١٢١) |
| ٩ | ناحیەی داقوق | (٣٠) | (١٥) |
| ١٠ | ناحیەی قادر کەرەم | (٢١٢) | (٣٥٠) |
| کۆی گشتی | | (٧١٠٧٦) | (٢٩٩٧٤٢) |

ئەگەر سەیری ترێ بکەین دەبینین هەردوو شێوەکەی سپیو ڕەشی بەرهەم دەهێنرێت لە ناوچەکە بەڵام زیاتر جۆری ترێی سپی بەناوبانگە لە پارێزگاکەدا وەترێی ڕەش تەنها لە ناوچەکانی (چەمچەماڵ)و (ئاغجەلەر)و (سەنگاو) بەرهەم دەهێنرێت. وبەڕێژەیەکی کەم.

**خشتەی ژمارە (٨٥)**

**بەرهەمهێنانی تریێ بەپێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٢٥٤٣١٤ | ١٦٠١ | ٤٠٩٤ | ٢,١ |
| کەرکوك | ٢١٤٦٢ | ١٤,٤ | ٣٠٩ | ٠,١ |
| دیالە | ٢٤١١٨٢٠ | ١٦ | ٣٨٥٨٩ | ١٩,٨ |
| ئەنبار | ١٩٩٤٠ | ٢٧,٥ | ٥٤٨ | ٠,٣ |
| بەغدا | ١٨٧٣٨٩ | ٢٩,٧ | ٥٥٦٥ | ٢,٨ |
| بابل | ١٢١٣٩ | ١٧,٤ | ٢١١ | ٠,١ |
| کەربەلا | ٦٤٥٨٨١٢ | ١٩,٥ | ١٢٥٩٤٧ | ٦٤,٧ |
| واست | ٢٢٢٥٩١ | ١٧,٣ | ٣٨٥١ | ٢ |
| سەلاحەددین | ٥٨٣٠ | ١٨ | ١٠٥ | ٠,١ |
| نەجەف | ٥٠٢٤٦١ | ٣٠,٥ | ١٥٣٢٥ | ٧,٩ |
| قادسیە | ١٤٢١ | ٢٣,٢ | ٣٣ | ٠ |
| موسەنا | ١٢٠٠ | ١٥,٨ | ١٩ | ٠ |
| زیقار | ٩٤ | ١٠,٦ | ١ | ٠ |
| میسان | - | - | - | ٠ |
| بەسرە | ١١١٥٦ | ١٢ | ١٣٤ | ٠,١ |
| کۆی گشتی | ١٠١١٠٦٢٩ | ١٩,٢٦ | ١٩٤٧٣١ | ١٠٠ |

**- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).**

**٢٠. زەردەلو:**

**"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) ژمارەی درەختەکانی (١١٨٣٦) دەرخت بووە کە بەرهەمی (١٦٩٥٨٤) کیلۆ بووە لەو ساڵەدا."[١٩٠] بەلام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەپلەی چوارەم دێت کەپلەی یەکەم پارێزگای موسڵە بریتییە لە (٥٠٨٨٧) درەخت و بەرهەمی (٢٤٨٧٤٤) کیلۆ بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٧٥-١٩٨٥)، (بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٦).**

**خشتەی ژمارە (٨٦)[١٩١]**

**ژمارەی درەختو بەرهەمی زمردەلو لە پارێزگاکانی کوردستان لەنێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)**

| ز | پارێزگاکان | ژمارەی درەختەکان | بەرهەمی بە کیلۆ | ئاستی بەرهەمی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٥٠٨٨٧) | (٢٤٨٧٤٤) | (پلەی یەکەم)[١٩٢] |
| ٢ | هەولێر | (١٣٢٤٧) | (٦٠٥٨٥) | (پلەی سێیەم)[١٩٣] |
| ٣ | سلێمانی | (٢٠٩١٩) | (١٩٦٤٤٢) | (پلەی دووەم)[١٩٤] |
| ٤ | کەرکوک | (١١٨٣٦) | (١٦٩٥٨٤) | (پلەی چوارەم)[١٩٥] |
| کۆی گشتی | | (٩٦٨٨٩) | (٦٧٥٣٥٥) | |

"بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (حەویجە) بە پلەی یەکەم دێت بریتییە لە (٧٤٣٩) ژمارەی درەختو بەرهەمی (١٥٠٤٣٩) کیلۆ بووە، بەپلەی دووەم (مەرکەزی قەزای خورماتوو) ە بریتییە لە (١١٤٠) درەخت کە بەرهەمی لەو ساڵەدا (٥٠٦٠) کیلۆ بووە، ئەگەر سەرنج بدەین بەرهەمی کەمە لەچاوڕێژەی درەختەکانییەوە کە ناحیەی (قەرەتەپە) بەرێژەی دووەم دێت لە رووی بەرهەمهێنانەوە بریتییە لە (٥٤٣٥) کیلۆ"[١٩٦]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٧).

**خشتەی ژمارە (٨٧)[١٩٧]**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی درەختەکان | بەرهەم بەکیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | ناحەی قەرەحەسەن | (٩٠٠) | (٢٥٠٥) |
| ٢ | ناحیەی حەویجە | (٧٤٣٩) | (١٥٠٤٣٩) |
| ٣ | ناحیەی شوان | (٤٣١) | (٢٩٩٥) |
| ٤ | ناجیەی قەرەتەپە | (٩٨٥) | (٥٤٣٥) |
| ٥ | ناحیەی شێروانە | (١٠) | (٥٠) |
| ٦ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٣٠) | (٤٢) |
| ٧ | ناحیەی ئاغجەلەر | (٨) | (٣٠٠) |
| ٨ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (١١٤٠) | (٥٠٦٠) |
| ٩ | ناحیە قادرکەرەم | (٨٩٣) | (٢٧٥٨) |
| | (کۆی گشتی) | (١١٨٣٦) | (١٦٩٥٨٤) |

(بۆ زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٨).

**خشتەی ژمارە (٨٨)**

**بەرهەمهێنانی زمردەلو بەپێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەک دارێک (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٧٧٨٣٠ | ٢٢,٥ | ١٧٥١ | ٩,٥ |
| کەرکوک | ٢٤٧٦ | ٢٧,٩ | ٦٩ | ٠,٤ |
| دیالە | ٦٢٣٤٧ | ١٤ | ٨٧٣ | ٤,٨ |
| ئەنبار | ٣٧٩٩٨ | ٢٨ | ١٠٦٤ | ٥,٨ |
| بەغدا | ١٧٩٤٨٩ | ٣١,٥ | ٥٦٥٤ | ٣٠,٨ |
| بابل | ٢١٦٧٧ | ٢٠,١ | ٤٣٦ | ٢,٤ |
| کەربەلا | ٢٤٩٩٦٩ | ٢٨,٧ | ٧١٧٤ | ٣٩,١ |
| واست | ٩٥٦٨ | ١٤,٥ | ١٣٩ | ٠,٨ |
| سەلاحەددین | ٧١٥٠٩ | ١٥ | ١٠٧٣ | ٥,٩ |
| نەجەف | ٤٨١٣ | ١٣,١ | ٦٣ | ٠,٣ |
| قادسیە | ٢٣٤٥ | ١٢,٤ | ٢٩ | ٠,٢ |
| موسەنا | ٧٦٩ | ١٠,٤ | ٨ | ٠ |
| زیقار | ٢١٣ | ٤,٧ | ١ | ٠ |
| میسان | – | – | – | ٠ |
| بەسرە | ٦٧٧ | ٧,٤ | ٥ | ٠ |
| کۆی گشتی | ٧٢١٦٨٠ | ٢٥,٤١ | ١٨٣٣٩ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**٢١. قۆخ:**

"لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا نزیكەی (١٣٠٢) ژمارەی درەختی قۆخ بووە لە پارێزگاكەدا."[١٩٨]، وبەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) ژمارە درەختەكانی (٥٤٣٠) بووەو بەرهەمی لەهەمان وەرزدا (٢٠٥٨٣) كیلۆ بووە.. "[١٩٩]. بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاكانی كوردستان (كەركوك)، بەپلەی چوارەم دێت كە (موسڵ) لە پلەی یەكەمدایەو بەرهەمی (٢٤٣٢٩٤) كیلۆیەو ژمارەی درەختەكانی (١١٧٨٥٧) درەختە، (بڕوانە خشتەی ژمارە ٨٩، ٩٠).

**خشتەی ژمارە (٨٩)[٢٠٠]**

**ژمارەی درەختو بەرهەمی قۆخ لەسەر ئاستی پارێزگاكانی كوردستان**

| ز | پارێزگاكان | ژمارەی درەختەكان | بەرهەمی بە كیلۆ | ئاستی بەرهەمهێنان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (١١٧٨٥٧) | (٢٤٣٢٩٤) | پلەی یەكەم [٢٠١] |
| ٢ | هەولێر | (١٦٢٢٠) | (١٣٠١٣٢) | پلەی دووەم [٢٠٢] |
| ٣ | سلێمانی | (١٢٠٥٣) | (١٣٤٢٥٤) | پلەی سێ یەم[٢٠٣] |
| ٤ | كەركوك | (٥٤٣٠) | (٢٠٥٨٣) | پلەی چوارەم [٢٠٤] |
| | كۆی گشتی | (١٥١٥٦٠) | (٥٢٨٢٦٣) | |

**خشتەی ژمارە (٩٠)**

**بەرهەمهێنانی قۆخ بە پێی پارێزگاكان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاكان | ژمارەی دارە بەردارەكان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (كغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی رێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٤٤١٥٥ | ١٨,٨ | ٨٣٠ | ٥٤,٤ |
| كەركوك | ٥٣ | ٣٧,٧ | ٢ | ٠,١ |
| دیالە | ٧٩٦١ | ١٥ | ١١٩ | ٧,٨ |
| ئەنبار | ١٠٨٠ | ٢٦ | ٢٨ | ١,٨ |
| بەغدا | ٣٨١٦ | ٢٠,٢ | ٧٧ | ٥ |
| بابل | ١٠٤٥٢ | ١٥ | ١٥٧ | ١٠,٣ |
| كەربەلا | ١١٦٦٥ | ٢٤,٦ | ٢٨٧ | ١٨,٨ |
| واست | ١٦٦ | ١٢ | ٢ | ٠,١ |
| سەلاحەددین | ٢٧٤ | ١٤,٦ | ٤ | ٠,٣ |
| نەجەف | ٨٥ | ١١,٨ | ١ | ٠,١ |
| قادسیە | ١٤٠٩ | ١٢,٨ | ١٨ | ١,٢ |
| موسەنا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زیقار | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| میسان | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەسرە | ٨١٢١٩ | ٩,٧ | ١ | ٠,١ |
| كۆی گشتی | | ١٨,٧٩ | ١٥٢٦ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

"بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا ناحیەی حەویجە بە پلەی یەکەم دێت ژمارەی درەختەکانی (٢٩٨٨) درەختە وبەرهەمی (١٥٠٠٠) کیلۆ دەبێت، بەپلەی دووەم ناحیە قەرەحەسەن دێت کە ژمارەی درەختەکانی (٢٣١٠) دەبێتو بەرهەمی (٥٠٠٣٨) کیلۆ دەبێت، کەمترین شوێن ناحیەی شێروانەیە کە تەنها دوو درەختەو بەرهەمی (٢٠) کیلۆیە"[٢٠٥].. بۆ زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە (٩١).

**خشتەی ژمارە (٩١)[٢٠٦]**

**ژمارە درەختی قۆخ و بەرهەمی لەقەزاو ناحییەکانی کەرکوك**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی درەختەکان | بەرهەمی بە کیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١٥) | (١٠٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٢٣١٠) | (٥٠٣٨) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٢٩٨٨) | (١٥٠٠٠) |
| ٤ | ناحیەی شوان | (٦٦) | (١٢٠) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (٢٤) | (٢٢٠) |
| ٦ | ناحیەی شێروانە | (٢) | (٢٠) |
| ٧ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٢٥) | (٥٥) |
| کۆی گشتی | | (٥٤٣٠) | (٢٠٥٨٣) |

**٢٢. هەرمێ:**

"لەساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا ژمارەی درەختەکانی (٧٦٠٢) درەخت بووە"[٢٠٧]. "لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا ژمارە درەختەکان (١٥٠٨) درەخت بووە، بەرهەمی لەو وەرزەدا (٢٨١٠٧) کیلۆ بووە.."[٢٠٨]. لەبەر ئەوە سەیردەکەین ڕێژەی بەرهەمهێنانی لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٨) زۆر.. زۆر کەمی کردووەو یان ئەو بایەخە نەدراوە لە بەرهەمهێنانی دا. "بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان لە وەرزی (١٩٥٢-١٩٥٣) بەپلەی سێیەم هاتووە"[٢٠٩]. بەڵام لەوەرزی (١٩٥٧-١٩٥٨) بەپلەی چوارەم هاتووە. (بۆ زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ٩٢، ٩٣).

**خشتەی ژمارە (٩٢)**

**ژمارەی درەختو بەرهەمی هەرمێ لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٧)**

| ز | پارێزگاکان | ژمارەی درەختەکان ١٩٥٢-١٩٥٣[٢١٤] | ژمارەی درەختەکان ١٩٥٧-١٩٥٨[٢١٥] | بەرهەمی بە کیلۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هەولێر | (١٦٦٤) | (٢٥٠٤٣٥) | (٢٦٣٧٣٧٥)[٢١٠] |
| ٢ | موسڵ | (٢٥٢٤٨) | (١٥٦٣١) | (٨٠٤٦٩)[٢١١] |
| ٣ | سلێمانی | (١١٤٣٧) | (٣١٦٢٤) | (٢٥١٥١٦)[٢١٢] |
| ٤ | کەرکوك | (٧٦٠٢) | (١٥٠٨) | (٢٨١٠٧)[٢١٣] |
| کۆی گشتی | | | (٢٩٩١٩٨) | (٢٩٩٧٤٦٧) |

"بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (حەویجە) بەپلەی یەکەم دێت بریتییە لە (١٣٤٩) درەختو بەرهەمی بریتییە لە (٢٦٩٨٠) کیلۆ. لەدوای ئەو ناحیەیی قەرەحەسەن دێت بریتییە لە (٨٨) درەختو بەرهەمی تەنها (٢٢٧) کیلۆیە، بەپلەی سێیەم ناحیەی قەرەتەپە دێت کە ژمارەی درەختەکانی (٧١) درەختەو بەرهەمی (٩٠٠) کیلۆ دەبێت. بۆیە ئەگەر لەچاو قەرەحەسەنەوە سەیری بکەین لە ڕووی بەرهەمهێنان قەرەتەپە بەرێژەی دووەم دێت لەدوای ناحیەی (حەویجە) "[٢١٦] بەڵام ناوچەکانی تری پارێزگاکە لەبەرهەمهێنانی هەرمێ کەمەو نییە.

**خشتەی ژمارە (٩٣)**
**بەرهەمهێنانی هەرمێ بە پێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٣٠٩٦٢ | ٢٣,٢ | ٧١٨ | ٥,٨ |
| کەرکوك | ١٩٦٩٦ | ٤٥ | ٨٨٦ | ٧,١ |
| دیالە | ٦٢٨٨٤ | ١٦,٩ | ١٠٦٣ | ٨,٥ |
| ئەنبار | ١٨١٠٩ | ٢٢,٩ | ٤١٣ | ٣,٣ |
| بەغدا | ١٣١٨٥٧ | ٢٩ | ٣٨٢٤ | ٣٠,٦ |
| بابل | ٢٦٢٤٦ | ١٩,٦ | ٥١٤ | ٤,١ |
| کەربەلا | ١٨٥٠٢٥ | ٢٤,٥ | ٤٥٣٣ | ٣٦,٣ |
| واست | ٢٠٥٧٥ | ٢٠,٥ | ٤٢٢ | ٣,٤ |
| سەلاحەددین | ٦٢٤٨ | ١٠,٦ | ٦٦ | ٠,٥ |
| نەجەف | ٢٩٦٣ | ١٠,٥ | ٣١ | ٠,٣ |
| قادسیە | ١٠٢٨ | ١٣,٦ | ١٤ | ٠,١ |
| موسەنا | ١٣١ | ١٥,٣ | ٢ | ٠ |
| زیقار | – | – | – | ٠ |
| میسان | – | – | – | ٠ |
| بەسرە | ١٥٨ | ١٩ | ٣ | ٠ |
| کۆی گشتی | ٥٠٥٨٨٢ | ٢٤,٦٩ | ١٢٤٨٩ | ١٠٠ |

– سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (٩٤)**
**ژمارەی درەختی ئاڵوباڵو بەرهەمی لە پارێزگاکانی کوردستان لەنێوان ساڵانی (١٩٥٢-١٩٥٨)**

| ز | پارێزگا | ژمارەی درەختەکان ١٩٥٢-١٩٥٣[٢٢٢] | ژمارەی درەختەکان ١٩٥٧-١٩٥٨[٢٢٣] | بەرهەمی بە کیلۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٢٦٧٨١) | (٣٩٣١٣) | (١٤١٧٧٩)[٢١٩] |
| ٢ | هەولێر | (٧٣٥١) | (١١٤١٦) | (٩٥٤٩٣)[٢٢٠] |
| ٣ | سلێمانی | (١٩٠٦٣) | (١٠٨٧٣) | (٧٤٥٠١)[٢٢١] |
| ٤ | کەرکوك | (٣٤١٤) | (٤٨٦٧) | (١٩٥٥٨) |
| | کۆی گشتی | | (٦٦٤٦٩) | (٣٣١٣٣١) |

**٢٣. هەڵوژە- ئاڵووباڵو-العنجاص:**

لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا ژمارەی درەختەکانی (٣٤١٤) درەخت بووە[٢١٧]، لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا (٤٨٦٧) درەخت بووە، بەرهەمی (١٩٥٥٨) کیلۆ بووە[٢١٨]. لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا بەپلەی چوارەم بووە لە دوای موسڵو سلێمانیو هەولێر لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بەپلەی چوارەم هاتووە. (بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە خشتەی ژمارە ٩٤، ٩٥، ٩٦).

**خشتەی ژمارە (٩٥)**
**بەرهەمهێنانی ئالووبالو بە پێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ١١١١٠ | ٢٢,٢ | ٢٤٧ | ٢,٧ |
| کەرکوك | ١٨٥٨ | ١٧,٨ | ٣٣ | ٠,٤ |
| دیالە | ٢٧٧٠٨ | ١٢,٨ | ٣٥٥ | ٣,٩ |
| ئەنبار | ٨٧١٣ | ٢٧,٢ | ٢٣٧ | ٢,٦ |
| بەغدا | ٥٥٢٠٤ | ٢٤,٩ | ١٣٧٥ | ١٥,٢ |
| بابل | ٦٥٣٧ | ١٣,٨ | ٩٠ | ١ |
| کەربەلا | ٢٣١٩٧٧ | ٢٨,٥ | ٦٦١١ | ٧٣,٣ |
| واست | ١١٩٧ | ١٤,٢ | ١٧ | ٠,٢ |
| سەلاحەددین | ٢٢٥٩ | ١٤,٢ | ٣٢ | ٠,٤ |
| نەجەف | ٤٤٢ | ١٥,٨ | ٧ | ٠,١ |
| قادسیە | ٢٠٥٥ | ٩,٧ | ٢٠ | ٠,٢ |
| موسەنا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زیقار | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| میسان | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەسرە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| کۆی گشتی | ٣٤٩٠٦٠ | ٢٥,٨٥ | ٩٠٢٤ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (٩٦)**

**بەرهەمهێنانی عینجاز بە پێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٦٨٦٣ | ١٨,٧ | ١٢٨ | ٧,٢ |
| کەرکوك | ٨٥ | ١١,٨ | ١ | ٠,١ |
| دیالە | ١٠٧١ | ١٢,١ | ١٣ | ٠,٧ |
| ئەنبار | ٥٣٦٢ | ٢٦,٧ | ١٤٣ | ٨ |
| بەغدا | ٧٥٠٥ | ٢٣,٥ | ١٨٦ | ٩,٩ |
| بابل | ١٩٠٢ | ١٨,٧ | ٣٥ | ٢ |
| کەربەلا | ٢٤٨٤٤ | ٢٢,٥ | ٥٥٩ | ٣١,٤ |
| واست | ٢٣٥٧ | ١٣,٦ | ٣٢ | ١,٨ |
| سەلاحەددین | ٦٠١١٦ | ١١,٥ | ٦٩١ | ٣٨,٨ |
| نەجەف | ١٩٧ | ١٠,٢ | ٢ | ٠,١ |
| قادسیە | ٨٢ | ١٢,٢ | ١ | ٠ |
| موسەنا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زیقار | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| میسان | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەسرە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| کۆی گشتی | ١١٠٣٨٤ | ١٦,١٣ | ١٧٨١ | ١٠٠ |

*** سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).**

**بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی حەویجە بەپلەی یەکەم دێت بریتییە لە (٢٧١٢) درەخت و بەرهەمی (١٢٠٠٠) کیلۆ دەبێت بەڵام پلەی دووەم ناحیەی قەرەحەسەنە بریتییە (١٦٨٩) درەخت بەرهەمی بەپلەی دووەم دێت بریتییە لە (٤١٤٨) کیلۆ پلەی سێیەم ناحیەی (قەرەتەپە) دێت بریتییە لە (٣٨٨) درەخت و بەرهەمی (٢٧٧٠) کیلۆیە کە لە ڕووی بەرهەمهێنانەوە بەپلەی دووەم دێت لەدوای ناحیە (حەویجە) کەمترین شوێن (مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ)، بریتییە لە (٤) درەخت و بەرهەمی (١٠) کیلۆیە. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٩٧).**

**خشتەی ژمارە(٩٧)[٢٢٤]**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی درەخت | بەرهەمی بەکیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | ناحیەی قەرەحەسەن | (١٦٨٩) | (٤١٤٨) |
| ٢ | ناحیە حەویجە | (٢٧١٢) | (١٢٠٠٠) |
| ٣ | ناحیەی شوان | (٢٤) | (١٣٠) |
| ٤ | ناحیەی قەرەتەپە | (٣٨٨) | (٢٧٧٠) |
| ٥ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٤) | (١٠) |
| ٦ | ناحیە قادرکەرەم | (٥٠) | (٥٠٠) |
| | کۆی گشتی | (٤٨٦٧) | (١٩٥٥٨) |

**٢٤. هەنجیر:**

"لە ساڵی (١٩٥٧–١٩٥٨) ژمارەی درەختەکانی (٣١٧٩٠) درەخت بووەو بەرهەمی لەو وەرزەدا (١٧٢١٦٥) کیلۆ بووە"[٢٢٥]، "لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەپلەی چوارەم دێت لە دوای (موسل)و (هەولێر)و (سلێمانی) لە رووی ژمارەی درەختی هەنجیر"[٢٢٦]. (بروانە خشتەی ژمارە ٩٨، ٩٩). "بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (قەرەحەسەن) بەرێژەی یەکەم دێت، ژمارەی درەختەکانی (٨٥٠٥) درختەو (٣٤٣٠٣) کیلۆیە پلەی دووەم ناحیەی شوانە، ژمارەی درەختەکان (٧١٠٢) درەختەو بەرهەمی (٣٣٧٥٢) کیلۆ دەبێت. پلەی سێیەم ناحیەی (حەویجە) دێت بریتییە لە (٥٢٨٩) درەختو بەرهەمی (٥٩٨٩٠) کیلۆ دەبێت، بۆیە ئەگەر بێت و لە رووی بەرهەمهێنانەوە بەراوردی بکەین (حەویجە) بەپلەی یەکەم دێت چونکە دەیسەلمێنێت کە درەختێك لە هەموو ناوچەکانی تر زیاتر بەرهەم دەهێنێت. کەمترین شوێن مەرکەزی قەزای خورماتووە بریتییە لە (٢٠) درەختو بەرهەمی تەنها (١٢٥) کیلۆ دەبێت"[٢٢٧]. (بۆ زیاتر شارەزایی بروانە خشتەی ژمارە ١٠٠).

**خشتەی ژمارە (٩٨)[٢٣١]**

**ژمارەی درەختو بەرهەمی هەنجیر لە کوردستان**

| ز | پارێزگا | ژمارەی درەختەکان | بەرهەمی بەکیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٢٢٣٧٦٤) | (٦٧٩١٠٠)[٢٢٨] |
| ٢ | هەولێر | (٧٧٠٨٦) | (٦١٨٦٣)[٢٢٩] |
| ٣ | سلێمانی | (٧١٣١٥) | (٥١٢٢١٥)[٢٣٠] |
| ٤ | کەرکوك | (٣١٧٩٠) | (١٧٢١٦٥) |
| کۆی گشتی | | (٤٠٣٩٥٥) | (١٩٧٣٦٤٣) |

**خشتەی ژمارە (٩٩)**

**بەرهەمهێنانی هەنجیر بەپێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی رێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٥٧٢١٣ | ٢٠,٤ | ١١٦٧ | ١٣,٢ |
| کەرکوك | ١٦٦٤ | ٤٠,٣ | ٦٧ | ٠,٧ |
| دیالە | ٢٦٤٦٧ | ٧ | ١٨٥ | ٢,١ |
| ئەنبار | ٩٨٥٩ | ٢٧,٧ | ٢٧٣ | ٣,١ |
| بەغدا | ٢٠٠٧٣ | ٢٢,٣ | ٤٤٨ | ٥,١ |
| بابل | ٨٩٩٢٧ | ١٢,٩ | ١١٦٠ | ١٣,١ |
| کەربەلا | ١٣٤٠٦٢ | ٣٥ | ٤٦٩٢ | ٥٢,٩ |
| واست | ١٩٥١٧ | ١٠,١ | ١٩٧ | ٢,٢ |
| سەلاحەددین | ١٠٢٩٨ | ١١,٨ | ١٢٢ | ١,٤ |
| نەجەف | ٩٥٨١ | ١٤,٣ | ١٣٧ | ١,٥ |
| قادسیە | ١١٧٢٨ | ٣٠ | ٣٥٢ | ٤ |
| موسەنا | ٨٣٨ | ١٣,١ | ١١ | ٠,١ |
| زیقار | ٣٦٤ | ٥,٥ | ٢ | ٠ |
| میسان | ٨٧ | ١١,٥ | ١ | ٠ |
| بەسرە | ٣٢٧٧ | ١٧,١ | ٥٦ | ٠,٣ |
| کۆی گشتی | ٣٩٤٩٥٥ | ٢٢,٤٦ | ٨٨٧٠ | ١٠٠ |

– سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (١٠٠)** [٢٣٢]

**ژمارەی درەخت و بەرهەمی هەنجیر لە قەزاو ناحییەكانی كەركوك**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەكان | ژمارەی درەختەكانی | بەرهەمی بە كیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەركەزی قەزای كەركوك | (٢٣٠) | (١٦٥٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٨٥٠٥) | (٣٤٣٠٣) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٥٢٨٩) | (٥٩٨٩٠) |
| ٤ | ناحیەی شوان | (٧١٠٢) | (٣٣٧٥٢) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (٤٩٦) | (٣٦٩٥) |
| ٦ | مەركەزی قەزای چەمچەماڵ | (٤٢١٠) | (٧٥٥٥) |
| ٧ | ناحیەی ئاغجەلەر | (٢٤٢٦) | (٢٢٤٤٥) |
| ٨ | ناحیەی سەنگاو | (١٠٠) | (١٠٠٠) |
| ٩ | مەركەزی قەزای خورماتوو | (٢٠) | (١٢٥) |
| ١٠ | ناحیەی قادركەرەم | (٣٤١٢) | (٧٧٥٠) |
| | كۆی گشتی | (٣١٧٩٠) | (١٧٢١٦٥) |

لەناوچەكەدا دوو جۆرە هەنجیر هەیە، هەنجیری ڕەش و هەنجیری زەرد بەڵام زۆرتر هەنجیری زەردە كە لە ناوچەكان هەیە، هەنجیری ڕەش ناوچەی (قەرەهەنجیر) بە ناوبانگ بووە پێی كە دێیەكەش هەنجیرە ڕەش هەر بەناو ئەوەوە ناونراوە بەڵام ئێستا تەنها دارێك چییە نەماوە لە ناوچەكە چونكە جێگای دارستانەكانی گشتی كرایە خانوو و ئۆردووگا بۆ نیشتەجێ بوونی (عەرەب) و كرا بە ناحیەی (الربیع).

**٢٥. شووتی:**

"لەساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا كۆی زەوییەكانی تۆوكراو بە شووتی (٣٥٤) مەشارەیە"[٢٣٣]. "ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاكە سەیری بكەین ناحیەی قەرەحەسەن بەرێژەی یەكەم دێت بریتییە لە (١٣٧) مەشارەو بە پلەی دووەم ناحیەی حەویجە دێت بریتییە لە (٦٥) مەشارە وپلەی سێیەم ناحیەی (داقوق) دێت بریتییە لە (٣٣) مەشارە، بەڵام ناوچەكانی (شوان) و (پێبان) و (ئاغجەلەر) و (سەنگاو) و (قەزای خورماتوو) لێی بەرهەم ناهێنرێت."[٢٣٤]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠١).

بەڵام لە جۆری بەناوبانگی شووتی ناوچەی سەرخاسە لە دێیی كۆچەك و یاروەلی جۆرێكی تایبەتی هەیە كە شێوەیەكی خڕو تۆكلێكی ئەستووری هەیەو زیاتر بۆ دروست كردنی مرەبا بەكاردەهێنرێت. لە ڕێژەی بەرهەمهێنانی لەسەر ئاستی پارێزگاكانی كوردستان بەپلەی چوارەم دێت لە كۆی زەوییەكانی كوردستان (٤٠٩٩) مەشارەیە كە (موسڵ) بەپلەی یەكەم دێت بریتییە لە (٢٥٠٦) مەشارە سلێمانی (٦٥٢) مەشارەیەو هەولێر (٥٨٧) مەشارەیە.

**خشتەی ژمارە (١٠١)** [٢٣٥]

**زەوی تۆوكراو بەشووتی بە پێوانەی مەشارە (١٩٥٧-١٩٥٨)**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەكان | پێوانە بە مەشارە |
|---|---|---|
| ١ | مەركەزی قەزای كەركوك | (٣٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (١٣٧) |
| ٣ | ناحیەی پردێ | (٤) |
| ٤ | ناحیەی حەویجە | (٦٥) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (١٧) |
| ٦ | ناحیەی شێروانە | (١٠) |
| ٧ | مەركەزی قەزای چەمچەماڵ | (٣٠) |
| ٨ | ناحیەی داقوق | (٣٣) |
| ٩ | ناحیەی قادركەرەم | (٢٨) |
| | كۆی گشتی | (٣٥٤) |

**٢٦. كاڵەك - گندۆرە:**

"لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا زەوی تۆوكراو بە كاڵەك نزیكەی (٢٢٥) مەشارە دەبێت"[٢٣٦]. لەسەر ئاستی پارێزگاكەدا ناحیەی (قەرەحەسەن) بەپلەی یەكەم دێت كە (٨٨) مەشارەیە مەركەزی قەزای كەركوك بە پلەی دووەم دێت بریتییە لە (٢٤) مەشارە پلەی سێیەم (مەركەزی قەزای چەمچەماڵ)ە بریتییە لە (٢٣) مەشارە كەمترین ناوچە (ئاغجەلەر)ە بریتییە تەنها لەیەك مەشارە، (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٢).

**خشتەی ژمارە (١٠٢)** [٢٣٧]

**زەوی تۆوكراو بە كاڵەك ١٩٥٧-١٩٥٨**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەكان | پێوانە بە مەشارە |
|---|---|---|
| ١ | مەركەزی قەزای كەركوك | (٢٤) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٨٨) |
| ٣ | ناحیەی پردێ | (١٧) |
| ٤ | ناحیەی حەویجە | (١٢) |
| ٥ | ناحیەی شوان | (٤) |
| ٦ | ناحیەی قەرەتەپە | (٨) |
| ٧ | مەركەزی قەزای چەمچەماڵ | (٢٣) |
| ٨ | ناحیە ئاغجەلەر | (١) |
| ٩ | ناحیەی داقوق | (٢٧) |
| ١٠ | ناحیەی قادركەرەم | (٢١) |
| | كۆی گشتی | (٢٢٥) |

"بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەپلەی چوارەم دێت لە کۆی زەوی تۆوکراو بە کاڵەگ (٥٢١٤) مەشارە، کە موسڵ بەرێژەی یەکەم دێت (٤٢٦٨)و سلێمانی بەپلەی دووەم دێت (٤٥٢) مەشارەو هەولێر (٢٦٩) مەشارە"[٢٣٨]. گەلێك جۆرو ڕەنگی جۆربەجۆر تۆوەدەکرێت کە جۆری ئاڵتون کۆپۆی گەورەیەو هەندێك ناوچەی تر هەیە جۆری بچووك-بچووکەو هەندێکی هەیە خڕو هەندێکی درێژ کۆڵەیە.

**٢٧. ترۆزی:**

گەلێك جۆرو ڕەنگی جۆربەجۆر تۆودەکرێت لە ناوچەکە بەڵام ئامارێکی دیاری کراومان نییە بۆ ئەوەی بزانین چەندێك تۆوکراوە لەو بەروبوومە کشتوکاڵییە، بەتایبەتی ناوچەی سەرخاسە بەناوبانگە بەترۆزیو هەروەها جۆری کالیاریش هەیە کە لە ترۆزی خۆشترە کە گەلێك ناوچەی کەرکوك پێی بەناوبانگە بە تایبەتی گوندی یارولی.

**٢٨. ئاروو (خەیار):**

"زەوی تۆوکراو لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا (١٤٤) مەشارە بووە، ناحیەی (قەرەحەسەن) بەپلەی یەکەم هاتووە بریتی بووە لە (٦٩) مەشارەو پلەی دووەم بریتییە لە مەرکەزی قەزای کەرکوك (١٩) مەشارە، کەمترین شوێن مەرکەزی قەزای خورماتووە کە تەنها (٣) مەشارەیە"[٢٣٩]، (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٣). بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەپلەی سێیەم دێت لە کۆی زەوی تۆوکراو (١٣٧٣)، پلەی یەکەم موسڵە ئینجا (هەولێر)و (کەرکوك)و (سلێمانی)[٢٤٠].

**خشتەی ژمارە (١٠٣)[٢٤١]**
**زەوی تۆوکراو بە خەیار**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | پێوانە بەمەشارە |
|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١٩) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٦٩) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (١٢) |
| ٤ | ناحیەی قەرەتەپە | (٦) |
| ٥ | ناحیەی شێروانە | (٥) |
| ٦ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٦) |
| ٧ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٣) |
| ٨ | ناحیەی داقوق | (١١) |
| ٩ | ناحیەی قادرکەرەم | (١٣) |
| | کۆی گشتی | (١٤٤) مەشارە |

**٢٩. هەنار:**

"لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا ژمارەی درەختەکانی هەنار (١٦٧٦٩) دار بووە"[٢٤٢]. "بەڵام لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) دا بریتی بووە لە (١٢٢٤٨) درەخت. لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (حەویجە) بەرێژەی یەکەم دێت بریتییە لە (٥٨٠٨) درەخت بەرهەمی (٧١٢١٨) کیلۆ دەبێت. پلەی دووەم ناحیە (قەرەتەپە) دێت بریتییە لە (٤٣٤٨) درەختو بەرهەمی (٢٥٤٩٣) کیلۆیە پلەی سێیەم ناحیەی (شوان)ە بریتییە لە (١٠٦١) درەخت بەڵام بەرهەمی کەمە لەچاو ژمارەی درەختەکان بریتییە لە (٥١٦٥) کیلۆ کە ناحیەی قەرەحەسەن (٨١٧) درەختە بەڵام بەرهەمی (١٤٥٠٩) کیلۆ دەبێت"[٢٤٣]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٤). "بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان بەرێژەی چوارەم دێت لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا بریتی بووە لە (١٦٧٦٩) درەخت لە کۆی گشتی (٣٣٧,٩٨٧)"[٢٤٤]، درەخت بەڵام لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) پارێزگاکە بەپلەی چوارەم هاتووە لە کۆی ژمارەی درەخت (٥٤٦١٠٢)و بەرهەمی (٦٢٩١١٨٨) کیلۆ، (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٥، ١٠٦).

**خشتەی ژمارە (١٠٤)[٢٤٥]**

| ز | ناوچەبەڕێوەبەرییەکان | ژمارەی درەخت | پێوانەی بەکیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (٦) | (٢٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٨١٧) | (١٤٥٠٩) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٥٨٠٨) | (٧١٢١٨) |
| ٤ | ناحیەی شوان | (١٠٦١) | (٥١٦٥) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (٤٣٤٨) | (٢٥٤٩٣) |
| ٦ | ناحیەی شێروانە | (٥٩) | (٣٠٠) |
| ٧ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٢٠) | (٥٠) |
| ٨ | ناحیەی ئاغجەلەر | (٢٥) | (١٠٠) |
| ٩ | ناحیەی سەنگاو | (٨) | (٨٠) |
| ١٠ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٧٠) | (١٠٥) |
| ١١ | ناحیە قادر کەرەم | (٢٦) | (٧٠) |
| | کۆی گشتی | (١٢٢٤٨) | (١١٧١١٠) |

**خشتەی ژمارە (١٠٥)**

| ز | پارێزگاکان | ژمارەی درەختەکان (١٩٥٢-١٩٥٣)[٢٤٦] | ژمارەی درەختەکان (١٩٥٧-١٩٥٨)[٢٤٧] | بەرهەمی بە کیلۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٨٦١٧٦) | (٢٤٥٣٤٢) | (١١٠٠٧٨٩) |
| ٢ | هەولێر | (٦٦٢٠٠) | (١٨٧٩١٧) | (٤٤٢٨١٧٢) |
| ٣ | سلێمانی | (١٦٨٨٤٢) | (١٠٠٥٩٥) | (٦٤٥١١٧) |
| ٤ | کەرکوك | (١٦٧٦٩) | (١٢٢٤٨) | (١١٧١١٠) |
| | کۆی گشتی | (٣٣٧٩٨٧) | (٥٨٦١٠٢) | (٦٢٩١١٨٨) |

**خشتەی ژمارە (١٠٦)**
**بەرهەمهێنانی هەنار بەپێی پارێزگاكان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاكان | ژمارەی دارە بەردارەكان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (كغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی رێژەیی بەرهەمهێنان ٪ |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٦٩٢٦٦ | ١٩,٧ | ١٣٦٥ | ١,١ |
| كەركوك | ٦٤٠٤ | ٢٧ | ١٧٣ | ٠,١ |
| دیالە | ٣٤٦١٢٣٧ | ٢٥ | ٨٦٥٣١ | ٧١,٦ |
| ئەنبار | ٥٥٦٩٩ | ٣٢,٧ | ١٨٢١ | ١,٥ |
| بەغدا | ٩٨١٣٧ | ٣٠,٦ | ٣٠٠٣ | ٢,٥ |
| بابل | ١٢٥١٣ | ١٨,٨ | ٢٣٥ | ٠,٢ |
| كەربەلا | ٩١٥٠٢٥ | ٢٥,٥ | ٢٣٣٣٣ | ١٩,٣ |
| واست | ٥٨٧٢٧ | ١٨,٤ | ١٠٨١ | ٠,٩ |
| سەلاحەددین | ٢٤٢٩٨٨ | ١٢ | ٢٩١٦ | ٢,٤ |
| نەجەف | ٤٨٤٨ | ١١,٨ | ٥٧ | ٠ |
| قادسیە | ٩٢٠٧ | ٢٢ | ٢٠٣ | ٠,٢ |
| موسەنا | ٤٨٨٥ | ١٨,٦ | ٩١ | ٠,١ |
| زیقار | ١٠٧٤ | ٨,٤ | ٩ | ٠ |
| میسان | ١٣٧ | ١٤,٦ | ٢ | ٠ |
| بەسرە | ٦٦٨٥ | ١٠ | ٦٧ | ٠,١ |
| كۆی گشتی | ٤٩٤٦٨٣٢ | ٢٤,٤٤ | ١٢٠٨٨٧ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

### ٣٠. سێو:

"لە ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣)دا نزیكەی (٥٨٢٨) دار بووە"[٢٤٨]، لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا بریتی بووە لە (٦٠١٤) دار بەرهەمی (١٣٨٥٦) كیلۆ بووە، بەڵام ئەگەر لەسەر ئاستی پارێزگاكە سەیری بكەین دەبینین ناحیەی (حەویجە) بەپلەی یەكەم دێت بریتییە لە (٣٥٨١) درەخت وبەرهەمی (٥٣٧١٥) كیلۆیە پلەی دووەم ناحیەی (قەرەحەسەنە) بریتییە لە (١٧٠٩) درەختو بەرهەمی (٧٣٠١) كیلۆیە پلەی سێیەم ناحیەی (قەرەتەپە)یە بریتییە لە (٣٠٨) درەختو بەرهەمی (١٤٨٠) كیلۆیە[٢٤٩]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٧). بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاكانی كوردستان (كەركوك) بەپلەی سێیەم دێت بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٢-١٩٥٣) لە كۆی ژمارەی سێوی پارێزگاكان كە (٧١٥٩٧) درەختە، بەپێی ئامارەی ئابووری ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) ئاستی پارێزگاكە لە كوردستاندا لەپلەی چوارەمە كە رێژەی بەرهەمهێنانیش هاتۆتە خوارەوەو لە پلەی چوارەم دایە. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٠٨، ١٠٩).

**خشتەی ژمارە (١٠٧)[٢٥٠]**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەكان | ژمارەی درەختەكان | پێوانە بەكیلۆ |
|---|---|---|---|
| ١ | مەركەزی قەزای كەركوك | (٧٠) | (٧٠٠) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (١٧٠٩) | (٧٣٠١) |
| ٣ | ناحیەی حەویجە | (٣٥٨١) | (٥٣٧١٥) |
| ٤ | ناحیەی شوان | (٥٥) | (١٣٠) |
| ٥ | ناحیەی قەرەتەپە | (٣٠٨) | (١٤٨٠) |
| ٦ | مەركەزی قەزای چەمچەماڵ | (٧١) | (١٥٠) |
| ٧ | ناحیەی ئاغجەلەر | (٢٠) | (٨٠) |
| ٨ | مەركەزی قەزای خورماتوو | (٢٠٠) | (٣٠٠) |
| | كۆی گشتی | (٦٠١٤) | (١٣٨٥٦) |

**خشتەی ژمارە (١٠٨)**

| ز | پارێزگا | درەختەکان ١٩٥٣-١٩٥٢ | ژمارەی درەختەکان ١٩٥٨-١٩٥٧ | پێوانە بە کیلۆ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | موسڵ | (٣٠٧٦٥) | (٦٦٤٤١) | (٢٤٣٨١٩) |
| ٢ | هەولێر | (١٤١٠١) | (٣٨٠٦٩) | (٥٢٢٧٦٤) |
| ٣ | سلێمانی | (٢٠٩٠٣) | (١٦٨٢٨) | (١٠٠١٥٨) |
| ٤ | کەرکوك | (٥٨٢٨) | (٦٠١٤) | (٦٣٨٥٦) |
| کۆی گشتی (١٢٧٣٥٢) [٢٥١] (٩٣٠٥٩٧) [٢٥٢] | | | | |

**خشتەی ژمارە (١٠٩)**

**بەرهەمهێنانی سێو بە پێی پارێزگاکان لە هاوینی ساڵی (٢٠٠٩)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٤٤٩٤٧ | ٢١,٩ | ٩٨٤ | ٢,٧ |
| کەرکوك | ١١١٨ | ٢٠,٦ | ٢٣ | ٠,١ |
| دیالە | ٨٥٣٤١ | ١٩,٩ | ١٦٩٨ | .٤ |
| ئەنبار | ٢٣٤٤١٠ | ٢١,٧ | ٥٠٨٧ | ١٣,٩ |
| بەغدا | ٤٧٤٣٢١ | ٣٠,٣ | ١٤٣٧ | ٣٩,٣ |
| بابل | ١٠٥٠٠٢ | ٢٢,٥ | ٢٤٨٥ | ٦,٥ |
| کەربەلا | ٤٧٥٠٣٢ | ٢٤,٦ | ١١٦٨٦ | ٣١,٩ |
| واست | ١٣٢٩٢ | ١٦ | ٢١٣ | ٠,٦ |
| سەلاحەددین | ٥٠٢٠ | ١٣,٣ | ٦٧ | ٠٢ |
| نەجەف | ١٨٣٣ | ٩,٨ | ١٨ | ٠,١ |
| قادسیە | ١٩٦٠ | ١٢,٨ | ٢٥ | ٠,١ |
| موسەنا | ٥٧٩ | ٢٤,٢ | ١٤ | ٠ |
| زیقار | ٨٨ | ١١,٤ | ١ | ٠ |
| میسان | – | – | – | ٠ |
| بەسرە | ٢٣٢ | ١٢,٩ | ٣ | ٠ |
| کۆی گشتی | ١٤٤٤١٧٥ | ٢٥,٣٣ | ٣٦٥٧٦ | ١٠٠ |

– سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**٣١. خورما:**

لە کەرکودا دارێکی تارادەیەك زۆر هەیە بەڵام لە ڕووی بەرهەمهێنانەوە بەرێژەی سفر دێت، هەمووی داری بێ بەرە، بەپێی سەرژمێری (١٩٥٧-١٩٥٨) نزیکەی (٩٢٢٠) دار هەبووە بەڵام تەنها کیلۆیەك بەرهەمی نەبووە. بۆیە زیاتر (خورما) لە دەرەوەی شارەکە دەهێنرێت وەکو ئەوەی لە ناوخۆدا هەبێت زۆرتری دارەکانی بۆ جوانی لە ماڵەکان شین دەدرێت چونکە ئاو و هەوای شارەکە نابێتە هۆی پێگەیاندنی خورماکە. لە ناوچەی قەرەتەپە (٨٩٠٠) دار هەیەو لە مەرکەزی قەزای خورماتوو (٣٢٠) دارهەیە[٢٥٣]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١١٠، ١١١).

**خشتەی ژمارە (١١٠)**
**دار خورماو ناوەدی بەرهەمهێنانی لە ساڵی (٢٠١٠) لەسەر ئاستی پارێزگاکانی عێراق**

| پارێزگاکان | ژمارەی دار خورماکان | ئەو دارخورمایانەی کە نەگەیشتۆتە قۆناغی بەرهەمهێنان | دار خورمای چێنراو لە ماوەی ساڵی (٢٠١٠)دا | دار خورما لە قۆناغی بەرهەمهێناندا | | | ناوەندی بەرهەمهێنانی دار خورما (کغم) | | | (٪) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | بێ بەرهەم | بەرهەمی ڕاستەوخۆ | کۆی گشتی | بەرهەم هێن | لە قۆناغی بەرهەمهێناندایە | | |
| کەرکوک | ٣٤١٩ | ١٢٦٦ | ٨١١ | ٠ | ١٣٤٢ | ١٣٤٢ | ٦٩,٣ | ٦٩,٣ | ٩٣ | ٠ |
| دیالە | ١٨٣٢٣٠٨ | ٣٤٨٠٦٦ | ٣٥٨٣٩٦ | ٠ | ١١٢٥٨٤٦ | ١١٢٥٨٤٦ | ٦٠,٥ | ٦٠,٥ | ٦٨١٤٦ | ١٢ |
| ئەنبار | ٥٩٠٨٥٢ | ٤٨٨٦٢ | ٢٢٩٩٣ | ٢٠٦٥٤ | ٤٩٨٣٤٣ | ٥١٨٩٩٧ | ٨٣,٤ | ٨٠,١ | ٤١٥٦٧ | ٧,٣ |
| بەغدا | ٢٠٥١٩٦٢ | ١٩٦٥٣٧ | ٦٥٢٥١٧ | ٠ | ١٢٠٢٩٠٨ | ١٢٠٢٩٠٨ | ٦٤,٥ | ٦٤,٥ | ٧٧٥١٩ | ١٣,٧ |
| بابل | ١٥٧٠٩٣٨ | ٢٢٩٥٨٨ | ١٢٨٧٨٥ | ٠ | ١٢١٢٥٦٥ | ١٢١٢٥٦٥ | ٧٦,٥ | ٧٦,٥ | ٩١٤٩٦ | ١٦,٢ |
| کەربەلا | ١٤٤٢٥٢٩ | ١٦٧٣٤٨ | ٦٨٩٨٧ | ٢٢٦٥٣٧ | ٩٨٠٦٥٧ | ١٢٠٧١٩٤ | ٦٦,١ | ٥٣,٧ | ٦٤٨٠٨ | ١١,٤ |
| واست | ٦٥٥٣٨٤ | ١٢٨٦٢٠ | ٦٦٢٧٨ | ٢١٤٢ | ٤٥٨٣٤٤ | ٤٦٠٤٨٦ | ٨٢ | ٨١,٦ | ٣٧٥٧٠ | ٦,٦ |
| سەلاحەددین | ٣٣٩٠٠٩ | ٨٧٢٥٠ | ٧١٤٠١ | ٠ | ١٨٠٣٥٨ | ١٨٠٣٥٨ | ٩٠,٧ | ٩٠,٧ | ١٦٣٧٠ | ٢,٩ |
| نەجەف | ٥٤٥٩٤ | ٦٠٤٣٥ | ٢٠٥٢٦ | ٣١٢٥٠ | ٤٣٣٧٢٩ | ٤٦٤٩٧٩ | ٦٣,٨ | ٥٩,٥ | ٢٧٦٦١ | ٤,٩ |
| قادسیە | ٥٤٨٣٥٨ | ٨١٩٤٢ | ٨٤٥٦٣ | ٠ | ٣٨١٨٥٣ | ٣٨١٨٥٣ | ٧١,٥ | ٧١,٥ | ٢٧٣١٩ | ٤,٨ |
| موسەنا | ٦٥٣٥٦٢ | ١٦٦٧٥٠ | ١١٥٣١٣ | ١٩٠٤٢ | ٣٥٢٤٥٧ | ٣٧١٤٩٩ | ٥٥,٤ | ٥٢,٥ | ١٩٥١٣ | ٣,٥ |
| زیقار | ١٠٣٧٨٢٣ | ٢٥٩٤٢٣ | ١٩٣٤٠٧ | ٣٤٤٨٦ | ٥٥٠٥٠٧ | ٥٨٤٩٩٣ | ٥٩,٣ | ٥٥,٨ | ٣٢٦٧٤ | ٥,٨ |
| میسان | ١٧٠٨٩٦ | ٢٦٢٧٩ | ١٠٥١٢ | ٥٧١٤ | ١٢٨٣٩١ | ١٣٤١٠٥ | ٥٩ | ٥٦,٥ | ٧٥٨٠ | ١,٣ |
| بەسرە | ١٢٤٩٨١٣ | ٢٠٣٦٢٣ | ٩٨٦٥٧ | ٦٠٧٧٠ | ٨٨٦٧٦٣ | ٩٤٧٥٣٣ | ٦١,٥ | ٥٧,٥ | ٥٤٥١٣ | ٩,٦ |
| کۆی گشتی | ١٢٦٩٢٧٩٣ | ٢٠٠٥٩٨٩ | ١٨٩٢١٤٦ | ٤٠٠٥٩٥ | ٨٣٩٤٠٦٣ | ٨٧٩٤٦٥٨ | ٦٧,٦ | ٦٤,٥ | ٥٦٦٨٢٩ | ١٠٠ |

سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**خشتەی ژمارە (١١١)**
**بەرهەمهێنانی خورما لە ساڵی (٢٠١٠) بە پێی جۆرەکانی خورما لە پارێزگاکانی عێراق**

| پارێزگاکان | بەرهەمهێنان (بە تەن) | | | | | | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | زەهدی | خەستاوی | سایر | خەزراوی | حەلاوی | دیری | جۆری دیکە | |
| کەرکوك | ٤١ | ٣ | ٠ | ١٢ | ١ | ١ | ٣٥ | ٩٣ |
| دیالە | ٤٧٤٧٤ | ٨٨٨٧ | ١٠٧٣ | ١٥١٢ | ١٤٢ | ١١٨١ | ٧٨٧٧ | ٦٨١٤٦ |
| ئەنبار | ٣٣٣٥٥ | ٦٩٩٤ | ٢٦ | ١٢٥ | ١٠ | ١٢ | ١٠٤٥ | ٤١٥٦٧ |
| بەغدا | ٥١٩١٥ | ١٠٢١٨ | ١٩٩ | ١٤٤٢ | ٢١٨ | ٢٣٧ | ١٣٢٩٠ | ٧٧٥١٩ |
| بابل | ٧٣١٠٠ | ١٠٩٧٨ | ٢٧٤ | ٩٠٧ | ١٥٤ | ٩١٢ | ٥١٧١ | ٩١٤٩٦ |
| کەربەلا | ٥١٦٧٩ | ٨٣٨٠ | ٦٧ | ٣٧٤ | ٣٤ | ١٦٠ | ٤١١٤ | ٦٤٨٠٨ |
| واست | ٢٢٨٣٧ | ٤٤٢٠ | ٢٢٢ | ١٤٩٩ | ٣٩٣ | ٣٦٢ | ٧٨٣٧ | ٣٧٥٧٠ |
| سەلاحەددین | ١٠٤٣١ | ٢٤٤٦ | ٩٩ | ٣٠١ | ١٦٣ | ٥٧ | ٢٨٧٣ | ١٦٣٧٠ |
| نەجەف | ١٩٨٥٤ | ٣١٩٥ | ٧١٨ | ١٢٤٦ | ٣١٣ | ٢٠٦ | ٢١٢٩ | ٢٧٦٦١ |
| قادسیە | ٢٢٩٦٥ | ٩٩٦ | ٢٣٤ | ٧٥٠ | ٢٨٠ | ٢٤٥ | ١٨٤٦ | ٢٧٣١٩ |
| موسەنا | ٨٥١٠ | ٩٣٠ | ١٠٢٠ | ١٧٢٤ | ٦١٨ | ٨٤٥ | ٥٨٦٦ | ١٩٥١٣ |
| زیقار | ٦٦٨٩ | ١١٥٣ | ٥٢٦٧ | ٩٠٥٢ | ٣٩٩ | ٣٩١٢ | ٦٢٠٢ | ٣٢٦٧٤ |
| میسان | ١٥٢٣ | ٥٥٠ | ١٦٥٤ | ١٨٥٧ | ١٠٩ | ٥٥٣ | ١٣٣٧ | ٧٥٨٠ |
| بەسرە | ٣٥٢٣ | ٩٨٨ | ٨١٤٣ | ٤٠٦٢ | ١٨٥٥٨ | ٤١٨٨ | ١٥٠٥١ | ٥٤٥١٣ |
| کۆی گشتی | ٣٥٣٨٩٦ | ٦٠١٣٨ | ١٨٩٩٣ | ٢٤٨٦٣ | ٢١٣٩٢ | ١٢٨٧١ | ٧٤٦٧٦ | ٥٦٦٨٢٩ |

سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

### ٣٢. یەنگی دونیا:

ئەمەش دارێکی زۆری هەیە لە شاری کەرکوك بەڵام ڕێژەیەکی دیاری کراومان نییە تا بزانین چەند دارو بەرهەمی بەکیلۆ چەندە، بەڵام ئەو جۆرەی هەیە لە ناو شاری کەرکوك بەشی تارادەیەکی کەم دەکات هەروەها ئەوەندەش بەکارناهێنرێت بۆ خواردن لەلایەن خەڵکییەوە، بۆیە زیاتر دارەکەی لە ماڵەکانی گەرەکی (عەرەفە) بۆ جوانی شین دەدرێت.

### ٣٣. توو-شاتوو:

ڕێژەیەکی چاك (توو) لە ناوچەکە هەیە بەڵام ئامارێکی ڕێکوپێکمان نییە دەربارەی ژمارەی دارو بەرهەمی بە کیلۆ بەڵام دەبینی ژمارەیەکی زۆر داری توو هەیە لە (خورماتوو) و (داقووق)و ناوچەی (شوان)و (چەمچەماڵ)و تارادەیەکی چاك بەرهەمی هەیەو تەنانەت لێشی زیاد دەبێت بۆدەرەوە بنێرێت.. دووجۆرە توو لە پارێزگاکە هەیە ئەویش تووی سپی وتووی ڕەشە کەزیاتر تووی سپی هەیەو جۆری گەورەو بچووکی زۆرترە لە تووەڕەشەکە. هەروەها زرە تووش هەیە لە ناوچەکە کەبەری نییەو بۆ جوانی شین دەدرێت، (شاتووش- تووەڕەشە) هەیە بەڵام جۆرەکەی کەمەو تەنها لەچەند ناوچەیەکی بەرتەسکدا هەیە، ئەم جۆرەیان زیاتر بۆ ئەوەیە کە لە ناوچەکانی دەرەوە هاتۆتە ناوەوە بۆ چاندنی.

### ٣٤. بەهێ:

ڕێژەیەکی زۆر کەمەو وەکو نەبوون وایەو زیاتر لەدەرەوەی پارێزگاکەوە دەهێنرێت و لەم ساڵانەی دوایی هەر تەنها دارێك چییە نەماوەو نییە.

### ٣٥. پرتەقاڵ:

"لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨)دا ژمارەی درەختەکانی (١٠٦٦) درەخت بووەو بەرهەمی لەو وەرزە دا (٧٤٦٠) ژمارە بووە. کەناحیەی قەرەتەپە بەرێژەی یەکەم هاتووە لەسەر ئاستی پارێزگاکە بریتی بووە لە (٨٥٠) درەخت و بەرهەمی (٣٨٣٥) ژمارە پرتەقاڵ بووە. بەپلەی دووەم هەریەکە لە ناوچەکانی (ناحیەی ئاغجەلەر)و (مەرکەزی قەزای خورماتوو) بووە کە (١٠٠) درەخت بوونە، بەڵام ئاغجەلەر بەرهەمی تەنها (٣٠٠) پرتەقاڵ بووە، مەرکەزی قەزای خورماتوو (٣٠٠٠) ژمارە پرتەقاڵ بووە. بەپلەی سێیەم ناحیەی شێروانە دێت بریتی بووە لە (١٦) درەخت و بەرهەمی (٣٢٥) پرتەقاڵ بووە"[٢٥٤]، ناوچەکانی تری پارێزگاکە هیچی لێ نییەو زیاتر لە پارێزگای دیالەوە بۆ کەرکوك دەهێنرێت بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان ناوچەی کەرکوك بەپلەی یەکەم دێت، چونکە هەریەکە لە (موسڵ)و (هەولێر)و (سلێمانی) هیچی لێ بەرهەم ناهێنرێت و نییە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ١١٢).

**خشتەی ژمارە (١١٢)**
**بەرهەمهێنانی پرتەقاڵ بە پێی پارێزگاکان لە ساڵی (٢٠١٠)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | تاوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسڵ | ٢٥١ | ٤٠٢ | ١ | ٠ |
| کەرکوك | ١٢٦٣ | ٨٠١ | ١٠ | ٠ |
| دیالە | ١٤١٠١٦١ | ٨٠٨ | ١٢٤٠٩ | ١٢,٧ |
| ئەنبار | ٣٤٥١١٨ | ١٣,٢ | ٤٥٥٦ | ٤,٧ |
| بەغدا | ١٩٤٢٦١٣ | ١٦,٨ | ٣٢٦٣٦ | ٣٣,٣ |
| بابل | ٦٣٨٩٢٢ | ١٣,٢ | ٨٤٣٤ | ٨,٦ |
| کەربەلا | ٢٥٥٩٩٩٤ | ١٤,٤ | ٣٦٨٦٤ | ٣٧,٧ |
| واست | ١١٥١٣١ | ٩,٥ | ١٠٩٤ | ١,١ |
| سەلاحەددین | ٢٣٤١٩٥ | ٧,٣ | ١٧١٠ | ١,٧ |
| نەجەف | ٣٧٦٣ | ٦,٩ | ٢٦ | ٠ |
| قادسیە | ٤٠٥٥ | ١٥,٢ | ٦٢ | ٠,١ |
| موسەنا | ٦٠١٩ | ١٥,٦ | ٩٤ | ٠,١ |
| زیقار | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| میسان | ١٤٠ | ٦,٨ | ١ | ٠ |
| بەسرە | ١٦١٥ | ٦ | ١٠ | ٠ |
| کۆی گشتی | ٧٢٦٣٢٤٠ | ١٣,٥ | ٩٧٩٠٧ | ١٠٠ |

- سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**٣٦. لیمۆی شیرین:**

"بەپێی ئاماری ئابووری ساڵی (١٩٥٧–١٩٥٨) نزیکەی (١٧٤٠) داربووەو بەرهەمی (١٣٤٣٠) کیلۆ بووە لەووەرزەدا، (قەرەتەپە) بەرێژەی یەکەم هاتووە لەسەر ئاستی پارێزگاکە بریتی بووە لە (١٦٨٣) درەختو بەرهەمی (١٣٠٧٠) کیلۆ بووە بەرێژەی دووەم ناحیەی (ئاغجەلەر) بووە بریتی بووە لە (٢٥) درەختو بەرهەمی (١١٠) کیلۆ بووە بەپلەی سێیەم (مەرکەزی قەزای خورماتوو) بووە بریتی بووە لە (٢٠) درەختو بەرهەمی (٥٠) کیلۆ بووە، وەپلەی چوارەم ناحیەی شێروانەیە کە بریتی بوو لە (١٢) دارو بەرهەمی (٢٠٠) کیلۆ بووە"[٢٥٥]. لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان ناوچەی (کەرکوك) بەپلەی یەکەم دێت، چونکە لە ناوچەکانی (موسل) و (هەولێر)و (سلێمانی) بەرهەم ناهێنرێتو نییە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ١١٣).

**خشتەی ژمارە (١١٣)**

**بەرهەمهێنانی لیمۆی شیرین بە پێی پارێزگاکان لە ساڵی (٢٠١٠)**

| پارێزگاکان | ژمارەی دارە بەردارەکان | ناوەندی بەرهەمی یەك دارێك (کغم) | بەرهەمهێنان (تەن) | گرنگی ڕێژەیی بەرهەمهێنان (٪) |
|---|---|---|---|---|
| موسل | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| کەرکوك | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| دیالە | ١٤٤٩٣ | ٧,٢ | ١٠٤ | ٨,٨ |
| ئەنبار | ١٢٨٧ | ١٣,٧ | ١٨ | ١,٥ |
| بەغدا | ٢٧٨٣٤ | ١٥,٧ | ٤٣٧ | ٣٧,٢ |
| بابل | ١٦٠٩٥ | ٧,٨ | ١٢٦ | ١٠,٧ |
| کەربەلا | ٢٤١٦٠ | ١٩,٥ | ٤٧١ | ٤,١ |
| واست | ١٢٩٦ | ٨,٨ | ١١ | ٠,٩ |
| سەلاحەددین | ١٥١٣ | ٨,٥ | ٦ | ٠,٥ |
| نەجەف | ٣٢٩ | ٠ | ٣ | ٠,٣ |
| قادسیە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| موسەنا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| زیقار | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| میسان | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| بەسرە | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| کۆی گشتی | ٨٧٠٠٧ | – | ١١٧٦ | ١٠٠ |

– سەرچاوە: (الاطلس الاحصائي الزراعي، خارطة الطريق للتنمية الزراعية، الإقتصاد الاخضر).

**٣٧. لیمۆی ترش:**

"بەپێی ئاماری ساڵی (١٩٥٧–١٩٥٨) ژمارەی درەختەکانی (٥٤٩) داربووەو بەرهەمی (٢٨٤٠) کیلۆ بووە لەسەر ئاستی پارێزگاکە ناحیەی (قەرەتەپە) بەپلەی یەکەم دێت بریتییە لە (٤٠٤) دارو بەرهەمی (٢٥٤٥) کیلۆیە بەپلەی دووەم ناحیەی (شوان) دێت بریتییە لە (١٠٠) درەختو بەرهەمی (١٥٠) کیلۆیە، بەپلەی سێیەم (مەرکەزی قەزای خورماتوو) دێت بریتییە لە (٣٠) دارو بەرهەمی (٤٥) کیلۆیە، بەپلەی چوارەم ناحیەی (شێروانە) دێت بریتییە لە (١٥) درەختو بەرهەمی (١٠٠) کیلۆیە"[٢٥٦]. بەڵام لەسەر ئاستی پارێزگاکانی کوردستان ناوچەی (کەرکوك) بەپلەی یەکەم دێت. چونکە هەریەکە لە (موسل)و (سلێمانی)و (هەولێر) لیمۆی ترشی لێ بەرهەم ناهێنرێتو نییە لەبەرئەوە ئەو پارێزگایانەی کوردستان زیاتر پشت دەبەستن بەهێنانی لە پارێزگای (دیالە) وە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ١١٤).

**خشتەی ژمارە (١٥٣)**

**کێڵگە نەوتیە ئەزموونییەکانی پارێزگای کەرکوك تا ساڵی ٢٠٠٣** [٥٥]

| ژ | کێڵگە | ژمارەی بیرە هەڵکەندراوەکان | قووڵی بیر/م | حاڵەتی بیر | عەمباری | یەدەکی نەوت/ ملیۆن بەرمیل | پلەی API |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کۆرمۆر | ٢ | ١٩٧٣ | کێڵگەی گاز/ داخراو | جيرية | ------ | ٥٧ |
| ٢ | چەمچەماڵ | ٩ | ٢٧٨٥ | داخراو | ثلاثي | ------ | --- |
| ٣ | ئینجانە | ٥ | ٣٥٢٤ | داخراو | طباشيري | ٥٢ | ٣٣ |
| ٤ | جەدیدە | ١ | ٣٦١٤ | لە بەرهەمدایە | ثلاثي طباشيري | ٤٧١,٩ | ٢٥ |
| ٥ | گلابات | ٣ | ٢٨٦٥ | داخراو | ثلاثي | ٦٣٢,٢ | ٣٩,٣٩ |
| ٦ | پەڵکانە | ٧ | ٢٨٩٦ | داخراو | ثلاثي طباشيري | ٦٠ | ٣٣ |
| ٧ | گومبر | ١ | ٣٢٠٠ | بیرێکی چاودێرکراو | ثلاثي | ٥٠٩ | ٤٣ |
| ٨ | تەق تەق | ٣ | ٣٩٨٦ | داخراو | ثلاثي طباشيري | ١٢٢١,٨ | ٤٧ |
| ٩ | قەرەچۆخ | ٢ | ٣٦١٩ | کۆنکریتکراو | جوراسي | ١٣٧,٢٣ | ٤٠ |
| ١٠ | خانوکە | ٢ | ٥٩١ | داخراو | ثلاثي | | |
| ١١ | خشم الاحمر | ٢ | ١٧٠٩ | بەرهەمی گازی | ثلاثي | ٤٥,٩٣ | ٣٩,١٨ |
| ١٢ | ئیسماعیل | ١ | ٢٨٠٠ | داخراو | ثلاثي | | ٣٢,٤ |
| کۆی | | ٣٨ | ٣٣٥٦٢ | | | ٣١٣٠,٠٦ | |
| ڕێژە | | | ٢٧٩٦,٥٨ | | | | |

*** تایبەتمەندییەکانی نەوتی کەرکوك:**

"نەوت لەناوچە کەرکوکدا بریتییە لە ناوچەیەکی نەوتی لە شێوەیەکی ئەوتۆ کە درێژییەکەی سەد کیلۆ مەترەو پانییەکەی نزیکەی چوار کیلۆمەتردەبێت، درێژدەبێتەوە لە (تەرجل) وە بۆ نزیکی شوێنێك پێی دەوترێت (دیبەگە) لە پارێزگای (هەولێر) لەوانەیە زەنبردن نەبێت بڵێین نەوت لەو ناوچەیەدا کۆبووەتەوە لە شێوەی حەوز یان دەریاچەیەك لەژێر زەویدا، هەروەها چەند چینێکی ئیسفەنجی دەبینرێت لەنێوان کوونەکاندا، ئاوی لە خۆی هەڵگرتووە"[٥٦]. "هەروەها لەسەرووییەوە چینێکی پتەو دەبینرێت پێکهاتووە لەبەردی خوێن، لەژێرییەوە بەردی ئیسفەنجی دەبینرێت کە لەژێریدا نەوت دیارە"[٥٧]، "ئەو چینی بەردە ئیسفەنجییە پێکهاتووە لە ماددەی (کلسی) کە کونەکانی زۆر بچووکە، هەندێکیان پانییەکەی ناگاتە (١٠) ملیمەتر.

چینی نەوتی لەشاری کەرکوکدا قووڵییەکەی لە سەرزەوییەوە لەنێوان دووهەزار تا سێ هەزار پێ دەبێت"[٥٨]، "لەنەوتی کەرکوکدا پێویستە ئەو کبریتەی لەنەوتدا هەیە لابرێت چونکە لەبەرئەوەی ماددەیەکی خوراوەیە لە ناو نەوتەکەدا کە بەرێژەیەکی زۆر هەیە زیاتر لەوەی هەیە لەنەوتی (بەسرە) و (عەین زالە) دا"[٥٩].

*** کارتێکردنی نەوت بەسەر ئابووری ناوچەی کەرکوکدا:**

١. سەرهەڵدانی ناوچەکە لە رووی ئابوورییەوە، پاش دۆزینەوەو بەرهەمهێنانی نەوتو بەکارهێنانی لەبەرهەمهێنانی کەرەستە پیشەسازییەکان، ئەمە وای کرد ناوچەکە وەکو بەشێکی گرنگ سەیربکرێت وهەوڵبدرێت نەخرێتە تای تەرازووی کێشە نەتەوەییەکەوە بەپێی توانا هەوڵی شێواندنی لایەنە نەتەوەییەکە بدرێتو بکرێتە شارێکی بێ گیانی هەستی نەتەوایەتی کوردی.

٢. هێنانی کرێکارێکی زۆر بۆ ناو شاری کەرکوك و ناوچەکانی دەوروبەری لە عەرەب و نیشتەجێ بوونیان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، دابین کردنی هەموو پێویستییەك بۆیان لە خانوو پارەو ماڵ تابۆئەوەی ببنە هێزێکی کارو هێزێکی بەرگری.
٣. کۆچ کردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك لەلادێ کانەوە بۆ شارو دەستکردن بەکار لەکارگەکاندا لەسەرەتای دۆزینەوەی نەوت ئەمەش وایکرد بەشێکی زۆر واز لە پێشە کشتوکاڵییە بنەرەتییەکە بهێنن.
٤. ڕووخاندنی ژمارەیەکی چاك گوندو لادێی دەوروبەری دۆزراوە نەوتییەکان وەکو (شۆراو)و (زەندەبۆر)و (سێکانیان)و (گورگەچاڵ) ئەمەش وای کرد ڕێژەیەکی چاك زەوی کشتوکاڵی بکەوێتە بەر فەوتاندن و لەناودان، پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەکان بەدەرییان خست کەزۆر لەوە بیرو کێڵگەی نەوتی هەیە، هەر ئەمەش پاڵپشت بوو بۆ هەڵسان بەکاری (ئەنفال) لەسەرتاپای کوردستان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی، کردنی هەموو ناوچەکان بەقەدەغەکراو لە ڕووی ژیانەوە.
٥. تێکەڵبوونی ڕۆشنبیری و زانیاری ئابووری ئینگلیزەکان و بەرزبوونەوەی باری ڕۆشنبیری خەڵکەکەیە بەتایبەتی ئەوانەی لەدامودەزگا نەوتییەکاندا کاریان دەکرد یاتێکەڵاوبوونیان لەگەڵ کارمەندە ئینگلیزو هیندییەکان، کە دروست بوونی گەڕەکی (عەرەفە) نموونەی ئەم ڕاستییەیە.

۲. خوێ:

"بوونی ڕێژەیەکی زۆر خوێ لە خوارووی ڕۆژئاوا"[٦٠] و "ڕۆژهەڵاتی شارکە هەیە لە کەناری ئاوە سپی کانگایەك هەیە بە ناوی (خوێ لێن)"[٦١]، "هەروەها ڕێژەیەکی چاك هەیە لە (خورماتوو)و (گۆم مەملەحە)و ئەوزەوییانەی نزیك چیای (حەمرین) کەبریتین لە شێوەی خوێیەکی چاك هەروەها لە ناوچەکانی (حەویجە) ش هەیە بەڵام شێوەی خوێیەکەی چاك نییە، لە ناوچەکانی (قەرەتەپە) ش هەیە"[٦٢]، "لە کاتی خۆیدا کۆمپانیای نەوتی عێراقی توانی ڕێژەیەکی پاك لەچینی خوێین بدۆزێتەوە، لەکاتی هەڵکۆڵین و بەدوادا گەڕانی نەوت، کەدەتوانرێت بەکاربهێنرێت لەبەرچاکی جۆرەکەی"[٦٣].
دەرهێنانی خوێ لەناوچەی کەرکوك لەشێوەی بەهەڵم کردن خوێیەکە لە ناوچە زەوییەکی نزم ودروستکردنی دەریاچەیەك بۆ ئەم مەبەستە کەلەدوایدا تەنها خوێیەکە دەمێنێتەوە، ئەم ڕێگەیە باشترین ڕێگایە بۆ بەدەستهێنانی خۆی بەڵام لەم ساڵانەی دوایدا بە شێوەیەکی ڕەسمی لەلایەن حکومەتەوە بەکاردەهێنرێت. (بۆ زیاتر شارەزایی لەڕێژەی خوێ بڕوانە خشتەی ژمارە ١٥٤).

**خشتەی ژمارە (١٥٤)[٦٤]**
**بەرهەمهێنانی خوێ بەتەن لەنێوان ساڵان (١٩٢٤-١٩٣٤)**

| ز | ساڵی بەرهەم | بەرهەم بەتەن (خورماتوو) | (گۆم) |
|---|---|---|---|
| ١ | (١٩٢٤) | (٤٥٦) | (-) |
| ٢ | (١٩٢٥) | (٦٧٥) | (-) |
| ٣ | (١٩٢٦) | (٧٣٦) | (-) |
| ٤ | (١٩٢٧) | (٣٩٩) | (٥٨٣) |
| ٥ | (١٩٢٨) | (٥١٧) | (٦٤٢) |
| ٦ | (١٩٢٩) | (٨١٩) | (٦٦٥) |
| ٧ | (١٩٣٠) | (٨٥٢) | (٧٦٢) |
| ٨ | (١٩٣١) | (٧١٧) | (٨٠٥) |
| ٩ | (١٩٣٢) | (٢٠٦) | (٥٥٠) |
| ١٠ | (١٩٣٣) | (-) | (-) |
| ١١ | (١٩٣٤) | (٣٢١) | (٣٦٢) |

٣. مس:

"مس لەناوچەیەکی وەکو (کفری) هەیە لە شێوەی کاربۆناتی (مس)وە تێکەڵاوبە بەردی کانزایی و خوێ"[٦٥]. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت تا ئێستا لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی لێ وەرنەگیراوەو بەکارنەهاتووە بەدواداگەڕان نەکراوە بەشێوەیەکی فراوان لەسەرتاپای ناوچەکانی کەرکوك چونکە بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ڕێژەیەکی زۆر هەیە چونکە کەرەستەیەکی زۆر لەناوچەکانی (نوزی)و (کووڕوخانی)دا دۆزراوەتەوە کە لە (مس) دروستکراوە. هۆی زیاتر ئەوەی وای کردووە بەدوایدا نەگەڕێن، ڕێژەیەکی کەمەو تێکەڵاوە بە خۆڵ کە پێویستی بە توانایەکی چاك و دڵسۆزانە هەیە بۆدەرهێنانی. لەم سەردەمەی ئێستاماندا دەتوانین بە نەبوونی دابنێین لەبەرئەوەی بوونی نییە بە هیچ جۆرێك.

٤. خەڵوزی بەردین:

لەناوچەکانی (قەرەتەپە)[٦٦] و (کفری)[٦٧] و (ناحیەی شێروانە)[٦٨] هەیە. "لە ناوچەی (کفری) لەدێی (ناساڵح) دەردەهێنرێت بەرهەمی ساڵانەی کاریان بەرلەشەڕی جیهانی یەکەم وکاتی ئەوشەڕە هەزار تەن دەبوو"[٦٩]. مامۆستا موکەڕەم بەم شێوەیە باسی ڕابردووی دەرهێنانی دەکاتەوە:
"کانە بەردینەکانی کفری بڵاوبووەتەوە لەدەوری چەند میلێك لە ڕۆژهەڵاتی شارەکە لە گردەکانی (ناساڵح) لەشێوەی تووننێلی تەسك وقووڵ کە تێدا کرێکاری نەشارەزا کاریان لێدەکرد بەکەرەستەی سەرەتایی وسادەو هەروەها نەبوونی هونەرییانە خەڵوزەکە دەردەهێنن بەسەبەتەی بچووك بچووك کۆی دەکەنەوە لە شوێنێك تا بیگوێزنەوە بۆ شارە نزیکەکان و

بەکاربهێنرێت بۆ گەرم کردنەوەو گەرماو سووتاندنی گۆزەکاریی و گەچ و شتی تر.

لە شەڕی جیهانی یەکەم ئەڵمانەکان بایەخیان دەدا بە فراوان کردنی چاڵە غەڵووزەکان بۆ سوود وەرگرتن لە خەڵوزەکەی بۆ ڕێکردنی شەمەندەفەرو پاپۆڕەکانیان بەرامبەر بەدانی کرێیەکی کەم بۆ کرێکارەکان گەلێك جار بووەتە هۆی مردنیان و ناشتنیان لەژێر چاڵەکانداو کەس خۆی ناکاتە بەرپرس، بۆ بەدوادا گەڕانی لاشەکانیان، هاوڕێکانیان ئەوەندە بایەخیان نادا بەم جۆرە ڕووداوانە لە ڕۆژی ڕوودانی ئەم کارەساتانە بۆیە دەرهێنانێکی کەم لەم خەڵوزە بوو بەفیرۆدانی ژمارەیەکی زۆری خوێنی کرێکاران"[٧٠].

### ٥. قیر:

"ئەمەش لە نزیك شاری کفری دا هەبووە بەلام بەکارهێنانی بەشێوەیەکی فراوان بەکارنەهاتووە"[٧١]. لەڕابردوودا ڕێژەیەکی چاك هەبووە لە ناوچەکە بەتایبەتی لەسەردەمی (بابلی) و (ئاشووری)یەکان تەنانەت لێی زیاد بووەو نێردراوەتە دەرەوەی (کەرکوك) بۆ لکاندن و ڕێژکردنی لە ئاوەڕۆی ناو خانووبەەردا.

### ٦. کبریت:

لە ناحیەی (قەرەتەپە)[٧٢] و (کفری)[٧٣] هەروەها لە ناوچە نەوتییەکان بەڕێژەیەکی زۆر لەگەڵ نەوتەکەدا تێکەڵاوە.

### ٧. بەردی سپی و بەردی سوور:

"زۆری خەڵکی کەرکوك بەکاری دەهێنن لەدروستکردنی خانووبەرەدا لە ڕابردوو کە بەبەردی چیایی بەناوبانگە، لەزۆر شوێنی ناوچەکەدا هەیە وەکو ناوچەی (لەیلان) و (داقوق) و مەعدەنەکانی (پەنجا عەلی) و (حەسەن ئاوا) و (سێ کانیان) و (دێی شۆڕاو) و دەوروبەری کەرکوك، بەردی دێی ژاژ لە (قادر کەرەم) بەردەکەی سوورە، هەروەها بەردی سپی لە (خورماتوو) و چیای (حەمرین) و (کفری) و (شێراوە)یش هەیە"[٧٤].

### ٨. بەردی مەڕمەڕو چەمەنتۆ:

ئەمەش بەڕێژەیەکی زۆر لە شارەکەدا دەبینرێت و بەچنگ دەکەوێت بەڵام تا ئێستا لەلایەن بواری ئابوورییەوە بەکار نەهاتووەو بایەخی پێ نەدراوە. "لە ساڵی هەزارو نۆسەدو پەنجاوییەك چەند سەرمایەدارێکی عێراق کۆمپانیاو کارگەیان بەوێنەیەکی تازەو مۆدێرن لە بناری کێوی (دەربەن تاڵە) بۆ دەرهێنانی بەردی چیمەنتۆ دامەزراندوە لە ئێستگەی (سلێمان بەگەوە)، ڕێگای ئاسنیان ڕاکێشابوو بۆ کارگەکەیان هەروەها بەسەتڵی کارەبا بەردو شتومەکیان لە کارگەوە ئەگەیاندە وێستگەی (سلێمان بەگ) نزیکەی هەزارکارگەو کارمەندو ئەندازیارو لێخوڕی خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەملاوئەولا کاری لێ ئەکرد بەڵام دوای ماوەیەك ناکۆکی لە بەینی بەشدارەکانی کۆمپانیاکە پەیدابوو کارگەو کۆمپانیایان تێکدا"[٧٥]. بۆیە دەبینین گەلێك ناوچەی هەیە کەبەردی چیمەنتۆی لێ هەیە بەڵام بەڕێژەیەکی کەمەو ئەو توانایەی نییە لە ڕووی ئابوورییەوە وەکو ناوچەکانی (سلێمانی).

### ٩. جیر:

"لەناوچەی (قەرەتەپە) و (کفری) هەیە"[٧٦]، بەڵام لەوانەیە لە زۆر شوێنی تردا بەرچاوبکەوێت، تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە هەڵکۆڵین و بەدواداگەڕان نەکراوە.

### ١٠. گەچ:

بەڕێژەیەکی زۆر لەشاری (کەرکوك)دا بەرهەم دەهێنرێت بەتایبەتی لەوشوێنانەی بەردی سپی لێ دەردەهێنرێت کە کان و مەعدەنێکی زۆر لەدەوروبەری (کەرکوك) و (کفری) و (قەرەتەپە) و (شێروانە) و (لەیلان) بەرچاو دەکەوێت. مامۆستا موکەڕەم تاڵەبانی بەم شێوەیە باسی ڕابردووی دەرهێنانی گەچ و بەرد دەکات لە کفری دا:

"لەو لووتکانە کەوتوونەتە سەرووی شاری کفرییەوە هەست دەکرێت بە دەنگی تەقینەوەی باروود لەژێر بەردەکاندا بۆ هەڵتەکاندنی تاشە بەردەکانی کەبەکار دەهێنرێت بۆ خانووبەرە، ئەو مەکینە بەرد هاراوانە شەوو ڕۆژ ئیش دەکەن بۆ هێنانی بەرد لەگەڵ (کلس)، هێزی لاوانیش هیچ شتێکیان نەدیوە لە ژیان تەنها ئەو دەورە بێزارانە نەبێت کە هەر کۆتایی نایەت و هیچ شتێك نابینین لە شوێنەواری ژیان تەنها ئەو بارانە نەبێت بۆ گواستنەوە لەسەر بارهەڵگرەکان بریتییە لە گەچ وبەردو دابەشکردنی بەسەر گەڕەك و کوچەکانی شاردا"[٧٧].

### ١١. ئاوی کانزایی (مەعدەنی)، گەڕاو:

ئەمە لە زۆر شوێنی ناوچەکانی کەرکوکدا بەرچاو دەکەوێت و سوودی زۆری هەیە لەلادێکان وەبەکاری دەهێنن بۆ لەناودانی نەخۆشییەکانی پێست و گەڕی نموونەی ئەم ئاوی گەڕاوە (قەتال) و گەڕاوی (قەیتول).

### * بۆچوون و هەڵسەنگاندنی ئابووری ناوچەکە:

### ١. بنەڕەتی ئابوورییەکی کشتوکاڵییانە:

ئەو ئابوورییەی کە ناوچەی کەرکوك پشتی پێبەستووە ئابوورییەکی کشتوکاڵییانەیە زیاتر ئەمەش خۆی لەچەند هۆیەکی دیاری کراو دەدۆزێتەوە هەرلەسەردەمەکانی پێش مێژووەوە هەتا سەردەمەکانی ئێستامان، چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ بوونی چەند دیاردەیەك دەوریان هەیە لەسەرهەڵدانی ئەو تایبەتمەندێتییە:

* بوونی ناوچەیەکی بەپیتی کشتوکاڵی، کە دەستدەدات بۆ تۆوکردن و پەروەردەکردنی دانەوێڵەی کشتوکاڵی و پێگەیاندن و بەدەستهێنان ڕێژەیەکی زۆری کشتوکاڵی کە بتوانێت لە ڕێژەی بەکارهێنانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاد بێت و لە پێویستییەکانی خۆی بنێردرێتە دەرەوە، هەر چەند ئەو ساڵانەش نەهات بووبێت وای کردووە بەشی ژیانی خۆی بکات، ئەگەر چیش لێی نەناردبێتە دەرەوەو ئاڵوگۆڕی پێ

نەکردبێت.

* بارینی ڕێژەیەکی مامناوەندی لەباران بارین و بوونی ڕێژەیەکی گونجاو لە کانیاو وبیرو کارێز وای کردووە کشتوکاڵەکەی هەردەم جێگای پێگەیاندن و پشت بەستبێت بە مسۆگەرکردنی ئاوو باران.

* بوونی پلەی گەرمایەکی گونجاو، مام ناوەندی وا کەببێتە هۆی پێگەیاندنی دانەوێڵە کشتوکاڵییەکان، چونکە زستانەکە ناگاتە پلەیەکی وا ببێتە هۆی لەناودانی زەوییەکشتوکاڵییەکانی، هاوینەکەشی پلەیەکی گەرمای وای هەیە ببێتە هۆی پێگەیاندنی ڕێژەیەکی چاکی بەرووبوومی کشتوکاڵی.

* بوونی پیرۆزی کشتوکاڵیش لەلای خەڵکەکە دەوری سەرەکییان هەیە لەدروستبوونی بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان، سەیرکردنی کشتوکاڵ بە ئەرکێکی گرنگ، ئینجا ئەمە خۆی لە دیاردەی یەکەم گوندی کشتوکاڵی یان بۆچوونێکی ئاینی زەردەشتانەدا دەبینێتەوە، "پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە بۆ ڕاستی بۆچوونەکەمان".

* زەوییەکەی بەشێوەیەکی گشتی تەختاییی و وردە گردۆڵکەیە وەرێژەیەکی زۆر کەمی چیاو شیوو دۆڵە، ئەمەش لەگەڵ خۆیدا هۆیەکە بۆ ئەوەی کارکەر ئەرکێکی کەم بەکاربهێنێت بۆ چاککردنی زەوی کشتوکاڵی و پێگەیاندنی.

* بوونی ڕێژەیەکی چاکی سامانی ئاژەڵ کە بۆ بەکارهێنانی لەئامرازو کەرەستە کشتوکاڵییەکانداو بەکارهێنانی لە هێنان و بردنی بەرووبوومە کشتوکاڵییەکان وەکو (ئەسپ)و (بارگیر)و (گوێ درێژ).

* بوونی هاوسەنگییەکی گونجاو لەنێوان ژمارەی دانیشتووان و ڕێژەی زەوی کشتوکاڵی کە هەردوولا هاوتەریبن بۆ تەواوکردنی ئەوی تر، چونکە ژمارەیەکی دانیشوانەکەی لە بارێکی گونجاوە کە بتوانێت زەوییە کشتوکاڵییەکان بەرێوە بکات و دابەش بێتە سەر ناوچە کشتوکاڵییەکان. دەبینین ژمارەی ئەو کەسانەی کەکاردەکەن لە موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییەکان لە ساڵی (١٩٥٧-١٩٥٨) بریتییە لە (١٠٠٤٧٩) کەس لە کۆی ژمارەی دانیشتووان لە هەمان ساڵدا کە بریتییە لە (٣٨٨٨٣٩) هەزار کەس. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٥٥).

**خشتەی ژمارە (١٥٥)[٧٨]**

**ژمارەی ئەو کەسانەی کاردەکەن لە موڵکداری و یەکە کشتوکاڵییەکانی نێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٨)**

| ز | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | پیاو تەمەنیان لەسەرووی (١٤) ساڵییەوە | ئافرەت تەمەنیان لەسەرووی (١٤) ساڵییەوە | پیاو ئەوانەی تەمەنیان چواردەو کەمترە | ئافرەت ئەوانەی تەمەنیان چواردەو کەمترە | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەرکەزی قەزای کەرکوك | (١١١٩٧) | (٣٢٤) | (٢٣٥) | (٨٨) | (١١٨٤٤) |
| ٢ | ناحیەی قەرەحەسەن | (٣٨٣٢) | (١٩٨٠) | (١٣٦) | (١٠٠) | (٦٠٤٨) |
| ٣ | ناحیەی پردێ | (٣٣٩٩) | (١١٧٢) | (٣٣٢) | (٧٢) | (٤٩٧٥) |
| ٤ | ناحیەی حەویجە | (٦١٢٤) | (٢٢٤٤) | (٧٤٢) | (٥٠٢) | (٩٦١٢) |
| ٥ | ناحیەی شوان | (٣٢٤٢) | (١٨١٥) | (١٢٤٧) | (٩٦٥) | (٧٢٦٩) |
| ٦ | ناحیەی پێباز | (١٤١٣) | (١١٤١) | (١٠٨٠) | (٨٩٥) | (٤٥٢٩) |
| ٧ | ناحیەی قەرەتەپە | (٥١٨٢) | (٢٠٦٩) | (٩٠٣) | (٦٨٤) | (٨٨٣٨) |
| ٨ | ناحیەی شێروانە | (٥٠٢١) | (٥٠١١) | (٢٦٣٨) | (٢٤٠٤) | (١٥٠٧٤) |
| ٩ | مەرکەزی قەزای چەمچەماڵ | (٤٤٥١) | (٢٣٢٢) | (٦٤٥) | (١٤٨) | (٧٥٦٦) |
| ١٠ | ناحیەی ئاغجەلەر | (١٧٠٠) | (٥٦١) | (٣٢) | (٣٤) | (٢٣٢٧) |
| ١١ | ناحیەی سەنگاو | (١٦٤٥) | (٣٠٤) | (٨٠٣) | (٥٥٣) | (٣٣٠٥) |
| ١٢ | مەرکەزی قەزای خورماتوو | (٥٧٧٩) | (١٣٤٤) | (٦٢١) | (٤٦٦) | (٨٢١٠) |
| ١٣ | ناحیەی داقوق | (٢٦٥٥) | (٢٥٦٧) | (١٥١١) | (١٢٩٥) | (٨٠٢٩) |
| ١٤ | ناحیەی قادرکەرەم | (٢٦٦٤) | (٩٠) | (٩٥) | (٤) | (٢٨٥٣) |
| | کۆی گشتی | (٥٨٣٠٤) | (٢٢٩٤٥) | (١١٠٢٠) | (٨٢١٠) | (١٠٠٤٧٩) |

* بوونی گۆڕانکاری چەند ئاین و بیروڕایەکی ئاینی لە ناوچەکە وای کردووە لەبوونی پیرۆزی کشتوکاڵ وەکو ئاینی (زەردەشتی)و (حەقە)و (کاکەیی)و (مەسیحی) بۆنموونە بڵاوبوونەوەی (حەقە) لەگەڵ خۆیدا شۆڕشێکی کشتوکاڵی کۆمەڵایەتی بوو نەك تەنها لە کەرکوك بەڵکو لەسەرتاپای کوردستان کەدەنگدانەوەکەی لەکاتی خۆیدا بەدەرکەوت و هەنگاوی دڵخۆشکەر بوو ئەگەر بهاتایە بەردەوام بووایە یان مانەوەی بیروباوەڕی زەردەشتی تائێستا پیرۆزی کشتوکاڵی لە ناوچەو لادێکانی کەرکوك هێشتۆتەوەو گەشەی پێداوە لە بوونی پیرۆزی کشتوکاڵ و پێگەیاندنی. سەرهەڵدانی کاکەییەکان وەکو بیروباوەڕێکی ئاینی و چ وەکو هۆزێکی گەورە دەوریان بینیووە لە گەشەکردنی کشتوکاڵ لە لادێکانیان.

* ئەگەر سەیری شێوەی دابەشبوونی بەڕێوەبەری لادێ و گوندەکان بکەین دەبینین کۆمەڵگای لادێی خەریك بوو بەکشتوکاڵ زیاتر لە کۆمەڵگای شاری لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٨) ئەمەش بەڵگەی بوونی (١٥٠٠) گوندە راستی ئەو کۆمەڵگا کشتوکاڵییە بەدەردەخات کە لەسەر بنەڕەتی لادێ و گوندەکان بنیات نراوە. (بڕوانە خشتەی ژمارە ١٥٦، ١٥٧).

**خشتەی ژمارە (١٥٦)**

**ژمارەی دانیشتووان لە رووی شارو لادێ وە**

| ژ | ساڵەکان | کۆمەڵگای شاری نێر | کۆمەڵگای شاری مێ | کۆمەڵگای شاری کۆی گشتی | کۆمەڵگای لادێی نێر | کۆمەڵگای لادێی مێ | کۆمەڵگای لادێی کۆی گشتی | کۆی گشتی نێر | کۆی گشتی مێ | کۆی گشتی کۆی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | (١٩٤٧) | | | | | | | | | ٦٨٣٠٨[٧٩] |
| ٢ | (١٩٥٧) | ٧٩٥٣٤ | ٧٣٢٥٣ | ١٥٢٧٨٧ | ١١٨٥٧٨ | ١١٧٤٧٤ | ٢٣٦٠٥٢ | ١٩٨١١٢ | ١١٩٠٧٢٧ | ٣٨٨٨٣٩[٨٠] |
| ٣ | (١٩٥٨) | | | ١٥٣١٧٢ | | | ٢٣٥٧٤٠ | | | ٣٨٨٩١٢[٨١] |
| ٤ | (١٩٧٧) | ٢٠٠١٨٤ | ١٤٧٢٥٣ | ٣٤٧٤٣٧ | ٧٣٤٠٧ | ٧٤٥٨١ | ١٤٧٩٨٨ | ٢٧٣٥٩١ | ٢٢١٨٣٤ | ٤٩٥٤٢٥[٨٢] |
| ٥ | (١٩٨٧) | ٢٣٢١١٤ | ٢٢١١٧١ | ٤٥٣٢٨٥ | ٧٢٨٦٧ | ٧٥٠٦٧ | ١٤٧٩٣٤ | ٣٠٤٩٨١ | ٢٩٦٢٣٨ | ٦٠١٢٤٩[٨٣] |

**خشتەی ژمارە (١٥٧)[٨٤]**

| ژ | ناوچە بەڕێوەبەرییەکان | کۆمەڵگای شاری نێر | کۆمەڵگای شاری مێ | کۆمەڵگای شاری کۆ | کۆمەڵگای لادێی نێر | کۆمەڵگای لادێی مێ | کۆمەڵگای لادێی کۆ | کۆی گشتی نێر | کۆی گشتی مێ | کۆی گشتی کۆ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەزای کەرکوك | ٦٦٨٦٦ | ٦١١٧٢ | ١٢٨٠٣٨ | ٤٦٦٢٨ | ٤٧١٨٥ | ٩٣٨١٣ | ١١٣٤٩٤ | ١٠٨٣٥٧ | ٢٢١٨٥١ |
| ٢ | قەزای کفری | ٤٦٣٥ | ٤٤٨٠ | ٩١١٥ | ٢٨١٩٦ | ٢٦٨٢٤ | ٥٥٠٢٠ | ٣٢٨٣١ | ٣١٣٠٤ | ٦٤١٣٥ |
| ٣ | قەزای چەمچەماڵ | ٢١١٥ | ٢٠١٦ | ٤١٣١ | ١٥٢٩٧ | ١٤٨٧١ | ٣٠١٦٨ | ١٧٤١٢ | ١٦٨٨٧ | ٣٤٢٩٩ |
| ٤ | قەزای خورماتوو | ٥٩١٨ | ٥٥٨٥ | ١١٥٠٣ | ٢٨٤٥٧ | ٢٨٥٩٤ | ٥٧٠٥١ | ٣٤٣٧٥ | ٣٤١٧٩ | ٦٨٥٥٤ |
| کۆی گشتی | | ٧٩٥٣٤ | ٧٣٢٥٣ | ١٥٢٧٨٧ | ١١٨٥٧٨ | ١١٧٤٧٤ | ٢٣٦٠٥٢ | ١٩٨١١٢ | ١١٩٠٧٢٧ | ٣٨٨٣٩ |

بەڵام ئەگەر بەووردی سەیری خشتەکەی (١٥٦) بکەین دەبینین کە لە ساڵی (١٩٧٧)، کۆمەڵگا لادێیەکە وورده وورده کەمی کردووەتەوە لە چاو ساڵەکانی (١٩٤٧)و (١٩٥٧)دا ئەمەش خۆی لە چەند هۆیەکی گرنگ دەبینێتەوە یەکێك لەوانە:- راکێشانی ژمارەیەکی زۆر خەڵکەکە بۆ کارکردن لەشارەکان و نیش کردن لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك، بایەخ نەدان بە کشتوکاڵ لەنێوان ئەو ساڵانەدا وایکرد کە خەڵکێکی زۆر کۆچ بکەن بۆ شارەکان و بەدوادا گەرانی کاروپیشەی تر بێجگە لە کشتوکاڵی کەزیاتر هۆکارە سیاسییەکان دەوری خۆیان بینی لە فەوتاندنی ئەو کۆمەڵگایەدا ئەمەش زیاتر بایەخ دانیان بە ناوچەی (حەویجە)و پشت گوێ خستنی ناوچەکانی تر بە تایبەتی لە دوای ساڵانی (١٩٨٩)دا بەگشتی ئەم کۆمەڵگایە هەرەسی هێنا دوای کارە شوومەکەی (ئەنفال) لە ناوچەی کەرکوك هۆیەکی گرنگی تریش ئەوەیە بایەخ نەدان بوو بەلادێ و پشتگوێ خستنی هەموو هۆیەکی ژیان بۆی، وای کرد مرۆڤ بیر بکاتەوە بەرەو شار ژیانی خۆی مسۆگەربکات. چونکە بەکارهێنانی رەنجێکی زۆرو بەدەست نەهێنانی دەسکەوتێکی گەورە وایکرد کشتوکاڵ ئەو بایەخە گرنگەی نەبێت. ئەگەر سەیری کۆمەڵگای شاری و لادێ بکەین لەنێوان قەزاو ناحییەکاندا دەبینین مەرکەزی قەزای کەرکوك گەورەترین کۆمەڵگای شاری و کۆمەڵگای لادێی لە خۆگرتووە لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا لە چاو قەزاکانی تردا، (بۆ زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە ١٥٧).

**٢. كارتێكراوی هۆكارە سروشتیو سیاسییەكان بەسەر ئابووری ناوچەكە:**

ئەگەر سەیری هۆكارە سروشتییەكان بكەین دەبینی تارادەیەكی گونجاو دەوری خۆیان بینیووە لە فەوتاندنو یەك خستنی ئابووری شارەكە، چونكە شێوەی دروست بوونی ناوچەكەی وا خولقاوە كە ببێتە ژێر كارتێكردنی ئەو هۆكارە وەكو باران.. ولافاو.. بەفرو...نەخۆشی ئاژەڵی و كشتوكاڵی.. بۆ نموونە ڕوودانی هێرشی كوولە لەنێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) دەورێكی گرنگیان بینیووە لە فەوتاندنی ولەناودانی بەشێكی ئابووری گرنگی ناوچەكە، ڕوودانی تەزرەو بەفر لە چلەكاندا دەورێكی كاریگەرییان بینیووە لە ڕوودانی گرانی.

بەڵام ئەگەر سەیری هۆكارە سیاسییەكان بكەین دەبینین بووەتە كۆڵەگەی هەرەسهێنانی ئابووری شارەكە، چونكە هەوڵدراوە بارە نەتەوەییەكەی بخرێتە تای تەرازووی هەرەس هێنانی ئابووری شارەكە. شێواندنی بارە نەتەوەییەكە وای كردووە كە كۆمەڵگای ئابووری ناوچەكە بگۆڕێت وابكات زیانێكی گەورەی پێبگەیەنێت وەكو ئەوەی ڕووخاندنی لادێكانی مانای ڕووخاندنی هێزی كارەكەری جووتیارو كرێكارە كەبناغەی ئابووری شارەكەیان داگرتووە. ئەمە بەزەقی بەدەردەكەوێت لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٤٨)و (١٩٥٧-١٩٦٠)و (١٩٦٣-١٩٧٥)و (١٩٨٩-١٩٩٦) چونكە هەموو ئەم ماوانە دەوریان بینی لە هەرەسی ئابووری شارەكە. بۆ نموونە لەنێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٨) ڕێژەیەكی زۆر جووتیارو كرێكاری عەرەبیان هێنان بۆ شارەكە كە تێنەگەیشتوو لە هەموو ڕووكارێكی ئابووری، ئەمە لەگەڵ خۆیدا پێویستی بەوە دەكرد ماوەیەكی زۆر بەكاربهێنرێت بۆ فێركردنو پێگەیاندنی تا بتوانێت جێگەی بازووی جوتیارو كرێكارە كۆنەكە بگرێتەوە.. هەر ئەم دیاردەیەش وای كرد لەنێوان ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٦) جووتیاری عەرەبی ناوچەی (حەویجە) هانا بۆ جووتیارو كاركەری كورد بەرێت بۆبەڕێوە بردنی كێڵگەو بەدەستهێنانی بەرووبوومەكانی چونكە ئەو زیادكردنەی ناوچەی (حەویجە) لە ڕووی ژمارەی دانیشتووانەوە هاوسەنگ نەبوو لەگەڵ زەوی كشتوكاڵی بۆیە پەنا دەبەن بۆ ئەو جووتیارە ڕاگوێزراوانەی كە لە لادێكانیان دەركراون چونكە ئەو ئەزموونەی جوتیارو كرێكاری كورد هەیبوو زۆر جیاواز بوو لەجوتیارو كرێكاری عەرەبی هێنراو، نامۆ لە هەموو ڕووكارێكی ئابووری. ئەوەی لە كاركەرە كوردەكە ڕەچاودەكرا لە جووتیارێكی عەرەب ڕێشی پێ نەدەبرد. هەرئەمەش وای كرد لە گەلێك شوێنی ناوچەكانی وەكو (حەویجە) كە عەرەبەكە هەستێت بەدانی زەوییەكەی بۆ تۆوكردنو بەرهەم هێنا بەنیوەیی لەگەڵ جوتیارێكی كورد تابۆئەوەی هەمووكارەكانی بۆ بەڕێوەبەرێت، چونكە جووتیارە كوردەكە توانای بڕستی ئەو بەڕێوەبەردنەی زیاترە.

**٣. كەمی كەرستەو بەرووبوومی بەكارهێنراوی لە بەرووبوومە پیشەسازییەكاندا:**

بێجگە لە (نەوت) بەرچاو ناكەوێت بەرووبووی پیشەسازی تر كە ئاستێكی ئابووری گرنگی هەبێت وەكو قیر، مس، كلس، بەردی چەمەنتۆ، هەر چەندە تا ئێستا پشكنینی پێویست نەكراوە لەناوچەكەدا، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە تائێسا دەوری كاریگەری نەبینیوە لە بەرەوپێش چوونی ئابووری ناوچەكەو نەبووەتە دەسكەلایەكی گرنگی لایەنەكانی كشتوكاڵیو ئاژەڵی، یان ئەوەندە كەمە كە لەچوارچێوەی شارەكەش ناچێتە دەرەوە. ئەگەر سەیری نەوتەكە بكەین كە زۆر تایبەت مەندێتی هەیە بەڵام تەنها لەخزمەتی سیایەتەكەدا بەكارهێنراوە نەك لەخزمەتی بەرەوپێش چوونی ئابووری شارەكە.

**٤. بنەڕەتی ئابوورییەكی دەرەبەگییانە:**

لەبەرئەوەی سەردەمە یەك لەدوای یەكەكان لەسەر شێوازێكی دەرەبەگیانە حوكمیان كردووە لە ناوچەكەدا دەبینین شێوەی دروست بوونی ئابوورییەكەش لەسەر ئەو بنەڕەتە دامەزراوە وەكو بوونی دەسەلاتدارو خاوەن زەویو چەوسێنەرو زوڵم لێكراوە كاركەر لەزەوی دەسەلاتدارەكەدا كەئەمەش لەگەڵ خۆیدا دووچینی ئابووری زەوی دروستكردووە، بەردەوام بووە تاسەردەمەكانی ئێستامان. هەروەها بەهۆی شێوازی كۆمەڵایەتی ناوچەكە لەسەر بنەڕەتی هۆزایەتی هەر لەسەردەمی گۆتییەكانەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان وای كردووە ئابوورییەكەشی لەسەر بنەڕەتی ئەو شێوازە كۆمەڵایەتییە دابەشبێت. وەكو هۆزەكانی (جاف)و (كاكەیی) و (داودە)و (ساڵەیی)و (بەیات)و (جبور)و (شوان)و (هەمەوەند)و (تاڵەبان)و (حەدید)و گەلێكی تر. وا ڕێكەوتووە هۆزێك ناوچەیەكی فراوانی لەژێر دەست بووەو بەڕێوەی بردووەو لەنێوان ئەندامانی هۆزەكە زەوییەكانی دابەشكراوە، دەسەلاتدار بەسەرزەوییەكانەوە فەرمانڕەوا بووەو هەوڵی داوە لەگەڵ سیاسەتەكانی سەردەم خۆی بگونجێنێت یان بەربەرەكانی بكات. هەرئەمەش بەزەقی بەدەردەكەوێت لەسیاسەتی ئینگلیزەكان بۆ جێگیركردنی دابەش بوونی هۆزەكانو ڕاكێشانیان بەلای خۆیانەوە بۆ ئەوەی وابكات هێلێكی سیاسیو ئابووری گرنگ بۆخۆیان دروست بكەنو پەرەی پێبدەن ئەگەر لەم سەردەمەی ئێستامان سەیریكەین دەبینین هەمان شێوازی دەرەبەگایەتییەكەو هۆزایەتییەكە لەناوچەكانی (حەویجە)و (داقوق)و (خورماتوو)دا ماوە بەڵام بەشێوازێكی نوێ باو لەگەڵ سیاسەتی حكومەتداو لەسەر ئەوبنەڕەتە ئابوورییەكەیان بەڕێوە دەچێت.

**٥. هەرەس هێنانی ئابوورییەکەی و بەرەو هەنگاونانی ئابوورییەکی هەڵەشە:**

هەموو ئابووری وولاتێك چەند بنەمایەکی هەیە لەسەری بەڕێوەدەچێت و گەشەی پێدەکات بۆیە هەرەس هێنانی ئەو بنەمایانە لەگەڵ خۆیدا ئابوورییەکە تووشی فەوتاندن و هەڵەشەیی دەکات. کارەساتی (ئەنفال) تەنها کاولکردنی لادێکان، راگوێزتنی خەڵکەکەی نەبوو بەڵکو هەرەس هێنانی کۆڵەکەکانی ئابوورییەکە بوو لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و پیشە دەستییەکان، هەر ئەوکارەساتە وای کرد ناوچەکە بکەوێتە بەرتەوژمی قەیرانەکەی (١٩٩١)و لە هەموو ناوچەکان زیاتر تەوژمی ئەو دەردە راپێچێت و بنەماکانی دروستبوونی ئابووری هەرەس بهێنێت، بۆیە دەبینین ئێستا زیاتر پشت بەهێنانی کەرەستە دەبەستێت وەکو ئەوەی لەناو خۆیدا بەکاری بهێنێت، ئەمەش بەهۆی لەناودانی ئەو کەرەستەو بەرهەمانەیە لەناوچەکەی کە لەڕابردوودا هەبووە.

**٦. هەوڵدان بۆ سڕینەوەی بنەماکانی هۆزایەتی ئابووری کوردی:**

ئەمە بەزەقی بەدەردەکەوێت لەنێوان سالانی (١٩٧٥-١٩٩٥) چونکە هەردەم هەوڵدراوە ئەو شێوە دروستبووەی لادێکان وا لێبکرێت تەنها بنەرەتییەکی کۆمەلایەتی عەرەبی بۆ دروست بکرێت. لەم ساڵانەی دوایدا هەوڵیدا بەلێسەندنەوەی زەوییەکانی ئەوکوردانەی لە (لەیلان) مابوون و راگوێزتنی هەندێیان بۆخوارووی (عێراق) بۆدەست بەسەراگرتنی زەوییەکانیان و دانانی (عەرەب) بەسەرزەوییەکانەوەو هێنانی گامێشەوانێکی زۆر بۆ ناوچەکە. لەنێوان ساڵانی (١٩٩٥-١٩٩٦)دا هەوڵی گۆڕینی مۆرکی کوردایەتی (تاڵەبان)و (کاکەیی)یان داوە تابێت و ئەگەر ئەمە نەکەن زەوییەکانیان لێدەسەنرێت و رادەگوێزرێن وەکو برا لەیلانییەکان ئەمەش لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەکی زۆری کردە نەتەوەی عەرەب تابۆئەوەی رانەگوێزرێن.

**٧. هەنگاونانی شارەکە بەرەوبازرگانی:**

لەدوای سەرهەڵدانی قەیرانە ئابوورییەکەی سەر عێراق لە ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٦) وای کردکە گەلێك بنەمایی ئابووری عێراق بگۆڕێت و گەلێك لایەنی ئابووری ناوچەکان تووشی شێواندن و لەدەستدانی کەرەستە ئابوورییەکان بکات. کەرکوك وەکو ناوچەیەکی عێراق و بەش بوونی بەو دوو ناوچەوە لە رووی بەڕێوەبەرییەوە وای کرد کە بکەوێتە ناوەندی چەند ناوچەیەکی بازرگانی و ببێتە گەشەکردنی بازرگانی شوێنێکی گونجاو بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەمە بازرگانییەکان. لەبەرئەوە چەند رێگایەکی سەرەکی بازرگانی دروست بووە لەشارەکە لەوانە رێگای ئێران-سلێمانی، چەمچەماڵ-کەرکوك دووەمیان رێگای سلێمانی-کفری، کەرکوك بەغدا سێیەمیان رێگای تورکیا-موسڵ- هەولێر کەرکوك. هەموو ئەم رێگایانە بەرووبوومەکانیان لە کەرکوك ئاڵوگۆڕدەکەن و بەرەو خوارووو ناوەندی عێراق بەرێ دەکرێن هەر لە کەرکوکەوە بەرەو سنوورەکانی (ئێران)و (تورکیا) دەگوێزرێتەوە. هەر ئەمەشە بووەتە گەشەکردنی بازارەکانی لە (حەسیرەکە)و (پردێ) و(کفری) و (خورماتوو) و سەرهەڵدانی ئاڵوگۆڕە بازرگانییەکانی تێدا.

**٨. گەشە نەکردنی بازووی کرێکار:**

هەرچەندە ناوچەیەکی نەوتی گرنگە بەلام نەتوانراوە وای لێبێت (کرێکار) ببێتە هێزێکی کارکەری بەرهەمە پیشەسازییەکان و دروستبوونی بازوویەکی ئیشکەر لەشارەکاندا، بەڵکو زیاتر کەوتووەتە ژێرکارتێکردنی بارە سیاسی و دەرەبەگایەتییەکانی ناوچەکە و توانەوەی لەناو ئەو بۆچوونە چەوتانەدا. ئەمەش راستی بۆچوونەکەمانە لە شۆڕشی گاورباغی (١٩٥٩)و دەرکردنی کرێکاری کوردو راگوێزتنیان لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك بەدەردەکەوێت خۆپیشاندانی گاورباغی هەرچەندە کرێکار کردی و کرێکار لە کۆتاییدا زەرەرمەندی سەرەکی بوو، بەلام چەندلایەنێکی حیزبە سیاسییەکان دەوریان بینی و کرێکارەکان بوونە قۆچی قوربانی سیاسەتی حیزبەکان بێ ئەوەی تەنانەت مافەکانیانیش جێبەجێ بکەن. یان دەرکردنی کرێکاری کوردو هێنانی کرێکاری عەرەب لە سیاسەتی بەعەرەبکردندا هەستی تەنها حیزبێکی لێ نەهاتە وەلام و سەری گرت و ئەو بازووەی لە دروستبوونی کرێکار دروست بوو هەرەسی هێنا.

* سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١. (كوردستان و كورد)، لێکۆڵینەوەیەکی، دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملۆ، سیاسی و ئابووری.
٢. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٩٣).
٣. گۆڤاری (الثقافة الحديثة)، گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە لێکۆڵینەوە دەکات لە زانست و رۆشبیری، ژمارەی دوو، تەمموز، ١٩٥٤، جلدی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (تأريخ استثمار النفط في كركوك)، نووسینی دادوەر عەتوڵڵا تەرزی باش، لاپەرە (١٥).
٤. (رۆمانی هەڵگشان بەرەو لووتکە)، نووسینی عەبدوڵڵا سەراج، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٩، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، لاپەرە (٥).
٥. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم، لاپەرە (٢٣).
٦. (كوردستان و كورد)، دکتۆر عبدولرەحمان قاسملۆ، لاپەرە (١٩).
٧. (العراق الشمالي)، لاپەرە (١٩٣).
٨. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٤).
٩. گۆڤاری (الثقافة الحديثة)، هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٠).
١٠. (دليل مشاهير العراقية)، لاپەرە (٢٨).
١١. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٢٩).
١٢. هەمان سەرچاوە، لاپەرە (٣٠).
١٣. (گەشتێك لە كوردستان)، نووسینی عەلئوددین سوجادی، چاپخانەی (المعارف)، بەغدا، ساڵی (١٩٥٦م-١٣٧٥هـ). لاپەرە (٨٣).
١٤. گۆڤاری ((نفط العراق عام ١٩٥٣)، لاپەرە (٢-٣).
١٥. هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی (٢٠-٢١).
١٦. هەمان سەرچاوە.
١٧. گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٥٤)، لاپەرە (٢-٣).
١٨. گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٥٩)، لاپەرە (١٠).
١٩. گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٢)، لاپەرە (٦).
٢٠. گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٣).
٢١. گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٤).
٢٢. (دليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠).
٢٣. (جغرافية النفط والطاقة)، محمد ازهر سعيد السماك واخرون، بغداد، ١٩٨١، الصفحة ٦٣.
٢٤. (إقتصاديات نفط الشرق الاوسط)، شارل عيساوي ومحمد يغانه، ترجمة: حسن احمد سلمان، بغداد، ١٩٦٦، الصفحات ٣-٤.
٢٥. (مبادىء إقتصاد النفط)، محمد احمد الدوري، ليبيا، ٢٠٠٣، الصفحة ٧.
٢٦. بڕوانە:
- (جغرافية النفط والطاقة)، المصدر السابق، الصفحة ٦٦.
- (الأصول التاريخية للنفط العراقي)، عبدالحميد العلوجي وخضير عباس اللامي، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٣، الصفحة ١٧.
٢٧. بڕوانە:
- (سامانی نەوت وگازی عێراق)، بایەزید حەسەن عەبدوڵڵا: سلێمانی، ٢٠٠٨، لاپەرە ١٢.
- (دراسات في الإقتصاديات والسياسات النفطية)، صلاح نوعمان عيسى: بغداد، ١٩٨٢، الصفحة ٦.
- (دراسات عن الذهب الاسود - البترول)، عزيز حسن الخفاف، بغداد، ١٩٦٩، الصفحة ١٩.
٢٨. (إقتصاد النفط والسياسة النفطية اسس وتطبيقات)، محمد ازهر سعيد السماك: الموصل، ١٩٨٧، الصفحة ١٩.
٢٩. (نفط العراق، دراسة إقتصادية سياسية)، حكمت سامي سليمان، بغداد، ١٩٧٩، الصفحة ١٠.
٣٠. (النفط في حضارة وادي الرافدين)، طه باقر، مجلة (العاملون في النفط)، العدد ٣٧، اذار ١٩٦٥، الصفحات ٢-٣.
٣١.، المصدر السابق، الصفحة ٣.
٣٢. بڕوانە:
- (الأصول التاريخية للنفط العراقي)، المصدر السابق، الصفحة ١٧.
- (الازمة العالمية في البترول)، هارفي اوكونور، ترجمة: عمر المكاوي، القاهرة، ١٩٦٧، الصفحة ٣٧.
٣٣. (نەوتی كەركوك و ململانێی زەلهێزەکان)، دڵشاد عومەر عەبدولعەزیز، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك، ٢٠١١، لاپەرە ٣٢.
٣٤. (الأصول التاريخية للنفط العراقي)، المصدر السابق، الصفحة ١٨.
٣٥. (دراسات في الإقتصاديات والسياسات النفطية)، المصدر السابق، الصفحة ٦.
٣٦. (جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا)، عەبدوڵڵا غەفور، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، لاپەرە ١٣.
٣٧. Norman J.Hyne: Nontechnical Guide to Petroleum Geology، Exploration،Drilling and Production، ٢nd edition، Penn Well Corporation،Tulsa-Oklahoma-٢٠٠١،p١.
٣٨. (سامانی نەوت وگازی عێراق)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرەکانی ١٣-١٤.
٣٩. بڕوانە:
- (العراق الشمالي)، محمد هادي الدفتري، عبدالله حسن، الجزء الاول، مطبوعات النهار، بغداد، ١٩٥٨، الصفحة ١٩٤.
- (نفط العراق، دراسة إقتصادية سياسية)، المصدر السابق، الصفحة ٦٠.
- (جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٣.
٤٠. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
S.H.Longrigg:Oil in the -MiddleEast،Oxfort،London،١٩٥٥، pp.٢٨٤ ٢٨٥.

٤١. (الاسس النظرية للبحث والتنقيب عن البترول والغاز)، ا. باكيروڤ، ترجمة: سمير رياض، موسكو، د.ت، الصفحة ٢٢.

٤٢. بڕوانە:

- (سامانی نەوت وگازی عێراق)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٧.

- (جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣.

٤٣. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

-(جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٣-١٤.

- (جغرافية النفط والطاقة)، المصدر السابق، الصفحة ٦٨.

٤٤. (سامانی نەوت وگازی عێراق)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٤.

٤٥. ڕێژەی کبریتید لە نەوتدا لەنێوان (٠,١-٣٪)، هەروەهائەگەر هاتوو ڕێژەی کبریتیدی هایدرۆجین لەنەوتدا زیاتر بوو لە (٠,٠٢-٣٪) ئەوا نەوتەکە بە قورس ئاودبرێت، بەڵام ڕێژەی قیر لە نەوتی سوکدا دەکاتە (١-٢٪)، بڕوانە: تاریق کاکە ڕەش: بایەخی جیۆپۆلۆتیکی نەوتی پارێزگای کەرکوك، مەکتبەی بیروهۆشیاری (ی.ن.ك)، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٣٢.

٤٦. (المميزات الجغرافية والجيولوجية لحقول كركوك النفطية)، ازاد محمد امين النقشبندي، بحث القي في المؤتمر العلمي الثالث لجامعة صلاح الدين- اربيل المنعقد خلال الفترة ٣-١٩٩٧/٦/٤، الصفحة ٢.

٤٧. بڕوانە:

- (النفط والمعادن في العراق)، وزارة النفط والشركة النفط الوطنية والشركة العراقية للعمليات النفطية، ١٩٧٣، الصفحة ٢٤.

- (المميزات الجغرافية والجيولوجية لحقول كركوك النفطية)، المصدر السابق، الصفحة ٢.

- (البنية الجيولوجية لمنطقة كركوك)، محمد عبدالله محمد المفرجي: مجلة (بارش)، العدد (٢٩)، تموز-٢٠٠٦، اربيل، الصفحة ١٠٨.

٤٨. بڕوانە:

- شركة نفط الشمال، هيئة الحقول، قسم الحفر، وەرگیراوە لە تاریق کاکە ڕەش: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦.

- (مێژووی نەوتی کەرکوك)، فەرهاد حەمزە محەمەد، ئەکادیمیای هۆشیاری‌و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی، ٢٠١٢، لاپەڕە ٣٢.

٤٩. (النفط والمعادن في العراق)، وزارة النفط والشركة النفط الوطنية والشركة العراقية للعمليات النفطية، ١٩٧٣، الصفحة ٣٠، وەرگیراوە لە تاریق کاکە ڕەش: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٤٨-٤٩.

٥٠. (مێژووی نەوتی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٣

٥١. بڕوانە:

- (المميزات الجغرافية والجيولوجية لحقول كركوك النفطية)، ازاد محمد امين النقشبندي، الصفحه ٢.

- (البنية الجيولوجية لمنطقة كركوك)، محمد عبدالله محمد المفرجي، الصفحة ١١٠.

٥٢. (مێژووی نەوتی کەرکوك)، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٣٤.

٥٣. بڕوانە:

- (البنية الجيولوجية لمنطقة كركوك)، المصدر السابق، الصفحة ١٠٩.

- تاریق کاکە ڕەش: سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی ٥٢-٥٣.

٥٤. سوود وەرگیراوە لە هەندێك زانیاری لە خشتەی (ژ١)و (ژ ٢) لە تاریق کاکە ڕەش: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٥-٥٧.

٥٥. کۆمپانیای نەوتی باکوور، دەزگای کێڵگەکان، بەشی ئەندازیاری نەوت، ئامار، وەرگیراوە بە دەستکارییەوە لە تاریق کاکە ڕەش: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

٥٦. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (١٩٦).

٥٧. هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (١٩٧).

٥٨. هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (١٩٨).

٥٩. هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (٢٠٥).

٦٠. هەمان سەرچاوەی لاپەڕە (٢٠٥).

٦١. گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە ١٣٦، ١٩٩٥. لاپەڕە (٤١).

٦٢. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٢٩٣).

٦٣. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٢).

٦٤. (دليل العراق الرسمي)، لاپەڕە (٧٥٣).

٦٥. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، لاپەڕە (٢٣).

٦٦. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٢٩٣).

٦٧. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٢٨٧).

٦٨. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٣٠٣).

٦٩. (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، د.کەمال مەزهەر، بەشی یەکەم، چاپخانەی (الاديب البغدادية)، بەغدا، ١٩٨٥ لاپەڕەکانی (٢٣٦-٢٣٧).

٧٠. (ابراهيم خان ثائر من كوردستان)، موکەرەم تاڵەبانی، چاپخانەی (اسعد)، بەغدا، ١٩٧١، لاپەڕەکانی (٨-٩).

٧١. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٣).

٧٢. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٢٩٣).

٧٣. (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٣).

٧٤. ئەم زانیارییانەم لە سەید حەمید محەمەد ئینجە وەرگرتووە.

٧٥. گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٣٦)، ١٩٩٥.لاپەڕە (٤١).

٧٦. (العراق الشمالي)، لاپەڕە (٢٩٣).

٧٧. (ابراهم خان ثائر من كوردستان)، لاپەڕە (٨-٩).

٧٨. مجموعة الاحصائية (١٩٥٨-١٩٥٩)، لاپەڕە (١٤١).

٧٩. (مجموعة الاحصائية ١٩٤٧).

٨٠. (مجموعة الاحصائية ١٩٥٧).

٨١. (مجموعة الاحصائية ١٩٥٨).

٨٢. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٧٨).

٨٣. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٧).

٨٤. (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٨-١٩٨٩).

* سەرچاوەکان بەشێوەیەکی گشتی...

* سەرچاوەکان بەزمانی عەرەبی:
* (حضارة العراق)، بەرگی دووەم، ساڵی ١٩٨٥ بەغدا، نووسینی کۆمەڵێك نووسەر.
* (العراق القديم)، نووسینی جۆرج ڕۆ، ساڵی ١٩٨٤ بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی عێراقی، وەرگێڕانی حوسێنی عەلوان حوسێن، پێداچوونەوەی دکتۆر فازڵ عەبدولواحید عەلی، چاپخانەی (دار الحرية)، بەغدا.
* (اثار بلاد الرافدين)، نووسینی سیتون لوید، وەرگێڕانی دکتۆر سامی سەعید ئەلئەحمەد، بڵاوکردنەوە (دار الرشيد للنشر)، ساڵی ١٩٨٠، چاپخانەی (دار الطليعة للطباعة والنشر)، بەیروت.
* (تأريخ حضارة وادي الرافدين، في ضوء مشاري الري والزراعة والمكتشفات الاثارية والمصادر التاريخية)، نووسینی ئەندازیار دکتۆر ئەحمەد سووسە، بەرگی یەکەم، بڵاوکردنەوەی (دار الحرية للطباعة)، بەغدا.
* هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی دووەم، هەمان نووسەر.
* (تاريخ الشرق الادنى القديم – ايران والاناضول)، نووسینی دکتۆر سامی سەعید ئەلئەحمەد، وڕەزا جەواد ئەلهاشمی، (وزارة التعليم العالي والبحث العلمي).
* (حضارة العراق واثاره)، نووسینی نیکۆلاس بوستنیت، ساڵی ١٩٩١، بەغدا، بڵاوکراوەی (دار المامون).
* (مقدم في تاريخ الحضارات القديمة)، بەرگی یەکەم، تاها باقر.
* (العراق القديم، دراسة تحليلية لأحواله الإقتصادية والاجتماعية)، نووسینی کۆمەڵێك لە زانایان ئاسەوار لە سۆڤێت، وەرگێڕانی سەلیم تاها ئەلتکریتی، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری ساڵی ١٩٧٦، بەغدا، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (القاموس العلمي، عەرەبی – کوردی)، نووسینی کەمال جەلال غەریب، بەرگی یەکەم.
* (القاموس العلمي، عەرەبی – کوردی – ئینگلیزی)، نووسینی کەمال جەلال غەریب، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، بەغدا ساڵی ١٩٧٩، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراقی.
* (القاموس العلمي، عەرەبی – کوردی – ئینگلیزی)، نووسینی کەمال جەلال غەریب، بەرگی سێیەم.
* (كنوز من العراق من العصور القديمه حتى الاسلام)، مۆزەخانەی (ڕواتشتراوخ یوست) لە شاری (کۆلۆنیا)، لە (٢٧)ی حوزیران هەتا (٢٠)ی ئەیلول، ساڵی ١٩٦٤.
* (حياة اليومية في بلاد بابل وآشور)، نووسینی (جۆرج کونیتنو) وەرگێڕانی، سەلیم تاها ئەلتکریتی و بورهان عەبد، ساڵی ١٩٧٩، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، بەغداد.
* (المرشد الى مواطن الآثار والحضارة)، نووسینی فوئاد سەفەرو تاها باقی، گەشتی پێنجەم.

* (بلاد مابين النهرين)، نووسینی لیوا و نیهایمە وەرگێڕانی سەعدی فەزوڵڵا.
* (تأريخ من العمارة العراقية عبر العصور)، نووسینی شەریف ئەلرەئس.
* (تجارة العراق قديماً وحديثاً، بحث تاريخي إقتصادي)، نووسینی ڕزقوڵڵا غەنیمە، چاپی یەکەم، چاپخانەی (العراق)، بەغدا، ساڵی (١٩٥٢) – (١٣٤١هـ).
* (العراق في التاريخ)، نووسینی کۆمەڵێك نووسەری عێراقی، ساڵی ١٩٨٣، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (حضارة العراق)، بەرگی پێنجەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەر ساڵی ١٩٨٥، بەغدا.
* (العراق في عهد المغول).
* (تأريخ مشكلة الأراضي في العراق ١٩١٤ – ١٩٣٢)، نووسینی عمارە ئەحمەد ئەلجواهیری) ساڵی ١٩٧٨، (وزارة الثقافة).
* (حضارة العراق)، بەرگی دەیەم، نووسینی کۆمەڵێك نووسەر بەغدا، ساڵی ١٩٨٥.
* (دليل مشاهير الألوية العراقية)، بەرگی دووەم تایبەتە بە شاری کەرکوك و سلێمانی.
* (تأريخ القوات العراقية، تاسيس الجيش العراقي)، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٨٦، بەغدا.
* (دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ساڵی ١٩٧٨.
* (تأريخ الوزارات العراقية)، نووسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، ساڵی ١٩٨٨ چاپی حەوتەم، بەرگی یەکەم.
* هەمان سەرچاوە، بەرگی دووەم.
* هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم.
* هەمان سەرچاوە، بەرگی پێنجەم.
* هەمان سەرچاوە، بەرگی حەوتەم.
* (العراق الشمالي)، نووسینی (عەبدوڵڵا حەسەن) و (محەمەد هادی) ساڵی ١٩٥٨، چاپخانەی (شفيق)، بەغدا.
* (تطور الحركة الوطنية العراقية ١٩٤١ – ١٩٥٢)، نووسینی دکتۆر ئیسماعیل ئەحمەد یاغی، (منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة)، بەغدا ١٩٥٩، چاپخانەی (الارشاد).
* (تأريخ احكام الأراضي في العراق)، نووسینی خەلیل ئیبراهیم ئەلخالدی و مەهدی محەمەد ئەلئەزدی، بەغدا، ساڵی ١٩٨٠، چاپخانەی (دار الحرية لطباعة).

بڵاوکراوە ئابوورییەکان بریتییە:
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٤٧).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٥٧ – ١٩٥٨).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٥٨ – ١٩٥٩).
* (النشرة الاحصائية الزراعية لعام ١٩٦٠)، (وزارة الزراعة، مديرية الزراعة العامة، قسم الإقتصاد الزراعي).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٧٨).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٧٩).

* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨١).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٢).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٤).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٧).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٨٨ – ١٩٨٩).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٩١).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٩٢).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٩٣).
* (مجموعة الاحصائية لسنة ١٩٩٤).
* (الاكراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية)، نووسینی دکتۆر شاکر خەسباك، چاپخانەی (شەفیق)، بەغدا، ساڵی ١٩٧٢.
* (انتاج واستهلاك الحنطة في العراق ١٩٥٠ – ١٩٨٠)، نووسینی سەنا عەبدوڵلا ئەلعومەری، ساڵی ١٩٨٠، بەغدا، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (العراق قديماً وحديثاً)، نووسینی عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی، چاپی حەوتەم، (١٩٨٢م – ١٤٠٢هـ)، بەغدا، بڵاوکراوەکانی (دار اليقظة العربية)، چاپخانەی (دار الكتب بيروت)، لوبنان.
* (ابراهيم خان ثائر من كردستان)، نووسینی موکەرەم تاڵەبانی، بەغدا، ساڵی ١٩٧١، چاپخانەی (ئەسعەد).
* (الطبقة العاملة العراقية، التكوّن وبدايات التحرّك)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، (دار الرشيد للنشر)، ١٩٨١، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (ماذا؟ في كركوك)، نووسینی فەهمی عەرب ئاغاو فازڵ محەمەد مەلا مستەفا ساڵی (١٩٥٧ – ١٩٧٧).
* (جغرافية العراق الثانوية)، نووسینی ئەلزەعیم تاها ئەلهاشمی، چاپخانەی (دار السلام)، بەغدا، ساڵی (١٩٢٩ – ١٣٤٨).
* دليل الجمهورية العراقية لسنة ١٩٦٠، لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنی ژیانی عێراقە کە ساڵ بە ساڵ دەردەچوو.

* سەرچاوەکان بەزمانی ئینگلیزی:
* (قەڵای کەرکوك)، نووسینی دلێر هیدایەت، وەرگرتنی نامەی ماجستێر لە زانکۆی بەغدا، ساڵی ١٩٧٥، ناونیشانەکەی بەزمانی ئینگلیزی:
conseruation of an Historic taun The Qala'a"
"of Kirkuk

هەروەها بروانە سەرچاوەیەکی تر بەزمانی ئینگلیزی دەستنووسەکانی نوزی و عەرەفە لە مۆزەخانەی عێراق نووسینی (ایرنست لخمان Ernest R.lacheman )
TaBlits from Arraphe and Nuzi in the Iraq"
" Musuum

* سەرچاوەکان بە زمانی کوردی:
* (ئاین و باوەر لە کوردستاندا)، نووسینی گەریدە کەریم زەند، ساڵی ١٩٧١، سلێمانی، چاپخانەی (کامەران).
* (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری)، نووسینی دکتۆر جەمال رەشید ئەحمەد، دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ساڵی ١٩٨٨، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠)، یان (شۆڕشی برایم خانی دڵۆ لە بنج و بناوان و لق و پۆپەوە)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٥، بەغدا، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (بیرەوەرییەکانی ژیانم)، نووسینی مستەفا نەریمان، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ساڵی ١٩٩٤، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (ئاوردانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە)، نووسینی مستەفا عەسکەری، پیاچوونەوەی محەمەدی مەلا کەریم، دووپاشەبەند مامۆستا هەمزە عبدوڵلاو دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول، بەغدا، ساڵی ١٩٨٣، چاپخانەی (عەلا).
* (کوردستان و کورد)، لێکۆڵینەوەی سیاسی و ئابووری، نووسینی دکتۆر عەبدلرەحمان قاسملۆ.
* (شاری سلێمانی)، نووسین و کۆکردنەوەی ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی رەشە، بەرگی یەکەم، پێداچوونەوە و پێشەکی دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٢، چاپخانەی (دار الحرية للطباعة)، چاپی یەکەم. رۆمانی (هەڵکشان بە لووتکە)، نووسینی عبدوڵلا سەراج دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٩ چاپخانەی (دار الحرية للطباعة).
* (گەشتێك لە کوردستان)، نووسینی عەلائوددین سوجادی، چاپخانەی (مەعارف)، بەغدا، ساڵی (١٩٥٦م – ١٣٧٥هـ).
* (چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر، بەشی یەکەم، چاپخانەی (الاديب البغدادي)، بەغداد، ١٩٨٥.
* (مێژووی نەتەوەی کورد)، نووسینی دکتۆر کاویس قەفتان.
* (یاداشت)، نووسینی رەفیق حیلمی، بەرگی یەکەم.

* گۆڤارو رۆژنامەکان بەزمانی کورد ی و عەرەبی:
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٧٠)، کانونی یەکەم، ١٩٨٨ ساڵی حەوتەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (کوردستان کمهد حضارة العصر الحجري الحديث)، بەشی دووەم وکۆتایی، نووسینی عەبدولفەتاح عەلی یەحیا.
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە ١٣، تشرینی یەکەم، ساڵی ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (من مواقع الاثرية في كردستان بەردەبەلەکە)، نووسینی کەمال نووری مەعرووف.
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٦)، کانوونی دووەم، ساڵی دووەم، ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (من مواقع الاثرية في كردستان، نووسینی کەمال نووری مەعرووف.

* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٦٢)، ساڵی ١٩٨٨، کانوونی دووەم و شوبات، لێکۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی (سۆمەرییەکان ئاری بوون)، نووسینی دکتۆرە پاکیزە ڕەفیق حیلمی.
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٢١)، ساڵی دووەم، حوزیران ساڵی ١٩٨٤، لێکۆڵینەوەیەك ناونیشانی (مملکه خبازی)، نووسینی دکتۆر فەوزی ڕەشید.
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٦٣)، ساڵی ١٩٨٨، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (کۆنترین نەخشەی جوگرافی لە (نوزی)یەوە)، نووسینی فازڵ قەرەداغی.
* گۆڤاری (کاروان)، ژمارە(١٥)، کانوونی یەکەم، ساڵی دووەم ١٩٨٣، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (مەسەلەیەکی مەزنو هەولێکی کەم)، نووسینی ڕەشید محەمەد عەلی.

* **گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ:**
* گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١١٤)، ساڵی ١٩٨٧، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (کوردستان لەدوا دوای چاخی سەهۆڵبەندانەکەی)، نووسینی فوئاد حەمە ڕەشید، مەریەم عەزیز.
* گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٣٧)، ساڵی ١٩٩٦، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (کشتوکاڵ لە عێراقی کۆن)، نووسینی نەژاد عەزیز سورمێ.
* گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە ٥٥و ٥٦، کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٧٦، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (یەکەمین لانکەی ڕەسەنترین شارستانیەت)، نووسینی ڕەزا شوان.
* گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٣٦)، ساڵی ١٩٩٥، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (ئاورێك لەشاری دووز خورماتوو)، نووسینی حەمەد سەعید جاف.

* **گۆڤاری زانیاری:**
* گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٣) ساڵی (١)، چاپخانەی دار السلام، بەغدا، ساڵی ١٩٧١، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (مێژووی زەوی لە کوردستانا)، نووسینی مستەفا مەجید، بەشی دووەم.
* گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٨)، ساڵی ١٩٧١، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (لێدوانێکی یاسایی دەربارەی یاسای نوێی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ)، نووسینی فایق هۆشیار.
* گۆڤاری (زانیاری)، ژمارە (٦)، ئۆکتۆبەر، ساڵی ١٩٧٣، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (دەربارەی چارەسەرکردنی کشتوکاڵ)، نووسینی محەمەد عەقراوی.

* **گۆڤاری سۆمەر:**
* گۆڤاری (سۆمەر)، بەرگی یەکەم و دووەم، جلدی بیست و نۆهەم، ساڵی ١٩٧٣.
* گۆڤاری (سۆمەر)، بەرگی یەکەم و دووەم، جلدی سی و سێیەم، ساڵی ١٩٧٧.
* **گۆڤاری کۆڕی زانیاری:**
* گۆڤاری (کۆڕی زانیاری عێراق)، دەستەی کورد، بەرگی بیست و سێیەم و چوارەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق ساڵی ١٩٩٢، بەغدا.
* گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کوردی)، جلدی سێیەم، ژمارە (٢)، چاپخانە کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، ساڵی ١٩٧٥.

* **گۆڤاری ڕەنگین:**
* گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (٥١)، ساڵی ١٩٩٣، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (کانیاو لە ژیانی کوردەواریدا)، نووسینی ناهیدە جەمال تاڵەبانی.

* **گۆڤاری پاشکۆی شۆڕشی کشتوکاڵی:**
* گۆڤاری پاشکۆی (شۆڕشی کشتوکاڵی)، ژمارە (١)، ساڵی یەکەم، کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٨، لێکۆڵینەوەیەك ناونیشانی (دەشتی کەرکوك لە دێمە ڕۆ ووە بۆ ئاوی)، نووسینی دکتۆر مەکەرەم جەمال.

* **گۆڤاری آفاق عربية:**
* گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٧) ئادار ١٩٨٣ ساڵی هەشتەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (العراق في سنوات الازمة الإقتصادية العالمية ١٩٢٩ - ١٩٣٣)، نووسینی دکتۆر کەمال مەزهەر.
* گۆڤاری (آفاق عربية)، ژمارە (٤)، ساڵی سیانزەهەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (قراءة في عصور ماقبل التاريخ في العراق القديم)، نووسینی ئەکرەم محەمەد عەبد کسار.

* **گۆڤاری النفط والتنمية:**
* گۆڤاری (النفط والتنمية)، ژمارە پێنج، ئەیلول تشرینی یەکەم، ساڵی نۆیەم، ١٩٨٤.
* **گۆڤاری الثقافة الحديثة:**
* گۆڤاری (الثقافة الحديثة)، ژمارە دوو، تەمموز، ١٩٥٤، جلدی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (تاريخ استثمار النفط في كركوك)، نووسینی دادوەر عەتەڵڵا تەرزی باشی.

* **گۆڤاری نفط العراق:**
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٥٣).
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٥٤).
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٥٩).
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٢).
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٣).
* گۆڤاری (نفط العراق عام ١٩٦٤).

* ئابووری نەوت لە کەرکوك:

فەیسەڵ عەلی

پارێزگای کەرکوك گرنگترین پارێزگاکانی ویلایەتی موسڵە. ئەم پارێزگایە دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ٣٤،٤٨ - ٣٥،٤٩ لە باکوورو هەردوو هێڵی درێژی ٤٣،٢٧ - ٤٠،٤٥ لە خۆرهەلات، رووبەرەکەشی (١٩٥٤٣ کلم)ی دووجایە[١]، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی بچووك‌و زێی سیروان‌و بەرزاییەکانی حەمرین‌و چیاکانی قەرەداغ‌و سەگرمەو بازیان.

* زێ:

١- زێی بچووك:
سەرچاوەی ئاوپێدانی ئەم زێیە دەکەوێتە بەرزاییەکانی خۆرئاوای ئێران‌و ناوچەکانی باکووری خۆرهەلاتی زنجیرە چیای قەندیل کە بەرزاییەکەی ٣٤٥٢ مەترە، لەسەر رووی دەریاوە، لە باشووری شاری شەرگاتەوە دەرژێتە رووباری دیجلەوە. درێژی ئەم زێیە (٤٠٠ کلم)ە، رووبەری حەوزەکەی ٢٢٢٥٠ کلم دووجایە، کە ١٧٦٦٠ کلم دووجای لە خاکی کوردستانی عێراقدایە ساڵانە ٩٩،٦ ملیار مەتر سێ جا لە ساڵێکدا برە ئاوەکەیەتی[٢].

٢- زێی سیروان:
حەوزی ئەم زێیە دەکەوێتە نێوان هەردوو بازنەی پانی (٣٣،١٣ - ٣٥،٥٠)ی باکوورو هێڵی درێژی (٤٤،٣٠ - ٤٧،٥٠)ی خۆرهەلات‌و کۆی رووبەری حەوزەکەی ١٨٩٦ کلم دووجایە[٣]. درێژی زێی سیروان تا دەرژێتە رووباری دیجلەوە (٣٨٦ کلم)ە.
هەردوو بەنداوی دەربەندیخان‌و حەمرینی لەسەر هەلبەستراوە. ئەم زێیە سنووری خۆرهەلاتی پارێزگای کەرکوك پێك دێنێ‌و لە قەزای خانەقینی جودا ئەکاتەوە.

٣- زێی رۆخانە:
سەرچاوەی ئاوەپێدانی ئەم زێیە چیاکانی قەرەداغ‌و سەگرمەو شوانە، ئەم زێیە لە سەرچاوەکەیەوە تا رێژگەکەی دەکەوێتە ناوچەی گردو دۆلەکانەوە، لە سێ لقی وەرزی پێك دێ، ئەوانیش رووباری (خاسە) کە پارێزگای کەرکوکی دەکەوێتە سەر، ئاووق سوو و ئاق سو، ١٥ کلم لە باشووری بەلەدەوە ئاوەسپی رۆخانە دەرژێتە رووباری دیجلەوە، رووبەری حەوزەکەی ١٠٩٨٨ کلم دووجایەو درێژییەکەی ٢٣٠ کلم[٤].

* چیا:
ناوچە شاخاوییەکانی پارێزگاکە کەوتونەتە باکووری رۆژهەلاتی‌و باشووری خۆرئاوایەوە. بەرزترینیان چیای سەرگرمەیە، کە بەرزییەکەی ١٧٢٧ مەترە، دوای ئەویش چیای بازیان دێ، کە بەرزییەکەی ١٥٤٤ مەترە، دواتریش چیای قەرەداغ دێت، کە ١٠٧٦ مەتر بەرزە، هەروەها بەرزاییەکانی حەمرینیش، کە سنووری باشووری خۆرئاوای پارێزگای کەرکوك پێك دێنێ ٤٦٥ مەتر بەرزە.

* کەش‌و هەوا:
تێکرایی کەش‌و هەوای پارێزگای کەرکوك لە باشوورییەوە تا دەگاتە باکووری‌و هەروەها لە خۆرئاوایەوە تا دەگاتە خۆرهەلاتی لە وەرزێکەوە بۆ وەرزێکی تری ساڵ جیاوازی زۆریان هەیە. چەند لە باشوورەوە بەرەو باکوور، لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەلات بچین، بەهۆی جیاوازی لە بەرزی زەوی لە ئاست دەریاوە، پلەی گەرما دێتە خوارێ. ئاستی بەرزیی زەوی لە ناوچەکانی خۆرئاوا ٣٠٥م لە ئاستی رووی دەریاوەیە، کەچی لە کەرکوکی خۆرهەلاتی حەویجە بەرزاییەکەی دەگاتە ٣٣١ مەتر، لە ناوچەکانی باکووریش دەگاتە هەزار مەتر[٥].
ئەم جیاوازییە لە بەرزی لە ئاستی رووی دەریاوە کاریگەریی دیاری لەسەر ئاستی باران بارینی ساڵانە لە کەرکوك دا هەیە، چونکە چەند لە باشووری خۆرئاواوە بەرەو باکووری خۆرهەلاتی بچین، رێژەی باران بارین لە ٢٠٠ ملمەوە بۆ ٦٠٠ بەرز دەبێتەوە[٦].

* پێکهاتەی جیۆلۆجیی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك:

جیۆلۆجیەکانی بواری نەوت بە چەندین تیۆری جیاجیا باس لە دیاریکردنی بنەرەت‌و چۆنیەتیی پێکهاتنی ئەم مادەیە دەکەن. گرنگترین ئەو تیۆرییانەی کە لەلایەن پسپۆرانی ئەم بوارەوە پەسەندکراوە (تیۆریی ئۆرگانیی)ە (ORGANIC THEORY) ئەم تیۆرییە بنەرەتی نەوت دەگەرێنێتەوە بۆ پاشماوەی گیانەوەری دەریایی، کە لەناوەندی دەریا فێنکەکاندا دەژیان وەك جەمبەری ئەسکا یۆریا و تۆێکلدار- قشریات‌و سەدەفیات‌و محاریات، جگە لە گیانەوەرێکی دەریایی میجهەری کە بەچاو نابینرێ، فۆرامینفرای پێ دەلێن، بە تێپەربوونی ملیۆنەها ساڵ، لەژێرکاریگەریی ملیۆنەها تەن‌و بارودۆخی گەرمایی جیاوازو پاڵەپەستۆی بێ پایانەوە، ئەم نەوتەی دروست کردووە، بوونی لە ٩٠٪ ی نەوتی جیهان بەمجۆرە لێکدەدرێتەوە.
بەم پێیە کوردستان باشترین‌و لە بارترین بارودۆخی هەیە، بەتایبەتی کە زۆربەی زەویی ئەم ناوچەیە کەوتبووە ژێر ئاوی دەریای (تسس - TETHYES) ئەمەش کێڵگەیەکی جیۆلۆجی لەبارو گرنگی بۆ دروست بوونی نەوت پێکهێنابوو. کەدەڵێی نەوت بریتی لە کەرەسەی هایدرۆکاربۆنی تێکەڵ کە لەداهێزرانی زیندەوەری ئاژەڵی یان رووەکی پێکهاتووە[٧].
واتە نەوت لەو مادە ئەندامییانە پێکهاتووە کە لە حەوزە



**تەقینەوەی یەکێك لە بیرە نەوتەکانی کەرکوك لە سالی (١٩٢٧)**





نیشتەنییە گەورە جیاجیاکاندا یان لە دەریاو شوێنەکانی تردا نیشتون لەو ناوچانە خربوونەتەوەو بەرەو ئەو شوێنانەی کە ئێستا لێی دەردەهێنرێت ڕۆیشتون، ئەمەش بەهۆی فشارو بزواتی تەکتۆنیی توێکڵی زەوی‌و هەروەها بە هۆی کاریگەریی ئاوەکانی زەوییەوە لەسەرخۆ ڕۆیشتووەو ملیۆنەها ساڵی پێچووە، بۆ ئەوەی لە چەند ساڵێکی کەمدا دەربهێنرێت‌و تەواو بکرێت[٨].

جیۆلۆجیی ناوچە نەوتییەکانی هەرێمی کوردستان بە گشتی بە پێکهاتەیەکی قۆقزیی روون لە جیۆلۆجیی ناوچە نەوتییەکانی تری عێراقی عەرەبی جودا ئەکرێتەوەو بەناوچەی کۆبونەوەش زۆری نەوت دائەنرێت، ئەو ناوچەیە بە ئاقاری باکووری خۆرئاوای پارێزگای موسڵ بۆ باشووری خۆرهەڵاتی قەزای خانەقین درێژبووەتەوە کە شێوەی هێڵێکی راستی وەرگرتووە، کێڵگە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکوکیش ناوەندی ئەو ئاکارو هێڵە راستەیان وەرگرتووە[٩]. لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێکهاتەی جیۆلۆجیی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك پێکهاتەیەکی قۆقزییە، نەوتەکەشی بۆ چاخی کرتیتاشی‌و تەنانەت بۆ ئۆلیگۆسنی دەگەڕێتەوەو ئەو کەڤرانەی کەنەوتیان لە خۆ گرتووە بۆ چاخی ئیۆسنیی‌و تەنانەت بۆ ئۆلیگۆسینی دەگەڕێنەوە کە ئەستوراییان دەگاتە ٣٠٠ مەتر[١٠].

*** گرنگترین کانە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکوك ئەمانەن:**

**١. کانگای کەرکوك - کلسی سەرەکی:**

ئەم کانگایە پێکهاتەیەکی لوتکەیی درێژی هەیە کە لە باکووری خۆرئاواوە بەرەو ئاقاری باشووری خۆرهەڵات دەچێت‌و ئەبێتە سێ لوتکە. نەوت‌وگازی ئەم کانگایە لە چینێکدایە کە بۆ سەردەمی ئالیۆسینی دەگەڕێتەوە، پانتایی ئەم کانگایەش لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەیە، بەڵام چینەکانی ئەم کانگایە بەشێوەیەکی بەربڵاو قاژقاژن.

لەم کانگایەدا تاوەکو ساڵی (١٩٦٩) (١٨٢) بیر لێدراون، پاشان هەندێکیان داخراون، وهەندێکی تریشیان بەمەبەستی چاودێری‌و پێوانەکردن بەکارهێنراون. زۆربەی بیرەکانیش نەوت، گازیان لێ بەرهەم دەهێنرێت. تێکرای بەرهەمداریی ڕۆژانەی ئەم کانگایە لەنێوان (٢٠) هەزار بەرمیل بۆ (١٠٠) هەزار بەرمیل نەوتە. ڕێژەی گازی تواوە لەیەك بەرمیلی پێوانەییدا لەنێوان (١٧٠) بۆ (٢٠٠) پێ/سێ جا دەبێت. چڕیی نەوتەکەشی لەدوای جیاکردنەوەی لە گازەکەی، نزیکەی ٣٦ پلەی API دەبێت[١١].

**٢. کانگای کریتیشیی کەرکوك:**

ئەم کانگایە دەکەوێتە لوتکەی (بابا)ی باشوورەوە، چڕی نەوتەکەشی لەنێوان (٠,٧٥٠) بۆ (٠,٧٨٠)دایە، وڕێژەی گۆگردی هایدرۆجینیش لە ملیۆنێکدا ٤٠٠ بەشە[١٢].

**٣. کانگای بای حەسەن:**

ئەم کانگایە بە هاوتەریبی کانگای کەرکوك درێژ بووەتەوەو پێکهاتەکەی لە نەوتی لوتکەی بابادەچێت، بەڵام لەو قوڵترەو دوو لوتکەی تیادایە. نەوتی ئەم کانگایە تێرەو چینێکی گازی گەورەشی هەیە. ڕێژەی گازی تواوە لەیەك بەرمیلی پێوانەییدا نزیکەی ٥٧٥ پێ/سێ جا دەبێت. چڕی نەوتەکەشی لە دوای جیاکردنەوەی لە گازەکەی نزیکەی ٣٣ پلەی (API)ە، تێکرای بەرهەمداری ڕۆژانەی ئەم کانگایە نزیکەی ١٠ هەزار بەرمیل نەوتە[١٣].

**٤. کانگای کریتیشیی بای حەسەن:**

نەوتی ئەم کانگایە لە پێکهاتەی شەرانش‌و قەمچووخەی باڵا دا کۆبوەتەوە، لە قوڵی ٤٣٠٠ پێ بۆ ٥٣٠٠ پێ دایە. ئەم کانگایە بچووکە. چڕی نەوتی بەرهەمهێنراوی ئەم کانگایە لە چینی شەرانشدا (٠.٨٨٤)ە لەگەڵ ڕێژەیەك لە کبریتیدی هایدرۆجین کە نزیکەی ٣٠٠٠ بەشە لە ملیۆنێکدا. چڕی نەوتی بەرهەمهێندراو لە چینی قەمچوخەی باڵا (٠.٨٩٥) ە لەگەڵ ڕێژەیەك لە کبریتیدی هایدرۆجین کە نزیکەی ٥٠٠ بەشە لە ملیۆنێکدا[١٤].

**٥. کانگای چەمەبۆر:**

لە راستیدا ئەمە دوو کانگایە، کەچینێك لەبەردی کلسی پتەووبەردی ئەنهایدرایت لێکیان جودا دەکاتەوە. چینە باڵاکەی پێی دەگوترێ جریبی کەتا رادەیەکی مام ناوەندی کون کونە، وتوانای گەشەکردنی نزمە، بەڵام چینەکەی تری خوارەوە پێی دەگوترێ فوراتکە ڕێژەی کوندارییەکەی زۆرەو توانای گەشەکردنی مامناوەندییە. نەوتی هەردوو چینەکە تێرەو چینێکی گازی گەورەشی هەیەو ڕێژەی گازی تواوە لەیەك بەرمیلی پێوانەییدا ١٥٠ پێ/ سێ جایە. چڕی نەوتەکەشی لەدوای جیاکردنەوەی لە گازەکەی ئەکاتە ٤١/٢ پاەی API وکبریتیدی هایدرۆجینی تیادا نییە. زۆربەی بەرهەمی نەوتی ئەم کانگایە لە چینی فوراتەو تێکرای بەرهەمی ڕۆژانەی ئەم کانگایە لەنێوان ١٠ بۆ ١٣ هەزار بەرمیلدا دەبێت[١٥].

**خشتەی ژمارە (١)**
**کێڵگە نەوتییەکان عێراق[١٦]**

| ناوی کێڵگە | مێژووی دۆزینەوە | قووڵی / پێ | پلەی چڕیی نەوت API |
|---|---|---|---|
| عێنزالە | ١٩٣٩ | ....... | ٣١ |
| بای حەسەن | ١٩٥٣ | ٥,٢٠٠ – | ٣٤ |
| چەمە بۆر | ١٩٥٣ | ٦,٥٠٠ | ٣٨ |
| کەرکوك | ١٩٢٧ | ٤,٨٠٠ – | ٣٦ |
| نەفتخانە | ١٩٠٩ | ٥,٤٠٠ | ٣٦ |
| رومێلەی باکوور | ١٩٥٨ | ٥,٥٠٠ – | ٤٢,٥ |
| زوبێر | ١٩٤٩ | ١٢,٥٠٠ | ٣٤ |
| رومێلە | ١٩٥٣ | ٢,١٠٠ – | ٣٤,٢ |
| بوهمە | ١٩٥٢ | ٤,٢٠٠ | ٣٥ |
| | | ٣,٥٩٠ | ٣٠ |
| | | ١٠,٥٠٠ | |
| | | ١٠,٨٠٠ | |
| | | ٣,٩٠٠ | |

هۆکاری سەرەکیی کەمیی تێچوونی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق لە چاو دەوڵەتانی تری ناوچەکەو جیهان بۆ کەمی تێچوی بەرهەمهێنانی نەوتی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی نەوتی کێڵگەکانی پارێزگای کەرکوك دەگەڕێتەوە. بەهۆی سروشتی جیۆلۆجی ناوچەی کێڵگە نەوتییەکان‌و کەمی قوڵی بیرە نەوتییەکانی‌و بەرزی ئاستی بەرهەمدارییان، هەروەها بەهۆی بوونی نەوتێکی زۆر لەڕووبەرێکی تارادەیەك بچووکدا، لێرە جێگەی خۆیەتی ئاماژە بە توانای بەرهەمداریی کێڵگەی بابەگوڕگوڕ بدەین، لە ساڵی (١٩٧٠) کۆمپانیای نەوتی سنووورداری عێراق توانی لە ماوەی تەنیا یەك ڕۆژدا بڕی (١,٠٩٦,٤٠٠) بەرمیل نەوت لە کێڵگەی بابا گوڕگوڕدا بەرهەم بهێنێت لە ڕووبەرێکی کەمتر لە ٤٧٩ کلم چوارگۆشەدا کە لە ڕێگەی ٤٤ بیرە نەوتەوە ئەنجامدراوە[١٧].

هەروەها ئەو سروشتی جیۆلۆجیەی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوك، وای کردووە کە جۆری نەوتەکەی زۆر باش بێت‌و جیاوازبێ لە نەوتی ناوچەکانی تری عێراق، چ لە ڕووی چڕی نەوتەکەیەوە، چ لە ڕووی ڕێژەی بوونی کبریت تیایدا، هەر ئەمەش وای کردووە خواستی جیهانی لەسەر نەوتی کەرکوك بەرزتربێت لەچاو نەوتی ناوچەکانی تری عێراق. بەپێی ئاماری هەناردەی نەوتی عێراقی بۆ ساڵەکانی (١٩٦٩) تا ساڵی (١٩٧١) ئیتالیا گەورەترین هاوردەی نەوتی عێراقی بووە بەتایبەتی نەوتی کەرکوك، لەدوای ئەویش فەرەنساو هۆڵەندە دێن[١٨].

*** مێژووی دۆزینەوەی نەوت لە کەرکوك:**

هەرێمی کوردستانی عێراقی کۆنترین ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە کەسامانی نەوتی لێ دۆزرابێتەوەو لێشی دەرهێنرابێت. دەرهاوێشتەی نەوت لە هەرێمی کوردستان پێش پێنج هەزار ساڵ پێش زایینەوە زانراوە[١٩].

هەر لە کۆنەوە تا ئێستاش لەم ناوچەیەدا گازە سروشتییەکان ڕووەو ئاسمان هەڵدەچن‌و ئاگری گڕی گرتووەو خەڵکی کەرکوك لەو باوەڕەدا بوون کە ئەمە ئەو ئاگرە ئەزەلییەیە کە لە سەرجەلەی دانیالی پەیامبەر باسی لێوەکراوە. لە هەموو شتێك سەیرتر ئەوەیە ئەگەر بەنووکی پەنجەت یان بە چیلکە دارێك خاکەکەی هەڵکۆڵی دەبینی یەکسەر گڕە ئاگر دەردەچێت، خۆ ئەگەر بتەوێت بە خۆڵ بەری پێبگریت ئەوە لە شوێنێکی ترەوە دەردەچێت‌و ئەو زەوییەی کە ئەو ئاگرەی لێوە دەرئەچێت پانتاییەکەی لە چەند مەترێکی چوار گۆشە تێپەڕ ناکات‌و لە دەیەها کون گڕی ئاگر بڵێسە دەکات[٢٠].

ململانێ لەسەر نەوتی ویلایەتی موسڵ لەنێوان دەوڵەتە ئیستعمارییەکان بەهەناردنی دەستەکانی ڕووپێوکردن‌و بەدواداگەڕان دەستی پێکرد. سەرەتاکەشی بۆ ساڵی (١٨٧١) دەگەڕێتەوە، کاتێك ئەڵمانەکان دەستەیەکی پسپۆڕیان ڕەوانەی هەردوو ویلایەتی موسڵ‌و بەغدا کرد، بە مەبەستی گەڕان‌و پشکنین بەدوای نەوتدا[٢١]. دوای ئەوە بە دە ساڵ، لە ساڵی (١٨٨١)دا، تیمێکی ئەندازیاریی ئەڵمانی بۆ هەمان مەبەست ڕەوانەی شاری کەرکوك‌و دەوروبەری کرا دوای ئەوە چەند توێژینەوەیەکی جیۆلۆجییان لەسەر زەوییەکانی ئەو ناوچەیە ئەنجامدا، لە گەڕانەوەیاندا ڕاپۆرتێکیان لەو بارەیەوە پێشکەشی حکومەتەکانیان کرد، کەتیایدا هاتبوو کەرکوك‌و دەوروبەری ناوچەیەکی نەوتیەو نەوتەکەشی لەئاستی زەوی نزیکە[٢٢].

لە ساڵی (١٩٠١)دا جارێکی تر ئەڵمانەکان دەستەیەکی پسپۆڕیان ڕەوانەی ناوچەکە کردەوە بۆ ئەوەی بە کردار لە ناوچەکەدا نەوت بپشکنن. ئەوانیش هەروەکو دەستەکانی پێش خۆیان بوونی نەوتیان لە ناوچەکەدا سەلماند، بەڵام گوتیان بڕی نەوتەکە ئەوەندە نییە کە بەکەڵکی بازرگانی کردن بێت[٢٣].

هەر لەو ساڵەدا ولیەم نۆکس دارسی توانی ڕەزامەندیی شای ئێران بەدەست بهێنێت بۆ وەرگرتنی ماڤ گەڕان‌و پشکنینی نەوت لە ئێران بە ناوچەی نەفتخانەوە کە ئەوکات بەشێك بوو لە خاکی ئێران. هەر لە هەمان ساڵدا، واتە ساڵی (١٩٠١) بەهەمان شێوەی ئێراندارسی هەوڵی ئەوەیدا دەوڵەتی عوسمانی ڕازی بکات بۆ ئەوەی ماڤ گەڕان‌و پشکنینی نەوتی لە هەردوو ویلایەتی موسڵ‌و بەغداد پێ ببەخشێت، بەڵام بەهۆی بوونی دەسەڵاتی ئەڵمانەکان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا، ئەو هەوڵەی شکستی هێنا[٢٤].

لە (٥)ی ئازاری ساڵی (١٩٠٣)دا دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی ئەنادۆڵ کەبانکی ئەڵمانی خاوەنی بوو، سەبارەت بەڕاکێشانی هێڵی ئاسنینی بەرلین – بەغدا ڕێکەوتننامەیەکی مۆرکرد، کە لە مادەی (٢٢)







گواستنەوەی نەوت بە ئاژەڵ و وڵاخ بۆ شوێنی مەبەست

یدا ئەم برگەیەی خوارەوە هاتبوو کە مافی سەرمایەگوزاری کردنی هەموو چاڵە نەوتەکانی ئەمبەرو ئەوبەری ئەم هێڵی ئاسنینیە بە درێژایی (٢٠) کلم، بە کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی ئەنادۆڵ دەبەخشیٚ، بە مەرجێك کۆمپانیاکە یاساو سستەمە پەیوەندیدارەکانی ئەو رێکەوتننامەیە پیادە بکات[٢٥].

بەمەش بانکی ئەڵمانی مافی گەڕان و پشکنین بە دوای نەوتی هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدای دەستکەوت. بەڵام لە ساڵی (١٩٠٦)دا ئەو مافەی لێ وەرگیرایەوە، چونکە بەهۆی خەریکبوونی بەجێبەجێکردنی پرۆژەی راکیشانی هێڵی بەرلین – بەغدا نەیتوانی پرۆسەی گەڕان و پشکنینی نەوت دەست پێ بکات، کەدەبوو لەگەڵ وەرگرتنی ئەو مافەدا دەستی بەکارکردن بکردایە[٢٦].

ئینگلیزەکان رۆڵێکی دیارو گەورەیان لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو مافەدا هەبوو کەئەڵمانەکان لە دەڵەتی عوسمانی وەریان گرتبوو. دوای ئەوەی سوڵتانی عوسمانی بۆی دەرکەوت کە هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا نەوتی زۆری تێدایە، لە ساڵی (١٩٠٤)دا سوڵتان عەبدولحەمید رووبەرێکی فراوانی ئەو دوو ویلایەتەی کەئەگەری بوونی نەوتی زۆری تیادایە، بەفەرمانێکی سوڵتانی خستە سەر موڵکەکانی خۆی، گەڕان و پشکنینی نەوتی تیادا قەدەغە کرد، جگە لە پێدانی مافی تایبەتی سوڵتانی[٢٧].

لە گەرمەی مشتومڕو ململانێ نێوان ئینگلیزو ئەڵمانەکان، دوو هێزی تر هاتنە نێو مەیدانی ململانێ لەسەر نەوت، یەکەمیان کۆمپانیایەکی ئینگلیزی – هۆڵەندی بوو بەناوی کۆمپانیای (رۆیاڵ – دوچ شل) کە لە ساڵی (١٩٠٧)دا وەك لایەنێکی تری کێبرکێکەر بەدیارکەوت، دووەمیان لە ساڵی (١٩٠٨) بوو، کاتێك ئەمریکا توانی لە رێگەی نوێنەرەکەیان (کۆلبی میشێل چستەر) بە پشتوانی ژووری بازرگانی نیویۆرك و سەرۆکی ئەمەریکا رەزامەندی سەرەتایی سوڵتانی عوسمانی بەدەست بهێنێت بۆ گەڕان بەدوای نەوتی کوردستان، لەهەردوو دیوی هێڵی ئاسنینی نێوان موسڵ – کەرکوك بەمەش ویلایەتی موسڵ کەوتە ژێر دەستی سەرمایەگوزاریی ئەمریکایی[٢٨].

لە ساڵی (١٩١٠)دا بە سەرمایەی ئینگلیز بانکی ئەهلیی تورکی دامەزرا، کۆڵپێنکیانی ئەرمنی بە بەرێوەبەری ئەو بانکە دانرا کەدواتر ئەوانەش لە رێگەی بەرێوەبەرەکەیەوە توانیان ئیمتیازی بەشێکی گرنگی نەوتی ویلایەتی موسڵ بەدەست بهێنن[٢٩].

ئەو رەوشە کتوپڕە واتە دەرکەوتنی هێزی تازە لە گۆڕەپانی نەوتی کوردستاندا، بەریتانیاو ئەڵمانیای ناچارکرد هەڵوێستەکانیان دژ بەدەرکەوتنی دەسەڵات و سەرمایەی ئەمریکی لە ناوچەکەدا یەکبخەن، لەو هەوڵەشیاندا سەرکەوتوو بوون. لە ساڵی (١٩١١)دا هەردوو بانکی ئەڵمانی و بانکی ئەهلی – تورکی رێککەوتن و پێکەوە کۆمپانیایەکی نوێیان بەناوی کۆمپانیای ئیمتیازاتی سنووررداری ئەفەریقی و خۆرهەڵات دامەزراندا، کەدواتر ناوەکەی بۆ کۆمپانیای نەوتی تورکی گۆڕا، سەرمایەکەشی ٨٠,٠٠٠ هەشتا هەزار جونەیهی ئیسترلینی بوو وپشکەکانی بەم شێوەیە دابەش کران[٣٠]: (٢٥٪) بانکی ئەڵمانی، (٥٠٪) بانکی ئەهلی تورکی کە (١٥٪)ی بۆ کۆڵپێنکیانە، (٢٥٪) بانکی ئینگلیزی – ساکسۆنی[٣١].

لە (٢٨)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩١٤) بابی عالیی عوسمانی لەژێر فشاری بەریتانیاو ئەڵمانیا مافی گەڕان و پشکنینی نەوتی لە هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا، دا بە کۆمپانیای نەوتی تورکی، بەڵام لەگەڵ دەستپێکرنی جەنگی یەکەمی جیهاندا، کۆمپانیای ناوبراو بەهۆی بەشداریکردنی دەوڵەتی عوسمانی لە پاڵ ئەڵمانیا لەو جەنگە لە دژی هاوپەیمانان نەیتوانی کارەکانی خۆی ئەنجام بدات، لەبەر ئەوە ئەو مافی گەڕان و پشکنینەی کۆمپانیای نەوتی تورکی پشتگوێ خرا.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان و رووخان و دابەش بوونی دەوڵەتی عوسمانی و دواتر پێکهێنانی دەوڵەتی عێراق لە (٢٣)ی ئابی ساڵی (١٩٢١)، لە ساڵی (١٩٢٣)دا کۆمپانیای نەوتی تورکی داوایەکی پێشکەش بە حکومەتی عێراق کرد بۆ تازەکردنەوەی ئەو ئیمتیازەی کە لە دەوڵەتی عوسمانی وەرگرتبوو، دوای مشت و مڕێکی زۆر لەنێوان حکومەتی عێراق و بەریتانیا و کۆمپانیای نەوتی تورکی، لە (١٤)ی ئازاری ساڵی (١٩٢٥)دا حکومەتی عێراق ناچار بوو ئەو ئیمتیازەی کە وەری گرتبوو بۆ ماوەی (٧٥) ساڵ تازە بکاتەوە[٣٢].

هەروەکو عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی دەڵی حکومەتی عێراق بۆی روون بوەوە کە کۆمەڵەی گەلان رێگە بەویلایەتی موسڵ نادات کەوەك بەشێکی عێراق بمێنێتەوە ئەگەر بێتوو ئیمتیازی گەڕان و پشکنین بە کۆمپانیای نەوتی تورکی لە هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەغدا نەبەخشێ[٣٣].

لە سەرەتای ساڵی (١٩٢٧)دا کۆمپانیای نەوتی تورکی دەستی کرد بەهەڵکەندنی بیر لە ناوچەی کەرکوك، لە (١٤)ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ توانی نەوتێکی ئێجگار زۆر، کە بۆ بازرگانی کردن دەشێت، لە بابەگوڕگوڕ بدۆزێتەوە، کاتێك یەکەمین بیر تەقیەوەو نافورەی دەرپەڕی[٣٤].

لەژێر فشاری زۆری ئەمەریکادا، ناچار بوو سەرلەنوێ پشکەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی دابەش بکاتەوە بروانە نەخشەی ژمارە (٢)، دواتر لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٢٩)دا ناوی کۆمپانیاکەش گۆڕا بۆ کۆمپانیای نەوتی سنووورداری عێراق[٣٥].

**خشتەی ژمارە (٢)**
**دابەشکردنی پشکەکانی**
**کۆمپانیای نەوتی سنووورداری عێراق[٣٦]**

| ناوی کۆمپانیا | دەوڵەت | ڕێژەی بەشداری |
| --- | --- | --- |
| کۆمپانیای ئەنگلۆ فارسی | بەریتانیا | ٪ ٢٣,٧٥ |
| کۆمپانیای ڕۆیال دۆچ شل | بەریتانیا -هۆڵەندە | ٪ ٢٣,٧٥ |
| کۆمپانیای نەوتی فەرەنسی(*) | فەرەنسا | ٪ ٧٥,٢٣ |
| کۆمپانیای سەرمایەگوزاری خۆرهەڵاتی نزیك | کۆمەڵە - کۆمپانیایەکی ئەمەریکی | ٪ ٢٣,٧٥ |
| کۆمپانیای هاوکاری سەرمایە گوزاری سنووردار(**) | کۆلبنکیان | ٪ ٥ |

(*) بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەی ویلایەتی موسڵ و ڕازیکردنی فەرەنسا لەبەرامبەر دەست هەڵگرتنی لەو زەبیانەی کەبەپێ ڕێککەوتننامەی سایکس - بیکۆ لە ویلایەتی موسڵ بۆی دیاریکرابوو، پشکەکانی بانکی ئەڵمانیا بە فەرەنسا بەخشرا.
(**) کالوست سەرکیس کۆلبنکیان، خەڵکی شاری تالاسی ئەنادۆڵە، بەرەگەز ئەرمەنیە، کۆلێجی پاشایەتی بەریتانی تەواو کردووە، یەکێك بووە لە ڕاوێژکارە دڵسۆزەکانی بەریتانیا لە دەوڵەتی عوسمانیدا، لەوەزارەتی دارایی عوسمانیدا کاری کردووە، بە مستەر ٥٪ ناسراوە PERCEN M R FIVE ئەو پیاوە خزمەتێکی گەورەی بەریتانییەکانی کردووە لە بواری وەرگرتنی ماف گەڕان و پشکنینی نەوت لە عێراق. لە ساڵی (١٩٥٦)دا مردووە[٤٧].

*** پاڵاوگەی نەوتی کەرکوك:**

پیشەسازیی پاڵاوتنی نەوت قۆناغێکە لە پرۆسەی تەواوکاریی پیشەسازییەکانی نەوت، کە بە گەڕان و پشکنین و دۆزینەوەی نەوت دەستپێدەکات و بەخستنە بازاڕی بەرهەمە هەمە چەشنەکانی کۆتایی دێت. پیشەسازیی پاڵاوتنی نەوت گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە بەکاربردنی نەوت دوای پرۆسەی پاڵاوتنی نەوتی خاو دەستپێدەکات، کە چەندین بەرهەمی هەمە جۆری لێ دەردەهێنرێت. کە هەر یەك لەو بەرهەمانە شێوە بەکاربردنی تایبەتی خۆی هەیە گاز، بەنزین، نەوتی سپی، ڕۆن و.. هتد.
هەروەها پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت بە یەکێك لە بەشەکانی پیشەسازیی تەحویلی کەرتی پیشەسازییە کیمیاوەو پترۆکیمیاوییەکان دائەنرێت، کە لە چوارچێوەی ئابووری بەرهەمهێنانی فراوانە سەرمایەگوزارییەکی فرە زۆرو شارەزاییەکی هونەری پێشکەوتووی گەرەکە، جگە لە چەندین ئیعتباراتی دیکەی ئابووری هونەری[٣٨].
دامەزراندنی پاڵاوگەی نەوت، پێویستی بە چەند بنەمایەکی سەرەکی هەیە. لێرەدا ئەو بنەمایانە دەخەینە ڕوو کە بە هۆیەوە پاڵاوگەی نەوتی کەرکوك دامەزراوە[٣٩]:

**١. شوێن:**

پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت ڕووبەرێکی فراوانی زەوی پێویستە بۆ دانانی دامەزراوەکەو دروستکردنی حەوزەکانی هەڵگرتنی نەوت، هەروەها دەبێ ئەگەری فراوانکردنی پاڵاوگەو پەرەپێدانی لە ئایندەدا لەبەرچاو بگیرێت، چونکە بچووکترین کارگەی ئەو پیشەسازییە (٤٠٠) دۆنم زەوی پێویستە. دەبێت پلەی لاری زەوییەکە لە بەرچاو بگیرێت، چونکە لە شوێنێکی بەرزتر بن لە ئاست پاڵاوگەکە بۆ ئەوەی بەئاسانی نەوتی ناو ئەو حەوزانە بڕژێنە ناو یەکەکانی پاڵاوگەکە. ئەم دووربوونی هۆکارانەی سەرەوە دەبنە هۆی دووربوونی شوێنی پاڵاوگە لە ناوچەی نیشتەنییەکانییەوە. پاڵاوگەی کەرکوك کەوتووەتە باکووری شاری کەرکوکەوە لە نزیك وێستگەی هەڵدانی نەوت لە ناوەراستی دامەزراوە نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق، لەبەر ئەوە ئەم پاڵاوگەیە بۆ گەورەکردن و فراوانبوونی دووچاری کێشەی نەبوونی زەوی دەبێتەوە.

**٢. ئاو:**

پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت بەکاربەرێکی گەورەی ئاوی سازگارە، چونکە پاڵاوتنی یەك لیتر نەوتی خاو پێویستی بە (١٨) لتر ئاوی سازگارە، هەر ئەمەشە وای کردووە کە کارگەکانی پاڵاوتنی نەوت پێویستی بە ئاوی بەردەوام بێت، بۆیە پاڵاوگەی کەرکوکیش لەسەر چەمی خاسە دامەزراوە.

**٣. شوێنی فڕێدانی پاشەڕۆ:**

یەکێك لەو بنەما گرنگانەی کە دەبێ لە کاتی دیاریکردنی شوێنی دامەزراندنی پاڵاوگەی نەوتدا حسابێکی زۆر ووردی بۆ بکرێت، ئەوەیە کەدەبینین هەموو پاڵاوگە نەوتییەکانی هەرێمی کوردستان لەسەر زێیەکانن، هەرچی پاشەڕۆی پاڵاوگەکانیانە دەخرێنە ناو ئەو زێیانەی کە لەسەریان دامەزراون، بۆ ئەو مەبەستەش هەر یەکەو بۆ خۆی کەناڵیکی هەڵکەندووە بۆ گەیاندنی پاشەڕۆی پاڵاوگەکەی بۆ ناو ئەو زێیە، ئەمەش دەبێتە هۆی پیسکردنی ئاوی ئەو زێیەو زیانێکی گەورە بە خەڵکی سەر ئەو زەوییە دەگەیەنێ کە ئەو ئاوە سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەی خۆیان و مەڕو ماڵاتەکانیانە، هەروەها بەهەموو ئەو زیندەوەرانەی تیادا دەژین.

**٤. ئاراستەی با:**

پیشەسازییەکانی پاڵاوتنی نەوت لەکاتی پرۆسەی پاڵاوتنی نەوتدا بۆنێکی پیس و گازێکی ژەهراوی دەردەدەن کە لەڕێگەی بورجە بەرزەکانیانەوە فڕێ دەدرێتە دەرەوە، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە لە کاتی دیاریکردنی شوێنی دامەزراندنی ئەو پیشەسازیانەدا ئاراستەی بای ئەو ناوچەیە لەبەرچاو بگیرێت، بۆ ئەوەی خەڵکی دانیشتووانی ناوچەکەوە دەورووبەری لە ئاسەواری خراپی ئەو بۆن و گازە ژەهراویە بەدوور بن و دووچاری نەخۆشی و گرفتی تر نەبنەوە. لە



سەرەتاییەکانی دەرهێنانی نەوتی کەرکوك

عێراقدا بە گشتی دوو جۆر ئاراستەی با هەیە، یەکەمیان بە ئاراستەی باکووری خۆرئاوایەوە دووەمیشیان بە ئاراستەی باشووری خۆرهەڵاتە. پاڵاوگەی کەرکوك کەوتووەتە بەردەم ئاراستەی بای یەکەمیان، کە ئەمەش ئاسەواری خراپی لەسەر ئەتمۆسفێری ناوچەکەو دەورووبەری هەیە، لەبەرئەوە دەبێت بەردەوام ئەو بورجە بەرزەی لەو نیشتەنییە کبریتەی پاك بکرێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی تێچوونێکی تر بۆ تێچونی بەرهەمهێنان. لەبەر فەراهەمبوونی بنەماکانی دامەزراندنی پاڵاوگە لە نزیك کێڵگەی بابە گورگور.
لەساڵی (١٩٢٧) کۆمپانیای نەوتی عێراق پاڵاوگەی کەرکوکی دامەزراند بەوزەی بەرهەمهێنانی ساڵانە (١٥٠) هەزار تەن[٤٠].
لە دوای ساڵی (١٩٧٣)وە ئەو پاڵاوگەیە فراوان کرا، وزەی پاڵاوتنی بۆ زیاتر لە (١) ملیۆن تەن لە ساڵێکدا زیادی کرد. ئەم پاڵاوگەیە تا ئێستاش بەردەوامەو، توانای ڕۆژانەی ٢٧ هەزار بەرمیلە.

*** یەدەکی نەوت لە کەرکوك:**

دیاریکردنی قەبارەی یەدەکی نەوت لە هەرێمی کوردستان بەگشتی و کەرکوك بە تایبەتی کارێکی ئاسان نییە، چونکە هەر مەزەندەکردنێکی ئەو قەبارەیە دوای ماوەیەکی تر چاوی پێدا دەخشێندرێتەوە، بە هۆی دۆزینەوەی کێڵگەی نەوتی تازە لەو ناوچانە یان بە هۆی پەرەسەندنی ڕێگەو شێوازی دۆزینەوەی نەوت، یان بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای دیاریکردنی قەبارەی نەوتی ناو کێڵگە نەوتییەکان. زانینی قەبارەی یەدەکی نەوتی لەهەر ناوچەیەکی جیهاندا بووەتە مەسەلەیەکی گرنگ بۆ ئابووریناسان و سیاسییەکان، چونکە ئەو قەبارەی یەدەکی نەوتییە کاریگەری تەواوی لەسەر تەمەنی چاوەڕوانکراوی سامانی نەوت هەیە، چونکە تەمەنی چاوەڕوانکراوی نەوت بریتییە لە دابەشکردنی قەبارەی یەدەکی نەوت بەسەر تێکرای بەرهەمی ساڵانەی نەوتدا، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەزانینی قەبارەی یەدەکی نەوت ڕۆڵی سەرەکی لە دارشتنی سیاسەتی بەرهەمهێنانی نەوتی دەوڵەتانی نەوتیدا دەگێڕێت. هەرێمی کوردستان دەوڵەمەندترین ناوچەی نەوتیە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەهۆی فەراهەمبوونی هەموو هۆکارەکانی دروست بوون و خربوونەوەی تیایدا، هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا، کەرکوکیش دەوڵەمەندترین ناوچەی نەوتییە لە هەرێمی کوردستاندا.
بۆ دیاریکردنی قەبارەی یەدەکی نەوتی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی نەوتی پارێزگای کەرکوك لەبەر نەبونی سەرچاوەیەکی پسپۆڕی بێ لایەن کە قەبارەی نەوتی کەرکوك دیاری بکات بە ناچاری دەبێ پشت بەو ژمارانە ببەستین کە کۆمپانیا بیانییەکان یان ئەو ژمارانەی کە حکومەتی عێراق ئاشکرای کردوون، کە بەڕای زۆر لە پسپۆڕانی نەوت یەدەکی نەوتی کەرکوك زۆر لەو ژمارانە زیاترە کە دیاریکراون تەنیا قەبارەی نەوتی یەدەکی مسۆگەرە، جگە لەوەی کە چەندین ناوچەی تری نەوتی لە سنووری پارێزگای کەرکوکدا هەن کە هێشتا نە قەبارەی یەدەکی نەوتەکەی ئاشکرا کراوە نە هێشتا نەوتی لێ بەرهەم هێنراوە[٤١]. لێرەدا تەنیا ئەوەندە بەسە ئاماژە بە پەرسەندنی قەبارەی یەدەکی نەوتی عێراق بدەین لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٩٨٠ - ٢٠٠٠) کەنەوتی کوردستان بە تایبەتیش نەوتی پارێزگای کەرکوك بەشێکی گرنگییەتی[٤٢].

**خشتەی ژمارە (٤)**
**قەبارەی یەدەکی نەوتی عێراق**
**(١٩٨٠- ٢٠٠٠) بەملیار بەرمیل**

| ١٩٨٠ | ١٩٨٥ | ١٩٨٧ | ١٩٨٩ | ٢٠٠٠ |
|---|---|---|---|---|
| ٣١ | ٤٤,٥ | ٤٧,٥ | ١٠٠ | ١١٢ |

**خشتەی ژمارە (٥)**
**قەبارەی یەدەکی نەوتی کێڵگە نەوتییەکانی هەرێمی کوردستان[٤٣]**

| ناوی کێڵگە | ناوچەی یەدەك | ملیار بەرمیل | تێبینی |
|---|---|---|---|
| باباگورگور | کەرکوك | ١٥,٠٠ | بەرهەم هێنراو |
| بای حەسەن | کەرکوك | ٣,٥٠ | بەرهەم هێنراو |
| چەمبۆر | کەرکوك | ٠,٤٠ | بەرهەم هێنراو |
| بەخمە حەسەن | کەرکوك | ٣,٧٠ | بەرهەرم نەهێنراو |
| چەنەبۆری باکوور | کەرکوك | ٥,٩٠ | بەرهەرم نەهێنراو |
| عێنزالە | خۆرئاوای دیجلە | ٠,٨٠ | بەرهەم هێنراو |
| بەتمە | خۆرئاوای دیجلە | ٠,٠٤ | بەرهەم هێنراو |
| نەفتخانە | خانەقین | ٠,٢٣ | بەرهەم هێنراو |

*** بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك:**

(١٤)ی تەموزی ساڵی (١٩٣٤) بە سەرەتای بەرهەمهێنانی بازرگانی نەوتی کەرکوك دا دەنرێت[٤٤]. چونکە لەو کاتەدا هەردوو هێڵی لوولەی گواستنەوەی نەوتی کەرکوك تەواو بوو، کەنەوتی کەرکوکیان دەگەیاندە هەردوو بەندەری حەیفا لە فەلەستین و تەرابلس لە لوبنان. بەمەش کەرکوك بووە یەکەمین ناوچەی هەناردەی نەوت لە عێراقدا. لەبەر ئەوەی نەوتی کەرکوك بۆ بازرگانی کردنەو بازارەکانی ساغکردنەوەی بەرهەمەکەی دەکەوێتە دەرەوەی سنووری عێراق، بڕی بەرهەمهێنانی نەوتەکەی لەژێر کاریگەری خواستی جیهانییە لەسەر نەوت هەروەها ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسییانەی کە لە ناوخۆی عێراق و ناوچەکەو

جیهان ڕوونەدەن جگە لەوەی كە مەحكومی وزەی گواستنەوەی ئەو هێڵە كە لەم باسەدا هەوڵدراوە پەرەپێدانی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك بەسەر سێ ماوە دابەش بكەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١. ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٣٤ - ١٩٤٩):**

لەو ماوەیەدا بەرهەمی نەوتی كەركوك لە ڕێگەی هەردوو هێڵی لوولەی گواستنەوەی كەركوك - حەیفاو كەركوك - تەرابلس ڕەوانەی ناوەندەكانی هەناردەی جیهانی دەكرا. بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك لە ساڵانی (١٩٣٤) بۆ (١٩٣٨) بە هۆی بەرەو پێش چوونی تەكنیكی پرۆسەی بەرهەمهێنان لە ٠,٩٦ ملیۆن تەنەوە هەڵكشا بۆ ٤,١٦ ملیۆن تەن. بەڵام لە ساڵی (١٩٣٩)وە بە هۆی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانییەوە بڕی بەرهەمهێنانی داكشا بۆ ٣,١٨ ملیۆن تەنو لە ساڵی (١٩٤١) دوو هێندەی تر هاتە خوارەوە، بەهۆی بزوتنەوەی ڕەشید عالی گەیلانییەوەو گەیشتە ١,٣٨ ملیۆن تەن، بەڵام پاش ئەوە بەرەبەرە ڕووی لە هەڵكیشان كردەوە تاوەكو لە ساڵی (١٩٤٥) بڕی بەرهەمەكەی هاتەوە دۆخی جارانی پێش جەنگو گەیشتە ١,٣٤ ملیۆن تەن. هەڵكشانی بەرهەمی نەوتی كەركوك تا ساڵانی (١٩٤٧) بەردەوام بوو، بەڵام لە ساڵی (١٩٤٧) بە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلو داخستنی لوولەی نەوت گواستنەوەی كەركوك - حەیفا، بڕی بەرهەمی نەوتەكەی لە ٤,٤٠ ملیۆن تەن لە ساڵی (١٩٤٧) دابەزی بۆ ٣,١٠ ملیۆن تەن لە ساڵی (١٩٤٨)دا.

**خشتەی ژمارە (٦)**

**پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك[٤٥]**

| ساڵ | ب / باباگورگور | ساڵ | ب / باباگورگور |
|---|---|---|---|
| ١٩٣٤ | ٠.٩٦ | ١٩٤٢ | ٢.٢٩ |
| ١٩٣٥ | ٣,٥٨ | ١٩٤٣ | ٣,٣٣ |
| ١٩٣٦ | ٣,٩١ | ١٩٤٤ | ٣,٩٣ |
| ١٩٣٧ | ٤,٣ | ١٩٤٥ | ٤,٣٤ |
| ١٩٣٨ | ٤,١٦ | ١٩٤٦ | ٤,٣٩ |
| ١٩٣٩ | ٣,٨١ | ١٩٤٧ | ٤,٤٠ |
| ١٩٤٠ | ٢,٣٥ | ١٩٤٨ | ٣,١٠ |
| ١٩٤١ | ١,٣٨ | ١٩٤٩ | ٣,٧٨ |

**٢. ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٠ - ١٩٧٢):**

لەساڵی (١٩٥٠) هێڵی دووەمی كەركوك - تەرابلس تەواو بوو و كرایەوەو توانی ئەو بۆشاییە پڕ بكاتەوە كە داخستنی هێڵی كەركوك - حەیفا دروستی كردبوو، بڕی هەناردەی نەوتی كەركوكیش بۆ دوو هێندەی ساڵی (١٩٤٩) زیادی كردو گەیشتە ٦,١٦ ملیۆن تەن[٤٦]. (بڕوانە خشتەی ژمارە ٧).

لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٠) تا (١٩٧٢) چەندین گۆڕانكاری گەورەی ئابووری سیاسی ڕوویدا كە كاریگەریی دیاری لەسەر قەبارەی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك هەبوو، لەوانە:

ا. لە ساڵی (١٩٥١) بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك ڕووی لە هەڵكشان كرد، دوای ئەوەی حكومەتی د. مسەدەق نەوتی كۆمپانیا بیانییەكانی لە ئێران خۆماڵی كرد[٤٧].

ب. لە ساڵی (١٩٥٢) بەهۆی كردنەوەی هێڵی لوولەی نەوت گواستنەوەی كەركوك - بانیاس بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك بۆ ١٥,٥٥ ملیۆن تەن بەرز بۆووە[٤٨].

ج. لە ساڵی (١٩٥٣) بەهۆی دۆزینەوەی نەوت لە هەردوو ناوچەی چەمەبۆرو بای حەسەن بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك بۆ ٢٢,٨٦ ملیۆن تەن زیادی كرد[٤٩].

د. لە ساڵی (١٩٥٥) بەهۆی گرێدانی كێڵگە نەوتییەكەی چەمەبۆر بە كێڵگەی كەركوكەوە بەرهەمی نەوتی كەركوك گەیشتە ٢٤,٢٠ ملیۆن تەن.

هـ. هەروەها جگە لەو هۆكارانەی سەرەوە، زیادبوونی خواستی جیهان لەسەر نەوت بەهۆی بەكارهێنانی نەوت وەك مادەیەكی سەرەكی گرنگ لە پیشەسازییە پترۆ كیمیاوییەكاندا، كەئەمەش ڕەنگدانەوەی گەشەكردنی وزەی بەرهەمداریی پاڵاوتنی نەوتی بوو، بەهۆی زیادبوونی بەكاربردنی نەوت لە ئەوروپادا[٥٠].

و. لە ساڵی (١٩٥٦) بەهۆی شەڕی نێوان بەریتانیاو فەرەنساو ئیسرائیل لە دژی میسر، بڕی بەرهەمی نەوتی كەركوك دابەزی بۆ ٢١,٨ ملیۆن تەن.

ز. لە ساڵی (١٩٥٧) بە هۆی ناكۆكی نێوان سوریاو عێراق سەبارەت بەكرێی لوولە نەوتییەكانو داخستنی لوولە نەوتییەكانی عێراق لەلایەن سوریاوە، بڕی بەرهەمی نەوتی كەركوك دابەزی بۆ ١١,٦٥ ملیۆن تەن[٥١].

ح. لە ساڵی (١٩٥٨)و بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی كەركوك بە شێوەیەكی بەرفراوان ڕووی لە زیادبوون كرد، ئەوە بوو گەیشتە ٢٢,٦٣ ملیۆن تەن، پاشان لە ساڵی (١٩٥٩) گەیشتە ٢٧,٣٣ ملیۆن تەن، لە ساڵی (١٩٦٠) بەهۆی كردنەوەی هێڵی لوولەی نەوت گواستنەوەی كەركوك - تەرابلس بڕی بەرهەمی نەوت بۆ ٣٣,٨٤ ملیۆن تەن بەرزبووەوە[٥٢].

گ. لە ساڵانی (١٩٦١ - ١٩٦٢) ئاستی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق تا ڕادەیەك جێگیربوو هۆكاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دەرچوونی یاسای ژمارە (٨٠)ی ساڵی (١٩٦١). كەڕووبەری ٩٩,٥٪ ئەو زەوییانەی وەرگرتەوە كە كۆمپانیاكان مافی گەڕانو پشكنینیان وەرگرتبوو. بەڵام بڕیاری كۆمپانیاكان لە كەمكردنەوەو جێگیركردنی ڕادەی بەرهەمهێنان، نەوتی كەركوكی كەمتر گرتەوە، چونكە ڕێژەی زیادبوونی ساڵانەی بەرهەمی كەركوك لە چاو ساڵانی پێشوودا كەمتر بوو[٥٣].

ی. لە ساڵی (١٩٦٦) بەهۆی دروست بوونی ناكۆكی لەنێوان كۆمپانیای نەوتی عێراقو حكومەتی سوریا، بڕی هەناردەی نەوتی كەركوك زیاتر لە یەك ملیۆن تەن هاتە خوارێ[٥٤].

ك. لە ساڵی (١٩٦٧) بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی عەرەب -

ئیسرائیل هەناردەی نەوتی کەرکوك بۆ بازارەکانی جیهان بۆ ماوەیەك ڕاگیرا. بەمەش بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك لە ٤٢,٦٧ ملیۆن تەنەوە دابەزی بۆ ٣٧,٢٦ ملیۆن تەن.

ل. بەهۆی ئەو گفتوگۆیانەی کەبڕیار بوو لە تشرینی یەکەمی سالْی (١٩٧١) لەنێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیا بیانییەکان بکرێ سەبارەت بە یەکلاکردنەوەی کۆمەڵێ کێشەی نێوانیان وەك پاکۆکاری موڵکانەی نەوتی سالانی (١٩٦٢ – ١٩٧١)و بەشداربوونی عێراق لە پشکی کۆمپانیاکان و ڕێککەوتن لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان، بەڵام کۆمپانیاکان بڕی بەرهەمهێنانی نەوتیان کەمکرەوە وەك فشارێك بۆ پاشگەزکردنەوەی حکومەتی عێراق لە داواکانی[٥٥].

خشتەی ژمارە (٧)

پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك بە ملیۆن تەن[٥٦]

| ساڵی | بڕ | ساڵ | بڕ |
|---|---|---|---|
| ١٩٥٠ | ٦,١٦ | ١٩٦٢ | ٣٨,٠٦ |
| ١٩٥١ | ٧,٩٨ | ١٩٦٣ | ٤١,٦٢ |
| ١٩٥٢ | ١٥,٥٥ | ١٩٦٤ | ٤١,٧١ |
| ١٩٥٣ | ٢٢,٨٦ | ١٩٦٥ | ٤٣,٨٦ |
| ١٩٥٤ | ٢٣,٧٣ | ١٩٦٦ | ٤٢,٦٧ |
| ١٩٥٥ | ٢٤,٢٠ | ١٩٦٧ | ٣٧,٦٢ |
| ١٩٥٦ | ٢١,٠٨ | ١٩٦٨ | ٥٤,٨٢ |
| ١٩٥٧ | ١١,٦٥ | ١٩٦٩ | ٥٥,٤٤ |
| ١٩٥٨ | ٢٢,٦٣ | ١٩٧٠ | ٥٦,٨٩ |
| ١٩٥٩ | ٢٧,٣٣ | ١٩٧١ | ٥١,١٢ |
| ١٩٦٠ | ٣٣,٨٤ | ١٩٧٢ | ٣٥,٢٨ |
| ١٩٦١ | ٣٦,٩٩ | | |

لەسەرەتای ساڵی (١٩٧٢) حکومەتی عێراق جارێکی تر داوای گفتوگۆی لە کۆمپانیا نەوتییەکان کرد سەبارەت بەهەمان ئەو کێشانەی کەلەپێشەوە ئامارەیان پێکرا، بەڵام کۆمپانیاکان بەهەمان ڕەوتی پێشویان ویستیان بە فشاری کەمکردنەوەی بەرهەمهێنانی نەوت حکومەتی عێراق لە داواکارییەکانی پاشگەز بکەنەوە، لەبەرامبەر ئەوە، حکومەتی عێراق بڕیاری ژمارە (٦٩)ی لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٢) دەرکرد کە هەموو پرۆسە نەوتییەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراقی خۆماڵی کرد. بەم بڕیارە کێڵگە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکوك کەوتنە دەستی حکومەتی عێراق بەمەش عێراق بەتەواوی بووە خاوەنی دارشتنی سیاسەتی بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك[٥٧].

**٢. ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٣) - ئەمڕۆ:**

بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوان حکومەتی عێراق و کۆمپانیا بیانییەکان، لە مانگی ئازاری (١٩٧٣) دا ڕێککەوتننامەیەکی پێنج خاڵی مۆرکرا کە خاڵێکیان پەیوەندی بە نەوتی پارێزگای کەرکوکەوە هەیە کە ئەمەیە دەبێت حکومەتی عێراق بڕی (١٥) ملیۆن تەن لە نەوتی خاوی پارێزگای کەرکوك وەك قەرەبووکردنەوەی هەموو زیانەکانی کۆمپانیا نەوتییەکان بدات، کە بەهۆی جێبەجێ کردنی بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتەوە لێیان کەوتووە[٥٨].

لەسایەی خۆماڵیکردنی نەوتی کۆمپانیای عێراقدا، بەرهەمهێنانی نەوتی کێڵگەکانی کەرکوك ڕووی لە هەڵکشان کرد، لە ساڵی (١٩٧٣) بەرهەمی ڕۆژانەی ئەو کێڵگانە گەیشتە ١,٢ ملیۆن بەرمیل ولەساڵی (١٩٧٦) گەیشتە ١,٤ ملیۆن بەرمیل و لە ساڵی (١٩٧٨) گەیشتە ١,٨ ملیۆن بەرمیل، هەروەها وزەی بەرهەمداری هەردوو کێڵگەی چەمەبۆرو بای حەسەن لە ساڵی (١٩٧٣)وە تا ساڵی (١٩٧٧) چوار هێندە زیادی کرد، واتە بڕی بەرهەمی ڕۆژانەی لە (٧٠) هەزار بەرمیل/ڕۆژ هەڵکشا بۆ (٢٦٠) هەزار بەرمیل/ڕۆژ[٥٩].

لە ساڵانی نێوان (١٩٨٠– ١٩٨٨) بەرهەمی نەوتی کەرکوك بەهۆی دووری ناوچەکانی بەرهەمهێنانی لە مەیدانی جەنگی عێراق ئێرانەوە، ڕێژەی گەورەی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراقی پێك هێنا کە لەنێوان (٤٠) ملیۆن تەن لە ساڵی (١٩٨١) بۆ (١٢٠) ملیۆن تەن لە ساڵی (١٩٨٧)دا بوو[٦٠].

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی عێراق – ئێرانەوە، نەوتی کەرکوك ڕێژەی گەورەی لە بەرهەمهێنانی نەوتی خاوی عێراقدا بۆ خۆی داگیرکرد، کە بڕی هەناردەی نەوتی خاوی پارێزگای کەرکوك تەنیا لە ڕێگەی هێڵی کەرکوك – جەیهانەوە ١,١ ملیۆن بەرمیل / ڕۆژ بووە، ئەمە جگە لەو بڕەی کە لە ڕێگەی لوولە نەوتیە ناوخۆییەکانەوە ڕەوانەی پاڵاوگەکانی حەدیسەو دۆرەو بێجی کراوە[٦١].

بڕی بەرهەمهێنانی نەوتی خاوی عێراق لە ساڵی (١٩٩٠) گەیشتە ٢,٠٤٠ ملیۆن بەرمیل / ڕۆژ، بەڵام دوای داگیرکردنی کوەیت لە ئابی ساڵی (١٩٩٠)و سەپاندنی گەمارۆی ئابووری نێودەوڵەتی بەسەریدا، ڕێژەی بەرهەمهێنانی نەوتی خاوی عێراق بەشێوەیەکی نیمچە تەواو دابەزی، چونکە هەموو دەروازەکانی هەناردەی نەوتی بە تەواوەتی لێ داخران[٦٢]. (بڕوانە خشتەی ژمارەی ٨).

**خشتەی ژمارە (٨)**
**بەرهەمی ڕۆژانەی نەوتی خاوی عێراق ملیۆن بەرمیل[٦٣]**

| ساڵ | م. بەرمیل / ڕۆژ |
|---|---|
| ١٩٩٠ | ٢,٠٤٠ |
| ١٩٩١ | ٠,٣٠٥ |
| ١٩٩٢ | ٠,٤٢٥ |
| ١٩٩٣ | ٠,٥١٢ |
| ١٩٩٤ | ٠,٥٥٣ |
| ١٩٩٥ | ٠,٥٦٠ |
| ١٩٩٦ | ٠,٥٧٩ |
| ١٩٩٧ | ١,١٥٥ |
| ١٩٩٨ | ٢,١٥٠ |
| ١٩٩٩ | ٢,٥٠٨ |
| ٢٠٠٠ | ٢,٥٧١ |
| *٢٠٠١ | ٢,٢٧١ |

(*) تەنیا تێکرای حەوت مانگی ساڵی (٢٠٠١) بەرهەمی نەوتی خاوی عێراقە.

ئەو برە نزمەی بەرهەمی نەوتی خاوی عێراق وەك لە خشتەی ژمارە (٨)ـە دیار کەوتووە، تەنیا بۆ دابین کردنی پێداویستی یە ناوخۆییەکانی عێراق بووە، چ لە ڕێگەی پاڵاوگەکانییەوە بۆ دابینکردنی پێداویستی دانیشتووانی عێراق بەکار هاتووە یان ڕاستەوخۆ لە کێڵگەکانەوە ڕەوانەی دامەزراوە ئابوورییە پیشەسازییەکان کراوە. پاڵاوگەی کەرکوکیش ڕۆژانە ٢٧ هەزار بەرمیل نەوتی پاڵاوتووە[٦٤].

لەگەڵ جێبەجێکردنی بڕیاری (٩٨٦)ی نەتەوە یەکگرتوەکانداو لەدوای شەش ساڵ داخستن، جارێکی تر هێڵی کەرکوك – جەیهان کرایەوەو ڕۆژانە بری (٩٠٠ هەزار بەرمیل نەوتی خاوی پارێزگای کەرکوکی ڕەوانەی بازارەکانی فرۆشتن کرد، بەڵام بەپێی لێدوانی کۆمپانیای نەوتی ڕوسیا ZARUBE ZHNEFT بری هەناردەی نەوتی خاوی کەرکوك لە ڕێگەی هێڵی کەرکوك – جەیهان لە کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٩)وە لە (٩٠٠) هەزارەوە بۆ ١,١ ملیۆن بەرمیل / ڕۆژ زیادی کردووە[٦٥].

لە (٢٠)ی ئابی ساڵی (١٩٩٨)دا بەهۆی نزیك بوونەوەی هەردوو حکومەتی عێراق و سوریا هەردوو حکومەت، ڕێککەوتن لەسەر کردنەوەی هێڵی کەرکوك – بانیاس، دوای ئەوەی کە لە ساڵی (١٩٨٢) بە هۆی لایەنگیری سوریا لە ئێران لە کاتی جەنگی عێراق – ئێراندا، ئەو هێڵە داخرا، کە ڕۆژانە بری (٣٠٠) هەزار بەرمیل نەوتی خاوی کەرکوکی لێوە ڕەوانەی کەناری دەریای ناوەڕاست دەکرا[٦٦].

*** گواستنەوی نەوت:**

لەبەر ئەوەی ناوچەی کێڵگە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکوك لە بازارەکانی بەکاربردنییەوە دوورە، نەوتیش ئەو گرنگییەی نییە ئەگەر نەگەیەنرێتە بازارەکانی فرۆشتن، بە تایبەتی کە ڕێژەی بەرهەمهێنانی نەوتی کێڵگەکانی پارێزگای کەرکوك ئێجگار زۆرەو زۆر زیاترە لە قەبارەی خواستی نێوخۆیی. پرۆسەی گواستنەوەی نەوت لە کێڵگەکانەوە بۆ ناوچەکانی بەکاربردنی لە گرنگی دەرهێنان و بەرهەمهێنانی کەمتر نییە لەبەر ئەوەی پرۆسەی بەرهەمهێنانی نەوتی کەرکوك پێویستی بە تۆڕێکی گواستنەوەی ڕێکخراو هەیە:

تا ئێستا لە جیهاندا بۆ گواستنەوەی نەوت چوار ڕێگەی دیار هەیە، کە هەر یەکێکیان بەپێی هەڵومەرجی مێژوویی و جوگرافی ناوچە نەوتییەکان گرنگی خۆی هەیە:

١. بەهۆی تەنکەرەوە.
٢. بەهۆی شەمەندەفەرەوە.
٣. بەهۆی پاپۆڕەوە بارهەڵگری نەوت.
٤. بەهۆی لوولەوە.

لەبەر ئەوەی پارێزگای کەرکوك کەوتووەتە ناوەڕاستەوەو دوورە لە دەریاوە لەبەر ئێجگار زۆریی بەرهەمەکەی، بەشێوەیەکی بەر فراوان هەر لەیەکەم ڕۆژی هەناردنە دەرەوەی نەوتەکەیەوە چ لەلایەن کۆمپانیا نەوتییە بیانییەکان و چ لەلایەن حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە ڕێگای چوارەمیان واتە لوولەی نەوت گواستنەوەیان بە گونجاوترین هۆکار زانیوە بۆ هەناردنە دەرەوەی نەوتی کەرکوك وهەروەها بۆ گرێدانی بە پاڵاوگەو وێستگەکانی هەڵدانەوە. دوو جۆر لوولە لە خزمەتی نەوتی پارێزگای کەرکوك دان:

أ. هێڵی لوولەی دەرەکی.
ب. هێڵی لوولەی ناوخۆیی.

**أ. هێڵی لوولەی دەرەکی:**

ئەو چەند لوولە هێڵە نەوتییانە دەگرێتەوە کە نەوتی کەرکوك ڕەوانەی ناوچەکانی فرۆشتنی دەکەن لەسەر کەناری دەریای ناوەڕاست و کەنداو، کە لوولەکانی زۆر درێژن و تیرەکانی فراوانن و توانای گواستنەوەشیان زۆرە، ئەو لوولانەش ئەمانەن:

١. مێژووی دروستکردنی یەکەمین هێڵی لوولەی نەوت گواستنەوە لە عێراقدا بۆ ساڵی (١٩٣١) دەگەڕێتەوە کە لە ساڵی (١٩٣٤) کۆتایی هاتووەو کراوەتەوە، وبەیەکەمین هێڵی گواستنەوەی نەوت بۆ دەرەوە دائەنرێت. ئەم هێڵە دوانەیە تیرەکەی (٢٥) ئینجە لە وێستگەی، هەڵدانی (K١) بەئاقاری باشووری خۆرئاوا درێژ دەبێتەوەو لە نزیك فەتحە ڕووباری دیجلە دەبڕێت و لە ئاقارەکەی بەردەوام دەبێت تاوەکو لە نزیك بێجی دەگاتە وێستگەی (K٢) ودواتر ڕووباری فورات لە نزیك حەدیسە دەبڕێت و دەگاتە وێستگەی (K٣) درێژەی

ئەم هێڵە لە کەرکوکەوە تا دەگاتە (K3) نزیکەی (٣٩٥) کلم دەبێت. لێرەوە ئەم لوولەیە دەبێتەوە دوو بەش:

یەکەمیان: هێڵی باکوور، بەرەو تەرابلس دەڕوات، دوای ئەوەی (٤٢٧) کلم لە خاکی سوریاو (٢٧) کلم لە خاکی لوبنان دەبڕێت، دەگاتە بەندەری تەرابلس.

دووەمیان: هێڵی باشوور بەرەو حەیفا دەڕوات، دوای ئەوەی (٣٢٥) کلم لە خاکی ئەردەن و (٦٤) کلم لە خاکی فەلەستین دەبڕێت دەگاتە حەیفا[٦٧].

٢. لە ساڵی (١٩٤٥) دەست کرا بەڕاکێشانی هێڵی دووەمی کەرکوک – تەرابلس و کەرکوک – حەیفا، بەڵام بەهۆی دامەزراندنی دەوڵەتی – ئیسرائیلەوە کارکردن لە هێڵی کەرکوک – حەیفا ڕاگیرا، هەرچەندە تەنها (٥٠) کلم مابوو تەواو ببێت.

بەڵام هێڵی کەرکوک – تەرابلس لە تەمموزی ساڵی (١٩٤٩) دا تەواوبوو کەتیرەکەی ١٦ ئینج بوو، بەمەش توانای گواستنەوی هێڵی کەرکوک – تەرابلس لە ٤ ملیۆن تەنەوە بۆ ٧,٥ ملیۆن تەن بەرزبووەوە[٦٨].

٣. لە ساڵی (١٩٥٢) هێڵی کەرکوک – بانیاس دروست کرا، کەتوانای نەوت گواستنەوەی ساڵانە (١٣) ملیۆن تەن بوو وتیرەکەشی لەنێوان (٣٠) بۆ (٣٢) ئینج بوو– ئەم هێڵە بە هاوتەریبی هێڵی کەرکوک – تەرابلس ڕاکێشراوە، درێژیی ئەم هێڵە (٨٨٨) کلم دەبێت[٦٩].

٤. لە ئابی ساڵی (١٩٦١)دا هێڵێکی تری کەرکوک – تەرابلس تەواو بوو، کە تیرەکەی لەنێوان (٣٠) بۆ (٣٢) ئینج بووە، ئەم هێڵەش بەهاوتەریبی هێڵەکەی تری کەرکوک – تەرابلس ڕاکێشرا، بە تەواوبوونی ئەم هێڵە توانای هەناردەی نەوتی کەرکوک بۆ سێ هێندەی توانای ساڵانی پەنجا بەرزبووەوە[٧٠].

٥. لە ساڵی (١٩٧٧) هێڵی کەرکوک – تورکیا کرایەوە، کە نەوتی کەرکوکی دەگەیاندە سەر کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، توانای ساڵانەی ئەم هێڵە (٣٥) ملیۆن تەنەو درێژییەکەی (٩٠٠) کلم کە (٣٤٥) کلم لە خاکی عێراقدایە[٧١].

٦. هێڵی ستراتیجیی حەدیسە– بەندەری ئەلعەمیق، درێژی ئەم هێڵە (٨١٠) کلم ڕاکێشانی ئەم هێڵە بۆ عێراق زۆر گرنگ بوو، بەهۆیەوە دەتوانێ نەوتی کەرکوک بگەیەنێتە سەر کەناری کەنداو هەروەها نەوتی باشووری عێراقیش بگەیەنێتە سەر کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست[٧٢].

٧. لەساڵی (١٩٨٧) هێڵی دووەمی کەرکوک – تورکیا ڕاکێشرا، بۆ زیادکردنی توانای هەناردەی نەوتی عێراق بەزەحمەت دەیتوانی نەوت لە کەنداوەو بفرۆشێت بە هۆی شەڕی عێراق – ئێرانەوە.

**ب. هێڵی لوولەی ناوخۆ:**

ئەم هێڵە ناخۆییانە تەنها بۆ گرێدانی کێڵگە نەوتییەکانی پارێزگای کەرکوکن بەیەکەوە، هەروەها بۆ گەیاندنی نەوتی خاوی کەرکوکن بە پاڵاوگەی دۆرەوە لە بەغدا.

١. ساڵی (١٩٥٥) وەزارەتی نەوتی عێراق، هێڵێکی لوولەیی لە کێڵگەی کەرکوکەوە گەیاندە پاڵاوگەی دۆرە، کە درێژییەکەی ٣١٩ کلم و تیرەکەی (١٢) ئینجە ئەم هێڵە بەوێستگەی، (K2) لە بێجی دا تێپەڕ دەبێت[٧٣].

٢. لە ساڵی (١٩٥٥) دوای دۆزینەوەی نەوت لە کێڵگەی چەمەبۆر، ئەم کێڵگەیە بە هێڵێکی (٥٨ کلم)ی بە کێڵگەی نەوتی کەرکوکەوە گرێدرا، تیرەی لوولەیی لەنێوان (٦) بۆ (٨) ئینج بوو[٧٤].

٣. لەساڵی (١٩٦١) دوای دۆزینەوەی نەوت لە کێڵگەی بای حەسەن، ئەم کێڵگەیە هێڵێکی (٣٢ کلم)ی بەکێڵگەی نەوتی کەرکوکەوە گرێدرا، تیرەی لوولەکەی لەنێوان (٨) بۆ (١٦) ئینج بوو[٧٥].

گرێدانی هەردوو کێڵگەی نەوتی چەمە بۆرو بای حەسەن بە کێڵگەی کەرکوکەوە، بۆ بەئاسانی هەناردنی نەوتی ئەم دوو کێڵگەیە بووە بۆ بازارەکانی دەرەوە.

*** کۆبەند:**

ئەم باسە بەچەند دەرئەنجامێك گەیشتووە کەلێرەدا دەیانخەینە ڕوو:

١. نەوتی کەرکوك فاکتەری سەرەکی گرێدانی ویلایەتی موسڵ بوو بە عێراقی عەرەبییەوەو بەریتانیاشی لە ڕێککەوتننامەی سایکس – بیکۆ سەبارەت بەدانی ویلایەتی موسڵ بە فەرەنسا پەشیمان کردووە.

٢. نەوتی کەرکوك ناوەندی ململانێی توندی نێوان دەوڵەتە ئیستعمارییەکان بووە، بەتایبەتیش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم.

٣. نەوتی کەرکوك هۆکاری سەرەکی نزمیی ئاستی تێچووی دەرهێنان و بەرهەمهێنانی نەوتی عێراقە، لەچاو دەوڵەتانی ناوچەکەو جیهاندا.

٤. نەوتی کەرکوك بەهۆی خەسڵەتە باشەکانییەوە، باشترین جۆری نەوتە لە ناوچەکەو جیهاندا، کەخواستی زۆری دەوڵەتانی ئەوروپا ئەمریکا لەسەری باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستییەن.

٥. یەدەکی نەوتی کەرکوك زۆر لەوە زیاترە کەدەزگا ڕەسمییەکانی عێراق و کۆمپانیا بیانییەکان ئاشکرایان کردووە، بەتایبەتیش کەچەندین کێڵگەی نەوتی تر لەسنووری پارێزگای کەرکوکدا دۆزرانەتەوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە قەبارەی نەوتەکە بدەن.

٦. کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوك سەرچاوەی گەورەترین کانگای گازی سروشتین لە عێراقدا، کە دەکرێ لە پاشەڕۆژدا، هەروەکو چۆن نەوتەکەی بەلوولەوە دەنێردرێتە دەرەوە، ئەویش بەهەمان شێوە ڕەوانەی بازارەکانی فرۆشتن بکرێت و، ببێتە سەرچاوەی داهاتێکی گەورە.

٧. ڕای ڕەسمی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق و نوخبە سیاسی و ئابوورییەکەشی بەردەوام جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە کۆمپانیا نەوتییە بیانییەکان بە قەدەر پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بایەخیان بە ناوچە نەوتییەکان داوە، ئەی دەبێ ئێمەی کورد دەرهەق بە سیاسەتەکانی حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق و نوخبە سیاسی و ئابوورییەکانیان چی بڵێن، کە نەك وەك کۆمپانیا بیانییەکان ڕەفتاریان نەکردووە، بەڵکو هەوڵەکانیان بەردەوام بووە

بۆ سرینەوەی مۆركی كوردانەی ناوچە نەوتییەكانی كوردستان، بەتایبەتی پارێزگای كەركوك، هەر لە گۆڕینی ناوی پارێزگاكەوە تا دەگاتە دابڕینی چەندین قەزاو ناحیەی سەر بەو پارێزگایە، هەروەها دەركردنی خەڵكی ڕەسەنی شارەكەو نیشتەجێكردنی عەرەب لە جێگەیاندا، جگە لەوێرانكردنی دەیان گوندی پارێزگاكەوە دروستكردنی پشتێنەیەكی نیشتەنی عەرەبی بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ كە كەركوك ناوچەیەكی عەرەبیەو، بەشێكی كوردستان نییە.

* سەرچاوەو پەراوێزەكان:


١. گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠) ساڵی (٢٠٠١)، لاپەرە (١٤٠)، لێكۆڵینەوەیەكە بە ناونیشانی:
(ڕۆڵی ئاوی كورد لە بەعەرەبكردنی كەركوك)، محەمەد عەبدوڵڵا عومەر.
٢. ئازاد جەلال شەریف، (سەرچاوەو دەرامەتی ئاو، كتێبی جوگرافیای هەرێمی كوردستان)، كۆمەڵێك مامۆستای زانكۆ، چاپی یەكەم، ١٩٨٨، لاپەرە (١٣٠).
٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (١٢٢).
٤. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (مياة كردستان وآفاق المستقبل)،، دراسة رقم (٩)، الطبعة الاولى، ١٩٩٦، الصفحات (٢٧ – ٢٨).
٥. محەمەد عەبدوڵڵا عومەر، (ڕۆڵی ئاوی كورد لە بەعەرەبكردنی كەركوكدا)، لاپەرە (١٤١).
٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٤١).
٧. محمد ازهر سعيد السماك، (إقتصاد النفط والسياسة النفطية)، جامعة الموصل، ١٩٨٦، الصفحة (٢١).
٨. محمد ازهر سعيد السماك، (دراسات في الموارد الإقتصادية)، جامعة الموصل، ١٩٨٧، الصفحة (١٢٠).
٩. د. عیمادەدین عومەر حەسەن، (دەرامەتە كانزاییەكان، كتێبی جوگرافیای هەرێمی كوردستان)، كۆمەڵێك مامۆستای زانكۆ، چاپی یەكەم، ١٩٨٨، لاپەرە (١٦٨).
١٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (١٦٩).
١١. سعيد عبود السامرائي، (موارد العراق الإقتصادية)، مطبعة (القضاء)، النجف، الطبعة الاولى، ١٩٧٥، الصفحات (٢٧٦– ٢٧٧).
١٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٧٧).
١٣. د. محمد ازهر سعيد السماك وآخرون، (العراق دراسة اقليمية)، الجزء الاول، جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٥، الصفحة (١٨٤).
١٤. سعيد عبود السامرائي، (موارد العراق الإقتصادية)، مطبعة (القضاء)، النجف، الطبعة الاولى، ١٩٧٥، الصفحة (٢٧٨).
١٥. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٢٧٨).
١٦. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد الاقطار المصدرة للنفط الاوبك)، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٧٩.
١٧. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، دراسة رقم (٣١)، الطبعة الاولى، ١٩٩٧، الصفحة (٣٣).
١٨. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد النفط العراقي)، مطبعة الادارة المحلية، بغداد، ١٩٧٨، الصفحة (٧٤).
١٩. حكمت سامي سليمان، (نفط العراق)، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩، الصفحة (٦٠).
٢٠. بڕوانە:
– عبد الحميد العلوجي، خضير عباس اللامي، (الأصول التاريخية للنفط)، الصفحة (٢٥).
– حكمت سامي سليمان، (نفط العراق)، الصفحة (٢٣).
٢١. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبدالحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة النفطية)، جامعه الموصل، الموصل، الطبعة الاولى، ١٩٨٠، الصفحة (٨١).
٢٢. حكمت سامي سليمان، (نفط العراق)، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٩، الصفحة (٧٤).
٢٣. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة والنفطية)، الصفحة (٨١).
٢٤. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة)، جامعة الموصل، الموصل، الطبعة الاولى، ١٩٨١، الصفحة (١٠٧).
٢٥. عبد الحميد فهمي، (تأريخ مشاهير الألوية العراقية)، مطبعة الزمان، ١٩٤٦، الصفحة (١١).
٢٦. د. محمد ازهر سعيد السماك، (إقتصاديات النفط)، الصفحة (١٠٨).
٢٧. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة الاولى)، الصفحة (٨٢).
٢٨. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، الصفحة (١٤).
٢٩. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط)، الجزء الاول، الصفحات (٨٢– ٨٣).
٣٠. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة النفطية)، الصفحات (٨٢– ٨٣).
٣١. لە (١٤)ی ئاداری ساڵی (١٩١٤)دا، گفتوگۆی نێوان حكومەتی ئینگلیزی‌و ئەڵمانی‌و بانكی ئەهلی توركی‌و كۆمپانیای چل‌و كۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – فارسی سەركەوتنی بەدەست هێنا، بۆ ڕێكخستنەوەی پێكهاتەی كۆمپانیای نەوتی توركی، كە پشكەكانی بەم شێوەیە بەش كران:
ا. (٥٠٪) بۆ كۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی – فارسی جەماعەتی دارسی.
ب. (٢٥٪) بۆ بانكی ئەڵمانی.
ج. (٢٥٪) بۆ كۆمپانیای ئەنگلۆ – ساكسۆنی.
٣٢. عبد المجيد فهمي، (تأريخ مشاهير الألوية العراقية)، الصفحة (٢٨).
٣٣. عبد الرزاق الحسني، (تأريخ الوزارات العراقية).
٣٤. د.. احمد نجيب، (دراسات في جغرافية العراق الصناعية)، بغداد، ١٩٧٥، الصفحة (١٣٦).
٣٥. د. محمد ازهر سعيد السماك، د. زكريا عبد الحميد باشا، (إقتصاديات النفط والسياسة النفطية)، الصفحة (٨٦).

٣٦. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٨).
٣٧. حكمت سامي سليمان، (نفط العراق)، الصفحات (٧٢ – ٧٣).
٣٨. د. محمد ازهر سعيد السماك، (إقتصاديات النفط والسياسة النفطية)، الصفحة (١١٥).
٣٩. بۆ نوسینی ئەم بنەمایانە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
– د. محمد ازهر سعيد السماك وآخرون، (العراق، دراسة اقليمية)، الجزء الاول، الصفحات (٢٢٨ – ٢٣٢).
– د. محمد ازهر سعيد السماك، (إقتصاديات النفط والسياسة النفطية)، الصفحات (٢٩٣ – ٢٩٦).
٤٠. د. خليل فضيل واحمد حبيب رسول، (جغرافية العراق الصناعية)، مطابع جامعة الموصل، ١٩٨٤، الصفحة (٢٠٨).
٤١. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، الجزء الاول، الصفحة (٦٢).
٤٢. بەپشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەکی ئەم باسە.
٤٣. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، الجزء الاول، الصفحة (٦٢).
٤٤. د. طارق شكر محمود، (اقتصاد النفط العراقي)، الصفحة (١٨).
٤٥. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، الجزء الاول، الصفحة (٦٦).
٤٦. د. محمد ازهر السماك، (إقتصاديات النفط)، الصفحة (٣٠١).
٤٧. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد النفط العراقي)، الصفحة (٢٨).
٤٨. د. محمد ازهر السماك، (إقتصاديات النفط)، الصفحة (٣٠١).
٤٩. بروانە خشتەی ژمارە (١).
٥٠. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد النفط العراقي)، الصفحة (٢٨).
٥١. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥).
٥٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥).
٥٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە (٣٥).
٥٤. مجلة (الجمعية الجغرافية العراقية)، المجلد الخامس، بغداد، حزيران، ١٩٦٩، الصفحة (٩١)، موضوع بعنوان:
(نقل البترول وتاثيراته الجانبية لبعض الدول)، د. علي البيرماني.
٥٥. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد النفط العراقي)، الصفحة (٣٦).
٥٦. مكتب الدراسات والبحوث المركزي، (نفط كردستان العراق)، الجزء الاول، الصفحة (٧٠).
٥٧. د. طارق شكر محمود، (إقتصاد النفط العراقي)، الصفحة (٤٧).
٥٨. مجلة (الإقتصاد)، بغداد، نيسان ١٩٧٣، الصفحة (٦)، موضوع بعنوان:
(اتفاقية آذار المعقودة بين الحكومة العراقية وشركات النفط الاجنبية).
٥٩. حكمت سامي سليمان، (نفط العراق)، الصفحات (٢١٨ – ٢١٩).
٦٠. ازاد محمد امين نقشبندي، تغلب جرجيس داود، (جغرافية الموارد الطبيعية)، جامعة البصرة، جدول رقم ٨٥، الصفحة (٦٣٨).
٦١. Country Analysis Briefs Iraq Lowell feld، September، ٢٨، ٢٠٠١.
٦٢. هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦٣. WoId crude oiI production خشتەیەکە لە ئەنتەرنێتەوە وەرگیراوە.
٦٤. desamber ١٩٩٩ ١٠ Lowellfeld. United states energy Information Administration Iraq.
٦٥. Country Analysis Briefs Iraq، LowelIfeld، September، ٢٨، ٢٠٠١.
٦٦. سەرچاوەی ژمارە (٦٤).
٦٧. د. محمد ازهر السماك واخرون، (العراق، دراسة اقليمية)، الصفحة (٢٣٩).
٦٨. د. محمد ازهر السماك، (إقتصاديات النفط)، الصفحة (٣٠١).
٦٩. د. محمد ازهر السماك واخرون، (العراق، دراسة اقليمية)، الصفحة (٢٣٩).
٧٠. هەمان سەرچاوەی پێشوو، الصفحه (٢٤٠).
٧١. مجلة (النفط والعالم)، بغداد، تموز، ١٩٧٦، موضوع بعنوان:
(شركة النفط الوطنية، حاضرها ومستقبلها).
٧٢. د. محمد ازهر السماك، (إقتصاديات النفط)،الصفحات (٣٠٤)و (٣٠٥).
٧٣. د. محمد ازهر السماك واخرون، (العراق، دراسة اقليمية)، الصفحات (٢٥٠)و (٢٥١).
٧٤. د. محمد ازهر السماك، (إقتصاديات النفط)، الصفحة (٣١١).

*** بەلقاس ناوچەی لەبیرکراوی کەرکووك و شارەزوور:-**

**ئەحمەد تاقانە**

چەند سەرچاوەیەکی کۆن و رەسەن و باوەڕ پێکراوی سەردەمی عوسمانی، ناوی"بەلقاس"یان بە ناوچە، یان بە لیوا یانیش بە تایەفە ناوبردووە. دیارە لەم چەند ساڵانەی دواییشدا لە ناو ئەرشیفە کۆنەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا کە بۆ تورکیای ئەمڕۆ ماونەتەوە هەندێك بەڵگەنامەی هەر ئەو سەردەمە کەوتوونەتە بەر دەستان و زانیاریی باشیان لێ روون بووەتەوە. دیارە ئەگەرچی زۆرێکیان پێوەندییان بە کورد و کوردستان و شارەزوور و کەرکووك و شارەکانی دیکەوە هەیە، بەڵام دەکرێ بڵێین هێشتا کەمتر کەوتوونەتە بەر چاوی لێکۆڵەرەوە و مێژوونووسانی کوردی ئەم سەردەمەمان. بۆیە لەو کتێبە مێژووییە کوردییانەی، بەلای کەمەوە ئەوانەی من دیومن، ناوی (بەلقاس) یان تێدا بەرچاو ناکەوێ، مەگەر تەنیا لە وەرگێڕانەکاندا ئەویش وەك ناوێکی رووتی بەبێ هیچ زانیارییەك و روونکردنەوەیەك.

ئەو سەرچاوە عوسمانییە کۆنە رەسەنانەی لەم وتارەمدا ئاماژەم بۆ کردوون،"چاپە رەسەنە باوەڕ پێ کراوەکانیان"ن و لەبەردەستدان و سوودمان لێ وەرگرتوون.

هەرچی ئەو چاوگانەشە کە پشتیان بەو بەڵگەنامانە بەستووە کە دەفتەری سەرژمێریی ورد و تۆمارێکی زۆری زانیارییان تێدایە، لە پێناوی باج و سەرانە لێ وەرگرتن لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانییەوە بەوردی ئامادە کراون لەبەردەستماندا نین!!. بەڵکو هەندێکیان لە شێوەی لێکۆڵینەوە لەلایەن کەسانێکەوە بڵاوکراونەتەوە، زۆر جێی متمانە نین. بە تایبەتی ئەو بەڵگە کۆنانە، بە پیتی عەرەبی و بەرێنووسی پرلە گرفتی ئەو سەردەمانە نووسراون، وەك لە خوێندنەوەیاندا هەندێك جیاوازیی بۆچوون پەیدا دەبن، هەندێکیش لەبەر دەمارگیری، لێکۆڵەرەوەکان لە خوێندنەوەیاندا نارەوا بەلای دیکەیاندا دادەتاشن.

بۆیە لەهەندێك لایەنیاندا دەبێ بە ئاگایی و هوشیارییەوە سوودیان لێ وەربگرین، چونکە، لەگەڵ ئەو تێبینییانەشدا زانیارییەکی باشمان لەو رێیانەوە دەست دەکەوێ و ناچارین بەو شێوەیە لێیان وردببینەوە.

مێژوو پێمان دەڵێ: کوردستانی نیشتیمانی ئازیزمان، هەمیشە رێی هاتوچووی داگیرکەرانی جۆراوجۆری بەسەرەوە بووە، هەر هەمووشیان هەوڵی کۆمەڵکوژی و گۆڕینی دیموگرافی و ناوی شوێنەکانیان داوە ناوگەلی دیکەیان بە زمانەکانی خۆیان سەپاندووە. بەڵام گەلی کورد بەوەی کە، گەلێکی زیندوو بووە، هەر کە ئەو داگیرکەرانە لەبەر هەر هۆکار و بارودۆخێکەوە بووبێ، لێی دوور کەوتوونەتەوە و جێیان هێشتووە، نیشتیمانە جوانەکەی بردووەتەوە سەر دۆخە رەسەنەکەی خۆی. ئەگەرچی ئەو داگیرکەرانەش بایی ئەوەندە شوێنەوار و ناو و هێمایان لێ بەجێهێشتوون کە ببنە مایەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە قێزەونە ئەفسانەئامێزانە و جارناجاریش سەرەداوێك بن بۆ دۆزینەوەی راستییە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە بە دووکەڵ و بۆچەك تەنراوانە. ناوی"بەلقاس"یەك لەو ناوانەیە کە بەسەر دەڤەرێکی نیشتیماندا سەپێنراوە و هەر کە بارودۆخەکە هەندێك رەوییەوەتەوە بزر بووە و لەگەڵ بارودۆخە کشاوەکەدا کشاوەتەوە و لە ناو لاپەرە کۆنەکانی مێژوودا ون بووە. چیرۆکەکەش بەم شێوەیە دەبینین:

*** شارەزوور و لیوا و ناوچەکانی سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی:-**

(کاتب چەلەبی"مستەفا حاجی خەلیفە / ١٦٠٨ - ١٦٥٧ی ز") لە چاپی یەکەمی ساڵی (١١٤٥ی کۆچی - ١٧٣٢ / ١٧٣٣ی ز)ی کتێبی جیهان نوما (جهان نما) یدا کە ئیبراهیم موتەفەرریقە (١٦٧٤ - ١٧٤٤ی ز)ی لە چاپدە و بڵاوکەرەوەی کتێبەکە، بەشێکی لە کارەکانی"ئەبو بەکر بەهرامی حەنەفیی دیمەشقیی زانای گەورە، کە ساڵی (١١٠٢ی کۆچی - ١٦٩١ی ز) کۆچی دوایی کردووە، خستووەتە سەر زانیارییەکانی کاتب چەلەبی و لەبارەی ئەیالەتی شارەزوورەوە نووسیویەتی دەڵێ:

"ئەوە لە بیر نەکرێ کە وڵاتی ئەیالەتی شەهرەزوول (شارەزوور) ئەگەرچی لەمەوپێش لە هەرێمی چیا( اقلیم الجبل) دا واتە لە بەشی عێراقی عەجەمدا تا رادەیەك باسی لێوە کرا و روون کرایەوە، بەڵام ئەم هەرێمە جار و بار پێوەندیی بە هەرێمی عێراقی عەرەبەوە هەیە، جگە لەوەی پەسنەکانی لەسەر وڵاتی کوردستان دەژمێرێ بەپێی یاسا و بنەمای دەوڵەتی بەرزی عوسمانی بە ئەیالەتێکی سەربەخۆ دادەنرێ، بە شیاومان زانی لێرە باسێکی لێوە بکەین و دەستەواژەی جوگرافیای ئەبو بەکری کوری بەهرامی دیمەشقی - ش لێرەدا وەك خۆی بچەسپێنین و بخەینە ناو رستی دێرەکانەوە.

ئەیالەتی شەهرەزوول - شارەزوور: ئەم ویلایەتە ئەیالەتێکە لەسەر سنووری عەجەم (ئێران) دا. کە بە بەشێك لە هەرێمی کوردستان دادەنرێ و زۆربەی ویلایەتەکانی لە تایەفەی گۆران پێکدێن. دەڤەری حەریر، وڵاتی (سۆران)ە، لەژێر دەسەڵاتی فەرمانرانانی گۆران و میرەکانی ئەردەڵاندا بوون، دەمێك سەر بە عوسمانییان و گاهێك سەر بە قزڵباشان"ئێرانی شیعە"دا بوون، زۆربەی وڵاتەکە لەوان وەرگیرا و خرایە سەر ئەیالەت (مەبەست ئەیالەتی شارەزووری سەر بە دەوڵەتی عوسمانییە-تاقانە)، ئێستا ئەوان شارۆچکەی حەسەن ئاباد (حەسەن ئاوا) یان کردووەتە پایتەخت، کە شارێکە لە نزیك هەمەدان و لەسەر رێی شەهرەزوول (شارەزوور) دایە.

سنووری (شارەزوور) بە سنووری ئەیالەتی بەغدا و ئەیالەتی مووسڵ و حکوومەتی عیمادییە (ئامێدی) و حەکاری و ئازەربایجان و عێراقی عەجەمەوە پەیوەستە.

هەروەها دەڵێ:

شارەزوور لە سی و دوو سەنجەق"لیوا"پێکهاتووە: کە ئەمانەن:

١- لیوای ئەربیل ٢ - لیوای شەمامك ٣- لیوای حەریر ٤ -

لیوای کۆیە ٥ - ئەبرومان"دواتر ئۆرمان هەیە."٦- ئوشنی ٧ - باف ٨- برەند ٩- بەلقاس ١٠- بیل ١١- ئوتاری ١٢- جەبەلی حەمرین ١٣- چنگۆڵە ١٤ - دەورامان"ناوی دیکەی داوەران"ە. ە ١- دلجوران (دۆڵ گۆران؟!! - وەرگێڕ) ١٦- سرووچك ١٧ - سەیید بەرنجین ١٨- شەهربازار ١٩- شەهرەزوور ٢٠- قەڵای عوجوور ٢١- غازی کوشان"غازی قران" ٢٢- مەرکاوە"مەرکوە"٢٣- هەزارمێرد ٢٤ - ،ڕۆدین ٢٥- مەهرووان"میهرەبان !!- مهربان ٢٦- شەمیراە (دەبێ شەمێران بێ - وەرگێڕ) ٢٧- قەرەداخ ٢٨- قزڵجە ٢٩- لیوای بەبە(بابان) ٣٠- لیوای زەنگە (دەبێ زەنگنە بێ!! بە هەڵەی چاپ نوونی دووەمی پەڕی بێ - وەرگێڕ) ٣١- لیوای کەرکووك ٣٢- ئەنجیران."[1]

ئەوەی سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیە (جیهاننما) کە نێوانی شوێنەکانی بە سەعات دیار کردووە و بۆ دێی ئەغاچلەر (اغاچلر-کە دیارە هەر ئاغجەلەر -ی ئێستایە و دواتر دێمەوە سەر باسەکە-تاقانە") کە دەڵێ: ناوی دیکەی ئەلقاس"القاص"ە و سەر بە کەرکووکە و لە مووسڵەوە بۆ شەهرەزوور تا ئەغاچلەر (ئاغجەلەر) سێ سەعاتە.[2]

بەلای ئەولیا چەلەبی (حافز محەمەد زیللی"١٦١١ - ١٦٨١ی ز") یشەوە لە"سیاحەتنامە-کەیدا، سەنجەقەکانی"ئەیالەتی شارەزوور"شەهرەزوور"لە سی و یەك سەنجەق و هەشتا و پێنج زەعامەت و هەشت سەت و شەش تیمار پێکهاتووە.[3] کەچی (هەر ئەولیا چەلەبی) خۆی لە (لاپەڕە/ ١٨٨) دا دەڵێ: ئەیالەتی شارەزوور (شەهرەزوور) بیست سەنجەقە، هەمووشیان خاوەنی دیوان و نۆکەر و بەگزادەگەلی خاوەن ئاڵای خۆیانن و سەرۆك - سەرباز"چەری باشی"یان هەیە و سەنجەقەکان ئەمانەن:

"سرووج - هەولێر (اربیل) - کەسنان - شەهر - چنگۆڵە (جنکوله) - جبل حجر (دەبێ جەبەل حەمرین بێ! - هزارود (دەبێ هەزارمێرد بێ!) - دوالحوران (دەبێ دولجوران - و چەمی گۆران -ی ئێستا بێ!) - مرکادە (مەرکاوە) - حزیر (دەبێ حەریر بێ!)

رودین - تیل طاری - سیەه زنجیر (سیه زنجیر) - عوجوور (عجور) - ئەبرومان (ابرومان) - داودان - پاق - (بەلقاس - بلقاص) - اوشتی - قلعه غازی - شارەزوور (شهرزور) سەنجەقی پاشایە"واتە پاشای لێ دادەنیشێ".[4]

وەك دەبینین لێرەشدا ناوی لیوای بەلقاس (بلقاص) دیسان هەر بەو شێوەیە ناو هێنراوەتەوە.

پەچەوی - ئیبراهیم ئەفەندی -ی پەچەوی (١٥٧٤ - ١٦٥٠ی ز) یش لە کتێبی"مێژووی پەچەوی"دا، کە باسی لەشکرکێشی و (گرتنی شارەزوور و قەڵای زەلم)ی سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی دەکات دەڵێ:

"پێشتر لە سەروبەندی لەشکرکێشیی سوڵتان بۆ سەر بەغدای پایتەختی جێنشینێتیدا، قەڵایەکی بتەو کە بە قەڵای زاڵم ناسراوە، کە دەوروبەر و لایەکانی کێوستانە و هاتن و چوونە ناوەوەی دژوار و داخراو و دەرەوە و ناوەوەی بە کوردی چیاییی (دێوئاسایی!!) یەو دەکەوێتە ناوەڕاستی وڵاتی لوڕ. بۆ گرتن و سەرپێ شۆڕکردنی وڵاتی شارەزوور، کە پێشتر بۆ دەست بەسەردا گرتنی، دامەزراندنی عوسمان پاشا و محەمەد پاشای (باڵتەچی)ی بەگی بەگگەلانی بەغدا ڕاگەبەنرا. سەربازی بەغدا و لوڕستان و هەندێك لە کوێستان کۆ کراوەتەوە و ماوەیەکی دوور و درێژ گەمارۆیان داوە. تەنانەت عوسمان پاشا لە ڕۆژانی گەمارۆودا کۆچی دوایی کردووە، لە ئەنجامدا بە چاودێریی خودای پڕشکۆی بەندان هێزی دڵی کوردە گەمارۆو دراوەکان بەرباد بوو و میرەکەیان کە ناوی سوهراب بوو، شەوێك ئامادەکاریی بۆ ڕزگار کردنی سەری خۆی کرد و قەڵای جێهێڵا و هەڵات. محەمەد پاشای ئاماژە بۆ کراویش بڕێکی لە پارێزەرانی قەڵا و دژدار دادەمەزرێنێ و ئەو قایمکارییانەی سەر بەون و ئەو قەڵایانەش کە ناویان هاوار و نقوود و پاسکە و شەمێران و فرانجە (فرەنجە) بوو گیران و جگە لەمانەش ئۆغورلو بەگ و میر یەساق بەگ لە میرانی سورخسەران، لەگەڵ دوو هەزار ماڵی عەشیرەتیان و میر محەمەد سەیف بەگ، بەگی بانە و یووسف بەگی ستارە و بوداقی بەگی برووجە و جیهانشای بەگی ئۆرخان بەگ کلیلی قەڵاکانیان ڕادەستی دەرگای پاتشای ئیسلام کرد و گوێرایەڵی و بەڵێنی بەدوو کەوتنیان دا و بەگشتی وڵاتی شەهرەزوول (شارەزوور) و (ناحیەی بەلقاص) بوونە بەشێك لەو دەڤەرە پارێزراوانەی شاهانە و دامەزراندنی حوکمداریان لەلایەن پاتشاییەوە بە نووسین داوا کردووە، کە ئەم موژدانە بە لەشکری ئیسلام گەیەنراوە خۆشیی تازە و شادیی بێ ئەندازە پەیدا بوو و موراد بەگ کە یەکێك بووە لە میرەکان، دامەزرێنراوە و نێراوەتە ئەوێ."[5]

ئەوەی لێرە مەبەستمانە لەم سی و دوو لیوایە، لیوای نۆیەمیانە کە لیوای (بەلقاس) ە کە لە هەموو ئەو سەرچاوانەدا لە شێوەی"بلقاص"نووسراوە.

## * ناوی بەلقاس:-

وەك بینیمان لەلای کاتب چەلەبی لە جیهاننوما"جهاننما"دا ناوەکە بەلقاس (بلقاص)ە.

هەموو ئەو سەرچاوانەی پێشتر باسمان لێوە کردن و سەرچاوەی کۆن و ڕەسەن و باوەڕ پێ کراون، ناوی ناحیەکە بە"بەلقاس - بلقاص"ناو دەبەن.

لیژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوە پێکهێنراوە، بۆ توێژینەوە لەو بەڵگەنامانە لەسەردەمی عوسمانییەوە ماونەتەوە، پرۆژەکە بە سەرپەرشتیی مامۆستا (د. یووسف سارینای) ئەنجام دراوە، یەك لەو پرۆژانە لێکۆڵینەوەیە لەو دەفتەرەی تەواوی ناوەکەی بەمجۆرەیە: (دەفتەری ژمارە / ٣ی تاپۆ و کادەسترۆ لە ئەرشیڤی قیوودی قەدیمە - تۆمارە کۆنەکان - دەفتەری تۆماری تێکراییی لیوای کەرکووك) ە، (٨٣) لاپەڕەیە و مێژووی لەسەر نییە، بەڵام لە توغرا - مۆری شاهانە -ی سەرەتاکەیدا ناوی"سولەیمان شای کوڕی سەلیم شای هەمیشە سەرکەوتوو"ی لێ نووسراوە کە سولەیمانی قانوونییە. وەك لێکۆڵەرەوە دەڵێ، لە سەرچاوەیەکی زۆر و جودا جودادا ساڵەکەی بە (٩٥٥ی کۆچی / ١٥٤٨ی زایین) دانراوە، لەگەڵ چەند دەفتەرێکی دیکە، کە پێوەندییان بە کەرکووك و شارەزوورەوە هەیە، یەك لەو دەفتەرانە ئەمەیە

کە بەمجۆرە باسی لێوە کراوە: دەفتەری چڕکراوەی ژمارە (٢٨٥) کە لە (٩٦٨ی کۆچی / ١٥٦٠ی زایین) نووسراوە زانیارییەکان لە هەردووکیاندا وەك یەکن، واتە هەر ئەنجامی یەك سەرژمێرین.[٦]

چەند تێبینییەك:

١ - لە لاپەڕە (١٢) وە زانیاری لەبارەی ئەو کۆمەڵە خەڵکانەوە دەدا کە لە کەرکووکدان. بە ژمارە (٨) لەلاپەڕە (١٣ - ١٤) دا باسی بەلقاس دەکا.

٢ - لەو لیستەدا کە لەبارەی باجی وەرگیراوەوە ڕێکخراوە، بە ژمارە (٥٠ - ٧٤) ناوی گوندەکانی بەلقاس تۆمار کراون. لاپەڕە (١٩)

٣ - هەر لەو لیستەی سەرەوەدا بە ژمارە (٢٠٣ - ٢٥٢) ناوی کێڵگە"مەزرەعە"کانی بەلقاس تۆمار کراوە. لاپەڕە (٢٢ - ٢٣).

٤ - لە لاپەڕە (٥١) ەوە وەرگێڕانی بۆ سەر تورکیی نوێی دەفتەری ژمارە (٣)ی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی داناوە. لە لاپەڕە (١١٣) وە باسی گوند و کێڵگەکانی بەلقاس دەکا.

٥ - لە هەموو کتێبەکەدا وەك بۆ چوونیان وایە، ناوەکەیان بە نیلقاز نووسیوە، من لەم وتارەی خۆمدا لە هەموو شوێنێکدا وەك بۆچوونم وایە، ناوەکەم بە (بەلقاز) نووسیوە!!

سەرپەرشتیارانی بڵاوکردنەوە، وەك ڕوون کردنەوەیەك - پێم وایە بە زیادەڕەوییەوە - وەك لە گەلێك ناو و شوێنی دیکەدا هەوڵی ئەوە دەدەن ناوەکان بەهەر شێوەیەك بێت ببەنەوە سەر ڕەسەنی تورك و بڵێن ئەمانە تورکن. بۆ ناوی بەلقاس - یش هەروای کردووە و بە زۆری زۆردارەکی ناوەکە دەکا بە نیلقاز.

نووسەر لە مینۆرسکی و ئەویش لە گەردیزی -ی گواستووەتەوە دەڵێ:

(یەك لەو حەوت تیرە تورکانەی بە ناوی"کیمەك - ەکان / کیمەکلەر"ەوە ناسراون و لە سەرەتاکانی سەدەی دەیەمی (زاییندا) لە ناوچەی ئێرتیشی ناوەڕاستی ئاسیادا ژیاون، ناوی"نیلهاز Nilhaz"بووە، بەم شێوەیە، تەنیا بەم لێکچوونە زۆر دوورە، بەبێ هیچ بەڵگە و سڵ کردنەوە و سەرچاوەیەکی دیکە بڕیاری ئەوە دەدا ئەم بەلقاس - ە هەر دەبێ ئەو نیلهاز - ە بێ.[٧]

لێکۆڵەرەوانی دەفتەری ژمارە (٣) دەڵێن ڕێی تێ دەچێ (ئەم تیرە و تایەفەیە (کە هەمیشە بە نیلقاز-ی دەنووسێ !!)، لەدەوروبەری ساڵی (١٥٤٠) دا هاتبنە ئێرە. بۆ ئەمەش بەڵگەی ئەوەی هێناوەتەوە کە لە دەفتەرەکانی ژمارە (١٠٢٨) و ژمارە (١٠٤٩) دا کە لەسەردەمی سوڵتان سولەیماندا واتە دوای ساڵی (١٥٣٤ی زایین) تۆمار کراون باسیان لەم تایەفەیەوە نەکردووە.[٨]

دەفتەری ژمارە (١٧٨٩٥)ی کورتەی ویلایەتی بەغدای ساڵی (٩٤٩) کە لێکۆڵەرەوە باسی دەکا دەڵێ: کەنارەکانی پەرەکانی ژاکاو و هەندێك لای نووسینەکانی نەماوە. دەفتەرەکە لە (٦٠) لاپەڕە پێکهاتووە. دەفتەرەکە بە سوود لە دەفتەرەکانی سەفەوییان ئامادە کراوە، ئەمە لەوەوە تێدەگەین کە لە سەرەتایدا نووسراوە:"دەفتەری ئیجمالی خاسسەی میری میران و میرەکان و زەعیمەکان"زوعەما"و خاوەنانی تیمار لە ویلایەتی بەغدا بەپێی دەفتەرەکانی عەجەمان لە ١٥ی شەعبانی موعەززەم ساڵی ٩٤٩ نووسراوە."

دەفتەرەکە لاپەڕەی کەمی تێدایە، لەلایەکی کەوە لێرەدا قانوونامەیەکی تایبەت بە لیواکانی بارگیری و وان و ئەرجیش و هەروەها دیباجە"پێشەکی"ی دەفتەرێکی تۆمار لە کۆتاییدا هەیە.

لە دەفتەرەکەدا (٥) زەعامەت و (١٢٠) تیماری سەر بە لیوای کەرکووکی تێدایە. لیوای کەرکووك، لە ناحیەکانی کەرکووك و داقووق و - مەوازیع"مواضع (Mevazi)"پێکهاتووە.لە بەشی تایبەت بە لیوای کەرکووکدا بەشە نووسراوەکانی بەشی چەپی خوارەوەی هەموو لاپەڕەکان بە هۆی چرچ و لۆچییان لەناوچوون. بەم هۆیەوە ژمارەی ئەو گوندانەی لە لیواکەدان دیار نەکراون.

لەو شوێنانەدا کە دەخوێنرێنەوە لە ناحیەی داقووق (١٠)، لە ناحیەی کەرکووك (٢٣) لە ناحیەی مەوازیع (٧) یەکەی نیشتەجێ بوون و لە ناحیەی داقووق (١)، لە ناحیەی کەرکووك (٢٣) دانە کێڵگە هەیە.[٩]

ئەمە هەموو ئەو زانیارییانەیە لەبارەی ئەو دەفتەرەوە باس کراوە.

دیارە هەرسێ بەشی ئەوسای لیوای کەرکووك تۆمار کراوە. ناوی (بەلقاس)ی تێدا نییە!! بەڵکو ئەو بەشەی دواتر ناوی بەلقاسی دراوەتێ دەبێ ئەو ناحیەیە بێ کە مەوازیع - یان پێ گوتووە، خۆ ئەگەر ساڵی ٩٤٩ی کۆچیی ساڵی نووسینەوەی ئەو دەفتەرە بەلقاس لە ئارادا بووایە ناوەکەیان تۆمار دەکرد. کەواتە ئەم نووسینەی کە دەڵێ: لە دەفتەری ساڵی ٩٤٩ی کۆچیدا نووسراوە"لە بری بەروبوومی گوندانی بەدەر لە دەفتەر"دەبێ دواتر خرابێتە سەر زانیاریی ناو دەفتەرەکە و من وای بۆ دەچم کە دەستەواژەیەکی وەها بۆ دەستنیشان کردنی"دۆزێکی وا بایەخدار"کە مێژووی هاتنی ئەم کۆمەڵە خەڵکەیە، پشتی زۆر پێ نابەسترێ. کە نووسەر بەم جۆرەی خوارەوە لێکی دەداتەوە:

لە دەفتەری ساڵی ٩٤٩ی کۆچی (١٥٤٢ / ١٥٤٣ی ز) دا نووسراوە: بەروبوومی تایەفەی بەلقاس، بەدەر لە دەفتەر"واتە ئەوەی لە دەفتەردا تۆمار نەکراوە"نزیکەی (٥١،٠١٧) یە، ئەمە تێماندەگەیەنێ ناوی ئەم تایەفەیە پێشتر لە دەفتەرەکاندا تۆمار نەکراوە، لەمەوە تێدەگەین ئەمانە لە ساڵانی (١٥٤٠) دا لێرە نیشتەجێ کراون. ئەمە لەلایەن ناوی کەسانیش و شوێنەکانیشەوە بایەخی هەیە. چونکە دەبێ ئەم تایەفەیە لەو شوێنانەدا کە خۆیان دایانمەزراندوون نیشتەجێ بووبن یانیش لەو گوندانەدا کە پێشتر چۆڵ کراون و ئەمان هاتوونەتە ناویەوە. ئەگەر گوندی چۆڵکراو هەبووبێ دەبێ بەر لە (١٥٣٦)ی ساڵی لەشکرکێشیی سوڵتان سولەیمانەوە بووبێ بۆ سەر عێراق، چونکە لەو دەفتەرانەدا کە لە ئەنجامی یەکەمین سەرژمێریدا هاتوونەتە کایە، نە ئەو گوندانەی لێی نیشتەجێ بوون و نە ناوی خودی تایەفەکەی تێدانییە.)[١٠]

بەڕای منی"نووسەری ئەم وتارە: هێشتا ئەو تیرە تورکەی

ناوەراستی ئاسیایە وەك خۆی گوتوویەتی"نیلهاز Nilhaz"ە نەك"نیلقاز Nilkaz"، تەنانەت ئەم ناوەی دواییشیان هەر دوورە لە ناوی"بەلقاس". بەرای من ئەم هەوڵە بەدگۆڕینەوەی بەلقاس - ە بە نیلقاز، دا نزیکی بکاتەوە لە ناوی ئەو تیرە تورکەی ناوی نیلهاز بووە، کارێکی نارەوا و نازانستانەیە، کە وەك بینیمان ئەو چەند سەرچاوە ڕەسەنە هەرە کۆنە باوەڕ پێ کراوە عوسمانییانەی نزیکی ئەو سەردەمانە بەو شێوەیەیان تۆمار کردووە.

لەلایەکی دیکەوە، هەر لەو کتێبەدا، لە باسی مەقامی شێخ ئەحمەدی هیندی -ی لای دێی سووورداشدا ناوی ناحیەکە لەشێوەی (Belkar) دەنووسێ و ئینجا بە تەکیەوە نیلقاز - ە بەدگۆڕاوەکەی خۆی دەخاتە ناو کەوانەیەکەوە، کە لاتینییەکەی بەم شێوەیەیە:

(Belkar [ Nilkaz]) [11]، دیارە ئەوەی دەرەوەی کەوانەکە بە پیتە عەرەبییەکەی پێی نووسراوە، بەلقاز - ە، جا یان خالی پیتی"ز"ێیەکەی - لەرێنووسە عەرەبییەکەیدا - لێ کەوتووە، یانیش هەر هەڵەی تایپی ئاساییە و لەگەڵ ئەو چەند سەرچاوە بەبایەخەدا یەك دەگرنەوە کە ئاماژەمان بۆ کردن. ئێمە دەفتەرەکە یان کۆپیی دەستنووسە ڕەسەنەکانی دەفتەرەکەمان لەبەر دەستدا نییە، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگانەی سەرەوە ئێمە دڵنیاین کە وشەکە دەبێ بەلقاز"بلقاص"بێ. لەبەر ئەوەی، وەك وتمان، بەڵگەی نییە و بە دەستکارییەکی نارەوا ناوەکەی لە بەلقاس - ەوە کردووەتە نیلقاز و بەم پێیەش لە کتێبەکەیدا لە هەموو جێیەکاندا هەر بەوجۆرەی نووسیوە، من لە هەموو شوێنەکاندا بە"بەلقاس"م نووسینەوە.

هەروەها نووسەری تورکی ناوبراو بوونی ناوی تورکیی کەسان و شوێنەکانی ئەم کۆمەڵە، بەبەڵگەی پشتگیریی بۆچوونی بە تورك بوونی دانیشتووانی ناوچەکە دادەنێ، کە بەپێی قسەی خۆی لە ناوی ٢٤ گوند ١٤ یان و.. لە ناوی ٥٠ کێڵگە ٣٧ یان بەتورکین و هەندێك قسەی دیکەشی کردووە. ئێمە لێرەشدا زۆر بە سادەیی دەڵێین (کە ئەوەش دەزانین داگیرکەری تورك لەژێر هەر ناو و بیانوویەکەوە بێ هەزار ساڵ ئەم ناوەی داگیر کردووە!!) ئەگەر ناوی کەسان و شوێنەکان بەڵگەی بنەچەی ئەتنیکی بن، خۆ زۆربەی هەرە زۆری ناوی سوڵتانە عوسمانییەکان بە عەرەبین و سوڵتانەکانی عوسمانیش"بەپێی ئەم جۆرە بۆچوونە نالۆجیکییە!"دەبێ عەرەب بن. کە وانییە و ئەو ناولێنانانە گەلێك هۆی دیکەیان هەیە و ئێرە جێی درێژە دان نییە بەم بابەتە.

من بەپێی ئەو بەڵگانە کە لەو ماوە دیارەدا ناوەکە دەرکەوتووە و لە دەفتەردا ناوەکە تۆمار کراوە و چەند ساڵێکی کەمی بەسەردا تێنەپەڕیوە، ناوەکە لە گۆڕێدا نەماوە، لەگەڵ نووسەرەکەدام، بەڵام ئەم ناوە وەك بینیمان لەوەوە نەهاتووە کە نووسەر دەڵێ تیرەی نیلهاس -ی لێ نیشتەجێ کراوە!! کە دێمەوە سەر ئەوەش.

هەر بۆ گریمانە دەڵێم ئەگەر وابووایە، ئەوە دەوڵەتی عوسمانی دەبوو نیشتەجێی کردبن و هیچ هۆیەك لە ئارادا نییە بۆ نەمان و ون بوونی ناویان. چونکە دەسەڵاتی عوسمانی سەدەگەلێك دوای ئەوەش لەم ناوەدا جێگیر و دەسەڵاتدار بووە.

باسێکی زۆر بە کورتیی مێژووی سیاسیی ئەو سەردەمەی ناوچەکە:

لە سنووری سەردەمی ئەم باسەدا، سوڵتان سولەیمانی قانوونی (١٤٩٤ - ١٥٦٦ی ز) فەرمانڕەوا و ئیمپراتۆری عوسمانی بووە، کە خۆیان بە"خەلیفەی پێغەمبەر و نوێنەری ڕێبازی سوننە"زانیوە و سەپاندووە. لەلایەکی دیکەوە، شاتەهماسپ -ی سەفەوی (١٥١٤ - ١٥٧٦ی زایین) فەرمانڕانی ئێرانی شیعە بووە.

ساڵی (٩٤٥ی کۆچی - ١٥٣٨ / ١٥٣٩ی زایین) سەفەوییەکان وڵاتی شیروان[12] دەگرن و فەرمانڕەواییەکەی دەدرێتەدەست ئەلقاس میرزا (١٥١٦ - ١٥٥٠ی زایین)ی براگچکەی شا تەهماسب.[13]

لەبەر ئەوەی ئەلقاس میرزا چاوی لە فەرمانڕەوایی بووە و بەوەی کە کوڕی شا ئیسماعیل بووە، خۆی بە میراتگر زانیوە، بۆیە، کاتێك کە فەرمانرانی موڵکی شیروان بووە ساردی دەکەوێتە نێوان شاتەهماسب و ئەلقاس میرزا و وردە وردە ناکۆکییەکە پەرەدەستێنێ و دەگاتە جەنگ[14]

شا تەهماسب لەشکر دەکاتە سەر ئەلقاس میرزای برای و ئەمەی دواییان دەزانێ بەرگە ناگرێ، ساڵی( ٩٥٤ی کۆچی / ١٥٤٧ - ١٥٤٨ی زایین) لە نیمچە دوورگەی قرم - ەوە بە دەریادا خۆی دەگەیەنێتە ئەستەمبووڵ و پەنا دەباتە بەر سوڵتان سولەیمانی قانوونیی عوسمانی[15]

سولاقزادە دەڵێ: ئەلقاس ماوەیەك بە سەرگەردانی دەگەرێ و ئینجا لە دەشتی قەپچاق و بەسەر نیمچە دورگەی قرمدا خۆی دەگەیەنێتە گەرووی ئەستەمبووڵ و پەنادەباتە بەر سوڵتان سولەیمانی قانوونی.

هەروەها دەڵێ: سوڵتان پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکا و ڕێزێکی زۆری لێ دەگرێ و پشتگیرییەکی باشی دەکا و دیارییەکی زۆری بۆ دەنێرێ. دوای ئەوەی دڵنیا دەبێ.. داوای جەنگی وڵاتی خۆرهەڵاتی دەکا و سوڵتانیش داواکارییەکەی پەسند دەکا. سوڵتان لەبەر ناکۆکیی ڕێبازی ئاینی چاوەڕێی بچووکترین هەل و بیانوو بووە، هاتنی ئەلقاس ئەوەی بۆ ڕەخساندووە. لەو لەشکرکێشییەدا گەلێك شار و شارۆچکە گیرا تا گەیشتە تەورێز و ئەوێشی گرت و ئامادەکاری بۆ ئەوە دەکرا ئەلقاس میرزا ببێتە حاکمی ئەو شارە. لەو کات و لەو ناوەدا سوڵتان بۆی دەردەکەوێ ئەلقاس میرزا شایەنی ئەوە نییە و هەر لەوساوە کە حاکمی شیروان بووە بەدکارییەکی زۆری لەگەڵ خەڵکدا کردووە. سوڵتان کە بەمە دەزانێ واز لە نیازی جەنگی ئێران دەهێنێ و یەکسەر لە تەورێزەوە ڕوو دەکاتە شاری وان و"بە کورتی"ئەوێش دەگرێ. محەمەد پاشای وەزیری دووەمیش بۆ پارێزگاریی بەغدا نێرا و ئەلقاس میرزاش داوای یارمەتیی کرد بچێتە سەر ئەسفەهان و قوم و کاشان کە بارخانە و گەنجینەی جۆراوجۆری شا"تەهماسب"ی لێ بووە، کە ئەمە هەلێکی چاك بووە بۆ دەستخستنی ئەوانە. سوڵتانیش لەبەر ئەوەی دڵی لێی کرمێ بوو بوو، بێ ئەوەی بیەوێ ڕووی ببینێ و بە

هیوای ئەوەی بە ئەجەلی خۆی بچێ، ڕێی پێ درا.. بەڵام بێ ئەوەی کەسێك لە سەرباز و میرەکانی لەگەڵدا بنێرێ، بەڵکو کۆمەڵێکی لە"کوردان"و ئەوانەی توانستی سوارچاکی و چالاکییان هەبوو لەگەڵیدا نێرا. لە سنووری هەمەدانەوە ڕووی کردە ئەسفەهان و ماڵ و بارەگاکانی سام و بەهرامی برایانی تەهماسب و گەلێکی دیکەی لە خانەدانانی ئەو شارە تاڵان کرد و سووتاند و بەدکارییەکی زۆری کرد و دیارییەکی بێ ئەژماری لەگەڵ نامەیەکدا بۆ سوڵتان نارد. سوڵتان ئەوانەی دیارییەکانیان پێ گەیاند بوو و ئەلقاس میرزای بە گەلێك دیاریی گرانبایی خەڵات کرد. ئەلقاس بەم خەڵاتانە گوڕ و تینێکی پتری پەیدا کرد و بەسەر قوم و کاشاندا.. تا سەر سنووری فارس چوو و هەمیشە ستەم و بەدکاریی دەکرد و وڵاتی ئێرانی سەروژێر کرد.

لەو ناوانەدا بوو سوڵتان پیاوی نارد و داوای کرد، بەڵام ئەلقاس نەیوێرا بچێ و گەلێك بیانووی بۆ هێنایەوە و هەروەها ترسیشی لە تەهماسب شای برای هەبوو بۆیە ناچار بە چیاکاندا گەڕا و لە"کەسك چنار"ی شارەزووردا گیرسایەوە. لەوێ تای لێ دێ و لەجێ دەکەوێ و پیاوانی تەهماسب شا پێی دەزانن و بەسەریاندا دەدەن و دەیگرن و دەیبەن بۆ تەهماسب شا و ئەویش دەینێرێتە زیندانی قەهقەهە و لەوێ دەکوژرێ.[١٦] خاوەنی گوڵشەنی خولەفاش کورتەیەکی لەم باسەی بە کەموکورییەوە هەر بەوجۆرە باس کردووە.[١٧]

ڕوملو – ش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە:

سوڵتانی عوسمانی بەڵێنی یارمەتیی دەدا (واتە یارمەتیی ئەلقاس میرزا – تاقانە) بۆ گرتنی ئێران و لە سەرەتادا یارمەتییەکی زۆریشی دەدا.

ساڵی (٩٥٥) کە شا تەهماسب لە ئەرزنجان بووە، سوڵتان سولەیمان بە پێنج هەزار سوارەوە لە ڕێی"کوردستان"و کەرکووك – ەوە (ئەلقاس) دەنێرێتە سەر هەمەدان.[١٨]

ڕوملو هەروەها دەڵێ:

ساڵی ٩٥٦ لە شاری قوم و کاشانەوە چووە بەغدا...... بەڵام لە ترسی ئەوەی گوێرایەڵی سوڵتان نەبوو بوو، دەرکەوت و چووە قەڵای مەریوان کە حاکمەکەی سورخاب بوو. کە تەهماسب شا بەوەی زانی لەشکرێکی بیست هەزار کەسیی کردە سەر و لە ئەنجامدا دەستگیریان کرد و دایانەوە دەست شا، کە ناردییە قەڵای قەهقەهە و لەوێ کوژرا.[١٩]

پەچەوی وردەکاریی دی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:

ساڵی ٩٥٦ (نامەی سوڵتانی) بۆ ئەلقاس میرزا نێرا و بانگهێشت کرا، بەڵام لەبەر ترس و دڵەڕاوکێی لە سوڵتان پاساوی هێنایەوە و داوای لێبووردنی کرد و لەبەر ئەوەی سۆفی محەمەد پاشای وەزیری سێیەم کە نێوانی لەگەڵ ئەلقاس باش نەبوو بە پارێزگاری بەغدا دامەزرابوو نەکرا بچێتەوە بەغداش و تێیدا بمێنێتەوە، داوای ئەوەی کرد لە سایەی ئەبەربەنام (ابربنام!؟) بەگی یەك لە میرە کوردەکاندا بێ و لەو شوێنەدا خێوەت و بارەگای خست کە ناوی"کەسك چنار"بوو. کە لەگەڵ ئەو تاقمە گومڕێیەدا نیشتەجێ بوو تای لێ هات و لەجێ کەوتبوو. سوهراب –ی برای میری ناوبراو بەوەی زانی، بە لەشکرەوە بەسەریدا دا و گرتی و ڕادەستی تەهماسب شای کرد و نێرایە زیندانی قەهقەهە و لەوێ کوژرا و لەناو چوو.[٢٠]

مەبەستمە بڵێم: هەر وەك بینیمان میر ئەلقاس میرزا کە ساڵی (٩٥٤ی کۆچی – ١٥٤٧ – ١٥٤٨ی زایین) پەنا دەباتە بەر سوڵتان سولەیمانی قانوونی، سوڵتان پێشوازییەکی چاکی لێ دەکا و یارمەتییەکی چاکی دەکا، من وای بۆ دەچم یەك لەو یارمەتییە گەورانەی سوڵتان ئەوە بووبێ ئەو ناوچەیەی بۆ بژێوی و خەرجیی ئەلقاس میرزا و دانیشتنی ئەوانەی سەر بەو بوون تەرخان کردبێ (لە شێوەی بۆ دابڕینەوە – ئەقتاع –) و هەر بۆیە ناوی (ئاغجەلەر) کە ناوەندی ناوچەکە بووە و وەك بینیمان"جیهاننوما"دەڵێ ناوی دیکەی"ئەلقاس"بووە، واتە هەر بەناوی ئەلقاس میرزاوە نراوە.

وەکی دی، لەو باسانەوە دیارە پێوەندییەکی زۆری لەگەڵ کورددا بووە و لەگەڵیاندا تەبا بووە، بەتایبەتی لەگەڵ کوردی ئەو ناوچەیەدا کە بە"بەلقاس"دانراوە. لە کاتی تەنگانەدا چووەتە"چیاکانی کوردستان"و ئەم خاڵانەی لە سەرەوە باسمان کردوون بە بیرماندا دێنەوە:

کە چووەتە سەر هەمەدان و جەنگی بەرپا کردووە. بەسەر کوردستان و کەرکووك – دا ڕەت بووە.

بەتایبەتی کە ئەوسا لەگەڵ سوڵتان سولەیماندا زۆر تەبا نەبووە، سوڵتان سەرباز و میری فەرمیی لەگەڵدا نەناردووە، بەڵکو ئەوەی پەسند کردووە، کۆمەڵە کوردێکی لەگەڵدا بنێرێ.

لە کۆتاییشدا، کە نێوانی لەگەڵ سوڵتان سولەیمان و"سۆفی محەمەد پاشای وەزیر"دا باش نەبووە،

نەیتوانیوە بچێ و لە بەغدا دابنیشێ، ناچار بووە داوای مانەوەی لەژێر سایە و پارێزگاریی میر"ئەبربەنام !!"ی یەك لە میرە کوردەکانی کردووە و لەو شوێنەدا خێوەتگای هەڵداوە کە پێیان گوتووە"کەسك چنار"[٢١]، کە وەك لە ڕیزبەندیی گوندەکانی دەڤەری بەلقاس – دا وەك کێڵگەیەکی سەر بە گوندی تولەکدان باس کراوە و هەموو ئەو دەڤەرەش بەشێك بووە لە وڵاتی شارەزوور.

*** ناوی بەلقاس:-**

وەکو گوتم، زۆر پێی دەچێ سوڵتان سولەیمانی قانوونی لەسەرەتای پێشوازییە گەرمەکەیدا، بەپێی نەریتی ئەو سەردەمە. ئەو ناوچەیەی بۆ ئەلقاس بڕیبێتەوە بۆ بژێوی و خەرجی.

بەوەی کە زمانی فەرمیی نووسین و پێوەندییەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا فارسی بووە، بە ناوچەکەیان گوتووە"بائەلقاس – با + ئەلقاس"واتە بۆ ئەلقاس یان لەگەڵ ئەلقاس و بائەلقاس لەسەر زماندا لە ئەنجامی گۆکردندا بووەتە"بەلقاس".

بەپێی لێکۆڵەرەوە تورکەکە ناوی"بەلقاس"لە دەفتەری ژمارە / ٣ دا نووسراوە کە وەك لێکۆڵەرەوەکە دەڵێ لە سەرچاوەیەکی زۆر و جودا جودادا ساڵەکەی بە (٩٥٥ی کۆچی / ١٥٤٨ی زایین) دانراوە. واتە ساڵێك دوای ئەوەی ئەلقاس میرزا پەنای بردووەتە بەر سوڵتان سولەیمانی قانوونی.. پێشتر ئەو ناوە

نەبووە و دواتریش ناوەکە بەرچاو ناکەوێتەوە. هەر بەقسەی لێکۆڵەرەوەی تورك: لەو لێکدانەوانەی ناو دەفتەرەکە و پارچە کاغەزە نووسراوە بۆ زیادکراوانەی ناو دەفتەری ژمارە (٣)ی سەنجەقی کەرکووکەوە بۆمان دەردەکەوێ دوای ئەمەش تۆماری دیکە ڕێك نەخراوە..[٢٢]

ڕووداوە مێژووییەکە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە هەر لەو ماوەیەدا ئەو ناوە بەسەر ناوچەکەدا سەپێنرابێ و هەر کە ئەو بارودۆخە کاتییە ناجێگیرە نەماوە ناوەکانیش گەڕاونەتەوە سەر دۆخی جاران و بووەتەوە بەشێکی دانەبڕاو لە شارەزوور و کەرکووك و هەندێك ناو وەك سەرەداوێکی ڕاستییەکانمان بۆ ماوەتەوە و هیچی دی.

دەفتەرەکە دەڵێ: تایەفەی بەلقاس کە گەورەترین تایەفەیەکن لەوانەی لە کەرکووك ژیاون لەم گوندانەی خوارەوەدا ژیاون: ئاغجەلەر، چوچوردی بوزورگ، مەتفەق، سوسلو، کەریتان،"مەحموود نووری"،"گوێك تەیە"، چوچوردی گچکە، تولەکدان، شوهوودی کۆمو، بابەك، گویللیجە، قازان ئوتاغی، - قازی کەندی =، گویرجیلەر، قورد دەلیگی"واتە: کونە گورگ"، کەلە باش، عەبدال (هەروەها بە شێوەی عەبدالان) یش نووسراوە.[٢٣] ، قەلەندەر، عومەر کۆمو، سووورداش بە(سووری تاش) نووسراوە. بەڵام ئەو خستنەپاڵەی نێوانی دوو وشەی سوور و تاش دایە لە ناو کەوانەدا نووسراوە کە نیشانەی ئەوەیە خۆیان بۆیان زیاد کردووە بەمجۆرە (Sur[i]taş)، گەچینە =، قاپچیقای[٢٤] ئەوجوش، مەلیك کەندی"مەڵکەندی!"[٢٥]

هەروەها لەم کێڵگانەی خوارەوەدا خەریکی کشتوکاڵ بوون: "قزڵجە – قشلاق، هەتوان، یولووکی، تۆپراق، ئوڵو – قشلاق، قازی – کەندی، چوبەکلو، بەکر – کەند، قزل – دەرە، ئەشەك – مەیدانی، کەهریز"کارێز"، خۆجالار، چنار، تەلوو، تولەك – خەرابەسی، بوغوت، بۆغامش، کەسوك – چنار، گەلین – ئاغاجی، ئەڤەردی، بەیات، چامی، بۆستانگاە، قزل – دەرە – چایی، کەهریزجوك (؟)، ئیمیزجە، جانگی – ئەغاجی، ساتی – باغ، تورکمەن – باغی، قەرە – ئینجیر، دێوە – بۆینو، نارلوجە، مەنسوور – بولاغی، ناسر – ماسر"ئەمرۆ: ناسر میسر"، قوش – دەرە، کەوەرگە – دەرە (؟)، یارمجە، تاش – بولاق، ئاغ – بولاق، چنارە، دینار، مرووەت، گوێك ، گوێك قزجە!!، گوێك تەپە"لای قوتبیش سەر بە ئاغجەلەرە"، بوغورد، بۆغامش"نزیك ئاغجە قەڵا"ی سەر بە نیلقا،ن، ئیکیزجە، چەرم – گاڤ"چەرمەگا"، عەسکەر، ئاغ – بولاق.

گەنم و جۆ و گەنمەشامی و نیسك و لۆکە لە ناوچەکەدا پێدەگەیەنرێ و تەونکاریش دەکرێ و ئاژەڵی گەورە و گچکە پەروەردە دەکرێ.(١٥٧,٣٧٦) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە. نێرینەی پێگەییویان (١,١٢١) کەس و ڕەبەنیان (٩٥) کەسن و کۆی گشتییان(١,٢١٦)کەسن.تایەفەی بەلقاس(١٦,٦١٢٪ی نێرینەی پێگەییوی سەنجەقی کەرکووك پێکدەهێنن.[٢٦]

*** گوند و کێڵگەکانی دەڤەری بەلقاس:**

تێبینی: دیارە لەسەردەمی عوسمانیدا ڕێکخستن و پایە و پلەی شار و شارۆچکە بەم شێوەیە بووە: لیوا (یانیش ناوەندی لیوا) یەکەی گەورە بووە، ئینجا شار و ئینجا شارۆچکە (ناحیە) ئینجا گوند (قەریە – قریە) و ئینجا کێڵگە (مەزرەعە – مزرعە)، نووسەر لێرەدا باسی سەرژمێر و دانیشتووانی گوندیشی کردووە، بەڵام بۆ کێڵگەکان، لەو گوندانەدا کە سەر بە دەڤەری بەلقاس – ن تایەفەی بەلقاسیان تێدا نیشتەجێ بوون و کێڵگەکانیشیان دەچاند:

**١ – گوندی ئاغجەلەر:**

لە حەفتا و سێ خێزاندار و حەوت ڕەبەن"سەڵتە زەلام) پێکهاتووە. دێیەکە دوو کویخای لێ بووە. ئەم کێڵگانەی خوارەوەیان چاندووە:

قزڵجە قشلاقی هەتیان، پانووکی، تۆپراق و ئوڵو قشلاق"قشلاقی گەورە"[٢٧]

گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکەیان بەرهەمهێناوە. لەو بەرهەمە باس کراوانە لەگەڵ ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و"لەخۆڕایی"[٢٨] و سوورانە و لە ماڵان (٣,٥٣٠ ئاقچە) (١٥) باجیان لێ وەردەگیرا.

**٢ – گوندی چوهووری دیزەك ١١٤( چوچوردی گەورە ):**

کە ناوی دیکەی خۆربەیان (Hor–beyan) بووە، تایەفەی بەلقاسی تێدا دانیشتوون و ئەم گوندە لە شەست و چوار خێزاندار و هەشت ڕەبەن پێکهاتووە. دێیەکە یەك کویخای بووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە بەرهەم هێنراوە، لەم بەرهەمانە و لە تەونکاری و بەخۆڕایی و سوورانە و فرن"تەندوور"و ئاش و لە ماڵان بری (٦,٦٢٤ ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە. موڵکی"خۆربەیان"کە ئێستاکە چوچوردی بزورگی پێ دەڵێن، بەپێی بەڵگەی شەرعی لەلای میر داودە. ل/ ١١٥.

**٣ – گوندی مەتفەق:**

ئەم گوندەی لە ("٥٦"٥٨) ماڵی خێزاندار و پێنج ڕەبەن پێکهاتووە. یەك کویخا و یەك کەر و یەك کوێری هەبووە و بەروبووی گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و نیسك و گەنمەشامیی سپی و سوور بەرهەم هێنراوە. ئەم بەرهەمانە و لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و خۆڕایی و سوورانە و ئاش و ماڵەکان بری ٨,٦٤٨ ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

خانووی فەرمی (٢٨٠) ئاژەڵی فەرمی (٢٢٥) لەوەرگە"مەراعی"مەبەستیان لە مەڕ"مێیینە"بووە (٢٣٥) جۆڵای فەرمی (٤٠) تەونکاری فەرمی (٣٠) هەلاجی فەرمی (٥) خۆڕایی و باجی سوورانە (٥٠٦). گەنم (١٩) تەغار بایی (٢,٨٥٠) – جۆ (٤٩) تەغار بایی (٣,٤٣٠) – قۆزاخە لۆکە (٥) وەزنە بایی (١١٢)

ئاسیاوی خان ئەحمەد – باب / ١ – باج/ ٤٠. گەنمەشامی و دوخن (٩) تەغار بایی (٧٤٠) – نیسك (١٠) وەزنە – بایی (٧٥) – گەنمەشامی (١) تەغار – بایی (٨٠).

**٤ - گوندی سوسلی و کەریتان:**

لە (٢٥) ماڵی خێزاندار و (٥) رەبەن پێکهاتووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکەی لێ بەرهەم هێنراوە، لە تەك ئەم بەروبوومە باسکراوانەوە لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و خۆرایی و سوورانە و ئاش و لە ماڵان بڕی (٩٣٧) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

**٥ - گوندی کەریتان:**

لە (١٢) خێزاندار و (٥) رەبەن پێکهاتووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و گەنمەشامیی لێ بەرهەم هێنراوە. لەتەك ئەمبەرهەمانەوە لە ئاژەڵ و تەونکاری و خۆرایی و سوورانە و ئاش و ماڵان (٨٦٧) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

**٦ - گوندی مەحموود نووری:**

لە (٥٩) خێزاندار و (١٣) رەبەن پێکهاتووە. ئەم گوندە یەك کوێری لێ بووە. لە گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە و نیسکی بەرهەم هێنراو، لەگەڵ ئەم بەرهەمانەدا ئاژەڵی گەورە و گچکەی بەخێو کراو و تەونکاری و خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٥,٦٢٥) ئاقچە باج وەردەگیرێ.

کێڵگەی بەکر کەندی، لە تەك ئاغجەداغ، نزیکی چانکاڵ ئاغاچ و قزڵ دەرە و ئەشەك مەیدانی

کێڵگەی کارێز"کەهریز"و کێڵگەی کوچوکچنار و کێڵگەی راس - یە

کێڵگەی دیوان / کێڵگەی حاجی قەرە و قەرە بولاق

کێڵگەی خۆجالار و چنارتەلو و تولەك خرابەسی"کەلاوەی تولەك"

**٧ - گوندی گوێك تە پە"گۆپ تە پە!"و کێڵگەی بوغوود و بۆغامش لە نزیك ئاغجەقەڵا :**

لەگەڵ کێڵگەکانی بوغوود و بۆغامش پێکەوەیە. لە(٦٥) ماڵەخێزان و (٥) رەبەن پێکهاتووە. یەك کوێخای هەیە. لەناو خەڵکەکەدا یەك کورد!! تۆمار کراوە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە بەرهەم دەهێنرێ. لەگەڵ ئەم بەروبووەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (١٠,٠٠٠) ئاقچە باج وەرگیراوە.

**٨ - گوندی چوچوردی گچکە :**

لە (٦٥) ماڵی خێزاندار و (٥) رەبەن پێکهاتووە. ئەم دێیە یەك کوێخا و یەك کوێری لێیە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە بەرهەم دەهێنن. لەگەڵ ئەو بەروبوومەدا لە تەونکاری و ئاژەڵی گەورە و گچکە و بە خۆرایی و سوورانە و لەماڵان (٥,٢٧٢) ئاقچە باجی لێ وەرگیراوە.

**٩ - گوندی تولەکدان:**

لە (٤٦) خێزاندار و (٣) رەبەن پێکهاتووە. لەم دێیەدا یەك کوێخا و یەك کوێری لێیە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخەلۆکە بەرهەم دەهێنن. لەگەڵ ئەم بەرهەمانەدا، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و لەخۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٢,٧١٩) ئاقچە باج وەرگیراوە.

کێڵگەی کەسك چنار و گەلین ئاغاج و ئەڤێردی

کێڵگەی نەبات چامی (بەیات چامی)

کێڵگەی بۆستانگاه

کێڵگەی خری قزڵ دەرە"قزڵ دەرە چایی"

**١٠ - گوندی شوهوود کۆمۆ:**

لە (١٢٢) خێزاندار و (٧- ٨) رەبەن پێکهاتووە. لە گوندەکەدا یەك کوێخا هەیە. هەروەها (١٠) دانە ماڵە سەیدی لێیە. تێکرا (١٣٢) ماڵی خێزاندار و (٧) رەبەنی لێیە. کێڵگەکانی ئاغ بولاق و چنارە و دینار و موروومت و گوێك ئیکیزجە و چەرم - گاڤ"چەرمەگا!"لەلایەن خەڵکی ـ ئەم دێیەوە دەچێنرێن. گەنم و جۆ و قۆزاخەلۆکەی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبووانەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و بۆیاخخانە و ئاش و لەخۆرایی و سوورانە و لەماڵان (١٥,٧٩٦) ئاقچە، باج وەرگیراوە.

**١١ - گوندی بابك:**

لە (٦٨) خێزان و (١) یەك رەبەن پێکهاتووە. گوندەکە یەك کوێری لێ بووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە و نیسك -ی لێ بەرهەم هاتووە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەدا، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و ئاش و لەخۆرایی و لە ماڵان (٨,٣١٧) ئاقچە باجی لێ وەرگیراوە.

**١٢ - گوندی گویللیجە :**

لە (٥٩) خێزان و (٧) رەبەن پێکهاتووە. لە گوندەکەدا دوو کوێخا هەبووە، کێڵگەکانی عەسکەر و ئاقبولاق و خەڵکانی ئەم دێیە کشتوکاڵیان لێ کردووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و گەنمەشامی بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومانەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و لەخۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٦,٧٥٢) ئاقچە باج وەرگیراوە.

**١٣ - گوندی قازان ئۆتاغی:**

لە (٣٤) خێزان و (٥) رەبەن پێکهاتووە. یەککوێخای لێ بووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و نیسك و گەنمەشامیی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و لە خۆرایی و سوورانە و ئاش و لە ماڵان (٢,٤١٢) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

**١٤ - گوندی قازیکەندی:**

لە (٦٠) خێزاندار و (٦) رەبەن پێکهاتووە. دێیەکە یەك کوێخای لێیە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و نیسك و گەنمەشامی بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروموومەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و لە خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٧,٨٢٢) ئاقچە باج وەرگیراوە.

**١٥ - گوندی گویرجیلەر"واتە : گورجییان":**

لە (١١) خێزان و (١) یەك رەبەن پێکهاتووە. یەك کوێخای لێ بووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکە و نیسك بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و لە خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (١,٤٢٠) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

**١٦ - گوندی مەلیککەندی"مەلکەندی!!":**

لە (٦٢) خێزان و (٥) رەبەن پێکهاتووە. یەك (کەلاسجی؟!)ی لێ بووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و گەنمەشامی و نیسك و نۆك -ی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەدا لە لەوەرگە و ئاژەڵی گەورە و گچکە و ئاش و تەونکاری و هەلاج و قۆزاخە لۆکە و لە خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٧,١٢٠) ئاقچە باجیان لێ وەرگرتووە.

١٧ - گوندی قورت دەلیگی"بە تورکی واتە:
کونەگورگ": لە (٢٦) خێزان پێکهاتووە. گەنم و جۆ گەنمەشامی قۆزاخە لۆکە بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەم بەروبوومەدا، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و لە خۆرایی و لە ماڵان (١,٥٨٥) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

١٨ - گوندی کەلە باش:
لە (٢٣) خێزان پێکهاتووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکەی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەم بەروبوومانەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و هەلاجی و لەخۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (١,٤٨٨ * ئاقچە باجی لێ وەرگیراوە.

١٩ - گوندی ئەبداڵ:
لە (٥٣ - ٥٤) خێزان و (٣) رەبەن پێکهاتووە. گەنم و نیسك و قۆزاخە لۆکە و گەنمەشامی و جۆ - یان بەرهەم هێناوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەی باس کران، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و هەلاجی و لە خۆرایی و سوورانە و ئاش و بۆیاخخانە و لە ماڵان (٦,٢٥٥) ئاقچە باج وەرگیراوە.

٢٠ - گوندی قەلەندەر:
لە (٣٨) خێزان و (٣) رەبەن پێکهاتووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە و گەنمەشامیی لێ بەرهەمهێنراوە. لەگەڵ ئەو بەرهەمانەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و تەونکاری و هەلاجی و ئاش و لە خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٤,٣٠٧) ئاقچە باجی لێ وەرگیراوە.

٢١ - گوندی عومەر کۆمو:
لە (٨) خێزان پێکهاتووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکەی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومانەدا، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و هەلاجی و لە خۆرایی و لەماڵان (٤,٢٠٧) ئاقچە باجی لێ وەرگیراوە.

٢٢ - گوندی سووورداش:
لە (٩) خێزان پێکهاتووە. یەك کوێخای هەبووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و قۆزاخە لۆکەی لێ بەرهەمهێنراوە. لەگەڵ ئەو بەروبوومەی باسیان لێوە کرا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و هەلاجی و لە خۆرایی و سوورانە و لە ماڵان (٩٣٧) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

٢٣ - گوندی گەچینە:
لە (٢٨) خێزان (٣) رەبەن پێکهاتووە. لە دێیەکەدا یەك کوێخا هەبووە. گەنم و جۆ و قۆزاخە لۆکە بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەم بەروبوومەی باسیان لێوە کرا، لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و هەلاجی ولەخۆرایی و لە ماڵان (١,٦٩٥) ئاقچە باجیان لێ وەرگیراوە.

٢٤ - گوندی قاپچیقای:
لە (٦١) خێزان پێکهاتووە. لە گوندەکەدا یەك کوێخا هەبووە. گەنم و جۆ و گەنمەشامی و نیسك -ی لێ بەرهەم هێنراوە. لەگەڵ ئەم بەروبوومەدا لە ئاژەڵی گەورە و گچکە و لە تەونکاری و خەلاجی و لە خۆرایی و سوورانە و ئاش و لە ماڵان (٤,٧٣٥) ئاقچە [٢٩] باجیان لێ وەرگیراوە. [٣٠]

* پەراوێزەکان:
(١) جهاننما - لاپەرە / ٤٤٥.
(٢) جهاننما - بەرگی (٩) - لاپەرە / ٤٣٥
(٣) ئەولیا چلبی - سیاحتنامە - بەرگی یەکەم - لاپەرە / ١٧٥
(٤) سەرچاوەی پێشوو - لاپەرە / ١٨٨.
(٥) تاریخ پچوی - لاپەرە / ٣٢٧ - ٣٢٨
(٦) س. پ - ل / ٣
(٧) لێکۆڵینەوە لە دەفتەری ژمارە / ٣ - ل / ١٣
(٨) لێکۆڵینەوە لە دەفتەری ژمارە / ٣ - لاپەرە / ١٣-١٤.
(٩) س. پ - ل/٥.
(١٠) سەرچاوەی پێشوو - ل / ١٣.
(١١) سەرچاوەی پێشوو - لاپەرە / ١٢٤
(١٢) شیروان: هەرێمێکە لەولای رووباری کەر لەسەر دەریاچەی قەزویندا شارە گەورەکەی"شەماخی"یە. بۆ زانیاریی پتر بروانە: لسترنگ - بلدان الخلافة الاسلامية - ل / ٢١٤.
(١٣) روملو - احسن التواريخ - ل / ٣٧٥ - ٣٧٦.
(١٤) تاريخ سولاقزاده - ص / ٥٠٥ - ٥٠٦.
(١٥) مێژووی پەچەوی ل / ٢٦٧.
(١٦) تاريخ صولاقزاده - بە کورتی لە ل / ٥٠٧ - ٥١٢
- هەروەها بروانە: مێژووی پەچەوی - ب ١ - ل/ ٢٧٧
(١٧) بروانە:
- نظمي زاده مرتضى افندي - گلشن خلفا - دار الطباعة المعمورة - قسطنطينية - ١١٤٣ هـ - ص (٦٢ ب - ٦٣ ا)"چاپی تورکی".
- نظمي زاده مرتضى افندي - گلشن خلفا - ترجمة موسى كاظم نورس - مطبعة الاداب النجف الاشرف - ١٩٧١ - ل / ٢٠٢."چاپی عەرەبی".
(١٨) بروانە:
رومل‍و - احسن التواريخ - ل (٤٣٣)
هەروەها بروانە:
http://www.iranicaonline.org/articles/alqas-alqasb-alqas-mirza-safawi
(١٩) رومل‍و - احسن التواريخ - ل / ٤٣٩ - ٤٤٠
(٢٠) تاريخ پچوی - ج ١ - ل / ٢٨٢ - ٢٨٣
(٢١) لە لێکۆڵینەوەکەدا باسی گوندی تولەکدان -ی سەر بە ناوچەی بەلقاس! دەکات، کە دێتە سەر یەك لەو کێڵگانەی ئەم ناوچەیە، بە کەسویك چنار"Kesük çınar"ی ناودەبا، (ل / ١١٨ی لێکۆڵینەوە لە دەفتەری ژمارە / 3). کە بە تورکی چناری براو دەگەیەنێ. لە کاتێکدا بە رێنووسی کۆن و پیتە عەرەبییەکان دەبێ نووسرابێ"کسك چنار"، ئەمەش جگە لەوە دەکرێ بە"کەسك چنار"بە کوردی واتە: چناری سەوز بخوێنرێتەوە و بە کەسویك- یش بخوێنرێتەوە، وەك لێکۆڵەرەوە تورکەکە خوێندوویەتییەوە.

من کەسك چنار – ە کوردییەکە بە شیاوترو راستتر دەزانم، بەوەی کە ناوچەکە ناوچەیەکی کوردنشینە و وەکو بینیشمان هەر لەو سەردەمانەشدا (ئەبەربەنام)ی میری کوردی لێ دەسەڵاتدار بووە، ئەگەر نا ئەلقاس داوای پارێزگاریی ئەوی نەدەکرد.

(٢٢) د. یووسف سارینای – لێکۆڵینەوە لە دەفتەری ژمارە / ٣ – ل / ٣

(٢٣) دەفتەری تۆماری ژمارە / ٣ – لاپەرە / ١٩ پەراوێزی ژ / ١٢٦.

(٢٤) دەفتەری تۆماری ژمارە / ٣ – لاپەرە / ١٤.

(٢٥) رەنگە ئەمە مەڵکەندیی بنەمای شاری سلێمانی بێ – تاقانە.

(٢٦) دەفتەری تۆماری ژمارە / ٣ – لاپەرە / ١٤

(٢٧) لێکۆڵەرەوە لە لاپەرە (٢٩) دا ناوی ئەو کێڵگانەی بەوجۆرە نووسیوە، واتە:
قزلجە قشلاقی هەتیان، پانووکی، تۆپراق و ئولو قشلاق"قشلاقی گەورە"
لە لاپەرە (١١٤) دا ناوی ئەو هەر ئەو کێڵگانەی بەمجۆرە نووسیوە:
کێڵگەی قزلجە – قشلاق و هەتبان و یولووکی و تۆپراق و ئولو – قشلاق

(٢٨) لەخۆرایی: لە تورکیدا زاراوەی – بادهوا / بادی هەوا بەکار براوە، دیارە زاراوەیەکی لێکدراوی فارسی و عەرەبییە لە کوردیدا واتاکەی دەکاتە: بای هەوا – کە واتەی خۆرایی دەگەیەنێ. لێرە لە دەقەکەدا بۆ ئەو جۆرە باجە بەکارهێنراوە کە لەسەردەمی عوسمانیدا لە قازانجی ئەو گوندنشینانە وەرگیراوە، کە زەوی و زاریان بەدەستەوە نەبووە.
بروانە:
– http://www.bulmacasozlugu.net/Sozluk/BADIHAVA
– http://www.topragizbiz.com/showthread.php/41-osmanli-kulturundeki-bazi-terimler-ve-turkce-anlamlari

(٢٩) ئاقچە:
ناوی ئەو دراوە بووە لە کاتی خۆیدا لەبەردەستان بووە. ناوەکە لە ئاقچە: بە تورکی واتە سپی – یەوە هاتووە و بە دراوی زیو گوتراوە.
ئەو ئاقچانەی لەسەردەمی سوڵتان یاوز و سولەیمانی قانوونیدا لێدراون، پێنجیان درهەمێك بووە و واتە هەر یەکەیان نزیکەی (سێ قیرات و نیو) بووە، عەیاریشیان (٨٥) بووە. لەم سەردەمەدا لە"کوردستان"و سووریە و میسر و حیجاز و قەفقاسیا و ئازەربایجان و عێراق و یەمەن و تەرابلوسغەرب و توونس – دا"دەربخانە – واتە شوێنی سکە لێدان"کراوەتەوە و سکە لێدراوە. سکەی هەر یەك لەم شوێنانە لەوی دیکە جودابووە،
بۆ زانیاریی زیاتر و فراوان بروانە لاپەرە (32) بەولاوەی:
OSMANLI TARİH DEYİMLERİ VE TERİMLERİ SÖZŞÜĞÖ C:I – Mehmet Zeki Pakalın – Milli Eğitim BakanlığıYayınları – İSTANBUL – ١٩٩٣.

(٣٠) دەفتەری ژمارە (٣) لاپەرە (٢٩ – ٣١).
– زانیارییەکانی کێڵگەکان لە لاپەرە (١١٥ – ١١٧) وە گواستراوەتەوە.

سەرچاوەکان:

( ١) کاتب چەلەبی"مستەفا حاجی خەلیفە – جیهان نوما – چاپی یەکەم – ساڵی ١١٤٥ی کۆچی – ١٧٣٢ / ١٧٣٣ی ز – بە چاپی ئیبراهیم موتەفەرریقە ناسراوە.

(2) اولیا چلبی"محمد ظلي ابن درویش – سیاحتنامه – برنجی جلد – طابعي: احمد جودت – در سعادتده"إقدام"مطبعه سي – ١٣١٤.

(٣) ئیبراهیم ئەفەندیی پەچەوی – تاریخ پچوی – ٢ جلد – مطبعەء عامرة – ١٥ صفر سنه ١٢٨٣.

(4) لێکۆڵینەوە لە دەفتەری ژمارە / ٣ی تۆماری تێکرایی لیوای کەرکووك"سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی"کە ئەمەیە:
III NUMARALI KERKÜK LİVÂSI MUFASSAL TAHRÎR DEFTERİ – (Kanûnî Devri)'Dizin, Transkripsiyon ve Tıpkıbasım'ANKARA– 2003

(٥) کی لسترنج – بلدان الخلافة الشرقية – ترجمة: بشير فرنسيس و كوركيس عواد – مؤسسة الرسالة – الطبعة الثانية – بيروت (١٤٠٥ هـ – ١٩٨٥ م)

(٦) حسن بيك روملو – احسن التواريخ – تصحيح دكتر عبدالحسين نوائى – چاپخانه حيدرى ١٣٥٧.

(٧) محمد افندى صولاق زاده – صولاق زاده تاريخى – باب عالى جوارنده (محمود بك) مكبعه سنده – استانبول – ١٢٩٧

(٨) – نظمي زادة مرتضى افندي – كلشن خلفا – دار الطباعة المعمورة – قسطنطينية – ١١٤٣ ه (چاپی تورکی)
– نظمي زادة مرتضى افندي – كلشن خلفا – ترجمه موسى كاظم نورس – مطبعة الاداب – النجف الاشرف ١٩٧١. (چاپی عەرەبی)

پێگە ئەلکترۆنییەکانی:
– http://www.iranicaonline.org/articles/alqas-alqasb-alqas-mirza-safawi
– http://www.bulmacasozlugu.net/Sozluk/BADIHAVA
– http://www.topragizbiz.com/showthread.php/41-osmanli-kulturundeki-bazi-terimler-ve-turkce-anlamlari
– OSMANLI TARİH DEYİMLERİ VE TERİMLERİ SÖZŞÜĞÖ C:I – Mehmet Zeki Pakalın – Milli Eğitim BakanlığıYayınları – İSTANBUL – 1993.

*** لیوای کەرکووك لە وەسفی گۆڤاری (لغة العرب)دا:-**

کەرکووك شارۆچکەیەکی کۆنە، نزیکەی ١١٦٠ هەزار و سەدوشەست پێ لە رووی دەریاوە بەرزە ئەگەر هەقی کۆنیی خۆی بدرێتێ، خاوەندەکەی زۆری لەسەر دەکەوێ، چونکە سەرچاوەگەلی وەهای مێژوویی نین پشتیان پێ ببەسترێ، دوو کتێبی کۆنی کلدانی لەو کتێبانەن کە ناویی تێدا هاتوون: یەکیان مەتران ئەدی شێر سالی ١٨٩٦ کردییە تورکی، بەبێ ئەوەی ناوی خۆی بێنێ. نوسخە تورکییەکە هێشتا دەستنووسە و لە کلێسەی کلدانی کەرکووك پارێزراوە.
ئەوی دیکە ناوی (هەوالی شەهیدان - أخبار الشهداء) ە و نوسخەیەکی زۆر دەگمەنە، بابە بۆلس بێجان لە لایبسك (ئەلمانیا) لە چاپی داوە. باسی ئەوە لەم دوو کتێبە گرانبەهایەدا، کراوە کە سەردناپالی پادشای ئاشوورییەکان بوو ئەم شارەی بنیاتنا. هۆی دامەزرانەکیشی ئەوەیە کە ئەفسەرێکی "ئارپاق" ناوی مادەکان، رۆژێك لە حکوومەتەکەی یاخی بوو، سەردناپالیش لە وەزیفەکەی دەریکرد و فەرمانی دا شارێك بنیات بنرێ، ئەمە ئەو شارەیە کە پاشتر ناونرا (کەرکووك) لە دەڤەری (باجرمێ) و پیاوێکی "گرمێ" ناویشی لەسەر کرد بە حاکم. پاشان هەزار کەسی ئاسووریی هێناو لێی نیشتەجێ کردن. ئیدی ئاوەدانیی فراوان بوو و جێ و رێی بەرزبووەوە، بەلام گرمێیش پاش ماوەیەك سەربەخۆ ویلایەتەکەی هەلسووراند و بووە حاکمی رەهای ئەو ولاتە، وێڕای ئەوەیش جاروبار سەری لە ئاسوورییەکان دەدا. ئەمجا حوکمی عێراق چووە دەستی "ئەسکەندەری گەورە" و کەرکووکیش کەوتە ناو قەلەمڕەوی ناوچەکانی مەملەکەتەکەی، کە ئەسکەندەر مرد و هەر سێ فەرماندەکەی (بەتلیمۆس و سلۆکس و ئەنتیکۆس) بەو شێوەیە کە مێژوو دەیزانێ، ولاتەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد، کەرکووك بووە بەرکەوتی سلۆکس، ئەویش بینا پەرپووتەکانیی رماند و شوورایەکی گەورەی بۆ دروستکرد و ٦٥ بورجی گرنگی بۆ دانا و ئاوەدانییەکی بە فراوانی پەل پێ هاویشت و دوو دەرگای تێدا کردەوە، ئەوەی باکوور ناونا (تووتی) بەناوی حاکمی ئەو رۆژەیەوە، دووەمیش پێی گوترا (دەرگای پادشا). پاشان خێلاتێکی زۆری بۆهێنا و لە دەوری شووراکەی دەستکردی خۆی نیشتەجێی کردن. ئیدی کەرکووك جێ و رێی هەلکشا و وای لێهات ناو بنرێ (کەرخ سلووك)، کە لە (کەرخا دەبیث سلووك)، واتە (شاری سلۆکس) بە زمانی ئارامی داتاشراوە. پاش ئەو، کەوتە دەستی جێنشینەکانی و ماوەیەك لە دەستیاندا مایەوە، تا سالی ٢٥٦پ.ز لەپال شتی دیکەدا کەوتە دەستی پارت (پارت)ەکان و ماوەیەکیش لە دەستی ئەوانەدا مایەوە. تا سالی ٢٢٧ز ئەردەشێر لە پارتەکان هەلگەرایەوە و کەرکووکی بەسەربەخۆیی دابری و تا عەرەب عێراقی داگیرکرد، لەژێر دەستی فارسدا مایەوە. بەتلیمۆس ناوی نا (کەرکوورا) و "سترابۆن"یش (دیمتریاس)ی پێ گوت.
(لغە العرب): ئەم داستانە مێژووییە لە بەندوباوەوە نزیکە نەك مێژوو، چونکە پادشا سەردناپال هەر لە خەیالدانی هێندێ مێژوونووسی یۆنانییەکاندا هەبووە. سەرباری ئەوە، لەسەر دیاریکردنی سالانی ژیانی هاودەنگ نین، هەیە گوتوویە: سالی ٧٥٩پ.ز خۆی و ژن و مولك و مالەکەیی سووتاند. هەیشیانە گوتوویە سالی ٨٣٦پ.ز پادشا بووە و سالی ٨١٧پ.ز خۆیی سووتاندووە. هەر چۆنێك بێ، پادشا نەبووە و تەنانەت سالی ٨٠٠پ.ز پادشایەکی هەلبەستراو یا خەیالیش نەبووە، تا ئەو شارە بنیات بنێ کە پاشتر بە کەرکووك ناسراوە.
ئەو کتێبانە کە نووسەری بەرێز ئاماژەی بۆ کردوون دانراوگەلێکی بە تێروانینی هەوالنووس و مێژوونووسان - بێ نرخن. دەتوانرێ بگوترێ بنیاتنەری ئەم شارە نەناسراوە، چونکە سەرچاوەی مێژوویی نییە پشتی پێ ببەسترێ کەواتە هەموو ئەو شتانە کە لە خانەی مێژوودا دەگوترێن، ساختەکارییەکی تەواو یا هەوالێکی هەلبەستراوە، ئەوەیش کە دەگوترێ هیی سەردەمی ئەسکەندەرە، متمانەی پێ ناکرێ، لەبەر ئەوەی پشت ئەستوور نییە بە سەرچاوەی راست.
با خوێندەواران رێمان بدەن پێیان بلێین ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامی ناوی کەرکووکی بە پیتی فەرەنگی نووسیوە، بەم شێوەیە kirkuk، کە پێچەوانەی گوتنە عەرەبییەکەیەتی. بەلێ تورك بە کیرکووك دەیبێژن، بەلام وشەکە تورکی نییە تا بارێکی راست وەربگرێ، بەلکو وشەکە عەرەب دایتاشیوە، دەبێ بگوترێ kirkuk ی یا karkuk هەرچی kirkuk، هەلەیەکی ئاشکرایە. لەو وتارەیشدا نووسیویە، چیاکانی حەمرین لە باکووری رۆژهەلاتدان و ناوی ئەم چیایانەیشی بە hamrim نووسیوە، کە راستەکەی (حومرین)ە، وەك یاقووت لە ماددەی بارما و هەمەدانی لە وەسفی جەزیرەی عەرەب (ل١٣٣)دا نووسیویە. باسی کەرکووکمان بەناوەوە لە کتێبگەلی مێژوونووسانی عەرەبی موسولماندا بەدی نەکردووە، بەلام مەسیحییەکان ناویان نابوو کەرخ، وەك ئیلیا دیمەشقی و ئارامییەکان بە ناوی (کەرخا بیث سلووك) ناویان بردووە لە کتێبی "سینۆکۆن"یش (لە ٤١٠ی زایینییەوە) ئاوا هاتووە.
ئەمە کورتەی مێژووی قەلای ئێستای کەرکووکە کە لە دوو بەشی گرنگ پێکدێت: یەکیان پێی دەلێن (قەلا) و ئەوەی پێشوو مێژووەکەی بوو. ئەمڕۆ قەلا لە رووی ئاوەدانییەوە لە بارێکی مامناوەندیدایە هێندێ خانووی بەسەر بەشی خوارووی شارۆچکەکەدا دەروانێ و دوو مزگەوتی گەورەی تێدایە: یەکەمیان مزگەوتی (مەریمانە) و دووەمیان مزگەوتی (پێغەمبەر دانیال)ی پێ دەگوترێ؟ مجێوریی هەردوو مزگەوتەکە بەدەستی موسولمانانەوەیە و مەسیحییەکانیش لافی ئەوە لێدەدەن کە هەردووکیان کلێسەی ئەوان بوو، بەلگەیشیان هێندێ نامەی ئایینییە کە بە تایبەتی بۆ ئەم دوو کلێسەیە نووسراون، مزگەوتی دووەم سێ گۆڕی سێ گەورەپیاوی تێدایە، ئەوانیش (حنانیاو عەزریا و میشائیل)ن. جوولەکەیش پێی وایە دانیالی پێغەمبەر لەم مزگەوتەدا نێژراوە ئەم قسەیە هیچ بەلگەیەك پالپشتی

نییە، سەرەرای ئەوەی کە هەموو ساڵێك ئەرکە ئایینییەکانی بۆ بەجێدەهێنن، چونکە دانیال پێغەمبەر -وەك دەڵێن- لە خووزستان مردووە و لە (شووشتەر) نێژراوە و گۆرەکەی هێشتا بەپێی بەسەرهاتێکی باو لەوێ ناسراوە(١).

بەڵام بەشی دووەمی کەرکووك (دەشت)ی پێ دەڵێن، کە وا دیارە بۆ کەسانی بەدواداچوون تازەیە، لە کاتێکدا بەساڵدا چووان، جەخت دەکەنەوە کە ساڵی ١١٤٤ك/١٧٢٩ز ئاوەدانیی تێکەوتووە. مێژوویەکیمان لە کتێبدا نەدیوەتەوە، ئەوە نەبێ کە باسی دێی (قۆریە)ی یەکێك لە گەرەکەکانی کەرکوك کراوە، وێڕای ئەوەی کە زۆر لە بەشی (قەڵا)وە دوورە. گوتراوە: تەهماسب ساڵی ١١٤٦ك/١٧٣٣ز هاتە ئەوێ و لە دانیشتووانەکەی دا و خانووەکانی رماندن و چادرەکانی سووتاندن و دێیەکە لە خەڵکەکەی شێواو بەجێیانهێشت و روویان کردە دێی (بەشیر) کە ٢٠ میل لە کەرکووکەوە دوورە. کە تەهماسب رۆیی دانیشتووان هاتنەوە گەرەکەکەیان کە بەرەبەرە لە نزیکی قەڵاوە گەورە دەبوو.

لیوای کەرکووك لە سێ قەزا (جگە لە ناحییەکانی پێیەوە بەستراون) و حەوت ناحیە و چەندین دێی گەورە و بچووك پێکدێت هەرسێ قەزاکەی بریتین لە: کفری و چەمچەماڵ و گل. حەوت ناحیەکەیشی (کەرکووك، شوان، ئاڵتوون کۆپری، مەڵحە، شبێچە، تاووق، قەرەحەسەن)ە، بەڵام دێیەکانی خۆ لە ٥٧٨دێ دەدەن، هەندێکیان بەستراونەوە بە قەزاکان و هێندێکیشیان بە حەوت ناحییەکەوەی راستەوخۆ لکێندراون بە ناوەندی لیواوە. زەحمەت بوو بۆ ئێمە ناوی ئەم دێیانە و بەتایبەت بچووکەکانیان کۆبکەینەوە لەبەر ئەوە باسکردنی ئەم دێیانەمان هێشتەوە بۆ دەرفەتێکی دیکە، ئەوەتا سەرەتا دەست بە باسی قەزاو ناحییەکان دەکەین و دەڵێین:

ناحییەکانی لکێندراون بە ناوەندی لیواوە حەوتن:

١- ناحیەی کەرکوك، ئەمەیان ناوخۆیە و بەرێوەبەرەکەی لە ناوەندەی لیوا نیشتەجێیە و ٥٧ دێ دەگرێتەوە.

٢- ناحیەی شوان: لە ٨٩ دێ پێکدێت و ناوەندەکەی دێی (رێدارە)ە کە ٢٥ میل لە باکووری رۆژاوای کەرکووکەوە دوورە و ئاوەدانی و فراوانی مامناوەندین.

٣- ناحیەی ئاڵتوون کۆپری: لە ٣٣ دێی گرنگ پێکدێت و ناوەندەکەی شارۆچکەی گرنگی ئاڵتوون - کۆپری (واتە پردی زێڕ)یە کە ٣٠ کیلۆمەتر لە باکوور کەرکووکەوە دوورە رووباری زێی بچووك دەیبڕێ و دوور پردی گرنگی تێدان، دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز دروستی کرد، پاش ئەوەی حکومەتی پێشووی دوابراو کەوانە بەردینەکەیی تێکدا بە مووشەك، بۆ پەکخستنی جموجووڵی عەسکەریی دوژمنەکەی (ئەو رۆژە ئینگلیز و رووس بوون). ئەو پردە سوڵتان مورادی چوارەم ساڵی ١٠٤٨ك بنیاتی نا، کاتێك ویستی بە زێی بچووکدا تێپەڕ ببێ، ئەوسا بە زێی (ئەلبووحەمدان) ناسراوبوو.

٤- ناحیەی مەڵحە: ٣٧ دێ دەگرێتەوە و ناوەندەکەی (گردی عەلی - تل عەلی)یە کە ٥٠ میل لە رۆژاوای کەرکووکەوە دوورە و خوێیەکی زۆری تێدایە.

٥- ناحیەی شبێچە: لە ٢٥ دێ پێکدێت و ناوەندەکەی دێیەکە بەم ناوەوە و ٤٩ کیلۆمەتر لە باشووری رۆژاوای کەرکووکەوە دوورە. ئەم دێیە لە زەوییەکانی نزماندا بنیات نراوە، چەند بان و لەندێك دەوریان داوە. دائیرەکانی حکوومەت و ناوەندە گرنگەکانیان لەسەر ئەم بانانە دروستکراون، چەمێکی پێدا دەڕوا بە هەمان ناوەوە و سەیرترین شتی ئەم دێیە دیبێتم، ئاو زۆرییە، تۆ ناتوانی دوو بست زەوی هەڵکۆڵی و ئاوی بە لێشاو لێ هەڵدەقوڵێ.

٦- ناحیەی تاووق: لە باشووری کەرکووکەوە ٢٨ میل لێیەوە دوورە ٢٩ دێ دەگرێتەوە و زەوییەکانی ئەوپەڕی بەپیتن و ناوەندەکەی دێی (تاووق)ە کە بە شێوەیەکی مامناوەندی ئاوەدانە. تاووق وشەیەکی تورکییە بە مانای (مریشك) رەنگە وا ناونرابێ، چونکە ئەم باڵندە ماڵییەی تێدا زۆرە. شەمەندەفەری بەغدا - کەرکووك بە نزیکیدا دەڕوا و پردێکی بەردینی ٣/٤میل درێژ تێدەپەڕێنێ و رووباری (خاسە)ی پێدا دەڕوا و نزرگەی ئیمام زەینەلعابدین (خ.ر) یش لێیەوە نزیکە، خەڵك لە هەموو لایەکەوە رووی تێدەکەن بۆ پیرۆزی و چاکبوونەوەی نەخۆشییەکانیان و زۆر جاریش بە تەندروستییەکی تەواوەوە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

٧- ناحیەی قەرەحەسەن: ناوەندەکەی دێی حاڵ و بار مامناوەندیی (خاڵە بازیانی)یە کە ٢٥ میل لە رۆژهەڵاتی کەرکووکەوە دوورە، دێیەکانی ژمارەیان (٥٢)ە.

ئەمە کورتە وەسفێکی حەوت ناحیەکەی سەر بە ناوەندی لیوایە و زۆربەی گوندەکانیان ئاوەدانن و دانیشتووانی هەموویان لە خێڵاتی کوردن کە پیشەیان کشتوکاڵە، کە سەرچاوەی بژێوی هەموو ناوچەکانی عێراقە.

١- قەزای کفری

کفری، ناوێکی دیکەی سەڵاحییەیە لە (خاڵس)ی وڵاتی عێراق، ئەمرۆ ناوەندی قەزایەکە بەم ناوەوە و ٧٨ میل لە باشووری کەرکووکەوە دوورە و هێڵێکی ئاسن لە بەغداوە بۆ کەرکووك بە پایتەختەوەی دەبەستێ. لە بناری چیایەکە ناوی (باوە شاسوار)ە هەوای خۆش و فێنك و ئاوی سازگار و رەوانە، لە دوو جێوە هەڵدەقوڵێ، پێیان دەگوترێ (سەرقەڵا و قوشەچاپان) چەند کانێك نزیکی ئەم شارۆچکەیەیە، خەڵووزی بەردیان لێ دەردەهێنرێ و ئەڵمانەکان لە دەورانی جەنگی جیهانیدا بەکاریان هێناوە، جۆرە قیرێك لەو دەورووبەرەیە، پێی دەڵێن (کفر). ئیبن شومێل گووتویە سێ جۆری کفر و قیر و زفت. کفر دەتوێنرێتەوەو پاپۆری پێ سواخ دەدرێ و زفت قیرتاوی پێ سواخ دەدرێ (لای فەرەنگ ئەسفەلتە).

شارۆچکەکە زۆر ئاوەدانە و خانووەکانی جوانن و

سەیرانگەی زۆری لێیە و بازارەكانی بەناویەكدا چوون و بزاوتی ئاوەدانكردنەوەی تێدا خێرایە و بازرگانیی لە برەودایە و لەوانەیە پاش ماوەیەكی دیكە ببێتە گرنگترین شارۆچكەی ئەو ناوە.

قەزاكە چوار ناحیەی هەیە: كفری، تووزخورماتوو، قەرەتەپە و شێروانە. ناحیەی كفری ناوخۆیە و پێشتر روونمان كردەوە مەبەست لە ناحیەی ناوخۆ چییە. ئەمرۆ لە ١١٩ گوند پێكدێت، بەڕێوەبەرەكەی لە ناوەندی قەزا-واتە كفری- دادەنیشێ، بەڵام ناحیەی تووزخورماتوو ناوچەیەكی فراوانی لە دەوڵەمەندترین ناوچەكانی عێراقە بە نەوتە نایابەكەی و كۆمپانیایەكی بیانی ئەم نەوتە دەردەهێنێ. پێشتر هێندێ شتی جێی بایەخمان لەبارەیەوە روون كردەوە. ئەم ناحیەیە لە ١٦٢ دێی گەورە و بچووك پێكدێت و ٤٨ میل لە باشووری كەركووكەوە دوورە و خانووی كرێكاران و پەیمانگا و مەكینە و هەموو پێویستییەكی كاروباری كۆمپانیای نەوت لێیەوە نزیكن، چەند چیایەك دەوریان داوە، هێندێكیان بەرز و هێندێكی دیكەیان بەرزییان كەمە و چەند دۆڵێكی پڕ لە داروردەختی هەڵچووی بەرداری پێگەییو لە نزیكییەوەن و جوانی و رازاوەیییەكیان بە دیمەنی بەخشیوە. رووباری خاسەی پێدا دەڕوا و شەمەندەفەریش لەوێ بەسەر پردێكی ئاسنی درێژدا تێدەپەڕێ.

هەرچی ناحیەی (قەرەتەپە)یە ٦١ دێی ئاست مامناوەندی دەگرێتەوە، ناوەندەكەی شارۆچكەیەكی جوانە بەم ناوەوە و ٢١ میل لە باشووری رۆژاوای ناوەندی قەزاوە دوورە. ئەم دێیە بە ناوی ئێستایەوە ناونراوە، چونكە گردێكی رەش لە لایەكیدایە و خەڵك پێویستی ناوی خۆیان لە چەمێكی چكۆلە دابین دەكەن، بە دێیەكەیاندا تێدەپەڕێ. سەرای حكوومەتیش بەسەر ئەم چەمەدا دەڕوانێ. دێیەكە بەوە ناسراوە كە ماست و رەزێكی باشی هەن. لەبەر ئەوەی حاجی لەقلەقیش زۆرن، خەڵك (دایكی لەقلەق)ی پێدەڵێن، بەڵام ناحیەی شێروانە، ناوەندەكەی ٢٥میل لە رۆژهەڵاتی كەركووكەوە دوورە و ئاوەدانیی تێدا ئاست مامناوەندییە و ١٣ دێی پێوە بەستراوە و قەڵایەكی سەختی لە ناوەڕاستدا هەیە، ناوەندە گرنگەكانی حكوومەتی لەسەر دروستكراون. زۆربەی دانیشتووانی ناحیەكە لە خێڵی كوردیی جافن.

٢- قەزای چەمچەماڵ

ئەم قەزایە پێش و پاش جەنگ سەر بە لیوای سلێمانی بوو، بەڵام لە ماوەكانی دواییدا لكێندرا بە كەركووكەوە. لە ناوەندەكەی و تەنیا دوو ناحیە پێكدێت بە یەكەمیان دەگوترێ ناحیەی چەمچەماڵ و ناوخۆیە، دووەمیشیان ناحیەی (ئاغجەلەر)ی پێدەگوترێ و ٢٥ میل لای باكووری رۆژهەڵاتی ناوەندی قەزاوە دوورە و لە بایەخی سیاسی بەدەر، هیچ بایەخێكی لە رووی ئاسایشەوە نییە و ناوەندەكەی دێیەكی بچووكی ناوەڕاستی شاخ و داخێكی بەرزە و داربەرووی دڵگیر لەسەر درێژایی رێی بەرەو دێیە و خانووەكانی لە بەردی كلس دروستكراون، و پۆلیس بینایەكی زۆر گەورەی تێدا هەیە دار هەناری لە دەور رووێندراوە و ئاوەكەیشی سازگارە.

هەرچی ناوەندی قەزایە، دێیەكی ناوەڕاستی دەشتێكی بەرینە بە هەمان ناوەوە و ٣٣ كیلۆمەتر لە رۆژهەڵاتی كەركووكەوە دوورە، رێی نێوان قەزاكە و كەركووك لەبەر زۆریی چاڵ و چۆڵ و كەندەكانی سەخت و عاسییە، لە كاتێكدا رێیەكەی بەرەو سلێمانی قیرتاو و تەختكراوە. ئەم دێیە لە ناوەڕاستی رێی (كەركووك-سلێمانی)دایە و نەوتەلانێكی گەورە لە نزیكییەوە و ئەوە نەبوایە، ئەم قەزایە بایەخێكی جێی باسی نەدەبوو.

دێی چەمچەماڵ دێیەكی مامناوەندیی پەڕپووتی نێوان لیواكانی هەولێر و سلێمانی و كەركووكە و چەمێكی چكۆڵەی ئاوسازگاری ئەوپەڕی سارد لە نزیكییەوە دەڕوا، گردێكی بەرز لە ناوەڕاستی دێیەكەدایە حكوومەت لەسەری جێگیر بووبوو، بەڵام ئێستا بینای بەپێی بایەخی دێ و قەزاكە بۆ دروستكراوە.

٣- قەزای گل:

گل، ناوچەیەكی پڕ لە نەوتی لیوای كەركووكە و نەوتەكەی لە نایابترین جۆرە و هەرە خاوێنترینە و پسپۆران جەخت دەكەنەوە كە لە نەوتی رووسییان باشترە لە سووتاندا، قەزای گل، هەرچەندە ناحیەكانی كەمن، بەڵام بەرفراوانە. ناوەندەكەی دێیەكی بچووكی ناو دەشتی (رۆخانە)یە، ٥١ میل لە رۆژهەڵاتی كەركووكەوە دوورە و پێی دەڵێن (قادر كەرەم) و ٦٧ دێی هەیە، هەموویان دانیشتووانی سەر بە دوو خێڵی كوردی داودە و زەنگەنە، یا جەنگنەیان تێدایە.

قەزاكە دوو ناحیەی هەیە، ئەوانیش گل و سەنگاوین، ناحیەی گل ناوەندەكەی دێی پەڕپووتی (قالقانلوو)ە، دە میل لە باشووری رۆژاوای ناوەندی قەزای قادر كەرەمەوە دوورە، بەڵام ناحیەی سەنگاو ناوەندەكەی (گۆك تەپە)یە، كە دێیەكی هاكەزاییە و ٣٨ میل لە رۆژهەڵاتی ناوەندی قەزاوە دوورە، چەند حەمامێكی ئەوپەڕی پاكی تێدایە و چەمێكی سازگاری تیژڕۆی پێدا دەڕوا و بینای حكوومەتیشی تێدا هاوشانی بایەخەكەیەتی.

* سەرچاوە:

(الجزء٦، السنة٨، ١حزیران ١٩٣٠، ص٤١٣-٤٢٠).

(١) بڕوانە لغة العرب، ٢١٩:٨، لە كاتێكدا جوولەكە و مەسیحی و موسڵمانانیش لە جێی نێژرانی دڵنیا نین.

*** نەوت لە بەرانبەر خاكدا: بەرەو سەودا و مامەڵەیەكی هەمەلایەنە لەبارەی عێراق و كوردەوە**

راپۆرتی گرووپی قەیرانی نێودەوڵەتی
و. لە ئینگلیزییەوە: محەمەد حەمە ساڵح تۆفیق

لە كاتێكدا كەوا زۆرێك لە ناوچەكانی عێراق ئارامییەكی ڕێژەیی دەگەیەنن لە ساڵی ٢٠٠٨دا ململانێ و ناكۆكییەكی گەرم لەسەر ئەوەی (پێیدەوترێ)[١] ناوچە كێشە لەسەرەكان بەشێوەیەكی بەرفراوان هەڵایساو بوو بەهۆی شڵەژاندنی مەسەلە یاساییە بنەرەتییەكانی چەشنی یاسای هایدرۆكاربۆن (نەوت و گاز)[٢]و پێداچوونەوەی دەستور[٣]. لە كاتێكدا ناوچەگەلێك هەن لە بەشەكانی تری عێراقدا كەوا بارودۆخی بەڕێوەبردنیان كێشەی لەسەرە، بەڵام ئەم ناكۆكی و ململانێیە لەسەر ئەو ناوچانەیە كە داواكاریی كوردیان لەسەرە. ئەم ناوچانەش بە سەر پێنج پارێزگادا درێژبوونەتەوە لە سنووری سووریاوە لە باكووری ڕۆژئاوا بۆ سنووری ئێران لە ڕۆژهەڵاتی بەغداوە[٤]. ئەم شوێنانە لەگەڵ ئەوەشدا كە زێدی تێكەڵەیەكی كورد و توركمان و عەرەب و شەبەك و كلدۆئاشوورین[٥]، بەڵام لەلایەن كوردەوە داواكاریی ئەوەیان لەسەرە كە "لەرووی مێژوویی و جوگرافییەوە بەشێكن لە كوردستان[٦]". كەركوكیش دەكەوێتە ناوجەرگەی ئەم ناوچانەوە، كە شارێك و پارێزگایەكە دەكەوێتە سەر كێڵگەیەك كەوا زیاد لە ١٣٪ ی یەدەكی سەلمێنراوی نەوتی عێراقی تێدایە. بوونی نەوت گرژی و ئاڵۆزیی زیاد كردووەو بەشێوەیەكی بەرفراوان ئەو هەوڵ و كۆششانەی ئاڵۆز كردووە كە بۆ چارەسەرێكی ئاشتیانەی دۆخی كەركوك دەدرێن.

حیزبە كوردییەكان پاش ناردنی پێشمەرگە جەنگاوەرەكانیان لە پێش هێزەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكانەوەو دامەزراندنی كۆنترۆڵێكی دیفاكتۆ لە نیسانی ٢٠٠٣دا، ستراتیجیەتی سەرەكییان بۆ گێڕانەوەی ئەو ناوچانە بۆ سەر هەرێمی كوردستان بەزۆری، نەك بە تەواوی، ئاشتییانەو یاساییانە بوو[٧]. لە خاڵە سەرەكییەكانی پەرەسەندنی دەستوریی و سیاسی وڵاتدا كوردەكان برگەو دەستەواژەی كاریگەریان تێخستووە بە مەبەستی ئاسانكاریی داواكانیان. لە پرۆسەكەدا ئەوان ریكۆردی یاساییان دروستكردووە كەوا ڕەوایی داواكارییەكانیان دەگەیەنێت كە بە هۆكار و ئامرازی ناتوندوتیژ پێیبگەن. بەهێزترین چەك بوو بە دەستور، كەوا زۆربەی زۆری هەڵبژێرەكان لە ریفراندۆمێكی ئۆكتۆبەری ٢٠٠٥دا ڕەزامەندییان لەسەر پیشاندا. مادەی ١٤٠ دەبوو بەتایبەتی هەنگاوی یەك لە دوای یەكی "ئاساییكردنەوە"[٨] برەخسێنێت لەگەڵ سەرژمێری و ریفراندۆمێكدا كە ئەنجامدانیان لە ٣١ ی دیسەمبەری ٢٠٠٧ تێپەڕی نەكردایە كەوا بە باوەڕی كوردەكان تەواو جێبەجێكردنی هیواكانیانی دەهێنایە دی[٩].

قادر عەزیزی نوێنەری باڵای سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان بۆ مادەی ١٤٠، پێناسەی سێ زەمانەت دەكات كە یارمەتیدەر دەبن لە هێوركردنەوەی تووڕەیی و بێمتمانەیی قووڵی كوردەكان لە ئاست حكومەتی عێراقدا (كەوا حیزبە كوردەكانی تێدا بەشدارە بەڵام وەك كەمینەیەك): مادە ٢٢ی ساڵی ٢٠٠٦ی هاوپەیمانیی حوكمكردن، كەوا دوا ماوەی بۆ "ئاساییكردنەوە"و سەرژمێری و ریفراندۆم دیاری كردبوو ولەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە[١٠] ڕەزامەندیی لەسەر دراو دیباجەی دەستور، كە پاش مشتومڕ لە برگەیەكدا مافی چوونە دەرەوە لە عێراق دەداتە كوردەكان لە حاڵەتێكدا ئەگەر دەستورەكە جێبەجێ نەكرا[١١]و هەمان مادە ریفراندۆمی دیسەمبەری ٢٠٠٧ی لەخۆ گرتووە[١٢].

سەركردە كوردەكان بۆیە ئەم ڕێڕەوەیان هەڵبژارد چونكە بروایان وابوو كەوا لە ڕێگەی هاوپەیمانییەوە لەگەڵ ویلایەتە یەكگرتووەكان و ئامادەبوونیان لە دامودەزگا سەرەكییەكانی دەولەتدا دەتوانن فشار بكەن بۆ جێبەجێكردنی مادەی ١٤٠. هەروەها زۆر بە قەناعەتەوە وایان دادەنا كە مەسەلە تایبەتییەكەی ئەمان شتێكە كەوا هەر كەس و لایەك بە ئەقڵ و مەنتیق بیربكاتەوە بیسەلمێنێت[١٣]، كە بەئەنجامگەیاندنی بەرەورووی دواخستنی ناپێویست و نارەوا بووەتەوە[١٤]و پێویستی بە چارەسەری میانڕەو نیە[١٥]. بەهەرحاڵ، میتۆدی هەڵبژاردەی كورد ئەنجامی خوازراوی بۆ نەرەخساندن و دوامۆڵەتی دیسەمبەری ٢٠٠٧ بێ هیچ ریفراندۆمێك تێپەڕی. بە دوای ئەوەدا ناوبژی كردنی نێردراوی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ یارمەتیدانی عێراق (یونامی UNAMI) هاتەكایەوە، بە سەرۆكایەتی ستیفان دیمستۆرای نوێنەری تایبەتی سكرتێری گشتیی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ عێراق و پێنج لە سەركردە باڵاكانی عێراق ڕازی بوون لەسەر دواخستنی مادەی ١٤٠و پێشنیاری یونامییان قبووڵ كرد بۆ راییكردنی جێبەجێكردنی لە ماوەی شەش مانگی دواتردا[١٦]. بەڵام هیچ پێشكەوتنێك نەكرا لەو ماوە یەك لەدوای یەكەكاندا، بۆیە دوامۆڵەتی ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٨ نەك هەر بێ ئەنجام تێپەڕی، بەڵكو بێ هیچ درێژكردنەوەیەك یان تەنانەت هیچ راگەیاندنێكی گشتیش لەو بارەیەوە. پرۆسەی مادەی ١٤٠ لە دیدی زۆربەی یاریكەرەكانەوە مردووەو ئەو كوردانە ڕزگار دەكات كە سوورن لەسەر ئەوەی كە ئەمەش تەنها دواخستنێكی ترە نەك نەمانی مادەكە[١٧].

سەركردایەتیی كورد كە بە تەواویی زانی بەرەورووی هەرەسی سیاسی دەبێتەوە[١٨] كەوتە راكێشانی كارتەكانی وەك: دەسەڵاتی ڤیتۆ بەكارهێنان لە پرۆسەی یاسایی و تەشریعیدا و تەنانەت لەناو حكومەتیشدا لە بەغدا. كاربەدەستێكی كورد دەڵێ" كورد دەتوانن لە عێراق بكشێنەوە، بەڵام سەركردە كوردەكان ئەوە ناكەن. ئێمە تا ئێستاش دەتوانین وەك تاكتیك بخەینە سەر حكومەتی فیدراڵ. ئێمە دەتوانین ڕێبكەوین لەسەر پێكهێنانی حكومەتێكی نوێ تەنها لەسەر بنەمای ڕێككەوتن ورازیبوونی لەسەر جێبەجێكردنی مادەی ١٤٠ [١٩]". كاربەدەستێكی تر بە زمانێكی زبرتر لە مەسەلەكە دواو وتی: "ئەگەر من ڕێگەی خۆمم نەبێت ڕێگەش لە تۆ دەگرم. ئەگەر چارەسەر نەبێت بۆ كەركوك ئەوە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگا نابێت لە كەركوكداو پێداچوونەوەش بۆ دەستور نابێت و شتی تریش[٢٠]. تەنانەت پێش ئەوەی دوا مۆڵەتی حوزەیرانی ٢٠٠٨ تێپەڕێت مەسەلەی چارەسەر نەكراوی كەركوك و ناوچە كێشەدارەكانی تر بوون بەهۆی

ئەوەی گفتوگۆ و دانوستان لەسەر هەردوو بواری ناسکی یاسادانان بشلەژێنن وەك یاسای نەوت و گاز کەوا دەمێکە لە چاوەڕوانیدایە لەگەڵ یاسای هەڵبژاردن و بێجگە لەوانیش پێداچوونەوەی دەستور کە لە ساڵی ٢٠٠٦ەوە بە ڕاوەستاوی ماوەتەوە[٢١]. دراماتیکیترین نموونە لە دوای گیرخواردن و پەککەوتنی یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان هات لە تەممووزی ٢٠٠٨دا. کاتێ کە ئەنجومەنی نوێنەران ویستی پرۆژە یاسایەك تێپەڕێنێ کەوا زەمینەی خۆشکردووە بۆ هەڵبژاردنی پارێزگاکان تا ١ی ئۆکتەبەر هاوپەیمانییەکی نوێنەران بۆ ئەم مەبەستە بە ڕابەریی ئەندامانی کەمینەی تورکمان دەسکارییەکیان خستە ناو پرۆژەکەوە کەوا هەڵبژاردنی کەرکوك لەوانیتر جیابکاتەوە. ئەوان پێشنییاریان کردبوو کە هەڵبژاردن لەوێ ڕابگیرێت تا ئەو کاتەی هەموو حیزبەکانی کەرکوك لەسەر ئەوە کەرکوك ڕێکدەکەون کە هەرسێ کۆمەڵگە گەورەکەی ئەو شارە بە یەکسانی کورسییەکانی ئەنجومەنی پارێزگا لەناو خۆیاندا دابەش دەکەن و هەندێکیش بخەنەلاوە بۆ مەسیحییەکان[٢٢]. عەرەب و تورکمانەکانی کەرکوك بەرهەڵستیی هەڵبژاردن دەکەن لە کەرکوکدا لە ترسی ئەوەی بدۆڕێن لە ئەنجامی ئەوەی، وەك خۆیان دەڵێن، کەوا لە نیسانی ٢٠٠٣وە یاریی بە ڕەوشی دیموگرافییەوە دەکرێت لەلایەن کوردەوە. ئەوان تووشی ئەنجامەکانی دۆڕاندن بوون و نایانەوێ هەمان ئەزموون دووبارە بکەنەوە، چونکە کوردەکان پێشتر بردیانەوە و لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ەوە کۆنترۆڵی ئەنجومەنی پارێزگایان کردووە[٢٣].

لە بری ئەوە ئەوان پێ لەسەر ڕێککەوتنی پێشوەخت دادەگرن ٣٢، ٣٢، ٣٢ – ٤ لە سەدا بۆ دەسەڵاتی پێکهاتەکان و پۆستە باڵاکانی ڕاپەڕاندن لە پارێزگای کەرکوکدا دابەش بکەن بەهەمان شێوەی کورسییەکان بەسەر هەردوو ئەنجومەنی پارێزگا و شاردا بەیەکسانی لە نێوان عەرەب و تورکمان وکورددا و پشکێکی بچووکیش بۆ کەمینە مەسیحیپەکان. جگە لەمەش ئیدیعای ئەوە دەکەن کەوا جەلال تالەبانی سەرۆك کۆماری عێراق، کە خۆیشی لە نەتەوەی کوردە، لەسەر دابەشکردنێکی لەم چەشنە ڕازیبووە کاتێ کە لە مانگی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا سەردانی کەرکوکی کردووە[٢٤].

بە پێچەوانەوە، سەرکردە کوردەکان بێخەمن لەوەی هەڵبژاردن ڕابگیرێت یان دوا بخرێت لە کەرکوکدا، چونکە بە هەموو ڕەنگێك وای لە قەڵەم دەدەن کە ئەوان هەر دەیبەنەوە. ئەگەر هەڵبژاردنەکە بکرێت دڵنیان لەوەی کە دەیبەنەوە، ئەگەریش دوابخرێت ئەوە ئەنجومەن حاڵی حازر کەوا کورد تێیدا باڵا دەستەو بەردەوام دەبێت لەسەر کارەکانی. هەروەها لە کاتێکدا ئەوان شێوازی هاوبەشیی دەسەڵات قبووڵ دەکەن کە لەلایەن عەرەب و تورکمانەکانەوە پێشنیار دەکرێت بۆ هەندێ قۆناخ، بەڵام زۆر بە توندی بەرهەڵستی دەکەن ئەگەر پەیوەندیی بە ئەنجومەنی پارێزگاوە هەبێت و قبووڵی دەکەن بۆ ئیدارەی پارێزگا تەنها ئەگەر پەیوەندی بە هەموو پۆستەکانەوە هەبێت نەك تەنها پۆستە باڵاکان[٢٥]. ڕزگار عەلی، سەرۆکە کوردەکەی ئەنجومەنی پارێزگا دەڵێ کەوا ئەو ڕەچاوی بەشداریی دەسەڵات دەکات لە ئەنجومەندا بەڵام نەك بەو شێوازەی عەرەب و تورکمانەکان پێشنیازی دەکەن: "بەڵێ ئێمە ڕازین بە بەشداربوون لە دەسەڵاتدا، بەڵام نابێ کورد زۆرینە لە دەست بدات کە بە دەستیان هێناوە (لە هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا)"[٢٦].

ئەنجومەنی نوێنەران ئەو یاسایەی تێپەڕاند بەو دەسکاری کردنەوە کە بۆ کەرکوك کرابوو پاش کشانەوەی پڕ نارەزایی کورد لە ٢٢ی تەموزدا. بەدوای ئەوەدا دوو ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ڤیتۆیان لە دژ بەکارهێنا، ئەوانیش تالەبانی و عادل عەبدولمەهدی جێگری سەرۆك کۆمار بوون (ئەندامێکی بەرزی ئەنجومەنی باڵای ئیسلامیی عێراقییە، کەوا هاوپەیمانە لەگەڵ هاوپەیمانیی کوردستاندا)و ناردیە دواوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران و لەوێ لەسەر مەسەلەی کەرکوك مایەوە و ئەنجومەن کەوتە پشووی هاوینەیەوە بێ ئەوەی بڕیار لەسەر مێژووی هەڵبژاردنی پارێزگاکان بدات، سەرباری فشارێکی گەورە لە ئیدارەی بوشەوە، لە دوادوایی سێپتەمبەردا یونامی چارەسەرێکی گەڵاڵە کرد و نوێنەران یاساکەیان پەسەند کرد و هەڵبژاردنیان بۆ چواردە پارێزگا دانا ئەنجامبدرێت لە ماوەیەکدا کە لە ٣١ی کانوونی دووەم تێنەپەڕێت[٢٧]و (لە مادە ٢٣دا) مەرجی پرۆسەیەکی جیاکار و سەربەخۆی بۆ کەرکوك داناوە بێ حوکمی پێشوەختی دوا ڕێکخستنی دەسەڵات بەشکردن.

بەهەرحاڵ لەکاتێکدا ئەمە کێشەی هەڵبژاردنی پارێزگاکانی لە شوێنەکانی تری عێراق چارەسەر کردووە بەڵام شتێکی کەمی کردووە بۆ چارەسەری باری چەقیوی کەرکوك، چونکە عەرەب وتورکمانەکان بەردەوام فشار دەکەن بۆ شێوازی ٣٢–٣٢–٣٢–٤ی ئەنجومەنی پارێزگا، کەوا کورد تێیدا بتوانێت ڕێگە لە ئاوها کۆمیتەیەکی دروستکراو بگرێت و بکاتە بڕیارێك هەموو لا پێی قایل بێت[٢٨].

پێشنیاری بنەڕەتی بۆ ئەوەی مەسەلەی کەرکوك لە یاسای هەڵبژاردن دەربکات، کەوا بۆ ماوەی زیاتر لە دوو مانگ سەرکەوتووانە ئەو تێپەڕاندنەی دواخست کە لە تورکیاوە هاتبوو. ئەنقەرە لە ڕێگای هاوپەیمانە تورکمانەکانیانەوە لە ئەنجومەنی نوێنەراندا دەیویست مەسەلەکە پاڵنێت. ئەمە بەڵگەیەکی ئەو ڕادەیەیە کەوا پرسی کەرکوك مەودایەکی نێودەوڵەتی وەرگرتووەو وڵاتە کاریگەرەکانی وەك تورکیاو (لە هەندێ حاڵەتی تردا ئێران)[٢٩]، دەتوانن باری بشڵەژێنن[٣٠].

لە ئابدا، لەنێو گرژییە پەرەسەندووەکەدا لەمەڕ یاسای هەڵبژاردن، حکومەتی سەرۆك وەزیران نوری مالیکی، کەوا کەوتووەتە ئەوەی خۆی بسەپێنێ لە بەرانبەر یاریکەرەکانی دەرەوەی حکومەت و دەوڵەتدا وەك (موقتەدا سەدری سوپای مەهدی، ئەلقاعیدە لە عێراقدا و ئەنجومەنەکانی ڕابوون "سەحوە"ی سوننە) کە چاویان بڕیبووە ناوچە کێشەدارەکان، هێزەکانی حکومەتی فیدراڵی وەك ئیدیعایەك بۆ مافی سەروەریی دەوڵەت بەسەر خاکی عێراقدا و بەکارهێنانی هێرشێکی سەرومڕ دژ بە جەنگاوەرەکانی قاعیدەی عێراق لە پارێزگای دیالەدا وەك ڕووپۆشێك، گوژمی خۆیان دا بەرەو سێ ناحیەکە کەوا کورد بە کێشەداریان دادەنێت و لە نیسانی ٢٠٠٣ەوە لەژێر کۆنترۆڵی دیفاکتۆی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە KRG و بێجگە لەوەش ئەم هێزانە کەوتنە هەڕەشەی دەرکردنی KRG لە قەزای خانەقینی

کێشە لەسەر. ئەگەر هەرسێ ناحیەی (جەلەولاو سەعدیەو قەرەتەپە) دانیشتوانیان تێکەڵەی عەرەب و کورد و تورکمان بن[٣١]، خۆ خانەقین بە زۆریی کوردنشینە و لە دیدی کوردەوە رەمزێکە بۆ شاڵاوی راگواستنی سەددام حوسێن[٣٢].

جموجۆڵی مالیکی کوردی راچڵەکاند و وایان تەماشا کرد نوقڵانەی بووژانەوەی دەوڵەتێکی سێنتراڵ بێت و نیازی داپڵۆسینی کەوتبێتە کەڵەکە[٣٣]. بێجگە لەوەش، ئەوان ترسیان لێنیشت ئەگەر هەر سازش و دەستبەرداربیەك بکەن لە پارێزگای دیالەدا، مالیکی لە داهاتوودا لە نەینەواو کەرکوکیشدا بەرەنگاریان دەبێتەوە. هەندێك وایدەبینێ کە دەستێکی ئێرانی لە پشت هێرشەکەی مالیکییەوەیە، هەندێکیش دەیگێرنەوە بۆ ئەو رۆڵەی ئەمەریکای هاوپەیمانی کوردەکان کە بە ئاشکرا وەك چاودێرێکی نەگەتیڤ رەفتار دەکات[٣٤]. بەڵام ئەوەی کە هەردوو رووداوەکەی، نزگەرەی سەختی دەستەی تەشریعی لەسەر پرسی کەرکوك و دەسدرێژی و پەلاماردانی سوپای فیدراڵ بۆ سەر ناوچە کێشەدارەکان، ئەوە دەسەلمێنێت کە مەسەلەی ناوچەکانی ململانێ تا چ ئاستێك بووە بە چەقی سیاسەتی عێراقی و چ دۆخێکی پرمەترسی وەرگرتووە بۆ سەقامگیربوونێکی درێژخایەن.

*** مەتەڵی ناوچەکانی ململانێ:-**

**أ - کێشەو ئاڵۆزیی ناوچەکان:-**

رووخانی رژێمی سەددام ناکۆکی و ململانێیەکی متبووی (عەرەب ـ کوردی) هەڵیسانەوە کەوا رەگی دەگەرێتەوە بۆ داواکاریی کورد بۆ خاك و وڵاتێك بە سنوورێکی دیاریکراوەوە. لە کاتێکدا کە رژێمی پێشوو دانی بە هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیداری کورددا نابوو لە ساڵانی ١٩٧٠کانداو ئەم هەرێمەش تەنها سێ پارێزگای لەخۆ گرتبوو (سلێمانی، هەولێر، دهۆك)، کە دانیشتوانیان بەزۆری کوردن لەگەڵ ژمارەیەکی کەم و پەرش و بڵاوی تورکمان و کلدۆ- ئاشووریدا. ئەم ناکۆکییەی ئێستا پەیوەندی بەو ناوچانەوە هەیە کە لە نێوان ئەم پارێزگا کوردانە و ناوجەرگەی خاکی عەرەبی عێراقیدایە. ئەمانە ناوچەگەلێکن کەوا دانیشتوانیان تێکەڵەیەکن لە عەرەب و کورد و تورکمان و کلدۆ ـ ئاشووری و هیتر.

هەرچەندە ئەم ناوچە کێشەدارانە پێشینەی دووریان هەیە، بەڵام گوزارشی ئێستا خاسییەتێکی تایبەتی خۆی هەیە (لە دوای نیسانی ٢٠٠٣وە)[٣٥]. ناوچەکانی کە ئێستا ئەم پرسەیان لەسەرە لە پێش رووخانی رژێمدا تەنانەت بە (ناوچە، هەرێم - خاك)یش ناو نەدەبران و ئەو دەمە نە ناویان هەبوو نە سنووری روونیش. کێشەو ئاڵۆزی هی یەك پارێزگا بوو بەتەواوی، کە ئەویش کەرکوك بوو، لەگەڵ چەند بەشێکی چوار پارێزگای ترکە، نەینەوا، سەلاحەدین، دیالەو واسیت بوون. کەوا رژێمی پێشوو یاریی بە سنوورەکانیان کردبوو (بە قەزا و ناحیەکانیشیانەوە)و کورد و خەڵکی تری غەیرە عەرەبی لێدەرکردن وەك بەشێك لە سیاسەتی بە عەرەبکردن[٣٦].

لەکاتێکدا کوردەکان بوونی مێژوویی خەڵکی غەیرە کورد دەسەلمێنن لەم ناوچانەدا بەڵام وای لە قەڵەم دەدەن کە ناوچەکان دەگەرێنەوە بۆ "کوردستان"، کە وڵاتێکی نەتەوەیی ئیلهامبەخشە بەڵام خەیاڵی، کەوا کوردەکان دەڵێن سنوورەکانی نێوان عێراق و تورکیا و ئێرانەوە درێژدەبێتەوە بۆ زنجیرە شاخێکی نزم، پێی دەوترێ حەمرین و یەکەم زنجیرەیە کە لە بەغداوە بەرەو باکووری رۆژهەڵات سەفەر دەکەیت. زاراوەی کوردستان پێشینەیەکی روونی هەیە لە مێژوودا و لەسەر گەلێ نەخشەی جۆراوجۆری سەدەکانی رابردوو دەردەکەوێت. بەڵام هەرگیز دەوڵەتێك نەبووە بە ناوی کوردستانەوە و تەنانەت هەرێمێکیش بەو ناوەوە کە لە رووی نێودەوڵەتییەوە دان بە سنوورەکانیاندا نرابێت، یان بە درێژایی زەمان و سەردەمێك سنوور بوو بێت. هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی چەشنی ویلایەتی موسڵ و شارەزوور کەوا کورد بە سنووری کوردستانیان دەزانێ تا رادەیەك سەردەمێکی ئەوتۆ بەردەوام نەبوون و بە زەحمەت رەنگ و بۆی کورد لەخۆ دەگرن[٣٧].

کورد کەوتوونەتە شەرێکی مێژووییەوە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆییان لە قەوارەیەکدا بە سنووری ئاشکراو دیاریکراوەوە کە تا رادەیەك یەکبگرێتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوان بە خاکی نەریتیی خۆیانی دەزانن بە گوێرەی زۆرینەیان یان لانیکەم بوونێکی بەرچاوی کورد. تا رۆژگاری ئەمرۆ ئەمە هەوڵ و تێکۆشان بووە بۆ خاك کەوا (کێ خاوەنێتی ئەوە حوکمی دەکات)، بۆ خەڵك (کێ مافی هەیە لەوێ بژی؟)و بۆ سەرچاوەکانی (کێ پەرە بەو سەرچاوانە دەداو سوودیان لێدەبینێت؟). لەو دەمەوە کە لە ساڵانی ١٩٢٠ەکاندا نەوت دۆزراوەتەوە، ململانێ و تێکۆشان خاسیەتێکی توندوتیژی هەبووە و مۆرکی چەندبارەبوونەوەی یاخیبوونی کوردی بەخۆوە بینیوە دژ بە حوکمی سێنتراڵ. ئەمانە بە شێوەیەکی نەگۆڕ بە هێرشی دژە یاخیبوون و ستەمکاری وەڵامدەدرانەوە لەسەر بنەمای سیاسەتێکی ئەتنیکی دارێژراو بۆ کەمکردنەوەی دانیشتوانە غەیرە عەرەبەکانی بە تایبەتی کوردەکان کەوا گەورەترین ورکابەرترین گرووپی نەتەوەییان پێکدەهێنا. کورد زۆر پەرۆشن کە ئەم بازنەیە تێکبشکێنن و لە هەل و دەرفەتی عێراقی دوای سەددام و هاوپەیمانییان گەیشتن لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.

بۆ کورد پرسیار لە مانای ناوچە کێشەدارەکان ناکرێت و وەك دەڵێن ئەمە لە یاسای بەرێوەبردنی کاتیی ساڵی ٢٠٠٤ دا پێناسەی کراوە[٣٨]، کە خرایە ناو دەستووری ساڵی ٢٠٠٥یشەوە[٣٩]. مادەی (٥٣/أ) لە یاسای بەرێوەبردنی کاتی بەم شێوەیە دەدوێ: "حکومەتی هەرێمی کوردستان وەك حکومەتی رەسمیی ئەو ناوچانە دانپێپانراوە کە تا ١٩ی مارتی ٢٠٠٣ لەلایەن حکومەتەوە بەرێوەبراوە لە پارێزگاکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك و دیالە و نەینەوادا[٤٠]". لەکاتێکدا ئەمە بەو رەنگە پێناسەی ناوچە کێشە لەسەرەکان ناکات، بەڵکو وای باس دەکات کەوا ناوچەگەلێکن کەوتوونەتە دەرەوەی هەرێمی کوردستان لە پێش رووخانی رژێمدا. بێجگە لەوەش، مادەی ٥٨ ئاماژە بە "ناوچە تایبەتەکان" و لەوانەش کەرکوك دەدات، کەوا "رژێمی پێشوو" هەندێ کرداری جێبەجێ کردووە بۆ گۆرینی مۆرك و خاسیەتی دیموگرافی.. بەهۆی راگواستن و دەرپەراندنی خەڵك لە شوێن و رێی نیشتەجێبوونیان و بە تۆبزێ کۆچپێکردنیان بۆ ناوەوە و دەرەوەی ناوچەکە و

نیشتەجێ کردنی کەسانی نامۆ بە ناوچەکەو بێبەشکردنی دانیشتوان لە ئیش و کار و راستکردنەوەی نەتەوە[٤١]، هەروەها باس لە یاریکردن دەکات بۆ سنووری ئیداری لەبەر هۆکاری سیاسی. لەکاتێکدا ئەم زمانە، بێجگە لە باسکردنی روون و ئاشکرای کەرکوك، رەنگە بە تەمومژ دەربکەوێت، بەڵام کاربەدەستە کوردەکان پشتگیریی لەوە دەکەن کە ئەمە ئەنجامێکی تایبەت و تۆکمەی دەبێت بەوەی کە پێگە و شوێنی ناوچە کێشەدارەکان دەتوانرێ دیاری بکرێت:

"ناوچە کێشەدارەکان ئەو شوێنانەن کە بەرگۆرانی دیمۆگرافی کەوتوون یان لە کەرکوك دابراون. کەوابوو بۆچی ئۆفیسێکی مادەی ١٤٠ لە خانەقیندایە؟[٤٢] لەبەرئەوەی ناوچەیەکی کێشە لەسەرە. هەروەها دەتوانی تەماشای شوێنی ئەو ئۆفیسانە بکەیت کە داواکاریی ماڵ و سامانیان تێدا دەکرێت و بەپێی دەستور دامەزراون[٤٣]. چونکە هیچکام لەمانە لە دهۆکدا دانەمەزراوە، چونکە ناوچەیەکی کێشەدار نیە. بە هەمان شێوەش لە حیللەدا (لە هەرێمی فوراتی ناوەراستدا). دبس (لە پارێزگای کەرکوکدا) ئۆفیسی داواکاریی مۆڵکیەتی تێدایەو ئەو خەڵکانەی لە ئاڵتون کۆپری دادەنیشن دەچن بۆ دبس بۆ پێشکەشکردنی داواکانیان[٤٤]. ئەمانە تەواوی ئەو راستیانەن کە لە دەستورەوە وەرگیراون[٤٥] ".

ئەم پێناسەیە بەپێی پێوەرەکان زۆر یارمەتیدەر نییە چونکە ئۆفیسەکانی خاوەندارێتی دەکەونە سەرانسەری عێراقەوەو رەنگدانەوەی سرووشتی بەربڵاوی کێشەی خاوەندارێتین و زەرورەتی ئەوەیان نییە هەڵگری پرسی ناوچەیی بن. بێجگە لەوەش شوێن و دەستەی کاری ئۆفیسەکانی مادەی ١٤٠ بەدەرنین لە مشتومرو ناکۆکی.

بەڵگەیەکی زیاتر یارمەتیدەری ناوچەکانی ململانێ ئەو لیستەیە کە لە رەشنووسی دەستوری هەرێمی کوردستاندا هاتووە[٤٦]. بەهەرحاڵ، ئەمە پێناسەیەکی یەکلایەنەیە کە خودی خۆی کێشەی لەسەرە[٤٧] و رەنگدانەوەی تەنها ئەو ناوچانەیە کە لەلایەن کوردەکانەوە داواکارییان لەسەرە، نەك ناوچەکانی تر کە ئەگەری ئەوەیان هەیە بکەونە ژێر باری مادەی ١٤٠ەوە، وەك هەندێ ناوچەی پارێزگای ئەنبار کە لەلایەن هەردوو پارێزگای کەربەلا و نەجەفەوە داواکارییان لە سەرە و کاربەدەستانی کورد دەڵێن کەوا ٢٦ ناوچەی ململانێ هەن[٤٨].

تەنانەت ئەگەر کەسێك پێناسەی دەستوریی کوردی قوبووڵ کرد وەك لانیکەم بەڵگەیەك بۆ ئەو ناوچە کێشەدارانەی لەلایەن کوردەکانەوە داواکارییان لەسەرە، لەهەر حاڵەتێکیان ئەم پرسیارە سەر هەڵدەدات: ئەو پێوەرانە چین کە بەکاربهێنرێن لە دەسنیشانکردنی ئاخۆ ناوچەیەك لە بنەرەتدا سەر بە کوردستانی خەیاڵی یان تیۆری بوو بێت؟ نەخشەو دۆکیومێنتی مێژوویی لە هەموو لایەنەکانەوە خراونەتەکار بۆ ساغکردنەوەی کێشە دژوارەکانیان و لە ئەنجامیشدا جەختکردن لەسەر راستییە سەلماوەکان کەوا کێشە و ئاڵۆزییەك هەیە. سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ی دانیشتوانی عێراق پێشنیارکراوە ببێتە بنەمایەکی بەرچاو بۆ بریاردان لەسەر ئەوەی کێ زۆرینەی پێکهێناوە و لە کوێ لەو کاتەدا. بەڵام ئەوە پەنجا ساڵ پێش ئێستا بووە و نیو سەدەی گەشەکردن و زیادبوونی سروشتیی دانیشتوان ناگرێتەوە

بێجگە لە کۆچکردنی ناپەیوەست بە هۆکاری سیاسی و گۆرانی دیمۆگرافی یان کۆمەڵبوونی گرووپێکی ئەتنیکی لە ناوچەیەکی دیاریکراودا لەم ماوە دوورودرێژەدا یان هەر کاتێك لە رابردوودا دەکرێ ببێتە پێوەرێکی یەکلاکەرەوە بۆ بریاردان لەسەر باری سیاسیی ئەمرۆی ئەو ناوچەیە.

بە باڵادا برینی حاڵەتی سۆزداری بۆ ئەو ناکۆکی و ململانێیانەی بنەمای ئەتنیکییان هەیە و بەدرێژایی چەندین سەدە دروستبوون کارێکی نەشیاوە و دەبێ ململانێی نێوان نەك دوو بەڵکو سێ گرووپە ئەتنیکەکەی، عەرەب و کورد و تورکمان،چارەسەر بکرێت بە خواست و قەناعەتی هەموو لایەکیان. ئەوپەری چاوەروان کردن لەمەو بەپێی ئەو کەش و هەوایە رێککەوتنێکی کاتییە کەوا هەندێك ناوچەی جوگرافی بگرێتەوە. ئەمە بە رۆڵی خۆی رێککەوتنێکی لێدەکەوێتەوە لەسەر سنوورێك بۆ کوردستان کەوا رەنگە ئاشتیی برەخسێنێت بۆ نەوەیەك یان زیاتر. نەتەوە یەککرتووەکان لە ساڵی ٢٠٠٧ ەوە بەم نیازە هاتووەتە ناو گێژاوەکەوە.

**ب ـ رۆڵێکی نوێی نەتەوە یەکگرتووەکان :-**

یونامی UNAMI کەوتووەتە گەران بەدوای ئەڵتەرناتیڤی گونجاودا کاتێ لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧دا روونبووەوە کەوا پرۆسەی مادەی ١٤٠ پێناچێت لە دوامۆڵەتدا کە مانگی دیسەمبەر بوو هیچ ریفراندۆمێك بێنێتە کایەوەو ترسی ئەوە هاتە ئاراوە کە جێبەجێ نەکردن دەتوانێ گرژیی و ئاڵۆزی لە ناوچە کێشەدارەکاندا زیاد بکات، بە تایبەتی لە کەرکوکدا، کە ئاڵۆزییەکان لەوپەریدایەو گرژیی نێوان عەرەب و کوردی خستووەتە بارێکی پرمەترسییەوەو ئەگەری دەستێوەردانی سەربازیی لێدەکرێت لەلایەن دەوڵەتە دەراوسێکانەوە. ئەمەش هانی پێشنیارێکی نارەسمیی دا و خرایە بەردەمی سەرکردەکانی حکومەتی فیدراڵ و هەرێمی کوردستان کەوا دەبێ بانگهێشتی نەتەوە یەککرتووەکان بکەن بۆ چاودێریی پرۆسەیەك بە نیازی دەسنیشان کردنی سنوورێکی قبوولکراو بۆ هەرێمی کوردستان و ئەمەش بە دیاریکردنی ئەو ناوچانەی سنووریان دەگەرێتەوە بۆ حکومەتی فیدراڵ یان قەڵەمرەوی حکومەتی هەرێمی کوردستانن. هەر بریارێك پشت بە ژمارەیەك پێوەر دەبەستێ و لەوانەش ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە ئاستی ناوچەییدا.

مەسەلەی مەنتیقی ئەوەبوو کەوا زۆرینەی ئەو عێراقییانەی لەم ناوچانەدا دەژین، بۆ نەتەوەکەی خۆیان دەنگیان داوە، بەو پێیەی کە زۆربەی حیزبە دەستباڵاکان عەرەب یان کورد یان تورکمانن. لەم حاڵەتەدا باوەر وایە کەوا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ هەڵبژاردەی خۆیان دیاری کردووە بۆ ئەو ناوچە و بارە سیاسییە[٤٩]. ئەنجامەکانی پشتبەستوو بە ناوچەکان بڵاونەکرانەوە بەڵام دران بە یونامی UNAMI لە رێگای پەیوەندییەوە بە کۆمیسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لە عێراقدا کە لە ساڵی ٢٠٠٥دا هەڵبژاردنی رێکخستبوو[٥٠].

رێگەی چوونە پێشەوە دوو قۆناخی لەخۆ گرتبوو: بەرفراوانکردنی رەسمیی کارپێسپاردنی یونامی و دەستباڵاییەکی زیاتری رۆڵی یونامی لەپاش تێپەرینی دوا ماوەی ریفراندۆم. لە ١٠ی ئابی ٢٠٠٧دا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککرتووەکان بریاری ١٧٧٠ی دەرکرد و

راسپاردەی دا بە یونامی و نوێنەری تایبەت بۆ عێراق "لەسەر داوای حکومەتی عێراق" بۆ (راوێژکردن و پشتگیری و هاوکاری کردنی حکومەتی عێراق و ئەنجومەنی نوێنەران... لەبارەی پەرەپێدانی ئەو پرۆسانەوە کەلای حکومەتی عێراق پەسەندن بۆ چارەسەرکردنی سنووره ناوخۆییە کێشەدارەکان)[٥١].مانگێك دواتر، بان کی موونی سکرتێری گشتی، ستێڤان دی مستۆرایی دانا وەك نوێنەری تایبەتی خۆی بۆ عێراق و جێی ئەشرەف قازیی پاکستانیی گرتەوە. یەکەم کاری ئاشکرای دی مستۆرا قەناعەت پێکردنی سەرکردەکانی عێراق بوو کەوا جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ دوابخەن و دوا مۆڵەتی ئەو جێبەجێ کردنە لەبیر ببەنەوە. ئەمەش رێگای بۆ مامەڵەیەکی نوێ خۆشکرد.

یونامی نەیدەتوانی ئەم رۆڵە تازەیە بگرێتە ئەستۆ بێ پاڵپشتێکی چالاکانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان. ستراتیجیەتی واشنتۆن، وەك بەشێك لە ورووژانەکە، گەلێ گۆرانکاریی بەرچاوی تاقیکردبووەوە، لەوانەش هاوپەیمانییەك لەگەڵ یاخیبووە پێشووەکانی عەرەبی سوننەدا کەوا ئەنجومەنەکانی رابوون (سەحوە) یان پێکهێنا[٥٢]. ئەم هاوپەیمانییە ئەنجامی هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی ئەمەریکا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی پاش ساڵی ٢٠٠٣، کە حیزبە حوکمرانەکان بوون. کوردەکان بەشێوەیەکی تایبەتی هەستیان بە کاریگەریی توندی کرد. زنجیرەیەك رووداو لە نیوەی دووەمی ساڵدا ئەوەی دەگەیاند کە ویلایەتە یەککگرتووەکان کەوتووەتە ئەوەی دەست لە پشتگیریی هەڵسوکەوت و مامەڵەی کورد لەگەڵ کەرکوکدا هەڵبگرێ (بۆ نموونە دەبێ مەسەلەکە لە رێگەی مادەی ١٤٠ەوە چارەسەر بکرێت) پشتیوانیی لە چارەسەرێك دەکات کەوا دانوستانی لەسەر بکرێت.

بریاری ئەنجومەنی ئاسایشی یەکەم رووداوی لەو چەشنە بوو. ئەم بریارە ئامۆژگاریی یونامیی کرد بۆ پێناسەکردنی "پرۆسەکان" (بۆ نموونەیەك بە تەنها پرۆسەی مادەی ١٤٠) "کەوا پەسەندکراو بن لەلایەن حکومەتی عێراقەوە" (لێرەدا هیچ باسی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەهاتووە) بۆ چارەسەری "سنووره ناوخۆییە کێشە لەسەرەکان" (بۆ نموونە نەك حاڵەتی ناوچە کێشە لەسەرەکان، وەك ئەوەی کە دەستور دەیخوازێت). لە رێگەپێدانی پرۆسەکاندا بێجگە لە مادەی ١٤٠، کۆمەڵی نێودەوڵەتی و بەتایبەتی واشنتۆن وەك دروستکەری سەرەکیی بریارەکە ئاماژەی دوورکەوتنەوە و دابرانێکە لە پشتبەستنی تایبەت بە دەستور.

کوردەکان بەمە دوو مشت تێسرەواندنیان بەرکەوت، چونکە بە شێوەیەکی ئیعتیباری نەتەوە یەکگرتووەکان پابەندی دەستورێك نابێت کەوا لە برگەی کاراکانیدا لەسەر ناوچەکانی ململانێ، کە لە بەرژەوەندیی ئەوان دارێژراوە و بەتایبەتی ئەنجامی هەوڵ و کۆششی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشبینی ناکرێت چی لێدەکەوێتەوە، بە پێچەوانەی پرۆسێسی مادەی ١٤٠ەوە کەوا کوردەکان بە وردی دایانناوە بۆ ئەوەی گێرانەوەی تەواوی ناوچە کێشەدارەکانی لێبکەوێتەوە کە داوای دەکەن بچێتەوە سەر هەرێمی کوردستان. بۆ نموونە، دەکرێ دانوستان چارەسەرێکی سازشکارانە لەسەر ناوچەکان دروست بکات کەوا کورد بەشێك لە ناوچە کێشەدارەکانیان دەست بکەوێت و رەنگە کەرکوکی لێدەربکرێت یان هەر بەم بارەی ئێستایان بمێننەوە. بێجگە لەوەش، دانوستان رەنگە کات ببات، لە کاتێکدا کورد ئاواتی لەسەر پەلە کردن لە پرۆسەکەدا هەڵچنیوە بە پشتبەستن بە دوامۆڵەتی مادەی ١٤٠.

کوردەکان لە سەرەتای دیسەمبەردا تووشی قۆرتێکی تر هاتن کاتێ کە نوێنەرانی حیزبەکان .لە کەرکوك ناوبژی کردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان قوبووڵ کرد بۆ هاوبەشیی دەسەلات و رێککەوتن لەگەڵ سیاسەتمەدارە عەرەبەکانی ناوچەکەدا[٥٣]. لە سازشکارییەکی ئاشکرادا ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەم سیاسەتمەدارانەی هێنایە پێشەوە، کەوا بڕواشی پێیان نەبوو لەبەرئەوەی پێشتر هاوپەیمانی یاخییەکان بوون، بۆ ناو پرۆسە سیاسییەکە پاش ئەوەی سەرکردەکانی عەشیرەتی جبور ئەنجومەنێکی سەحوەیان لە نۆڤەمبەردا پێکهێنابوو لە حەویجە و کەوتبوونە پەلاماردانی ئەندامەکانی ئەلقاعیدەی عێراق لە ناوچەکەدا[٥٤]. سەرکردە کوردەکان ماوەیەکی دوورودرێژ بەرهەڵستی هەر رێککەوتنێکیان دەکرد لەگەڵ ئەو حیزبە عەرەب و تورکمانانەدا کە پشتگیرییان لە هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ نەدەکرد. بەهەرحاڵ، رێککەوتنی ٢ ی دیسەمبەر هیچ ئاماژەیەکی بەو مادەیە نەدا.

تارادەیەك، ئەمە دەکرێ بە چاو خستنە سەر هاوبەشیی دەسەلات باسی لێوە بکرێت وەك لەوەی حاڵەتی ناوچەیی بێت، بەڵام ئەمە هەرگیز پێشتر رێگەی لە کورد نەگرتووە کە زمانی مادەی ١٤٠ بەکاربێنێ. لە خۆشیی ئەوەی کە یەکەمجارە لە هەموو عێراقداو لە سەرەتای پشێوی ونائارامیی ئەو وڵاتەدا لەسەر ئاستی ناوخۆو پاش دانوستانی لایەنەکان و گەیشتن بە چارەسەر لە رێگەی رێککەوتنەوە، کۆندۆلیزا رایس وەزیری دەرەوە گەشتێکی کەرکوکی کرد بۆ پیرۆزبایی کردن لە سەرکردە ناوخۆییەکان. ئەمە بۆ کورد ئەو راستییە بوو کە کۆتایی بەوە هێنا ویلایەتە یەکگرتووەکان پرس و رایان پێبکات لەسەر مەسەلەی کەرکوك.

ئەم پەیامە لە دیدی کوردەوە زیاد لە راچڵەکین وراتەکاندن بوو بە دەستپێکردنی هێرش و پەلاماری بۆمبارانی تورکیا لە ناوەراستی دیسەمبەرداو بە ئامانجکردنی ئەو شوێنانەی کەوا گومانی حەشارگەی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە)ی لێدەکرد لە هەرێمی کوردستاندا[٥٥]. لەکاتێکدا کەوا تورکیا جاری ئەوەی دەدا تەنها مەبەستی پەکەکە بووە بەڵام وتەبێژی رەسمیی کورد سکاڵای ئەوەی دەکرد کەوا حکومەتی هەرێمی کوردستان ئامانجی راستەقینە بووە[٥٦]و دەگونجێ واشنتۆنیش رەزامەندیی دەربریبێت لەسەر ئەو بۆردمانە[٥٧]. کوردەکان ئەم رووداوەیان وەك ئیشارەتێك ئەمەریکا بینی بۆ سنوردارکردنی ئۆتۆنۆمیی کورد و جەختکردن لەسەر یەکێتیی خاکی عێراق، هەروەها وەك بیرخستنەوەیەك کەوا پشتگیریی ئەمەریکا بە مەرجی خواستی کوردەکان بووە بۆ پشتیوانی کردن لە ئەجێندەی ئەو، بۆ نموونە مەسەلەی پەیوەندیدار بە ئەنجومەنەکانی سەحوە[٥٨]. کاربەدەستانی ئەمەریکا بەشێوەیەکی رۆتینی نکووڵی لە بوونی پلانێکی گشتی دەکەن بۆ لاوازکردنی خولیای کورد لە ناوچە کێشەدارەکاندا بەڵکو فشار خستنە

سەر پێویستی هەموو لایەنەکانە بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی دەستووردا کار بکەن[٥٩]. لە هەمان کاتدا ئەمەریکا جەختیشی لە پشتگیریی بەهێزی هەوڵ و کۆششی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرد بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك کەوا، بە زەبری دەوروپشت، بەشێوەیەکی دراماتیکی لەگەڵ خەون و خولیای کوردەکاندا یەکناگرێتەوە[٦٠]. لە حوزەیرانی ٢٠٠٨دا سێ هەفتە پێش بەسەرچوونی دوامۆڵەتی ریفراندۆمە نوێیەکە، یونامی حکومەتی عێراقی تێگەیاند لەوەی کە پێی دەوترێ قۆناخی یەکەم لە پرۆسەیەکی سێ قۆناخی "پەیوەندیدار بەو پرۆسە گونجاوانەی بۆ چارەسەری سنووره ناوخۆییە کێشە لەسەرەکان". هەر بۆ تاقیکردنەوە، یونامی چوار ناوچەی "نموونەیی" هەڵبژارد وەك بەشێك لە ستراتیجیەتێك "بۆ پەرەپێدانی میتۆدێك بگونجێت لەگەڵ ئەم ناوچانەدا یان ناوچەکانی تری کێشە لەسەردا بۆ رەچاوکردنی بۆچوونی حکومەتی عێراق. هەروەها قسەکانی دیمستۆرای دووپات کردەوە کە دەڵێ: "حکومەتی عێراق بە تەنها سەروەری و بەرپرسیارێتی هەیە بۆ بریاردان لەسەر ئەو پرۆسێس و رێبازەی بەکاردێت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ سنوورەکانی ناوخۆدا. ئامانجی یونامی لە ئامادەکردن و خستنەرووی ئەم شیکارییە تەنها هاوکاری کردنە لە پێشخستن و پەرەپێدانی پرۆسێسەکانی چارەسەری ئەم مەسەلە ئاڵۆز و هەستیارانە[٦١] ".

پێشنیارەکە جێی خۆشحاڵی بوو لەبەر هەڵبژاردنی ناوچەکان و دەستنیشانکردنی ئەو پێوەرانەی داتای مامەڵەو هەڵسەنگاندنی حاڵەتی گونجاو، حوکمدان لەهەر حاڵەتێکی تایبەت و تارادەیەك ستایلی خستنەرووی بەرهەمهێنن، کە ببنەهۆی دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی وململانی لە رێگەی رۆڵی یونامییەوەو بە پێی دیبلۆماسییەتی تەمومژەوە. بۆ نموونە، بێجگە لە دەربرینی راسپاردەکان، یونامی ئەو دەستەواژە ناراستەوخۆیانە هەڵبژێرێت کە رەچاوکردنی سەروەریی عێراقی تێدابێت لەگەڵ بەئاگابوون لە ماندێتی سنورداری[٦٢]. بێجگە لەوەش، پێشنیارەکانی پێکهاتەی بەرێوەبردنی هەر چوار ناوچەکە دەگرێتەوە لەرووی پەیوەندییان بە پارێزگاکانەوە، نەك باری ناوچەییان چ لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدرالدا بن یان حکومەتی هەرێمی کوردستان، بە پێشنیارکردنی رێکخستنی ئیداری کەوا بە وریایی کارەکە بەرێوە ببات وئەگەری ژەهراوی بوونی ململانێی عەرەب و کورد بخاتە پێش چاوی. لەگەڵ ئەوەشدا، پێشنیارو بۆچوونەکانی یونامی راسپاردەی راستەقینە بوون کەوا شەقامی کوردی بەشێوەیەکی بەرفراوان وەك بریار لێکیدایەوە[٦٣]. چوار ناوچە (سەرەتاییەکە) ئاکرێ و حەمدانییە و مەخمور و مەندەلی بوون. لەناو ئەمانەدا ئاکرێ دەکەوێتە هەرێمی کوردستانەوە و بەو پێیە حکومەتی هەرێم وایناببینێت کە کێشەی لەسەربێت. یونامی لەبەرئەوە دەستنیشانی کردووە چونکە لە رووی رەسمییەوە سەر بە پارێزگای نەینەوایە و ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٩١ یشەوە لەلایەن پارێزگای دهۆکەوە بەرێوەدەبرێت. یونامی پێیوایە بە رسمی ئیدارەدانی بگوێزرێتەوە سەر دهۆك وەك ئیجرائێکی درەنگوەخت کەوا کاریگەرییەکی ماددیی نابێت وریزبەندییەکی ئاسانە بۆ واقیعێك کە هەیە. سێ ناوچەکەی تر تا نیسانی ٢٠٠٣ لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقدا بوون و بەو پێیە زیاتر نموونەی ناوچە کێشەدارەکانن (بە تایبەتی وەك لەلایەن کوردەکانەوە پێناسە دەکرێت). ئەم شوێنانە لە کاتی رووخانی بەعسەوە بە شێوەو ئاستی جۆراوجۆر کورد کۆنترۆڵی کردوون: راستەوخۆ و رەسمی وەك لە حاڵەتی مەخموردا، کە زۆربەی زۆری دانیشتوانی کوردن و لە رووی ئیدارییەوە سەر بە پارێزگای هەولێرە (هەرچەندە لە نێوان ساڵانی ١٩٩١ ـ ٢٠٠٣دا لەلایەن نەینەواوە ئیدارە دراوە) و لەوانیش کەمتر حەمدانییەو مەندەلی، کە دانیشتوانیان زۆر تێکەڵە[٦٤].

یونامی رایسپاردووە کەوا قەزای مەخمور دەبێ لەلایەن هەولێرەوە بەرێوەببرێت، جگە لە ناحیەی قەراجی سەر بەو قەزایە، کە دانیشتوانێکی بەرچاوی عەرەبی تێدایەو پێشنیاری کردووە لە رووی ئیدارییەوە بخرێتە سەر قەزا یان پارێزگایەکی نزیکی خۆی (وەك گریمانەیەك نەینەوا یان کەرکوك بێت[٦٥]. هەروەها یونامی پێشنیاری کردووە کەوا حەمدانییە وەك خۆی لەلایەن پارێزگای نەینەواوە ئیدارە بدرێت و مەندەلیش لەلایەن پارێزگای دیالەوە.

هەڵبژاردنی ئەو ناچانە وەك یەکەم قۆناخ وەك ئاماژەیەکە بۆ پێشخستنی ئەو ناوچانەی کەوا لە قەڵەمدەدرێن ناکۆکییان لەسەر نەبێت: لەبەرئەوە دەست نیشان کردنیان پێناچێت کاردانەوەیەکی بەهێز بورووژێنێت، بەتایبەتی لەبەرئەوەی یان بە روونی بوونی کوردیان تێدا باڵادەستە (وەك ئاکرێ و مەخمور، قەراجی لێبەدەر) یان بێ ئەملاو ئەولا وانیە (وەك حەمدانیەو مەندەلی). بێجگە لەوەش، لە هەوڵێکدا بۆ خستنەرووی شێوەیەك لە هاوتایی، یونامی دوو ناوچەی هەڵبژارد کە سەر بە حکومەتی هەرێمی کوردستان بن لە واقیعداو دوانیش سەر بە دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی بن.

پێوەرەکانی یونامی بۆ ئەم کارە (کە بەریز دانراون) ئەمانەن: مێژووی بەرێوەبردنی ناوچەکە، گۆرانکارییەکان لە مارتی ٢٠٠٣وە، دابینکردنی خزمەتگوزاریی حکومی، مەسەلە دیموگرافییەکان و هەڵبژاردنی پەرلەمانی دیسەمبەری ٢٠٠٥دا، بارودۆخی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری (وەك بەڵگەی کۆنترۆڵ)، داواکاریو قەرەبووکردنەوە (وەك بەڵگەی دەسکاریکردنی پێشتر)و بارودۆخی ئەمن و ئاسایش. ئەوان تیشکیان خستبووەسەر ئەو مەودایەی کەوا بە عەرەبکردن راستییە ئیداریو دیمۆگرافیەکانی گۆریوە (بێجگە لە پرۆسەکانی بینای دەوڵەت و ئەوانی بنەمای ئەتنیکییان نەبووە). لە کاتێکدا کە ئەوانە سەلماندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی دیسەمبەری ٢٠٠٥ لەخۆ دەگرن وەك لانیکەم بیرهێنانەوەیەك بۆ هەڵبژاردنی سیاسی دانیشتوانی ناوچەکە، یونامی لە بایەخی سوودی زانیاریی هەڵبژاردنی رابردوو کەمدەکاتەوە بۆ پێشبینی کردن لە رەفتار و هەڵسوکەوتی دەنگدان لە ریفراندۆمێکدا لەسەرباری ئەم ناوچانە[٦٦]و، لەبری ریفراندۆم، کەوا یونامی هەست دەکات کاتی تەواوی نەدراوەتێ و کێشەی جیددی بەرپا دەکات لەرووی ئەمنییەوە، واچاکترە هەڵبژاردنی دانیشتووان لە رێگەی زنجیرەیەك پرس و راوێژی ناوخۆوە بێت.

ج، هەڵوێست لە ئاست پێشنیار و بۆچوونەکانی یونامیدا

ئەو دەمەی کە یونامی لە ٥ی حوزێراندا بیروبۆچوونی خۆی بڵاوکردەوە بەرەورووی نارەزایی و ئیدانەکردنێکی گەورە بووەوە و سەرلەبەر عەرەبی عێراق و کورد و تورکمان و ناشنالیزمی تورك بوون بەیەك دژ بە تێکەوتنی نێودەوڵەتی کەوا بانگهێشت کراوە بۆ چارەسەری کێشەیەکی ناوخۆیی ئاڵۆز(٦٧). ئەم کاردانەوە سەرەتاییە رێگایەکی سەختی بەردەمی پیشاندا تەنانەت ئەگەر بێ مەبەستیش جەختی لەسەر بێلایەنی یونامی کردبێتەوە. بەهەرحاڵ، گفتوگۆکردن لەگەڵ پەیوەندیدارە سەرەکییەکان ئەوە دەگەیەنێت کە لە ژێر ئەو نارەزاییی دەربرینەدا شتێکی شاردراوە هەیە وا دەردەکەوێت قوبووڵکردنی مامەڵەی یونامی بێت وەك تاقە چارەسەرێکی کردەیە.

سەرکردە کوردەکان نارەزایی تەنها لە هەندێك راسپاردەی تایبەت دەردەبرن، نەك هەموو دیدو بۆچوونەکە. ئەوان رەخنە لە پێوەرەکانی یونامی دەگرن، گوایە رێککەوتنی پێشوو تیایاندا رەنگی نەداوەتەوە. بۆ نموونە، محەمەد ئیحسان کاربەدەستی بەرپرسی فایلی ناوچە کێشەدارەکان لە حکومەتی هەرێمدا ئاماژە بۆ "کارنامەیەك" دەکات کەوا، بە قسەی ئەو، هەموو لایەنەکان لە دوادوایی ساڵی ٢٠٠٧دا ئەوەیان قوبووڵ کردووە و سەلماندوویانە کە بۆچوونەکانی یونامی دەبێ بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە ئەنجامە ناوچەییەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانیی دیسەمبەری ٢٠٠٥ ببەستێ(٦٨).

بەهەمان شێوەش، قادر عەزیزی نوێنەری تایبەتی مەسعود بارزانی بۆ پرۆسەی مادەی ١٤٠ تەئکید لەوە دەکاتەوەو دەڵێ: "رێککەوتنی ئێمە لەگەڵ دیمستۆرا ئەوەیە کە ئەگەر ریفراندۆم چارەسەری مەسەلەکەی نەکرد، لەبری ئەوە پشت بە هەڵبژاردنی دیسەمبەری ٢٠٠٥ دەبەستین. بەڵام ئەو لە راسپاردەکانیدا ئەمەی نەکردووە(٦٩)".

وەك هەر بوارێکی مەسەلەی ناوچە کێشەدارەکان، بەکارهێنانی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥ پڕ لە گێروگرفتە. ئەمە لە دیدی کوردەوە ئەو هەڵبژاردنانە رێنمای قەناعەتبەخشن لەبارەی تەفزیل کردنی گرووپێکی ئەتنییەوە بۆ چوونەپاڵ هەرێمی کوردستان یان مانەوە لەژێر دەسەڵاتی بەغدادا. بەم چەشنە، ئەوان دەڵێن، ئەگەر لە ناوچەی مەندەلیدا لیستی کوردی ٢٥٪ی دەنگەکانی هێنا ئەوە مانای وایە ٢٥٪ی دانیشتوانی کوردن و بەم پێوەرە بێت زەحمەتە بەگوێرەی راسپاردەی یونامی مەندەلی لەژێر دەسەڵاتی ئیدارەی پارێزگای دیالەدا بهێڵێتەوە (واتە هێشتنەوە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا).

بەپێی هەمان پێوەر ئەگەر تەنها ٥٪ی دانیشتوانی ناوچەی زوممار لە پارێزگای نەینەوا دەنگ بدەن بە حیزبە عەرەبییەکان و ئەودوای بۆ لیستی کوردی بێت، کەواتە بەپێی لۆجیك دەبێ زوممار بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان(٧٠). کۆسرەت رەسوڵ عەلی، جێگری هەرێمی کوردستان، داوای لە یونامی کردووە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن لەسەر ئاستی ناوچەکان بڵاوبکاتەوە(٧١).

بەهەرحاڵ، سیاسییە غەیرە کوردەکان لەسەر ئەنجامەکانی ساڵی ٢٠٠٥ جەخت لەوە دەکەنەوە کەوا هەڵبژاردنەکە ساختەکاری شێواندی و بە گۆڕینی باری دیموگرافی دەستی پێکرد و بوو بە بار بەسەریەوە:

"ئێمە رازین لەسەرئەوەی ناوچەیەك ٧٠٪ی کورد بێت بچێتە سەر هەرێمی کوردستان. بەڵام ئەوە دەڵێین کە تەواوی ئەم ناوچە (کێشەدارانە) بەر دەسکاریی دیموگرافی کەوتوون (لە نیسانی ٢٠٠٣وە). بەم رەنگە ئێمە پێویستمان بە گێڕانەوەی ئەو گۆڕانکارییانە هەیە و تەنها ئەو کاتە دەگەڕێینەوە بۆ بریاردان لەسەر رەوشی ئەو ناوچانە. بێجگە لەوەش، ئەگەر تۆ هەڵبژاردن بکەیتە بنەما بۆ ئەمە، ئەوە کورد هەموو شتێك دەکەن بۆ یاری کردن بە هەڵبژاردنی داهاتوو، چونکە گەلێ سکاڵا هەن لەسەر هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥(٧٢)".

بۆ ئێستا، وادیارە کوردەکان بریاری ئەوەیان دابێت لە کاتێکدا ئەگەر رێگر بن لە راسپاردەکانی قۆناخی یەکەم وبیانەوێ لە هەندێ شتدا چاووراو بکەن، ئەوە پێگەیەکی رەسمی وەرناگرن. ئەوان بە ئاشکرا رەخنەیان لە تێهەڵکێشکردنی ئاکرێ(٧٣)و ئەو پێشنیارانەی لەبارەی قەراج و حەمدانییەو مەندەلییەوە کراون، کە ناوچەگەلێکن ئەوان لەرووی مێژووییەوە بە بەشێك لە کوردستانی دەزانن بەدەر لە پێکهاتەی ئێستای دانیشتوانیان (کە دەڵێن لە ئەنجامی دەستکاری کردنی دیموگرافییەوەیە). لەبری ئەوە، یەکەمجار دەیانەوێ تەواوی پاکێجەکە ببینن، بەهەرسێ قۆناخەکەوەو بە کەرکوکیشەوە. وەك کۆسرەت رەسوڵ عەلی گوزارشی لێوە دەکات:

"دەبوو یونامی هاوکاریی تەکنیکیمان بکات، نەك چارەسەری سیاسی بدات. ئەم پێشنیار و بۆچوونە شتەکان زیاتر ئاڵۆز دەکەن. ئێمە ئێستا چاوەڕێی فەیسی دوو و سێمانە، رەنگە ئەوان باشتر بن. ئێمە ناتوانین پرۆژەکە رەتکەینەوە تا هەموو شتێك نەبینین. لەراستیدا، واباشترە هەرسێ قۆناخەکە بەیەکجار روون بکرێتەوەو بەجیا لەگەڵ کەرکوکدا مامەڵە نەکرێت(٧٤)".

کاربەدەستانی دیکەی کوردیش هەمان بۆچوون دەڵێنەوە. کاربەدەستێکی باڵای KRG دەڵێ "ئێمە بەرهەڵستیی راپۆرتەکە ناکەین، بەڵام دەمانەوێ لەگەڵ بۆچوون و پێشنیارەکانی یونامیدا وەك پاکێجێکی تەنیا مامەڵە بکەین و پاشان رێککەوین لەسەر چارەسەر(٧٥)"، بە واتایەکی تر، وا دەردەکەوێ ئەوان پێشنیاری مامەڵەیەکی ناوچەیی گونجاویان هەبێت.

وادیارە سیاسەتمەدارە عەرەبەکان بیروبۆچوونی جیاجیایان هەیە لەسەر پێشنیارەکەی یونامی، لەوانەیە رەنگدانەوەی نەبوونی پتەوی و مشتومری ناوخۆیی بێت. راکان سەعیدی جێگری پارێزگاری کەرکووك، کە بە دوای رێککەوتنی دیسەمبەری ٢٠٠٧ ی عەرەب و کورددا لەو پۆستەدا دامەزرا ئەمەی بە "پلانی دابەشکردن" ناوبرد و دەڵێ: "ئێمە رەتیدەکەینەوە چونکە یونامی راوێژی پێنەکردووین. ئێمە قسەمان لەگەڵ کردوون بەڵام نەك بە دیاریکراوی لەبارەی زۆرینە و کەمینەی ئەم ناوچانەوە(٧٦)". ئەو پێشنیاری کرد کەوا باشترین شێوە بۆ چوونە پێشەوە هەوڵدانی یونامییە بۆ کۆدەنگی لەسەر هەڵبژاردنی پارێزگای کەرکوك. عەرەبەکانی کەرکووك، بەو هەستەوە کە بەهێزبوونەتەوە بەهۆی پشتگیریی ئەمەریکا لە ئەنجومەنەکانی رابوون (سەحوە)، هیوای ئەوەیان پەیداکردووە کە ئەنجامی باشتر بەدەستبێنن

لە هەڵبژاردنی پارێزگادا وەك لەوەی كە لە كانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا هێنایان كاتێ زۆرێكیان، لەبەر ئەم یان ئەو هۆكار، خۆیان بەدوور گرت لە سندووقەكانی دەنگدان. ئەوان لەرێگەی نوێنەرایەتییەكی زیاترەوە لە ئەنجومەنی پارێزگادا نیازیانە پاشەكشە بەهێزی كورد بكەن لە كەركوكداو ئەو رەوشە ئالۆز بكەن بۆ ئەوەی نەگەرێتەوە سەر كوردستان لە رێگەی مادەی ١٤٠ەوە، چ بە میتۆدی یونامی بێت یان هەر شتێكی تر. سەركردەیەكی تری عەرەب كە زیاتر ئیجابی بوو، پێشنیارەكەی بە "هاوتا" ناوبرد[٧٧]، بەڵام ئەمیش قسەی سەركردە كوردەكانی دەكرد لە باسكردنی مەسەلەی كەركوكدا. بەهەمان دەستور، سەرۆكی ئەنجومەنی سەحوەی حەویجە ئیشارەتی بەوە دەكرد كە هەندێ بواری پێشنیارەكەی پێ پەسەندە، بۆ نموونە ئەوەی كە پەیوەندیی بە قەراجەوە هەیە، بەڵام نیگەرانی خۆی دەربری لەوەی كە بە هەوڵ و كۆششی كورد باسدەكرێت بۆ "كڕینی خەڵك لە قەراج چەشنی ئەوەی لە حەویجە و لە بەغداش دەیكەن[٧٨]". رەنگە بەهێزترین بەرهەڵستیی لەلایەن توركمانەكانەوە بووبێت.حەسەن توران، كە ئەندامێكی ئەنجومەنی پارێزگای كەركوكە، رەخنەی لە یونامی دەگرت لەبەر پشتبەستنی بە ئەنجامەكانی هەڵبژاردنی دیسەمبەری ٢٠٠٥ (بڕوانە سەرەوە)و دیمستۆرای بەوە تاوانبار دەكرد كە بەلای كورددا دایتاشیوە كاتێ كە داوای كردووە جێبەجێكردنی مادەی ١٤٠ دوابخرێت (بێجگە لەوەی كە بە شەرعیەت نەماو و بەتاڵ لە قەڵەمی دەدا)، هەروەها تاكلایەنە ناوچە ململانێ لەسەرەكانی دەسنیشان كردووە[٧٩]. بەهەرحاڵ، ئەو پشتیوانیی دەكرد لە بۆچوونی گشتیی یونامی، بەمەرجێ رەزامەندیی ئەنجومەنی نوێنەرانی لەسەربێت لەمەر پێناسەیەك بۆ ناوچە كێشەدارەكان و مامەڵە لەگەڵ هەموویان بكات (بۆ نموونە بە ناوچەگەلێكەوە كە دوورن لە كوردستان وەك ئەنبار/ كەربەلا/ نەجەف و بەغداو لەولاشەوە سەلاحەدین بەسەر دوجێلدا). سەبارەت بە یونامی و شكستهێنانی لە مامەڵەكردنی هەموو سنوورە ناوخۆییە كێشەدارەكانداو وەك دەیوت "ئەمە گومان دروست دەكات لەسەر نیاز و مەبەستی[٨٠] ".

رەوشی حكومەتی فیدراڵی بە ناروونی ماوەتەوە و لەم رووەوە كوردێكی سەربەخۆی ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای كەركوك كەوا رازییە بە پێشنیاری یونامی، داوا لە حكومەت دەكات خۆی ساغ بكاتەوە:

"ئێمە دەبێت فشار بخەینە سەر مالیكی سەبارەت بەوەی ئاخۆ ئامادەیە بۆ جێبەجێكردنی راسپاردەكانی یونامی: ئایا تۆ ئامادەیت مامەڵە لەگەڵ ئەمەدا بكەیت؟ ئێمە دەبێت مەرامی ئەم و نیازی ئەنجومەنی سەرۆكایەتی تاقیبكەنەوە. ئەمە دۆكیومێنتێكی نێودەوڵەتی جیددییە. ئێمە ناتوانین هەروا بیخەینە ئەولاوە و ئەمە گەمەیەكی گەورەیە بە یاریكەری گەورەوە[٨١] ".

بەڵگەیەك لە ئارادا نییە كەوا حكومەتی مالیكی هیچ هەنگاوێكی نابێت بۆ كاركردن لەسەر ئەو پێشنیارانەی كە یونامی "یەكەم شیكارییەكانی" بۆ ناردووە. زۆر پێدەچێت كە بڕیاری دابێت چاوەڕێی قۆناخی دوو "ناوچەكانی تەلەعفەر، تلكێف، شێخان و سنجار بكات لە پارێزگای نەینەوا و قەزای خانەقین لە پارێزگای دیالە"و قۆناخی سێ (كەركوك) بكات[٨٢]، كەوا یونامی ئێستا دەڵێ لە یەك راپۆرتدا لێكیداون و بەتەمایە لە كۆتایی نۆڤەمبەری ٢٠٠٨دا بڵاوی بكاتەوە. بەهەرحاڵ، كارنەكردن رەنگە ئەو هەستە دروست بكات كە حكومەت پشكێكی لە رەوشی ئێستادا هەبێت تا ئەم ئاستە و كوردەكانیش لە بارێكی سروشتیی وادان كەوا كەمترین سەركەوتن بەدیبێنن ئەگەر پاڵ بە حكومەتەوە بنێن بۆ كاركردن.

لە مانگی تەموزدا، پێشنیاری چاوەڕوانكراوی یونامی لەسەر كەركوك تووشی گرفت و گێچەڵ هات بەهۆی یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاكانەوەو دوای ئەوە لە ئابدا سوپای عێراق كەوتەرێ بۆ ناوچەكانی ململانێی پارێزگای دیالە. وادیارە تێكەڵبوونی پێداگرتن و سووربوونی حكومەتی مالیكی و ئارادەیەك رۆڵی نیگەتیڤی ویلایەتە یەكگرتووەكان بوون بە كۆسپ و رێگر لەبەردەم خواست و ئاواتی كوردەكاندا لە كەركوك و ناوچە كێشەدارەكانی تر كەوا داواكارییان لەسەرە و هیچ شتێكیان بۆ ناكرێت. جارێكی تر، چاوەڕێ دەكرا لە یونامی پێشنیاری نوێ بەرهەمبێنێت بۆ شكاندنی ئاستەنگ و بەستەڵەكەكە. هەرچەندە لە پاش دوو مانگ ئەمە یارمەتیدەر بوو بۆ خاوكردنەوەی قەیرانەكە لە یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاكاندا بەهۆی پێشنیاركردنی میكانیزمێكی جیاواز بۆ كەركوك، بەڵام تاقیكردنەوە جارێكیتر پێویستیی گەران بەدوای "مامەڵەیەكی هەمەلایەنەی" هێنایە ئاراوە كەوا پێدەچێت چارەسەری مەسەلەی نەوت و گاز و پێداچوونەوەی دەستور لەخۆبگرێت.

*** پەرەسەندنی ململانێ لەسەر نەوت:-**

نەوت و گاز وەك تاقە سەرچاوەی داهاتی عێراق رۆڵێكی هێجگار گەورە دەبینێ لە كاروباری سیاسیدا، لەگەڵ ئەو پرسیارانەی بەدەوروبەری ئەوانەدا دەخولێنەوە كە دەبنە خاوەنی و بەرێوەی دەبەن و كۆنترۆڵی هەناردەی دەكەن و پشكداری داهاتەكەین[٨٣]. لە نیسانی ٢٠٠٣ەوە ئەم مەسەلانە كێشە بەرپا دەكەن و دەیوروژێنن، لەگەڵ دەستكردنی ولاتەكە بە ئاسێنتراڵی لە بارودۆخێكی توندوتیژی ئەتنیكی و تائیفیداو لە بەرفراوانیی گەندەڵی و تاواندا (لە نێویاندا قاچاخچێتی بە نەوتەوە) و بێمتمانەییەكی قووڵدا. دەركەوتنی هەرێمێكی كوردستانی ئۆتۆنۆمی و بەهێز، بەشێوەیەكی تایبەتی، مەسەلەكانی نەوتی هێناوەتە پێشەوە. كورد، كە ناوچەكەیان بۆ چەندین دەیە پشتگوێ خرابوو، بە پەرۆشن بۆ پەرەپێدانی بەڵام، بەوەی كە سەرچاوەكانی داهاتی خۆیان لەبەردەستیاندا نیە، بە تەواوی پشتیان بە بودجەی فیدراڵی بەستووە. بە ئاڵۆزبوونی كێشەكان پەیوەندییان لەگەڵ بەغدا گرژ بووەو بودجەی تەرخانكراوی ساڵانەی ١٧٪ یان ناكۆكیی لەسەر پەیدابووە و سكاڵای ئەوە دەكەن كە ئەو برە پارەیە وەرناگرن كە پشكی راستەقینەی خۆیانە، یان بەپێی خشتەیەكی كات وەریناگرن. بۆ دەربازبوون لەم كەموكورییە، حكومەتی هەرێمی كوردستان دەبوو بە گەرمی بكەوێتە كار بۆ پەرەپێدانی دوو سەرچاوەی شاراوەی داهات: ئەو سامانە نەوتەی چاوەڕوان دەكرێ لە هەرێمی كوردستاندا بوونی هەبێت و بەوەرگرتنەوەی

ناوچە کێشەدارەکان، یەدەکی سەلمێنراوی نەوتی کەرکوك و هەر نەوت و گازێك کە ڕەنگە لە ناوچەکانی تری ململانێدا بدۆزرێتەوە. ئەمە کۆسپێکی تری هێناوەتە ئاراوەو پرۆسەی مادەی ١٤٠ تووشی دواخستن و فروفێڵ هاتووە و خەون و خولیای حکومەتی هەرێم بۆ بەرهەمهێنانی نەوت و گازی خۆی تووشی قۆرت و نائومێدی هاتووە بە ساغنەبوونەوە یاسای نەوت و گازی فیدراڵی و یاسای بەشکردنی داهات کەوا دامودەزگا و بناغەی بەڕێوەبردن و پەرەپێدانی سەرچاوە کانزاییەکانی وڵات و دابەشکردنی داهاتی پاش فرۆشتنیان دەگرێتە ئەستۆ[٨٤].

دانوستان لەسەر ئەم یاسایانە بووە بە شەڕە دەمی بێهوودە چونکە وەزارەتی نەوتی فیدراڵی و حکومەتی هەرێمی کوردستان دوو ڕەشنووسی ڕکابەری دژبەیەکی یاسای نەوت و گازیان لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧دا خستووەتە بەردەست. پاشان KRG یاسای لەمەڕ نەوت و گازی خۆی لە ئابی ٢٠٠٧دا دەرکردو یەکلایەنە کەوتە مۆرکردنی کۆنتراکت لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکاندا لە پێناوی دامەزراندنی ژێرخانی بنەرەتیی نەوت و گاز دۆزینەوە و بەرهەمهێناندا. ئەم ئالۆزی و شێرازە تێکچوونی پەیوەندییە لەگەڵ بەغدادا (کە لە ساڵی ٢٠٠٨دا بە مۆرکردنی یەکلایەنەی کۆنتراکتەکانی خۆی وەڵامدرایەوە لەمەڕ کێڵگەکانی نەوت و گاز لە ناوچەکانی وڵاتدا)، لە کاتێکدا کە سەرنج چووەتە سەر کۆسپ و تەگەرەی تری KRG. تەنانەت ئەگەر ئەم بیشتوانێت نەوت هەڵێنجێت ئەوە ناتوانێ بیفرۆشێ تاوەکو ئەوە مسۆگەر نەکات کە دەیگەیەنێتە بۆریی هەناردە کەوا دەگاتە سەر دەریای ناوەڕاست لە تورکیاوە. بەهەرحاڵ، تورکیا لە ترسی ئەوەی نەوت ببێتە مایەی سەربەخۆیی کوردستان هیچ ڕێگە بە KRG نادات نەوتەکەی بەنێو خاکی ئەودا هەناردە بکات بە بێ یاسایەکی نەوت و گازی فیدراڵ کەوا هەرێمی کوردستان توندتر دەبەستێت بە دەوڵەتی عێراقەوە.

لە ڕاپۆرتێکی پێشتردا، کرایزس گرووپ مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکات کەوا "چوارچێوەیەکی شەفافی، بە تواناو ڕەوا بۆ بەڕێوەبردنی سامانی نەوت وگاز، کە مشتومڕی لەسەر بکرێت، بایەخدارترین بەردی بناغەی عێراقێکی نوێیە"، هەروەها نەبوونی چوارچێوەیەکی لەو چەشنە هانی وەربەرهێنانی نێودەوڵەتی نادات لە پیشەسازی نەوتدا بەڵکو هانی ئەکتەرانی وەك KRG دەدات کە بە تەنها ئەو کارە بکەن[٨٥]. دانوستان لەسەر یاسای نەوت و گاز کەلێنێکی قووڵی درووستکردووە سەبارەت بە ڕۆڵی دەوڵەت لە ئابووریدا، هەروەها لە ململانێی نێوان ناشنالیزمی کورد و عەرەبدا. کوردەکان دەیانەوێت ڕۆڵی حکومەتی فیدراڵی کەمبکەنەوە لە بەڕێوەبردنی سێکتەری نەوتدا و داوای ئەوە دەکەن کە خۆیان بڕیاردەر بن لە پەرەپێدانی کێڵگەکانی ناو خاکی خۆیان، ئەمە ڕەنگدانەوەی بێمتمانەیی قووڵی بەغدایە لەسەر بنەمای ئەزموونی مێژوویی دوور و ئێستا، لەوانە بەکارهێنانی سامانی نەوت لەلایەن ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانەوە بۆ سەرکوتکردن و داپڵۆسینیان و چکەچکە سەرفکردنی ئەو بودجەیەی لەسەری ڕێککەوتوون کە حکومەتی ئێستا بیانداتێ. بێجگە لەوە وادیارە کوردەکان بە دوای بەهێزکردنی ئابووریی سەربەخۆدا دەگەڕێن بۆ زیاتر کردن و گەورەکردنی ئۆتۆنۆمییەکەی خۆیان و ڕەنگە دەرفەتی جیابوونەوەی پاشەڕۆژیشیان.

بە پێچەوانەوە، زۆربەی عێراقییەکانی تر، لەوانە هەندێ سەرکردەی سیاسیی شیعە وەك مالیکیی سەرۆك وەزیران، وایبینن کە بووژاندنەوەی دەوڵەت هەرەشەیەك پێکبێنێت. ئەوان دەیانەوێت لەڕووی ئابووری و دامودەزگاییەوە بەهێز و دەستباڵای بکەن و بەرهەڵستی ناشنالیزمی کورد دەکەن و لە جیاتیدا ئەوەیان پێباشە کە پێیدەوترێ سەرچاوەی نەتەوەیی (یان نیشتمانی) کە بۆچوونێکە بە تایبەتی گوزارشی لەخۆی دەکرد لەو مشتومڕانەدا کەوا کێ خاوەنی نەوتە و (بەو پێیە ئەوە خاکی کێیە کە ئەو بیرە نەوتەی تێدایە) و ئاخۆ کۆمپانیا بیانییەکان دەکرێ خزمەتگوزاریی نەوتیان بدرێتێ نەك پارە. ململانێی نەتەوەیی وڕۆڵی دەوڵەت لینکێکی دروستکردووە لەنێوان شەڕوشۆڕی جیاجیا لەسەر نەوت لەگەڵ ناوچە کێشەدارەکاندا. نەك هەر تەنها حاڵەتی چارەسەر نەکراوی ناوچە کێشەدارەکانی کە داوای کوردیان لەسەرەو واپێدەچێت یەدەکێکی زۆری نەوت تێدابێت دانوستانی یاسای نەوت وگازی ئالۆز کردووە، بەڵکو داواکاریی پڕ لە نائومێدی کوردەکان بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بۆراگرتنی هاوکاریی لەسەر هەردووك یاسای نەوت و مەودایەکی یاسادانانی ناپەیوەندیداردا. زیاد لەوەش، هەوڵ و کۆششەکانی کورد بۆ گێڕانەوەی چەندین ساڵ پشتگوێ خستن و جیاوازی کردنی پەیوەندیدار بە تەعریبەوە، KRG کۆنترۆڵی دیفاکتۆی بەسەر هەندێك ناوچەی ململانێ لەسەردا بەشیاو دەزانێ کە هەنگاوی سەرەتایی بنێ بۆ دۆزینەوەو پەرەپێدانی چەند دەتوانێ لە سەرچاوەکانی ئەو نەوت و گازەی لە ژێردەستیدایە. ناکۆکی و ململانێ لەسەر نەوت و ناوچەکان بە تەواوی لێکئاڵاون و کێشەکە لە ئێستادا قورس و سەخت بووە و لە تەقینەوەدایە.

### أ. پەرەپێدانی سامانی نەوتی کوردستان

حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرەورووی تەحەدایەکی هێجگار گەورە بووەتەوە لە دانەخستنی سامانی بێ سەرقاپی هەرێم. بە کورتهێنانی ئەزموون و سەرچاوەو پشتگیریی سیاسی لەلایەن بەغداوە بە تەنها خۆی کەوتووەتە گەشتێکی دوورودرێژ بۆ نەخشاندنی ئۆتۆنۆمیی کورد بە بناغەیەکی ئابووریی پشت بەخۆ بەستوو. ئەوەی کە ئەم هەرێمە هەیەتی ئەگەرە[٨٦]و هەرچەندە ژمارەی وردو تەواو تەنها هەر خەمڵێو چاووراوە[٨٧]، بەڵام هەندێ کاربەدەستی کورد زیادەڕۆیی دەکەن لە گەشبینیدا کەوا بڕێکی بێشوماری نەوت و گاز دەدۆزرێتەوە.

ئاشتی هەورامی وەزیری سەرچاوە سروشتییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەڵێ "پێموانیە کەرکوکێکی تر بدۆزرێتەوە (کە تا پانزە ملیار بەرمیل بروات). بەڵام پێموایە ژمارەیەکی زۆر کێڵگەی نەوت دەدۆزمەوە کە بە تێکرای دەگاتە ئاستی کەرکوك[٨٨]، بەڵام هەندێکی تر کەمتر گەشبین بوون و دەیانووت: "بەڵێ، نەوتی هەرێم بۆ ئێمە گرنگە، بەڵام ئەمە نابێتە ئەڵتەرناتیڤ بۆ نەوتی کەرکوك[٨٩].

لە ساڵی ٢٠٠٨دا، هێشتا بڕێکی زۆر کەمی نەوت بەرهەمهێنراوە و هەمووشی لە تاقە کێڵگەی تەوکێیە لە

پارێزگای دهۆك، کە لەلایەن کۆمپانیای DNO نەرویجییەوە بەرێوەدەبرێت و رۆژانە برێکی کەمی دە هەزار بەرمیلی بەرهەمدێنێت، کە وەك باسدەکرێت بۆ بەکاربردنی ناوخۆیە، بەڵام پێدەچێت بە نایاسایی وبە تەنکەر هەناردە بکرێت بۆ ئێران[٩٠]. بەخێرایی پسپۆرانی نەوت دەڵێن کەوا DNO دەتوانێ بەرهەم هێنان بەخێرایی زیاد بکات و برەکەی چەند بارە بکاتەوە ئەگەر کەناڵێکی هەناردەی بۆ برەخسێت[٩١]".

بەهەرحاڵ، رێگەی هەناردە لەو نەوتە داخراوە بەهۆی ناکۆکیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ وەزارەتی نەوتی حکومەتی فیدرالدا و هاوزەمانیش شکستهێنانی رێککەتنیان لەسەر یاسای نەوت و گاز. ئەگەر ئەو مەسەلەیە چارەسەر بکرێت ئەوە کاربەدەستانی KRG وا باسدەکەن کە پێشبینی ئەوە دەکەن کەوا تێکرای بەرهەمهێنانی هەموو کێڵگەکانی هەرێم لە ساڵی ٢٠١٣دا بگاتە یەك ملیۆن بەرمیل لە رۆژێکدا. هەرچەندە پسپۆرانی سەربەخۆی نەوت بە پارێزەوە لەوە دەدوێن وپێیان وانیە تا ساڵی ٢٠١٣ ژمارەکە لە نیو ملیۆن تێپەڕ بکات لە رۆژێکدا، بەڵام گەشبینن لەوەی کە هەرێم دەرفەتی بازرگانیی گەورەی تێدا دەرەخسێت[٩٢].

فشاری سەرکردە کوردەکان بۆ پەرەپێدانی ئەم سامانە هایدرۆکاربۆنە گەلێ پاڵنەری لە پشتەوەیە. یەکەم، حکومەتی هەرێمی کوردستان دەیەوێت توانای ئابووری زیاد بکات لە بەرانبەر حکومەتی فیدرالدا، کەوا لە بەشی هەرە گەورەی داهاتیدا پشت بەم دەبەستێ[٩٣]، چونکە حکومەتی فیدرالی ساڵانە ١٧٪ی بودجە بۆ هەرێمی کوردستان تەرخان دەکات، بەڵام ئەم برە بەشێوەیەکی بەرچاو دابەزێنراوە بە کۆمەڵێك داشکاندن (بەزۆری بۆ داپۆشینی (خەرجی سەروەری) پەیوەندیدار بە عەمەلیاتی حکومەتی فیدراڵەوە)[٩٤]و بەرەورووی بەرەنگاری ئەو حیزبە سیاسیانە بووەوە کەوا جەخت دەکەنەوە کە کورد رێژەیەکی کەمتری ژمارەی دانیشتوان پێکدێنن[٩٥]. تەنانەت ئەگەر KRG لە هەناردەی نەوتی خۆی هاوبەشیی حکومەتی فیدراڵ بکات، کە وەك هەمیشە دەڵێ حەزی بەوەیە، بەڵام دەکرێ وەك سەرچاوەیەکی لاوەکی بەکاریبهێنێت لە بەرانبەر هەر هەوڵێکی حکومەتی فیدرالدا بۆ راگرتنی ئەو پارەیەی کەوا KRG بە ئیستیحاقی خۆی دەزانێ[٩٦].

حکومەتی هەرێمی کوردستان بەوەی لەرووی ئابوورییەوە بیەوێت کەمتر پشت بە حکومەتی ناوەندی ببەستێت وا دێتە بەرچاو بەرەورووی بارێکی ناسك بێتەوە بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی خەڵکەکەی کە خزمەتگوزاریی بنەرەتییە وەك کارەبا و سووتەمەتی و (لە ئەنجامی ئەمەشدا، ئاوی پاك و ئاوەرۆو شتی هاوشێوە). هەموو ئەمانە کەموکورتی هەیە لە دابینکردنیانداو نارەزاییان لای خەڵك دروستکردووە. هەرێمەکە هیچ پاڵاوگەیەکی تێدا نیەو چەند وێستگەیەکی کەمی وزەی کارەبای تێدایە[٩٧]. بە فرۆشتنی نەوت و گاز KRG دەتوانێ پارە پەیدا بکات بۆ بنیاتنانی ژێرخانی پێویستی لەو چەشنەو پاشانیش دابینکردنی کەرەستەی خاو بۆی. ئەمە کۆتایی بەو سەربەخۆییە لاوازەی دێنێ کەوا لە هاوردەکردنی سووتەمەنی لە تورکیا و شوێنانی ترەوە رەخساندوویەتی و بەزۆری بەنرخ گەلێك کە هەرزان نەبێت بۆ هاووڵاتیی ئاسایی[٩٨]. لە کۆتاییدا، تا ئەو مەودایەی کە سەرکردە کوردەکان خولیای سەربەخۆییان هەبێت، ئەوە پێویستیان بە بنەمایەکی ئابووریی بەهێزە کە سامانی نەوت و گازی هەرێمەکە دەیرەخسێنێ. ئەوان هەرچەندە بە ئاشکرا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەخوازن لەگەڵ عێراقدا بمێننەوە، بەڵام وابەستە بەجێبەجێ نەکردنی مادەی ١٤٠ و بوارەکانی تری دەستور بوونەتە مایەی هەرەشەیەکی تەواو بۆ قەناعەتهێنان بە زۆرێك لە عێراقیەکان کەوا کوردەکان تەنها چاوەڕێی دەرفەتن بۆ ئەوەی بەپەلە بکەونە کار[٩٩].

بەپێی ئەم دیدو بۆچوونە ئەوەی زۆر بایەخدار بێت بۆ KRG هاوبەشییەکەی رەوای داهات نیە، (کە ئەمرۆ زۆریان پێویست پێیەتی بەڵام رەنگە گونجاو نەبێت بۆ سەربەخۆیی)، بەڵکو خاوەندارێتی و کۆنترۆڵی کێڵگە نەوتییەکانە.

بۆ شوێنکەوتنی ئەم مەسەلانە، KRG ستراتیجێکی بە هەڵپەی جێبەجێکردووە بۆ راکێشانی وەبەرهێنانی بیانی بە دەستپێشخەریی ئاشتیی هەورامی وەزیری سەرچاوە سروشتییەکان، کە لە مایسی ٢٠٠٦دا دەستبەکاربوو. کاتێ گفتوگۆ لەسەر یاسای نەوت و گازی فیدراڵ لە ساڵی ٢٠٠٧دا شکستی هێنا، ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان یاسای نەوت و گازی خۆی پەسەند کرد، لەسەر بنەمای لێکدانەوەی KRG بۆ دەستوری فیدراڵی[١٠٠]. یاساکە و مۆدێلی کۆنتراکتەکەی کە پەیرەوی دەکات، (لەلایەن نوێنەرانی پیشەسازییەوە) بەباشترین کار لە پیشەسازیدا باسکراوە[١٠١].

حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستی کردەوە بە دانوستان لەسەر ژمارەیەك کۆنتراکت کە پێشتر بە ئەنجامی گەیاندبوون[١٠٢]و کۆنتراکتی نوێ ئیمزا بکات لەگەڵ ئەو کۆمپانیایانەی دەخوازن کاری جدی بکەن و تا ئەیلوولی ٢٠٠٨ زیاد لە بیست کۆنتراکتی مۆر کردووە[١٠٣]. لەبەر مەترسییەکانی کارەکە (وەك دڵنیا نەبوون لە رەوشی بازرگانیی و باشبوون و پەرەسەندنی نەوت و گاز و غیابی ژێرخان ونەبوونی سیستەمێکی ژمێریاری و نەتوانیی هەناردە بە نەبوونی یاسایەکی نەوت و گازی فیدراڵ[١٠٤]،ئەوانەی کە هاتنە پێشەوە بۆ وەرگرتنی زیاتر کۆمپانیای بچووك بوون و سەرچاوەو توانای پێویستیان لەبەردەستدا نەبوو کە بە تەنها ئەو پیشەسازییە دامەزرێنن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمان توانیان دەست بە پرۆسەی دۆزینەوەی نەوت بکەن لەرێگەی بیر هەڵکەندنی تاقیکردنەوەو لانی کەم لەیەك حاڵەتدا نەوت دەربێنن وئیمزاکانیان زیاتر بایەخێکی سەرەکیی رەمزی و سیاسییان هەبوو وەك لەوەی ئابووری بن[١٠٥]. KRGوا باس لەم کۆنتراکتانە دەکات کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا هەرێم شیاوی وەبەرهێنانی دەرەکییە و گیانی کێبڕکێ دەگەیەنن لەسەر ئەو گریمانەیەی کە ئەگەر داهات چەور بێت ئەوە هیچ کۆمپانیایەکی قەبارە مامناوەندی لێی راناکات.

حکومەتی هەرێم دەیەوێت لە رێگەی جاردانی دۆزینەوە سەرەتاییەکانەوە سەرنجی کۆمپانیا گەورەکان رابکێشێت و فریویان بدات و هەروەها لەرێگەی هاوبەشیی کۆنتراکتەوە بۆ ئەو ناوچانەی پێشتر تەرخان کراون و دیاریکردنی شوێنی نوێ[١٠٦]. ئەگەر هەندێك لە وەبەرهێنە سەرەتاییەکان لەلایەن رکابەری گەورەترەوە بخرێنە لاوە[١٠٧]، تەنها ئەمە هێز و دەسەڵاتی KRG زیاد دەکات و ئەوپەڕی ئامانجی

ئەوەیە کەوا کۆمپانیای نەوتی گەورە بێنێتە ناوەوە. وەك پسپۆڕێکی نەوت باسی دەکات کەوا: (ئاشتی هەورامی، حالی حازر کۆمپانیای نەوتی بچووکی لە هەرێمی کورددا ناوێت، بەڵکو کۆمپانیای ئەزموونداری چاکی دەوێ و دەیەوێت لەسەر ئەرزی واقیع و ڕاستی دروست بکات(١٠٨)".

بەهەرحاڵ، زۆریان دوو دڵن وحەزْ بەو کارە ناکەن وپاساویان نەبوونی کەشوهەوای مسۆگەری وەبەرهێنانە لە هەرێمی کوردستانداو لەوەش گرنگتر هەرەشەی حکومەتی فیدراڵە کەوا هەر کۆمپانیایەك گرێبەستی لەگەڵ KRG ئیمزا کردبێ بێبەش دەکرێ لە هەموو کۆنتراکتێك لەگەڵ وەزارەتی نەوتی حکومەتی فیدراڵدا، کەوا کۆنترۆڵی کێڵگە نەوتی زۆر گەورەتر دەکا لە باشووری عێراقدا.

کۆنتراکتە چەورەکانی حکومەتی هەرێم لەگەڵ کۆمپانیا گەورەکاندا هەرچەندە بۆ سامان وسەرچاوەی زیاترە بەڵام ڕەنگە بەشێوەیەکی بایەخدارتر بۆ ئامانجی سیاسییان بێت(١٠٩). قادر عەزیزی نوێنەری باڵای سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ مادەی ١٤٠، بەگەڕانەوە بۆ سەرکردە کوردەکان، دەڵێ: "ئەوان باوەڕیان وایە ئەگەر کۆمپانیا گەورەکان هاتن بۆ کوردستان ئەوە هەرێم دەپارێزن چونکە ئەوان وڵاتە گەورەکان پاڵپشتیانن(١١٠). ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵ لەو بارەیەوە ڕایەکی هەیە کەوا:

"کاربەدەستانی کورد وا دەڕواننە ئەو کۆنتراکتە نەوتییانەی ئیمزایان کردووە. کە سیاسەتێکی دڵنیای دوو کەرت بێت. بە مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمپانیا جۆراوجۆرەکانی وڵاتانی وەك ئوستڕالیا، بەریتانیا، فەرەنسا، هندستان، ڕووسیا، کۆریای باشوور، تورکیاو ویلایەتە یەککگرتووەکان، کورد دەڵێن کە بە هیوان پشتیوانیی سیاسی نێو دەوڵەتی ببەنەوە لە حاڵەتێکدا کە شتەکان لەگەڵ بەغدا باش نەڕۆیشتن، لە حاڵەتێکیشدا کە عێراق پەیوەندیی لەگەڵیان بری ئەوە کوردە سەرچاوەی داهاتی خۆیان دەبێت". بەڕێز هەورامی، وەزیرە کوردەکەی سەرچاوە سروشتییەکان بە بزەیەکەوە دەڵێ: "ئاخۆ ئەم بۆچوونە وردەکاریی تێدا کراوە؟ بە دڵنیاییەوە بەڵێ(١١١)".

ئەم ستراتیجە لە هەندێ سەرەوە بەجێیە، لە سۆنگەی ئەو ڕاستییە ڕەهایەوە کەوا هەرێمی کوردستان بە وشکایی دەوردراوەو لە واقیعدا تاقە هیوای بۆ هەناردە کردنی نەوت وگاز لەڕێگەی تورکیاوەیەو دەبێ داوای ڕێگەپێدان لە حکومەتی فیدراڵ بکات کە نەوتی خاوی کورد بە بۆرییە نەوتی کەرکوك ـ بێجی ـ جیهاندا بنێرێت. بەڵام لەم ئاستەنگەی ئێستادا، KRG لە هاوکاریی کردنی بەغدا ڕانابینێ، تەنانەت ئەگەر حکومەتی هەرێم بە هەر شێوەیەك بووە ئەو کۆسپەی لابرد و لوولە نەوتی ستراتیجیی خۆی ڕاکێشا لە هەرێمی کوردستانەوە بۆ سنوری تورکیا، بەڵام هێشتا هەر پێویستی بە ڕێگەپێدانی تورکیایە وەك ترانزێت بۆ سەر دەریای ناوەڕاست(١١٢). هەندێ لە کاربەدەستانی KRG پێدەچێت دواجار پشت بەڕێککەوتن لەگەڵ ئەنکەرە ببەستن و ئەمیش بکەوێتە بەر فشاری پێویستبوون بە وزە(١١٣). پسپۆڕێکی وزە دەڵێ:

"حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕاستی بۆچووە لەبارەی بە پرۆژەکردنی گەیشتنە یەك ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا لە ماوەی پێنج ساڵداو پاشان ڕەنگە مەسەلە ئابوورییەکان وا لە تورکیا بکات تەنگ بە حکومەتی عێراق هەڵچنێ و ڕاستەخۆ لەگەڵ KRG مامەڵە بکات. تورکیا ڕۆژانە پێویستی بە هەشت سەد بەرمیل نەوتی خاوەو خۆی تەنها ٤٣ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا بەرهەمدێنێ و ئەمە نەوتێکە جۆرەکەی باش نیەو نرخیشی گرانە. ئەوجا ئەگەر KRG بتوانێ بڕێکی تەواو نەوت بەرهەم بێنێت کەوا پێداویستییەکانی تورکیا داین بکات ئەوە بە تەواوی دەمچەورو چەشە دەبێت(١١٤)".

کاربەدەستانی ئەنکەرە بەباشی درکیان بەمە کردووەو وایدەبینن کە یاسای نەوت و گازی فیدراڵ بلۆکێکی پێویستی بنیاتنانی عێراقێکی یەککگرتووە کە هەرێمی کوردستانیش بگرێتەوەو دەڵێن کەوا بەرهەڵستیی هەناردەی نەوتی خاوی کورد دەکەن تا ئەو یاسایە جێی خۆی نەگرێت(١١٥). بەم ڕەنگە و لەبەرمەترسییە پراکتیکییەکان هەموویان، نەوتی کورد بەشێوەیەکی سەرەکی قەتیس ماوەو چارەسەری یاسای نەوت و گازی تووشی پەشۆکان و هەڵپەساردن کردووە، ڕێك لە کاتێکدا کەوا گەلێ لەو کۆمپانیایانەی گرێبەستیان کردووە ساز و ئامادەن بۆ ئەوەی دەست بە بەرهەمهێنان بکەن.

**ب، نەوت لە کەرکوك و ناوچەکانی تری ململانێدا:-**

گرگرتنی مشتومڕ لەسەر نەوت وناوچە کێشەدارەکان مەسەلەی نەوتە لەو ناوچە کێشەدارانەداو بەتایبەتی کەرکووك. قادر عەزیزی نوێنەری باڵای مەسعود بارزانیی سەرۆکی هەرێم بۆ مادەی (١٤٠) دەڵێ: "ئەگەر کەرکوك نەوتی تێدا نەبوایە کەس شەڕی لەسەر نەدەکرد(١١٦)". شەڕ لەسەر کەرکوك لەو دەمەوەیە کەوا کۆمپانیای شێڵی شاهانەی هۆڵەندی لەسەرەتای ساڵانی ١٩٢٠کاندا نەوتی تێدا دۆزییەوەو کەشەکەش هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا لەنێو خۆڵەمێشی ئیمپراتۆرێتی عوسمانیدا(١١٧). خەبات وتێکۆشانی کورد بۆ ڕزگاربوون لە حوکمی بێگانە هاوشان بوو لەگەڵ ئەو داواکارییەی کەوا لەو ڕزگارییە بکات لە ڕووی ئابوورییەوە سەقامگیربێت. لە کاتێکدا کە یەدەکی نەوتی هەرێمی کوردستان پێدەچێت بەس بێت بۆ ئەوەی ئاستێکی گەورەی پشت بەخۆبەستنی ئابووریی بۆ برەخسێنێ، بەڵام قەبارەی نەوتی یەدەکی کەرکوك بێگومان ئەوە دەکات و پێگەی هەموو لایەکی پەیوەندیدار بەهێز دەکات کە ئەو یەدەکەی لە بندەستدا بێت. قسەکردن لەسەر هێڵی سوری ئێران وتورکیا لەمەڕ ئەوەی کەرکوك بچێتە سەر هەرێمی کوردستان، کاربەدەستێکی KRG جەخت لەوە دەکاتەوە کە: "ئەوان کەرکوك وادەبینن کە بنکەیەکی سەربەخۆیی کوردستانە و ئێمەش وەك کورد دەزانین کەوا بێ کەرکوك پاشەڕۆژێکی باشمان نابێت(١١٨)".

کێڵگە نەوتی "زەبەلاحی" کەرکوك نزیکەی ١٣٪ ی یەدەکی سەلمێنراوی نەوتی عێراقی تێدایە (پانزە ملیار لە کۆی ١١٥ ملیار بەرمیل)(١١٩)، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەزەندە دەگۆڕێت(١٢٠). بەهەرحاڵ، کێڵگە نەوتی کەرکوك، وەك گەلێك لە کێڵگە نەوتەکانی تری عێراق بە باشی پارێزگاری لێنەکراوەو (تەنانەت بە خراپیش مامەڵەی لەگەڵدا کراوە) و پشت بە تەکنەلۆجیای کۆن وبەسەرچوو بەستراوە بۆ نەوت دەرهێنان

(هەڵکەندنی ستوونی لە بەرانبەر ئاسۆییدا)، هەروەها زیان پێگەیاندنی بەسەرلەنوێ تێکردنەوەی نەوتەخاوە "مردووەکە"و ئاوی کانزایی سوێرو زوو هەڵگوستن و وشکردنی. بەم جۆرە مامەڵەیە و بە تێپەربوونی کات و بە واتایەکی تر بایەخی کەرکوك وەك ناوچەیەکی نەوت هەڵگر بەرەو پووکانەوە و نەمان دەچێت. بیوڕا کۆك نییە لەسەر مەسەلەی چوارچێوەی کات. هەندێك دەڵێن کەوا کەرکوك، وەك زۆرێك لە بیرە نەوتەکانی ئێستا، لە ماوەی بیست تا پەنجا ساڵی تردا تەواو دەبن[١٢١].

ئەمە بووە بە چەکێك بە دەست سەرکردە کوردەکانەوە لە دانوستان ومشتومڕیاندا کەوا نەوت پەیوەندیی نییە بە کێشەو داواکاریی ئەمانەوە چ بۆ کەرکوك و چ بۆ سەربەخۆیی. لە دیدی ئەوانەوە، مەسەلە بایەخێکی کردەیی نیە، چونکە ئەوان رازین لەسەرئەوەی کە بەپێی دەستور KRG پابەندە بە هاوبەشی کێڵگەی کەرکوك بەڕێوەببەن لەگەڵ حکومەتی فیدراڵدا، ئەگەر هەر کاتێ کەرکوك خرایەسەر هەرێمی کوردستان وهاوبەشی داهات دەبن لەگەڵ هەموو عێراقییەکاندا. بۆ نموونە، کەریم سنجاری، وەزیری هەرێم بۆ کاروباری ناوخۆ لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا جەخت لەوە دەکات کەوا: "کەرکوك زۆر گرنگە بۆ ئێمەو هیچ مەسەلەیەکی نەوت لە گۆڕیدا نییە چونکە کێشەی نەوت لە دەستوردا چارەسەر کراوە. کێڵگە نەوتەکان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا دەمێننەوە بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ کەرکوك دەچێتە سەر هەرێمی کوردستان... (لەگەڵ ئەوەشدا) ئێمە نەوتی تەواومان هەیە لە هەرێمی کوردستاندا بۆ ئێستا و بۆ چەندین ساڵی تر دەمێنێتەوەو هەولێر لەسەر دەریایەك نەوتە[١٢٢].هەندێکی تر مشتومڕ لەسەر ئەوە دەکەن کەوا کێڵگەی کەرکوك "پێناچێت وا زوو وشك بکات و ئەگەری ئەوە هەیە یەکێك بێت لە گەورەترین کێڵگەی بەرهەمهێنانی نەوت لە جیهاندا[١٢٣]". لەرووی بایەخپێدانەوە ئەم درك پێکردنە، راست بێت یان نە، ڕێك و ڕەوان تورکیا هاوهەستە تێیدا کە نەوتی کەرکوك بە بەردی بناغەی کوردستانێکی سەربەخۆ دەبینێ لە نزیك سنووری خۆیەوە. بێجگە لەوەش، ئەو بیرۆکەیەی کەوا نەوتەکەی لە چەند دەیەیەکی کەمی داهاتوودا وشك دەکات پێدەچێت هۆکار ئەوەی لە پشتەوە بێت کە بۆچی KRG بەپەلەیە لەوەی کەرکوك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان (وەك تەوزیفکردنێکی تری بەهێزبوونی سیاسی ڕێژەیی KRG لە عێراقی ئەمڕۆدا)، بۆ نموونە، پێشتر هیچ شتێك نەدەمایەوە کەوا دەوڵەتێکی سەربەخۆی لەسەر بنیات بنرێت.کێڵگەی کەرکوك، کە ئێستا لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی فیدراڵدا ماوەتەوە، لە پاش گەلێ کۆسپی دوای ساڵی ٢٠٠٣ نرخ وبەهای خۆی دەسەلمێنێت. هەرچەندە تا ئێستاش ڕێژەی بەرهەمهێنانی خوار قەبارە و توانای خۆیەتی و ئەمەش بەزۆری لەبەر ئەو کێشانەیە کە پەیوەندییان بە پاراستنی ئەو ٧٩ کیلۆمەتر لوولە نەوتەیە لە کەرکوکەوە بۆ بێجی (لە باکووری بەغدا) کە لەوێوە دەبەسترێ بەو بۆرییە سەرەکییەوە کە بۆ جیهان دەچێ[١٢٤]. لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٨دا کەرکوك تێکرا شەش سەد هەزار بەرمیلی لە ڕۆژێکدا بەرهەم دەهێنا و ئەمە نزیکەی دوو لەسەر سێی توانای پێش جەنگی بوو. بەشی زۆری ئەم بەرهەمە (٤٠٠، ٤٥٠ هەزار بەرمیل لە ڕۆژێکدا) لە ڕێگەی جیهانەوە هەناردە دەکرا بە پێی داواکاریی[١٢٥]. ئەودواشی دەنێردرا بۆ گەورەترین کۆمەڵگای پاڵاوگەی عێراق لە بێجی، بۆ پرۆسێسەکردنی و فرۆشتنی لە بازاری ناوخۆدا[١٢٦].

ناکۆکییەکی تایبەت دروست بوو لەسەر بەشێك لە کێڵگەی نەوتی کەرکوك، کە پێی دەوترێ گردی خورماڵە و دەکەوێتە سەر سنووری پارێزگای هەولێر[١٢٧]. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٧دا، KRG تێچوونی گرێبەستێکی خزمەتگوزاریی لە ئەستۆ گرت بۆ دروستکردنی پاڵاوگەیەك کە نەوت لە خورەو لە دۆمەوە بگەیەنێتە ئەو پاڵاوگە نوێیە بە خاوەندارێتی کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی کوردستان (KNOC)[١٢٨]. لە کۆتایی ئەو مانگەداو دیسان لە حوزێرانی ٢٠٠٨دا، هێزەکانی پاسەوانیی KRG وەك باسدەکرێت ڕایگەیان لە کرێکارانی حکومەتی فیدراڵ گرت کەوا کار لەو کێڵگەیەدا بکەن[١٢٩]. دۆخەکە پرمەترسی بوو و کێڵگەکەش ئەوپەڕەکەی ٧٠ هەزار بەرمیلی بەرهەم دەهێنا بۆ بەکارهێنانی ناوخۆ. ئەمەش تارادەیەك فشاری پێداویستیی سووتەمەنیی هەرێمی کوردستان دەردەخست هەر کاتێ پاڵاوگەکە بکەوێتە کار[١٣٠].

مشتومڕی حکومەتی هەرێم لەسەر ئەوەیە کەوا لەبەرئەوەی کێڵگەکە درێژبووەتەوە بۆ ناو پارێزگای کەرکوك کەواتە زیاتر لەناو هەرێمی کوردستانندایە وەك لەوەی لە ناوچە کێشەدارەکاندا بێت، بۆیە کورد مافی تەواوی خۆیەتی لەو کێڵگەیەدا[١٣١]. بێجگە لەوەش، KRG دەڵێ کەوا خورمەڵە دۆم هەرگیز پێشتر بەرهەمی نەبووەو بەو پێیە کێڵگەیەکی نوێیەو دەبێ KRG مافی تەواوی بەڕێوەبردنی هەبێت بە گوێرەی دەستور. دواجار، مشتومڕی ئەوەش دەکات کەوا مەسەلەیەك نییە ئایا KRG یان حکومەتی فیدراڵ نەوتی لێدەردەهێنێت (چ هەناردەی بکات یان هەرکاتێ پاڵاوگەکە دروستکرا، نەوتەکە پاکتاو دەکات و لە بازاری ناوخۆدا دەیفرۆشێت)و بەهەر ڕێگایەك بێت سوود بە خەڵکی عێراق دەگەیەنێت. لەم ڕووەوە ئاشتی هەورامی بە ڕەسمی رایدەگەیەنێت کەوا: "ئێمە نەوت نادزین، ئەوە نەوتی خۆمانە، واتە نەوتی عێراقە و مافی خۆمانی تێدایە. ئەگەر بەغدا کاری باشتر دەکات، با بێ ببنە میوانم... وەرن کارمان لەگەڵ بکەن و هیچ کێشەیەك نیە، بەڵام ئەوان ناتوانن بێنە ئێرە بۆ وەستاندنی کاری ئێمە. چونکە ئەوە گیانی دەستور یان هاوکاریی نیە[١٣٢]".

کاربەدەستانی عێراق ئەم ئیدیعایانە ڕەتدەکەنەوەو مشتومڕی ئەوە دەکەن کەوا خورمەڵە دۆم بەشێکی تەواوکەری کێڵگەی کەرکوکە، کەوا دانی پێدانراوە کە ببێتە بەشێکی ناوچە کێشەدارەکان ولەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا بمێنێتەوە لانیکەم تا چارەسەرێك دەردەخسێت. سەرەرای ئەوەش، ئەوان دەڵێن تازە نییە بەڵکو کێڵگەیەکی چالاکی بەرهەمهێنانە کە لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە ڕۆژانە ٣٥ هەزار بەرمیل نەوتی لێدەردەهێنرێت و بەم شێوەیە ناکەوێتە ناو سنوری حکومەتی هەرێمەوە بەپێی ماددەی ١١٢ای دەستور[١٣٣].

ناکۆکی وململانێکە بەهۆی گرژیی دووریانی نەوت وناوچەی کێشەدارو راستییەکانی سەر ئەرزەوە سەریهەڵداوە. وەك پێشتر باسی لێوە کراوە، پێناسەی ناوچە کێشەدارەکان

تەمومژەو تەنانەت لەسەر دیاری کردنی شوێنەکانیشیان ناکۆکی هەیە. ئاخۆ چەند بەشێك لە هەر سێ پارێزگا کوردییەکە بە ناوچەی ململانێ لە قەڵەم نادرێت؟ پێدەچێت حکومەتی هەرێم بە نەخێر مشتومڕی لەسەر بکات. ئاشتی هەورامی پەنجە بۆ هێڵی کۆنترۆڵ ڕادەکێشێ لە کاتی هێرش وداگیرکردنی نیسانی ٢٠٠٣دا بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان کەوا هەرێمی کوردستانی لەودوای عێراق جیاکردەوە، لەوانەش ناوچەکانی ململانێ، دەڵێ: "ئێوە خەتی سەوزم لە دەستووردا پیشان بدەن. خەتێکی سەوزم پیشان بدەن کەوا کەسێك بە ڕەسمی ئیمزای لەسەر کردبێت. گەڵێ خەتی سەوز هەن بەڵام ئەوەی کە بەڕاستی ڕەچاو دەکرێ ئەوەیە کە ئێستا لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندایە(١٣٤)". بەڵام، بە بارێکی تردا، KRG ئەوەی سەلماندووە کەوا ئەو ناوچانەی لە ئەنجامی سیاسەتی بە عەرەبکردندا خراونەتە سەر پارێزگا کوردییەکان وبەڵام پێشتر سەر بە پارێزگای کەرکوك بوون، وەك چەمچەماڵ (کە خراوەتە سەر سلێمانی)، دەبێ بگەڕێنەوە سەر کەرکوك(١٣٥) و ئەمەش پێچەوانەی ئەو بنەمایەیە کەوا ئەو ناوچانەی دەکەونە ناو کوردستانەوە ناکرێ بە کێشەدار لەقەڵەم بدرێن. هەر لەم ڕووەوە ژمارەیەك کێڵگە نەوت هەن، چ بەرهەمدار یان چاوەڕوانی بەرهەمیان لێدەکرێ، یان پەرت و بڵاون بەملاوبەولادا یان بە چواردەوری خەتی سەوزدان[١٣٦].

ئەمە وا دەگەیەنێت کەوا تا هێڵی سەوز بە دیاری نەکراوی بمێنێتەوە، ململانێ و ناکۆکیی وچەشنی ئەوەی لەسەر خورماڵە پەیدا بووە بەردەوام لە هەڵایساندا دەبێت[١٣٧]. لە ڕاستیدا، حاڵی حازر کێشەیەکی تر لە ئارادایە و بریتییە لە بەشە ئیمتیازێك کە دراوەتە کۆمپانیای هانت ئۆیلی ئەمەریکی لە ناوچەیەکی پارێزگای دهۆکدا[١٣٨] هەرچەندە ڕووبەری تەواوی ئەو شوێنەی دراوەتە کۆمپانیا کە هەر بە نارونی ماوەتەوە، بەڵام کۆنتراکتەکە مشتومڕی لێکەوتووەتەوە، چونکە هەندێك دەڵێن کەوا (K7، "عەین سفنی") لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی KRG چووەتە ناو ناوچەکێشەدارەکانەوە لە پارێزگای نەینەوا[١٣٩] هەورامی پاساوی بۆ کۆنتراکتەکە هێنایەوە بەوەی کەوا بەدەر لە وردەکاریی شوێن، داهات هەقی شەرعیی حکومەتی فیدراڵ دەبێت وهەرێمی کوردستان لە ڕێگەی بودجەی ساڵانەوە بەشی ڕەوای خۆی وەردەگرێت و لەبەرئەوە کارەکانی زیان بە بەرژەوەندییەکانی حکومەتی فیدراڵ ناگەیەنێت[١٤٠]. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کۆنتراکتانەی ئەمڕۆ دەکرێت سبەی دەتوانرێ هەڵبوەشێنرێتەوە (بە گریمانەی ئەوەی بێ هیچ خەرجێك نابێت لەسەر حکومەت).

لە حاڵەتی عەین سفنیدا، ئەگەر ناوچەی کۆنتراکتەکە لە ڕاستیدا درێژبووبێتەوە بۆ ناوچە کێشەدارەکان، بەواتاKRG ڕەچاوی یاسای نەوت و گازی خۆی نەکردووە کە لە ئابی ٢٠٠٧دا دەریکردووە و ڕێگەنادات KRG هیچ کۆنتراکتێك بکات لە ناوچە کێشەدارەکاندا بێ ڕەزامەندیی حکومەتی فیدراڵ. لەبری ئەوە، پێدەچێت پشتی بەرەشنووسێکی پەسەندنەکراوی ئابی ٢٠٠٦ بەستبێت کە هەق دەداتە KRG بۆ بەڕێوەبردنی کێڵگە نەوتەکان لە هەموو ئەو ناوچانەدا کەوا داواکاریی کوردیان لەسەرەو زیاتر پێدەچێت بخرێنەوە سەر هەرێمی کوردستان لە پەیرەوکردنی مادەی ١٤٠دا[١٤١].

لە کاتێکدا ڕەنگە KRG پاساوی ئابووری بێنێتەوە بۆ پەرەپێدانی کێڵگەکان لە ناوچە کێشەدارەکانداو پاکانە بۆ سیاسەتی یەکلایەنەی بکات بە لێکدانەوەی ئەوەی کە کاریگەریی پێچەوانەی نابێت لەسەر بەرژەوەندییە داراییەکانی حکومەتی فیدراڵو پاڵنەری فەرامۆش کردنی پێدەچێت پاڵپشتی بێت بۆ ئیعدام کردنی ئەم ناوچانەو بەو پێیەش حوکمی پێشوەختی خۆی دابێت. بەم پێیە، سیاسەتەکە بەشێوەیەکی حەتمی بارگرژی بەرزدەکاتەوە.

لە بەرانبەر کاری یەکلایەنەی KRGدا وەزارەتی نەوتی حکومەتی فیدراڵ لە سەرەتای ئۆکتۆبەری ٢٠٠٨دا ڕایگەیاند کە ئامادەیە بۆ تەندەرکردنی کێڵگەکان لە ناوچە کێشەدارەکانی پارێزگای دیالەدا[١٤٢]. ڕوون و ئاشکرایە حکومەتی فیدراڵ دەتوانێ هەمان بێنەوبەرەی ئابووری بکات (کەوا زیان بە بەرژەوەندییە داراییەکانی KRG نەگەیەنێت)و زیاتر پشتیوانی دەکرێت بەهۆی ئەوەوە کە سەروەریی هەیە لەم ناوچانەدا لانیکەم تا بارودۆخیان چارەسەر دەکرێت.

وەك ڕووداوەکانی خانەقین لە ئابی ٢٠٠٨دا پیشانی دا، ناکۆکی وململانێ لەسەر ناوچەکان دەکرێ لە هەر شوێنێکی ناوچە کێشەدارەکاندا بەرپابێت ونەوت ڕۆڵی فاکتەرێکی بایەخدار بگێڕێت، بە تایبەتی وەك سنووری چاوەڕوانکراوی کێڵگەکان وباشتر تێگەیشتن لەبری ئیحتیاتیان. ئەگەری نەوتی ئەو ناوچانە بێجگە لە کەرکوك نەزانراوە. کنەو پشکنینێکی زۆر کەم، پەرەپێدانێکی لاواز لەوێ بەدی دەکرێت یان لەو دوای ناوچەکانی وڵات. عێراق هەرگیز پاڵنەری هیوای نەبووە بۆ کێڵگەی تازە لە کاتێکدا سێ کێڵگەی زەبەلاحی هەبوو بۆ بەرهەمهێنانی ئەو برەی ڕێگەی هەناردەی پێدەدرێت بەپێی پشکی ئۆپێك لەهەر کاتێکداو هیچ کاتێ نەخشەی ورد بۆ سامانی نەوتی نەکراوە. نەوت لانیکەم لە خانەقین[١٤٣]، مەخمور[١٤٤]و ناوچە ڕکابەرەکانی نەینەوا[١٤٥]. بەبێ بەرەوپێشچوونی دانوستان لەسەر ڕەوشی ناوچە کێشەدارەکان، ئەم ناوچانە دەبنە ئاگرە سوورەی ململانێی داهاتوو لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی فیدراڵدا.

**ج ـ شەر لەسەر یاسای نەوت و گاز ( هایدرۆکاربۆن )؛**

کاربەدەستانی کورد دڵخۆشن بە سەرکەوتنیان لە پەیداکردنی نەوتداو ئیدیعای ئەوە دەکەن کەوا سامانی نەوتی ناوچەکەیان سوودی بۆ هەموو عێراقییەکان دەبێت چونکە KRG ڕەزامەندە لەسەر دابەشکردنی داهات. عەدنان موفتیی سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان دەڵێ: "سیاسەتی نەوتمان ڕاستەو نامانەوێ سواڵ لە حکومەتی فیدراڵ بکەین پارمەتیمان بدات. ئێمە دەمانەوێ لەڕووی ئابوورییەوە بەهێزبین و هاوبەشیی[١٤٦]. سامانمان بکەین لەگەڵ بەشەکانی تری عێراقدا و پێکەوە وڵاتەکە ئاوەدان بکەینەوە بەهەمان شێوە، کەریم سنجاری، وەزیری هەرێم بۆ کاروباری ناوخۆ، پاش سکاڵاکردن کەوا "ئێمە دەمانەوێ هەناردەی عێراق زیاتر بکەن (بەدەرهێنانی نەوت لە هەرێمی کوردستاندا)، بەڵام حکومەتی فیدراڵ دەڵێ ئیتر بەسە"و،

رایدەگەیەنێ "ئێمە دەمانەوێ عێراق ئاوەدان بکەینەوە، بەڵام بۆ ئەم کارە پارەمان دەوێ. تاقە ڕێگایەکی خۆش نییە لە نێوان بەسرە و زاخۆدا. ئەگەر هەناردەی نەوت زیاد بکات، ئەوە دەتوانین عێراق سەرلەنوێ بنیات بنێینەوە لە پێناوی هەموو عێراقییەکاندا"[١٤٧]. ئاوها هەست ودەربڕینێکی گەرمی رووکەشی لەلایەن وەزارەتی نەوتی حکومەتی فیدراڵەوە وەڵام نەدرایەوە، کەوا بیروبۆچوونێکی خراپی وەرگرتبوو لەسەر کردارە یەکلایەنەکانی KRG. حوسێن ئەلشەهرستانی وەزیری نەوت بەرەسمی رایگەیاند کەوا کۆنتراکتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەتاڵن و شەرعی نین و کۆمپانیاکانی لیستی ڕەشی کار لەگەڵ حکومەتی هەرێم دەکەن و هەرەشەی ئەوەی کرد کە هەر کۆمپانیایەك بەنیازە ئەو کارە بکات بیانخاتە لیستی ڕەشەوە[١٤٨]. سەرباری ئەوەش، گلەیی لە KRG دەکرد بۆ بەربەست خستنەڕێی چوونە پێشەوەی یاسای نەوت و گاز بەهۆی یەکلایەنە مۆرکردنی کۆنراکتی هاوبەشی لە بەرهەمدا و راشیگەیاند کە وەك وەڵامدانەوەیەك، حکومەتی فیدراڵ هیچ خیارێکی تری لەبەردەستدا نییە بەدەر لەوەی کۆنتراکتەکانی کێڵگە نەوتییەکان بەپێی یاسای ئێستا مۆر بکات، کە میراتێکی سەردەمی سەددامەو کۆنترۆڵکردنی مەرکەزیی پێباشترە بەسەر پیشەسازیی نەوتداو کوردیش بەهیچ جۆرێك حەز بەمە ناکات[١٤٩]. وەك لەسەرەوە باسکراوە، دانوستان لەسەر یاسای نەوت و گاز بەهۆی جیاوازیی قووڵەوە پەکی کەوتووە لەسەر ڕۆڵی ئابووریی دەوڵەت و ململانێی نێوان ناشنالیزمە رکابەرەکان، کە لایەکیان کوردەکانن. ئەوان لە دووی ئۆتۆنۆمیی بەرفراوان دەگەڕێن بۆ ڕزگاربوون لە دەیان ساڵی پشتگوێ خستن و جیاوازی کردن و دواکەوتن لەسەر بنەمای ڕەگەزی. بۆ بەدیهێنانی ئەمە داوای مافی دەرهێنانی نەوتی خۆیان دەکەن بێ دەستێوەردانی حکومەتی ناوەندی کەوا لەرووی مێژووییەوە پشت بەخۆبەستنی ئابووریو خۆشگوزەرانییانی پەکخستووە. ئەوان پشکێکی عادیلانەیان دەوێ لە داهاتی هەموو نەوت و گازی عێراق، بەڵام لە هەمووی گرنگتر، کۆنترۆڵی تەواو بەسەر سەرچاوە کانزاییەکاندا. ئەوان کەوا دەکەن نەك لەبەرئەوەی تەنها بەهۆی سوودی ئابووریی سانەوییەوە کە پیشەسازیی نەوتی تەواویان هەبێت (وەك ژێرخان و وەبەرهێنان و هێزی کار)، بەڵکو بەهۆی ئەوەشەوە کەوا KRG کۆنترۆڵی راستەوخۆی دەوێ لەپێناوی سەربەخۆییدا. پسپۆڕێکی وزە باس لەوە دەکات کەوا: "کوردەکان پتر بایەخ بەخاوەندارێتی و بەڕێوەبردنی پیشەسازیی نەوت وەك لە هاوبەشیی داهات چونکە دەیانەوێ سەروەری بنیات بنێن و بە تێپەڕبوونی کات ریکۆردێك لە نموونە پێکەوە بنێن کە تیایدا KRG ئەزموونی کاریگەری سەروەری پیادەکردبێت و ئەمە بەکاربێنێ وەك بناغەیەك بۆ سەربەخۆیی بەپێی یاسای نێودەوڵەتی(١٥٠).

ئەگەر کوردەکان سەربەخۆیی بەدەستبێنن ئەوە هاوبەشیی داهات شانبەشانی هەموو ڕێککەوتنامەکانی لە یاسای فیدراڵیدا پارێزراون، دەبنە شتێکی رووکەش، وەك کرایزس گرووپ پێشتر مشتومڕی لەسەر دەکرد کەوا: "کوردەکان بەردەوام جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کەوا مەسەلەیەك نییە کێ کۆنترۆڵی بیرە نەوتەکان دەکات، حکومەتی فیدراڵ یان هەرێم، و بەو پێیە ئەگەر ناوچە کێشەدارەکان چوونەوە سەر هەرێمی کوردستان، چونکە KRG رازیبووە لەسەر ناردنی داهاتی فرۆشتنی نەوت لە کێڵگەکانی هەرێمی کوردستانەوە بۆ حکومەتی فیدراڵ. هەرچەندە ڕەنگە ئەمە بۆ ئەمڕۆ مەسەلەیەك نەبێت، بەڵام گرنگی وبایەخی خۆی دەبێ ئەگەر هەر کاتێ هەرێمی کوردستان سەربەخۆیی خۆی جاڕدا. باشە بۆچی کوردستانێکی سەربەخۆ ڕازییە داهاتی نەوت وگازی خۆی بنێرێتە دەوڵەتێکی دراوسێ، کە عێراق دەبێت، ئەگەر ئەم داهاتانە کلیلێکن بۆ مانەوەو بەردەوامیی خۆی؟"[١٥١].

کوردەکان پێویستیان بە یاسایەکی نەوت وگازی فیدراڵە بۆ ئەوەی دەستیان بگاتە کەناڵە کردەییەکانی هەناردن. بەهەرحاڵ، ئەوان وا دەردەکەون کە حەزیان لەوەیە بێ یاساکە کار بکەن، لانیکەم بۆ ئێستا، ئەگەر هەلومەرجەکە قەناعەتبەخش نەبوو سەبارەت بە کۆنترۆڵ وبەڕێوەبردن.

لەناو ڕەتکردنەوەکانی تردا، KRG بەرهەڵستیی دامەزراندنی ئەنجومەنێکی نەوت وگازی فیدراڵ دەکات کە تواناو دەسەڵاتی ببێت ڤیتۆ بخاتە سەر کۆنتراکتەکان و پاشکۆی پێشنیارەکانی وەزارەتی نەوت هەڵوەشێنێتەوەو کێڵگە نەوتی بەرهەمهێن ونا بەرهەمهێن پۆلێن بکات.

ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەوا ئەم ئیجرائاتانە، بەدوای یەکدا، ڕەنگە دەسەڵاتێکی زۆرتر بداتە حکومەتی فیدراڵ دیاری بکات کە لە بری ئەوە دەبوو بکەوتنایەتە بەر حکومەتی هەرێمی کوردستان[١٥٢].

لەبری ئەولاشەوە گرووپێك لە کاربەدەستانی ناوەوەو دەرەوەی حکومەتی فیدراڵ وەستاونەتەوە، لەوانەی کە ئاڵای نیشتمانیی عێراقییان هەڵکردووە و خەمی ئەوە دەردەبڕن کە یەکەمیان ئەوەیە کەوا یاسای داهاتوو ڕێگە بە فرۆشتنی تێکرا سامانی سروشتیی وڵات دەدات بە وڵاتان وکۆمپانیاکانی بێگانە لەڕێگەی هاوبەشیی بەرهەمهێنان ودووەمیشیان ئەوەیە کە نامەرکەزییەتی تەواو بەهۆی دەستورەوە ڕێگە بە بەرپابوونی کێبەرکێی نارێکوپێك دەدات لەنێوان هەرێمە فیدراڵەکاندا لەسەر بەرهەمهێنانی نەوت بۆ هەناردە کردن و بەمەش یەکێتیی عێراق هەڵدەوەشێتەوە.

وەك پێنج ساڵی ڕابردوو دەریانخست کە ناشنالیزمی عێراقی هێزێکی کاریگەرە و زیاد لە جارێك بەرپەرچی ویلایەتە یەککگرتووەکانی داوەتەوە و ڕەگ وریشەشی قووڵەو لە ساڵی ١٩٧٢دا ڕابەریی خۆماڵی کردنی پیشەسازیی نەوتی کردووە.

ئەو یاسایەی لەوەوە سەرچاوەی گرت نەیهێشت هیچ کام لە بێگانەو کەرتی تایبەت کەلك لە بەدەستهێنانی هیچ پشکێك لە نەوت وگاز ببینن تەنانەت لەژێر زەویشدا. لە ئەنجامی ئەوەدا، وەزارەتی نەوت لەو کاتەوە تەنها مامەڵەی کۆنتراکتی خزمەتگوزاریی تەکنیکی دەکرد. ئەمەش کرێو مزێکی خزمەتگوزاری دەدا بەو کۆمپانیایانە نەوەك پشکداریی لەو نەوتەدا کە دەریاندەهێنا.

ڕەشنووسی یاسای شوباتی ٢٠٠٧، بەپێچەوانەوە، ڕێگەی بە کۆنتراکتی ئەوەی پێی دەوترێ هەقی مەترسی، یان بە کۆنتراکتی هاوبەشی لە بەرهەمدا دەناسرێ ،Production Sharing Contracts (PSCS). ئەمە پشکی بەشداربوون دەبەخشێتە کۆمپانیا بیانییەکانی نەوت، لەو نەوتەی لە

کێڵگەکان بەرهەمدێنن وەك قەرەبوویەك بۆ وەبەرهێنانیان و کارەکانیان و گریمانەی مەترسییە بازرگانی و سیاسییەکانیان[١٥٣].

هەرچەندە وەزارەتی نەوت پەشیمانە لەوەی کە لە کۆنتراکتی هاوبەشیی بەرهەم دوورکەوتووەتەوە لەبەر رۆشنایی پەرەسەندنی بەرهەڵستیی (لە یەکێتییەکانی بازرگانییەوە بۆ پسپۆرانی نەوت)[١٥٤]، بەڵام هەردووك رەشنووسی یاسای نەوت و گازی فیدراڵ رایگەیان پێدەدات و لە راستیشدا KRG سووورە لەسەریان[١٥٥]. KRG و کۆمپانیا بیانییەکان کۆنتراکتی هاوبەشیی بەرهەمیان پێباشترە هەر یەکەیان لەبەر هۆکاری تایبەت بەخۆی. کۆمپانیاکان وایان پێباشترە کە نەوتیان بدرێتێ چونکە پشك و خاوەندارێتییان زیاد دەکات وبەوشێوەیە بەهای پشك و سەرمایەکانیان بەرز دەبێتەوە[١٥٦]. KRG کۆنتراکتی هاوبەشیی بەرهەم وا لە قەڵەمدەدا کە ئامرازێکی بنەرەتی و پێویست بێت بۆ کنەو پشکنین، کە ئەمەش ئەولەوییەتی ژمارەیەکی کوردە، چونکە تا ئێستا هەرێمەکەیان پەرەپێدانی بەخۆیەوە نەبینیوە[١٥٧]. KRG پشت بە دەستوری ساڵی ٢٠٠٥ دەبەستێ بۆ بەڵگە هێنانەوەی ئەوەی کەوا خۆماڵی کردنی نەوت بەتاڵ بووەوە بەپێی بنەماکانی بازار (مادەی ١١٢)[١٥٨]، کە رێگە بە گرێبەستی هاوبەشیی بەرهەم دەدا و بەو پێیە یاسای نەوت وگازی ساڵی ٢٠٠٧ ی حکومەتی هەرێمی کوردستان یاسا دژوارەکانی فیدراڵ بەناتەواو دادەنێت (مادەی ١١٥)[١٥٩]. زیاد لەوەش، کوردەکان دەڵێن کەوا گرێبەستەکانی هاوبەشیی بەرهەم ئەداو کارکردن بەهێز دەکات. بۆ نموونە کۆمپانیایەك دەگەرێ بەدوای زیادکردنی دەسکەوتە نەوتی خۆیداو لەبەرئەوە ئەوپەری توانای تەرخان دەکات بۆ گەران و پشکنین و بەم پێیە کوردستان نەوتی زۆرتری دەستدەکەوێت بۆ هەناردەکردن[١٦٠]. دواجار، ئەوانەی گرێبەستی هاوبەشیی بەرهەمیان پێباشترە بەڵگە و پاساویان ئەوەیە کەوا باشترین کۆمپانیای بە ئەزموون لە تەکنەلۆجیا و بەرێوەبردندا رادەکێشن.

رەخنەکان لەوە دەدوێن کەوا کۆنتراکتەکانی هاوبەشیی بەرهەم خراپترین جۆری کۆنتراکتن چونکە گەلێ هەلومەرجی دارایی و یاسایی قەتیس دەکەن بۆ ماوەیەکی درێژکراوە (کە ٣٢ ساڵە لە هەندێ کۆنتراکتی KRG)دا، و بارودۆخی سیاسی و قانوونی و ئابووریی کە لە سەردەمی ئیمزاکردنەکەدا هەبوون وشك دەکەن و ئەمەش دەکرێ کاریگەریی پێچەوانەی درێژخایەنی هەبێت لەسەر مافی مرۆڤ و ژینگەو رەنگە بەجیددی سەروەریی هەرێمی کوردستان و عێراقیش پێشێل بکات[١٦١].

ئەم رەخنەو رەخنەکارییە لەگەڵ مەسەلەیەکی تردا هاتە ئاراوە، ئەمیش ئەوە بوو کە ئەوپەری ناسێنترالی کە لەلایەن دەستورەوە رێگەی پێدرابوو دەسپێشخەری ستراتیجێکی سێنترالی نەوتی کردو ئەمەش بووە رێگر لەبەردەم پەرەپێدانی سەرچاوەکانی نەوت وگازدا. لەبری ئەوە، بوو بەهۆی کێبەرکێیەکی کۆنترۆڵ نەکراوەوە لەلایەن قەوارە بچووکەکانی حکوومەتەوە کە پێدەچێت لە تاقە پارێزگایەك گەورەترنەبێت، لەگەڵ تێکرا ئەنجامی قوبوولکردنی ولاتێکدا. لێرەدا، تاریق شەفیق، کە گەورە کاربەدەستێکی جارانی نەوت بوو، لێکدەداتەوەو ئاماژە بۆ رەشنووسێکی پێشتری یاسای نەوت و گازی KRG دەکات: "رەشنووسێکی یاسای نەوتی KRG کاریگەریی خراپی لەسەر مەسەلەی سەروەری هەیەو خۆی لە خۆیدا واتایەك دەبەخشێت کە هاندانی خێراو بێپلانی دابەزینی دەسەڵاتە لە ناوەندەوە بۆ هەرێم بەشێوەیەك کەوا کۆنترۆڵ نەکرێت. ئەمە زیانەکان خراپتر دەکات بە قەناعەت پێکردن و هاندان بۆ هەمان ئاراستەی ناوچەو پارێزگا هاوشێوەکان کە جمووجۆڵ لەناو ئەوانەدا بەرپابێت کە "بووەن"و رێگە بکاتەوە بۆ سنوری کێشەو ناکۆکی لەگەڵ "نەبووەکاندا"... ئەم رەشنووسی یاسایە زۆر نایەتەوە لەگەڵ ئامانجی پلە یەکی دەستوردا بۆ پارێزگاری لە یەکێتیی گەل و خاك و سەروەری[١٦٢] ". ئەنجامی ئەوەی کە یاسایەکی نەوت و گاز نەبێت سەختە. بەبێ یاسایەك، "زەبەلاحە سەرەکییەکانی [١٦٣]". نەوت بەردەوام دەبن لەبەرهەڵستیی کردنی وەبەرهێنان لە عێراقدا و هەرچۆنێك بێت تەماداری و چاوەروانی رەنگە مەترسیی کارکردن لە کەشوهەوای بێیاساییدا بێنێتە ئاراوە. لەلای خۆیەوە، KRG پێویستی بەوە هەیە بگاتە لوولە نەوتێکی ستراتیجی، کە تەنها یاسایەکی فیدراڵی دەتوانێ دابینی بکات. هەر هیوایەك بۆ ناردنی نەوت راستەوخۆ لە هەرێمی کوردستانەوە بۆ تورکیا رێکورەوان وەك خەونی بۆرییە نەوتە. تورکیا، کە هیچ شتێك ناکات بۆ پشتگیری کردنی سەربەخۆیی کورد، داوای رەزامەندییەکی تۆکمەو تەواوی عێراق دەکات بۆ هەر رۆیشتنێکی نەوت لە بۆرییەکانییەوە[١٦٤]. وەزارەتی نەوتی فیدراڵیش ئەو رەزامەندییە نادات بێ یاسایەکی فیدراڵی کەوا حکومەتی هەرێمی کوردستان بەشێك بێت تێیدا.

کێشەکە فشاری دروستکردووە بەڵام دوورە لە چارەسەرەوە، چونکە DNO (تاوکێ) و ئەداکس گینێل ئینەرجی (تەقتەق) بەشێوەیەکی سەرەکی کەوتوونەتە نەوت دەرهێنان. لە کاتێکدا کەواتە واتی ئەوە هەیە کەوا وەزارەتی نەوتی فیدراڵ رەنگە خۆی ئامادە کردبێت بۆ دەرکردنی مۆڵەتی هەناردە لە حاڵەتی ئەم دوو کۆمپانیایەدا، چونکە گرێبەستەکانیان پێش ناکۆکی و ململانێی ساڵی ٢٠٠٧ کەوتووە لەسەر یاسای نەوت وگازو دەرکردنی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ یاسای نەوت و گازی خۆی و ئاماژەی ئەوەش لە ئارادایە کەوا لەژێر ئاوها باروزروفێکدا رەنگە KRG بە توندی بەرپەرچی وەزارەتی نەوت بداتەوە بۆ خۆلادان لەو ئەنجامگیرییە زمنییەی کەوا کۆنتراکتەکانی دواتری نایاسایییە.

نەتوانینی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ هەناردە کردن بەمزوانە رۆژانە ١,٧ ملیۆن دۆلاری لەسەر دەکەوێت (واتە ساڵانە ٦٢٠ ملیۆن دۆلار)، بە بنەمای سەد هەزار بەرمیل لە رۆژێکدا و بە نرخی سەد دۆلار بۆ هەر بەرمیلێك و بودجەی تەرخانکراوی ئێستای. پێدەچێت ئەمە بەشێوەیەکی خراپ زیان بە شکۆ و متمانەی حکومەتی هەرێم بگەیەنێت لە ناوخۆداو پێداویستییەکان فشار دروست بکەن. رەنگە ئەمە هەمان کاریگەریی هەبێت لەسەر حکومەتی فیدراڵیش، کە پێدەچێت رۆژانە ٨,٣ ملیۆن دۆلار لەدەست بدات (رێك سەروو ٣ ملیارە لە ساڵێکدا) لە هەمان رێژەی فرۆشتن. پسپۆرێکی نەوت دەڵێ: "حکومەت لووتی خۆی دەبرێت بۆ

درێو کردنی دەموچاوی[١٦٥] ". ئەم ڕاستییە گورزی خۆی دەسرەوێنێتە ناوخۆو بەشێوەیەکی سەختترکاتێ کە هەردوو دۆزینەوەکانی حکومەتی هەرێم و توانای بەرهەمهێنانی زیاد بکەن، تەنانەت بە نرخێکی پتر مامناوەندیش[١٦٦].

لە کاتێکدا کە ئەژمارێکی ئابووریی سادە وایبۆدەچێت، وەك پسپۆڕێکی تری نەوت دەڵێ: "لە بەرژەوەندیی کەسدا نییە ڕۆژانە ملیۆنێك بەرمیلی نەوت لەژێر زەویدا قەتیس بکات[١٦٧] "، حکومەتی هەرێم و حکومەتی فیدراڵ زۆر بە گەرمی هەوڵدەدەن بەوردیی ئەوە بکەن. ئەوان کە ناتوانن بگەنە ئەنجام یەکلایەنە بەدوای سیاسەتی دژو پیچەوانە بەیەکتردا دەگەڕێن بەواتای تەواوی وشەوپێشبینی دەکرێت سەریان بتەقێ بەیەکدا. هەردوو خۆیان مەڵاسداوە بزانین کامیان ماوەیەکی درێژتر خۆڕاگرترە، حکومەتی فیدراڵ بە بەربەست کردنی هەناردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان یان KRG بە دەرگا داخستن لەسەر بەرەوپێشچوونی مەسەلە یاسایی و تەشریعییەکان و هەردوولا تووشی بنبەست بوون بەهۆی ڕەقی و سەرسەختییانەوە.

٤- ئـەگــەری چـارەســەری گـونـجــاو:-

أ، چــارەســەری گــونــجــاوی نــاوچــەکــان:-

هەرچەندە سیناریۆی مامەڵەی هەمەلایەنە لای خوارەوە کورتە باسێکی لێوەکراوە، بەڵام لێکتێگەیشتنێکی ئاسانتر دەبێ ڕەچاو بکرێت، یەکێکیان بازرگانییەکی ناوچەیی دەگرێتەوەو وادیارە ئەمەیان ئەو سەوداو مامەڵەیە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان KRG بۆی دەگەڕێت. کەس بەڕوونی باسی لەوە نەکردووە کەوا چی دەکاتە گۆڕینەوە خاك بە شتی تر، بەڵام ئەو ڕاگەیاندنانەی بەدوای بڵاوکردنەوەی پێشنیارو بۆچوونی قۆناخی یەکەمی یونامی داهات کەوا بەلای کەمەوە KRG بیر لەو سەوداو مامەڵەیەك دەکاتەوە کە تێیدا ئەو ناوچانەی زۆرینە کوردن بێنەوە سەر هەرێمی کوردستان و ناوچەکانی کە زۆرینەیان عەرەب/ تورکمانن لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا بمێننەوە. کەواتە چۆن بەشێوەیەکی تر سووربوونی حکومەتی هەرێم لێکبدرێتەوە، کاتێ بە ڕاسپاردەکانی عەرەب و کورد وا دیارە لەوە دەترسن کە زوو ڕێکبکەون لەسەر بازرگانیی تایبەت بە شوێن وناوچەکانەوەو بەو پێیە تواناو دەسەڵاتیان لە دەست بدەن لەمانەوەو گێڕانەوەی کەرکوکدا، یەك لە دوای یەك. بۆ KRG مەسەلەی بنەڕەتی ئەوەیە کەوا کەرکوك ببێتە بەشێك لە کوردستان.

کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی، جێگری سەرۆکی هەرێم، کاتێ لە وەڵامدانەوەی پێشنیاری مانگی حوزەیرانی یونامیداو پاش جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کورد لە حەمدانییەو مەندەلی زۆرینە پێکدێنن وتی: "با ئەوان (واتە عەرەب و تورکمان) حەمدانییەو مەندەلی ببەن. کەرکوك بۆ ئێمە مەسەلەیە[١٦٨]".

بە واتایەکی تر، ترۆپکی داواکاریی KRG بۆ هەموو ئەو ناوچانەی کەوا ئیدیعا دەکات لەڕووی مێژووییەوە زۆرینەیەکی کوردیان تێدایە وا دەردەکەوێ ببێتە بەشێك لە ستراتیجیەتێکی سەوداکاری بۆ مسۆگرکردنی کەرکوك لەسەر حیسابی ئەو ناوچانەی کەوا کورد زۆر کەمتر لە زۆرینە پێکدێنن. وەك ئەندامێکی کوردی ئەنجومەنی نوێنەرانی فیدراڵ باسی دەکات کەوا "کەرکوك مەسەلەیەکی بنەڕەتییە بۆ سیاسەتمەدارانی هەردوو حیزبەکە و ئامانجەکانی مەودا دوورترین لەو داواکارییانەی لەسەر ناوچە کێشەدارەکانی ترن. ئێمە بۆیە ئەو شوێنانە قەبە دەکەین تا هێزو کاریگەری بە دەستبێنین لە دانوستانماندا بۆ کەرکوك[١٦٩] ". لەکاتێکدا کە مامەڵە کردنی یونامی دەکرێ ئەنجامێکی لێبکەوێتەوە کەوا ڕەنگە KRG قوبووڵی بکات، بەڵام لەوە ناچێت کارێکی لەو چەشنە بکات، بەدەستهێنانی کەرکوك و ئەو قەزایانەی زۆرینەیان کوردن، بەڵام نەك ئەوانەی زۆرینەیان عەرەب، تورکمانن و تێکرا ناوچەو قەزای لە کەرکوك زیاتر تێکەڵەن. نە عەرەب و نە تورکمان (ڕەنگە بێجگە لەو کەسە کەمانەی چونەتە پاڵ لیستی برایەتیی کوردەکان لە کەرکوکدا) ڕازی بێت کەرکوك بگۆڕێتەوە بە قەزاو ناوچەکانی تر. توانای ئەوان، لە ڕێگەی حکومەتی فیدراڵەوە، بۆ قۆرت خستنەڕێی بەرەو پێشچوونی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ ئەمەی بە تەواوی ڕوونکردووەتەوە. پەرەسەندنی پێداگرتنی حکومەت لە نیوەی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨دا لە بەرانبەر ڕکابەرەکانیدا، کەوا کوردەکانیش دەگرێتەوە، بارو دۆخەکەی زۆر سەخت و هەڵەت کردووە.

بەپێی بیروبۆچوونە لۆجیکییەکان، ئەگەر مامەڵەی چارەسەری ناوچەکان گرێدراوبێت بە کەرکوکەوە ئەوە مەسەلەکە وا دەکەوێتەوە ئاخۆ هەڵوێستی KRG لەسەر کەرکوك نەگۆڕ دەبێت یان دەبێتە بەشێك لە ستراتیجی سات و سەوداکردنێ. پابەندبوونی سۆز ئامێز بە کەرکوکەوەو بە تایبەتی لای خەڵکانی دەستەبژێری کورد وا دەگەیەنێت کە زەحمەتە ئەرزییەتێکی مامناوەندیی بۆ بدۆزێتەوە. ئەم بارەش وا دەڵێ کەوا KRG نەتوانێ جموجۆڵێك بۆ پێشەوە بکات لە هێنانی کەرکوك بۆسەر هەرێمی کوردستان و ڕەنگە زوو لەو ڕاستییە بگەن[١٧٠].

دەکرێ ئەمە ڕێبەدێی بێت بەرەو لێکتێگەیشتنێکی گونجاو تری وەك دواخستنی بارودۆخی بنەڕەتی وکۆتایی کەرکوك لە ئالوگۆڕدا بەوەی ئەمڕۆ گەورەترین بایەخی پراکتیکی بۆ هەرێمی کوردستان هەیە، کە ئەویش بەرفراوان کردنی ئۆتۆنۆمیی سیاسی و ئابووریی، کردنەوەی ڕێگەی بازرگانی وسنوورێکی ناوخۆی سەلامەت کەوا نەتەوە یەککگرتووەکان نەخشەی کێشابێت و ویلایەتە یەککگرتووەکانیش گەرەنتیی کردبێت.

ب ـ سەودا و مامەڵەیەکی هەمەلایەنە :-

هەر سەوداو مامەڵەیەکی هەمەلایەنە پێدەچێت پێویستی بە گەڵاڵەکردنی بچووکترین داواکاریی لایەنە پەیوەندیدارەکان بێت و بایەخ و خەتی سووریان تاوتوێ و پشتگیریی بکات و بەو پێیە داواکارییە بنەڕەتییەکان دەبێ ڕوون بن. لەگەڵ ئەوەشدا کە داوای کەرکوك دەکرێ، بەڵام ئەوەی پاساوی گەورەترین پێداویستیی کوردە پارێزگاریی هەرێمی کوردستانە لە ئەگەری دەوڵەتێکی سێنترالی بەهێزو هەروەها لە وڵاتانی دەوروبەر هاوکاتیش کردنەوەی دەرفەتێك بۆ هەرێمەکە بۆ گەشەکردن بەهۆی بازرگانییەوە بەشێوەیەکی ئازادانە لەگەڵ دنیای دەرەوەدا. KRG دەتوانێ ئەم ئامانجانە گەڵاڵە بکات بە پەیڕەوی کردنی ئەم سیاسەتانەی

خوارەوە لەمەڕ ئامانج بەدیهێنان: نەخشەکێشانی سنوورە ناوخۆییەکانی لەگەڵ ئەودوای بەشەکانی عێراقدا، پلەیەکی پێشکەوتووی ئۆتۆنۆمیی سیاسی، کارایی ئابووریی بەرچاو لە بەرانبەر حکومەتی فیدرالدا، عێراقێکی ناسێنتراڵ بۆ ڕێگرتن لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی دەوڵەتێکی سەنترالی بەهێز، پەیوەندیی ئاشتیانە لەگەڵ دەوڵەتە دەراوسێکانی سوریا و تورکیا و ئێراندا.

یونامی لە هەوڵ و تەقەلایەدا بۆ چارەسەری مەسەلەی سنووری ناخۆ و بۆچوون و پێشنیارەکانی داهاتووی بەمزوانە بڵاوبکرێنەوەو نەگاتە کۆتایی مانگی نۆڤەمبەر. ئاخۆ یاریکەرە عێراقییەکان لەسەری ڕێکدەکەون. ئاخۆ هەرێمی کوردستان سنووری خۆی و دانپیانانی پێویستییەکانی بەدەستدێنێ. بێجگە لەوەش تێکرا سات و سەوداکە ڕەنگە بە پارێزگارییەکی نێودەوڵەتی تەواوبکرێت وڕێی تێدەچێت لە شێوازی بنکەیەکی سەربازیی ئەمەریکیدا بێت، وەك هەندێك بۆیدەچن، یان پابەندبوونێکی ئەمەریکا بێت بە حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە کە بیر لە پارێزگاری یان سزادانی هەر هەوڵێك دەکاتەوە بۆ سنوور بەزاندن. حکومەتی هەرێمی کوردستان پێشتر و لە دەستوری ساڵی ٢٠٠٥دا ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانی بەدەستهێناوە و هیچ کاربەدەستێکی KRG پێشنیاری نەکردووە کە دەبێ زیاد بکرێت. لە ڕەوشی ئابووریدا KRG هەنگاوی باش دەنێت و ئەگەر نەتوانێ کۆنترۆڵی کێڵگەی کەرکووك بکات ئەوە پێویستی بەدەستهێنانی هێز و دەسەڵاتی ئابووری هەیە لە ڕێگەی مافی ئیدارەدان و پەرەسەندن وهەناردەی نەوت وگازی هەرێمی کوردستانەوە. پسپۆڕێکی وزەی نێودەوڵەتی ئەم ئامۆژگارییەی KRG کردووە: "واز لەوە بێنن کە دەستتان نەکەوتووە بۆ دەستکەوتنی هەندێ لەو شتانەی کە دەتانەوێ واز لە کەرکووك بێنن بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵی تەواو بەسەر نەوت و گازدا لە هەرێمی کوردستان[١٧١].

بێجگە لەوە، KRG پێویستی بە دڵنیابوونەوەیە کە ئەو نامەرکەزییەتە دەستور خەملاندوویەتی نابێ پێچەوانە ببێتەوە و نابێ حکومەتێکی سێنترالی بەهێز جارێکیتر سەرهەڵبداتەوە[١٧٢].

هەروەها KRG پێویستی بە پەیوەندیی باشترە لەگەڵ دراوسێکانیدا. پەیوەندی ئابووری لەگەڵ تورکیادا بەتایبەتی لە ساڵی ٢٠٠٣وە باش بووەو حکومەتی ئەنکەرە مامەڵەی دۆستانەی پێباشترە لەگەڵ قەوارەیەکی ئۆتۆمی داری کورددا، کەوا خراوەتە نێو تۆڕێك پەیوەندیی ئابوورییەوە بەسەر مەودایەکی درێژخایەنی دوژمنایەتیدا لەگەڵ کوردستانێکی ناپەرەسەندووی ناخۆشحاڵدا کە ڕەنگە هاوکار نەبێت لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندیی تورکیا گرژو ئاڵۆز دەکەن. تا ئێستاش ئەم پەیوەندییە دەکرێ بەهێزتربێت بەڵام ئەگەر KRG هەڵوێستی توند وەربگرێت لە دژی پەکەکە[١٧٣].

عەرەبەکانی عێراق، گەر زۆرینەی گەورەی دانیشتوان پێکدێنن، وادیارە یەکێتیی خاکی وڵاتەکە دەخەنە سەروو هەموو شتێکەوەو[١٧٤]بەو پێیە ئەوە ڕەتدەکەنەوە کەوا کەرکوك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان ئەگەر ئەمە دەرفەتی کورد زیاد بکات بۆ سەربەخۆیی. بێجگە لەوەش، تەوژمێکی بەهێزی ناشنالیست بەرهەڵستیی ڕادەستی هەربەشێك دەکات لەوەی بەگەنجینەی نیشتمانی لەقەڵەم دەدرێت، کە سامانی کانزایی وڵاتە. پاشانیش، عەرەبەکانی عێراق، وەك کوردەکان دەیانەوێ بە ئاشتی بژین لەگەڵ دراوسێکانیان لەپاش نزیکەی سێ دەیە جەنگ وهەراو بتوانن لەگەڵیان ئالوگۆڕی بازرگانیی بکەن. لە کەرکوك خۆیدا، عەرەبەکان دەستباڵایی قەزا عەرەبەکانیان دەوێت لە دەرەوەی شارەکە، وەك حەویجە، کە وەك بەشێك لە پارێزگاکە بمێنێتەوە[١٧٥]، بە پێچەوانەی ئەو بیروبۆچوونانەوە کەوا سیاسەتمەدارە کوردەکان دەریاندەبڕی[١٧٦].

هەروەها دەیانەوێ لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا بمێنێتەوەو وای بە باشتر دەزانن وەك پارێزگایەکی تاك بمێنێتەوە، بۆیە هەندێ سیاسەتمەدار وادیارە بیریان لێکردووەتەوە کە ببێتە هەرێمێکی فیدراڵی یەك پارێزگایی (بە دەسەڵاتی تەواوەوە بەپێی دەستور)[١٧٧]و لەژێر بارودۆخێکی تایبەتدا[١٧٨]. ناکۆکی لەسەر کەرکوك گەیشتووەتە ئاستێك کە هەندێ ڕەهەندی نێودەوڵەتیی وەرگرتووەو تا ڕادەیەك لە ترسی ئەوەی هەڵلووشینی کەرکوك لەلایەن هەرێمی کوردستانەوە ڕەنگە ڕێخۆشکەر بێت بۆ سەربەخۆیی کورد، کە ئەمەش خەتی سوورە بۆ هەر سێ دراوسێکەی هەرێم. گرەوێکی ئاوهاو ئاستی دەسکەوتەکانی دەبێ لای ئەوان ڕەچاو بکرێت. تورکیا و ئێران سوریا هاوبەشیی ئەفزەلەت پێدانی یەکگرتوویی خاکی عێراقن و بە تایبەتیش بە تۆکمەیی بەستنەوەی هەرێمی کوردستان بە دەوڵەتی ناوەندییەوە، بۆ نموونە لەڕێگەی یاساکانی نەوت و گاز و هاوبەشیی لە بەرهەمدا. ئەوامن دەیانەوێ کەرکوك و سامانە نەوتییەکەی لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵدا بمێنێتەوە. بەهەمان شێوەش خولیاداری پەیوەندیی بازرگانیی بەهێزن لەگەڵ کورددا. تورکیا بەتایبەتی پەرۆشی کڕینی یان هەناردەی نەوت وگازی هەرێمی کوردستانە و حەز دەکات وەبەرهێنانی کۆمپانیاکانی زیاد بکات لەوێ و وایدەبینێ کە پەرەپێدانی سەرچاوە کانزاییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان هەرەشەیەکی درێژخایەنی کەمترە لە گەڕانەوەی کەرکوك بۆسەر هەرێمی کوردستان دەوڵەتانی وەك تورکیاو ئێران پێ لەسەر ئەوەش دادەگرن کەوا KRG تێکدەشکێت بەهۆی توندوتیژیی بەرچاوی پەکەکەو پژاکی ڕێکخراوە دەستە خوشکەکەی کە ئێران چاوی خستووەتە سەر[١٧٩].

بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانیان، دەبێ تەواوی یاریکەران واز لە هەندێ شت بێنن.و حکومەتی هەرێمی کوردستانیش دەبێ واز لە داواکاریی ڕەها و بێسنووری بێنێ لەسەر کەرکوك. بەهەرحاڵ، ئەو دەتوانێ حاڵەتی ئێستای کەرکوك درێژە پێبدات کە بریتییە لە - زۆرینەی دیمۆگرافی و کۆنترۆڵی سیاسیی دیفاکتۆ، لەکاتێکدا کە پرۆسەی ئاسایی بوونەوە بەردەوامە و دەبێ بخرێتە ژێر ڕکێفی چاودێریی نێودەوڵەتییەوە بۆ پێداچوونەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی لە نیسانی ٢٠٠٣وە ڕوویانداوەو ڕێگرن لەهەر دەسکاری کردنێکی دیمۆگرافی.

بۆ بواردان بە پەرەپێدانی هەرێمی کوردستان لەپاش ساڵانێکی زۆری پشتگوێ خستن، حکومەتی فیدراڵ دەبێ پشکێکی بودجەی فیدراڵ بداتە حکومەتی هەرێم کەوا

لەسەری ڕێککەوتبێتن و گەرەنتی هەبێت، شان بەشانی مافی گرێبەست ئیمزاکردنی هەبێت بە مەرجێك وایان لێبکات کە بگونجێن لەگەڵ ئەو پێوەرانەی کە لە یاسای نەوت و گازی فیدراڵ نەترازێن.

حکومەتی فیدراڵ دەبێ بە ئاشکرا ئەو تاوانە بنەرەتیانە بسەلمێنێ کە ئەم هێزە ورووژێن و پاڵنەرەی داوە بە داواکاریی کوردەکان لەسەر کەرکوك وەك: بە عەرەبکردن، پەلاماری ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ و هێرشی گاز بۆ سەر خەڵکی مەدەنیی کورد لە ئاخروئۆخری جەنگی ئێران ـ عێراقداو بەشێوەیەکی زۆر بەرچاویش هەڵەبجە(١٨١). کەمکردنەوەی بایەخی ئەم ڕووداوانە یان نکووڵی کردنی سەرلەبەریان کارێکی ئەوتۆ ئاکاتە سەر لاواز کردنی خولیاو ئاواتی کوردەکان. بەڵکو لەبری ئەوە دەبێ حکومەت بەئاشکرا تاوانی ڕژێمەکانی پێشوو بسەلمێنێ لەگەڵ قوربانیەکانیان و دەربازبوونی ئەو تاوانانە لە ڕووی داراییەوە قەرەبوو بکاتەوە.

لەلای خۆیەوە، دەبوو تورکیا ڕاستییە تازەکان قوبووڵ بکات، یەکەم و لە پێش هەموو شتێکەوە پەیدابوونی هەرێمێکی کوردستان بە تەنیشت سنوورییەوەو بە سامان و دەسەڵاتێکی نوێوە کە پێشتر نموونەی نەبووە.لە بەرانبەر دەسبەرداربوونی کەرکوك و پەکەکە و لە کاتێکدا کە یاسای نەوت و گازی فیدراڵ دەردەکرێت و جێی خۆی دەگرێت، دەبێ تورکیا چالاکانە دەرگای بازرگانی بەڕووی هەرێمی کوردستاندا والا بکات و بەتایبەتی لە کڕین یان هەناردەی نەوت و گازەکەیدا. ئەمە لەخۆیدا تێکشاندنی بیرو بۆچوونە ناشنالیستە پەرگرەکانە کە بەرهەڵستی هەموو جۆرە پەیوەندییەك دەکەن بە کوردی عێراقەوە. ڕێککەوتنێك کە لەلایەن کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی خەڵکی عێراقەوە جێی ڕەزامەندی بێت و لەلایەن تورکیاشەوە قوبووڵ بکرێت بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ تورکمانەکان بایەخدارە، کە مانەوەو بەردەوامییان وەك کەمینەیەك پابەندە بە هاوڕایەکی نیشتمانی و کەمکردنەوەی گرژیی ناشنالیستی لەو ناوچانەدا کە لە ڕووی ئەتنیکییەوە جیاوازییان تێدایە. ڕەوشی کەرکوك و ڕێکخستنی دەسەڵاتە ناوخۆییەکانی لەنێو ئاڵۆزترین ئەو مەسەلانەدا دەبێ کە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت (١٨٢).

زۆر لە کەرکوکییەکان ئیشارەت بەوە دەدەن کەوا کەرکوك، وەك شارێکی فرەنەتەوە ، پێویستی بە چارەسەرێکی فرە ڕەگەز یان فرە پێکهاتەیە(١٨٣). وەك گرووپی قەیرانەکان لە ڕاپۆرتێکی پێشتردا پێشنیاری کردووە کەوا یەك لەو چارەسەرە گونجاوانە ئەوەیە کە کەرکووك ببێتە، یان ناوچەیەکی تاقە پارێزگایی و لەلایەن حکومەتی فیدراڵەوە ئیدارە بدرێت بەڵام بە پەیوەندییەکی دیفاکتۆر بە حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، یان هەرێمێکی فیدراڵی یەك پارێزگایی بەتواناو دەسەڵاتی بەهێزەوە ( ئەڵبەتە بەپێی دەستور)(١٨٤).

لەگەڵ ئەوەشدا و بەهەر مامەڵەیەکی هەمەلایەنەو گشتگیر، دەبێ پەنجەرەی ئەگەری چوونە سەر هەرێمی کوردستان بەشێوەیەك لەشێوەکان کراوە بێت لە ڕێگەی میکانیزمێکی داڕێژراوەوە بۆ بڕیاردان لەسەر ڕەوشی ناوچەکە دوابەدوای ماوەیەکی کاتی و ڕەچاوکردنی هەستیاریی کورد لەم مەسەلەیەدا، کەوا لە ڕابوردوودا گرووپی قەیرانەکان پێشنیاری دە ساڵیان کردبوو (١٨٥). چەندین دەنگ روو لەزیادبوونە لە نێو دەستەبژێری کورددا کە ئەم جۆرە چارەسەرەیان لا پەسەند بێت، هەرچەندە بەردەوام لەو بروایەشدان کە دواجار کەرکوك دەچێتەوە سەر هەرێمی کوردستان(١٨٦).

لە ماوە کاتییەکەدا، دەبێ دەسەڵاتەکان دابەش بکرێن لەنێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی کەرکوکدا. ئەمە مەبدەئێکە هەمووان لەسەری کۆکن(١٨٧). تەحەداکە ئەوەیە کە شێوازێکی تایبەتی بدۆزرێتەوەو هەمووان پێی قایل بن. وەك لەسەرەوە باسکرا، کاتێ سەرۆك تاڵەبانی سەردانێکی مانا گەورەو پڕ بایەخی سیاسیی کەرکوکی کرد لە دوا دوایی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا، لەگەڵ نوێنەرانی هەموو لایەنەکاندا کۆبووەو بەڵێنی دا کە پۆستە ئیدارییە سەرەکییەکان بە ڕێژەی ٣٢، ٣٢، ٣٢ – ٤ لە سەدا دابەش بکرێن بەسەر عەرەب و کورد و تورکمان و مەسیحییەکاندا.KRG حاڵی حازر لەسەر ئەم شێوازە ڕازییە بۆ ئەنجومەنی شاری کەرکوك پێکبێت(١٨٨)، بەڵام لەسەر ئاستی ئەنجومەنی پارێزگا ڕەتیدەکاتەوە، چونکە لە ئێستادا کورد زۆرینەیە لەوێ. عەرەب و تورکمانەکان، لە بەرانبەردا، ڕازی نین بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگا. بەپێی مادەی ٢٣ ی یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان لە ئەیلولی ٢٠٠٨دا، دەبێ کۆمیتەیەك ڕاسپاردەکانی خۆی بخاتەڕوو بەپێی بنەمای کۆی دەنگ لەسەر شێوازی هەڵبژاردنی پارێزگا لە کەرکوکدا. چارەسەرێکی جێی ڕەزامەندیی هەموو لا دەکرێ هەندێ شتی نێوان ڕێکخستنەوەیەکی هەڵبژاردن و بەشداربوون لە دەسەڵاتدا بگرێتەوە، وەك:

هەڵبژاردنێکی پاڵێوراوانی هەرپێکهاتەیەك بۆ ژمارەی دیاریکراوی کورسی بۆ هەرلایەك(١٨٩)، لەگەڵ ژمارەی ئەو کورسییانەی کە زیاتر بەلای کورددا دایدەشکێنێ. ڕاستێکەی، شێوازێك بۆ هەڵبژاردنێکی بنەما پەشککاری (محاصصە) پێلێنانە لە دەسەڵاتی سیاسی و دیمۆگرافیی کوردەکان، بێ ئەوەی زۆرینەیەکی ڕەهایان بدرێتێ. لە کاتێکدا بوار بە مەسیحییەکان دەدا کە دەنگی سەرپلی بەملاوبەولادا خستنی مەسەلەکانیان ببێ، بەمجۆرە: بۆ هەرلایەك لە عەرەب ٢٤، تورکمان ٢٤، کورد ٤٨، مەسیحی ٤، یان ٢٢-٢٣-٤٦-٨(١٩٠). بۆ هەموو ئاستەکانی تر لە پارێزگادا (وەك پۆستەکانی جێبەجێ کردن و کورسییەکانی قەزاو ناحیەکان و ئەنجومەنی شار) شێوازی ٣٢-٣٢-٣٢-٤ جێبەجێ دەکرێت.

بە کورتی سەوداو مامەڵەیەکی هەمەلایەنە بەزەروورەت مامەڵەیەکی نەوت بە خاك دەبێت و حکومەتی هەرێمی کوردستان واز لە داواکارییەکانی دێنێ یان دوایان دەخات لەبارەی پارێزگای کەرکوکەوە لە بەرانبەر مافی بەڕێوەبردنی پیشەسازیی نەوت و گازی خۆیداو بتوانێ ئەوی بەرهەمی دێنێ هەناردەی بکات. مەسەلەکە دەکرێ ئەم توخمانەی خوارەوەی تێدا بێت.

* تێبینی:-

– لەبەر زۆری دووبارەبوونەوەی سەرچاوە و پەراوێزەکان نەمانتوانی بەکاریبهێنین کە زۆر لە بابەتەکە زیاتر

*** هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە کەرکوك ساڵی ٢٠١٨:-**

لە ١٢ی مایسی ٢٠١٨ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لەسەرتاپای وڵاتدا بەڕێوەچوو و هەموو پارێزگاکانی عێراق بەشداری تێدا کرد، لە کاتێکدا هەر پارێزگایەك تایبەتمەندی خۆی هەیە لە هەڵبژاردن، لەگەڵ کەشی هەڵبژاردن و چۆنییەتی بەڕێوەچوونی ئەو هەڵبژاردنە...

ئەوەی تایبەتمەندی ئەم هەڵبژاردنە لە هەڵبژاردنەکانی تر جیا دەکاتەوە، زۆری لیستەکانی هەڵبژاردنە و سوننە و شیعە و کورد بەسەر چەند لیستێکی جۆراوجۆر دابەش بوونە، تەنانەت ماڵی شیعە بەشێوەیەکی بەرچاو تووشی ئەو دابەشبوونە بوون.

لە هەمان کاتدا کەرکوکیش دابەش بووەتە سەر چەندەها لیست کە پەرتەوازەیی لیستی کوردی و عەرەبی بەشێوەیەکی بەرچاو دیارە و هەمەچەشنە و لیستی نوێ هاتوونەتە نێو هەڵبژاردنەکەوە.

ئەوەی لەم هەڵبژاردنەی کەرکوك بەرچاو کەوت، ئەوەبوو کە هەڵبژاردنێکی دژوار و ڕکابەرییەکی گەورەی تێدابوو کە ٢٤ لیست بەشدارییان کرد، لەنێویاندا لایەن و حیزبی جۆراوجۆر بەشدارییان کرد، بەشێکی گۆشەگیر لە یەکتری هەموویان بۆ بەدەستهێنانی ١٢کورسی لەگەڵ کورسییەك بۆ مەسحییەکانی کەرکوك لە کێبڕکێدان.

عەرەبی سوننە لە کەرکوك لەپاش ساڵی ٢٠٠٣ەوە بە پێکهاتەیەکی نایەکگرتوو و بەرە جیاواز ناسراون، بە پێچەوانەی پێکهاتەکانی تر، کە لە پرسە چارەنووسازەکاندا هاو هەڵوێست بوون.

ساڵی ٢٠١٤ لەدوایین هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا، عەرەب بە بەدەستهێنانی (٩٢١٢٤) هەزار دەنگ دوو کورسی بەدەستهێنا.

پەتای ئەو جیاوازییە لیستەکەشیانی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق گرتووەتەوە، هەرچەندە پێشتریش بە هەمان شێوە پەرت بوون نەیانتوانی خۆیان ڕێکبخەنەوە.

پێکهاتەی عەرەب لەم هەڵبژاردنەدا بەسەر ١٥لیست و هاوپەیمانێتیدا دابەش بوون و تاکە جیاوازیش بەراورد بە هەڵبژاردنی ڕابردوو چەند لیستێکە تایبەت بە عەرەبی پارێزگاکە دروست کراون، پێچەوانەی ساڵی ٢٠١٤ کە بەسەر لیستە گەورەکاندا دابەش بوون.

فرە لیستی زۆربوونی کاندیدانی عەرەب کارگەی خراپی لەسەر ڕێژەو دەنگەکانیان دەبێت، کە ئەمیش ڕەنگدانەوەی پەرتەوازەیی ناو ماڵی عەرەب و دۆخی ئەو پێکهاتەیەیە لە کەرکوك.

دیارترین هۆکارەکانی پەرتەوازەیی حیزبە عەرەبییەکان بریتییە لە:-

نەبوونی مەرجەعییەتی سیاسی و عەشایەری بۆ سەرکردایەتیکردنی شەقامی عەرەبی و پاڵاوتن لە لیستەکاندا لەسەر بنەمای عەشیرەتگەرایی. دواتر بەشداریکردن لە پرۆسەکەدا لەسەر بنەمای سیاسی بوایە و داوای پاڵپشتی لە هۆزەکان بکردایە.

*** لیستە عەرەبییەکانی کەرکوك:-**

١- تحالف الفتح
٢- الدكتور سلام نعيم عطية ماهود
٣- نوفل الناشي
٤- تيار الحكمة الوطني
٥- رحيم لعيبي ثامر
٦- التحالف العربي في كركوك
٧- إئتلاف كفاءات للتغيير
٨- باب العرب
٩- بيارق الخير
١٠- رعد جبار صالح
١١- لمياء شاوي الهلالي
١٢- إئتلاف النصر
١٣- حارث شنشل الحارثي
١٤- تضامن
١٥- إئتلاف الوطنية

بۆ ڕێگەگرتن لە پەرتەوازەیی لیستە عەرەبییەکان هەندێك لە دەنگە عەرەبییەکان کشانەوەی خۆیان ڕاگەیاندووە وەکو (باب العرب) بەسەرپەرشتی (شێخ وەسفی عاسی) بەپێی وتەی خۆی وای بڕیار دابوو کە ئەرکی ماددی بانگێشەی هەڵبژاردن بەشێوەیەکی بەرچاو لەخۆبگرێت، بەڵام هەندێك لە کاندیدە کشاوەکان داوای پارەی کاشیان کردبوو بۆ بەردەوام بوون، بۆیە کشانەوە.

هەروەها کاندیدێکی تری لە (إئتلاف الوطنية)ی ئەیاد عەلاویش کشایەوە لە کەرکوك کە گوایە بۆ یەکخستنی ماڵی عەرەبە لەو شارە.

لەپاڵ ئەو لیستە عەرەبییانەدا، یەکگرتووی تریش وەك (التضامن) بەسەرپەرشتی (وضاح الحديد) و (بيارق الخير)، بەسەرپەرشتی وەزیری بەرگری پێشوو (خالید العبیدي) بەشداریان کردووە.

*** لیستە کوردییەکانی هەڵبژاردن:-**

کوردیش ئەمجارە وەکو عەرەب پەرتەوازەییەکی گەورەی پێوە دیاربوو کە بەسەر حەوت لیستدا دابەش ببوو و پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە کەرکوك بایکۆتی هەڵبژاردنی کردووە، کە گوایە کەرکوك داگیرکراوە و ڕێگە بە چالاکی هەڵبژاردنیان نادرێت لە شارەکە.

هەروەها دوو لیستی کوردی نوێش سەری هەڵدابوو لە هەڵبژاردنەکەدا، ئەویش بزووتنەوەی نەوەی نوێ بەسەرپەرشتی شاسوار عەبدولواحید و هاوپەیمانی دیموکراسی بەسەرپەرشتی د.بەرهەم ساڵح لیستە کوردییەکانیش بەم شێوەیە چڕ بووەتەوە:-

١- الجبهة الفيلية:-

ئەمانە هەرچەندە کوردن، بەڵام لە ڕووی مەزهەبەوە شیعەن و هەستێکی نەتەوەیی ئەوتۆیان نییە و کاریگەرییان بەو شێوەیە نییە کە بایەخیان بۆ لیستە کوردییەکان هەبێت.

٢- بزووتنەوەی نەوەی نوێ:-

ئەم بزووتنەوەیە بە سەرۆکایەتی (شاسوار عەبدولواحید)ە

کە خاوەن کۆمپانیای (نالیا)یە و لە رابردوودا بازرگانێکی گەورە بوو، هەروەها ئەو ئەنجێدایەی هەیەتی لەگەڵ خواستی خەڵکی کەرکوکدا یەکانگیر نابێت و تەنها قسەکانی بریقەدارە.

٣- حیزبی شیوعی کوردستانی عێراق
٤- یەکێتی نیشتمانی کوردستانی
٥- حیزبی سۆشیالیستی کوردستانی
٦- یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی
٧- لیستی نیشتمان

ئەم لیستە پێکهاتووە لە بزووتنەوەی گۆڕان و کۆمەڵی ئیسلامی و هاوپەیمانی دیموکراتی بە سەرۆکایەتی د. بەرهەم سالح.

*** لیستە تورکمانییەکانی هەڵبژاردن:-**

دۆخی پێکهاتەی تورکمانیش لە عەرەبی کەرکوک باشترە هەرچەندە وای پیشانی دەدەن کە ئەوان هاوپەیمانێتییەکی گەورەیان پێکهێناوە بەشێوەیەك لیست و کاندیدەکانی دیکە کاریگەرییان لەسەریان نابێت.

ئەگەرچی تورکمان هەوڵێکی زۆری دا بە بەشداریکردن بە یەك لیست، بەڵام دواجار بەرەی تورکمانی لە کۆکردنەوەی ناوماڵی تورکمانی شکستی هێنا و جگە لە دوو لیستی تایبەت بە تورکمان، هاوکات کاندیدی ئەو پێکهاتەیە بە سێ لیستی دیکەشدا دابەش بوون.

بەرەی تورکمانی لە دوایین هەڵبژاردنی ٢٠١٤دا (٧١٤٩٢) دەنگی بەدەستهێنا کە توانی دوو کورسی بەدەستبهێنێت.

بە بۆچوونی خۆیان لیستی بەرەی تورکمانیی کەرکوك لە بەرەی تورکمانی عێراق و زۆربەی حیزبە تورکمانییەکانی دیکە پێکهاتووە بە باڵی بەدری شیعەیشەوە، ئەمەش وا دەکات لیست و کەسایەتییەکانی دیکەی تورکمان کاریگەرییان لەسەر دەنگەکانی ئەو پێکهاتەیە نەبێت.

هەروەها ئەو حیزبە تورکمانانەی کە لە رابردوودا سەر بە حیزبە کوردییەکان بوون، لەم هەڵبژاردنەدا بوونیان نییە و بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەی شارەکانی هەولێر و سلێمانی بوونە.

* لیستە تورکمانییەکان بریتیە لە:-

١- جبهە تورکمان کرکوك
٢- تحالف الفتح
٣- قائمە النصر

*** لیستە مەسیحییەکانی هەڵبژاردن:-**

بەهەمان ئەو شێوانەی پێشوو مەسیحییەکانی کەرکوکیش دابەش بوون بەسەر حەوت لیستدا بۆ بەدەستهێنانی تەنها یەك کورسی کۆتا لە پارێزگاکە

بەپێی بۆچوونەکانیش هۆکاری ئەم زۆری و پەرتەوازەییە بۆ کاریگەری هێزە شیعە و کوردییەکان دەگەڕێتەوە کە هەوڵیان داوە لایەنگرانی خۆیان بخەنە نێو لیستەکانەوە بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە کە لە کۆی ٥٠٠٠ پێنج هەزار مەسیحی ئەم شارە تەنها (١٢٠٠) خێزان ماونەتەوە، کە ئەگەر بەراوردی نێوان (٢٠٠٣-٢٠١٦) بکەین، چونکە بەشێکیان بەرەو کوردستان و دەرەوەی وڵات کۆچیان کردووە و لەبارێکی دژواردا دەژین کە مەحاڵە بەشداری هەڵبژاردن بکەن.

*** شیعە لە کەرکوك بە تەمای کورسین:**

لە دوای رووداوەکانی ١٦ی ئۆکتۆبەر، قسەی یەکەم و دوایی لە کەرکوك شیعە دەیکات، لە حیزبە کوردییەکانیش پارتی بایکۆتی کردووە، شیعە لە سێ خولی پەرلەمانی رابردوودا هیچ کورسییەکی لەو شارە نەهێناوە، ئەمجارە چاوی لە کورسییە لەو شارەدا.

ئەمجارە زۆربەی لایەنە شیعییەکان لە کەرکوك لیستیان هەیە، لەوانەش هاوپەیمانی فەتح ٢٤کاندید، رەوتی حیکمە ٢٠ کاندید، هاوپەیمانی نەسر ٢٤کاندید و هاوپەیمانی نیشتمانی عێراقی (٢٤) کاندید.

بۆیە ئەوەی لە هەڵبژاردنی کەرکووکدا بەم شێوەیە:-

١- ژمارەی حیزب و یەکگرتنەکان (٣١) لایەنە.
٢- ژمارەی کاندیدەکانی (١٩٠) کاندیدە
٣- کۆی گشتی کورسییەکانی پارێزگا (١٣) کورسی بە کۆتای یەك کورسی مەسیحییەکان.

ئەگەر بەراوردێکی دەنگی کورد (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بکەین لەنێوان ٢٠١٤ بۆ ٢٠١٨ دەبینین کە کەمی کردووە، کە لەساڵی ٢٠١٤دا (٢٠٩٩٦٤) هەزار دەنگی بەدەستهێناوە، بەڵام لە ساڵی ٢٠١٨دا بریتی بوو لە (١٨٤٣٠٠) هەزار دەنگ کە دەکاتە (٦) کورسی، کە لایەنە کوردییەکانی تر نزیکە (٣٠٠٠٠) دەنگیان لە دەستداوە کە هەریەکەی بە لیستی جیاجیا بەشدارییان تێدا کرد.

*** ژمارەی دەنگی کورسییەکانی لایەنەکانی کەرکوك بۆ هەڵبژاردنی ٢٠١٨**

١- یەکێتی نیشتمانی کوردستان ١٨٣٣٠٠ شەش کورسی
٢- هاوپەیمانی نیشتمانی عەرەبی ٨٣٠٠٠ سێ کورسی
٣- بەرەی تورکمانی عێراقی ٧٩٠٠٠ سێ کورسی
٤- هاوپەیمانی نەسر ٢٣٢٤٥ یەك کورسی
٥- یەکگرتوو ٤٦٥٠ دەنگ
٦- ئەوانی تر ٢٦٤١١ دەنگ

* کاندیدە دەرچووەکان

١- رێبوار تەها-کورد.
٢- ئەرشەد ساڵحی-تورکمان
٣- د. بیستوون عادل زەنگەنە-کورد
٤- ئەڵماس فازڵ-کورد
٥- د. ئەحمەد حەیدەر قاسم-شیعە مەزەب
٦- دیلان مامۆستا غەفوور-کورد
٧- جەمال محەمەد شوکور-کورد
٨- خالید مەفرەجی-سوننە مەزەب
٩- مەریوان نادر-کورد
١٠- محەمەد تەمیمی-سوننە مەزەب
١١- راکان سەعید-سوننە مەزەب
١٢- خەدیجە تازەلی-شیعە مەزەب

ئەوەی سەرنج دەدرێت لەم هەڵبژاردنە ئەوەیە کە ٢ کاندیدی شیعەی تورکمان لە کەرکوك دەرچووە، ئەمە هەنگاوێکە بۆ

بەشیعەکردنی کەرکوك و تورکمان لەم شارە.
کۆتای مەسیحییەکانیش بۆ (رەیحانە حەنا) دەرچوو، ئەو کاندیدەی کە لەلایەن پارتییەوە لە کەرکوك پشتیگیریی لێدەکراو بانگەشەی بۆ دەکرا.

* سەرچاوەکان:

١- رۆژنامەی (ئاژانس)، ژمارە (٨٤) رۆژی ١٨ی نیسانی ٢٠١٨ لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی ((تورکمان و عەرەبی کەرکوك مالیان پەرتەوازەیە)) لەلایەن (عیماد جەباری)، لاپەرە ٦.

٢- رۆژنامەی (المدى)، ژمارە ٤١٨١ لە رۆژی ٢٦ی نیسانی ٢٠١٨، لێکۆڵینەوەیەکە بەناونیشانی:- (مكونات كركوك تنشطر إلى ٢٤ قائمة لتقاسم ١٣ مقعدا برلمانيا، وائل نعمة.

٣- (انتخب) ملحق اسبوعي خاص بالإنتخابات يصدر عن جريدة الصباح، ٩ی ئایاری ٢٠١٨ لاپەرە (١٢-١٣)

٤- رۆژنامەی (رووداو)، ژمارە (٥٠١)، لە رۆژی ١٦ی نیسانی ٢٠١٨، لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- ٥٢ کورد لە کوردستان خۆیان لەسەر چوار لیستی عەرەبی پاڵاوتووە، لە نووسینی سالح قادر، ناسر عەلی، لاپەرە (٣).

*** سیناریۆی هەڵبژاردنی پارێزگاکان لە کەرکوك لە ساڵی ٢٠١٨:-**

هەر لە سەرەتای هەڵبژاردن لە عێراقدا، تەنها جارێك لە ماوەی تەمەنیدا هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کراوە و تاوەکو ئێستا بەهۆی کۆمەڵێك راوبۆچوونی جیاواز و بێ بنەما لەلایەن تورکمان، عەرەب، هەڵبژاردنی کەرکوك دواخراوە.
رۆژ لەدوای رۆژ کێشەکانیان چڕ کردووەتەوە و لە هەموو بوارەکاندا کوردیان تاوانبار کردووە کە گوایە دەستکاری ژمارەی دانیشتووان و خەڵکێکی زۆریان هێناوەتە شارەکە بێ رەچاوی دەربەدەری ئەو ژمارە زۆری کوردییان کردبێت لەلایەن رژێمی بەعسەوە تا ساڵی ٢٠٠٣ کە بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو بە عەرەبکردن رەچاوکراوە.
بەڵام لەدوای رووداوەکانی ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ەوە کە کورد دەسەڵاتی لە شارەکە نەماو تورکمانەکان و عەرەب کەوتوونەتە دووبارە دارشتنەوەی سیناریۆی هەڵبژاردنی پارێزگای کەرکوك، هەر لەم چوارچێوەیەدا نێردراوی یۆنامی لە هەوڵی ئەوەدایە کە نووسینگەی خۆی دووبارە لە پارێزگاکە بکاتەوە بۆ ئەوە کێشەکانی بەردەم هەڵبژاردن چارەسەر بکات.
هەر بۆیە یۆنامی هەوڵی ئەوەی دا پێکهاتەکانی کەرکوك لێك نزیك بکاتەوە و لێکۆڵینەوە بکات لە ماددەی (٣٧)ی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان.
ئەو سیناریۆیەی کە یۆنامی هەڵیبژاردووە دووبارە دارشتنەوەی پلە کارگێڕییەکانی هەموو پێکهاتەکان بەو شێوەیەی کە هەموویان رەزامەندی لەسەر بدەن.
کورد داواکاری ئەوەیە کە هەڵبژاردن بەو شێوەیە لە کەرکوك بکرێت وەکو ئەوەی لە یاسای هەڵبژاردندا هاتووە بەڵام پێکهاتەی تورکمان و عەرەب داوای یاسایەکی تایبەتی هەڵبژاردن دەکەن.
لە رابردوودا هەڵبژاردنەکان راوەستا لەم پارێزگایەدا بەهۆی دژواری کێشەکان لەنێوان پێکهاتەکان ئەوەی بووە هۆی دواکەوتنی هەڵبژاردنەکان لە یاسای هەڵبژاردن، ماددەی ٣٧ بوو، لەنێویدا دووبارە وردبینی کردنی بەیان و تۆماری دەنگدەران و دابەشکردنی پلە کارگێڕییەکان، لە هەمان کاتدا لە ماددەی ٥٢دا رێگری کرد لە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی قەزاو ناحیەی پارێزگاکان لە ژمارە ٣٦ی ساڵی ٢٠٠٨.
بەڵام ماددەی ٣٧ لە یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاکان ئەوە لەبەر چاو دەخات بۆ هەڵبژاردن لەو چوارچێوەیەدا کە بەرژەوەندی ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگرێت:-

١- دووبارە وردبینی تۆماری دانیشتووان کە هاوپەیوەستە بە باری دانیشتووان لە پارێزگاکە بەتایبەتی ئەوەی لە تۆماری دەنگدەراندا هاتووە.

٢- دیاریکردنی ئاوازی دووبارە دابەشکردنەوەی پلە باڵاکان لە پارێزگاکان بێجگە لە پلە فیدرالییەکان کە هەموو پێکهاتەکان رۆڵی تێدا ببینن.

٣- مانەوەی باری پارێزگای کەرکوك هەر وەکو ئەوەی لە

ئێستادا هەیە تا ئەو کاتەی ئەنجوومەنی پەرلەمان بڕیاری دواڕۆژی دیاری دەکات.
لە ٣ی شوباتی ٢٠١٨ نێردراوی یۆنامی گەیشتە ڕێککەوتنێکی تازە دەربارەی هەڵبژاردن لە پارێزگاکە کە هەموو پێکهاتەکان ڕەزامەندیان لەسەری دەربڕی هەر لەدوای ئەو ڕێککەوتنەوە پەرلەمانی عێراق بەدوو ماددەی ٢٣و٣٧ هەڵبژاردنی لە کەرکوك ڕاگرتبوو.
ئەم ڕێککەوتنە هەر یەکە لە ئەندام پەرلەمانەکانی کەرکوك:-
ئەرشەد ساڵحی، خالید ئەلمەفرەجی، عیماد یۆحنا، حەسەن تۆران، محەمەد تەمیم، محەمەد عوسمان، شوان داودی، ڕێبوار تەها، شاخەوان عەبدوڵڵا، ڕەزامەندیان لەسەری دەربڕی و پەنجەمۆریان کرد.
ئەم ڕێککەوتنە بۆ ماوەی هەڵبژاردنی داهاتووی چوار ساڵە و ئەنجوومەنی تازەی پارێزگاکە پلەی پارێزگار و جێگر و ئەنجوومەن و جێگرەکەی هەڵدەبژێرێت بەپێی ڕێژەی هەڵبژاردن.

سەرچاوە:-
١- ڕۆژنامەی المدی، ژمارە، ٤١٤٠.
٢- ڕۆژنامەی المدی، ژمارە، ٤١٤٨
٣- ڕۆژنامەی المدی، ژمارە، ٤١٤١

*** دانیشتوانی کەرکوک بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧:-**

**د. جەبار قادر**

**چەند وتەیەکی پێویست لە بارەی سەرژمێرییەکەوە:**

سەرژمێری لە عێراق لە ڕۆژی دروستبوونێوە کێشە بووە، ئەوەتا لە سەدەی بیست و یەکدا دوو دەیەیە ناتوانێت سەرژمێرییەکی دانیشتوانەکەی بکات. لەم بوارەدا عێراق سەدە و نیوێک لە وڵاتانی وەك ئەمێریکا(١٧٩٠)، ئەڵمانیا(١٨٧١)، ژاپۆن(١٨٦١) و هیندستان(١٨٨١) وەدواکەوتووە. لە نیسانی ١٩٢٠ دەسەڵاتی کۆلۆنیالی بریتانی لە عێراق هەندێ ئامار و زانیاری لە بارەی عێراقەوە ئامادە کردو و ڕایگەیاند کە ژمارەی دانیشتوانی ٢٨٤٩٢٨٢ کەسن. بەپێی ئەم داتایانە کۆی دانیشیتوانی لیوای کەرکوك ٩٢ هەزار کەس بوون. هەرچی حکومەتی عێراقە لە ساڵی ١٩٢٧ هەوڵێکیدا سەرژمێرییەك بکات، بەڵام زوو بۆی دەرکەوت کە ئەم کارەی بۆ ناکرێت، بۆیە هیچ ئەنجامێکی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندرا کە دانیشتوانی عێراق ٢٩٦٨٠٥٤ کەس بوونە. سەرژمێری ساڵی ١٩٣٤یش زیاتر خەمڵاندن بوو، نەك زانیاری نادروست. لێژنەکانی سەرژمێری لە شوێنێکی دیاریکراو دادەنیشتن و موختارەکان سەرۆك خێزانەکانیان بانگ دەکرد بۆ ئەوەی لە بارەی ئەندامانی خێزانەکانیاوە زانیارییان لێ وەربگرن. سەرژمێرییەکە بەمەبەستی سەربازی و هەڵبژاردن بوو. زۆر کەس زانیارییان لەبارەی نێرینەکانی خێزانەکانیانەوە دەشاردەوە بۆ ئەوەی نەبرێن بۆ سەربازی. بەپێی ئەم سەرژمێرییە دانیشتوانی عێراق ببوون بە ٣٢١٣١٧٤ کەس.

لە ١٩ ئوکتۆبەری ١٩٤٧ لە یەك کاتدا و لە هەموو عێراق سەرژمێری کرا. هەرچەندە سەرژمێرییەکە ورد نەبوو، بەڵام لە چاو ئەوانەی پێشوو هەنگاوێك بوو بۆ پێشەوە. بۆ یەکەمین جار ناونووسەکان دەچوونە ماڵان، ئەنجامەکانی سەرژمێرییەکەش لە سێ بەرگدا بڵاوکرانەوە. ئەوەی بۆ ئامادەکردنی ئەم وتارە بەکارهاتووە بەرگی دووەمە کە لیواکانی موسل، کەرکوك، سلێمانی و هەولێری گرتۆتەوە و لە ساڵی ١٩٥٤ لە بەغدا لە چاپ دراوە و بڵاوکراوەتەوە.

زانیارییەکانی ئەم سەرژمێرییە هەژارن و لە گەڵ ئەوەی دواتردا واتا ئەوەی ساڵی ١٩٥٧ کرا بەهیچ شێوەیەك بەراورد ناکرێن. لەمەی ١٩٤٧ هۆز و خێڵە کۆچەرەکان تۆمار نەکراون کە ژمارەی ئەندامانیان بە ١٧٠ هەزار کەس خەمڵێنراوە. یەکێ لە ناتەواوییەکانی ئەم سەرژمێرییە لەوەدایە لە کتێبکدا ژمارەی ئاواییەکانی سەر بەیەکە کارگێڕییەکانی داوە، بەڵام لەو ژمارەیە ناو و ژمارەی دانیشتوانی بەشێکی کەمیانی تۆمار کردووە. لەو بەرگەی لە بەردەستمدایە ئەوە ڕووننەکراوەتەوە، ئایە ئەم کارە لە سەر چی بنەماییەك کراوە. لە باسی یەکە کارگێڕییەکاندا ئاماژە بە ژمارەی ئاواییەکان دەکەم و باسی ئەوەش دەکەم چەندیان لێ تۆمار کراون و چەندی دیکەیان باسیان لێوە نەکراوە. خاڵێك کە لەم سەرژمێرییەدا سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کە کۆی ژمارەی دانیشتوانی لە هەندێ لە یەکە کارگێڕییەکان لەگەڵ ئەو ژمارانەدا یەك ناگرنەوە کە سەرژمێرییەکە تۆماری کردوون،

ئەمەش بەگشتی بەشێك لەو کەم و کوڕییانە دەردەخات. لە کاتی باسکردنی یەکە کارگێڕییەکانی کەرکوکدا ئاماژە بە هەندێ لەو جیاوازییانە دەکەم.

بەڵگە و زانیاری زۆر لە بەردەستدان کە سەرژمێرییەکە ناتەواوی زۆریان تێدایە. وەك نموونەیەکی پڕ واتا ئاماژە بە وتەکانی خوالێخۆشبوو عەلائەدین سوجادی دەدەم، کە ئەو کاتە ماڵی لە بەغدا بووە و تا ئێوارەی ڕۆژی سەرژمێرییەکە لە ماڵەوە چاوەڕوانی ماڵنووسەکانی کردووە، بەڵام کەس سەری بە ماڵیاندا نەدابوو و ناویان نەکردووە بۆ ناویان بنووسێت، ئەو دەپرسێت: ئەگەر ئەمە حاڵی پایتەخت بێت، ئەی دەبێ لە شوێنە دووردەستەکان کارەکە چۆن بەڕێوە چووبێت؟.

سەرژمێرییەکە دانیشتوانی تەنها لە سەر بنەمای ئاین پۆلێن کردووە و بەلای پێکهاتەی نەتەوەییاندا نەچووە، تەنانەت وەك ئەوەی ١٩٥٧ لە سەر بنەمای زمانی دایکیش تۆماری نەکردوون. ڕەنگبێ هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەو کاتە هێشتا ژمارەی عەرەب لە عێراق زۆر زۆر نەبوون.

*** یەکە کارگێڕییەکانی لیوای کەرکوك لە کاتی سەرژمێری ١٩٤٧دا:-**

لە ساڵی سەرژمێرییەکەدا لیوای کەرکوك لە چوار قەزا و ١١ ناحیە پێکهاتبوو:

١-قەزای ناوەندی کەرکوك و هەر چوار ناحیەیەکەی: قەرەحەسەن، ئاڵتون کۆپری، مەلحە و شوان.

٢-قەزای داقوق و هەردوو ناحیەی قادر کەرەم و دوزخورماتو.

٣-قەزای چەمچەماڵ و هەردوو ناحیەی ئاغجەلەر و سەنگاو.

٤-قەزای کفری و ناحیەکانی پێباز و قەرەتەپە و شێراونە.

هەر یەکەیەکی کارگێڕیش دەیان ئاوایی پێوە گرێدرابوو.

*** قەزای ناوەندی کەرکوك لە ساڵی ١٩٤٧دا:**

لە کاتی سەرژمێرییەکەدا قەزای ناوەندی کەرکوك لە شاری کەرکوك و شارەدێکانی (ناحیە)ی قەرەحەسەن، پردێ (ئاڵتون کۆپری)، شوان و مەلحە پێکهاتبوو. شار لەم ١٧ گەڕەکە پێکهاتبوو: ساری کەهیە، شاترلو، بەگلەر، ئیمام قاسم، بولاق، ئاخور حوسێن، مەیدان، ئاغالق، حەمام موسلیم، حەمام مەسیحی، پریادی موسلیم، پریادی موسەوی (یەهودی)، شۆریجە، چقور، ئاوچی و چای. کۆی دانیشتوانی ئەم گەڕەکانە ٦٤٥١٤ کەس بوون. لە سەرژمێرییەکەدا دانیشتوانی ئاواییەکانی تۆپزاوای حوسێن بەگ، تسن، بەشیر و کۆمپانیای نەوت لە گەڵ ئەوانەی گەڕەکەکانی شاردا تۆمارکراون، بۆیە ژمارەکە بووە بە ٧٣٩٨٤ کەس.

لە ڕاستیدا هۆی هەژمارکردنی دانیشتوانی ئەم ئاواییانە لە گەڵ گەڕەکەکانی شاردا و نەژمارنەکردنی ئەوانی دیکە دیار نیە چیە، چونکە لە تەك ئەمانەدا ٨٣ گوندی دیکەش سەر بە قەزای ناوەند بوون، کە کۆی دانیشتوانیان بە پێی سەرژمێرییەکە ١٤٣٥٦ کەس بوو. ئەم ئامارانە زۆر جێگای باوەڕ نین، چونکە سەرژمێرییەکە لەو ٨٣ ئاواییە تەنها ناوی ٢٧ یانی لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانیاندا تۆمار کردووە، کە دەکەنە ١٠٢١٩ کەس بوونە. مرۆڤ بۆی هەیە بپرسێت: ئەگەر ژمارەی دانیشتوانی تەنها ٢٧ ئاوایی ١٠٢١٩ کەس بێت، چۆن دەبێت ئەو ٥٦ ئاواییەی تر، کە ناویان تۆمار

نەکراون تەنها ٤١٣٧ دانیشتوویان هەبن؟. بەم پێیە بێت هەر ئاواییەك تەنها ٧٤ دانیشتووی بەردەکەوێت، کە ئەمەش بۆ باری دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی خێزانەکانی ئەو سەردەمە مایەی گومان و تێرامانە. ئەمە نەك تەنها لە ئامارەکانی قەزای ناوەندی کەرکوکدا دەبینین، بەڵکو لە گوندەکانی هەموو یەکە کارگێرییەکانی تریشدا هەمان شت کراوە. ئەم شێوازەی تۆمارکردنی دانیشتوان کۆی ئامارەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. تۆ بڵێی ئەمە هەوڵێك بێت لەو سەردەمە زووەی دەسەڵاتی ناوەندی عێراقدا بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لە لیوای کەرکوکدا، کە نزیکەی ٩٠٪ ئاواییەکانی کوردنشین بوون؟. شایانی باسە کە ژمارەی ئاواییەکانی لیوای کەرکوك لەو کاتە و بەپێی سەرژمێرییەکە ١٠٠٧ ئاوایی بوونە، کە لە رێگەی شوێن، هەڵکەوتە و ناوەکانیانەوە دەزانین زیاتر لە ٨٥٠ گوندی کوردنشین بوونە. ناتەواوییەکی دیکەی ئەم سەرژمێرییە لە بارەی دانیشتوانی قەزای ناوەندی کەرکوکەوە ئەوەیە، کاتێ ژمارەکانی دانیشتوانی ناو شار و دێکانی کۆدەکەیتەوە دەکاتە ٨٨٣٤٠ کەس، نەك ٩١٥٨٢ کەس وەك لە سەرژمێرییەکەدا هاتووە. من پسپۆری بواری ئامار نیم و ناتوانم لەم بارەیەوە شتێکی ئەوتۆ بڵێم. هیوادارم شارەزا و پسپۆرانی ئەم بوارە ئەو پرسانەمان بۆ لێکبدەنەوە.

*** ناحیەی قەرەحەسەن:-**

سەر بە قەزای ناوەندی کەرکوك بوو، مەڵبەندەکەی شارەدێی لەیلان بوو. ژمارەی دانیشتوانی لەیلان ١٤٤٧ کەس بوو، ٥٥ ئاواییش سەر بەم ناحیە بوون، سەرژمێرییەکە تەنها ناوی ٢١ یانی بۆمان تۆمار کردووە: باوا، مامشە، یەحیاوە، خالۆبازیانی، حەساری خالۆبازیانی، کەوەڵە، چیمەنی بچوك، سالەیی، قەرەهەنجیر، هەیبە، چیمەنی گەورە، سیامەنسوری خواروو، زەنگەنە، فەرقان، تەپەلو، شێخ جگری، ئۆمەرگەدە، ترکەشکانی گەورەی خواروو، تەرجل، یارمجە و بەیانلو. کۆی دانیشتوانی ئەم ٢١ گوندە بە ١١٠٤٠ کەس دانراون. هەموو دانیشتوانی ناحیەی قەرەحەسەن ١٣٨٧٨ کەس بوون. لێرەش بەهەمان شێوە ئەو جیاوازییە دەبینین. کاتێ ژمارەی دانیشتوانی ئەو ٢١ گوندەم کۆکردەوە کردیە ٩٢٠٥، نەك ١١٠٤٠ وەك لە سەرژمێرییەکەدا هاتووە. ئەی چۆن دانیشتوانی ئەو گوندانەی ماونەتەوە کە ٣٤ گوندن تەنها ١٨٣٥ کەس بوونە؟. بەم ژمارانە بێت ئەوا هەر ئاواییەك تەنها ٥٤ دانیشتوی بەردەکەوێت!!!.

*** ناحیەی ئاڵتوون کۆپری:-**

هەرچی ناحیەیە ئاڵتون کۆپری یا پردێیە کە شارەدێی ئاڵتون کۆپری ناوەندەکەی بوو لە گەڕەکەکانی سەرای، بازار، سەلاحیە، مزگەوت، تسن و قەرەبەگ پێکهاتبوو. کۆی دانیشتونی گەڕەکەکانی پردێ ٣٧٢٩ کەس بوون. ئاواییەکانی سەر بەم ناحیەش ٥٠ ئاوایی بوون، کە ژمارەی دانیشتوانیان ١١٢١١ کەس بوون. گرنگترین ئاواییەکانی ناحیەی پردێ ئەمانە بوون: کوزرەبی، کتکە، یارمجە، زەردەلی، حەساری گەورە، قادر باغر، نەبیاوا، دارەمانی بچوك، دارەمانی گەورە، بیبانی گەورە، سرید(!)، سابونچی، کلۆزی، قەرەدەرە، قوشقایە، بای حەسەن، کۆردەرەی گەورە، دبز، خورماڵجە، میر ئەسفەهانی بچوك، میر ئەسفەهانی گەورە و حەساری بچوك. کۆی دانیشتوانی ناحیەکە ١٤٩٤٠ بوون. ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتوانی ئاڵتون کۆپری تورکمان بوون، دانیشتوانی ئاواییەکان کورد بوون و هەندێ خێزانی عەرەب و تورکمانیش لێرە و لەوێ هەبوون.

*** ناحیەی مەلحە:-**

لەو کاتەدا تاکە ناحیەی سەر بە قەزای ناوەندی کەرکوك بوو، کە خەڵکەکەی عەرەب بوون. شارەدێی فاروق ناوەندی ناحیەی مەلحە بوو و ژمارەی دانیشتوانی ٩٠٢ کەس بوون. مەلحە ٧٦ ئاوایی هەبوو، کە ماحوز (١٠١٣) و غەریب (١٠٥٨) لە هەرە گەورەکانیان بوون. ئەوانی دیکە فەتحە، عوبەیدیە، عەبباسیە، سەلاحیە، جبوریە، تەلزەهەب، غازیە، دبس، مامسە، مەلحە عەرەب، دغێلەی بچوك، تەلعەلی، سەجرە...تاد. ژمارەی دانیشتوانیان بەسەریەکەوە ١٢٣٥٣ کەس بوون. کۆی دانیشتوانی ناحیەکە بەهەموو گوندەکانێوە ١٥٣٢٦ کەس بوون، کە لە ٢٥٢٨ خێزان پێکهاتبوون. لێرەش لە کۆی ٧٦ ئاوایی تەنها ناو و ژمارەی دانیشتوانی ١٦ ئاوایی تۆمار کراون، بۆیە مرۆڤ ناتوانێت ڕاستی و دروستی ژمارەکان پشتراست بکاتەوە.

پەیدابوونی و گەشەکردنی ئەم ناحیە و دواتر قەزای حەویجە بەرهەمی سیاسەتی نیشتەجێکردنی هۆزەکانی عوبێد و جبور و ئەوانی دیکە بوو لە سەر ئەو خاکە. ئەمە دەسپێکی سیاسەتی بەعەرەبکردنی بەشێك لە خاکی کوردستان بوو کە لە سییەکانی سەدەی رابردووەوە دەستیپێکرد. ئەم ژمارە زۆرەی عەرەب کە پێش سەرژمێرییەکە بە دە ساڵ لە سنوورەکانی لیوای کەرکوك پەیدابون، لە ماوەی نیو سەدەدا بوون بە ژمارەیەکی یەگجار گەورە و رۆڵێکی زۆریان لە گۆڕینی دیموگرافی هەموو لیوای کەرکوکدا گێڕا. ئەم ناحیە و دواتر قەزای حەویجە بوو بە ناوەندێکی بەهێزی نەیارێتی کورد و داخوازییە رەواکانی، هەروەها لەم ساڵانەی دواییدا بوو بە بنکەیەکی سەرەکی تیرۆریستانی داعش و هەڕەشەیەکی گەورە لە سەر ئاسایشی هەموو کەرکوك.

*** ناحیەی شوانیش:-**

هەر سەر بە قەزای ناوەندی کەرکوك بوو، شارەدێی رێدار ناوەندی ناحیەی شوان بوو کە ژمارەی دانیشتوانی تەنها ٣٨٢ کەس بوون. زیاتر لە ٧٦ ئاوایی سەر بەم ناحیە بوون. کۆی دانیشتوانی ئەم ئاواییانە ١٠٨١٨ کەس بوون. بەم شێوەیە کۆی دانیشتوانی ناحیەکە ١١٢٠٠ کەس بوون. ئەو گوندانەی ناو شوان کە سەرژمێرییەکە ناویانی تۆمار کردووە ئەمانەن: مەرزیجەی ژوورو، عەلی بەبان، حەمدون، مامەرەش، چۆلمان، قەرەناو، کارێزی خالخالان، تازلوجەی جمەبڵە، کلمکوە، کلاوقوت، ئۆمەر مەندان، ئیلینجاغ، قەفار، تلکی شوکیر و بابلان. لێرەش لەو ٧٦ گوند تەنها ناو و ژمارەی دانیشتوانی ١٦ یان تۆمار کراون.

*** قەزای داقوق لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧**

داقوق ئەو کاتە قەزا بوو، لە ناوەندی قەزا کە شارۆچکەی داقوق بوو و هەردوو ناحیەی قادر کەرەم و خورماتوو پێکهاتبوو. هەرچەندە دانیشتوانی شارۆچکەی خورماتوو(٦٣٧٤) کەس

بوون، واتا سێ ئەوەندەی دانیشتوانی شارۆچکەی داقوق، کە ژمارەیان تەنها(١٩٨٧) کەس بووە، بەڵام داقوق کراوە بە قەزا و خورماتوو بە ناحیە. ڕەنگبێ هۆکارەکەی ئەوە بووبێت کە داقوق لە مێژوودا ناوێکی گەورە و دیار بووە، لە سەردەمی عەبباسییەکانەوە پێگەیەکی گرنگی هەبووە، تەنانەت کاتێ سەرچاوە مێژووییەکان باسیان لە کەرکوك دەکرد ئاماژەیان بەوە دەکرد کە قەڵایەك بووە و کەوتۆتە نێوان داقوق یا داقوقا و هەولێرەوە(اربل دواتر اربیل). خورماتوو دواتر کرا بە قەزا و داقوقیش بە ناحیە، بەڵام جارێکی تر کرایەوە بەقەزا.

لەو کاتدا دانیشتوانی شارۆچکەی داقوق دەتوانم بڵێم چەند ماڵێکی لێدەرکەی ئەوانی تر هەموویان تورکمانی شیعە بوونە، بەڵام ئەو ئاوایییانەی سەر بە ناوەندی قەزاکە بوون و ژمارەیان ٦٩ ئاوایی بوو، تەنها دانیشتوانی ئاوایی ئیمام زەینەلعابدین، کە هەر بەئیمام نێودەبرا، تورکمان بوون و ژمارەیان ٣٥٥ کەس بوو. هەندێ ئاواییش وەك ئەلبومحەمەد، ئەلبونەجم، دەلس...تاد دانیشتوانیان کورد و عەرەب بوون، ئەوانی دیکە هەموویان کورد بوون. دانیشتوانی ئاواییەکانی کوردان بەژمارە زۆر بوون، تەنها بۆ نموونە دانیشتوانی ئاوایی ئێنگیجە (١٠٦٦) کەس و زەند مەلا یوسف (٩١٧) کەس بوون، واتا بە هەردووکیانەوە ئەوەندەی دانیشتوانی شارۆچکەی داقوق بوون. من بەمنداڵی لە ئێنگیجە ژیاوم تەنها یەك ماڵە عەرەبی لێبوو و سێ چوار ماڵی بەیاتی لێبوو و کەس نەیدەتوانی لە کورد جیایان بکاتەوە. بەگشتی ژمارەی دانیشتوانی ئاواییەکانی داقوق ١٢٦٥٤ کەس بوون، واتا شەش جار بەقەد دانیشتوانی داقوق. لەو ٦٩ ئاواییە، سەرژمێرییەکە ناو و ژمارەی دانیشتوانی تەنها ٢٢ یانی بۆ تۆمار کردووین، کە ئەمانەن: ئێنگیجە، ئیمام زەینەلعابدین، کلیسە، عەولاغانم گەورە، عەولاغانم بچوك، عەلی سەرای، زەنقر، جنگلاوە، ئەلبومحەمەد، سنور، مەتیق، تۆپزاوا، عەربکۆیی، حەوز١٦، زەند مەلایوسف، ئەلبونەجم، دەلس، زەند نەبسر(وادەزانم هەر زەند بنعێزە!)، گولی تەپە یا کولی تەپە، چەورکە، هەفتەغار، زەند بنعێز. دانیشتوانی ئەم ٢٢ ئاواییە بەسەر یەکەوە ٥٢٣٥ کەس بوون، ئەو ٤٧ گوندەشی کە تۆمار نەکراون دەبێت ژمارەی دانیشتوانیان ٧٤١٩ کەس بووبێت.

ناحیەی قادرکەرەم ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەکەی ٦٢٠ کەس بووە، ٨٦ ئاواییش سەر ناحیەکە بووە، کە ژمارەی دانیشتوانیان ١٤٠٦٩ کەس بوونە و لە گەڵ دانیشتوانی شارۆچکەکەدا دەیانکردە ١٤٦٨٩ کەس. دانیشتوانی قادرکەرەم و ئاواییەکانی هەموو کورد بوون. لەو ٨٦ ئاواییە سەرژمێرییەکە تەنها ناوی ٢٥یانی تۆمار کردووە، کە ئەمانەن: قەلخانلو گەورە، قەلخانلو بچووك، چەم سورخاو، کونەکانی، تاوێر بەرز، جمك، تەکیە، جان وەیس بەگ، عەلی خان، داربەسەرە، نەورۆز، قەڵای میکایلی سەروو، قەشقە، بانگۆل، کۆکمە، مەلا ئۆمەر، هەرنیە، گولباغ، ڕەشید ئاغا، قەیتول، قرجە، کانی قادر، ژاڵەدێوانە، بەهرام بەگ، ئاوباریك و مەلا ناسر. کۆی دانیشتوانی ئەم ئاوایییانەش ٧٨٦٧ کەس بوونە.

هەرچی ناحیەی خورماتوو بوو، وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد ژمارەی دانیشتوانی شارۆچکەکە ٦٣٧٠ کەس بوو، ٨٨ ئاواییش سەر ناحیەی خورماتو بوون، کە ژمارەی دانیشتوانیان بە گوندەکانی ئامرلی، بەستاملی، ئەلبوسەباح و بابلانەوە دەیکردە ٢٣٣٠٥ کەس. لێرەش بە هەمان شێوە، لەو ٨٨ گوندە تەنها ناوی ٢٦ یانی تۆمار کردووە، کە ئەمانەن: یەنگیجە، بساسی، شێخ هەوازی، نەوجول، زنکۆبی، چەرداخلی، لەك، حەفریە، لقوم، عەبود یا غبود، شاهسیوان، ڕوباری عەبسە، ڕوباری جەیدەر، مرادلی، قەڵا، جلێوەی گەورە، تەپە حرمکی سەروو، جوری، زندانە، کرمك یا گەرمك، مەفتولی بچوك و خاسەدارلی. کۆی دانیشتوانی ناحیەی خورماتو دەیانکردە ٢٩٦٨٦ کەس. بەم شێوەیە ژمارەی ئەوانەی لە شارۆچکەکانی سەر بە قەزای داقوق دەژیان ٨٣٥٧ کەس بوون و دانیشتوانی ئاواییەکانیش ٥٠٦٠٧ کەس بوون. هەموو بەسەر یەکەوە لە قەزای داقوق ٥٩٠٠٥ کەس دەژیان. هەندێ جار سەرژمێرییەکە ژمارەی هەندێ جیاواز لە مانە دەدات، کە پێموایە ئەمەش بەشێکە لە ناتەواوی و هەڵە و پەڵەکانی. ژمارەی موسوڵمانان لە قەزای داقوق بە ٥٨٣٨١ دانراوە، جولەکەش ٥٨٥ کەس بوونە کە زۆربەی هەرە زۆریان لە شارۆچکەی خورماتوو دەژیان، کرستیانەکان تەنها ٦٣ کەس بوونە. وادیارە کاکەییەکانی داقوق لە گەڵ موسوڵمانەکاندا ناونووس کراون.

دانیشتوانی ناو شارۆچکەکانی داقوق و خورماتوو زۆربەی هەرە زۆریان تورکمان بوون. من لە پەنجاکان لە قوتابخانەی ناوەندی داقوق خوێندوومە و فەرمانگەی بەسەربازیکردنیشمان لە خورماتوو بوو، ئەو دەمە دانیشتوانی داقوق هەموو تورکمانی شیعە بوون چەند ماڵێکی کەمی بەکتاشی و کورد و عەرەبی لێدەرچێ. بەڵام دانیشتوانی ئاواییەکانی بە ڕێژەی ٩٠٪ کورد بوون، هەرچی قادرکەرەمە بە ناوەند و گوندەوە هەموو کورد بوون. لە بەر ئەوەی لە سەرژمێرییەکە باسی پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان نەکراوە، بۆیە ئاسان نیە لێرەدا بەژمارە باسی کورد و تورکمان و عەرەب بکەین. لە کۆتایی ئەم وتارەدا و لە بەر ڕۆشنایی ئامارەکانی سەرژمێرییەکە هەوڵدەدەم ڕێژەی کورد و عەرەب و تورکمان لە کەرکوك بقەبڵێنم. لێرەدا جارێکی دیکە هەندێ جیاوازی لە ژمارەکاندا بەرچاو دەکەون. بۆ چەندین جار بە ژمارەکاندا چوومەتەوە و کۆیانم کردۆتەوە هێشتا ڕەنگبێ خوێنەری ورد لێرە و لەوێ هەست بەهەندێ هەڵە و ناتەواوی بکات.

*** قەزای کفری لە ساڵی ١٩٤٧دا:-**

قەزای کفری، لە سەردەمی عوسمانیدا ناوی سەڵاحیە بوو، لە کاتی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧دا لە ناوەندی قەزا و ناحیەکانی:- پێباز، قەرەتەپە و شێروانە پێکهاتبوو. شارۆچکەی کفری بە پێی سەرژمێرییەکە دوو گەرەکی دەگرتە خۆ: ئیسماعیل بەگ، کە ژمارەی دانیشتوانی ٢٧٨٠ کەس بوون و گەرەکی سەیدەکان(السادە) کە ١٩٠١ کەسی تێدا دەژیا. بەم شێوەیە کۆی گشتی دانیشتوانی شارۆچکەی کفری تەنها ٤٦٨١ کەس بوونە. هیچ ئاواییەك لە گەڵ ناوەندی قەزادا لەم سەرژمێرییە تۆمار نەکراوە.

ناحیەی پێبازە(پێوان) بە هەر ٦١ ئاواییەکەیەوە ژمارەی

دانیشتوانی ٥٩٥٩ كەس بووە. گرنگترین ئاواییەكانی ئەم ناحیەیە: تەپەكرون، زەردەلیكاو، جرجەقەڵا، بەكر بایف، كولیتەپە و كۆكس بوون.

ناحیەی قەرەتەپە بەگەورەترین ناحیەی قەزای كفری دادەنرا. ئەمیش لە دوو گەرەك پێكهاتبوو گەرەكی مزگەوت و گەرەكی بازار، ژمارەی دانیشتوانی هەردوو گەرەكەكە دەیكردە ٢٧١٤ كەس، ئاواییەكانی قەرەتەپە ٩٨ ئاوایی بوون و كۆی دانیشتوانیان ١٨٣٣٢ كەس بوون. گرنگترین گوندەكانی قەرەتەپە ئەمانە بوون: كولەجۆ، مەحموله، عەلی سەرای سەروو، عەلی سەرای خواروو، كارێزەكۆن، كۆشك، ئۆمەر مەندان، گاوری سالح محەمەد، گاوری بچوك، كۆكس، شیبان، كاوخۆر، ساریتەپە، خزران، كەشكۆڵی كۆن، كەشكۆڵی تازە، سیبان، شێخ بابا، سەیدەلان و گلیتەپە. هەموو بەسەر یەكەوە لەو ساڵەدا ٢١٠٦٩ كەس لە ناحیەی قەرەتەپە دەژیان.

هەرچی ناحیەی شێروانەیە ناوەندەكەی سەرقەڵا بوو. دانیشتوانی سەرقەڵا زۆر كەم بوون و تەنها ٢٧٣ كەس بوون، لە كاتێكدا لە كەلار كە ئاواییەكی سەر بەم ناحیە بوو ١٠٦٤ كەس ژیانیان بەسەردەبرد. لە تەك كەلاردا ١٣٠ ئاوایی سەر بە شێروانە بوون، كە ژمارەی دانیشتوانیان دەیكردە ١٦٢٢٩ كەس، هەموویان بەسەر یەكەوە ١٧٥٦٦ كەس لە ناحیەی شێروانە دەژیان. بەم شیوەیە كۆی دانیشتوانی قەزای كفری ٤٩٣٣٦ كەس بوون. لەم ژمارەیە ٤٢٦ جو، ٢١ كرستیان و ٢ سوببی بوون، ئەوانی دیكە هەموو موسوڵمان بوون. زۆربەی هەرە زۆری جولەكەكان كە ٣٣٦ كەس بوون لە شارۆچكەی كفری دەژیان و ٨٧ یانیش لە قەرەتەپە و تەنها ٣ یان لە ناحیەی شێروانە بوون. هۆكاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە جووەكان زیاتر لە شار و شارۆچكەكان دەژیان و خەریكی بازرگانی و پیشەگەری بوون. شێروانە وەك دەڤەرێكی كشتوكاڵی بۆ ئەوان دەستی نەدەدا، بەڵام پەیوەندی بازرگانی و ئابوورییان لە گەڵ خەڵكەكەیدا زۆر بوو.

ئەو دەمە ڕێژەیەكی دیاریكراوی دانیشتوانی ناو شارۆچكەی كفری توركمان بوون و لە ناو قەرەتەپەش بارەكە زۆر جیاواز نەبوو، لە هەندێ لە گوندەكانیش عەرەب هەبوون، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانیان كورد بوون، لە نزیكەی ئەو پەنجا هەزار كەسەی كە كۆی دانیشتوانی قەزای كفریان پێكدەهێنا، دەتوانین بڵێین زیاتر لە چل هەزاریان كورد بوونە.

پێش ٢٠٠٣ كۆمەڵێ وتار و توێژینەوەم لە بارەی پێكهاتەی ئەتنیكی دانیشتوانی كەركوك و قەزا و ناحیەكانێوە بەزمانی عەرەبی بڵاوكردەوە، بەشێكیانم لە كۆنفرانس و سیمپۆزیۆمدا لە لەندەن و هەندێ لە پایتەختەكانی تری ئەورووپا پێشكەش كرد. بەداخەوە ئەو كاتە دەستمان نەدەگەیشت بەسەرچاوە و بەڵگە فەرمییەكانی دەوڵەتی عێراق، بۆیە ئاسان نەبوو بۆچوونەكانمان بەخەڵكی دی بدەین بەقەبووڵكردن، بەتایبەتی هەڵمەتی نەیارانی كورد زۆر بەرفراوان بوو. ئێستا هەندێ لەو بەڵگانەمان لە بەردەستن، بۆیە دەتوانین زۆر وردتر لەو بارەیەوە بدوێین. بەداخەوە بەڵگەكان كەوتوونەتە دەستی خەڵكانێك كە نەدەتوانن كەڵكی لێوەربگرن و نە ڕێگەش دەدەن بەكەسانی پسپۆر و شارەزا بەكاریان بێنن. دەبوایە ناوەندەكانی توێژینەوە و میدیای كوردی لە بەر ڕۆشنایی ئەو بەڵگە و دەكیومێنتە فەرمییانە بەشێوەیەكی زانستییانە تیشكی زۆریان بە زمانی عەرەبی و زمانەكانی دیكە بخستایەتە سەر ئەم بابەتانە، لێ مخابن ئەو بوارە هێشتا كێڵگەیەكی نەكێڵراوە.

ئەم جۆرە وتارانە بۆیە بە زمانی كوردی دەنووسم، چونكە دەبینم ژمارەیەك لە خوێنەران و سیاسەتبازانی كورد شتێكی ئەوتۆ لە بارەی رابردووی كەركوكەوە نازانن و تائاستێك باوەڕیان بەلێكدانەوە و بۆچوونەكانی نەیارانی كورد هێناوە. هەڵبەتە ئەمە لەبەر بێ ئاگایی و نەشارەزاییە لەم بوارانەدا، بۆیە زانیاری و لێكدانەوە نادروستەكان زۆر بەئاسانی بەسەریاندا تێدەپەڕن. كێشە گەورەكە لەوەدایە كە ئەمانە بڕیار لە پرسەكانی كەركوك دەدەن. بەكەیفی خۆیان و لەسەر حیسابی كوردی كەركوك پێگە و ڕێژە بەپێكهاتەكانی دیكە دەبەخشن بۆ ئەوەی كوری باشیان پێبڵێن. ئەمانە «پیاوەتی بەناوی حەمامەوە دەكەن». ئەم خوێنەوار و سیاسەتبازانە، كە بۆ خۆیان ڕۆژێك لە كەركوك نەژیاون، بەچاوی گومانەوە سەیری ئەم نووسینانەی ئێمەومانان دەكەن و بەلێكدانەوەی ناسیۆنالیستانەی توندڕەو لە قەڵەمیان دەدەن. ئەمە بەرهەمی تێكەڵەیەكە لە خۆ بەكەم زانین، دووڕوویی، و بێ ئاگایی. ئێمە لە كاتێكدا لە گەڵ ماڧی تەواوی هەموو پێكهاتەكانی كەركوكداین، قەت قایل نابین بەوەی ئەو ماڧانە لەسەر حیسابی كوردی ئەو شارە بن.

*** قەزای چەمچەماڵ لە ساڵی ١٩٤٧:-**

قەزای چەمچەماڵ لە كاتی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧دا یەكێ لە قەزا گرنگەكانی لیوای كەركوك بوو و بریتی بوو لە ناوەندی قەزا و هەردوو ناحیەی ئاغجەلەر و سەنگاو. ژمارەی دانیشتوانی ناوەندی قەزاكە كە چەمچەماڵ بوو تەنها ١٨١١ كەس بوو. ژمارەی ئاواییەكانی ٦٤ ئاوایی بوو كە كۆی دانیشتوانیان ١٠١٢٥ كەس بوون. هەموو بەسەر یەكەوە دانیشتوانی چەمچەماڵ و ئاواییەكانی دەیانكردە ١١٩٣٦ كەس. گرنگترین ئاواییەكانی چەمچەماڵ لەو كاتەدا ئەمانە بوون: تەكیەی كاكەمەند، بنگرد، گورگەیی خاسە، پریادی، گورگەیی شامار، دانەسۆڤ، سەپدانی سەروو، نورە، عەلی مەنسور، قەرەتامور، تالەبان، ژاڵەی بەردەربەند، شێردەرە، قەرەوەیس، ئەحمەد لەوەند، قەڵاچوغە، چراغەسوتە، هەراوە، خاڵدان، مارولە و فەرقە(؟

لە ناحیەی ئاغجەلەر دانیشتوانی ناو شارەدێكە تەنها ٦٢٧ كەس بوون، ٥٥ ئاواییش سەر بە ناحیەكە بوون، كە ژمارەی دانیشتوانیان ٨٩٤٠ كەس بوون و بەسەر یەكەوە دەیانكردە ٩٥٦٧ كەس. گرنگترین گوندەكانی ئاغجەلەریش ئەمانە بوون: یاوەفەنەری سەروو، قۆجەلەر، قەسرۆك، تلیان، كزەڵان، جلەمورد، دلاوەرونە، كەراد، عەسكەر، نۆكەل، كوێرەدێ، بكۆكی، گۆكتەپە (ناوی گوندەكان زۆر جار بەهەڵە و بەعەرەبی نووسران).

هەرچی ناحیەی سەنگاوە دانیشتوانی شارەدێكە تەنها ٥٢٤ كەس بوونە، ٦٦ ئاواییش سەر بەم ناحیە بوون، كە ژمارەی دانیشتوانیان ٧٧٧٧ كەس بوو، لە گەڵ دانیشتوانی

شارەدێکەدا هەموو دەیانکردە ٨٣٠١ کەس. گرنگترین ئاواییەکانی سەنگاو وەك لە سەرژمێرییەکەدا ناویان هاتووە ئەمانەن: درۆزنە، کچان، دەرەوار، هشەزەنێ، ژالە مەملەحە، دێ ڕەشە، ژالە و ڕەبات.

ئەو دەمە لە چەمچەمال تەنها پێنج کرستیان و دوو جولەکە دەژیان. ئەوانی دیکە هەموویان موسوڵمان بوون و کۆی گشتیی دانیشتوانی قەزای چەمچەماڵ بە هەردوو ناحیە و ئاواییەکانیانەوە ٣٠٣٢٨ کەس بوون و هەموویان کورد بوون.

بەپێی ئامارەکانی سەرژمێری ١٩٤٧ بێت، قەزای ناوەندی کەرکوك لەو کاتەدا کۆی دانیشتوانی ١٢٥٢٨٢ کەس بوون. وەك ئاماژەی پێکرا ٢٩٠ ئاواییش سەر بەم قەزایە بوون. کاتێ دانیشتوانی قەزای داقوق بە هەر ٢٤٣ ئاوایی و (٥٩٥٨٩) دانیشتوانەکەیەوە و قەزای کفری بە هەر ٢٨٩ گوندەکەی و (٤٩٣٣٦) دانیشتوانەکەیەو و قەزای چەمچەماڵیش بە هەر ١٨٥ گوند و ٣٠٣٢٨ دانیشتوانەکەیەوە بەیەکەوە کۆدەکەینەوە، کۆی گوندەکانی لیواکە دەکەنە ١٠٠٧ گوند و کۆی دانیشتوانی لیوای کەرکوکیش دەکەنە ٢٦٤٥٣٥ کەس.

ئەم وردەکارییانە لەم خشتەی خوارەوە خراونەتە ڕوو:

ئەم ئامارانە هەندێ جیاوازیان لەگەڵ ئەوانەی لە سەرژمێرییەکەدا هاتوون. بۆ نموونە لەوێ ژمارەی دانیشتوانی لیوای کەرکوك لەو ساڵەدا ٢٨٥٦٠٨، واتا ٢١٠٧٣ کەس زیاتر لەمەی لە خشتەدا خراونەتەڕوو. لە ئامارە فەرمییەکاندا باس لە ژمارەیەك کەس کراوە کە بەشێوەی کاتی لە کەرکوك بوونە یا بەسەردان هاتوونەتە شارەکە. بەڵام ژمارەی ئەوانە هاوتا نیە لە گەڵ ئەم جیاوازییە گەورەیەدا، واتا بەشێك لە پرسەکە ڕووندەکاتەوە نەك هەمووی. من بۆ خۆم سەرم لێدەرنەکرد، هیوادارم توێژەران و پسپۆڕانی بواری ئامار ئەو پرسانەمان بەشێوەیەکی زانستی بۆ لێکبدەنەوە. لێکدانەوەی من بۆ ئەم پرسە و زۆر پرسی دیکەش ئەوەیە کە ئەمانە هەموو بەشێکن لەو ناتەواوییانەی لەم سەرژمێرییەدا بەدیدەکرێن.

*** هەوڵێك بۆ خەملاندنی ژمارە و ڕێژەی پێکهاتەکانی کەرکوك لە ساڵی ١٩٤٧دا:-**

وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا لە سەرژمێری ١٩٤٧دا دانیشتوان تەنها بەپێی ئاین پۆلێن کراون و باس لە پێکهاتەی ئەتنیکییان نەکراوە، بۆیە لە توانای هیچ کەسێکدا نیە ژمارە و ڕێژەیان بەوردی دیاری بکات. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەم بە پێی داتاکانی سەرژمێرییەکە و زانیاری جۆراوجۆر ژمارە و ڕێژەی کورد و عەرەب و تورکمان لە کەرکوکی ئەو ڕۆژانەدا بەهەزەنە بخەمەڕوو. یەکسەر دەبێ ئەوە بڵێم کە ئەم ئامارانە لە کۆتاییدا خەملاندن و قەبلاندنن.

لەم ڕۆژانەدا بەکتێبێکی پڕ لە زانیاری بەسوددا دەچوومەوە، کە کاك هۆشیار بەکر عەزیز لە سەر گەرەکی شۆڕیجەی کەرکوك ئامادەی کردووە، لەوێدا ڕستەیەك سەرنجی ڕاکێشام کاتێ ئاماژە بەوتەی نووسەرێکی تورکمان دەکات گوایە ئەو گەرەکە لە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧دا ناوی نەهاتووە. ئەم وتانە بەشێکن لە هەڵمەتێکی فراوان کە دەمێکە کەسانی توندڕەوی تورکمان و عەرەب لە دژی کورد بەرپایان کردووە. هەوڵدەدرێت هەموو ڕاستییە مێژوویی و جوگرافییەکان سەروژێر بکرێن و بشوێنرێن. لەباتی ئەوەی باسی بەعەرەبکردنی کەرکوك بکرێت، دێن باسی ئەوە دەکەن گوایە کورد لە پەنجاکانەوە هاتوونەتە ناو شار. ئەمانە ئاگاداری ڕاستییە مێژووییەکان نین و بەبێ بەڵگە لێکدانەوە دەکەن، بۆ نموونە بەپێی بەڵگەنامەی عوسمانی گەرەکی ئیمام قاسم لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەهەمدا لە دەرەوەی قەڵای کەرکوك تەنها گەرەك بووە و هەموو گەرەکەکانی تری کەرکوك لە دەرەوەی قەڵا دوای ئەو بەچەند سەدەیەك پەیدابوونە. گەرەکی شۆڕیجەش لە سییەکاندا نەك پەنجاکاندا ئاوەدان کراوەتەوە و لە کاتی سەرژمێرییەکەدا ژمارەی دانیشتوانی ٢٣٦٥ کەس بووە. ئیمام قاسمیش ژمارەی دانیشتوانی هەر بە پێی سەرژمێرییەکە ٤٦٥٤ کەس بووە، ئاخورحوسێنیش ٢٠٢٧ کەس بووە. سەرباری هەموو ئەمانە و هەر بە پێی ئامارەکانی سەرژمێریی ١٩٤٧ ئەو کاتە ٥٦٤٦ کەس کە لەدایکبووی لیواکانی سلێمانی و هەولێر بوون لە کەرکوك دەژیان. تەنها ئەمانە دەکەنە نزیکەی دە هەزار کەس، ئەگەر ڕێژەیەك لەو پێنج هەزار کەسەش کە لە دیالە و مووسڵەوە هاتبوون بخەینە سەر ئەوانە، ئەوا ژمارەکە خۆی لە بیست هەزار کورد دەدات لە نێو شاردا. کەواتە ئەوە قسانەی گوایە کورد لە پەنجاکان هاتوونە کەرکوك هیچ واتا و بایەخێکی زانستی نیە. ئەگەر ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین، کە ژمارەی لەدایکبوانی لیوای کەرکوك لە نێو شار بە پێی سەرژمێرییەکە تەنها ٤٩٤٤١ کەس بوونە، ئەوا ژمارەی کورد ڕێژەیەکی سەنگین و بەرچاو بووە. هەر بە پێی سەرژمێرییەکە نزیکەی دە هەزار کەسیش لە دانیشتوانی ناو شار کرستیان و جو بوون، ئەمانەش هیچیان تورکمان نەبوون. بۆیە بەپێی هەموو ئەم ئامارانە ڕێژەی تورکمان ئەو کاتەش لە نیوەی دانیشتوانی ناو شار کەمتر بووە، بەڵام نزیکەی نیوەی خەڵکی شار بەتورکمانی قسەیان کردووە بێ ئەوەی بەرەچەڵەك تورکمان بن. ئەمە لە سەرژمێری دە ساڵ دواتردا کە زمانی دایکی کردووە بەبنەما بۆ پۆلێنکردنی پێکهاتەی دانیشتوان. ئەوەش درۆیەکی زلە، گوایە کەرکوك شارێکی تورکمانییە یا سیمایەکی تورکمانی هەبووە. ئەو قسەیە زۆر دووبارە دەکرێتەوە کە دەڵێت، بەهاتنی بەلێشاوی کورد و دواتریش عەرەب سیمای شارەکەی گۆڕیوە، ئەمەیان هەندێك ڕاستی تێدایە بەڵام نەك لە قازانجی کورد. جارێ زۆربەی هەرە زۆری کورد لە ئاواییەکانی کەرکوکەوە هاتوونەتە ناو شار، نەك لە لیواکانی دیکەوە. ئەمەش دیاردەیەکی سروشتی سەدەی بیستەمە لە سەر گۆی زەوی. هیچ یەکێك لە شارەکانی دونیا بە شارەکانی عێراق و کوردستانیشەوە بەر لە نیو سەدە چواریەکی دانیشتوانی ئێستای نەبووە. کەرکوکیش وەك شارێکی پیشەسازی نەوت و دەرفەتی گەورەی کار و بژێوی پەیداکردن خەڵکی بەلێشاو بەرەو خۆی ڕاکێشاوە. تەنها لە ماوەی دە ساڵدا پاش دەرکردن و هەناردەکردنی نەوت زیاتر لە ١٥ هەزار عەرەب، کە لیوا عەرەبییەکانی عێراق لەدایکبوونە هاتوونەتە شاری کەرکوك. توندڕەوانی تورکمان نایانەوێ ئەم ڕاستییانە ببینن و تەنها باس لە هاتنی کورد دەکەن. لە ساڵی سەرژمێرییەکەدا هەموو دانیشتوانی شاری کەرکوك ئەوەندەی دانیشتوانی ئەمڕۆی شۆڕیجە نابن کە بە پێی هەندێ ئاماری نافەرمی نزیکەی ٩٠

هەزار کەس دەبن .
بە پێی پێوەرە دیمۆگرافییەکان ژمارەی ئەوانەی کە لەو کاتەدا بە تورکمانی قسەیان کردووە، کە مەرج نیە بە رەچەڵەك تورکمان بووبێتن، لە نێوان پازدە بۆ بیست هەزار کەس بوونە. هەڵبەتە ئەم ژمارەیە بۆ ئەو کاتە دەیکردە رێژەیەکی یەکجار گرنگ لە دانیشتوانی شار. ئەگەر باڵادەستی زمانی تورکمانی بەهۆی دەسەڵاتی پێشووی عوسمانییەوە لە بازار و دەزگاکانی دەوڵەتدا بخرێتە سەر ئەو ژمارەیە، ئەوا رێژەکە ئەوەندەی تر بەرچاو دەبێت، هەر ئەمەشە وای لە چاودێران و گەریدە بیانییەکان کردووە باس لە سیمای تورکمانی دانیشتوانی شاری کەرکوك بکەن. دانیشتوانی شار و لادێکان لە لیوای کەرکوك ئەو کاتە هاوتا بوون. کۆی دانیشتوانی شاری کەرکوك و مەڵبەندی ناحیە و قەزاکانی ٧١٠٠٣ کەس بوون، لە کاتێکدا سەرجەم دانیشتوانی دێکانی لیوای کەرکوك ٧٢٩٥٠ کەس بوون.
راستییەکی دیکە کە توندرەوەکان نایانەوێت ببینن ئەوەیە، کە لە سییەکانی سەدەی رابردووەوە هەرچی گەشەی دیمۆگرافی روویداوە لە کەرکوك بەپلەی یەکەم بەقازانجی عەرەب بووە و دوای عەرەب ئەمجا کورد، واتا لە هەردوو حاڵەتەکەدا بەزیانی رێژەی تورکمان بووە. کۆچی کوردان لە ئاواییەکانی کەرکوکەوە بۆ ناو شار جووڵەیەکی سروشتی دانیشتوان بووە لە سەدەی رابردوودا. کەرکوك کە لە هەموو عێراق و تەنانەت دەرەوەی عێراقیشەوە خەڵکی راکێشاوە، زۆر ئاساییە دانیشتوانی گوندەکانی خۆی، کە ٩٠٪یان کورد بوونە رابکێشێ.
عەرەب ئەو کاتە تەنها یەك ناحیەیان هەبوو لە لیوای کەرکوك کە سەر بەقەزای ناوەند بوو، کە تەواو عەرەبنشین بوو، ئەویش ناحیەی مەلحە بوو، کە شارەدێی فاروق ناوەندەکەی بوو. شارەدێی فاروق تەنها ٩٠٢ کەسی تێدا دەژیا. ژمارەی ئاواییەکانی ناحیەکە ٧٦ ئاوایی، کە ژمارەی دانیشتوانیان بەسەریەکەوە ١٢٣٥٣ کەس بوون. کۆی دانیشتوانی ناحیەکە بەهەموو گوندەکانێوە ١٥٣٢٦ کەس بوون و لە ٢٥٢٨ خێزان پێکهاتبوون.
ئەم ناحیە و دانیشتوانی بەرهەمی نیشتەجێکردنی هۆزەکانی عوبێد، جبور و ئەوانی دیکە بوون لە سییەکانی سەدەی رابردوودا. لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا بوون بەو ژمارە بەرچاوە. دواتر حەویجەی لێ پەیدا بوو و کرا بە قەزا و ژمارەی دانیشتوانی بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی گەشەیدەکرد، ئێستا باس لە چوارسەد هەزار عەرەب دەکرێت لەو قەزایە. لە تەك ئەم ناحیەدا لە قەزاکانی داقوق و کفریش چەند گوندێکی تێکەڵاو هەبوون کە دانیشتوانیان عەرەب و کورد بوون. هەموو عەرەبەکانی ئەو گوندانە کاتی خۆی پەنایان هێنابووە بەر ئاغا و شێخەکانی ئەم گوندانە، یا لەبنەڕیتدا ماڵە سەید و شێخ بوون هاتبوونە ئەو ناوانە و دواتر خەڵك لێیان کۆبوونەوە و ئاواییان دروست کرد. هەموو ئەمانە لە دەرەوەی شاری کەرکوك دەژیان و ژمارەیان نەدەگەیشتە بیست هەزار کەس.
هەرچی شاری کەرکوکە تەنها یەك دوو گەرەکی بچووك هەبوون، کە دەکرێت وەك گەرەکی عەرەب ناویان ببرێت، حەدیدییەکان کە وەك ئاواییەکی قەراخی شار بوو، سەرژمێرییەکە لە گەڵ ئاواییەکانی بەشیر و تازەدا ئاماژەی پێی کردووە و ژمارەی دانیشتوانەکەی تەنها ٣٩٥ کەس بوو. کەسە بە تەمەنەکانی کەرکوك دەزانن کە گەرەکی حەدیدییەکان بریتی بوو لە کۆمەڵێك ماڵ کە بەتەنەکە و دار و دەوەن دروست کرابوون، کاتێ مەلیك فەیسەڵ سەردانی کەرکوك دەکات و گەرەکەکە بەو حاڵە شپرزەیە دەبینێت، فەرمان دەدا هەندێ خانووی قوریان بۆ دروست بکرێت. لەوە بترازێت لە یەك دوو گەرەکی کەرکوك کۆڵان هەبوون بە ناوی کۆڵانی عەرەبەکان وەك شۆریجە، قەسابخانە و عەرەسەکان.
زۆربەی هەرە زۆری عەرەبەکانی دیکە ئەوانە بوون کە وەك فەرمانبەر و سەرباز هاتبوونە ئەم شارە، یا وەك کرێکار لە دوای دەرکردنی نەوت و هەناردەکردنێوە روویان کردە کەرکوك لە لیوا عەرەبییەکانی عێراقەوە وەك بەغدا، مووسڵ، بەسرە، دیالە، دلێم (رومادی)، کوت، عەمارە، حلە، کەربەلا، دیوانیە و مونتەفیك (ناسریە) کە ژمارەیان بەسەر یەکەوە بە پێی سەرژمێرییەکە ١٠٩٥٩ کەس بوون. هەڵبەتە لە ناو ئەمانەدا بەتایبەتی ئەوانەی لە مووسڵ، دیالە و کوتەوە هاتبوون کوردیش هەبوون، بەڵام پێدەچێت بەرێژەیەکی کەمتر بووبن. هەر لەو سەرژمێرییەدا باس لە ٣٨٦١ کەس کراوە کە بەشێوەیەکی کاتی لە کەرکوك بوونە، نەك هەمیشەیی. ئەوانەش بەشێکی کەمیان هەر لەو لیوایانەوە هاتبوون، لە تەك هەموو ئەمانەدا ١٣٢٧ کەسیش لە کەرکوك بوون کە هەڵگری رەگەزنامەی بیانی بوون و بەشێکی ئەمانەش خەڵکی وڵاتە عەرەبییەکان بوون. بەعەرەبەکانی ناو شارەوە ژمارەی عەرەب دەیکردە نزیکەی سی هەزار کەس کە هەندێك زیاتر لە ١٠٪ دانیشتوانی لیوای کەرکوك. لە ناو شاریش یەك لەسەر شەش بۆ حەوتی دانیشتوان بوون.
تورکمان لە ناو شاردا رێژەیان رەنگبێت لە نێوان ٤٠ –٤٥٪ی دانیشتوان بووبێت. لە دەرەوەی شاریش لە داقوق، خورماتو، کفری و قەرەتەپە دە هەزار کەسێك دەبوون. بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین ئەو کاتە ١٥ – ٢٠ ٪ دانیشتوانی لیوای کەرکوك تورکمان بوونە. رێژەی ٥٪ دانیشتوانیش کرستیان، جو و ئەوانی دیکە بوون. بەم پێیە رێژەی کورد لە ٦٠٪ دانیشتوان زیاتر بووە. لە لادێ رێژەکە لە هەندێ لە قەزاکان و ناحیەکان گەیشتووەتە ١٠٠٪ و لە هەندێکی دیکە ٩٠٪ و لە هەندێکیش لە ٨٠٪ کەمتر نەبووە. بەڵگەیەکی گرنگ لەم بارەیەوە ئەوەیە لەو ١٠٠٧ ئاواییەی کەرکوك تەنها ٧٦ ئاوایی مەلحە و دە پازدە گوندی دیکەی لێدەرکەیت لە دوبز، قەرەتەپە و داقوق و خورماتو کە عەرەب بوونە، بە هەموویانەوە لە سەد گوند زیاتر نەبوونە، نزیکەی بیست بۆ سی گوندیش تورکمان بوونە لە قەزای ناوەند و ناحیەکانی خورماتو و قەرەتەپە ، ئەوانی دیکە هەموویان ئاوایی کورد بوونە، کە دەکاتە زیاتر لە ٨٥٠ ئاوایی.
ئەم رێژانە لە ساڵانی دواتر گۆڕانکاری دراماتیکیان بەسەردا هات. ژمارەی عەرەب رۆژ لە دوای رۆژ لە هەڵکشاندا بوو، هەرچی ژمارەی کورد و تورکمان بوو لە کەمیدەدا. بە پێی سەرژمێری ١٩٥٧، کە زمانی دایکی کردبوو بە بنەما بۆ پۆلێنکردنی دانیشتوان، کورد ٤٨٪ و تورکمان ٢١٪ی دانیشتوانی لیوای کەرکوکیان پێکهێنابوو، بەڵام عەرەب ببووە ٢٨٪ی دانیشتوانی لیواکە. لە سەرژمێرییەکانی

دواتردا ڕەوشەکە خراپتر بوو، بۆ نموونە لە سەرژمێری ١٩٧٧دا ڕێژەی تورکمان دابەزی بۆ ١٦٪ و کوردیش بۆ ٣٨٪، لە کاتێکدا ڕێژەی عەرەب بەرزبووەوە بۆ ٤٤٪ دانیشتوان. لە هەشتاکان و نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو و تا ڕووخانی ڕژێمی بەعس بارەکە زۆر لەوەش خراپتر بوو. ئەم گۆڕانکارییە دراماتیکیانە لە ژمارە و ڕێژەی پێکهاتەکاندا ئەنجامی کۆمەڵێک هەنگاو و سیاسەت بوو: لە لایەکەوە هێنانی بەلێشاوی عەرەب بۆ کەرکوک لە چوارچێوەی سیاسەتی بەعەرەبکردندا و لەهەمان کاتدا دەرکردنی کورد و دابرینی قەزاکانی چەمچەماڵ، خورماتو و کفری لە پارێزگای کەرکوک لە ساڵی ١٩٧٦ و لکاندیان بە سلێمانی و تکریت و دیالەوە. هەرچی دابەزینی ڕێژەی تورکمانەکانە بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە، یەکەمیان بەرزبوونەوەی ناسروشتی ژمارە و ڕێژەی عەرەب و دووەمیش ناونووسکردنی بەشێک لە تورکمانەکان بەعەرەب. ئەم خشتەی خوارەوە بەشێک لەو گۆڕانکارییە دراماتیکییە دەخاتە ڕوو کە بەسەر دیمۆگرافیای کەرکوکدا هێنرا.

* خشتەی دانیشتووانی قەزای ناوەندی کەرکوک ١٩٤٧

| یەکەی کارگێڕی | ناوەند | ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی ئاواییەکان | ژمارەی دانیشتووان |
|---|---|---|---|---|
| کەرکوک | کەرکوک | ٦٤٥١٤ | ٨٣ | ٢٣٨٢٦ |
| قەرە حەسەن | لەیلان | ١٤٤٧ | ٥٥ | ١١٠٤٠ |
| مەلحە | فاروق | ٩٠٢ | ٧٦ | ١٢٣٥٣ |
| شوان | ڕێدار | ٣٨٢ | ٧٦ | ١٠٨١٨ |
| کۆی گشتی | ٤ شارو شارەدێ | ٦٧٢٤٥ | ٢٩٠ | ٥٨٠٣٧ |

* خشتەی دانیشتوانی لیوای کەرکوک لە ساڵی ١٩٤٧دا:-

| قەزاکانی کەرکوک | گوندەکانی | ژمارەی دانیشتووان |
|---|---|---|
| کەرکوک | ٢٩٠ | ١٢٥٢٨٢ |
| داقوق | ٢٤٣ | ٥٩٥٨٩ |
| کفری | ٢٨٩ | ٤٩٣٣٦ |
| چەمچەماڵ | ١٨٥ | ٣٠٣٢٨ |
| کۆی گشتی | ١٠٠٧ | ٢٦٤٥٣٥ |

* خشتەی دانیشتوانی لیوای کەرکوک ١٩٤٧-١٩٧٧

| ساڵ | کۆی دانیشتووان | ڕێژەی کورد | ڕێژەی عەرەب | ڕێژەی تورکمان | کەمینەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٢٨٥٦٠٨ | ٪٦٥ | ٪١٠ | ٪٢٠ | ٪٥ |
| ١٩٥٧ | ٣٨٨٨٣٩ | ٪٤٨ | ٪٢٨ | ٪٢١ | ٪٣ |
| ١٩٧٧ | ٤٨٣٩٧٧ | ٪٣٨ | ٪٤٤ | ٪١٦ | ٪٢ |

* خشتەی دانیشتووانی قەزای چەمچەماڵ ساڵی ١٩٤٧:-

| یەکەی ئیداری | دانیشتووانی شارۆچکە | ژ. ئاواییەکانی | ژ. دانیشتووان | ژ. موسڵمان | ژ. جولەکە | ژ. کریستیان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| چەمچەماڵ | ١٨١١ | ٦٤ | ١١٢٥ | ١١٩٤٦ | ٢ | ٥ |
| ئاغجەلەر | ٦٢٧ | ٥٥ | ٨٩٤٠ | ٩٥٦٧ | – | – |
| سەنگاو | ٥٢٤ | ٦٦ | ٨٣٠١ | ٨٣٠١ | – | – |
| کۆی گشتی | ٢٩٦٢ | ١٨٥ | ٢٧٣٦٦ | ٢٩٨١٤ | ٢ | ٥ |

* خشتەی دانیشتووانی قەزای داقووق ساڵی ١٩٤٧:-

| یەکەی ئیداری | ژ. دانیشتوانیان | ژ. ئاواییەکانی | ژ. دانیشتوانیان | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| داقوق | ١٩٨٧ | ٦٩ | ١٢٦٥٤ | ١٤٦٤١ |
| قادر کەرەم | ٦٢٠ | ٨٦ | ١٤٠٦٩ | ١٤٦٨٩ |
| خورماتوو | ٦٣٧٠ | ٨٨ | ٢٣٣٠٥ | ٢٩٦٧٥ |
| کۆی گشتی | ٨٩٧٧ | ٢٤٣ | ٥٠٠٢٨ | ٥٩٠٠٥ |

* خشتەی دانیشتووانی قەزای کفری

| یەکەی کارگێڕی | ناوەندەکەی | ژ. دانیشتووان | ژ. ئاواییەکان | ژ. دانیشتوانیان | موسڵمان | جولەکە | کۆی دانیشتووان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| قەزای کفری | کفری | ٤٦٨١ | – | – | ٤٤١٥ | ٣٣٦ | ٤٧٥١ |
| ناحیەی پێباز | پێباز | ٥٩٥٩ | ٦١ | ٥٩٥٩ | ٥٩٥٩ | – | ٥٩٥٩ |
| ناحیەی قەرەتەپە | قەرەتە | ٢٧١٤ | ٩٨ | ١٨٣٣٢ | ٢٠٩٨٢ | ٨٧ | ٢١٠٦٩ |
| ناحیەی شێروانە | سەرقەڵا | ٢٧٣ | ١٣٠ | ١٩٢٢٩ | ١٧٥٤٥ | ٣ | ١٧٥٥٧ |
| کۆی گشتی | ٤ | ٧٦٦٨ بێ پێباز | ٢٨٩ | ٤٠٥٢٠ | ٤٨٩٠١ | ٤٢٦ | ٤٩٣٣٦ |

* سەرچاوەی سەرەکی هەموو داتا و ئامار و زانیارییەکان کە لەم وتارەدا ئاماژەیان پێکراوە سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧، بروانە:-

* المملكة العراقية، وزارة الشؤون الإجتماعية، مديرية النفوس العامة، إحصاء السكان لعام ١٩٤٧، الجزء الثاني، لواء الموصل- لواء كركوك- لواء السليمانية- لواء (اربيل)، بغداد ١٩٥٤، الصفحات ١٠١- ١٥١.

*** کەلتووری سووتاندنی دەغڵ و دان:-**

هۆز و خێڵەکان لە ڕابردوودا، هەردەم لەبارەی هێرش و دەستدرێژی کردنە سەر یەکتری بوونە و ماڵ موڵك و ماڵی یەکتریان بە تاڵان بردووە، بۆ ئەوەی شوێنێکی ئارام بۆ ژینگەکەی خۆیان فەراهەم بکەن.

لە ڕابردوودا عەرەبەکان سووتاندن، سیفاتێکی بەرچاویان بووە و هەردەم لە شەڕ و بەربەرەکانیدا بوونە، بۆ گیانی یەکتری، دوورو نزیك کەلتوورێکی باویان بووە لە ڕابردوو و ئێستادا، بۆیە هەر لێکدانەوەیەك دەربارەی ئەم دیاردەیە هەڵگری کۆمەڵێك خاسیەتی ڕابردوود خێڵەکییانە و بەپێی سەردەم ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە.

لە مانگی ئایاری (٢٠١٩)ەوە ئاگرێك هەڵایساوە بۆ سووتاندنی دەغڵ و دانی جووتیارانی عێراق، کە لە سەرەتاوە دیاربوو قەزا و قەدەرە، بەڵام ئامارە ترسناکەکان نیشانی دەدەن گری ئەو ئاگرە هەر قەد و گوڵی گەنمەکان ناسووتێنێ، بەڵکو گرەکەی مەترسیدارە بۆ داهاتووی عێراق هەر لە باکوورەوە تا باشوور.

بەپێی ئامارە فەرمییەکان تا ڕۆژی ٨ی حوزەیرانی (٢٧٢) ڕووداوی ئاگر کەوتنەوە تۆمار کراوە لە حەوت پارێزگای عێراق کە زیاتر لە ٤٠هەزار دۆنم دەغلودان سووتێنراون، بەپێی ئەو بەدواداچوونە ڕۆژنامەوانییەیانەی کە ئەنجامدراوە، یەکەم ناوچە لە عێراقدا کە دەغلودانی سووتاون، ناوچەی جەزیرەی تکریتە، کە دەکەوێتە نزیك چیای مەکحول لە پارێزگای سەلاحەدین لە ڕۆژی ٤ی ئایاری ٢٠١٩ هەر یەکە لە ناوچەکانی عەلەم و بێجی و سامەڕا و خورماتوو.

دووبارەبوونەوە بەردەوامی سووتانی دەغلودان، کارەساتەکەی لە حاڵەتەوە کردە دیاردەو لە ماوەی هەفتەی سەرەتای مانگی ئایاردا، جووتیارانی هەریەکە لە ناوچەکانی خانەقین و بەهرۆز و قەرەتەپە لە پارێزگای دیالە کەوتنە بەر شاڵاوی ئەو ئاگرە، هەروەها داقووق و دووبز و پردێ و حەویجە و ڕەشاد لە پارێزگای کەرکوك. شەرگات و گەیارە و شەنگال و مەخموور لە پارێزگای نەینەوا و چەندین ناوچەی دیکەی جیاوازی لەو چوار پارێزگایە بێبەش نەکران لە ئاگری قوودرەت. بەڵام دواتر هەر یەکە لە پارێزگاکانی نەجەف و بابل و دیوانیە و ئەنباریشی گرتەوە، پشتبەستن بە مانگە دەستکردەکانی ئاژانسی ناسا و ئاژانسەکانی تر نزیکەی ١٠٠٠ کیلۆمەتر چوار گۆشە دەغلودان سووتاون.

*** هۆکارەکانی ئاگر کەوتنەوەکان:-**

١- هۆکاری سووتاندنەکان وابەستەی هەندێك ناکۆکی لەنێوان هۆزە جیاوازەکان وەکو نەریتی خێڵەکایەتی ئەو ناوچانە.

٢- هۆکاری بەرزبوونەوەی پلەی گەرما لە هەندێك شوێن، نابەرپرسیارێتی لە پاراستنی دەغلو دانەکان.

٣- لە پێشهاتێکی ترسناکدا ژمارەیەك چەکداری نەناسراو لە هەندێ ناوچەدا تەقەیان لەو جووتیارانە دەکرد کە هەوڵی کووژاندنەوەی ئاگری کێڵگەکانیان دەدا، کە نزیکەی ١٥جووتیار بە گولەی وێل لەسەرتاپای عێراقدا کوژراون، کە هەندێك لەو جووتیرانە کورد بوون لە خانەقین و داقووق.

٤- گومانکردن لە داعش کە ئەنجامدەری سەرەکی ئەو ئاگرکەوتنەوانە بێت، چونکە لە ڕابردوودا ئەو ناوچانە لەژێر دەسەڵاتێدا بووە، بەڵام لەوانە دەغلودانی جووتیارانی نەجەف و بابل و دیوانیە لە باشوور و ناوەڕاستی عێراق، شرۆڤەی جیاواز هەڵدەگرێت کە ناچێتە ئەستۆی داعشەوە.

٥- لیژنەی کشتوکاڵ و سەرچاوەکانی ئاو لە پەرلەمانی عێراق لە بەیاننامەیەکدا ئاماژە بەوە دەکەن:- کە سووتاندنی کێڵگەکانی دانەوێڵە بەشێکە لە پیلانی بەرنامە بۆ داڕێژراوی دەرەکی و ناوەکی بۆ وێرانکردنی ئابووری نیشتمانی عێراق.

٦- هەندێك هێز و لایەنی ناوخۆیی کە هێشتا ناتوانرێت بسەلمێنێت کە کێ بوون، بەشدارن لە درێژەپێدانی ئاگر خستنەوەکان، هەندێکیان بە ئامانجی درێژە بە بەرژەوەندییەکانیان بدەن کە پەیوەستە بە گەنم و بازرگانیکردنی دانەوێڵەوە، هەندێکی تریشیان بە ئامانجی نانەوەی پشێوی و ئاژاوەی تائیفییە، بەو پێیەی مانەوە و هێزی ئەو گرووپانە لە کەشێکی نائارام و ناسەقامگیردا بەرجەستە دەبێت.

٧- ساڵانێکی زۆرە مەلەف گەنم و دانەوێڵە بووەتە بابەتێکی قازانجداری ئاڵۆز و لێوانلێو لە گەندەڵی لە عێراقدا، بەپێی داتا فەرمییەکان، عێراق ساڵانە یەك ملیۆن بۆ ملیۆنێك و ٥٠٠هەزار تەن گەنمی هاوردە دەکرد و بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ناوخۆ، بڕی بەرهەمی گەنمی ساڵانەش پەیوەست بوونە بەبڕی ئەو بارانەی دەباری، ئەو وڵاتانەشی عێراق گەنمی لێ هاوردە دەکردن ئەمریکا و ئێران بوون بە پلەی یەکەم، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیار بوو ئەو گەنمەی عێرا ق لە ئێران دەیکڕی گەنمی دەستی دوو بوو واتە گەنمی ڕووسی بوو، دواتر بە عێراقی دەفرۆشتەوە.

بەڵام ساڵی ٢٠١٨-٢٠١٩ عێراق وەرزێکی تەڕی بارانبارینی بەڕێکرد، ئەوەش وایکر دکە وەرزی دروێنەی کێڵگەکانی دانەوێڵە، دوای دەیان ساڵ لە وشکە ساڵی، زۆرترین بەرهەم بۆ جووتیاران فەراهەم بکات.

وەزارەتی کشتوکاڵی عێراق لە کۆتایی مانگی نیساندا ٢٠١٩ ئاشکرایکرد، پێشبینی دەکرێت عێراق بگاتە ئاستی خۆبژێوی لە ڕووی بەرهەمهێنانی دانەوێڵەوە و پێشبینی دەکرێت سێ ملیۆن و ٥٠٠ هەزار تەن دانەوێڵە بەرهەم بهێنێ کە ئەو بڕەش بەسە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی نارخۆ.

لە کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجوومەنی وەزیرانیدا، عادل عەبدولمەهەدی بڕیاریدا هاوردەکردنی گەنم لە ئەمساڵدا بخاتە دەرەوەی کارنامەی وەزارەتی بازرگانییەوە، ئەوەش وەکو چاودێران ئاماژەیان بۆ کرد لێدانێکی گەورە بوو لەو بازرگانییە قازاندارەی ساڵانێکە لە عێراقدا بەڕێوەدەچێت.

لایەنێکی تێکدەر هەیە، ئامانجی ئەوەیە عێراق نەگاتە ئاستی خۆبژێوی لەڕووی بەرهەمهێنانی دانەوێڵەوە و هەوڵدەدات وەکو وڵاتێکی هاوردەکاری دانەوێڵە بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییە ئابوورییە بچووکەکانی خۆی بپارێزێت.

**پانتایی سووتێنراوی گەنم و جۆ بە دۆنم لە پارێزگاکانی عێراق لەنێوان ٨ی مایسی ٢٠١٩ تا ٤ی حوزەیرانی ٢٠١٩**

| پارێزگاو دەڤەر | ژمارە ڕووداو | پانتایی زەوی سووتێنراو بە دۆنم | پانتایی زەوی ڕزگاربوو بە دۆنم |
|---|---|---|---|
| کەرخ | ٤ | ٣٦ | ٧٤ |
| ڕەسافە | ٢ | ١٤ | ٤٠١ |
| بابل | ٧ | ٨٥ | ٤٦ |
| میسان | ٣ | ٤٩ | ٧ |
| واسیت | ٨ | ٢٢٧ | ٣٦٦ |
| دیوانیە | ١ | ٥ | ١٠ |
| دیالە | ٢٧ | ٣٧٩ | ٤٦١٧ |
| موسەننا | ٢ | ٢٧ | ٨٨ |
| سەلاحەدین | ٨٦ | ٤٩٠٧ | ٤٢٨٦٢ |
| کەرکوك | ٤٢ | ٣٧١٩ | ٣٣٠٤ |
| موسڵ | ٤٤ | ١١١٨٣ | ٤٤١٠٢٠ |
| ئەنبار | ١٠ | ٩٩ | ٢٩٢ |

* سەرچاوە:-
- ڕۆژنامەی (زەمەن) ژمارە ٢١، ١١ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٩ لێکۆڵینەوەیەکە بە ناونیشانی:- (گەنم و گەنمەڵی.. ئاگری کێڵگە سووتاوەکان چیتر دەسووتێنێت؟) نووسینی فەرمان عەبدولڕەحمان، لاپەرە (٤).
- ڕاپۆرتی فەرمی وەزارەتی کشتوکاڵی عێراق.

# پێڕست

## * جیۆپۆلیتیکی پارێزگای کەرکوك

کۆکردنەوەی زانیارییەکان و نووسینەکان و دۆکیۆمێنتەکان و سەرلەنوێ دارشتنەوەیان و ڕێکخستنەوەیان لە چوارچێوەی ئینسایکلۆپیدیایەکدا هەر وا کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پشوودرێژی و توانایەکی ئێجگار زۆری دەوێ بەتایبەت لە وڵات و ناوچەیەک کە دۆکیۆمێنتەکردنی زانیاری و نووسینەکان زۆر جێگەی بایەخ نەبووبێ، لەوەش ئەستەم تر لەناو گەل و نەتەوە و شارێک کە دوژمنانی بەدرێژایی مێژوو بەشێوەیەکی پیلان بۆ دارێژراو کاریان بۆ سڕینەوە و لەناوبردن شێواندنی سەرجەم کایەکانی ژیان تێدا کردبێ، بۆیە بڕیاردان بۆ گرتنە ئەستۆی نووسینەوەی ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک وەک شار و وڵاتانی دیکە هەروا کارێکی ئاسان نەبوو. کەرکوک سروشتێکی تایبەتی هەیە، چونکە بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەبووە، هەربۆیە لە ڕابردوودا هەموو هێزە جیاکان ویستوویانە وێنەی ڕاستەقینەی شارەکە بشارنەوە، بۆیە ئێمە جیاواز لە ڕابردوو لە ڕێگەی ئەم پرۆژەیەوە هەوڵمانداوە وێنەی ڕاستەقینەی کەرکوک بەتەواوی پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی، کەسایەتییەکانی (ڕووناکبیری، ئایینی، سیاسی، کۆمەڵایەتی...) سروشتی لادێ و ئاواییەکانی بخەینەڕوو.

دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان
لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە
2023